# حەمەدۆك

## یەشارکەمال


وەرگێڕانی
عوسمان ئیسماعیلی ( ئاشق )


بەشی چوارەم

# حەمەدۆك

**(بەرگی چوارەم)**

نووسینی

**یەشار کەمال**

وەرگێڕانی لە سویدییەوە

**عوسمان ئیسماعیلی**

هەولێر - ٢٠١١

# عەبدوڵڵای حەسەنزادە

لە ساڵی١٩٨٣ەوە دەگەڵ "ئینجە مەمەد"،شاکاری ئەدەبیی نووسەری گەورەی کورد بەڵام تورکی نووس یەشار کەماڵ ئاشنا بووم و ئاواتیشم بوو قارەمانە خەڵکی و خوێنشیرنەکەی بە خوێنەرانی کوردیش بناسێنم. خواوڕاستان ساڵی ١٩٨٦ دەرفەتم بۆ ڕەخساو بەرگی یەکەمی ڕۆمانی "ئینجە مەمەد"م لەژێر ناوی "حەمەدۆك"دا چاپ و بڵاو کردەوە. پێشوازیی گەرمی خوێنەرە خۆشزەوقە هاوزمانەکانم لەو کارە، هانی دام تا دوو بەرگی دیکەی حەمەدۆکیش بەرودوا بکەمە کوردی و بڵاویان بکەمەوە. دیارە بەرگی سێیەم لەبەر ئەوەی زۆر درێژ بوو، بەناچار لە کوردییەکەدا بە دوو بەرگ چاپ کرا.

بەڵام ئەمنیش و زۆر لە خوێندەوارانی کوردیش دەمان زانی کە "ئینجە مەمەد" بۆخۆی چوار بەرگە و بەو پێیە کارەکەی من کە بەڕاستی جێی ئۆگریی خوێنەران بوو نیوەچڵ و ناتەواو بوو. لەماوەی دەپازدە ساڵی ڕابردوودا بە دەیان کەس (ئەگەر نەڵێم بە سەدان) هەر کە تووشی یەکتر بووین لێیان پرسیوم: دەنگ وباسی حەمەدۆك چیە، بەرگی چوارەمی حەمەدۆکت نەکردۆتە کوردی، حەمەدۆك کەنگێ دێتەوەو زۆر پرسیاری لەوبابەتە، کە بەداخەوە بۆهەموو ئەو بەرێزانە تەنیا یەك وەڵامم پێ بووە: "بەداخەوە بەرگی چوارەم نەکراوەتە فارسی و ناشکوری نەبێ ئەمنیش تورکی نازانم".

نزیکەی دووساڵ لەمەوبەر دۆست و هاوڕێی ئەدیب و شاعیرو کوردی زان و پاراوزمانم کاك عوسمانی ئیسماعیلی ناسراو بە مامۆستا ئاشق کە ماوەیەکی زۆرە لە وڵاتی سوێد دەژی و زمانی ئەو وڵاتە بەجۆرێك فێر بووە کە شێعری پێ دەنووسێ و بڵاو دەکاتەوە، لێی پرسیم پێت چۆنە بەرگی چوارەمی "ئینجەمەمەد" کە کراوەتە سوێدی بکەمە کوردی. سەرنج ڕاکێش ئەوە

بوو دەیەویست ئیزنی ئەوکارەی پێ بدەم (کە ئەمە نیشانەی ئەخلاقی بەرزی ئەو دۆستە بوو). ئەمن کە لەمێژ بوو ئاواتم دەخواست یەکێك هەبێ لە هەر زمانێکەوە بۆی بگونجێ ئەو ئەرکە لەجیاتی منیش بەجێ بگەیەنێ، لەخۆشییان شاگەشکە بووم و زۆرم سوپاس کردو هانم دا کەهیچ سێ ودووی لێ نەکا.

لەوماوەیەدا هەمیشە بە تەلەفۆن و بە ئیمەیل پێکەوە لە پێوەندیدا بووین و تەنانەت زۆر وەختیش بەشێك لە کارەکەی لەسەر داخوازی خۆم بۆ ناردووم بۆ ئەوەی تامەزرۆییم بۆ تەواوکردنی خوێندنەوەی ئەو شاکارەی پێ بشکێنم. ئێستا بەڕاستی خۆشحاڵم کە مامۆستا ئاشقی خۆشەویست ئەوکارە گەورەیەی تەواو کردوە و ئەو چاوەڕوانییەی بەجێ هێناوە کە چەندساڵ بوو خوێنەرانی کورد و ئۆگرانی چارەنووسی حەمەدۆك لە منیان هەبوو.

لەو پێوەندییەدا وێڕای سوپاس و دەستخۆشی لە مامۆستا ئاشقی نووسەرو شاعیرو وەرگێڕ پێم خۆشە بۆ ئەوکەسانەی ئاشنای شێعرو نووسینەکانی ئەو بەرێزە نین ڕابگەیەنم کە کارەکەی مامۆستا نەك هەر تەواوکەری کارە نیوەچڵەکەی منە، بەڵکوو لە باری ڕەوانی و شیرینیی زمانەوە وەپێش بەرگەکانی دیکەش کەوتۆتەوە. دڵنیام خوێنەرانی ئەم بەرگەی حەمەدۆك دوای خوێندنەوە قبووڵ دەکەن کە ئەوەی لێرە دا گوتوومە نە زێدەڕۆیی تێدایە و نە خاترگرتن. پیرۆزبایی لە مامۆستائاشق کە ئەو کارە قورسەی لە ماوەیەکی کورتدا ڕاپەڕاندو لە خوێنەرانی کورد کە لە دیتنی دواتابلۆکانی شاکاری یەشار کەمالی مەزن چێژ وەردەگرن و لەخۆشم کە دۆستێکی وا بەڕێز کارەکەمی تەواو کرد.

عەبدوڵڵای حەسەن زادە

# کورتە پێشەکی‌یەك

ساڵی ١٩٨٦ بەرگی یەکەمی "حەمەدۆك"، وەرگێڕراوی "ئینجە مەمەد"ی بەرهەمی نووسەری بەناوبانگ یاشار کەماڵ خوێندەوە، کە وەرگێڕی ناوداری کورد، مامۆستای بەڕێزم مامۆستا عەبدوڵڵا حەسەنزادە کردبوویە کوردی. ئەوکات شوێنی کاروژیانم لە مامۆستا حەسەنزادە نێزیك بوو و جیرانیش بووین. مامۆستا لوتفی کرد و بۆخۆی کتێبێکی بە دیاری دامێ. خوێندنەوەی ئەو کتێبە چێژێکی تایبەتیی پێبەخشیم، ئاشقی شێوە داڕشتن و هێزی بەیانی ئەو نووسەرە کوردە تورکی نووسە بووم و بە دڵ ئاواتم دەخواست بەرگەکانی دیکەی ئەو ڕۆمانەش بە کوردی ببینم. ساڵەکانی دواتر ئەو ئاواتەم وەدی هات و مامۆستا بە دوای یەکدا دوو بەرگی دیکەشی چاپ و بڵاو کردنەوە کە دیارە هەر وەك بۆخۆی فەرموویەتی، بەرگی سێهەم لە بەر زۆر بوونی لاپەڕەکانی لە دوو بەرگ دا چاپ کراوە. من لە کاتی خۆی دا دەستم وە هەموو ئەو بەرگانەی ڕۆمانەکە ڕاگەیی و خوێندمنەوە.

دوای هاتنم بۆ وڵاتی سوێد لە ساڵی ١٩٩٢ دا و دەست پێکردنی خوێندنی زمانی سوێدی، ڕۆژێکیان لە کتێبخانەی خوێندنگەکە بە دوای کتێبێك دا دەگەڕام، لە نەکاو چاوم بە هەرچوار بەرگی ڕۆمانەکە بە زمانی سوێدی کەوت، کە لە پەنا یەك دانرابوون. زۆرم پێخۆش بوو. کاتێك لە گەڵ بەڕێوەبەری کتێبخانەکە قسەم کرد، بۆم دەرکەوت کە بەرهەمەکانی یاشار کەمال و بە تایبەت زنجیرەداستانی "ئینجە مەمەد" بۆ خوێنەرە سوێدی‌یەکان زۆر ئاشنان و زانیشم کە هەموو بەرگەکانی ئەو ڕۆمانە بە دەیان زمانی دیکە وەرگێڕراون.

ئەڵبەت ئەو کات زمانە سوێدی‌یەکەم وا نەبوو بتوانم ڕۆمانەکەی بە چاکی پێبخوێنمەوە، بەڵام یەك ــ دوو ساڵ دواتر بەرە بەرە دەستم بە خوێندنەوەیان کرد و لە نێوان ساڵەکانی ٩٥ و

٩٩ دا هەر چوار بەرگەکەم خوێندنەوە و پێویستە بڵێم وێڕای دامرکاندنی تامەزرۆییم کەلکێکی باشیشم لە بواری باشتر فێربوونی زمانەکە دا لێوەرگرتن. کاتێك بەرگی چوارم دەخوێندەوە، کە تەنیا بەرگێکی ئەو ڕۆمانە بوو پێشتر بە کوردیم نەدیبوو، بە بیرم داهات کە خۆزیا ئەو بەرگەش بە فارسی، یان بە عەرەبی هەبوایە، تا مامۆستا حەسەنزادە بە قەڵەمە بەتواناکەی و زمانە ڕەوانەکەی وەریگێڕابا و ئەو ئەرکە بۆ منی شاگردی دەستکورت نەمابایەوە، بەڵام بە داخەوە وا دیارە ئەو بەرگە تا ئێستاش نەکراوەتە فارسی، یان عەرەبییش.

سەرەنجام دوو ساڵ پێش ئێستا بە هاندانی مامۆستا و هێندێك دۆست و هاوڕێی دیکەم، دەستم بە وەرگێڕانی بەرگی چوار لە سوێدییەوە کرد و ئێستا زۆر خۆشحاڵم کە توانیومە کارەکە ڕاپەڕێنم و هەر لەو حاڵەش دا سوپاسی مامۆستا دەکەم کە وورەی پێبەخشیم بەو ڕێچکەیە دا بڕۆم، لە هەموو ماوەی کارەکە دا نێوە نێوە پێوەندیی پێوەگرتم، ڕێنوێنیی لێ نەبڕیم و لە کردنەوەی گرێکان و هاواهەنگ کردنی زۆر ناو و زاراوە لە گەڵ بەرگەکانی پێشتر دا یارمەتیی دام.

سەبارەت بە یاشار کەماڵ و نووسینەکانی بە پێویست نازانم چ بڵێم. ئەو نووسەرە پایەبەرزە ئەوەندە بەناوبانگە و ئەوەندەی لە سەر نووسراوە، کە لە ڕادەی جیهانی دا ناسراوە، لە ڕیزی نووسەرە گەورەکانی دنیا دایە و بەرهەمەکانی لە ئەدەبیاتی نەتەوە جۆراوجۆرەکان دا ڕەنگیان داوەتەوە. تەنیا پێمخۆشە ئەوەندە بڵێم کە یاشار کەماڵ خاوەنی هێزی بیرکردنەوە و خەیاڵێکی یەکجار بەرینە. ئەو نووسەرە جۆرێك وەستایانە دیمەنەکان دروست دەکا و بە ناخی کەسایەتی و سروشتی قارەمانانی داستانەکانی دا شۆڕ دەبێتەوە، کە خوێنەر لە گەڵ خوێندنەوەی داستانەکە هەست بە دیمەن و کەسەکان دەکا. بە ڕاستی من بە تایبەت لە ماوەی وەرگێڕانی کتێبەکە دا لە نێو ئەو ڕووداو و دیمەنانە دا دەژیام و جۆرێك لە گەڵ کەسەکان تێکەڵ بووم و دەمناسین، دەتگوت لە دەوروبەرمن.

لە کۆتایی دا هیوادارم بە زوویی ئەم کتێبە دەرفەتی چاپی بۆ بڕەخسێ، بگاتە دەست خوێنەرەکان و دۆستانی حەمەدۆکی قارەمانی یار و یاوەری هەژاران بتوانن دوایین بەشی ئەو زنجیرە بەسەرهاتە بخوێننەوە.

وەرگێڕ

مانگی مای ٢٠١٠

## (١)

ئەمن هاتمە شاری "جالیندرا" ی نێزیك سنوورەكانمان. ئەو شارە لە ڕۆخی ئاوێ، لە نێزیك ئەو بەشەی چیای "تووڕووس"ی کە دەکەوێتە ئەو بەری چۆمی "فوڕات"یێ هەڵکەوتوە و لە لای ڕۆژاواوە بەرامبەر بە زنجیرە چیای بەرزی تووڕووسە. لووتکەكانی ئەو زنجیرەچیایە ئەوەندە بەرزن، دەڵێی خۆیان لە ئاسمانێ دەسوون. پێمانیە هیچ شوێنێکی ئەم جیهانە بە قەد سەری ئەو کێوانە بەرز بێ. گزینگی خۆر بەیانییان، چوار سەعات پێش ئەوەی هەموو شوێنەکانی دیکە ڕووناك بکاتەوە، سەری ئەو کێوانە دەنگێوێ. بەردی سپی شەبەق دەدەنەوە و تریفەیەکی ڕووناکی ئەوتۆ بە سەر عەردی دا بڵاو دەکەنەوە، دەڵێی عەردەکە دەبریسکێتەوە. بۆ ئەرمەنییەکانی ئەو ناوچەیە ئەو شەبەقە لە تریفەی مانگی شەوی چاردە جوانترە. لووتکەی چیاکان مەودای چوارمیلی باڵەڕێ(بە حەوای دا) لەو هەورانە بەرزترن کە لە سەرەوەی هەموو هەوران دەفڕن.

دوای ئەوەی خۆر ئاوا دەبێ، لە بەشێکی زۆری خۆراوای ئەو هەرێمە، هەتا سێیەکی شەوێ شەبەقی خۆر بە سەر یەکێك لەو لووتکانەوە دەبینرێ. هەر ئەو لووتکەیەش بوو کە ئەو کاتەی لە لای ئێمە هەوا ساو دەبوو، لە پێش دا وەك ئەستێرە کلکنە دەهاتە بەرچاو و لە بوولێڵی شەوێ دا شکڵ و شێوەی دەگۆڕی: جاری وا بوو بە دوو جێ و جاری وا بوو بە سێ جێ دەبینرا، وا هەبوو ماوەیەکی زۆر و وا هەبوو تەنیا چاولێکنانێك خۆی نیشان دەدا. ئەوەش لە بەر ئەوە بوو کە پەڵەهەورەکانی ئاسۆ دەکەوتنە نێوان خۆر و لایەکی کێوەکە و بەو شێوەیە شۆقی خۆریان دەبڕی، شکانەوەی شۆقەکە لە کێوەکانیشەوە بە هۆی پەڵەهەورەکانەوە جێ جێ دەبوو و دەگۆڕا.

... نیسێی ئەو لووتکانە ئەوەندە درێژ دەبنەوە کە لە مانگی جۆزەردانێ دا، ئەو کاتەی کە ڕۆژ لە شوێنی هەرەبەرزی جەغزی گەڕانی خۆیەتی، دەگەنە سنوورەکانی "سەرمەتییە"ی، کە ڕێگای

دوازده ڕۆژەڕێیانە و لە نێوەڕاستی سەرماوەزێ دا دەگەنە کێوەکانی هەرەخوارووی باکوور، واتە ڕێگای سەفەرێکی یەك مانگە. پەڵە هەورەکان و هەر وەها بەفریش هەمیشە دەکەونە ئەولایەی کە باپەنایە و بە هۆی لووتکەبەردینەکانەوە لەت دەبن، بەڵام کاتێك بایەکە دەیانگرێتەوە، هەورەکان وێلدەکەونەوە. با هەورەکان لە هەموو لایەکەوە کۆ دەکاتەوە و لە گەڵ خۆیان دەبا. زۆر جار کاتێك هەورەکان دوور دەکەونەوە، هێندێك ڕەوەزی ڕووخاو لە دوای خۆیان بەجێ‌دێڵن، چونکە بایەکە هەمیشە بە برووسکانەوە دێ و پەڵەهەورە بچووك و گەورەکان لێکدەدا و وەپێش خۆیان دەدا.

لە داوێنی ئەو چیایە زۆر خەڵکی جۆراوجۆر دەژین. ئەو دەوروبەرە پڕە لە چۆم و جۆگە. خاکێکی بە پیتە و خێروبەرەکەتی بۆ هەمووان پێوەیە. لێرە ئەگەر پیاو بەرەو باشوور بڕوا، تووشی دارستانێك لە دارچنار و بەڕوو و هێندێك داری دیکەی لەو نەوعانە دەبێ. لکی دارەکان بەرزن. دوای ئەوە سێ میلی دیکە، هەر جاڕ، مێرگ، گیادروو و لەوەڕگەیە. دواتریش هەتا دەگەیە سەر ترۆپکی تووڕووسی، ئیدی هەر بەفرە، کە ساڵەوساڵ دەکەوێتەوە سەریەك و قەت ناچێتەوە، پانایی ئەو بەشە بەفرینە تا سەرێ خۆ لە چاردە میل دەدا.

بە درێژایی میلێك لەو شوێنەوە کە لووتکەکان خۆ قوت دەکەنەوە، هەور هەمیشە هەن و ڕادەی پازدە میلێك تا نێزیکەی بەرزایی پێنج میل دادەپۆشن. دەکرێ بڵێین سەری لووتکەکانی تووڕووس لە بەرزایی‌یەکی ئەوتۆ هەڵکەوتوون. لە نێوقەدی ئەو لووتکانەڕا هەوا گەرم دەبێ، پشووەبایەکی ساردی لێ‌نایە. لێرە هیچ شتێك ناتوانێ بژی، تەنیا هێندێك باڵندەی گۆشتخۆر نەبن، کە لە کونوکەلێنە قووڵەکانی ڕەوەزەکانی تووڕووس دا هێلانە دەکەن و بە بن هەوران دا بۆ ڕاوی نێچیران، لە داوێنی زەمەند و بژوێنی ئەمدیو و ئەودیوی چیاکە، دێنە خوارێ. لێرە، لە سەرەوەی هەورەکان، تەنیا ڕەوەزی ڕووت هەن، و بەردە سپییەکان وا دەبریسکێنەوە، چاویان لە بەر هەڵنایە. ڕەوەزەکان ئەوەندە ڕژد و چڕن، کەس ناتوانێ پێیان هەڵچێ و بگاتە سەری لووتکەکان..." ( لە یادداشتەکانی لیۆناردۆ دا وینچی)

چیای تووڕووس لە شێوەی مانگی یەکشەوە دەشتی دە نێوخۆی گرتوە و "چوکووراوا"ش لە نێوان دەریای نێوەڕاست و چیاکان هەڵکەوتوە. زنجیرەچیاکە هەنگاو بە هەنگاو هەڵدەچێ و لە شینی کاڵەوە بۆ شینی تۆخ و لە سووری شەڕابییەوە بۆ شینێکی ئاوی ڕەنگ دەگۆڕێ و زۆر دوورتر، لە ئاسۆ، لە گەڵ ڕەنگی ئاسمانێ وا تێکەڵ دەبن، کە مرۆڤ بە زەحمەت دەتوانێ لێکیان کاتەوە.

دۆڵ و شیوی چیاکان پڕ لە نیسێ دەبن. کاتی خۆرهەڵات نیسێکان بەلای خۆراوا دا دەکەون و بە کاتی خۆراواش لای خۆرهەڵاتی دۆڵەکان دادەپۆشن. کاتێك گەرما دەگاتە ئەوپەڕی خۆی، فێنکی‌یەکی

گیانبەخش لە چیاکانەوە دادەبەزێتە سەر دەشتەکە. هەموو ڕۆژێ، بەردەوام، دیمەنی چیاکان دەگۆڕێ. هێندێك ڕۆژان لە گەڵ هەڵاتنی خۆر، لە زەردێکی زێڕین دا مەلە دەکەن، زەردەکە وردەوردە بەرەو سوور، دوایە سپی یەکی شیری و دواتریش بەرەو شینێکی کاڵ دەکشێ. جاری وا هەیە ڕەنگێکی ئاماڵێنەوشیان دەبێ. بەرەبەری نیوەڕۆیە کە ئیدی گەرما قوولەی دەکا، وەك هەوری ڕەنگ نارنجی دێنە بەرچاو و هاوکات هەموو شتێکی دەوروبەریان دە ڕەنگێکی خۆڵەمێشیی تاوسووتوو دا خۆ دەنوێنێ.

هێندێ جار ڕەنگی چیاکان شینێکی تۆخە و لە بەهاران دا لە ڕەنگێکی بنەوشی دا دەدرەوشێنەوە، یان دەڵێی بزماری زێڕن لە داوێنەکانی خۆیان دراون. ئەو چیایانە نوقمی تۆفانێك لە ڕەنگن، بنەوش، شینی تۆخ... و... بەو شێوەیە ڕەنگەکانیان بە دوای یەك دا دێن و قەت کۆتایی یان نایە.

زۆر لە خوارەوە، لە نێوەڕاستی هەموو چیاکان، کێوی گەورە و بە سامی "چیای دوڵدوڵ" خۆ دەنوێنێ. ئەو کێوە شەبەقێکی وا دەداتەوە، چاوی لە بەر هەڵنایە. مرۆڤ پێی وایە کێوەکە لە گەڵ بریسکانەوە دەسووڕێ و دەشت و دەری دەوروبەری خۆی ڕووناك دەکا. زۆر بە دەگمەن هەورەکان دەبنە چارشێوی سەری ئەو کێوە. لووتکەی چیای دوڵدوڵ لە هاوینان دا وەك پەڵەیەکی بنەوشی دەدرەوشێتەوە، یان بریسکانەوەیەکی تێکەڵاوی ئاماڵ مسی، شین و بنەوشیی هەیە. ئەستێرەیەکی ئەفسانەیی لە سەری لووتکەکە دەجووڵێتەوە و هەزاران ئاورینگی بچووك بە دەوری خۆی دا دەپرژێنێ.

لووتکەکانی تووڕووس لە بەردەسماتەیەك پێك‌هاتوون، کە هەموو ڕەنگەکانی کۆلکەزێرینەی تێدان، لە سپی یەوە بەرەو پەمەیی، سوور، قاوەیی تۆخ و سەوز، تا نارنجیی گەش. بە سەر ئەو بەردانە دا هێندێك هەڵۆ دەگەڕێن، کە باڵیان لە ڕادەبەدەر پانە. لە خوارەوەتر دارستان دەست پێ‌دەکا. دارستانێکی پڕ، کە دەعبای کێویی تێ‌دا دەژین. لەو دارستانە دا دار سەرو، عەرعەر و سنەوبەر سەریان لێك‌داوە و دە ئاسمانێ هەڵچوون. لە هەر دۆڵێك، لە هەر مێرگێك و لە بن هەر گابەردێك کانی‌یەك هەڵدەقوڵێ. ئاوەکە بۆنی جاترەکێویلە، سنەوبەر و گوڵی جۆراوجۆری لێ‌دێ. ماسیی ڕەنگاوڕەنگ لە ئاوی کانی‌یەکان دا خۆ هەڵداوێن. ئاوەکە بە نێو دار و گابەردان دا دەڕژێتە خوار، بەملا و ئەولای لاپاڵی شاخەکان دا دێتەخوار و دەڕژێتە چۆمێکەوە.

هەر چیای تووڕووسیشە چووکووراوای دروست کردوە. لە سەردەمی کۆن دا، زۆر لەمەوپێش، دەریای نێوەڕاست لە بن چیای تووڕووسەوە دەستی پێ‌دەکرد، بەڵام وردە وردە "جەیهان" و "سەیهان" و بێ‌ئەژمار ڕووبار و چۆماوی دیکە، گڵی بە پیتوبەرەکەتی چیاکەیان لە گەڵ خۆیان دە دەریایە کرد و بەو شێوەیە چوکووراوا دروست بوو. تیشك و شەبەقی خۆرەتاو

دەشتەکەی پڕ کرد. سەرچاوە تەقینەوە، ئاو بەخوڕەخوڕ ڕژا خوار و هاوکات دەریا عەردەکەی لێواولێو لە پیتوبەرەکەت کرد.

"سەیهان" دەڕژێتە "زامانتی". چۆمەکە پاشان دەگاتە "نوزوم یایلا" و کاتێك بە بەرزاییی‌یە پڕ کەند و قوولەکانی تووڕووس دا سووڕ دەدا، تووشی ڕەوەزە بەردەسماتەکان دێ. ئاوەکە بە دەوری گابەردەکان دا کەفێ دەکا و بەگوڕ دەڕژێتە دۆڵە قوولەکانەوە، لە تەختی هەرە خوارێی دۆڵەکان دا گێژ دەدا و عەرزی دەگەڵ پێچ و سوڕدانی خۆی هەڵدەقەنێ، دەڕواتە پێش، دیسان ئاوقای ڕەوەزی دیکە دەبێ و کاتێك ناتوانێ وە سەر ڕەوەزەکان بکەوێ، بنیان دەکۆڵێ و ڕێگای خۆی بە ژێر گابەردەکان دا دەکاتەوە. بەو شێوەیە ماوەیەکی زۆر بە بن عەرزی دا دەڕوا، لە پڕ لە شوێنێکی دیکە وەدەر دەکەوێتەوە و بە خێرایی و توندی‌یەکی زۆرەوە خۆی بە ڕەوەزە بەردێك دادەدا، دیسان بە یەکی دیکە و دواتریش یەکی دی. لە بەینی هەر ڕەوەزێك تا ڕەوەزێکی دیکەش و لەو ماوەیە دا کە بە نێو چیای تووڕووس دا تیٚدەپەڕێ، زۆر کانیاو، جۆگە و چۆماوی دیکەی تێکەڵ دەبنەوە. یەکێك لەو چۆماوانە کە تێکەڵی ئاوەکە دەبێ و دەوڵەمەندی دەکا، "گوێکسوو"ە. ئەو چۆماوە لە کێوی "تەختەلی"یەوە سەرچاوە دەگرێ، کە بەشێك لە تووڕووسە و هەروەها پێش ئەوەی بڕژێتە "زامانتی"یەوە، ئاوی زۆر جۆگە و ئاوهەڵدێری دیکەشی تێکەڵ دەبنەوە. کاتێك ئەو دوو ئاوانە تێکەڵ دەبنەوە و دەبنە ڕووبارێکی بەهێز، ڕووبارەکە پێی دەگوترێ"سەیهان". ئاوی ئەو ڕووبارە ئەوەندە ڕوونە هەر دەڵێی شۆق و ڕووناکی‌یە بەستێنەکەی پڕ کردوە. هێندە ڕوونە کە ئەگەر کتێبێکی تیٚکەوێ، مرۆڤ دەتوانێ زۆر بە ڕوونی خەتی کتێبەکە لە تەختی بنی ئاوەکەی دا بخوێنێتەوە و بزانێ چیی تیٚدا نووسراوە.

لە بەرامبەر دا "جەیهان" لە نێوەڕاستی چیای "هەزارگا"وە دێتە خوار و لە سەرەتاوە تەنیا جۆگەلەیەکە کە پێی دەگوترێ"خۆرمان". جۆگەلەکە لە گەڵ "سوقوتلوو"، کە لە کێوی "نوورحەق"ــەوە سەرچاوە دەگرێ، تێکەڵ دەبن. ئەو دووانە بە یەکەوە ئاوهەڵدێرێکی سەرکێش پێکدێنن و لە ڕێگای ڕژانەخواریان بە نێو تووڕووس دا، لەگەڵ زۆر ئاوی دیکە، وەك "تاخسوو"، کویرسوولوو"، "چایر"، "ساوروون"، "سومباس"، "خاندەرەسی"، "جەربەجە" و هەزاران کانی و جۆگەی دیکە یەکتر دەگرنەوە، کە لە گەڵ خۆیان دەیانبەن و تێکەڵی دەریای نێوەڕاستیان دەکەن. سەیهان و جەیهانیش کە دەڕژێنە نێو دەریایە، لە گەڵ خۆیان هەزاران و سەدانهەزار تۆن خاك دێنن و بە قەراغەکانی دەریای نێوەڕاست دا بڵاوی دەکەنەوە. هەرساڵەی دەشتەکە هێندێك زیاد دەکا، ڕەوەزەکانی تووڕووسیش کەمێك ڕووتتر دەبنەوە و لە هەمان کاتیش دا سپی‌تر و تیژتریش دەبن. لەوانەیە ڕۆژێك، تاقەدارێك، یان مستە خاکێك لەو شاخانە نەمێننەوە و ئەو کات ئیدی هەر

ڕەوەزەکان بێننەوە کە دە نێوان عەرزو ئاسمانێ دا بە بەرچاوانەوە دیار بن. ئەگەر واش بێ، لەوانەیە ئەو کات وەك مسی سوورەوەبوو هەڵمێکی گەرمیان لێ هەستێ و ڕەنگە یەك دڵۆپە ئاویش لەو کێوە ڕووتانە دەست نەکەوێ و هەروەها ڕەنگە تاقە یەك زیندەوەریش لەو سەرانە نەمێنێ ...

خاکی ڕۆخەکانی دەریای نێوەڕاست وەك شەپۆلەکانی دەریایە ڕادەژێ و کەفێ دەکا. ئەو دەشتە بێکۆتاییە و ئەو چیا بەرز و زەبەلاحانە وەك ئاوی دەریای نێوەڕاست شینن. ئەو تیشکەی لە دەریایە دەدا، ڕاست وەك ئەو تیشکەی بە سەر دەشتەکە و توورڕووس دا دەدرەوشێتەوە، بەهێزە. وەك چۆن کێوەکان پڕن لە بۆنی خۆشی ڕەوەزەکان، سنەوبەرەکان، جاترە کێویلە و هەمو چەشنە گوڵێکی دیکە، دەشتیش لێوالێو لە بۆنی عەرد، دەریا، پرتەقاڵ، لیمۆ و نارنجە.

سەرانسەری ساڵێ عەرزی ئاوس، کە لە خۆشیی ڕێژەو و پیتوبەرەکەتی خۆی سەرمەستە، بە زاری ئاواڵەوە چاوەڕوانە چیای توورڕووس بەهار و بارانی پی ببەخشێ. سەرەنجام ئەو ئاواتە وەدی دێ. ڕۆژێك هەورێکی ڕەش سەری "ئالاکێو"ی دادەگرێ و بایەکی گەرم بە سەر دەشتێ دا دێ. ئەوجار دڵۆپە بارانە قورس و شیلەوتینەکان دێنە خوارێ و پاشانیش ئیدی باران وەك گۆزەی سەرەوژێر دەست پێدەکا. کاتیك بارانەکە لێیدەکاتەوە، ئەو دەشتە پڕ دەبێ لە گوڵ، باڵندە و مێشومەگەز و دەڵێی لە خۆشیان مەستە، خاك و هەوای نەرم و گەرم دەبن، لەبەرخۆیەوە دەلۆرێتەوە و لایەلایەی دەکا. دار نارنجەکان، پرتەقاڵەکان و لیمۆکان چارشێوێك لە گوڵ بە خۆیان دادەن. شنەبا بۆنی گوڵە جۆراوجۆرەکان لە قولینچکێکی دەشتەوە بۆ قولینچکێکی دیکە دەبا و دەیگەیەنێتە چیای توورڕووسیش.

هەڵۆکان لە گەڵ ئاوەکەی لە شاخی ڕا دێنە خوار. تەواوی ساڵێ زەوییە باتلاغەکان بۆ هەموو جۆر و ڕەنگە باڵندەیەك وەك بەهەشتیان لێدێ. ئەوانەی لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژاوا، یان لە باکوورەوە بۆ باشوور کۆچ دەکەن و ڕێگایان بەو مەڵبەندە دایە، هەمیشە لە عەرزە باتلاغەکانی چوکووراوا، بۆ ماوەیەك دەمێننەوە.

هەموو شتێك لە چوکووراوا لە بەر گەشییان دەترووسکێتەوە، هەم ڕەوەزەکان، هەم دارەکان و هەم خاکەکەش، تەنانەت باڵندە، مێشومەگەز و ئینسانەکانیش ... ئاسمان یەکتەخت ساماڵە و شەوانە پڕ لە ئەستێرەیە. ئەوندە ڕووناکە کە مرۆڤ دەتوانێ خەتی قورئانێ لە تەختی بنی چۆمێکی قووڵ ڕا بخوێنێتەوە.

## (٢)

حەمەد بە پارێزەوە و بێ ئەوەی بێڵێ کەس پێبزانێ، لە نێو گابەردەکانی ئاناوارزای هاتە خوارێ و خۆی بە نێو دڕووەلانی کیفار و کەرتەشیجاڕ دا کە وەك دارستانێکی چڕوپڕ سەریان لێکدابوو و لە زۆر جێیان ئەوەندە بەرز بوون کە سەریشی تێیان دا دیار نەبوو، داکرد. بەهار بە تەواوی دەسەلاتی خۆی نیشان دەدا و لە نێو گابەردەکانی ئاناوارزاش گوڵی هەمیشە بەهار لە گلەسووری هاتبوونەدەرێ. هەموو ڕەوەزە بەردەکان بە گوڵە کاکتوسی سوور، شین، زەرد و سپی داپۆشرابوون. سەری گوڵەکان پڕ بوو لە زەرگەتە و مێشەنگوین، کە باڵیان بریقەی دەدا. لە سەری ڕەوەزەکان ڕا، تا ئەو کۆنەکەلاوانەی پاشماوەی قەڵایەکی ڕووخاو بوون و حەمەد لە شەوێوە خۆی تێدا حەشار دابوون، هەموو جۆرە گیایەك سەرشێتانە سەریان لێکدابوو. ئەو لە لای ڕۆژاوای دیوارێکی گەورەی کۆنەقەلاکە خۆی حەشار دابوو، بەلام لە ترسی ماران، تا ئەو کاتەی هەوەڵ کەڵەشێری بەیانی نەیخوێند، تەنانەت ساتێکیش خەوی نەهاتبووە چاوانەوە.

کاتێك وەخەبەرهات، قاوەڵتوونێکی درەنگ بوو. کزەبایەکی نەرم و هێدی هات. پۆلێك پەپوولە، کە هەرکام بە قەد لەپی دەستی گەورە بوون، لە سەر گیا و گوڵان نیشتنەوە و لە جووڵە کەوتن. واوەتر، مژێکی چڕ بە سەر "ئاخچەساز" و دەوروبەری دا بلاو ببۆوە و ئەوێی بە تەواوی دەخۆی دا ون کردبوو. لە لای باشوور، لەو جێیەی کە جەیهان بە پەنا ڕەوەزەکان دا دەهاتە خوارێ، یازدە هەڵۆ لە بن هەورێکی کە وەك گێچێ سپی و وەك تۆپێکی خڕ بوو، دەفڕین. هەڵۆکان باڵیان ئاواڵە کردبوو و لە ئاسمانی شینی تۆخ دا بە بێ ئەوەی دەربەستی ئەو بایە بن، کە تازە هەڵیکردبوو، دەخولانەوە.

سەلکی کەرتەشی پشکووتبوو، گوڵێکی بنەوشی دەرکردبوو و بۆنێکی سەیر تێکەلاو لە بۆنی گیا و ئەو گوڵە، کە هەم تاڵ و هەم شیرین بوو، بلاو ببۆوە. حەمەد ڕاوەستا و بە چاو ڕەوەزەکانی ئاناوارزای

پشکنی. پۆلێك مێشوولە سەروچاوی‌یان داگرت، بە زەحمەت لە خۆی دوور کردنەوە و هەردووك دەستی بە روومەتەکانی‌یەوە گرت، بۆ ئەوەی لە هێرشی مێشوولەکانیان بپارێزێ. لە ئێوارەی ڕۆژی پێشووەوە بیری هەر دەگەڕایەوە بۆ لای نایب ڕەجەب، دورردووە شێت و عەبدی خان، کە هەرسێکیان زۆر لەمێژ بوو ببوونەوە گڵ. ئەوان وەدوای چ مەبەستێك کەوتبوون؟ بە ڕاستی نایب رەجەب و دورردووە شێت چی‌یان دەویست؟ یان دەنا عەبدی خان چ ئامانجێکی لەو دنیا و ژیانە کاتی‌یەی دا هەبوو؟ ئەدی مەلافەرهاد؟ ئەو کە هێندە کوڕژانی مەحموودی پێ خۆش بوو، مەحموودی ئاغای کانی‌گوڵان... ئەو شەوێ تا بەیانی خەوی لێ‌نەکەوت و هەر پرسیاری لە حەمەدی کرد: دەی بۆم بگێڕەوە، کاتێك گوللەکەی وێ‌کەوت، چیی کرد؟ هاواری کرد؟ چیی گوت؟ و حەمەدیش دەبوو هەمو شتێکی لە نووکەوە بۆ بگێڕێتەوە، جارێکی دیکە و جارێکی دیکەش. مەلا فەرهاد هەر ماندوو نەدەبوو و دەی‌گوت توخودا دیسانیش بۆم بگێڕەوە، هەر تاقەجارێکی دیکە و ئیدی بەسە. ئاخرەکەی حەمەد لەخۆیەوە هێندێك شتی ساز کرد و بۆی گێڕایەوە، بەڵام هەرچەندی پێوەی دەنا، مەلا فەرهاد بۆ بیستنی تینووتر دەبوو. بە ڕاستی پێی‌وابوو دیتنی تەرمی بێ‌گیانی مەحموودئاغای هێندە خۆشە؟ ڕوخساری گەش ببوو و چاوەکانی دەبریسکانەوە. حەمەد تائێستا نەی‌دیبوو کەسێك بە شتێك ئاوا خۆشحاڵ بێ. ئەدی نایب ڕەجەب چیی لەو ژیانەی دەویست؟ حەمەد بۆخۆی دیتن و لێکدانەوەیەکی ڕوونی هەم سەبارەت بە کەسەکان و هەم سەبارەت بە ڕووداوەکان هەبوو و لێکیشی دەکردنەوە، بەڵام خۆ ڕەجەب قەت تێگەیشتنێکی ڕوونی نەبوو. بۆ نایب ڕەجەبی هەموو لێکدانەوەیەك لەوە دا کورت کرابۆوە کە مرۆڤ بە شتێك خۆشحاڵ دەبێ، یان تووڕە. ئەدی کوڕی فرۆمەی؟ ئەسپەکە، کە ئەو هێندەی خۆش‌دەویست، لەچیاکانی ئەو نێوە دەخولایەوە، ئەدی بۆچی نەدەچوو لێی بگەڕێ... ئەو هەم لەو ئەسپە وهەم لە هەموو خەڵکیش دەترسا، هەر لە هەموو شتێك دەترسا، تەنانەت لەو باڵندەی لە ئاسمانێیە و ئەو مێشەش کە بە بەردەمی دا تێ‌دەپەڕی. هەموو شتێك دەی‌ترساند، بەڵام بە ڕاستی ئەو خەونی بە چی‌یەوە دەدەی؟ ئەدی دایە حۆری؟ حەمەد پێکەنی: هەرچۆنێك بوو کەسێکم دیتەوە کە بە ڕاستی دەزانێ چیی دەوێ! ڕوخسار و هەیکەلی ئەو ژنە پیرەی هاتەوە بەرچاوی، ڕوانینە گەرمەکەی و ئازایەتی‌یەکەی وەبیر هاتەوە و شەپۆلێك لە خۆشەویستی کە وەك خۆرەتاو ئیان و وەك بەهار بۆنخۆش بوو، دڵی پڕ کرد. بیری کردەوە: ئاخ دایکی خۆم، دەڵێی گوڵی ناسکی. بە دایکێکی وەك دایە حۆری‌یەوە ئەو دنیایە وەك بەهەشتێ وایە. پاشان بیری لە خەجێ کردەوە: کاتێك گوللەکانی وێ‌کەوت، کاتێك زانی نەجاتی نابێ و دەمرێ، لە پێش دا تێ‌یەوە ڕاما، دوایش چاوی لە دایە ئیرزا و منداڵەکەی کرد و ئیدی تا دوا هەناسەی کێشا، ڕوانینی لە سەر منداڵەکە نەگوێزتەوە.

لە پڕ حەمەد تەمەشای کرد لە سەرەوەی دڕووەڵانەکەیە. ئای ئای... ئەگەر یەکێك دیتبێتی... بێجگە لەوەش لە برسان پرزەی لێبڕابوو و تامی زاری تاڵ ببوو. چوو دە کەندالێکیەوە. چەند دەستە باڵندەی چووکەڵانەی زەرد، سوور و سەوز بە باڵەفڕە لە سەر دڕووە کورتەکان نیشتنەوە. لە پێش وی مارێکی ڕەشی درێژ بە سەر عەرزی دا دەخزی و پشتی مارەکەی لە بەر شەبەقی تاوێ دەبریقایەوە. حەمەد دەسبەجێ دەستی بۆ دەمانچەکەی برد، بەڵام وا دیار بوو مارەکە ئەوی نەدیبوو، چونکە بە ئەسپایی ڕێگای خۆی درێژە دا. حەمەد تا ئەو کاتەی مارەکە هێندێك لە پێشی دوور نەکەوتەوە، دەسکی دەمانچەکەی بەرنەدا. بیری کردەوە: مار شومی باشە. باپیرانمان گوتوویانە: "مارت بێتە سەر ڕێیە، چاکت بۆ دێ".

مارەکە سوورێکی دا و هێندێکی دیکەش ڕۆیی، بەڵام پاشان سەری هەڵێنا و ڕاست چاوی دە چاوی حەمەدی بڕی، دریشوکەی دەرێنا و ددانەژاراوییەکانی وەدەرخستن. حەمەد دەمانچەکەی هەڵکێشا. دەستی لەرزی: وشیار نەبم پێوەم دەدا، مارە ئیدی! بەڵام زوو هێور بۆوە. وەبیری هاتەوە کە پێویست ناکا هەر سێرەشی لێبگرێ. ئەوە نیە پێشینیان گوتوویانە هەرچۆنێك پیاو سێرە بگرێ، ماری هەر دەنگێوێ. ئەوە یەکێك لە کارە سەیرەکانی خوایە. لە گەڵ ئەوەش دەستی دەلەرزی و دڵی وەك چەکوچی لێی دەدا. ئاخرەکەی مارەکە چاوی لە چاوی حەمەدی وەرگێڕا، خولێکی دا بە خۆی و بەرەودواوە کشایەوە. بەڵام ئەوجار سەری زیاتر هەڵێنا، درێشووکە سوورەکەی درێژتر کردەوە و ڕایوەشاند. حەمەد ئۆقرەی لێ بڕابوو. بەو حاڵەش بڕیاری دابوو تا مارەکە هێرشی نەکاتێ، تەقەی لێنەکا. چ ماوەیەك بەو شێوەیە ڕووبەڕووی یەك ڕاوەستان، لە بیری نەبوو. کۆمەڵێك باڵندەی زەردی بچووك لە بەرامبەر وی لە سەر پنچکان نیشتن. لەو کاتە دا تەقە لە دەمانچەی هات و مارە ڕەشەکە بە مردوویی لە بەرپێی حەمەدۆکی وەعەرزی کەوت.

حەمەد ورتەیەکی لێهات: تەمەشای ماڵت نەشێوێ، خۆ تۆ نیشانەی بەختی خۆت کوشت! لە ژیانی دا وەك ئەمجار نەترسابوو. گوللەی حەمەدی نێوقەدی مارەکەی هەڵتەکاندبوو.

حەمەد ئەو جار وەخۆ هاتەوە و بیری کردەوە: بلێی کەس گوێی لە تەقەکە نەبووبێ؟ ئەو هەڵۆیانەی دوور دیار بوون و لە بن هەورەکەی دەفڕین، زیاتر ببوون. حەمەد دووسێ شەقاو کشاوە و هێندێك لە مارەکەی دوور کەوتەوە. پاشان بە دەوری پنچکێکی دا لێهاڵاوە و خۆی دە خڕێکی هاویشت. ترس بەردەوام لە نێو دەروونی دا تەشەنەی دەکرد، دە سەری دا دەگەڕا و ڕووناکایی لە دڵی دەبڕی. ئێوارەدرەنگانێکی ڕۆژی پێشوو، ئەو کاتەی گەیشتە ئاناوارزای، ئەوەندە خۆشحاڵ

بوو کە هەرگیز پێشتر هەستی بە شادی‌یەکی ئەوتۆ نەکردبوو. کاتێك بیری دەکردەوە، لە خۆشیی ئەوەی لەو مەترسی‌یەی هاتبووە پێشی، بە سلامەتی دەرچووبوو، وەخت دەبوو بالآن بگریٚ و بفڕیٚ، بەلآم ئێستا نێوچاوانی بە دیوارێك لە تاریکی‌یەوە نابوو، کە سامێکی زۆری لەو تاریکی‌یە دەکرد. لە پڕ بیرێك هاتە مێشکی‌یەوە کە پێی‌وابوو تەواوی ئەو دەورووبەرە پڕە لە ژاندەرمە و چوارتەنیشتیان لیٚ‌گرتوە. هەر بۆیە لە ئاودڕەکەی دا دانیشت، سەربەرگەکەی داکەند، تفەنگەکەی لە شانی کردەوە، میلی ڕاکێشا و فیشەکێکی بردە بەر لوولەی. کەمێك لەولاتر پۆلە تووەدڕکێك ڕوابوون. تووەدڕکەکان گوڵیان کردبوو و لە ئاودڕەکەوە تا خوارەوەی خڕەکەیان داگرتبووو. خۆی کووڕ کردەوە و بە ویٚ دا لە سەر چۆکان چووە پێشیٚ. کاتێك چاوی بە بەردێکی پان کەوت کە چەندپیتی نەناسراوی بەسەرەوە نووسرابوو، هێندێك ئەهوەن بۆوە و خۆشحالٚ بوو. خۆی گەیاندە بەردەکەی. لەویٚ بەردی پانی دیکەش هەبوون. ئەو بەردانە بە یەکەوەکۆمەلێك نزمی و بەرزیی وەك پلیکانیان دروست کردبوون و سەریان دەگەیشتە قوولکەیەك کە دەورووبەری بە سەختەبەردی گەورە گەورە گیرابوو. ئەویٚ جێگای چاك بوو: لێرە حەمەدۆك دەخۆی رادەدی خۆ لە بەرامبەر گورهانێك ژاندەرمە دا ڕاگریٚ و پاشانیش کە شەو داهات، دەرباز بیٚ. حەمەد لە سەر عەرزی دانیشت و پشتی وەبەردکەی دا کە ڕەنگێکی سپیی جوانی هەبوو. هێشتا دەترسا و زۆریش ماندوو بوو. بیری کردەوە. ئەریٚ چ دەبیٚ ئەگەر تفەنگ و دەمانچەکەم دانێم، وەك ڕێبوارێکی ئاسایی بە دەستڕاوەشاندن بڕۆم بۆ لای مەلا عەبدوسسەلامی، کە لە گوندێکی لێرە دوور مەلایە و پێی بلێم ئەمن ناوم مەلا محەممەدە، مەلا فەرهاد ناردوومی ... خۆ پێشتریش ئەو هەولی دابوو تفەنگەکەی دانیٚ و جارێکیش دای‌نابوو و بە مەلافەرهادی سپاردبوو، بەلآم بیٚ ئەو تفەنگەی خۆی بەتەنیٚ و لە چۆلەوارێك دا هەست دەکرد، کە کەسی بە دەورەوە نەبیٚ، هیچی نەبیٚ، وەك ئەوەی کە ڕووتوقووت بیٚ. نەخێر، نابیٚ. پەژیوان بۆوە و بە پەشۆکاوی تفەنگەکەی هەلگرتەوە. تا ئەو دەمەی گەیشتە سەر شاخەکانی چووکووڕاوایە، پێنج جاران چەکەکانی شاردبۆوە، بەلآم هەموو جاریٚ گەڕابۆوە، هەلی‌گرتبوونەوە و لە بن سەربەرگەکەیەوە لە خۆی بەستبوونەوە. خۆ کاتی خۆی بۆی زەحمەت بوو سەرکلاوەکەشی فڕیٚ دا و لە جیاتی‌یان کلاوی خەتخەت لە سەر نیٚ، بەلآم ئەوە ئێستا ڕاهاتوە و سەرکلاوەی، کە ئەو هەموو سالآنە لە سەری دەنا، هەر لە بیریش چۆتەوە،. حەمەد پشتی بە بەردەکەیەوە کوشی. فێنکیی بەردەکەی پیٚ‌خۆش بوو. هێشتاش بە گومانەوە چاوی لە دەورووبەری خۆی دەکرد. کزەبایەکی دەهات و کەرتەشی‌یەکان کە پڕ بە سەلکان گوڵی بنەوشیان دەرکردبوو، بە ناسەرسەنگی ڕادەژان. لە بەر

چاوی وی هەموو شتێك لە ڕەنگی بنەوش دا خۆی دەنواند. ئاسمان، گابەردەکانی ئاناوارزا و کۆنە کەلاوەکان، دارە بەرزەکەی ئاخچەساز و تیشکی ڕۆژێ. هەمو دەشتەکە ڕەنگی دڕووەڵانی گرتبوو و وە سەر ڕەنگی بنەوش گەڕابوو. هەروەها حەمیدەکۆ لە ڕۆژهەڵات و تووڕووسیش لە باکوور، بنەوشیان دەنواند.

حەمەد کاتێك وەخەبەر هات، دەسبەجێ چاوی بە دار چنارە گەورەکەی باتلاغی ئاخچەسازی کەوت. دەبوو لە بن ئەو دارەی لە گەڵ موسلیمی چاویان بە یەکتر بکەوێ. ئەگەر هەستابا و بە ڕاوەستانەوە ڕوانیبای، هەر لە نێو ئەو خرەش ڕا کە تێیدا دانیشتبوو، دەیتوانی دارەکە ببینێ. چونکە ئەو دارە زۆر بەرز بوو. بیری کردەوە: خوا بکا کوڕەکە چیی بە سەر نەهاتبێ. ئەو زۆر کەللەشەقە. بە ڕاستی غەزەبی خوایە. کەسێکە لە ژیانی دا قەت لە تفەنگەکەی جیا نابێتەوە... بەڵام لە هەر بارودۆخێکیش دا بەرەی خۆی لە ئاوێ دەردەکێشێ. بێجگە لەوەش عەلی کەرتیشی لە قووڵایی دڵییەوە ناخۆش دەوێ. ڕقی ئەو کوڕەی وشترییە، شکی تێدا نیە گوروووبان کەرتیش و یاوەر فاڕوق بە دەستی وی دەکوژرێن. حەمەد تا ئێستا کەسێکی نەدەناسی لەو کوڕەی پیتۆڵتر و وشیارتر بێ. هەر ئەو موسلیمەش بوو کە دەبوو حەمەدۆکی بردبا بۆ لای مەلا سەلامی، لەو گوندەی کە بۆیان باس کردبوو و گوندەکەش لە نێزیك قەڵای "پایاس"ێ، لە خوارەوەی "گاورکۆ"ی، لە قەراغ دەریایە هەڵکەوتبوو.

کە بیری لەو گوندە کردەوە، هەستی بە ئارامبوونەوەیەك کرد و بزەیەکی هاتە سەر لێوان. ئەو شوێنە بوو ئەو لێیدەگەڕا. ئەو گوندە هەمیشە لە مێشکی ئەو دا هەبوو. ئەو دەبوو بۆ ئەوێ هەر بچێ، لە وێ ببێتە شوان، دەریایە ببینێ، بە نێو دارپڕتەقاڵان دا بگەڕێ و بە بۆنی گوڵەکانیان مەست بێ. بیری کردەوە: دەبێ دورسون بۆ کوێ چووبێ. ڕەنگە گەڕابێتەوە بۆ گوندەکەی خۆی و ڕەنگە هەر ئەو گوندەش بێ کە من دەیچمێ. بۆ نابێ گوندەکەی مەلا عەبدوسسەلامی هەمان گوندی دورسونی بێ؟ خۆ ناشکرێ بێئەژمار گوند لە قەراغ دەریایە هەبن... ئەوە وای کرد کە ئەو دیمەنە بێنێتە پێش چاوی خۆی کە چۆن لە گەڵ دورسونی تێكهەڵدەنگوون و ئەو پێی دەڵێ سڵاو حەمەدۆك! پاشان دەستی دە قژی وەردەدا و لەشانی دەدا. ئەو جار دەباوەشی دەگرێ و دەڵێ: بەخێر بێی حەمەد، یاخوا بەخێر بێی! دیتووتە گوندەکەم چەند جوانە؟! یان، ئەدی بە ڕاستی تۆ پێت چۆنە؟ ئەتۆ هەر چاو لەو دەریایەی بکە! بڕوانە شەپۆلەکان چۆن کەفێ دەکەن! هەر کاری خوایە و لە خۆی جوانە! وا نیە؟ چاو لەو هەمموو کەشتییانە کە! دیتووتە چۆن دەدرەوشێنەوە؟ دەڵێی شیری سپین، دەڵێی کۆیەك ڕووناکین، نەرم بە نێو ئاوێ دا دەخزن... ئەو کوڕە چاوەکانی چەند جوانن، ئەو چاوانەی کە هەمیشە خەماوین... تێڕامانی هەمیشە بە

تێکەڵاوێك لە خەم و شادی‌یەوەیە. چ ڕوخسارێکی سەرنجڕاکێشی هەیە! هیچ ڕوخسارێکی ئەو دنیایەی وەك ڕوخساری وی گەرمیی مرۆڤایەتی‌یان تێ‌دا نادرەوشێتەوە. کە تێئەوە ڕادەمێنیّ، ڕووناکایی‌یەکت دەخاتە دڵی. ئەو ڕووناکایی‌یە تەنیا دەتوانیّ لە دۆستایەتی‌یەکی پاکەوە سەرچاوە بگریّ. چما ئەتۆ بووی بە چەتە حەمەدۆکی من؟ بەڵیّ ئەتۆ عەبدی خانت کوشتوە، لە نێو خەڵکی دەشتیّ و کێوپارەی نێوبانگت دەرکردوە و لە هەموو شوێنێکی باس باسی تۆیە. نێوبانگت چۆتە ئەنکەرەی و بە گوێی مستەفا کەماڵ پاشای قارەمانیش گەیشتوە. بیٚگومان مستەفا کەماڵیش بە بیسیتنی ناو و ناوبانگی تۆ خۆشحاڵ بووە، چونکە ئەویش وەك تۆ کوڕی بیوەژنێکی هەژار بووە. ئەویش وەك تۆ پشتیوانی فەقیر و هەژارانە! کاتێك ناوی تۆی بیستوە، حەتمەن گوتوویەتی: دەبیّ ئێوە ئەو کوڕەی بۆ من بیيننەوە! ئەو کوڕەی پێی‌دەڵێن حەمەدۆك! دەبیّ ئەو کوڕەم بۆ بێننە ئێرە! ... ماری بنەوشی ڕەنگ سووریان دەدا و لە ڕەوەزە بنەوشی‌یەکان دادەگەڕانە خوار... مارەکان لە نێو ئاو و بەردان هەڵدەقوڵێن ... گابەردە بنەوشی‌یەکان لەرزینەوە، ڕاژان، لە گەڵ لافاویّ هاتنە خوار، هیچیشیان قوم نەبوون و هەزاران پریشکە ڕووناکایی‌یان بە دەوری خۆ دا بڵاو کردەوە. دورسون وەك فرفرەی بە دەوری خۆی دا سووڕا و لە نێو کەرتەشی‌یان دا حاسی‌یە بوو. ئەو شۆقە بنەوشی‌یە و ئەو هەموو مارانە کە دەترووسکێنەوە و بەرەوپێش دەخزن ... سەری حەمەدی بە سەر بەردەکەی دا بەربۆوە. ئەو جیٚیەی سەری وی وی‌کەوت گوڵێکی پێنج پەلکی ژاکاویشی لیّبوو، کە بە بەردەکەیەوە پان ببۆوە. کە خەوی لیّکەوت، دەمودەست مارێکی ڕەش، لە چەشنی ئەوەی پێشووی لیّپەیدا بوو. مارەکە لە حەمەدی نێزیك بۆوە، سەری هەڵێنا، تێیەوە هەڵڕوانی و پاشان چۆن لە نەکاو پەیدا ببوو، هەر بەو خێرایی‌یەش سوورێکی دا، لێی‌دا ڕۆیی و دوور کەوتەوە. پاشان مارێکی دیکەی هەر لە نەوعی ئەوی پێشوو هات. ئەویش لە پێش حەمەدی ڕاوەستا، سەری هەڵێنا، دەتگوت خەریکە لێی بوشێنیّ. سەری بۆ لای دەستی برد، وەك ئەوەی بی‌لێسێتەوە. پاشان هێندێك لەولاتر پاپۆکەی خواردەوە و کپ بوو. سەری مارە تۆپیوەکەی، کە لەشی لەویّ گولۆڵە ببوو، بە لای حەمەدی دا سووڕابوو.

پۆلە پەپوولەی زلی زەرد، سوور و بنەوش و زەرگەتە و مێشی گەورە گەورە کە باڵیان بە تیشکی ڕۆژیّ دەبریقایەوە، لە گەڵ سەدان باڵندەی چکۆلە چکۆلە، لە نێو دڕووەکەرتەشی‌یەکان نیشتنەوە و دەسبەجیّ هەستانەوە. لە شوێنێکی دوور دوور لەو بەری چۆمی جەیهانی، جار بە جار گێژەڵووکەیەك دەبینرا. خۆڵ کۆڵەکەی دەبەست و دە ئاسمانیّ هەڵدەچوو.

کاتێك حەمەد وەخەبەر هات، هەور سەری دەریای نێوەڕاستیان داگرتبوو و زریان هەڵی‌کردبۆیە. هەموو گیانی لە ئارەقەی دا شەڵاڵ ببوو. حەمەد چاوەکانی گوشین و لە دەوری

خۆی ڕوانی. چاوی لە گەڵ چاوی مارە ڕەشە گەورەکەی کە لە تەنیشتی کەوتبوو، تێکئاڵقان. سەروپشتی مارەکەی پنۆك پنۆکێکی ئاماڵ سەوزی بریقەدار بوو. حەمەد دەسکی دەمانچەکەی دە دەستی گرت و بە تووڕەیی‌یەوە ڕاست بۆوە:

ــ جەهەننەمو پیێڕ بیێ مارەکان. حەك ئاسەوارتان بڕیێ!

حەمەد بە لێواری خڕیێ دا وەڕیێکەوت. نەی‌دەویست نێو دڕووەکەرتەشی‌یان بەجی‌بێڵیێ. هەولی دەدا خۆی وەدەر نەخا و بە پارێزەوە دەڕۆیشت. ئێرە ئەوەی باش بوو کە ئەگەر هەستی بە مەترسی کردبایە، دەی‌توانی بڕواتە خوارەوەی خڕەکە. هەرچەند بنی دۆڵیێ پڕ بوو لە دڕووە کیفار، بەڵام چونکە دڕووەکان هێشتا شین بوون، دە لەشی ڕانەدەچوون. حەمەد لە سەرەخۆ دەڕۆیی. وشیار بوو نەکا مار لە نێو گیای دا نوستبن و ئەویش نەیانبینیێ و پێیان لیێبنیێ. دوای ئەوەی ماوەیەك ڕۆیی، گەیشتە قوولکەیەکی، لەویێ کەرتەشی‌یەکان لە باڵای وی بەرزتر بوون. دەت‌گوت لە دارستانێك لە داری دڕاوی دا ڕاوەستاوە. ئێرە هەزاران باڵندەی بچووکی ڕەنگاوڕەنگی لیێبوو. هەر هەنگاوێکی هەڵدێنایەوە، دەستەیەك لەو باڵندانە بە جیکەجیك لە بەرلاقی هەڵدەفڕین و ون دەبوونەوە. پەپوولان دەخولانەوە و وا هەبوو کۆمەڵێك وێکڕا لە سەر کەرتەشی‌یەکی دەنیشتن و سپی‌یان هەڵدەگێڕا.

حەمەد وەبیر خەجیجیێ کەوتەوە. گوڵە کەرتەشی‌یەکان بۆنێکی خۆشی‌یان لیێدەهات، کە بۆ وی نامۆ نەبوو. پاشان بیری لە سەیرانیێ کردەوە. ئەو شەوە ئەو نەی‌توانی بچێتە نێو گوندەکە و ئێستا کە وەبیری دێتەوە، کە زۆری نەمابوو دە داوی ژاندەرمانیش بکەویێ، مچوڕکی بە لەشی دا دیێ. ژاندەرمەکان گوندەکەیان گەمارۆ دابوو. دەیانزانی حەمەد دێتە ویێ. لە بەختی باش یەکێك لە ژاندەرمەکان کۆخیبوو، ئەسپەکە ڕەویبۆوە و حەمەد بۆی دەرچووبوو. چەند دەسرێژیان بە دوا دا کردبوو، بەڵام نەیانپێکابوو و ماوەیەکیش دوای دوورکەوتنەوەی حەمەدی تەقەی تفەنگان ئەو بەینەی پڕ کردبوو. ئەو هەتا نەگەیشتە داوێنی بەرزایی‌یەکانی ئاناوارزای، لغاوی ئەسپەکەی نەکێشا. کە گەیشتە ئەوێش بە پەلە وەسەر کەوت و چووە نێو گابەردەکانەوە. دەی‌زانی زۆری پیێناچیێ ئەو دەوروبەرە پڕ دەبیێ لە ژاندەرمە کە وەك شارەمێرووی بە وڵاتی وەردەبن و دەیانەویێ ئەوی قۆڵبەست کەن و بی‌بەن. لە بەر بیێخەوی ئەوەندە شەکەت بوو کە هەر سەری وەسەر دیواری کۆنەقەڵاکەی کرد، خەوی لیێکەوت. کاتێك وەخەبەر هات و تاقە ژاندەرمەیەکیشی لە ویێ نەدی، لە خۆشیان شاگەشکە بوو... لە حاڵێك دا ــ ڕاست وەك ئێستاــ زگی لە برسان قۆڕەی دەهات، لە ڕەوەزەکانەوە بەرەوخوار شۆڕ بۆوە.

گومانی لەوە دا نەبوو کە ژاندەرمان هەموو ئاناوارزا و ئاخچەسازیشیان گرتوە و دەرچوونی زەحمەتە... هەموو گیانی شەلاڵی ئارەقەی بوو. ئای سەیرانی چارەڕەش، قەت ڕۆژێکت ڕووی خۆشبەختی نەدی! خەجێش هەروا! دایکیشم! هەرکەس لە من نێزیك بێتەوە، بەدبەخت دەبێ... بەڵام کاتێك دایە حۆریی وەبیر هاتەوە، خۆشحاڵ بوو، وەك ئەوەی ئاوپرژێنی دڵی بکەن: هەرباشە، چاك نیە لانی کەم ئەو هێندێك دڵی پێمخۆشە!

کەوێك دوور خوێندی، زریان کە تا ئێستا سۆزەیەکی دەهات و بە ئەسپایی پۆلە کەرتەشیی ڕادەژاندن، توندی کردبوو. بەڵکوو خوا بە فریای بێ. لە پڕێك بە سەر دارەبی‌یەکی دا کەوت. خۆی گەیاندێ. بە ڕاستی بۆ ئەو بڕیاری داوە دەست لە یاغیگەری‌یە بکێشێتەوە؟ بۆ تووشی ئەو دوو دڵی‌یەی بوو و وای لێ‌هات لێرە و دەو وەزعەی دا خۆی ببینێتەوە؟ کاکە لە شاخی ماباوە، تێ‌دا دەچوو، درەنگ، یان زوو یەکێك دەی‌کوشت. بەڵام ئەگەر واش با، بە چەکەوە و لە بەربەرەکانی دا دەکوژرا. ئەرێ ئەو ژاندەرمانەی ئەو شەڕی دەگەڵ دەکردن، تاوانیان چ بوو؟ ئەدی بۆ خۆی چ تاوانێکی هەبوو، کە بۆ پاراستنی گیانی خۆی شەڕی دەکرد؟ ئەو خەڵکە چیی لە وی دەویست؟! کاتێك هاتە بن دارەکەی، درێژ بوو و خۆی لە بەریەك کێشایەوە. پاشان توورەکە نانوپێخۆرەکەی لە پشتێ کردەوە. کێ ئەو نانوپێخۆرەی دابۆیە و لە کەنگێوە پێی‌بوو، لە بیری نەمابوو. نانێکی گەورەی ساغی لە توورەکەکەی دەرێنا، سێ سەلکە پەنیرێش کە دە دەسرەیەکی‌یەوە پێچرابوون، سێ هێلکەی کوڵاو و دە پازدە گوێزیشی پێ‌بوون. حەمەد چاوی بە دەوری خۆی دا گێڕا، نە کانی‌یەك، نە جۆگەیەك و تەنانەت قومەئاوێکیشی لەو دەوروبەرەی چاوپێ‌نەکەوت. جا ئەگەر بەو حاڵەی نانی بخوا، لە تینوان وشك دەبێ. ناچار نانوپێخۆرەکەی دە توورەکەکەی نایەوە و توورەکەکەشی لە پشتێ بەستەوە. تفەنگەکەی لە شانی هێنا دەر و لە سەر عەرزی لە پێش خۆی دانا. سەربەرگەکەی لە خۆ کردبۆوە و لە سەر پنچکێکی دانابوو. هاوکات کە بیری لەوە دەکردوە کە چۆن لەو تەڵەیە ڕزگار ببێ، کە خۆی تێ‌دا گرفتار کردبوو، بە وردیش لە دەوروبەری خۆی، لە مارانی دەڕوانی. دەترسا ئەو شوێنە ماری لێ بن. ڕەنگە وا باش با هەر ئێستا ڕۆیشتبا و خۆی گەیاندبا دارچنارە بەرزەکەی. دەی ئەدی ئەگەر ئێستا ژاندەرمەکان موسلیمیان گرتبێ؟ خۆ عەلی کەرتیش دەتوانێ ئەوەندەی لێ‌دا، هەتا پێی ئاشکرا دەکا لە کوێ قەرارە یەکتری ببینن... ددانی وا ڕێك‌کوشین، ماسوولکەکانی لەشی وێك‌هاتن. ئای ئای... حەمەد، سەرت ڕاست ڕاگرە ترسەنۆك! گریمان موسلیم گیرابێ، خۆ ئەگەر تەواوی ئازای لەشی پارچە پارچە کەن، چاوەکانی دەرێنن و بە زیندوویی کەوڵی کەن،

یەك وشەشی لیٚنابیسن. کە وا بوو ورە بەرمەدە و سەرت بەرز ڕاگرە. ئەگەر دایە حۆری تۆسقاڵێك لیی بە گومان با، بە تووك و نزایان دەی کوشت. بەڵام بڵێی بە ڕاستی دایەحۆری ئەو کوڕەی باش ناسیبیٚ؟ قسەی تیٚدا نیە لە هۆیەکەیان دیتوویەتی و لیی حاڵی بووە چ کوڕێکە... ئەو بیرانە دە مێشکی دا دەهاتن و دەچوون.

هەورەکانی سەر دەریای نێوەڕاست ئاوسان و بەرەو ئاسمان بەرز بوونەوە. زریان توندی کردبوو و بە سەدان گێژەڵووکە بە سووڕخواردن بەرەوە ئاخچەساز بەڕێوەبوون و کە دەگەیشتنە ئەویٚ بڵاو دەبوون. پیادە،سوار، داشقە و عەرابە بە ڕێگای خوارەوەتر دا، کە بە دم چۆمی سەیهانی دا دەرۆیی، دەهاتن و دەنگەدەنگ و گاڵۆبوغریان لە گابەردەکانی ئاناوارزای دەنگی دەدایەوە. لەو کاتەوە بایەکە توند ببوو، باڵندە بەدەرەوە نەمابوون. بۆنی گیا، گوڵ و قامیش وڵاتی پڕ کردبوو. دنیا لە ڕەنگی سەوز، سوورەتی و بنەوشی درووەجارەکەی دا ون ببوو. حەمەد هەستا سەرپیٚ، پشتی دە دارەکەی کرد، دۆخینی پاتۆڵەکەی کردەوە و لە حاڵێك دا چاوی دە ئاسۆیەکی دوورەدەست بڕیبوو، دانیشتە سەر پێشاویٚ. کاتێك خۆی سووك کرد و هەستایەوە، دیتی لە دوورەوە لە نێو ڕەوەزەکانی ئاناوارزای شتێك بریقایەوە، وەك تیشکی لەتە ئاوێنەیەکی. تیشکەکە ون بوو و دیسان هاتەوە. حەمەد زانی ئەوە بریقەی ئەستێرەی سەر کڵاوی ژاندەرمەیەکی‌یە. پاشان گرمەیەك هات و دواتر تەقە لە نێو ڕەوەزەکان دەستی پیٚکرد. حەمەد نیگەران بوو، دڵی وای لیٚدەدا دەتگوت خەریکە لە قەفەسی سینگی بێتە دەریٚ. لە دڵی خۆی دا گوتی خوایە گیان هەر ئەوان دەستیان وە کوڕەکەی ڕانەگا، چی‌دیکەم ناویٚ. ئەو هەروا لە بن دارەکەی دانیشتبوو و چاوی دە ڕەوەزەکانەوە بڕیبوو. دەنگی تفەنگان دەهات. بڵێی ئەو بتوانیٚ لەو بارودۆخە دا یارمەتیی موسلیمی بکا؟ هەر لە جیٚ دا بڵێی پێش ئەوەی ژاندەرمەکان بی‌گرن، بتوانیٚ بگاتە ئەویٚ و کارێك بکا؟ ئەدی نەچیٚ؟ هەر وا دەست لە سەر دەست دانیٚ و چاویان لیٚبکا! باشە هەر بۆخۆی بوو کوڕەکەی ئاوا دە زاری گورگی هاویشتبوو و ئەگەر ئەو شتێکی لیٚبیٚ، قەت ناتوانیٚ خۆی ببەخشیٚ... بیٚ ئەوەی چی‌دیکە بیر بکاتەوە باڵاپۆشەکەی دەبەر کردەوە، تفەنگی دە شانی کردەوە و ڕای کرد. لە پڕ چاوی بە مارێکی ڕەشی گەورە کەوت کە ڕاست بەرەورووی دەهات و لەوحاڵەش دا شتێکی ڕەقی وەڕانی کەوت و هێندەی ژان پیٚگەیاند کە پیی‌وابوو لایەکی ڕانی لیٚبۆتەوە. مارەکە لیی لادا و بە ڕێی خۆی دا ڕۆیی، حەمەدیش لە بەر ئێشی ڕانی نەی‌توانی چی‌دیکە بڕوا، لە حاست خۆی نوشتایەوە و کەوتە عەرزی. بەڵام دوای کەمێك حەسانەوە، کە هەستی ڕاگرت و گوێی لە دەنگی تفەنگان

بۆوه، ڕاست بۆوه و دەستی بە غاردان کردەوە. لە نەکاو تەقە بێدەنگ بوو... ماڵی نەوێرانم، وەڵلاهی موسلیم کوژرا. حەمەد لە سەر عەرزی درێژ بوو، چەند بەو حاڵە مایەوە؟ وەبیری نەدەهاتەوە. پۆلێك پەڕەسللێرکە لە سەر سەری دەهاتن و دەچوون. چاوی بە پەپوولەیەکی شینی گەورە کەوت، کە خاڵی سپیی دە لەشی دا بوون، بە دەوری سەری دا دەخولاوە، پاشان هات لە سەر دەستی نیشت، ماوەیەك باڵەکانی لێکدان و پاشان هەستی لە خۆی بڕی. حەمەد لە بەرئەوەی نەکا پەپوولەکە بفڕێ، نەیدەتوانی خۆی ببزێوێ، تەنانەت هەناسەشی هەڵنەدەکێشا. بۆنێکی شیرنباوی وەبەر دەم کەوت. هەموو هێز و هەستی خۆی لە گوێی دا کۆ کردبۆوە، تا هەر چرپەیەك لە لای ئاناوارزاوە بێ، بیبیسێ. پەپوولەکە باڵەکانی ڕێك بە یەکەوە نووساندبوون و لە جێی خۆی نەدەبزووت. هێندەی پێنەچوو تەقە لە داوێنەکانی ئاناوارزای دەستی پێکردەوە. حەمەد جارێکی دیکەش دە پەپوولەکەیەوە ڕاما. تەقە گەرم بوو. حەمەد گوتی: ئاخر پەپوولەی ماڵوێران ئەوە جێگایە ئەتۆ لێی نیشتووی! پاشان هەستا سەرپێ، دەستی ڕاوەشاند و گوتی: برۆ بە ڕێی خۆت دا! پەپوولەکە فڕی، هێندێك بەرز بۆوە و دیسان گەڕایەوە و لە سەر حەمەدی نیشتەوە، بەڵام حەمەد چیدی سەرنجی نەدایە. لە پڕ تەقەکە بێدەنگ بوو، بەڵام دوای چەند دەقیقە چڕتر لە پێشوو دەستی پێکردەوە و ڕەوەز بە ڕەوەز دەنگی دایەوە. حەمەد دە دڵی خۆی دا گوتی: ئەو پەپوولە بچکۆلانەیەش دروستکراوی خوایە و لەوانەیە نیشانەی بەختی باش بێ، بەڵام پەپوولەکە فڕی و لەوێ نەما. چەند هەنگاو واوەتر تووشی پۆلێك خاڵخاڵۆکە بوو، کە لە سەر پنچکێکی نیشتبوون. حەمەد چووە پێشتر و داهاتەوە تا باشتریان ببینێ. خاڵخاڵۆکەکان پنچکەکەیان بە تەواوی سوور هەڵگێڕابوو. وێرای ئەوەی چاوی لە وان دەکرد، بیری کردەوە: مار، پەپوولە، دەعبا و جرِوجانەوەری دیکە هەموویان نیشانەی باشن و ئیشاڵڵا خێرم وەرێ دی! کە وابوو ئێستا دەتوانم ڕاست بۆ لای چنارە بەرزەکەی برۆم...

حەمەد بۆ خوارەوەی خڕەکەی داگەڕا و بە تالووکە بەرەو دارچنارە گەورەکەی ئاخچەسازی وەڕێکەوت. کاتێك گەیشتە ئەوێ، هێزی دەبەر دا نەمابوو. درووە وشترخۆرکە، چاوزەقە، کیفار و زی لە سەر سەربەرگ و پاتۆلێوە دە قالبی رووچووبوون و و تەواوی پێستی لەشیان ڕووشاندبوو. خوێن لە ڕانانی دەتکا و هەموو ئازای لەشی دێشا. حەمەد خەنجەرە چەرکەسییە دەبانەکەی هەڵکێشا و بۆ لای قامیشەڵێنەکەی چوو. گۆلێك بە سەر قامێشەڵێنەکەیەوە هەبوو. بە نووکی خەنجەرێ، لە ڕۆخی گۆلەکەی، عەردی هەڵکۆڵی و قوولکەیەکی دروست کرد.

قوولکەکە دەسبەجێ پڕ بوو لە ئاوێکی سارد و خاوێن. پاشان حەمەد توورەکە نانوپێخۆرەکەی لە پشتێ کردەوە و خواردنەکەی لە سەر سەربەرگەکەی بڵاو کردەوە.لە پێش دا ئەوەندەی ئاوخواردەوە هەتا زگی وەك تۆپێ هەڵمسا، ئەوجار خۆی لەبەریەك کێشایەوە. هەموو گیانی دێشا، دەتگوت بە چەکوچی هەموو ئازای لەشیان کوتاوە.

لە پڕ تەقە لە لای گابەردەکانی ئاناوارزای دەستی پێ‌کردەوە. حەمەد لە جێی خۆی ڕاست بۆوە. هێندەی نەمابوو ڕۆژ ئاوا بێ. تەقەکە زۆری نەخایاند، بڕایەوە و ئەو کات حەمەد هەستی کرد تا چ ڕادەیەك برسی‌یە. لە سەر سەربەرگەکەی کە وەك سفرە ڕای‌خستبوو، هەڵتڕووشکا، تێروپڕی لە نانوپێخۆرەکەی خوارد و گەڕایەوە لای کانی‌یەکەی.

حەمەد دوای ئەوەی تێری خوارد و تینوێتیی شکا، پاشماوەی تێشووەکەی دە توورەکەکەی ئاخنی‌یەوە و سەربەرگەکەشی کۆ کردەوە. چوو لە بن دارەکەی دانیشت و پشتی بە قەدی دارەکەیەوە دا. ئەو لە حاڵێك دا گنجی دابووە برۆ و نێوچاوانی، بە چاوان دەورویەری خۆی پشکنی. هێندێك ڕەقە، لە قەراغ باتڵاغەکەی، خۆیان وەبەرتاوێ دابوو. بۆقان بە قاچە درێژەکەیانەوە لە نێو پۆلە قامیش و نێرگزەئاویلکان هەڵبەز دابەزیان بوو. لە لای ڕاستە ڕیزێك دارەبیی بەرز هەبوون و لە لای ڕۆژهەلات توودڕك و پنگەڵ سەریان لێك‌دابوو، بەرزایی‌یان دەگەیشتە نیوەی دارەبی‌یەکان و لە گەڵ دارەکان بە بای ڕادەژان، ڕێك‌دەخشان و سیڕەسیڕ و هاشەیان لێ‌دەهات. لە لای ڕۆژاوا و بەرەو ئاناوارزا، جەگەن و قامیشەڵێن لە ڕەنگێکی کەسکی تۆخ دا دەترووسکایەوە و تا داوێنەکانی ئاناوارزای ڕاخرابوو.

حەمەد لەوەی کە کەوشە قایشەکانی لە پێ‌دانەبوو، پەشیمان بوو. ئەو پێڵاوانەی ئێستای کەلکیان بڕابوو و لاقەکانی زۆر دێشان. لە دڵی خۆی دا گوتی: ئای لاقە هەژارەکانم! دەزانم چەندوو پێ ڕۆیشتووم! بە سەر ڕەوەزان دا، بە نێو پنچکان دا، بە پەنا داران دا...

لەگەڵ ئاوابوونی ڕۆژێ هەستی کرد لە لای قامیشەڵێنەکەیەوە دەنگێکی وەبەر گوێی کەوتوە، وەك گرمەیەکی هێندێك کپ و ناڵەیەکی کزیشی بە دوای ئەوە دا گوێ لێ‌بووە. حەمەد ڕاست بۆوە و بە پەلە چووە قەراغی باتڵاغەکەی کە دەنگەکەی لێوە هاتبوو. بە وردی گوێی هەڵ‌خست، بەڵام بێجگە لە دەنگێك کە وەك خۆ هەڵاویشتنی ماسی دەئاوێ دا دەچوو، شتێکی دیکەی نەبیست. ڕاوەستا هەتا وڵات تاریك بوو، بەڵام چونکە دەنگی دیکەی گوێ لێ‌نەبوو، گەڕایەوە بن دارچنارەکەی. هەموو چەشنە بۆنێك تێکەڵ دەبوون و وەبەر دەمی دەکەوتن. بۆنی باتڵاغی، بۆنی قامیشی شین، جاترەکێویلە، گەنم و... لە هەموو لایەکەوە لە

تاریکایی دا دەنگی سەیر سەیر دەهاتن. بۆق بە کۆمەڵ دە باتلاغی پان و بەرین دا دەیانقڕاند و سەگان لە گوندەکانی دەوروبەر دەوەڕین. چەند شەقاو واوەتر چەقەڵێك پێش ئەوەی چاوی بە حەمەدی بکەوێ، لووراندی، پاشان کە ئەوی دی، دەرپەڕی و خۆی دە نێو دڕوەڵانی هاویشت. ئەوجار چەقەڵێکی دیکە هات و لووراندی، دواتر چەندی دیکەش بە دوای یەك دا هاتن و هەروا خێراش ون بوونەوە. هەتا تاریکتر دەبوو، گاڵوبوغری نێو باتلاغێ زۆرتر دەبوو، دەتگوت عەرزەکە هەناسەبڕکەیەتی و ڕادەژێ. وەك ئەوە دەچوو با، کتوپڕ شێت بووبێ و خەریك بێ دارچنارەکە و قامیشەڵێنەکەی لەبەریەك هەڵتەکێنێ. لە نێو ڕەوەزەکانی ئاناوارزای دەنگی کوندان دەهات. لە کاتی بوولێڵێ دا دەعبای سەیرسەیر بە سەر شوێنەکە دا دەفڕین و چونکە ئاسمانەکە ڕووناکتر بوو، زۆر باش دەکرا بیانبینی و سێرەیان لێبگری. حەمەد کە چاوی تێبڕیبوون، بیری دەکردەوە: بریا توانیبام تفەنگێ باوێم و یەکێکیان ڕاو کەم! بەڵام بۆچما دەکرێ تەقەی بکەم؟! هەر تەقەم لە تفەنگێ بێ، جووتێری ئەو بەینەم هەموو وەسەر دەگەڕێن، ژاندەرمەش دێن. باشە ژاندەرمە، ژاندەرمەیە ئیدی، بەڵام جووتێرەکان لەوان خراپترن. ئەوان چییان دەگەڵ ناکرێ. جاری وایە جووتێرەکان لە هەرچی شتی دە دنیایە دا هەیە، خراپترن. لە هەموو شتێکیش ناخۆشتر ئەوەیە کە ئەوان لە گەڵ یەکتریش ناحاوێنەوە. ئەرێوەڵلاهی جووتێر لە ماریش، لە هەژدیهاش، لە شێریش، لە پڵینگیش، لە کەرگەدەنیش، تەنانەت لە بەگ و پاشاکانیش خراپترن. پیاو دەبێ لە هەموو شتێکی زیاتر لە وان بترسێ. بە ڕاستی پیاو قەت نازانێ وەك دوژمن حیسابیان لە سەر بکا، یان وەك دۆست! چونکە لەو کاتەی دا دۆستتن، دەبنە دوژمن و دەبینی دوژمنیشتن بە کوفلەکوونێکی دەبنە دۆست. وەك مەلا فەرهاد دەڵێ: جووتێر نابێ بەقای پێبکەی! وایە. بەڵام باشە، بۆ مەلا فەرهاد بۆخۆی هەر لەو جووتێرانە نیە؟ ئەدی عەلییە شەل، ئومەتە زەرد، کوێرۆغڵی کە هێندە قارەمان بووە، دادالئۆغڵی کە گۆرانیی ئاوا خۆشی دەگوتن، گەنج عوسمان، گزیك دۆران، فینکە، کە لە دەوڵەمەندانی دەستاند و دەیدا بە فەقیران و هەر ئەو موسلیمە چکۆلەش، چلسوارەی غەیبی، هەموو شێخ، سۆفی و ئەوانەی کەشف و کەرامەتیان هەبووە، بۆ هەموویان ئەوانە جووتێر نەبوون؟! دەی ئەمن بۆخۆشم هەر جووتێر نیم؟ بڵێی ئێمە جیاوازیمان لە گەڵ خەڵکی دیکە هەبێ؟ هەروەها قەرەچئۆغڵی، ئەو گۆرانیبێژە خوا پێداوە، کە هەموو شتێکی سەبارەت بە مردن و ژین دەزانی و گۆرانییەکانی باسی ئەوین و چەوسانەوەیان دەکرد، ئەویش هەر جووتێر بوو، بەڵام ئەوان ئەوعە پیاوێکی دیکە بوون. ئەوان جیاوازییان هەبوو و جووتێری ئاسایی نەبوون. لەوەتا دنیا

هەیە، جووتیێران هەر لە ژێر ستەم و چەوساندنەوە دا بوون و ناچارکراون زەبروزەنگ و هەژاری، سەرکوت و بێ ڕێزی، مردن و کۆیلەتی، شەڕی دەساڵە و ڕێپێوانە دوورەکەی یەمەنێ قبووڵ بکەن. بەڵام ئەوانەی هێز و ڕاپەڕیان هەبووە قەت نەچوونە ژێر باری ئەو شتە ناخۆشانە! هەر ئەوانن زەبروزەنگیان لە سەرە، لە بەرامبەریش دا خۆ بەدەستەوە دەدەن و بەربەرەکانی ناکەن، بەڵام هەرکە هەلیان بۆ هەلکەوت، دەبنە زاڵمێك ئەوانی دی هەر تۆزیشیان ناشکێنن...

سەرەڕای لوورەلوور و چەقەچەقی چەقەڵان، قوولەی کەڵەبابان و هەموو ئەو دەنگە تێکەڵ ـ پێکەڵانەی لە نێو باتلاغی ڕا دەهاتن، حەمەد وێژینگی دەدان و خەونی دەدیت: نە تاو بوو نە دەباری. پیاوێك لە سەر ڕەوەزێکی دانیشتبوو، باڵندەیەکی ڕاوکەری لە سەر دەستێکی بوو و بە دەستەکەی دیکەشی لغاوی ئەسپێکی ڕەشی گرتبوو. ئەسپەکە لە بەر ڕەشی‌یان دەترووسکایەوە. لە خوارەوەی ڕەوەزەکانەوە پۆلە سوارێك بە سەررەو دەهاتن، ئاورینگ لە ناڵی ئەسپەکانیان دەبووە. لە نەکاو موسلیم خۆی هاویشتە پێش سوارەکان و دەسرێژێکی لێ‌کردن. سوارەکان بڵاو بوون و پریشکە ئاوری ناڵی ئەسپەکانیان بە سەر هەموو بەرزایی‌یەکانی ئەو دەوروبەرەی دا بڵاو بۆوە. لە هەمو لایەکی ڕا ماری قەفقەف بە درێشووکەی سووری دووفلیقانەوە داوەرین. مارەکان هەوەڵێ سووربوون، پاشان بوونە بنەوشی و سەرەنجام سوور، وەك ئاگری سووریان لێ‌هات. مارەکان ساتبەسات زیادیان دەکرد و پێچپێچ و قەفقەف لە ئاناوارزای ڕا دادەگەڕان و دەهاتن. درێشووکەکانیان سوور بوون و چاوەکانیشیان لە بەرسووری‌یان دەدرەوشایەوە و بە نێو درووان دا دەخزین و دەهاتن...

حەمەد وە سەر دارەکەی دەکەوێ، دەچێتە لکی هەرە سەرەوە و بێ ئەژمار ماری سووریش بە درێشووکەی سووری دووفلیقانەوە لە خوارەوەی دارەکەی دەخولێنەوە، تێکەوە دەدەن و دێن. موسلیم خۆیان لێ‌لادەدا، بەڵام لێ‌یان ناترسێ. ڕادەوەستێ و تێیانەوە ڕادەمێنێ. ئای ئەو کوڕە چەند ئازایە! خۆ لە مارانیش ناترسێ! گێژەڵووکەیەك پەیدا دەبێ، هەمووی وردەخیزە. گێژەڵووکەیەکی سوور، وەك ئاوری. هەژدیهایەکی حەوت سەر بە حەوت درێشووکەی دووفلیقانەوە لە نێو گێژەڵووکەکەی دێتە دەرێ و پێشی مارەکان دەگرێ، دابڕ دابڕیان دەکا و لە دارەکەیان دوور دەکاتەوە. پۆل پۆل مار بە دوای یەك دا و بە فڕین، لە ئاناوارزای ڕا دێنە خوارێ و هەژدیهاکەش لە وێ بەرەنگاریان دەبێتەوە. حەمەد دەستی خەجێی گرتوە. خەجێ دەستەکەی دیکەی لە سەر برینەکەی داناوە، دڵۆپە خوێنەکان دەرژێنە سەر عەرزی و وردە خیز هەموو لەشی خەجێی داپۆشیوە. ئەو لە سەر بەردێکی دانیشتوە و بێ‌دەنگە. بەردەکە سپی

هەڵدەگەڕێ و پاشان ڕەنگی خوێنیٚ دەگرێ. بەردەکە خوێنی لێدەڕژێ و مەحموداغای کانییە گوڵان دەمانچەکەی لە دەست بەردەبێتەوە. مورتەزا ئەوەندە دەقیژێنێ، هەتا دەنگی دەگیرێ، ئەو سەربەرگە زەردەکەی بە سەرخۆی دەکێشێ و خۆی لە بنی دا خڕ دەکاتەوە. مەلێکی شینی بچکۆلانە لە سەر وی هەڵدەفڕێ. مەلەکە هەموو ئاسمانێش شین هەڵدەگێڕێ. هەموو شتێك لە بەر ڕووناکییان دەترووسکێتەوە. مەلەکە ڕووناکاییشی لە گەڵ خۆی هێناوە. ئەو مەلە بچتە هەرکوێیەك، دوایە دێتەوە، بە دەوری سەری حەمەدی دا دەخولێتەوە و قژ و سەری وی دە ڕەنگی شین هەڵدەکێشێ. مەلەکە کلکە شینەتۆخەکەی لە بەرتاوێ هەڵدەتەکێنێ. دندووکی درێژ و سوورە، سینگی وەك ڕۆژێ زەردە و چاوی وەك یاقووتی سوورن. مەلەکە دە دەوری سەیرانی دەگەڕێ. دەموچاو، قژ، چاو و لەشی سەیرانێ هەموو شین دەبن... مەلەکە بەردەوام بە دەوری سەری سەیرانێ دا دەخولیتەوە و دەور لێدەدا. سەیران بەرەو مزگەوت ڕا دەکا و لە پڕ لە پێش وی ئیدارەی ژاندەرمە بە کۆمەڵێك ژاندەرمەوە کە کێشك دەکێشن، ڕیز بوون و بەو شێوەیە دیوارێکیان دروست کردوە، وەدەردەکەوێ. مەلەکە باڵان لێكدەدا و بەسەر وان دا هەڵدەفڕێ، پاشان دەگەڕێتەوە لای سەیرانێ و لە خۆشیان گۆرانی دەڵێ... دیوارەکە بە تەواوی شین هەڵدەگەڕێ. ئیدارەی ژاندەرمە، بازاڕی شاری، سەنگفەرشی مەیدانی شاری و تەنانەت ڕووبارەکە کە لە دوورەوە دەبریقێتەوە، شین هەڵدەگەڕێن. سەیران بە نێو ژاندەرمەکان دا تێدەپەڕێ. لە بن دیواری ژاندەرمەخانەکەی تەرمی نۆ چەتەکان ڕیز کراون، ڕەختەکانیان لە سەر سینگیانن، هەموویان جلی ڕەشیان لە بەر دایە، تفەنگەکانیان لە سەر کۆشیانن و سەریان بڕاون. مەلەکە یەکە بە یەکە لە سەر شانی هەموویان دەنیشێ و لە نەکاو سەیران دەبینێ سەرەکانیان کە تا ئێستا دیار نەبوون بە شینهەڵگەڕاوی وەدەردەکەونەوە. مەلەکە دەست دەکا بە پێکەنینێ، باڵان لێكدەدا و پێدەکەنێ، لە سەر تەرمی چەتەکان دەنیشێ و قاقا پێدەکەنێ، بە سەر شاری دا، هەتا پردێ، هەتا چۆمی دەفڕێ، بە سەر شاخەکان دا دەفڕێ و بە سەر هەر شوێنێکیش دا دەفڕێ، هەموو شتێکی شین هەڵدەگێڕێ. ئەو دەگەڕێتەوە لای شاری و هەروا پێدەکەنێ و پێکەنینەکەی نابڕێتەوە... پێکەنینەکەی لە تەواوی شوێنەکانی شار و هەموو دنیاش دا دەنگ دەداتەوە. دەچێ لە سەر منارەی مزگەوتێ دەنیشێ و ئەوێش شین دەکا. هەر پێدەکەنێ و پێدەکەنێ! ئەوەندە پێدەکەنێ هەتا دەمرێ و لە سەر منارەکەی ڕا دەکەوێتە خوارێ. سەیران لە سەر کەلاکە بچکۆلەکەی دەلۆرێتەوە و پێی هەڵدەڵێ... مەحموداغا پەیدا دەبێ و بە شمشێرەکەی سەری سەیرانی دەپەڕێنێ. دەسبەجێ خەجێ لە پەنا تەرمی سەیران و

مەلەکەی وەدەردەکەویٚ، پیٚیان هەڵدەلیٚ و شین دەگیٚڕیٚ. دەستیشی هەر لە سەر برینەکەیەتی... ئەوجار دایە حۆری بە سواری ئەسپیٚکی ڕەش، بە سەرڕەو دەگاتیٚ. ئەسپەکەی تیٚتاوەستیٚ و بە سەر دیواری ژاندەرمەخانەی دا باز دەدا، باسکی خەجیٚ دەگریٚ، دەیهاویٚتە پاشتەرکی خۆی و دەڵیٚ: ڕەبی چاوتان کویٚر بن و لەگەڵ شەیتانی بە لەعنەت بن کچینە! ئیٚوە حەمەدی دەکەنە مردوو و بۆ حەمەدی دەگرین. حەمەدیش شوکور نەمردوە. ئەو تەرمەی لیٚرەیە، ئی حەمەدی نیە. ئەوەش کە لە پیٚش دەرگای مزگەوتیٚ کەوتوە، هەر تەرمی حەمەدی نیە. ئەوە مەلیٚکی بچکۆلانەیە، بە پیٚکەنینیٚ پساوە. بە بیستنی ئەو قسانە خەجیٚ و سەیران کە ئیٚستا سواری ئەسپەکەی بوونە و مەلە شینە بچکۆلەکەش کە بە دەوری سەری سەیرانی دا دەگەڕیٚ، لە قاقای پیٚکەنینیٚ دەدەن. دەنگی قاقایان دەگاتە ئاناوارزای و دایە حۆریش دەگەڵیان پیٚدەکەنیٚ. کاتیٚك ئەوان بەوحاڵەوە وەڕیٚ دەکەون، حەمەدۆك پەیدا دەبیٚ و لیٚیان دەپرسیٚ: بۆ ئاوا پیٚدەکەنن؟ چ قەوماوە ماڵویٚرانینە؟ ئەو مەلە چیٚیە بە سەر سەرتانەوە؟! ژنەکان دەڵیٚن: کوڕە وەڵلاهی دەبیٚ شوکری خودای بکەین، کە هیٚشتاش دەتوانین پیٚبکەنین. دایە حۆری لغاوی ئەسپەکەی دەکیٚشیٚ و دەڵیٚ: باشە ئەمن چۆن پیٚنەکەنم، کاتیٚك ئەو ئەسپەی کە من سواری بووم و لە هەموو ژیانی خۆی دا پیٚنەکەنیٚوە، ئیٚستا پیٚدەکەنیٚ. ئەوە بە چاوی خۆت دەیبینی ڕۆڵە کە قسەکەم ڕاستە! ئەمن دایکی حەمەدۆکیم کوڕم. دایکی حەمەدۆکیش، وەك ئەو باڵندەیەی، وەك ئەسپەکەی سەیرانیٚ و وەك هەموو خەڵکی دیکە پیٚدەکەنیٚ. ئەو کە دایکی حەمەدۆکییە، دایکی باڵندەکەی، ئەسپی سەیرانیٚ، هەموو خەڵکی کانییەگولان و هەموو جووتیٚرەکانی دیکەشە! کوڕم! ژاندەرمان لە داویٚنی ئاناوارزای دەوری حەمەدۆکییان داوە. گرتوویانە، تفەنگیان لیٚئەستاندوە، کەلەبچەیان لە دەستی داوە، پەتکیٚکیان دە ملی کردوە و دەبەردەستی عەلی کەرتیشیان ناوە. ئەوەت زانیوە کوڕم! بەڵیٚ زانیومە. بەڵام ئەتۆ کیٚی ڕۆڵە! ڕەبی ئەو زەمانانە بە بڕین چن، کە هەواڵی وا ناخۆش بۆ من دیٚنن!

حەشیمەت وای پاڵ ویٚکداوە، مووی دەبەرەوە ناچیٚ. دایەحۆری و سەیران لە نیٚوەڕاستی خەڵکەکەی ڕاوەستاون. هەردیٚ و خەڵك زۆرتر، جیٚگا تەنگەبەرتر و بارودۆخەکە ترسیٚنەرتر دەبیٚ. لە نیٚوەڕاستی مەیدانیٚ، حەمەدۆکیان هەڵاوەسیوە. تەنافی دە ملی دایە، سەری ڕاست ڕاگرتوە، زمانی بە لالغاوەی دا شۆڕ بۆتەوە، ملی شکاوە، چاوەکانی خەریکن لە کالانیٚ دەرپەڕن، ددانەکانی دەچیڕەوە بردوون، دەستەکانی خویٚنیان لیٚدەچۆڕیٚ، قاچەکانی تا ئەژنۆیان هەڵکراون و دەلینگی پانتۆڵەکەی بزربزر و شیتاڵ شیتاڵ بووە. هەم ڕانی و هەم قۆەکانی شەڵاڵی خویٚنن و

دڵۆپ دڵۆپ خوێن لە لەشییەوە دەڕژێتە سەر عەردی. لە پڕ هەڵلا و گرمە پەیدا دەبێ. خەڵکەکە بە دەم نەڕە و هەراوە دەجووڵێن و هەرچی وە بەر دەستیان دەکەوێ، بە حەمەدی دا دەدەن. توێلکەشووتی، هێلکە، تەماتە، تەپاڵە، سندەگڵ، بەرد و هەنجیر بە سەر حەمەدی دا دەبارن. ڕادەتلەکێ و بەردەبێتەوە. ژاندەرمەکان بە سەر عەرزی دا ڕایدەکێشن و هەموو گیانی دە قوڕوقاڵ و ئەو زبڵوزاڵەی خەڵکەکە پێیان داداوە، وەردەدرێ. ژاندەرمەکان بە شەقان تێیهەڵدەدەن و تفی لێدەکەن، تەنانەت ئەوکاتەی هەموو لەشی لە تف و زبڵی دا ون بووە، بەزەیییان پێیدا نایە. دایە حۆری لە داخان وەك چەوەندەری سوور هەڵدەگەڕێ و دەقیژێنێ: خەڵکی شاری، تۆسقاڵێکیان شەرم و شوورەیی دە قالبی دا نیە. بەڵێ، جووتیێرەکان دڵڕەق دەبن، بەڵام قەت تف لە تۆ ناکەن. قەت ئەوان هێندە زاڵم نین. تەنانەت ئەو چەشنە جووتێرانە کە خەڵکی دەکوژن و بە زیندوویی کەوڵیان دەکەن، ئاوا بێشەرمانە، وەك ئەوەی ئەو خەڵکە دەیکەن، هەڵسوکەوت ناکەن. هاواری دایەحۆری لە شاری دا دەنگ دەداتەوە. باڵندە شینەکە لە دەوری سەری وی دەگەڕێ و هەوای شین هەڵدەگێڕێ. ئەسپی دایەحۆری دەردەپەڕی، هەڵدەکاتە گورووبان عەلی، قەپ بە یەخەی کراسەکەی دا دەکا، هەڵیدێنێ و لە دیواری مزگەوتێی رادەکێشێ. دیوارەکە لە خوێنێ دا شەڵاڵ دەبێ و گورووبان وەك جەواڵی بەتاڵ تەپەی لە عەرزی دێنێ. ئەسپەکە دەکەوێتە نێو ئاپۆرای خەڵکەکەی، بە گازان و بە جووتان دابڕدابڕێکیان وێدەخا، هەر مەپرسە! حەشیمەتەکە ئەوەندەی بلێی یەك و دوو، بڵاوەی دەکەن، هیچکەس لەوێ نامێنێ و وڵات بێدەنگ دەبێ. باڵندەکە هەڵدەفڕێ و ڕەنگی شین بە دەوری خۆی دا بڵاو دەکاتەوە. سەیران دەناڵێنێ و لە تەنیشت ئەو پیاوەی لە سەر عەرزی کەوتوە، چۆك دادەدا. دایە حۆری ئەسپەکەی بۆلای وی لێدەخوڕێ و دەڵێ: هەستە کچم هەستە! هەمووتان هەستن! ئێوە بۆ هێندێك کەس دەگرین، کە ئەوان نەمردوون. ئەوە حەمەدۆك نیە! حەمەدۆك ئەنگوستیلەی دایە سوڵتانی پێیە و هیچکەس ناتوانێ بیکوژێ. کەس ناتوانێ بریندارێشی کا، تەنانەت ماریش، هەرچەندی بن، ناتوانن پێوەی دەن... سەیران دەڵێ: ئاخر ئەنگوستیلەکە بە وی نیە، ئەوەتا بە منە و ئەنگوستیلەکەی نیشان دەدا. دایە حۆری دەڵێ: جا ئەگەر وابێ، ماڵوێران بووم. لە ئەسپەکەی دێتە خوارێ، دادێتەوە و تەرمەکەی وەردەگێڕێتە سەر زگ. پاشان دەڵێ: وەرە بڕوانە سەیران ئەوە حەمەد نیە، بڕوانە سەیران!... باڵندەکە بە سەر تەرمەکەی دا دەفڕێ، هەوای شین دەکا و لە قاقای پێکەنینێ دەدا. دایە حۆری بە وەی تووڕە دەبێ و بە سەر باڵندەکەی دا دەقیژێنێ: بێبڕەوە ئەو پێکەنینەی! ڕەبی هەموو لەشت بە گوللان کون کون بێ! بێچارەی قوڕبەسەر، پیاو نابێ بە

جەنازەی پێبکەنێ، تەنانەت ئەگەر دوژمنیشی بێ! باڵندەکە دەسبەجێ بێدەنگ دەبێ، بە ڕێی خۆی دا دەڕوا و لە بەرچاوان ون دەبێ...

حەمەد وەخەبەرهات، خۆی لە بەریەك کێشایەوە و قرچەی لە هەموو لەگەکانی لەشی هات. باڵندەیەکی شین بە سەر سەری دا دەفڕی و بازنەی شینی دروست دەکردن... شتێکی وەبەر گوێی کەوت و هەستی کرد یەکێك نێزیك دەبێتەوە. لە دڵی خۆی دا گوتی: ئیشاڵڵا ئەوە موسلیمە. قەرار بێ، هەر بگەمە ئەو شوێنەی مەبەستمە، مەڕێکی بۆ بکەمە خێرا!

باڵندەکە هێشتا بە سەرییەوە هەڵدەفڕی. ماران، درێشووکە سوورەکەیان ڕادەوەشاند و بە نێو دڕوان دا دەهاتن. هاتن هەتا دە شەقاویان ما بگەنە حەمەدی. لە وێ باڵندە شینە بچکۆلەکان بە پاڵوێکدان و باڵەفڕەکردن دیوارێکیان لە پێش مارەکان پێکهێنا، دیوارێکی ڕووناك کە وەك دڵی ئینسانی لێی دەدا. مارەکان زۆرتر بوون و هەروا ئی دیکەش دەهاتن. چاوە سوورە ئاگرینەکانیان لە تاریکایی شەوێ دا دەترووسکانەوە. مارەکان لە نیوەڕاستی ڕووناکییەکە و لە پێش ڕیزی باڵندکان ڕاوەستان. لە نەکاو هەر مارەی قەپی بە باڵندەیەکی شینی نێو دیوارە شینەکە دا گرت. باڵندەکان باڵەفڕە و جیکە جیکێکیان دەست پێکرد، گوێی پیاویان کەڕ دەکرد...

حەمەد دەنگێکی وەبەر گوی کەوت و هەستی ڕاگرت. زریان لکی دارانی ڕادەژاند و تەنانەت خشەی گەنم وجۆی زەوییەکانی دەوروبەریش، کە لێرە تەواوێك دوور بوون، دەبیسرا.

حەمەد بە خۆشحاڵییەوە گوتی:

ـ ئەوە موسلیمە! و زیاتر ورد بۆوە و هەستی ڕاگرت. هێندەی پێنەچوو دەنگی فیتوویەکی، کە وەك خوێندنی نەوعە باڵندەیەکی دەچوو، گوێ لێبوو و ئیدی دڵنیا بوو کە ئەوە موسلیم لەو دەوروبەرەیە.

پۆلێك حاجیلەکلەکی دندووکدرێژی لاقسوور بە باڵی پان و درێژەوە پەیدا بوون و لە وێ نیشتن. لەکلەکەکان هەرکامەو مارێکی ڕاو کرد و فڕییەوە. هەر مارێك ڕاو دەکرا، باڵندەیەك لە باڵندە بچکۆلە شینەکان ڕزگار دەبوو. مارەکان خۆیان لە دندووکی لەکلەکەکان دەهاڵاند و بێهوودە هەوڵیان دەدا پێیانەوە دەن، لەو حاڵەش دا باڵندە شینە بچکۆلەکان کە تازە ڕزگار ببوون، بازنەیەکیان لە دەوری سەری حەمەدۆکی پێکهێنابوو.

جارێکی دیکەش دەنگی فیتووەکەی هاتەوە و ئەو جار زۆر نێزیك بوو و لە نێو دڕووەکان هات. حەمەد بێ ئەوەی دەنگی بەرز کاتەوە گوتی:

ـ ئەوە ئەتۆی موسلیم!
دەنگێکی لەسەرەخۆتر وەڵامی دایەوە:
ـ بەڵێ ئەمنم، کاحەمەد! و هاوکاتیش سەروسەکوتی لە پشت پنچکان وەدەر کەوت.
حەمەد ڕای کرد و دە باوەشی گرت.
ـ موسلیم بۆم بگێڕەوە! موسلیم گیان، ئەو تەقەیەی ئەمڕۆی ئاناوارزای! ئەوە ئەتۆ بووی تەقەیان لێدەکردی؟
ـ جارێ ئەوە لە برسان دەمرم. دوایە هەموو شتێکت مووبەموو بۆ دەگێڕمەوە کاحەمەد! بەڵام پێش هەموو شتێك با ئەو ئەنگوستیلەیەت بدەمەوە!
ـ ئەها، کە وابوو بۆت نەکرا سەیرانێ ببینی؟
ـ جارێ ها وەریگرە، گوتم دوایە هەموو شتێکت بۆ دەگێڕمەوە. ئێستا دەبێ ئەمن شتێکی بخۆم. وەڵڵاهی ئەگەر ئەو ئەنگوستیلەیەم پێنەبوایە، حەوت ڕوحم پێبا، یەکم پێنەدەما. ئای چ ئەنگوستیلەیەکی پیرۆزە. پیاو هەتا ئەوەی پێبێ، گوللەی تۆپیش کاری لێناکا. ڕەبی ماڵت ئاوەدان بێ دایە سوڵتان!
حەمەد کانی‌یەکەی قەراغ باتڵاغەکەی نیشان دا و گوتی:
ـ ئەوە ئاوی سارد و خۆش، ئێستا هێندێك خواردنیشت بۆ ئامادە دەکەم!
ـ ئەمن تێشووی خۆم پێیە. ئی خۆت بۆخۆت هەڵگرە.
بوخچەیەکی چکۆلەی لە پشتی بەستبوو. کردی‌یەوە و لە پێش خۆی دانا.
ـ ئەو کانی‌یە چکۆلەت دیتوە، ئەو ئاوە جوانەی لێ هەڵدەقوڵێ، ئەوە بۆخۆم دروستم کردوە، ئاوەکەی زۆر خۆشە.
موسلیم دەستی لەوبەرەوبەری کانی‌یەکەی دادا و تێری لە ئاوەکەی خواردەوە.
ـ ئاوێکی سارد و خۆشە.
ئیدی موسلیم قسەی دیکەی نەکرد. نانەکەی خوارد، چوو لە ئاوی کانی‌یەکەی دە زاری وەردا و پاشان لە کن حەمەدی دانیشت. لە پڕ گوتی:
ـ چی دیکە ناتوانین لێرە دانیشین. ئێرە پڕە لە مار.
ـ ئەتۆ ئەو دەوروبەرەی باش بەڵەدی، وانیە؟
ـ هەموو چوکووراوایە بە چاوبەسراوی دەگەڕێم.
پاشان پێکەنی:

ـ به خۆڕایی پێمان نالێن "خێڵی یۆرۆکی‌یان". نێو ئەو دڕووە کەرتەشی‌یانە پڕە لە مار، بەڵام ئەو مارانە جێگای مەترسی نین، هەر زۆر درێژن. لانی کەم پێنج هێندی من درێژن. نی وایان هەیە، دەگاتە نیوەی ئەو دارچنارەی. دەزانی ئێستا دەبێ چ بکەین، کاحەمەد؟ بەڵام جارێ هەروەك پێشتریش گوتم ئەنگوستیلەکەت وەربگرەوە. دەی هەر ئێستا!

ـ بۆچی؟!

ـ ئەتۆ لێم وەرگرە، پێت دەڵێم بۆ وا بە پەلە دەبێ وەری‌گری‌یەوە... ئێستا دەبێ بچینە سەر یەکێك لەو دارەبی‌یانەی ئەوبەری. ئەگەر کەسێك لە خێڵی ئێمە قاچاغ دەبێ، هەمیشە خۆی لە سەر دارەبی‌یەکی ئاوا دەشارێتەوە. ئەو دارانە لکی وایان هەیە بە قەد تەختێکی گەورەیە.

ـ بە ڕاستی؟

ـ باوەڕ کە، لێرە بنووین، مارمان وەسەر دەگەڕین، ئەگەر پێشمانەوە نەدەن، لێماندەهاڵێن و دەمانخنکێنن. ئەو مارانە عادەتیان وایە لە ملی کابرای دەهاڵێن و ڕێکی دەکوشن، هەتا دەخنکێ.

ـ نەتگوت جێگای ترس نین؟

ـ باشە، پێوە نادەن ئیدی... ئەگەر لێرە بنووین، لەوانەیە بەرازی کێوی، چەقەڵ و گورگیشمان بێنە سەر...

پاشان حەمەدی بۆ لای خۆی کێشا، دمی بە گوێیەوە نا و گوتی:

ـ هەژدیهایەکیش دەو قامیشەڵێنەی دایە، حەوت سەری هەیە، بە هەموو چاوەکانی دا ئاوری دەپرژێنێ و لە هەر حەوت زاری درێشووکەی هەزارپارە دێنە دەرێ... هەر کەس بێتە سەر ڕێگای، ئەو هەژدیهایە بەزەیی پێی دا نایە، هەموان دەگرێ و دەیانباتە شوێنەکەی خۆی... بەڵام ئەتۆ مەترسێ، چونکە ئەنگوستیلەکەت دە قامکی دایە و هیچ هەژدیهایەك ناوێرێ لێت نێزیك بێتەوە. بێجگە لەوەش.. ئەتۆ با جارێ بچینە سەر یەکێك لەو داربی‌یانەی ئەوبەری.

ئەوان کەلوپەلەکانیان پێچایەوە. زریان ئەو جار حەشری دەکرد، هاشەهاش و سیرەسیر لە نێو قامیشەڵێنێ ڕا دەهات. لکی دارەکان وێکدەکەوتن و دارچنارە گەورەکەش خوار دەبۆوە.

ـ بایەکە زۆر توندە و ئاسمانیش پڕی ئەستێرەیە.

ـ کاتێك ئاسمان وەك ئەمشۆ، پڕ لە ئەستێرەیە، هەژدیهاکە لە شوێنی خۆی نایەتە دەرێ، چونکە زۆر لە ئەستێران دەترسێ... کەمێك ڕاوەستە کاحەمەد، با من لە پێش دا وەسەرکەوم.

ئەمن دەزانم ئەو لکانەی ئەستوورترن و مرۆڤ دەتوانێ لە سەریان بنوێ، کامانەن. چاو لێرە کە کاحەمەد! ئەوەتا وەسمانە شێت لێرەجێگایەکی چاك کردوە. بە راستی جێ‌خەوی چاکەاچاو، ئەو دۆشەك و سەرینیشی لە گیای دروست کردوە و لێرە دایمەزراندوون، هەر شتێکی کەمە و ئەویش لێفەیەکی ئاوریشمە.

ــ ڕاوەستە ئەمنیش ئەوە دێمە سەرێ.

حەمەد تفەنگ و توورەکەکەی هەلێنا، دانیە دەستی موسلیمی و وەسەر کەوت. قەدی دارەکەی ئەوەندە ئەستوور بوو، باوەشی سێ پیاوانی وێکڕا لێ‌نەدەگەیشتەوە. حەمەد خۆی کوور کردووە، چووە پێشێ و دەستی بەو لکانە داهێنا کە دۆشەك و سەرینەکەیان لە سەر دامەزرابوو.

ــ بە ڕاستی دۆشەکێکی نەرمە، هەردەلێی دۆشەکی مالێیە.

ــ دەتوانی بە کەیفی خۆت تێیدا درێژ بی و بحەسێیەوە. سەربەرگەکەت لە سەر تفەنگەکەی دانێ و ئەوانیش وەبن سەرت دە، ئیدی سەرینەکەت تەواو باش دەبێ.

حەمەد وایکرد. ئاسمان پڕی ئەستێرە بوو. لە بەر ڕووناکایی ئەستێرەکان دەموچاوی موسلیمی دەبینرا.

ــ ئێستا کاتی ئەوەیە قسەم بۆ بکەی..

ــ لە کوێڕا دەست پێ‌بکەم کاحەمەد؟ مەلا فەرهاد دەستی ئاوالەیە، هەرکەسی بێتە سەر ڕێ، ڕووتی دەکا. لە دەولەمەندان‌دەستێنێ و دەیدا بە هەژاران... ئەتۆش هەر وات نەدەکرد؟

ــ با، منیش هەر وام دەکرد.

ــ ئەمن چوومە لای و ئەویش نامەیەکی دامێ. نامەکە بۆ مەلا عەبدوسسەلامی نووسراوە. دەبێ زانیبت نوشتووی مەلاسەلامی چەند بە قەوەتن. دوعای وی مردووی زیندوو دەکاتەوە! بێجگە لەوەش ئەو زۆر ئازایە. من نامەکەم وەرگرت، دە گیرفانی کراسەکەم نا، چووم بۆ لای دایەحۆری و هەموو شتێکم بۆ گێڕایەوە. ئەویش گوتی ئەتۆ دەسبەجێ دەبی بچی بۆ لای حەمەد چاوجوانی من، پێی‌بلێ خانوویەکی جوانم لە نێو دارە پرتەقالان بۆ ساز کا. پاشان گوتی ئەمن بۆخۆم لە پێش دا دەچمە بنارەکانی چیای دولدولی، هەتا نە ژاندەرمەکان و نە دێهاتی‌یەکان، هیچیان نەتوانن شوێنم هەلگرن و لە وێ ڕا خۆم دەگەیەنمە چوکووراوایە. بەلام تۆ دەبێ بچیە لای سەیرانێ و پێی بلێی لە ویمان دەوێ کوڕێکی چاوڕەشی جوانی وەك حەمەدۆکی ببێ و ئێمە دەمانەوێ کوڕەکە لە گەلْ دایك و باوك و نەنکە حۆریی خۆی گەورە

بێ... ئیدی ئەمن وەڕێکەوتم بۆ لای سەیرانێ. کە گەیشتمێ، تەماشام کرد ژاندەرمان دێیەکەیان گەمارۆ دابوو، بەڵام لای بەیانی توانیم بە نێو ژاندەرمان دا بچمە نێو دێی و سەیرانێ ببینم. ئەو بە دیتنی من ئەوەندە خۆشحاڵ بوو، هێندەی نەمابوو بفڕێ! ئەویش گوتی: بە حەمەدی بڵێ کە منیش پێمخۆشە خانوێکم لە چوکووراوایە هەبێ. خانووەکە دەنێو باغە پڕتەقاڵێکی گەورە دابێ، وەك بەفری سپی بێ، پێنج ژووری هەبن، دووقات بێ، ڕۆژگر بێ و هەموو ڕۆژێ تێشکی تاوێ بە پەنجەرەکان دا لە نێو ژووورێ بدا... دیاریيەکیشی بۆ ناردووی، ئەوەتا، فەرموو...

موسلیم کیسەیەکی چکۆڵەی بۆ لای حەمەدی ڕاداشت. پشتی کیسەکەی بە مووررووی جوان جوان چندرابوو.

ــ سوپاست دەکەم موسلیم، دۆستی خۆم، برای بە ورە و ئازام...

ــ ئەوەشم بە خوشکە سەیرانێ گوت. گوتم مەترسە، ئەمن بۆخۆم ئاگام لە تۆ و لە هەموو جووتێرەکانی دیکەش دەبێ. لە شاخیش و لە دەشتێش چاوەدێرییان دەکەم. ئەمن دەبێ جێی حەمەدۆکی بگرمەوە. دەبێ لە دەوڵەمەندان بستێنم و بیدەم بە فەقیران.. ئەوانەی دەستیان ناڕوا.. ئەوان هیچیان نیە! وانیە کاحەمەد؟

ــ تەواو ڕاستە.

دوایە سەیرانم بەجێهێشت. هێشتا هەر تاریك بوو و ئەمن پێمهابوو کە دەتوانم دیسان بە نێو ژاندەرمەکان دا دەرباز بم، بەڵام یەکێکیان دیتمی و تەقەی لێکردم. ئەمنیش لێی گەڕامەوە و تەقەم لێکردەوە و بەو شێوەیە بۆی دەرچووم و خۆم گەیاندە ئاناوارزای. کاتێك گەیشتمە بەرزاییيەکانی ئەوێ، تەمەشام کرد کوڕە خۆ ئەوان پێش من ئەوێیان گرتوە! وا دیار بوو سەرمیان لە پشت بەردان دیتبوو، نازانی چییان کرد؟ لەوانەیە باوەڕ نەکەی کاحەمەد. لە هەموو لایەکییەوە دەسرێژیان لێکردم، دەتگوت دەگەڵ لەشکرێکی شەڕێ دەکەن. عەرز و ئاسمان ئاوری لێدەباری. بزنێك لە وێ، لە پەنا بەردێکی بوو، ئەوان نەیاندیبوو، بزنەکەم لە پنچکێکی بەستەوە و بۆخۆم جێگام گۆڕی. هەر بزنی بەستەزمان خۆی دەبزاوت، دەسرێژیان لێکرد و منیش بەرەو کۆنەقەڵاکەی فیزماڵکم دایە و خۆم گەیاندە ئەوێ. بۆوێم بە دوا دا هاتبان، هەموویانم ئاقڵ دەکردن. شوکور منیان لێون بوو و ئیدی بزنی فەقیریان داگرت. لە دوورەوە چاوم لێدەکردن، بزنەکە دەتگوت گاڵتەیان پێدەکا. کە تەقەکە بێدەنگ دەبوو، لە پشت گابەردەکان و بە پەنا پنچکان دا سەروخواری دەکرد. سوێندت بۆ دەخۆم، خودا هەردووك

چاوم کوێر کا ئەگەر درۆیە بکەم! بزنەکە لەوان دوور بوو و ژاندەرمەکان بۆیان لێکنەدەبۆوە کە ئەوە منم یان بزنێکە. پاشان لە ناناوارزای هاتمە خوارێ، لەو بەینەی دا دەستەیەك ژاندەرمەم دیتن، پازدە کەس دەبوون، ئەوانیش منیان دی...

ژاندەرمەکان خۆیان بە عەرزی دادا و موسلیمیان بە تفەنگان داگرت. کوڕەکەش دەستی کردەوە، مەتەریزی لێگرتن و تەقەی لێکردنەوە. پاشان لە کەلێنی کۆنەگۆڕێکی دا خۆی لێ ون کردن. ژاندەرمەکان هەرچی ڕوانیان، نەیاندیتەوە. ناچار تەقەیان نەکردەوە و لێیاندا ڕۆیشتن. لە جێگایەکی دیکە لە داوێنی ڕەوەزەکان ئەو تاقمێکی دیکە لە ژاندەرمەکانی دی. موسلیم چاوی لە ئاسمانێ کرد و کۆمەڵێك هەڵۆی بەدیکرد، کە باڵ بە باڵ، بە تەنیشت یەکەوە هەڵدەفڕین. وا دیار بوو بە تەقەکەی هەستابوون و ئێستا لە هەوای دا دەخولانەوە...

موسلیم لە بازی عەلی تووشی ژاندەرمەکان بۆوە و دەنێو تالّوو و گۆگەمان دا وای خۆ شاردەوە، کە تەنانەت هەڵۆکانیش بە چاوە تیژبینەکانیان نەیاندەتوانی بیبینن. دواتر جارێکی دیکەش ژاندەرمەکان تەقەیان لێکردەوە. موسلیم خۆی گەیاندە نێو زەوییە گەنمێکی. گەنمەکە هەتا پشتێندی دەهات و بە سۆزەی بای کەروێشکەی دەکرد. گوڵەخاشخاشك لە نێو گەنمەکەی شین ببوون، کە ڕیشەیان وەك لبادی پتەو و بە قەوەت بوو. موسلیم لە حاڵێك دا وەك ماری پێچاوپێچ، بەرەو جەیهان دادەگەڕا، تووشی پۆلێك "گوڵە بێژان"ی بوو. دیتنی ئەو گوڵانە شاگەشکەی کرد. بە پەلە هەمووی هەڵقەندن و دە گیرفان، کەلێنی یەخە، پشتێند، دەلینگ و قەیتانی کەوشەکانی چەقاندن. لە بەری پێی ڕا تا سەری بۆنی بەهارێی لێدەهات. ژاندەرمە هەر بە دوویەوە بوون و تەقەیان لێدەکرد. موسلیم پێنج جاریان بۆ گەڕاوە و تەقەی لێکردنەوە. ئەو جار ژاندەرمەکان لە گابەردەکانەوە هاتنەخوار، بەڵام ئیدی درەنگ ببوو و تا ئەوان گەیشتنی موسلیم گەیشتبوە نێو کەرتەشیجارەکەی لێژایی ڕاستبەڕاستی جەیهانێ و سەر و شوێنی نەبوو.

ــ ژاندەرمەکانیش وەك جووتیێرەکان، ناوێرن خۆ لە نێو دڕووەڵانی بدەن. هەموو ساڵێ، ئەو وەختانە، ماران لانی کەم دە پازدە کەسان دەکوژن، بەو شێوەیە کە خۆیان لە ملی دەهاڵێنن و دەیانخنکێنن.

ــ باشە ئەدی ئەتۆ بۆخۆت چۆن دەوێری بچیە نێوی؟

ــ ئەمن ودمم پێیە. ئەو ودمە نایەڵی ئەو دەعبایانە هیچیان زەڕم پێبگەیەنن و ئیدی منیش لە هیچ ناترسم. هەموو مارەکانی ئەو ناوچەیەی من دەناسن. ئەوان پارەکە ئەمنیان دیوە.

ــ باشە پارەکە تۆیان دیوە، ناترسی ئەوساڵ نەتناسنەوە!

ـ مار وەك ئینسانی نیە. ئەوان نە دۆستیان لە بیر دەچێتەوە و نە دوژمن. ئەمن ساڵی پێشوو بە سەتڵان شیرم بۆ دێنان و دەمدانێ.

ـ دەی دیارە مارەکانیش شێتی شیرین، ئەویش بە تایبەت شیری مەڕی.

ـ بەڵێ نە ژاندەرمە و نە دێهاتی‌یەکان هیچیان ناوێرن بێنە نێو ئەو کەرتەشیجارەی.

ـ ئەگەر وابێ من بەختم باش بووە کە بە نێو کەرتەشی‌یان دا هاتووم و هیچیشم لێ‌نەهاتوە.

ـ نا، ڕاوەستە پێتبلێم چۆنە: دەبێ تۆ لە ژێر ئەستێرەیەك دا کە نیشانەی بەختی باشە، لــە دایك بووبی، دەنا ئێستا تۆم بە خنکاوی و بە ڕوخساری بنەوشی‌یەوە دەدیتەوە.

حەمەد بە سەرسوڕماوی‌یەوە دووپاتی کردەوە:

ـ بنەوشی؟

ـ ژاندەرمەکان ناتوانن لە لای ڕۆژاواوە بێن، چونکە دەزانن هەژدیهاکە لە وێیە و دەشزانن هەرچی بە وێ دا بێ، ئەو هەژدیهایە هەڵی‌دەلووشێ. کاتێك ڕەوەزەکانی ئاناوارزای، باتلاغ و هەموو ئەو عەرزەی دیکە ڕادەژێ، ئەوە ئەو هەژدیهایە دەفیشقێنێ. هیچ‌کەس ناتوانێ تا ئێرە بێ. ژاندەرمەکان ناتوانن بمانبیننەوە و هەژدیهاکەش کاری بە ئێمە نیە. پارەکە دایکم مەنجەڵێکی گەورەی شیر بۆ وی لێرە دانابوو. مەنجەڵەکە ئەوەندە گەورە بوو، بە سێ پیاوان هەڵیان‌گرتبوو. بەو جۆرە هەژدیهاکەش من دەناسێ. ئەمن هەتا نێوەڕاستی کەرتەشی‌جاڕەکەی چووم، هەمووی بستەبست گەڕاوم، قەت ئەو هەژدیهایە کاری بە من نەبووە... ئەتۆش کە ئەو ئەنگوستیلەت پێ‌یە، لە هەمووی ئەو دنیایەی دا، هیچ شتێك نیە کە بتوانێ زەفەرت پێ‌بەرێ، جا چ ئینسان، چ گورگ، یان باڵندەی گۆشتخۆر! فەرق ناکا، هیچیان ناتوانن! باشە ئەتۆ دەزانی کە ئەو ژاندەرمانە ئەو هەموو گوللانەیان پێوە نام، بۆ هیچیانم وێ نەکەوت؟ دەتوانی پێم‌بلێی بۆ وا بوو؟

ـ بەڵێ، چونکە تۆ ئەنگوستیلەی دایە سوڵتانیت پێ‌بوو...

ـ تەواو ڕاستە، هەر کاری ئەو ئەنگوستیلەیەی بوو.

ـ بەڵام ئێستا ئەو ئەنگوستیلەیە بە منە..

ـ ئێستا گومانی تێ‌دا نیە، دەوری باتلاغەکەی گەمارۆ دراوە و ئاخرەکەی ژاندەرمە و دێهاتی‌یەکان تا ئێرە دێن.

ـ ئێمە دەبێ سێ ڕۆژان دێرە دا خۆ ڕاگرین. ئەگەر لەو ماوەیەی دا باش خۆ بشارینەوە و سۆراغمان نەکەن، ئەوە بڵاوەی دەکەن و ئێرە بە جێ دێڵن.

ـ سەرم لێ‌شێواندن و بە هەڵەم بردن. ئەوان پێ‌یان وایە کە من بەرەوخوار داگەڕاوم، لە کاتێك دا من بەرەو سەر هەڵگەڕامەوە. ئەوان وابزانم مێشەڵانە چکۆلەکەیان گەمارۆ داوە. دار و پەنچکەکانی ئەوێ بە قەوەتتر و گەورەترن و مار و هەژدیهاشی لێ‌ین.

ـ بە هەرحاڵ وا باشترە لێرە بمێنینەوە، تەنانەت ئەگەر دەوریشیان دابین. وا باشترە لێرە بین، تا ئەوەی لە دەشتێکی ئاواڵە و بێ‌پەنا و پەسیو دا پێوەبین.

زۆریان قسە لە سەر ئەوەی کرد کە چۆن خۆیان لەو گرفتەی ڕزگار کەن و سەرەڕای وەی زۆر ماندوو بوون خەویان لێ‌نەدەکەوت. حەمەد سەری لەو کوڕەی سوڕمابوو. موسلیم ڕەفتاری وەك مێرمنداڵێکی دەمڕووت منداڵانە بوو، بەڵام وەك ڕێوییە زیرەك و فێڵەزان بوو. وشیار و زیرەکی وەك خۆی کەم بوون. ئاقڵی‌یەکەی وەك مەلا فەرهادی دەچوو، بەڵام لە هەژدیها و ماران دەترسا و ئەو فکرە کە نەکا ڕۆژێك لە گەڵی دۆست نەبن، ئازاری دەدا. باشە ئەو کوڕە لە کوێ فێر ببوو ئاوا چاك تەقەی بکا و بۆ ئەوەندە دەستی ڕاست بوو؟

ـ موسلیم، قەت ئەتۆ بۆخۆت هەژدیهاکەت دیوە؟

ـ نا، قەتم نەدیوە.

ـ لەوانەیە ئەو هەژدیهایە هەر نەبێ...

ـ چۆن شتی وا دەڵێی کاحەمەد، نابێ وا بڵێی! چۆن دەبێ ئەو هەموو مارانە لێرە هەبن، بەڵام هەژدیهایەك نەبێ حوکمیان بە سەر دا بکا؟

ـ بەو حاڵەش دەکرێ مرۆڤ بیربکاتەوە کە ...

ـ ئەدی ئەگەر ئێرە هەژدیهای لێ‌نیە، چ شتێك شێرەکەی خواردبۆوە؟

شێوەی قسەکردنی موسلیمی شك و گومانی تێ‌دا نەبوو و بە ڕوونی نیشانی دەدا کە ئەو تا چ ڕادەیەك باوەڕی بەو شتە هەیە کە باسی کردبوو.

حەمەد باسکی وی گرت و گوتی:

ـ با ئەمن شتێکت لێ‌بپرسم و تۆش ڕاستم وەڵام بدەوە.

ـ بە سەر چاو، قەرار بێ ڕاستت وەڵام بدەمەوە.

ـ پێم بڵێ چت لەو بارەیەوە کە من بۆت باس دەکەم، بە چاوی خۆت دیوە و چی‌یان بۆ گێڕاویەوە؟ کاتێك سەمیران چووبوو بۆ شاری، بۆ ئەوەی بزانێ کە تەرمی من بوو لە پێش دەرگای ژاندەرمەخانەی داندرابوو، یان نا، ئەو دەنگۆیە هەبوو کە سەمیران بۆ هەرکوێیەك چووبا، باڵندەیەك لە گەڵی هەڵدەفڕی. دەڵێن ڕاست لە سەر سەری دەفڕی و هەتا بۆی ڕوون نەبۆوە کە تەرمەکە ئی من نیە، بە جێی‌نەهێشت، ئەوە ڕاستە؟

ـ بەڵێ زۆر وێدەچێ. مەلا فەرهاد، تەواوی خەڵکی دێی و تەواوی خەڵکی شاری ئەو باڵندەیان دیتوە، کە بەردەوام لە سەر سەری سەیرانێ فڕیوە. ئەو خەڵکە بۆ منیان گێڕاوەتەوە. ئەوان لە گەڵ سەیرانێ چوونەتە شاری و هاتوونەتەوە. دەڵێن هەر سەیران لە ماڵێ دەچێتە دەر، باڵندەکە دەگاتە سەری و بەجێی‌ناهێڵێ. ڕاست بە سەر سەریشیەوە هەڵدەفڕێ. هەموو ڕۆژێ، هەموو خەڵکی دێی ئەوەیان دیتوە. ئەمن بۆخۆم چم نەدیوە...

پاشان لە سەرەخۆ گوتی:

ـ بەڵام دەڵێن باڵندەکە زەردە، شین نیە..

ـ نەخێر شینە.

ـ نا، زەردە.

ـ گوتم شینە!

ـ ئاخر سەیران گوتی زەردە.

ـ بێدەنگ بە، ئەمن دەزانم شینە!

ـ باشە با وابێ، زۆر چاکە زەرد نیە و شینە.

لەو کاتە دا سیوادی دابوو و ئاسۆ ڕووناك ببوو. سەری چیای هیممەتی کەمێك سپی هەڵگەڕابوو کە دەنگێك لە باتلاغێوە هات و عەرز لەرزییەوە. دوای ساتێکی دی باڵندەکان دەستیان بە فڕینێ دەکرد و مێشومەگەز دەهاتن و دەچوون. دنیا وەخەبەر هاتبوو و لە هەزارویەك تیشك دا، لە هەموو ڕەنگەکانی دا، بە هەموو باڵندەکانی‌یەوە، ترووسکەی لووتکەکانی‌یەوە، گەشی گوڵەکانی‌یەوە و ئەو تەمە تەسکەی بە سەر باتلاغێوە بوو، شەبەقی دەداوە. سەرەتا موسلیم خەوی لێکەوت و پاشان حەمەدیش وردە وردە پیلووەکانی قورس بوون و خەوت

## (٣)

کاتێك دەنگی تەقەکەی هات، هەموو خەڵکی شاری وەخەبەر هاتن و بە تونێی کراس و دەرپێیانەوە ڕژانە نێو شەقام و بازاڕی. ئەوان بەو حاڵەی، نیوەڕووت، بە خەواڵوویی دەهاتن و دەچوون و تێکیانەوە دەدا. هیچکەس قسەی نەدەکرد. پاشان هەموو وەقسە هاتن و گاڵوبوغرێك دە شاری دا پەیدابوو، هەر مەپرسە. پرسیار هاتنەگۆڕێ و خەڵك هەرچی بە زاری دا دەهات، دەیگوت. پێش ئەوەی خۆر دەرکەوێ، نێوشار پڕ بوو لە خەڵك. لە منداڵی حەوت ساڵە ڕا بگرە تا پیری حەفتا ساڵە لە دەرێ بوون. دەنگە دەنگ کۆتایی نەدەهات. خەڵك لە بەر دەرگای قاوەخانە و دوکانان کۆ ببوونەوە و هەموویان سەبارەت بە ڕووداوی شەوی ڕابردوو دەدوان. هێشتاش لە تەپکەکانی دەوروبەری شاری دەنگی تفەنگان دەهات.

ئەو کاتەی مورتەزاغا دیتی حەمەدۆك هاتە نێو ژوورەخەوەکەیان، سەری لە بن باڵنجەکەی دا شاردەوە و کپ بوو. ژنەکەی هەوڵی دا باڵنجەکەی لە سەر سەری لاببا، بەڵام ئەو نەیدەویست سەری بێنێتە دەر. یاوەر بە جێی خۆی، خۆ ئەگەر هەر قازی و دوکتوریش هاتبان و ئەویان بەو حاڵە دیتبا کە لە ترسان لاڵ و ئیفلیج بووە، حوسنی خانم لە شەرمان دڵی دەتۆقی. ئەو شتەش بە خەڵکی گەیشتباوە، هەتا هەتایە گاڵتەیان پێدەکرد و پێیپێدەکەنین.

ـ کوڕە بۆ خاتری خودای، هەستە مورتەزا! ڕوومەتگوڵی خۆشەویستم، داوات لێدەکەم! تەماشای نێرە کە پڕە لە خوێن! ئێستا وڵات ڕووناك دەبێ. خەڵك هەموو دێنە نێرە، هەموویان دەیانەوێ ڕاست بێنە ئەم ژوورەی. ئەوان نابێ بزانن لە ترسان نە زمانت دەگەڕێ، نە لاق دەگری! کوڕە هەموو عالەم گاڵتەمان پێدەکا، شار هەمووی پێمانپێدەکەنێ! مورتەزا پیاوی چابە هەستە!

بەڵام ئەو پاڕانەوە و لالآنەوەیە بێسوود بوو. مورتەزا نەیدەوێرا خۆی ببزێوێ و حوسنی خانمیش بانگی نۆکەرانی نەدەکرد، چونکە حەزی نەدەکرد ئەوان مێردەکەی ئاوا زەبوون ببینن. ئاخرەکەی سەتڵێکی ئاوی سارد هێنا و بە سەر سەری داکرد و پاشان سەتڵێکی دیکەشی پێداکرد، جا ئەو جار دەستی بزاوت. حوسنی خانم داهاتەوە، باسکی گرت و کێشای، بەڵام ئەو نەبزووت. سەرەنجام خانم ماندوو بوو و داوای یارمەتیی لە نۆکەرەکانی کرد. ئەوانیش بە ڕاکردن هاتن، مورتەزاغایان هەڵگرت و بردیانە ژووڕە گەورەکەی.

حوسنی خانم گوتی:

ـ هێندێك ئاوێ گەرم کەن!

وا دیار بوو مورتەزاغا هێندێك باشتر ببوو، بەڵام هێشتا بێحاڵ و ڕەنگپەڕیو بوو. حوسنی خانم بە پارچەیەکی نەرم کە بە ئۆدکولۆنێکی بۆنخۆش تەڕی کردبوو، نێوچاوانی دادەماڵی، دەیدواند و هەوڵی دەدا قسەیەکی لێببیسێ.

ـ خانم، هەموو شتێك ئامادەیە...

نۆکەرەکان مورتەزاغایان بردە حەمامێ و حوسنی خانم لە سەر بەردە مەڕمەڕەکانی تەختی حەمامەکەی وردە وردە جلەکانی لەبەر داماڵی. ئەوە شتێکی باش بوو، چونکە مورتەزاغا توانی باسکێکی هەڵێنێ. پاشان لاقێکیشی بزاوت، سەرەنجام چاویشی هەڵێنان و لە حاڵێك دا چاوەکانی ترس و دڵەڕاوکێیان لێدەباری، لە بن لێوییەوە گوتی:" خوێن، خوێن، هەموو جێگایەك پڕ لە خوێنە"، پاشان چاوەکانی لێکنان و دووبارە هەڵیهێنانەوە و گوتی:

ـ ئەرێ خانم برینەکەم زۆری خوێن لە بەر ڕۆیشتوە؟

ـ خۆ ئەتۆ شوکور هیچت لێنەهاتوە، ساغ و سەلیمی، هیچ، هەر بە قەد سەری دەرزییەش بریندار نی!

ـ هەر هیچ برینم لێنین؟

ـ هیچ هیچ، پاشا چاوخەمناکەکەم! خودای گەورە لە گوللەی ئەو دڕندەیەی پاراستووتی.

حەسار لە مێژ بوو پڕ ببوو لە خەڵك. لەوەتا ڕووناکی کردبوو، خەڵك ڕژابوونە دەرێ و ئێستا جادەی پێش ماڵی وان، لەمسەرەوە بۆ ئەو سەر، لە حەشیمەت جمەی دەهات.

مورتەزاغا هاواری کرد:

ـ عەلییە شەل... عەلییە شەل... ! بۆ خاتری خودای بگەنە عەلییە شەلی و ئەو پیاوە باشەم بۆ بێننەوە. بیر لە پارەی مەکەنەوە. هەرچەندی هەڵدەگرێ، با هەڵگرێ. ئەو پیاوە

گەورەیە کە باشترین پیاوی ئەم جیهانەیە! ئەو منی ڕزگار کرد. ئەگەر ئەو نەبا، ئەمن لەمێژ بوو دە خوێنی خۆم گەوزابووم، ئەو نەبایە، لەگەڵ مەحموداغای پێکرابووم... ئەرێ ئەو چی بە سەر هاتوە؟ مەحموداغا؟

ـ ئەو کوژراوە. لەشی دەخوێنێ دا شەلاڵ بووە. هەر دەڵێی بە سەتڵان خوێنت پێداکردوە، ژوورەکە پڕە لە خوێن.

ـ گوتت ئەمن هیچم لێنەهاتوە؟

ـ نا نا، هیچ، ئەتۆ شوکور ساغی! هیچکوێت بریندار نیە.

ـ ئەدی دەزانی دەبێ ئەو ڕزگاربوونەی لە کێ بزانم و سوپاسی کێ بکەم؟

ـ نا، سوپاسی کێ دەبێ بکەی؟

ـ عەلی‌یە شەل... دەزانی کاتێك ئەو دڕندەیە... مەبەستم حەمەدۆکی قارەمانی خۆمانە، وەك شێری هاتە ژوورێ، تەقەی کرد و چراکە کووژایەوە، پێم‌گوت ڕۆڵە کێت دەوێ؟ ئەویش وەڵامی دامەوە... ئەوە هێشتا مەحموداغا خوێنی دەبەردا مابوو و منیش بێهۆش نەببووم. گوێم لێبوو حەمەدۆکی چاونەترسی من گوتی:"دەمتوانی وەك مەحموداغای دەخوێنی خۆت بگەوزێنم، بەڵام ئەوەی ناکەم و بە دەست عەلی‌یە شەلیت دەسپێرم! ئەتۆ سوپاسی عەلی‌یە شەلی بکە"

ـ لەوەی دەی‌ڵێی دڵنیای؟ کوڕە ڕەنگە هەر بە خەیاڵ ئەو شتانەت دیبی!

ـ نەخێر ئەوە تەواو ڕاستە. بۆخۆم بەو گوێیانەی خۆم ئەو قسانەم گوێ لێبوو. پاشان کاتێك خوێنم بە دەستمەوە دیت، وامزانی ئەوە خوێنی خۆمە و بە ڕاستی مردووم. دەی خۆ ئێستاش من وەك مردووانم. ئەرێ ئەتۆ دڵنیای کە من هیچم لێنەهاتوە؟

ـ نا، لە سایەی خودایەوە هیچت لێنەهاتوە. با سوپاسی ئەو خودا گەورەیەی بکەین، ئەو خودایەی لە تۆپەقوڕێکی هەم مرۆڤی دروست کرد و هەم گورگ و هەم باڵندە. شوکر بۆ تۆ خوایە!

ـ ئەرێ باشە ئەمن چۆن چاکەی عەلی‌یە شەلی بدەمەوە و چ بکەم کە لە گەڵم ئاشت بێتەوە؟ ئێستا بۆت دەرکەوت ئەو چ چاکەیەکی گەورەی لە گەڵ کردووم و ئەمنیش چەندە دەرحەق بە وی خراپ بووم؟

ـ نەدەبوو ئەتۆ ئاوا ناحەزت هەڵسوکەوت لە گەڵ ئەو شوێنگێڕە بە نێوبانگەی، ئەو عەلیاغا زێڕەی کردبا.

مورتەزا ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:

ـ ڕاست دەکەی، نەدەبوو ئەمن وام کردبا، بەڵام چ بکەم خانم گیان مرۆڤ زۆر جار هەڵەش دەکا.

ـ هەرچۆنێك بێ خۆت زۆر بەو مەسەلەیەوە نارەحەت مەکە ئاغا رۆوومەتگوڵەکەم! بە هەر شێوەیەك بێ ئاشتی دەکەینەوە. ئەو پیاوێکی ئاقڵە و لە ئاغایەکی گەورەی وەك تۆ خۆش دەبێ.

ـ دەبێ وا بێ. هیوادارم هەرواش بێ.

حوسنی خانم بە سابوونی جوان شۆردی، ئاوی پێداکرد و خاوێنی کردەوە.

ـ شوکور ئێستا لە سایەی سەری ئاغا عەلی‌یە شەلی برامەوە باشترم.

حوسنی خانم خاولیی تازەی بۆ هێنا و دایە دەستی. خاولی‌یەکە بۆعەترێکی خۆشی لێدەهات.

ـ ئەو چاکەت و پانتۆڵەم بۆ بێنە کە رۆژی جێژنان دەبەرمیان دەکەم. کڵاوە ئاستراکانی‌یەکەشم، هەروەها ئەو کراسە سوورەی لە سەردەمی شەڕی سەربەخۆیی دا دەبەرم دەکرد. ئەو کراسەی کە وەك خوێنی خۆم سوورە و ئەو کاتەی لە بەرەی "مەرسین"ی بە دژی فەڕانسەیی‌یەکان شەڕم دەکرد، لە بەرم دابوو. ئەو کراسەم کە بەخوێنی خۆم، وەك کەسێك کە لە رێگای نیشتمان دا دەمرێ، شەڵاڵ ببوو! حەمەدۆك، ئەو قارەمانە، شەهێنی من، ئەرێ خانمی خۆم بیستبووت هیچ گوللەیەك کاری لێ‌ناکا؟

ـ ئاغای من، ئەوەی نابێ لە لای هەموو کەس باس بکەی! هەروەها کاتێك باسی وی دەکەی، نابێ پێی‌بڵێی "شەهێنی من".

مورتەزاغا قاتەکەی زەمانی شەڕیی دە بەر خۆی کرد و چەکمە بریقەدارەکانی هەڵکێشا. ئەو جار هاتەوە سەر حاڵی جارانی.

ـ بەرێوەڵلا خانم ڕاست ئاوای نێو دێنم! بۆچما بۆ ئەو ژیانەی ئێستام قەرزداری وی نیم؟ باشە لە بەرچی ئەمنیشی نەکوشتوە، ها؟ ئەمن هەر پرسیار لە تۆ دەکەم، بۆ وای نەکردوە؟ پێتوانیە ئەو پێی‌خۆش نەبووە من بکوژێ و بە ئەنقەست منی لە مەرگ ڕزگار کردوە؟ ئەدی ئەو شەهێنی من نیە، چی‌یە؟

ـ بەڵێ، هیچ گومانی تێدا نیە کە ئەو شەهێنە، هەر ئەو شەهێنەیە کە ناوی دە ئەفسانەکان دا هەیە، ئەو پڵینگی نێو چیاکانە. بە ناوی پێغەمبەریشەوە کراوە و وەك ئەویش ئازاو میهرەبانە. ئەوە ڕاستە ئاغا. قسەکانی تۆ وشە بە وشە ڕاستن، بەڵام لە بارودۆخی ئێستا دا ئەو قسانە مەترسی‌یان لە گەڵە.

مورتەزاغا لە حاڵێك دا کڵاوەکەی لە سەر سەری ڕاستەوپاستە دەکرد، گوتی:

ـ مەترسیی چی؟

ـ لەوانەیە مستەفا کەماڵ پاشاش ئەگەر ببیستێتەوە بە حەمەدی دەڵێی شەهێن، بە سووکایەتی بزانێ. باشە مورتەزاغا گیان حەمەدی ئێمە هەرچۆنێك بێ، هەر چەتەیە. ئەدی مستەفاکەماڵی گەورەی لە شکاننەهاتوو دەبێ لەو بارەوە چ بڵێ؟ پێتوانیە ئەو هێندێکی پێناخۆش دەبێ، ئەگەر ئەتۆ لێرەولەوێ تاریفی ئەو یاغی‌یەی بکەی؟ مورتەزاغا، نووری چاوم!

ـ ڕاست دەکەی، دیارە ئەو ئەوەی پێ خۆش نابێ... بەڵێ دەبێ ئەمن ئاگام لە زمانی خۆم بێ، بەڵام ئەوە بەو مانایە نیە کە من نیشان نەدەم چەندە منەتباری ویم. دەبێ لە چەك و تەقەمەنی هەرچەندی پێویستی بێ، بی‌دەمێ و دۆستایەتیی خۆشی پێ‌بسەلمێنم. هەروەها دەبێ دە عەلی‌یەشەلیش بگەیەنم کە ئەمن منەتباری ویم. ئەرێ چۆنە ئەمشۆ بۆ ناخواردنی شەوێ بانگهێشتنی بکەم؟

ـ لە وەی دا پەلەی مەکە ئاغا! عەلی دڵی یەشاوە و ئەگەر لەو بارودۆخەی دا بانگی کەی، پێی‌خۆش نابێ. دڵ وەك شووشەی وایە، ئەگەر شکا، چاکبوونەوەی زەحمەتە. وا چاکترە قسە لە وەی نەکەین.

ـ قسە لە چی نەکەین؟

ـ لە دۆستایەتیمان لە گەڵ حەمەدۆکی.

مورتەزا پێ‌کەنی:

ـ نا، بە یەك وشەش باسی وەی لە لای خەڵکی ناکەین. ئەوە تا ئێستا دوو کەسین ئاگامان لەوەی هەیە، من و تۆ، هەروەها خودا ... و عەلی‌یەشەل...

ـ بۆچما عەلی‌یەشەل دوژمنی قەستەسەری حەمەدۆکی نیە؟

مورتەزاغا هێندێك ڕاما و گوتی:

ـ ئەو خەڵکە هەموو شتێکی لە دەست دێ. حەمەدۆك بۆ ئەمنی بەخشی و نەی‌کوشتم؟ لە بەر ئەوەی دوژمنی قەستەسەری خۆی ڕازی کا؟ ئەو ماستە بێ موو نیە حوسنی خانمی خۆم...

پاشان نێوچاوانی ویكهێنا:

ـ ئەوجار بۆچی دەبێ عەلی‌یەشەل داوای لێ‌کردبێ من نەکوژێ؟ ئەویش دوای ئەوەی من ناوام هەڵسوکەوت لە گەڵ کردوە، دوای ئەوەی هێندەم سووکایەتی پێ‌کردوە و شکاندوومە! لەوەتا دنیا دنیایە، کەس ناوای ڕەفتار لە گەڵ کەسێکی دیکە نەکردوە. بەڕاستیش ئەو ماستە بێ‌موو نیە! هەر خوا بکا پیلانێکیان بۆ منیش بە دەستەوە نەبێ و سەری منیش تێ‌دا نەبەن.

هیچیان نەیاندەوێرا ئەوەی بە دڵیان دا دادێ، بە زمان بیڵێن. حوسنی خانم بە زەحمەت تفی زاری قووت دا و گوتی:

ــ ئەگەر ئەتۆ تکای لێبکەی، ... ئەگەر پێیبڵێی لەوەی لە گەڵیت کردوە، پەژیوان بوویەوە... ئەویش بێگومان پەژیوان دەبێتەوە. لە بیرت نەچێ دۆستایەتییەکە تا مردنێ دەبێ بمێنێتەوە.

ــ خوا لە زارت بڕوانێ!

مورتەزاغا حوسنی خانمی دە ئامێز گرت.

ــ با ئەو جار مەحموداغای جێبەجێ بکەین.

سەری مەحموودئاغای بە سەر سەرینەکەی دا شۆڕ ببۆوە، دەموچاوی سپی هەڵگەڕابوو، چاوەکانی هەڵگەڕابوونەوە سەرێ و لە دیوارەکەی بەرامبەریانەوە بڕابوون. زاری نیوەئاواڵە بوو، دەتگوت ویستوویەتی شتێك بڵێ، یان خەریك بووە هاوار بکا. دیوارەکان، سەرینەکە، لێفە و ڕوولێفەکە هەموو دە خوێنێ دا شەلاڵ ببوون. خوێن هەتا بن جێوبانەکەی مەحموودئاغای داگرتبوو.

مورتەزاغا بە سەرسوڕمانەوە گوتی:

ــ ئەو هەمووە خوێنەی! ئەو بۆخۆی هەر بە قەدەر چۆلەکەیەکی دەبوو.

پاشان ڕووی دە ژنەکەی کرد و گوتی:

ــ بە قەد گامێشێکی خوێن لە بەر ڕۆیوە!

ژنەکە چاوی لێکرد، دیتی چۆن سپی هەڵگەڕاوە و خێرا لەو ژوورەی بردە دەرێ. ئێستا دەرگا گەورەکەی حەسارێ لە سەر پشتێ بوو و سەرۆك و گەورەکانی شاری دەهاتنە ژوورێ. عەلییە شەل لە دەرێ، لە خەیابانێ، ڕاوەستابوو. کەوشەکانی تازە ـ ڕەش کردبوونەوە و هەر بریقەیان دەهات. کڵاوی بە گەوەڕی لە سەرنابوو و جلی تازە و کراسێکی سپیی دە بەر دا بوو. دەسرەیەکی سووری لە ملی هاڵاندبوو. دە بیرەوە ڕۆچووبوو و خەمناك و تازیەبار دیار بوو. سمێڵە درێژەکانی هێندێك دەلەرزین.

ئەوانەی دەهاتنە ژوورێ، هەموویان لە پێش دا ڕادەچەنین و لە جێی خۆیان ڕادەوەستان.

خەلیل بەگی گەورە گوتی:

ــ پێویست ناکا دوکتۆر تەرمەکەی بپشکنێ، ئەوە قارەمانی نیشتمانە!

یاوەر گوتی:

ـ بە ڕاستی قارەمانە. ئەو تەنانەت میداڵی دەورەی شەڕی سەربەخۆییشی هەبوو! نەخێر بە هیچ شێوەیەك تەرمپشکنینی ناوێ.

پزیشکی قانوونییش گوتی:

ـ نەخێر دیارە پێویست بە کردنەوە و پشکنینی لەشی تەرمەکە ناکا و من هەر ئێستا ڕاگەیاندنی مەرگ و ئیجازەی بەخاکسپارنەکەی بۆ دەنووسم، بەڵام هەرچۆنێك بێ، هەر دەبێ چاوێکی لێ بکەم.

مورتەزاغا گوتی:

ـ نا ئەوەش پێویست نیە، ئەو گوللانەی وێی کەوتن، هەمووم ژماردوون. بێ‌زیاد و کەم سێ گوللەی وێ‌کەوتوون.

پزیشکەکە لێفەی سەر تەرمەکەی هەڵداوە. کراسی خەوی مردووەکە تا پشت چۆکانی هەڵکرابوو، هەردووك لاقی بە ڕووتی بەدەرەوە بوون و هەر یەکەی بە لایەك دا کەوتبوون.

ـ زەحمەت نەبێ، دەکرێ چەند دەقیقەیەك ژوورەکەی چۆڵ کەن؟

هەموو چوونەدەرێ. پزیشکەکە تەرمەکەی چاو لێ‌کرد و هەردوك دەستی بە خوێن بوو. کوژراوەکە سێ گوللەی وێ‌کەوتبوون. هەرسێك گوللە وە یەك جێی کەوتبوون.

پزیشکەکە لە.بن لێویەوە گوتی:

ـ ئەو مارزە تفەنگچیی چاکە!

پاشان وەدەرکەوت.

لای نیوەڕۆیە ژن و کوڕ و خزمەکانی مەحموودئاغای گەیشتنێ. نیوەی خەڵکی کانی گوڵانیشیان لە گەڵ هاتبوو. پزیشکەکە شایەتنامەی مەرگی مردووەکەی نووسی و یاوەریش ڕاپۆرتی خۆی نووسی. پاشان ڕێگا بە بنەماڵەی کوژراوەکە درا کە بچنە سەر تەرمەکەی.

تەرمەکە شۆرا و سەرلەنوێ جلەکانی لەبەر کرایەوە، تا بە پێی ئامۆژگاریی مەلای بە جلەوە بنێژرێ. پاشان بردیانە مەیدانی شار، لە سەر تەختێکیان دانا و لە پارچە ئاڵایەکی نوێیانەوە پێچا. پێش هەموو کەس یاوەر چووە سەر سەکۆی قسەکردن و گوتی:

ـ ئاخ قارەمانەکەی شەڕی سەربەخۆییمان. ئەو هەموو میداڵ و نیشانانەی وەرتگرتوون، هەتا هەتایە دەبریقێنەوە و دیارە ئەتۆ هەرگیز نامری. هەتا چیای تووڕووس بمێنێ و ئەو وڵاتە بژی، هەموومان لە دڵی خۆمان دا زیندووت ڕادەگرین. تەنیا کاتێك خۆر ئاسەواری نەمێنێ، تۆ ون دەبی. لەمڕۆوە یادی تۆ لە نێو دڵی خەڵکی تورکیە دا دەژی. ئەمن بە خاکی پاکی

نیشتمان سوێند دەخۆم، پێش ئەوەی لەشی تۆ سارد بێتەوە، خاکی سەر گۆڕی تۆ بە خوێنی ئەو یاغی‌یەی کە پێی دەڵێن حەمەدۆك، ئاو بدەم. ئەتۆ کە بەگزادە و ڕەسەن بووی، ئەتۆ کە پەلکووری تووڕووس بووی، تۆ کە میداڵە زێوەکەی سەر سینگت، کردە قەڵغانی گوللە. ئاخ تۆی قارەمانی نیشتمان، تەنانەت فەڕانسەیی‌یەکانیش نەیانتوانی خوێنی ڕەسەن و بە نرخی تۆ بڕێژن، ئەو خوێنەی کە لە ناخی ئاسیاوە هاتبوو، بەڵام یاغی‌یەك، دوژمنێکی ئەو نیشتمانە، جووتێرێکی ترسەنۆکی بێ‌بنە و بنەچەکە، خوێنی تۆی دڵسۆز دەڕێژێتە سەر ئەو خاکە پیرۆزە. بەڵام ئەو خوێنەی تۆ خۆر، ئەستێرە و ڕووناکایی لێ دروست دەبێ! من تۆڵەت دەستێنمەوە! من تۆڵەی تۆ لە حەمەدۆك و هەموو دوژمنانمان دەستێنمەوە.

یاوەر گەرم داهاتبوو، دەی‌گوڕاند و قسەکانی وایان لەو حەشیمەتە، کە لە وێ کۆ ببوونەوە، کردبوو، کە هەموویان مات و حەیران تێیان هەڵدەڕوانی. کاتێك بە بزەیەك لە سەر لێوانەوە لە سەر سەکۆی قسەکردن هاتەخوار، هەموو گیانی لە ئارەقەی دا شەڵاڵ ببوو، بەڵام ئەو شانازیی بە خۆیەوە دەکرد. مەلا و دادەستێن هەردووکیان ڕایانکردە پێشی، داوای سەرکەوتنیان بۆ کرد و بە دوای ئەوانیش دا گەورەپیاوەکانی شار هەر وایان کرد! ئەوە پێی‌دەڵێن هونەری قسەکردن!! ئەوانەی لەوێ بوون هەموو وەگریان کەوتبوون.

شەڕکەرە دێرینەکان، کە هەموو کڵاوی بە گەوەڕیان لە سەر بوو، بەڕیز لە پێش سەکۆی قسەکردن ڕاوەستابوون. مورتەزاغا، بە تفەنگەوە و سێ ڕیز فیشەکدان ڕاست و چەپ بە قەدەوە، هات، لەوێ لە ئەسپەکەی دابەزی و دەسبەجێ غاری دا لای یاوەری، باوەشی پێ‌دا کرد و بە دەنگی بەرز گوتی:

ــ خودا هەموو ئەو کەسانە ببەخشێ کە وەکوو تۆ نازان! قسەکانت ئەوەندە جوان و بە سۆز بوون، کە تەنانەت فرمێسکیان دەخستە چاوی گورگ و باڵندەشەوە! جاچۆن ئەو وتارە کار لە ناخی دڵی ئێمە ناکا؟ وەڵڵاهی وشەکانی تۆ عەرز و داروبەردیشیان ڕاتلەکاند!

پاشان مەلا، حاکم و زۆر کەسی دیکەش چوونە سەر سەکۆکە و قسەیان کرد، بەڵام هیچیان نەیانتوانی وەك یاوەری بەگوڕ و تین بدوێن.

دوای ئەوەی ڕێوڕەسمەکە کۆتایی هات، ژاندەرمان تابووتەکەیان هەڵگرت و خستیانە نێو تاکسی‌یەك کە تاقە تاکسیی شارەکە بوو و مام هەمزە خاوەنی بوو. ماشێنەکە وردە وردە بەرەو پردێ وەڕێ‌کەوت. گەورەکانی شاری لە پێش ماشێنەکەوە دەڕۆیشتن و تەواوی حەشیمەتی دیکەش، لە خەڵکی شار و جووتێرەکان، لە حاڵێك دا سەریان بە نیشانەی ڕێزلێنان داخستبوو،

بە دوای ماشێنەکە دا دەڕۆیشتن. لە سەر پردێ، مام هەمزە گازی دایە، زۆری پێنەچوو ماشێنەکە لە پێش چاوان ون بوو و خەڵکەکەش گەڕانەوە نێو شاری. نیشانەی خەمباری و هەستی ڕێزلێنان بە ڕوخساری هەموانەوە دیار بوو.

بەو شێوەیە چەند ڕۆژ پێچوو و هیچ شتێك نەقەوما. ئەو ژاندەرمانەی پێیان سپێردرابوو حەمەدۆکی بگرن و چووبوون ئەو ئەرکەی جێبەجێ بکەن، بە دەستڕاوەشاندن گەڕانەوە. یاوەر دەرگای ژوورەکەی لە سەر خۆی گاڵە دابوو و ئیدی لە نێو بازاڕی نەدەبیندرا. ئەوە دووهەم جار بوو کەسێك لە نێوەڕاستی شاری، ڕاست لە تەنیشت ژاندارمری، دەکوژرا. وەك ئەوەی دەچوو کە حەمەدۆك بە ئەنقەست دەیەویست قەڵسەی لە خودی یاوەری بگێڕێ و شەڕی پێ بفرۆشێ. وەك ئەوە دەچوو بیەوێ تۆڵەی ژنەکەی، کە یاوەر کوشتبووی، لە وی و لە شارەکەی بکاتەوە. حەمەدۆك کاتی بە فیڕۆ نەدەدا و زەبری خۆی دەوەشاند. یاوەر وەخت بوو لە داخان بتەقێ، ددانی دەچیڕەوە دەبرد و دەیگرماند:

ــ وەکیل باشی ئەو هەتیوەشێتێکی تەواوە. بە ڕاستی ئیدی بێتامی کردوە، ئێمەش ڕێگایەکی دیکەمان نیە، یان دەبێ بیگرین، یان ئاخرەکەی هەمووی ئێمەش لە بەین دەبا!

وەکیل باشی عاسمیش تووڕە بوو: هەتا ئەو حەمەدۆکە زیندوو بێ، ئەو شارە یەك سەعاتیش ناحەسێتەوە.

ــ دەبێ خوێن بڕژێ. جا یان خوێنی ئێمە یان ئی حەمەدۆکی!

یاوەریش گوڕاندی:

ــ بەڵێ خوێن! ئەو دەیەوێ تۆڵەی خۆی لە شارەکە بکاتەوە. ئێستا ئیدی ئەو هەتیوە هەر لە شاخی خەڵکی ناکوژێ. ئەوەتا لە بنەوپاڵی ئێمە مەحموداغای کوشتوە!

ــ مەبەستیشی هەر ئەوە بووە کە قەشمەری بە ئێمە بکا!

ــ هەتا ئەمن بشکێم و ئایندەی من بە با دا بچێ!

مورتەزاغا وردە وردە ترسەکەی کەم بۆوە و توانی هەستی سەرشۆڕی و تێشکاوی لە خۆی دوور بکاتەوە. تەنانەت زمانیشی کرابۆوە و وەقسە هاتبۆوە. هەموو ڕۆژێ دوکان بە دوکان و چاخانە بە چاخانەی شاری دەکردن و هەرکەسی دیبا، قسەی بۆ دەکرد. دوو ــ سێ جاران دە عەلیپەشەلی هەڵەنگوتبوو و هەموو جارێش بە پێچەوانەی هەستی دەروونیی خۆی، دڵخۆشیی دابۆوە و تاریفی کردبوو، بەڵام عەلیپەشەل خۆی لێبواردبوو، چاوی بەردابۆوە و بە پەلە دوور

کەوتبۆوە. مورتەزاغا دەیگوت:"ئەو کابرا سەقەتە، ئەو شەلە، ئەو مەلعوونە، گیانی منی ڕزگار کردوە، بەڵام ناوێرێ چاو دە چاوی من ببڕێ. مرۆڤ بۆ دەبێ چاو لە چاوی ئەو کەسە نەکا کە ڕزگاری کردوە؟

ئەو جار هەر کە مورتەزاغا چاوی بە عەلیپەشەلی کەوت، ڕقێکی وا دایگرت کە هێندەی نەمابوو چۆکی لە بن لەشی دا بنوشتێنەوە. لە ژێر لێوییەوە گوتی: ئاخرەکەی ئەو کابرایە ئەمن دەکوژێ! ئەو جار بیرێکی بە مێشکی داهات، بیرێکی ئەوتۆ کە قەت بۆ ئەوە نەدەبوو لای کەس باسی بکا. باشە بۆ تووشی بە تووشی ئەو کابرایەوە بووە؟ هەموو جارێکیش کە دەکەوتە بیری ئەوە کە بە شێوەیەك عەلیپەشەلی بکوژێ و لە کۆڵ خۆی کاتەوە، ڕۆستەمە کوردی نارەقفرۆشی دەهاتە پێش چاوی. باشە، ئەگەر خانوێك و زەوییەك، کیسەیەکی پڕ لە زێڕ، ئەسپێکی ڕەسەنی عەرەبی و دیارە تفەنگێکی کارابینی ئەڵمانیشی بداتێ( چونکە کورد هەموو ئاشقە چەکن)، بڵێی ڕۆستەم ئامادە نەبێ عەلییە شەلی بۆ بکوژێ؟ خۆ کوشتنی پیاوێکی سەقەتی بەستەزمان نابێ ئەوەندەش زەحمەت بێ...، بەڵام سەیرە! هەر کاتێك بیر لە کوژرانی عەلی دەکاتەوە، زەحمەتە بتوانێ وەبیر بەسەرهاتی ئەو شەوەش نەکەوێتەوە و ئەگەر لەو ساتە دا کەسی وەگیر نەکەوێ بۆی بگێڕێتەوە، تاب ناهێنێ و دەتەقێ:

ـ دەرگا کرایەوە، منیش وەخەبەر هاتم. چرا سووڕەتییە زێڕکفتەکە هەڵکرا و ژوورەکە وەك ڕۆژی ڕووناکی لێهات. یەکێك هاتە ژوورێ، قەڵافەتێ زۆر گەورە بوو، سەری وەبنی میچی دەکەوت. باسکی وەك لکی دارپەڵکی ئەستوور بوون، ئاوری لە زاری دەهاتە دەرێ، ڕاست وەك هەژدیهای. مەحموداغاش وەخەبەر هات و کاتێك کابرای لە ژوورێ دی، دەستی بردە بن سەرینەکەی و دەمانچەکەی دەرهێنا، بەڵام پیاوەکە بە سەری دا گوڕاند:" دەمانچەت فڕێدە، ئەمن حەمەدۆکم! مەحموداغا کە ئەوەی بیست، دەمانچەکەی لە دەستی بەربۆوە و کەوتە سەر سەرینەکەی. دەستی مەحموودئاغای دەلەرزین، لێوەکانی شین هەڵگەڕابوون و ڕوخساریشی وەك ڕەنگی سەر لێفەکەی سپی ببۆوە. پیاوەکە بە منی گوت مورتەزاغا ئەمن نان و نمەکی تۆم کردوە ــ کەنگێی نمەکی من کردوە، نازانم، بەڵام گومانی تێدا نیە کردوویەتی ــ و ئەمن بە داخم کە لەو ماڵە جوانە میوانگرە پڕ لە شانازییە دا خوێن دەڕێژم. ببوورە، ئەو جار ڕووی دە مەحموداغای کرد و گوتی بەڵام ئەتۆ خائینێکی خوێڕیی! ئەتۆ ئێستا دەبێ شادەوئیمانی خۆت بێنی، هەرچەند خودا گوێت لێ ناگرێ! کەسێك خەڵکی هەژار بچەوسێنێتەوە، گوندان بە خەڵکی چۆل بکا، دێوەزمەیەکی بە خوێن تینووی وەك تۆ، کوشتنی لە هەرچوار کتێبە

پیرۆزەکان دا حەڵاڵ کراوە. ئەگەر ئەتۆش وەك مورتەزاغای ئاغایەکی باش بوایەی، قەت کارم پێت نەبوو، بەڵام ئێستا مەحموودئاغای کانی‌یەگوڵان وەرگرە! ئەوەی گوت و لوولەی تفەنگەکەی دەمن کرد و نەڕاندی: "سەرت بەرە بن سەرینەکەت!" وای نەڕاند، هەموو خانووەکە لەرزی‌یەوە و هاوکات سێ گوللەی تەقاندن، تەق، تەق ،تەق! مەحموودئاغا هەر دەنگیشی لێ‌نەهات. پاشان دەنگی پێیانم لە نێو پلیکانان گوێ لێ‌بوون. کاتێك سەرم هەڵێنا جێویانی مەحموودئاغای پڕ بوو لە خوێن... ئای چەندی خوێن لە بەر ڕۆیبوو، قەتم هێندە خوێن نەدیوە! ئەو بەستەزمانە بە قەد سێ گایانی خوێن لە بەر ڕۆیشتبوو... ئەو فەقیرە ئاوا کوژرا. ئەوە کۆستێکی گەورە بوو.

مورتەزاغا ئیدی بەیەك وشەش بە خراپ باسی حەمەدۆکی نەدەکرد و بە پێچەوانەوە هەتا باس کرابا، تاریفی دەکرد: کەس ناتوانێ بی‌کوژێ، هیچ کەسی پێ‌ناوەستێ، چونکە حەمەد ئەنگوستیلەی خانەقای چل چاوی پێیە. ئەو بەردە برووسکەی پێیە. بۆم نەگێڕاونەوە کاتێك ئەو شەوە چاوم هەڵێنانەوە، چم دی؟ ژوورەکە پڕ بوو لە ڕووناکی، کابرایەکم هاتە پێش چاوی، نێوچاوانی دەگەیشتە بەری میچی. تفەنگێکی کاڕابینی بە دەستەوە بوو، ئەمن بۆخۆم ئەنگوستیلەکەی قامکیم دی، وا دەترووسکاوە، چاوم لە بەری هەڵنەدەهات. دەسبەجێ زانیم ئەوە کێیە. ئەو بەستەزمانە، مەحموودئاغاش، زانی. خودا عافووی کا پیاوێکی ئازا بوو. دەمانچەکەی هەڵیش‌گرت و سێرەشی لە حەمەدۆکی گرت، بەڵام دەمانچەکە لە دەستی کەوت.. پیاوەکە چۆنی هاتبوە ژوورێ، هەر ئاواش، لە حاڵێك دا نووری لێ‌هەڵدەستا، وەدەرکەوت. ئەمن بۆخۆم دیتم بە نێو شاری دا دەڕۆیی و بە هەر جێ‌یەکیش دا دەڕۆیی، شۆق و ڕووناکی‌یەکەی دەگەڵ بوو و بە دەوری دا بڵاو دەبۆوە. ئەو بۆ لای شاخی چوو و من بە چاوی خۆم دیتم چۆن هەورازەکانی دامێنی ئەو تەپکانەی ئەو لێیان وەسەر دەکەوت، ڕووناك دەبوون. دەتگوت ئەو هەوراز و نشێوانەی ئەو پێیان دا ڕەد دەبێ، لە ڕووناکایی دا مەلە دەکەن و ئالقەیەك لە نووریش دەوری دابوون. بەڵێ، ئەو بەرەو چیای دولدڵ و بۆ لای چلسوارەی غەیبی دەچۆوە. پێی گوتم من ئەتۆ دەناسم و کەس شەڕی لە گەڵ تۆ نیە، هیچ مرۆڤێك زیانت پێ‌ناگەیەنێ و تەنانەت عیزرائیلی فریشتەی مەرگیش کاری پێت نیە. هەموو کەس دەزانێ عەلی‌یەشەل دۆستی هەرە نێزیکی منە، بەڵام ئێستا هێندێك دلێشیمان لە بەین دایە، کە دیارە براش نێوان ناخۆشی‌یان هەر دەبێ و ئەوەش تاوانی هەردووکمانی تێدایە... برای ئازیزی من عەلی‌یە شەل بەگ وەك خەڵکی دیکە نیە. ئەو نیشانەی خانەقای چلچاوی بە نێوچاوانی‌یەوەیە.

ئەو ترس و دڵەڕاوکێیەی تا ئێستا ئارا و قارای لە موڕتەزاغای هەڵگرتبوو، ئەو جار گەیشتبوە خەلیل بەگی گەورەش. هەموو ئاغا و بەگەکان لە خۆیان دەترسان و قەت وەك ئێستا زەندەقیان نەچووبوو. دەی هیچ دوور نەبوو ڕۆژێك ئەوانیش هەر ئەو چارەنووسەیان بە سەر بێ، کە بە سەر مەحموداغای هات. عەریزەنووسەکان لە پڕکارییان سەری خۆیان بۆ نەدەخورا و تەتەرەکان(نامەبەرەکان) لە ڕێی پێتەخت و سالۆنی وەزارەتخانەی نێوخۆ دا لە گەڵ یەکتری پێشبڕکێیان بوو. پیاوە گەورەکانی شاری ئەزموونیان لە ڕابردوو وەرگرتبوو و ئێستا نامەکانیان پڕتر و سەرنجڕاکێشتر دەنووسین، بەڵام عارف سایم بەگ هیچ دەربەست نەبوو، هەر ئاوڕیشی وەو شارەی نەدەدایەوە و نەك هەر نەدەچووە ئەوێ، بەڵکوو نامە و پەیامەکانیشی وەرنەدەگرتن. هەر بۆیەش دەمڕاستەکانی شاری لەوە دەترسان کە ئەوە بەو مانایە بێ کە ئەو بە هێندیان نەگرێ، یان هەر بە ڕاستی بڕیاری دابێ کە حەمەدۆکی دەبن باڵی خۆی بگرێ و بیپارێزێ. خۆ وەڵڵا هیچ دووریش نەبوو جێگایەکی لە شاری ئەنکەرەش بۆ بدۆزێتەوە. هەر ئاغایەی یاغیی خۆی لە شاخی هەبوو، ئەدی بۆ عارف سایم بەگ، یان سیاسەتوانێکی گرینگی دیکە، پیاوێکی ئەوتۆی لە پێتەخت نەبێ...

باش بوو ئەو هەواڵە تازانەی لە وایوای و ئائاوارزاوە دەگەیشتن، هێندێك دڵەڕاوکێکەی هێور کردنەوە. بە پێی ئەو هەواڵانە ژاندەرمان لە وایوای دەوری حەمەدۆکیان دابوو، بەڵام ئەو مارە مەلعوونە شەوێ خۆی لە دەستیان دەرباز کردبوو. لەو کاتە دا کە ئەوان ئەو هەواڵە خۆشەیان بۆ یەکتر دەگێڕایەوە، سوارێك بە پڕتاو خۆی بە نێو شاری دا کرد، لە بەر دەرگای مەحکەمەی جلەوی هەڵەنگاوت و هاتە خوار. هەموو گەورەکانی شاری لەوێ بوون.

سوارەکە نەڕاندی:

ـ ئیدی تەواو بوو. گەمارۆمان داوە! هەموو کەس دیتوویانە! دوو گورهان و خەڵکی هەژدە دێیان، بە ژن و پیاوەوە، لە باتلاقی ئاخچەسازی دا گەمارۆیان داوە!

قازی پرسی:

ـ کێیان گەمارۆ داوە؟

ـ حەمەدۆك جەنابی قازی! حەمەدۆك! هەرچوار دەوریان گرتوە، ئیدی دەرباز نابێ، خەڵکی هەژدە گوندان، بە ژن، پیاو، منداڵ، ئەسپ و سەگەوە لێی وەخڕ بوون و دەوری ئاخچەسازیان داوە. ئەوە بە لێشاو خەڵکی دیکەش هەر دێن! هەر جووتێرێکی بە باسوخواسەکەی زانیوە، بەرەو ئەوێ چووە. هەرکەس هەرچی وەبەر دەستی هاتوە، دەمانچە، چەقۆ، شەنە، پێمەڕە و ..

ڕۆیبۆتیێ و ڕۆیشتوە، لە هەموو دێیەکانەوە هاتوون، لە جەیهان، عوسمانلی، لە داوێنەکانی کۆزانیێ، لە هەموو شوێنیکییەوە، هەموو دەیانەوێ ئەو دڕندە خوێنخۆرەی بگرن! دەوری ئاخچەسازی ئەوەندەی خەڵك لێیە، دەرزی هەڵاوێی وەعەرزی ناکەوێ.

ـ باشە کوڕە، ئەتۆ چۆن دەزانی ئەوەی لە نێو باتلاغی ئاخچەسازی دا خۆی حەشارداوە، حەمەدۆکە؟

ـ هەموو کەس دیویەتی ئیدی! هەوە! ڕاست بۆخۆیەتی!

ـ ئەوانەی دەڵێن دیتوومانە، بە ڕاستی دەیناسن؟

ـ بەڵێ، وەلی زۆرزان کە خەڵکی گوندەکەی وێیە و ئێستا لە ئاناوارزای نۆکەرە، دەیناسێ.

ـ ئەدی کێ ئەتۆی ناردوە؟

ـ نایبی خۆمان قوربان! ئەو فەرمووی بە پەلە سواربم، بێم بۆ ئێرە و ئەو هەواڵە بە جەنابی یاوەری بگەیەنم. گوتی بە جەنابی یاوەری بڵێ کە ئێمە ئاخچەسازمان گەمارۆ داوە و ئەو هەرچی زووتر خۆی بگەیەنێتە ئەوێ، چونکە ئیدی حەمەدۆك ناتوانێ لە دەستمان دەرچێ و گومانی تێدا نیە یان ئێمە دەیگرین، یان باتلاغ هەڵیدەلووشێ. بڵێ بە کەرەمێ خودای و بەرەکەتی نێوچاوانی یاوەری، هەوڵ دەدەین هەر بە ساغیش بیگرین!

یاوەر بزەیەکی هاتی و گوتی:

ـ بەڵێ، ئەگەر وا بێ ئیدی لە دستمان دەرناچێ و دەیگرین، بەڵام پێم بڵێ لەو کاتەی دا حەمەدۆك چۆتە نێو باتلاغەکەیەوە، کێ دیویەتی؟

ـ هەوەڵێ جەنابی نایب بۆخۆی دیتوویەتی قوربان! لە دەربەندی گوندی وایوای، کاتێك حەمەدۆك ویستوویە بچێتەوە لای سەیرانێ. ئاخر بۆخۆت دەزانی ئەو سەیرانی مارە کردووە و ئێستا ئەو ژنە خێزانیەتی! نایب تەقەی لێکردوە، ئەویش جوابی تەقەکەی داوەتەوە و دوایە هەڵاتوە. دەربەندەکە هێندێك بزنی لێبووە، کە لێرە و لەوێ لەوەڕاون. حەمەدۆك بە دەم ڕاکردنەوە گەیشتۆتە هەر بزنێکی، لە پەنا بەردان و پنچکان بەستوونییەوە، نایبیش بزنەکانی لە گەڵ حەمەدی لێتێکچووە، ئەوی لێ ون بووە و یەك یەك هەموو بزنەکانی کوشتوون. بەو شێوەیە حەمەد دەرباز بووە و ڕاست لەگەڵ ولات ڕووناکبوونێ، خۆی گەیاندۆتە گابەردەکانی ئاناوارزای. لەو تەقە و لێکدانەی دا حەمەد حەوت ژاندەرمەی بریندار کردوون. هەموویان بە لاقی ئەنگاون و ئێستا لەوێ کەوتوون. حەمەد ئاخر بزنی لە بەرەوەی کۆنەقەلاکەی لە پەنا

پنچکێکی بەستبۆوە و بەو شێوەیە بۆی دەرچووبوو. ژاندەرمەکانیش هەر وا تەقەیان کردبوو و بزنی چارەڕەشیان وەك بێژینگێ دابێژ دابێژ کردبوو. پاشان حەمەد خۆی دە کەرتەشیجارەکەی هاویشتبوو و لە بەستێنی چۆمی دا خۆی حەشاردابوو، کە دیارە ئێستا ئەوێ ئاوی تێدا نیە و وشکە. وەلی زۆرزان بە چاوی خۆی دیتوویەتی، ناسیویەتەوە و بە پەلە چووە بە ژاندەرمەکانی گوتوە. بەستەزمانانە لە ترسان ڕوحیان پێنەمابوو.

ـ ئەوە دەڵێی چی کوڕە؟ یانی ژاندەرمەکانی ئێمە لەو تاقە کەسەی دەترسن؟!

کوڕەکە ئارەقێکی ساردی لە لەشی نیشت. بە پەلە وەڵامی دایەوە:

ـ نا، نا، جەنابی یاوەر! ژاندەرمەکان لە حەمەدی نەدەترسان.

ـ ئەدی لە چی دەترسان؟ خۆ سەربازی تورك قەت ناترسێ!

لەشی کوڕەکەی ئەوجار شەڵاڵی ئارەقە بوو:

ـ بەڵێ، بەڵێ، دەزانم قوربان! ئەمن بۆخۆشم سەربازیم کردوە. سەربازی تورك قەت لە هیچ ناترسێ، بەڵام ئەو شوێنە، بەستێنی چۆمەکەی، پڕە لە مار. ماری یەکجار گەورە! هەر کامەیان ئەوەندە درێژن ــ کوڕەکە باسکەکانی بڵاو کردن ــ لانی کەم پێنج هێندی درێژایی ئەو باسکانەی من! کەس ناوێرێ بچێتە دەوێوە، نە ژاندەرمە و نە جووتیێرەکان، هیچکەس ...

یاوەر لە تووڕەیییان لەجێی خۆی ڕاست بۆوە، یەك دوو جار لە سەر پانیەی چەکمەکانی سووڕا و پاشان گوتی:

ـ دە باشە، ئەدی ئەگەر وایە ئەو دڕندە خوێنخۆرە چۆن چۆتە دەوێوە؟

ـ ئەو دەتوانێ گەورەم! دەڵێن ئەو ئەنگوستیلەی خانەقای چلچاوی پێیە هەروەها دەڵێن ودمێکی پێیە لە هەموو نەوعەمارێکی دەپارێزێ، هەر مارێکیش بێتە سەر ڕێی، دەیگرێ، دەستی بە پشتی دادێنێ و ڕامی دەکا. بێجگە لە وەش هەژدیها بە نێوبانگەکەی نێو باتلاغیش دەپەنا خۆی گرتوە و دەیپارێزێ.

یاوەر نەڕاندی:

ـ دەمت داخە و لەپێش چاوم ون بە! بە نایبەکەت بڵێ ئەمن بۆخۆم دێم بۆ ئەوێ. هەتا من دێم، گەمارۆکە ڕابگرن و مەهێڵن ئەو یاغییە دەرچێ! هەموو جووتیێرەکان دەبێ قۆڵ دە قۆڵی یەکتر بکەن و بازنەیەکی چڕ لە دەوری ئاخچەسازی دروست بکەن!

کوڕەکە وەك سەربازان دەستی هەڵێنا، چەستێکی بۆ یاوەری لێدا و گوتی:

ـ تێگەیشتم قوربان!

پاشان سواری ئەسپەکەی بۆوە و بە ویرغە راست بە نێو بازاڕی دا دوور کەوتەوە. وا دیار بوو دەیەویست خەڵك ئەسپە شۆخەکەی ببینن.

خەلیل بەگی گەورە لە حاڵێك دا چاوی لە سوارەکەی بڕیبوو، گوتی:

ـ ئەو لاوە کوڕی تالیب بەگی‌یە، کە بە "پڵینگی ئاناوارزای" بە نێوبانگ بوو. ئەو ئەو کوڕەی زۆر خوشدەویست.

زولفۆ ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:

ـ داخی گرانم ئەو پڵینگە نەماوە، دەنا کارێکی بەو حەمەدۆکەی دەکرد با بە دەواری شڕی نەکردبا.

قازی گوتی:

ـ دەی پڵینگی ئاناوارزای نەماوە، خو شوکور یاوەرمان هەیە! یاوەرمان دەزانێ چۆن مشووری ئەو دڕندەیەی بخوا.

پاشان چوو دەستی دە دەستی یاوەری نا:

ـ خودا یارت بێ یاوەری من، ئەو سەرکەوتنە دەبێ لە مێژوی کۆمارەکەمان دا تۆمار بکرێ! ئێوە دەبێ ئێمە لە دەستی ئەو دێوەزمەی ڕزگار بکەن و دیارە ناوی ئێوە بە ئاوی زێڕ دەنووسرێ و بۆ هەتاهەتایە لە لاپەڕەی مێژووی نیشتمانەکەمان دا دەمێنێتەوە!

پاشان هەموو هەستان، بە ڕیز ڕاوەستان و هەرکام بە نۆرەی خۆی چوونە پێش و داوای سەرکەوتنیان بۆ یاوەری کرد:

ـ ژاندەرمەی تورك هەر سەر دەکەوێ و قەت ناشکێ!

ـ یاوەری خۆم، دەزانم سەری حەمەدی لە باتلاغی بێ‌بن ڕۆدەکەی!

ـ زۆری پێ‌ناچێ لە سەر ئەو عەرزە پیرۆزەی ئێمە گۆڕی ئەو دڕندەیەی هەڵدەقەنین!

ـ خودا قەوەتت بدا و شمشیرت تیژ بێ!

ـ ئیشاڵلا قەت سایەت لە سەر ڕۆڵەکانی ئەم کۆمارە کەم نەبێ!

ـ ئاخر بڵێم چی؟! پیاوێکی وەك تۆ بکەوێتە بەرامبەر حەمەدۆکی گەورە جاسووسی سامناکی ئینگلیسی‌یان! هەر هیچ نەڵێم، باشترە!

نیو سەعات دواتر یاوەر بۆ ڕۆیشتن ئامادە بوو. ئەو جار سوار بوو و لە حاڵێك دا گورهانێك ژاندەرمەی کۆك و پۆشتەی چەکداری بە دووەوە بوو، بە مەیدانی شاری دا تێ‌پەڕی و بەرەو ئاناوارزا چوو...

سێ ڕۆژی تەواو شار بێدەنگ بوو. تەنانەت مورتەزاغاش وستەی لێبڕابوو. عەریزەنووسەکان هیچیان نەبوو بینووسن. هیچکەس تێلگرافی بۆ ئەنکەرەی نەدەنارد. شار بە تەواوی چاوەڕوان بوو. ئێوارەی ڕۆژی سێهەم کوڕی هەرەچکۆلەی پڵینگی ناناوارزای، بە سواری ئەسپە ڕەسەنەکەی بە پڕتاو بە مەیدانی شاری دا هات، لە بەر دەرگای مەحکەمەی لە ئەسپەکەی دابەزی و بە ڕاکردن چوو بۆ لای حاکمی شاری.

ـ چ ڕووی داوە کوڕە!

ـ قوربان جا چ ڕووی داوە؟ یاوەر گرتوویەتی! پەتکێکی دەستۆی حەمەدۆکی کردوە و ئەوە دەیهێنێ بۆ ئێرە!

ـ ئەو هەواڵەت لە کێ زانیوە؟

ـ لە کوێخای گێوژاوایە قوربان! ئەو پێیگوتم بێمە خزمەتتان! گوتی سڵاوی من بە خزمەتی جەنابی حاکم بگەیەنە و ئەو هەواڵە خۆشەشی بدەیە!

دوای ئەوە کوڕەکە سوار بۆوە، بە پەلە بە ڕێگای خۆی دا گەڕایەوە و شاری بەجێهێشت.

هیچکام لە ئاغا و گەورەکانی شاری نەیانوێرا بە گەیشتنی ئەو هەواڵە خۆیان خۆشحاڵ نیشان بدەن و هیچیان تێلگرافێکی پیرۆزبایییان بۆ ئەنکەرە یان ئەدەنە نەنارد. مەسەلێك هەیە دەڵێ:"ئەوەی بە دۆکولێوێ زاری سووتابێ، فوو لە دۆش دەکا".

تەنیا مورتەزاغا زاری کردەوە:

ـ هیچکەس حەمەدۆکی بۆ ناگیرێ! ئەو شێری خوایە، شەهێنی محەممەدییە! دەزانن کێ ئەو ئەنگوستیلەیەی داوەتێ، کە هەمیشە دە قامکی دایە؟ دوایین خاتوونی پاك و پیرۆزی خانەقای چلچاوی ئەو دیارییەی پێبەخشیوە! ئەو ئەنگوستیلە وا دەبریسکێتەوە، چاوی لە بەر هەڵنایە. هەرکەس تێیەوە ڕامێنێ، کوێر دەبێ، کە وابوو کێ دەخۆی ڕادەبینێ کە شێری خودای بگرێ؟

عەلییە شەل بە وردی ئاگای لە هەڵوێستی تازەی مورتەزاغای هەبوو. بیری بۆ ئەوە دەچوو کە لە وانەیە ئەو ئاغایە هەر بەو زووانە هەوڵ بدا لە گەڵ وی ئاشت بێتەوە.

حەمەدۆك دەچێتە نێو کەرتەشیجاڕی چڕوپڕەوە، دەسبەجێ ماری ڕەشی گەورە گەورەی لێ پەیدا دەبن و ئامبازی دەبن، بەڵام حەمەد ناترسێ، دەڵیی مێشێکیشی لێ میوان نیە. هەڵدەکێشێتە دەمانچەی و بە یەکەم گوللە مارێکی لە نێوەڕاست دا دوولەت دەکا، پاشان یەکی دیکە و دیسان یەکی دی. ئەوجار ئیدی مارەکان تێدەگەن کە دەرووەستی نایەن و لێیدەگەڕێن بۆخۆی لە وێ دا بمێنێتەوە. نە یاوەر، نە ژاندەرمەکان و نە دێهاتییەکان، هیچیان

ناوێرن تخوونی وێ بن. وەختە لە ترسی مارەکان زەندەقیان بچێ. حەمەد بە تەنێ دەنێو کەرتەشیجارەکەی دا ماوەتەوە. ژاندەرمە و دێهاتی‌یەکانیش ڕەوەزەکانی ئاناوارزای و دوراندەوری باتلاغەکەی ئاخچەسازیان گرتوە.

ـ شای مارەکان، یانی هەژدیها گەورەکە لە شوێنی تایبەتی خۆی هاتۆتە دەرێ و حەمەدۆکی بەخێر هێناوە. ئەو حەمەدۆکی سواری شاخەزێڕینەکەی خۆی کردوە!

ـ یاوەر فاڕوق بڕیاری خۆی داوە. گوتوویە ئیللان و بیللان دەبێ حەمەدۆك دەرنەچێ. بەزیندوویی یان بە مردوویی، دەبێ هەر بی‌گرم!

ـ یاوەر حەمەدی لە شاخی هەژدیهاکەی ڕا دەکێشێتە خوارێ، هەرچەند شاخی هەژدیهاکای لە زێڕ و ئەڵماسە!

ـ بریا شوێنی ئەو هەژدیهایەشی وێران کردبا!

ـ ئەگەر پێویست بێ، یاوەر ئاگر لە هەموو باتلاغەکەی بەردەدا. دار، مار ، ئاخچەساز و هەموو باڵندانیش بە یەکەوە دەسووتێنێ و هەرچۆنێك بێ، حەمەدی دەگرێ.

ـ زۆر زەحمەتە یاوەر حەمەدۆکی بۆ بگیرێ!

ـ ئەوە دەڵێن چی؟ حەمەدۆك ئەنگوستیلەیەکی پێیە، کە لە چاولێکنانێك دا هەزار پریشکە ئاوران بە دەوری خۆی دا دەپرژێنێ و هەرچی لە دەورەی بێ، کوێری دەکا! هیچکەس ناتوانێ لە حەمەدی نێزیك بێتەوە!

حەشیمەتێکی لە ئەژمارنەهاتوو لە هەموو لایەکی ڕا داوەرینە دەورویەری ئاخچەسازی. خەڵك کە دەیانەویست تێکەڵی ڕووداوەکە بن، خێوەتیان قوت کردبوونەوە، ڕەشماڵیان هەڵدابوون و کەپریان دروست کردبوون. ئاگرەکان تابەیانی داییسان، قەسابی دەکرا و مەڕ، بزن و گوێلك دەکوژرانەوە. بازاڕێکی لێ دروست ببوو، هەر مەپرسە! فرۆشیارە گەڕۆکەکان سوودێکی زۆریان لە فرۆشتنی نان، پەنیر، هێلکەی کوڵاو، ماست، شیر، هەنگوین، ساوار و شتی وا وەگیر کەوت. خەڵك بە تاژی و توڵە و سەگی جۆراوجۆری دیکەوە وەسەر گەڕابوون و پنچك بە پنچك، دار بە دار و بەرد بە بەردی ئەو نێوەیان دەپشکنی. هیچ کون و کەلێنێکیان وەپاش خۆ نەدەدا.

ئاخرەکەی وای لێهات هیچکەس پێی‌وانەبوو حەمەد بدۆزرێتەوە. دەیانگوت ئەوە ئیدی بێجگە لە موعجیزە شتێکی دیکی نیە! خۆ عەرز قووتی نەداوە، خۆ نەبۆتە مار خوشیبێ، یان نەبۆتە باڵندە فڕیبێ! ئەدی باشە چی لێ‌هاتوە؟ مرۆڤ سەری لەو داستانە سوڕ دەما. بە ڕاستی خودا نەبێ کەس بەو نەهێنی‌یەی نەدەزانی.

داخوا حەمەد دەنێو کەرتەشیجارەکە و مارەکان دا مابوو؟ ژاندەرمە و جووتێرەکان لەمێژ بوو لە دەوری باتلاغ و دڕووەڵانی چڕوپڕ دا، کە لە ڕەنگێکی زێوی دا دەترووسکایەوە، مابوونەوە. هەرچییەکییان دەکرد، نەیاندەوێرا بچنە نێوی. سەرەنجام دوای ماوەیەکی زۆر چاوەڕوانی، یاوەر ئەسپەکەی بە زۆر وەنێو دڕووەکان خست. دەستی بە دەمانچەی ڕووتەوە هەڵێنا و گوڕاندی: بۆ پێشەوە! دڕوو تا تەنگەی ئەسپەکەی دەهاتن، بەڵام چونکە چەکمەی دە پیێدابوون، کاریان لیێنەدەکرد. لە پێش دا ژاندەرمەکان و دواتریش جووتێرەکان بە دوای یاوەری دا چوون... مارکوشتن تا ئێواریێ بەردەوام بوو، هەتا ئەو وەختی، سەد مار، یان بەڵکوو هەزار ماریشیان کوشت، بەڵام مارەکان کۆتاییییان نەدەهات و پەنا پنجە کەرتەشییان هەر پڕ بوون. هەر دەخوشین و ون دەبوون. دەتگوت باڵیان هەن.

هەتا ڕۆژاوایە یاوەر و پیاوەکانی هەموو شوێنێکی گەڕان. نێو دار، پنچك و گابەرد نەما نەیپشکنن. ئێواریێ کە گەڕانەوە، شەکەت و ماندوو بوون و هەموو لاق و پەلیان بە پەلان دارووشابوو و خوێنیان لیێدەچۆڕایەوە.

بەیانیی ڕۆژی دواتر، یاوەر بڕیاری دا گەمارۆکەی هەڵگریێ و بۆخۆی نیوەشەویێ بەرەوشار بۆوە. دەستەیەك ژاندەرمە بە فەرماندەرایەتیی وەکیل باشی لەویێ مانەوە، کە دەستووریان پیێدرابوو ماڵ بە ماڵی گوندەکانی ناوچەکە بە دوای حەمەدی دا بپشکنن. پیێیان گوترابوو بۆیان نیە چاوپۆشی لە بچووکترین نیشانە بکەن، کە تەنانەت سووکە سۆراغێکی حەمەدیشی پیێبکریێ. بە خەیاڵ دا نەدەهات کە ئەو خوێنخۆرە ئەو نێوەی بەجیێهێشتبیێ و درەنگ یان زوو هەر دەبوو لە شوێنێکی وەدەرکەویێ.

# (٤)

جیٚخەوی سەر لکەکانی داربی‌یەکەی بەو تەختەخەوەیەوە کە بە گیای دروست کرابوو، زۆر نەرم و خۆش بوو. حەمەد دەسبەجیٚ خەوی لیٚکەوت، بەڵام زووش وەخەبەر هاتەوە. دڵەخورپەی هەبوو. شەماڵەکەی خستبوو و هەورێکی چڕ ئاسمانی پڕ کردبوو. تاریکی‌یەکی وا خەست باتڵاغی دەخۆیەوە گرتبوو، کە گوللەشی تیٚنەدەچوو.. ئێستا موسلیمیش وەخەبەر هاتبوو.

ــ هەستە با بڕۆین موسلیم!

ــ بۆ کویٚ؟

ــ دەبیٚ ئێرە بەجیٚبێڵین، دڵم خەبەر دەدا کە ئێمە گەمارۆ دراوین.

ــ چۆن؟

ــ بە تەواوی دڵنیام کە دەورەیان داوین. گویٚ بگرە بزانە چت پیٚدەڵێم... دەنگێکی زۆر کز لە دوورەوە نابیسی؟

ــ ئەمن هیچ نابیسم.

ــ ڕاستە، چونکە گوێی تۆ ئەو گوێیە نیە کە چەتەیەك دەبیٚ هەی‌بیٚ.

ــ باشە گوێی چەتان چۆنە؟

ــ وەك گوێی منە. ئەگەر گەلایەك چوار ڕۆژەڕیٚ ئەولاتر بەربێتەوە، چەتە گوێی لیٚدەبیٚ. ئێستا هەستە. دەبیٚ هەرچی زووتر بڕۆین. گوتم ئێمە گەمارۆ دراوین.

ــ دەی ئەگەر گەمارۆ درابین، چۆن لیٚی دەرچین؟

ــ بە نێو کەرتەشی‌یان، بە بەستێنی چۆمەکەی و بە پەنا ئەو شوێنەی دا کە ماری زۆرە. کەس فکری ئەو ڕێیەی ناکا و هیچیشیان تخوونی ویٚ نابن. ئەوان زۆر دەترسن. هەستە زوو بە!

ـ بەڵام کاحەمەد بەو تاریکەشەوەی ماران قووتمان دەدەن! ماری نیوەشەوێ لە ئی هەموو وەختێکی بێڕەزاترە، وەڵڵاهی لەتوپەتمان دەکەن...

ـ ئەتۆ نەتگوت مارەکان هەموو دەتناسن، چونکە شیرت داونێ؟

ـ جا بەو تاریکەی کوا دەمناسنەوە.

ـ ئەدی مارە گەورە حەوت سەرەکە، پاشای مارەکان، ئەوەی وەك برایەك خۆشی دەویستی، ئەوەی دەتوانێ سواری شاخی خۆیت کا و بتباتە شوێنەکەی خۆی؟

ـ گاڵتەم پێمەکە کاحەمەد...

ـ بەسە ئیدی، یاڵڵا هەستە با برۆین!

ـ بەڵام کاحەمەد، هەر کەمێکم گوێ بدەیە، پێموانیە ئەوان گەمارۆیان دابین. لانی کەم ڕاوەستە با کەمێکی ڕووناك کا!

ـ ئەو وەختی دەمانبینن. ئێستا برۆین دەتوانین خۆمان دەرباز کەین!

ـ پیاوی چابە ئێستا با نەڕۆین کاحەمەد! لای نیوەشەوێ مارەکان لە هەموو دەمێکی دیکە دڕترن. ئەو کاتە هێندە تووڕەن یەکتری دەخۆن! بێجگە لەوەش وەختی لێکهاڵان و جووتبوونیشیانە. سوور سوور دەبن، وەك پۆلووی سووریان لێدی و وەك داری ڕاست لە سەر کلکێ ڕادەوەستن. ئەدی هەر پیاوی ببینن، وەك گوللەی تفەنگێ خۆی پێدادەدەن و لەتی دەکەن!

ـ ئەوە ئەو کاتەیە کە دارهەنار گوڵێ دەکەن. ئەو وەختی مار جووت دەبن.

ـ دەی خۆ دارهەنار گوڵیان کردوە. دارهەنارەکانی چوکووراوایە زوو گوڵێ دەکەن.

ـ وا نیە! لە جۆزەردانێ دا گوڵ دەکەن و جارێ زۆری بۆ ئەو کاتە ماوە. هەستە درەنگە.

حەمەد خۆی لە سەر دارەکەی ڕا فڕێ دا خوارێ و موسلیمیش قۆڵی دە لکێکی وەرێنا و شۆڕبۆوە عەرزی. لەو حاڵەی دا دەستی کرد بە دوعاخوێندنێ.

حەمەد بە سرتە، بە شێوەیەك کە قسەکانی بە ئاستەم دەبیسران بە موسلیمی گوت:

ـ هیچ ڕێگایەکی دیکەمان نیە موسلیم! ئەمن سوور دەزانم کە هەم دەوری ئەو باتلاغەی و هەم سەری ئاناوارزاش پڕن لە خەڵك. هەموو دێهاتییەکانی ئاناوارزای، بە گەورە و چکۆڵەوە، بە ئەسپ و سەگەوە لێرەن. ئەگەر هەر ئێستا بە تاریکی لێرە وەدەرنەکەوین، ڕووناکی کا، کونەمشکێکیشمان وەگیر ناکەوێ خۆی تێدا بشارینەوە. دێهاتییەکان، وەبەر ژاندەرمامان ناهێڵن، هەر بۆخۆیان دەمانگرن، پارچە پارچەمان دەکەن! کەوابوو با پەلەی بکەین!

هەردووکیان خێرا چوونەوە نێو دڕوەڵانەکەی. موسلیم گوتی:

ـ هێندێك لە سەرەخۆ بە کاحەمەد! ڕاوەستە با ئەمن لە پێش دا بڕۆم، مارەکان ئەمن دەناسن. پێم‌گوتی شێرم زۆر داونێ. پێم‌وایە چاکەی منیان دەچاوی دا ماوە و کارمان لێ دژوار ناکەن!

موسلیم وەپێش کەوت. هێندە خێرا دەڕۆیی، حەمەد بە زەحمەت دەیگەیشتێ. دڕووەکان وە لاقولەتەر و دەموچاوی دەکەوتن، بەڵام ئەو شل نەدەبۆوە و جاربەجار خێراتر دەڕۆیی. سەیر ئەوە بوو نەی‌دەهێشت دڕووە کەرتەشی‌یەکان خشەشیان بێ. وەك ماری، بێ چرپە، دەخزی.

لە لای ڕاستە، ئەو شوێنەی ڕەوەزەکانی ئاناوارزای دەبڕانەوە و ئاوی جەیهانی دەڕژا سەر تەختەبەردان، هێندێك کۆناگر دیار بوون و دەنگیش دەهات. هەردووکیان ڕاوەستان.

حەمەد بە سرتە گوتی:

ـ ئەم‌گوت؟ خەڵکی دەشتێ هەموو هاتوونە ئێرە و لە گەڵ تاوهەڵاتێ وەخۆ دەکەون و بە دوای حەمەدۆکی دا دەگەڕێن!

موسلیم بە سەرسوڕمان و تووڕەیی‌یەوە وەڵامی دایەوە:

ـ باشە خۆ ئێمە چمان لەوان نەکردوە!

ـ ڕاستە ئێمە چ زیانێکمان بە وان نەگەیاندوە، بەڵام ئەوان کەیفیان بەوە دێ حەمەدی بگرن و لەتوپەتی بکەن. پێیان خۆشە ئەوەی بکەن و دواتر وەك داستان بی‌گێڕنەوە.

موسلیم گوتی:

ـ چاو، ئەوە ئەستێرەی ڕۆژێیە. دیتووتە؟

حەمەد وەڵامی دایەوە:

ـ بۆ خاتری خودای، کوڕە موسلیم ڕۆژ بێتەوە تێ‌دا دەچین!

ـ لێرەڕا ئیدی ئەوان ناتوانن بێن. ئەوان زۆر لە مارەکان دەترسن. ئێمەش هەرئەوەندە لەو بستووەی لە پێشمان دایە، بچینە خوارێ، چی‌وامان بۆ قەراغ جەیهانی نامێنێ.

حەمەد پرسی:

ـ بڵێی پێش تاوهەڵاتێ بگەینە ئەوێ؟

ـ بەڵێ، دەگەینێ...

ـ دەزانی تا ئێستا تووشی ماران نەبووین؟

ـ ئاخر ئەوان بە شەو دەنوون، بە تایبەت شەوانی بەهارێ کە فێنکن، ئەو بەستەزمانانە پاپۆکەی دەخۆنەوە و لە پەنا پنجەکەرتەشی‌یان بۆی دەخەون.

ـ ئەدی بۆ دەت‌گوت شەوانە سوور هەڵدەگەڕێن؟

ـ ئەی... چونکە لێیان دەترسم!
ـ ئێستا دەترسی؟
ـ نەیچۆن!
ـ برێك خێراتر برۆ، بەڵام خشەت نەیە...
موسلیم وەڕێکەوتەوە، ئەوەندە بە پارێزەوە دەڕۆیی کە چرپەی پێی بە هیچ شێوەیەك نەدەبیسرا. حەمەد پێیسەیر بوو کە چۆن ئەو دەتوانێ ئاوا خێرا و بێدەنگ بڕوا! دەیەویست بۆخۆشی وا بکا. گەیشتنە جێگایەکی ڕووتەن، کە پڕ بوو لە بەردی گەورە گەورە.
موسلیم لەسەرەخۆ گوتی:
ـ ئێرە پڕە لە مار، ئەوی هەرە بێڕەزایان لێرەن. پێیان دەڵێن "تیژەمار"، سێ باڵی تەواو درێژن، بەڵام هێندە باریکن، هەر بەقەد ئەو قامکە چکۆلەی من دەبن. هەرکەسیان لێ‌نێزیك بێتەوە، خۆی داوێنێ و پێوەی دەدەن. بە گامێشییەوە دەن، سەقەتی دەکەن. پێش ئەوەی کابرا بپەرژێتە سەر ئەوەی خۆی لابدا و بەرگری لە خۆی بکا، پێوەی دەدەن. تیژە مار وەك زێڕی دەترووسکێتەوە و کاتێك باز دەدا، ترووسکەی لەشی هەتا ڕۆژێ دەڕوا.
ـ باشە ئێستا، ئەو دەمانە، ئەوان چ دەکەن؟
ـ ئێستا ئەوانیش نوستوون، بەڵام تیژەمار وەختێك دەخەوێ، وەك ماری دیکە پاپۆکەی ناخواتەوە، بە درێژەوە دەکەوێ، وەك وەکازێکی زێڕ دەچێ کە لەوێ فڕێدرابێ. لەوانەیە ئەتۆ هەروا بڕۆی و لە نەکاو وەکازێکی زێڕت لە بەر دەمی خۆت چاو پێبکەوێ، بەڵام کاتێك بۆی دادێییەوە، قەپت بە دەستی دا دەگرێ، پێتەوە دەدا و دەتکوژێ. شوکور بۆ خودای ئەوان خەویان قورسە و تەنانەت ئەگەر پیاو پێشیان لە کلکی بنێ، وەخەبەر نایەن!
موسلیم کاتێك ئەو قسانەی بۆ حەمەدی دەکرد، هێندێك شل ببۆوە و سەبرتر دەڕۆیی. ڕاست ئەو کاتەی ئەو باوی هەنگاوەکانی خێراتر کردەوە، دەنگی تەقەی تفەنگان کە تاق تاق لە چەند جێگای جۆراوجۆرەوە هات، دەنگی دایەوە. لە پڕ موسلیم هاواری لێ‌بڵیند بوو:
ـ ئاخ، بمگەنێ! ئای ئای...
حەمەد دیتی کە موسلیم لە پێش دا هەڵبەزییەوە، پاشان نوشتایەوە و دانیشت، دەنگی فڕکەیەکیشی گوێ‌لێبوو. حەمەد بە پەلە خۆی گەیاندێ. پێش ئەوەی حەمەد یارمەتیی بکا، موسلیم هەستایەوە سەر پێ.
ـ ئەوە چ بوو موسلیم؟

ـ مارێك... مارێكی گەورە... ڕەشمارێك، باوەڕ کە سەد باڵ دەبوو! سەیر خۆی بە لاقی دادام! پێموانیە ئیدی بتوانم بڕۆم. لاقم سڕ بووە!

ـ بزانە دەتوانی بڕۆی؟

ـ نازانم، زۆر دێشێ!

ـ ڕاوەستە، لە پشتێت دەکەم!

ـ نا کاحەمەد! ڕانم ژانێ دەکا، بەڵام دەتوانم پێیبڕۆم.

موسلیم هەستا و دەستی بە ڕۆیشتنێ کردەوە، جاربەجار ڕادەوەستا. حەمەد گوتی:

ـ ئەوە چی‌یە موسلیم؟ ژانێ دەکا؟

ـ هێندێك سەبرتر کاحەمەد، وا دیارە ناتوانم باش لاقم ببزێوم.

ـ باشە بڵێی مارەکە پێوەی نەدابی؟

ـ نا، ئەگەر پێوەی دابام، ئێستا مردبووم، بەڵام زۆر توندی خۆ پێدادام. هیوادارم یەسکی لاقمی نەشکاندبێ!

موسلیم دەستی بە شانی حەمەدی گرت و خۆی قیت کردەوە:

ـ ڕێبوار هەتا دانیشێ، ڕێگای دوور دەکەوێتەوە، با بڕۆین! پێش ئەوەی ڕووناك بێ، لێرە وەدەر نەکەوین، دەگیرێین، قسەی تۆیە...

پاشان قامکی بۆ کۆناگرەکان راداشت، کە لە دوورەوە دیار بوون و گوتی:

ـ هەر دەڵێی تەواوی خەڵکی چوکووڕاوایە بە سەگ و ئەسپانیانەوە هاتوونە ئێرە. جا ئەو کاتەی بۆشیان دەردەکەوێ کە ئێمە لە باتلاقی ئاخچەسازی دا نەماوین...

ـ ئەو کاتی هەر هەڵاتوویەك، یان قاچاغێکی دیکەیان وەدەست کەوێ، تۆڵەی ئێمەش لەوان دەکەنەوە.

ـ ڕاست دەکەی، هەمیشە کەسێك هەر هەیە کە لەوێ خۆی شاردبێتەوە.

دیسان موسلیم هەنگاوەکانی توند کردن و خێراتر ڕۆیی. حەمەدیش هەوڵی دەدا بەجێ نەمێنێ، بە تایبەت کاتێك موسلیم خوارویێچەی دەکرد، نەیدەگەیشتێ. بە هەناسەبڕکێوە گوتی:

ـ موسلیم ناتگەمێ، برێك سەبرتر!

ـ پەلەی بکە کاحەمەد، ژانی لاقم زۆرە، وا هەست دەکەم سەردڵێشمی پێوە دێشێ.

لە دەوروبەر تەقە هەر دەهات و بەو تاریکوڕوونەی بەیانی، لە نێو ڕەوەزە بەردەکانی ئاناوارزای دا زیاتر دەنگی دەدایەوە.

ـ موسليم، دەڵێی خەریکین ڕاست دەچینە نێویان!

ـ نا نا ، هیچ کەسمان لە پێش نیە!

ـ چۆن دەزانی موسلیم؟

ـ چونکە پێش ئێمە ماری زۆر لێیە، کاحەمەد. هەژدیهاکەش لە دەوروبەری ڕەوەزەکەی قەراغ چۆمی دەبێ. هەموو کەس دیویەتی. بیست شاخی هەن، شاخەکانی سوور سوورن، ئاوریشی لە زاری دێتە دەر. خەڵکی ئەو دەوروبەرەی ناوێرن ڕوو دێرە کەن.

لە باشووری ڕۆژهەڵاتەوە، لە سەر گاورکۆی،ڕووناکایی‌یەکی کز وە دیار کەوت. لەو کاتە دا ئەوان گەیشتنە سەر بەستێنی چۆمی جەیهانی. موسلیم لە نێوەڕاستی لێژایی‌یە خڕێ درێژ بوو و دەستی بە ناڵەناڵێ کرد.

حەمەد لێی پرسی:

ـ چی‌یە موسلیم، زۆر ژانێ دەکا؟

ـ هیچ نیە دەی، بەڵام دەبێ هێندێك بحەسێمەوە. هەردێ و ژانەکە زۆرتر دەبێ. ئای خوایە... مارێکی سەیر گەورە بوو! قسەی تێدا نیە دە باڵ دەبوو!

حەمەد چاوێکی بە دەوروبەر دا گێڕا. تاوێك بوو سیوادی هەڵدابوو و سەری گاورکۆی تەواوێك ڕووناك ببوو. چووە بن باڵی موسلیمی، هەڵی‌ئەستاندە سەر پێ و گوتی:

ـ هەستە موسلیم، ئێمە بە نێو ماران دا تا ئێرە هاتووین، لێرە نابێ بوەستین. هەستە خۆمان دەگەیەنینە ئەو گوندانەی ئەو سەرەی!

حەمەد ئەوجار دەستی لە بن باڵی موسلیمی دەرکێشا و بە سەر خیزەڵێنی دەم ڕووبارەکەی دا ڕای کرد.

موسلیم بانگی کرد:

ـ وا نابێ! پێویست ناکا وا بە پەلە ڕا بکەی. دێیەك هەیە لێرە زۆر نێزیکە. وەرە بەسەر خیزەکەی دا مەڕۆ. وەدووی من کەوە با بە قەراغ خڕێ دا بڕۆین!

کاتێك ڕۆژ بۆوە، ئاوی چۆمەکەی وەك ئاوێنەی ڕوون بوو، دەتگوت ڕووبارەکەش تازە وەخەبەر هاتوە و ڕووناکایی تێی‌دا ڕەنگ دەداتەوە.

ـ دیتووتە، ئەوە دێیەکەیە!

موسلیم دانیشتە عەرزی و ناڵاندی.

ـ چی‌یە؟ دەڵێی وەزعت باش نیە موسلیم؟

موسلیم ددانەکانی دەچیڕەوە بردن و گوتی:

ـ ناوەڵڵا، هیچ باش نیم!

ـ جا ئەگەر وا بێ، ئەتۆ لێرە بە و ئەمن لە پێش دا دەچم نێو دێیەکەی بەتاقیدەکەمەوە!

ـ نا، نابێ، دەبێ ئەمن لە پێش دا بچم! تفەنگ و ڕەختەکەم لە لای تۆ بەجێدێڵم. ئەوەندەی سێ سیغاران دەکێشی لە سەرم ڕاوەستە، ئەگەر نەهاتمەوە، بۆخۆت چۆنت پێخۆشە، وا بکە!

موسلیم تفەنگەکەی لە بەردەستی حەمەدی لە عەرزی دانا، فیشەکدانەکەشی لە خۆی کردەوە و لە سەر تفەنگەکەی دانا و پاشان بە شەلەشەل بەرەو نێو گوندەکە وەڕێکەوت.

کاتێك ئەو گەڕایەوە، ڕۆژهەڵاتبوو و وڵات گەرم داهاتبوو. چۆم و بەستێنە خیزەڵانەکەی، هەردووکیان، لە بەر تیشکی ڕۆژێ دا دەدرەوشانەوە. موسلیم ئەوجار زیاتر دەشەلی. لەتاو ئێشی لاقی هەر بۆڵەی دەهات و دەیناڵاند.

ـ دێ کەسی تێدا نیە! مێشێکیشی تێدا هەڵنافڕێ. هەمووی سەروبن گەڕام، مریشك و پەڕەسێلکە نەبێ، چی دیکەم نەدی. با، مارێکی زەردیشم دی!

ـ دەبا کوشتبات!

ـ کەس ماری بێزەڕ ناکوژێ، گوناهە!

حەمەد سەربەرگەکەی لە سەر شانان ڕاست کرد و گوتی:

ـ دەی باشە، بابڕۆینە نێو دێی! چاو لە خۆمان کە موسلیم! جلەکانمان هەموو دڕاون و هەموو گیانمان بە خوێنە. دیتووتە دڕووان چی‌یان لێکردووین؟

لە دۆڵێ هاتنە دەرێ. ماڵەکانی دێیەکەی لە جەگەن، پووش و قامیشی دروست کرابوون و ئەو دێیە وەك دەعبایەکی سەیر، کە مردبێ و بێهەست لەوێ کەوتبێ، دەهاتە بەرچاو.

حەمەد گوتی:

ـ با دوور نەڕۆین، دەچینە ئەو ماڵەی پێشەوە!

موسلیم زەردەیەکی هاتێ و لە حاڵێك دا لە بەر ئێشی لاقەکەی ددانی ڕێكدەکوشین، گوتی:

ـ زۆر باشە کاحەمەد، با ڕوو دێرە کەین، بزانین خودا چمان بە سەر دێنێ!

هاتنە نێو حەوشی ماڵەکەیەوە. دیواری خانووەکە بۆرییە بوو، کە لە جەگەنی چنرابوو و سەریشی بە قامیشی داپۆشرابوو. کاتێك ئەوان نێزیك بوونەوە، ژنێکی پیر بە پێریانەوە هات. ژنەکە کەڵەگەت بوو و دەمووچاوی باریك، چەنەی درێژووکە و چاوی لە چەشنی بادامی بوو. دەسماڵێکی سپیی لە سەر بوو و جووتێك کەوشی مەڕاشیی قایشی دەپێدا بوو. ژنێکی کزەڵە بوو، زۆریش میوانگر و ڕووخۆش بوو و لە حاڵێك دا بزەیەکی لە سەر لێوان بوو گوتی:

ـ مامۆستا گیان بەخێر بێی! ئەو کورە کە دەشەلێ، ئەو بەستەزمانە، حەتمەن فەقێتە؟ ئەوە زگماك شەل بووە، یان تازە شتێکی بەسەر هاتووە؟ بەخێر بێن سەر هەردووك چاومان! پیاومان لە ماڵ نین، بەڵام ماڵ ماڵە خۆتانە، بەخێربێن، فەرموون بچنە ژووری!

کچێکی جوان لەبەر بێلایە ڕاوەستابوو. کچەکە بە پەلە چۆوە ژوورێ. دوو دۆشەکچە و باڵنجی لە ژوورەکەی شوێنی دانیشتنێ دانان و پاشان هات، دەستی حەمەدی ماچ کرد و بە ڕێزێکی زۆرەوە بە نێوچاوانی‌یەوە نا:

ـ یاخوا بەخێر بێی مامۆستا!

ـ ماڵە خۆمانە، بەخێرهاتنی بۆ چی‌یە کچم! ئێمە زۆرتان سوپاس دەکەین!

ژنێکی جحێڵ بە دوو منداڵی چکۆڵەوە، کە کچێك و کوڕێك بوون، هاتە ژوورێ. هەرسێکیان میوانەکانیان بەخێرهێنان.

حەمەد لە سەر دۆشەکچەیەکیان دانیشت و لە حاڵێك دا سەربەرگەکەی لەبەر خۆی دادەکەند، بە بزەیەکەوە گوتی:

ـ دایە گیان، ئەمن مەلا نیم!

ـ ئەها، دەزانم ڕۆڵە، دەزانم میوانی خۆم. وا دیارە ئێوەش لە ڕاوی حەمەدۆکی بوون و ئێستا دەڕۆنەوە بۆ ماڵە خۆتان! وانیە؟! خاوەنی ئەم ماڵەش بە تفەنگێکی ماوزەر و دوو ڕیز فیشەکدانەوە وەدەرکەوتووە و بە دوای حەمەدی‌یەوەیە، بۆیە لە ماڵ نیە. بەڵێ چووە حەمەدۆکی بکوژێ. تەواوی پیاوەکانی ئەم گوندە، لە منداڵی حەوت ساڵەوە تا پیری حەفتا ساڵە چەکیان دەست داوەتێ و چوون حەمەدی بکوژن. تەنانەت هێندێك ژنیش ڕەگەڵیان کەوتوون!

ـ باشە بۆ پێیان خۆشە حەمەدۆکی بکوژن؟

ـ کاکە بەڕاستی نازانم بۆ! دەڵێی ئەو حەمەدۆکە بابی کوشتوون، دەستدرێژیی کردۆتە سەر دایکیان، ماڵی بە سەر دا ڕووخاندوون و دێهاتەکانی ئاگر تێبەرداون! ئەمن نازانم کاکە! هەرچی پیاوە، تەنانەت یەکێکیشیان، لەو دێهاتانە دا نەماوە. هەرکە باس و خواسی حەمەدیان بیست، بۆی وەدەرکەوتن. دەیانگوت لەتوپەتی دەکەین، دەی‌هاڕین! بە خوای هەر ئەوەندەی دەزانم کاکە گیان!

ـ باشە حەمەد چ زیانی بەوان گەیاندوە، یان شتێکی بەسەر هێناون؟ بۆ دەبێ ئەوان هێندە ڕقیان لە حەمەدۆکی بێ؟

ژنەکە لێی چووە پێشێ، ڕوخساری سوور هەڵگەرابوو و ڕەگی ملی هەستابوون، دەنگی هەڵێنا و بە سەری دا قیژاند:

ــ ئەدی ئەتۆ بۆ خۆت؟ ئەتۆ چت لێی دەوێ؟ ئەتۆ چ دوژمنایەتی‌یەکت لە گەڵ حەمەدۆکی هەیە، کە ئەو هەمووە ڕەخت و فیشەکەت لە خۆت بەستوە، خەنجەری چەرکەسیت دەبەر پشتێ ناوە، دووربینت دەملت کردوە، تفەنگی کارابینی ئەڵمانیت بە دەستەوە گرتوە و هاتووی سەری ئاناوارزای و باتلاغی ئاخچەسازی لێ‌دەپشکنێ؟! پێم بڵێ حەمەد چی لە تۆ کردوە، برام؟ ئەو بەستەزمانە شەلەشت وەدوای خۆت داوە و لە حەمەدۆکی دەگەڕێی! چاو لە خۆتان کە چەند شڕ و شپڕێون! ئەوە حاڵە هەتانە؟ خۆ بەو حاڵەیەوە وەك بەشەرانیش ناچن. باشە حەمەدتان گرتبا، چتان لێ‌دەکرد، ها؟ دەتان‌کوشت، بە زیندوویی کەوڵتان دەکرد، پێستەکەیتان بە تاوێ ئیشك دەکردەوە، چاوتان دەردێنا و گۆشتەکەیتان دەبرژاند؟ یان لەوانەیە بیرتان کردبێتەوە بی‌دەنە دەست یاوەر و سەرجووخە عەلی کەرتیشی دڕندەی نائینسان، کە دەڵێی بەرازە چاوی بۆقیت لێ‌ناوە؟ دەی پێم بڵێ بە ڕاستی حەمەدۆك چیی لە ئێوە کردوە کاکی من؟! ژن و خوشکی لێ‌هەڵگرتوون؟! بەڵێ، ئەو عەبدی خانی خوێنمژی ستەمکاری کوشتوە. عەبدی خانێك کە دوژمنی هەموو جووتێرەکانی ئەو دێیانە بوو. نەکا ئەتۆ خزمی وی بی، کە ئاوا خۆت دە چەکی دا ڕەش هەڵگێڕاوە و دەتەوێ تۆڵەی ئەو جینایەتکارەی بستێنی‌یەوە! باشە ئەگەر عەبدی خان کوژرا، هەر جووتێرەکانی چیای تووڕووس نەبوون کە جێژنیان گرت و ئاگری گەورەیان کردنەوە، بۆ ئەوەی خۆشحاڵیی خۆیان لە نەمانی ئەو ستەمکارەی نیشان بدەن؟! باشە جووتێرەکانی وایوای نەبوون، کە لە سەر ماڵ و مەزرای خۆیان دەرکرابوون و لە سایەی سەری حەمەدۆکی‌یەوە، کە عەلی سەفابەگی کوشت، توانیان بگەڕێنەوە سەر جێگاوڕێگای بابو باپیرانی خۆیان؟ ئەو مەحموودئاغای کانی‌یەگوڵانی کوشتوە، کە پیاوکوژێکی خوێنخۆر بوو، جەللادی خەڵکی هەژار بوو و هەزار پیاوی زیاتر کوشتبوو. لەبیرتان نیە دوای کوژرانی ویش جووتێران کردیانە چ شاییلۆغانێك؟! دەتانەوێ تۆڵەی ئەوانە لە حەمەدۆکی بکەنەوە؟!

ــ دایە گیان، تکایە هێندێك ڕاوەستە با بۆت باس بکەم...

ئازای لەشی پیرێژنەکەی وەسەر ئارەقەی گەڕابوو. قیژاندی:

ــ نا، بێ‌دەنگ نابم! سەیرێکی خۆت بکە، بەو هەموو ڕەخت و فیشەکەوە! ئەوەندەشت بەو کوڕە بەستەزمانەیەوە هەڵاوەسیوە و وەدوای خۆت داوە. باشە ئەو کوڕە چ تاوانێکی هەیە؟ بە ڕاستی حەمەدۆك چ زیانێکی بە ئێوە گەیاندوە؟

ژنەکە جاربەجار دەنگی زیاتر هەڵدێنا و حەمەدۆکیش هەر تیٚیەوە ڕامابوو و پیٚدەکەنی.

ـ دایە گیان، حەمەدۆك چ خراپەیەکی لە گەڵ من نەکردوە و...

ژنەکە بە تووڕەیی‌یەوە گوتی:

ـ بۆ پیٚدەکەنی؟ وەڵلاهی میوان نەبای، هەر بۆخۆم دەمزانی چم لیٚدەکردی!

دوای ئەوە ڕۆیشتە دەریٚ و بەڵام زۆری پیٚنەچوو، هاتەوە.

ـ چاو... بڕوانە ئەوە بەو قەدوگیپاڵەیەوە دەڵیٚ حەمەدۆکی دەکوژم! چووە جلکی مەلایانی دەبەر کردوە، پیٚی‌وایە دەتوانیٚ بەو فیٚڵەی حەمەدۆکی فریو بدا، بی‌گریٚ و بی‌داتە دەستی سەرۆکەکەی خۆی و یاوەری بۆرەمالۆس! وەڵلا دیارە زیرەکی! وەڵلا پیاوی ئاوا دەگمەن و گەورەی وەك تۆ دە قوتووش دا وەگیر ناکەویٚ و قسەی تیٚدانیە مستەفا کەمالی گەورەش میدالی بەندسووری دەملی دەکا!

ـ دایە گیان، سەرجۆخە عەلی کەرتیش سەرۆك و ئاغای من نیە!..

ـ عەلی کەرتیش، ئەو جەللادە، ئەو گزیرە خویٚنمژە خویٚڕیە پاشای تۆیە! پاشای کوڕەکەی خۆشمە! دە ڕەبی ئەگەر حەمەدۆك شتیٚکی لیٚبیٚ، کوڕەکەم ئەوماڵەی بەسەر دا ویٚران بیٚ! دیارە دەزانم حەمەدۆك چی بە سەرنایە و ئەوانە زەفەری پیٚنابەن، بەڵام هەرچۆنیٚك بیٚ ئەگەر شتیٚکی بە سەر حەمەدی بیٚنن، بەڵیٚن بیٚ نەهیٚڵم کوڕەکەم پیٚی دەوماڵەی بنیٚتەوە! هەر بە ژن و ماڵەوە بە لەعنەتی دەکەم و وەدەریدەنیٚم! قەرار بیٚ وای لیٚبکەم! ئەمن زیٚنەبەڕەشم پیٚدەڵیٚن. ئەگەر بیٚلم لاقی دەوماڵەی بنیٚتەوە، بەڵیٚن بیٚ پرچەکانم لە بن ڕا خشت بە مقەستی ببڕم و دە کلکی کەریٚیان خەم!

زیٚنەب ئەو جار هەستا و بە بیٚزاری و تووڕەیی‌یەوە دریٚژەی بە قسەکانی دا:

ـ لەم گوندە هەر پیاویٚك خۆی پیٚتازا بووە و نی ئەو دیٚیانەی سەرەوەش هەر پیاویٚك دەخۆی ڕادیبیٚ، هاتوونە خواریٚ، وەدوای گورهانیٚك ژاندەرمە کەوتوون. ئەوە چی‌یە حەمەدۆکی دەگرین! جا ئەوە ئازایەتی‌یە؟! وەڵلاهی دابڕزن باشترە!

لەپڕ تووڕەیی‌یەکەی هیٚندیٚك هیٚور بۆوە، بەڵام لۆمەکردنەکەی نەبڕی‌یەوە:

ـ ڕۆڵە گیان، چۆن دەبیٚ پیٚنجهەزار کەس بە پیٚیان و بە سواری، بە دوای یەك تاقە کەسی‌یەوە بن و ئەو جار منداڵیش ڕەگەڵ خۆیان خەن؟ وەك ئەو بستەمنداڵەی گەڵ تۆ! گرتنی تاقە ڕوحیٚکی بۆ ئەو هەموو خەڵکەی خۆ نابیٚ زەحمەت بیٚ! بەڵام حەمەدۆك نامریٚ! دڵنیا بە ئەوتان بۆ ناکوژریٚ!

پاشان لە سەرەخۆ گوتی:

ــ کورم، حەمەدۆك گاڵتەی لە گەڵ ناکرێ. ئێوە کارێکی باشتان کردوە، کە چی‌دیکە بە دوای حەمەدۆکی دا نەگەڕاون!

زێنەب ئەوجار لە حەمەدی نێزیك بۆوە. چاوەکانی حەمەدی پڕ ببوون لە فرمێسك. ئەو لەوکاتە دا پڕ بەدڵ پێی خۆش بوو خۆی دە بەر پێی ئەو ژنەی باوێ، دەستی دە لاقانی وەرێنێ و بە دەنگی بەرز بگری.

زێنەب گوتی:

ــ ڕۆڵە گیان، ئەتۆ دەبێ بزانی حەمەدۆك پیاوی خودایە! پیاوچاکە، پیاوچاك! هەر کەس پێشی پێ‌بگرێ، یان بیەوێ زیانی پێ‌بگەیەنێ، گۆج و ئیفلیج دەبێ، ماڵی وێران دەبێ، هەرچی هەیەتی، با دەی‌با و کوند لە سەر کەلاوەی ماڵەکەی دەخوێنێ... ئێوە بەختتان هەبووە کە وازتان لە گرتنی وی هێناوە و چیی دیکەی وەدوو نەکەوتوون.

پاشان چووە بن گوێیان و وەك ئەوەی بیەوێ نەهێنی‌یەکی‌یان بۆ ئاشکرا بکا، گوتی:

ــ چاکم گوێ لێ‌بگرن! ئەمن ئەوەم لە کەسێکی باوەڕپێکراو بیستوە. حەمەدۆك گوللەبەند و تیغبەندی هەیە، کەس پێی بریندار ناکرێ. دایە سوڵتانی خانەقای چلچاوی هەم گوللەبەندی داوەتێ و هەم شمشێری خانەقاکەش. شمشێرەکە ئەوەندە قورسە کە هەر حەمەدۆك دەتوانێ هەڵی‌گرێ و کەسی دیکە ئەوەی پێ‌ناکرێ. هەروەها حەمایەڵێکی داوەتێ کە هەزار ئایەتی قورئانێی تێدا نووسراوە! هەر بۆیەش لە هەموو بەلایەکی پارێزراوە... گومانی تێدا نیە ئێستا حەمەدۆك بۆتە باڵندەیەك، یان مارێك، تەنانەت لەوانەیە بووبێتە هەورێك، لەمێژ بێ ئاکچەسازی بەجێ‌هێشتبێ و ئێستا لە سەری چیای دوڵدوڵی بێ! هیچ شتێك زەفەری پێ‌نابا، نا! ئێوە خودا ڕەحمی پێ‌کردوون کە گۆج و ئیفلیج نەبوون و بە سلامەتی گەڕاونەوە! ئیشاڵڵا خودا ڕەحم بە منیش بکا کوڕەکەم بە سلامەتی بگەڕێتەوە!

دوای ئەوەی زێنەب هەرچی دە دڵی دابوو بەتاڵی کرد، هێندێك هێور بۆوە. هێشتاش ڕوخساری سوورهەڵگەڕاوی ئاسایی نەبۆوە و لەشی هەروا شەڵاڵی ئارەق بوو، بەڵام کاتێك چاوی پڕ لە فرمێسکی حەمەدی دی، وردە وردە وەخۆ هاتەوە، لە شێوەی هەڵسوکەوت و قسەکردنی خۆی پەشیمان بۆوە و گوتی:

ــ ڕۆڵەکانم ببوورن! ناڕەحەتم کردن، خودا غەزەبم لێ‌گرێ کە ئاوا لە ئێوە تووڕە بووم. خۆ بەخودای ئەمن وانیم ! نازانم بۆ ئێستا وام کرد! ئاخر ئێوە میوانی منن و میوانیش دیاریی

خودایە. ئەمن شەرمەزاری ئێوەم ڕۆڵەگیان! ئێوە کارێکی زۆر باشتان کرد کە گەڕانەوە و خۆتان لەو خەڵکەی وەدوای حەمەدی کەوتوون، جیا کردەوە. توخوا ببوورن ڕۆڵە!

دوو دڵۆپ فرمێسک لە چاوی حەمەدی جیابوونەوە و بە سەر قۆنداغی تفەنگەکەی دا، کە لە سەر کۆشێی دانابوو، بەربوونەوە. زێنەب کە ئەوەی دی، زۆر ناڕەحەت بوو، لە بەرامبەر حەمەدی چۆکی دادان و دەستی بە پاڕانەوەی کرد. نەی دەزانی چۆن دڵی میوانەکەی چاك کاتەوە:

ــ ڕۆڵە گیان، ئەوە چییە؟ یاڕەبی خودا هەردووك چاوەکانم کوێر کا! یاڕەبی گوللەی گەرمم وێکەوێ و بچمە دەقوڕێ! ئەمن ئەوە چم کرد؟ خۆ پیاو لە گەڵ میوانی خۆی ئاوا ناجووڵێتەوە!

پاشان دەستی لە سەر شانی حەمەدی دانا و گوتی:

ــ تکات لێدەکەم میوان، دەستەکانت ماچ دەکەم، لاقەکانت ماچ دەکەم، ئەتۆ گەورەی! نینۆکێکی تۆ سەروماڵی من دێنێ، بە قوربانت بم، مەگری!

حەمەد گریانی دە ئەوکێ مابوو، هەرچی دەخۆی دەنووسا، دەنگی دەرنەدەهات و وەڵامی پێنەدەدرایەوە. زێنەبیش هەر دە دەوری دەسووڕا و داوای لێبووردنی لێدەکرد. سەرەنجام حەمەد هاتەوە سەرخۆ و گوتی:

ــ دایە گیان، ئەمن دەبێ دەستی تۆ ماچ کەم، ئەمن دەبێ لاقەکانی تۆ ماچ کەم! توخودا ئەو جۆرە مەپاڕێوە و ئەشکەنجەم مەدە! ئەو کەسەی پێی دەڵێن حەمەدۆك، منم...

ــ چی؟! ئەوە دەڵێی چی؟!

موسلیم وەڵامی زێنەبی دایەوە:

ــ ئەو کەسەی خەڵك پێی دەڵێن حەمەدۆك، ئەوەیە! ئەوە کاحەمەدە!

پیرێژنەکە سەری سوڕما، قسەی بۆ نەدەکرا. نوشتایەوە و لە سەر عەرزی دانیشت. یەك دوو دەقیقە هەروا چاوی دە چاوی حەمەدییەوە بڕی و پاشان لەسەرەخۆ گوتی:

ــ سوپاس بۆ خوای! خودایە ئەمن شوکرانەبژێرم کە ئەو ڕۆژەت نیشان دام! شوکر بۆ تۆ خوایە!

ئەوجار هەستا سەر پێیان، لە ژوورەکەی چووە دەرێ، هێندێکی پێچوو و دوایە هاتەوە ژوورێ، دەستی لە سەر شانی حەمەدی دانا و بە پێکەنینەوە گوتی:

ــ بە چی ڕا بزانم کە ئەتۆ بە ڕاستی حەمەدۆکی؟ تێمبگەیەنە میوان! تۆ کە ئاوا کزەڵە و کورتەبالای، چۆن دەکرێ حەمەدۆك بی؟ هاوڕێکەشت بۆنی شیری خاوی لە زاری دێ. دەکرێ بستە منداڵێکی ئاوا هاوکاری حەمەدۆکی بێ. بێجگە لەوەش بابەکەم ئەتۆ وەك ژنان دەگری.

تۆخوا ببووره میوان، دوور نیه ئەتۆ ڕاست بکەی و حەمەدۆك بی، بەڵام ئەمن هەرچی دەکەم ناتوانم دڵنیا بم کە حەمەدۆك ئاوا، وەك تۆ، بێ. ڕۆڵە گیان بۆ خاتری خودای ئەو گرێیەم بۆ بکەوە!

موسلیم ئەو جار بە دەنگێکی بەرزتر گوتی:

ـ دایە گیان، چاو لە دەستی بکە! بزانە نیشانەی خانەقای چلچاوی دە قامکی دا دەناسی‌یەوە؟

زێنەب بە پەلە دەستی حەمەدی گرت، هەڵی‌هێنا و گوتی:

ـ ئەڵبەت دەی‌ناسمەوە!

ئیستێکی باش دە ئەنگوستیلەکەیەوە ڕاما، پاشان بە تاسەوە ماچی کرد و بە نێوچاوانی‌یەوە نا:

ـ بەڵێ ئەوە هەوە! خودایە گیان شوکرانەبژێرم! شوکری تۆ دەکەم کە ئەم بەختەوەری‌یەت بە نسیب کردم. سوپاسی تۆ دەکەم کە حەمەدۆکت هێنا ماڵی من! دە خودایە هەردووك چاوم کوێر کە! چاو! خۆ ئەمن هەر ڕاوەستاوم و زۆربڵێی‌یە دەکەم! کوڕەکان ئەوە لە برسان و لە شەکەتی‌یان دەمرن. ئادەی کچینە وەرن، دەی!

دوو ژنە جحێڵەکان بە پەلە هاتن:

ـ خێرا بن ئاوی شیلەوتێن ساز کەن، با کوڕەکان دەست و دەموچاویان بشۆن، ئەمنیش ئەوە نانی ساز دەکەم!

ژنەکان دەسبەجێ ئەفتاوە و لەگەنیان لە بەردەستی حەمەدی دانا و خاولی‌یەکیشیان هێنا. خاولی‌یەکە تازە شۆرابوو و بۆنی جاترەی لێ‌دەهات. یەکێك لە ژنەکان ئاوی بە دەستی داکرد.

حەمەد دەست و دەموچاوی بە سابوونێ شوت و پاشان گۆرەوی‌یەکانی لە لاقی دەرهێنا. لاقی هەموو بە دڕوان ڕووشابوو و کووزکووز ببوو. کاتێك بەو سابوونە بۆنخۆشەی لە بەردەستی بوو، شوتنی و ئارەقە و خوێنەکەی لێ‌کردنەوە، هەستی بە ئاسوودەیی کرد. پاشان نۆرەی موسلیمی هات. ئەو بە دەم دەموچاو شوتنەوە بیری لە هەڵسوکەوتی حەمەدی دەکردەوە و لە دڵی خۆی دا دەی‌گوت:" بە ڕاستی ئەو حەمەدۆکە زیرەکە، وای لە خۆی کردبوو هەر دەتگوت هەتیوێکی پازدە ساڵەی بێ‌کەسوکارە! لەو کاتە دا سەری وەرسووراند و دە حەمەدی‌یەوە ڕاما!

ـ بۆچی ئاوا تێمەوە ڕاماوی موسلیم؟

ـ بۆ هیچ!

دایە زێنەب هاتەوە. سفرەیەکی هێنا و لە پێشی ڕاخستن. پاشان کولێرەگەنمی گەرمەتەندوور، هەنگوینی سپی، قەیماغ، پەنیر، ماست و ڕۆنی کەرەی تازەشی هێنان و لە سەر سفرەکەی دانان.

ــ کوڕم حەمەدۆك، بمبوورە. جارێ چیی دیکەم بۆ ساز نەبوو!

ــ سوپاس دایە گیان، بەزیاد بێ، جا چ لەوەی باشتر دەبێ، دەستت خۆش بێ!

ئەو جار یەکێك لە ژنەکان کیتەڵەیەك شیری گەرمیشی بۆ هێنان.

دایە زێنەب گوتی:

ــ ئەرێ حەمەد گیان، توخوا سەیران چۆنە؟

ــ دەستت ماچ دەکا دایە گیان. شوکور زۆر باشە!

ــ خودا ئاگاداری بێ، ئەدی ڕۆڵە بۆت ڕەخساوە زەماوەندی لەگەڵ بکەی؟

ــ بەڵێ دایە!

ــ ڕەبی مەبارەکتان بێ و یاخوا لە گەڵ یەك پیر بن!

موسلیم هاتە نێو گفتوگۆکەیانەوە:

ــ نازانی دایە زەماوەندەکەیان چەندە خۆش بوو! سێ شەووڕۆژان دەهۆڵ تەقەیان هات. حەوت دەهۆڵکوت دەیانکوتا! لە سەرانسەری چوکوڕاوایە قەت شایی وا نەدیتراوە!

ــ ئەدی دایە حۆرییت؟! کە ئەو کاتەی بریندار بووی، چوو و دایەسوڵتانی بەو ڕێگا دوورەی دا هێنا بن سەرت و ئەویش برینەکانتی چاك کردەوە؟.. ئەرێ وابزانم ئەو دایکی خۆت نیە؟

ــ ناوەڵڵا، خزمیش نین، ئەو جیرانمان بوو.

ــ خودا تەمەنی درێژ کا. وەڵڵاهی ئەو ژنە وەك حەزرەتی عەلی نازایە!

ــ بەڵێ، دایە حۆریی من هەمیشە نازا بووە.

ــ حەمەد، ڕۆڵە، با پرسیارێکی دیکەشت لێبکەم. توخوا بەسەرهاتی خەجێی بەستەزمان چۆن بوو؟ هیچ هەواڵی پوورە ئیرازیت هەیە، کە خەڵکی ئەو دێیەی خوارەوەی ئێمە بوو؟ قەت چاوت پێیان کەوتۆتەوە؟

ــ نا، قەت نەمدیتوونەوە دایە گیان، ئەمن هەمیشە قاچاغ بووم و نەمتوانیوە لە شوێنێکی بمێنمەوە.

ــ خەمێ مەخۆ، ئەو خودایەی لە بنی چاڵاوێ دا بە هانای یۆسفی گەیشت، ڕۆژێکی دەفریای تۆش دێ و بە دیداری منداڵەکەت شاد دەکاتەوە!

حەمەد ئاخێکی هەڵکێشا:

ـ ئیشاڵڵا!

ئەو جار چاوی دە چاوی زێنەبێ بڕی و گوتی:

ـ دایە زێنەب، ئەو جار نۆرەی منە پرسیارانت لێبکەم. ئەتۆ باسو خواسی سەیران و دایە حۆریت لە کوێ بیستوە؟ چۆن ئەو بەسەرهاتانە گەیشتوونە گوێی تۆ؟

دایە زێنەب قاقایەکی کێشا:

ـ بۆخۆت دەزانی هەموو کەس ئەتۆ دەناسن، لە منداڵێکی حەوت ساڵەوە هەتا دەگاتە پیرێکی حەفتا ساڵە! خەڵك هەموو بەسەرهاتی ژیانی تۆ دەزانن. هەموو کەس دەزانێ ئەتۆ ئەسپێکت هەیە وەك ئەسپەکەی کوێرئۆغڵی‌یە، لە چەشنی دولدولی حەزرەتی عەلی و بۆراقی پێغەمبەری گەورەمانە! ئەسپێکی سیحراوی‌یە! غەیبی‌یە! نە کەس دەتوانێ بی‌گرێ و نە کەس بۆی دەکوژرێ! دەڵێن ژیانی تۆو ئەو ئەسپەی لێك‌گرێدراون و هەتا ئەو ئەسپە زیندوو بێ، کەس زەفەر بە تۆ نابا. هەروەها دەڵێن ئەسپەکەی تۆ وەك ئەسپە بۆرەی بەناوبانگی کوێرئۆغڵی لە "ئاوی حەیات" ێی خواردۆتەوە و هەتا دنیا دنیایە، هەر دەمێنێ. پێتوایە چۆنم ئەتۆ ناسیوە؟ ڕۆڵە هەموو کەس ئەتۆ دەناسێ و لە هەموانیش زیاتر هەژارەکان باست دەکەن! ئێمە نایب ڕەجەبیشمان دەناسی، دورِدووە شێتیش و مەلا فەرهادیش... دەشزانین ئەتۆ نیشانەیەکی پیرۆزت بە بەری دەستی‌یەوەیە.

لەوبەینە دا حەمەد و موسلیم لە نانخواردنێ ببوونەوە. هیچیان لە سەر سفرەکەی نەهێشتبوو و هەرچی بۆیان دانابوون، خواردبوویان. ژنە جحێڵەکان دیسان ئەفتاوە و لەگەنیان هێنا و ئەوانیش دەستیان شوتەوە و ئاویان دە زاری وەردا.

دایە زێنەب گوتی:

ئەوە لەو ژوورەی دیکە جێگام بۆ ڕاخستوون. هەر خودا دەزانێ ئێوە چەند شەوە خەوتان لە چاوی نەکەوتوە و ئەوە لە سوێی خەوێ شێت دەبن. وەرن بۆخۆتان بخەون!

حەمەد هەر دەسبەجێ خەوی لێ‌کەوت. موسلیم لە تاو ژانی لاقی نەی‌دەتوانی بنوێ، بەڵام دەری‌نەدەبڕی. ئاخرەکەی شەکەتی بە سەر ژانەکەی دا زاڵ بوو و خەوی لێ‌کەوت. بەرگەلێفەکان وەك گێچێ سپی بوون و بۆنی سابوون و سێویان لێ‌دەهات.

پاشنیوەڕۆیەکی درەنگ بوو و ڕۆژ هاتبوو ئاوا بێ، بەڵام حەمەد و موسلیم هەروا نوستبوون. لە باشوورەوە هەوری سپی پەیدابوون، زیادیان کرد و بە سەر دەریای نێوەڕاست دا بڵاو بوونەوە. نیسێی شاخەکان شۆڕ بوونەوە، بەرەو ڕۆژهەڵات درێژ بوونەوە و شنەی زریان هەڵی‌کردێ. جووتێرەکان کە بە

خەنجەر، شمشیرە کۆن، پاچ، پێمەڕە، شەنە، تفەنگ و هەموو جۆرە چەکێکی کۆن و تازەوە چووبوونە ڕاوی حەمەدۆکی، شەکەت و ماندوو دەهاتنەوە ماڵێ. دایە زێنەب لە بەر دەرگای ماڵێ ڕاوەستابوو، چاوەڕوانی کوڕەکەی بوو و هەر کەسیش لەوانەی بەدوای حەمەدی دا گەڕابوون، بەوێ دادەهات، تەوسێکی وی وەبەردەکەوت. هێندەی پێ‌تەچوو، کوڕەکەی کە ئەسپێکی چاکی دەبن دابوو، فیشەکدانی چەپ و ڕاست لەخۆ بەستبوو و تفەنگێکی کاڕابینی ئەلّمانیشی دە شانی دا بوو، لە دوورەوە وەدەرکەوت. ئەسپەکەی، ئەسپێکی عەرەبیی ڕەسەن بوو، کە لە عورفای هێنابووی. کوڕەکە گەیشتە نێو حەساریێ و لە بن دارەگێوژێکی کە لە نێوەڕاستی حەسارەکەی بوو، لە ئەسپەکەی دابەزی. دایەزێنەب لە حالێك دا دەستەکانی دە کەلەکەی دابوون و بزەیەکی لە سەر لێوان بوو، ماندوونەبوونی لە کوڕەکەی کرد. منداڵ بە دەوری ئەسپەکەی دا هەڵبەزدابەزیان بوو.

ــ یۆنس بەخێربێیەوە، ڕۆڵە! چ بوو؟ حەمەدۆکتان گرت؟ وەڵلاهی وێ دەچێ هیچتان بۆ نەکرابێ، دیارە هەر کەستان دێتەوە، مات و بێ‌کەیفە. کەسیش دەنگ ناکا.

یۆنس چاوێکی لە دایکی کرد. پێی‌سەیر بوو کە دایکی ئاوا بە کەیف و خۆشحاڵ دەدی. خوشکەکەی هات، ئەسپەکەی لیّ‌وەرگرت و بردی لە تەویلەی بەستی‌یەوە.

ــ یۆنس گیان، ئەمن دەبینم هەمووتان ناڕەحەتن... ڕەنگە حەمەدۆکتان گرتبێ و دابێتتان بە عەلی کەرتیشی، یان یاوەری بۆرە بەراز و ئێستاش پەرۆشتان بێ، وایە کوڕە ئازاکەم؟

ــ ئەوە چی‌یە دایە؟ بۆ ئاوا گاڵتەم پێ‌دەکەی؟

ــ لەوەی گەڕێ! پێمبڵێ بزانم حەمەدۆکتان پێ‌گیرا؟ ئەدی بۆ وا بە دەستبەتاڵی گەڕاونەوە؟ ماران قووتیان داوە؟ زۆر ماندوو بووی ڕۆڵە گیان؟ باشە ئەمن پێمنەگوتی قەت حەمەدۆکتان بۆ ناگیرێ؟

ــ چۆن دەزانی هیچمان بۆ نەکراوە؟

ــ هەر لە ڕوخسارتان ڕا دیارە. چاوێك لە خۆت و هاوڕێکانت بکە... لە دوور ڕا دیارە چوون وە دوای کلاّوی خوار کەوتوون و هیچتان بەدەستەوە نەهاتوە.

یۆنس ئاخێکی هەڵکێشا:

ــ وایە... بە داخەوە هیچمان بۆ نەکرا. تەواوی ئاکچەسازی گەڕاین، نێو هەموو پۆلە قامیشێکی، بن هەموو پنچکێکی، بە کورتی هەموو شوێنێکی گەڕاین، زۆریش بووین، خەڵکی سێ دێیان بووین، بەڵام بۆمان نەدیترایەوە. کاتێك چۆتە نێو دڕووەڵانی، سەدکەس زیاتر دیویەتی. سەیرە! ڕێیەڵ بۆتە نێو کونە ماران، چۆتە بن باڵی هەڵۆیان، یان عەرز قەڵشیوەتەوە و قووتی داوە؟ نازانم. ئێمە بە خۆرایی خۆمان ماندوو کرد و بە دوای دا گەڕاین...

دایە زێنەب لە قاقای پێکەنینێی دا:

ـ لەوانەیە پێش ئەوەی ئێوە بگەنێ، هەژدیهاکە قووتی دابێ...

ـ دایە ئەوە چییە؟ توخودا پێم بڵێ بۆ ئاوا پێدەکەنی؟ چ بووە؟

ـ دەزانی چ بووە... کورە چاوڕەشە چاوجوانەکەم؟ ئەمڕۆ شەهێنێك بۆتە میوانمان! باڵندەیەکی پیرۆز و بەخێروبەرەکەت!

ـ دایە.. چی؟ شەهێنێك؟

ـ بەڵێ، شەهێنێکی بەرزەفڕ ئەمڕۆ لە سەر گوێسوانەی ئێمە نیشت و مارێکی ڕەشیشی بە چنگانەوە بوو... ئەمنیش بە ڕێزەوە پێشوازیم لێکرد، شیروهەنگوینم دایە و هەر ئێستاش بەرانێکی بۆ سەر دەبڕم!

ـ دایە... دەڵێی هەمووتان شتێکم لێدەشارنەوە و بۆخۆشتان پێی دڵخۆشن... لەمێژساڵە، لەوەتا بابم مردوە، قەت ئاوا بەکەیفم نەدیوی...

زێنەب چووە پێشێ، دەستی لە سەر شانی کوڕەکەی دانا و بە دەنگێکی سەبر گوتی:

ـ دەزانی ئەو شەهێنەی ڕێگای کەوتۆتە ماڵی ئێمە، کێیە؟

ـ کێیە؟

ـ ئەوەیە کە خودا لە هەموو کەسی جوانتر دروست کردوە، ژیرە، قارەمانە، شێرعەلیی ئەم سەردەمەیە، کوێرۆغڵیی ئەم دەورەیە، حەمەدۆکە...

ـ باشە ئێستا لە کوێیە؟

ـ نوستووە....

ـ ئەوە دەڵێی چی دایە؟ شتی وا چۆن دەبێ؟ چۆن دەکرێ ئەو میوانە حەمەدۆك بێ؟! حەمەدۆك ئەو هەموو خەڵکەی بەدووەوە! هەرچی خەڵکی چوکووراوایەیە بە خوێنی سەری تینوون، بەوحاڵەی ئەو چۆن دەتوانێ لێرە بێ و لە ماڵی ئێمە خەوتبێ؟!

ـ کوڕم درۆت دە گەڵ ناکەم. حەمەدۆك لێرەیە و لەو ژوورەی نوستووە!

ـ یانی ئەو هێندەشی باوەڕ بە تۆ بوو کە لێرە بە ئاسوودەیی بۆی بنوێ؟

ـ بەڵێ ئەو باوەڕی تەواوی بە من بوو و هیچ نەدەترسا. دەزانی ئەو لە هەموو پیاوێکی گەورەتر و لە هەموو منداڵێکی سادەتر، پاکتر و بێگوناحترە! وەك شێرعەلی ئاقڵە و وەك کوێرۆغڵی زیرەکە. وەك حەزرەتی محەممەد ڕێز لە خەڵکی خوای دەگرێ. دەتوانێ وەك خدری زیندەی سەوزەپۆشی ڕیش سپی کەرامەتان بنوێنێ. ئەو باوەڕی بە خەڵك هەیە کوڕم! ئەو

متمانەی تەنانەت بە بەشی هەرە خراپی ئەو خەڵکەش هەیە! کوڕم کەسێك کە باوەڕی بە خەڵکی دیکە نەبێ، ڕێز لە خەڵکی دیکە نەگرێ و بە چاوی دوودڵی و گومانی خراپەوە لە خەڵك بڕوانێ، ئەوە بێجگە لە مرۆڤێکی نالەبار، دڵڕەش و بێمایە، شتێکی دیکە نیە!

ـ باشە دایە، چۆن دەزانی ئەو کەسەی ئێستا لە ماڵی ئێمە میوانە و لەو ژوورەی خەوتووە، حەمەدۆکە؟

ـ لە پێش دا، هەتا نیشانە پیرۆزەکەم دەقامکی دا نەدی، ئەمنیش باوەڕم پێنەکرد. دوایە کە ئەوەم دی، وەخت بوو لە خۆشییان بفڕم.

ڕوخساری یۆنسی گەشایەوە و بە دڵخۆشییەوە لە حەسارێ دەستی بە ڕاوێچکان کرد: "خودایە حەمەدۆك لە ماڵی منە، لە ژووری منە و لە جێویانی من دا نوستووە! بە ڕاستی چەندە سەیر و لە نەکاو!" پاشان گوتی:

ـ بە راستی حەمەدۆك چ جۆرە ئینسانێکە؟ بەخۆوەیە؟ خۆشمەشرەفە، یان ڕووگرژە؟ دەڵێن پڕیشکەی لە چاوی دەبنەوە، ڕاستە؟ شتێکی دی، خۆ چاکت بەخێرهێناوە و قەدرت گرتوە؟ ئەدی کەنگێ وە خەبەر دێ؟ کەنگێ دەکرێ بیبینم!

ـ ڕوانین لە ئینسانی نوستوو باش نیە و بە تایبەت ئەگەر میوان بێ، هەر ناکرێ! کەسێك نوستبێ و چاوی لێبکەی، وەك ئەوە وایە کوشتبێتت... هێندێك خۆتڕاگرە ڕۆڵە! هەرکاتێك وەخەبەر هات، دەتوانی لەگەڵی دانیشی و قسەی لە گەڵ بکەی! کوڕە حەمەد دڵێکی ئەوەندە بە ڕوحم و پاکی هەیە، کە جاری وایە وەك منداڵان دەگری!

یۆنس لە تاو دیتنی حەمەدۆکی ئۆقرەی لێبڕابوو، نەیدەتوانی لە جێیەکی ڕاوەستێ و هەروا لە حەسارێ هاتوچۆی بوو. لە پڕ گوتی:

ـ دایە ئەوە بۆ لە بیرمان نیە؟ باشە ئاخر کاتێك ئێمە حەمەدۆکمان میوانە، نابێ ئەمشۆ مەڕێکی بۆ بکوژینەوە؟!

ـ ئەگەر بابت مابا و حەمەدۆکی لێ میوان بووبا، مەڕێك چییە، بێگومان دوو بەران، دوو جوانەگا، یان دوو گای دەکوشتنەوە... بەڵێ، وای دەکرد کوڕم! نازانی بابت چ پیاوێك بوو؟! ئاخر پیاوێکی وەك حەمەدۆکی، یان خدری زیندە، یان چل سوارەی غەیبی بە هەزار ساڵان جارێك خۆیان لە سەر ئەو دنیایەی ئاشکرا دەکەن و بەختەوەر ئەو کەسەیە کە ئەوانەی لێ میوان دەبن!

ـ دایەگیان، ئەمن ئەوە دەچمە مەزرایە و لە نێو مێگەلی بەرانێکی باش هەڵدەبژێرم و دەیهێنمەوە. پیاوی چاك بە هەتا دێمەوە نەیەڵی حەمەدۆك بڕوا!

ـ نان ڕۆڵە گیان خاترجەم بە! بەڵام بەرانێك کەمە. دوویەرانان بێنەوە، چونکە دەمەوێ لە بەر حەمەدۆکی هەموو خەڵکی دێی بانگهێشتن بکەم!

یۆنس وڵاخی دەرکێشا، سوار بوو و بە پرتاو ڕۆیی. مێگەلەکەیان لە تەپکێکی کە بە سەر چۆمی جەیهانێی دا دەڕوانی، دەلەوەڕا. یۆنس سێ بەرانی قەڵەوی هەڵبژارد و بەشوانەکەی گوت:

ـ دەبێ زوو ئەو بەرانانە ببەمەوە و سەریان ببڕم. حەمەدۆك لە ماڵی ئێمەیە! هەموو خەڵکی دێم میوانن. ئەتۆش لە گەڵێ!

کاتێك گەیشتەوە ماڵێ، حەمەدۆك و موسلیمیش هەستابوون و خەریکی دەموچاو شوتنێ بوون. یۆنس غاری دا و دە باوەشی گرتن:

ـ یاخودا بەخێربێی کاك حەمەدی بەڕێز! بەڕاستی ئەوە بۆ ئێمە شانازییەکی گەورەیە کە تۆ لە نێومانی...

یۆنس لە تەمەشاکردنی حەمەدی تێر نەدەبوو. بە وردی لە بەری پیێ ڕا هەتا تەپڵی سەری دەیپشکنی و هەموو جارێش کە دەگەیشتە دەستی، دە نیشانەی خانەقای چلچاوییەوە ڕادەما. لەو بەینەی دا کۆمەڵێك ژنی پیر و جحێڵی دێی هاتن. حەسارەکەیان ماڵی، پاشان پڕ بە حەسارەکەی حەسیر و پەتۆیان ڕاخستن لە سەر ئەوانیشەوە لبادیان ڕاخستن و پاڵەپشتیان دانان. کۆمەڵێك ژنی دیکە ئاگریان کردەوە و گۆشتیان چاك کرد، پەتاتەیان سپی کردن و برینجیان شوتەوە.

پێش ئەوەی ڕۆژ ئاوا بێ، هەموو پیاوی دێی هاتن. بەدوای یەکدا باوەشیان بە حەمەدۆکی دا کرد و بەخێریان هێنا. دوای هەمووان حەمەداغای هەوشارۆغلی هات، پیاوێکی کەڵەگەتی ڕووخۆش، سمێڵ بابڕ و سەنگین. بە بزەیەك لە سەر لێوانەوە نێوچاوانی حەمەدی ماچ کرد و گوتی:

ـ بەخێربێی حەمەدۆك، بە ڕاستی بەخێر بێی هەڵۆی سەر لووتکەی چیای هەزارگا! یاخوا بەخێر بێی!

ـ سوپاسی میوانگریتان دەکەم حەمەداغا!

ـ ئێمە شانازی بەوەوە دەکەین کە تۆ هاتوویە گوندی ئێمە و میوانمانی!

ـ منیش شانازی دەکەم کە هاتوومە ئێرە و چاوم بە ئێوە کەوتوە ئاغا!

هەوشارۆغلی لە سەرەوەی مەجلیسێ، کە دارێکیشی لێ بوو، دانیشت و حەمەدی لە پەنا خۆی دانا. پاشان خەڵکەکەی دیکەش دەوراندەور دانیشتن.

هەتا شەودرەنگانێك خەریکی نانخواردن و قسەوباس بوون. هەموو بە یەکەوە قسەیان دەکرد و جەفەنگیان لێدەدان. کاتێك باسی ئەوەی دەکرا کە چۆن یاوەر فاڕوق بەو هەموو

هاتوهووتەیەوە دڕووەڵانێ گەڕاوە و لە شەڕی ماران زیاتر هیچی وەدەست نەکەوتوە، هەوشارۆغڵی هێندە پێدەکەنی، ڕەشوشین دەبۆوە. پاشان کاتێك هەستا و دەیەویست بڕواتەوە ماڵەخۆی، گوتی:

ـ ئەگەر دایە زێنەب ئیزنی لە سەر بێ، پێمخۆشە کاك حەمەد لە ماڵی ئێمە بنوێ!

دایە زێنەب وەجواب هات:

ـ حەمەدۆك ئەمشۆ میوانی منە و قسەی تێدا نیە کە بۆ هیچکوێی دی ناچێ! ئەگەر بێڵم بچێتە شوێنی دیکە، ڕوحی مێردەکەم دە قەبری دا ناحەسێتەوە!

ـ باشە دایە زێنەب، قسەی تۆیە. با حەمەدۆك ئەمشۆ لە ماڵی ئێوە بێ، بەڵام سبەینێ میوانی خۆمە! نابێ بێڵی خۆم لێبشارێتەوە!

ـ بە سەرچاو، سبەینێ لە لای ئێوە دەبن!

ـ ئاخر دایە زێنەب، ئەو کوڕانە چەتەن، ئەوەندی بلێی یەك و دوو دەتوانن خۆمان لێ ون کەن!

ـ خودا عافووت کا ئاغا، ئەمن بۆخۆم عۆدەدار دەبم، سبەینێ بۆخۆم دەیانهێنم بۆ ماڵی ئێوە!

# (٥)

ئەویٚ شەویٚ مورتەزاغا نەیتوانی چاو لە سەر یەك دانیٚ. هەر ئاخی هەلکێشان، نالآندی و دەجێیە دا ئەمدیوئەودیوی کرد. ئەگەرچی ئێستا دەو ژوورەی دا نەدەنوست کە مەحمووداغای تیٚدا کوژرابوو، بەوحالەش هەمیشە ئەوەی دەهاتەوە بەرچاو کە چۆن مەحمووداغای میوانی دە خوێنی خۆی گەوزیبوو و دەچووە هەر شوێنێکیش تەرمی ئەو کابرایەی هەر لە پێش چاوی بوو. بەوحالەش ئەو بە بیٚ ئەوەی شەرمیٚ بکا، یان دەربەستی ئەوەی بیٚ خەلك لۆمەی بکا، لە هەموو جێیەك تاریفی حەمەدی دەکرد، بەو "دڕندە خوێنخۆر"ەی هەلدەگوت و دەیهێنا ڕیزی "حەمە چەتە"ی بە نێوبانگ، و "سەلیم سامناك" و تەنانەت دەیگەیاندە ئاستی حەزرەتی خدری زیندەش. بەلیٚ، ئەو تا ئەو رادەیە دەچووە پێش کە دەیگوت حەمەد لە گەلٚ چلسوارەی غەیبییە، بۆخۆی یەکێك لەوانە و لە سەر چیای دولدولی لە گەلیان کۆ دەبێتەوە. کەسیش لێی وەدەنگ نەدەهات. لە بیری وی دا ئەو خەلکە گێل و گەمژە بوون، بەلآم ئەوەشی بە خۆی دەگوت: مورتەزا شێت هەر بۆخۆتی! حەمەد بە خوێنی سەری تۆ تینووە و ناشتبەخشیٚ. ئەگەر هەتا ئێستاش نەیکوشتووی، لە بەرخاتری عەلییەشەلی بووە. عەلییە شەل لە گەلٚ ویٚیە و لە هەموو کەسی لیٚ نێزیکترە. بەلیٚ، ئەگەر هەتا ئێستا نەیکوشتووی، بۆ عەلییەشەلی هێشتوویەوە کە ئەو بتکوژیٚ. وایە، سەدهەزار جاری دیش دەلێم وایە، ئەمن بە دەستی عەلی نەبیٚ، بە دەستی کەسی دیکە ناکوژرێم... ئەو جار خەیالی واوەتر چوو، خۆی بە مردوویی دی، هەموو گیانی دە خوێنیٚ خۆی دا شەلآلٚ بوو، ملی شکابوو، دەستی بە لایەکی بالنجەکەی دا کەوتبوو. زمانی دەرکشابوو و هەتا سەر سینگی درێژ ببۆوە و هەروا خوێنیشی لیٚ دەچۆڕا. وردە وردە تەرمەکەی هەلمسا، هێندە هەلمسا وەك ڕەشکەکای لیٚهات، هەزاران

مێشەشینکەی لێهاڵان. هەموو مێشەکانیش دە دەریای خوێنێ دا خنکان. پاشان کەلاکەکە بە چواردەوری خۆی دا سوورِا و خوێن و پۆلەمێش بە لووزەو بە دیوارەکان دا کران. خوێن کەفی کرد، دیسان بە سەر زمانی دەرکشاو، ڕوخساری سپیهەڵگەڕاو و هەموو بەشەکانی دیکەی لەشی مردووەکە دا بلاو بۆوە و دیسان مێشە شینکە لە سەر کەلاکەکەی نیشتنەوە. باڵی مێشەکان دەبریقایەوە و دەوری کەلاکەکەی لە مێشان هەر بریقە بریقی بوو. دەتگوت کەلاکەکە دە هەورێکی بریقەدار وەرگیراوە، هێندێك سەگ پەیدا بوون و خەریك بوون لە سەر کەلاکەکەی لە گەڵ مێشەکان بە شەرِ بێن. هێشتا کەلاکەکە هەر خوێنێ لێ دەچۆڕا. ئەو جاردەیدی: ئەوە کەلاکی مورتەزاغای لە دەشتێکی کەوتوە، پڕ بە دەشتەکەی گوڵی سوور، نەرگس و وەنەوشە ڕواون. کەلاکەکە بەرەبەرە هەڵدەمسێ و لە پڕ میلیون میلیون پەپوولە، وەك پەڵە هەورێکی پەیدا دەبن. دەوری دەدەن و لە نێو خۆیان دا ونی دەکەن. هەموو ئەو دەوروبەرە لە شۆقێکی بنەوشی دا، کە لە سەر دەشتەکەی خۆ دەنوێنێ، مەلەی دەکا. کەلاکەکە لە نێوەڕاستی دەشتێ کەوتوە. گەرمایە، گەرمایەکی وشکی ئەوتۆ کە خەریکە عەرزی بسووتێنێ و بەردان بقەڵشێنێ. دەڵێی ڕۆژ ئاگری لێدەبێتەوە. کەلاکەکە دەو گەرمایەی دا هەر دێ و زیاتر هەڵدەمسێ، پاشان ئاوێ دەکا و ئاوەکەی لە بەر دەڕوا. زۆری پێناچێ وشك هەڵدەگەڕێ، ڕەش دەبێ و پێستەکەی بە ئێسکانییەوە دەنووسێ. عەلییە شەل پەیدا دەبێ. لە بەر بۆگەنی کەلاکەکەی توند لووتی گرتوە. هاوار دەکا: "ئەو کەلاکە بۆنی کردوە، مورتەزاغا بۆگەن بووە! زانیبام ئاوا بۆگەن دەبێ، قەتم نەدەکوشت". بەڵێ، وایە ئیدی، باشە حەمەد دەستی وێیڕاگەیشتبوو و نەشیکوشت! بۆ؟! خۆ ئاغایەك کە ئەمن بم، برای نەبووم. وا نیە؟! ئەو بە تفەنگەوە لە سەرم ڕاوەستابوو و زۆر هاسان دەیتوانی قامك لە پەلەپیتکەی بیزێوی و دوو گوللان لە سەر دڵی منیش دا، هەروەك لە مەحموداغای دا! هەر ئەوەندەی گوت:" ئەتۆ بە عەلییە شەلی دەبەخشم!" دەی مەبەستی لەوە چ بوو؟ ڕاست مەبەستی ئەوە بوو کە بڵێ چارەنووسی تۆ دە بەر دەستی خودای دایە، بەڵام بە دەستی عەلییەشەلی دەکوژرێی! ئەوە لە مە زیاتر مانایەکی دیکەی نیە!

ئیدی نەیتوانی زیاتر دە جێیە دا بمێنێتەوە. لەپڕ دەرپەڕی و جلەکانی دەبەر کرد. دوای کوژرانی مەحموداغای، بێجگە لە مورتەزاغای بێچارە هیچ ئاغا و بەگێك لە ماڵی خۆی نەدەنوست، نە زولفۆ، نە خەلیل بەگی گەورە و نە ئی دیکەش. وەك ئەوەی وا بوو کە ئەو بە ئەنقەست دەیەوێ خۆی بە کوشت بدا.

ـ ئەریٚ ئەوە تۆش بە خەبەری حوسنی خانم؟

ـ هەر چاوم لێکنەناون مورتەزا گیان! کاتێك ئەتۆ هێندە ئالۆز و نیگەران بی، ئەمن چۆن خەوم لیٚدەکەویٚ!

ـ راست دەکەی خانم گیان، ڕاستە! ئەمن ئێستا پێوە بووم. پەتێکم لە ملی دایە و گوللەیەکیشم لە سەر دڵی دراوە. باشە بە باوەڕی تۆ چ بکەم؟ "ئەمن تۆ بە عەلی‌یە شەلی دەبەخشم"، ئەوە یانی چی؟ مەبەستی ئەوە نەبووە کە ئەمن بە دەستی عەلی‌یەشەلی دەکوژرێم؟

ـ بیٚگومان دەبیٚ مەبەستی هەر ئەوە بیٚ...

ـ کەوابوو دەبیٚ یان دیسان لە گەڵ عەلی ببمەوە بە برا، یان بی‌کوژم!

ـ لەو دوو ڕێگایەی زیاتر ڕێگایەکی دیکەت نیە!

ـ نا... باشە خانم ئەتۆ ڕێگایەکی دیکەت پیٚشك نایە؟

ـ جاریٚ نا ئاغا، ئەوە بیر دەکەمەوە و لەوانەیە بە شتێك بگەم. بەڵام... وا بزانم هەموو شتێك دەبن سەری مەلا دۆران ئەفەندی دایە. ئەمن بیستوومە حەمەدۆك جاری وایە نیوەشەویٚ دیٚ و سەری دەدا.

ـ بیٚدەنگ بە خانم، شتی وا نەڵێی، بۆ خاتری خودای ئەوەی نەڵێی!

ـ وەڵڵاهی دەنا ڕاست وایە! ئەوەی ئەمن ئەو خەبەرەم لیٚبیستوە، ئی ماڵە وانە و بە چاوی خۆی حەمەدۆکی لە ویٚ دیوە. حەمەد سیٚ شەو و ڕۆژان لە ماڵی ئەوان دا خۆی شاردۆتەوە و هەر لە وێش ڕا هاتوە و مەحموداغای کانی‌یەگوڵانی کوشتوە. بیستووشمە کە عەلی‌یەشەل وەپیٚشی کەوتوە و بە دەستی خۆی دەرگای بۆ کردۆتەوە.

ـ بیٚدەنگ بە، شتی وا قەت نابیٚ! ئەگەر ئەوەی تۆ دەی‌ڵێی، وا بیٚ، ئەو شەلە کەسمان نایەڵیٚ، هەر تایفەمان دەبڕێتەوە!

ـ ئەو دەردەی ئەتۆ داتیٚ و ئەو مەرەدەی ئەتۆ بە سەر ویت هێنا، لە کوشتنیٚ خراپتر بوون، وایە، قسەی تیٚدا نیە هەمووومان دەکوژیٚ!

ـ باشە ئەمن چم لی‌کردوە؟ چم بە سەر هێناوە، کە ئەو ئێستا ئاوا ئەمن ئازار دەدا؟ دەبیٚ بایرامۆغڵی بدۆزمەوە. چۆن خەوم لیٚدەکەویٚ، کاتێك حەمەدۆك چارەنووسی منی داوەتە دەست عەلی! ئەی هاوار کەسێك بزانیٚ هەر ئەمڕۆ دەی‌کوژن، یان زۆرەکەی هەتا سبەینێی عومر ماوە، چۆن دەتوانیٚ بنویٚ؟

ـ ڕاست دەکەی دە سەرت گەڕێم! یارەبی خودا لە عومری من هەڵگرێ و بیخاتە سەر ئی تۆ! بە تەواوی ڕاست دەکەی ئاغا گیان! هەتا ئەو عەلی‌یە شەلە بمێنێ، ئێمە ژیانمان نابێ!

ـ بڵێی ڕۆستەمە کورد نەتوانێ بیکوژێ!

ـ ڕۆستەمی باش ناناسم، تەنیا کاتێك جێژن، داوەت و شتی وا دەبێ، ناوی دەبیسم.

ـ ئەدی بڵێی نەتوانم لە گەڵ عەلی ببمەوە دۆست و برا؟

ـ بۆچی، ڕەنگە بکرێ، ئەمن لەو بوارەی دا هەوڵێك دەدەم، بزانم چم بۆ دەکرێ! دوو حەوتووانم لە سەر ڕاوەستە!

ـ ئەمنیش سەرێکی ڕۆستەمە کوردی دەدەم.

ـ وا بکە ئاغا گیان، بەڵکوو بەو شێوەیە شتێکمان بۆ بکرێ و گیانی خۆمان بپارێزین.

ـ ...

ـ وشیار بە ئاغا! کام دەرگا لە هەمووان تاریکترە، بە وێ دا بڕۆ! هیچ دوور نیە عەلی‌یە شەل دە بۆسە دا بێ و لە کەلێنێکی ڕا چاوی لێت بێ!

مورتەزاغا بە ئەسپایی و بە پارێزەوە لە پلیکانان هاتە خوار. هەنگاو بە هەنگاو گوێی ڕادەداشت. لەوانە بوو ئەو عەلی‌یە شەلە بەڵایە لە قولینچکێکی خۆی شاردبێتەوە. دەرگای کردەوە و بە پەنا دیواری دا، بەو شوێنەی دا کە تاریکتر بوو ڕۆیی. کە لە جادەی چووە دەرێ، دەستی بە ڕاکردن کرد و لە حاڵێك دا هەوڵی دەدا دەنگی هەناسەشی نەیە، بە سەردیوارێکی دا بازی دا، بە نێو باغچەیەکی دا ڕۆیی و لە پەرژینێکیش تێپەڕی. سەگێکی گەورەی مەڕی بۆی هات و دەستی بە وەڕینێ کرد. مورتەزا خۆی دە کەندالێکی هاویشت و هەتا سەگەکە لە کۆڵی بۆوە و بە جێی‌هێشت، دەوێ دا مایەوە. دوای ئەوەی لە کەنداڵەکەی هاتە دەرێ، تووشی هێندێك کەلاوان بوو. پێشتر ئەوێ دار هەناری لێبوون کە هێشتا هێندێکیان مابوون، ماریشی زۆر بوو، بەڵام بێگومان ئێستا مارەکان لە کونەکانیان دا خەوتبوون، چونکە دار هەناریش هێشتا گوڵیان نەکردبوو، ترسی ماری کەم بوو. ماڵەکەی ڕۆستەمی هێندێك واوەتر بوو. دارپەڵکێکی گەورە لەوێ شین ببوو و لکەئەستوور و درێژەکانی بە سەر ماڵەکەی ڕۆستەمی دا بڵاو ببوونەوە. مورتەزاغا لە بن دارەکەی ڕاوەستا، کۆخەیەکی کرد، هەوڵی دا هەناسەیەك بێنێتەوە بەرخۆی و پاشان هەرای کرد:

ـ کاك ڕۆستەم! کاك ڕۆستەم!

دەسبەجێ ڕۆستەم لە ژوورێ ڕا وەڵامی دایەوە:

ـ بەڵێ مورتەزاغا! فەرموو... ئەوە هاتم!

کاتێك ڕۆستەم هاتەدەرێ، دەستێکی بە دیخوونی پاتۆڵەکەیەوە بوو و فانۆسێکیشی بە دەستەکەی دیکەیەوە بوو. فانۆسەکەی لە بەر دەمی مورتەزای ڕاگرت و گوتی:

ـ دەسبەجێ دەنگتم ناسی‌یەوە و زانیم ئەوە دەبێ ئەتۆ بی! ماشەڵلا بەو نیوەشەوەش ڕوخسارت گەشە ئاغا! فەرموو دانیشە، دەزانم ترست هەیە!

مورتەزاغا دیسان کۆخی، گەرووی خاوێن کردەوە و گوتی:

ـ چ ترسێکم هەیە؟

ڕۆستەم لە بەرامبەری دانیشت، فانۆسەکەی لە بەر پێی خۆی دانا.

ـ دەتوانی ئەو فانۆسەی بکوژێنی‌یەوە؟

ڕۆستەم فووی لە فانۆسەکەی کرد، کوژاندی‌یەوە و گوتی:

ـ نیگەرانیت زۆرن، حەمەدۆك بۆ کوشتنی تۆش هاتبوو، نازانم چۆن بوو نەی‌کوشتی و لە جیاتی‌یان مەحموداغای کوشت؟

ـ بەڵێ، مەحموودئاغای دە خوێنی خۆی گەوزاند و نازانی چەندی خوێن لە بەر ڕۆیی! ئەو پیاوە کورتەباڵایە بە قەد سێ گایانی خوێن لە بەر ڕۆیی. بۆ وا بوو ڕۆستەم، ئەو هەموو خوێنە چۆن دە نێو ڕەگەکانی ئەو پیاوە لاوازەی دا جێی ببۆوە، ها؟

ـ دوای ئەوەی مەحموداغای کوشت، نۆرەی تۆ بوو بت‌کوژێ، بەڵام کاتێك ڕووی تفەنگێی دە تۆ کرد، بڕیارەکەی گۆڕا و گوتی ئەتۆ بە عەلی‌یەشەلی دەبەخشم و دوایە لێی‌دا ڕۆیی. ئەو بەڵێنی بە عەلی‌یە شەلی داوە ئەتۆ نەکوژێ و ئەو کارە بە وی بسپێرێ. ئەرکی کوشتنی تۆی خستۆتە سەرشانی عەلی و دیارە عەلیش دەیەوێ تۆڵەت لێ‌بستێنێتەوە. هەر لە بناخە دا حەمەد نەی‌دەتوانی ئەتۆ بکوژێ، چونکە عەلی لێی قبووڵ نەدەکرد... ئێستا ئیدی عەلی پەلە ناکا و بە کاوەخۆ و لە کاتێکی لەبار دا دەت‌کوژێ!

ـ باشە ئەتۆ ئەو هەموو هەواڵانەت لە کوێوە پێ‌گەیشتوە؟

ـ ئای ئاغا بەستەزمانەکەم، مورتەزاغا بێ‌بەختەکەم! ماڵتە کابرا خولێکی بە نێو بازاڕی دا لێ‌بدا، دەزانێ هەمووکەس لەو شتانە ئاگادارن. هەر کەس پێی‌خۆش بێ، عەلی‌یەشەل هەموو ئەو شتانەی بۆ باس دەکا. بە ئاشکرا لە لای هەموو کەس گوتوویەتی: هیچ‌کەس مافی ئەوەی نیە مورتەزاغای دولکادیرلی بکوژێ. ئەو مافەی نادەم بە کەس، تەنانەت بە حەمەدۆکیش. ئەو نێچیری خۆمە خۆم! بەو دەستانەی خۆم، وەك گای، بە چەقۆیەکی کول،

سەری دەبڕم! لە نێو جێوبانەکەشی دا نا، لە نێوەڕاستی بازاڕی! ئاغا بەستەزمانەکەم، هەموو خەڵکی شاری ئەوەی دەزانن! بڕۆ لە منداڵێکی حەوت ساڵە، یان پیرێکی سەد ساڵە بپرسە، هەمووت بۆ باس دەکا. ئاوایە ئیدی ئاغا بڵێین چی؟! ئێستا بفەرموو چۆنە بەو نیوەشەوەی زەحمەتت کێشاوە و ئەمنت بە سەر کردۆتەوە؟

مورتەزاغا وەڵامی نەدایەوە.

ـ ئەوە چی‌یە مورتەزاغا! بۆ وا بێدەنگی؟

ئاغا تەنیا بۆڵەیەکی لێهات. ڕۆستەم بە غار چوو پەرداخێکی هێنا، لە گۆزەیەکی کە لە ژێر دارەکەی حەساری داندرابوو، پڕی کرد لە ئاو و بۆی هێنا:

ـ ئەو ئاوەی بخۆوە، دێیەوە سەرەخۆ! ناحەقت نیە بابم، مەسەلەکە مەسەلەی مردن و ژیانە و دیارە هێندە هاسان نیە! یاڕەبی خودا لە چارەنووسی ئاوامان بە دوور کا! عەلی‌یە شەل پیاوێکی کەللەشەقە! زۆر کەللەشەقە! نەدەبوو ئەوەت لە گەڵ کردبا! نەدەبوو بە ڕووت و قووتی لە نێوەڕاستی مەیدانی شاری فڕێی‌دەی! هەڵەیەکی گەورەت کرد ئاغا! ئەتۆ ئەگەر ئەوەت لە گەڵ یەکی دیکەی بێجگە لە عەلی‌یەشەلیش، کە چەتەیەکی بەنێوبانگە و وەك شێرعەلی ئازا و پاکە، کردبا، نەخێر با بڵێین هەر ئەوەت دەرحەق بە منداڵێکی حەوت ساڵە کردبا، لەمێژ بوو تۆڵەی لێکردبوویەوە و ئێستا نەمابووی. دەزانی عەلی‌یەشەل بۆ هەتا ئێستاش نەی‌کوشتووی؟

ـ نا... بۆچی؟

ـ ئەو دەڵێ:" ئەمن ڕۆژێ هەزار جار مورتەزاغای دەکوژم، ئەو کابرایە ڕۆژ نیە نەمرێ، جا ئەو جار ڕۆژێکی، ئەو کاتەی بزانم وەختی‌یەتی، لە نێوەڕاستی بازاڕی دەی‌کوژم. یەکجێ سەری لێدەکەمەوە!

ـ باشە کەس نیە پێشی پێبگرێ؟ کەس نیە نەهێڵێ وا بکا؟ ناکرێ کەسێك پەشیمانی کاتەوە و بمبەخشێ؟

ـ هەموو کەس هەستی ڕوحم و بەزەیی تێدا هەیە. وا هەیە کابرا بابی، دایکی، برای، یان منداڵی بە دەستی کەسێکی کوژراوە و دوایە بەزەیی بە قاتڵەکەی دا هاتوە و بەخشیویەتی، بەڵام عەلی‌یەشەل وا نیە و لەوانە نیە ئەتۆ ببەخشێ! تەنیا یەك کەسی دیکەم پێشك دێ کە وەك وی کەللەشەقە، ئەویش کوڕی بایرامی "بایرامۆغلی" یە!

مورتەزاغا کە تا ئێستا قوم قوم لە ئاوەکەی خواردبۆوە و هەر گەرووی پێتەڕکردبوو، پەرداخەکەی بە سەری‌یەوە نا و بەتاڵی کرد:

ــ خودا مردووانت ببەخشێ!

ــ خودا تۆش ببەخشێ ئاغا!

ــ بەڵێ، ئێستا با باسی وەی بکەین کە بۆ بەو نیوەشەوەی هاتوومە لای تۆ و...

ــ ئەمن چاوەڕوانت بووم!

ــ یانی چی؟ چۆنت دەزانی دێم بۆ لات؟

ــ چۆنم دەزانی؟ عەلی‌یەشەل قسەی دەگەڵ کردووم. پێی گوتووم موڕتەزاغا ئەوە لە ترسان خەریکە شێت بێ. قسەی تێدا نیە دێتە لای تۆ و داوات لێدەکا ئەمنی بۆ بکوژی، لە بەرامبەر دا زەوی و زێڕێکی زۆریشت دەداتێ.

ــ ڕاست وایە. بێتوو ئەو کارەم بۆ بکەی، هەم عەرزت دەدەمێ و هەم سێ لیرەی زێڕت دەدەمێ، لیرەی عوسمانی! ئەوم بۆ بکوژە، بەڵێن بێ نەهێڵم تاقە ڕۆژێکیش بگیرێی.

ــ ئەمن کەسم پێناکوژرێ ئاغا. کوشتن گوناحێکی گەورەیە. چۆن کابرا دەتوانێ جوانترین دروستکراوی خودای بکوژێ؟

ــ حاها... یانی جوانترین دروستکراوی خودای ئەو عەلی‌یەشەلەیە؟

ــ ئەمن ئەوەی نازانم و خودا بۆخۆی دەزانێ. هیچکەس نازانێ کێ لە لای خودای گەورەتر و بە بایەخترە! ئەمن نامەوێ گیان لە گیانداری خودای بستێنم، ئەگەر هەموو زێڕی دنیایەشم بدەنێ، شتی وا ناکەم! مرۆڤ گیانلەبەرێکی یەکجار جوانی خوای گەورەیە ئاغا! گیانلەبەرێك کە دەتوانێ پێبکەنێ، بگری و ئەوینداریش بێ.

ئەو دوو کەسە هەتا بەیانی بە یەکەوە قسەیان کرد. موڕتەزاغا هەوڵی دەدا بە هەر شێوەیك بوویێ ڕازیی کا و هەزار شێروڕێویی بۆ هێنایەوە، بەڵام ڕۆستەم نەچووە ژێر بار. کاتێك موڕتەزاغا بەرەو ماڵ بۆوە، ڕۆژ بە قەد ڕمبێکی بڵیند بوو. خانم لێی پرسی:

ــ چت کرد؟ کوردەت ڕازی کرد؟

ــ بە داخەوە نا!

پاشان هەر بە شتومەکەوە لە سەر جێگایە کەوت و خەوت.

حوسنی خانم بە ئەسپایی جلەکانی لە بەر داکەند. زۆری بەزەیی بەو پیاوەی دا دەهات، کە وەك منداڵان دەجووڵایەوە و هێندە لە گیانی خۆی دەترسا.

ئەوێڕۆژی، پاشنیوەڕۆیەکی درەنگ، نۆکەرێکی خەلیل‌بەگی گەورە هاتە ماڵێیان و گوتی بەگ داوای موڕتەزاغای کردوە. نۆکەرەکە گوتی:

ـ ئاغا دەبێ هەرچی زووتر تەشریف بێنێ بۆ لای خەلیل بەگی لە نووسینگەکەی. کارێکی زۆر بە پەلە و گرینگی پێیەتی!

حوسنی خانم بە پەلە غاری دا دیوەکەی مورتەزاغای. ئەو تازە وەخەبەر هاتبوو، بێزاز بوو، نەیدەزانی خۆی بە چییەوە خەریك کا و هەموو گیانیشی وە سەر ئارەقەی گەڕابوو.

ـ خەلیل بەگ بە دوای دا ناردووی، ئەو چاوەڕوانی تۆیە و وا دیارە کارێکی زۆر بە پەلەشی پێتە!

مورتەزاغا دەسبەجێ ڕاست بۆوە، لە تەختەکەی هاتە دەر و بەپەلە خۆی کۆ کردەوە:

ـ ئێستا ڕدێنم ناتاشم، ناپەرژێم، دوایە دەچم لە لای ساڵە یەکچاوی دەیتاشم. جارێ کاری گرینگتر هەیە.

ـ بۆ شەوێ چ لێنێم؟

ـ مریشکی سوور کەوە حوسنی. لەمێژە نەمخواردوە، نیشتیام لێیە!

بە پەلە لە پلیکانان چووە خوارێ. حەساری کردە چەند شەقاو و بێ ئەوەی چاو لە دەوروبەری خۆی بکا، لە کەس بپرسێ، یان ئەو دوکاندارانە ببینێ کە لە بەری هەڵدەستان، خێرا بە نێو بازاڕی دا تێپەڕی و بە چەند دەقیقان خۆی گەیاندە نووسینگەی خەلیل بەگی گەورە. خەلیلبەگ تا بەربێڵایە بە پیرییەوە هات، بەخێری هێنا و پاشان دەستی بۆ لای مۆبلێکی سووری تۆخی چەرم ڕاداشت و گوتی: "فەرموو دانیشە". ئەو مۆبلە تاقە مۆبلی ئەو شارەی بوو. وێنەدەچوو تەواوی ناوچەی ئەدەنەش مۆبلێکی وای تێدا بێ. خەلیلبەگی گەورە پوولێکی زۆری بەو مۆبلەی دابوو. لە کابرایەکی ئەندازیاری لۆکەی ئەڵمانیی کڕیبوو. ئەو کابرایە تەواوی ماڵەکەی خۆی لە ئەڵمانی ڕا لە گەڵ خۆی هێنابوو. خەلیل بەگ کوڕی ئاغایەکی تورکمان بوو. ئاغاکە ڕووت بوو، شتێکی وای نەبوو، بەڵام لە سایەی سووت و سەلەم و پشتیوانیی عارف سایم بەگی ئێستا هێندەی زەوی هەبوو، بەشی حەوت پشتی دیکەشی دەکرد. بەگ زۆری ڕێز لە مورتەزاغای دەگرت، هەرچەند ئەو ڕێز گرتنە هێندێك جار بە گاڵتەپێکردنەوە بوو. هەرچۆنێك بێ بەگ نەك هەر یەکە دەوڵەمەندی چوکووراوایە بوو، بەڵکوو لە ئانتاکیایە ڕا هەتا مەرسینێ کەس هێندی وی نەبوو.

ـ سوپاست دەکەم کە دەسبەجێ تەشریفت هاتە ئێرە ئاغا! ڕێزم بۆت هەیە و لەوەی کە زەحمەتم دای، داوای لێبووردن دەکەم. ناچار بووم، کارێکی بە پەلەم پێت بوو... جارێ با چایەکی بخۆینەوە!

ـ زۆرم پێخۆشە و دە خزمەتت دام!

مورتەزاغا هەستی کرد مەسەلەیەك هەیە کە بەگ گرینگیی پێدەدا. خەلیل بەگ رای کردە دەرێ و دەستووری دا چایان بۆ بێنن، پاشان هاتەوە و لە پشت مێزی نووسینەکەی خۆی دانیشت. مورتەزاش لە نێو مۆبلە چەرمەکەی دا هەستی بە ئاسوودەیی‌یەکی کەموێنە دەکرد، بۆخۆی پالّی لێدابۆوە و لاقی هاویشتبوونە سەر یەك.

ــ بەلّێ، ئا... ئم، ببوورە مورتەزاغا، بەلاّم مەسەلەیەکی گرینگ هەیە کە بوو بە هۆی ئەوەی ئاوا زەحمەتت بدەم...

ــ کاتێك جەنابت دەفەرمووی گرینگ، ئەوە دیارە شتەکە گرینگە.

ــ ئەو مەسەلەیە پێوەندی هەم بە من و هەم بە جەنابتەوە هەیە، برای بەرێزم.

ــ ڕاست و ڕەوان شتەکەم پێبلّێ خەلیل، ئۆقرەم لێبڕا ئیدی، ئەوە چ مەسەلەیەکە ئاوا گرینگە و ئەمنیش دەگرێتەوە؟

ــ بەلّێ گرینگە، شتەکەش ئەوەیە ئەتۆ قسێکی ناخۆشت کردوە، کە ئێستا لە بازاڕی ئێرە و لە سەرانسەری چوکووڕاوایە لە سەر زاری هەموو کەسە... ئەتۆ دەبێ گالّتەت بە یاوەری کردبێ و ئەویش کە زانیویەتەوە، هێندە نارەحەت بووە وەختە لە خەفەتان گیانی دەرچێ. دەلّێ ئەمن قەت چاوەڕوانیم لە مورتەزاغای نەبوو کە ئاوا لە نێو خەلّکی باسم بکا و بمشکێنێ!

ــ چم پێگوتوە؟ بە چی شکاندوومە؟ پێمخۆشە بزانم!

ئەو جار مورتەزا لە جێی خۆی هەستا، لە خەلیل بەگی چووە پێشێ و گوتی:

ــ تکایە پێم بلّێ، بۆم ڕوون کەوە بزانم بۆ شکاندوومە؟

پاشان بە نێوچاوانێکی گرژ و بیرێکی ئالّۆزەوە لە جێگاکەی خۆی دانیشتەوە.

ــ ئەتۆ دەبێ گوتبێتت... دەلّێن بە هەموو کەست گوتووە کە یاوەر لەشکری بردۆتە سەر مارەکانی ئاکچەسازی... هەروەها دەبێ بە گالّتە باسی سەرنەکەوتنی یاوەریت کردبێ...

مورتەزاغا دەنگی هەلّێنا:

ــ بەلّێ وایە، ئەوەم کردوە. بۆچما ئەو بۆ ئەوەی نەچووە ئاکچەسازی کە حەمەدۆکی بکوژێ؟ ئەوە جاری چەندەمە و چ جارێکی شتێکی بۆ کراوە؟ ها؟! ئەو لە جیاتیی وەی حەمەدۆکی بگرێ، نەوەدونۆ ماری بەردەست کردوە! بەلّێ ئەمن گوتوومە و .... بە ئاشکراش دەلّێم ئەمن گوتوومە کە شەڕی لەشکری یاوەری لەگەلّ نەوەدونۆ ماران دەچێتە نێو لاپەڕەکانی مێژووەوە و وەك شەڕە پڕ لە شانازی‌یەکانی سەربەخۆیی لە مێژوو دا دەدرەوشێتەوە. باشە ئەوە شتێکی زۆر ناخۆش و بێجێیە بە زاری من دا هاتوە؟

ـ یاوەر زۆری پێ‌قەڵسە...

ـ با پێی ناخۆش بێ، ئەمن بڵێم چی؟ بەڵام نیگەران مەبە! ئەمن دەزانم چۆنی بێنمەوە سەرەخۆ و ئەوانەی لەبیر بەرمەوە.

پاشان قاقایەکی کێشا و خەلیل بەگیش وەك وی دەستی بە قاقاکێشانێ کرد.

ـ ئەو دێوەی بە حەمەدۆك بە ناوبانگە، خۆی هێنا سەر شکڵی مارێکی، بە پەنا یاوەری دا خوشی و بۆی دەرچوو. یاوەری خۆشەویست و بەرێزی ئێمەش کە ئەوەی زانی، خەڵکی سی گوندانی لە گەڵ دوو گورهان ژاندەرمە کۆ کردەوە و بردنی‌یە شەڕی ماران. یاوەر لەو شەڕە قارەمانانەیە دا توانی پێنسەد ماران بکوژێ... نا، چم گوت؟ زیاتر، هەزار و نۆسەد و نەوەد و نۆ ماری لە عەرزێ دان! شەڕەکە یەکجار گەورە بوو! کاتێك ڕۆژ ئاوا بوو، کەلاکی مارانیان کۆ کردنەوە و لە سەر یەکیان کەڵەکە کردن، دیتیان ئەستوورایی کۆی کەلاکە ماران باوەشی پێنج پیاوانی لێ ناگاتەوە! بەڵێ، یاوەری ئەبەز و قارەمانی ئێمە هەزار و نۆسەد و نەوەد و نۆ ماری لە لەشکری ماران کوشت و پاشماوەی مارەکانیش کە ئەوەیان دی، پاشەکشەیان کرد...

ـ بەسە مورتەزاغا... کورە خەریکە لە بەر پێکەنینێ بپسێم.

بەگی گەورە هێندە پێ‌کەنیبوو، ناچار دەستی بە زگی گرتبوو، تا بتوانێ خۆی ڕاگرێ.

ـ ڕاست دەکەی مورتەزاغا، وەڵڵاهی یاوەر کەڵەکباز و بێ‌چاوورووە. دیارە پێویست نیە ئەوەی بە ئاشکرا بڵێین، بەڵام ئەو بە کەس ناوەستێ، بە ماری بەستەزمانی بێ‌ئازار نەبێ... ئەویش دەبێ خەڵکی سی دێیانی لەگەڵ بێ، جا دەوێرێ شەڕی مارانیش بکا.

ـ دەبینی هەر لە سایەی سەری ئەو یاوەرەیەوە، هێندەی پێ‌ناچێ حەمەدۆك ڕیشەی هەموومان لە بن دەردێنێ. وەك عەلی‌یەشەل گێڕاویەتەوە... دەبێ ئەو جار نۆرەی تۆ بێ بکوژرێی...

ـ ئەمنیش لە سەرچاوەیەکی جێگای متمانەم بیستوە. دەبێ هەرواش بێ مورتەزاغا. ئەگەر ئەو کابرا چەتەیە لە پێش دا ئەمن نەکوژێ، چۆن دەتوانێ دەسەڵاتی بە سەر ئەو شارەی دا هەبێ؟

مورتەزاغا گوڕاندی:

ـ قەت شتی وای بۆ ناکرێ خودات لێ‌ڕازی بێ! بەڵام عەلی‌یەشەل ئەمن دەکوژێ!

ـ کورە بۆ خاتری خودای وا مەڵێ، شتی واش نابێ. ئێمە بە یارمەتیی عەلی‌یەشەل بەگی نەبێ، قەت ناتوانین ڕۆژێك حەمەدۆکی بگرین.

مورتەزا بە نارەحەتی‌یەوە گوتی:

ـ بەو سەگەی مەلێ"بەگ". دیسان ئەوە دەیلێمەوە کە ئەو بیر لە کوشتنی من دەکاتەوە.

ـ ئەتۆ لە هەڵە دای.

ـ بەڵام ئەمن بڕیارم داوە بیکوژم، تەنانەت ئەگەر هەموو سامانی خۆشم لە سەر ئەو کارەی دابنێم.

ـ ئەوەی بکەی، هەڵەیەکی گەورە دەکەی!

ـ ئەمن دڵنیام ئەگەر دەستوبردێ نەکەم و نەیکوژم، ئەو ئەمن دەکوژێ.

ماوەیەکی زۆر لە سەر ئەو مەسەلەیە مشتومڕیان بوو. ئاخرەکەی خەلیل بەگ چاوی دەچاوی مورتەزای بڕی و گوتی:

ـ چەندی دەدەی ئەگەر یەکێك عەلیت بۆ بکوژێ؟

ـ بۆخۆت شتێکی دانێ! ئەمن ئامادەم هەرچی پێویست بێ بیدەم. وەڵڵاهی ئەتۆ ئەو کارەم بۆ جێبەجێ بکەی، هەرچی بتەوێ دەتدەمێ!

خەلیل بەگ پێکەنی:

ـ ئەمن بۆخۆم پووڵم ناوێ، بەڵام دەبێ بیری لێبکەمەوە. پێموانیە لەکۆلکرنەوەی عەلییە شەلی هێندەش زەحمەت بێ.

مورتەزا غاری دا پێشێ و بە دەستی خەلیل بەگی دا نووسا:

ـ ئەوەی بکەی گیانی من ڕزگار دەکەی! باوەڕ بکە لە مردنێم ڕزگار دەکەی و هەتا هەم منەتبارت دەبم.

خەلیل بەگ لێوەکانی کۆ کردەوە و نێوچاوانی تێکنا. کاتێك وای دەکرد، نیشانەی ئەوە بوو ئیدی گاڵتە ناکا. مورتەزاش ئەوەی باش دەزانی:

ـ ئەوە هاسانە، لەکۆلکردنەوەی عەلی زۆر هاسانە. دەتوانم بڵێم هەر ئەمشۆ بیکوژن، بەڵام گرفتەکە ئەوەیە کە...

مورتەزاغا قسەکەی پێبڕێ و بە پەلە گوتی:

ـ چی؟ گرفتەکە چییە؟ تکات لێدەکەم پێم بڵێ چ گرفتێك دێتە پێش؟

ـ ئەگەر ئێمە عەلییە شەلی بکوژین، حەمەدۆك قەت نامانبەخشێ! ئەمن و تۆ هیچ، وەڵڵاهی هەموو ئەو شارەی دە قوڕو خۆڵەمێشێ دا نوقم دەکا!

ـ ڕاست دەکەی. حەمەدۆك قەت ئەوەی قبووڵ ناکا.

ـ بەڵام ئەوەشت با پێبڵێم، حەمەدۆك نازانێ عەلی پیاوی ئێمەیە و بۆ ئێمە كار دەكا، ئەگەر بەوەی بزانێ، هەر بۆخۆی، بە دەستی خۆی، سەری لێهەڵدەقەنێ.

ـ دەی باشە! ئەگەر وابێ، با ئێمە كارێكی وا بكەین حەمەدۆك بەو شتەی بزانێ و دیارە ئەو كاتی...

ـ بەڵام ئەگەر ئێمە عەلی‌یە شەلمان نەبێ، كەس دەرووەستی حەمەدی نایە! كێ دەتوانێ جێگای ویان بۆ بگرێتەوە؟ ها؟ بەڵام مورتەزا ئەوە پێتدەڵێم، ئەوەی لەمنت بیست، نەكەی بۆ كەسی دی بگێڕی‌یەوە! ئەوە دەبێ لە بەینی من و تۆ دا بمێنێتەوە!

مورتەزا لە جێی خۆی دەرپەڕی و ویستی بگورێنێ، بەڵام خەلیل‌بەگ دەسبەجێ دەستی بە زاری‌یەوە نا و بێدەنگی كرد:

ـ گوێت لێبێ بزانە دەڵێم چی! ئەو قسەیە ئاشكرا بێ، ئەگەر عەلی‌یەشەل بە هەر شێوەیەك و لە هەر كوێیەك خۆی بشارێتەوە، تەنانەت ئەگەر بچێتە نێو سندووقێكی ئاسنیشەوە و دەركی سندووقەكەی لە سەر خۆی داخا، حەمەدۆك دەیبینێتەوە و لەتوپەتی دەكا. وەبیرت نایە وەختی شەڕی سەربەخۆیی چۆن بوو؟ یاغی‌یەكان خەیانەتیان لە هیچ‌كەس قبووڵ نەدەكرد. ئەتۆ دەڵێی نازانی چەتە چۆن دەجووڵێنەوە! دەڵێی هێشتا حەمەدۆكت نەناسیوە!

ـ چۆنم نەناسیوە، ناسیومە و ئەوانە دەزانم. ئەتۆ لە مەلا دۆرانیش بپرسی، باسوخواسی عەلیت بۆ دەكا و پێت دەڵێ ئەو پیاوی حەمەدی‌یە، وەك چۆن هەر مەلا بۆخۆشی بە ڕواڵەت لەگەڵ ئێمەیە، بەڵام ئەمن لە چاوانی ڕا دەزانم ئەو لە دوژمنی بابەكوشتەشمان خراپترە! قەولت پێدەدەم بۆی هەڵكەوێ، هەموومان دەكوژێ. ئەو شەوەی حەمەد مەحموداغای كوشت، لە ماڵە وی ڕا هاتبوو و عەلی‌یەشەلیشی لە گەڵ ببوو، بەڵام دەزانم ئەتۆ باوەڕ بە وەش ناكەی...

ـ بێدەنگ بە! بۆ خاتری خودای و هەرچی خودا خۆشی دەوێ، لەخۆڕا قسان بۆ عەلی هەڵمەبەستە مورتەزاغا! پیاوی چاك بە مەیەڵە كەس گوێی لەو قسانە بێ، كە ئێستا لە لای من دەیان‌كەی...

لە پڕ مورتەزا ترسی ڕێ‌نیشت و بێدەنگ بوو. ماندوو ببوو و نەیدەزانی ڕوو دە كوێ كا. جاری وا بوو لە دڵی خۆی دا دەی‌گوت: قیرو سیا! با بچم حەمەدۆكی ببینمەوە، بزانم ئەو پیاوە نازایە چ كەسێكە كە بە تاقی تەنێ لە بەرامبەر وڵاتێك دا ڕاوەستاوە، ئەو جار قسەی لە گەڵ بكەم و لە بەری بپاڕێمەوە بم بەخشێ. دیارە دەبێ پیاوێكی ئاوا گەورەش لە ئاغایەكی ماڵوێرانی بێ‌تاوان و بێ‌كەسی وەك من خۆش بێ.

ـ ئاخر خۆ قسەکە هەر بە وەندە نابڕێتەوە. ئەتۆ تاریفی حەمەدۆکیت کردوە، ئەتۆ حەمەدۆکت هێناوەتە ڕیزی پیاوچاکان، لە لای هەموو کەس ئەوەت باس کردوە و هەموو خەلکی ئەدەنە و ئەنکەرەی پێتەختیش ئەو قسەیەی تۆیان بیستوە. دەڵێن مستەفا کەمالیش ئەوەی بە گوێی گەیشتۆتەوە.

ـ ئەوەی ئەمن سەبارەت بە حەمەدیم گوتوە، هەمووی ڕاستە. ئەمن قەت درۆودەلەسەم نەبووە و شت هەتا بناخەیەکی نەبووبێ بە زاری من دا نەهاتوە!

ـ ئەتۆ دەبێ گوتبێتت کە کاتێك حەمەد هاتۆتە نێو ژوورەکەی ئێوەوە، گۆیەك ڕووناکایی بە دەورەوە بووە، گۆیەکە تەقیوەتەوە و ژوورەکەی پڕ کردوە لە نوور.

ـ ڕاست وابوو، لە پێش دا حەمەدۆکم نەدی، ئەوەی دیتم گۆیەك نوور بوو کە چاوی لەبەر هەڵنەدەهات و دەکرێ بڵێم کوێری کردم. گۆیەکە سێ جاران تەقی‌یەوە و پاشان هەر مەپرسە چم دی... مەحموداغای بەستەزمان شەلاڵی خوێنێ بوو.

ـ شتی دیکە چت دی برام، دەڵێن گوتووتە کە...

خەلیل بەگ هێندێك بێدەنگ بوو و دوایە دەستی پێکردەوە:

ـ ... گوتووتە ئەنگوستیلەیەکت دە قامکی دا دیتوە کە وەك ڕۆژێ درەوشاوەتەوە و ئەوەش هەر ئەو ئەنگوستیلەیە کە دایەسوڵتان داویەتێ، گوتووتە هەرکەس ئەو ئەنگوستیلەیەی پێبێ، گوللەی وێناکەوێ، وێشی کەوێ، کاری لێناکا، گوتووتە ئەگەر گوللە کاریشی لێبکا، نایکوژێ و هەروەها گوتووشتە شیر و چەقۆ نایبڕن، بچێتە نێو کوورەی ئاوریش ناسووتێ، دە گۆمێش کەوێ ناخنکێ!

ـ بەڵێ ئەوانە هەموو ڕاستن، هیچ گومان لە ڕاستیی ئەوانە دا نیە!

ـ کوڕە مورتەزاغا، ئەتۆ دەڵێی بە تەواوی شێت بووی! بۆ خاتری خودای چۆن پێتوایە ئەوانە هەموو ڕاستن؟

ـ بەڵێ پێموایە ئەوانە هەموو ڕاستن! چۆن؟! هەزار ساڵ دەبێ خەڵك ئەو چەشنە کەرامەت و موعجیزانە لە خانەقای چلچاوی‌یەوە دەبینن.

خەلیل بەگ بە تەوسەوە گوتی:

ـ بەڵێ... بەڵێ، ئاسکە کێوی هەموو ڕۆژێ لە شاخی ڕا دێنە خوار و لە خانەقای چلچاوی دەیاندۆشن؟ نێرییە کێویش دێن ملیان دەدەنە بەر چەقۆی، هەتا بۆ خانەقایەیان بکوژنەوە، وانیە؟!

مورتەزاغا زۆر لە سەرەخۆ و نەرم گوتی:

ــ دەی ئەوە ڕاستە ئیدی! پێم‌گوتی هەزار ساڵ زیاترە ئەو شتانە لەو خانەقایەی ڕوو دەدەن. بەڵگەش بۆ ئەو شتانە هەن. شتێکی دیش!.. دایە سولتان سندووقێکی هەیە، ئەو سندووقە کراسێکی تیّدایە کە بۆنێکی زۆر خۆشی لیّدی و نۆسەد و نەوەدو نۆ ئایەتی قورئانیّ و سێهەزار و سێسەد و سی و سیّ دوعای لە سەر نووسراونەوە. قەرارە دایە سولتان ئەو کراسەی بدا بە حەمەدۆکی! هەروەها شمشێرێکیشی دەداتیّ کە نۆسەد و نەوەد و نۆ پیاوی بە گورد بە یەکەوە، نە بۆیان هەڵدیّ و نە دەتوانن لە دیوار ــ ئەو شوێنەی پێوەی هەڵاوەسراوە ی بکەنەوە. ئەوە هەر ئەو شمشێرەیە کە سولتان سەلاحەددینی ئەییووبی بە تاقی تەنی پێشی لەشکری خاچپەرستانی پیّگرتبوو. هەرکەس ئەو شمشێرەی پیّبیّ، لەشکرێکی پیّناوەستیّ. هەر کەسیش کراسەکەی دەبەر دابیّ، کە گوتم ئەو هەموو ئایەت و دوعایانەی لە سەر نووسراوەنەوە، دەتوانیّ وەك باڵندەی بفڕیّ، خۆی نەدیو بکا، یان خۆی بکاتە پارچە تیشکێك لە ئاسمانیّ...

ــ کوڕە لێیبڕەوە، ئەتۆ وا دیارە هەر بە تەواوی خەرفاوی مورتەزاغا! شمشێر و کراس و ودمی چی؟! ئەوانە هەموویان قسەی بیّمانا و بنەمان! هەموویان خەیاڵات و ئەفسانەن!

ــ نەخێر وانیە، هەموو دنیا شاهیدە کە ئەوانە هەن. هەزار ساڵە خەڵك ئەوانە دەزانیّ و دەیانبینیّ! ئەتۆ پێتوایە خەڵك شێتن؟! چۆن دەبیّ ئەو خەڵکە ئاوا توند باوەڕی بە شتێکی هەبیّ و نەشیدیبیّ؟ هەزار ساڵە خەڵك دەزانیّ کە ئەو شتە سەیرانە لە خانەقای چلچاوی ڕوو دەدەن...

ــ هەموویان درۆن و دایە سولتانیش هەر ژنێکی سووك و حەکەدارە و هیچی دی.

ئەوە زۆر لە دڵی مورتەزاغای گران هات. لە ناڕەحەتی‌یان لە جێی خۆی دەرەپەڕی، لە خەلیل‌بەگی چووە پێشیّ و لە حاڵێك دا دەستی هەڵێنابوو و قامکی ڕادەوەشاند گوتی:

ــ چی؟ چی؟ ئەوە دەڵێی چی؟ کوڕە سەبارەت بەو کوفرەی هەر ئێستا کردت، دەسبەجیّ دوای لێبووردن لە خوای بکە، هەتا برووسکەیەك لە ماڵەکەی نەداوی و وێرانی نەکردوە، هەتا هەموو منداڵەکانت تیّدا نەچوون، هەتا بۆخۆشت خودا غەزەبی لیّنەگرتووی، بڵیّ خودایە تۆبە! خودایە بمبەخشە پەشیمانم. ئەمنیش هەر بۆت دەپاڕێمەوە و دوعات بۆ دەکەم خودا و پیاوچاکان بتبەخشن!

خەلیل‌بەگیش ڕاست بۆوە. بەڵام ئەوەندەی مورتەزا تووڕە بوو، هەر بەو ڕادەیە ئەو لەسەرەخۆ و ئارام بوو و بە پێکەنینەوە گوتی:

ــ ئەگەر ئەو حەکەدارە دەرپیّشلە بتوانیّ موعجیزە و کەرامەتان بنوێنیّ، چش، دەبا هەر ئێستا برووسکە خۆم و ماڵەکەم تەفروتونا کا. ئەمن تف لە خانووە گڵاوەکەشی دەکەم.

پاشان هەردووك دەستی پان کردنەوە و گوتی:

ـ فەرموو مورتەزاغا ئەوە جنێویشم پێدا و هیچیشم لێنەهات. ئەوەتا دەبینی ساغ و سلامەتم! راوەستە بزانە چۆن مشووری ئەو حەکەدارەی دەخۆم. قەرار بێ لە کۆڵەکەی بەستم. ئەو بوو حەمەدۆکی وەبن باڵی خۆی دا و تا ئەو رادەیە پشتی گرت، کە ئێستا خەڵك بە فریشتەی دەزانن و نێوبانگی پیرۆزبوونی لە هەموو چیای توورووس و تەواوی چوکووراوایە گەڕاوە. ئێستا ئیدی کەس حەمەدی پێناگیرێ. بەڵێ، دەبێ ئەمن ئەو ژنەی بگرم و بەو دەستانەی خۆم لە دارێی بەستم.

مورتەزاغا زۆری هەوڵ دا وەڵامی بداتەوە، تێیبگەیەنێ کە ئەو قسانە کوفرن و خودا غەزەبی لێدەگرێ، بەڵام خەلیلبەگ گوێێ نەدایە و بێدەنگ نەبوو. مورتەزا ئەوەندەی گوڕاندبوو کە ئیدی گوێی لە قسەکانی وی نەدەبوو، لە عەیبەتان ڕوخساری سوور و شین هەڵگەرابوو و هەر دەفی دەدا. چاوی لە ژێللا هاتبوون و ئازای لەشی دە ئارەقەی دا خووسابوو.

خەلیل بەگ هێشتا هەروا لەسەرەخۆ و نەرم بوو. هەر شلوێ نەدەبوو. پەرداخێك ئاوی لە پێش مورتەزاغای ڕاگرت و گوتی:

ـ زیاتر هەڵمەچۆ ئاغا، ئەو ئاوەی پێداکە!

مورتەزا پەرداخەکەی بە زارییەوە نا و یەکبێن خواردییەوە.

ـ خەلیل، داوا لە خودای بکە بتبەخشێ، بە ڕاستی لە خودای بپاڕێوە، دەنا ئەمن دەزانم چت بە سەر دێ!

ئەو جار لە حالێك دا لە ماندوویی‌یان هەناسەبڕکێی بوو، دانیشتەوە و بە دەسەسڕێکی ئارەقەی نێوچاوانی سڕییەوە. خەلیلبەگ دەستی بە قسان کردەوە. ئەوجار قسەکانی تەشەراویتر بوون:

ـ هەرچی سەبارەت بە حەمەدی گوتووتە، زەرەرەکەی بۆخۆت دەگەڕێتەوە! بۆچما ئەتۆ نازانێ جاسووسان راپۆرتت لێدەدەن و هەموو قسەکانت دەگەنەوە پێتەخت؟ مستەفا کەماڵ نێوانێکی وای لە گەڵ ئەو چەشنە خورافاتەی نیە. ئەو وڵاتی ئێمەی هەم لە دەستی یۆنانی‌یەکان ڕزگار کرد و هەم لە دەست ئەو کەڵەکباز و کەللەوشکانە! دیارە ئێمەش باوەڕمان بە وی هەیە و متمانەی پێدەکەین!

مورتەزا دیسان لە جێی خۆی هەستا:

ـ خودا بمانبەخشێ! کوڕە تۆبەی بکە تۆبە! ئینسانی موسوڵمان بێجگە لە خودای باوەڕی بە هیچی دیکە نیە! هیوادارم ئەو خودایە بتبەخشێ!

ـ ئەو سەڵێتەیە و ئەتۆ، ئەو هەتیوە چەتەیەتان کردۆتە شێخێکی تەواو. وای لێهاتوە جووتێرەکان هەموو باوەڕیان پێی هەیە و دەیپارێزن، هەر بۆیەش یاوەری ماڵوێران بۆی ناگیرێ.

ـ وانیە! نە دایە سوڵتان و نە ئەمن، هیچمان حەمەدمان نەکردوە بە شێخ و پیاوچاك. خودا کردوویەتی. بەڵێ ئەو لە ڕیزی پیاوچاکان دایە!

هەرچەند خەلیلبەگی گەورە زۆر پیاوێکی مەند و لەسەرەخۆ بوو و لەو بارەوە نێوبانگی هەبوو، کاتێك ئەوەی بیست، ئیدی خۆی پێڕانەگیرا، ڕاست بۆوە و یەخەی مورتەزاغای گرت. مورتەزاش یەخەی وی گرت و بەوجۆرە ئەو دووانە تاوێکی باش یەکتریان ڕاوەشاند و بەسەر یەکتر دا گوراندیان. ئاخرەکەشی ماندوو بوون، دەستیان لە یەخەی یەکتری بەردا و دانیشتنەوە. خەلیل بەگ پێش مورتەزاغای پشووی هاتەوە بەرێ:

ـ بمبوورە ئاغا، داوات لێدەکەم چاوپۆشیم لێبکە، ئەمن بۆ وەم بانگ نەکردبووی لە گەڵت بەشەڕ بێم. بە ڕاستی داوای لێبووردن دەکەم!

ـ ئەمن دەبێ داوای لێبووردن بکەم ئاغا! ئەمن هەڵەم کرد کە تۆم بە کافر ناو برد، ئەتۆ کە دۆستمی، برامی و لە گلێنەی چاوم خۆشتر دەوێی!

ـ قەی ناکا، وا دیارە هیچمان خۆمان پێڕانەگیرا و هەڵچووین. دەبوو بە سەر خۆمان دا زاڵ بووباین، بەڵام دەی، ڕەنگە ئەمەش لەبەر ئەوە بێ، کە ئەو مەسەلەیە پێوەندیی بە مان و نەمانمانەوە هەیە.

مورتەزاغا دووپاتی کردەوە:

ـ بەڵێ، مەسەلەی مردن و ژینە.

ـ سەبارەت بە حەمەدیش ئەتۆ ڕاست دەکەی! جووتێرەکانمان، دەسەڵاتدارەکانمان و تەنانەت سەرکۆماریش، هەر ئاوا دەڵێن. هەموویان حەمەدیان پێ پیاوچاکە و باوەڕیان پێیەتی. ئەوە لە حاڵێك دایە کە ئێمە لە ترسانی خەریکە زەندەقمان بچی!

ـ ڕاستە. ئەو دێوەزمەیە... کاتێك مەحمووداغا گوللەکانی وێکەوت و خوێنی لەشی فیچقەی کرد، ئەی هاوار... وەڵلاهی دەتگوت ژوورەکە پڕ بووە لە خوێن! هەر دەتگوت باڵندەیەکی بچکۆلەیە! ئەو چۆلەکە بەستەزمانە ئەو هەموو خوێنەی چۆن دە دەماران دا جێببۆوە؟

ـ بەشەر ئەگەر بریندار بوو، خوێنی هەروا بە خوڕ دەڕژێ، لەشی من و تۆش، ئەگەر نۆرەمان هات، ڕاست ئاوا خوێنی لێدەڕژێ.

ـ وایە.... بەڵام ئێمە عەلی‌یەشەلی چ لێ‌بکەین؟

ـ ئەوە لەستۆی من، بۆخۆم دەزانم چۆن ئەو مەسەلەیەی لە گەڵ وی چارەسەر بکەم.

ـ خودا پشتیوانت بێ! ئەمنیش ئەوە بە قسەی تۆ دەکەم و ئیدی چیی دیکە لە لای خەڵکی باسی حەمەدۆك و دایە سوڵتانی ناکەمەوە.

ـ بەڵێ... منیش ئیدی قەت بە خراپ باسی دایە سوڵتانی ناکەم و قسەی پێ‌ناڵێم. ماڵم وێران بێ، خوا مندالەکانم لێ‌بستێنێ و خوێنم لە دەماران دا وشك کا، ئەگەر جارێکی دی شتی وا بکەمەوە.

ـ زۆر باشە، بەڵام ئەگەر ئێمە بمانەوێ زەفەر بە حەمەدی بەرین، دەبێ خەڵکی لێ‌بکەینە دوژمن. چونکە هەتا جووتێرەکانی لە پشت بن و ئاوا بە پیرۆزی بزانن، ناتوانین تەنانەت تاڵەموویەکیشی لە سەری کەم کەینەوە و لە بەرامبەر دا ئەو یەکە یەکە هەموومان دەکوژێ و تۆوی ئاغایان لەو شارەی دەبڕێ. ئەتۆ عەلی کەرتیشی لە من باشتر دەناسی. هەر کەسی بدەیە دەستی، دەتوانێ بە ئەشکەنجە وە قسەی بێنێ، جا ئیدی بەرد بێ، ئاسن بێ، پۆڵا بێ، یان هەر قوڕ بێ، وەقسە هەر دێ. ئەو وەستای ئەو شتەیە. خۆ دەزانی مەبەستم چی‌یە!

ـ بەڵێ، دەزانم..

ـ ئەو کابرایە ئەشکەنجەگەرێکی زۆر بێ‌ڕەزایە، بەڵام هەر ئەو، ماوەی سێ مانگان لە گەڵ سێ گورهان ژاندەرمە گوندەکانی تووڕووسی پشکنیوە، جووتێرەکانی کوتاوە و دەست ولاقی زۆرانیانی شکاندوە، بەڵام یەك وشەشیان لە زاری نەهاتۆتە دەر. تۆ بڵێی ئەگەر ئێمە هەموو خەڵکی شاخی، لە منداڵی حەوت ساڵەوە هەتا پیری حەفتا ساڵەیان لە ژێر دار و قەمچی دا شەل و کوت کەین و ئازای لەشیان داغ کەین، بتوانین تاقەکەسێکشیان رازی کەین خەیانەت بە حەمەدی بکا؟

ـ قەت ناتوانین.

ـ ئەوەش بەو مانایەیە کە ئێمە هەر حەمەدۆکمان لە بەرامبەر دا ڕانەوەستاوە، بەڵکوو تەواوی جووتێرەکانی تووڕووسیش، جووتێرەکانی چوکووڕاوای پان و بەرینیش و هەموو جووتێرەکانی ئەنەدۆڵییش دوژمنمانن. دەی ئەوەش یانی ئەو نیشتمانەی ئێمە خەباتمان بۆ کردوە، بچووك بۆتەوە. جووتێرەکان دوژمنمانن.

ـ ڕاست دەکەی، ئەوان لێمان بێزارن!

ـ هەر ئەو نەفرەتەش بۆتە هۆی ئەوە کە بە تاقە حەمەدۆکێکی ئەو هەموو گرفتەمان بۆ دروست کەن.

ـ جا ئەگەر ڕۆژێکی ببنە پێنج حەمەدۆك، یان دە حەمەدۆك، ئەوکاتی ڕوو دە کوێ کەین؟
ـ یان ئەگەر ببنە هەزار، یان میلیۆنێك؟
ـ دەی ئەوە قسەکەی من وەڕاست گەڕا! ئەگەر ئەمن هەر لە هەوەڵێ ڕا بەردەوام دووپاتم دەکردەوە کە پیاوی چاك بن با سەری مارەکەی پێش گەورەبوونێ پان کەینەوە و ئێوەش پێمپێدەکەنین، ئەوەیە ئاکامەکەی! دە هەڵیگرنەوە!
ـ وا بوو، ئێمە قەت دەو شتەی نەگەیشتین و بە هێندمان نەگرت. ئێستاش مارەکە بۆتە هەژدیها! ئێستا هەتا کارەکە لەوەش زیاتر وە درەنگی‌یە نەکەوتوە، چ بکەین باشە؟
مورتەزاغا هەردووك دەستی ڕاوەشاندن و نرکاندی:
ـ باداوای هێزی زیاتر بکەین! با داوا بکەین لەشکرێکی تەواومان بۆ بنێرن، لەوەی زیاتر چ ڕێگایەکی دیکەمان هەیە؟!
ـ ئەوەمان بۆ ناکرێ! عارف سایم بەگ ئێشتاش لێمان تووڕەیە. دەبێ بۆ ئەو مەبەستە هەر پشت بە هێزی خۆمان ببەستین!
ـ ڕاست دەکەی، ئاخ... دەستی شکاوم! ئەو وەختەی ئەمن هاوارم دەکرد، هێشتا حەمەدۆك نەببووە شێخ و فریشتە... حەیف بەقسەتان نەکردم!
ئەوجار ئاخێکی وا قووڵی هەڵکێشا، دەتگوت تەختی سینگی خەریکە بقەڵشێ.
ـ لە ئێستاوە ئەمن و ئەتۆ... ئاخر بەراستی ئەگەر دەو شارەی دا کەسێك هەبێ، ئەختێك ئەقڵی دە کەللەی دا بێ، ئەتۆی!
ـ تکا دەکەم...
ـ نا... شەرمێ مەکە، وایە ئیدی مورتەزاغا!
بەو پێهەڵگوتنەی مورتەزاغا گەش بۆوە و هاتەوە سەرحاڵ.
ـ پێش هەمووو شتێکی دەبێ ئێمە چارەیەکی ئەو ئەسپەی بکەین، ئەسپەکەی حەمەدۆکی! هەموو ئەوەی دەزانن، یاوەر، حاکم، زولفۆ ـ کە لە هەمووان زیاتر دە بیری ئەو ئەسپەی دایە ـ تەنانەت پارێزگارە گێلەکەشمان، قازی و دادەستێن و ئەوانی دیش هەموو... هەتا ئەو ئەسپەی نەگرین، نەیهێنین لە نێوەڕاستی مەیدانی ئەم شارەی نەیکوژین، قەت هیچمان لە گەڵ حەمەدۆکی پی‌ناکرێ.
ـ ئەو ئەسپە هارە!
ـ بەڵێ وایە، تەلەسمبەندیشە!

ـ جووتێرەکان ئەویش وەك حەمەدۆکی دەپارێزن!

ـ ئەو ئەسپە وەك ئەسپی کوێرۆغڵی نەمرە، کەس بۆی ناگیرێ و هەر لە بناخە دا کەس ناتوانێ دەستیشی لێدا. سوور دەبینی ئەوە لە پێشت ڕاوەستاوە، لە پڕ دەبێتە گرێك، یان دەبێتە ئاسکێك، یان هەڵۆیەك و دەفڕێ، دەچێتە ئاسمانێ!

ـ ئەو ئەسپە دێوەزمەیە!

ـ بەڕاستی ژانەسەرێکی گەورەیە، لە خودی حەمەدۆکی خراپترە. دەڵێن روحی حەمەدی دەبەر ئەو ئەسپەی دایە. لە حیکایەتان دا بیستووتە ئیدی، وا هەیە جندۆکەیەك لە نێو لەشی باڵندەیەکی چکۆلە دا بەند کراوە، وەك دە قەفەزێکی‌یان نابێ... جا ئەگەر کەسێك باڵندەکەی بکوژێ، جندۆکەکە دەڕواتە دەرێ...

ـ ئەوەی گوتوویانە ڕاست ڕاستە!

مورتەزاغا کە دەی دی بێباوەڕێکی وەك خەلیل بەگی ئاوا گۆڕاوە، ئەوەندە خۆشحاڵ بوو کە هێندەی نەمابوو لە نێو مۆبلەکەی دەرپەڕێ و هەردووك لاڕوومەتی ماچ کا.

ـ کەوابوو ئێمە دەبێ ئەو ئەسپەی بدۆزینەوە و بی‌کوژین. ئەوەی بکەین، حەمەدۆك نەش‌کوژرێ، نیوەگیان دەبێ. جا ئەو جار بادەدەینەوە سەر دایە سوڵتانێ و مشووری دەخۆین. حەمەدۆك ئەو دووانەی لێبنەوە، تەنانەت ئەگەر وەك کوێرۆغڵی و حەزرەتی عەلیش بەهێزبێ، ناتوانێ چی‌دی لە شاخی بژی. ئەو ئەسپەش وەك دایە سوڵتانی نیشانەی مەبارەکی و پیرۆزیە. کوێرۆغڵی مرد، بەڵام جووتێرەکان، (کانالی‌یەکان) هەرگیز باوەڕیان بەوە نەکرد کە ئەسپەکەشی مردبێ. ئەوان پێیان وایە هەتا دنیا دنیایە، ئەو ئەسپە هەر دەمێنێ.

ـ بەڵام ئەوە ئەفسانە نیە. ئەسپی کوێرۆغڵی ئێستاش ماوە. ئەو ئەسپە ساڵێ جارێك لە بازاڕی "ئالەپۆ"ی بە هەزارێکی دەفرۆشرێ! تەنانەت دەڵێن هەر ئەو ئەسپە لە هەموو بازاڕەکانی دنیایە دەفرۆشرێ و ئەو کابرا هەزارەی دەی‌کڕێ، خێر و بەرەکەت و ماڵ و سامانی بە نسیب دەبێ.

ـ دیارە ئەو ئەفسانانەی خەڵك درۆستیان دەکەن، نیشانەی بزووتنەوە و دژایەتی‌کردنن. ئەو کاتەی خەڵك ناوێرن ڕاستەوخۆ هێرشمان بکەنەسەر، ئەسپ، گورگ، چەقەڵ و جروجانەوەری دیکە دەکەنە شتی پیرۆز و نەمر.

ـ کوێرۆغڵیش نەمردوە!

خەلیل بەگ لە حاڵێك دا خۆی وەك مرۆڤێکی ساکار و بێفڕوفێڵ دەنواند، پرسی:

ـ ئەگەر نەمردووە، ئەدی چی لیّهاتوە؟
ـ لە گەڵ چل سوارەی غەیبی‌یە! نەتزانیوە؟ بەسەرهاتی کوڕی ئاسنگەرەکەت نەبیستوە؟
ـ ناوەڵلا.
ـ چۆن دەبیّ نەتبیستبیّ؟ رۆژیّکی کوڕی ئاسنگەری، لە گەڵ کویّرۆغلی، لە شاخی، تووشی شوانیّکی دەبن. شوانەکە لوولەیەکی ئاسنیی بە شانی‌یەوە دەبیّ. کوڕی ئاسنگەری لیّی‌دەپرسیّ، ئەوە چی‌یە بە شانتەوە؟ شوانە دەڵیّ ئەوە چەکە.
مورتەزا کاتیّك ئەو بەسەرهاتەی کویّرۆغلیی دەگیّڕایەوە و دەی‌دی کە بەگی گەورە گویّی بۆ ڕادەگریّ، هیّندە خۆشحاڵ بوو، چاوەکانی زەق ببوون و هیّندەی نەمابوو لە خۆشی‌یان بفڕیّ:
ـ بەڵیّ، کوڕی ئاسنگەری گوتی:" باشە ئەو چەکە بە کاری چ دیّ؟" شوانە وەڵامی دایەوە:" ئەوە ژیان لە مرۆڤ دەستیّنیّ و مەرگ بڵاو دەکاتەوە"، کوڕی ئاسنگەری گوتی:" دادەی لە سەر ئیّمە تاقیی کەوە، بزانین ئیّمەی پیّ‌دەکوژریّ"؟ شوانەکە گوتی شتی وا ناکەم و داوای لیّکرد دەست لەو تاقیکردنەوەیە بکیّشیّتەوە، بەڵام ئەو لە کۆڵی نەبۆوە و هەر لە سەر داواکەی سوور بوو. سەرەنجام شوانە لوولەی چەکەکەی دەسینگی کوڕی ئاسنگەری دەکا و پەلەپیتکەی دەکیّشیّ و هەرچەند ئەو پیاویّکی کەڵەگەت و بەخۆوەش بوو، وەك داربەڕوویەکت بڕیبیّ، بە لا دا دیّ و دەسبەجیّ حەیاتی لیّ‌دەبڕیّ. کویّرۆغلی کە ئەوەی دەبینیّ، دەڵیّ:" ئیّستا کە خەڵك ئاسنیّکی کونیان دروست کردوە، کە مرۆڤی لە دوورەوە دەکوژیّ، ئیدی ئازایەتی و پیاوەتی لە سەر ئەو عەردەی دەوری نەماوە"! لەو کاتەوە دەڕوا و دەچیّتە گەڵ چل سوارەی غەیبی.
ـ ئەو بەسەرهاتە جوان بوو، بەڵام ئەمن نەمبیستوە! کەوابوو کویّرۆغلی لە گەڵ چلسوارەی غەیبی‌یە؟
ـ بەڵیّ، حەمەدۆکیش هەر وای لیّ‌دیّ!
ـ جا ئەوە ڕاست ئەو شتەیە کە ئیّمە بە هەموو توانامانەوە دەبیّ هەوڵ بدەین ڕوو نەدا. هەر بۆیەش دەبیّ لە پیّش دا ئەسپەکەی دەداو خەین و بی‌کوژین، پاشان دایە سوڵتانی بگرین و ناچاری کەین بڵیّ حەمەدۆك لە دین وەرگەڕاوە و کافریّکی ڕووتە.
ـ دایە سوڵتان قەت ڕازی نابیّ ئەوەی بڵیّ!
ـ هەر شتەی بە وەختی خۆی! جاریّ با ئیّمە ئەسپەکەی بگرین!
ـ پاشانیش خودا پشتیوان بیّ!
ـ وا چاترە کاریّکی وا بکەین کە دیّهاتی‌یەکان هاوکاریمان بکەن، بۆخۆیان ئەسپەکەی بگرنەوە و بۆمان بیّنن.

مورتەزا گوتی:

ـ دیارە ئەوە باشترە، جووتیرەکانیش دەبێ هاوکاریمان بکەن.

ـ بەڵێ، بەڵام چۆنیان ڕازی کەین ئەو کارەمان بۆ بکەن؟

مورتەزاغا سەری بەردایەوە، بەقامکی هێندێك چەنەی خوراند و بیری کردەوە. پاشان سەری هەڵێنا و ڕاست چاوی دەچاوی خەلیلبەگی بڕی. دیسان سەری دە بەرخۆ نا و بیری کردەوە، ئەوجار هەستا، دەورێك بە نێو ژوورەکەی دا گەڕا و لە سەر جێی خۆی دانیشتەوە. پاشان دەستی وەبەر چەنەی دا و دەبیرەوە ڕۆچوو، بەڵام هیچ شتێکی تازەی بە بیر دا نەهات.

خەلیل بەگیش بێدەنگ بوو و بیری دەکردەوە. شتێکی بە مێشك دا هاتبوو و چاوەڕوان بوو مورتەزا لە پێش دا وە قسەبێ و بزانێ داخوا ئەویش ڕاست بیری لەو شتە کردۆتەوە، یان نا؟

ـ چ بکەین مورتەزاغا؟ هیچ ڕیگایەکت پێشك نایە؟ ئەو ئەسپە...

ڕوخساری مورتەزای لە پڕێك گەش بۆوە و گوتی:

ـ بۆچی... با، کە گوتت ئەو ئەسپە ...

خەلیل بەگ بە سەرسوڕمانەوە گوتی"

ـ چی؟

ـ ئێمە خەڵاتێك دیاری دەکەین! دەڵێین هەر کەس ئەو ئەسپەمان بە ساغ و سلامەتی بۆ بێنێ، خەڵاتەکەی دەدەینێ. دوای ئەوەی بۆیان هێنایین، جێژنێکی گەورە پێکدێنن و ئەسپەکەی گوللەباران دەکەین. دەتوانین سەری ئەسپەکەی لێکەینەوە و لە شار و گوندەکانی ئەم هەرێمە هەڵیواسین و نیشانی خەڵکی بدەین، بەڵام دەبێ خەڵاتەکە گەورە بێ!

ـ پێتوایە چەندە بێ باشە؟

مورتەزا دیسان بیری کردەوە و دوای ساتێك سەری هەڵێنا:

ـ ئەها... پوولێك بێ...

ـ ئەمڕۆ ئەسپێکی چاك چەندی دێنێ؟ ئەسپێکی ڕەسەنی عەرەبی چەندی دەکا؟ بۆ وێنە هەر ئەسپەکەی خۆت، چەندی لە سەر دادەنێی؟

ـ ئەگەر وابێ...

ـ ئەسپی من ئەسپێکی زۆر ڕەسەن و باشە. با بڵێین ئەگەر بیفرۆشم، داوای سەد لیرەی دەکەم.

ـ کەوابوو...

ـ مەبەستت ڕادەی خەڵاتەکەیە؟

ـ بەڵێ...

مورتەزا هێندێك ڕاما و گوتی:

ـ با هەزار و پێنسەد لیرە بێ. ئەگەر ڕابگەیەنین هەرکەس ئەسپەکەمان بداتە دەستی، خەڵاتێکی ئەوتۆی دەدەینێ، ئیدی پێویست ناکا زۆر چاوەڕوان بین. ئەو خەڵاتە کاری خۆی دەکا!

ـ وایە، بەڵام پووڵێکی ئاوا بۆ تاقە ئەسپێکی، یان تەنانەت بۆ سەری حەمەدۆکیش زۆر نیە؟!

ـ ئەمن ئامادەم بە تەنیا هەزار لیران لە بەرامبەر سەری حەمەدۆکی دا ببەخشم.

ـ گوێ بگرە مورتەزا قارەمانەکەم! برا چاوڕەشە چاو جوانەکەم، ئێمە ناتوانین خەڵاتێك دیاری بکەین کە لە پازدە هێندی نرخی ئەسپێکی ڕەسەن و جوان زیاتر بێ، ئەویش بۆ ئەسپی چەتەیەکی!

ـ بێگومان... بەڵام ئەدی چبکەین؟ جووتێرەکان قەت بە خۆڕایی، یان بە پووڵێکی کەم ناچن هەوڵی دەداوخستنی ئەسپێك بدەن، کە تەلەسمبەندە و پێیان وایە پیرۆزیشە! ئەوان ئامادە نابن ژیان، ماڵ و هەموو خزم و کەسی خۆیان لە بەرامبەر خەڵاتێکی کەم دا فیدا بکەن! بەڵێ ئەمن بە تەنیا ئامادەم هەزار لیرەی بۆو ئەسپەی دابنێم! بەو پووڵەی جووتێرەکان خوداشت دەدەنە دەستی.

ـ دەی باشە، ئەوە خەڵاتەکەمان دیاری کرد، با هەزار لیرە بێ!

ـ دەتوانم بیکەمە هەزار و پێنسەتیش.

ـ هەرچۆنێك بێ ئێمە هەر ناتوانین هەزار و پێنسەد لیرەی لە پێناوی ئەسپێکی قۆتڕ دا بدەین.

ـ دەزانم. بەڵام ئەو ئەسپە لە پێش دا عەلی سەفابەگ لە عورفای ڕا هێنای. ئەوە چەند ساڵ پێش ئێستا بوو. ئێستاش ئەمن ئەو ئەسپەی نیوەشەوێش ببینم، دەیناسمەوە. عەلیسەفابەگی بەستەزمان زۆری شایی پێیبوو، بەڵام دەرفەتی نەهێنا جارێکی سواری بێ و بە خەڵکی نیشان بدا. خێری لێنەدی! هەر ئەو ئەسپەش بوو بە هۆی کوژرانی. دیارە ئەوە لە چاو ئەسپی من زۆر پیرە، بەڵام هەرچۆنێك بێ، ئەسپی حەمەدۆکییە ئیدی!

خەلیلبەگ لە جێی خۆی هەستا و چوو بۆ لای مورتەزای، کە ئەویش هەستابووە سەر پێ و دەستی لە سەر شانی دانا:

ـ ئێمە خەڵاتەکەی دەکەینە هەزار لیرە و ڕایدەگەیەنین. ئەگەر دێهاتییەکان بە وەندەی نەیانکرد، زیادی دەکەین، دەیکەینە هەزار و پێنسەد!

ـ تەنانەت دووهەزاریش، دەهەزاریش... ئەگەر پێویست بێ. خەمی پووڵیت نەبێ. ئەوە بڕیمانەوە! ئەدی عەلییەشەلی چ لێبکەین؟

ـ هێندە وەدووی وی مەکەوە، بۆ خاتری خودای! گوتم ئەو لەستۆی من...

ـ باشه، باشه، ئەو بەعۆدەی تۆ... ئەمن چارەنووس و پاشەڕۆژی خۆم و منداڵەکانم دە بەر دەستی تۆ دەنێم!

ـ ئەمشۆ ئێمە لێرە یەکتر دەبینینەوە و بە بۆنەی گرتنی ئەم بڕیارەوە خۆشی ڕادەبوێرین. سبەینێش ڕادەی خەڵاتەکە ڕادەگەیەنین.

ـ ئامۆژگاریی من ئەوەیە کە لە سەر هەزار و پێنسەتەکەی ساغ بی‌یەوە! ئەمن چاك ئەو خەڵکەی دەناسم. کاتێك ئێمە ئەو ئەسپەیان لێ‌دەکڕین، وەك ئەوەی وایە کە خودا و ئیمانەکەشیان لێ‌بکڕین! لە سەر هەزاروپێنسەتەکەی سوور بە، پیاوی چابە! بەڵی، ئەو ئەسپە ئەوەندەی ناهێنێ، بەڵام بۆ کڕینی بیر و باوەڕیان کەمە.

ـ دەتوانین ئەمشۆ زیاتر لە سەر ئەوەی قسە بکەین. دەتوانین هەتا سێ‌هەزاریشی بەرینە سەرێ.

مورتەزا سەری لەقاند:

ـ بەڵێ، دەکرێ.

هەر ئەوێ ئێوارێ لە ماڵی خەلیلبەگی کۆ بوونەوە. جەمی شەوێیان گۆشتکەوی برژاو بوو. تێروپڕیان خوارد و ڕاکی‌یەکی زۆریشیان پێ‌دا کرد. زۆر سەبارەت بە حەمەدۆك و ئەسپەکەی دوان و هاوکات باسی عارف سایم بەگ و پێتەختیشیان کرد. پاشان ماوەیەکی باشیش بابەتی قسەیان، کۆزانی، عوسمانلی و هەموو ئاغا و بەگەکانی دەور و بەری جەیهانی بوو. کاتێك شەو درەنگ بوو خۆیان بە سەر پێوە بۆ ڕانەدەگیرا.

ڕۆژی دواتر سامی تورگوت وێنەی سەرە ئەسپێکی لە سەر پارچە کاغەزێکی گەورە کێشایەوە. لە بن وێنەکەش نووسی:

" هەر کەس ئەسپی حەمەدۆکی بدۆزێتەوە و بی‌هێنێ، هەزار و پێنسەد لیرە خەڵات دەکرێ"!

کاتێك سامی کە مامۆستای فێرگەش بوو، وێنەکەی، کە لە سەر چەند کاغەزان کێشابوویەوە، هێنا، خەلیلبەگ چاوی لێ‌کردن و گوتی:

ـ زۆر باشە! زۆر سەرنجڕاکێشە! ئێستا مورتەزاغا دێتە ئێرە، دەبێ ئەویش ئەم وێنانە ببینێ.

سامی سەری لەقاند و گوتی وایە.

مورتەزاغا هاتە ژوور. وەك ڕۆژی پێشوو شەکەت نەبوو، جەغزی بەرچاوی نەمابوون و گنجی نێوچاوانی پڕ ببوونەوە. زۆر گەنجتر دەهاتە بەرچاو. بە دیتنی وێنەکان زۆر خۆشحاڵ بوو و گوتی:

ـ زۆر جوانە، یەکجار باشە! بەڵام نەدبوو ڕەنگی ڕەشت لێ‌دابا، دەبێ سوور و سپی بێ. خەڵاتەکەش دەبێ بە خەتی گەورەتر لە ژێرەوە بنووسرێ و دەبێ دووسەدو پەنجا دانە لەو وێنەیەمان

هەبن، چونکە لە هەر دوورییان، سێڕێیان و چوارڕێیانێکی و هەروەها لە هەر گۆشەیەکی شەقامەکان و گوندەکان، دەبێ یەکێ هەڵاوەسین. بە چەند ڕۆژان دەتوانی ئەوەندە وێنانە بکێشی‌یەوە؟

ـ بە حەوتوویەکی!

ـ چەندت پوولێ دەوێ؟

ـ هەرچەندی بۆخۆت پێتباشە ئاغا!

مورتەزاغا دەستی دەگیرفانی ڕۆکرد و کیسەی پوولیی دەرێنا. ئەسکیناسەکانی نێو کیسەکەی دەرێنا، ژماردنی، چەپکێکی لێ جیا کردنەوە و دانی بە سامیی مامۆستای فێرگەی شار:

ـ ئەوەندە بۆ پیاوێکی هونەرمەندی وەك تۆ کەمە... کاتێك ئەسپەکەمان وەگیر کەوت، ئەتۆخەڵاتی خۆت هەر هەیە، بەڵام ئێستا کارێکی دیکەشم پێتە!

سامی تورگوت ئەسکیناسەکانی دە باغەڵی نا، پاشان سەری هەڵێنا و ڕاست ڕاوەستا:

ـ دەخزمەتت دام، ئاغا!

ـ کاتێك ئەسپەکەمان گرت، ئەمن دەسبەجێ کۆبوونەوەیەکی لە نێوەڕاستی ئەو مەیدانەی شاری پێکدێنم. دەبێ شوێنی کۆبوونەوەکە بە ئاڵایان ڕازابێتەوە. وام داناوە خەڵکی حەفتا دێیان، پێنج شارەدار و سێ حاکمی شار و ناوچە جیرانەکان بانگ کەم. دەبێ خەڵکێکی زۆر کۆوە کەم، ئەوەندە زۆر کە ئەگەر دەرزیی هەڵاوێی، وە عەرزیی نەکەوێ!

ـ بەڵێ ئاغا، چۆنی جەنابت دایئنێی دەبێ وابێ...

ـ جا دەبێ ئەتۆ بچی‌یە سەر سەکۆی قسەکردن، سینگت توند کەی و ...

ـ یانی سینگم دەرپەڕێنم و...

ـ ئەو جار دەبێ دەست بە قسان بکەی و بە شێوەیەك کە هەموو خەڵکەکە گوێی لێبێ، بڵێی:

" لە چیاکانی ئاڵتاوە هەتا دەروازەکانی وییەنێ، ئێمە دوازدە وڵاتمان دروست کردن! دنیا لە ژێر ناڵی ئەسپەکانی ئێمە دا دەی‌ناڵاند! خوێنی ئێمە وەك ڕووباری لەعل و جەواهێرات بە سەر عەردی دا ڕژاوە، ئێمە ئاڵاکانمان بە خوێنی خۆمان سوور کردون، گورگمان وەك سیمبۆلی نەتەوایەتیی خۆمان هەتا ئاسمانێ بەرز کردۆتەوە و ئەو نیشانەیە وەك ڕۆژ و مانگ و ئەستێران بە نرخە و دەدرەوشێتەوە"!

سامی تورگوت لە جێی خۆی چەقیبوو، ڕاست و ئامادە وەك ئەوەی سەربازێك بێ و لە کاتی ڕێزگرتن دابێ. مووی لێ‌نەدەبزووت. سەرت پەڕاندبا، جوولەی نەدەکرد.

ـ خوێنی ئێمە ئاڵاکانمانی پێ‌سوور بووە! ئێمە بەردەوام لە دەریایەك، یان ئوقیانووسێك خوێن دا مەلەمان کردوە! پیاوە هەرە چکۆڵەکانی ئێمە بەقەد سێ گایانیان خوێن دە دەماران دایە! هەر بۆیەش

ئێمە توانیومانە خوێنی خۆمان بە سەر خاکی هەموو دنیایە دا، بە شوێنە هەرە تەریککەوتووەکانی تەواوی ئەم جیهانە دا بڵاو بکەینەوە... ئێمە خوێنمان داوە، خوێنمان بڵاو بۆتەوە...

ــ بەڵێ قوربان، خوێنمان داوە...

ــ هەروەها پیاوی چاك بە لە بیرت نەچێ باسی دەوڵەتی ئێستای تورکیەش بکەی!

ــ جاچۆن ئەوەم لەبیر دەچێ، قوربان؟ دەڵێم ئێمە هەرگیز نایەڵێن ئەو ئەسپە جووتان لە دەوڵەتەکەمان بدا!

ــ هیچ ئەسپێك بۆی نیە وا بکا، تەنانەت ئەسپی کوێرۆغڵی، یان هێسترەکەی حەزرەتی عەلی، یان بۆڕاقی پێغەمبەری، یان ئەسپە ڕەسەنەکەی گەنجعوسمانیش هەر بۆیان نیە، چ بگا بە هێندێك بارگینیقۆتر، یان پیرەکەر، کە چوونە دە کەوڵی ئەسپییەوە!

ــ بەڵێ، ڕاست وا دەڵێم!

ــ بەڵێ بەڵێ، پێمٌوانیە پێویست بێ ئەمن بایەخی مێژووی ئاڵاکەمان وەبیر مامۆستایەکی خوێندنگە بێنمەوە. ئەو ئاڵایەی دە خوێن دا شەڵاڵە! ئاڵای شازدە دەوڵەتی تورك! ئەمن تەنیا دەمەوێ بڵێم کە قسەکانی تۆ دەبێ بۆ هەموو خەڵکەکەی ڕوون کەنەوە، کە ئەو چەشنە ئەسپانە چەندە جێگای مەترسین، ئەو ئەسپانە کە بوونە سیمبۆلی بزووتنەوە وئاژاوە. دەزانم ئەتۆ هەموو ئەو مەبەستانە زۆر لە من باشتر لە وتارەکەت دا دەگونجێنیٚ و ڕۆژێکیش هەر لە سایەی ئەو وشە ئاگرینانەت، کە لە نێو خوێن هەڵدەقوڵن، کە بە ڕاستی سەربەسەر ئاسیایە دێنن، دەبی بە نوێنەر، یان سەرۆکی دەستەی نوێنەرایەتی! ئێستا برۆ و وتارەکەت ئامادە بکە. دایکی نیشتمان چاوی لە تۆیە، بزانێ چیی بۆ دەکەی و چاوەڕوانی ئەوەیە کە وەك نوێنەر هەڵبژێردرێی!

پاشان چەند جاران بە بەریدەستی لە شانی مامۆستای دا و دوای ئەوەی سامی لە ژوورەکە چووە دەرێ، ڕووی دە خەلیلبەگی کرد و گوتی:

ــ زۆر باش دەبێ. تاوێکی دی دەنگی ئەحمەد پشتکووڕی جارچی لە مەیدانی شاری دەنگ دەداتەوە. وەرە با ئێمەش بچینە قاوەخانەی و گوێمان لە دەنگی بێ. دەزانی لە سەرانسەری ئەو وڵاتەی کەس دەنگی بەقەد وی ناڕوا!

ئەو دوو دۆستە لە حاڵێك دا وەك ئەوەی لە پلانی پێشگرتن بە تاوانێکی گەورە بووبنەوە، هەستیان بە ئاسوودەیی و سەربەرزی دەکرد، بەرەو مەیدانی شار وەڕێکەوتن. هێشتا بە تەواوی نەگەیشتبوونە سەری مەیدانەکەی، کە دەنگی ئەحمەد پشتکووڕییان گوێلێبوو.

ـ گوێ بگرە خەلیل بەگ! یاخوا ئەو دەنگە نەڕزێ! ئەو دەنگە دەنگی ئێرەیە، گوێ لە دەنگی خۆشی ئەو تورکەی بگرە!

ئەحمەد پشتکووڕ پیاوێکی قوڵەخڕە بوو، لاقەکانی بە زەحمەت سەرەوەی لەشی‌یان پێهەڵدەگیرا، لە نێوقەدی ڕا بۆ سەرێ دەتگوت بلووکە تاشراوە و سەرێکی بێملی لە سەر دانراوە. بە لارەلار خۆی دەکێشا پێشێ و دەی‌نەڕاند:

ـ گوێبگرن! گوێ بگرن خەڵکی بەڕێز! هەمووتان ئاگادار بن و سەرنج بدەن! ئەمڕۆ شتێکی زۆر خۆشم پێیە بۆتان باس بکەم! بۆخۆتان دەزانن حەمەدۆکی خوێنخۆری چەتە، ئەو کەسەی چیاکانی ئێمەی کردوە بە ماڵی خۆی، دەستدرێژی دەکاتە سەر کچان، بە سەرنێزەی زگی ژنی زگپڕ دەدڕێ، منداڵی ساوا بە سەری خەنجەری‌یەوە دەکا، خەڵکی بە زیندوویی کەوڵ دەکا و تووشی هەرکەس بێ، چاوی دەردێنێ و بۆی بکرێ نایەڵێ تەنانەت منداڵێکیش هەردووک چاوی هەبن، یاغی‌یەك کە تاوان و جینایەتەکانی دە ئەژمار نایەن، دوژمنی ستەمکاری نیشتمانەکەمان و هەموو ئینسانەکان، ئەو خاینە کافرەی ناوی حەمەدۆکە...

پێش ئەوەی دەقی مەبەستەکە باس بکا، جارێ کۆڵێك لەو تاوانە سەیروسەمەرانەی دا پاڵ حەمەدۆکی و دوای ئەوە هاتە سەر ئەسڵی مەبەستەکەی و گوڕاندی:

ـ خەڵکی بەڕێز، گوێ ڕاگرن! ئەو حەمەدۆکە چەتەیە ئەسپێکی هەیە، ڕوحی حەمەدی دەبەر ئەو ئەسپەی دایە، ئەسپەکەش شێت و سەرکێشە، وەك فڕفڕەی دەو بەینەی دا دەخولێتەوە، دەبینی لەپڕ لە شوێنێکی سەر وەدەر دەنێ و ون دەبێتەوە، خۆی دە ئاوری داوێ، بەڵام ناسووتێ و بە ساغی دێتەوە دەرێ، دایمە بە سەر لووتکەی ڕەوەزان دا دێ و دەچێ... هەر کە ئینسانی دەبینێ، ون دەبێ... جا گوێبگرن! هەر کەس ئەو ئەسپەی بگرێ، هەزاروپێنسەد لیرە خەڵات دەکرێ. بەڵێ هەر کەس ئەو ئەسپەی دە داوخا، بی‌گرێ و بی‌هێنێتە ژاندەرمەخانەی ئێرە، هەزاروپێنسەد لیرەی دەدرێتێ. ئەو خەڵاتە، خەڵاتێکی گەورەیە. کەسێك ئەو ئەسپەی بگرێ، هەم خەڵاتەکەی وەردەگرێ و هەم دەبێتە قارەمانی نەتەوەیی! گوێ بگرن! گوێبگرن! خەڵکی بەڕێز! هیوادارم هەمووتان ئەو پەیامەتان پێگەیشتبێ!

سێ ڕۆژی تەواو ئەحمەد پشتکووڕ جاڕی کێشا و ئەو شتانەی دووپات کردنەوە. لەو ماوەیە دا تورگوتی مامۆستای فێرگەش هەموو چوارڕێکان، جادەکان، قاوەخانەکان و دارەکانی بە سەرە ئەسپی سەوز، سپی، سوور و زەردی تۆخ ڕازاندەوە...

# (٦)

سەرانسەری عەرزی لێوارەکانی دەریای نێوەڕاست، وەك دەریاکەی بە کەف داپۆشراوە. دار پرتەقاڵ، لیمۆ و نارنجیش دەڵێی وەك شەپۆلەکان کەفاوین. هەورەکانیش کە بە تیشك دەئاوسێن و لە سەر دەریایە بەرز دەبنەوە، هەر وان.

حەمەد و موسلیم لە شوێنێکی قەراغ دەریایە لە سەر بەردان دانیشتن. هێشتا زۆری مابوو ڕۆژ بێتەوە و ئاوی دەریایە کە ڕەش دەچوو، بە گرموهۆڕ خۆی بە لێوارەکان دادەدا. حەمەد لەسەرەخۆ دەستی دە ئاوەکەی ڕۆ کرد، گەرم بوو و هیچ وەك ئاوی کانییەکانی تووڕووسی نەدەچوو. لە پێش خۆیان، دوور، لە ئاسۆ، چاوی ڕەشایییەکی بەرین و گەورەی بەدی دەکرد، ئەوە چیاکان بوون کە بەسەر یەکتر دا دە ئاسمانێ هەڵچووبوون و دەسەڵات و شکۆی خۆیان دەنواند. لە سەرووی وانیش ئەستێرەکان دەدرەوشانەوە. لە سەر تووڕووس، چیای دوڵدڵ و چیای دیبەکیش، کە لووتکەکانیان دە شەوی تاریك دا نابینرێن، ئەستێرەکان سەرانسەری هاوینێ دەدرەوشێنەوە، بەڵام لەوێ، لەو سەرانە، ئەستێرەکان لە لووتکەیەکەوە دەچنە لووتکەیەکی دیکە و لێرە، لەو خوارەی، لە لای ئەو ئاوە ڕەشە تووڕە و تۆسنەی، لە سەرێکی ئاسمانێوە بۆ سەرێکی دیکەی دەڕۆن. بۆنێکی نامۆی سوێر و تاڵ، بەڵام دڵبزوێن وەبەر دەمی حەمەدی کەوت. ئەو خەریك بوو لە بەر شەکەتی و بێخەوییە بە لا دا بێ و گیانی دەرچێ، بەڵام نەیدەهێشت خەوی لێبکەوێ. موسلیم دەمێك بوو خۆی وەك گولۆڵەی خڕ کردبۆوە و نوستبوو. حەمەد سەربەرگەکەی بە وی دادا و بۆخۆشی پاڵی وە تەپکۆڵکەیەکی پشت خۆی دا و دەبیرەوە ڕاچوو. ئێشی لاقانی نەیدەهێشت بیری خۆی کۆ کاتەوە. بەو حاڵەش فکری جۆراوجۆر لە کۆڵی نەدەبوونەوە. بە خۆی نەبوو بیری دەچووە سەر دایە زێنەبێ و هەروەها

کۆمەڵ کۆمەڵ ماری ڕەشی گەورە گەورەی دەهاتنە پێش چاوی... بە سەدان ماری ڕەش، بە هاشوهووشێکی زۆرەوە دەهاتنە پێش. جارێك حەمەد چاوی لێبوو دارستانێك ئاگری تێبەربوو. شەماڵێکی بە قەوەتی دەهات، گڕی ئاگرەکەی بە قەد کێوێکی بەرز دەکردەوە و بە دار و گیانلەبەرانی دادەدا. دار دەسووتان، دەعبای کێوی لە ترسان بازرە ببوون و بەملا و ئەولا دا ڕاوڕاوێنیان بوو. کلکی ڕێوییەکی ئاگری تێبەر ببوو و ئەویش کە دەنێو ئالقەیەك ئاگر دا مابۆوە، هیچی بۆ نەدەکرا، ناچار لە سەر عەرزی درێژ ببوو و خۆی دەگەوزاند. سێ ماری چاوپێکەوتن کە لە ترسی سووتانێ بە خێرایی بە دووی یەك دا دەخوشین و هەرچی چەقەڵ، ئاسك، بانبانك، دەڵەك و سمۆرە بوون، وەك شێتانیان لێهاتبوو. لە هەموو لایەکی هەر قرچەقرچ و قرمە قرم دەهات و پاشان گرمەیەکی توندی وەك گرموهۆڕی شەپۆلەکانی دەریایە لە نێو دارستانی گڕگرتوو هەستا و زەوی لەرزاندەوە. دارە سووتاوەکان بۆنێکی خۆشیان لێدەهات... بەڵێ، هەموو مارە ڕەشەکانی ناکچەسازی لە ترسی ژاندەرمە و جووتێرەکان هەڵدەهاتن، دەتگوت دارستان ئاگری تێبەربووە و ئەوانیش لە ترسی ئاگرەکەی هەڵدێن. مارەکان خۆیان دە ئاوی جەیهانی هاویشت... یاوەر حەمەدی بۆ نەگیرا، بەڵام کۆمەڵێك ماری کوشتن. ڕاست وەك سووتمانی دارستانەکەی، هەرچی گیانلەبەر بوو، بە پەلە ڕایاندەکرد و دوور دەکەوتنەوە. مارەکان دوای هەمووان دەهاتن و بۆ ئەوەی ئاوی خوڕێنی ڕووبارەکەی لەوێیان دوور کاتەوە، خۆیان دە ڕووبارەکەی داویشت ...

دەنگی باڵندەیەکی لە شوێنێکی دوور ڕا دەهات. باشە ئەمن چم کردوە کە دایە زێنەب و ئەو خەڵکەی دیکە ئاوا بە ڕێز و خۆشەویستییەوە هەڵسوکەوتم لە گەڵ دەکەن؟! چ سوودێکم پێگەیاندوون؟ پێیان وایە ئەمن کێم؟ بۆچما ئەمن هەر ئەوە نیم کە وەك دزان عەلییە قەلەم ڕووت کرد و هەرچی پێیبوو، لێمئەستاند؟ ئەمن کوڕی برایمەڕووتیم ئیدی. ئاخر بابی من چ بوو؟ مرۆڤێکی هەژاری بێدەسەڵات، پارووبان لە زاری ڕفاندبا، چی پێنەدەکرا... زۆر باشم کرد دەستم لە چەتەیییە هەڵگرت. لێرە، لە پەنا دەریایە، لە ئاکیالی، لە ژێر سایەی مەلا سەلامی دا، کە وەك کوڕی خۆی دەمپارێزێ، دەتوانم بۆخۆم لە گەڵ سەیران و دایە حۆریم بە ئاسوودەیی بژیم. لێرە پێویست ناکا خۆم تێکەڵی شتی دیکە بکەم، چونکە ئەمن وا دروست کراوم، دەروونێکی بە هەست و ناسکم هەیە و ناتوانم خەڵکی ببوغزێنم. تەنانەت ڕقم لە یاوەریش نیە، لە گەڵ ئەوەی خەجێی کوشتوە. هەموو جووتێرەکانی دیکەش، چ ئەوانەی خەڵکی شاخین و چ ئەوانەش کە لە چۆڵەووراوایە دەژین، هەر وەك من گیانلەبەرێکی بێدەنگ و

بیٚتازارن و مرۆڤ دەتوانی بە کەیفی خۆی باریان بێنیٚ و چۆنی بیەویٚ، بیانچەوسێنێتەوە. ئەوانە ئەو خەڵکەن کە گرتیانن بە سەرباز و چاردە ساڵی تەواو شەڕیان پیٚکردن. چەشنە خەڵکێك کە دەتوانی بیانکوژی، بە زیندوویی کەوڵیان کەی و کەلکی خراپیان لیٚوەرگری، بیٚ ئەوەی یەك کەسیشیان وەدەنگ بیٚ.

لە شوێنێکی نێزیکەوە بۆنێکی خۆشی بۆ هات. دەسبەجیٚ بۆنەکەی ناسی‌یەوە، بۆنی پنگەی بوو، هەر ئەو پنگەی کە لە قەراغ چۆم و جۆگە و دەوروبەری کانی‌یان شین دەبیٚ. لە شاخی بونی پنگەی هەتا بلێی دوور دەڕوا. حەمەد بە لووشمە لووشم هەستا و بە دوای بۆنەکەی دا چوو. تیٚگەیشت بۆنەکە لە جۆگەیەکی‌یەوە دەهات. جۆگەکە ئاوی پیٚدا نەدەهات، بەڵام نمی هەبوو. لە پێش دا تووشی پۆلە گیایەکی بوو، کە هەتا چۆکانی دەهاتن، داهاتەوە و بۆنی کردن، ئەوان پنگ نەبوون، پنگەکان لە نێو جۆگەکەی ڕوابوون. حەمەد لە نێو پنگەکان هەڵترووشکا، پۆلێکی دەدەستی گرتن و بۆنی پێوەکردن. بەو کارە گەشایەوە و هەستی بە خۆشحاڵی کرد. بەهاری چوکووڕاوایە زوو دەگاتیٚ، هەر بۆیەش بۆنی پنگەکان ئەوەندە بە قەوەت بوو، لەوانەیە لە بەر ئەوەش بیٚ کە جۆگەکە لە نێزیك دەریایە هەڵکەوتبوو. حەمەد کاتێك بە نێو پنگەکان دا ڕۆیی و لە چواردەوری خۆی ئەو بۆنە خۆشەی هەست پیٚکرد، ماندوویی، ئێشی لاقەکانی و خەم و خەفەتی دەروونیشی هەموو لە بیر چوونەوە و دڵی پڕ بوو لە شادی و هومێد. لێرە لە نێو ئەو جۆگە و ئەو پنگەڵەی، بەو شەوە تاریکەی، دوور لەو کێشە و هەرایەی کە عەرزی دەلەرزاند و لە حاڵێك دا هیچکەسیشی لە لا نەبوو، پشووی هاتەوە بەر، دڵی خۆش بۆوە و ئیدی بیری لە تەنیایی خۆی نەکردەوە. ئەریٚ... بلێی مەلا سەلام چۆن پیاوێك بیٚ؟ ڕەنگە هێندێك وەك مەلا فەرهادی بچیٚ، ئاخر ئەوان دۆستی نێزیکی یەکتر بوون و دەبیٚ زۆر وەك یەك بچن. دەبیٚ تووڕەبوون و پێکەنینیان وەك یەك بیٚ. ڕەنگە وەك مەلا فەرهادیش چاونەترس و ئازا بیٚ و هەمیشە ئامادە بیٚ لە پێناوی شتی ڕەوا و ڕاست دا خۆ دە ئاوری هاویٚ... مرۆڤ نابیٚ زۆریشی باوەڕ بە مەلایان بیٚ، بەڵام نەك مەلای وەك مەلا فەرهادی. ئی دیکە، ئەوانەی ترسەنۆك، بیٚدەسەڵات و دووڕوون... دیارە ئەگەر مەلا سەلامیش خەیانەتم پیٚبکا، ئەوە موسلیم لێرەیە و تۆڵەم دەستێنێتەوە. حەمەد گەڕایەوە لای موسلیمی. ئەو هێشتا نوستبوو و خەوەکەشی ئەوەندە قووڵ بوو، هەر هەناسەی نەدەهات. وەك مردووان کەوتبوو. حەمەد لە دڵی خۆی دا گوتی مرۆڤی ساکار و بیٚگوناح ئاوا دەخەون، وەك منداڵی ساوا. دایە حۆریش ئاوا دەخەویٚ، هێندەش پیرە، بەڵام ئەویش هەر وەك موسلیمی

دەنویّ. خەڵکی دێی دەڵێن کەسێك دە خەویّ دا دەنگی نەیە، پڕخەی نەیە و جووڵەی نەکا، پاك و بێخەوشە.

لە پڕ حەمەد دیتی سەری کێوان سپی بوونەوە و سەردەریاکەی پەناشی روناك بوو. لە لای هەرە خواریّ، لە باشووری رۆژاواوە پەڵە هەوری سپی دەجووڵانەوە و بە سەر دەشتیّ دا دەهاتن. باڵندەی سپیی دەنووك زەرد لوور دەبوونە دەریایە و پاشان بەرەو ئاسمان تیّهەڵدەچوونەوە. شنەبایەك هات و حەمەد زۆری پیّ خۆشحاڵ بوو.

حەمەد هەستا و رووی بۆ لای کێوەکان وەرگێڕا. لووتکە سپی‌یەکانیان بەرەوە ئاسمان بەرز ببوونەوە، هەورە قەراغزێڕینەکانی سەریان، سوور، پەمەیی و بنەوش هەڵدەگەڕان و دەتگوت ڕاستەوخۆ لە کارگەیەکی ئاسنگەری دێنەدەر. لە ئاسۆی دوور، خۆر لە نێوەڕاستی ترۆپکی کێوێکی هاتبووە دەر.

ئەدی خەڵك بۆ دەڵێن ئاوی دەریایە شینە؟! خۆ ڕەنگی ویش وەك ڕەنگی هەورەکان سپی‌یە و ویّناچیّ قەت وەسەر ڕەنگێکی دیکە بگەڕیّ. تەسکە مژێك لە سەر لێوارەکان دەبینرا و دەتگوت دەریا شەوی پێشوو بەشێك لە هێز و قورسایی خۆی لە دەست داوە، کە ئێستا نەیدەتوانی وەك کێوێکی قورس خۆ بە لێوارەکان دابدا و عەرز، ئاسمان و ئەستێرەکان بلەرزێنێتەوە.

تا خۆر زیاتر بەرز دەبۆوە و ڕووناکتر دەبوو، دەریا زیاتر وەسەر ڕەنگی شین دەگەڕا، شەپۆلەکان گەورەتر دەبوون و خێراتر خۆیان بە ڕۆخی دەریایە دادەدا. هەورەکانی باشووری ڕۆژاواش زیادیان دەکرد و بەرەو ئاسمان بەرز دەبوونەوە. ئێستا، لە کاتی ڕۆژهەڵاتنیّ دا هەموو شتێك دەگۆڕا. عەرز، شاخ و دەشتەکەش... ئێستا ئیدی دەریا ئەو دەریای پێشوو نەبوو. هەموو شتێك وەخەبەر هاتبوو. پەڕەسێلکەکان لوور دەبوونە ئاویّ و چاو لەبەر شکانەوەی شۆق و شەبەقی شتەکان هەڵنەدەهات. حەمەد گەڕایەوە نێو پنگەڵەکەی، بۆنی خۆشی پنگەکان زیادی کردبوو و تەنانەت وای هەستدەکرد کە دەریاش بۆنێکی تازەی خۆشی لیّدیّ. ئەو بۆنە تێکەڵاوێك لە بۆنی گڵ و جیوەی داری چیاشی لە گەڵ هەست پیّدەکرا و هەتا وڵات گەرمتر دەبوو، بۆنجیوەکە زیادی دەکرد.

ماوەیەکی دیکەش پیّچوو هەتا موسلیم وەخەبەر هات. کاتێك هەستا، بە دەوری خۆی دا ڕوانی و چاوەکانی گوشی. دەتگوت دەور و بەری خۆی تاقی دەکاتەوە، تا بزانیّ لە کویّیە. حەمەد پیّکەنی و گوتی:

ـ ئێمە لە قەراغ دەریایەین موسلیم! ئەتۆ بۆخۆت ئێمەت هێناوەتە ئێرە! وەبیرت هاتەوە لە کوێین؟

موسلیم سەربەرگەکەی لە خۆ کردەوە و هەستایە سەر پێ:

ـ بە ڕاستیتە!

پاشان ڕای کردە خوارێ، چوو لە سەر ئاوەکەی دەموچاوی شوت و هاتەوە:

ـ دەڵێی ئەتۆ هەر نەنوستووی؟

ـ ناوەڵڵا، خەوم لێنەکەوت. کاتێك ئەو شەپۆلە ڕەشانە بە دوای یەکدا دێن، جار بە جار دەگەنە تەنیشتت و هەر ناپسێنەوە، کوا پیاو خەوی لێدەکەوێ؟

ـ هەموو کەس هەوەڵ جار لە دەریایە دەترسێ، جا چ شەو بێ، چ ڕۆژ، فەرق ناکا! هەوەڵێ ئەگەر چاوی لێدەکەی، دەترسێی، هەست دەکەی تەنیای، لاوازی، غەریب و بێکەسی.

ـ چاکی لێکدەدەیەوە موسلیم!

ـ گاڵتەم پێمەکە، کاحەمەد. سەردەمی منداڵی‌یە جاروبار مەڕم لە قەراغ دەریایە دەلەوەڕاند. هەوەڵ جار کە چاوم بەو ئاوە زۆرەی کەوت، هەموو گیانم لەرزی. دواتر پێیڕاهاتم، بەڵام هەرجارەی هاتوومەوە ئێرە، دڵم پڕ بووە، وەك ئەوەی گریانم بێ...

ـ قسەکەت ڕاستە موسلیم، ئەمڕۆ کاتێك ڕۆژ هەڵدەهات، منیش، کە چاوم لە خۆر کرد، گریانم هات. کاتێك لە سەری چیای دوڵدوڵێش بووم و لەوێ بۆ یەکەم جار خۆرم لە کاتی هەڵاتن دا دی، هەر وام بە سەر هات.

موسلیم گوتی:

ـ برسیمە، هەمیشە لە قەراغ دەریایە، برسێم دەبێ!

ـ لەو دەوروبەرەی ئاوی خواردنەوەی وەگیر دەکەوێ؟

ـ چاوت لەو جۆگەیەی کرد، ئاوی پێدا نایە؟

ـ نا، وشکە.

ـ ئەگەر وا بێ، دەبێ نانەکەی بێ ئاو بخۆین.

موسلیم توورەکەکەی لە پشتێ کردەوە و لە سەر عەرزی ڕایخست، بەڵام زوو پەشیمان بۆوە، دیسان خڕیکردەوە و لە پشتێی بەستەوە، ئەوجار ڕایکردە سەر گۆڕایی‌یەکەی پشت خۆیان، بە هەموو لایەکی دا ڕوانی و خێرا هاتەوە خوارێ:

ـ هەتا نیوەڕۆیەش نانی نەخۆین، چمان لێنایە، دەتوانین خۆ ڕاگرین!

حەمەد وەڵامی دایەوە:

ـ بێگومان!

حەمەد قەت لە موسلیمی وەڕەز نەدەبوو. ئەو کوڕە ڕوومەتسووره مندالکارە ئازایە، وەك جندۆکان تەردەست و زیرەك بوو. لە دڵی خۆی دا گوتی بریا برایەکی ئاوام بووبا، بەڵام زوو فکرەکەی گۆڕا:" دەی، بۆچما ئەو کوڕە بۆ من لە برایان باشتر نیە؟ هەر لە باب و دایکیشم باشتر نیە؟" لێرە دا لە نەکاو ڕاچەنی:" وەخت بوو بڵێم لە دایە حۆریشم لێ نێزیکترە! جا خۆ ڕۆژێکی ئەوەی بڵێم و دایە حۆری پێبزانێتەوە، ژیانی پێ تاڵ دەکا".

کە موسلیم گەیشتەوە لای، حەمەد دە ئامێزی گرت و گوتی:

ـ موسلیم گیان، برا ئازا و بە وەفاکەم! برا خۆشەویستەکەم کە لە هەموو لاوەکانی ئەم دنیایە ئاقڵتری!

لەو حاڵەی دا ئاورینگەکەی نێو چاوی درەوشایەوە و تیشکێکی زەردی زێڕین بە دەوری سەری دا سووڕا:

ـــ پێویست ناکا ئەتۆ ببی بە چەتە!

لە بەرامبەر ئەو هەموو هەستەی خۆشەویستی و برایەتی‌یە دا، چاوەکانی موسلیمی پڕ بوون لە ئاو.

حەمەد درێژەی بە قسەکەی دا:

ـ خانوێکت لە پەنا خۆم بۆ دەکڕم!

هەر لەو کاتەش دا بیری کردەوە: بە چ پوولێکی؟ بە پوولی عەلی‌یە قەلەی، کە لە ڕێگای ڕووتکردنی خەڵکی‌یەوە کۆی کردبۆوە؟ لە پڕ شەرم دایگرت. بەڵام فەرقی چی‌یە؟ مەبەست ئەوەیە موسلیم پێویستیی بەوە نەبێ ببێتە چەتە و لە لای من بمێنێتەوە ...

پاشان حەمەد گوتی:

ـ دەی ئێستا چ بکەین؟

ـ ئەتۆ لێرە بمێنەوە، پێتخۆشە دانیشە و ئەگەر حەوسەلەت هەیە، بۆ دەریایە بگری، بەڵام دەبێ سەربەرگەکەت دەبەرکەی، تا تفەنگەکەت دیار نەبێ. ئەگەر کەسێکیش بتبینێ و لێتبپرسێ، دەبێ بڵێی پاسەوانی دەریایەی، ئی ئەو دەریایە و هەموو دەریاکانی دیکەش! دەڵێی ناوم حەمەدۆکە و پاسەوانی دەریایەم ... ئەمن دەزانم ڕێگای شارۆچکەکەی مەلا سەلامی بە کوێ دایە. لەو گۆڕاییی‌یەی ڕا منارەی مزگەوتەکەیان دوور دیارە. ئێستا ئەمن وەڕێدەکەوم، دەچمە وێ و نامەی مەلافەرهادی بۆ دەبەم.

ـ کام نامە؟

موسلیم کاغەزێکی هێنا دەر و دایە دەستی حەمەدی. حەمەد بە وردی چاوی لیٚکرد و دوایە گوتی:

ـ خۆ ئەو کاغەزە هیچی لیٚنەنووسراوە! ئەوەی پیاو تێیدا دەبینیٚ، هەر هێندێك داری سەروبنن. یانی دارەکان لکیان دەخواریٚ و ڕیشەیان دە سەرێیە.

موسلیم پیٚکەنی و کاغەزەکەی وەرگێڕا:

ـ بڕوانە کاحەمەد! ئێستا ڕیشەی دارەکان دەخواریێیە.

ـ نەخێر، وانیە. خۆ تۆ نابیٚ بە کەیفی خۆت کاغەزەکەی ڕاگریٚ! فەرموو! ڕاستی ڕاگری، ڕیشەیان دە سەرەوە دەبیٚ.

تاوێکی باش قسەیان لە سەر ئەوەی کرد و سەرەنجام موسلیم گوتی:

ـ دە باشە با قسەی تۆ بیٚ، بەلاّم چ جیاوازییەکی هەیە؟

ـ بلێی مەلا فەرهاد چیی تیٚدا نووسیبیٚ؟

ـ نازانم کاحەمەد، دەبیٚ شتێکی نێوخۆیان بیٚ، یان لەوانەیە دوعا بیٚ، نووسیبێتیٚ.

ـ هەر دەبیٚ شتێکی وا بیٚ! دەزانی موسلیم، دەڵێن یاوەر و جووتێرەکان تۆوی مارانیان بڕیوەتەوە. دەڵێن تەنانەت یەك ماریشیان نەهێشتوە...

موسلیم ئاخێکی هەڵکێشا:

ـ بەڵیٚ، دەڵێن تاقەمارێکیشیان لە هەموو چوکووراوایە نەهێشتوە. ئەومارانە سیمبۆلی دەشتەکە و نیشانەی خۆشبەختی بوون. ئێستا دەبیٚ ئیدی بڕۆم. بە مەلا عەبدوسسەلامی دەڵێم مەلایەك دەیەویٚ بچیٚ بۆ لای و سەردانی بکا. مەلاکە سەربەرگێکی دەبەر دایە هەتا سەر لاقانی دیٚ!

ـ ئەریٚ موسلیم ئێرەش ماری لیٚیە؟

ـ ئەیچۆن؟! هەزارپیٚ و کیسەڵەشی هەن... ئەمن ئەوە دەڕۆم و هەتا بۆشم بکریٚ زوو دێمەوە.

موسلیم بە جۆگەکەی دا تیٚهەڵکشا و ڕۆیی. حەمەد چاوی لە دەریایە بڕی و دە بیرەوە ڕۆچوو. لە شوێنێکی زۆر دوور لە سەر دریایە کەشتییەك دیار بوو. کەشتییەکە هەموو باگرەکان(بادبانەکان)ی هەڵیٚکردبوو.

لای نیوەڕۆیە موسلیم گەیشتەوە. حەمەد لە جیٚی خۆی دانیشتبوو و هەروا دە دەریایە ڕامابوو. مووی لیٚنەدەبزووت.

کاتێك حەمەد چاوی بە موسلیمی کەوت، وەخۆ هاتەوە و هەستایە سەر پیٚ. ئاڵۆز دەهاتە بەرچاو:

ـ موسلیم، مرۆڤ خۆی لە بەرامبەر دەریایە دا زۆر چکۆڵە دەبینیٚ! هەست دەکا هەر بە قەد کونی دەرزییەکییە!

ـ هەوەڵێ جار مرۆڤ هەر وا هەست دەکا.

ـ مرۆڤ کاتێك بۆ یەکەم جار چیاش دەبینێ، ئەو هەستەی هەیە.

ـ ئەمن ئەوەی نازانم، چونکە لە چیا لە دایك بووم و هەر لە سەرەتاوە لە وێ ژیاوم.

حەمەد گوتی:

ـ بە ڕاستی ئەو هەموو هەوڵدان، دەربەدەری و ڕاوڕاوێنە بە کاری چ دێ، کاتێك سەرەنجام مرۆڤ لێرە خۆی بە قەد کونەدەرزی‌یەکی هەستپێ‌دەکا؟

ـ ئەمن شتی وا نازانم. تاوێکی دیکە دەگەینە کن مەلا سەلامی. وا چاکترە ئەو شتانە لە وی بپرسی! ئەرێ دەزانی دارەکە چ بوو؟ ئەوی نێو کاغەزەکەی دەڵێم؟

ـ نا، بۆچی؟

ـ بە ڕاستی دارەکە ڕیشەکانی دە سەرێ بوون و لکەکانی دەخوارێ. کاتێك مەلا سەلام نامەکەی دەخوێندەوە، ئەوەم بۆ دەرکەوت.

ـ نامەکە چیی تێدا نووسرابوو؟

ـ مەلاسەلام پێی‌گوتم مەلا فەرهاد نووسیویەتی کە ئەو کەسەی دێ بۆ لات و دەبێتە میوانت، خۆشەویستی منە، لە گیانی خۆشم خۆشتر دەوێ و دەبێ ئەتۆش وەك بەشێك لە خۆتی بزانی و ئاگات لێی‌بێ. هەتا عەرز لەت نەبێ، تا دنیا سەروبن نەبێ، تا شاخەکان بە سەر یەك دا نەیەن و تا ئەو کاتەی دارەکانی چوکووڕاوایە ڕیشاژۆ دەکەن و دەئاسمانێ هەڵدەچن، نابێ هیچ‌کەس بتوانێ تاڵە موویەك لە سەری ئەو میوانەی کەم کاتەوە! هەرچی بی‌یەوێ، دەبێ بۆی دابین کەی... تێگەیشتی؟

حەمەد وەڵامی دایەوە:

ـ بەڵێ، تێگەیشتم!

ـ دەبێ هەتا تاریك دادێ، لێرە ڕاوەستین و ئەو کاتی وەڕێ‌کەوین بۆ لای مەلا سەلامی.

ـ بەڵام ئەمن ئەوە لە برسان دەمرم.

ـ وەڵڵاهی ئەمن برسیم نیە، تێروپڕم جەرگی سوورەوەکراو و هەنگوین خواردوە.

ـ ئەرێ مەلا سەلام چۆن پیاوێکە؟

ـ کەڵەگەت و باریکە. کەسایەتی و شکۆی بە سەروسیمایەوە دیارە و هەمیشە بزەی لە سەر لێوانە. عەبای دەبەر دا نیە. زۆر وەك مەلا فەرهادی دەچێ، یان با بڵێم ڕاست وەك یەکن، دەڵێی سێوێکن لە نێوەڕاستێ دا لەت‌کراوە. لەوانەیە هەر براش بن، ئەتۆ چۆنی بۆ دەچی؟

ـ دۆستی کۆن سەرەنجام وایان لێ‌دێ کە زۆر وەك یەك دەچن.

ـ ئەمنیش وەك تۆ دەچم؟

ـ جاریٚ ڕاوەستە، با هێندێك پیر بین، ڕۆژێك دەبیٚ من و تۆش ڕاست وەك یەك بچین.

موسلیم چاوێكی لە حەمەدی كرد، بە وردی تێیهەڵڕوانی و گوتی:

ـ پێمناخۆش نیە وابیٚ.

ـ با هێندێك لێرە بگەڕێین، جاریٚ ماویەتی تاریك دابیٚ.

ـ ئەگەر كەسێك چاوی پێمانكەوت، بڵیٚ ئەمن مەلام. بەو سەربەرگەیەوە كەس گومانت لیٚناكا و مەترسیشمان نایەتە پێش!

لە شوێنێكی دوور گاوركۆ دیار بوو كە بەرەو ئاسمان تیٚهەڵچووبو و دەتگوت ڕاست لە دەریایە هاتۆتە دەر. لە لێژاییەیەكی كە بۆ لای دەریایە شۆڕ دەبۆوە، خانووبەرەیەكی گەورە دیار بوو و لای چەپیش كە ئەوان ڕوویان تیٚكردبوو، هەتا چاو هەتەری دەكرد، باغی پرتەقاڵ، لیمۆ و نارنجی لیٚ بوو. عەرزەكە بە گوڵی لالە كێویلكە، لە هەموو ئەو ڕەنگانەی دە كۆلكەزێڕینەی دان، داپۆشرابوو. پەپوولە پۆل پۆل بە فڕین دەهاتن، جاری وابوو سەد دانەش زیاتر وێكڕا لە سەر پنچكێكی دەنیشتنەوە و هەر زووش دەفڕینەوە، وەك گێژەڵووكەیەكی نەرم دەخولانەوە و لە بەر تیشكی ڕۆژیٚ لە حەوای دەدیتران.

لە پێش خۆیان تووشی دارێكی بوون. دارەكە لە گوڵی سپیی ورد دا خەملابوو، بەلاٚم تەنانەت یەك گەلاٚشی پێوەنەبوو. دارەكە لكەكانی خۆی بە سەر كۆمەڵێك لە گوڵە لالەكان دا بلاو كردبۆوە و وەك هەورێكی دەچوو كە ڕەنگە سپییەكەی لە بەر شەبەق و ڕووناكایی ڕۆژیٚ دا لێكدا لێكدا لە نێوان كاڵ و تۆخ دا بیٚ و بچیٚ و بە چەند شێوە خۆ بنوێنیٚ. هاشە هاشێكی سەیر لە نێو لكەكانی دارەكەی دەهات.

حەمەد گوتی:

ـ دیتووتە دارەكە دەوشێنیٚ. قەتم نەدیوە لكی داریٚ ئەوەندەی دەنگ لێوە بیٚ. دەڵێیٚ هەزار مێش لە نێو لكی دارەكەی دا دەخولێنەوە. شوێنێك لە سەرەوەی "كونە بەرد"یٚ هەیە، ئەشكەوتێكە زۆر دە نێو شاخی دایە... هەرچەندی بڕۆی ناگەیە بنەبانیٚ. كاتێك دەچیە دەوێوە، بەردەكان دەنگ دەدەنەوە و قەڵشێكیش لە سەرەوەی ئەشكەوتەكەیە. جێگایەكی ئاستەمە و لە وێڕا هەنگوێن دێتە خواریٚ. هەرچی مێشومەگەز، جڕوجانەوەر و باڵندەن لە بەر هەنگوینەكەی دەچنە دەوروبەری ویٚ. بەلاٚم هیچ زیندەوەرێك ناتوانیٚ تخوونی ئەشكەوتەكەی بیٚ، هەرچی زۆر بچێتە پێشیٚ، مێشەنگوین كەولی لە حاجەت دەخەن. كەسێك ئەوەی نەزانیٚ و لەویٚ نێزیك بێتەوە، زەحمەتە بە ساغی دەرچیٚ.

موسليم گوتی:

ـ زۆر ئەشكەوتی وا پیێدەزانم كە كونەمێشیان تیێدان. هەنگوینی ئەو شوێنانە ئەوەندە خۆشە، ئەگەر دەستت ویێرابگا و بیخۆی، هەست دەكەی خەریكە باڵت لیێرویێن و بفڕی.

ـ دەزانم، ئەمن هەنگوینی ئەو جۆرە جیێیانەم خواردوە!

موسلیم بە دەنگێكی سەبر و گڕ گوتی:

ـ بەڵام ئیدی نایبینییەوە، ئیدی قەت چاوت بە شاخی ناكەویێتەوە، جارێكی دی ئەو چەشنە هەنگوینەی ناخۆی و هەست بە فڕین ناكەی!

حەمەد پیێكەنی:

ـ ڕاست دەكەی، بەڵام دەزانم ئەتۆ جار جار بۆم دیێنی! خۆ برای خۆت بیێهەنگوین ناكەی؟

ـ ئەریێوەڵڵا هەرچەندی بتەوێ، بۆت دیێنم. ئەوەندەت بۆ دیێنم، لە خۆت زیاد بیێ و بەشی مەلا سەلامیشی لیێبدەی. وا دیارە ئەو مەلایە پیاوی چاكە، با ئەویش هەنگوینەكەی بخوا و هیێندیێك لە گەڵ تۆ بفڕیێ.

حەمەد دەستێكی لە شانی موسلیمی دا و گوتی:

ـ ئەریێوەڵڵا، با ئەویش تامی ئەو هەنگوینەی بكا و بفڕیێ!

ـ دەبیێ زۆر هەنگوینی بۆ ئەو پیاوە چاكەی بیێنین. ئەویش با بیخوا و بفڕیێ، بچیێتە سەر لوتكەی هەرە بەرزی گاوركۆی، ئەو شوێنەی خۆری لیێ لە دایك بووە!

دە شەقاو دوور لە دارەكەی، كە هاشەی لیێدەهات، ڕاوەستان. دارەكە پڕ بوو لە میێش و باڵی میێشەكان لە نیێو پەلكی گوڵی هەموو لكەكانی دارەكەی دا دەبریقانەوە. حەمەد قەت هیێندە میێشی جۆراوجۆری بە یەكەوە نەدیبوو! میێشەكان لە هەموو ڕەنگ و جۆریێك، گەورە و بچووك، سوور، شین و سەوز لەنیێو لكەكانی دارەكەی و لە دەورو بەرەی دارەكەی، وەك پەڵە هەوری بچووك بچووك دەخولانەوە و دەبریقانەوە.

موسلیم گوتی:

ـ تیاح... كوڕە خۆ عەرز و ئاسمان پڕە لە میێش!

حەمەد قسەكەی وی پشتڕاست كردەوە:

ـ بیێجگە لە میێشان پیاو هیچ شتێكی دی نابینیێ!

بۆنی گولان و میێشان تیێكەڵ ببوو و كاتیێك شنەبایەكە ـ كە دەهات ـ خستی، چاویان دە ڕەشەوە دەهات. دووجار بە دەوری دارەكەی دا خولانەوە و پاشان بەرەو باغە میوەكان دریێژەیان

بە ڕێگاکەیان دا. دارپرتەقاڵ، لیمۆ و نارنج هەموو گوڵیان کردبوو و ئەو دەشتە ببووە دەریایەك لە گوڵی سپی و هەر شەپۆلی دەدان. مێشێکی زۆریش لەو دەریایەی دا دەخولانەوە. بۆنی گوڵی دارەکان ڕاست هەستی خواردنی هەنگوینی ڕەوەزانی دەخستە دڵی حەمەد و موسلیمی‌یەوە و وەك ئەوەی وابوو کە بە باڵان بفڕن.

ـ ئەو هەموو مێشەی! سەیرە، ئەوانیش وەك گوڵەکان بۆنیان خۆشە!

حەمەد وەڵامی دایەوە:

ـ بە ڕاستی بۆنیان زۆرە و خۆشیشە.

لە سەر عەرزەکەی، لە ژێر دارەکان، دانیشتن. هێشتا بە تەواوی دانەنیشتبوون، کە خاڵخاڵۆکێك لە سەر دەستی حەمەدی نیشت.

ـ چاو... موسلیم! ئەو خاڵخاڵۆکە بچووکەی خوات دیتوە؟ لە هەر کوێیەکی بم، خاڵخاڵۆکان دەمدۆزنەوە! خاڵخاڵۆکە، خاڵخاڵۆکە ماڵە خاڵم لە کوێیە؟...

موسلیم وتەکەی لە زاری حەمەدی وەرگرتەوە و دووپاتی کردەوە. پاشان خاڵخاڵۆکەکە فڕی و چووە نێو لکی دارنارنجێکی‌یەوە، کە لە گوڵێ دا ون ببوو.

هەستان و هێندیك بە نێو یەکێك لە باغە پرتەقاڵەکان دا خولانەوە. دار پرتەقاڵ وەك داری جەنگەڵی پاڵیان وێکدابوو. تووشی مارێکیش بوون، کە وەك ڕەنگی گیای قەراغ کانی و دەراوان شین بوو. مارەکە سەری هەڵێنا، هێندێکیان تێوە ڕاما و دوایە بەکاوەخۆ سووڕێکی دا و بە ڕێی خۆی دا ڕۆیی. دواتر تووشی دوو کیسەڵان بوون، کیسەڵەکان نێرە و مێیە بوون و خەریکی جووتبوونێ بوون. هەموو جارێ کە نێرەکە خۆی داویشتە سەر مێیەکەی، چاوی زەق دەبوون و مێیەکەی بەرەو پێشەوە پاڵدەدا، هاوکات دەنگی مشەمش و گزەگزیان لە دوورەوە دەبیسرا. ڕیوی‌یەك پەیدا بوو. هێندێك ڕاوەستا، چاوی لێکردن و دوایە کلکە درێژەکەی ڕاوەشاند، دەرپەڕی و لە وێ دوور کەوتەوە.

ڕۆژ بەرەو ئاسۆی ئاوابوون شۆڕ بۆوە و قرەقری ماسیگران لە لای دەریایە ڕا بەرز بۆوە. لە سەر سەریان، لە ئاسمانێ، باڵندە دەفڕین و باڵەکانیان بە تیشکی خۆری بەرەوئاوابوون دەدرەوشایەوە.

کاتێك تاریك داهات، باغە بەگوڵخەملاوەکەیان بەجێهێشت. جلەکانیان و پێستی لەشیان بە خەستی بۆنی گوڵی دارنارنجەکەی گرتبوو.

حەمەد گوتی:

ـ ئەمن زۆر خۆشحالّم. سەرم دەسووڕێ و خەریکم بفڕم. بە ڕاستی پێمخۆش بوو...

قسەکەی بڕی و ئاخێکی هەڵکێشا. لە دلّی خۆی دا گوتی:"بریا سەیران و دایە حۆریش لێرە، لە گەڵمان بوایەن".

ـ بریا سەیرانیش لێرە بوایە. ئەویش ئەگەر ئێستا لە گەڵ ئێمە بوایە، وەك ئێمە بۆنی گوڵەنارنجی دەگرت!

حەمەد بە پەرۆشەوە دووپاتی کردەوە:

ـ گوڵە نارنج...

مەلا عەبدوسسەلام لە بەر دەرگای ماڵەکەی چاوەڕوانیان بوو. تاوێکی باش بوو لە وێ ڕاوەستابوو و کاتێك گەیشتنێ، زۆر بە گەرمیی لە گەڵیان ڕووبەڕوو بوو:

ـ بەخێر بێی، بەخێر بێی حەمەدۆك، کوڕم! کاتێك نامەکەی مەلا فەرهادیم خوێندەوە، زۆر خۆشحالّ بووم. خودا ئەمنی بە سەرکردۆتەوە، کە نەمردووم و لە ماڵە خۆم چاوم بە حەمەدۆکی دەکەوێ.

پلیکانەکان دار بوون و لە ژێر پێیان دا جیڕەیان دەهات. کاتێك وەسەرکەوتن، لە پێش دا گەیشتنە هاڵێکی بەرفرەوان، کە شەش ژووری گەورەی بە سەر دا دەکرانەوە. بنەماڵەی مەلا سەلامی لە هاڵەکەی دا ڕاوەستابوون و بە گەرمی بەخێرهاتنیان کردن. خێزانی مەلاسەلامی دەسماڵێکی سپیی بە سەرەوە بوو. دوو کچ و کوڕێکی جحێڵیشیان هەبوون. هەر لە هاڵە گەورەکەی لە سەر مۆبلان دانیشتن. مۆبلەکان نەرم بوون و پیاو تێیان دا دەحەسایەوە. سێ چرای گەورە ڕووناکایی نێو ژوورەکەیان دابین دەکرد.

مەلا سەلام گوتی:

ـ حەمامیان گەرم کردوە، وا چاکە پێش ناخواردنێ خۆتان بشۆن. موسلیم گیان حەمامێك لە خوارێ هەیە ئەتۆ بچۆ ئەوێ. ئەوە کوڕەکەم لە گەڵت دێ و پێت نیشان دەدا.

کوڕە جحێڵەکە خاولی‌یەکی خاوێنی هەڵگرت و موسلیمی بردە قاتی خواروو. مەلا سەلام بۆخۆی حەمامەکەی سەرێی بە حەمەدی نیشان دا. چرایەك لە حەمامەکەی هەڵکرابوو، حەوزێکی چکۆلەی تێدا بوو، کە یەکپارچە لە بەردی مەڕمەڕ دروست کرابوو، حەوزەکە پڕ بوو لە ئاوی گەرم و سابونێکی بۆنخۆشی پەمەییش لە سەر لێواری حەوزەکەی دانرابوو. حەمەد ئاوی بە خۆی داکرد، دوایە دەستێکی چاکی سابوون لە خۆی دا و خۆی شوتەوە. تا ئێستا قەت لە حەمامێکی ئاوا، یەکپارچە لە بەردی مەڕمەڕ و ئاوێکی گەرمی وا خۆش دا و بە

سابوونێکی ئەوەندە بۆنخۆش، خۆی نەشوتبوو. هەم موسلیمی لە بیر چۆوە، هەم برسی‌یەتی، هەم مەلا سەلام و تەنانەت گوێی لێ‌نەبوو کە مەلا سەلامیش چەند جاران هاتە پشت دەرگای حەمامەکەی و کۆخی.

ئاخرەکەی موسلیم هات، لە دەرگای دا و بانگی کرد:

ــ ئەرێ کاحەمەد چت لێ بە سەر هات؟ کورە ئێمە خەریکین وردە وردە نیگەران دەبین...

حەمەد لە حەوزەکەی دا درێژ ببوو و بە دەم بیرکردنەوەوە هاتبوو خەوی لێ‌بکەوێ. کە گوێی لە دەنگی موسلیمی بوو، ڕاپەڕی و گوتی:

ــ موسلیم گیان ئەوە دێم، ئەوە خۆم دەبەر دەکەمەوە و دێم!

خاولی‌یەکان ئەوەندە نەرم و بۆنخۆش بوون، حەمەد لە خۆپێ‌وشککردنەوەیان تێر نەدەبوو، لە تووکی کەروێشکێ نەرمتر بوون. لە دڵی خۆی دا گوتی هەر خانووم هەبێ، چ ناکەم تا لەو خاولی‌یانە نەکڕم.

لە مەجومعەیەکی گەورەی مس دا، کە لە بەرخاوێنی‌یان دەبریقایەوە، خواردنیان دانابوو. چێشتەکان جۆراوجۆر بوون، پلاو و خۆرشت، گۆشتی حەیوانەکێوی‌یە، مریشکی سوورەوەکراو، کفتەی پڕ لە مێوژ و پستە و زۆر چێشتی دیکەش لە سەر مەجومعەکەی دانرابوون. بە کورتی شیری مریشکێ نەبێ، هەموو شتێکی لە سەر بوو.

دوای ئەوەی هەموو لە دەوری مەجومعەکەی کۆ بوونەوە، مەلا سەلام دوعایەکی خوێند و پاشان هەموو دەستیان بە خواردنێ کرد.

حەمەد قەت چێشتی ئاوا خۆشی نەخواردبوو، یان زۆر برسی بوو، بۆیە وای هەست دەکرد، هەرچۆنێك بوو بە ئیشتیاوە لەو چێشتە خۆشانەی دەخوارد. موسلیمیش چاکی دەخوارد، پارووی وای بادەدان، کە بە زەحمەت بۆی قووت دەدران.

ماوەیەکی زۆر خەریکی ناخواردنی بوون و لە کۆتاییش دا هەنگوێنیان خوارد، هەنگوینێکی سپی، کە بۆنی گوڵی دارلیمۆی لێ‌دەهات. لە گەڵ پارووی هەوەڵێ حەمەد هەستی کرد کە ئەو بۆنە خۆشە دەروونی ئاخنی. دەتگوت باغێکی دارلیمۆی دەگوڵێ دا بە ساغی قووت داوە. هەر بۆیە گوتی:

ــ هەموو شتێك لێرە بۆنی گوڵی لیمۆی لێ‌دێ، عەرز، دەریا، ئینسانەکان، دارەکان، گەڵا و گوڵ، هەموو هەر ئەو بۆنەیان لێ‌دێ.

مەلا سەلام وەڵامی دایەوە:

ئەمنیش کاتێك تازە هاتبوومە ئێرە، لە پڕێك هەستم بەو بۆنە کرد. ئەو بۆنە هەموو شوێنێکی ئێرەی پڕ کردوە. کاتێك مانگی تەواو( مانگی شەوی چاردە) دەردەکەوێ، بۆنی دەریایە دێ. ڕۆژێکی دیکە، کازیوەی بەیانی، بۆنی دارکاجی لە لای شاخی ڕا دێ، لە گەڵ بۆنی جاترە و پنگی تێکەڵ دەبی و دە وڵاتی دەگەڕێ. بەهاران چوکووراوا بۆنی گوڵی لیمۆی لێدی و هاوینان هەموو ئەو دەشتە تەنیا بۆنی گەنی دەدا، کە ئەو بۆنە لە جەنگەی گەنمدروونێ دا زۆر زیاتر هەست پێدەکرێ. دوای وەرزی بارانبارینێ، ئەو عەرزە بۆنێکی دیکە دەدا، ئەوەش بۆنێکە کە ئەگەر بە دەوری دەریایە دا بگەڕێی، بۆت دێ. کەسێك لێرە لە دایك بووبێ، یان جارێك هاتبێتە ئێرە و ماوەیەك مابێتەوە، ئیدی لە جێی دیکە ژیانی بۆ ناکرێ و لێرە دوور خرێتەوە، دەمرێ...

ـ ئەمن هێشتا بۆنی گوڵەلیمۆم هەر بۆ دێ، لە گەڵ ئەوەی من دەمێکە خۆشم شوتوە! ئەوەندەی هاتین، ڕێگامان هەر بە نێو داران دا بوو.

موسلیم قسەی حەمەدی پشتڕاست کردەوە:

ـ وایە، ئەمنیش لە بەری پێم ڕا هەتا تەپڵی سەرم بۆنی گوڵەلیمۆی لێدی!

مەلا سەلام گوتی:

ـ هەوەڵڕۆژەکان هەروایە... بەڵام دەزانم ئێوە ماندوون و دەبێ بنوون. سبەینێ دەتوانین تێر قسان بکەین!

حەمەد لە حاڵێك دا بە ڕێز و خۆشەویستییەوە چاوی لەو مەلا دڵسۆزەی دەکرد، گوتی:

ـ سوپاس مامۆستا، دەستت ماچ دەکەم! بە ڕاستی ئەتۆ زۆر وەك مەلا فەرهادی دەچی! ئەگەر قامکەکانت ئاوا درێژ نەبان، دەمگوت هەر مەلا فەرهاد بۆخۆتی!

مەلا سەلام قاقایەکی کێشا و دەستی بە ڕدێنی دا هێنا.

ـ ئەرێ بە ڕاستی مەلا فەرهاد برات نیە؟

مەلا سەلام وەڵامی ئەو پرسیارەی نەدایەوە و تەنیا پێکەنی. پاشان دەرگای یەکێك لە ژوورەکانی بۆ کردنەوە و گوتی:

ـ سبەینێ کاتی قسەکردنمان زۆرتر دەبێ. ئەگەر پێت خۆش نیە دوای ئەوەی خەوتان لێکەوت چراکە باییسێ، ئەوە پێش ئەوەی بنوون، فوویەکی لێکە و بیکوژێنەوە. شەو خۆش!

ـ خوا ئاگای لێت بێ مامۆستا گیان!

حەمەد قەت جێگاوبانی ئاوا خۆش و ڕوولێفی ئاوا سپی و بۆنخۆشی نەدیبوون:

ـ موسلیم....

ـ بەڵێ کاحەمەد...

ـ دەزانی ئەو جێگاوبان و پێخەفانەش هەر ئەو بۆنەیان لێدێ...

حەمەد خۆی ڕووت کردەوە. چراکەی فوو لێکرد و تێخزا. هەر لێفەی بە سەر خۆی کێشا و خەوی لێکەوت.

کاتێك بەیانیی ڕۆژی دواتر وەخەبەر هات، ڕۆژ زۆر درەنگ بوو. بە پەلە لە جێگاکەی هاتە دەر، غاری دا حەمامێ، دەمو چاوی شوت و جلەکانی دەبەر کردەوە. پاشان چووە بەر ئاوێنەی و کاتێك بەو سەر و ڕیشەیەوە چاوی بە خۆی کەوت، ترسا. خێرا لە بەر ئاوێنەکەی لاچوو.

موسلیم لەمێژ بوو هەستابوو و لە گەڵ مەلا سەلامی لە هاڵەکەی دانیشتبوون. کاتێك حەمەدیان چاوپێکەوت، هەردووکیان پێکەنین. حەمەد داوای لێبووردنی لە مەلا سەلامی کرد:

ـ ببوورە مامۆستا، ئەمن قەت هێندە درەنگ هەڵنەستاوم!

خواردن لە سەر مەجومعە گەورەکەی شەوی پێشوو داندرابوو. هەرسێکیان لە دەوری مەجومعەکە کە وەك ئێوارەی پێشوو نانوپێخۆری خۆش و جۆراوجۆری لە سەر ئامادە کرابوو، دانیشتن و دەستیان بە خواردن کرد. هەنگوین، ڕۆنی کەرە، قەیماغ، شیری کوڵاو، چەند جۆرە پەنیر و نان، کولێرە ناسکە و زۆر شتی دیش لە سەر مەجومعەکەی هەبوون. حەمەد بەکاوەخۆ دەیخوارد، هەر پاروویەکی دەزاری دەنا، باش دەیجووت و تام و چێژێکی تایبەتیی لێدەدی. ئەو هەنگوین و ڕۆنی کەرەی لە کولێرەناسکەی هەڵدەسوو، وردە وردە دەیخوارد و هێندێك جاران شیرەی هەنگوێنی بە قامکان دا دەهاتە خوارێ. لەو کاتە دا حەمەد هەستی بە خۆشحاڵی و ئاسوودەیی دەکرد و مەلا سەلامیش زۆر شاد بوو کە حەمەدی بەو شێوەیە دەدی.

ـ حەمەد ڕۆڵە! ناردوومە سەرتاش بێ! خۆت ساز کە! سەرت چا کە و ڕدینت بتاشە! لە لای خەڵکی گوتوومە ئەوە خوشکەزای منە و با هەرواش بزانن. دەزانم ئەتۆش هەر وا دەڵێی و شتێکی وا نادرکێنی لێت دڕدۆنگ بن. شتێکی دی: ئەو جلانەی کوڕەکەی من بۆ بەری تۆ دەبن. دە بەریان کە! دوای ئەوەش کە سەر و ڕدێنت تاشی، سەریکی شاری دەدەین و شتی دەکڕین.

موسلیم گوتی:

ـ مامۆستا، دەکرێ ئەمنیش لە گەڵتان بێم؟

ـ بۆ ناکرێ، ئەمن تفەنگەکانتانم چەور کردوون و لە جێگایەکی باشم داناون. جێگایەکی وشکوبرینگە و مۆرکەش زەفەریان پێنابا. جا ئەگەر ڕۆژێکی کارتان پێیان بۆوە...

حەمەد گوتی:

ــ ئیشاڵڵا ئەمن قەت کارم بە تفەنگێ نابێتەوە!
مەلا سەلامیش گوتی:
ــ ئیشاڵڵا، بەڵام لەو دنیایەی ئێمە دا مرۆڤ ناتوانێ لە هیچ شتێکی دڵنیا بێ ...
حەمەد قسەکەی وی دووپات کردەوە:
ــ نەخێر، مرۆڤ ناتوانێ لە هیچ شتێك دڵنیا بێ!
ــ ئەگەر ئێستا لە نێو بازاڕی بڵێم خەڵکینە ئەوەی لە گەڵمە حەمەدۆکە، کەس باوەڕم پێ ناکا. ئەو مەترسی‌یە کە خەڵك بتناسنەوە، دەگۆڕێ دا نیە!
ــ ناوەڵڵا لێرە کەس باوەڕ ناکا ئەمن حەمەدۆك بم. بۆخۆشم هاوار کەم، کەس باوەڕ ناکا!
لەو کاتە دا سەرتاشەکە هات. قاپێك ئاوی گەرمی هێنا، پێشبەندێکی سپیی خاوێنی بە سینگی حەمەدی‌یەوە هەڵواسی و لکەکانی لە پشتملی گرێ دا. سەرتاشەکە تووکی سەری حەمەدی کورت کردەوە، پاشان کەفێکی زۆری لە دەموچاوی حەمەدی دا، جوان ڕدێنی خووساند و بە گوێزانێکی تیژ بۆی تاشی.
حەمەد زۆری کەیف بەو سەروڕدێنتاشینەی هات. هەستی بە قالبسووکبوونێکی خۆش دەکرد. کۆت و شاڵواری کوڕی مەلا سەلامی دەبەر کرد. پارچەی جلەکان پەشمی ئینگلیسیی ئەسڵ بوون، کە بە قاچاغی دەهاتنە وڵاتی. کڵاوێکی ڕێکوپێکیشی لە سەر نا و پاشان سوار بوون، لەگەڵ مەلا سەلامی چوونە شاری.
شارەکە لە نێو باغان دا هەڵکەوتبوو. هەرچوار دەوری شاری بە ڕەز و دارمیوەی جۆراوجۆری دیکە گیرابوو. ڕەنگی ماڵەکان سپی بوو و مزگەوتەکان و منارەکانیشیان هەر ئەو ڕەنگە بوو. منارەکان لە دوور ڕا وەك ملی سۆنەی سپی و جوان، بەرەو ئاسمان بەرز ببوونەوە.
هەر بە سواری هەتا کاروانسەرایەکی نێزێك نێوەندی شاری چوون. دەوروبەری کاروانسەراکەی بە دارلیمۆیان گیرابوو. لە وێڕا چوونە نێو بازاڕی شارەکەی.
مەلا سەلام حەمەدی بردە لای خەیاتی و شاڵوارێکی باشی بۆ کڕی. پارچەی شاڵوارەکەی هەر لەو پەشمە ئینگلیسی‌یەی بوو کە بە قاچاغی دەهات و بە دەزوویەکی زەردی زێڕین تەریب درابوو. پاشان جووتێك کەوشی چاکیشی لە دوکانی کەوشفرۆشێکی بۆ کڕی. ئەو جار چوونە دوکانێکی زۆر گەورە و لە وێش کۆتێکی چاکیان هەڵگرت. ئەو کۆتە ڕاست لە ئینگلستانێ ڕا هاتبوو. خاوەنی دوکانەکە هەتا بەر دەرکێ بە پیر مەلا سەلامی‌یەوە هات:
ــ ئەو دوو لاوە شۆخە کێن لە گەڵتن مامۆستا!

ـ ئەوەیان خوشکەزامە و ئەوی دیکەشیان هاورێی ویەیە! زۆر کوڕی چاکن. بابی خوشکەزاکەم ماڵی لە بناری ئاناوارزایە.

ـ بناری ئاناوارزای بە نێوبانگە و عەرزەکەی لە هەموو چوکووراوایە بە ڕێژەوترە! خەڵکی وێ هەموویان دەوڵەمەندن.

ـ بەڵێ وایە، ئەو خوشکەزا ژیرەم پێیخۆشە ماوەیەك لێرە، لە لای من بژی. ئەوان لە ماڵێ دا هەشت بران، بەڵام ئەمن ئەوەیانم لە هەمووان خۆشتر دەوێ، ئەویش خاڵی خۆی زۆر خۆش دەوێ.

ـ جا مامۆستا کێ بێ و پێیخۆش نەبێ خاڵێکی وەك تۆ بەڕێز و زانای هەبێ؟

ـ سوپاست دەکەم. دیارە ئەمن دەبێ یارمەتیی حەمەدی بکەم و ماڵێکی بۆ پێکەوە نێم. زۆری پێناچێ خێزانەکەی و خەسووشی دێن. ئەو لێرە غەریبە و وا چاکە ژن و منداڵی خۆی دەگەڵ بێ.

زەینوڵڵا ئەفەندی بازرگانێکی هەرە کۆنی ئەو ناوچەیەی بوو. کەس هێندی وی دە کاری کڕین و فرۆشتنێ دا شارەزایی و نێوبانگی نەبوو. دوکانەکەی لە نێوەندی شاری بوو و لە ڕاستیش دا لە هەموو شوێنەکانی دیکە بە ڕمێنتر و قەوغاتریش بوو. پیاو دەیتوانی هەموو چەشنە هەواڵێکی ئەو دەوروبەرەی لە وێ وە دەست کەوێ و هەر لە وێش ڕا هەموو قسەوباسێکی تازە بڵاو دەبوونەوە. ئەگەر شتێکی چکۆڵە لەو سەری تووڕووسی ڕووی دابایە، بەو مەرجەی هەر تۆزێك سەرنجڕاکێش بووایە، دەسبەجێ لەو دوکانەی ڕا بڵاو دەبۆوە و دەگەیشتە ئەدەنە، مەرسین، عوسمانیە، کۆزان و قەدریلی. ئەگەر هەواڵەکە تۆزێك گرینگتر بوایە، تەنانەت تا پێتەختیش دەچوو و بە گوێی مستەفا کەماڵ پاشاش دەگەیشتەوە. هەر بۆیەش مەلا سەلام هەر لە ئێستاوە ئەوانەی بۆ زەینوڵڵا ئەفەندی باس کرد.

ـ ئەها، کە وابوو حەوت خوشکەزای دیشت هەن کە لە گەڵت سوار بن و پشتت بگرن؟

مەلا سەلام پێکەنی و گوتی:

ـ ئەرێوەڵلا و شوکور هەمووشیان کوڕی چاکن!

ـ خودا هەموویانت پێبێڵێ.

زەینوڵڵا ئەفەندی کەپۆی خوار، چەنەی باریك و ملی درێژ بوو. چاوەکانیشی ڕەش و چکۆڵە بوون. وەك ڕێویی فێڵباز بوو و نەك هەر هیچ شتێکی پێشەرم نەبوو، بەڵکوو شانازیشی بە کەڵەکبازیی خۆیەوە دەکرد.

ـ زەینولڵلا ئەفەندیی خۆشەویستم، برا گیان، ئەو حەمەدەی خوشکەزام کۆتێکی پەشمی ئینگلیسیی دەوێ و دیارە لە هیچ شوێنێکیش جلوبەرگی جوانی وەك ئەوەی لە دوکانی تۆ هەیە، دەست ناکەوێ. تەنانەت ئەنکەرەش شتی وای لیّنیە. جا بۆیە ئەمن بە خوشکەزاکەم گوت کە ئەو شتانە لە لای خۆیان نەکڕێ و لێرە...

ـ زۆر باشی کردوە!

پاشان زەینولڵلا ڕووی دە حەمەدی کرد و گوتی:

ـ خاڵت ڕاستە مەلایە، پیاوێکی ئایینیە و زۆریش بەدینە، بەڵام لە جندۆکان زیرەکترە و لە هیچ شتێکی دا دانامێنێ. مەلا نەبوایە، قسەی تیّدا نیە دەبوو بە سەرۆکی ئەو وڵاتەمان. لەوانەش بوو سەربەخۆیی چوکووراوای ڕاگەیاندبا و بووبا بە شای ئێرە. خاڵت ڕاست دەکا. ئەو جلوبەرگ و کوتاڵە باشانەی لە فرۆشگە هەرە بەنێوبانگەکانی لەندەنێ هەن و لۆردەکانی وێ دەیانکڕن، لێرە لە لای من دەست دەکەون. هەروەها لێرە دەستت بە هەموو ئەو شتومەکانە ڕادەگا، کە گەورەپیاوەکانی پاریسێ دە بەریانی دەکەن.

کوڕێك بەردەستی بوو و لە وێ کاری دەکرد. کوڕەکەی ناردە عەمباری خوارێ و کاتێك کوڕەکە هاتەوە، چەند دانە کۆتی جوانی بە دەستەوە بوو. زەینولڵا ڕووی دە حەمەدی کرد و بە بزەیەکەوە گوتی:

ـ حەمەد، کوڕم، هەستە بزانم!

سێ کۆتی جیا کردنەوە. ئەوی یەکەمیانی بە کەیفێ نەبوو:

ـ نا، ئەمەیان لە خوشکەزای مەلا سەلامی خۆشەویستی من جوان نیە، بەڵام ئەوەیان دەبیّ بە بەرت خۆش بێ و زۆریش لە گەڵ بەژن و باڵای تۆ دێتەوە. دە بەری کە بزانم!

ـ بەڵێ ئەمەیان تەواوە. هەر دەڵێی بۆ تۆ دروراوە. هەر ئەو ڕەنگەش لە تۆ دەوەشێتەوە.

حەمەد گوتی:

ـ بەڵێ ئەوەیان بە بەرم خۆشە و ڕەنگەکەشیم پێ جوانە. سوپاست دەکەم زەینولڵلا ئەفەندی ، زۆرمان زەحمەت دای.

پاشان کیسەی پوولێی دەرێنا:

ـ باشە دەبێتە چەند؟ وەڵلاهی خۆ پوولی کاغەزیشم پیّنیە و هەر ئەو سکە زێڕەم...

ـ قەی ناکا، دەبێ.

لێرە دا مەلا سەلام وەدەنگ هات:

ـ ڕاوەستە بزانم، خوشکەزای خۆشەویستم. کیسەکەت دە گیرفانت نێوە! خاڵی خۆت حیسابی دەکا!

زەینوڵڵا گوتی:

ـ بەڵێ وایە، تەنانەت ئەگەر پیاو زۆریش دەوڵەمەند بێ، لە خزمەت خاڵێکی وەك تۆ دەست بۆ گیرفانی نابا.

حەمەد سوور هەڵگەڕا و بە ئەسپایی کیسەکەی دە باغەڵی نایەوە.

ـ ئەو جار دەبێ دوو ـ سێ کراسی باشیشی هەبێ!

ـ کراسیشم هەن، کراسی زۆر چاکی ئینگلیسی! هەر پێرێ یاوەر ڕۆبێرت لە ئینگلستانێ ڕا بۆی هێناوم.

دەو بەینەی دا خەڵك دەهاتنە ژوورێ و دەڕۆیشتن، زەینوڵڵاش قسەی دەگەڵ دەکردن و وردە دەنگۆ و هەواڵی کۆ دەکردنەوە:

ـ ئەرێ مامۆستا هیچ هەواڵی شاکیر بەگی دولکادیرلیت هەیە؟ داخوا خانووەکەی تەواو بووە؟

مەلا سەلام قاقایەکی کێشا:

ـ ئەو خانووە قەت تەواو نابێ! هەموو جارێ کە دێ تەواو بێ، شاکیر بەگ شتێکی لێ دەبینێتەوە، دەیەوێ ئاڵوگۆڕێکی تازەی تێدا بکا و بیکاتە باڵەخانەیەکی جوانتر. خانووەکە جار بە جار گەورەتر دەبێ.

ـ دەڵێن ئەندازیاران بۆ ئەو خانووەی لە ئەستەمبووڵی ڕا دێنێ و بەردشکێنان لە ماردین و دیاربەکرێ ڕا! ئەوە ڕاستە؟

ـ نازانم، بەڵام دەبێ ڕاست بێ.

ـ ئەدی نێوانی لە گەڵ مامۆستا زەکی ئەژادی چۆنە؟

ـ جا نێوانی چۆن بێ! دەڵێ سوێندم خواردوە هەر دەیکوژم، ڕۆژێکم مابێ، بۆ ویم ماوە.

ـ وەڵڵا بۆشی دەکرێ! ئەو شاکیر بەگەی ئەمن دەیناسم، ئەگەر بیەوێ، دەتوانێ مارشاڵ فەوزی و تەنانەت خودی عیسمەت پاشاش بکوژێ!

ـ مامۆستا زەکیشت پێ کەم نەبێ. ئەویش پیاوێکی کەللەشەقە و پێموانیە زۆر دەربەستی شاکیر بەگی بێ.

ـ بیستوومە بەگ بە نیازە سەدان هێکتاری دیکەی دەشتێش بکاتە چەڵتووك، بەو قەرارەی نۆ گوند وە بن ئاوێ دەکەون.

حەمەد لەو قسە و باسەی نەدەگەیشت. نە دەیزانی مەسەلەی بەینی مامۆستا زەکی و شاکیربەگی چییە و نە هیچیشی سەبارەت بەو گوندانە دەزانی کە دەگوترا وەبن ئاوێ دەکەون.

نێزیك نیوەڕۆیە مەلا سەلام دەستی بۆ بەرۆکی برد، سەعاتەکەی لە باغەڵی دەرهێنا. سەعاتەکە زێڕ بوو، زنجیرێکی زێڕی ئەستووری پێوە بوو و سەرقاپەکەی بە نەخش و نیگاری جوان ڕازابۆوە. مەلا سەلام چاوێکی لە سەعاتەکەی کرد و گوتی:

ـ هێشتا بۆ نوێژی نیوەڕۆیە ماویەتی. وا چاکە بچین نانی بخۆین!

کەبابی گۆشتی مەڕی، لە سەر پۆلووان، بێجگە لە بۆنی خۆشی خۆی، بۆنی بیبباری سوور و گوڵە لیمۆشی دەدا. شاگرد کەبابچی‌یەکە کە سەربەرگێکی پەڵەپەڵەی دەبەر دا بوو، بە پیریانەوە هات و بە ڕێزێکی زۆرەوە مێزێکی نیشان دان. حەمەد کاتێك دانیشت، سەری هەڵێنا و تەمەشای دەوروبەری خۆی کرد. لە نەکاو دوو چاوی دیتن، کە ڕاست دە وی‌یەوە ڕامابوون. حەمەد سپی هەڵگەڕا. ئەو کابرایە ناسیاو بوو، بەڵام وەبیری نەدەهاتەوە کێ‌یە! هەر بۆیەش ترسا. بە ڕاستی ئەوە کێ‌یە؟! دڵنیام لە جێگایەکی دیتوومە و قسەم لە گەڵ کردوە، بەڵام ئاخر کێ‌یە؟ کابرا لە پڕێك هەستا و وەدەرکەوت. حەمەدیش هەستا و وەدووی کەوت. دەتگوت ئەو کابرایە جادووی لێ‌کردوە و بە دووی خۆی دا دەکێشێ. پیاوەکە بۆ لای بازاڕی چوو. زۆر توند دەڕۆیی. حەمەد قەت تا ئێستا نەی‌دیبوو کەس ئاوا توند بڕوا.

کابرا لە نێو بازاڕی ئاوڕی داوە و خێسمەیەکی دیکەی لە حەمەدی کرد، پاشان لە جیاتیی ئەوەی بۆ لای مزگەوتێ بڕوا، ڕووی دە کۆڵانێکی کرد، کە هەردووك لای دیوارەکانی بە دارمێو داپۆشرابوو، لە وێش ڕا چووە نێو کۆڵانێکی دیکەوە. حەمەد هەر بە دوایەوە بوو. ئەو جار کابرا چووە نێو جادەیەکی گەورەترەوە، بە دەوری مەیدانێکی دا سووڕایەوە، بە نێو پۆلەدارێکی دا ڕۆیی، لە جۆگەیەکی پەڕی‌یەوە و چووە نێو باتلاغێکی‌یەوە. لە وێ، لە نێو قامیشەڵێنێکی دا ون بوو و ئاسەواری نەما. حەمەد ئەوەندە ماندوو بوو، کە نەی‌دەتوانی یەك هەنگاوی دیکەش هەڵێنێتەوە. ناچار دانیشت و تۆزێك حەسایەوە.

کاتێك حەمەد گەیشتەوە نێو شاری، تەواوێك ماندوو ببوو. لە مزگەوتێ مەلا سەلام و موسلیمی دیتەوە:

ـ ئەرێ ئەوە چ بوو حەمەد، چت لێ‌هات؟

ـ ئەو کابرایە ئەمنی ناسی‌یەوە!

ـ کێ؟

ـ یەکێك بوو دەم‌ناسی، بەڵام وەبیرم نایەتەوە کێ بوو...

## (٧)

سامی تورگوتی مامۆستای فێرگە تابلۆیەکی زۆری لە سەرەئەسپی کێشابۆوە. تابلۆکان لە هەموو ڕەنگێك بوون، لە هەموو ئەو ڕەنگانەی دە کۆلکەزێڕینەی دا هەن. وێنەی سەرەئەسپ لە هەموو ڕێگاکان درابوو و بە هەموو دارەکانی شارییەوە هەڵواسرابوو. لە گوندە هەرە دوورەکانی تووڕووسی و لە هەموو قاوەخانە و مزگەوتەکانی چوکووڕاویەش، وێنەکە بە دیوارانەوە دەبیندرا.

ڕۆژێکی، بازاڕ بوو. ئەو بازاڕە لە کۆنەوە و تەنانەت پێش دروستبوونی ئەو شارەش هەر هەبووە. شوێنی بازاڕەکەی لە گۆڕاییەکی خوارەوەی تەپۆلکەیەکی قەراغ چۆمییە. ئەو خێڵانەی لە کوێستانێ ڕا دەگەڕانەوە، هەروەها تورکمانەکانیش، ڕایەخیان پڕ بە مەیدانەکەی ڕادەخستن و بەرهەمە تایبەتییەکانی خۆیانیان، بۆ فرۆشتنێ، لە سەر بڵاو دەکردنەوە. لای پردەکەی پێیدەگوترا پاڵ پردێ، بەرێکی پردەکەی، کە بازاڕیش بوو، تەپکەکە بوو.

لە سەردەمی زۆر کۆنەوە هەوشارییەکان، تورکمانەکان و خێڵە چادرچییەکان هاتوونە ئەو بازاڕەی و مەڕ، بزن و ماڵاتی وەك گوێدرێژ و گایان فرۆشتوە و هەروەها زۆر شتی وەك: ڕۆنی کەرە، هەنگوین، جیوەی گوێنی و دارسنەوبەری، سەتڵ، لانك، پنە، وەردێنە، لباد، جەواڵ، فەرش و ڕایەخی دی و نوێنوبانیشیان بۆ فرۆشتنێ هێناوە.

هەمیشە ئەو بازاڕە پڕ بووە لە خەڵك. بەهاران لە بەر تیشکی ڕۆژێ، چاو لە تەمەشای ئەو لبادە ڕەنگاوڕەنگانەی "جیگجیك"ێ تێر نابێ، کە لەو مەیدانەی دا ڕادەخرێن. مرۆڤ لە دیتنی ئەو هەموو ڕەنگە جوانە جۆراوجۆرانە لە بازاڕی پاڵ پردێ حەیران دەبێ.

لە سەرەوەی ئاناوارزای و لە بناری "بوزکویو" و گوندی "جیگجیک"ی، تووشی پاناوکێکی بەرین دەبی. ئەو گۆڕاییی‌یە گڵێکی تاوەسووتی هەمەڕەنگەی یەکجار جوانی هەیە. کەس نازانێ ئەو گڵە بەو هەموو ڕەنگ و نەوعە تێکەڵاوانەوە لە کەنگێوە هەیە، بەڵام ئەو ڕەنگە تێکەڵاوانە لە کۆنەوە بوونە سەرچاوەی ئیلهام و ئەزموون بۆ خەڵکی دەستڕەنگینی هەرێمەکە. ئەو لبادانەی جووتێرەکانی گوندی جیگجیکی دەیانگێڕن، کۆمەڵێك ڕەنگ و نەخشیان تێ‌دان کە دە هیچ نەوعە لبادێکی دیکە دا نین. ئەو لبادانە هێندە جوانن، دەڵێی دە ڕەنگ و نەخشەکان دا دەدرەوشێنەوە و خەڵکی جیگجیکیش نەهێنیی ئەو سەنعەتەی خۆیان بە کەس ناڵێن. هەروەها ئەو ڕازەش کە چۆن نەخشەکان دادەنێن هەر لە لای خۆیانە و وەك گلێنەی چاویان دەیپارێزن. ئەو هونەرە، یانی ئەو چەشنە لباد دروستکردنە، بە نەخش و ڕەنگەوە تایبەتیی خۆیانە، سەدان ساڵە بە ناوی ئەوان و گوندەکەیانەوە بڵاو بۆتەوە و ناوبانگی دەرکردوە، هەروەك فەرشی خێڵەکان، کە بێ‌ئەژمار نەخشی کەو، ماری ڕەش و ئاسکەکێوی‌یان لە سەر تێکەڵ کراون. یان دەبینی هەر لە سەر ئەو فەرشانە نەخشی دەگمەن هەن کە لە جۆرە فەرشی دیکە دا نین: ئەسپێکی کوێت لە سەر عەرزێکی سەوز غار دەدا، ئەسپەکە کلکی ڕاست هەڵێناوە و یالی دەڵێی پەڵەهەورە ڕادەژێ. نێری‌یەکی شینکی لە سەر ڕەوەزێکی ڕاوەستاوە. دووپشکێکی زەرد، کە ڕەنگی لەشی بە لای ڕەنگی گڕی ئاگر دا دەشکێتەوە، کلکی هەڵێناوە و بەدوای نێچیرێك دا دەگەڕێ کە پێوەی دا. مارێکی سوور لە لاقی کچێکی پرچدرێژ ئاڵاوە. بەیانی‌یە، ڕێوی‌یەك کە کلکی لە ڕەنگی بڵێسەی ئاگری‌یە، قوت بووە و چاوەکانی، کە دەڵێی کەللان، بە دووی هەوێردەیەکی دا دەگێڕێ و هەوێردەکەش فڕیوە و لێی دوور کەوتۆتەوە. ڕۆژ بە سەر دەشتێ دا دەدرەوشێتەوە، هێندێك لەکلەکی دەنووکدرێژی لاقسوور و درێژ، سەریان ڕادەوەشێنن و ئەوی پێشەوەیان خەریکە بۆقێکی بگرێ، کە هەر ئێستا لە نێو قامیشان دەرپەڕیوە. لە کەلاوەکانی کۆنەقەڵای ئاناوارزای، ئەگەر هەربستێك عەرزی هەڵکۆڵی، خشت و بەردی ڕەنگاوڕەنگ و جۆراوجۆری گەورە و چووکە دەبینی‌یەوە. لە میسیسێ و لە دەوروبەری دوملووکالێش هەر وایە. یۆرووکەکانیش فێر بوون، خشتە نەخشینەکان دەردێنن، و بۆ نەخشی لباد، بەڕە و فەرشەکانیان وێنەیان لێ‌هەڵدەگرنەوە، بەڵام ئەوەشیان لە بیر ناچێ کە وێنەی هەموو چەشنە باڵندە، ئەسپ و ئاسکێکی ئەو سەرانەش دە نەخشەکانیان باوێن. ڕەنگ و وێنەی سەدان ساڵ کۆن، تازە دەبنەوە، دێنە سەر لبادەکان و جار بە جار جوانتر و بە نرختر دەبن. کاری ئەو نەخشگەرانە ڕۆژ بەڕۆژ جوانتر، وەستایانەتر، سیحراویتر و ڕێکوپێکتر دەبێ. هەر کەسێ ئەو هونەرە دەبینێ، سەری سوڕ دەمێنێ.

بازاڕەکە پڕ بوو لە خەڵك. لە هەموو شوێنێك فەرش و لباد ڕاخرابوون و لە سەرانسەری قەراغ چۆمەکەش لانك و شتی دەستسازی دیکە داندرابوون. دارەکانی دەوروبەر و کۆڵەکەکانی پردەکەش تابلۆی سەرەئەسپیان پێوەدرابوو. جووتێرەکان کە دەهاتن، دەگەیشتنە هەر تابلۆیەکی، ماوەیەك لە لای رادەوەستان و تێیڕادەمان، دوایە دەچوون چاویان لە وی دیکە دەکرد. خەڵکەکە بە تەواوی لە بیریان چۆبۆوە، بۆ چی هاتوون وچ دەبێ بکرن و هەر باسی ئەسپەکەیان دەکرد.

هێندێك دەیانگوت: تیاح! ئەو خەڵاتە تەنیا بۆو ئەسپەی؟! وەڵلاهی ئەو خەڵاتە نەك هەر بۆ ئەسپێکی، بەڵکوو بۆ تەسلیمکردنەوەی خودی حەمەدۆکیش، زۆرە. قسەی تێ دا نیە بەو خەڵاتەی ئەسپە بۆرەی کوێرۆغلی، ئەسپە ڕەسەنەکەی گەنج عوسمانی، یان دولدولی حەزرەتی عەلیشیان بۆ دێنن. بەڵێ ئیدی... بەو هەموو پوولەی ...!

ـ ڕەنگە ئەسپەکەی کوێرۆغلییان بۆ بگیرێ، بەڵام ئەگەر بە دوای ئەسپی حەمەدۆکیەوە بن، بە هیلاك دەچن و بۆشیان ناگیرێ. دولدولی حەزرەتی عەلی ئێستاش لە دەوروبەری یەمەنێ دێ و دەچێ و ئەوان دەتوانن بیدۆزنەوە، بەڵام قەت دەستیان ناگاتە ئەسپی حەمەدی. گەنج عوسمان ئەوە لە بەر دەروازەی بەغدایە، سەری دە بن باڵی ناوە و شیرەکەی ڕادەوەشێنێ. جووتێرەکانی ئێرە دەتوانن ئەسپەکەی وی بگرن، بەڵام هەرگیز ئەسپی حەمەدیان بۆ نابینرێتەوە و تەنانەت ئەگەر بشیبیننەوە و بشیگرن، بوومەلەرزە دێ، سێلاو هەڵدەستێ و دنیا دەشێوێ. ئەسپەکەش ڕزگار دەبێ.

خەڵك هەروا چاویان لە تابلۆکان دەکرد و خەڵاتەکەیان بەراوەرد دەکرد. لە پڕ پاشنیوەڕۆیە دەنگۆیەك بڵاو بۆوە و گوترا ئەسپەکە گیراوە و هێنراوەتە بەر دەرگای ژاندەرمەخانەی. حەشیمەت هورووژمی بردە لای ژاندەرمەخانەی. ئەسپێك لە وێ، لە بن تابلۆ گەورەکەی بەر دەرکێ، کە لە بەردی مەرمەڕی خالیس بوو، ڕاگیرابوو. سەروسەکوتی ئەسپەکەی مێیانە هەڵکەوتبوو، جوان بوو، لووتی ڕاست بوو، کزەڵە و ویشك و ڕەق بوو و ئاوی بە چاوییەوە بەند نەدەبوو. برینێکی لە پشتی بوو و پۆلێك مێش لە سەر برینەکەی دەخولانەوە، بەڵام ئەسپەکە تاقەتی نەبوو لانیکەم کلکی ڕاوەشێنێ و مێشەکان لە خۆی دەرکا. هەر ڕاوەستابوو، سەری بەردابۆوە و پاشووی ڕاستەی بە بەرزگییەوە نابوو. دەترسای هەر بایەکی بێ، وەك پووشێ لە عەردی ببرێ و دەگەڵ خۆی بەرێ.

هەرکەس دەهات و ئەسپەکەی دەدی، پێی سەیر بوو. بەو حاڵەش کەس بەر دەرگای ژاندەرمەخانەی بەجێ نەدەهێشت و خەڵکی دیش هەروا دەهاتن. هەموویان مات و حەیران ڕاوەستابوون و چاوەڕوان بوون.

مورتەزاغا یەکەم کەس بوو کە خۆی دە باڵ خەڵکەکەی ڕاکرد و لە حاڵێك دا وەخت بوو لە خۆشیان بفڕێ، خۆی گەیاندە حەساری ژاندەرمەخانەی. یاوەریش بە پەلە لە پلیکانان هاتەخواری، بە پیرییەوە هات و پاشان دەستی گرت، بردی بۆ لای ئەسپەکەی، کە هەروا بێ جووڵە ڕاوەستابوو و ئەو جار سەرنجی دا بزانێ ئاغا دەڵێ چی. کاتێك مورتەزا چاوی بەو کەلاکەی کەوت، وشك بوو. بە دەوری ئەسپەکەی دا سووڕا و چاوی لە هەموو لەشی کرد، بەڵام هەر چەندی زیاتری لێ ورد بۆوە، زیاتریش تێکچوو. مورتەزا کلکی ئەسپەکە هەڵێنا و لە نێوگەڵی ڕوانی، شەویلکەی لێککردنەوە، چاوی لە خلێنانی کرد، پاشان ددانی دە چیرەوە برد، بۆڵەیەکی لێهات، گەڕایەوە بۆ ژووری ژاندەرمەخانەی و یاوەریشی هەر بە دووەوە بوو. ساتێك دواتر ژاندەرمەکان دڕیان بە خەڵکەکەی دا و ڕێگایەکیان کردەوە. لە پێش دا حاکم هات، ئەوجار خەلیل بەگی گەورە، شارەدار، قازی، زولفۆ و پیاوە گەورەکانی دیکەی شاری بە دوای یەکدا گەیشتنێ.

کاتێك ئەوان هەموویان گەیشتنە لای تابلۆکەی و چاویان بە ئەسپەکەی کەوت لە قاقایان دا و لە حاڵێك دا دەستیان بۆ لای ئەسپەکەی ڕادەداشت، دەیانگوت:" چاو ئەو ئەسپە بەستەزمانەیان هێناوە". مورتەزاغا بە پەلە لە پلیکانەکان هاتە خوارێ و بە نێوچاوانێکی گرژەوە دەستی بە قسەکردن لە گەڵیان کرد. ئەوانیش هەموویان بەرەو ژووری ژاندەرمەخانەی چوون. مورتەزا لەپێشیانەوە دەڕۆیی و لە حاڵێك دا هەردووك دەستی تێکەوە دەدان، قسەی بۆ دەکردن و ئەوانی دیش هیچیان نەدەگوت. کاتێك هەموویان لە پلیکانەکان وەسەرکەوتن، چوونە ژوورێ و کەسیان بە دەرەوە نەما، لە نێو حەشیمەتەکەی دەنگ پەیدا بوو. خەڵکەکە دەستیان کرد بە قسەکردن، جەفەنگ، یەکتر پاڵپێوەنان وهەراوهوریایە:

ــ ئای لەو گاڵتەجاڕییەی!

ــ یانی ئەوە ئەسپی حەمەدۆکییە؟

ــ کەس بێمێشکی وەك ئەوانەی نەدیوە! بۆ وەی دەبن لەتوپەتیان کەی!

ــ کوڕە ئەوە قسەیە، کێ دەتوانێ ئەسپی حەمەدۆکی بگرێ؟

ــ ئەسپی حەمەدۆکی جندۆکەیە! دێوەزمەیە!

ــ ئەو ئەسپە خۆرە خۆر!

ــ ئەمن ئەو قۆترەم هێنابایە، چەندیان دەدامێ؟

ــ نابینی، ڕاست ئەسپەکەی کوێرۆغڵییە...

ـ ئەی ئەوە نیە وەك ئەسپەکەی وی بۆرەشە...

ـ ئەو ئەسپە بۆرەیە سەیر لاوازە...

ـ هەر فووی لیٚبکەی، با دەیبا.

ـ ماڵت بە قوڕیٚ گیریٚ، حەیدەر یەکچاوی مەیتەر!

ـ ئەو کەلاکەی بەڕەڵاٚ کردبوو، بۆخۆی بلەوەڕیٚ.

ـ دەی ئیٚستا دەبیٚ هەزاروپیٚنسەد لیرەی لە مورتەزاغای وەرگریٚ!

ـ پووڵی ئاغای پووڵە، خۆ ورکەبەرد نیە!

ـ کوڕە قەت ئاغا ئەو پووڵەی لە بەرامبەر ئەو کەلاکەی دا نادا!

ـ وەڵلاهی حەیدەر یەکچاو شتیٚکی عەنتیکەی هیٚناوە. دەبیٚ ئەوە هەزار ساڵی تەمەن بیٚ!

ـ خۆش دەبیٚ ئەگەر حەمەد ببیسیٚتەوە کە یەکچاو ئەو قۆتڕەی کردۆتە ئەسپەکەی وی...

ـ ئەویش ئەو کەلاکە...

ـ ئەو یەسك و پیٚستە...

ـ ... بە ئەسپی وی لە قەڵەم بدەی...

ـ وەڵلاهی یەکجیٚ دەیکوژیٚ!

ـ گوللەیەکی لە تەپڵی سەری دەدا.

ـ وەڵلا بابە ئەسپیٚکی سەیرە، وەنیە؟

ـ ڕەسەنە، وەك بای دەڕوا!

ـ بە باڵان دەفڕیٚ!

ـ بام ئەو ئەسپە ڕەسەنە! وەڵلاهی ڕۆییٚتە پشتئەستۆی حەیدەری هەتا پشت کیٚوی قافیٚی بەند ناکا!

ئەسپەکە هەروا سەری بەردابۆوە، لە بن تابلۆ مەڕمەڕە سپییەکەی ڕاوەستابوو و نە دەبزووت. خەڵکیش بە دەنگی بەرز گاڵتەی خۆیان دەکرد و باسی خەڵاتەکەشیان دەکرد: هیٚندیٚك پیٚیان وا بوو کە حەیدەر یەکچاو دەبیٚ خەڵاتی خۆی کە هەزاروپیٚنسەد لیرەکە بوو، وەرگریٚ و هیٚندیٚکیش دەیانگوت نایکەویٚ. ئاخرەکەی کیٚشە پەیدا بوو. بەشیٚکیان دەیانگوت ئەو ئەسپە لەوانەیە بە ڕاستی ئەسپەکەی حەمەدۆکی بیٚ و ئەگەر ئاواش کز و کەڵەلایە، لە بەر ئەوەیە کە زۆر بە نیٚو شاخان دا ڕاوڕاویٚنی کردوە. بەشەکەی دیکەش لە سەر ئەوەی سوور بوون کە ئەوە ئەسپی حەمەدۆکی نیە و دەیانگوت ئەسپی حەمەدۆکی قەت ئاوا تیٚكناقوپیٚ.

لەو کاتە دا ژاندەرمەکان دیسان هاتن و دڕیان بە خەڵکەکەی دا. دەیانەویسیت یەکێکی بەرنە نێو ژاندەرمەخانەی، ئەویش سەیدی کۆنەمەیتەری عەلی سەفابەگی بوو، کە تازە گەیشتبوە ئەوێ. خەڵکەکە زار بە زار ناوی سەیدییان دووپات کردەوە و باسی ئەوەشیان کرد کە حەمەد عەلی سەفا بەگی کوشت، بۆ ئەوەی دەست بە سەر ئەسپەکەی دا بگرێ.

ــ ژیانی حەمەدۆکی بەو ئەسپەیەوە بەستراوەتەوە.

ــ ئەگەر سەیدی بڵێ بە ڕاستی ئەوە ئەسپەکەی حەمەدۆکییە، ئەوە ئیدی...

ــ ئەو بەستەزمانەی بە گوللان کون کون دەکەن.

ــ ئەو کاتی حەمەدۆکیش دەسبەجێ دەکەوێ و دەمرێ!

ــ دەمت ببەستە!

ــ بەستەزمانە!

ــ کوڕە ئەوە هەر فشەیە...

لەو کاتەی دا ئەسپەکە کلکی ڕاوەشاند و مێشومەگەزی لە دەوری خۆی دەرکرد.

قاقای خەڵکەکەی دەنگی دایەوە:

ــ ئەها، ئاخرەکەی کلکی بزاوت!

ــ سوێندێ دەخۆم کلکی بزووت!

ــ ئەسپی حەمەدۆکی نەبا، ...

ــ ... بڵێی توانیبای کلکی ئاوا جوان ڕاوەشێنێ؟

ــ بەڵێ، چونکە ئەوەمان لێدیوە،...

ــ حەیدەر یەکچاو خەڵاتەکەی دەکەوێ بابم! پووڵی خۆی دەبێ وەرگرێ!

ــ دەبێ دوای ئەوەی ئەو هەموو پووڵەی وەرگرت چ بکا؟

ــ با بچێ بە کەیفی خۆی عەرزی هەڵکۆڵێ!

ــ وەڵڵاهی ئەو کوێرە مەلعوونە ئاخری خەزێنەکەی دەبینێتەوە.

سەیدیی کۆنە مەیتەر لە سەرەخۆ هاتە لای ئەسپەکەی، یەك دوو شەقاو دوورتر ڕاوەستا و چاوی لێکرد، پاشان وەرسووڕا و چۆوە بۆ لای پلیکانەکان. خەڵکەکە لە بەر چاوەڕوانییە هەناسەیان بۆ هەڵنەدەکێشرا و هەنگاو بە هەنگاو چاویان بە دووی سەیدی دا دەگێڕا.

لە ژووری ژاندەرمەخانەی کێشەیەکی گەورە دە گۆڕێ دا بوو. مورتەزاغا دەیگوت بە هیچ شێوەیەك ئەوە ئەسپە کوێتی عەلی سەفا بەگی نیە و یەکچاویش دەیگوت نەخێر هەوە.

حەیدەر یەکچاوی مەیتەر لە گوندێکی ئەوسەری دەشتێ، لەو جێیەی جەیهان لە شاخی ڕا دەڕژێتە دەشتێ، لە دایك ببوو. کۆنە قەڵایەك لە پەنا دێیەکەیان بوو و کۆمەڵێك کەلاوەی بە سەریەکدا ڕووخاوی پاشماوەی شارێکی وێرانکراوی کۆن لە دەورو بەری قەڵاکەی بوون. شانۆخانەی ئەو شارە کۆنەی، هێشتا وەك خۆی مابوو، دەتگوت دوێنێ دروست کراوە. کاتێك جووتێرەکان باراشیان گێژەو دەکرد و بەگشتی کاتی خاوێنکردنەوەی گەنم و دانەوێڵەی دیکە، کەلکیان لە کەلاوەکان وەردەگرت. لە نێو مەیدانەکەی و کەلاوەکان سەختەبەردی بنەوشیی پان و گوڵی شینی لێ بوون، گوڵەکان بۆنێکی خۆشیان هەبوو. هێندێك کۆڵەکەی بەردینی بڵیند، لە سەختەبەردی شین، بە ڕیز چەقابوون. هەر سێ دانە لەو کۆڵەکانە کەوتبوونە عەرزی. لەو دەوروبەرەی زۆر پەیکەرە لەتوپەت و پرشوبڵاو، سەر لێرە، لەتە باسك و دەست و شتی دی لە وێ، کەوتبوون. هەروەها زۆر لەتەکاشی و بەردی ڕەنگاوڕەنگیشی لێبوو.

حەیدەر یەکچاوی مەیتەر بەردتاش بوو، ئەو کارەی لە باب و باپیرانی بۆ بە میرات مابۆوە، کە لە سەردەمی کۆنەوە بەرداشیان لە سەختە بەردی گەورە گەورەی شین، یان سپی دەتاشی. حەیدەر یەکچاو هەتا بوو بە حەڤدە ساڵ خەریکی ئەو کارەی بوو. ڕۆژێك خەریکی بەردێکی بوو، دەیتاشی، لە پڕ پڕیشکەیەك لە بەردەکەی بۆوە و وە چاوی کەوت. ئەگەر مەلا ئیدریسی سەرتاشی خەڵکی گوندەکەی جیرانی خۆیان نەبوایە، کە دەفریای هات و بە دەرمانان چاوێکی بۆ چاك کردەوە، ئەوە هەردووك چاوی کوێر دەبوو و بە حەیدەرە کوێر ناوی دەردەکرد. دوای ئەوە ڕووداوە حەیدەر یەکچاو بەردی نەتاشییەوە و ئیدی چەکوچ و پوازی بە دەستەوە نەگرتەوە. ئەو چەند ساڵان هەر بە نێو شاخان و باغان دا گەڕا و لە پڕێك بە شتێکی چاوەڕواننەکراو ژیانی گۆڕا. ئەویش ئەوە بوو کە حەیدەر دەستی کرد بە کۆکردنەوەی توێژەماران. لەو ماوەیە دا کە دەگەڕا، هەر توێژەمارێکی تووشی دەبوو، کۆی دەکردەوە و بەو شێوەیە توێژەمارێکی زۆری کۆ کردەوە. مەلا ئیدریس پێیگوتبوو چاوی تۆم بە توێژەماری چاك کردۆتەوە. گوتبووی مەڵحەمێکی لە توێژی نەودونۆ ماران دروست دەکەم و دەتوانم چاوی زۆر کەسی وەك تۆی پێ چاك بکەمەوە.

ڕۆژێکیان کە یەکچاو لە نێو کەلاوەکانی قەڵا کۆنەکەی لە توێژەماری دەگەڕا، لە بن پنچکێکی چاوی بە شتێکی زەرد کەوت، کە دەبرووسکایەوە. کە هێنایە دەرێ، دیتی دوو ئەنگوستیلەی زێڕ بوون. ئیدی لەو ڕۆژەوە لە کەللەی دا. بە قسەی کەس نەدەگەڕایەوە. کاری بوو بەوە کە عەرزی هەڵکۆڵێ، لە زێڕی بگەڕێ و لە تەواوی چوکووڕاوایەش ناوبانگی بەوە

دەرکرد کە عەودالّی خەزێنە دیتنەوەیە. لەو ڕۆژەوە تا ئێستا حەیدەر هەموو شوێنێکی هەرێمەکەی پشکنیبوو، تەماشای زۆر کتێبی کردبوو کە باسی خەزێنەیان تیّدابوو و گەلێك شوێنی عەرزی چوکووڕاوای شێو و وەرد دابۆوە. لە هەر شوێنێك کەلاوەیەکی دۆزیبایەوە، خێرا دەچووە زگی، دەیکۆلّی و لەو بەینەی دا هێندێك پەیکەرە، بەردی بە قیمەت، زێڕ، مس، زێو، کۆمەلّێك ملوانکە، ئەنگوستیلە، بازنە، خڕخالّ و بەردی نەخشینی ڕەنگاوڕەنگی دۆزیبۆونەوە. ئەو هەموو کەلاوەکان و ئەو شوێنانەی گومانیان لیّدەکرا کۆنە ئاسەوار بن، دەگەڕا و بە دوای خەزێنەی پاشاکانی" لاوی"، "ئەرزاواکان"، "کیزواتاکان"، "کیکلینەکان"، "فارسەکان"،" ئاسۆرییەکان"، "هیتتیتەکان" و "سەلەوسیسکەکان"ـەوە بوو.

حەیدەر یەکچاو لاقی زۆر درێژ بوون. سمێلّی دە خەنە دەدا و مژی گەورە گەورەی لە مۆدنە کارەباکەی دەدان. لە هەمووی ئەو شتانەی کۆی کردبۆوە، ئەوەی هەیبوو، خانوێکی چکۆلّە، کە لە نێو باخچەیەکی لە گوندەکەی خۆیان دروست کرابوو و پێنسەد دۆنم عەرز بوو. بە پوولّەکەی دیکە، بە کەیفی خۆی ڕایبواردبوو. هەرچی شوێنی خۆش لە شارەکانی ئەستەمبووڵ، ئەنکەرە، دیمەشق و ئالێپوو هەبوو، دیتبوونی و ژنی جوان لەو شارانە نەمابوو، سەردانی نەکردبیّ، بەلاّم ئێستا ئیدی پیر ببوو. تەنیا شتێکی بە نرخی مابوو، ئەویش بالّندەیەکی بەردین بوو، کە مل، سینگ و لاقی زێڕ بوون. بە قسەی حەیدەر یەکچاوی ئەو بالّندەیە سێهەزار و پێنسەد سالّ کۆن بوو و ئەویش وەك گلێنەی چاوی خۆی خۆشی دەویست، ئاگای لێیبوو و بە کەسیشی نەدەگوت لە کوێی دەشارێتەوە و هەر لە بناخە دا بە کەم کەسی نیشان دەدا.

ـ بەلّیّ، ئاغاکانم، وەلّلاهی ئەوە ڕاست ئەو ئەسپەیە کە حەمەدۆك لە عەلیسەفابەگی ئەستاندوە. بۆخۆم بەو دەستانەم گرتوومەتەوە. ئەو ئەسپە تەلەسمبەند کراوە و بە هەموو کەس ناگیریّ. بەلّیّ ئەوە ئەو ئەسپەیە کە حەمەد لە عەلی سەفابەگی ئەستاندوە.

ـ ئەوە هەر ئەو ئەسپەیە کە ئێوە داوای دەکەن. ئەمن هەموو شوێنێکم بەدوا دا کرد، کێوەکان، دۆلّەکان، هەوراز و نشێوەکان، دارستانەکان، ڕژد و هەلّدێرەکان، پاناوك و تەپك و بەندەنەکان و بە کورتی هەموو شوێنێکم پشکنیوە تا لە سەر ڕەوەزی هەرە بەرز و تیژی چلچاوی، لە سەر لووتکەی چیای دولّدولّیم دیتۆتەوە. ئاخر کام ئەسپی دیکە بێجگە لەو ئەسپە سیحراوییەی دەتوانیّ بچێتە سەر بلّیندترین لووتکەی چیای دولّدولّی، کە ڕەوەزێکی بەردەستێی سپییە، وەك نووکی چەقۆی تیژە و پیاو بە زەحمەت بۆی دەکریّ هەردووك لاقی وێکڕا لە سەر دانیّ؟ یان

کێ بەرگەی ئەو بۆرانەی دەگرێ، کە لە وێ بە دایم دێ و بەردی لە عەردی هەڵدەقەنێ، بە ڕاستی پێمبڵێن کێ...

مورتەزاغا نەیدەتوانی حەیدەر یەکچاوی بێدەنگ کا و وەخت بوو لە حەیفان بتەقێ:

ـ ماڵت نەشێوێ حەیدەر، ئەوە کوا ئەسپەکەی عەلیسەفابەگییە؟! برام، ئەمن ئەسپی عەلیسەفابەگیم هەر لەو ڕۆژەوە کە لە عورفای ڕا هێناویانە دیتوە و ناسیومە. پێت وایە ئەمن نازانم ئەسپەکە چۆن بوو؟ هەستاوی کەلاکێکت لەولا ڕا هێناوە، وا دەزانی هەر وا لە خۆڕا هەزارو‌پێنسەد لیرەت دەدەمێ؟ نەخێر ئەوە ئەسپی حەمەدۆکی نیە!

ـ بەڵێ هەوە! کاتێك لە سەر دوندی چیای دولدولی چاوی بە من کەوت، وای حیلاند، تەواوی ئەو کێوانە ڕاژان! پاشان لە سەر ڕەوەزەکەی ڕا کە وەك نووکی چەقۆی تیژ بوو، بازی دا و هات بۆ لای من. ئەو چەشنە ئەسپە سیحراوییانە دەسبەجێ کەسی خۆیان دەناسنەوە و دەزانن خۆ بە دەست کێوە دەدەن! ئەتۆ کە دەڵێی ئەوە ئەسپی حەمەدۆکی نیە، مەبەستت ئەوەیە کە خەڵاتەکەم نەدەیەی!

ئەو دوو کەسە ماوەیەکی زۆر بە یەکەوە دمەچەقەیان بوو. یاوەر ڕقی هەستابوو، ئاخرییەکەی خۆی پێڕانەوەستا و لە حاڵێك دا هەوڵی دەدا بە سەر قینی خۆی دا زاڵ بێ، تێکەڵی باسەکەیان بوو و بە دەنگێکی بەرز گوتی:

ـ هەر لە دوور ڕا دیارە ئەوە نابێ ئەسپی حەمەدۆکی بێ، ئەو کەلاکە ڕووتە! خۆ ئێوە شێت نەبوون!

ـ یاوەری بەڕێزم، توخوا ئەتۆ بەو ئاغایانە بڵێ هەر کەمێکم گوێ بدەنێ. جا گەورە و سەروەرم، ئەگەر پێم نەسەلماندن کە قسەکەم ڕاستە، ئەوە بەڵێن بێ ئەسپەکەی بەرمەوە ئەو جێیەی لێمدۆزیوەتەو. ئەو کاتی ئەوانەی دەڵێن ئەوە ئەسپی حەمەدۆکی نیە، گرتنەوەکەی قوربانی چاویان بێ، با بزانین تەنانەت دەوێرن مەیدانە ئەسپێکیشی لێنێزیك بنەوە؟

گفتی ماقوولانە و پڕ لە ڕێزی حەیدەر یەکچاوی یاوەری هێور کردەوە:

ـ بەڵام ئاخر حەیدەر بەگ، ئەو ئەسپە هەر یەسك و پێستێکە و هەر بینا تۆپی!

ـ قوربان، یاوەری قارەمانم! داوام ئەوەیە، تکام ئەوەیە جەنابت کە ڕۆڵەیەکی کۆماری لاوی ئێمەی، کە کوڕێکی سەربەرزی ئەو نیشتمانەی و وەك گورگی بۆر بەسامی، گوێم بۆ ڕاگری! یاوەری خۆشەویست ئەو ئەسپە ڕەسەنە نەمرانە هەر ئاوا دێنە بەرچاو. لە هەمووان بە تەمەنتریان "بووکێفالۆس"ــە کە ئەسپی ئەسکەندەری گەورە بووە، هەر ئەو ئەسکەندەرەی

پێی‌دەڵێن "جووتشاخ"، چونکە کاتێك لە دایك بووە دوو شاخی درێژ و خواری هەبووە. با ئەوەش بلێم هەر بۆیەش دایکی کاتێك ئەوی هێنا سەر دنیایە، بەرگەی برینی ئەو شاخانەی نەگرت و پێ‌چوو. ئەسپەکەش بۆخۆی دووسەر بوو. دیارە ئەسکەندەر هەم بە "جووتشاخ" ناوبانگی هەبووە، هەم بە "ئەسکەندەری گەورە" ناوبراوە و هەم پێشی‌گوتراوە "ئەسکەندەری مەقدوونی"... بە هەرحاڵ ئەسکەندەری جووتشاخ یەکەم کەس بوو دنیای گرت و دوای ویش کەس ئەو کارەی پێ‌نەکراوە. ئەمن ماوەیەك لەو خەزێنانە دەگەڕام، کە ئەو گەورەپیاوە ئەو کاتەی چووە هیندووستانێ بگرێ، لە کۆنەقەڵای ئاناوارزای دا شاردوونی‌یەوە و لەو بەینەی دا ئەو شتانەش فێر بووم. ئەوەش بۆ یاوەری خۆم بگێڕمەوە کە ماینەکەی دایکی ئەسپە دووسەرەکەی ئەسکەندەریش لە کاتی زانێ دا، یانی ئەو کاتەی جوانووە دووسەرەکەی بوو، بەرگەی نەگرت، قەڵشی و تێ‌داچوو.

لێرە دا مورتەزاغا خۆی پێ‌ڕانەگیرا، لێی مۆڕ بۆوە و بە سەری دا قیژاند:

ـ بەسە ئیدی، بەسە! بە ئێمە چی کە ئەسکەندەر کاتێك لە دایك بوو، بە شاخانی چۆن لەشی دایکی بریندار کرد! بەسە یەکچاو چی‌دی بەوەی سەرمان مەیەشێنە!

یاوەر هاتە بەینیان:

ـ با حەیدەر بەگ قسەکانی بگێڕێتەوە، وا دیارە ئەو زۆر شت سەبارەت بەو ئەسپەی دەزانێ و ئێمەش دەتوانین کەلك لە زانیاریی وی وەرگرین.

حەیدەر بە تاقە چاوەکەی دە مورتەزای هەڵڕوانی و ئەویش پشتی تێ‌کرد و چیی نەگوت.

ـ بەڵێ ئەمن، دەبێ ئەمن، یاوەری زۆر بەڕێزم. ڕۆڵەی بە شەرەفی گەل! بۆت بگێڕمەوە: بەڵێ، ئەسکەندەری جووتشاخ ئەسپێکی هەبوو، کە قەزاوقەدەر وای کردبوو ئەو ئەسپە تایبەتیی وی بێ، ڕاست وەك ئەسپە بۆرەی کوێرۆغڵی، یان وەك دوڵدوڵی ئیمامی عەلی، یان وەك ئەسپ و وڵاغی سواری‌یەی دیکە کە ئەمرن و بۆ کەسایەتی‌یە دەگمەنەکان دیاری کراون! ئەسکەندەر هەر شازدە ساڵ دەبوو، کە بووکێفالۆس ڕۆژێکیان هاتە بەردەرکی قەسری پادشای بابی. بۆی چوون بی‌گرن، بەڵام کەس بۆی نەگیرا، بۆ هیچ‌کوێش نەدەڕۆیی و هەر دەهاتەوە بەردەرگای پادشای و ڕادەوەستا، هەتا ئەسکەندەر خۆی لیۆەدەرخست، ئیدی ئەسپەکە بۆخۆی چوو بۆ لای و دەستی بە لستنەوەی دەستی وی کرد! ئەسکەندەری جووتشاخ دەسبەجێ تێ‌گەیی کە ئەو ئەسپە لەو لای ڕا بە تایبەتی بۆ وی نێردراوە، هەروەك ئیمامی عەلی، کە دوڵدوڵی بۆ نێردراوە، ئەو عەلی‌یەی کە بە زەبرێکی شمشیرەکەی ڕەوەزێکی ئاناوارزای لەت کرد، جێگاکە بوو بە دۆڵێك، ئەو دۆڵە کە شوێنەواری ئەو

جیٚدەمەشیرەیە، ئێستاش هەرماوە و پێی دەڵێن "دۆڵی عەلی"... بەڵێ، کاتێك ئەسکەندەر دیتی ئەو ئەسپە دوو سەری هەیە، وەك خۆی کە دوو شاخی هەبوو، ناوی نا بووکێفالۆس، کە یانی دوو سەر! ئەسپەکە دوو جووت چاو، چوار گوێ، دوو زار و چوار کونەلووتی هەبوون... ئەسکەندەر سواری ئەسپەکەی بوو و شیرێکی بە دەستەوە گرت. شیرەکە وەك شیری حەزرەتی عەلی دەچوو. پاشان بەو شێوەیە چوو بۆ لای بابی. کاتێك پاشای بابی، ئەسکەندەری لە سەر ئەو ئەسپە دووسەرەی دی، لێی پرسی:" کوڕم، دەزانی ئەوئەسپە دووسەرە چ پەیامێك دەگەیەنێ؟" ئەسکەندەری لاو وەڵامی دایەوە، نا بابە گیان. بابی گوتی ڕۆڵە پەیامەکە ئەوەیە کە ئەو ئەسپە ئی تۆیە و هەتاهەتایەش هەر ئی تۆ دەبێ و هەروەها بەشێکی پەیامەکەش ئەوەیە کە تۆ تەواوی دنیایە، لەو جێگایەوە ڕۆژی لێ‌هەڵدێ، تا ئەو جێگایەی ڕۆژی لێ‌ئاوادەبێ، دەگری و ئەگەر دنیایەکی دیکەش هەبێ، ئەویش دەگری. هەر بۆیەش ئەو ئەسپە بۆ تۆ ناردراوە. ... کاتێك ئەسکەندەر ئەوەی گوێ لێ‌بوو، زۆر خوشحاڵ بوو! جا بە یاوەری خۆم بڵێم ئەمن ئەو ئەسپە دووسەرەم ئەو بەهارەی لە قەراغ باتلاغی ئاکچەسازی چاوپێکەوت، بەڵام بۆم نەگیرا. تووکی بۆر بوو و چاوی وەك ئەستێرەی دەدرەوشانەوە. بۆم گیرابا و بە مۆزەخانەی ئەڵمانی‌یەکانم فرۆشتبا، یەکجار دەوڵەمەند دەبووم! بۆخۆتان دەزانن ئەسپی ئەسکەندەری جووتشاخ چۆن بووە ئیدی! ناڵی لە یاقووتی بووە، یاڵی داوی زێڕ بووە، زینەکەی لە گەوهەر، مرواری، ئەڵماس و یاقیقی سەوز بووە ... حەیف! ئەمن لێی نێزیك بوومەوە، زۆر نێزیك، ئەوەی بۆتان دەگێڕمەوە یەك وشەشی درۆ نیە، ئەوەندەی لێ نێزیك بوومەوە، کە توانیم دەستم لە سەر پشتی بووکێفالۆسی بە نێوبانگ دانێم، بەڵام هەرکە دەستمی گەیشتێ، بوو بە پەڵەهەورێك، پەڵەهەورێکی چکۆڵە و بەرەو ئاسمان هەڵچوو! هەورەکە تەقی‌یەوە و ئەستێرە و ڕووناکی‌یەکی زۆری لێ‌بوونەوە و بە دەوروبەر دا بڵاو بوونەوە. هێندەی پێ‌نەچوو ئەستێرەیەکیان وەك یاقووتی سووری لێ‌هات، هەڵکشا و چووە بەرزایی ئاسمانێ. هەتا بەیانی بەو شەوەی هەم وڵات سوور هەڵگەڕابوو و هەم دەریای نێوەڕاستی پانوبەرینیش ڕەنگی یاقووتی گرتبوو... با لەوەی گەرێین، بەڵام ئەسپی حەمەدۆکیش لەو چەشنە ئەسپانەیە و بەڕاستیس پێتان وا نیە زۆر زیاتر لە هەزاروپێنسەد لیرەی دێنێ؟! ئەو ئەسپەی دیکە ــ کە بۆم گێڕانەوە ــ بەهاری ڕابردوو لە قەراغ ئاکچەسازی دیتم، سەرەتا زۆرم سەرنج نەدایە و پێموابوو ئەسپێکی ئاسایی‌یە و لە ئەسپی دیکە زیاتر نیە، بەڵام دواتر تەماشام کرد بابە ئەوە شتێکی دیکەیە. ئەوە دوو سەری هەیە. هەربۆیەش لێی چوومە پێشێ. ئەویش بۆرە بوو و کز و شەکەت، لە گەڵ ئەو ئەسپەی حەمەدۆکی کە لە دەرێ ڕاگیراوە، بە مووی فەرق نەبوو ... دوایەش وەك بۆم گێڕانەوە فڕی

و بۆی دەرچوو... جا چونکە لەوانەیە ئەوەش وەك بووکێفالۆسی ئەمشۆ هەڵفڕێ و لە دەستتان دەرچێ، با بە ڕاشکاوی پێتان بڵێم، بە باوەڕی من هەرچی زووتر وە بەر گوللانی دەن و بیکوژن! دەنا نەڵێن پێی‌نەگوتین، لە دەستتان دەچێ، ها! ئەوەش با بڵێم ئەمن ئەگەر سواری بووکێفالۆسی دووسەر بووبام، دیسان هەر دەفڕی و ئەو کاتی دەستم لە یالی توند دەکرد، دەچوومە نێو ئەستێران و ماوەیەکی زۆر بۆخۆم لەو ئاسمانەی دەخولامەوە. دیارە ئاخرەکەی ئەسپەکە ماندوو دەبوو و دەهاتەوە سەر عەرزی ... ئیمامی ئێمە، عەلی، شیرەکەی هەڵسووڕاند، ڕکێفی لە ئەسپەکەی توند کرد و بە یەك زەبر ڕەوەزەکەی ئاناوارزای لەتکرد!

ئەسکەندەری جووتشاخ سواری ئەسپی دووسەری خۆی، بووکێفالۆس، بوو، ڕۆیی و لەنێزیك ڕەوەزەکانی سەری تووڕووسی ڕاوەستا. ئەو چیایە و ئەو ڕەوەزانە کەسیان لێ‌وەسەر ناکەون. فەرماندەرەکان و سەربازەکان زۆریان هەوڵ دا شوێنێك یان کەلێنێك بدۆزنەوە و پێی دا بڕۆن، نەبوو. چەند ڕۆژان بیریان کردەوە و ڕاوێژیان کرد، بەڵام ڕێگایەکیان نەدیتەوە، کە بتوانن بەو لووتکە تیژانە دا کە لە بەردەستێی بنەوشین و تا ئاسمانێ هەڵچوون، وەسەرکەون. ناچار بوون چوونەوە لای جووتشاخی و گوتیان، ناکرێ، بە داخەوە هیچ ڕێگایەکمان بۆ نەدۆزرایەوە، با بگەڕێینەوە. ئەسکەندەر تووڕە بوو و گوتی ڕێگای گەڕانەوەمان نیە. پاشان لە سەر بووکێفالۆسی داهاتەوە، سەری بردە بن یەکێك لە گوێیەکانی ئەو ئەسپە دەگمەنەی و سرتەیەکی دەگەڵ کرد، هەر چوار چاوی ماچ کرد و شیرەکەی هەڵکێشا. شیرەکە حەوت جاران شەبەقی دا. پاشان خۆی خستە سەر ئاوزەنگی‌یان و بە پڕتاو ئەسپی بەرەو ڕەوەزەکان لینگ دا. ئەسپەکە وەك برووسکەی تێ‌کشا. لە سەری شاخی شمشیری ئەسکەندەری حەوت جار بریسکایەوە، ئەوجار گرمەیەکی قورس هات و شاخەکە دوولەت بوو. وەك باسم کرد لە سایەی ئەو ئەسپەیەوە ئەسکەندەر توانی ئەو چیا سەختەی لەت کا و ئەو دۆڵەی بە "دۆڵی گولەك"ی بە نێوبانگە، جێی زەبری شمشیری وییە. ئەسکەندەری جووتشاخ بە نووکی شمشیرەکەی خۆی، هەر ئەو کاتی، ئەو بەسەرهاتەی لە سەر بەردێکی ئەو دۆڵەی نووسی. ئەو بەردە نووسراوە هێشتاش لە شوێنێکی نێو دۆڵەکەی دا هەر وا ماوە. لە وی‌ڕۆژێوە هەموو ساڵێك، بەهاران، ئەو کاتەی سەری چیاکان بە گوڵ دەڕازێنەوە، بووکێفالۆس بە نێو دۆڵی گولەکی دا دێتەوە، لە بەرامبەر ئەو بەردەی ڕادەوەستی و دە نووسراوەکەیەوە ڕادەمێنێ. پاشان دەحیلێنێ و حیلاندنەکەی دۆڵ بە دۆڵ و ڕەوەز بە ڕەوەز لە هەموو تووڕووسی دەنگ دەداتەوە...

مورتەزاغا چی دی بە خۆی نەوەستا و وەدەنگ هات:

ـ ئەوانە هەموویان حیکایەتن، حیکایەتی سەیر سەیرن! خودا بە لەعنەتت کا حەیدەر یەکچاو بۆ ئەو هەموو ئەسپ و ماین و شاخ و بەیت و ئەفسانە سەیروسەمەرانەت!

حەیدەر وەك ئەوەی هەر گوێشی لە قسەی مورتەزاغای نەبووبێ، خۆی شلوێ نەکرد، تەنیا پێی لە سەر ئەوە داگرتەوە کە:

ـ ئەسکەندەری جووتشاخ پیاوێکی گەورە و بە ناوبانگ بووە.

کاتێك ئەسکەندەر چوکووراوا، هیندوستان، سەروو و خوارووی چینێ و میسری گرت، هاتە بابولێ. لەو بەینەی دا قەت لە ئەسپەکەی دانەبەزی، خواردن و خواردنەوەی لە سەر ئەسپی بوو و هەر لە سەر پشتی زینیش دەنوست. ئەو سەردەمە بابول لە هەموو شارەکانی دنیایە گەورەتر بوو. نەخۆشیی تاولەرز لەو شارەی دا حەشری دەکرد، وەك ئەدەنەی، شارێکی پڕ لە مار و هەزارپێ. ئێستاش وەك ئاناوارزای وایە، چونکە ئێوە نابێ پێتان وابێ کە ئەوکاتیش ئاناوارزا وەك ئێستا بووبێ. لە زەمانی ئەسکەندەری دا ئەوێش وەك بابولێ شارێکی گرینگ بووە و ئێستاش هەر بەردوودارەکەی ماوەتەوە. ئاخر هەرچی دەو دنیایەی دا هەیە، هەمووی لەنێو دەچێ، دنیاش بۆ خۆی بە کەس نامێنێ و دەزانین تەنانەت بە ئەسکەندەریش نەما. ئەدی دەزانن "سیسەرۆ"، قسەزان و زانای بە نێوبانگ لە دەوری ئەسکەندەری دا حاکمی ئاناوارزای بووە؟ دوکتۆری گەورە گەورەش لە ئاناوارزای لە دایك بوون، ئەو دوکتۆرانە دەرمانی دژی مردنێیان دۆزیەوە. ئەو دەرمانەیان لە ژەهری ماری ساز کردبوو. دیارە ئەوەش دەزانن ئاغاکانم کە هێندێك پێیانوایە ئەسکەندەر لە بابولێ بە تاولەرزی مردوە و هێندێکیش دەڵێن بە زگێشەی چووە، بەڵام ئەگەر لە حەیدەر یەکچاوی خۆتان بپرسن، ئەو دەڵێ دوویشك پێوەی دا و کوشتی. دەوری بابولێ، وەك دیاربەکرێ، دیوارێکی ڕەشی لێ کێشرابوو و دیوارەکە دووپشکی زۆر بوو. سەرلەشکرەکان دڵیان نەدەهات تەرمی ئەو گەورە پیاوەی بنێژن، دە چۆمی فوڕاتێی باوێن، یان بیسووتێنن، بەڵکوو هێنایان ڕاست لە ئەسپەکەیان بەست. ئەسپەکە تەرمی ئەو گەورەپیاوەی بردە چیای تووڕووسێ و لە وێ تەسلیم بە چلسوارەی غەیبیی کرد و بۆخۆشی لەو کاتەوە ئیدی هەر لەو نێوەی خولاوەتەوە، وەك ئەسپی کوێرۆغڵی، ئیمامی عەلی، حەزرەتی محەممەد و گەنج عوسمان و ...

ئەو جار حەیدەر گوتی:

ـ زۆرتان سوپاس دەکەم، بەرێزان، ئاغاکانم، بۆ ئەوەی گوێتان دامێ. شتێکی گرینگ کە دەبێ ئێوە سەرنجی بدەنێ، ئەوەیە کە ئەو ئەسپە پیرۆزانە هەموویان کزن، هەر یەسك و پێستن

و هیچی دی... ڕەنگ بێ هۆی ئەمەش ئەوە بێ کە ئەوان زۆر پیرن، یان هەر خودا وای دروست کردوون و دەبێ ئەوەندە کز و باریك بن، کە ئەگەر فووت لێکردن، وەحەوای کەون و بتوانن بفڕن. هەر ئەو ئەسپە، ئەو چەند ڕۆژەی دوایی هێندێك قەڵەو بووە، ئەگەر ئەو کاتی کە لە سەر چیای دوڵدوڵی دیتم، نەمزانیبا ناوا لاوازە، ئەگەر وەك ئەسپەکەی مورتەزاغای قەڵەو و بە کەیف با، میلیۆنێکیشتان دابامێ، هەر بۆی نەدەچووم بیگرم...

حەیدەر لێرە دا پشوویەکی تازە کردەوە و پێش ئەوەی دەست بە قسان بکاتەوە، تاوێك بێدەنگ بوو:

ـ خۆ بە چاکی هەموو شتێکم بۆ ڕوون کردنەوە، بەڕێزان! دەی جا ئێستا کاتی ئەوەیە کە خەڵاتی خۆم، واتە هەزار و پێنسەد لیرەکەم بدەنێ و بە دوای کاری خۆم دا بڕۆم. دیارە ئەگەر پێویست بکا، لە پێناوی ئەستاندنی مافی خۆم دا تا ئەنکەرەش بچم، دەچم و دەستی لێ هەڵناگرم.

مورتەزا بە سەری دا گوڕاند:

ـ ڕامەوەستە، بچۆ! ئەمنیش هەر لەوێ بە تاوانی کەڵەکبازی بە گرتنت دەدەم و هەتا ملان پێوە دەبێ!

مورتەزا و حەیدەر تاوێکی باش دەمەچەقە و کێشەیان بوو و ئەگەر خەلیل بەگی گەورە خۆی نەخستبایە نێویان، بێگومان کارەکە بە خۆشی کۆتایی نەدەهات. باش بوو دەو دەمەی دا سەیدیی مەیتەریش هاتە ژوورێ.

مورتەزاغا بە دەنگی بەرز و بە تووڕەیی‌یەوە گوتی:

ـ ئەرێ سەیدی، برا، ئەوە لە کوێی؟ ئەوە چەند سەعاتە چاوەڕوانی تۆین! لەو بەینەی دا ناچار بووین، سەری خۆمان بێشێنین و گوێ بۆ ئەو هەموو حیکایەتە سەیر و سەمەرانە ڕاگرین!

حەیدەر یەکچاو گوێی نەدا ئەو تەوسەی مورتەزای و لە جیاتی‌یان بە تاقە چاوەکەی دە سەیدیی مەیتەرەوە ڕامابوو و چاوەڕوان بوو بزانێ قسەی وی چی‌یە.

سەیدی دەستی بە پێکەنینێ کرد:

ـ ئەو ئەسپەمان لە گەڵ چەند ئەسپی دیکە بەرەڵاکردوە، چونکە زۆر پیر ببوو. دیارە ئەوە لە گەڵ ئەو ئەسپەی حەمەدۆك لە عەلی سەفا بەگی ئەستاندوە، جیاوازی‌یان زۆرە و هێچکوێ‌یان وەك یەك ناچێ.

حەیدەر یەکچاو ڕاست بۆوە، لە حەیفان سوور هەڵگەڕابوو. لە سەیدی چووە پێشێ و گوتی:

ــ درۆ دەکەی، مالّوێران! هەر لە بەر ئەو درۆیەشت خودا لێت خۆش نابیّ!

پاشان رووی دە خەڵکەکەی دیکە کرد و لە سەرەخۆ گوتی:

ــ بە ڕاستی باوەڕ بە قسەی ئەو مەیتەرە درۆزنەی دەکەن؟ باشە، ئەمن ئەو ئەسپە ڕەسەنەی حەمەدۆکی دەبەمەوە. یارەبی خودایە زۆر شوکور کە ئەوانە باوەڕیان بە من نەکرد و ئەسپی حەمەدۆکی‌یان گوللەباران نەکرد. وا بایە، گومانی تیّدا نیە کە ئاهی ئەو ئەسپەی دەی‌گرتم و بە ئاگری جەهەننەمیّ دەسووتام ... ئێستا لە کوێم هێنابوو، دەی‌بەمەوە ئەویّ، یانی دەی‌بەمەوە سەری چیای دولّدولّی!

لە ژوورەکەی ڕۆیشتە دەریّ، بەڵام گەڕایەوە، لە نێو شیپانەی دەرکەی ڕاوەستا و گوتی:

ــ ئەریّ بە ڕاست کەستان دەزانیّ کە ئەو شاخە بۆ ناوی چیای دولّدولّی‌یە؟

کەس وەڵامی نەدایەوە.

ــ چونکە دولّدولّی ئیمامی عەلی لەویّ دەژی. ئەو شەوانەی مانگی تەواو دەردەکەویّ، ئەو هێسترە لە سەر لوتکەی کێوەکەی ڕادەوەستیّ. تریفەی مانگەشەویّ لە سەر یالّی شەبەق دەداتەوە و دولّدولّ ئەوەندەی دەتوانیّ خۆی لە بەریەك دەکێشێتەوە... ئەسپی حەمەدۆکیش دەبەمەوە ئەویّ و لە لای دولّدولّی بەڕەڵای دەکەم. لە نێزیك ئاخر زەمانیّ دا ئەو دووانە بە گژ ستەم، کاری خراپ و دەسەڵاتداری سەرەڕۆ دا دەچن! بە ڕاستی خودا ڕەحمی کرد ئەسپەکەتان نەویست و نەتان‌کوشت. واتان کردبا، ئەمن چۆن لەو تاوانە گەورەیەی ڕزگار دەبووم. وا دیارە ئەمن دە شەوێکی پیرۆز دا لە دایك بووم، کە ئەو گوناهەم لیّدوور کەوتەوە. جا ئەو جار بۆخۆتان بچن و ئەو ئەسپە کوێتەی بگرنەوە... بەلّیّ، خودا ڕەحمی پیّ‌کردم.

حەیدەر بە پێکەنین و ڕوویەکی گەشەوە لە پلیکانەکان هاتەخوار و چوو بۆ لای ئەسپەکەی، سەری بەرز کردەوە و دەستێکی بە یالّی دا هێنا. پاشان جلّەوەکەی گرت، خەڵکیش دڕیان دا، ڕێگایان بۆ کردەوە، ئەویش بیّ ئەوەی پەلەی بکا ئەسپی بە دوای خۆی دا کێشا و بە بزەیەك لە سەر لێوانەوە شوێنەکەی بەجیّ‌هێشت.

دوای ئەوەی ئەو ڕۆیی، خەڵك دەستیان کرد بە قسان:

ــ خودا دەزانیّ ئەوە ڕاست ئەسپەکەی حەمەدۆکی بوو!

ــ ئەو ئەسپانەی ڕەسەنن، سالّیّ سیّ چوار مانگان ئاوا کز و کەلەلا دەبن.

ــ چاك بوو ئەوانە نەیانناسی‌یەوە.

ــ بە ڕاستی باش بوو کە ئەسپی حەمەدۆکی لە دەست ئەوانە ڕزگار بوو.

# (٨)

مەلا فەرهاد دە بیرانەوە ڕۆچووبوو. هەستا چوو دەسنوێژی هەڵگرت و نوێژی کرد. هاوڕێکانی لە نێو گابەردە سووربلوەکانی پەناگەکەیان دا بە هێمنی چاوەڕوانی بوون. سەری کاتی نوێژان، مەلا فەرهاد نوێژەکەی دەکرد و دوعای دەخوێند، دەنا قسەی نەدەکرد، تەنیا دادەنیشت، ڕوخساری گرژ دەبوو، گنجی دەهاتنە سەر نێوچاوانی و بیری دەکردەوە. وەختی جەمێ بیری لەوە نەدەکردەوە چی لە پێش دادەنێن، هەر خواردنێك بوایە، چەند پاروویەکی لێ دەخوارد و ئەو جار هەڵدەستا، لە سەر چیمەنێ دەستی دەکرد بە ڕاوێچکان و هەتا کاتی نوێژی دواتر بەو شێوەیە هەر لە هاتوچۆ و بیرکردنەوە دا بوو.

سێ ڕۆژ بوو ئەوان دەو بارو دۆخەی دا بوون.

بەرەبەری ڕۆژاوابوونێ، مەلافەرهاد دوای ئەوەی ماوەیەکی باش دانیشت، دەستی بە ڕیشی داهێنا و بیری کردەوە، هاتەوە سەرحاڵ و بە ڕوومایەکی کراوەوە قاسمی بانگ کردە لای خۆی:

ــ قاسم خۆتان ساز کەن! نانی بخۆن و هێندێك بحەسێنەوە! کارێکی قورسمان لە پێشە.

ئاگریان کردەوە. بۆ جەمی پێشوو مەڕێکیان کوشتبۆوە، بەشێکی باش لە گۆشتی مەڕەکەی مابوو، گۆشتەکەیان برژاند و بە نانی گەنم خواردیان. کاتێك لە نانخواردنێ بوونەوە، هەرکەس باڵتۆی خۆی دەبەر کرد، کڵاوی خۆی لە سەرنا، تفەنگی خۆی بە دەستەوە گرت و هەموویان بە ڕیز لە پێش مەلا فەرهادی دانیشتن.

مەلا فەرهاد دەستی بە قسان کرد:

ــ ڕۆڵەکانم، لەوەتا ئەو چیایە هەیە، هەمیشە یاغیی لێ‌نەبوون. یاغیگەریەتی کارێکی هاسان نیە. ئێستا ئێمە یاغیین و دە خۆمان ڕادەبینین بەربەرەکانی بکەین. ئەگەر ئێمە لە

کاری خۆمان دا سەرکەوتوو بین، ئەوە ناوبانگی حەمەدۆکی زۆر لە ئێستاش زیاتر دەبێ و دوورتریش دەڕوا! لە بیرتان بێ وا هەیە ئێمە هەموومان لەو ڕێگایەی دا تێدابچین ... ئەمشۆ بە سەر ماڵە سوڵتانۆغڵی‌یە زەردی دا دەدەین. ماڵەکەی وی بە ڕاستی وەك قەڵایەکی سەخت وایە. شەو و ڕۆژ دەستەیەك تفەنگچیی ئەنگێوە و بە ئەزمون پارێزگاریی لێدەکەن. ئێستا ئێمە دەچینە سەر شوێنێکی ناوا ناستەم و پڕ مەترسی و وەك گوتم دوور نیە تووشی شەڕێکی وا بین، کە سەری هەموومان تێدا ببا. جا گوێم لێبگرن پێتان بڵێم، ئەوانەی لە مردن دەترسێن، با هەر ئێستا لێمان هەڵبڕێن. ڕەنگە کەسی وا هەبێ، شەرمێ لە هاوڕێیانی بکا، بە ئاشکرا و بە ڕۆژی ڕووناك پێی عەیب بێ بڵێ ناوێرم، کاری من نیە. ئەوە ئێمە سەرەتا بە نێو دارستانێکی چڕ و پڕ دا تێدەپەڕین و زۆریشی پێناچێ تاریك دادێ. ئەوانەی دە خۆ ڕانابینن بێن و پێیانخۆشە بەجێمان بێڵن، بە بێدەنگی خۆ ون کەن و لێمان جیابنەوە.

وەڕێکەوتن. مەلا فەرهاد بۆ خۆی وەپێش کەوت. وا دەڕۆیی دەتگوت لاقەکانی بوونە باڵ و بە حەوای دا دەفڕێ. هێندە خێرا، کە هاوڕێیانی بە زەحمەت دەیانتوانی بیگەنێ. هەر لەو کاتەش دا کە هەنگاوەکانی بە پەلە دەگوێزتنەوە، لە بیر و خەیاڵ دا نوقم بوو. ئاخر ئەوە یەکەم جار بوو گەڵاڵەی چالاکی‌یەکی ئاوا بێباکانەی دادەڕشت و بەڕێوەی دەبرد. ماڵی سوڵتانۆغڵی لە نێوەڕاستی باغێکی گەورە دا، لە قەراغ شاری بوو. شارەکەش لە شوێنێکی شاخاوی هەڵکەوتبوو. حەسارێکی گەورە، کە دیوارەکانی لە بەردی تاشراو دروست کرابوون بە دەوری ماڵەکەی دا کێشرابوو. ماڵەکە خانوێکی دووقات بوو، چل ژووری هەبوو، ژوورەکانیش ئەوەندە گەورە بوون، دەکرا بە سواری ڕمبازی‌یان تێدا بکەی و پەنجەرەکانیان ئەوەندە زۆر بوون، نەدەژمێردران. دەگوترا کە سوڵتانۆغڵی ئەو موڵکەی لە باپیری‌یەوە بە میرات بۆ بەجێماوە.

دوای ماوەیەکی زۆر ڕێپێوان، گەیشتنە شوێنێکی کە لەوێ دارستان هێندە پڕ نەبوو و ڕێچکەکە هێندێك بەرینتر دەبۆوە. پاشانیش دوای ئەوەی بە سەر زۆر دۆڵ، چۆم و جۆگان دا تێپەڕین و لە سەربەرەژێرێکی بەرداوی چوونە خوار، گەیشتنە مێرگێکی. مرۆڤ هەستی بە بۆنی سووتاوی دەکرد.

مەلا فەرهاد لە وێ ڕاوەستا، ئاوڕی دایەوە و هاوڕێکانی بە سەر کردەوە. کەس نەگەڕابۆوە. هەموو لە گەڵ بوون:

ــ ئەوە بەو مانایەیە کە هەموومان بە یەکەوە بەرەو مردن دەچین و یەکتر بە جێ ناهێڵین. ئێستا زۆر باشم گوێ بدەنێ: قاسم و شاهێن لە گەڵ من دێن، ئەتۆش تەیموور لە گەڵ کوڕەکانی

دیکە لە خەندەکی دەوری ماڵەکەی دا مەتەریز دەگری. ئەگەر ئێمە لە ژووریٚ تووشی تەقە و لێکدانیٚ بووین، ئەوە بزانن هیچ کەسی ئەو ماڵەی بە زیندوویی وەدەرناکەویٚ. ئێوەش دەبیٚ هیچیان نەهێڵن، تەنانەت سەگ، پشیلە، قاز، قەل، مریشك و ئەو پەڕەسیلکانەش کە لە بن میچی هەیوانیٚ هێلانەیان کردوە، هەمووان بکوژن. یەك کەسیان دەرباز بیٚ، هەمووتان تیٚدا دەچن.

تەیموور گوتی:

ــ تیٚگەیشتم!

ئەو سیٚیە بە ئەسپایی وەسەر دیواری حەسارەکەی کەوتن، بازیان دا ئەو دیو و خۆیان گەیاندە بەر دەرگای دیوەخانەکەی.

مەلا فەرهاد هەرای کرد:

ــ کێشکچی بیکەوە! ئێمە دەستەی حەمەدۆکین و ئەمن ناوم مەلا فەرهادە.

ــ هێندێك ڕاوەستن، دەبیٚ بەگی ئاگادار بکەم.

زۆری پیٚ نەچوو پیاوەکە گەڕایەوە و دەرگای کردەوە:

ــ فەرموون، وەرنە ژووریٚ.

پیاوەکە دەرگای پێوەدایەوە و وەپێشیان کەوت بۆ دیوەخانیٚ.

ــ بەگم ئەوانەن دەیانەویست بێنە لات!

بەگ لە بەریان هەستا:

ــ بەخێر بێن! کامەتان حەمەدۆکە؟

مەلا فەرهاد قامکی بۆ لای قاسمی ڕاداشت. سولتانۆغڵی بە هەردووك دەستان دەستی قاسمی دە دەستی گرت:

ــ لە مێژ بوو بە ئاواتەوە بووم بتبینم حەمەدۆك!

پاشان دەستی مەلا فەرهادی گرت و لە سەرەوەی ژوورەکەی دایەنان. ژوورەکە سیٚ چرای گەورەی تیٚدا داییسان.

سولتانۆغڵییە زەردە پیاوێکی کەڵەگەتی باریکەڵە، چاوڕەش، کەپۆ هەڵۆیی و سمێڵگەورە بوو. پاشەڕۆژبینی و خەم، بە ڕوخسارە کزەڵەکەیەوە دیار بوو. کۆت و شاڵوارێکی خەتخەتی شینی کاڵی دەبەردابوو، خەتەکان تۆختر بوون، دەوری گیرفانەکانی بە دەزووی زەرد چنرابوو و ملی کۆتەکەی بە قەد بەری دەستی نەخشی لە سەر چنرابوو. سەعاتەکەی بە پازدە زنجیری زێری ورد بە سینگییەوە هەڵاوەسرابوو و لزگە زنجیرەکە تا سەر زگی شۆڕ ببۆوە.

ـ زۆر بەخێر بێن، نانتان خواردوە؟

ـ خودا بە زیادی کا، برسیمان نیە، نانمان خواردوە.

ـ کە وابوو با قاوەتان بۆ بێنن، بە شەکرەوەی دەخۆنەوە، یان بێشەکر؟

ـ ئێمە لەو ماڵەی کە تاڵانی دەکەین، قاوەی ناخۆینەوە، باش نیە، وا نیە سوڵتانۆغلی؟!

سوڵتانۆغلی پێکەنی و گوتی:

ـ بەڵێ وایە، بەڵام هەر کەس بێتە نێو ئەو ماڵەی، بە بێ خواردن، یان خواردنەوە، جا با هەر فینجانە قاوەیەکیش بێ، ناڕواتە دەر.

پاشان ڕووی دە نۆکەرێکی مێرمنداڵ کە لەوێ بوو کرد گوتی:

ـ ها کوڕە قاوەی بۆ ئەو برادەرانە بێنە!

مەلا فەرهاد و هاوڕێکانی هەر سێکیان گوتیان:

ـ سوپاس، بەڵام شەکری تێمەکە!

سوڵتانۆغلی گوتی:

ـ خێرا کەن، میوانەکان بە پەلەن!

لەو ژوورەی دا پێش هەموو شتێك سۆبەیەکی گەورەی بەردین، کە لە سەختە بەردێکی بریقەداری جوان بوو و بە دیوارییەوە دروست کرابوو، سەرنجی مرۆڤی بۆ لای خۆی ڕادەکێشا. پاشان دیوارەکانی ژوورەوەی خانووەکەی هەموویان لە دارگوێزی بوون. دەرگای دەربیجە و ڕەفحان و تەنانەت بەری میچی خانووەکەش بە پەیکەرە و نەخش و نیگاری زۆر جوان ڕازابوونەوە و دیار بوو بەرهەمی کاری وەستایەکی کارامە بوون. دیوارەکان کۆمەڵێك تابلۆی زێڕینیان پێوە بوون، کە نامە و دەستخەتی چەند میر و پاشایانیان لە ڕەنگی سوور و شین دا تێدا پارێزرابوو. لە سەرەوەی سۆبەکەی ڕەگەزنامەیەکی گەورە کە لە شێوەی داری و هەر لە دارێکی یەکپارچەش دروست کرابوو، هەڵواسرابوو. لك و گەڵای دارەکەی زێڕکفت کرابوون و لە سەر هەر گەڵایەی ناوی کەسێك لە بنەچەکەی سوڵتانۆغلی بەگی بە ئاوی زێڕی نووسرابوو.

سوڵتانۆغلی بێدەنگ دانیشتبوو. مەلا فەرهاد چاوی بە بست بە بستی دار و دیواری دیوەخانەکەی دا دەگێڕا و بیری دەکردەوە.

ـ بیر لە چی دەکەیەوە مامۆستا؟

ـ ژوورێکی یەکجار جوانە! ئەمن نەمدەزانی ئەم ژوورە هێندە ڕازاوەیە و ئەو هەمووە شتە عەنتیکانەی تێدایە.

ــ ئەوە لە کۆنەوە شوێنی دولکادیرلی‌یان بووە. تایفەی دولکادیرلی لە چوارسەد ساڵ لەمەو پێشەوە بە سەر وڵاتێکی دا کە لە ماراشێوە بۆ ئەدەنەی، لە ئەدەنەیەوە بۆ قەیسەری و نیدەی و هەتا نێو ئاناتۆلیی دەگرتەوە، دەسەڵاتدار بوون. دایکی محەممەد مولکئەستێنی کچی شازادەیەکی دولکادیرلی بووە، هەربۆیەش عوسمانی‌یەکان برازای ئێمەن و ئەوەش لە گۆرانیی گۆرانیبێژەکانی چیای تووروسی دا دەنگی داوەتەوە...

سوڵتانۆغلی‌یە زەردە بۆخۆی دەی‌گوت لەو تایفە بە ناوبانگەیە، بەڵام ئەوانەی باشیان دەناسی، دەیان‌گوت کوردە، لە گەڵ ئەوەش کە دولکادیرلی‌یەکان تورکمان بوون. ڕاستی‌یەکەی ئەوەیە کە تایفەی سوڵتانۆغلی دەیانتوانی خۆیان لە گەڵ دولکادیرلی‌یەکان بەراوەرد بکەن. مۆڵکی وان لە ئوزوونئایلای پان و بەرینەوە دەستی پێ دەکرد، بە لەوەڕگە گەورەکەیەوە، تا دارستانە چڕەکانی چیای هەزارگای. لە نێو وان ئەسپی هەرە ڕەسەن پەروەردە دەکران و مێگەلی گەورە گەورەیان مەڕ، گا و جوانەگا هەبوون. ناوبانگی ئەسپەکان و مەڕە سوورەکانیان تا دەشتی عەرەبستانیش ڕۆیبوو و تەنانەت لە فەرەنگستان، واتە ئورووپاش دەنگی دابۆوە.

مەلا فەرهاد گوتی:

ــ بەڵێ، تایفەی دولکادیرلی کۆنن، لە عوسمانی‌یەکانیش کۆنترن و دنیاش پاشای باشتر لە پاشاکانی ئەو تایفەیەی بە خۆیەوە نەدیوە.

ــ وا دیارە بە چاکی مێژووی ئێمە دەناسی مەلا فەرهاد!

ــ بەگم، هێندێك کتێبم لەو بارەیەوە خوێندوونەوە.

سوڵتانۆغلی بزەیەکی شادی هاتێ.

مەلا فەرهاد و هاوڕێکانی بە پارێز و ڕێزەوە قاوەکانیان خواردنەوە و فینجانەکانیان لە سەر کەشەفەکەی دانانەوە. پاشان بەگ هەستا سەر پێ:

ــ پێم‌بڵێ مەلا فەرهاد ئەمن چ بکەم، چت لێم دەوێ؟

ــ ئەمن داوام لێت هەیە، زۆرت لێ‌ناکەم، زۆرتر داوایە!

ــ بڵێ مامۆستا، چەند؟

ــ هەزار لیرەی زێڕ، بەگ!

ــ زۆر باشە مەلا فەرهاد.

بەگ بانگی نۆکەرە مێرمنداڵەکەی کرد:

ـ برِۆ سندووقەکەم لە لای خانمێ بۆ بێنە...

کورەکە رۆیی و زۆری پێنەچوو بە سندووقەوە گەرِایەوە. سندووقەکە دار بوو، بەلاّم هەموو دەرەوەی بە نەخش و نیگاری جوان رازابۆوە و زێر و گەوهەری دە گۆشە و تەنیشتانی گیرابوون. سولتانۆغلێ دەستەکلیلێکی لە گیرفانی دەرێنا، بە کلیلێکیان سندووقەکەی کردەوە، کیسەیەکی مەخمەری دەرێنا و رِووی دە مەلا فەرهادی کرد:

ـ فەرموو، ئەو کیسەیە راست هەزار لیرەی تێدایە.

مەلا فەرهاد کیسەکەی کردەوە، لە پێش خۆی هەڵیرِشت و دەستی کرد بە ژماردنێ:

ـ یەك، دوو، سێ... شەش، حەوت، هەشت...

بە زەحمەت دەنگی دەبیسرا.

سولتانۆغلێ لاقی هاویشتبوە سەر لاقی، سەری داخستبوو و لە حالێك دا بزەیەکی لە سەر لێوان بوو، چاوی لە دەستی مەلا فەرهادی دەکرد. مەلا فەرهاد هەر جارەی مستێکی پرِی بە دەستی چەپی لە پوولەکەی هەڵدەگرت، دە دەستی راستە دا دەیژمارد و پاشان دە کیسەکەی دەکردنەوە.

کاتێك هەموو لیرەکانی ژمارد، کیسەکەی گرێدایەوە، هەستا و تفەنگەکەی بە دەستەوە گرت.

ـ سوپاست دەکەم سولتانۆغلێ. ئەتۆ مرۆڤێکی بەرِێزی. بریا زانیبام... بەلاّم رێگایەکی دیکەمان نەبوو، دەبوو هەر ئەوەی بکەین.

ـ بێگومان دەزانی دەستەی حەمەدۆکی نەبێ، کە ئەوە بۆ جاری یەکەم هاتۆتە سەر ئەم مالّەی، دەنا کەس نەیوێراوە شتی وا بکا. لەوێ رۆژێوە کە ئەم مالّەی من بۆ جاری یەکەم ئاگری تێدا کراوەتەوە، تا ئێستا، تەنیا ئێوە بوون کە ئەو ئازایەتی‌یەتان نواندوە!

مەلا فەرهاد گوتی:

ـ بەڵێ وایە!

قاسم کە خۆی کردبووە حەمەدۆك، هەستی کرد ناچارە شتێك بلّی:

ـ جەنابی بەگ بمانبوورە، ئەتۆ مرۆڤێکی بە راستی بەرِێزی.

بەگ رِووی بۆ لای قاسمی وەرگێرِا و گوتی:

ـ دادەی راوەستە بزانم، وێناچێ ئەو پیاوە حەمەدۆك بێ ...

ئەو جار گوتی:

ـ ئەتۆ یۆرِووکی، دیارە، وەك یۆرِووکی‌یان قسە دەکەی...

ئەو جار ڕای‌کرد باسکی مەلا فەرهادی گرت و گوتی:

ـ قسەی تی‌دانیە ئەتۆ مەلا فەرهادی، بەڵام ئەو کوڕە حەمەدۆك نیە. ئەگەر درۆتان لە گەڵ کردبم و ئەوە حەمەدۆك نەبێ، نایەڵم کەستان بە ساغی لێرە وەدەرکەوێ.

قاسم بی‌ئەوەی شلوێ بێ، بزەیەکی هاتێ و لە سەرەخۆ گوتی:

ـ بەڵێ ئەمن حەمەدۆکم، بەشێکی زۆری ئێمە زۆر درەنگ نیشتەجێ بووین و لە سەرەتاوە هەمووومان هەر یۆڕووك بووین. کە وابوو شتێکی ئاسایی‌یە کە ئێستاش هێندێك دیالێکتی یۆڕووکیمان بە زمانی‌یەوە دیار بێ.

لەسەرەخۆیی، بڕوا بەخۆبوون، شێوەی قسەکردن و بزەی سەرلێوی قاسمی، گومانی بەگیان ڕەواند:

ـ ئا... وا، گوتم ئەتۆ دەبێ حەمەدۆك بی، چونکە چۆنی بۆیان باس کردبووم، هەر وام هاتی‌یە پێش چاوی.

بەگ قۆڵی دە قۆڵی قاسمی کرد و لە گەڵی لە پلیکانان چووە خوارێ. مەلا فەرهاد و شاهێنیش لە دواوە دەهاتن. بەگ هەتا دەرگای دەرێیان لە گەڵ چوو. کێشکچی دەرگای کردەوە و ئەو جار سوڵتانۆغڵی ماڵاوایی لی‌کردن. دوای ئەوەی چەند شەقاو دوور کەوتنەوە، بەگ بە دەنگی بەرز گوتی:

ـ حەمەدۆك! حەمەدۆك!

قاسم بە پەلە بۆ لای دەرگاکەی گەڕایەوە. نیگەران بوو کە نەکا هەر ئێستا گرمە هەستێ:

ـ بەڵێ، بەگ ...

ـ خۆ جووتێرەکان ئەسپەکەتیان پی‌ناگیرێ، تا تەسلیمی دەوڵەتێی کەن! وا نیە؟

ـ قەتیان پی‌ناگیرێ!

ـ دەزانی، هەزار و پێنسەد لیرەیان خەڵات بۆ دیاری کردوە، پووڵێکی زۆرە...

ـ ئەوە گرینگ نیە، کەس تەسلیمی ناکاتەوە.

ـ با بزانین جووتێرەکانمان ئەو پیاوەن بۆیان بگیرێ.

ئاسمان پڕ لە ئەستێرە بوو و ئەستێرەکان دەزریوانەوە. مەلا فەرهاد لە پێشەوە و ئەوانی دیش بە دوای دا، بە پەلە بە نێو دارستان و کانی و خڕ و دۆڵان دا گەڕانەوە و هێشتا ڕۆژ هەڵنەهاتبوو، کە خۆیان گەیاندەوە بناری شاخە سەختەکان.

لە وێ مەلا فەرهاد ڕاوەستا و بە هاوڕێیانی گوت:

ـ لێرە ڕاوەستن کوڕینە!

کانی‌یەك لە نێوەڕاستی گابەردە شینەکان بوو. لە دەوری کانی‌یەکەی کۆ بوونەوە. مەلا فەرهاد بینی بە کانی‌یەکەیەوە نا و تێری لیٚ خواردەوە. پاشان ڕدێنی سڕی‌یەوە، قۆڵی هەڵکرد، کەوش و گۆرەوی‌یەکانی داکەند، کلاوەکەی لە سەری کردەوە، دەستنوێژی هەڵگرت و چوو هێندێك واوەتر نوێژی دابەست. نوێژکردن و دوعا خوێندنەکەی هەتا تاوهەڵاتێی کێشا. پاشان هەستا، کڵاوەکەی لە سەر نایەوە و تفەنگەکەی دە شانی کردەوە، دەستی بۆ لای لوتکەی چیاکە ڕاداشت و گوتی:

ـ دەبیٚ بۆ نیوەڕۆیە بگەینە ئەو ڕەوەزە سەختانەی سەری شاخی!

ئەو جیٚیەی مەلا فەرهاد ئیشارەی بۆ دەکرد، شوێنێکی یەکجار سەخت و ڕژد بوو، پیاو بە زەحمەت دەی‌توانی وێی‌هەڵگەڕیٚ. ئەوانی دیکە بیٚ‌ئەوەی تەنانەت یەك وشەشیان لە زاری بێتە دەر، وە دوای کەوتن. بە شوێنی وا هەڵدەگەڕان، کە وەك دەمی چەقۆی تیژ بوو و هێندەی پیٚ‌نەچوو کە زۆریان دەست و ئەژنۆیان بریندار بوون و لاق و لەتەریان دارووشان.

هێندێکی مابوو بۆ نیوەڕۆیە گەیشتنە ئەویٚ. ڕەوەزەکان دەت‌گوت دیوارن و لە نێوەڕاستی ئەو دیوارەی دا مێرگۆڵەیەکی لیٚبوو. کانی‌یەکیش لە نێوەڕاستی مێرگۆڵەکەی هەڵدەقوڵی. پلووسکێکی بچووك، لە دارسنەوبەری، دە کانی‌یەکەی گیرابوو.

مەلا فەرهاد دەستی بەرەو ئاسمان هەڵێنا و بە دەنگی بەرز گوتی:

ـ ماشەڵڵا لە گەورەیی تۆ خوایە! باشە بڵێی کیٚ بەو شاخە ڕژدەی هەڵچووبیٚ، گەیشتبێتە ئێرە و ئەو پلووسکەی دەو کانی‌یەی گرتبیٚ؟

پاشان لە تەنیشت کانی‌یەکەی چوارمێردەکی دانیشت و ئەوانی دیش هەموو بە دەوری‌یەوە دانیشتن. مەلا فەرهاد دەستی بە قسان کرد:

ـ زۆر باشم گویٚ لیٚ بگرن کوڕینە، بۆخۆتان دەزانن ئەو کەسەی دوێنیٚ‌شەویٚ بە سەرمان دادا، سوڵتانۆغڵی‌یە زەردە بوو. ئەو لە ماڵە خۆی وەك میوان بە پیرمانەوە هات و ڕیزێکی زۆری لیٚ‌ناین. دەبیٚ شاهێن و قاسم بە ڕێوە بۆیان گێڕابنەوە کە هەڵسوکەوتی چۆن بوو. بەڵام بە هەڵە نەچن، سوڵتانۆغڵی کەسێك نیە بێڵیٚ ئەو پووڵەی لێمانئەستاندوە، بە ئاسوودەیی بی‌خۆین. قسەی تیٚدا نیە هەر ئێستا سەد پیاوی چەکداری ویمان بە دووەوەن و دەبیٚ ئێمە لە خۆمان خافڵ نەبین. لەمڕۆوە دەبیٚ خۆمان بە نیوەمردوو، یان هێندێکیش واوەتر بزانین. ڕەنگە ئەو پرسیارەتان بۆ بێتە پێش کە ئەگەر وایە بۆچی ئێمە ڕاست بە سەر ئەو پیاوەمان دادا؟ هەر بۆ ئەوەی کە تیٚدا بچین؟! نا کوڕینە! دەبیٚ بیر بکەنەوە کە ئەگەر ئێمە بە سەر کەسێکی ئاوا گەورە و ناوبەدەرەوەمان دا نەدابا، نەماندەتوانی ماوەیەکی زۆر لەو شاخانە خۆ ڕاگرین. ئێستا

دڵنیا بن، کە دوای ئەو کارە گرینگەی کردمان، هەر دوژمنێك، هەرچەند زۆردار و بە دەسەڵاتیش بێ، هەڕەشەمان لیێکا و بیەوێ قەڵاچۆمان کا، چیاکان پشتی ئێمە بەرنادەن.

تەیموور گوتی:

ـ ئەوەی ئەتۆ پێت باش بوو، ئێمە کردوومانە و ئەوەش بەو مانایەیە کە ئێمە کارێکی زۆر باشمان کردوە.

ـ هەر بژی تەیموور گیان، بەڵام ئێستا دەبێ نانی نیوەڕۆیە بخۆین و دوایەش هێندێك بخەوین، جا ئیدی نازانم چەندەمان مەودا دەبێ بە ئاسوودەیی بخەوین.

حاجی، کە لە بەر کورتەباڵایی‌یە پێیان دەگوت"حاجی‌یە بستە"، بەرپرسی تێشووی بوو. ئەو کوڕە هەمیشە هەر دەمانچەیەکی پیێبوو. حاجی کورتەباڵابوو، بەڵام پیاوێکی چوارشانە و بەقەوەت بوو و کەم کەس بە ملانە دەرەقەتی دەهات.

ـ حاجی گیان، بۆ ئەو جەمەی چمان دەدەیەی بی‌خۆین؟

حاجی کۆڵەپشتی‌یەکەی، کە لە بن دارێکی دای‌نابوو، هێنا:

ـ کاکە، کولێرە و هەنگوین و زۆر شتی دیش، وەك لە زووەوە گوتوویانە شیری مریشکیشتان دەدەمێ.

کوڵەپشتی‌یەکەی کردەوە. کۆمەڵێك کولێرەناسکەی گەنمی دەرهێنا و لە سەر چیمەنەکەی دانان. پاشان پەنیر و هەنگوێن و هێندێك پێخۆری دیکەشی دەرهێنا و دای‌نا. هەموو دەستیان کرد بە خواردنێ، کولێرە و هەنگوینەکە تامێکی تایبەتیی هەبوو.

مەلا فەرهاد گوتی:

ـ دەستت خۆش بێ حاجی، کولێرە و هەنگوین و پێخۆری دیکەشت داینێ. بە ڕاستی سفرەکە هەر شیری مریشکێی لە سەر نەبوو!

حاجی بە بزەیەکەوە گوتی:

ـ بۆ جارێکی دیکە ئەویش پەیدا دەکەم، خەمتان نەبێ!

حاجی پاشماوەی نانوپێخۆرەکەی کۆ کردەوە و دە نێو کۆڵەپشتی‌یەکەی نایەوە.

مەلا فەرهاد گوتی:

ـ ڕۆڵەکانم، وشیار بن! لە پەنا یەك مەنوون و وا درێژ مەبن کە دیار بن. لە قولینچك و پەنایان درێژ بن، جۆرێك کە گوللە نەتان‌گرێتەوە. با تەیموور هەوەڵ کێشك بێ.

هەموو خەویان لیێکەوت، بەڵام زۆر نەنوستن، تەقەیەکی غالّب دەستی پیێکرد و وەخەبەر هاتن. تەیموور لە دوورەوە دیتبوی کۆمەڵێك چەکدار خەریکن بۆیان وەسەر دەکەون، بە یەکەم

فیشەك یەکی لێ‌بەردابوونەوە. ئەو جار ئیدی تەقە لە هەموو لایەکی ڕا دەهات. بە ڕوونی دیار بوو هێرشکەرەکان زۆر بوون و تفەنگچیی چاکیش بوون.

لەو بەینەی دا یەکێك لە لای هێرشکەرەکانەوە گوڕاندی:

ـ ئێمە سەدکەس زیاترین، کە دەوری ئێوەمان داوە، حەمەدۆك! ئەوە ئیدی عەبدی‌خانی بەستەزمانی شوانەوێڵە نیە، پێتەنەوەستێ، ئەوجار سولتانۆغلی‌یە، کە ناو و ناوبانگی لە تابلۆیان دا نووسراوە، بە دیوارانەوە دراوە و لە هەموو شوێنێکی ئەو وڵاتەی دەنگی داوەتەوە! هەرچی زووتر خۆتان بە دەستەوە بدەن، دەنا هەمووتان دەنێرینە جەهەننەمێ!

مەلا فەرهاد بە دەنگێکی بەرز و نێرانە وەڵامی کابرای دایەوە:

ـ بە سەری تۆ جارێ زووە. هیچ‌کەسمان وەڕەزیی مردنێی نەکردوە و ئەتۆش ئەو پیاوە نی ئێمەت پێ‌بکوژرێ!

ئەوەی گوت و هەموو فیشەکەکانی نێو عەمباری تفەنگەکەی بە لای پۆلە بەردیکی‌یەوە نا، کە دەنگی کابرای لێوە هاتبوو.

شەڕێکی قورس و بێ‌بەزەیی‌یانە دەستی پێ‌کرد. دەنگی کابرای هێشتاش هەر دەهات، بەڵام لە دەنگی تفەنگان دا ون دەبوو و پیاو لێی تێ‌نەدەگەیشت.

مەلا فەرهاد بە سینگەخشکە خۆی لە تەیووری نێزیك کردەوە:

ـ تەیوور بە دوای من دا وەرە. من و تۆ دەبێ ئەو پۆلە بەردەی سەرەوەی خۆمان بگرین. بگەینە وێ، ئیدی بە تەواوی بە سەریان دا زاڵ دەبین.

شوێنەکە زۆر ئاستەم بوو، سێ گوللە لە پەنا مەلا فەرهادی وە عەرزێ کەوتن و زۆری نەمابوو هەڵدێرێتە نێو خڕێکی، بەڵام بە خێرایی خۆی گرتەوە، دەستی لە لکی پنچکێکی قایم کرد، هەڵکشا و خۆی گەیاندە نێو پۆلە بەردەکەی. لەو ماوەیەی دا تەیووریش وەك ماری بە لایەکەی دیکە هەڵچوو و گەیشتە سەرێ.

ئەو شوێنە لووتکەی شاخەکەی بوو. لە وێ ڕا کە دەتڕوانی‌یە دۆڵی خوارێ، کە لە لایەکی ڕەوەزەکان بوو، چاوت دە ڕەشەوە دەهات.

مەلا فەرهاد بانگی هاوڕێیانی کرد:

ـ هەمووتان وەرنە لای ئێمە و ئەم بەرزایی‌یە بگرن. تا دەگەنێ ئێمە تەقە دەکەین و ناهێڵین سەر هەڵێنن، مەترسن وەرن!

لە وێ ڕا مەلا فەرهاد و تەیوور بە سەر هێرشکەرەکان دا زاڵ بوون، هەرچی سەری وەدەردەنا، دەیانپێکا. کابرای ئەنگواو خلۆر دەبۆوە و هاوار و زیڕەی لە نێو دۆڵ و ڕەوەزەکان دا دەنگی دەدایەوە.

کاتی ڕۆژاوایە تەقە لە لای بناری شاخی، کە هێرشکەرەکانی لێبوو، بێدەنگ بوو.
مەلا فەرهاد گوراندی:
ـ کوڕینە تەقەی مەبڕنەوە و دەرفەتیان مەدەنێ. نابێ بێلێن بە ساغی لە دەستمان دەرچن. بە قەستی کوشتنێیان پێوەنین! ئەو شەڕە زۆر گرینگە و دەبێ بە چاکی تەواوی کەین. لەمەو دوا ئیدی نە تاقمە چەتەی دیکە و نە سولتانۆغلی هیچیان ناوێرن خۆمان لێدەن...
پاشان لە حالێك دا لە بەر ماندوویەتی‌یان بە زەحمەت دەی‌توانی هەناسەی بێنێتەوە بەر خۆی، سێرەی گرتەوە و چەند فیشەك دە عەمباری تفەنگەکەی دا مابوون، هەمووی هاویشتن. بە دەگمەنیش فیشەکی مەلا فەرهادی بە فیڕۆ دەچوو.
وردە وردە لە سەری شاخی ڕا داگەڕانەوە بۆ لای خوارێ، بەڵام بە پارێزەوە، بە ماتە ماتە و بە پەنا بەردان دا. ئێستا ئیدی تەقە بە تەواوی بڕابۆوە و هیچ دەنگێك نەدەبیسرا. ڕۆژیش چوو دە پشت شاخی‌یەوە و ئاوا بوو.
کاتێك گەیشتنەوە سەر کانی‌یە خۆشەکەی نێو مێرگۆلەکەی، گوێیان لە نالەیەکی بوو. یەکێك لە هێرشکەرەکان برینێکی قورسی لێبوو و لەولاتر کەوتبوو.
مەلا فەرهاد دەستووری دا:
ـ خێرا ئەو کابرایەی بکوژن!
قاسم غاری دا سەر کابرای و هێندەی نەکێشا نالەکە بێدەنگ بوو.
ـ ئێمە دەبێ هەر ئەمشۆ لێرە بڕۆین ، ئەوەندەی بۆمان دەکرێ دوور کەوینەوە و هەر نەبێ بگەینە گوندی "قزلباش"ـەکان کە لە شوێنی دیکە نێزیکترە. بەڕاستی گوندەکەیان ناوی چی‌یە؟ ئەمن لە بیرم چۆتەوە!
تەیموور گوتی:
ـ ناوی وەنەوشەیە.
ـ لەم وەرزەی ساڵێ دا تەنانەت شیرەکەشیان بۆنی وەنەوشەی لێدێ.
ـ ئاخر دەوروبەری دێیەکەی پڕە لە وەنەوشە. هەموو شتێك هەر بۆنی وەنەوشەی دەدا، خەڵکەکەی، ماڵاتی، عەردەکەی، داری، باڵندەی، هەموو شتێکی... چونکە لەوەڕگەکانیش وەنەوشەیان لێن و مانگاکان لە گەڵ لەوەڕی دیکە وەنەوشەی دەخۆن، شیرەکە بۆنی وەنەوشەی لێدێ، ئاوی کانی‌یەکانیش ئەو بۆنەیان گرتوە ...
مەلا فەرهاد گوتی:

ـ یاڵڵا کوڕینە، با بڕۆین!
بۆخۆی وەپێش کەوت و قاسم و شاهێنیش هەرکام لە تەنیشتێکی دەڕۆیشتن. هەم لەشی و هەم جلەکانی دە ئارەقەی دا خووسابوون، ئەوە زۆر گرینگ نەبوو بەڵام برینەکانی دەست و سەر چۆکانی زۆر دێشان. هەموویان دە وەزعەێکی ئەوتۆ ناخۆش دابوون. بەو حاڵەش زۆر خێرا دەڕۆیشتن، دەتگوت باڵیان لێڕواون، لەو ڕەوەزی بۆو ڕەوەزی، لەو پنچکی بۆ ئەو پنچکی و لەو دۆڵی بۆ ئەو دۆڵی. هەر جۆگەیەك دەهاتە سەر ڕێیان، بە قەڵەمبازێکی بە سەری دا تێدەپەڕین. بەو شێوەیەی ماوەیەکی زۆر ڕۆیشتن. بەرەبەری ڕۆژهەڵاتێ گوندی وەنەوشەیان لێ وەدیار کەوت. ڕێگایەکی زۆریان بڕیبوو. ئەگەر بۆ خەڵکی گوندەکەیان گێڕابایەوە کە لە کوێ ڕا هاتوون و چ مەودایەکی دووردودرێژیان بە شەوێکی بڕیوە، کەس باوەڕی پێنەدەکردن.
کە گەیشتنە نێو گوندی، پرسیاری ماڵی بابەدورسوونیان کرد. کچۆڵەیەکی چاوگەش وەپێشیان کەوت و ماڵەکەی نیشان دان.
زۆری پێنەچوو خەڵکی گوندەکەی لە پێش دەرگای بابە دورسوونی کۆبوونەوە. خەڵکەکە بە سەرسوڕماوییەوە چاویان لە چەکدارەکان دەکرد، کە باسك، ئەژنۆ، سینگ و سەروسەکوتی هەموویان بریندار بوو و هەموو گیانیان خوێن بوو. بابە دورسوون دەسبەجێ مەلا فەرهادی ناسییەوە و بە ڕێزێکی زۆرەوە دەستی بۆ لە سەر سینگی دانا و بەخێری هێنا. مەلا فەرهادیش هەر بەو شێوەیە ڕێزی گرت و لە ئامێزی گرت. ئەو جار بابە دورسوون ئاوڕی دایەوەو لەگەڵ ئەوانی دیکەش هەربەو شێوەیە، لە حاڵێك دا دەستی لە سەر سینگی دانابوو، چاکوخۆشیی کرد و بەخێرهاتنی کردن. پاشان داوای لێکردن بچنە ژوورێ. پڕ بە نێو ژوورەکەی لباد ڕاخرابوون، دیوارەکانیش بە وێنەی جوان جوانی مینیاتۆر ڕازابوونەوە و چەند سازیشیان پێوە هەڵاوەسرابوو. لە سەرەوەی ئاگردانی ژوورەکەش شمشێرێکی دووسەر بە دیوارییەوە بوو. پیاوەکان لە بەر ماندوویەتییە هەر چوونە ژوورێ، لە سەر لبادەکان خۆیان بە عەرزی دادا.
بابە دورسوون گوتی:
ـ ئەوە چتان بە سەر هاتوە مامۆستا؟
مەلا فەرهاد وەڵامی دایەوە:
ـ وەڵڵاهی تووشی تێکهەڵچوونێکی قورس بووین.
پاشان هەموو بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە.
بابە دورسوون گوتی:

ــ به خودای ئەو کابرایە دەستتان لیّهەڵناگریّ. بیّگومان ئیّستا پیاوەکانی وی گوندی ئیّمەیان گەمارۆ داوە. ڕەنگە بزانی کە ئەو لە عەشیرەتی دولکادیرلیی نیە. ئەو عەشیرەتە بنەیان براوەتەوە و نەماون. لە وان تەنیا یەك کەس ماوە و ئەویش "حاجیی زیندروو"ە، کە لە "ئاندیرین" ێ دەژی. ئەو کابرایە دەنگی زۆر خۆشە و گۆرانی چاك دەڵیّ، زین و ڕەختی دروست دەکا و پەڕاوێزی زەردی زێڕین و زیّوینی یەکجار جوانیان لیّدەدرویّ. ئەگەر ئەسپەکە ئەسپی چاك نەبیّ و بە کەیفی وی نەبیّ، هەرچەندی بیدەیەی، زین، ڕەخت، یان تەنانەت تەڕلکیّکیشی بۆ دروست ناکا! زینیّك حاجی دروستی بکا، دەریایەك ڕەنگ و میّرگیّکی پڕ لەگوڵ دەخاتە بەرچاو... نە خیّر دەزانم سوڵتانۆغڵیـیە زەردە هەر کاتیّك بۆی بلویّ، تۆڵەتان لیّ دەکاتەوە، بەڵام ئەگەر ئیّستا هاتن و دەوری گوندی ئیّمەیان دابیّ، ئەوە ئیّوە خەمتان نەبیّ، کوڕەکانی ئیّمە دەزانن چۆنیان پیّش پیّبگرن...

زۆری پیّنەچوو قاوەیان بۆ هیّنان. بۆنی قاوەی ژوورەکەی پڕ کرد. مەلا فەرهاد گوتی:

ــ زەحمەتمان دان بابە دورسوون!

ــ ئەوە شتیّکی وا نیە... ئیّوە ماوەیەکی زۆر بە ڕیّیە دا هاتوون و ماندوون.

مەلا فەرهاد قومیّکی لە قاوەکەی خواردەوە و گوتی:

ــ ئەو قاوەیە بۆنی وەنەوشەی لیّدی.

هاوڕیّکانیشی هەر قسەی وییان کردەوە.

بابە دورسوون بزەیەکی هاتیّ و گوتی:

ــ ئەو بەینە وەنەوشەی زۆرە. هەموو شویّنیّکی وەنەوشەی لیّدەڕویّ. بن ڕەوەزان، بن پنچك و داران، دەمجۆگە و ڕووباران و شویّنی دیکەش، هەمووی پڕن لە وەنەوشە. کاری خودایە وەنەوشەمان بە سەر دا دەباریّ. هەرکەس بە نیّو گوندی ئیّمە دا تیّپەڕیّ، بۆنی وەنەوشەی بۆ دیّ.

دوای ئەوەی قاوەکەیان خواردەوە، مەلا فەرهاد گوتی:

ــ ئیّمە کاتیّك لە گوندیّکی دەمیّنینەوە، قەت هەمووومان لە ماڵیّکی نانووین. ئەگەر ئیجازەمان بدەی ئیّستا دوومان لە ماڵی هەرە ئاخری، لە بەرەوەی گابەردەکان، دوو لە ماڵی هەرە خواریّ و دوو لە ماڵیّکی سەرەوەی دیّی دەبین و ئەوانی دیش لیّرە دەمیّنینەوە.

بابە دورسوون بانگی کرد:

ــ ئادەی کوڕینە وەرن بە میوانەکان ڕابگەن!

هەرکە بابە دورسوون بانگی کرد کۆمەڵێك پیاوی جحێڵ هاتنە ژووری. هەموویان کەڵەگەت و ڕەشنەسەمەر بوون. بابە دورسوون ئەو ماڵانەی کە دەبوو هاوڕێیانی مەلافەرهادییان لێ بنوون، دیاری کرد و گوتی:

ــ برینەکانیان بۆ دەرمان کەن و جلوبەرگەکانیان بۆ بدروونەوە. ئەگەر جلی کەسێکی زۆر دڕابێ، ئی تازەیان بۆ پەیدا کەن و بیاندەنێ.

پیاوەکان گوتیان:

ــ بە سەر چاو، چۆنی تۆ بفەرمووی، وا دەکەین.

مەلا فەرهاد و قاسم لە وێ مانەوە و ئەوانی دیکە لە گەڵ پیاوەکان ڕۆیشتن.

بابە دورسوون ڕووی تێکردن و گوتی:

ــ ئێوەش جلوبەرگە دڕاوەکانتان دانێن، پاشان لەو دیوەی دیکە خۆتان بشۆن. ئەو مەڵحەمەتان دەدەمێ، هەرجێیەکی لەشتان داڕووشاوە، یان بۆتە برین، تێیدەن، یەکاویەکە. جلی تازەشتان بۆ دادەنێن، ئەگەر خۆتان شوت، جلەکانتان بگۆڕن.

ساتێك دواتر مەلا فەرهاد و قاسم خۆیان شوتبوو، جلەکانیان گۆڕیبوو و پاك و خاوێن لە لای بابە دورسوونی دانیشتبوون. مەلا فەرهاد گوتی:

ــ یاخوا ماڵت ئاوەدان بێ، مامەگیان! وەڵڵاهی لەش و دەروونمان وێکڕا تازە بوونەوە.

لەوەتا گەیشتبوونە وێ، مەلافەرهاد تێگەیشتبوو کە بابە دورسوون پرسیارێکی هەیە و دەیەوێ بیکا، هەر بۆیە ڕووی تێکرد و گوتی:

ــ دەزانم دەتەوێ سەبارەت بە حەمەدۆکی پرسیار بکەی. وا نیە؟

خەم بە ڕوخساری ئەو پیرەمێردەیەوە دیار بوو:

ــ ئەمن بۆی نیگەرانم. ئەو میری منە. هیوادارم تووشی هیچ ڕووداوێکی ناخۆش نەبووبێ.

ــ ئەومان لە گەڵ نیە بابە! ئەو پێیخۆش نەبوو چیدی چەتەییە بکا. دەیگوت ئیدی ناچمەوە شاخی. ئەو ناوی خۆی گۆڕیوە، بۆتە جووتێر و ئێستا وەك هەموو جووتێرێکی دیکە دەژی. بەڵام ناوەکەی خۆی بۆ ئێمە بەجێهێشت. "دەستەی حەمەدۆکی" هەرگیز چیای بەجێناهێڵێ، هەرگیز! تا ئەو کاتەی دنیا سەروبن دەبێ ئەم دەستەیە بەم ناوەوە هەر دەمێنێ!

بابە دورسوون پێی لە سەر قسەکەی وی داگرتەوە:

ــ بەڵێ، ئیدی هیچ کەس ئەو دەستەیەی لەو چیایانە بۆ هەڵناکەندرێ، نە من، نە کەسێکی دیکە، با زۆردارێکی بێڕەزاش بێ! تەنانەت حەمەدۆك بۆخۆشی شتێکی ئاوای بۆ ناکرێ!

پاشان دەستی بە سمێڵ و ڕدێنی دا هێنا، کە هەموو ڕوخساری ڕەنگپەڕیوی وی‌یان داپۆشیبوو:
ـ باشە مەلا فەرهاد، گەورەم، باسوخواسی ئەسپەکەی حەمەدۆکیت بیستوە؟
ـ بیستوومە، بەڵام مەبەستت چی‌یە؟
ـ خەڵاتیان بۆ دیاری کردوە، هەرکەس بی‌گرێ، هەزار و پێنسەد لیرەی دەدەنێ.
ـ باشە دەیانەوێ ئەو ئەسپەی چ لێ‌بکەن؟
ـ دەیانەوێ گوللەبارانی کەن.
ـ ئەو جووتێرانەی من دەیانناسم، قەت شتی وا ناکەن. ئەوان زۆر لەو ئەسپەی دەترسن.
ـ بەڵێ وایە.
ـ چەند ئەسپی کوێت لەو چیایانە هەن، هەموویان بۆ دەبەن، بەڵام هیچ کەس ناوێرێ تخوون ئەو ئەسپە شێتەی کەوێ.
ـ دەڵێن باڵی هەیە و هەموو بەیانە و ئێوارێکی دەفڕێ بۆ بەهەشتێ و دێتەوە.
ـ کێ گوتی ئەسپەکەی دەگرن و دەی‌کوژن؟
ـ نازانم. هەرچۆنێك بێ، ئەوە بۆ ئێمە ئەزموونێکی گەورەیە. ئەگەر جووتێرەکان ئەسپەکەی بگرن و بی‌بەن لە شاری تەسلیمی کەن، ئەوە دیارە هەروا بە هاسانیش دەتوانن خەیانەت بە حەمەدی بکەن.
ـ باوەڕم پی‌بکە بابە دورسوون، ئیدی هەتا دنیا دنیایە حەمەدۆك و ئەسپەکەی دەمێنن و درێژە بە خەبات دەدەن.
بابە دورسون گوتی:
ـ ئەو حەمەدۆکە شتێکی سەیرە، پیاو سەری لێ سوڕ دەمێنێ. ئەمن و تۆ هەردوکمان حەمەدی دەناسین و دەزانین ئەویش هەر وەك خەڵکی دیکەیە. زۆری دیکەش هەن کە دوای ئەوەی کەسێکیان کوشتوە، لە شاخی‌یان داوە، بە دژی ستەم و بێ‌عەداڵەتی خەباتیان کردوە و دوژمنی ئاغا و بەگان بوون. دە نێو وانە دا ئی وا هەبوون کە لە حەمەدیش ئازاتر و بە جەرگتر بوون، بەڵام نازانم بۆ تەنیا حەمەدۆك ئاوا چۆتە نێو دڵی خەڵکی و بڕوایان پی‌یەتی ... باشە ئەگەر تۆ لە گەڵ حەمەدۆکی نەبوایەی، ئیدی ...
مەلا فەرهاد بە دەنگی بەرز گوتی:
ـ ئیدی تی‌دا دەچووم. بە بێ حەمەدۆکی چووبامە سەر سوڵتانۆغڵی‌یە زەردەی، هەر لە پێش دا ڕێگایان نەدەداین بچینە ژوورێ و دوایەش ئەگەر چووباشینە ژوورێ، قەت نەماندەتوانی پووڵی لێ‌بستێنین و بە ساغی بێینەوە دەرێ ...

ـ بە ڕاستی ئەوە ڕازێکە ... ئینسانی وەك حەمەدۆکی نەهێنییەکیان لە گەڵە، کە ئێمە نازانین چییە و بۆمان نابینرێ، بەڵام زۆریدیکە دەیبینن!

مەلا فەرهاد دەستی بە ڕدێنی دا هێنا وەڵامی دایەوە:

ـ بابە دورسوون، من و تۆ تەنیا دوو چاومان هەن، زۆری دیکە یانی هەزار، سەدهەزار، سەدمیلیۆن چاو... ئەوان بە چاوی سەد میلیۆن ئینسان لە حەمەدۆکی دەڕوانن، چاوی وا کە هەزارساڵیان تەمەنە ...

بەو شێوەیە قسەیان سەبارەت بە حەمەد و ئەسپەکەی درێژەی کێشا. کاتێك ئێوارە داهات، چەند کوڕ و کچ کە بە جل و بەرگی جوان خۆیان ڕازاندبۆوە، دە مەجومعەی مسی جوان دا نان و چێشتیان هێنا.

ـ فەرموو مامۆستا مەلا فەرهاد، با نانی بخۆین.

ـ سوپاس بابە گیان، هەموو شتێك بۆنی وەنەوشەی لێدێ!

بابە دورسوون دووپاتی کردەوە:

ـ بەڵێ، هەموو شتێکی ئێرە بۆنی ونەوشەی لێدێ.

بە بێ دەنگی نانەکەیان خوارد. دوای ئەوەی کە لە نانخواردنێ بوونەوە، خەڵکی دێی یەك یەك و دوو دوو پەیدا بوون. هەرچی وەژوور دەکەوت، بە ڕێزێکی زۆرەوە دەستی لە سەر سینگی دادەنا و پاشان لە شوێنێکی ژوورەکەی دادەنیشت. هێندەی پێنەچوو ژوورەکە پڕ بوو لە پیاو و ژن. کوڕێك دەستی برد، لەو سازانەی بە دیوارییەوە بوون، یەکی هێنا خوارێ و لە سەر کۆشی بابە دورسوونی دانا. سەرەتا پیرەمێرد دەستێکی بە سمێڵانی داهێنا، سازەکەی هەڵگرت وناڵەی لێهەستاند. هەرکە ساز ناڵاندی، پیرەمێرد ڕەنگی گۆڕا، چووە خەیاڵێکی قووڵەوە و بە ئاهەنگی سازەکەی دەستی چڕی. دەنگی یەکجار زوڵاڵ و خۆش بوو، دەتگوت ئەو سۆز و ئاوازە لە نوختەی دروستبوونی دنیایەوە دێ و تا هەتایەش درێژ دەبێتەوە ...

" هێشتاش دوڵدوڵ هەر وا بە ڕاپەڕە و تێدەکۆشێ، دوور لێرە، دوور، لەو بەری یەمەنێ. هێشتاش ئیمامی ئێمە، عەلی، هەروا شەڕێ دەکا. لە پشت کێوی قافێ کوێرۆغڵی سواری ئەسپە بۆرییە و لە ڕێگای جێگیر کردنی دۆستایەتی، ئازایەتی و ڕاستی لە سەر عەرزێ، خەبات دەکا. ئەو لە گەڵ ستەم و خراپەکاری شەڕ دەکا. پیر سوڵتان، شێخی چاوکاڵی من، لە پشت حەوت دەریایان، بە دژی کاری ناڕەوا خەبات دەکا. چلسوارەی غەیبی لە گەڵ ستەم بە شەڕ دێن و پشتی ڕاستی دەگرن. لە وەتا دنیا دنیایە چاکەکان بە دژی خراپەکان ڕاوەستاون و شەڕیان لە گەڵ کردوون. هەر ڕۆژ و شەوێکی، هەتا ئەو جیهانە هەیە، ئەستێرەی نوێ لە ئاسمانێ وەدەردەکەون"

" هەموو جارێ کە ڕۆژ نوێ دەبێتەوە، ئەستێرە نوێیەکان خەبات دەکەن و هەموو شەوێك ئاسمانێ پڕ دەکەن. هەموو بەیانییەك گوڵی تازە دەپشکوون، ڕۆژ لە ڕۆژێ جوانتر، منداڵی نوێ لە دایك دەبن، بەهێزتر لەو منداڵانەی ڕۆژی پێشووتر لە دایك بوون. هەموو جارێ، هەموو ڕۆژێ، کە ڕۆژ هەڵدێ، زەوی پێست دەگۆڕێ و یەکی تازەی بە بەر دا دەکرێ. هەموو ڕۆژێ کە خۆر هەڵدێ، هەموو ئینسانەکان لە دایك دەبنەوە، هەموو تۆوێکیش تازە دەبێتەوە و جێی هەردەمە پێمەڕەیەکیش لە سەر ئەم عەرزە نوێ دەبێتەوە. هەموو ڕۆژێ کاتێك ڕۆژ سەر وەدەردەنێ، ئاسمان دروست دەکرێتەوە، کازیوەی بەیانی دنیا لە دایك دەبێتەوە و ڕووناکاییەکی وا دەڕژێتە سەر وڵاتی، کە قەت پێشتر نەدیتراوە. دڵی ئینسانەکان، نوێ دەبنەوە، لاو دەبنەوە و وەلێدان دەکەونەوە. هەر دڵێك و هەر گوڵێك لێوالێو لە ئەوین دەبن و ڕووبارەکانیش هەموو پڕ دەبن لە خۆشەویستی. ئیدی مردن نامێنێ"

ئەو جار بەو دەنگە خۆشەی دیسان تێیچریکاند:

" مرۆڤ نامرێ. مرۆڤ بۆ ئەوین و دۆستایەتیی دروست کراوە. مرۆڤ بێجگە لە خۆشەویستی بۆ هیچ شتێکی دیکە لە دایك نەبووە، ئەوین نەبێ، دەمرێ. مرۆڤ بۆ مرۆڤ لە دایك بووە ..."

بابە دورسوون سازەکەی بە سینگییەوە نابوو، چاوی لێکنابوو و دەلۆرایەوە. لەو حاڵەی دا میهرەبانی و ئەوین و گەرمی لە سیمای دا دەدرەوشایەوە. دەتگوت لە بەهەشتێ دا گۆرانی دەڵێ:

"خودا حەوت ڕۆژان بە دروستکردنی دنیایەوە نەبووە، بەڵکوو لە چاولێکنانێك دا، لە بریسکەیەك دا خولقاندوویەتی و بە ئەوینەوە دروستی کردوە. خۆشەویستی بوو وای کرد زەوی لە دایك ببێ، زەوی و ئاسمان هەردووکیان. هەربۆیەش دنیا ئەمسەر و ئەوسەری نیە و عەرزیش ئاوا دەوڵەمەند و بە ڕێژەوە. لە ئاسمانێ ڕا ڕووناکایی دەڕژێتە سەر عەرزی. ئەوین بوو ئینسانی خولقاند، هەر بۆیەش ئینسان بۆخۆی بوو بە داهێنەر و خولقێنەرێکی ئاوا جوان".

دەنگی بابە دورسوونی جار بە جار بەهێزتر دەبوو:

ـ ئینسان هەر دێ و جوان دەبێ. ڕۆژ نیە مرۆڤ هێندێك خۆشبەختتر نەبێ، لە خۆشەویستی پڕتر نەبێ و باشتر نەتوانێ لە بەرامبەر خراپی و دیاردەی ناڕەوا دا خەبات بکا،... بۆ؟ چونکە مرۆڤ لە ئەوین دروست کراوە ... "

ئەو جار بابە دورسوون ماندوو بوو. هاتبوو ڕۆژ بێتەوە. پیرەمێرد چاوەکانی هەڵێنان، سازەکە لە دەستی بۆوە و بە نەرمی خزییە سەر کۆشی، ئەویش بزەیەکی هاتێ، هەستا و سازەکەی لە جێی خۆی بە دیوارییەوە هەڵاوەسییەوە.

کاتێك ئەو پیاوە بەڕێز و بەساڵداچووە دانیشتەوە، مەلا فەرهاد هەستا سەر پیێیان، هەردووك دەستی ویی گرت و بە سەر دڵی خۆیەوە گوشین. خەڵکەکە هەموو هەستان، هەموویان دەستیان بە سینگییانەوە نا، ماڵاواییان کرد و بێدەنگ وەدەرکەوتن. ئیدی ڕۆژ ببۆوە و نوێژی بەیانی ببوو. مەلا فەرهاد چووە دەرێ و دەستنوێژی هەڵگرت.

بابە دورسوون بەرماڵی ڕاخست. مەلا فەرهاد نوێژی کرد، پاشان لە سەر چۆك دانیشت، سەری بەردایەوە و بێدەنگ دەستی بە دوعاخوێندنێ کرد. بابە دورسوون هێندێك واوەتر پاڵیدابۆوە و دەوییەوە ڕامابوو، کە لێوەکانی دەبزووتن و لە دوعاخوێندنی خۆی دا نوقم ببوو. مەلا فەرهاد تاوێکی خۆش بە دوعاخوێندنێوە بوو، پاشان هەستا سەرپێ و بەرماڵەکەی کۆ کردەوە.

ـ بەختت هەیە بابەی قزڵباشانی! بۆخۆت ئاسوودەی، نە پێویستە نوێژێ بکەی و نە ڕۆژووی بگری!

بابە دورسوون بزەیەکی هاتێ و گوتی:

ـ بە پێچەوانەوە، لە هەموو شتێکی زەحمەتتر ئەوەیە ئینسان بتوانێ ئینسان بێ. مرۆڤبوون کارێکی قورسە.

لە مەجومعەیەکی مسی گەورە دا نانی بەیانییان بۆ هێنان. قاپێك دۆکلیو لە سەر مەجومعەکەی بوو و هەڵمی لێهەڵدەستا. چەند کەوچکی داریشیان دانابوو.

مەلا فەرهاد کەوچکێکی دەست دایە و گوتی:

ـ بڕوانە، تەنانەت دۆکلیوەکەش بۆنی وەنەوشەی لێدێ.

بابە دورسوون پێکەنی و گوتی:

ـ بەڵێ دەبێ بۆنی وەنەوشەی بدا.

قاسم کە لە ئێوارەی ڕۆژی پێشووەوە هیچی نەگوتبوو، وەقسە هات و گوتی:

ـ وەڵڵاهی چووزانم، ئەمن ئێستا ئەو بۆنەم بۆ نایە.

بە بێدەنگی نانەکەیان خوارد. پاشان شتومەکەکانیان بۆ هێنانەوە. جلەکانیان شۆرابوون و ئەو جێیانەیان کە هەڵوەشابوون، یان دڕابوون دروابوونەوە. مەلا فەرهاد و قاسم بە نۆرە چوونە ژوورەکەی دیکە و خۆیان پۆشتە کردەوە.

کاتێك ئەوان لەو شتانە بوونەوە، تاو لە هەموو شوێنێکی دابوو. لاوێکی خەڵکی دێی هاتە ژووری و گوتی:

ـ بابە سوڵتان، (وا دیارە قزڵباشەکانی ئەم گوندە بە پیاوە گەورەکانی خۆیان گوتوە سوڵتان، هەر بۆیەش بە دورسوونی هەم دەڵێن"بابە دورسوون" و هەم دەڵێن "بابە سوڵتان" وەرگێڕ) ئەمن و هەشت کەسی دیکە لە دەرەوەی دێی کێشکمان دەکێشا، پیاوەکانی سوڵتانۆغڵیمان دیتن. ئەوان نێزیکەی شێست کەس دەبن و لە نێو بەردەکانی لای خوارێ، نێزیك چۆمی، بۆسەیان داناوەتەوە.

ـ ئەوانیش ئێوەیان دی؟ چۆنتان بۆکرا بیانژمێرن؟

ـ نەمانهێشت ئەوان ئێمە ببینن. ئەوان خۆیان کوورِ کردبۆوە و بە ماتەماتە دەهاتن. ئەمن لە سەر دارێکی خۆم حەشار دابوو و لە وێرا زوو ئەوانم دی. ئێستا ئەوان بۆسەیان داناوەتەوە و چاوەڕوانن.

ـ ئافەرین کورِم، سوپاست دەکەم، ئێستا زوو بچۆ بە هەموو کورِەکانی دیکەش بڵێ بێن و لێرە کۆ ببنەوە!

نێزیك ماڵی بابە دورسوونی، دارپەلکێکی لێبوو. دەوری دارەکەی گۆڕ بوو. ئەو دارە لانی کەم سێسەد ساڵی تەمەن بوو، هێندەی ڕەگاژۆ کردبوو، کە ڕیشەی گەیشتبوە ڕەوەزەکانی شاخی و لکوپۆپیشی گۆڕاییەکەی هەموو داپۆشیبوو. دارەکە بەو چێشتەنگاوەی و لە بەر ڕووناکایی ڕۆژێ، دەتگوت لە تیشکێ دا مەلە دەکا. مەلا فەرهاد و قاسم لە بن دارەکەی دانیشتن. بابە دورسوونیش هات. هێندێك نیگەران دەهاتە بەرچاو، دوای ئەوەی لە لایان دانیشت، ڕووی لە مەلافەرهادی کرد و گوتی:

ـ داوایەکم لێت هەیە!

ـ لە خزمەتت دام، بابە سوڵتان.

ئارەقە ڕوخساری ئەو پیرەمێردەی داگرتبوو. قوتوویەکی چکۆڵەی بە دەستەوە بوو بۆ لای مەلا فەرهادی ڕاداشت:

ـ ئەمە هەڵگرە! ئەمە متفەرِکە، یان با بڵێم دوعا و تەلەسمی دێی ئێمەیە. ئەوە لە ڕووداوی ناخۆش، نەخۆشی، ئاگر و گوللە دەتپارێزێ. هەر نەبێ ئێمە بۆخۆمان باوەڕمان پێیەتی، جا ...

مەلا فەرهاد باوەشی پێداکرد:

ـ خودا ڕاوەستاوت کا بابە سوڵتان!

قوتووەکەی کردەوە، بەردێکی تێدا بوو. ڕەنگی بەردەکە سەوزێکی ڕوونی بریقەدار بوو و وەك گیانلەبەرێکی نەناسراو دەچوو، کە قەتیان نەدیبوو.

ـ سوپاست دەكەم بابە سولّتان.

دەو بەینەی دا هەموو چەتەكان هاتن و لە بن دارەكەی كۆ بوونەوە.

ـ مەلا فەرهاد، دەتانەویّ هەر ئێستا بڕۆن؟

ـ بەلّیّ، هەر ئێستا. بۆخۆت دەزانی ئەوان لە خوارەوەی دێی لە سەرمان ڕاوەستاون. بەلاّم پێش ئەوەی بڕۆین، داوایەكم هەیە، بۆم جیّبەجیّ كە.

ـ هەر چی بیفەرمووی، لە سەر چاومی دادەنێم، مەلا فەرهاد.

ـ ئەو كچە عەزەبانەی وەختی مێردییانە و بابەكانیان لە شەڕیّ دا كوژراون و كەسیان نیە، هەموویانم بۆ بانگ كە! با بێنە ئێرە.

بابە دورسوون سرتەیەكی لە گەلّ لاوەكان كرد و ئەوانیش دەسبەجیّ هەر یەكەو بە لایەكی دا ڕۆیشتن.

ـ جاریّ ناتوانن بڕۆن.

ـ ئەوانەی لەو خواریّ بۆسەیان بۆ داناوینەوە، با جاریّ چاوەڕوان بن. ئاخرەكەی ئێمە هەر دەڕۆین.

لاوەكان گەڕانەوە، شازدە كچی جحێلّیان لە گەلّ بوو، كە هەموویان بابیان لە شەڕیّ دا كوژرابوو.

مەلا فەرهاد گوتی:

ـ پیّیان بلّیّ ئەمن لە جێی بابیانم. دەمەویّ شتێكیان بە جەیاز بدەمیّ و هیوادارم دەستم ڕەد نەكەنەوە.

بابە دورسوون سوور هەلّگەڕا و ئارەقەی كرد، بەلاّم بە دەنگی بەرز قسەكەی مەلا فەرهادی بۆ دووپات كردنەوە. مەلا فەرهاد چووە پێشیّ. كیسەیەكی دەرهێنا، دەستی بردە نێو كیسەكەی و هەر كچەو سكەیەكی زێڕی دە مستی نا. هەموو ژن و پیاوی ئەو دێیەی كەلّەگەت، سووروسپی و چاوشین بوون.

كاتێك وەڕیّدەكەوتن، مەلا فەرهاد ڕووی لە خەلّكەكەی كرد و گوتی:

ـ بمانبوورن، زۆرمان زەحمەت دان!

ـ ڕەبی بەخێر چن، مامۆستا!

ـ خودا لە بەلاّیان بتانپارێزیّ!

ـ یاخوا ئەو تەلەسمەی ئێمە بتانپارێزیّ!

ـ کوا زەحمەتتان داوین، ئێوە چاوی ئێمەن.

هێندەی نەمابوو لە دێی وەدەرکەون، بابە دورسوون هەرای لێکردن:

ـ ڕاوەستن مەلا فەرهاد، وەخت بوو لە بیرم بچێ، شتێکی گرینگە...

مەلا فەرهاد بە هاورێیانی گوت:

ـ کوڕینە بڵاو بڕۆن، نابێ ئاوا بە پۆل بڕۆن.

بابە دورسوون و چەند کەسی دیکە گەیشتنەوە لایان. چەند کیسەیان بە دەستەوە بوون:

ـ کوڕە ئەوە زۆر گرینگە، باش بوو وەبیرمان هاتەوە. هێندێکمان فیشەك بۆ هێناون.

ـ ماڵتان ئاوەدان بێ، بێگومان زۆری پێئاچێ پێویستمان دەبێ.

لە دەرەوەی دێی تووشی حەوت کوڕی جحێڵ بوون. هەموویان کەڵەگەت، مووزەرد و چاوگەورە و شین، ڕانك و چۆغەیان دەبەر دا بوو و سەربەرگی یەخە زەردی چنراوی ماڕاشیشیان بە خۆ دادابوو. هەموویان سەرتا پێ چەکدار بوون.

ـ مەلا فەرهاد، ئێمە چاوەڕوانی ئێوە بووین!

ـ بەخێر بێن!

وەدەرکەوتنی ئەو کوڕانە هێندێك کتوپڕ بوو، هەربۆیە مەلا فەرهاد تۆزێك بە گومانەوە وەڵامی دانەوە.

ـ لە دوێنێ ئێوارێوە لە سەر ئێوە ڕاوەستاوین. ئێمە دەمانەوێ بێینە دەستەی حەمەدۆکییەوە.

ـ پێمخۆشە، بەڵام پێمبڵێن بۆچی دەتانەوێ وەشاخی کەون؟

ـ حەمەدۆك بۆ وە شاخی کەوت؟ ئێمەش هەر بە هەمان هۆ!

ـ همم ...

مەلا فەرهاد سەری هەڵێنا، یەك بە یەك تێیانەوە ڕاما و چاوی دە چاویان بڕی. یەکیشیان ڕووی وەرنەسووڕاند و چاوی نەترووکاند.

لە وی هەرە پێشەوەیانی پرسی:

ـ ناوت چییە؟

ـ حەمەد ...

مەلا فەرهاد پێکەنی و لەوی دیکەیانی پرسی:

ـ ئەدی ئەتۆ ناوت چییە؟

ـ حەمەد ...

لە هەموویانی پرسی. هەموویان ناویان حەمەد بوو.

مەلا فەرهاد لە سەر بەردێکی دانیشت، دەستی وەبەر چەنەی دا و بیری کردەوە. دوای ساتێك قاسم و تەیموری بانگ کردە لای خۆی و ڕاوێژی لە گەڵ کردن. حەمەدەکان ڕاوەستابوون و چاویان لە مەلا فەرهادی دەکرد.

ئاخرەکەی مەلا فەرهاد هەستا و بانگی کردن:

ـ وەرن بزانم، دادەی، با چاوێك لە تفەنگەکانتان بکەم.

هەموو حەمەدەکان یەکجێ، وەك ئەوەی هەموویان یەك هێز و یەك دەست بن، تفەنگەکانیان لە شانی هێنایە خوار و لە پێش مەلا فەرهادی‌یان دانان. مەلا فەرهاد داهاتەوە، تفەنگێکی هەڵگرت و دەروژووری چاو لێ‌کرد.

ـ باشە ئەتۆ تەقەت بەو تفەنگەی کردوە؟

ـ بەڵێ، تاقیم کردۆتەوە. پیاو بەو تفەنگەی دەتوانێ پەنجەی کەروێشکێ دە غارێ دا بنگێوێ!

هەموو تفەنگەکان باش بوون.

ـ ڕۆڵەکانم، دەبێ شتێکی ناخۆشتان پێ‌بڵێم. هەر ئێستا لە خوارەوەی ئەو دۆڵەی شێست کەس بۆسەیان بۆ داناوینەوە. پیاوی سوڵتانۆغلی‌یە زەردەن. ئەوان خۆیان حەشار داوە، چاوەڕوانمانن و دەیانەوێ خوێنمان برێژن. جوان تێ‌گەیشتن؟

حەمەدەکان وەڵامیان دایەوە:

ـ بەڵێ دەزانین. ئێمە ئەوانمان دیتوە و تەنانەت دەزانین لە کوێش دامەزراون.

مەلافەرهاد بانگی تەیموری کرد:

ـ تەیمور گیان، ئەتۆ هەموو ئەو حەمەدانە دەبەی و ئەو دۆڵەی ئەوبەری دەگری. هەر دیتتانن، تەقەیان لێ‌بکەن. دەستیان لێ‌مەپارێزن و بەزەییتان پێ‌یان دا نەیە. نابێ یەکێکیش لەو بێ‌تەقلانە کە دەیانەوێ خۆیان بۆ ئاغاکەیان بە کوشت دەن، ڕزگار بێ. ئەوە ئیدی ژاندەرمە نین بڵێین ناچارن بە دەستووری فەرماندەرەکەیان بجوولێنەوە، بەڵکوو بەکرێگیراوی سوڵتانۆغلێن!

ـ فەرمانت لە سەرچاوان مەلا فەرهاد. بە قەوەتێ خودای نایەڵین یەکیان دەرچێ.

بوونە دوو دەستە و لە نێو داران دا ون بوون. مەلا فەرهاد ئێرە وەك بەری دەستی خۆی بەڵەد بوو. باسکێکیان لەگەڵ پیاوەکانی سوڵتانۆغلی بەین بوو و سەری باسکەکەی گابەردی گەورەی لێ‌بوون. هێرشکەرەکان لە دۆڵەکەی ئەو دیوی دا خۆیان حەشار دابوو و چاوەڕوانیان بوون.

ـ قاسم، خۆ دەزانی نابێ یەك کەسیشیان بە ساغی بچێتەوە!

ـ بەڵێ دەزانم، یەك کەسیان نابێ دەرچێ!

ـ ئەمن لە سولّتانۆغلی توورە نیم، ئەو سولّتانۆغلی‌یە، تایبەتمەندیی خۆی هەیە و ناگۆڕێ. زاڵمە، خوێنخۆرە و هاریشە. ئەمن دەمەوێ ئەو سەگانە بکوژم، کە پاسی وی دەکەن، ئەوانەی ئامادەن لە بەرامبەر بڕە دەستخۆشانەیەکی سولّتانۆغلی دا، سەری دۆست و جیرانی خۆیان ببڕن. ئەوانە لە سولّتانۆغلی ملۆزمترن و وڵاتەکەش زیاتر تێکدەدەن! ئەگەر ئێستا سولّتانۆغلیم لێرە بۆ هەڵکەوتبایە، نەمدەکوشت، بەڵام تۆسقاڵێکیش بەزەییم بەو سەگانە دا نایە، کە دەوری وی‌یان گرتوە، دەی‌پارێزن و لاقی خەڵکی بۆ دەگرن. خودا پشت و پەنای ئێمەیە. خودا هەرگیز لە گەڵ ئەوانە نیە کە دەبنە داردەستی دەستی ستەمکاری.

ـ هیوادارم یەکێکیشیان دەرنەچێ.

ـ نەخێر نابێ ئەو خوێری‌یانە کە ئامادەن خۆیان بە قوربانی سولّتانۆغلی بکەن، یەکێکیشیان دەرچێ.

هەردووکیان دەستیان بەرەو ئاسمان بەرز کردەوە و گوتیان:

ـ ئیشاڵڵا!

مەلا فەرهاد هاوڕێیانی خۆی لە نێو گابەردەکانی پشتی دوژمن دامەزراند. بەو شێوەیە پیاوەکانی سولّتانۆغلی گەمارۆ دەدران و ڕێگای دەربازبوونیان دەگیرا. بۆخۆی لە گەڵ قاسمی لە پشت پۆلەبەردێکی بەرز مەتەرێزیان گرت. دەوری بەردەکان پڕ بوو لە پنچك و بن پنچکەکان وەنەوشەی لێ‌شین ببوو.

قاسم بە خۆشحاڵی‌یەوە گوتی:

ـ بڕوانە، بڕوانە مەلا فەرهاد ئەو هەمووە وەنەوشەیەی. بۆنی وەنەوشەی دنیای پڕ کردوە مەلا فەرهاد!

هێشتا ئەو وتەیەی بە تەواوی لە زاری نەهاتبووە دەرێ، کە دەستەی حەمەدەکان لەوبەری ڕا دوژمنیان وەبەر دەسرێژان دا. گرمەی تفەنگان و ویزەی گوللان تێکەڵ بوو.

ـ یاڵڵا کوڕینە لێیان دەن!

قاسم بە تەڕدەستی سێرەی گرت و تەقەتەی کرد. ئەو کوڕە سەرەڕای تەڕدەستی، نەنگێوەی چاکیش بوو و گوللەی بە فیڕۆ نەدەچوو. مەلا فەرهادیش بە ڕقەوە پەلەپیتکەی دەکێشا و لەگەڵ هەر گوللەیەکی کە دەی‌تەقاند، بە هەموو هێزی خۆشی‌یەوە بە سەر هێرشکەران دا دەی‌گوڕاند.

# (٩)

حەمەد ئەو پۆلە پنگەیەی شەوی یەکەمی هاتنیان لە نێو خڕەکەی دیتبوونی، لە بیر نەدەچوو. کاتێك منداڵ بوو، دایکی سەرینەکانی پڕدەکرد لە گوڵی گەسکەسپیلکەی، پنگە، جاترە کێویلە و ڕیحانە و نەعنەشی دەبن دۆشەگەکان دەنا. حەمەد لە سەر نوێن و بانێکی ئاوا دەخەوت و هەموو ئەو بۆنە خۆشانەی بۆ دەهاتن، کاتێکیش ڕۆژ دەبۆوە، دایکی تەندووری هەڵدەکرد و ئەو بۆنانە لە گەڵ بۆنی ئاگرەکەی تێکەڵ دەبوون. حەمەد لە جێگایە نەدەهاتە دەر و لە حاڵێك دا ئەو بۆنە خۆشانەی بۆ دەهاتن، چاوی لە میچی خانووەکەی دەکرد کە بە شەبەقی گڕی ئاگرەکەی ڕووناك دەبوو و پاشان بۆنی ئیشتیابزوێنی ڕۆنی کەرەشی بۆ دەهات، کە دایکی لە سەر تەندوورەکەی دەیقرچاند و ماشێنەی پێ لێدەنا.

یەکەم جار کە وەدەرکەوت، یەکسەر بەو خڕەی دا، کە پێشتر چۆم بوو و ئێستا ئیشك ببوو، ڕۆیی و چووە قەراغ دەریایە. بەهاری چوکووڕاویە دەتگوت ڕەنگەکانی تێدا تەقیونەوە. هەموو نەوعە گوڵێك، لە گەڵ شیناوەرد، مێشومەگەز و پەپوولەی جۆراوجۆر تێکەڵی یەکتر ببوون. دەتگوت دار، گوڵ و گیای ئێرە لە پێش دا چرۆ ناکەن، بەڵکوو یەکجێ دەتەقنەوە و لە عەرزی دێنە دەر.

کاتێك حەمەد گەیشتە دەریایە، لە سەر تەپۆڵکەیەکی بچکۆلە کە پۆلە پنگەکەی لە پەنا بوو، دانیشت. دەریا ئەوسەری دیار نەبوو و ئاوەکەشی بە تەواوی ڕوون بوو. تا چاو بڕی دەکرد، سەر دەریاکە شین دەچوو و بۆنی سوێریی ئاوەکەی لە گەڵ بۆنی پنگی تێکەڵ دەبوو. حەمەد بە دیتنی پنگەکان لە نێزیك دەریاکەی کەیفخۆش بوو و لە خۆوە هەستی بە جۆرێك هێمنایەتی دەکرد. دەتگوت لە خۆشی‌یان باڵی لێڕواون و ڕۆژ، عەرد، گوڵەکان و بۆنەکان لە پێش چاوی دەسووڕان.

ئەو ڕۆژە ئەو بێ ئەوەی بیر لە شتێك، یان كەسێكی بكاتەوە، هەتا ئێواری لە وێ مایەوە و دە شینایی بێسنووری دەریایەوە ڕاما. تەنانەت سەیران، دایە حۆری، یان مەلا فەرهادیشی بە بیر دا نەهات. هەموو شتێكی نێو سروشتی دەدی. سەرنجی دەچووە سەر یەك بە یەكی دارەكان، باڵندەكان، شارەمێرووەكان، كونە زەرگەتەكان، بەردەكان، كانی‌یەكان، جۆگەوبەرەكان و شتەكانی دیكە. هەموو بۆنەكانی لێكدەكردنەوە. دەیزانی ئەوە كام باڵندەیە و ئەمە چ گیایەكە. كاتێك لە جەنگەی نیوەشەوێ دا بە ڕێگایەكی دا دەڕۆیی، بە نێو دارستانێكی دا تێدەپەڕی، یان بە سەر گۆڕاییی‌یەكی دا ڕادەبرد، دەیزانی چ گیایەكی دەوروبەری هەروا خۆڕسك شین بووە و چ شینایی‌یەكیش داچناوە. بۆنی شاخی شتێكی دیكە بوو و دیارە ئی چوكووراوایەش تایبەت بوو: هەروەك ڕەوەزەكانی شاخی، بۆنی دەشت و دارستانەكانیش جیاواز بوو. هەروەها لە چوكووراوایە، بۆنی ڕۆخەكانی دەریایە، ئی عەرزەكەی، ئی دێهاتەكەی و ئی شارەكانیشی جیاواز بوو. گیای قەراغ دەریایە بۆنی تایبەتیی خۆی هەیە و پرتەقاڵ و لیمۆ و نارنجەكانیشی هەروەتر. تا لە دەریایە دوورتر كەوی‌یەوە، ئاڵوگۆڕی بۆنەكان زۆرترە. هەر بەو شێوەیە هێلانەی باڵندەكانی قەراغ دەریایەش وەك هێلانەی ئەو باڵندانە ناچن كە لە دەشتێ و لە دەوروبەری شار و گوندەكانن. لێرە لە لێواری دەریایە تەنانەت ئەو تەسكە مژەش كە بە سەر عەرزی ڕۆخەكانەوە دەبینرێ و هەورەكانیش، جیاوازن.

ڕاست كاتی زەردەپەڕێ حەمەد لە جێی خۆی هەستا. هەورەكانی لای ڕۆژاوایە ڕەنگیان گۆڕیبوو، سەرەتا لە سوورێكی گەشەوە بەرەو شینێكی تاریك چووبوون و ئێستاش وا دەدرەوشانەوە، دەتگوت زێڕن و زێویان دە قەراغ گیراوە. ئاسۆ هەزار ڕەنگی پێوە دیار بوو و خۆر كە لە ڕەنگێكی سووری تۆخ دا خۆی دەنواند، وردە وردە بەرەو ئاوابوون دەچوو و شۆڕ دەبۆوە نێو دەریایە.

كاتێك وەرسووڕایەوە، دیتی. كابرا لە دەم خڕەكەی ڕاوەستابوو، باسكی تێكبەزاندبوون و ڕووی دە ڕۆژاوایە كردبوو، سێبەرەكەی درێژ ببۆوە و كەوتبوە سەر بەستێنە بەردینەكەی خڕێ و پنچكەكانی بەرپاڵی لای كابرای، كە لە گوڵی ڕەنگ بنەوشی دا نوقم ببوون. حەمەد هەستی بە دڵەكوتەیەكی توند كرد، چی وای نەمابوو لە هۆش بچێ و بكەوێتە عەرزی، بەڵام لەو كاتەی دا بۆنی پنگی بۆ هات، بۆنەكە وشیاری كردەوە و هێنایەوەسەرحاڵ. بیری كردەوە:" ئێستا ئیدی دەستم وێی ڕادەگا و دەبێ بزانم ئەوە كێیە كە ئاوا وەدوای من دەكەوێ". بە تەردەستی، وەك چۆن تیر لە كەوانی دەبێتەوە، غاری دا پێش كابرای، گەیشتە پەنای و دەستی بۆ لای درێژ كرد، بۆ

ئەوەی دەستی دەگەڵ لێداتەوە و چاك و خۆشیی دەگەڵ بکا، بەڵام دەستی چوو دە بەتاڵاییەوە و هیچی وەبەر دەستی نەهات. دەمودەست پیاوەکە ون بوو، دەتگوت عەرز قەڵشی و کابرای قووت دا. حەمەد چاوی بە هەموو لایەکی دا گێڕا، بەڵام نەیدۆزییەوە. بڵێی ئەوە هەر خەیاڵ بوویێ؟! چووە قەراغ دەریایە. ڕۆژ تەنیا بە قەدەر دەورییەکی بچووکی سووری لێمابۆوە و کێوەکان، هەورەکان و ئاسۆش هەمووی هەر سوور دەچوون. ئەو جار زریانێکی نەرم هەڵیکردێ و کۆمەڵێك شەپۆلی بچووك کەوتنە سەر دەریایە. حەمەد سەری هەڵێنا و زۆر دوورتری ڕوانی. سەری گاورکۆی چاو پێکەوت، لووتکەی ئەو چیایەی ئێستاش ڕووناك بوو. لە نێو باغەکان دا گوڵە پرتەقاڵ و لیمۆ لە سەرەخۆ بە دەم باوە ڕادەژان. کاتێك حەمەد لە لای گوندی ڕوانی، چاوی بە کابرای کەوتەوە، کە لە ژێر دارێکی دانیشتبوو. دارەکە پڕ بە لکەکانی گوڵی سپیی دەرکردبوو. بە شێوەی ئاسایی نێو دارەکەی و دەوروبەری دارەکەی پڕ بوو لە مێش و زەرگەتە و هازوهووزیان لە دوورەوە دەهات. کابرا سەرتاپێ جلی ڕەشی دەبەر دابوو. حەمەد هەستی کرد دەیناسێ، دەزانێ کێیە و تەنانەت جارێکی قسەشی لە گەڵ کردوە. بە ڕاستی دەبێ کێ بێ؟ چیی لە من دەوێ؟ دیسان حەمەد بە ڕاکردن چوو بۆ لای. سەرەتا کابرا نەبزووت، بەڵام دواتر خۆی لە پشت دارەکەی شاردەوە. بە دەوری دارەکەی دا سووڕان و تەنانەت حەمەد سێ جاران دەستی گەیاندێ و باسکی گرت، بەڵام هەرسێك جاران خۆی لە دەستی ڕاپسکاند و دەرچوو. گرمەیەکی سەیر لە دەوری دارەکەی دەهات، دەتگوت بە میلیۆن مێش لەو دارەی ئاڵاون. بۆنی گوڵی دار نارنجەکەی زۆر توند و مەستی هێنەر بوو. کابرا ئارەقەی کرد و حەمەد بۆنی ئەو ئارەقەشی دەناسییەوە. حەمەد جارێکی دیکەش داهاتە کابرای، بەڵام بۆی نەگیرا و لە دەستی دەرچوو، سەرەنجام بە تەنێ مایەوە و ناچار ماندوو و شەکەت، لە بن دارەکەی دانیشت. ئیدی لە گرتنی کابرای هیوابڕاو ببوو. بیری کردەوە: " ئاخ! بریا دەمانچەکەم پێیا، نەمدەکوشت، هەر گوللەیەکم لە لاقی دەدا، نەم دەهێشت چی دی لە دەستم دەرچێ و دەمگرت".

سەری لەو شتەی سوڕ مابوو: ئاخر ئەو پیاوە کێیە، وەك کەسێکی ناسیاو دەچێ؟ ئەگەر ناسیاوە، لە کوێم دیوە و کەنگێم دیوە؟ دەڵێی بە بێ وەی بزانم کێیە، ئۆگرییەکی تەماوییشم پێی هەیە. بڵێی جندۆکە بێ؟ دێو بێ؟ چیی لە من دەوێ ئاخر؟ کەسێکە لێی دەترسم و ناوێرم بیدرکێنم؟ لە دڵی خۆی دا گوتی قەرار بێ تازە بێچەك وەدەرنەکەوم. هەر لەو کاتە دا سەری کابرای لە نێوەڕاستی خرێکی و لە نێو پۆلێك کەرتەشی لێوەدەرکەوت. حەمەد زۆر تووڕە بوو، ددانی دەچیڕەوە برد و غاری دایە، بەڵام پیاوەکە لە بەردەستی هەڵات و چوو دە باغێکییەوە. هێندەی پێنەچوو دیسان لە شوێنێکی خوارەوەتر، لە نێو دڕووە کەرتەشییان و لە نێوەڕاستی خرێ، سەری

قوتکردەوە. کابرا دەستی هەڵنەدەگرت. جاری وا بوو هێندەی لیٚدەهاتە پێشیٚ، کە حەمەد پێیوا بوو ئیدی ئەوجارەیان دەستی دەیگاتیٚ و دەیگریٚ، بەڵام کە حەمەد تاوی دەدایە، لە بەرپێیانی دەردەپەڕی و دوور دەکەوتەوە.

حەمەد دەیتوانی چەند سەعات غار دا و هەروەها چەند ڕۆژان بە دوای یەکدا ڕێگا ببڕی، ئەمڕۆش ماوەیەکی زۆر بە دوای ئەو کابرایەی دا ڕایکرد و ئاخرەکەی ئەوەندە ماندوو بوو کە پشووی سوار بوو و وازی ڕاکردنێی نەما. کابراش ئەو جار دەهاتە پێشی، سەبر دەڕۆیی و کاتێك حەمەد ئەوەندەی لیٚنێزیك دەبۆوە کە دەستی بیگاتیٚ، دەردەپەڕی و وا خێرا هەڵدەهات، کە حەمەد هەر تۆزیشی نەدەشکاند. ئەو جار تاریك داهات و ئیدی حەمەد تارمایی کابراشی بە زەحمەت دەدی. کاتێك لە دێی نێزیك بوونەوە، کابرا هەنگاوی شل کرد و حەمەد ئەوەندەی لیٚنێزیك بۆوە، کە پێی وا بوو ئەو جار لە دەستی دەرناچیٚ، بەڵام کاتێك دەستی درێژ کرد کە بیگریٚ، خوشی و لە پێش چاو ون بوو. حەمەد بیری کردەوە: نەخێر ئەوە نابیٚ ئینسان بیٚ، یان جندۆکەیە، یان دێوەزمەیە، یان شوانهەڵخەڵەتێنەیە، ئەو باڵندەیەی شوانان هەڵدەخەڵەتێنی! کاتێك گەیشتە نێو گوندی، شەکەت ببوو. تازە خواردنی شەوێیان دانابوو و چاوەڕوانی وی بوون. کە چووە ژووریٚ، مەلا سەلام چاکوخۆشیی لەگەڵ کرد و گوتی:

ـ ئەوە لە کویٚ بووی برا؟ وردە وردە بۆت نیگەران دەبووم! وەرە دانیشە بزانم، دەڵێی زۆر ماندووی!

حەمەد هەوڵی دا بە بزەیەکەوە وەڵام بداتەوە:

ـ وەڵڵاهی چووبوومە لای دەریایە مامۆستا!

هەموویان لە دەوری مەجومعە گەورەکەی کۆ بوونەوە و دەستیان بە خواردنیٚ کرد:

ـ ئەو دەریایە، عەرزی ئێرە و هەموو ئەو بۆنە خۆشانەی وڵاتی دادەگرن، مات و حەیرانتان دەکەن. لێرە ئینسان ڕاست وەك مارێکی کە توێژیٚ داویٚ، لە پێست دێتە دەر و دەچێتە جلدێکی نوێوە. لە ڕاستی دا کاتێك دەشت پڕ دەبیٚ لە گوڵە مێلاقە، کاتێك دار نارنجەکان گوڵ دەکەن و نێو دارەکان پڕ دەبیٚ لە مێشومەگەز، کاتێك با بە بۆنی پنگ و جاترە کێویلەیەوە لە لای شاخی ڕا دیٚ، کاتێك ڕۆژ لە ئاسۆ سەر وەدەردەنیٚ و دەریای بیٚسنوور تا چاو بڕ دەکا، وەك ئاوێنەیەکی ڕوون دەنوێنیٚ، کاتێك بۆنی دەریایە وڵاتی پڕ دەکا، مرۆڤ تووشی سەرەگێژە دەبیٚ... بەڵام شتێك نیە، ئەوە بە سەر دەچیٚ حەمەد، زۆری پیٚناچیٚ ڕادێی...

حەمەد دووپاتی کردەوە:

ـ بەڵێ کاتێك پیاو بۆنی پنگ و جاترەکێویلەی بۆ دێ...

بە قسەکانی مەلا سەلامی هێندێکی سوکنایی هاتێ. دەستیان کرد بە نانخواردنێ، هەموویان زۆر برسی بوون. مەلا سەلام پێکەنی و بە گاڵتە گوتی:

ـ بەڵێ، کاتێك پیاو ئاوا برسی بێ ...

ـ بەڵێ، بەڵێ، کاتێك چێشتەکەش ئەو بۆنە خۆشەی لێبێ.

لە کاتی نانخواردنێ دا حەمەد هەستی کرد تا ڕادەیەکی باش هاتۆتەوە سەرحاڵ، ئەو جار ڕوخساری کرایەوە و چاوەکانی گەش بوونەوە. مەلا سەلام هەستی بەو ئاڵوگۆڕە لە حەمەدی دا کرد و زۆر خۆشحاڵ بوو. دوای نانخواردنێ ڕووی دە حەمەدی کرد و گوتی:

ـ ڕۆڵە حەمەد، لێم مەپرسە ئەمرۆ چم کردوە، بەڵام هەواڵێکی خۆشم بۆ تۆ پێیە.

ـ دەی مامۆستا پێم بڵێ، بزانم چییە؟

ـ خانوویەکم بۆ دیوییەوە. خانووەکە لە نێوەڕاستی باغێکی پرتەقاڵ، لیمۆ و نارنجی دایە و ڕەنگی دیوارەکانیشی سپییە، کۆتری سپی چۆنە، ڕاست ئەو ڕەنگەیە.

ـ خودا ڕاوەستاوت کا!

بەو هەواڵەی حەمەد شاگەشکە بوو، لە مەلا سەلامی چووە پێشێ و گوتی:

ـ کەوابوو سبەینێ دەچین؟

ـ بەڵێ سبەینێ دەچین و چاوی لێدەکەین.

ئەوێشەوێ حەمەد چاوی لە سەر یەك دانەنا. تاریك وڕوونی بەیانی هەستا و چووە نهۆمی خوارێ. بۆ ئەوەی کەس وەخەبەر نەیە، کەوشەکانی بە دەستەوە گرت و هەروا بە پێخواسی لە پلیکانەکان چووە خوارێ، وەك مشکی بێدەنگ خزییە خوارێ و لەوێ لە سەر کورسییەکی دانیشت و چاوەڕوان مایەوە، تا وڵات ڕووناك بێ و مەلا سەلام لە خەوێ هەستێ. بە پەنجەرەی دا، کە کرابۆوە، سەری گاورکۆی دوور دوور لێ دیار بوو و حەمەد دەیڕوانی بزانێ کەنگێ سەری ئەو کێوەی ڕووناك دەبێ و ڕۆژ دەبێتەوە. جار جار هەڵدەستا، گەڕێك بە نێو ژوورێ دا دەگەڕا و بە پەنجەرەی دا چاوی دەبرییە سەری کێوەکەی. دەتگوت قەت جارێکی دیکە وڵات ڕووناك نابێ و ڕۆژ سەر وەدەرنانێتەوە. بیری کردەوە: ئەرێ ئەو مەلا سەلامە بۆ هێندە دەخەوێ؟ وا دیارە ئەمرۆ هەر وەخەبەر نایە. هات دانیشتەوە، بەڵام ئۆقرەی نەگرت و دیسان هەستایەوە و بە نێو ژوورێ دا دەستی بە خولانەوەی کرد. وردە وردە هاتبوو سپیادی بدا، بەڵام هێشتا تاریکی بە سەر ڕووناکی دا زاڵ بوو. حەمەد بۆنی گوڵە پرتەقاڵی بۆ هات.

داڕپرتەقاڵێك لە دەرێ لە تەنیشت پەنجەرەی شین ببوو، لکێکی هاتبووە بەر پەنجەرەکەی و بۆنەکە لە گوڵەکانی ئەو لکە دارەی ڕا دەهات. حەمەد چووە حەساریێ. گیا ئاونگی لە سەر کەوتبوو. ئاونگەکە سارد بوو و هەستی کرد لاقەکانی هێندێك سڕ بوون. لە حەسارەکەی دا دەگەڕا و بۆنی لکە داڕپرتەقاڵەکانی دەکرد، کە دە گوڵێ دا خەملابوون. کاتێك ڕووناکی سەری کێوەکانی بە تەواوی سپی کردەوە، لە بن پێرە داڕپرتەقاڵێکی دانیشت و چاوی بڕییە پەنجەرەی ژوورەخەوی مەلا سەلامی. هێشتا هیچ باس نەبوو. لە گەڵ ڕووناکی کە بە نەرمی هەر دەهات و زیادی دەکرد، شنەبایەکی نەرمیش هەڵیکردێ. بۆنی خۆش لە هەموو لایەکی ڕا دەهات. حەمەد هەستی بە دڵخۆشی‌یەکی زۆر کرد. دەتگوت باڵێ لێ‌دەڕوێن. هەستا بە نێو حەسارەکەی دا ڕای کرد. ڕۆژ لە پشت شاخی سەری وەدەرنا و لە دەشتێی دا. سێبەرەکان لەو کاتەی دا زۆر درێژ دەبوونەوە. مێشومەگەز دەنێو لکە دار پرتەقاڵان دا خەوتبوون و هێشتا دەستیان بە جموجۆڵ نەکردبوو. لە پەنا دیواری دەوری حەساریێ گوڵی وردی شینکەڵە لە سەرەخۆ دەپشکووتن، سەرنجی خاڵخاڵۆکانیان بۆ لای خۆیان ڕادەکێشا و ئەوەش بۆ وی وەك موعجیزەیەك دەچوو، کە بە چاوی خۆی دەی‌دی. کۆمەڵێك مێروولە لە کونەکەیان هاتبوونەدەر و سەریان لە لەشی خۆیان دەسوو. هەموو ڕیشەکان، گەڵا وردەکان بە پەپوولەکانەوە کە هێشتاش خەوتبوون و باڵەکانیان کە لە بەر تیشکی ڕۆژێ دەبریقایەوە، وێکهاتبوون، عەرز، مێشومەگەز و تۆوی گیایان کە دەگووران و دنیا کە بە هەموو سامان و خێر و بەرەکەتی خۆیەوە خەریك بوو چاوی هەڵدێنا و دەژیایەوە... حەمەد هەمووی لە بەرچاوی بوون. دەنگێك وە ئاگای هێنا، دەنگی مەلا سەلامی:

ـ ئەوە لە کوێی حەمەد؟

بەودەنگە بە هێزەی وەخۆ هاتەوە و غاری دا لای دەرکێ:

ـ لە حەساریێ بووم ...

ـ ڕۆڵە ئەتۆ شەوی ئەوشۆ نەنوستووی! وا نیە؟

لە ژووریێ، سفرەیان ڕاخستبوو. ماشێنە، نەعنە، ڕۆنی کەرە و هێندێك پێخۆری دیکە لە گەڵ نانی داندرابوون. ماشێنەکە هەڵمی لێ‌هەڵدەستا. حەمەد بە پەلە نانەکەی خوارد و کشایەوە.

ـ حەمەد، ڕۆڵە، لە سەرەخۆ بە! خۆ من هێشتا دوو کەوچکم لەو چێشتەی نەخواردوە.

ـ بمبوورە مامۆستا...

ئەو جار مەلا سەلامیش پەلەی کرد، تەنیا چێشتە ماشێنەکەی خوارد و هەستایە سەرپێ و گوتی:
ـ خانووەکە دوور نیە، ئەوەتا لێرە، لەو تەنیشتەمانە، پێموایە پێویست ناکا بە سواری بچین؟
ـ نەخێر، با هەروا بە پێیان بچین...

لە حەساریٚ چوونە دەریٚ. کەیفخۆشیی حەمەدۆکی کاری لە مەلا عەبدوسسەلامیش کردبوو و ئەویش بە پەلە هەنگاوی هەڵدێنایەوە. لە پێش دا ڕێگاکە تووڵەڕێیەك بوو، لە هەردووك لای ڕا دارەمێو بە سەر یەك دا هاتبوونەوە و وایان سەر لێكدا بوو پیاو بە زەحمەت دە ڕێگاکەیەوە دەچوو. دیواری باغەکان بە بەردان دروست کرابوون. بەردەکان بە قەد سەری ئینسانێکی دەبوون، لە هێندێك شوێن کەوتبوونە سەر یەك و دیوارەکە وە سەر ئیشکەبەردی گەڕابوو. پاشان گەیشتنە شوێنێکی کە ڕیگاکە بە نێو سپیداران دا تیٚدەپەڕی و سەرەنجام مەلا سەلام لە بەر دەرگایەکی داری گەورە ڕاوەستا. دەرگاکە لە هێندێك شوێن قەڵشی دابوو. مەلا سەلام ناڵقەڕێزی دەرگاکەی گرت و لە دەرگای دا. هێندەی پیٚنەچوو دەنگی پیٚیان لەو دیوی ڕا هات. حەمەد زاری وشك ببوو و هەموو گیانی دەلەرزی. ژنێکی گەڕاوەوەی چاوشین کە لەچکەیەکی سپیی بە سەرەوە بوو، دەرگای کردەوە و فەرمووی کردن بچنە ژووریٚ. کاتێك ژنەکە دەدوا، نیشانەی دیالێکتی یۆنانیی بە ناخاوتنیيەوە دیار بوو.

مەلا سەلام وەپێش کەوت. لە نێو حەسارەکەی بەرەو دەرگای ژووریٚ باریکەڕێیەکیان لە بەردی سپی دروست کردبوو. خانووەکە دوونهۆم بوو و هەموو دار و دیواری سپی بوون. حەساری خانووەکەی گەورە بوو و بێجگە لە دارپرتەقاڵ، لیمۆ و نارنج، هەناریشی تیٚدا بوو. لە هەردووك لای باریکەڕێیەکەی دارەمێوی گەورە داریان وەبەر درابوو و هەڵچووبوون. دارمێوەکان دە گوڵیٚ دا بوون و قەراغی ڕێیەکەش هەمووی بە ڕیز گوڵی لیٚ چەقابوو. چوونە ژووریٚ. نهۆمی خواریٚ لە دارێکی سپیی جوان دروست کرابوو. تەواوی خانووەکەی بە باشی خاوێن کرابۆوە و بە دەرمانیش تۆزت پێوە نەدەدی. خانووەکە هەمووی بۆنی جیوە و سابوونی بۆنخۆشی لیٚدەهات. قاتی سەریٚ لە ژوورێکی گەورەی دانیشتنیٚ و سیٚ ژوورەخەوان پێكهاتبوو. هەیوانێکیشی بە سەرەوە بوو، هەیوانەکەی دەیڕوانیيە دەریایە و هەر لەو کاتەش دا شیبایەکی نەرم هات. قاتی خوارێش ژوورێکی گەورەی دانیشتنیٚ و چوار دیوی بچووکتری هەبوو. دیوێکیان کرابووە چێشتخانە و یەکیان کرابووە حەمام. چێشتخانەکە ناورگێك لە بەردی مەڕمەڕی خالیسی لیٚ دروستکرابوو. کە چوونە نێو حەمامەکەش، حەمەد زۆری نەمابوو بیٚهۆش بیٚ:

ـ ئەو پیاوە خوالیخۆشبووەی من، کەیفی بە حەمامێکی دەهات، کە زۆر ڕێك و پێك و خاوێن بێ. نازانم لە کوێ ئەو بەردە مەڕمەڕانەی بۆ هێنابوو، بەڵام ئەو مەڕمەڕە سەوزانە کە حەوزەکەیان پێ دروست کراوە، لە گەڵ لوولەکان، هەمووی لە ئەستەمبووڵێ ڕا بۆ هاتبوون. ئاوەکەش بە ئاگری ئەو ئاورگەی گەرم دادێ، بەڵام دووکەڵەکە نایەتەوە نێو حەمامی. بە ڕەحمەت بێ مێردەکەم زۆری دڵ بەو خانووەیەوە بوو.

لە حەمامەکەی هاتنەدەر. ژنەکە چوو لە چێشتخانەکەی قاوەی دروست کا. حەمەد کە لە تاوان هەموو گیانی دەلەرزی، هەردووك دەستی دە باسکی مەلا سەلامی وەرێنا و گوتی:

ـ ئەو خانووەی دەکڕین، وا نیە!

ـ با، بۆ نایکڕین.

ـ یانی هەر ئەمڕۆ بۆم دەکڕی؟

کاتی خۆی ئەو ژنە لە گەڵ پیاوەکەی و زۆر خەڵکی دیکەش لە "کرێتا"ی ڕا هەڵاتبوون، هاتبوون و لێرە نیشتەجێ ببوون. دەوڵەت لەو شوێنەی عەرزی دابوونێ. کابرا دانەوێڵە و عەرابەی دەفرۆشتن، کاسبی‌یەکی باشی هەبوو، ئۆگریی زۆریشی بە خانووەکەی بوو و چاکی پێڕادەگەیشت. پووڵ و سامانێکی زۆری بۆ ئەو ژنە و دوو کچی بە جێ‌هێشتبوو. ئەوانە خزمیان لە ئەستەمبووڵێ هەبوو و هەردووك کچەکان لە وێ لە ماڵی خزمەکانیان دەژیان. ئەو ژنە بە تەنێ مابۆوە و خودا خودای بوو یەکێك پەیدا بێ، خانووەکەی پێ‌بفرۆشێ، بۆخۆشی بڕواتە لای کچەکانی و بە یەکجاری لە وێ بمێنێتەوە. دەکرا بڵێی پێی خۆش بوو هەرچۆنێك بێ، خانووەکەی لە کۆڵ بێتەوە و زۆریش دەربەستی ئەوەی نەبوو، نرخی خۆی دەکا، یان نا.

ژنەکە بە سینی‌یەکی زێوینەوە لە چێشتخانەی هاتەوە دەر. فینجانەکان جوان بوون، قاوەکە دەو فینجانانە دا عەترێکی خۆشی هەبوو کە حەسارەکەی پڕ کردبوو. کاتێك حەمەد ئەو بۆنەی بۆ هات، هەستێکی تایبەتی دایگرت، دەتگوت لەمێژە ئارەزووی ئەو بۆنەی دەکا و دوای تامەزرۆیی‌یەکی زۆر پێی‌گەیشتوە، قاوەکەی لە زاری نێزیك کردەوە، هێندە خۆش بوو هەر مەپرسە. ئەو قاوەیە تام و بۆنی قاوەیەکی دەدا، کە یەکەم جار لە ژیانی خۆی دا خواردبوویەوە. وەخت بوو لە خۆشی‌یان دڵی بتەقێ. لە وێ ڕا تەواوی دەریای نێوەڕاستی بەهەموو ڕەنگ، ترووسکانەوە و دیمەنەکانی‌یەوە لە پێش چاوان بوو. باڵندەیەکی زەرد خولێکی بە سەر سەری دا لێدا و بازنەیەکی زێڕی لە سەر دروست کرد. ڕووناکیی ڕۆژێ سەری پڕ کرد و نەختە ترووسکەکەی نێو چاوی ژیایەوە. مەلا عەبدوسسەلام بە ڕوونی هەستی بە ئاڵوگۆڕی سیمای حەمەدی کرد و لە دڵی خۆی دا گوتی: ئەوەی پێی دەڵێن حەمەدۆك، ئەمەیە!

ژنەکە فینجانەکانی خڕ کردنەوە، لە سەر سینی‌یەکەی دانان و چۆوە ژووریٚ.
حەمەد لە مەلا سەلامی پرسی:
ــ باشە لە سەر چی ڕاوەستاوی، بۆ نای‌کڕی؟
ــ جاریٚ دەڕۆین ...
ــ دەڕۆین؟
لە پڕیٚك حەمەد مات بوو: پیاوەکەی دویٚنیٚ، لە پشت دەرگای حەساریٚ، کە لە سەر پشتیٚ بوو، ڕاوەستابوو و تیٚیانەوە ڕامابوو. وەك ئەوەی وابوو حەمەدی بۆ دژکردەوەیەك هان بدا.
ــ دیتت؟
حەمەد ڕوخساری سپی هەڵگەڕابوو و لە بەر تووڕەیی‌یان هەموو گیانی دەلەرزی.
ــ ئەو کابرایەت دی؟
ــ بەڵیٚ دیتم، دەی جا؟
ــ ئەو پیاوەی لە پشت دەرگاکەی ڕاوەستابوو، ئەوت دی؟
ــ بەڵیٚ، بەڵی دیتم.
ــ ئەمن ئەو کابرایەم لە شوویٚنیٚکی دیتوە، هیچ گومانم لەوەی دا نیە.، بەڵام وەبیرم نایەتەوە ناوی چی‌یە و کیٚ‌یە. لە هەر شویٚنیٚك بم، ئەو کابرایە بە دوامەوە، بەڵام هەموو جاریٚش کە دەمەویٚ بی‌گرم، ون دەبیٚ.
حەمەد ئەو قسانەی زۆر بەپەلە کرد. ئەو جار گوتی:
ــ بریا دەمانچەم پیٚ‌با، یەکجیٚ گوللەیەکم لیٚ‌دەدا. بە ڕاستی سەرم لیٚ‌سوڕ دەمیٚنیٚ، هەر گاڵتەم پیٚ‌دەکا و ئازارم دەدا ...
بە بیٚ ئەوەی قسەکەی تەواو کا، ڕای کردە دەریٚ و بە دوای کابرای دا ڕۆیی. مەلا سەلام و ژنەکەش، کە هاتبۆوە دەریٚ، پیٚ‌یان سەیر بوو و کاتیٚك حەمەد ئاوا لە نەکاو دەرپەڕی و ڕای کردە کابرای، زۆریش ترسان، بەڵام کابرا پیٚش ئەوەی حەمەد لە دەرگایە بچیٚتە دەر، هەڵاتبوو.
حەمەد لە دووی نەبۆوە. بە سەر مۆرەدیواریٚکی دا بازی دا نیٚو باغیٚکی. لە دوورەوە کابرای دە نیٚو دانگەیەکی مەڕی دادی. دانگەکە بە چاڵووکان دەوری گیرابوو. حەمەد ویستی بە سەر پەرژینەکەی دا باز دا، بەڵام بە سەر چاڵووکەکان دا کەوت. دەو ماوەیەی دا کابرا گەیشتە میٚرگیٚکی و دواتریش بە نیٚو چەقڵەشینکان دا خۆی دە نیو پۆلەبی‌یەکی هاویشت، دەمیٚك دە ویٚ دا ون بوو و هیٚندەی پیٚ‌نەچوو لە نیٚو کەرتەشیجاریٚکی لە بەری ئەوبەری سەری

وەدەرنا. حەمەد هەر بە دوایەوە بوو، بەڵام قەت نەیدەگەیشتێ. دەموچاو، لاقولەتەر و شانوشەپیلکی هەموو پچڕپچڕ ببوون و خوێنیان لێ دەچۆڕا. هەموو لەشی وە سەر نارەقەی گەڕابوو. پیاوەکەش ئەو جار خۆی دە نێو پۆلەپنچکێکی چڕوپڕ ڕۆکرد و ون بوو. لکوپۆپی پنچکەکان وا تێکئبەزیبوون، بواری وەیان نەدەدا پیاو بچێتە نێویان و حەمەدیش هەرچەندی ڕوانی، کابرای وەپێش چاوی نەهاتەوە، ناچار دەستی لە ڕاونانی هەڵگرت و گەڕایەوە. بە هەناسە برکێ و لە حاڵێك دا دە نارەقەی دا شەڵاڵ ببوو، گەیشتەوە لای مەلا سەلامی. ئەو خوێنەی لە دەم و چاوی ڕا هاتبووە خوارێ، کراسەکەی سوور کردبوو.

ـ ئەرێ حەمەد ئەو پیاوە کێ بوو؟

ـ نازانم، هەرچی دەکەم نایناسمەوە، بەڵام دەزانم لە شوێنێکی دیتوومە.

ـ باشە ئەوە چت لێ بەسەرهاتووە؟

ـ دڕوان سەروسەکوتی‌یان داڕووشاندووم و خوێنەکەش هەر ئی وەیە.

ـ بڕوانە کراسەکەت هەمووی بەخوێنە!

ـ وەڵلاهی لە شوێنێکی دیتوومە، بەڵام بۆم ناچێتەوە سەریەك کە بزانم کێیە.

ـ نیگەرانی وەی مەبە، ئاخرەکەی وەبیرت دێتەوە.

ـ بەڵێ، بەڵام لە وەی دەترسم ... دەترسم لە وەختی نوستنێ دا بێ و بمکوژێ.

ـ مەترسە ئەوەش جێبەجێ دەکەین!

دڵدانەوەی مەلا سەلامی ورەی حەمەدی زیندوو کردەوە و هێور بۆوە.

مەلا سەلام گوتی:

ـ با بڕۆینەوە، ئەتۆ دەبێ جلەکانت بگۆڕی.

کاروباری کڕینی خانووەکەی بە سێ ڕۆژان کۆتایی هات و حەمەد قەباڵەکەی وەرگرت. مەلا عەبدوسسەلام پیاوێکی دەستڕۆیشتوو و خاوەنرێز بوو. کاری زوو لە بەر دەستی ڕادەپەڕی، هەموو دەرگایەکی بۆ دەکەوتە سەر پشتێ و بە قسەی دەکرا.

حەمەد هەر کە قەباڵەکەی وەرگرت، بە غار ڕۆیی بۆ لای بیوەژنەکەی. ژوورەکان بەتاڵ ببوون، ماڵەکە خاوێن کرابۆوە و هەموو شتێك ڕێکوپێك کرابوو. ژنەکە لە وێ بوو، خەمبار و نارەحەت، فرمێسکی دە چاوان گەڕابوو و هەر لەو حاڵەش دا بزەیەکی لە سەر لێوان بوو. دەستەکلیلێکی بۆ لای حەمەدی ڕاداشت:

ـ خێرێی لێ ببینی. هیوادارم دەو خانووەی دا بەختەوەر بی و بە خۆشی و سلامەتی بژی. ئێمە ژیانێکی خۆشمان تێدا ڕابوارد. خودا خێرت وەرێ بێنێ و ئیشاڵڵا تەمەنت درێژ بێ.

حەمەدکلیلەکانی وەرگرت. هێندێکیان تێوە ڕاما، دەتگوت نازانێ چی‌یان لێ‌بکا. پاشان بە بزەیەك لە سەر لێوانەوە چاوێکی لە ژنەکەی کرد و چۆوە حەسارێ. نەی دەزانی چ بکا. هێندەی نەمابوو لە خۆشی‌یان باڵ بگرێ. سەیرانی هاتە پێش چاوی، ئای چ ژنێکی جوانە، کە دەڕوا چەند شیرن هەنگاو هەڵدێنێتەوە، چەندە باریکە، بەژنی هەر دەڵێی لاولاوە. ئەو دوو قوولکانەی ڕوومەتی لە کاتی پێکەنینێ دا چەند جوانن. پاشان بیری لە دایك و بابی کردەوە و هەروەها لە خەجیجێش. دایە حۆریی هاتە پێش چاوی کە هەردووك دەستی بە پشتی‌یەوە گرتبوو، هاتە نێو حەسارەکەی، چاوی لە خانووەکەی کرد و پاشان بە خۆشحاڵی‌یەکی زۆرەوە ڕووی بۆ لای وی وەرگێڕا.

حەمەد بە حەسارەکەی دا گەڕا. یەك بە یەك دار و بەرد و تەنانەت چڵ بە چڵی گیای نێو ئەو حەسارەی بە سەر کردەوە. کاتێك چاوی بە چالاوێکی کەوت، کە بەردی مەڕمەڕی دە سەری گیرابوو، لە خۆشی‌یان قیژاندی. لە دڵی خۆی دا گوتی دەبێ ترومپایەکی دەو چالاوەی گرم، دەنا سەیران ماندوو دەبێ.

لە پڕ هەستی کرد وردە وردە وڵات بەرەو تاریکبوون دەچێ و زۆریشی برسی‌یە. ماوەیەکی دیکەش دە خانووەکەیەوە ڕاما کە ئەوەندە سپی بوو، لە بوولێڵەی دا دەترووسکایەوە. کزە بایەکی بەهاریی لاوێنەرەوە بە بۆنی لیمۆیەوە هات.

بەیانیی زووی ڕۆژی دواتر لە جێگایە دەرپەڕی. هێشتا سەری گاورکۆی بە تەواوی ڕووناك نەببوو. خێرا جلەکانی دەبەر کرد و چوو بۆ لای ماڵەکەی. کاتێك دەرگای کردەوە، چاوی بە پیرێژنەکەی کەوت کە هەروا بە دانیشتنەوە پاڵی وە هەمان داری دا بوو، کە دوێنێ کاتێك حەمەد لە وێ ڕۆیی لە بنی دانیشتبوو و خەوی لێ‌کەوتبوو. بە ئەسپایی، بۆ ئەوەی ژنەکە وەخەبەر نەیە، خۆی گەیاندە سەر پلیکانەکان کە سێ ڕیز بوون و لە بەردی مەڕمەڕ بوون. لەوێ لە سەر پلیکانەکان دانیشت و چاوەڕێی خۆرهەڵاتن بوو. پێش تاوهەڵاتێ باڵندان وەخەبەر هاتن و لە حاڵێك دا لەو داری بۆو داری هەڵدەفڕین، دەیانخوێند. هەموو حەسارەکانی دەوروبەریش هەر بەو شێوەیە بوون و دەنگی باڵندانیان لێوە دەهات. کاتێك ڕۆژ سەری وەدەرنا، شنەبایەکی دڵبزوێن هات و بۆنی خۆشی جۆراوجۆری لە گەڵ خۆی هێنان.

لە نەکاو حەمەد پیرێژنەکەی وەبیرهاتەوە و بە پەلە چوو بۆ لای. ئێستا ئەو وەخەبەر هاتبوو و پڕ بە چاوانی دە خانووەکەیەوە ڕامابوو. کە حەمەدی دی، بزەی هاتێ، بەڵام خۆی نەبزاوت. حەمەد چوو لە بەرامبەری دانیشت. هەردووکیان بێ ئەوەی یەك وشەشیان لە زاری بێتە دەر، هەتا نیوەڕۆیە، ئەو کاتەی ڕۆژ گەیشتە نێوەڕاستی ئاسمانێ، بەو شێوەیە مانەوە.

جەنگەی نیوەڕۆیە لە پێش دا حەمەد هەستا، سێبەرەکەی لە بەرپێیانی واوەتر نەدەچوو، داهاتەوە و کلیلەکانی دە نێو دەستی ژنەکەی نا.

ـ هەتا دەڕۆی لێرە بخەوە و با کلیلەکانیش هەر بە تۆ بن خوشکی گەورەم! جاریّ دایکم و خێزانم نە گەیشتوونیّ و ئەمن پێویستم بە خانووەکەی نیە.

ـ نانا، کاکە گیان، ئەمن لە ماڵی جیرانێکیم. چت لیٚوەشێرم، ئەمشۆ هەرچی کردم خەوم لیٚنەکەوت، ئیدی هاتمە ئێرە و لێرە خەوم لیٚکەوت.

کلیلەکانی لیٚوەرنەگرتەوە.

ئیدی هەموو بەیانان حەمەد هەڵدەستا و بە پەلە دەهاتە خانووەکەی. هەموو ڕۆژیش دەیدی ژنەکە لە بن ئەو دار پرتەقاڵە گەورەی نوستوە و کاتێکیش وەخەبەر دەهات، بە یەکەوە دادەنیشتن و چاویان لەو خانووە سپییە جوانەی دەکرد. ئەوەیان بۆ ببوو بە عادەت.

حەمەد ڕۆژبەڕۆژ خۆشحاڵتر دەبوو. کابرای نەناسراویشی ئیدی نەدیتەوە، بەڵام ئەو نیگەرانی‌یەی هەر لە دڵی دا بوو کە نەکا ڕۆژێك ئەو کابرایە پەیدا بێتەوە.

ڕۆژێکی‌یان بەیانیی زوو کاتێك حەمەد زۆر بە ئەسپایی دەرگاکەی کردەوە و هاتە نێو حەسارەکەی، دیتی ژنەکە لە ویّ نیە. دڵی داخورپا، زۆری پیٚناخۆش بوو و نەیدەزانی چ بکا. گەڕێك بە نێو حەسارەکەی دا گەڕا، هاتەوە لە سەر پلیکانەکان دانیشت، چوو ژووریّ گەڕا، پاشان چوو بۆ ماڵی جیرانەکەیان و لە دەرگای دا. ژنێك دەرگای کردەوە، کە چاوی بە حەمەدی کەوت، پیٚکەنی و گوتی:

ـ دەزانم لە کیّ دەپرسی.. بەڵام پوورە زارا پێش تاریکوڕوونی بەیانی ڕۆیی بۆ ئەستەمبووڵیّ. دیارە ئەمشەویش تا کاتی ڕۆیشتنیّ هەر چۆوە ماڵەکەی خۆی و لەویّ خەوت...

حەمەد بە دڵنارەحەتی‌یەوە گەڕایەوە ماڵی مەلا سەلامی. کاتێك وەژوور کەوت، مەلا سەلام خەریکی نانخواردنیّ بوو.

حەمەد بە حاڵەتێکی خەمبارەوە گوتی:

ـ ژنەکە ڕۆیوە.

ـ دانیشە حەمەد، چەند ڕۆژە چاوم پێت نەکەوتوە، بە ڕاستی لە کویّ بووی و ئێستا خەریکی چی؟

حەمەد لە بەرامبەری دانیشت و پیٚکەنی.

ـ دەمەوێ ئەمڕۆ بچمە شاری حەمەد، ئەرێ ئەتۆ هەروا سەرقاڵی؟
ـ نەخێر، کارم نیە، ئەو ژنەش خۆ ئیدی لێرە نەماوە.
ـ بۆ شتومەك و کەرەسەی نێومالّێ، ڕامنەسپاردووە هێندێك شتمان بۆ دانێن. ئێستا دەبێ بچین هەلّیانبژێرین.

مەلا سەلام دوو تەختی خەوی دیاری کردبوو، کە سەری پێچکەکانیان گۆی مس بوون. حەمەد بیری کردەوە: ئەها، کە وابوو من و سەیران دە نێو ئەو تەختەی دا دەنووین و ئەوی دیکەش بۆ دایە حۆری. بەلاّم وەللاّهی دایە حۆری قەت دەو تەختەی دا نانوێ. وای پێ بلّێین قەلّس دەبێ و قسەمان پێدەلّێ، بەلاّم ئاخری ڕادێ و تێدەگا کە نوستنی سەر تەختی خۆشە...

مۆبل و کورسی، سەربەرگی ئاوریشم بۆ کورسی‌یەکان... تابلۆی نەخشی خەتیی جوان جوان و ئایەتی قورئانێ... وێنەی دە شووشەگیراو: سەری ژنێکی جوان بە لەشی هەژدیهایەکی‌یەوە، بوڕاقی پێغەمبەری کە لەشی ئەسپە و سەری کچە و وێنەی لەشی بێ‌گیانی حەزرەتی عەلی کە لە دەشتێکی کاکی بە کاکی دا بە سەر وشترێکی‌یەوەیە ...

حەمەد بە ئۆگری‌یەوە هەموو تابلۆکانی چاو لێ‌کردن و مەلا عەبدوسسەلامیش مەبەستی هەموو تابلۆکانی بۆ لێکدایەوە. حەمەد لە خۆشیان ئۆقرەی لێ‌بڕابوو، ڕوخساری سپی هەلّدەگەڕا، سوورهەلّدەگەڕا و بەردەوام پرسیاریشی دەکردن:
ـ کە وابوو شتێکی وا هەیە کە لەشی هەژدیهایە و سەری ژنە؟
ـ بەلّێ حەمەد، هەیە، لەو دیوی کێوی قافێ.
ـ ئەسپی حەزرەتی محەممەدیش سەری کچ بووە، بە ڕوخسارێکی ئاوا جوانەوە؟
ـ بە تەواوی وایە حەمەد و ئەو ئەسپە ئێستاش دەژی، لەو دیوی کێوی قافێ.
ـ حەزرەتی عەلیش تەرمی بێ‌گیانی خۆی سواری وشترێکی کرد و وشترەکەشی دە دەشتێ کرد؟
ـ بەلّی بۆخۆی وشترەکەی لێ‌خوڕی و کەس نازانێ ڕووی دە کوێ کرد...

حەمەد بە نێو دوکانەکەی دا گەڕا و بۆخۆشی تابلۆیەکی شووشەی هەلّبژارد کە نەخش و ڕەنگەکانی لە بەر گەشی‌یان دەترووسکانەوە: پیاوێکی بە دیمەن سواری ئەسپێکی بۆرە ببوو، ئەسپەکە هەستابووە سەر پاشووان و پیاوەکەش یەکی چوارشانە بوو، چاوەکانی گەورە بوون و سمێلی دەتگوت مانگی یەکشەوەیە بە دەوری لێوانی دا هاتبووە خوار و شمشێرێکی ڕووتی بە دەستەوە بوو.
ـ ئەوە کێیە؟
ـ کوێرۆغلی‌یە ...

حەمەد گوتی:

ـ دەڵێی چی ئەوەش بکڕین؟

ـ دەیکڕین، ئەوە زۆر جوان کێشراوەتەوە. ئەو کەسەی ئەو تابلۆیەی کێشاوەتەوە، هونەرمەندێکی گەورەیە. ئەو سوارە کە کوێرۆغڵی‌یە، کێشک لە مەرقەدی مەلا خونکاری، لە کۆنیایە، دەکێشێ و پیاوێکی عادڵ و پیرۆزە کە لە ڕیزی چلسوارەی غەیبی دایە. ئەو تابلۆیانە بە ڕاستی پیرۆزن و هەر ماڵێکی ئەوانەی تێدابن، شتی خراپ و نگریس ڕووی تێناکا، قەت تەڵاق و لێکهەڵبڕان لەو ماڵەی دا ڕوو نادا و بە پێچەوانەوە پڕ دەبێ لە خێر و بەرەکەت.

حەمەد لە پێش تابلۆیەکی دیکە ڕاوەستا: بۆقێکی سەوز کە ئاگری لە زاری لە دەهاتە دەر.

ـ ئەوەیان بە دەستی پیاوچاکان دروست نەکراوە. هیچ نایەنێ، هەر بۆ وەی نابێ چاویشی لێکەی.

حەمەد بە دوودڵی‌یەوە لە بەرامبەر تابلۆیەکی دیکە ڕاوەستا. ئەوەیان ئاسمانێکی بێسنووری هەر بەو ڕەنگە گەشانەوە نیشان دەدا، کە ئاسمانی سەر چوکووراوایە هەیبوو. دەشتێکی دەخستە بەرچاو کە پڕ بوو لە گوڵی زەرد، سوور، بنەوش و کاڵ، ڕاست وەك گوڵەکانی ئەو دەشتەی، هەروەها هێندێك داری تێدابوون، کە هەرچەند ڕەنگی هەموو دارەکان سەوز بوو، بەڵام هەر ئەو ڕەنگە لە دارێکەوە بۆ دارێکی دی لە باری توندی و کاڵی‌یەوە جیاوازیی هەبوو و هەرکامە و جۆرێکی تایبەتیی دەنواند. لکی دارەکانیش پڕ لە گوڵی ڕەنگاوڕەنگ بوو. ژنێك و پیاویك لە سەر جۆگە ئاوێکی ڕاوەستابوون، هەردووکیان ڕووت بوون و مارێك لە پشتەوەیان درێشوکە سوور و دووفلیقانەکەی دەرهێنابوو و قەفقەف لە دارێکی ئاڵابوو. وا دیار بوو ژن و پیاوەکە لە وەی کە ڕووت بوون، شەرمیان دەکرد. حەمەد ئەو بەرەبەیانەی وەبیر هاتەوە کە سەیرانی لە قەراغ چۆمەکەی چاو پێکەوت. وەبیری هاتەوە کە سەیران لە پشت پۆلە قامیشیك و هێندێك پنچکان لە نێو گوڵان درێژ ببوو، ئای کە لەشی نەرم و جوان بوو... حەز و ئارەزوو هۆشی لە هەردووکان بریبوو و مەستی هەستی خۆشەویستی و یەکترویستن بوون... کە ئەوەی وەبیر هاتەوە، ئازای لەشی لە حەسرەتان لەرزی. لە تاوان خەریك بوو دیق بکا، بەڵام نەیدەزانی چ بکا ... کاتێك تاو هەڵات و خۆر لە سەروسەکوتی دان، هێشتا هەر خەریکی ئیشقبازی بوون. ئەسپە کوێتیش مەودای پەنجا میترێك لەولاتری وان سەری دە حەوای کردبوو، لیچی لیککردبوونەوە و ڕەق ڕاوەستابوو...

ـ حەمەد دەڵێی ئەو وێنەیەت زۆر بە کەیفێە.

حەمەد وشیار بۆوە و خۆی کۆکردەوە:

ـ وەڵڵاهی جوانە مامۆستا، هەروا پێم خۆش بوو چاوی لێبکەم.

ـ ئەوە شاکارێکی جوانی هونەرمەندانەیە. بڕوانە، ئەوە بەهەشتە کێشاوییەتەوە، لەو بەهەشتەش جوانتر و رازاوەترە کە باسی دەکرێ.

حەمەد سوور هەڵگەڕا، سەری بەرداوە و گوتی:

ـ وایە، بە ڕاستی زۆر جوانە.

ـ هونەرمەندەکە بەهەشتی چۆن دیتوە، هەر واشی کێشاوەتەوە.

حەمەد ئیدی سەرسوڕمانی خۆی بۆ نەشاردرایەوە و گوتی:

بۆچما ئینسان دەتوانێ پێش ئەوەی بمرێ، بچێتە بەهەشتێ و بیبینێ؟

ـ هونەرمەندەکە هەموو ڕۆژێ لە وێیە. دیارە ئەو بە چاوی دڵ دەیبینێ. ڕێگای بەهەشتێش هەر بە دڵ بەڵەدە. ئەگەر وا نەبا، ئەگەر ئەوێی نەدیبا، چۆن دەیتوانی ئەو وێنەیەی وا جوان بکێشێتەوە، کە لە بەهەشتێ جوانتر بێ؟

ـ ئەوە زۆر جوانە، زۆر زۆر، ئەدی ئەو مارە ...

ئیدی نەیزانی چۆن هەستی خۆی دەربڕێ:

ـ ئەدی ئەو سێوە سوورە... چاو چەندە سوورە... لە سووریيان هەر بریقەی دەدا...

ـ ئەم تابلۆیە بابە ئادەم و دایە حەوای ئێمە لەو کاتەی دا نیشان دەدا کە لە بەهەشتێ دەردەکرێن. ئەو مارەش هەر ئەو مارە فێڵبازەیە کە فریوی دان و گوناهی پێکردن. دایە حەوا سێوێکی سووری بە دەستی ڕاستییەوەیە، کە مارەکە داویەتێ. ئێستا ئەو چیدی خۆی پێڕاناگیرێ و قەپ بە سێوەکەی دا دەگری، نیوەی سێوەکەی دەخوا و نیوەکەی دیکە دەدا بە بابە ئادەمی... دیتووتە وێنەکە چەندە زیندووە؟ ئینسان پێیوایە هەر ئێستا هەرچی دەو وێنەی دا هەن، دەبزوون. هەر دەڵێی خوا ڕوحی وەبەر وێنەکەی ناوە، هەر بەو جۆرەی کە گیانی وەبەر عەرزی ناوە... مرۆڤ دەتوانێ سوێندێ بخوا کە بابە ئادەم و دایە حەوا بۆخۆیان لە گەڵ ئەو مارەی و بەو سێوەیەوە لە نێوەڕاستی بەهەشتێ، لە پێش وێنەکێشەکەی ڕاوەستاون و ئەویش وێنەکەی کێشاوەتەوە و ڕەنگی کردوە.

ـ دایە حەوا جوانە و بابە ئادەمیش زۆر بە شانوشکۆیە!

ـ دوای ئەوەی ئەوان لە بەهەشتێ دەرکران، لەش، دڵ و بیری ئینسانیش شێوا. ئێمە هەموومان لە سەرەتاوە لە سەرچاوەیەکی ڕوونەوە هاتووین، بەڵام ئێستا ڕووباری گەورەی مرۆڤایەتی هەر ئاوی لێڵ و پیسی پێدا دەڕوا.

حەمەد بیری کردەوە: سەیران زۆر جوانە، هەزار هێندەی دایە حەوای جوانە. گەردنی کێلی، قەدی باریکی و ڕەنگی ئەسمەری... لە نەکاو ئاوڕی دایەوە و هێندێك نیگەران بوو: بلێی مەلا سەلام هەستی نەکردبێ بیر لە چی دەکەمەوە؟

ــ با ئەو تابلۆیەش بکرین، دیارە دەبێ گران بێ، بەڵام قەیدێ ناکا دەیکرین.

حەمەد لە بن لێوی‌یەوە گوتی:

ــ بەڵێ، بیکرە!

لەوە زیاتری لە سەر نەڕۆیی. دەترسا مەلا سەلام بە قسەی نەکا و ئەو تابلۆیەی بابە ئادەم و دایە حەوای بۆ نەکڕێ.

کابرایەکی پیر کە عەبایەکی دە بەردا بوو، تەپلەیەکی لە سەر بوو، ملێکی درێژی چرچاوی و ڕدێنێکی کۆرپەی هەبوو و تەسبیحێکی بە دەستەوە بوو، زۆر بە لە سەرەخۆیی و لە حالێك دا لە بن لێوی‌یەوە دوعای دەخوێند، تابلۆکەی هێنایە خوارێ. ملی ئەوەندە درێژ بوو، دەت‌گوت سەری بە سەری داردەستێکی‌یەوە کراوە.

پاشان لبادێکی جیگجیکی، فەرشێکی هەوشاری و بەرماڵێکی نەخشینیشیان کڕی. بەرماڵەکە لە لبادەکەش جوانتر بوو.

حەمەد وەك کەسێکی کە دەخەوێ دا دەڕوا، وەدوای مەلا سەلامی دەکەوت. بۆخۆی لە خۆوە هیچی نەدەگوت. هەرچی مەلا سەلام گوتبای، پێی ڕازی بوو و دیارە هەر شتێکیش ئەو کڕیبای پێی‌جوان بوو و پێی باش بوو. ئەو تەنیا بیری لە هونەری هونەرمەندە وێنەکێشەکەی دەکردەوە. پێی‌وا بوو ئەگەر شەو و ڕۆژ لە بن ئەو وێنەیەی دابنیشێ، نە بخوا، نە بخواتەوە و نە بیر لە شتێکی دیکە بکاتەوە، تەنیا چاو لەو وێنەیەی بکا، هێشتا تێر نابێ.

پیاوە پیرە خاوەندوکانەکە چەند تابلۆی دیکەشی هەروا بە دیاری لە گەڵ شتومەکەکان دانێ، بەڵام هیچیان وەك ئەو وێنەیەی سەرنجی حەمەدیان ڕانەکێشا.

دوایە چوونە دوکانی زەینولڵا ئەفەندی. کورسی، مۆبل، مێز، کەلوپەلی چێشتخانەی، دەوری و تاقمی چینی و زۆر شتی دیکەیان لە وێ کڕین. کاتێك مەلا سەلام چرایەکی کووپپەمەیی گەورەی نەوتیی هەڵبژارد، حەمەد ڕووی وەرگێڕا. چرایەکی ئاوای جارێکی لە شوێنێکی دیبوو، بەڵام نەی‌دەزانی لە کوێ و کەی، ڕاست وەك پیاوە نەناسراوەکەی کە بەردەوام خۆی نیشان دەدا و کاتێك حەمەد دەیەویست بچێتە لای و بی‌گرێ، لەبەری هەڵدەهات.

ــ مامۆستا ئەو چرایەم ناوێ.

ـ ئەدی ئەوەیان کە کووپەکەی سەوزە، ئەوەشت ناوێ؟
ـ نا، مەبەستم ئەو پەمەیی‌یەیانە، دەنا قەیدێ ناکا، لەوانەی دیکە هەرکامیان بکڕی، پێم‌ناخۆش نیە...
مەلا سەلام دوو چرای جوان و باشی هەڵگرت.
لە ماوەی چەند ڕۆژان دا دیوار و دەرگا و پەنجەرەکانی خانووەکە ڕەنگ کرانەوە. فەرش، مۆبل و شتومەکی دیکە هەرکام لە جێی خۆی دانرا. ڕۆژێکی خێزانی مەلا سەلامی کە ئەویش وەك سەیرانێ ژنێکی جحێڵ و جوان بوو و ملی وەك ملی قووی درێژ بوو، بە سەبەتەیەکی گەورەوە پەیدا بوو. سەبەتەکە پڕ بوو لە پەردەی جوان جوانی گوڵدۆزی کراو. ژنەکە لە گەڵ مەلا سەلامی پەردەکانیان بە پەنجەرانەوە هەڵواسی. کاری ڕێکوپێك‌کردنی ماڵەکەی چەند ڕۆژێکی گرت، بەڵام حەمەد بیریشی لێ نەدەکردەوە. بۆخۆی ڕۆژ تا ئێوارێ دادەنیشت و چاوی لە تابلۆی بەهەشتەکەی دەکرد.
ـ ئەرێ حەمەد، ئەتۆ هەر دەڵێی لە نێو ئەو هەموو شتانە دا تەنیا کەیفت بەو تابلۆیەی دێ، وایە؟
حەمەد لە حاڵێك دا چاوی لە سەر تابلۆکەی نەدەگوێزتەوە، گوتی:
ـ ئەمن پێم‌وایە بە ڕاستی تابلۆیەکی جوانە.

حەمەد هەر چاوی لە تابلۆکەی دەکرد و بەردەوام شتی تازەی تێدا دەدۆزی‌یەوە، ڕەنگی نوێی تێدا بەدی دەکرد و هەموو جارێکیش ڕادەپەڕی و دڵی دادەخورپا.
لە سەر گەڵایەکی سەوزێ کاڵ خاڵخاڵۆکەیەکی دۆزی‌یەوە و لە پشت گەڵایەکی دیکە، کۆمەڵێکی دی. لە شوێنێکی دیکەی وێنەکە دا باڵندەیەکی شینی سینگ زەردی بەدی‌کرد. باڵندەکە بە نیگەرانی‌یەوە لە هەرچوار دەوری خۆی دەڕوانی... وا دیارە زۆری پێ‌ناچێ باڵەکانی دەکاتەوە و دەفڕێ... قالۆنچەیەکی سەوز کە جار بە جار ئاماڵ سوور و شینیش دەنوێنێ، باڵە تەسکە لەرزۆکەکانی دەردەکێشێ... لە نەکاو حەمەد بە شەوق و زەوقێکی زۆرەوە ڕای کردە لای مەلا سەلامی:
ـ دەڵێن زیارەتکردنی گلکۆی مەلا خونکاری لە کۆنیای، بە نیوە زیارەتێکی مەکەی دەبێ. ئەمن زۆرم پێ‌خۆشە بچمە کۆنیایە لای ئەو هونەرمەندەی کە ئەو تابلۆیانەی کێشاوەتەوە، ئافەرینی لێ‌بکەم و ڕێزی لێ‌بنێم. هەر سەیران بگاتە ئێرە...

ـ بەڵێ دەتوانین بچینە سەر گڵکۆی بابە مەولانای، بەڵام هونەرمەندەکە ئەوەتا لێرەیە. ئەو پیاوە پیرە ملدرێژەی ئەمڕۆ لە لای بووین، خاوەنی ئەو شاکارەیە...

ـ بە ڕاستی ئەو بوو؟ چاو لە من کە، تەنانەت دەستیشیم ماچ نەکرد.

ـ دەرفەتی ئەوەت دەبێ...

حەوتووی دواتر ئەسپێکی ڕەسەنی عورفاییyان کڕی، جوانووئەسپێکی چوار ساڵە. حەمەد زینێکی چەرکەسیی پەڕاوێز زێوکفتی کڕی. هەموو ڕەختەکەشی هەر زێوکفت بوو. پاشان دەمانچەیەکی ناگانیشی کڕی و دە بەرپشتێنێی ڕاکرد.

مەلا عەبدوسسەلام گوتی:

ـ حەمەد گیان، ببوورە، لێرە خەڵك بەو نەوعە جلوبەرگەیەوە سوار نابن.

هەستان، چوونەوە دوکانی زەینوڵڵا ئەفەندی، چاکەت و پانتۆڵێکی سورمەیی، جووتێك چەکمەی درێژ، کڵاوێکی خەتخەت و دەرزەنێك کراسیشیان هەڵگرت.

حەمەد زۆر خۆشحاڵ بوو کە بەو لیباسەیەوە دەگەڕا، بەڵام بەو جلانە ڕانەهاتبو و هەستی دەکرد بە ڕووتی دەگەڕێ. ئەو بێجگە لە سەربەرگە یەخە زێوچنراوەکەی، کەوشە قایشەکانی، گۆرەوییە خورییەکانی و کراسە لۆکە ماراشییەکەی، شتی دیکەی پێ جلوبەرگ نەبوو.

لەو کاتەوە ئەسپ و دەمانچەکەی کڕیبوو، کابرای نەدیبۆوە. ڕۆژێکیان بە سواری چوو بۆ لای چۆمی و هەتا ئێوارێ لە لای پۆلەپنگەکەی مایەوە، کە بە سەر دەریایەی دا دەڕوانی، چوو لە پێش مزگەوتەکەی چاوەڕوان بوو و پاشان چوو لە کەبابخانەکەش نانی خوارد، بەڵام هیچ نەقەوما. ئەو بەینەی هەموو لێگەڕا، لە دڵی خۆی دا وای دانابوو کە بیدۆزێتەوە و ئیدی نەیەڵێ لە دەستی دەرچێ!

کاتێك کاری ماڵەکەی تەواو بوو، مەلا سەلام حەمەدی بانگ کرد و کیسەیەکی زەردی زێوکفتی دا دەستی. ئەمە هەر ئەو کیسەیە بوو کە کاتێك حەمەد گەیشتبوە ئێرە، بە مەلا سەلامی سپاردبوو، تا بۆی هەڵگرێ:

ـ فەرموو حەمەد، ئێستا ئەتۆ ماڵوحاڵی خۆت هەیە و دەکرێ پووڵی خۆشت لە لای خۆت بێ!

حەمەد کیسەکەی کردەوە. لەگەڵ ئەوەی ئەو هەموو شتەش کڕابوو، هەروا پڕ بوو لە پووڵ. حەمەد کیسەکەی دایەوە دەستی مەلا سەلامی:

ـ مامۆستا گیان، دەبێ هەتا سەیران دێ، هەر لە لای تۆ بێ.

مەلا سەلام کیسەکەی لێوەرگرتەوە، پێنج سکەی زێڕی لێدەرهێنا و دانییە دەستی حەمەدی:

ـ باشە، بەڵام با ئەوەندەت هەر پێ‌بێ. لەوانەیە پێویستت پێی ببێ.

حەمەد سکەکانی دە کیسەی باغەڵی خۆی نا. وێنەی دووپشکێکی بە زەنگیانەی ڕەنگاوڕەنگ لە سەر پشتی کیسەکەی چنرابوو.

مەلا سەلام گوتی:

ـ دەتوانی لە لای زەینوڵڵا ئەفەندی هێندێك لەو سکانە ورد کەیەوە. ئەو زۆری خۆش‌دەوێ. دۆستایەتیی کەسێکی وەك وی بۆ تۆ زۆر بەکەڵکە.

حەمەد پانتۆڵی سواری‌یەی هەڵکێشا، قایشێکی زێوناژنکراوی لە سەر بەست، کراسێکی سپیی بێ یەخە و کۆتێکی سورمەییشی دەبەر کرد و قەمچی‌یەکەشی دە بەر چەکمەکەی ڕاکرد.

ئەسپەکانیان لە کاروانسەراکەی نێزیك بازاڕی کە دارپەلکێکی گەورەشی لە تەنیشتێ بوو، بەجێ‌هێشت. لە بن دارەکەی کە سێ‌سەدەی زیاتر تەمەن بوو، کانی‌یەك هەڵدەقوڵی و ئاوەکەی دەچو دە حەوزێکی‌یەوە، کە بە بەردی سپی دروست کرابوو و لە حەوزەکەش ڕا بەرەوخوار بە ئاوهەڵدێرێکی دا دەڕژایە نێو باغە پرتەقاڵێکی. قاوەخانەیەك لە و جێگا خۆشەی هەبوو.

لە بن دارپەلکەکەی دانیشتن و قاوەیەکیان خواردەوە. پاشان چوونە فرۆشگەکەی زەینوڵڵا ئەفەندی. مەلا سەلام حەمەدی بە هاوڕێکانی ناساند. زەینوڵڵا ئەفەندی حەمەدی بەو بەرگەیەوە زۆر پێ جوان بوو، هەر چاوی لێ‌دەکرد و دواتریش بە خۆشحاڵی‌یەوە گوتی:

ـ خوشکەزاکەت بەڕاستی خوێنشیرینە! ئەگەر سەڵت بوایە، لەوانە بوو هەموو کچی چوکووراوایە ملی خۆیانی بۆ بشکێنن!

مەلا سەلام بە شێوەیەك کە خۆڕانانی تێ‌دا هەست پێ‌دەکرا، گوتی:

ـ بەڵێ، حەمەد بە ڕاستی شۆخ و ڕێکوپێکە! ئەوەش کە وەبەر دڵی تۆ کەوتوە، بۆ وی سەربەرزی‌یە و جێگای خۆشحاڵی‌یە!

زەینوڵڵا ئەفەندی گوتی:

ـ خودا ئاگاداری بێ!

فرۆشگەی وی لە زووەوە هەر بەڕەمێن و بە نێوبانگ بوو. هەر کاڵا و شتومەکێکی لە ئالیپوو، دیمەشق، ئەسکەندەری‌یە، پاریس، لەندەن و ناپێلی ڕا دەهات، یان بە قاچاغی لە ئەسکەندەروونێ وەدەردەکەوت، هەمووی بە فرۆشگەکەی وی دا بۆ نێو تورکیە، ئێران، ئێراق و وڵاتانی تەنانەت زۆر دوورتری دیکەش دەڕۆیی. زەینوڵڵا ئەفەندی مێوانێکی زۆری دەهات، خانوویەکی ڕازاوە و گەورەی لە دەرەوەی شاری هەبوو، میوانەکانی دەبردە ئەوێ و لەوێ پێ‌یان

ڕادەگەیشت. ئەوانەی سەودا و کڕین و فرۆشی لە گەڵیان هەبوو، تورك، عەرەب، فەڕانسەیی و ئیتالیایی بوون. هەموو کەس دەیزانی ئەو چ دەکا ولە ئەستەمبووڵ و ئەنکەرەش خەڵك دەیانزانی. زەینولڵلا ئەفەندی پووڵی یەکجار زۆر بوو و هەر بۆیەش مەزرا و خاکێکی زۆری بە نرخی زۆر هەرزان کڕیبوو. تەواوی ئەو دەشتەی لە پەساری شاخی ڕا هەتا سەر لێوی دەریایە ئی وی بوو. هەرچی بابەتی سەودا و بازرگانی بوایە، لە چەکەوە بگرە، هەتا حەشیش، ئەسپ و مەڕ و ... لێی نەدەپڕینگایەوە. شەو نەبوو کاروانێك باری لە شتی نایاب و بە نرخ بۆ نەیە...

هەموو گەورەپیاوانی شاریش هەر لە فرۆشگەی وی کۆ دەبوونەوە. ئێواران حاکم، فەرماندەی ژاندەرمە، شارەدار، قازیی شاری و هەموو ئاغا و بەگەکانیش دەهاتنە ئەوێ، لە مۆبلی چەرم دا دادەنیشتن، چایان دەخواردەوە و باسی سیاسەتی ئەو سەردەمەی تورکیە، سووریە، فەڕانسە و بریتانیای گەورەیان دەکرد و هەر لە وێش بڕیاری جۆراوجۆر دەدران. دەنگۆ و هەواڵ و بۆچوونی ڕەخنەخولقێن و ئاڵۆز، شتێك بوون کە بە گەرمە باس‌یان دەکرا. هیچ شتێك نەبوو لە گوندێکی هەرە دوورەدەست و تەریککەوتۆوەی ئەو وڵاتەی ڕووبدا و لە وێ نەیەتە بەرباس و قسەی لە سەر نەکرێ.

ـ دەڵێن ئێوە خانووەکەتان کڕیوە؟

ـ بەڵێ هونەرمەندی بەڕێز، شوکر بۆ خوای!

ـ هەرزانیشتان کڕیوە؟

ـ وەڵلاهی ئەوەندەش هەرزان نەبوو...

ـ بیستوومە پیرێژنە خاوەنماڵەکە دڵی نەدەهات خانووەکەتان بۆ چۆل بکا. دەڵێن دەهات شەو و ڕۆژ لە بەر دەرگای خانووەکەی دەمایەوە.

حەمەد لە حاڵێك دا بە مەبەستی ڕێز گرتن هەردووك دەستی لە سەر چۆکی دانابوو، وەڵامی دایەوە:

ـ پێم‌گوت نەڕوا و لە گەڵ ئێمە بمێنێتەوە...

ـ ئەدی ئەو چیی گوت؟

ـ بەیانی‌یەکی کە چووم لە حەسارەکەی نەمابوو، ڕۆیشتبوو بۆ ئەستەمبووڵێ...

زەینولڵلا ئەفەندی گوتی:

ـ خوابمان‌پارێزی! بەجێ‌هێشتنی ماڵوحاڵ بۆ ئینسانی دەردێکی گرانە. ئەمن لەمێژساڵە لێرە دەژیم. بابم فەرماندەری قەڵای پایاسێ بووە، ئەوکاتەی ئەوێ بەندیخانە بووە. ئەمن لە

دیمەشقیێ دەرسم خوێندوە و پاشانیش بە هەموو دنیایە دا گەڕاوم، بەڵام قەت نەمتوانیوە نیشتمانی خۆم لە بیر بکەم. ئێستاشی لەگەڵ بیێ، من لە بۆنی ئەو وڵاتەی تێر نابم. کوڕم ئەتۆش زۆری پیێناچیێ وەڕەزیی دەشتە بەرزەکانی ئاناوارزای دەکەی! دیارە خۆ ئەویێ زۆر لێرە دوور نیە، بەیانی سوار بی، بۆ ئێواریێ دەگەیەوە ئاناوارزای! ئەو شارەی من لێی لە دایك بووم، ئێستا ئیدی لە نێو سنوورەکانی وڵاتی ئێمە دا نەماوە و ئیدی وازم لە دیتنیشی هێناوە، بەڵام دیارە ئەگەر کرابا لە شاری جێی لە دایکبوونم ژیابام... خانوو، پرد و جوانییەکانی ئەو شارەی لە هەموو دنیایە ناوبانگیان هەیە.

کاتێك زەینولڵا باسی شاری سەردەمی منداڵیی خۆی کرد، لێوەکانی لەرزین، چاوەکانی پڕ بوون لە ئاو و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا.

لە پێش دا موفتی هات، پیاوێکی کەڵەگەتی پشتکووڕ، کە چاوی گەورە و قاوەیی بوون، ڕیشێکی ڕەشی هەبوو و نێوە نێوە بزەی دەهاتیێ. پاشان شاکیر بەگ هات. کە ئەو وەژوور کەوت، هەموو یەکپیێ بڵێند بوون. شاکیر بەگ پانتۆڵێکی شینی پەشمی سوارییەی لە گەڵ جووتێك چەکمەی پان و گەورە دە بەر دابوو و قامچییەکی دەسك زێوکفتی دەبەر لینگێکییان چەقاندبوو. چاکەتەنینگلیسییەکەی بە دەستی بەرگدروویەکی بە نێوبانگی ئەستەمبووڵیێ دروابوو. کراسە سپییەکەی بەری بە ڕێکی ئوتوو کرابوو و کڕاوات(بۆینباخ)ێکی سووری تۆخی لە سەر بەستبوو. دەرزیی بۆینباخەکەی مراوارییەکی پێوەبوو، کە لە دوورەوە سەرنجی مرۆڤی بۆ لای خۆی ڕادەکێشا. کڵاوێکی بە گەوەڕی بەنداری لە سەر بوو و پەڕێکی چکۆلەی جوان دە بەندەکەی چەقابوو. کە هاتە ژوور، یەکە بە یەکە دە هەمووانی هەڵڕوانی. ڕوانینەکەی وەك ڕوانینی هەڵۆی دەچوو.

ئەو جار زەکی نەژادی مامۆستا هاتە ژوور. مەلا سەلام دەسبەجیێ لە بەری هەستا و حەمەدیش وەك ویی کرد. موفتی کەمێکی خۆ بزاوت، وەك ئەوەی وا نیشان بدا خەریك بووە هەستیێ و نەپەرژاوە، بەڵام شاکیر بەگ و زەینولڵا ئەفەندی هەر لە جێی خۆیان نەبزووتن.

مامۆستا زەکی بەوەی زۆر تێکچوو، بە زەحمەت خۆی بۆ زەوت دەکرا. ئەو بە شێوەی ناسایی دەشەلی، بەڵام ئێستا بە هەموو توانایەوە هەوڵی دەدا ئەو کەمئەندامییەی خۆی بشارێتەوە و لە لای وان لاواز نەنوێنیێ. هەربۆیە جۆرێك خۆی قیتوقنج ڕاگرتبوو، کە مرۆڤ بە ڕاستی شەلینەکەی نەدەدی. ئەو کۆت و شاڵوارێکی سورمەریی دە بەر دا بوو، گۆرەوییەکانیشی هەر سورمەیی بوون، جووتێك کەوشی جوانی دە پیێ کردبوو و کڕاواتێکی

شینیشی بەستبوو. کراسێکی شینی ناوریشمی دەبەردابوو، کڵاوێکی بە گەوەڕی ڕەشی بیێپەڕی لە سەر بوو. شتێك کە سەرنجی مرۆڤی بە تایبەت بۆ لای خۆی ڕادەکێشا، میداڵی سەر سینگی بوو، کە دوای شەڕی سەربەخۆیی درابوویە، میداڵێکی بریقەداری لە زێڕی سوور، ڕاست لەو میداڵەی کە مستەفا کەماڵ لە هەموو وێنەکانی دا بە سینگییەوە بوو...

دوای ئەوەی هەر کەس هات و لە جێی خۆی دانیشت، زەینوڵڵا ئەفەندی لە سەر کەشەفێکی زێوین ڕیزە چایەکی هێنا. چایەکەی لە سەماوەرێکی مسی بە قیمەت تیٚکرد، کە لە سەر خشتێکی پەڕاوێزنەخشین دانرابوو و لە قولینچکێکی ژوورەکەی دایسا. چایەکە تازە دەم و بۆنخۆش بوو و تامێکی تایبەتیی هەبوو. هەر کەس چای خۆی هەڵگرت و خواردییەوە. لە گەڵ چاخواردنەوەکەش قسەوباسی خۆیان دەکرد. هەموو ڕۆژێ هەر وا بوو، چاخواردنەوە و قسەوباسی لای زەینوڵڵا ئەفەندی ببوو بە نەریتێك و هیچکەس، تەنانەت خانەخوێ بۆخۆشی بۆی نەدەگۆڕا.

لە پێش دا باسی قاچاغچییانییان کرد. قاچاغچییەك کە بە کوڕی چەرکەسی بە ناوبانگ بوو، لە گاورکۆی دە بۆسەی ژاندەرمان کەوتبوو، بەڵام توانیبووی خۆی بە ساغی دەرباز بکا و بچێتە سووریەی. کوڕی چەرکەسی کاتێك سنووری دەپەڕاند، هەمیشە شێست سواری لەگەڵ بوو، کە هەموویان یەکە تفەنگچی بوون... پاشان باسی کابرایەکی نوێنەر، کە لە هەموو وڵاتی دا ناسراو بوو، هاتە گۆڕێ. ئەو کابرایە گوندێکی بە هەزاران هێکتار زەویی دەوڵەتێوە داگیر کردبوو. گوندەکە لە ناوچەی "یوورێگیر"ی بوو و دەیانگوت خاکێکی بە ڕێژەوی ئەوتۆی هەیە، ئینسانی لیٚبچێنی، شین دەبێتەوە! هەروەها باسی هێندێك پیاوی گەورە و سیاسیی سەردەمی شەڕی سەربەخۆییان کرد، کە عەرزی هەرێمەکەیان لە نێوان خۆیان دا دابەش کردبوو. دەیانگوت ئەوە تاڵانکردنێکی ئاشکرایە، بەڵام کەس پێشی بۆ نەدەگیرا! سەرەنجام هاتنە سەر باسی شتێکی کە لەو مانگانەی دوایی دا لە نێو خەڵك دا زۆری دەنگ دابۆوە، ئەویش باسی چەتە و یاغییان و بە تایبەت مەسەلەی حەمەدۆکی بوو. موفتی ڕووی دە پێشنوێژی مزگەوتێ کرد و گوتی:

ــ ئەرێ کەس شتێکی نوێی لەو بارەوە بیستوە؟

پێشنوێژ کە پیاوێکی ڕەقەڵە بوو و عەبایەکی گەورەی دە بەر دا بوو، هەمیشە هەواڵی هەرە تازەی چەتانی لە لا بوو و قسەکەشی ئەوەندە بە تاموخوێ دەگێڕایەوە، مرۆڤ لە بیستنی تێر نەدەبوو. دەتگوت حیکایەتوێژێکی بە ئەزموونە کە بەسەرهاتی هەموو چەتە و یاغییەکانی ئەو سەردەمەی ئەم وڵاتەی دەزانی.

پێشنوێژ پێش ئەوەی وەڵامی پرسیارەکەی بداتەوە، کۆخەیەکی کرد و گەرووی خاوێن کردەوە. ئەوانی دیکەش هەموو بێدەنگ ببوون و چاوەڕوان بوون بزانن ئەو چیی لەو بارەیەوە پێیە. ئەویش کە دەی‌دی خەڵکەکە ئاوا بە ئۆگرییەوە گوێیان بۆ شل کردوە، کەیفی زۆر ساز بوو و بە وردی بۆی گێڕانەوە کە چۆن حەمەدۆك لە ئاکچەسازی دە گەمارۆی ژمارەیەکی زۆر ژاندەرمەی سەرتاپێ چەکدار کەوتوە، کە لە سێ ناوچانەوە بۆی کۆوە ببوون و خەڵکی سێ گوندانیشیان لە گەڵ بووە، بەڵام حەمەد بە سواری هەژدیهای باتلاغەکەی لێیان وەخۆ کەوتوە و ئەوانیش کە هەموویان وەخت بووە لە ترسان دڵیان بتۆقێ، خۆیان نەگرتوە، هەڵاتوون و...

شاکیر بەگ بە تووڕەیی‌یەوە قسەکەی پێبڕی:

ــ ئەو قسە قۆڕانە چن؟ شتی وا چۆن دەبێ؟ یانی حەمەدۆك لە باتلاغی ئاکچەسازی دا گەمارۆ دراوە و دواتر سواری هەژدیهای بووە، هێرشی کردۆتە ئەو هەموو ژاندەرمە و خەڵکەی، هەژدیهاکەش گڕی لە زاری بۆتەوە و ئاگری بە سەر دا پرژاندوون! بە ڕاستی ئەوە درۆیەکە تووکی لەشی پیاوی ڕاست دەکاتەوە! ئەو قسانە خەڵکی بە فریو دەبەن و وایان لێ‌دەکەن هەموو پێیان وا بێ کە ئەو ئینسانکوژە پیاوی خودایە و شێخە. ئەگەر لە بیرت بێ مانگێك پێش ئێستاش جەنابت هەر ئەو قسە سەیروسەمەرانەت کردن و ئەوکاتیش من گوتم کە ئەوە هەمووی دەنگۆی پڕوپووچن. بە ڕاستی ئێمە دەبێ کۆتایی بە گێڕانەوەی ئەو هەواڵە بێ‌بنەمایانە بێنین، ئەمن بەشبەحاڵی خۆم پێم‌خۆش نیە چی دیکە ئەو قسە قۆڕانە دە مێشکی خەڵکی‌یەوە بچن.

ــ بەڵام ئەمن یەك وشەشم لە خۆمەوە دروست نەکردوە و ئەوەم گێڕاوەتەوە کە لە خەڵکیم بیستوە. جاری پێشوو داستانەکە تەواو بە شێوەیەکی دیکە بوو. ئەو دەم دەگوترا چەتەیەك کە خۆی بە حەمەدۆك ناساندوە و هەزار و شێست و شەش ڕەشماریشی لە گەڵ بووە، بە پڕتاو لە سەری چیای ماران ڕا هاتوە و دەریایەك نوور و ڕووناکاییشی بە دەورەوە بووە. خەڵك کە ئەوەیان دیتوە، پێشیان چۆڵ کردوە، لە بەری هەڵاتوون و هەرچەندەی ژاندەرمەکانیش تەقەیان لێ‌کردوە، نەیان‌پێکاوە و تەنانەت یەك ماریشیان بۆ نەئەنگواوە! ئەوەی ئێستا گێڕامەوە، هەواڵی هەرە تازە بوو و پێوەندیی بە هەواڵی پێشووەوە نیە.

ــ قسەی بێ‌مانا و پڕوپووچ!

موفتی هاتە نێو باسەکەوە:

ــ ئەوەیان قسەی بێ‌مانا نیە...

شاکیر بەگ دەرپەڕی، گنجی هێنانە نێوچاوانی و گوتی:

ـ چۆن؟ تکا دەکەم موفتی ئەفەندی، ئەتۆ پیاوێکی دینداری گەورەی، چۆن دەتوانی باوەڕت بە داستانی هەژدیها، جندۆکە و دێوان بێ؟

موفتی لەسەرەخۆ گوتی:

ـ باسی ئەوانە لە قورئانێ دا هاتوە. لە قورئانێ دا سەبارەت بە هەژدیها، جندۆکە و دێوان نووسراوە.

پاشان ئایەتێکی قورئانیی خوێندەوە و گوتی ئەوە بۆ هەبوونی ئەو شتانە بەلگەیە.

ئایەتەکە جێگای قسەی نەدەهێشتەوە، بەلام شاکیربەگ کێشەکەی نەدەبڕییەوە.

ـ یانی جەنابی موفتی حەمەد هەژدیهاکەی ڕام کردوە، هەوساری کردوە و سواری بووە؟

ـ بەلێ دەکرێ، هەر زۆر وێدەچێ.

ـ بلێی ئەوەش دە قورئانێ دا هەبێ؟

موفتی لە بن لێوییەوە گوتی:

ـ پەنا بۆ خودای، خودا هەر بۆخۆی ڕەحمان پێ بکا.

پاشان دوعایەکی خوێند و گوتی:

ـ سەبارەت بەو قسەیەی هەر ئێستا کردت، داوای لێبووردن لە خودای بکە شاکیر بەگ! یارەبی خوایە هەموومان ببەخشی!

ـ بەلێ، بەلێ، داوای لێبووردن لە بارەگای خوای دەکەم! دەلێن حەمەدۆك ئەنگوستیلەیەکی پێیە، کە لە خانەقایەکی دزیوە. ئەو ئەنگوستیلەیە شەو و ڕۆژ وەك برووسکەی دەبریسکێتەوە! دەلێن هەتا ئەو ئەنگوستیلەیەشی پێبێ، هیچ ئاوێك نایخنکێنێ، هیچ ئاگرێك نایسووتێنێ و هەروەها گوللەش، ئەگەر وەك بارانەش بە سەری دا بباریێنی، کاری لێناکا! ئەوە دە قورئانێ دا نووسراوە؟

ـ شاکیر بەگی خۆشەویست، ئەو نەوعە داستانانە دە قورئانێ دا نین، بەلام لە ئەفسانە پیرۆزەکان دا هەن. با ئەوەش بلێم ئەو خۆ ئەنگوستیلەکەی نەدزیوە، ئەو ژنە خواناسە شێخەی کە خانەقای چلچاوی بەڕێوە دەبا، واتە دایە سولتان، داویەتێ.

شاکیر بەگ بە تووڕەییەوە هاواری کرد:

ـ ئەی هاوار، ژن چۆن بۆ شێخ دەبێ؟ ئەرێ کامە لە ئێمە تا ئێستا ژنێکی دیوە کە شێخ بێ، یان پێغەمبەر بێ؟

موفتی وەلامی دایەوە:

ـ بەڵێ هەیە و دیتراویشە. ئەمن دووانت بۆ حیساب دەکەم: دایکە حەوا و حەزرەتی مریەم کە هەردووکیان پیرۆز و گەورە بوون...

ئەو کێشەیە ماوەیەکی زۆری درێژە کێشا. هێدیکردنەوەی شاکیر بەگی هاسان نەبوو، موفتیش هەرچی دە دڵی دا بوو هەڵیڕشت:

ـ ئەگەر وا بێ جەنابت باوەڕت بە شازدە پیاوچاکە سەوزپۆشەکانیش نیە کە لە خانەقای چلچاوی ڕا هاتن و چوونە شەڕی یۆنانی‌یەکان، کە ئەو سەوزپۆشانە وەپێش سەربازەکانی ئێمە کەوتن و لە دوژمنیان دا، کە ئەو یۆنانی‌یانەی بەدیل گیران، گوتیان ئەوە ئێوە و چەکەکانی ئێوە نەبوون کە ئێمەیان شکاند، بەڵکوو هێندێك پیاوی سەوزپۆش بوون کە بە قەد چنارێکی کەڵەگەت بوون و شەڕکەرێکی بێ‌وێنە بوون! هەر لەو حاڵەش دا سەربازەکانی ئێمە سوێندیان دەخوارد کە تەنانەت یەك پیاوی سەوزپۆشیشیان لە پێشەوەی بەرەی شەڕ نەدیوە. جەنابت... جەنابت...

لێرە دا شاکیر بەگ قسەی بە موفتی بڕی و گوتی:

ـ جەنابی موفتی، لە وەیان دا لە گەڵ قسەی تۆم. ئەمنیش ئەو شتانەم لە زمانی ئەو سەربازانەوە کە لە بەرەی شەڕ دەگەڕانەوە بیستوە...

ئەو دەترسا کە لە شارەکەیان بە بێ‌باوەڕ و لەدین‌وەرگەڕاو نێو دەرکا و هەر بۆیەش ئێستا قسەکەی دەگۆڕی، بەڵام موفتیش کە هەستی بە ترسەکەی وی کردبوو، جار بە جار لێی ڕژدتر دەبوو:

ـ بێجگە لە وانەش دایە سوڵتان کراسەکەی سەلاحەدینی ئەیوبیی، ئەوەی سەلاحەدین بۆخۆی لە شەڕی خاچپەرستەکان دا دەبەری دەکرد، داوە بە حەمەدی. ئەو کراسە کە هەزار و نۆسەد و نەوەد و نۆ ئایەتی قورئانێ و هێندێك دوعای گەورەی دیکەی لە سەر چنراوە...

ـ دایە سوڵتان ویستوویەتی حەمەد لە برینی شیری، لە سووتانێ، لە خنکانێ پارێزراو بێ و هیچ گوللەیەکیش نەی‌پێکێ، هیچ ئینسانێك بۆی بەدیل نەگیرێ ... ڕاست وەك سەلاحەدینی ئەییووبی کە پێشتر کراسەکەی دە بەردا بووە!

شاکیربەگ بە ناڕەحەتی‌یەوە گوتی:

ـ باشە دایە سوڵتان چ شتێکی باش دەو پیاوکوژە خوێنخۆرەی دا دەبینێ؟

ئێستا ئەو هێندە توورە بوو، کە ئامادە بوو دەست لە هەموو بەرژەوەندی‌یەکانی هەڵگرێ و قسەی خۆی بکا. ئەو کە ڕۆژانی هەینی لە مزگەوتێ، لە ڕیزی پێشەوەی نوێژکەران جێگای دەگرتەوە و نوێژی هەینیی دەکرد، بۆ ئەوەی بوو کە خەڵك بە پیاوێکی لە خواترسی بزانن، دەنا نە باوەڕی بە خودای هەبوو و نە بە شەیتانی.

موفتی وەڵامی دایەوە:

ــ ئەوە هەر خودا دەیزانێ و ئێمە سەرمان لێیدەرناچێ. ئێمە ناتوانین دەست دە کاروباری وی وەردەین. ئەگەر دایە سوڵتان ئەنگوستیلەکە، کراسی سوڵتان سەلاحەدین و ودمی خانەقای چلچاوی دابێ بە حەمەدۆکی، ئەوە ... ئەوە بۆخۆی دەزانێ چ دەکا.

ــ خۆ شمشیرەکەی خۆی ناداتێ ...

ــ بۆ نایداتێ؟

ــ چونکە بێجگە لە شێخەکانی خانەقاکەی کەس ئەو شمشیرەی بۆ بەرز ناکرێتەوە.

ــ کێ دەزانێ، بەڵکوو حەمەدۆك لە وان بێ، ئەدی ئەو ئەنگوستیلەیە ...

لە نەکاو چاوی بە ئەنگوستیلەکەی قامکی حەمەدۆکی کەوت. حەمەد خۆی کۆی کۆ کردبۆوە و بە ئەدەب دەستی لە سەر چۆکان دانابوو و دانیشتبوو. موفتی وا دە ئەنگوستیلەکەیەوە ڕامابوو، هێندەی نەمابوو هەردووك چاوی بە جووت دەرپەڕن.

ــ وەرە پێشێ، وەرە پێشێ، پێمخۆشە چاو لە ئەنگوستیلەکەت بکەم!

حەمەد چووە پێشێ و ئەو دەستەی ئەنگوستیلەکەی تێدا بوو، بۆ لای موفتی درێژ کرد.

موفتی بە سەرسوڕماوییەوە گوتی:

ــ ماشەڵڵا! ئەمن بە جحێڵی جارێکییان چوومە زیارەتی خانەقای چلچاوی و شێخێکی ئەوێ، کە دواتر چووە شەڕێ، ئیدی نەگەڕاوە و ئێستا لە گەڵ چل سوارەی غەیبییە، ئەنگوستیلەیەکی وەك ئەوەی دە قامکی دا بوو، هەر ڕاست وەك ئەوەی بوو ...

حەمەد بە بێ ئەوەی قسە بکا، چۆوە جێێ خۆی و دانیشتەوە. دیسانیش بۆ پاراستنی ڕێز و نیشاندانی ئەدەب دەستی لە سەر چۆکانی دانا.

ــ ڕۆڵە ئەو ئەنگوستیلەیەت لە کوێ بووە؟

حەمەد لە سەرەخۆ وەڵامی دایەوە:

ــ لە باپیری باپیرمەوە بۆم بە میرات بەجێ ماوە.

ــ ئەدی ئەو لە کێی ڕا پێگەیشتوە؟

ــ ئەوەی نازانم.

ــ بنەماڵەی ئێوە پێوەندییان بە خانەقای چلچاوییەوە هەبووە؟

ــ لەلای مە، لە ئاناوارزای، هیچ خانەقای لێنین.

ئەو جار یاوەر دەستی بە قسان کرد؟

ـ ئەوە هەر بەیتەکەیە. ئەمن لە ئەزمیری لە دایك بووم و ئەو کاتەی منداڵ بووم، چەتەیەك لە لای ئێمە هەبوو پێیان دەگوت "حەمە عەفە" و ئەویش لە چوکووراوایە ڕا هاتبوو. هەزار کەسی زیاتر کوشتبوو. دەیانگوت ئەویش ئەنگوستیلەیەکی سیحراویی پێیە و کراسێکی جادوویشی دەبەر دایە. ئەوەش بۆیە بوو کە ئەو دەوڵەمەندی ڕووت دەکردن و پووڵ و ماڵی وانی بە سەر هەژارەکانی گوندەکان دا دابەش دەکرد. دەتگوت کوێرۆغڵی زیندوو بۆتەوە... ئاخرەکەشی کوژرا و تەرمەکەیان بە ڕووتی، لە نێوەڕاستی بازاڕی، بە لکی دارێکیەوە هەڵاوەسی. خەڵکیش کە هەمیشە پێیان وابوو گوللە کاری لێ‌ناکا، تەرمەکەیان برد لە دەشتێکی، لە سەر دووڕێیانێکی، لە بن دارەبەڵکێکی، ناشتیان. شەش مانگ پێ‌نەچوو گۆڕەکەی بوو بە زیارەتگە. هەر جووتێرێك شەوانە تۆپە گرێکی دەدی کە بە ئاسمانێ دا دەخوشێ و دێ ڕاست لە سەر گۆڕی چەتەکەی، لە لای سەری ڕادەوەستێ. گڵی سەر گۆڕەکەی ببوو بە متفەڕك و هەموو چەشنە نەخۆشی‌یەکی پێ چاك دەبۆوە. ئەو جووتێرانەی بە تەنیشت گۆڕەکە دا تێ‌دەپەڕین، هێشتا مەیدانەئەسپێکیان دەما، هەرایان دەکرد: سڵاو چاکیرجالی، ئێمە خۆمانەین، ڕێگامان بدە بە لات دا تێ‌بپەڕین. هەموو جارێ کە لە گەڵ بابم بە وێ دا دەڕۆیشتین، چ شەو با و چ ڕۆژ، ئەسپەکەی ڕادەگرت و ئەوەندەی هێزی دەبەر دا بوو هەرای دەکرد: سڵاو حەمە عەفە!

حاکم گوتی:

ـ ئەمنیش کاتێك لەو ناوچەیەی بووم ئەوەم بیستوە.

دادەستێن لە ژێر سمێڵە پڕە گەورەکانی‌یەوە پێ‌کەنی:

ـ ئاخرەکەی ئەو حەمەدۆکەش هەر وای بە سەر دێ. ئەو خەڵکە نەزانە خۆ قسەیان لەگەڵ نایە!

قازی قسەکەی وی پشتڕاست کردەوە:

ـ بە ڕاستی وایە، ئەو خەڵکە سەیرن. سی ساڵە ئەمن قازیم و هێشتاش دەو خەڵکەی نەگەیشتووم. سوور دەزانم کە حەمەدۆك خەریکە ڕاپەڕینێکی دروست دەکا. ئەو کەڵك لە بیر و باوەڕی خەڵکی وەردەگرێ و سکەی زێڕ بە سەر هەژاران دا دابەش دەکا ... دوای ئەو شتەی دوێنێ بیستمان، ئەوە ...

حەمەد بە هەموو توانایەوە گوێی دابۆیە، بیری کردەوە: ئەها، ڕەنگە ئێستا باس بکا، کە مەلا فەرهاد خەریکی چی‌یە.

پێشنوێژ قسەکەی لە قازی وەرگرتەوە: ئەو مرۆڤێکی گفتخۆش و قسەزانە و دەزانێ چۆن بدوێ کە خەڵك گوێی بدەنێ. کەس نەی‌وێراوە قسەی لە قسەی بکا. لە تووڕووس و چوکووراوایە حەمەد دەوڵەمەندەکانی وەبەر هەموو چەشنە ئەشکەنجەیەك داوە و بێ‌بەزیی‌یانە لە حاڵێك دا ئەوان فرمێسکیان هەڵوەراندوە، ماڵ و سامانیانی بە تاڵان بردوە و سێ شەو و

سێ ڕۆژان لە سەریەك دەستدرێژیی کردۆتە سەر ژن و بووك و کچەکانیان ... تەواوی بنەماڵەی سێ ئاغایانی لە پێش چاوی خۆیان قەتڵوعام کردوە و پاشانیش بۆخۆیانی کوشتوون...

حەمەد لە دڵی خۆی دا گوتی، وەڵڵاهی مەلا فەرهاد قەت شتی وا ناکا و هێندەی نەمابوو ڕاستەوە بێ و بڵێ وانیە، بەڵام باش بوو خۆی زەوت کرد.

مەلا عەبدوسسەلام لە داخان هەر جینگڵی دەدا:

ــ دایە سوڵتان قەت کراسێکی پیرۆز کە هەزار و نۆسەد و نەود و نۆ ئایەتی لە سەر نووسراوە، ودمی خانەقایە و شمشیری سەلاحەدینی نادا بە کەسێکی کە پیاوکوژە و دەستدرێژی دەکاتە سەر کچ و ژنان! مەسەلەی دەستدرێژی‌یەکە درۆیەکی ناشکرایە!

پێشنوێژ گوتی:

ــ ڕاست یان درۆ ئەمن ئاوام بیستوە.

دادەستێنیش گوتی:

ــ ئێمەش هەر وامان بیستوە.

بێجگە لە وەش بە پێی ئەو هەواڵانە دەبێ حەمەد ناوی خۆی لە سەر هەموو کوڕە جحێڵەکانی چوکووراوایە دانابێ و بە پێی دەنگۆیەکی دیکە، پیر و لاوی ناوچەکە هەموو ناوی حەمەدیان لە خۆ ناوە. ڕۆژ نیە لانی کەم هەزار کەس نەیەن و داوا نەکەن بچنە پاڵ دەستەکەی حەمەدی. لە نێو هەمووان دا حەمەدۆك حەوت لاوی هەڵبژاردوون کە هەموویان وەك یەك دەچن، یەك چەشنە چەکیان پێیە و قەرارە ئەوانە ببنە دەستەی تازەی وی. بەو شێوەیە ئێستا ئەو شاخانە پڕن لە حەمەدۆك. هەرچی دەوڵەمەندی لە توورڕووس و چوکووراوایە هەن، هەموویان بە ماڵومنداڵەوە هەڵاتوون، قیروسیایان لە پووڵ و سامانی خۆیان کردوە و شەڕەف و نامووسی خۆیان پاراستوە. خۆ بابم نامووس و شەڕەف بە دارێوە نابێ و ئەگەر چوو، چوو.

ماوەیەکی زۆر دانیشتن و باسی حەمەدۆکی و دەستەکەی وی‌یان کرد. هێندێکیان دەیانگوت هەواڵەکان ڕاستن و هێندێکیش پێیان وا نەبوو. یاوەر هیچی نەدەگوت، مات ببوو و بە وردی سەرنجی دابووە باسەکەی:

ــ ئەو جووتێرە تاوانبارانە هەموو شتێکیان لە دەست دێ. پیاوکوژەکانی وەك حەمەدی ئەگەر دێهاتی‌یەکانیان لە گەڵ نەبێ، چی‌یان پێدەکرێ؟ هەر ئەوەندەی دەڵێم ئەگەر ئەمن مەودام هەبا و پێم سپێردرابا مشووری ئەو حەمەدۆکەی بخۆم، بۆی دەچوومە شاخی، دەمگرت، هەردووك لاقیم دەپەڕاند و دوایەش لەنێوەڕاست دا لەتم دەکرد! ئەو جار ئەو جووتێرە

شەریکەدزانەشم تەمبێ دەکرد، وام ئەشکەنجە دەکردن کە خوێنیان وەك جۆگەی لە بەر ڕۆیشتبا، جا ئیدی دوایە سەدهەزار، یان میلیۆنێك حەمەدۆك پەیدا دەبوون قەیدیی نەبوو.

ئەوانەی لە وێ بوون، هەموویان لە سەر ئەوە یەکدەنگ بوون کە یاوەر هەم پیاوێکی هەلکەوتوو و هەم خزمەتکارێکی بە وەجی نیشتمان بوو. ئەو لە توانای دا هەبوو نەك هەر لە لەشی هەموو حەمەدۆکەکان، بەلکوو لە هەموو دەشتی چوکووراوا، چیای تووڕووس و سەرانسەری ولات، جۆگەی خوێن وەڕێبخا و تەنانەت دەیتوانی بە گازی ئینۆکی هەمووان بکێشێ و بە زیندوویش کەولیان کا.

یاوەر بە تووڕەیی‌یەوە نەڕاندی:

ـ ئەو هەموو خەیانەتکارانە کە لەم ولاتەی ئێمە دا ناوی حەمەدۆکی لە خۆیان دەنێن، بۆچی وادەکەن و چی‌یان دەوێ؟

زەکی نەژاد لێرە دا وەدەنگ هات و لە حالێك دا قامکی ڕادەوەشاند، گوتی:

ـ چەتەکان خەیانەت بە ولات ناکەن!

شاکیر بەگ گوتی:

ـ خاینی بێ ئەملاوئەولان، مەبەستت چی‌یە جەنابی مامۆستا!

زەکی نەژاد وەلامی دایەوە:

ـ نامەوێ بێمە دەو باسەیەوە و شتێك لەو بارەیەوە بلێم!

یاوەر سوور هەلگەڕا، ڕەگی ملی هەلمسان، هەستا سەرپێ و گوڕاندی:

ـ ئەوە دەلێی چی جەنابی مامۆستای؟ ئێمە سنوورەکانی ئەم ولاتەمان بە خوێنی خۆمان پاراستوە. چەتەکان یاغین و خەیانەت بە نیشتمانەکەمان دەکەن!

زەکی نەژادیش ڕاست بۆوە و نەڕاندی:

ـ ئێمە بۆمان نیە چەتەکان وەك خاین چاو لێبکەین!

پاشان باسکی تێكبەزاندن و بێ ئەوەی گوێبداتە خەلکەکەی دیکە، دیسان بە سەری دا گوڕاند:

ـ گوێت لە من بێ یاوەر، ئەمن با بۆت ڕوون بکەمەوە مەسەلەکە چۆنە! گوێ لەمن بگرە سەربازی بە شەڕەفی نیشتمان!

لە کاتێك دا دەی‌نەڕاند، میدالەکانی سەر سینگی هەلدەبەزینەوە. قسەکانی وی یاوەریان کە شەلالی ئارەق بوو، خاو کردەوە و دانیشتەوە.

ـ بەلێ یاوەر با من بۆت ڕوون بکەمەوە. گیزیك دۆران چەتەیەکی بە ناوبانگ بوو. ئێمە بە یەکەوە لە بەرەی هاچینێ بووین. ئەگەر ئەومان دەگەل نەبا، بێ‌گومان زۆری دیکەمان لە

دەست دەچوون. ئەمن لە بەرەی ئانتێپیش شەڕم کردوە. لە وێ ڕەشمار و سولەیمانە کوردەمان لە گەڵ بوون... ئەتۆ بۆخۆشت دەزانی کە ئەو دووانە چەندە ئازا بوون. ڕەشمار لە پێش چاوی خۆم لە شەڕێ دا کوژرا... ئەو جار قارەمانەکانی وەك گوێکچەن عەفە، دەمیرچی عەفە و عەلی عەفەش کە لە بەرەی یۆنانێ شەڕیان دەکرد، لە من باشتر دەناسی، یاوەر ...

شاکیر بەگ قسەکەی بڕی:

ـ مامۆستا، پاکانەی بۆ حەمەدۆکی دەکەی؟

زەکی نەژاد لێی مۆڕ بۆوە و گوتی:

ـ ڕاست ئەو کاتەی کە ئەو چەتانە لە مەیدانی شەڕێ دا دەکوژران، ئاغاکان و بەگەکان هاوکاریی دوژمنیان دەکرد ...

ئەو قسەیە هەمووانی ئەنگاوت، بەڵام هیچکەس نەیوێرا وەدەنگ بێ، تەنانەت یاوەریش. ئەو گومانی وەی دەکرد کە مامۆستا زەکی لە گەڵ بەشێکی زۆر نەهێنیی دەوڵەتێ کار بکا، دەنا بۆچی پیاوێکی ئاوا خوێندەوار، بە ئەزموون و زانای وەك زەکی نەژادی، کە میداڵی سەردەمی شەڕی سەربەخۆیی و هەموو شتێکی دیکەشی هەبوو، هەموو ژیانی خۆی لە گوندێکی تەریککەوتووی دەرەوەی شاری کاری کردبوو؟ ئەو هەرگیز هەوڵی نەدابوو زەویی خەڵکی داگیر بکا، قەت بۆ لای ڕەخنەگرتن لە عیسمەت پاشا و دەوڵەتێش نەدەچوو و هەروەها لە لایەن مستەفا کەماڵ پاشاشەوە هەرگیز ئیرادی لێ نەگیرابوو و وەك خەڵك دەیانگوت وێدەچوو ڕاستەوخۆ لە ژێر فەرمانی سەرۆککۆماری وڵات دا هەڵسووڕێ.

ـ بەڵێ برایان، خەڵك ستایشی حەمەدۆکی دەکەن! ئەو بۆتە شێخ، بۆتە پێغەمبەر و ئەوەش بەو مانایەیە کە خەڵك کەسێکی وایان پێویستە. هەروەها بەو مانایەیە کە ئێمە چاوەڕوانییەکانی ئەو خەڵکەمان جێبەجێ نەکردوون، لە جیاتییان سوودی خراپمان لێوەرگرتوون و خراپیان لە گەڵ جووڵاوینەوە. ئێمە بەردەوام تەوهینیان پێدەکەین و دەیانشکێنین. هەر بۆیەشە کەسێك کە یاغی دەبێ، ئەو خەڵکە دەیپارێزن و داڵدەی دەدەن! جا ئەگەر ناوی حەمەدۆك بێ، ئەوە هەموو جووتێرەکان بە ورد و درشتەوە، لە منداڵی حەوتساڵەوە هەتا پیری حەفتا ساڵە ناوی وی لە خۆیان دەنێن! کە وا بوو گرتنی حەمەدی کارێکی هەر وا هاسان نیە!

یاوەر ئاخێکی هەڵکێشا:

ـ ئاخ دۆستان، هەر دەڵێم خۆزگە ئەو شتە بە من سپێردرابا ... کاتێك من لە لای ڕۆژهەڵات بووم، زۆر حەمەدی جۆراوجۆرم بەردەست کردن!

حاکم گوتی:

ئەمن یاوەری باش دەناسم و دەزانم کە لەو کارانە دا چەند بە ئەزموونە. چاکیرجالی و تەنانەت کوێرۆغلیش بۆ وی شتێکی وا نین!

یاوەر وەك منداڵێکی چکۆڵەی شەرمێون سەری داخست.

تەواوی ئەو ماوەیەی مەلا عەبدوسسەلام قسەی نەکرد. جار جار بە دزیەوە تەمەشای حەمەدی دەکرد و لە دڵی خۆی دا پێ‌دەکەنی.

وردە وردە بابەتی قسەکان گۆڕا و خەڵکەکە هێور بوونەوە. نۆکەری زەینوڵڵا ئەفەندی ڕیزە چایەکی دیکەی تێ‌کرد. پێشنوێژ دەیەویست دیسان قسە بکا و خێرا خێرا دەی‌گوت هەواڵی دیکەشم پێن، بەڵام ئیدی کەس گوێی نەدەدایە.

ــ کوڕە هەواڵێکی دیکەشم پێیە، هەواڵێکی یەکجار گرینگ سەبارەت بە ئەسپەکەی حەمەدۆکی!

کاتێك خەڵکەکە ئەمەیان بیست، دیسان بێ‌دەنگ بوونەوە و گوێیان بۆ شل کرد. هێندێکیان گوتیان:

ــ دەی ئەسپی حەمەدۆکی چیی بە سەرهاتوە. خەڵك لەو بارەوە چ دەڵێن؟

چەند حەوتوو بوو خەڵك لە بازاڕی و لە ماڵێ تەنیا باسی ئەو ئەسپەیان دەکرد. هەموو کەس دەی‌زانی ئەو ئەسپە چۆنە. دیارە مەلا عەبدوسسەلامیش هەواڵی ئەو ئەسپەی دەزانی، بەڵام لە لای حەمەدی باسی نەکردبوو، چونکە پێی‌خۆش نەبوو ئەو لە خۆڕا نیگەران بێ.

پێشننوێژ قسەی لێ‌نەدەبڕا. لە تەواوی ناوچەکە دا هێچ‌کەس بە تایبەت بەسەرهاتی کوێرۆغلیی وەك وی نەدەگێڕایەوە.

شاکیر بەگ پرسی:

ــ هەواڵی تازە لەو بارەیەوە چیە؟ بۆیان کراوە بی‌گرن؟

ــ نا، هێشتا بۆیان نەکراوە. بە قەد خیزی دەریایە خەڵك بۆی وەدەرکەوتوون و لە چیای تووڕووسی دا لێی دەگەڕێن. دەستی لێ‌هەڵناگرن، تەنانەت کونە دووپشك و بن باڵی باڵندانیشی بە دوا دا دەگەڕێن.

شاکیر بەگ گوتی:

ــ جا ئەگەر ناوا بێ هەر دەی‌دۆزنەوە، دەی‌گرن و دەی‌هێنن لە پێش چاوی هەزار جووتێران، لە نێوەڕاستی مەیدانی شاری گوللەبارانی دەکەن!

لێره دا زەکی نەژاد دیسان وەجواب هات و بە تەوسەوە گوتی:

ــ بێگومان کاتێك گوللەبارانی دەکەن، چاویشی دەبەستن، وایە؟

شاکیر بەگ بە پێکەنینەوە گوتی:

ــ ئەڵبەت هەر وا دەکەن! جا نەتۆ بە کەیفی خۆت تەوسی خۆت باوێ جەنابی مامۆستای! ئەو ئەسپە سیمبۆلی چەتەکەی خاوەنی‌یەتی. ئەسپەکە بگیرێ و گوللەباران بکرێ، حەمەدۆك بۆخۆشی لە بەین دەچێ. کوشتنی ئەسپەکەی و کوشتنی حەمەدی هەر یەکە... ئەویش زۆری پێناچێ، دەگیرێ!

موفتی گوتی:

ــ قەت ئەوەیان بۆ ناکرێ! هێندێك ئەسپ هەن کە خودا لە خاوەنەکانیان زۆرتر ئاگای لێیانە. دەتوانم سەدان نموونە ئەسپی وات بۆ هەڵدەم. ئەسکەندەری گەورە، ئەوی جووتشاخ، بۆ خۆی مردوە، بەڵام ئەسپەکەی هەر وا دەژی. هەروەها ئەسپەکانی حەزرەتی عەلی و کوێرۆغلێش هەرماون! بوراقی حەزرەتی پێغەمبەری خۆمان، ئەویش هەر دەژی و دەشزانین کە پێغەمبەر بۆ خۆی زۆر لەمێژە نەماوە! ئەمن بە وردی بیرم لە ئەسپی حەمەدۆکی کردۆتەوە و بۆم دەرکەوتوە کە ئەو ئەسپە لە لایەن حەزرەتی خدری زیندەوە چاوەدێریی دەکری، یانی حەزرەتی خدر بۆخۆی دەیپارێزێ!

ــ نەمدەزانی جەنابت تا ئەو ڕادەیە حەمەدۆکت خۆشدەوێ ...

ــ وەڵامی ئەو قسەیەت چۆن بدەمەوە شاکیر بەگ؟ بڵێم ئەو ئەسپە ڕەسەنە جوانوویماینی خۆمە و حەمەدۆکیش حەق ئامۆزامە؟ بەڵێ؟

شاکیربەگ ڕاستەوە بوو و گوتی:

ــ ئێستا دەزانم، ئێستا تێدەگەم! هەر ئێوە پیاوە ئاینی‌یەکانن کە مێشکی خەڵکی لەو چەشنە وشکەباوەڕانە دەئاخنن. مستەفا کەماڵ ئێوەی پێ بێدەنگ نەکراوە، بەڵام ئاخری ئەو ڕۆژەش دادێ کە ئێوە بێدەنگ بکرێن! هەر نەزانی و خورافاتیش بوو بە هۆی ڕووخانی ئیمپراتۆریی عوسمانی!

کاتێك لە دەرگا دەچووە دەرێ، بۆ جاری ئاخر ڕووی وەرگێڕا و هاواری کرد:

ــ ئەوانەی دەڵێن ئەو کابرایە، ئەو خاین بە نیشتمانە و ئەو چەتە ستەمکارە شێخە، ئەوانەی دەڵێن ئەسپەکەی وی گیانلەبەرێکی پیرۆزە و ئەوانەی کە لە بەردەمی حاکم، قازی و ئەفسەرێکی ئەم دەوڵەتە، ئەو چەشنە درۆیانە دەکەن، ڕۆژێکی سزا دەدرێن!

پاشان بە پەلە وەدەرکەوت و ڕۆیی.

هەر ئەو ون بوو، خەلکەکە دەستیان بە لۆمەکردنی کرد. هەموو ڕابردووی شاکیر بەگیان بە وردی خستە بەر لێکۆلینەوە و ڕەخنەیان لە خۆی، لە بنەمالەی و لە خزمەکانی گرت. درۆ، پیلان و فێلوفەندەکانی‌یان خستە ڕوو و باسی ئەوەیان کرد کە چۆن ئەو دزە بێویژدانە پیاوکوژە تەواوی زەوی‌یەکانی ئەو دەشتەی بە کەلکوەرگرتن لە میدالێکی برۆنزی قەلب، کە بەندێکی سەوزی پێوە بووە و بە هەلکەوت دیتوویەتەوە، داگیر کردوە...

ڕۆژێکی کوێرۆغلی لە کاتێك دا بە سەر شاخی بەنگالی دا تێدەپەڕی، بە سێ تیران سێ مراویی کێویی کوشتن. لە مێرگی هەزاردەریاچان چادری سەوز و سووری هەلدا و بە مەیتەرەکەی خۆی گوت کە لە کانی‌یەکی ئەولاتری شوێنەکەی خۆیان، مراوی‌یەکان چاك بکا. مەیتەرەکە ئەسپەکەی لە کانی‌یەکەی ئاو دا و بەڕەلای کرد تا بۆخۆی لەو مێرگە لەوەڕخۆشەی بلەوەڕێ. پاشان دەستی بە چاککردنی مراوی‌یەکان کرد. تووکی لە یەکێکیان کردبۆوە و خەریك بوو دەی‌شوتەوە، کە لە نەکاو بالندەکە، ڕووتوقووت و بێ‌تووك، دە نێو دەستی دا زیندوو بۆوە، بالی بە خێرایی لێکدان، هەلفڕی و ڕۆیی. دوای وی دووەکەی دیش فڕین. مەیتەرەکە ترسا، بە غار چۆوە بۆ لای کوێرۆغلی و بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە. کوێرۆغلی ڕاست بۆوە و لیی‌پرسی داخوا ئەو قومێکی لەو ئاوەی خواردۆتەوە، مەیتەرەکە نەی‌خواردبۆوە. ئەدی ئەسپەکە؟ وەلامی دایەوە: وەللاهی ئەسپەکە تێروپڕی خواردۆتەوە. کوێرۆغلی گوتی: ئەو کانی‌یە، کانی ژینە و هەر زیندەوەرێکی لیی‌بخواتەوە، تازە نامرێ. هەر ئەو ئاوەش بوو کە حەزرەتی خدر لیی‌خواردەوە و بوو بە نەمر. با ئیمەش لیی‌بخۆینەوە! هەردووکیان غاریان دا کانی‌یەکەی، بەلام کانی‌یەکە هەلچۆڕابوو و چووبوو دە عەرزی مێرگەکەیەوە. کوێرۆغلی گوتی حەیف! ڕووداوێکی سەیر بوو! لەو ڕۆژەوە کوێرۆغلی، قارەمانی قارەمانان بە دوای ئەو ئاوەی دا دەگەڕێ. ئەو بۆخۆی زۆر لەمێژە چۆتە لای چلسوارەی غەیبی و قەت نامرێ. لە بەر خۆشی نیە کە دەیەوێ کانی‌یەکەی بدۆزێتەوە، بەلکوو لە بەر هەموو ئینسانەکانە ... هەموو جارێك کە پیی‌وا دەبێ کانی‌یەکەی دۆزیوەتەوە، لە خۆشی‌یان خەریك دەبێ بال بگرێ. هاوار دەکا و دەلێ: ئەوەتا ئاوی ژینم دیتەوە و ئەوەتا ژیانی هەتا هەتایە! هاوارەکەی لە نێو کێوان دا دەنگ دەداتەوە، بەلام ڕاست ئەو کاتەی کە چی وای نەماوە لە خۆشی‌یان بال بگرێ، دەبینێ چۆن ئاوەکە لە بن لاقی بلاو دەبێتەوە، هەلدەچۆڕێ و دەچێتە نێو هەزاردەریاچان، کە لەوێ ئاوەکان تێکەل دەبنەوە! بالندەی وا لە ئاسمانێ هەن کە قەت نامرن و ئەوەش ئەو بالندانەن کە کوێرۆغلی ڕاوی کردبوون

و دوایەش کە ئاوی کانی‌یەکەیان چوو دە لەشی‌یەوە، زیندوو بوونەوە و فڕینەوە. کوێرۆغڵی هەم باڵندەی خۆشدەویستن و هەم ئەسپ. هەربۆیەش لەو دووانەی نەمر کردوە... پارێزەری ئەو چەشنە ئەسپانەش حەزرەتی خدرە. ئەو ئەسپەی بۆخۆی سواری دەبێ، ناوی "گورگی بۆر"ــە و ئەویش هەر نەمرە. هەر بۆیەشە کاتێك خەڵك هاواری خدری زیندە دەکەن دەڵێن: خدر، خدری سواری گورگە بۆری! ئەو ئەسپە دەتوانێ بە سەر ئاوێ دا بڕوا! ئەو ئەسپە بە سەر دەریایە دا دەڕوا، وەك تیشك بە سەر دەریاکەی دا تێدەپەڕێ و بە چاولێکنانێکی دەگاتە ئەو سەری دنیایە. بەڵێ، لەو ڕۆژەوە کوێرۆغڵی لەو دیوی کێوی قافێ بە دوای ئەو کانی‌یەی دا دەگەڕێ، کە ژیانی هەتا هەتایە بە مرۆڤ دەبەخشێ. گومانی تێدا نیە کە ئاخرەکەی هەر دەشی‌دۆزێتەوە و ئیدی نایەڵێ بچێتەوە نێو هەزار دەریاچان. لەوانەیە هەر ئێستا، لە شوێنێکی ئەم جیهانە، با بڵێین لە مێرگێکی کێوی هەزاردەریاچان، لە یەمەنێ، یان لە وڵاتی بەلقیسایە، لە لای شاژنی سەبایە، ئەوە خەریکە باڵندەی مردوو لە کانی‌یەکی هەڵدەکێشێ، بۆ ئەوەی باڵندەکان زیندوو بنەوە و هەڵفڕنەوە.

ــ ڕۆژێك سەرەنجام ئینسانەکان نەمر دەبن!

موفتی گوتی:

ــ هەرگیز دەستیان ناگاتە ئەو ئەسپەی.

حەمەد بیری کردەوە: هەر چۆنێك بێ بە ڕاستی ئەو ئەسپە شتێکی سەیرە، ئەوە چ هێزێکە ئەو ئەسپە هەیەتی!

مەلا عەبدوسسەلام کە هەتا ئێستا بێدەنگ و جووڵە دانیشتبوو، چاوی لە حەمەد، زەکی نەژاد و موفتی کرد و هێندێك تێیانەوە ڕاما. پاشان دەستێکی بە ڕیشی دا هێنا، تەسبیحەکانی خێراتر دە نێو قامکانی دا هێنا و برد و لە بن لێوی‌یەوە، وەك ئەوەی خۆی بدوێنێ گوتی:

ــ مرۆڤ دەتوانێ شتی زۆر گەورە بکا، ئەسپەکەش هەروا، باڵندە و مێش و تەنانەت...

پاشان پێکەنێ. ددانەکانی کە لە بەر سپی‌یەتی‌یە دەبریقانەوە، وەدەرکەوتن. هەر پیاوێکی سەرکەوتووی دڵ پڕ هیوا دەی‌توانی ئاوا پێبکەنێ.

ــ ئەو عەرزەی ئێمە شتی زۆر گەورەی لە دەست دێ.

حەمەد لە حاڵێك دا کە بە تامەزرۆیی‌یەوە چاوەڕوانی هاتنی سەیران، دایەحۆری و موسلیمی بوو و هەروا شێلگیرانەش بە دوای کابرای نەناسراو دا دەگەڕا کە ئیدی پەیدا نەببۆوە، هاتوچۆی بازاڕی دەکرد. سەری بە هەموو دوکانەکان دا دەکرد و دەچووە هەموو

قاوەخانەکانیش. دەو ماوەیەی دا تێکەڵاویی لە گەڵ خەڵکەکەی پەیدا کردبوو. ئێستا ئیدی ئەو هەموو کەسی دەناسی و هەموو کەسیش ئەویان دەناسی. لە گەڵ هەموو کەس قسەی دەکرد، گوێی دەدانێ و لە کاتی نارەحەتی دا هاودەردیی لە گەڵ دەکردن. زۆری پێنەچوو زانیاریی بە سەر وەزعی شارەکەی دا پەیدا کرد. چ دەو شارەی دا دەکرا و نەدەکرا هەمووی دەزانی. زۆر زوو لە گەڵ مامۆستا زەکی نەژادی بوو بە دۆست. زەکی پیاوێکی بەڕێز بوو. جارجار ڕەفتاری ساویلکانە و منداڵانە بوو و دەتگوت دە خەیاڵ دا دەژی، بەڵام لە سەر قسەی خۆی سوور بوو و ئامادە بوو گیانی خۆی لە ڕێگای بیر و باوەڕی دا فیدا بکا. ئەو بێئەملا و ئەولا پشتی حەمەدۆکی دەگرت و لە بەرامبەر هەر کەس و هەر شتێك دا بەرگریی لێدەکرد. هەمیشە باسی حەمەدۆکی دەکرد.

حەمەد وەك چۆن بایەخی بە دۆستایەتیی زەینوڵڵا ئەفەندی دەدا هەر بەو شێوەیەش پێوەندی و دۆستایەتی لە گەڵ ئاسنگەرەکان، سەرتاشەکان و فرۆشیارەکانی بە هێند دەگرت و لە بیری نەدەچوو کە لانی کەم ڕۆژنارۆژێك لە گەڵ مامۆستا زەکی سەریان بدا. هەروەها قازی، دادەستێن و پێشنوێژیشی، کە وەك گوتمان زۆر ئاشقی گێڕانەوەی هەواڵ و داستان بوو، چاو پێدەکەوت. ئەو هەواڵەکانی حەمەدۆکی وردتر و دوور و درێژتر بۆ حەمەدی دەگێڕایەوە. دەنگۆکان بە تایبەت سەبارەت بە ئەسپەکەی، زۆر بوون و هەرلەو کاتەش دا ئەوەندە سەیر و سەرسوڕهێنەر بوون، کە مامۆستا زەکی و حەمەد هەموو جارێ مات و حەیران دەبوون.

زەکی نەژاد گوتی:

ــ خەڵك ناوێرن بە ئاشکرا و بەو جۆرەی دەیانەوێ یارمەتیی حەمەدۆکی بکەن، هەر بۆیەش ئەوەندەی دەتوانن دەنگۆی سەیر و سەمەرە سەبارەت بەو ئەسپەی دروست دەکەن. ئەو ئەسپە بۆتە سیمبۆلی بزووتنەوە، سیمبۆلێك بۆ هەموو ڕاپەڕینەکانی مێژوو و بۆ هەموو ئەو شتانەی کە مرۆڤ بیریان لێدەکاتەوە و لە دڵی دا هەن ...

خەڵکی شارەکەی دوو بەش بوون. ئاسنگەرەکان، دارتاشەکان، کرێکارەکان، ئەوانەی لە مەزراکان دا کاریان دەکرد و هەموو کرێکارەکانی دیکەش لایەنگری حەمەدۆکی بوون و هەتا هەواڵێك لە لای شاخی ڕا سەبارەت بە حەمەدۆکی بۆ وان دەهات و بڵاو دەبۆوە، حەمەدۆك ستایشی زیاتر دەکرا و گەورەتر دەبۆوە، بەڵام لایەکەی دیکە، یانی بەشی دەوڵەمەندەکان هەر هەواڵە ڕەشەکانیان بۆ دەهات و ئەوانیش ئاواتیان ئەوە بوو، کە ڕۆژێکی هەواڵی مردنی حەمەدۆکی ببیسن. بەڵام کاتێك مەسەلەی ئەسپەکەی دەهاتە پێش، بێجگە لە شاکیربەگی،

هەموویان هاودەنگ بوون. هەر ڕۆژەی هەواڵێك سەبارەت بە ئەسپە کوێتی بڵاو دەبۆوە و ورد و درشتی خەڵك لە منداڵی حەوت ساڵەوە تا پیری حەفتا ساڵە بەو هەواڵە نوێیەیان دەزانی. هەرچی دەکرا سەبارەت بە جینسی ئەسپ لە هەموو دنیایە بگوترێ، ئێستا بۆ ئەسپی حەمەدۆکی ساز دەکرا و بڵاو دەبۆوە. لێرە هەموو کەس داستانی ئادەمی دەزانی.

ــ دەزانن ئیدی عەلی سەفابەگ چیی گوت؟ هەر ئەو کەسەی حەمەدۆك کوشتی. ئەو بە ئادەمی گوت: تۆ کە تفەنگچی‌یەکی ئاوا باشی، تۆ کە دەتوانی چۆلەکەی لە فڕینێ دا بنگێوی، دەبێ ئەو ئەسپەی بۆ من بێنی‌یەوە، جا چ بە زیندوویی و چ بە مردوویی... ئادەم لە وەڵام دا گوتی: جا ئاغا ئەوە چی‌یە، هەر ئەمڕۆ ئەسپەکەت بۆ دێنمەوە، بە مردوویی یان بە زیندوویی! پاشان ئادەم دەست دەداتە تفەنگێ، فیشەکدانی لە خۆی دەبەستێ و دەڕوا بۆ دەشتی ئاناوارزای. ئەسپەکەی لەبن پەڵکێکی دەبینێ، زۆر خۆشحاڵ دەبێ، بە جوانی سێرەی لێدەگرێ و کاتێك دڵنیا دەبێ کە ئەسپەکەی بە تەواوی دە بەر سێرە دایە، پەلەپیتکەی دەبزێوێ. ئەسپەکە لە جێی خۆی نابزوێ. ئادەم چۆك دادەدا و هەرچەندی فیشەکی پێیەتی، پێوەی دەنێ، بەڵام ئەسپەکە لە جێێ خۆی ناجوولێ و گوێشی پێ نابزوێ، هەروا ڕاوەستاوە، پاشوویەکی بە بەرزگی‌یەوە نووساندوە، کلکی ڕادەوەشێنێ و مێشان لە گوندێنی دەردەکا...

"ڕاست لەو کاتەی دا حەزرەتی خدر خۆی پێشانی ئادەمی دەدا و دەڵێ: کوڕی بنیادەمی خۆبەزلزان و لە خۆڕازی! ئەتۆ ئەو گوللانەت بە کوێوە نان؟ پێویست نیە پیاو ئەنگێوەیەکی وەك تۆ ناسراو بێ، تا لەو نێزیکەی ڕا تەقە لە ئەسپێکی بکا. لەوەندەی منداڵێکی پێنج ساڵەش زۆر بە هاسانی دەنگێوێ! ئاخ، کوڕی بنیادەمی کە تێناگەی، ئەوە یانی گرتن یان کوشتنی ئەو ئەسپەی قەدەغەیە. ئێستا بگەڕێوە و لە کۆڵ ئەو ئەسپە کوێتەی بەوە، دەنا خراپ دەبینی و لەشت دەبێتە خۆراکی کرمی ئەو باتلاغەی. خودا ئەو ئەسپەی بۆ حەمەدۆکی داناوە... بەڵام ئادەم گوێێ نەدا ئامۆژگاریی حەزرەتی خدری، هەر لە گۆڕایی‌یەکانی ئاناوارزای بەدوای ئەسپەکەی دا خولاوە. ئەسپەکوێتیش هەر گاڵتەی پێدەکرد، جاری وا بوو دەیکێشا نێو باتلاغی و جاری وا بوو لە نێو پۆلەشیلان و چاڵووکان خۆی پێ‌نیشان دەدا. دەنا وەدوای خۆی دەدا بۆ سەر ڕەوەزان، بۆ نێو پنچك و دەوەنان، بۆ قامیشەڵێنی، بۆ نێو زەل و لیتە و مرداوان. لە نێو پاناوك، ڕەوەز، دەشت و تەپکان دا هەر دەیهێنا و دەیبرد و ئادەمیش هەر لە دوای نەدەبۆوە. جلەکانی هەموو ڕیشاڵڕیشاڵ ببوون، دەست، دەموچاو و قاچی هەموو ببوون بە برین. ئیدی وەك بنیادەمی نەدەچوو و ببوو بە شتێکی سەیر. حەزرەتی خدر بەزەیی

پیّدا هات و دوو جاران خۆی نیشان دا: کوڕە بگەڕێوە و دەست هەڵگرە، دەنا دەستمت لە سەر لادەبەم و ئیدی ناتپارێزم، بەڵام ئەو زۆر تووڕە بوو و تەنانەت بە قسەی حەزرەتی خدریشی نەکرد. بەیانییەکی زوو، تاریك و ڕوونی بەیانی، ئەسپەکوێت لە نێو باتلاغی خۆی نیشان دا و پاشان کاتێك لێی نێزیك بۆوە، دەرپەڕی و غارێکی وا ڕۆیی دەتگوت باڵی گرتوە. ئادەم بە دوای داچوو و هەوڵی دا خۆی بگەیەنێتیّ، بەڵام دە باتلاغی دا چەقی و هەر لە ویّ قوم بوو. ئەسپەکە چاوی لیّبوو چۆن زەلەکە ئادەمی قووت دا.

ئادەم دەیقیژاند:

ــ ئەی هاوار، بەزەییت پێمدابیّ! وەرە دەرمهێنەوە ئەسپی جوان و بە نرخ، تکات لیّدەکەم!

هەتا قوم بوو، هەر دەیقیژاند. ئاخرەکەی ئاوای بە سەر هات و بوو بە خۆراکی کرمەکانی باتلاغی. ئێستاش ئەوانەی لە کاتی بوومەلێڵی بەیانی دا بە بناری ئاناوارزای دا دەڕۆن، گوێیان لە زایەڵەی هاواری ئادەمی دەبیّ ...

ــ دوور نیە حەمەدۆك بۆخۆی بشگیریّ و بشکوژریّ، بەڵام هیچ کاتێك، هیچ کەس بە نیازی گرتنیّ، دەستی وەیاڵی ئەو ئەسپەی ڕاناگا ...

لە لای ئاسنگەرێکی ڕیش سپیی چاوشینی تێکسرماو بوون، کە ئەو قسانە دەکران. ئەو پیاوە زوو لە کرێتای ڕا هاتبوو. زەکی نەژاد لیّی پرسی:

ــ ئەوانەی دەگوترین، دەبیّ ڕاست بن وەستا خەیری.

ــ نا، چونکە ئەگەر حەزرەتی خدر کەسێکی دە پەنای خۆی بگریّ، لەوانەیە دواتر ببێتە ئەسپێك، مێرووولەیەك، شتێکی ئاوا ...

## (١٠)

ژاندەرمەکان شەکەت ببوون. چەند شەو و ڕۆژ بوو بە دۆڵ و کێوانەوە ڕاوی ئەسپەکوێتی‌یان دەکرد. هەموو جووتێری ئەو ناوچەیان بە لێدانێ شەلوکوت کردبوون و پێیان گوتبوون دەبێ ئەو دێو و درنجەیان بۆ بگرن، بەڵام ئەو کافرە تاوانبارانە نە بۆخۆیان ئەسپەکەیان دەگرت و نە بە وانیشیان دەگوت لە کوێ خۆی ون دەکا.

سەرجووخەیەك کە خەڵکی دەشتی شۆرەکاتی ئانتێپی بوو، دەی‌گوت:

ـ ئەمن بە ڕاستی سەرم لەو خەڵکەی ئێرە سوڕماوە. لە وڵاتی ئێمە خەڵك هەر خودایان خۆش‌دەوێ و ڕێز لە پێغەمبەری دەگرن، بەڵام لەو سەرشاخانە خەڵك ئەو ئەسپەیان خۆش‌دەوێ! ئەو ئەسپە بۆ وان بایەخی لە دایك و منداڵیشیان زۆرترە.

تەنیا هەر سەرجووخە و پیاوەکانی گورووپەکەی نەبوون کە هاتبوون و ڕاوی ئەسپەکەیان دەکرد، خەڵکێکی زۆری دیکەش هاتبوونە ئەو شاخانە و دێبەدێ دەگەڕان و وڵاتیان دەپشکنی. ئەو جووتێرانەی لە ژێر لێدان و ئەشکەنجە دا باسکیان شکابوو، ڕانیان ورد ببوو، سەریان شکابوو و ئازای لەشیان سووروشین هەڵگەڕابوو، ئەوەندە زۆر بوون، دە ئەژمار نەدەهاتن. ژاندەرمە وەك گژەبای ڕەش بە سەر توورووسی دا هاتبوون، بەڵام هەرچی زەبروزەنگیان بە کار هێنا، بێ‌سوود بوو. ئەوە هیچ کە کەس ئامادە نەبوو هاوکاری‌یان بکا و بۆ گرتنی ئەسپەکەی ڕەگەڵیان کەوێ، تەنانەت یەك کەسیش ئامادە نەبوو پێیان بڵێ ئەسپەکە لە کوێیە، یان زۆرتر لە کوێ دەبێ.

ئێوارێکیان سەرجووخە لە گەڵ گورووپەکەی چووە نێو دێیەکی. کوێخا و خەڵکی دێیەکەی نێویانگی ئەو گورووپەیان بیستبوو و دەیانزانی چەندە دڕ و بێبەزەیین. نیگەران بوون و

نەیاندەزانی چۆنیان لە دەستی ئەو زۆردارانە ڕزگاری دێ. هەربۆیە بە پیریانەوە چوون و بۆ ئەوەی شەڕی وان لە سەر خۆیان کەم کەنەوە، گاوگەردوونیان بۆ کردن و لە بەر دەرگای ماڵی کوێخای قۆچێکیان لە بەر پێی سەرجووخەی سەربڕێ. کوڕێکی مێرمنداڵ سەری قۆچەکەی بڕی و کاتێك کێردی بە ملی قۆچەکەی دا هێنا، خوێن فیچقەی کرد و لاقی سەرجووخەی بە خوێن بوو. ئەو ئیدی دەرهەڵبوو:

ـ هەی بێکیفایەتینە، گایەکیشم بۆ بکەنە گاوگەردوون، دیسان هەر بەزەیم پێتاندانایە. کێ دەتوانێ چاوپۆشی لە خەڵکێکی بکا، کە باوەڕیان بە ئەسپێکی‌یە . ئەمن هەرچۆنێك بێ، لێتان خۆش نابم!

وا دیار بوو لە سەرچاوەیەکی جێگای متمانەوە هێندێك شتی پێگوترابوو و دەیزانی چیی دەوێ: خەڵکی ئەو گوندە یان دەبوو، شوێنی ئەسپەکوێتی بۆ بدۆزنەوە، یان دەبوو ئەو ئەسپپەرستانە لە ژێر دارکاری و ئەشکەنجە دا بمرن.

بەو حاڵەش ئەوێ ئێوارێ سەرجووخە و پیاوەکانی هیچیان نەگوت، تەنیا نان و کەباب، هەنگوین و ڕۆنی کەرە و قەیماغیان خوارد و لە نوێنوبانی خاوێن دا کە ڕوولێفە سپی‌یەکانیان بۆنی سابوونی بۆنخۆشی لێدەهات، خەوتن و حەسانەوە.

بەیانیی ڕۆژی دواتر سەرجووخە دەستووری دا بە کوێخای:

ـ هەموو خەڵکی ئەو دێیەم بۆ خڕ کەوە. ئێوە دەبێ ئەو ئەسپەم بۆ دە داو خەن و بۆشم بێنن. ژاندەرمەیەکم لە گەڵە عەلی کەرتیش لە چاو وی ملایکەیە! لە سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراویشەوە زانیاریی پێویستم پێدراوە. جا ئێستا یان بە خۆشی ئەسپەکەم دەدەنە دەستی و خۆتان ئاسوودە دەکەن، یان ناچارم دەکەن جۆرێکی دیکەتان لە گەڵ بجوولێمەوە.

ـ سەرجووخە ئەتۆ دەزانی ئەو ئەسپە خەڵاتێکی پێوە بەسراوەتەوە و خەڵاتەکەش هەزار و پێنسەد لیرەیە؟

ـ بەڵێ دەزانم.

ـ ئەدی دەزانی کە ئەوان گوتوویانە ئەوەندە کەمە و خەڵاتەکەیان کردۆتە سێهەزار لیرە؟

ـ ناوەڵڵا کوێخا نەمزانیوە!

ـ دەی ئەوە زانیت.

ـ جا باشە پاشان؟

ـ جەنابی سەرجووخە بیری لێبکەوە! بۆخۆت دەزانی سێهەزار لیرە سێسەد گاجووتی پێدەکڕدرێ. هەروەها بەو پوولە پیاو دەتوانێ ڕەوەیەك ئەسپ و مێگەلێك مەڕیش بکڕێ.

ـ بەڵێ وایە کوێخا، دەزانم!

ـ کە وابوو ئەگەر ئەو ئەسپە لەو دێیەی ئێمە بوایە، هەر ئێستا و زووتریش لە ئێستا دەمگرت، دەمبردە شاری، خەڵاتی خۆم وەردەگرت، زۆر دەوڵەمەند دەبووم و پاشماوەی ژیانم بە ئاسایش و خۆشی دەبردە سەر!

ـ ئەوەش بەو مانایەیە کە ئەسپەکەم نادەیە دەستی!

ـ نەخێر، ئەوە بەو مانایەیە کە ئەسپەکە لێرە نیە.

ـ ئەمن بیستوومە کە ئەو ئەسپە لە دەوروبەری ئەم گوندە دەخولێتەوە.

ـ ئەمنیش ڕاست ئەوەم بیستوە، بەڵام قەت چاوم پێی نەکەوتوە! تەنانەت یەك جاریشم نەدیوە!

ـ باشە ئەگەر دیبات و زانیبات لە کوێیە، دەتگرت و دەتدا بە ئێمە؟

ـ نازانم ...

ـ بەڵام ئێوە ئەو ئەسپەی دەپەرستن!

ـ ئەستەغفیروڵڵا، سەرجووخە!

ـ پێغەمبەر و کتێبێك کە ئێوە پەنای بۆ دەبەن، ئەو ئەسپەیە؟

ـ دەسبەجێ داوای لێبووردن لە خودای بکە سەرجووخە! ئەستەغفیروڵڵا! ئەو قسەیەی کردت کوفر بوو! تۆبەی بکە!

ـ ئێوە لە خودای ناترسن، لەو ئەسپەی دەترسن!

ـ خوایە تۆبە، ئەستەغفیروڵڵا.

ـ ئەستەغفیروڵڵا و تۆبەی چی، بێکیفایەتینە. پێتانوایە ئەگەر ئەسپەکەمان بۆ بگرن، گوناهتان دەگاتێ! یاڵڵا دەفتەری سەرژمێریی خەڵکی ئاوەدانییەم بۆ بێنە!

ـ هەر ئێستا سەرجووخە!

ـ هەموو دەبێ لەو مەیدانەی نێو دێی کۆ ببنەوە! دەفتەرەکەشت لە بیر نەچێ! هەموو شتێکی تازەی تێدا نووسراوە؟

ـ بەڵێ سەرجووخە.

پیاوێکیان ناردە سەر گابەردێکی. کابرا گوڕاندی:

ـ خەڵکی دێی! هەرکەس هەرچی زووتر نەیەتە ئەو مەیدانەی نێوەڕاستی دێی، کە هەموو خەڵکەکە لە وێ کۆ دەبێتەوە، وەك تاوانبار چاو لێدەکرێ! سەرجووخەی زۆر بەڕێز و خۆشەویستمان، سەرجووخە بەکر لە ئیدارەی ژاندەرمەوە، لە وێ چاوەڕوانتانە. هەر کەس نەیە،

بە توندی سزا دەدرێ. ئەوەش بزانن کە دەفتەری سەرژمێریی دێی بە سەرجووخەی زۆر بەرێزمانە و کەسێك لە وێ نەبێ، دەزانێ.

سەرجووخە چوو بۆ شوێنی کۆبوونەوەکەی و کوێخاشی بە دووەوە بوو. شوێنەکە گۆڕاییی‌یەکی بەرداوی بوو و کانی‌یەکیشی لە نێوەڕاستی بوو.

سەرجووخە دوای ئەوەی یەك بە یەك ناوی خەڵکەکەی خوێندەوە و بە سەری کرنەوە، دەستووری دا بە پیاوەکانی کوێخایان لە عەرزی دا، لاقی‌یان بەست و بە قەمچی‌یان وەرگەڕانە بەری لاقی. کوێخا هاواری دەگەیشتە ئاسمانێ. دوای ماوەیەکی لاقی‌یان کردەوە و بە شەق و زللان ناچاریان کرد خۆ دە ئاوی کانی‌یەکەی هەڵکێشێ و دوایەش دەستیان بە لێدانی کردەوە.

ئەوێ ڕۆژێ ژاندەرمەکان نیوەی خەڵکی گوندەکەیان بە لێدانێ نیوەگیان کرد. کاتێك شەو داهات دەستیان هەڵگرت و هاتنەوە دیوەخانی کوێخای. ئەو شەوەش چەند سەر گوێلکیان بۆ کوشتبوونەوە، کەبابیان بۆ ساز کردبوون و هەروەها هەنگوین، قەیماغ، ڕۆنی کەرە و... یان بۆ دانابوون. کوێخای بەدبەخت بۆخۆی نەی‌توانی لە گەڵیان بێتە سەر سفرەی و داوای لێبووردنی لە سەرجووخەی کرد.

سەرجووخە بەکر کوڕێکی خراپ نەبوو، بەڵام ناچاربوو ئەرکی خۆی بەڕێوەبەرێ. بابی قاچاخچی بوو و زۆر جار ژاندەرمان دەیانگرت و دارکاری‌یان دەکرد. ئاخرەکەشی جارێکی ژاندەرمە لە سەر سنوور لە داویان خست و هەرچەندی هاواری کرد و پاڕایەوە، گوێیان نەدایە و کوشتیان. هەر لە بەر ئەوە سەرجووخە هێندێك هەستی هاودەردیشی تێدا هەبوو. دەنگی ناڵەناڵێ کوێخای لە ژوورەکەی تەنیشتی‌یەوە دەبیست و ئەوەش بۆ کەسێك کە بابی لە ژێر دارکاریی ژاندەرمان دا مردبوو، خۆش نەبوو. هەربۆیە ژاندەرمەیەکی نارد و ڕای‌ئەسپارد کە کوێخا دەبێ بێ‌دەنگ بێ، دەنا ...

ئەشکەنجە و ئازاری دێهاتی‌یەکان ڕۆژی دواتر و دوو ڕۆژ دواتریش، ئەگەر پێویست بوایە، دەبوو هەر درێژە بدرێ. یان دەبوو ئەسپەکەی بێنن و یان یەك کەسیش لە خەڵکی ئەو دێیەی بە سەرپێوە نەمابا و هەموو دە جێیە کەوتبان. بەڵام سەرجووخە پێی‌خۆش نەبوو خەڵکەکەی بکوژێ، ئاخر بابی خۆی بە دەستی ژاندەرمان کوژرابوو، لە سەر سنووری سووریەی، لە سەر دەهەزار لیرەی خوێڕی ... ئەو دێهاتی‌یانە دەبوو منەتباری بن! خۆ سەرجووخەی وا هەبوون کە ئەو هەستی هاودەردی‌یەیان نەبوو ...

ڕۆژی دواتردێ ئاڵۆز بوو. خەڵك بە سرتە و بە پارێزەوە یەکتریان دەدواند. سەرجووخە نەی‌دەزانی بۆ وایە. لە هێندێکانی پرسی، بەڵام وەڵامێکی وای وەرنەگرتەوە. سەرەنجام پیرێژنێك هاتە لای و گوتی:

ـ سەرجووخە بەکر، ئەتۆ لەخۆڕا سەروسەکوت و لاقولەتەری پیاوەکانی ئێمە تێکدەکەیەوە. ئەسپە کوێتی حەمەدۆکی ئەوەتا لە خوارەوەی دێیە! هەموو کەس دیویەتی و دەزانن ئەوە ئەو ئەسپەیە کە تۆ لێیدەگەڕێی، چونکە هەموو خەڵکی ئەو شاخانە دەیناسن. ئێستا ئەوە لەو مێرگەی خوارێیە. بۆخۆی هاتوە و ڕەگەڵ ڕەوەی دێی کەوتوە و ئەوە لە وێ دەلەوەڕێ. دیارە ئەو ئەسپە لە نێو سەد ولاغانیش بێ، لە دوور ڕا دیارە و لێککردنەوەی لە وانی دیکە زەحمەت نیە. تەنانەت ئەگەر کەسێك تا ئێستاش نەیدیبێ و بۆ یەکەم جار چاوی پێیبکەوێ، دەسبەجێ دەزانێ ئەوە ئەسپە کوێتی حەمەدۆکی‌یە!

پاشان پێرێژنەکە بە تەوسەوە گوتی:

ـ فەرموو ئەگەر بۆت دەکرێ بۆخۆت بیگرە! دە بچۆ بیکوژە بەکرۆکە دلێرەکەم! دە بڕۆ دەی پیاوە ئازاکە! قارەمانە دەنگ شێرەکە!

ـ بێدەنگ بە پیرێژن! گاڵتەم پێمەکە! ئەمن گاڵتەم لە گەڵ ژنان نیە، تەنانەت لە گەڵ پیرێژنانیشم نیە. ئەمن عیزراییلی ئەو شاخانەم.

ـ جا ئەگەر وایە دە بۆخۆت بچۆ و ئەسپەکەی بکوژە، با وەك ئادەمیت لێبەسەر بێ! ئەگەر پیاوی بچۆ بیگرە، جا ئەو کاتی دەتبینم چۆن وەك هۆمەرە کەچەڵی مالۆێران دەبی! دە فەرموو ئەگەر دەوێری بۆ لای بچۆ! جا بزانە چۆن ئەسپەکە ئیفلیجت دەکا! بزانە چۆن کەڕ و کوێر و خوار دەبێ! دە بڕۆ دەی! ئەتۆ کە بابی خۆت کوشتوە، هەوڵی کوشتنی ئەو ئەسپەش بدە، با ئیدی دایکت چاوی بەو سەرو سەکوتە نیگریسەت نەکەوێتەوە!

پیرێژنەکە هەرچی بە سەر زاری دا دەهات، پێی دەگوت.

بەکر گوتی:

ـ ئەمن بابی خۆمم نەکوشتوە!

ـ بۆخۆت نەتگوت ژاندەرمان بابتیان کوشتوە؟

ـ با، وام گوت.

ـ دە باشە، مادام ژاندەرمە کوشتوویانە و ئەتۆش ژاندەرمەی، جیاوازی‌یەکی نیە، هەر وەك بۆ خۆت کوشتبێتت وایە، وانیە؟

ـ نەخێر جیاوازیی زۆرە. پێمگوتی دەمت گرێدە پیرێژن، ئاگات لە زارت بێ، توورە بم وات دە سەرەوە ناچێ ها!

پیرێژن بە سەری دا قیژاند:

ـ کەسێك بابی خۆی کوشتبێ، هەموو شتێکی لێ‌دەوەشێتەوە! ئەتۆ لە دەستت دێ منیش بکوژی و ئەسپەکەی حەمەدۆکیش بکوژی! دەی ئەدی بۆ ڕاوەستاوی؟ ئەوە نیە ئەسپەکە لەو خوارەوەوەیە... گوللەیەکی لە سەری دە و بی‌کوژە، دیارە ئەگەر گوللەی وات پێ‌بن، کە ئەو ئەسپەی ببڕن. دەی ئەگەر پیاوی بڕۆ و بی‌گرە!

سەرجووخە نەی دەزانی چ بکا، لە وێ ڕاوەستابوو و لە بن بارانی لۆمەی پیرێژنێ دا سەری لێ‌شێوابوو. ژنەش بێدەنگبوونی نەبوو.

سەرجووخە بە باشی ئەو بەسەرهاتانەی دەزانی. دەیزانی چۆن هۆمەرە کەچەڵ بە دوای ئەسپەکەی دا وە ڕەوەزێکی هەڵگەڕاوە و ڕاست ئەو کاتەی بە هەزار چەرمەسەری گەیشتۆتە سەرێ، هەڵخلیسکاوە، هەڵدێراوەتە نێو دۆڵێکی هەزار بە هەزار و لەتوپەت بووە.

بەسەرهاتی نادەمیش لە هەموو چوکووڕاوایە دەنگی دابۆوە و ئی تەحسین تاژیش کە هەوڵی دەداوخستنی ئەسپەکەی دابوو و برووسکە لێی‌دابوو، هەروا. تەحسین لە کاتێك دا ویستبووی تەقە لە ئەسپەکەی بکا، لە جێی خۆی وشك هەڵاتبوو. هەر کەس هەوڵی گرتنی ئەو ئەسپەی دابوو، بەڵایەکی بە سەر هاتبوو. سەرجووخە بۆخۆشی شتێکی لەو بابەتەی دیبوو. ژاندەرمەیەکی خەڵکی عورفای کە ناوی شەهمووز بوو، سوێندی خواردبوو و گوتبووی شەرت بێ هەتا ئەو ئەسپەی نەگرم، ڕوو دە وڵاتی خۆم نەکەمەوە. سێ ڕۆژ دواتر کوڕێکی چاردە ساڵەی خەڵکی گوندەکەی خۆیان تەقەی لە شەهموززی کردبوو، حەوت گوللەی لە سەری دابوو و کوشتبووی. دواتر دەرکەوت کە بابی ژاندەرمە کوژراوەکەی بابی ئەو کوڕەی کوشتبوو ...

ـ پێم‌گوتی ئەگەر پیاوی هەر ئێستا بڕۆ ئەسپەکەی بکوژە! دەبینی ئەسپی حەمەدۆکی بۆخۆی هاتۆتە بەر دەستت. ئەگەر ڕاست دەکەی، ئەو دەرفەتەی لە دەست مەدە ...

خەڵکی دێیەکەی بە ناڵەناڵ و بۆڵەبۆڵ کۆ بوونەوە. تەنانەت کوێخاش کە دوو کەس چووبوونە بن باڵی، بە زەحمەت دەنگی دەردەهات و ڕوانینی کزی دڵی پیاوی دەسووتاند، هات و ڕووی دە سەرجووخەی کرد:

ـ سەرجووخە، وا دیارە ئەتۆ دە پیرۆزترین شەوی مانگی ڕەمەزانێ دا، یانی دە شەوی لەیلەتولقەدرێ دا لە دایك بووی. چاوت لێ‌بێ، ئەسپەکە بۆ خۆی هاتۆتە لات. ئێستا دەبێ هەموومان بچینە خوارێ. ئەسپەکوێت لەو مێرگەی خوارەوە دەلەوەڕێ. قسەی تێ‌دا نیە ئەو دەزانێ کە ئەتۆ لێرەی و دە سۆنگەی وی دا ئێمە ئەشکەنجە دەکەی. هاتوە ئێمە ڕزگار کا. ئێستا ئێمە دەبێ هەموومان بە یەکەوە بی‌گرین و بی‌کوژین! پیاوەکانی تۆ ئەنگێوەن، بۆخۆشت

گوللەی نابوێری، وانیە؟ منداڵێکی پێنجساڵەش دەتوانێ ئەو ئەسپە گەورەیەی بنگێوێ. تەنانەت ئەو کابرا پیرەش کە کەس نازانێ چەند ساڵ دەبێ، بە چاوبەسراوییش دەیئەنگێوێ. بە ڕاستی ئەتۆ دە شەوێکی پیرۆز دا لە دایك بووی، چونکە ئەسپەکە بۆخۆی هاتۆتە بەر دەستت. دیارە ئەگەر بۆخۆت بی‌کوژی، سێ‌هەزار لیرە خەڵاتەکەش وەردەگری. دە فەرموون با بڕۆین. هەموو خەڵکەکە با بێ، پیاو، ژن، منداڵ، هەموو وەرن! یاڵڵا با بڕۆین و بی‌گرین، ئەگەر نەش‌گیرا، بی‌کوژین!

سەرجووخە سوور هەڵگەڕا، دەستەکانی لەرزین و ساتێك بێ‌ئەوەی هیچی پێ‌بگوترێ، چاوی دە چاوی کوێخایەوە بڕین. ژاندەرمەکانی دیکەش وەك وی نارەحەت بوون.

هەموو خەڵکەکە بەرەو خوارەوەی ئاوایی چوون. منداڵ لە پێش دا هەڵدەهاتن، دوای وان کچ و کوڕی جحێڵ دەڕۆیشتن، ئەو جار نەخۆشەکان و ئەوانەی ئەشکەنجە کرابوون و ژاندەرمەکانیش لە دوای هەمووان دەهاتن. لە قولینچکێکی مێرگەکەی کە لە شوێنێکی بەرین و خۆش هەڵکەوتبوو، لەوەڕی لە بەلەکان بوو و بەشێکی بە سێوەڕەیەکی ناسك داپۆشرابوو، هەموویان ڕاوەستان. ژاندەرمەکان ڕیز بوون. ڕەوەکە هێندێك واوەتر دەلەوەڕا، لە سەر یەك دووسەد ـ سێسەد سەر دەبوو و ئەسپ، ماین و جوانووی گەورە و بچووکی لە هەموو ڕەنگ و شێوەیەك تێدا بوو. هێندێکیان دەلەوەڕان، هێندێك ڕاوەستابوون و کلکیان لە بەر تاوێ ڕادەوەشاند. ئەسپە کوێتیش لە وێ بوو. سەرخۆش و لەخۆبایی بەرەو ئاسمان بەرز ببۆوە، باریك و بە دیمەن، چاوی شین و گەورە، گوێی بچووك، کەفەڵی پان، یاڵی ڕەش و درێژ، تووکی بریقەدار و کلکی ئەوەندە درێژ بوو، کە هەتا سەر سمی دەهات. کاتێك ئەسپەکان چاویان بەو هەموو خەڵکەی کەوت، هێندێك ئالۆز بوون، بەڵام بڵاو نەبوون. ئەسپە کوێت سەری هەڵێنا، ملی درێژ کردەوە، کونەلووتەکانی قووچاند، کلکی هەڵێنا و هێندێك بەرەو دارستانی تەنیشتێ غاری دا. پاشان گەڕایەوە، بە وێرغە گەڕێکی بە دەوری ڕەوەکەی دا لێدا و ڕاوەستایەوە. دیسان سەری هەڵێنا، پڕماندی، ملی ڕاوەشاند و حیلاندی. جار بە جار دەنگی حیلەی دە شاخان دەگەڕا و دەبیسرایەوە. دەتگوت ناتوانێ لە جێی خۆی بجەجمێ. ئەو جار بە قۆرتە بە دەوری ڕەوەکەی دا سووڕا و چەند جار ئەوەی دووپات کردەوە، بەڵام جار بەجار بازنەی سووڕدانەکەی لە ڕەوەکەی نێزیکتر دەکردەوە. پاشان ڕووی بۆ لای حەشیمەتەکەی وەرسووڕاند، وەك ئەوەی دەچوو کە چاوی لە هەمووان کردبێ و دوای ئەوەش سەری ڕاوەشاند و چوارناڵ بەرەو هێندێك پنچك کە لە لای خوارەوەی مێرگەکەی بوو چوو. ئەسپ و ماینەکانی دیکە

نەجوولاّبوون، هەروا لە بەرتاویّ سەریان بەرداُبۆوە و ڕاوەستابوون. تەنیا کۆمەڵێك جوانوو دەهاتن و دەچوون و دەخولانەوە. جۆگەیەك لە لای پنچکەکان بوو، ئەسپەکە لە ویّ جارێکی دیکەش حیلاندی. خەلکەکە دیتیان چۆن سەری هەڵێنا و دیسان چوارناڵ غاری دایەوە.

سەرجووخە و پیاوەکانی لە جێی خۆیان ڕەق ڕاوەستابوون. تفەنگەکانیان لە شانیان نەهێنابووە خواریّ و روخساریان سپی هەڵگەڕابوو.

پیرێژنەکە دیسان هاتەوە بۆلای سەرجووخەی. دەسماڵێکی سپیی لە سەرنابوو، لاواز بوو و گنجی دەموچاوی لە دوورەوە دیار بوون. ئێستا ئەسپەکە هێندێك شل ببۆوە و لە مەودایەکی کەم دا، وەك ئەسپی راهێنراوی سیرکی، هەر دەچووە پێشیّ و دەگەڕایەوە. ژنەکە گوتی:

ــ ئەوەتا ئەسپەکە لە بەرامبەر خۆت و ژاندەرمەکانتە. دەی هەولّ بدەن بیگرن! تفەنگەکانیشتان پڕن لە فیشەك، دەی ئەدی بۆ پێیەوە نانێن؟ دەی یاڵلاّ دەست پیّبکەن، با خەلکی دێش بتانبینن چ دەکەن!

پاشان ڕووی بۆ لای جووتێرەکان وەرگێڕا:

ــ ئەریّ بۆ وەدەنگ نایەن! خۆ هەمووتان دەزانن ئەوە ئەسپەکەی حەمەدۆکی‌یە، وا نیە؟

هیچ کەس وەدەنگ نەهات. سەرجووخە و ژاندەرمەکانی هەر وا سەرسام ڕاوەستابوون و دە ئەسپەکەیەوە ڕامابوون و خەلکەکەش چاویان لە وان دەکرد. ئەسپەکە لە بەر دەمی وان بە نەرمەغار دەهات و دەچوو. پیرێژن بە سەر سەرجووخەی دا قیژاندی‌یەوەو:

ــ دە فەرموو تەقەی لیّبکە و ئەسپی حەمەدۆکی بکوژە! ئەوە نیە بە بەر دەمتانەوە دیّودەچیّ. دەی ئەدی بۆ لە لێدانی خەلکی ئاسایی و ماڵوێران ئەوەندە ئازان ...

کوێخا تینی دا خۆی، بە زەحمەت هەستا و چوو بۆ لای پیرێژنیّ، بەلاّم زۆر نەڕۆیی، سەرەنگریّ بوو و کەوت. خەلکەکە غاریان دا و هەڵیان‌ئەستاندەوە:

ــ بەسە پوورە زارا، چی دی دەنگیّ مەکە!

ــ نەخێر ئەمن بیّدەنگ نابم، ئێوە دارکاری دەکەن و ئەشکەنجەتان دەکەن، بەلاّم وەك ژنان بیّدەنگ دەبن و هیچ نالێن. ئێستا دەتانەوێ ئەمنیش بە قسەتان بکەم، ها؟

ــ پوورە زارا بیّدەنگ بە و تووشی کێشەمان مەکە!

ئەو جار پێنج ـ شەش ژن هاتن، باوەشیان بە پوورە زارای داکرد و لە ویّیان دوور کردەوە.

لەو کاتەی دا ئەسپەکە گەڕایەوە بۆ لای ڕەوەکەی. دەتگوت دوای ئەو هەموو غاردانەی ماندوو بووە. ماینێك هاتە پێشی، گەڵی بلاّو کرد و میزی کرد. ئەسپە کوێت بە یاڵی دانووسا، یەك ـ دوو

جاری سووڕاند، بۆنی بە نێوگەڵی‌یەوە کرد و پاشان سواری بوو، هەردووک پێشووی لەملاو ئەولای لە پەراسووانی قایم کردن و قەپی بە ملی دا گرت. هەرچی ماینەکە هەوڵی دا خۆی لە ژێر قورسایی لەشی ڕزگار کا، بێ‌سوود بوو و ئەسپەکوێت تا بە تەواوی لێی‌نەهات، دەستی لێ‌هەڵنەگرت.

پاشان تاوی دا ماینێکی دیکە و لە ویش هات. دواتر ماوەیەك لە گەڵ جوانوو ماینێکیش گەمەی کرد و پێش ئەوەی لێی‌بێ قەپێکی وای لە ملی گرت، کە جێی ددانەکانی خوێنیان لێ‌هات. ئەو جار بە شەکەتی لە ڕەوەکەی دوور کەوتەوە و لە قولینچکێکی سەری بەردایەوە و ڕاوەستا.

ئێستاش خەڵکەکە هەر لە شوێنی خۆیان بێ‌دەنگ ڕاوەستابوون، چاویان لە وی دەکرد و چاوەڕوان بوون بزانن ژاندەرمەکان چ دەکەن.

ساتێك دواتر ئەسپەکە سەری هەڵێنا، پڕماندی و حیلاندی. دەنگی حیلەکەی ئاوازی دایەوە و پاشان هات ڕاست لە پێش خەڵکەکەی ڕاوەستا. دوای ئەوەی چەند جار چوارناڵ چووە پێشێ و هاتەوە دوایە، ڕۆیشت و دوور کەوتەوە. هێندەی پێ‌نەچوو لە سەرێ، لە سەر دوندی ڕەوەزان وەدیار کەوت. لە وێ لە بەر تیشکی ڕۆژێ ڕاوەستابوو و کلکی هەڵدەسووڕاند.

خەڵکەکە بە بێ‌دەنگی گەڕانەوە نێو دێی. ژاندەرمەکانیش بە دوایان دا هاتن. ئەوانیش بە تەواوی بێ‌دنگ بوون و ئەوەندە ماندوو بوون، کە بە زەحمەت هەنگاویان بۆ هەڵدەهاتەوە. هەموویان سپی هەڵگەڕابوون. لە نێو دێش ئیدی ڕانەوەستان، بارگەیان پێچایەوە و ڕۆیشتن بۆ دێیەکی دیکە.

## (۱۱)

هێشتا شار دە خەوێکی قووڵ دا بوو، کە عەلی‌یەشەل هەستا، خۆی دەبەر کردەوە و لە ماڵێ هاتەدەرێ. تاریکوڕوونی بەیانی بوو. کاتێك گەیشتە تەنیشت قەبران و نێزیك ماڵی ڕۆستەمە کوردی، هەوەڵ کەڵەبابی بەیانی خوێندی.

ــ ڕۆستەم! ڕۆستەمە کورد! کاك ڕۆستەم!

ــ ئەوە کێیە؟

ــ ئەمنم، عەلی‌یە شەل!

ــ ئەوە هاتم کاك عەلی، هەر ئێستا!

ڕۆستەم بە پەلە غاری دا دەرێ:

ــ یاخوا بەخێر بێی کاك عەلی، ئەوە خێرە شوکور؟! چۆنە بەو بەیانی‌یە زووەی هاتووی؟

ــ بەڵێ، خێر دەبێ ئیشاڵلا!

پاشان چوونە سەر سەکۆی پێش دەرگای ماڵەکەی.

ــ کاك عەلی قاوەی دەخۆیەوە، یان شیر؟ دەزانم هێشتا جەمی بەیانیت نەکردوە.

هەردووکیان لە سەر کورسیی دار لە بن دارپەڵکێکی گەورە کە لە پێش دەرگای ماڵەکەی بوو، دانیشتن. خێزانی ڕۆستەمی کە لەمێژ بوو هەستابوو و ماشێنەی بۆ منداڵان وەسەر ئاوری نابوو، کاتێك چاوی بە عەلی کەوت، حەوجۆشێکی لە پەنا دیزەی ماشێنەی لە سەر ئاورگەکەی دانا و هێندێك شیریشی دە تاوەیەکی چکۆڵە دا وەسەرنا.

ــ ڕۆستەم، بیستوومە کارێکی زۆر خراپت کردوە، هەر بۆیەش هاتوومە لات!

ــ چم کردوە، کاك عەلی؟

ـ بوویە کێشکچیی مورتەزاغای...

ـ بەڵێ، راستە...

عەلی‌یە شەل لێی چووە پێشێ:

ـ چۆن شتی وات کردوە؟ کەسێکی وەك تۆ کە لە گەڵ چەتەیەکی وەك بایرامۆغڵی لە شاخی بووە، چۆن دەبێ ئێستا چەشنە نۆکەرایەتی‌یەکی بکا کە گومانی تێدا نیە مەترسیی بۆ سەر ژیان و گیانی خۆی تێدایە!

ـ منداڵەکانم برسین کاك عەلی... دەبینی ئێمە لەو خانووە شڕەی پاڵ ئەم گۆڕستانەی، لە نێو مردووان دەژین. کاتێك کەسێکی وەك تۆ دەبێتە نۆکەر، بۆ یەکی چارەڕەشی هەژاری وەك ڕۆستەمە کوردی نەبێتێ؟

وەك ئەوەی دەچوو کە عەلی‌یە شەل باش قسەکەی ڕۆستەمی گوێ لێ‌نەبووبێ، هەروا کە لە جێی خۆی دانیشتبوو، چاوی دە مێوێکی‌یەوە بڕیبوو کە قەفقەف لە دارەکەی هاڵابوو:

ـ بە داخەوە ئەمن ئەو شانازی‌یەم بە نسیب نەبوو کە لە گەڵ پیاوێکی گەورەی وەك بایرامۆغڵی لە شاخی بم. ئەمن تەنیا کابرایەکی شەلی بێ‌دەسەڵاتم.

ـ ئەتۆ لە گەڵ چەتەیەکی وەك حەمەدۆکیی. پێتوایە خەڵکی ئەم شارەی ئەوەی نازانن؟ ئێوە بە یەکەوە مەحمووداغای کانی‌گوڵانتان کوشت. حەمەد گوللەیەکی لێدا و ئەتۆش گوللەیەك. هەموو کەس لەوەی ئاگادارە. خەڵك دیتوویانە کە تۆ چۆن حەمەدت بردۆتە ماڵە مورتەزاغای و ئەوێت پێ‌نیشان داوە.

ـ با ئەمن پرسیارێکت لێ‌بکەم!

ـ فەرموو کاك عەلی!

ـ ئەگەر حەمەد بێ و بیەوێ مورتەزاغای بکوژێ، ئەتۆ وەك کێشکچیی وی چ دەکەی؟

ـ حەمەدۆك قەت ناتوانێ بێتە نێو ماڵی مورتەزاغای.

ـ بۆ ناتوانێ؟

ـ دەست و تفەنگی من وەك دەست و تفەنگی خەڵکی دیکە نیە، عەلی‌یە شەل!

ـ یانی ئەتۆ ئامادەی لە سەر مورتەزاغای حەمەدۆکی بکوژی؟

ـ ئەدی بۆچی مورتەزاغا بەکرێی گرتووم؟ پێتوایە بۆ ئەوەم پووڵ دەداتێ کە ئەگەر حەمەد بێ و بیەوێ ئاغای بکوژێ، ڕێگای بۆ ئاواڵە بکەم و تەنانەت بڵێم، بەخێر بێی حەمەدۆك، مورتەزا دەو دیوەی دا نوستوە، فەرموو بچۆ سەرێ و بی‌کوژە!

ـ ئەگەر وا بیٚ، حەمەد هەتا ئەتۆ نەکوژیٚ، کەسی دیکە ناکوژیٚ!

ـ ڕەنگە واش نەبیٚ، خودا دەزانیٚ کێهامان پێشتر دەکوژرێین. بێجگە لە وەش بۆچما ئەتۆ نەتزانیوە کە حەمەد نەماوە؟ دەڵێین یان کوژراوە، یان بیٚسەروشوێن بووە و ئێستا مەلا فەرهاد بۆتە چەتە، جێی وی گرتۆتەوە و بەناوی وییەوە دەستەکەی بەڕێوە دەبا؟

کاتێك عەلی ئەوەی بیست، لەشی وە سەر ئارەقەی گەڕا، سەبر، بە شێوەیەك کە بە زەحمەت دەبیسرا، لێی پرسی:

ـ لە کویٚ ئەوەت بیستوە؟

ڕۆستەمە کورد قاقایەکی کێشا:

ـ هەموو کەس دەزانیٚ، کەس نیە لەو بازاڕەی بیٚ و ئەوەی نەزانیٚ. بچۆ لە لای ساڵە یەکچاوی سەرت بتاشە، زۆر وردتر شتەکەت بۆ باس دەکا. لە سەر خۆشت ...

ـ چ لە سەر خۆشم؟

ـ ڕەنگە بۆخۆت پێتوا نەبیٚ خەڵك دەزانن کە ئەتۆ لە نێو ئەم شارەی دەستی ڕاستی حەمەدۆکی. بەڵام پێویست ناکا لە وەی بترسی، چونکە تەنیا ئێمە ئەو بەشەی دەزانین و چ شتێك لەو بارەوە بە ئاغا و بەگەکان ناڵێین. دیارە مورتەزاغاش ئەوەی دەزانیٚ.

ـ کیٚ ئەو باسەی بۆ وی کردوە؟

ـ کەس بۆی نەکردوە، هەر بۆخۆی پێیزانیوە. مورتەزاغا ئەوەش دەزانیٚ کە تۆ ڕۆژی خۆی، جا درەنگ یان زوو، دەیکوژی. دەزانیٚ ئەگەر حەمەد ئەو شەوەی نەیکوشتوە، مەبەستی ئەوە بووە کوشتنی وی بە تۆ بسپێریٚ، تا تۆ تۆڵەی لیٚبکەیەوە. مورتەزاغا ئەمنی لە ترسی حەمەدی بەکریٚ نەگرتوە، بەڵکوو ترسی سەرەکی بۆ وی ئەتۆی و مەبەستی ئەوەیە کە من لە بەرامبەر تۆ دا بیپارێزم.

ـ بۆ ئەو کارەی چت دەداتیٚ؟

ـ زۆر شت ... عەرز، خانوێك، ئەسپێك، هەموو شتێك!

ـ ئەمنیش ئەوانەت دەدەمیٚ.

ـ بەڵام من بەڵێنم بە مورتەزاغای داوە.

تاوێکی چاك دمەچەقەیان بوو. عەلی‌یە شەل دەیگوت دە هێندی مورتەزاغات دەدەمیٚ، دەست هەڵگرە! بەڵام ڕۆستەمە کورد هەر ئەوەی دووپات دەکردەوە کە بەڵێنی بە ئاغای داوە و ناتوانیٚ بەڵێنەکەی بشکێنیٚ ...

ــ ئەگەر وا بێ هەر کامەو کەوتووینە لایەکی، ڕۆستەمی نارەقفرۆش؟
ڕۆستەم بە ئەنقەست شاقەلی کەواکەی لادا تا دەمانچەکەی وەدەرکەوێ و گوتی:
ــ بەڵێ ڕاست وایە!
ــ ڕۆستەم، ئەو دەمانچەیەی دەبەر پشتێنت دایە و خۆی پێوە ڕادەنێی، ڕاست ئەو دەمانچەیە کە مورتەزاغا زۆر پێش تۆ پێشکەشی منی کردبوو.
ــ دەزانم عەلیبە شەل.
ــ ئەوەش دەزانی کە دواتر چیی بە سەر هێنام؟
ــ بەڵی دەزانم، بە شەقان لە دەروازەی وەدەرنای، و بە ڕووتوقووتی دە بازاڕی کردی. وانەبوو؟
ــ با، ڕاست وابوو، کەوا بوو بزانە و باوەڕم پێبکە ئەو ڕۆژەی ترسی حەمەدۆکی نەمێنێ، هەمان کاری لە گەڵ تۆش دەکا، کە لە گەڵ منی کرد.
ڕۆستەم گرماندی:
ــ ئەمن عەلیبە شەل نیم، بیەوێ وام لێبکا، دەمودەست دەیکوژم. ئەتۆ پیاوێکی فێڵەزانی و بە شێوەیەکی دەکوژی کە تاوانەکەی بکەوێتە ئەستۆی حەمەدی.
عەلی کە یەکجار کەم تووڕە دەبوو، ئەو قسەیەی ئەوەندە پێناخۆش بوو کە بۆ یەکەم جار لە ژیانی دا خۆی پێ زەوت نەبوو، ڕاست بۆوە، لاقی دە عەرزی کوتا و گوڕاندی:
ــ کە وایە خودا یان بە من دەدا یان بە تۆ! بەڵام گوێ بگرە با پێت بڵێم، وەباڵی چارەڕەشیی منداڵەکانت تەنیا بە ئەستۆی خۆتە!
ئیدی ڕانەوەستا، چوو دە نێو گۆڕستانەکەیەوە و ون بوو. ئەوەندە خێرا ڕۆیی، کە ئاسەواری شەلینێی پێوە دیارنەبوو، هەر لە چاولێکنانێك دا گەیشتە نێو قەبرەکان و لە پێش چاو نەما.
لەو ڕۆژەوە عەلی نیگەران بوو. هەرچەندی بیری دەکردەوە، نەیدەزانی چ بکا. ئێستا کە ڕۆستەمە کورد دەبوو بە کێشکچیی مورتەزای و پارێزگاریی لێدەکرد، تۆڵەکردنەوە لە مورتەزای بۆ وی دژوار دەبوو. ئەگەر کەسێك ئەو جار ویستبای مورتەزای بکوژێ، دەبوو پێشتر مشووری ڕۆستەمی بخوا، کە پیاوێکی ئازا بوو و وا هاسان چارەی نەدەکرا. تەنانەت ئەگەر ڕۆستەمیش کوژرابا، گرفتی دیکە پەیدا دەبوون، بایرامۆغلی و هاوڕێ کۆنەکانی تۆڵەیان دەستاندەوە. دیارە دەستە کۆنەکەیان هەڵوەشابوو، بەڵام دیسان پێوەندیی نێوانیان هەر مابوو.
ئەو فکرانە عەلییان زۆر ئاڵۆز دەکرد و هەر خودا دەیزانی دەبوو چ بکا ئەگەر حوسنی خانم ئەو ڕۆژە لێیڕانەسپاردبا ...
ڕۆژێکی کولفەتێك هاتە لای عەلیبە شەلی:

حوسنی خانم ناردوومی و دەڵێ:

ـ ئەوە دوایین جارە ڕایدەسپێرمێ. ئەو جار بە قسەم نەکا ئیدی هەتا هەم، نانێرمە لای و ناشیدوێنم. ئەوە ئاغا بڕیاری داوە ڕۆستەمەکوردی دەکاتە کێشکچیی خۆی و ئەمن زۆرم هەوڵ داوە پێشی بگرم، بەڵام گوێم ناداتێ. داوا لە عەلی دەکەم، لەمشەو نێزیکتر نیە، هەر ئەمشەو، دوای وەی خەڵك نوستن و نێو شاری چۆڵ بوو، بێ بۆ ماڵی ئێمە. بە قسەم نەکا، کارێکی باش ناکا. چونکە ئەمن کچی بەگزادەیەکی تورکمانم و هیچکەس لە سەرانسەری چوکووراوایە تا ئێستا بێقسەیی نەکردووم. هیچ کەس تا ئێستا ڕقەبەریی تایفەی ئێمەشی نەکردوە. ئەگەر عەلیئاغا تۆسقاڵێك ویژدانی هەبێ و نەختێك چاکەی منی لەبیر بێ، ئەوە دێ بۆ لام ...

ـ سلاوی من بە خانمێ بگەیەنە. بلێ دەستی ماچ دەکەم و هەر ئەمشەو دێمە لای. کاتێك قسەی لە گەڵ دەکەم، دەبێ مورتەزاغا لە ژوورێکی دیکە بێ.

نیوە شەوێ چوو بۆ لای ماڵی خانمێ و لە دەرگای دا. دەرگا دەسبەجێ کراوە. مورتەزاغا و حوسنی خانم لە سەر پلیکانان ڕاوەستابوون و چاوەڕوانی بوون. هەردووکیان جلی جوانیان دە بەر کردبوو. خانم چارشێوێکی بە سەرەوە بوو، کە قەراغەکانی بە دەزوویەکی زەردی زێڕین چنرا بوو، زنجیرێکی زێڕی دە ملی دابوو و باسکی دە بن بازنە زێڕەکانی دا ون ببوو. خانم کاتیك میوانی ڕێکوپێکی دەهاتن، بەو چەشنەی خۆ دەڕازاندەوە.

مورتەزاغا چەند شەقاوی بە پیرەوە چوو و دەستی گرت، تا لە پلیکانان وەسەر کەوت. چەند جاری بەخێرهاتن کرد:

ـ یاخوا بەخێر بێی. ئەتۆ هەر برای منی. دەمزانی نایەڵی چی دی چاوەڕوان بین و خەفەتت پێوە بخۆین. دەمزانی وەك لە کۆنەوە گوتوویانە قەت نینۆك لە قامکێ نابێتەوە و ئەو دڵێشییە کە ئاکامی گاڵتەیەکی بێجێ بوو، ماوەیەکی زۆر ناخایەنێ. ئێستا ئەمن بەجێتان دێڵم و لە گەڵ خانمێ قسەی خۆتان بکەن. جارێ خواحافیز برا گیان، دوایە یەکتر دەبینینەوە و دیارە قسەمان یەکجار زۆرە بیانکەین. دەڵێن مەلا فەرهاد حەمەدۆکی کوشتوە، هەروەها دەڵێن حەمەد چۆتە ئەنکەرەی... بەڵێ، بە ڕاستی زۆر شت هەن باسیان بکەین. لەو کاتەوە تۆ ڕۆیشتووی زۆر شت ڕووی داوە.

پاشان دەستەکانی بەرەو ئاسمان بەرز کردەوە.

ـ خودایە زۆر شوکور! زۆرت سوپاس دەکەم خوایە کە من برای خۆم ئەو جاریش لە لای خۆم دیتەوە! ئیدی داوای دیکەم لێت نیە. زۆر شوکور خوایە گیان!

لێره دا له پڕ هەڵوێستەیەکی کرد و گوتی:

ــ دەزانی ئەوەش دەڵێن که ئەسپەکەی حەمەدی گیراوه و ئەوه خەریکن بیهێنن بۆ ئێره، بەڵام ئەمن باوەڕ بەو دەنگۆیانه ناکەم ...

پاشان دەرگای له سەر پێوەدان و وەدەرکەوت.

دوای ڕۆیشتنی مورتەزاغای حوسنی خانم گوتی:

ــ عەلی، برای خۆم، هەرچی لەو ماڵەی دا داوای بکەی، دەتدەینێ. هەرچی بتەوێ... ئیدی باسی جلك، کڵاو و چەکمان ناکەین، ئەوه مافی خۆته هەتبن برام! بەهیچ شێوەیەك پێویست نیه باسی دەمانچه، زەوی و و خانووی ده گەڵ ئاغای بکەی، ئەوانه مافی بێتەملاوئەولای خۆتن و پێویست نیه کێشەیان له سەر بکەی... ئەوەی که پێویسته قسەی له سەر بکرێ، پووڵێکی باشه که دەبێ وەك مووچه بتدرێتێ. دەبێ مووچەی تۆ وەك داهاتی حاکم، یاوەر و دوکتۆری بێ...

عەلی له حاڵێك دا سەری بەردابۆوه، گوتی:

ــ بەڵێ، حەقدەستی من نابێ له ئی وانه کەمتر بێ.

ــ له سبەینی بەیانی ڕا!

ــ هەروەها ئەو ڕۆستەمه کورده نابێ پێی دەحەساری ئەو ماڵەی بنێتەوه. لەو بەر دەرگایەی بیبینم، سێودووی لێناکەم، دەیکوژم. ئەو وەك چۆن ئێستاش له گەڵ بایرامۆغڵییه، دەستی ڕاستی حەمەدۆکیشه.

ــ بەڵێنت پێدەدەم که ئیدی ڕۆستەمه کورد پێ دەو ماڵەی نانێتەوه، عەلی!

ــ خودا ڕاوەستاوت کا خانم!

ــ عەلی، با شتێکت بۆ بگێڕمەوه، که تا ئێستا کەس لێینەزانیوم، تەنانەت له لای مێردەکەم و منداڵەکانیشم باسم نەکردوه.

ــ فەرموو خانم.

خانم ڕوخساری سوور هەڵگەڕا و چاوەکانی وەك ئەوەی تای هاتبێتێ، بریقانەوه.

ــ ئەو شەوەی، ئەتۆ دەزانی، ئەو شەوەی که مەحموداغا کوژرا... من تۆم دی...

عەلی لەجێی خۆی وشك بوو. برووسکەیەك له بەری پێی ڕا هات و له تەپڵی سەری دەرچوو، ڕەوتی لێدانی دڵی توندتر بوو.

ــ ئەمن له بەر پەنجەرەی ژوورەکەی خۆم ڕاوەستابووم، بیرێکی ڕەش هاتبووه مێشکمەوه و نەیدەهێشت بنووم. کاتێك ئێوەم چاو پێکەوت، لاقەکانم وەك لۆکەیان لێهات و فیڕان. ئێوه له

پلیکانان وەسەور کەوتن، ئەتۆ دەرگای ژووری خەوەکەت کردەوە و پیاوەکەی دیکە چووە ژووریٚ. چونکە تاریك بوو، ڕوخساری پیاوەکەی دیکەم نەدەدی، بەڵام دەزانم کە ئەو لە تۆ کورتتر بوو. ئەتۆم هەر دەسبەجیٚ ناسی‌یەوە، چونکە تۆ دەشەلی. ئەتۆ شتێکت بە وی دیکە گوت و ئەو جار تەنانەت دەنگیشتم ناسی‌یەوە. دواتر دەنگی دەسرێژەکەی هات. ئەمن چۆکم نوشتانەوە و لاقم جووڵەیان لیٚبڕا. نەمتوانی لە بەر پەنجەرەکەی واوە بچم... وا بوو عەلی، ئەتۆ بووی، وا نیە؟

ــ ئەمن شتی لە تۆ ناشارمەوە، خانم، بەڵیٚ من بووم. بەڵام لەوەی دا سەرم سوڕ دەمێنیٚ کە چۆنە ئەو باسوخواسەت بۆ کەس نەگێڕاوەتەوە؟

ــ نازانم بۆ، هەرچۆنێك بووە نەمتوانیوە ئیدی... با ئەوەش بڵێم خەڵکی دیکەش ئێوەیان لە دەریٚ، لە نێو مەیدانیٚ دیوە، مانگەشەوێك بوو وەك ڕۆژیٚ... ئەوانیش هەر زانیویانە ئەتۆ لە گەڵ بووی و ئەوەیان بۆ مورتەزاغا و بەگەکانی دیش گێڕاوەتەوە... ئەمن سوێندم بۆ خواردن کە چەند کەسم دیوە خۆیان دە حەساریٚ ڕاکردوە، بەڵام ئەتۆیان لە گەڵ نەبووە، بەڵیٚ سوێندم بۆ خواردن.

ــ باشە خانم لە بەرچی ئەو چاکەیەت لە گەڵ من کرد؟

ــ بە ڕاستی نازانم بۆ، کردم ئیدی.

ــ ئەمن هەستم کرد کەسێك دیتووینی، بەڵام نەمدەزانی ئەتۆ بووی...

ــ هەرچەندی لێیان پرسیم هەر حاشام کرد و بەو شێوەیە لە گرتن و زیندانێم ڕزگار کردی.

ــ خودا ڕاوەستاوت کا، خانم، منیش لە بەرامبەر دا ئیدی بیر لەوە ناکەمەوە کە زیانم بۆتان هەبیٚ.

ــ با، عەلی، دەتبیٚ! ئەتۆ نیازت وایە درەنگ یان زوو مورتەزاغای بکوژی، بەڵام دەکریٚ لە بەر من و منداڵەکانم بی‌بەخشی. ئەو زۆر لە مردنیٚ دەترسیٚ و زۆریش لە تۆ دەترسیٚ.

ــ باشە خانم، ئێستا کە ئەو شتانە هەموو دەزانی، بۆچی ئەمن دەکەیە کێشکچیی تایبەتیی وی؟

ــ ئاغا هێندە لە مردنیٚ دەترسیٚ، کە هەموو ڕۆژیٚ هەزار جار دەمریٚ و دەژیتەوە و شەوانە قەت چاو لە سەر یەك دانانیٚ. ئەو دایمە پێی‌وایە کە دەکوژریٚ و ئەوەش هۆش و فامی لیٚبڕیوە. ئەگەر ئەتۆ لێرە بی، هێندێك هێورتر دەبێتەوە. بە بڕوای من مادام ئەتۆ ڕۆژێك هەر دەی‌کوژی، هەر ئەو یەکجارە بمریٚ باشترە لە وەی هەموو سەعاتان بمریٚ.

ــ لەوانەیە بۆچوونەکەی تۆ ڕاست بیٚ خانم... دەی، ئێستا ئەمن دەبیٚ بڕۆم.

ـ باشه، قبوولّی دەکەی کە جارێکی دیکەش بێیەوە، ببیەوە کێشکچی وی و بی‌پارێزی؟
عەلی‌یە شەلّ لە حالێك دا بە خەستی دە بیرەوە چووبوو، لە جێی خۆی هەستا. چەند جاران بێ ئەوەی بە خۆی بزانێ، لاقە شەلەکەی ڕاوەشاند، پاشان سەری بەرز کردەوە و چاوی دە چاوی خانمێوە بڕی:
ـ قبوولّی دەکەم، خانم، تەنیا لە بەر خاتری تۆ، لە بەر تۆ کە کچی بەگێکی گەورەی تورکمانی و لە گولّەباغی ناسکتری!
ـ ئێستا مەڕۆ، شەو زۆر درەنگە.
ـ نا، دەبێ بچمە لای مەلا دۆران ئەفەندی، سەری بدەم و بە ڕێز و حورمەتەوە داوای لێبکەم گەردنم ئازاد بکا.
ـ ئەو سەبارەت بەو شتانەی ڕوو دەدەن، باوەڕی چۆنە و چ دەلّێ؟
ـ ئەگەر ئاغایەك، بەگێك، دەولّەمەندێك و تەنانەت ئەگەر بابی خۆشی بمرێ، ئەو زۆری پێ‌خۆش دەبێ! ئەو دلّنیایە کە ئەمن ڕۆژی خۆی مورتەزاغای دەکوژم و تامەزرۆی دیتنی ئەو ڕۆژەیە... خواحافیز خانم، ئەمن سبەینێ دێمەوە.
عەلی لە حالێك دا شەکەت و ماندوو بوو و لاقە شەلەکەی بە دوای خۆی دا دەخشکاند، لە ژوورەکەی هاتە دەرێ و لە پلیکانان چووە خوارێ. مورتەزاغا کە لە ژوورێکی دیکە بوو و لە تاو ئەوەی کە بزانێ باسەکەی نێوان عەلی و خانمێ بە کوێ گەیشت، ئۆقرەی لێ‌برابوو، هەر کە دیتی عەلی ڕۆیی بە پەلە چووە ژوورەکەی خانمێ.
ـ چ بوو خانم گیان، باسەکەتان بە کوێ گەیاند؟
ـ تەواو بوو، قبوولّی کرد، ئاغا!
مورتەزاغا دەستی بەرەو ئاسمان پان کردەوە و بە دەنگی بەرز گوتی:
ـ خوایە سوپاس بۆ تۆ! سوپاس بۆ تۆ کە گیانی منت ڕزگار کرد!
پاشان خێزانی دە ئامێز گرت و ماچی کرد:
ـ خودا تەمەنێکی درێژت بداتێ، خانم گیان، ئەگەر ئەتۆ نەبای، قەت ئەو کافرەم بۆ ڕازی نەدەبوو. ئەو هەر لە سەر قسەی خۆی دەبوو و لە بڕیاری کوشتنی من پەشیمان نەدەبۆوە. بەلاّم ئێستا کە ئەو ڕازی بووە نانی مە بخوا و قاوەی مە بخواتەوە، ئەوە بەو مانایەیە کە ئیدی بیری کوشتنی منی وەلا ناوە، وا نیە؟
حوسنی خانم گوتی:

ـ قەتت ناکوژێ. عەلی‌یە شەل لە گەڵ ئێمە وەك برایانی لێ‌هاتوە.

ـ سوپاسی خوای گەورە دەکەم کە ئاوای بەسەرکردینەوە! دەزانی خانم ئەوان قەت ئەسپی حەمەدۆکی‌یان بۆ ناگیرێ، کە وا بوو ئەمنیش هەرگیز پووڵی خەڵاتەکەی نادەم و ئەو پووڵەم بۆ دەمێنێتەوە. بەشێك لەو پووڵەی دەدەم بە برای خۆشەویستمان عەلی!

ئیدی تا بەیانی خەویان لێ نەکەوت و هەر بە یەکەوە قسەیان کرد. خانم هەوڵی دەدا هەرچی زیاتر ئەو ترسەی کە لەمێژ بوو لە سەر دڵی مورتەزای ببوو بە بار، برەوێنێ. ئەو هەوڵێکی زۆری دا و دیارە ئاغاش بەو زووانە ئەو ترسەی لە دڵی نەدەچووە دەر. لە مەو دوا عەلی‌یە شەل ئاگای لێی دەبوو و ئاغا هێندێك دڵی دەحەسایەوە، بەڵام بە شێوەی کاتی، نەك یەکجاری، چونکە دواتر دیسان ترسی حەمەدۆکی دای‌دەگرتەوە و لە عەلی‌یە شەلیش دەترسایەوە. قەت لە بیری نەدەچۆوە چۆن مەحموداغای کانی‌یە گوڵان لە لای وی دە خوێنی خۆی گەوزی و ئەوەش ترسێکی وای لە دڵی دا دروست نەکردبوو کە وا هاسان برەوێ.

بەیانی زوو سوبحانەیان خوارد. مورتەزاغا دەبوو بچێتە ژاندەرمەخانەی و لە وێ لە گەڵ کوڕێکی چەند کەسی چاو لەو ئەسپانە بکەن کە خەڵك بە ناوی ئەسپی حەمەدی‌یەوە و بۆ ئەوەی خەڵاتەکەی وەرگرن، دەیانهێنان.

ـ خودا دەزانێ چەند لەو بێ‌وێژدانانە هەر یەکەو ئەسپێکی وە دوای خۆیان دەدەن، دێن و دەڵێن ئەوە ئەسپی حەمەدۆکی‌یە! هەمووشیان کەڵەکباز و درۆزنن. ئاخر ئێوە ئەسپی حەمەدۆکیتان بۆ دەگیرێ؟

کوڕەکە لە بەر دەرگای ژاندەرمەخانەی چاوەڕوانی وی بوو. مەلا دۆرانیش لە گەڵ بوو. ئەو ئەزموونێکی تایبەتیی دە ناسینی ئەسپان دا هەبوو. کاتێك مورتەزا گەیشتە لایان، مەلا دۆران پێی گوت:

ـ ئەتۆ گۆڕاوی، دەبینم کەیفت زۆر سازە. دەڵێی خەریکی بفڕی. وا دیارە هەست بە هێمنایەتی‌یەکی باش دەکەی. قسەی تێدا نیە لە گەڵ عەلی‌یە شەلی خۆمان پێك‌هاتووی!

مورتەزا وەڵامی دایەوە:

ـ نینۆك لە قامکێ نابێتەوە!

ـ مەلا دۆران گوتی:

ـ سوور دەزانم پشیلەت لە دەرکی کونە مشکێ بەستۆتەوە ...

مورتەزا بە ناڕەحەتی‌یەوە چاوێکی لێ‌کرد:

ـ ئەگەر ئەتۆ وای تێدەگەی، با...

بیست کەسێك دێهاتی و هەر بەو ڕادەیەش ئەسپی لەڕ و لاواز، کە بە زەحمەت دەیانتوانی خۆیان لە سەر لاقان ڕاگرن، لە حەساری ژاندەرمەخانەی ڕاوەستابوون و چاوەڕوان بوون. مورتەزا پرسی:

ــ ئەریٚ کابرا هێشتا لێرە ماوە؟

ــ لێرە دایکوتاوە و ناڕوا، دەڵێ هەتا دەمرم لێرە وەدەرناکەوم و ئێمەش پێمان وەدەرنانرێ. دەبێ خەڵاتی خۆی بدەینێ، دەنا بۆمان دەرناکرێ!

خەلیل بەگی گەورە گوتی:

دەی با ئێستا بچینە خوارێ و چاو لە ئەسپەکان بکەین. بڕوانە چ بەزمێکمان بۆ خۆمان ساز کردوە. کارەساتێکی سەیرە وەڵڵاهی، هەر خودا بۆخۆی دەزانێ چۆنمان لەو هەڵلایەی نەجات دەبێ!

یاوەر، سەرجووخە عەلی و ڕۆستەم بەگی مامۆستای مەدرەسەش کە بە دڵخوازی خۆی هاتبوو و لە هەمووانیش زیاتر گرینگیی بە کارەکەی دەدا، هاتنە خوارێ، لە گەڵ ئەوانی دیکە یەکتریان گرتەوە و لە حەسارێ، لە سەر کورسی‌یان، کە بە ڕیز بۆیان داندرابوون، دانیشتن. قەمچی‌یەك، تونگەیەکی پڕ لە ئاو، پەرداخێك و هێندێك فینجان، لە وێ، لە سەر کورسی‌یەکی، کە پارچەیەکی سەوزی پێدادرابوو، داندرابوون.

ــ با دەست پێبکەین، بە نۆرە بیانهێنن!

دێهاتی‌یەکی پیری پشتکوڕ، بە ڕیشێکی درێژی تەنك، ڕوومەتی چرچاوی و بەقووڵداچوو، پانتۆڵێکی دڕاو و کڵاوێکی خوری‌یەوە کە هەتا سەر برۆیانی داکشابوو، بە ئەسپەوە لە پێش هەمووان لە ڕیزەکەی دا ڕاوەستابوو و دیارە نۆرەی وی بوو.

ژاندەرمە پێیان گوت:

ــ ئەسپەکەت بەرە پێشێ!

کابرا هەوساری ئەسپەکەی ڕاکێشا، بەڵام ئەسپ لە جێی خۆی نەبزووت. پیرە جنێوی دا، بە شەقان لە بەرزگی ئەسپەی دا و گوێی کێشا، بەڵام ئەسپ سمی نەگوێزتەوە. ئاخرەکەی خەڵك و ژاندەرمەکان پاڵیان پێوەنا و ئەو جار بە حاڵەحاڵ دووـ سێ هەنگاو چووە پێشێ.

ــ یانی ئەوە دەبێ ئەسپی حەمەدۆکی بێ؟!

پیرەکە وەڵامی دایەوە:

ــ بەڵێ بۆخۆیەتی، ئەوە ڕەسەنترین و جوانترین ئەسپی ئەو وڵاتەیە!

ــ چۆن ئەو قسەیەت دەسەلمێنی؟

ـ سەلماندنی بۆ چییە، کاتێك دەڵێم ئەسپی حەمەدییە، یانی ئەسپی حەمەدییە ئیدی! پێتانوایە دەبێ مۆری          بە نێوچاوانییەوە بێ؟

سەیدیی مەیتەڕ گوتی:

ـ نا، ئەسپە کوێتی حەمەدۆکی مۆری          بە نێوچاوانییەوە نابێ، بە مەلاشوویەوە دەبێ. ئێستا چاو لە نێو زاری دەکەین و بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە ئەوە ئەسپی حەمەدییە، یان نا...

دوو ژاندەرمە سەری ئەسپەکەیان گرت و شەویلکەیان لێككردەوە. سەید بە وردی چاوی لە مەلاشووی کرد.

ـ چ نابینم... دەنگی دەن با بڕوا! یەکی دیکە بێننە پێش!

پیرە وە هاوار کەوت، دەنگی دەرنەدەهات و وەخت بوو بخنکێ:

ـ ئاخر ئەوە ئەسپی حەمەدییە. پێتاندەڵێم لێرە لاچێ، ئیدی نایبیننەوە!

بە هەموو هێزی خۆی هەوساری ئەسپەکەی دەکێشا، هاواری دەکرد و نارەقەی هەڵدەڕشت، بەڵام ئەسپەکە کەلاکێکی تەواو بوو و نەدەبزوت. پیرە پیاو بە تووڕەیییەوە چاوێکی لە کۆڕی بڕیاردەر، ژاندەرمەکان و خەلکەکەی دیکە کرد، بەڵام کەس گوێی نەدایە. سەیدی خەریك بوو ئەسپێکی دیکەی چاو لێدەکرد، تا بزانێ ئەویان مۆرە پیرۆزەکەی پێوەیە.

پیرە گرماندی، دەنگی ئەمجار بە شێوەیەك گڕ و بەهێز بوو، کە لە تەمەن و سیمای نەدەوەشایەوە:

ـ گوێم لێ بگرن، ئەو ئەسپە بە ڕاستی ئەسپی حەمەدییە! دەزانن بۆچی وا دڵنیام، چونکە دەزانم هەوە، دەزانم ئەو ئەسپەیە کە ئێوە بە دوای دا دەگەڕێن. ئێوە کە دەڵێن مۆری پێغەمبەری پێوە نیە، مەبەستتان ئەوەیە کە خەڵاتەکەم نەدەنێ، دەی مەمدەنێ، بەڵام دەبێ ئەو ئەسپەش مۆر و نیشانەیەکی تایبەتیی خۆی بەجێیەکی دیکەی لەشییەوە هەبێ.

پاشان کلکی ئەسپەکەی لادا:

ـ بڕوانە، بە سەر کەفەڵییەوەیەتی...

کلکی ئەسپەکەی بەردا و هەوسارەکەی گرتەوە:

ـ دیسان پێتان دەڵێم ئەوە ئەسپەکوێتی حەمەدۆکییە، ئەوە ئەمن گوتم و ئێوە بیستتان! ئیدی کەیفی خۆتانە!

شەقێکی لە ئەسپەکەی دا و بە دوای خۆی دا کێشای. ئەو جار بە نێو حەشیمەتەکەی دا ڕۆیی و دوور کەوتەوە.

سەیدیی پسپۆڕ یەکە بە یەکە نێو زاری هەموو ئەسپەکانی چاو لێکرد. زۆر بە ڕێکوپێکی، وەك کەسێك کە بڕوای بە کارەکەی خۆی هەیە، لە نێو زارییان ورد دەبۆوە، بەڵام هیچکام لە ئەسپەکان مۆرەکەیان پێوە نەبوو. خاوەن ئەسپەکان هەموویان بێ ئەوەی ڕەخنە بگرن و گلەیی بکەن، ڕۆیشتن. هێندێکیان ئەسپەکانیان لە نێوەڕاستی مەیدانی شاری بەجێهێشت و بەشێکیشیان لە قەراغ رووبارەکەی خوارەوەی شاری بەرەڵایان کردن. لەو ڕۆژەوە کە ئەو خەڵاتە دیاری کرابوو، ئەو شارە پڕ ببوو لەو جووتێرانەی کە هەر یەکە و ئەسپێکیان بە دوای خۆیان دا دەکێشا و دەیانگوت ئەوە ئەسپی حەمەدییە، دوایەش کە دەڕۆیشتن ئەسپە لەڕوولاوازەکانیان لە نێو شاری و دەوروبەری شاری بەجێدەهێشتن. ئێستا تەواوی کۆڵانەکانی شاری، مەیدانەکە، قەراغ چۆمی و تەپۆلکەکانی دەوروبەری شاری پڕ بوون لە ئەسپی پیر، شەل، کەلەلا، کوێر، لەڕ و نەخۆش.

یەکیان تێدا نەبوو بریندار نەبێ. قشقەڵەیان لە سەر پشتی دەنیشتن. قشقەڵەکان بە دندووکی برینەکانیان دەکۆڵین و وا خەریکی کاری خۆیان دەبوون، کە لە بیریان دەچوو لە نێو شارین، هەتا دەگەیشتنە نێوەڕاستی مەیدانێ و بە هەڵلای خەڵکی وەخۆ دەهاتنەوە، جا هەڵدەفڕین.

ئەو جار نۆرە گەیشتە قەدرییەکتکەی کە لە ڕۆژی یەکەمی خەڵاتدیاریکردنەکەیەوە لە حەساری ژاندەرمەخانەی خۆی بە عەرزی دادابوو. قەدری لە گوندێکی دەشتێوە هاتبوو. دەیانگوت زۆر پیرە، بەڵام پیێوەی دیار نەبوو، چونکوو قەت تووکی لە ڕدێنی شین نەببوو و کۆسە بوو. لاقی چەوێڕ و کەپۆی خوار بوو و چاوی بە قووڵدا چووبوون. قژی ئالۆز بوو و بە هەموو لایەکی دا بڵاو ببۆوە.

قەدری چاوی دە چاوی سەیدیی پسپۆڕەوە بڕی و گوتی:

ــ کاکە سەیدی، پیاوی چاك بە چاوێك لەو ئەسپەش بکە. ئەتۆ هەتا ئێستا هیچ شتێکت لە سەر ئەو ئەسپەی نەگوتوە. ئەو ئەسپە بە ڕاستی مۆرەکەی پێوەیە!

شەویلکەی ئەسپەکەی لێككردەوە و گوتی:

ــ وەرە بۆ خۆت چاوی لێبکە، یارەبی خودا لە بابت خۆش بێ! ئەوەی گوتت شتێکی باش بوو! گومانم لە وە دا نیە کە ئەو ئەسپە ئەو مۆرەی بە مەڵاشوویەوەیە. وەرە چاوی لێکە! ئەوەتا خاڵێکی گەورەیە، بۆخۆم دیتوومە! ئیدی ئەوە بێگومان ئەسپەکەی حەمەدۆکییە. هەر باش بوو هەوەڵێ کە یەکجێ گوتت ئەوە هەو نیە، نەرۆیشتم...

تفەنگەکەی لە عەرزی دانا و لە پێش کۆرەکەی ڕاوەستا:

ــ بە ڕاستی بەخت یار بوو کە ئەو هەڵەیەم نەکرد. ئەگەر بە قسەی ئێوەم کردبایە، دەبوو ئێستا لە مێژ با ڕۆیشتبام و ئەسپی حەمەدیم لە گەڵ خۆم لێرە دوور کردبایەوە. پاشان دەبوو

ئێوه هەتا دنیا هەیە، بە دوای مۆری                دا گەڕابان! هەر ئەو کاتی کە ئەو ئەسپەم لە سەر ترۆپکی چیای دوڵدڵی دۆزییەوە، زانیم ئەوە ئەسپەکەی حەمەدۆکی‌یە، بۆی وەسەر کەوتم. ئەسپەکە نەبزووت، بۆم ڕاوەستا و سواری بووم. لە بیرمە چاوم قووچاند، دەزانن کاتێك چاوەکانم کردنەوە، چم دی؟

ـ چی‌دی لە سەر مەڕۆ، پێم بڵێ بزانم چت دەوی؟

ـ نابێ خەلیل بەگ! قسەی مردن و ژینە! چۆن دەتوانم بەشێکی هەڵبوێرم و نەی‌گێڕمەوە. ئێستا گیانی من بەو مەسەلەیەوە بەسراوەتەوە، بەڵێ، نی ئێوەش لەو بەشەی دا... بە ڕاستی ئێوه چ دەکەن ئەگەر ئەسپی حەمەدیتان بۆ نەگیرێ؟ ئەمن دەبێ بۆم هەبێ قسەی خۆم بە تەواوی بکەم خەلیل بەگ!

مورتەزاغا گوتی:

ـ لێی‌گەڕێن با قسان بکا!

مەلا دۆرانیش هەر گوتی:

ـ با بزانین دەڵێ چی؟

یاوەر بە تووڕەیی‌یەوە دەستووری دا:

ـ دەی درەنگە بیڵێ یاڵڵا!

قەدری‌یە کتکە گوتی:

ـ خودا ڕاوەستاوت کا یاوەر! خودا تەمەنت درێژ کا. هەر ئێستا دەی‌ڵێم! یاوەر ئەتۆ دەبێ دە شەوی لەیلەتولقەدری مانگی ڕەمەزانێ دا لە دایك بوویی و هەر بۆیەش نەتهێشت ئەو دەرفەتە گرینگە لە دەست بچێ. ئاخر ئەو ئەسپە شتێکی پیرۆز و تایبەتی‌یە... ئەو ئەسپە قەت لە لووتکەی ڕەوەزەکان نایەتە خوارێ، لە شوێنێکی ئەوەندە بەرز دەژی، کە هیچ ئینسانێك دەستی وێی ڕاناگا و قەت پێی هیچ مرۆڤیکی نەگەیشتۆتێ! ئێوه هەزار و پێنسەد لیرەتان خەڵات بۆ کەسێکی داناوە کە بتوانێ ئەو ئەسپەتان بۆ بێنێ. ئەسپەکە ئەوە لە بەر دەستتانە. بەڵام ئێستا خەڵاتەکە دووقات بووە. ئەگەر ئەمن هێندێکی دی ڕاوەستابام ئەو خەڵاتە تا پێنجهەزار لیرە و زیاتریش، تا شەشهەزار، دەهەزار، چووزانم، بەڵکوو تا سەدهەزاریش دەڕۆیی! بەڵام ئەمن ڕانەوەستام، چونکە من نیشتمانی خۆم خۆش دەوێ. کەسێکم کە لە بەرامبەر دوژمنانی وڵاتەکەم دا سینگم کردۆتە قەڵغانێکی ئاسنین. ئەمن نەمدەتوانی ڕاوەستم و ئەو ئەسپەی تەحویلی نیشتمانی خۆم نەدەم! کاتێك ئەمن چاوم لە سەر یەك دانان و هەڵم‌هێنانەوە، تەماشام کرد ئەوە لە گوندەکەی خۆمانم. بیرم کردەوە، گوتم لێرە زۆر شتی گەورە ڕوو

دەدەن، کاری وا کە لە دەست ئینسانی نایەن. مەلایەك لە گوندەکەی ئێمەیە، پیاوێکی مەبارەکە، هەموو دنیایە گەڕاوە و بە چاوپێداخشاندنێکی هەموو قورئانێ دەخوێنێتەوە. هەموو شەوێ لە گەڵ پێغەمبەری قسان دەکا و پێغەمبەر پێیدەڵێ دەبێ چ بکا... ئەمن دەسبەجی ئەسپەکەم بردە لای ئەو پیاوە پیرۆزەی و ئەو زۆر بە وردی چاوی لە ئەسپەکەی کرد. تەنانەت کلك و سمەکانیشی چاو لێکردن! دەستی بە هەموو لەشی دا گێڕا و بە کورتی هەموو گیانی دی، بەڵام کاتێك شەویلکەی ئەسپەکەی هەڵپچڕی، ئیدی هەر شێت بوو و گوتی ماشەڵڵا خوایە لە گەورەیی تۆ. ئەو جار هاواری کرد: قەدرییەکتکە، ئەو ئەسپە مۆرێکی دە زاری دایە کە مرۆڤ بە هاسانی دەتوانێ ناوی خودای لە سەر بخوێنێتەوە، بەڵام لە لای کەس دەنگێ مەکە. پێت دەڵێم لە لای هیچ کەس باس مەکە، چونکە نابێ هیچکەس بزانێ کە ئەو ئەسپە شتێکی پیرۆزە! بیبەوە ماڵێ، ئیدی ماڵەکەت پڕ دەبێ لە بەرەکەت و پووڵ و سامان و سلامەتیت بۆ دەباری! ئەسپەکەم هێنایەوە ماڵێ و دوایە بیرم کردەوە و تێگەیشتم کە ئەوە هەر ئەو ئەسپەیە کە ئێوە بە دوای دا دەگەڕێن. چونکە نیشتمانەکەمان ئەو ئەسپەی پێویستە و منیش هاونیشتمانێکی وەفادار و دڵسۆزم، هەرچی شکی دەبەم و تەنانەت گیانی خۆشم دەکەمە قوربانی وڵاتەکەم. کە وابوو من ئەو ئەسپەی دەدەم بە ئێوە، بەڵام بە مەرجێك، چونکە بیستوومە دەیکوژن. دەبێ هەر ئێستا و هەر لێرە خەڵاتەکەم بدەنێ و ئەو جار دەبێ پێش ئەوەی بیکوژن، سێ ڕۆژان بەخێوی کەن و زۆر چاکی پیڕابگەن. بۆخۆتان دەزانن ئەو کەسانەی بڕیاری کوشتنیان دەدرێ، یان لە دار دەدرێن، پێش ئەوەی بڕیارەکە لە سەریان بەڕێوە بچێ، هەر ئارەزوویەکی هەیانبێ، بۆیان جێبەجێ دەکرێ! ئێستا ئەسپەکە برسییەو دوایین ئاواتیشی توورەسپێك ئالیکە...

خەلیل بەگ بە ناڕەحەتییەوە لێیپرسی:

ـ کە وا بێ ئەتۆ و ئەسپەکە یەکتریشتان دواندوە؟

قەدرییەکتکە بەو پرسیارەی خافڵگیر بوو و وەك ئەوەی داوای یارمەتی بکا، ڕووی دە مورتەزاغای کرد. وا دیار بوو هەموو کۆڕەکە گەمەیان بەو بەسەرهاتەی هاتبوو. قەدری ئەوەی پێناخۆش بوو و لە دڵی خۆی دا گوتی ئەگەر ئاوا پێویستم بەو پووڵەی نەبوایە، قەتم نەدەهاتم ئەو ئەسپەتان بدەمێ، بەڵام چونکە پیاوێکی زیرەك بوو، زوو ڕێگایەکی بۆ وەڵامدانەوە دیتەوە:

ـ بە وتەی ئەو پیاوە ئایینییەی گوندەکەی ئێمە، هەر حەیوانێك ئەو مۆرە پیرۆزەی دە زاری دا بێ، هەم لە ئادەمیزادی ئاقڵترە و هەم پیرۆزتریشە، هەر بۆیەش دەبێ پێش ئەوەی بکوژرێن، ئاواتەکانیان وەدیبێن! ئەمن لەو پیاوە خواناسەم پرسی کە من چۆن دەتوانم لە گەڵ ئەسپەکەی قسان بکەم، چونکە خۆ من زمانی ویم نەدەزانی!

لێرە دا تەواوی ئەندامانی کۆڕەکە قاقا پێ‌کەنین و قەدرییش وەك وان پێ‌کەنی. لە پڕ هیوایەکی هاتە نێو دڵی‌یەوە: دوور نیە بتوانم بەو وشە بژاردانەم بیانهێنمە سەر ئەو باوەڕە کە قسەکانم ڕاستن... خوایە هاوارم بۆ تۆ هێنا، یارمەتیم بکە! ئەو جار درێژەی بە قسەکانی دا:

ــ دوایین ئاواتی هەموو ئەو گیانلەبەرانەی ئەو چەشنە مۆرەیان دە زاری دا هەیە، ئەوەیە کە سێ شەو و ڕۆژان ئەوەندەی دەتوانن، بخۆن...

ئەو جار باسکەکانی تێکبەزاندن و دەنگی تیژ کرد:

ــ ئەگەر ئێوە کاغەزێکم نەدەنێ کە بەڵێن بدەن دوایین ئاواتی ئەسپی حەمەدۆکی بێننە دی، هەرگیز ئەسپەکەتان نادەمە دەستی، تەنانەت ئەگەر سەدهەزار لیرە، یان میلیۆنێکیشم بدەنێ!

درەنگ ببوو، هەموو برسی بوون. خەلیل بەگی گەورە هەستا سەر پێ و خۆی لە بەریەك کێشایەوە:

ــ ئای، ئای چەندە ماندووم. سەیدی ئەسپناس چاو لە نێو زاری ئەوەش بکە، بزانە نێوی خودای تێ‌دا نووسراوە!

پاشان پێ‌کەنی.

قەدریەکتکە وەخت بوو لە شەرمان بمرێ، بەڵام هێشتا هیواداربوو سێهەزار لیرەکەی وەدەست خا و دوارۆژی ماڵو منداڵی خۆی پێ دابین کا. هەربۆیە هیچی نەگوت و دڵخۆشیی خۆی بە وەی دایەوە کە پیاوە گەورەکان هەر ئاوا هەڵسوکەوت دەکەن ئیدی: هەموو بەگێك پێی‌خۆشە گاڵتە بە خەڵکی ئاسایی بکا...

بێ ئەوەی لە سەر سەیدی ڕاوەستێ، بۆخۆی غاری دا و زاری ئەسپەکەی هەڵپچڕی:

ــ فەرموو چاوی لێ‌بکە کاکی پسپۆڕی ئەسپان! دیتووتە لە خوارەوەی مەلاشووی نووسراوە "خودا" دیتت؟ خۆ بۆخۆت دیتت چ نووسراوە!

سەید زۆر بە وردی چاوی لێ کرد و تەنانەت لە بنی زمانیشی ڕوانی:

ــ هیچ نابینم. نە ناوی خودای لێ نووسراوە و نە ئایەتی قورئانێ! گاڵتەی مەکە قەدریەکتکە! دیارە ئەسپەکوێتی حەمەدی ئەسپێکی جوانە، بەڵام ئەوە کەلاکێکی لەڕولاوازی گرۆتییە!

قەدری هاواری کرد:

ــ ئەتۆ خوێندەواریت نیە و ناتوانی بی‌خوێنی‌یەوە. خەڵکینە پێم‌بڵێن کەسێك کە نە دەزانێ بخوێنێتەوە و نە دەزانێ بنووسێ، چۆن دەتوانێ ناوی خودای لە زاری ئەسپی دا بخوێنێتەوە؟

یاوەر دە ژاندەرمان راخوڕی و ئەوانیش هاتن بە مرخێش مرخێش قەدرییان بە ئەسپەوە لە حەساریّ وەدەرنا، بەڵام ئەو بیّدەنگ نەدەبوو و هەر هاواری دەکرد:

ــ لێرە نارۆم! ئەمن بە ئەسپی حەمەدۆکییەوە کە مۆری پیرۆزی دە زاری دا هەیە، لێرە، لە بەر دەرگای ژاندەرمەخانەی دەمێنمەوە. قەرار بیّ نە نانی بخۆم و نە ناویّ بخۆمەوە، هەر لێرە ڕادەوەستم، هەتا ئێوە نەختەنەقلێکتان دێتەوە دە کەللەی! با ئەمن بمرم، قەیدیّ ناکا، بەڵام ئەگەر ئەسپەکە ڕۆژێك بمریّ، ئەو ئەسپە هەڵبژاردەیە کە مۆری پیرۆزی پێوەیە، ئەو کات ئەو تاوانە گەورەیە نایەتە سەر ئێوە؟ بە ڕاستی ئێوە چۆن لە هەردووك دنیایان خۆتان لە ژێر باری سزای ئەو تاوانەی دێننە دەر؟

یاوەر سەری وەرسووڕاند و ڕووی دە عەلی کەرتیشی کرد:

ــ سەرجووخە عەلی، بزانە بیّدەنگی ناکەی!

خەلیل بەگی گەورە لە سەیدی پرسی:

ــ پێم بڵیّ سەیدی، ئەتۆ مەسەلەی ئەو مۆرە پیرۆزەت لە کویّ ڕا هێنا؟

سەیدی وەڵامی دایەوە:

ــ ئەوە شتێکی بیّمانا بوو کە هەر بۆخۆم سازم کرد. مەبەستم ئەوە بوو پیاوە پیرەکەی هەوەڵێی پیّ بیّدەنگ کەم، بەڵام ئیدی تووش بووم. لە مەو دوا ناچارم چاو لە نێو زاری هەرچی ئەسپە بکەم! زۆری پیّناچیّ کە لانی کەم هەزار ئەسپی دیکە لە مەیدان و دەوروبەری ئەم شارەی دا دەخولێنەوە، ئەویش چ چەشنە ئەسپ، پیرە کەلاکی وا کە لەمێژە لە کۆڵ کراونەوە.

دادەستێن کە لە سەرەتای هاتنی بۆ نێو ئەو کۆڕەوە بەردەوام سەبارەت بە ئەسپان پرسیاری جۆراوجۆری دەکرد، لەو قسەیەی باش تیّنەگەیشت و گوتی:

ــ لەمێژە لە کۆڵ کراونەوە یانی چی؟

مورتەزاغا بۆی ڕوون کردەوە:

ئەسپ کە پیر دەبیّ، ئیدی کاری پیّناکریّ. دەی کابرای جووتیار چی لیّبکا؟ ئەگەر بیکوژێتەوە، سوودێك نابا، چونکە گۆشتەکەی بە کەلکی خواردنیّ نایە و پێستەکەشی بۆ هیچ نابیّ. هەر بۆیە کابرا دەیبا لە شاخی بەڕەڵای دەکا. لە ویّ ئەوانە کۆ دەبنەوە و ڕەوەی سەد ــ سەد و پەنجا سەرییان لیّپێکدیّ و ئیدی بە شاخی دا دەخولێنەوە. بە تایبەت ساڵێك کە تفاق کەم بیّ و بەخێوکردنیان زەحمەت بیّ، جووتیرەکان ئەسپە پیرەکانیان وا لیّدەکەن. سەیدیش مەبەستی ئەوە بوو.

ـ ئەها، ئێستا تێ‌دەگەم. باشە دوایە ئەو ئەسپانە چی‌یان بە سەر دێ؟
ـ وردە وردە دەمرن. ئەوانەش کە جارێ نامرن، هەر ئەوانەن کە جووتیێرەکان دەیانگرنەوە، دەیانهێنن بۆ ئێرە و دەڵێن ئەوە ئەسپی حەمەدۆکی‌یە...
ـ ئێستا خەریکە بە تەواوی بۆم ڕوون دەبێتەوە مورتەزاغا...

شار گۆڕابوو. دەتگوت جێژنە. هیچ‌کەس شەڕ و کێشەی نەدەکرد و تەنانەت دەنگۆش کەم ببوونەوە. دەتگوت ئەو شارە قەت گرفت و ئاڵۆزیی تێ‌دا نەبووە. خەڵکەکە وەبیریان نەدەهات تا ئێستا سەردەمی وا خۆشیان دیبی و ئەوەش هەمووی دەگەڕایەوە سەر حەمەدۆکی. ئەو خەڵکەی لەو هەرێمەی دا دەژیان، بە تایبەت هەموو دەسکورتەکان، لاوەکان و جووتیێرەکان بە شەوقوزەوقەوە هەزار و یەك بەسەرهاتی حەمەدۆکی‌یان بۆ یەکتری دەگێڕایەوە. ئەو خەڵاتە کە لە بەرامبەر تەسلیم‌کردنی ئەسپی حەمەدی دا داندرابوو، هەمووی خۆشحاڵ کردبوون. هێندێکان دەیانگوت زۆری پی‌ناچێ دێهاتی‌یەکان ئەسپەکەی دەگرن، بەڵام ئەوانی دیکە سوێندیان دەخوارد کە هیچ‌کەس، هیچ‌کاتێك توانای ئەو کارەی نیە. پاشان کاتێك خەڵك ئەو ئەسپانەی لە هەموو نەوع و ڕەنگێکی دەدیت کە دەستە دەستە لێرە و لەوێ دەهاتن و دەچوون، وەك ئەوەی جێژنیان بێ، خۆشحاڵ دەبوون. ئەوانەی وەدوای خەڵاتەکەی دەکەوتن، ئەسپێکیان دێنا، بەڵام نەیاندەتوانی بی‌سەلمێنن کە ئەوە ئەسپی حەمەدۆکی‌یە. دواتر هەر ئەوانە لە نێو جادە و کۆڵانی شاری دەهاتن و دەچوون و هەزاران داستان و بەسەرهاتی سەیروسەمەرەیان بۆ ئەو ئەسپانە دروست دەکرد، کە بە هەزار حاڵ و بە ڕاکێشراکێش گەیاندبوویاننە وێ. لە هەموو شوێنێکی ئەو ئەفسانە و داستانانە دەگێڕدرانەوە، تەنانەت شێعر و بەیتی دووروودرێژیشیان سەبارەت بە ئەسپی حەمەدی دانابوون و دەیانگوتنەوە. ئێستا ئیدی هەموو منداڵە وردەکانی شاری بە داستانی ئەسپی سیحراویی حەمەدۆکی‌یەوە خەویان لێ‌دەکەوت.

کاتێك ژنان کۆ دەبوونەوە، لە باسی حەمەدۆکی زیاتر هیچ باسێکی دیکەیان نەدەکرد. ژنی یاوەری کە ئەو شارەی زۆر پی‌ناخۆش بوو و هەتا دەرفەتی دێنا، دەچووە شوێنی دیکە، ئێستا بە هیچ شێوەیەك پێی‌خۆش نەبوو لەو شارەی دوور کەوێتەوە و حەزی دەکرد هەمیشە دەو حاڵوهەوا خۆشەی دا بێ.

ئەو هەواڵانەی بە شاری دەگەیشتن، ژنیان زۆر پێ خۆشحاڵ دەبوون. هەموویان لایەنگری حەمەدۆکی بوون. تەنانەت حوسنی خانمیش! بەڵێ، تەنانەت ژنی هەموو ئاغا و بەگە گەورەکانیش کە دوور نەبوو نۆبەیان گەیشتبێتێ و حەمەد ئەم‌جار بیانکوژێ، کەیفیان بە حەمەدی دەهات. هەر نەبێ دوو ـ سێ جاران دە حەوتووی دا کۆ دەبوونەوە و باسی ئەسپی حەمەدۆکی‌یان دەکرد.

حەمەدۆك مێرمندالێكی چاونەترس و ئازا بوو و هێندە جوان بوو كە ئەوەی بەخت یاری بوو و چاوی پێی دەكەوت، دەحەبەسا، ئاگای لە خۆی نەدەما و ماوەیەكی زۆر دە ڕوخساری‌یەوە ڕادەما. ئەو لە گەڵ ژنان ئەوەندە نەرمونیان و بە سەرنجەوە هەڵسوكەوتی دەكرد، كە ژن هەموو خۆیان بە قوربان دەكرد. هێندە بە دیمەن و شكۆ بوو كە هەموو ژن و كچی تووڕووسی لە هەموو وەرز و هەوایەكی دا، باران با، بەفر با، شەماڵی هاتبا یان زریان، وشكانی با یان قوڕ و زەلەق، وەدوای پێوشوێنی دەكەوتن. حەمەد دڵی ژنانی نەدەشكاند، بەڵام چونكە ژنەكان زۆر بوون و بەردەوامیش ئی دیكەی دەهاتنە لای، لە نەكاو تەمەشای دەكرد ناچارە هەر شەوەی میوانداری‌یەتی لە دوازدە كچ و بێوەژنان بكا. ڕەنگە ئەوە شتێكی زۆر باش نەبێ، بەڵام ئاخر حەمەد چیی دیكەی بۆ دەكرا. كچەكان هێندە جوان و نەرمونۆڵ بوون...

ژنان داستانی وایان بۆ یەكتر دەگێڕایەوە، كە بۆخۆیان بە گێڕانەوە و بیستنیان سوورهەڵدەگەڕان. ئەوانی بوێرتر بوون، پێیان خۆش بوو بە وردی بزانن حەمەدۆك چۆن باوەشی بەو كچ و ژنە ئەویندارانە دا دەكرد و چۆنی ماچ دەكردن...

حوسنی خانم بە شێوەیەك ئەو داستانانەی دەگێڕانەوە، كە هەر ژنێك گوێی لێدەبوو، لە تاوی حەمەدی، كە قەتیشی چاو پێ‌نەكەوتبوو، وەخت دەبوو سوێی بێتەوە. ژنی سندووقداری لە هەموان زیاتر سوور هەڵدەگەڕا. ئەو ژنە چاوی گەورە، گەردنی درێژ و لێوەكانی گۆشتن و پتەو بوون و ئەوەندە جوان بوو، هەركەس دەی‌دی، ئیشتیای دەچۆیە. هەرچی لاوی ئەو شارەی بوو، وەخت بوو بۆی شێت بن. ئەو ژنە ئەگەرچی پێنج ساڵ بوو لە شاری دەژیا، شێوەی جلوبەرگی خۆی نەگۆڕیبوو و هەر وەك پێشووش دەدوا. هەمیشە بە كراسی شۆڕی ژنە دێهاتی‌یانەوە دەهات و دەچوو و تاسكڵاوێكی زەنگیانەداری سوورەتبەندی لە سەر دەنا، كە سوورەتەكانی زێڕ بوون، دەوراندەوری كڵاوەكەیان دەگرتەوە و لە سەر ویش دەسماڵێكی ڕەنگاوڕەنگی لە سەر دەنا. پاوانەی زێڕی نەقیم مرواری دە بەلەكانی دا بوو، دەستی پڕ بوون لە بازنەی زێڕ و كەمەرەیەكی زێڕیشی لە پشتێ دەبەست كە دەقیمەت نەدەهات. ئەو ژنە یەك كۆبوونەوەشی لە كیس خۆی نەدەدا. كە قسەكانیان دەگێڕانەوە، سوور هەڵدەگەڕا و لە حاڵێك دا چاوەكانیشی دەدرەوشانەوە، بە تامەزرۆیی‌یەوە گوێی ڕادەگرت. دەیانگوت حەمەدۆك، شەوێك پێش ئەوەی مەحموداغای كانی‌یەگولان بكوژێ، خۆی دە ماڵە سندووقداری ڕاكردبوو. زولفۆ لە ترسان چووبوو دە ژوورێكی‌یەوە و دەرگای لە سەر خۆی داخستبوو. ژنە جوان و شۆخوشەنگەكەشی ئەو شەوەی لە گەڵ حەمەدی ڕای‌بواردبوو. بەیانی، كاتێك حەمەد ویستبووی بڕوا، ژنە جڵەوی ئەسپەكەی گرتبوو، بەری پێی ماچ كردبوو و داوای لێ‌كردبوو لەگەڵ خۆی بەرێ. حەمەدیش گوتبووی خانمە جوانەكەم، ئەمن ئەتۆم

یەکجار خۆشدەویّ، بەڵام بتبەمە شاخی تووشی ناڕەحەتی‌یە دەبی. ژیانی شاخی بۆ تۆ نابیّ. بۆخۆت دەزانی خەجێی خێزانم چی بەسەرهات. ئەمن لە گیانی خۆمم خۆشتر دەویست، بەڵام نەمتوانی بی‌پارێزم و ئاخرەکەی بە گوللەی یاوەری کوژرا. ئەمن پێم‌خۆش نیە ئەتۆش ئاوات بە سەر بیّ، خۆشمەویستم! بەڵام دڵنیا بە جاروبار هەر دێم بۆ لات و یەك ـ دوو شەوان لە گەڵت دەبم... حەمەد ئەوەی گوت، ئاوزەنگی لە ئەسپی توند کرد و خێرا وەك برووسکەی لە ویّ دوور کەوتەوە. لە ویّ ڕۆژێوە ئەو ژنە بەستەزمانە ئۆقرەی لیّبراوە و هەر چاوی لە ڕێیەیە بزانیّ کەنگیّ حەمەد دێتەوە لای! ئەوە ڕاستە کە گوتوویانە: مەکەن مەنعی ئاشقان، ئیشق کاری دژوارە...

لە نێو هەموو ژنانی شار دا، تەنیا ژنی خەلیل بەگی گەورە بوو کە چووبووە خوێندنگەی ژنان لە ئەدەنەی. ئەو ژنێکی قەڵەو بوو و چونکە وشەی قەبەقەبەی تێکەڵی قسەکانی دەکردن، ژنەکانی دیکە نەیاندەتوانی زۆری گویّ لیّبگرن و ماندوو دەبوون. زۆریش تامەزرۆی قسان بوو و تەنانەت چووبووە لای ژنی سندووقداری و سەبارەت بەو شەوەی دەگوترا لە گەڵ حەمەدی بووە، پرسیاری لیّکردبوو: خوشکیّ ئەریّ تۆخوا ئەویّ شەویّ خۆش بوو؟ ئەدی حەمەد هاتۆتەوە بۆ لات؟ ژنەش وەك چەوەندەری سوور هەڵگەرابوو، تەنیا بە چاوە جوانە گەورەکانی ساتێك تێیەوە ڕامابوو و پاشان سەری بەرداێۆوە و هیچی نەگوتبوو. ژنی خەلیل بەگی لە دڵی خۆی دا گوتبووی: چاو ئەو ژنە چۆن سوور هەڵدەگەریّ! ئەوین و خۆشەویستی شتێکی هێندە ساکار نیە و ئیدی پرسیاری دیکەی لیّنەکردبوو.

ڕاستە باسی حەمەدۆکی زۆر دەکرا، بەڵام ئێستا زۆرتر ئەسپەکە سەرنجی خەڵکی بۆ لای خۆی ڕاکێشابوو. هەواڵی هەرە نویّ ئەوە بوو کە ئەسپەکە دە یەك ڕۆژی دا، لە پێش چاوی هەموو خەڵکی گوندێکی بە پیاو، ژن، منداڵ، پیر و لاوەوە، تەنانەت لە پێش چاوی کۆمەڵێك ژاندەرمە، لە چل ماینان هاتوە. ژاندەرمەکان ئەو هەلەیان بە دەرفەت زانیوە و ویستوویانە بی‌کوژن، بەڵام ئەسپەکە لە بەر مێشوولەی خۆی بزاوتبیّ، لە حاست ژاندەرمەکان تۆسقاڵێکیش نەجووڵاوە و ئەوانیش نەیانوێراوە تەقەی لیّبکەن. پاشان بە بەر چاوی ژاندەرمەکانەوە غاری داوەتە سەر ڕەوەزێکی گەورە لە سەرەوەی وان و لە ویّ، لە سەر سەریّ، سیّ جاران حیلاندوویەتی و شاخەکان ئاوازیان داوەتەوە، هەموو ماینەکانیش جوابیان داوەتەوە و حیلاندوویانە!

بۆ لای نیوەڕۆیە سەیدیی پسپۆڕی ئەسپان نێو زاری ئێزیك بە پەنجا ئەسپانی چاولیّکردبوو، کە بەڵیّ بزانیّ هیچیان مۆری پێغەمبەری‌یان بە مەلاشوویەوە هەیە، یان نا؟ بەڵام ئەوە کارێکی بی‌سوود بوو و شتێکی ئەوتۆی بۆ نەدۆزرایەوە. لە پێش دا دێهاتی‌یەکان خەریك بوون هەڵلایە بکەن، بەڵام کاتێك سەرجووخە عەلی کەرتیش هاتە پێشیّ، وەزعەکە هێدی بۆوە.

لەو کاتە دا سەلیم چەرکەس کە بە سەلیمە دزە بەناوبانگ بوو، گەیشتێ. سەلیم لە حاڵێك دا هەوساری ئەسپێکی کوێتی زۆر چاکی بە دەستەوە بوو و لە سەرەخۆ هەنگاوی هەڵدێنایەوە، هاتە نێو حەساری ژاندەرمەخانەی، لە پێش کۆڕەکەی ڕاوەستا و گوتی:

ـ با بزانم کێ دەتوانێ بڵێ ئەو ئەسپە، ئەسپە کوێتی حەمەدی نیە؟

سەلیم لەو ڕۆژەوە کە باسی خەڵاتەکەی بیستبوو، لە هەوڵی ئەوە دا بوو کە ئەسپێکی لە چەرکەسەکانی ناوچەی ئوزوونیایلای وەرگرێ، بە ناوی ئەسپی حەمەدی بیهێنێتە شاری و تەحویلی ژاندەرمانی بدا. یاوەر لە هەموو کەس چاتر دەیزانی کە ئەو ئەسپانە هەمویان دزێتین، بەڵام چیی نەدەگوت. بۆچما دەکرا لەو ماوەیەی دا کە هێشتا ئەسپەکە نەدۆزرابۆوە و خەڵاتەکە نەبەخشرابوو، کەسێك بە تاوانی ئەسپدزینێ بگیرێ؟ شتێکی وا هەم جوان نەدەبوو و هەم سوودێکیشی نەبوو! ویژدانی ڕێی نەدەدا کاری وا بکا.

سەیدیی پسپۆڕ چوو بۆ لای ئەسپەکەی و دەستووری دا بە سەلیمی:

ـ شەویلکەی هەڵپچڕە!

سەیدی وەك هەموو ئەو کەسانەی ئەسپیان بەخێو دەکردن و پسپۆڕی ئەسپناسینێ بوون، ئەسپدزی ناخۆشدەویستن. بیری دەکردەوە: جا وەرە ئەتۆ خزمەتی ماینێکی بکە تا دەزێ، ماینەکەت جوانوێکی جوانی ببێ، بەخێوی کە هەتا دەبێتە ئەسپێکی جوان و لە پڕ یەکێك بێ و لێت بدزێ! جا وەرە خۆت مەکوژە!

سەلیم چەرکەس گوڕاندی:

ـ یانی چی؟ بۆ شەویلکەی لێككەمەوە؟ دەتەوێ بزانی چەند ساڵە؟ بۆخۆم پێتدەڵێم و پێویست ناکا ئەتۆ دیاریی بکەی. ئەو ئەسپە پێنج ساڵە!

ـ شەویلکەی لێككەوە...

ـ پێمگوتی پێویست ناکا، پێنج ساڵە!

یاوەر تووڕە بوو و گرماندی:

ـ سەیدی چ دەڵێ، وا بکە و لە سەری مەڕۆ. سەیدی دەیەوێ بزانێ داخوا مۆری پێوەیە!

سەلیم چەرکەس ئیدی خۆی نەگرت و بە قسەی کرد. سەیدی چاوی لە نێو زاری کرد، زمانی هەڵدایەوە و پاشان گوتی:

ـ نا مۆری پێوە نیە! بەڵام ئەوە ئەسپێکی جوانە و بۆ ئەوەی دەبێ بڵێی ئەسپی حەمەدۆکی‌یە.

یاوەر گوڕاندی:

ـ ئەو ئەسپەی خێرا لێرە لابەن، تەنانەت ئەگەر ئەسپی حەمەدیش بێ و مۆرەکەشی پێوە بێ، هەر بێبەنە دەرێ. ئەو ئەسپە دزێتییە، خودا دەزانێ لە کوێت دزیوە!

ـ سەلیم چەرکەس حەبەسابوو و قسەی پێنەدەکرا، لەبەر خۆیەوە بۆڵاندی:

ـ مۆری پێغەمبەری چی؟ دە زاری دا؟!

یاوەر غاری دایە:

ـ یالڵا زوو بە وەدەرکەوە! یالڵا!

هاوکات لەگەڵ وەدەرکەوتنی سەلیمی، دورموشاغا کێچە پەیدا بوو، حەشیمەتەکە ڕێگایان بۆ کردەوە و هاتە ژوورێ. هەموو کۆڕەکە لە بەری هەستان و چاکوخۆشییان لە گەڵ کرد. دورموشاغا کێچە بەگێکی عەشیرەتێکی تورکمانی ئەو بەری جەیهانێ بوو. دەیانگوت بە ڕەچەڵەك دەچۆوە سەر شایەکانی خارەزمی و خودی جەلالەدینی خارەزمشای. دورموشاغا هەوساری ئەسپێکی عەرەبیی بە دەستەوە بوو. ئەسپێکی ڕەسەن، کە زینەکەی پەڕاوێزی زێرکفت و لغاوەکەی زێوکفت بوو. ئەسپەکە کۆمەڵێك نوشتووی دە ملی دا بوون، کە نوشتووەکانیش دە بەرگی زێرکفت گیرابوون و زەنگیانەی گەورەی سوور، شین و زەردیشیان تێگیرابوو. بەرچاوکەیەکی ڕەنگاوڕەنگی بە بەرچاوییەوە بوو و کلکیشی بە بەنێکی جوانی نخشین بەسرابوو.

وەك دورموشاغا دەیگێڕایەوە، ئەو زەحمەتێکی زۆری لە پێناوی گرتنی ئەسپەکەی دا کێشابوو، کە ڕاست هەر ئەوەش ئەسپی حەمەدی بوو. دوای کوێرەوەرییەکی زۆر، ئاخرەکەی ئەو شتەی لێیدەگەڕا، دۆزیبوویەوە. ڕاستییەکەی ئەوە بوو کە خودا هاتبوە فریای، چونکە دورموشاغا بۆ خۆی دەیگوت ئەگەر خودا مەیلی لە سەر نەبێ، ئەو چەشنە ئەسپانە نە دەبینرێن و نە دەگیرێن! جاری وایە بە زەحمەت تارماییەکیان دەبینێ و لە پێش چاوت ون دەبنەوە. دورموشاغا لە پێش دا لە عورفایە بە دوای دا گەڕابوو، پاشان لە ئالێپۆی و سەرەنجام لە دەشتێ دۆزیبوویەوە. ئەسپەکە لە گەڵ دەستە ئاسکێکی کە حەڤدە سەر بوون، دەلەوەڕا، بەڵێ لە گەڵ دەستە ئاسکێکی، چونکە ئەو چەشنە ئەسپانە بە تایبەت پێیانخۆشە دە گەڵ ئاسکان لە دەشتێ غارغارێنێ بکەن. ئاغا دەسبەجێ ئەسپەکەی لە نێو حەڤدە ئاسکەکان دا بەدی کردبوو و توانیبووی بیگرێ...

دورموشاغا پیاوێکی بە ئەزموون بوو و پێش ئەوەی لە ماڵێ وەدەرکەوێ و لە ئەسپەکەی بگەڕێ، چووبوو دوعای " ئیسمی ئەعزەم" فێر ببوو. ئەو دوعایەی بە سەر هەر گیانلەبەرێکی

دا بخوێنی، گومانی تێدا نیە لە جێی خۆی ڕەق ڕادەوەستێ. بەو شێوەیە کاتێك دورموشاغا دوعاکەی خوێند، هەم ئەسپەکە و هەم حەڤدە ئاسکەکە ڕاوەستان، نەیانتوانی لە جێی خۆیان بجووڵێن و بە یارمەتیی خوای دورموشاغا بۆی کرا یاڵی ئەسپەکەی بگرێ، سواری بێ و بیباتەوە ماڵێ!

ــ سەیدی چاو لە نێو زاری بکە!

ــ چاوم لە ددانی کردوە، ئەو ئەسپە شەش ساڵە، ڕاست وەك ئەسپەکەی حەمەدی.

ــ ئەسپی حەمەدی مۆری پێغەمبەری بە مەلاشوویەوەیە، مۆرەکەش بە جوانی ناوی خودای تێدا دەخوێندرێتەوە.

لە نەکاو دورموشاغا تووشی دڵەڕاوکێ بوو:

ــ ئەمن مۆر و شتی وام نەزانیوە و لە شتی واش ورد نەبوومەوە، بەڵام شتێکی...

سەیدی چاوی لە نێو زاری ئەسپەکەی کرد:

ــ هیچ مۆری بە زارییەوە نابینم، مەلاشووی هەر وەك ئی ئەسپەکانی دیکەیە.

دمەتەقەیەکی گەرم لە نێوان سەیدی و ئاغای دەستی پێکرد و ماوەیەکی کێشا. ئەندامانی کۆڕەکەش یەکە بە یەکە هەستان و چاویان لە نێو زاری ئەسپەکەی کرد.

ئاخرەکەی دورموشاغا کێچە گوتی:

ــ ئەرێ بە ڕاستی سەیرە! دەڵێی ئێوە ئەقڵتان سووك بووە. یانی ئێوە، کە هەمووتان لای خۆی گەورە و تەواون، کۆڕێکتان دروست کردوە، لێرە دانیشتوون و ڕۆژ تا ئێوارێ چاو لە مەلاشووی ئەسپان دەکەن، بزانن نیشانە و مۆریان لە سەرن یان نا؟! وەڵڵاهی هەمووتان شێت بوون! بۆچما دەکرێ ئەسپ مۆری دە زاری دا بێ؟ باشە ئەوە کێ دەتوانێ ئەومۆرەی لە نێو زاری ئەسپی بدا؟ پێتان وایە قەت مۆرێکی ئاواتان بۆ دەبینرێتەوە؟ بڵێی ڕۆژێکی ئەسپێك بدۆزنەوە کە لە سەر نێوچاوانی نووسرابێ"ئەمن ئەسپی حەمەدۆکیم؟" ئاخر ئەسپی حەمەدۆکیش هەر ئەسپێکی ڕەسەن و جوانی وەك ئەو ئەسپەیە و هیچی دی. ئێوە دەتوانن سووك و هاسان ساغ بنەوە و بڵێن ئەوە ئەسپەکەی حەمەدییە. هەر ئەوەندە جارێك سواری بن گەڕێکی بە بازاڕی دا بگێڕن و جاڕ بکێشن بڵێن ئەوە ئەسپەکوێتەکەی حەمەدییە، ئیدی تەواوە!

ئەو پێشنیارەی دورموشاغای خراپیش نەبوو، هەر بۆیە کۆڕەکە باس و ڕاوێژیان لە سەر کرد و سەرەنجام ڕێككەوتن: کورە ڕەنگە ئەسپە کوێتی حەمەدی هەر نەشبێ و لەوانەیە ئەفسانەیەك بێ، هەر دێهاتییەکان دروستیان کردبێ. ئەوە نەبوو هەر بۆخۆیان کاتێك گرفتیان

هەبوو، ئەسپێکی لەو چەشنەیان تۆپاند؟ دوایەش باسی دێو، جندۆکە، شێخ و مشایەخ و چەتانیان دەستپێ‌کرد، وا نەبوو؟ باشە ئەدی بۆچی ئەسپێکیان نەدەدۆزی‌یەوە کە سەد باڵی هەبان، کەس پێی نەگیرابا و قەت نەمردبا؟

زولفۆی سندووقدار هەستا و بۆ جاری پێنجەم زاری ئەسپەکەی پشکنی.

ــ ڕاستی‌یەکەی ئەوەیە ئەو ئەسپە هیچ نیشانە و مۆری بە نێو زاری‌یەوە نین. خوا بۆخۆی باشتر دەزانێ، بەڵام زۆریش وێ‌دەچێ ئەسپەکەی حەمەدی بێ!

دورموشاغا کێچە بە خۆشحاڵی‌یەوە دەستەکانی لێکدان و بە دەنگی بەرز گوتی:

ــ ئەمنیش هەر وا دەڵێم برا! دیارە مۆرێکیش بە مەلاشووی ئەو ئەسپەیەوە هەیە، بەڵێ هەیە! ئەویش ناوی خودایە کە بە شێوەیەکی زۆر جوان بە خەتی سولوس(پلپ) نووسراوە.

ــ دەی خەلیل بەگ بۆخۆشت چاوی لێ‌کە...

سەیدیی پسپۆڕ شەویلکەی ئەسپەکەی هەڵپچڕی و خەلیل بەگی گەورە بە وردی چاوی لێ‌کرد:

ــ بەڵێ ئەمن شتێکم دی، بەڵام لێم ڕوون نەبوو خەتی سولوس بوو، یان کووفی.

دورموشاغا کێچە گوتی:

ــ برا با یاوەریش چاوێکی لێ‌بکا. ئەو وەك کەسێکی پسپۆڕی سەربازی چاوی لێ‌دەکا و هەزار هێندی ئێمە باشتر دەبینێ!

یاوەریش هەستا و بەکاوەخۆ چوو، چاوی لە نێو زاری ئەسپەکەی کرد و گوتی:

ــ مۆرێك بە سەر مەلاشووی ئەو ئەسپەیەوە دەبینرێ، بەڵام بۆم لێکناکرێتەوە بە چ خەتێکی نووسراوە!

ڕۆستەم بەگی مامۆستای فێرگە، قازی، دادەستێن و شارەداریش یەکە یەکە چاویان لێ‌کرد و گوتیان بەڵێ مۆرەکە دروستە و جوان دەخوێندرێتەوە، بەڵام بۆیان ڕوون نیە کە بە چ نەوعە خەتێکی نووسراوە.

مورتەزاغا دوای هەمووان هەستا. هەموو کۆڕەکە چاوی لە وی بوو، چونکە لەو بوارەی دا ئەزموونی لە هەمووان زیاتر بوو، هەر ئەویش دەی‌توانی ئەو مەسەلەیە یەکلا بکاتەوە کە داخوا ئەو مۆرە بە خەتی سولوس، کووفی، یان چەشنە خەتێکی دی نووسراوە، یان نا.

مورتەزاغا زاری ئەسپەکەی لێك‌کردەوە، سەری لەقاند، گەرێك بە حەسارەکەی دا گەڕا، چاوی کوشین، هێندێك پاشی خوراند و لە پڕ دەستی لێکدا و هاواری کرد:

ــ دەزانم، ئێستا دەزانم!

دەتگوت لە خۆشی‌یان شێت بووە:

ـ ئەوە نە خەتی کووفی‌یە، نە سولوسە. ئەوە نەوعێك خەتی دیکەیە. ئەوە هەر خوا بۆخۆی دای‌ناوە، وەرن چاوی لی‌کەن بزانن کاتێك مرۆڤ لێی دەڕوانێ، چۆن شەبەق دەداتەوە!

بەڵێ، ئیدی ئەوە بە ڕاستی ئەسپەکەی حەمەدۆکی‌یە، ئەو مۆرەی نێو زاریشی نیشانەی خوای گەورەیە و وەك ڕۆژێ شۆق دەداتەوە!

خەلیل بەگی گەورە چاوێکی لە مورتەزاغای داگرت و تێی‌گەیاند کە چی‌دیی لە سەر نەڕوا و پاشماوەی باسەکە بە وی بسپێرێ...

ـ دەی دورموشاغا ئەو ئەسپەمان بە چەندی دەدەیەی؟

ـ یانی چی... بۆچما خەلاتەکە سی‌هەزار لیرە نیە؟

ـ بۆخۆت چاکتر دەزانی کە ئەوە ئەسپەکەی حەمەدۆکی نیە، کە وا بوو نە درۆیانمان بۆ بکە و نە هەوڵ بدە کەڵەکمان لی‌دەی. بەڵێ، ئەو خەلاتە، یانی سی‌هەزار لیرە، بۆ ئەسپەکوێتی حەمەدی دیاری کراوە، بەڵام خۆ ئەوە ئەسپی حەمەدۆکی نیە!

ـ وایە، ئەسپی حەمەدۆکی نیە، بەڵام خۆ بۆخۆتان دیتتان کە مۆرە پیرۆزەکەی بە مەلاشوویەوە هەیە.

ـ ڕاستە. هەر بۆیەش ئێمە سەد لیرەت دەدەینێ، هەرچەند لە پەنجا لیرەی زیاتری ناهێنێ.

دورموشاغا کێچە وەك کێچی لە کورسی‌یەکەی دەرپەڕی و قامکی ڕاوەشاند:

ـ پێم بڵێ بزانم، پێتوایە گوێدرێژێکم لی‌دەکری؟ ئەوە ئەسپی حەمەدۆکی‌یە و مۆرە پیرۆزەکەی نێو زاریشی خوای گەورە پێی‌بەخشیوە!

ئەوەندەی بڵێی یەك و دوو هەواڵەکە لە نێو شاری بڵاو بۆوە، خەڵکێکی زۆر هاتن و لە دەوری ژاندەرمەخانەی کۆبوونەوە.

یاوەر لە هەڵسوکەوتی دورموشاغای زۆر نارەحەت بوو:

ـ بەسە ئیدی بی‌دەنگ بە! شەرمێ بکە! ئێمە هەموومان دەڵێین ئەو ئەسپە مۆرەکەی دە زاری دایە، بەڵام ئەتۆ هەر کێشەی دەکەی و دەگوڕێنی. بڕوانە چەندەمان خەڵك لە دەورەی کۆوە بووە!

دورموشاغا هێور بۆوە، بەڵام لە سی‌هەزار لیرەی خۆی خۆش نەدەبوو. ماوەیەکی باش هەڵلا و چەقەیان بوو، بەڵام ئاخرەکەی بە دووسەد و پەنجا لیرەی ڕازی بوو.

مورتەزاغا بە فیزەوە گوتی:

ـ ئەو جار تەواوە ئیدی! بۆخۆت ئەوە دووسەد و پەنجا لیرەت پەیدا کرد. بڕۆ بی‌خۆ نۆشی گیانت بێ! چونکە ئەسپی حەمەدۆکیت بۆ هێناوین! ڕۆژی هەینی هەم بازاڕە و هەم دێهاتی‌یەکانیش دەچنە

نوێژی هەینی... بەڵێ ڕۆژی هەینی، بەیانی زوو ئەسپەکە لە مەیدانێ، گوللەباران دەکرێ. ئێمە هەمووومان و خەڵکی شاریش هەموو، بە چاوی خۆمان دەبینین کە ئەو ئەسپە دەکوژرێ. ئەتۆش وەرە ئاغا، با کاتێك ئەسپی حەمەدۆکی گوللەباران دەکرێ، لە وێ بی!

دورموشاغا هەستا سەرپێ، هەموو گیانی بوو بە ئارەقە و هەرچەند بە زەحمەت قسەی بۆ دەهات، گرماندی:

ـ چی؟! ئەوە دەڵێی چی؟ ... وەڵلاهی ئەگەر پڕ بەو دنیایەم زێڕ دەیەی، ئەو ئەسپە جوانەت نادەمێ بی‌یەی گوللەبارانی کەی. ئەو ئەسپە جوانووی ڕەسەنترین و جوانترین مایینی خۆم بووە. ئەوە ڕەچەڵەکنامەی هەیە و دەچێتەوە سەر بەنێوبانگترین تیرە ئەسپی ئەو وڵاتەی! چاو لەو ڕواڵەتە هێدی‌یەی مەکەن، بابە ئەوە زۆر ڕەسەن و دەگمەنە. ئەمن پێم‌وابوو ئەسپی حەمەدۆکیتان بۆ یاوەری دەوێ و هەر بۆیەش بە دووسەد و پەنجای ڕازی بووم. نەخێر، میلیۆنێکیشم دەنی، نایەڵم ئەو ئەسپەی بکوژن! ئەمن ئەوە عومرێکە وەك منداڵی ساوا بەخێوی دەکەم! هەرگیز بۆتان نیە بی‌کوژن! هەر نایەڵم قامکیشی لی‌دەن! نایەڵم تووکێکیشی لی لار کەنەوە! دووسەد و پەنجا لیرەی خۆتان، بۆخۆتان! ئەو ئەسپە لە تەویلەی خۆم گەورە بووە و بۆخۆم ئاگام لی‌بووە چۆن لە دایك بووە. جا چۆن دڵم زەرەری پی‌بگەیەنن!

ـ ئەدی ئەتۆ نەت‌گوت ئەو ئەسپەت بە زەبری دوعای، لە نێو حەقدە ئاسکان، لە بیابانی سووریە، یا میزۆپوتامیای گرتوە؟

ـ بەڵێ بەڵێ، هەزار جار بەڵێ، وایە! بەڵام ئەوکاتەی جوانوو بوو، هەر شەش مانگ دەبوو، هەڵات و چووە نێو ئاسکەکانی بیابانێ. ئەمن وەدوای کەوتم، ئەوکاتی نەم‌دەزانی ئەو جوانووە شتێکی تایبەتی‌یە. لە نێو حەقدە ئاسکەکان دا دۆزیمەوە، ئەویش دەسبەجێ ئەمنی ناسی‌یەوە و لە خۆشی‌یان وای حیلاند، کە عەرز و ئاسمان ڕاتلەکان. دوایە هات بۆ لام، لمبۆزی دە نێو دەستم نا، پێی خۆش بوو دەستی بە سەروسەکوتی دا بێنم و بی‌لاوینمەوە. ئیدی ئەو ڕوحم و خۆشەویستی‌یە شوێنێکی زۆری لە سەر دانام. چاوم پڕ بوو لە ئاو ... جا ئێستا چۆن دڵم ئێوە گوللەبارانی کەن؟ ئەمن لە بەرتان دەپاڕێمەوە، تووك و نزاتان لی‌دەکەم، ئێوە کە خاوەندەسڵاتن، ئەو ئەسپەی مەکوژن! بڕوانن چۆنم ڕازاندۆتەوە! هەر دەڵێی زاوایە و ئەمڕۆ بووکی بۆ دێنن! ڕووی ئەبوونی‌یە ڕەش بێ، ئەگەر هێندەم پێویستی بە پووڵی نەبا، قەت ئەو ئەسپە خۆشەویستەم لە خۆم دوور نەدەکردەوە! بەو حاڵەش ئەگەر لە برسانیش بمرم، هەر هیچم نەمێنێ و بنەماڵەکەم و بۆخۆشم لە برسان ئاوەلیکەی مردنێمان بە زاری دا بێتە خوار، قەت، نا قەت... کوڕە تکاتان لی‌دەکەم!

دورموشاغا بەگێکی تورکمان بوو، کە کاتێك خەڵکی خێڵەکەی ژیانی خێڵەکی‌یان وەلانا و نیشتەجێ بوون، ئیدی کەوتە سەر ساجی عەلی و هیچی نەما. لەو ڕۆژەوە کەس پێی نەگوت بەگ و بۆخۆشی هەر ئەوەندە پێیان گوتبا ئاغا، کلاوی هەڵداویشت و نەی‌دەگرتەوە. ئێستا کوڵی گریانیی دە ئەوکێ مابوو و لە بەر ئەو کوڕەی دەپاڕایەوە، بەڵام هەرچەند ئەوانە زۆریان دۆستی نێزیکی بوون، گوێیان نەدەدایە و بایەخیان بۆ لاڵانەوەکەی دانەدەنا...

ئاخرەکەی دورموشاغا کێردی گەیشتە ئیسکانی. ئەوەندە لە بێبەزەیەتی و دڵڕەقیی وان تووڕە بوو کە لە پڕ لە جێی خۆی ڕاست بۆوە و خۆی هاویشتە سەر ئەسپەکەی:

ـ خوێنمژی جینایەتکارینە، ئەگەر سەد ئەوەندەی دیکەش دەوڵەمەند بن و دەستتان بڕوا، هێشتا بە قوربانی سمی ئەو ئەسپە ڕەسەنەتان دەکەم! ئەو پووڵەش بۆخۆتان و هیوادارم بی‌دەن بە کفن و دە خۆتانی‌یەوە پێچن! سوور بزانن زۆری پێ‌ناچێ حەمەدۆکتان لێ پەیدا دەبێ و حیسابتان لە گەڵ دەکا، جا ئەمن دەزانم کە دەبێ هەر لە ئێستاوە دە فکری کفنەکەتان دا بن...

ئەو جار جڵەوی لە ئەسپی توند کرد، ئەسپ قەڵەمبازێکی هاویشت، بە سەر دیواری دا ئاوەژوو بۆوە ئەو دیوی و لە چاولێکنانێك دا ون بوو. تا ماوەیەك دەنگی سمی ئەسپەکەی کە چوارناڵ بە سەر سەنگفەڕشی نێوەڕاستی مەیدانی شاری دا تێ‌دەپەڕی، دەبیسرا.

قەدری‌یە کتکە کە لە قولێنچکێکی حەسارەکەی وەك کتکێکی وشیار مات ببوو، ئەو دیمەنەی دی و هەموو باسوخواسەکەشی بیست. کاتێك دورموشاغا زیز بوو و ڕۆیی، قەدری بە پێکەنینەوە هەوساری ئەسپەکەی کێشا، هاتەوە و لە پێش ئەندامانی کۆڕەکەی ڕاوەستا:

ـ ئاخر پێم‌نەگوتن؟ بابە ئەوەتا ئەسپی حەمەدۆکی! فەرموون زاری هەڵپچڕن بزانن مۆرە پیرۆزەکە چۆن وەك ئەستێرەی ڕۆژێ دە زاری دا دەدرەوشێتەوە! ئەمن باسی وەم کرد، بەڵام ئێوە سەرنجتان نەدایە و لە مەڵاشووی ورد نەبوونەوە. ئەوەشم بۆ باس کردن کە ئەو ئەسپە ڕاستەوخۆ لە بەهەشتێ ڕا هاتوە.

خەلیل بەگ ماندوو ببوو و دەیەویست بە شێوەیەك کۆتایی بەو شانۆسازی‌یەی بێنێ، هەر بۆیە ڕووی دە مورتەزاغای کرد و گوتی:

ـ بڕۆ چاو لە مەڵاشووی ئەوەش بکە. دڵم خەبەرێ دەدا کە ئەو ئەسپە مۆرە پیرۆزەکەی دە زاری دایە. هەر لە سەروسەکوتی ئەسپەکەی چاك ورد بی‌یەوە، تێ‌دەگەی کە شتێکی وای لێ‌دەوەشێتەوە...

قەدری‌یە کتکە لە خۆشی‌یان گەش بۆوە، ڕای کرد و شەویلکەی ئەسپەکەی لێككردەوە:

ـ فەرموو، وەرە چاوی لێبکە، مورتەزاغا، ئەوەتا مۆرەکە لەو شوێنەی مەلاشوویەتی. هەر زۆریش جوان دیارە. دیتووتە وەك چاو دەچێ، هەر دەڵێی چاوێکە و دەدرەوشێتەوە. ناوی خوای ڕوون و ئاشکرا تێدا شەبەق دەداتەوە!

مورتەزاغا بە وردی نێو زاری ئەسپەکەی چاولێکرد و دوای هێندێك تێڕامان و لێوردبوونەوە گوتی:

ـ بەڵێ ئەوە ڕاست ئەو ئەسپەیە کە ئێمە لێیدەگەڕێین. ئەو هەمووە زەحمەتەمان بە خۆڕایی کێشا. لە خۆڕا نێو زاری ئەسپانمان دەپشکنی! ئێستا وەرە بڕوانە! لە هەرە پشتەوەی مەلاشووی ناوی خودای لە شێوەی ئەستێرەیەك دا دیارە، ئای کە ئەو ئەستێرەیەش چەندە جوانە! دۆستان تۆخوا وەرن چاو لێبکەن! وەرن ناوی خودای ببینن! ئەوە موعجیزەیە!

وای دەنەڕاند، ئەو خەڵکەی لە دەرەوەی حەسارەکەی بوون، هەموو گوێیان لێبوو.

ـ لێم سوورە ئەوە ئەسپەکەی حەمەدۆکی‌یە. مۆرەکە لە سەر مەلاشووی وەك ئەستێرەی دەدرەوشێتەوە و لە وێ ڕا ئەو شۆقە پیرۆزە دێتە دەرێ و لە دنیای ئێمە دەدا. بڕوانن، بڕوانن و ببینن کە چۆن ناوی خودای دە زاری ئەو ئەسپەی دا شەبەق دەداتەوە!

ئەندامانی کۆڕەکەی یەکە بە یەکە هاتن و چاویان لە زاری ئەسپەکەی کرد:

ـ ماشەڵڵا خودایە! ئای خوایە گیان! بە ڕاستی موعجیزەیە! پیاو باوەڕ ناکا! کوڕە کۆکۆ نووری لە زاری دێتە دەر.

شارەدار کە تازە گەیشتبوە جێ، هات چاوی لە مەلاشووی ئەسپەکەی کرد و دوایە بێ ئەوەی قسە بکا، مات و سەرسام لە وێ ڕاوەستا.

مورتەزاغا بانگی قەدریی کرد:

ـ قەدری‌یەکتکە ، وەرە ئێرە بزانم!

قەدری چوو و لە ڕووبەڕووی ڕاوەستا. ئاغا کیسەی پووڵیی لە باغەڵی دەرهێنا، سەد و پەنجا لیرەی لێ هێنا دەر و دەستی بۆ لای ڕاداشت:

ـ ئەوەی وەرگرە، نۆشی گیانت بێ!

ـ چی، سەد و پەنجا لیرە؟ پێتوانیە کە ئەوە زۆر کەمە ئاغا؟

ـ وەریگرە و برۆ قوڕمساغی خوێڕی! ئەمن سەد و پەنجا لیرەت لە بەرامبەر ئەو کەلاکە قۆترەی دا دەدەمێ! هێشتا قسان دەکەی؟ نا، نا ڕاوەستە بزانم، باشە بۆ ئەو هەموو پووڵەت لە خۆڕا بدەمێ... پووڵەکەم بدەوە، دەنا بە یاوەری دەڵێم بە تاوانی ئەسپدزینێ بتگرێ.

پووڵەکەی لە دەستی قەدری دەرهێنایەوە و بە سەری دا گوڕاند:

ــ یاڵڵا زوو بە بە خۆت و بەو ئەسپە پیسەتەوە گۆڕتان گوم کەن و برۆن! چاو ئەو خەڵکەی چەندە سپڵە و بێئەمەگن! سەد و پەنجا لیرەی بۆ ئەسپێکی دزراوی گڕوێ دەدەمێ، کە چی هێشتا ئەو منەتمان لە سەر دەکا.

ــ ئاغا گیان بمبوورە... پێموا بوو ئەتۆ مۆرە پیرۆزەکەی نێو زاریت دیبوو، کە ناوی خودای تێدا دەدرەوشایەوە...

ــ ئەوە باسی چ دەکەی؟ مۆری چی و درەوشانەوەی چی؟ کێ مۆری بە مەلاشووی ئەوەیەوە دیوە؟ ئەسپی حەمەدۆکی مۆری خودای بە مەلاشوویەوە! کوڕە ئەوەش هەر حیکایەتە! حیکایەتی ئەنگوستیلەکەی خانەقای چلچاوی کەم بوو، ئەوەشیان دروست کردوە... ئەوە کێ ئەو شتە بێمانایانەی ساز کردوە؟

ــ ئەمن نەمکردوە، ئاغا.

مورتەزاغا بەرۆکی گرت و ڕایتلەکاند:

ــ پێم بڵێ بزانم، کێ دروستی کردوە؟

قەدرییە کتکە کە زۆر ترسابوو، ناڵاندی:

ــ ئەمن نەبووم، ببەخشە ئاغا. ئەمن نەبووم، خەڵکی دیکە بوون. ئەو پیاوە بوو کە ئێوە پێتاندەگوت کێچە. ئەو درۆزنە. ئەو بوو پێش هەمووان مۆری دە زاری ئەسپەکەی دا دیبوو! ئەمن بێتاوانم! پووڵەکەم بدەوە، قەرار بێ یەکجێ بۆی دەرچم و ئیدی نەمبینییەوە.

ــ باشە پووڵەکەت دەدەمێ، بەڵام بە مەرجێك. دەبێ بچییە لای وەکیل باشی عاسمی جێگری دایرە و پێی‌بڵێی کە سێ‌هەزار لیرە خەڵاتەکەم وەرگرتوە، دەبێ پسوولەی پووڵەکەشی بدەیەی.

ــ ئاغا ئەتۆ سەد و پەنجای خۆمم دەیە، وەڵڵاهی پسوولەی دەهەزار لیرانت دەدەمێ!

ــ سەرجووخە عەلی، وەرە قەدرییەکتکەی بەرە لای وەکیل باشی عاسمی!

پاشان چوو بۆ لای خەڵکەکەی کە لە دەوروبەری حەساری کۆ ببوونەوە، ڕووی تێکردن و گوتی:

ــ شتەکە جێبەجێ بوو و ئیدی کار تەواوە. سەیدی... کوای؟ لە کوێی؟

ــ ئەوە لێرەم ئاغا.

ــ هەتا ڕۆژی هەینی ئەو ئەسپەی بەخێو دەکەی! تفاق و نالیکی دەدەیەی و خزمەتی دەکەی! لە بیرت بێ هیچ‌کەس مافی ئەوەی نیە تەمەشای نێو زاری بکا. دوایە دەبێ جوان و خاوێن بێ. زاوایەکی دە ڕۆژی بووکگوێزتنەوەی دا چۆن جوان دەکەن و دەیڕازێننەوە، ئاوا بێ!

ـ بە سەر چاوان ئاغا!

ـ ئەسپەکە دەبێ هەر لێرە، دە تەویلەی ژاندەرمەخانەی دابێ، دەرگاشی لە سەر داخرێ و کێشکی لێبکێشرێ.

لەو کاتە دا ئەحمەد پشتکوورِ بە لەقەلەق پەیدا بوو و هات لە پێش کۆڕەکەی ڕاوەستا. ئیدی هەموو خەڵکی شارەکەی زانیبوویان کە ئەسپی حەمەدۆکی گیراوە، زاریشی مۆرێکی تێدایە کە وەك ئەستێرەی دەدرەوشێتەوە و ئەو مۆرەش ناوی خودای لە سەرە. ئەحمەد پشتکوورِ کاتێك ئەوەی زانیبوو بە پەلە هاتبوو، دەیزانی ئەمڕۆ هونەرەکەی بە کار دێ و مەسەلەکە نانێکی بۆ ویش تێدایە.

سەیدی دووبارە گوتی:

بەڵێ ئاغا، ئەمن خزمەتی ئەسپەکەی دەکەم! ڕۆژی هەینی دەبێ بە خاوێنێ، وەك گوڵێ، تەسلیمتی کەم.

ـ خاوێن، وەك دوڵدوڵی ئیمامی عەلی!

ـ بەڵێ، وەك دوڵدوڵی ئیمامی عەلی...

مورتەزاغا چەپکێك پووڵی ئەسکیناسی دە مستی نا. سەیدی ڕۆیشت. ئەو جار مورتەزاغا چاوی بە قەدرییەکتکەی کەوت کە بە پسوولەوە لە وێ ڕاوەستابوو:

ـ فەرموو ئاغا ئەوە پسوولەکە! وەکیل باشی عاسم زۆر جوانی نووسیوە. ئەوەتا نووسیویەتی کە ئەسپەکە مۆرێکی دە زاری دایە کە وەك زێڕی دەدرەوشێتەوە!

مورتەزاغا کاغەزەکەی وەرگرت و پووڵەکەی دایەوە. پاشان چووە بن گوێی و گوتی:

ـ ئێستا ئەوەی ئەمن پێتدەڵێم دووپاتی بکەوە، بڵێ:

ـ ئەمن لە بەرامبەر تەسلیمکردنی ئەسپی حەمەدۆکی دا، هەموو خەڵاتەکە، یانی سێهەزار لیرەکەم وەرگرت و لە گەڵ شەیتانی بە لەعنەت بم، ئەگەر لەوەی زیاتر شتێکی دی بڵێم!

ـ کوڕە ئاغاهەزار جار لە گەڵ شەیتانی بە لەعنەت بم، ئەگەر خەڵك شتێکی دیکەم لێبیبیسن!

پاشان دەستی مورتەزاغای ماچ کرد، ڕۆیشت و بە پەلە لە دەرگای حەساری ژاندەرمەخانەی وەدەرکەوت. هەر گەیشتە نێو بازاڕی، خەڵکی لە خۆی خڕ کردەوە و بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕانەوە.

ـ ئەمن دوعایەکی دەزانم، دەتوانم بەو دوعایەی هەر ئەسپێکی پێمخۆش بێ، بێگرم و ڕامی کەم. ئەو دوعایەش " ئیسمی ئەعزەم" ـە ... لە نێو حەڤدە ئاسکان... لە دوندی

چیای دولدولێ... ئەمن سێهەزار لیرەکەی خۆم وەرگرت و ئیدی بۆخۆم، خێزانم و منداڵەکانم حەساینەوە... ئەسپەکە مۆرێکی دە زاری دا بوو، مۆرەکە لە سەر پەڕەیەکی زێڕ بوو.

بە هەرچوار دەوری بازاڕی دا گەڕا. لە هەموو ژیانی دا ئەوە یەکەم جار بوو خەڵك وەك ئاندیری کەچەڵی گوێیان دەدایە.

خەلیل بەگی گەورە هەستا لە جارچی چووە پێشێ و باسکی گرت:

ـ خۆ دەزانی چ باسە، ئەحمەد ئەفەندی! لە سایە خوایەوە ئەسپی حەمەدۆکیمان گرتوە. ئەتۆ دەبێ هەتا ڕۆژی هەینی، هەموو ڕۆژێ ئەو هەواڵەی بۆ خەڵکی دووپات بکەیەوە. هەر لە بەیانی‌یەوە تا ئێوارێ دەبێ دووپاتی کەیەوە. بۆخۆشت لە من چاتر دەزانی چ بڵێی و چۆنی بڵێی!

ـ دەزانم خەلیل بەگ!

مورتەزاغا بە پەلە لەو دووانە چووە پێشێ:

ـ دەبێ لە کاتی جارکێشانەکەی دا دەنگت وەك دەنگی بیلالی حەبەشی بێ و کارێکی وا بکەی ئەوانەی گوێیان لێ‌دەبێ، بە ڕاستی خەم دایانگرێ و وەك هەوری بەهارێ بگرین! حەمەدۆکیش...

لە پڕ وە بیری هاتەوە کە لە گەڵ عەلی‌یە شەلی ئاشت بوونەوە، دیسان وەك برایانیان لێ‌هاتۆتەوە و کە وابوو نابێ قسەی ناخۆش بکا. هەر بۆیە ئەوەندەی لە زاری هاتە دەر و ئیدی قسەکەی بڕی.

ئەحمەد پشتکووڕ دەستی بە سینگی‌یەوە نا، کڕنۆشێکی برد و گوتی:

ـ دڵنیا بن ئاغا... ئەوەندەی لە دەستم بێ، درێخی ناکەم!

خەلیل بەگی گەورە ڕووی دە کۆڕەکەی کرد و داوای لێ‌کردن کە بە خۆشیی ئەو سەرکەوتنە گەورەیە، یانی گرتنی ئەسپە کوێتی حەمەدۆکی، هەموویان میوانی وی بن و لە ماڵە وی بی‌کەنە جێژن. ئەو جار لە حاڵێك دا هەموویان وەك کۆمەڵێك ژێنراڵ کە شەڕێکی گەورەیان بردبێتەوە، هەستیان بە شانازی و سەرکەوتن دەکرد، بەرەو ماڵی خەلیل بەگی وەڕێ‌کەوتن. هەر لە سەر شەقامی پێش دەرگای ماڵی بەگی گەورەوە بۆنی چێشتی خۆش خۆشیان بۆ هات و تێ‌گەیشتن سفرەیەکی ڕازاوە چاوەڕوانیانە.

ئەحمەد پشتکووڕ دەی‌زانی ئەو هەواڵە یەکجار گرینگە و تا ئێستا هەواڵی وا گرینگ نەبووە. بێ گومان گرتنی ئەسپی حەمەدۆکی لە گرتنی خۆشی گرینگتر بوو. بە گشتی بەسەرهاتی ئەو ئەسپەی سەرنجی خەڵکی زۆر بۆ لای خۆی ڕاکێشابوو. شێوەی جارکێشانی ئەحمەد پشتکووری جێگای ڕەخنەی نەدەهێشتەوە. دەنگی زولاڵی بۆ هەمیشە لە مێشکی خەڵکی دا تۆمار دەبوو و جارکێشانەکەشی ئەوەندە بەهێز بوو کە خەڵك بە گشتی ئۆگری دەبوون و دەبوو بە هەوێنی باسی سەرەکیی خەڵکی

هەرێمەکە. هەر بۆیەش ئەویٚ شەویٚ ساتێکیش خەوی نەچووە چاوی‌یەوە و لە جیاتی‌یان ئەو دەقەی لە بەر کرد و ڕاهێنانی لە سەر کرد، کە نێوەڕۆکی جاڕکێشانەکەی بەیانیی پێکدێنا. پاشان چووە سەر تەپکێکی کە بە سەر شاری دا دەڕوانی و لە ویٚ تا بەیانی هاواری کرد و هەواڵەکەی دووپات کردەوە. بەیانی زوو، داگەڕا بۆ نێو شاری، لە جادەی سەرەکیی نێو شاری کۆخەیەکی کرد، گەرووی خاوێن کردەوە و ڕاست ئەو کاتەی کە دەرابەی دوکانەکان هەڵدەدرانەوە و خڕەیان لە نێو شاری دەنگی دەدایەوە، گوڕاندی و دەستی بە جاڕکێشانی خۆی کرد. گوڕەی ئەحمەد پشتکووڕی خڕەی دەرابانی دە خۆی دا ون کرد. هەموو خەڵکی شاری دەسبەجیٚ گوێیان لە هەواڵەکەی بوو:

ــ گویٚبگرن، گویٚ بگرن، خەڵکی بەڕێز! ئەمە هەواڵێکی بیٚئەملا و ئەولا ڕاست و دروستە! ئێستا هەواڵێکتان دەدەمیٚ کە لە هەرچی هەواڵی تا ئێستا بیستووتانە، گرینگتر و جێگای سەرنجترە! ئەوەندە گەورە و گرانە، هەر کەس بی‌بیسیٚ، لە حاست خۆی ڕەق دەبیٚ، لێوی دەقەڵشن و مات و حەیران دەمێنێتەوە!

ئەو جار پشوویەکی دا، سەری هەڵێنایەوە، ملیوانەی باڵتۆکەی بە هەردووک دەستان گرت، گەرووی خاوێن کردەوە و دیسان بە هەموو هێز و قەوەتی خۆی گوڕاندی:

ــ گویٚ بگرن، گویٚ بگرن، خەڵکی بە شەڕەف!

بەو بەیانی‌یە هێدی و بیٚدەنگەی، دەنگی وی لە نێو شاری دا ئاوازی دەدایەوە. خەڵك، شەقامەکان و عەرزی دەوروبەریشی دەتگوت لە جێی خۆیان دەحەبەسێن و وەك جادوولیٚکراوان تەنیا دە وی هەڵدەڕوانن. ئەویش لە خۆشی‌یان وەخت بوو گیانی دەرچیٚ:

گویٚ بگرن، گویٚ بگرن، خەڵکی بەڕێز! ئەوە هەواڵێکی ڕاستە کە من بۆ ئێوەی بەیان دەکەم! ئەسپی ئەو کابرا چەتەیەی کە بە حەمەدۆك بەناوبانگە، گیراوە. ئەوکەسەش کە گرتوویەتی و هێناویەتی، سێهەزار لیرە خەڵاتەکەی وەرگرتوە. گرتنی ئەو ئەسپەی نەك هەرکارێکی هاسان نەبووە، بگرە زۆریش سەخت بووە. ئەو کەسەی ئەو کارە سەختەی لە دەست هاتوە، لە پێش دا چووە دوعای ئیسمی ئەعزەم فێر بووە. پاشان چووە لە ئەسپەکەی گەڕاوە و دوای چەند شەو و ڕۆژان لە دەشتی میزۆپۆتامیای ئەسپەکەی لە حاڵێك دا دۆزیوەتەوە، کە لە گەڵ حەڤدە ئاسکان خەریکی لەوەڕانیٚ بووە. هەم ئەسپەکە و هەم ئاسکەکان سەریان هەڵێناوە و چاویان بە وی کەوتوە. ماوەیەك هەر دە یەکترەوە ڕاماون. هێشتا ئەو هاونیشتمانەی ئێمە بە تەواوی دوعاکەی نەخوێندوە، کە ئەسپەکە و ئاسکەکان لە جێی خۆیان ڕاوەستاون و ئیدی نەبزووتوون. هاونیشتمانەکەمان ئەسپەکەی لغاو کردوە و سواری بووە، سیٚ جاران دوعای ئیسمی ئەعزەمی خوێندۆتەوە، ئەسپەکە هاتۆتەوە سەر باری ئاسایی و چوارناڵ، بە شێوەیەك کە وەك باڵی

لیڕوابیٚ وا بووە، غاری داوە. هاونیشتمانە قارەمانەکەی ئێمە کە ئیسمی ئەعزەمی زانیوە، چاوی لە سەر یەك داناوە و کاتێك چاوی هەڵێناوە، تەمەشای کردوە ئەوە لە سەر لووتکەی چیای دولّدولّی‌یە. جاری دووهەم دیتوویەتی کە ئەوە ئەسپەکە لە سەر دوندی ڕەوەزێکی گەورە، لەوسەری دنیایە ڕاوەستاوە و هێندەی نەماوە سەری لە ئاسمانیٚ بسویٚ. دیسان هاونیشتمانەکەمان دوعاکەی خوێندوە، تەواوی ئەو هەڵۆیانەی هێلانەیان لە ویٚ بووە هەستاون و ئەسپ و سوار هەردووکیان ترساون. هەر لەو کاتە دا بایەك هەڵی‌کردۆتیٚ و تۆفانێکی لە دەورە دروست کردوون... پاشان کاتێك بۆ جارێکی دیکە چاویان هەڵێناوەتەوە، دیتوویانە لێرە، لە نێو شارین و هەموو ئەو کۆڕەش کە لە حەساری ژاندەرمەخانەی بوون، دیتوویانە کە ئەسپێکی باڵدار ئەوە بە سوارەوە لە ئاسمانیٚ دێتە خوار و بە شێوەیەکیش دەدرەوشێتەوە، کە چاوی لە بەر هەڵناتایە. کاتێك سەرەنجام توانیبوویان چاوی لیٚبکەن، ئەسپەکە گۆڕابوو و ببوو بە ئەسپێکی تەواو ئاسایی، وەك هەموو ئەو ئەسپانەی دیکە کە ئێوە دەیانبینن و تەنانەت وا لەڕ و لاواز هاتبووە بەر چاو کە گووتوویانە هەربینا مرد. کۆڕەکە مات و حەیران ببوون، هەر چاویان لە یەکتر کردبوو، قسەیان بۆ نەکرابوو و نەیانزانیبوو چ بکەن. لەو کاتەی دا بەگێکی تورکمان بە ناوی دورموشاغا کێچە هاتبووە لایان و گوتبووی ئاگاتان لە خۆتان بیٚ، ئەو ئەسپە سیحراوی‌یە. ئەگەر باوەڕ ناکەن چاوی لە نێو زاری کەن! مۆرێکی دە زاری دایە. کاتێك زاری ئەسپەکەیان هەڵپچڕیبوو، تیشکێکی یەکجار بە هێز لە زاری سەری کردبوو، تیشکێکی وەك شۆقی ڕۆژیٚ کە مرۆڤ چاوی لە بەری هەڵناتایە!...

ـ گویٚ بگرن، گویٚ بگرن، خەڵکی بەڕێز! ئەوەی پێتانڕادەگەیەنم بە تەواوی ڕاستە! دەزانن چ لە سەر مۆرەکەی نووسرابوو، لە سەر ئەو مۆرەی کە بە مەلاّشووی ئەسپەکەیەوە بوو؟ دەزانن چ بوو؟ دیارە نازانن! چونکە ئەوە موعجیزەیە. کارێکە تەنیا لە چوارچێوەی توانای بینایی‌چاوان دایە! بەڵیٚ ئەو مۆرە ناوی خوای گەورەی لە سەرە... هەربۆیەشە خەڵکی بە شەڕەف، کە نێو زاری ئەو ئەسپەی وەك ڕۆژیٚ، تیشك و شەبەقی لیٚدەبێتەوە! ئەو ئەسپە ئەسپی حەمەدۆکی‌یە، هیچ ئەسپێکی دیکە ئەسپی وی نیە، چونکە ئەسپی دیکە ئەو مۆرەیان بە مەلاّشوویەوە نیە، کە وەك ڕۆژیٚ دەبریسکێتەوە...

ـ گویٚ بگرن خەڵکی بە شەڕەف، ڕووحی حەمەدۆکی دەبەر ئەسپەکەی دایە و بە پێچەوانەشەوە ڕووحی ئەسپەکەش دەبەر حەمەدی دایە... تکایە گوێم لیٚبگرن! هەر کاتێك ئەسپەکە نەخۆش دەکەویٚ، دەستبەجیٚ حەمەدیش نەخۆش دەبیٚ. ئەگەر ئەسپەکە خۆشحاڵ بیٚ، ئەوە حەمەدیش خۆشحاڵە و پیٚدەکەنیٚ و دیارە کاتێکیش ئەسپەکە بگری، حەمەدیش دەگری. ئەو ڕۆژەی حەمەد بمریٚ، ئەسپەکەش دەمریٚ و ئەگەر ئەسپەکەش بمریٚ، ئەوە حەمەد دەمریٚ. هەر بۆیە خەڵکی بەڕێز ئەو ئەسپە بەیانیی ڕۆژی

هەینی گوللەباران دەکرێ و دیارە هەر کە ئەسپەکە کوژرا، حەمەدۆکیش لە هەرکوێیەك بێ گیانی دەردەچێ! بەو شێوەیە وڵاتی ئێمە لە دەست ئەو دێوەزمە خوێنخۆرەی کە دوژمنی شەرەف، سەروەری و ماڵوسامانی ئەو خەلکەیە، رزگاریی دێ. بەگەکانمان، ئاغاکانمان، سەرۆکەکانمان، کوێخاکانمان و هەموو ئەو جووتێرە ماڵوێرانانەش کە بە زەحمەت ڕیە ماشێکیان بۆ بژێوی منداڵەکانیان دە ماڵێ دایە، لەو ڕەنج و نارەحەتی‌یە و لە دەست ئەو دوژمنەی نیشتمانەکەمان ڕزگار دەبن.

ـ گوێ بگرن، خەلکی بەڕێز، لەمە بە دواوە خەلکی ئێمە و چوکووڕاوای ئێمە کە وەك بەهەشتێ وایە، لە چنگی بە خوێنی ئەو دێوەی ڕزگار دەبن و ئەو دوژمنەی خوا و هەموو دینانیان لە کۆڵ دەبێتەوە! بەڵێ ڕزگار دەبن و ئێوەش با ئەو هەواڵەی بزانن! بەڵێ، ڕۆژی هەینی، دەو ڕۆژە پیرۆزەی دا، ئەسپەکە، کە ئەو مۆرە پیرۆزەی بە مەلاشوویەوەیە، گوللەباران دەکرێ! هەر لەو کاتەش دا حەمەدۆك گیانی دەردەچێ!

ـ دەبێ خەلکێکی زۆر لە کاتی گوللەبارانکردنی ئەسپەکە دا، کە لە ڕاستی دا گوللەبارانکردنی حەمەدۆکی خوێنخۆریشە، بەشدار بن!

ئەحمەد پشتکووڕ بە مەیدانێ دا هاتە خوار، چەند جاری دیکە و جار لە گەڵ جارێش توندتر و بە گوڕتر جاڕی کێشا و ئەو هەواڵەی بە خەلکی ڕاگەیاندەوە. خەلکێکی زۆر بە بیستنی ئەو هەواڵەی، لە نێو شاری کۆ بوونەوە. پێشتر قەت خەلك هێندە کۆ نەدەبوونەوە. لای نیوەڕۆیە تەواوی کۆڵان و شەقامەکان پڕ لە خەلك بوون. هەموویان بە وردی گوێیان دەدا وشە بە وشەی ئەو هەواڵەی جارچیی شاری ڕایدەگەیاند.

سێ ڕۆژان لە سەر یەك ئەحمەد پشتکووڕ هەر بە نێو شاری دا هات و چوو و جاڕی کێشا. جار لە گەڵ جارێش دەنگی چاتر دەهات. کاتێك پشوویەکی دەدا و گەرووی خاوێن دەکردەوە، هێندێك کەس ڕایان دەکردە لای، تاریفی بەهێزی و زوڵاڵیی دەنگی‌یان دەکرد و هانیان دەدا، بە تایبەت بەگ و ئاغاکان زۆریان کەیف پێ دەهات و لە نێو ئەوانیش دا مورتەزاغا لە هەمووان زیاتر خۆشحاڵ دەبوو...

ئەندامانی کۆڕی پشکنین کە بەرپرسایەتیی بەڕێوەچوونی بڕیارەکەیان بە ئەستۆوە بوو، جارێکی دیکەش چوونەوە حەساری ژاندەرمەخانەی و چاویان لە ئەسپەکەی کردەوە. سەیدیی مەیتەر وای خزمەت کردبوو کە بە ڕاستی ئەو کەلاکە نیوەگیانە بووژابۆوە و هەر نەختێکی خۆ بزاوتبا، دەکرا بڵێی ئەوە ئەسپەکەی حەمەدۆکی‌یە...

پێش تاریك و ڕوونی بەیانی دەنگی دەهۆڵ و زوڕنای دە وڵاتی گەڕا و لە شار و دەوروبەری دەنگی دایەوە. بەڕێوەبەرانی ڕێوڕەسمەکە پێیانوا بوو کە مەیدانی شاری بۆ ئەو کارە بچووکە و هەر

بۆیەش ڕایان هاتە سەر ئەوە کە بڕیارەکە لە دەشتەکەی نیزیك پردێ، کە لە زووەوە حەوتووی ڕۆژێك بازاڕی لێبووە، بەڕێوە بچێ. ئەو جێگایە بۆ مەبەستێکی ئەوتۆ زۆر لەبار بوو.

ڕۆژی هەینی بازاڕێکی گەورە لەو دەشتەی دانرا و لە هەموو لایەکی ئەو هەرێمەی ڕا دێهاتییەکان ڕوویان دەو بازاڕەی کرد. ئەوانەش کە نوێژیان دەکرد، بۆ نوێژی هەینی دەهاتنە مزگەوتی گەورەی نێو شاری. بێجگە لە وەش هەواڵی گوللەبارانکردنی ئەسپی حەمەدۆکیش خەڵکێکی زۆری کێشابووە مەیدانەکەیەوە.

ڕادەی ئەو خەڵکەی هاتبوون زۆر لەوە زیاتر بوو کە پێشبینی دەکرا. پێش ئەوەی وڵات بە تەواوی ڕووناك بێ، جێیبازاڕی کە مەودای بەینی شار و پردێی هەموو دەگرتەوە و تەواوی لێواری چۆمیش، پڕ بوو لە حەشیمەت و هەر ڕەش دەچوو.

ڕاست ئەو کاتەی گزینگ لە سەرانی دا، دیسان دەهۆڵ و زوڕنا دەستیان بە لێدانێ کردەوە و کاتێك تیشکی ڕۆژێ گەیشتە تەپکی پشت شاری، خەڵکەکە ئەوەندە زۆر بوو و وایان پاڵ وێکدابوو، کە ئەگەر دەرزیت هەڵاویشتبا، وە عەرزێ نەدەکەوت! ئەو دەستە ژاندەرمە چەکدارەی ئەرکی گوللەبارانکردنەکەیان پێتەسپێردرابوو، گەورەکان، ئاغاکان و کاربەدەستەکان بە زەحمەت توانیان بە نێو ئەو هەموو خەڵکەی دا بێنە پێش. کاتێك هەموو هاتن و هەر کەس لە جێی خۆی دامەزرا، ئەسپەکەیان هێنا و هەموو دیتیان. زۆر باشیان ڕازاندبۆوە. کاتێك ئەسپەکە وەدەرکەوت، هەم دەهۆڵ و زوڕنا بڕیانەوە و هەم هەرا و هوریای خەڵکەکەش بێدەنگ بوو. ئەوەی دەبیسرا، تەنیا هەناسەی خەڵکەکەی بوو.

سەیدیی مەیتەر ئەسپەکەی بە دوای خۆی دا دەکێشا و دوو دەستە ژاندەرمەی چەکدار بە دەورییەوە بوون و تفەنگ بە دەست کێشکیان لێدەکێشا. خەڵکەکە بێئەوەی کەس پێیان بڵێ، بە خواستی خۆیان دڕیان دا و ڕێگایان بۆ ئەسپە لەڕەی کە بە زەحمەت دەیتوانی بڕوا، کردەوە. ئەو بەستەزمانە ئەوەندە کز بوو، بایەکی بە قەوەت هاتبا، دەیبرد. سەیدی ئەسپەکەی لە نێزیك پردێ کە بە بەردی سپی دروست کرابوو، ڕاگرت و ژاندەرمەکانیش لە بەرامبەری ڕیز بوون. پێشتر سەکۆیەك دروست کرابوو و بە ئاڵایان ڕازاندبوویانەوە. پێش هەمووان حاکم چووە سەر سەکۆکە و سەبارەت بە گرینگیی کوشتنی ئەو ئەسپەی، پێوەندیی ئەسپەکە و حەمەدۆکی و شوێنەواری ئەو ئەسپەی لە سەر ئەو کابرا چەتەیەی قسەی کرد.

حاکم دوای ئەوەی قسەکانی تەواو کرد، چاوەڕوان بوو کە خەڵك چەپڵەی بۆ لێدەن، بەڵام خەڵکەکە بێدەنگ بوون و ئەویش سەری بەردایەوە و بە ناڕەحەتییەوە چۆوە سەر جێی خۆی. دوای وی شارەدار و گەورەکانی دیکەی شاری قسەیان کرد، بەڵام خەڵکەکە بچووکترین دژکردەوەیان لە خۆیان نیشان نەدا. وتاری ئاگرینی سامی تورگوتی مامۆستای فێرگەش کە ئیشارەی بە برایەتیی خەڵکی ئاسیای نێوەندی و جاریبوونی دەریای خوێن کرد، کەم و زۆر شوێنی لە سەر خەڵك نەبوو. مێشێك کە دەوزێنێ، خەڵك چەندە

گوێی دەداتێ، هەر ئەوەندەشیان گوێ دا بە وی. ئەو حەشیمەتە زۆرە هەر ورتەیەکیشیان لێ‌نەدەهات. سەرەنجام بێ‌دەنگی‌یەکە بە دەستووری تەقەی یاوەری و دەنگی دەسڕێژی ژاندەرمەکان شکا. ئەسپەکە وردە وردە نوشتایەوە، وە عەرزێ کەوت و تەنانەت بێ ئەوەی لینگەفڕەش بکا، تەواو بوو. شەپۆلێك دەنگ وەك گرمەیەکی لە ڕووی ڕق و تووڕەیی‌یەوە دە نێو خەلکەکەی گەڕا، بەلام زوو بڕایەوە و دیسان بێ‌دەنگی‌یەکە زاڵ بۆوە. هیچکەس نەدەبزووت. لە تەواوی ئەو شارەی ورتەیەك نەدەبیسرا. یاوەر گوڕاندی و دەستووری نیزامی دا بە ژاندەرمەکان، سەرەتا خەبەردار ڕاوەستان، پاشان بەڕیز، بە ڕێکوپێکی بەرەوشار وەڕێ‌کەوتنەوە. تا گەیشتنە نێزیك شاری و چوونەوە نێو حەساری ژاندەرمەخانەی، دەنگی خرمەی پۆتینەکانیان هەر دەهات. تەنانەت کاتێك گەورەکانی شاری کە یاوەر دە پێشیان دابوو، سەریان بەردایەوە و بەرەو شار بوونەوە، خەلکەکە هەر لە جێی خۆیان نەبزووتن و هەروا بێ‌دەنگیش بوون.

لە مەیدانی شاری خەلیل بەگی گەورە ئاوڕی دایەوە و بە وانی دیکەی گوت:

ـ هەلەیەکی گەورەمان کرد، بەگەکانم! ئەو داستانەی سازمان کرد و گوتمان ئەو ئەسپە مۆری پیرۆزی پێوەیە، ژانەسەرمان بۆ دروست دەکا.

حاکم گوتی:

ـ هەر ئەوەمان بۆ دەکرا.

یاوەر گرماندی:

ـ بە کوشتنی ئەسپەکەی کۆتاییمان بە ژیانی حەمەدۆکیش هێنا!

هەتا گەیشتنە ژاندەرمەخانەی هەر وا ئەو باسەیان درێژە دا و لە وێ ئیدی بزەیان لە سەر لێوان پەیدا بۆوە. خەلیل بەگ گوتی:

ـ ئێستا دەبێ چاوەڕوان بین، با بزانین چارەنووس بۆ کوێمان دەبا. ئەو بێ‌دەنگی‌یەی خەلکی دەکرێ بە شێوەی جۆراوجۆر مانا بکرێتەوە...

هەمویان پێیان وابوو کە بێ‌دەنگیی خەلکەکەی زۆر لە وەی مەترسیدارتر بوو کە خەلکەکە هاواریان کردبا و ئاگریان دە مالان بەردابا. وردە وردە هەمووشیان ـ بە یاوریشەوە ـ خەریك بوون لە کوشتنی ئەسپەکەی پەشیمان دەبوونەوە.

ئەو جار ئەوانیش بێ‌دەنگ بوون. سەرانسەری دانی بەیانی لە ژاندەرمەخانەی مانەوە و گوێقولاغ بوون بزانن لە نێو ئەو شارە چکۆلەی چ دەقەومێ، بەلام هیچ ڕووی نەدا. کاتێك ڕۆژ گەیشتە نێوەڕاستی ئاسمانێ، دەنگی خوێندنی کەلەبابێکی لە نێو شاری هات، پاشان وردە وردە دەنگەدەنگ لە نێو شاری بیسرایەوە و شار ئاسایی بۆوە. دەت گوت ئەو شارە قەت هیچی لێ ڕوو نەداوە.

ئەوێ ڕۆژێ هەتا ئێوارێ دەستە دەستە خەڵکی شاری و دێهاتی بە ناڕەحەتی‌یەوە بە لای ئەسپەکەی دا دەڕۆیشتن. کە دەگەیشتنە پەنا کەلاکەکەی، ڕادەوەستان و بە دڵپڕی‌یەوە تێیەوە ڕادەمان. کەلاکەکە هەتا ئێوارێ هەر لە وێ بوو.

کاتێك شەویش بە سەر دا هات، کەلاکی ئەسپەکەی هەر لە جێی خۆی بوو، کەس لێی نێزیك نەبۆوە. تەنانەت سەگیش خۆیان تێ‌نەدەگەیاند. سەگەکان کە دەگەیشتنە پەنای، هێندێکیان چاو لێ‌دەکرد و دوایە کلکیان دە نێو گەڵێ دەگرت و بە ڕاکردن لە وێ دوور دەکەوتنەوە.

تاریکوڕوونی بەیانیی ڕۆژی دواتر خەڵکی شاری بە دەنگی حیلەیەکی دوور و درێژ لە خەوێ ڕاپەڕین. سێ جاری دیکەش ئەو حیلاندنە لە هەوای لێڵ و تەماویی بەیانی دا دووپات بۆوە و زایەڵەی دەنگەکەی لە بن پردی ڕا تا چیاکان لە لای سەروو و تا دەریای نێوەڕاست لە خواروو، ڕۆیی. خەڵك لە ماڵان دەرپەڕین، کۆ بوونەوە و ڕۆیشتن بۆ لای پردێ. کە گەیشتنە ئەوێ دیتیان کەلاکی ئەسپەکەی نەماوە و کەس نازانێ چی‌لێ‌هاتوە.

ئەوێ ڕۆژێ وەزعی ئەو شارەی نائاسایی بوو. پیر و لاو، ژن و پیاو و منداڵ لە مەیدانێ و لە نێو شاری دەهاتن و دەچوون و تێکیانەوە دەدا. هەمووشیان لە دڵەڕاوکێ دا بوون و تووڕەش بوون...

" ڕاست پێش تاریکوڕوونی بەیانی، دوازدە پیاوی سپیپۆش لە سەر تەپکی سەرەوەی شاری ڕا هاتنە خوار و هەر کە گەیشتنە لای پردێ، ئەسپی حەمەدۆکی ڕاست بۆوە. دەتگوت لە خەوێ وەخەبەر هاتوە. کاتێك دوازدە پیاوە سپیپۆشەکە کە دەریایەك نووریان بە دەورەوە بوو، گەیشتنە کن ئەسپەکەی، ئەو خۆی ڕاوەشاند و چەند جاران لە سەر یەك حیلاندی. ئەو جار گەورەتر بۆوە، یاڵی گۆڕا و وەك هەوری لێ‌هات. کلك و یاڵی لە بەر بای ڕادەژان...

دوازدە پیاوە سپیپۆشەکە بە بێ‌دەنگی دەوریان دا و بازنەیەکیان لە دەورەی پێك‌هێنا. ئەسپەکە یەك بە یەك بۆنی پێوە کردن و وا دیار بوو ئەو جار هێدی بۆوە، ڕووی دە لای شاخی کرد و پڕماندی. هەر دوازدە پیاوەکە لە حاڵێك دا ئەسپەکەیان دە نێو خۆیان گرتبوو، بەرەو چیا ڕۆیشتن. لە لای پردێش، لەو جێ‌یەی ئەسپەکە گوللەباران کرابوو، پڕیشکە ئاگرێك مابوو، کە جار بە جار شەبەقی دەدایەوە..."

بەیانی لە نێو خەڵکی باس باسی ئەسپەکەی بوو. هێندێك دیبوویان کە دوازدە پیاوی سپیپۆشی نەناسراو لەگەڵ خۆیان بردبوویانەوە بۆ شاخی و هێندێکانیش دیبوویان کە بەرەو دەریای نێوەڕاست چووبوو. لە هەموو شوێنێکی ئەسپەکە دیترابوو...

ئەسپەکە و دوازدە پیاوە سپیپۆشەکە لە تاریکیی شەوێ دا وەك گوڵێکی سپیی یەکجار گەورە دەچوون. هەر نەبێ هێندێکان ئەوەیان دیبوو.

# (١٢)

هەواڵی گوللەبارانکردنی ئەسپی حەمەدۆکی دوای چەند ڕۆژان گەیشتە دوکانی زەینوڵڵانەفەندی. پێشنوێژ لە حاڵێك دا چاوی قووچاندبوو و هەمووگیانی دەجووڵایەوە، بەسەرهاتی ئەسپەکەی گێڕایەوە. ئەگەر شتێکی لەبیرچووبایە، موفتی دەهاتە نێو قسەکانی‌یەوە و ئەو بەشەی هەواڵەکەی وەبیر دەهێنایەوە. هەواڵەکە بە خێرایی‌یەکی کەموێنەوە لە هەموو بەشەکانی بازاڕی بلاو بۆوە و ئاسنگەرەکان، زیندرووەکان، قاوەچی‌یەکان و هەموو کاسبکارەکانی دیکە لێی ئاگادار بوون و لە وانیشەوە ڕۆیی بۆ دێهاتەکانی شاخ و دەشتێ. هەواڵەکە وەك ڕنوویەکی دەچوو کە بەردەوام گەورە ببێتەوە و زیاتر دەور و بەری خۆی داگرێ.

"کاتێك ئەسپەکە لە جێ‌بازاڕەکەی تەنیشت پردێ زیندوو بۆوە و حیلاندی، دیتی هەموو گیانی شەلاڵی خوێنە و چل پیاوی خودای لە دەوری ڕاوەستاون. پیاوەکان هەموویان سپیپۆش بوون و بازنەیەکیان لە دەوری ئەو ئەسپە جوانەی، کە ساتبەسات گەورەتر و شۆختر دەبوو دروست کردبوو. پاشان هەموویان بە یەکەوە بۆ لای دەریای نێوەڕاست چوون. حیلەی ئەسپەکەی بەو بەیانە زووەی، لە عەرز و ئاسمانێ وای دەنگ دابۆوە کە هەموو خەڵکەکە وەخەبەر هاتبوون و دیتبوویان سپیپۆشەکان ئەسپەکەیان دە نێو خۆیان گرتوە و ئەویش وردە وردە بەرەو ئاسمان بەرز بۆوە و بەرە بەرە ئەوەندە تێ‌هەڵچوو هەتا بوو بە ئەستێرەیەکی سپیی ڕووناك و لە ئاسمانی شین دا دەستی بە درەوشانەوە کرد. تەنانەت پیاوچاکەکانیش سەریان لێی سوڕما. دوای ئەوە بوو بە هەورێکی سپی و بە سەر شارەکەی کشا. لەو ڕۆژە بە دواوە هەموو بەیانی‌یان ئەو هەورە سپی‌یە دەکشێتە سەر شار و دێیان، دێتەوە سەر شکڵی ئەسپی و وا دەحیلێنێ، کە هەموو خەڵك وەخەبەر دێن، دەردەپەڕنە دەرێ و کاتێك لە ئاسمانێ دەڕوانن، دەبینن کە هەورێکی سپیی ئەوەندە

ڕووناك كه مرۆڤ چاوی له بەری هەڵتایه، ئەوه له سەر شار، یان دێیەکەیانە. دەشزانن ئەوه ئەسپی حەمەدۆکی‌یه و دڵیان به دیتنی پڕ دەبێ له شادی..."

ڕۆژێکی بەیانی تازه وڵات ڕووناك دەبوو، حەمەد خۆی ساز کردبوو بچێته نێو شاری و بزانێ چ هەواڵێکی تازه سەبارەت به ئەسپەکەی هەیه، لەو کاتەی دا گوێی له دەنگی موسلیمی بوو که له دەرەوەی دەروازەی حەساریّ ڕا بانگی کرد. حەمەد، به هەڵەداوان له پلیکانان چووه خواریّ، ڕای کرد و دەرگاکەی کردەوه. کاتێك دەرگا وەسەر پشت گەڕا، به جارێك دڵی داخورپا. له خۆشی‌یان ئەژنۆکانی فیزان و وەخت بوو وەعەرزی کەویّ. چاوی له گەڵ چاوه ڕەشه جوانەکانی سەیرانیّ تێکئاڵقان. ئیدی هیچی بۆ نەکرا و له بێڵایه دەرگایه دا ڕەق بوو، تەنانەت بۆی نەکرا چاکوخۆشی‌یان له گەڵ بکا و بەخێرهاتنیشیان بکا. دایه حۆری و موسلیمیش هەروا ڕاوەستابوون و چاویان ده وی‌یەوه بڕیبوو.

دایه حۆری له هەمووان زووتر وەخۆ هاتەوه و له حەمەدی چووه پێشیّ:

ـ ئەوه چی‌یه ڕۆڵه، ئەوه بۆ وا حەبەساون؟ باش دەزانم ده چ حاڵێك دان و هەست به چی دەکەن. کاتێك دوڕموش عەلیی منیش دوای نۆ ساڵان له یەمەنیّ هاتەوه، ئیمەش ڕاست وەك ئێوەمان بەسەرهات. شەوێکی هەتا بەیانی دانیشتین، تەنیا ده یەکترەوه ڕاماین و تەنانەت به یەك وشەش له گەڵ یەکتری نەدواین، مات و حەیران هەر چاومان لێکتر کرد! هەمیشه کاتێك دوو یار به یەکتری دەگەنەوه، هەر ئاوایه. ڕۆڵه خۆشەویستەکانم، له جیاتیی ئەوەی ئینسان خۆشحاڵ بیّ، دەپەشۆکیّ، هەر ڕادەوەستیّ و هیچ ناکا! هەمیشه بۆ ئینسانەکان هەر وایه!

ئەو جار حەمەد وەخۆ هاتەوه، چاوی له چاوی سەیرانیّ کرد، چووه پێشی دەستی دایه حۆریی گرت، سیّ جاران ماچی کرد و له سەر سەری دانا. پاشان ڕووی ده سەیرانیّ کردەوه. ئەو سەیرانه جوان و جحێڵه وەك کافووری سپی هەڵگەڕابوو، چاوی پڕ ببوون له ئاو و لێوەکانی دەلەرزین. حەمەد چووه پێشتر، دەسته نەرم و گەرمەکانی له نێو دەستی خۆی گرتن و به نەرمی تاوێك گوشینی. ئەو جار هەردووکیان بزەیان هاتیّ و چاویان له یەکتر بڕی‌یەوه. موسلیم هەوساری ئەسپەکانی به دەستەوه بوو و به شەوقەوه چاوی لەو دیمەنەی دەکرد. له پڕ حەمەد وەبیر موسلیمی کەوتەوه، چووه پێشیّ و له ئامێزی گرت.

موسلیم هەوساری سیّ ئەسپانی به دەستەوه بوو. یەکێکیان بارێکی قورسی پێوه بوو و ئەوانی دیکەش هەر زینیان پێوه بوو. موسلیم گوتی:

ـ ئەو ئەسپانه ئی خۆمانن، بۆخۆم کڕیومن!

حەمەد وەڵامی دایەوە:

ـ زۆر باشە، دەی با بڕۆینە ژووریّ! موسلیم گیان بۆخۆت ئەسپەکانیش جێبەجیّ بکە.

پاشان وە پێشیان کەوت بۆ ژووریّ و بردنیە چێشتخانەکەی.

ـ لە پێش دا نانێکی بخۆن و برێك بحەسێنەوە، دواتر هەموو شوێنێکی ماڵەکەتان نیشان دەدەم.

کاتێك ئەو قسانەی دەکردن، سەری بەردابۆوە، چاوی لە عەرزی دەکرد و بە ڕاستی نەی دەزانی دەبیّ چۆن هەڵسوکەوت بکا.

لە بەر بێڵایە سەیران ڕاوەستا. ئارەزووی بوو زووتر ژوورەکانی دیکە ببینیّ و هەستی دەکرد ئەوەندەی بە خواردنی فراوینەکەیەوە دەبن، کاتێکی زۆرە و تاقەت ناهێنیّ هێندە ڕاوەستیّ.

حەمەد کەرەسەی چاخواردنەوەی نیشان دان. هەروەها سینی‌یە مسە جوانەکە، قاپەکان، دەوری‌یەکان، تاوە، قابڵەمە، مەنجەڵەکان، کەوچك، چەنگاڵ و کێردەکان. هەروەها حەمەد لە بیری نەچووبوو کەوچکی ماستاو، ئاوگەردان، کەوگیر و چەند جۆر کەوچکی چێشتلێنانێش بکریّ. دەسکی ئەو کەوچکە دارینانە نەخشین بوون و بە هەموو ڕەنگەکانی کۆلکەزێرینەی ڕازابونەوە. حەمەد هێندە بە پەلە شتەکانی نیشان دەدان، کە ژنەکان نەدەپەرژان نیوەی شتەکانیش چاو لیّ‌کەن.

پاشان لە حاڵێك دا هێشتاش پەشۆکاویی پێوە دیار بوو و ڕوخساری هەر وا سوور بوو، نهۆمی سەرەوەی نیشان دان. ئەو وێنانەیان لە گەڵ مەلا سەلامی کڕیبوو. پێش هەموویان چاویان لە وێنەکەی ئادەم و حەوای کرد:

ـ ئەوە بابە ئادەم و ئەوەشیان دایە حەوایە. ئەوەش ئەو مارەیە کە فریوی دان. ئەوە گوڵەباغێکی دە زاری دایە و بەو مانایەیە کە عەرز زۆر جۆرە خواردەمەنیی لێیە. ئەوەش ئەو سێوەیە کە خواردیان، مارەکە فریوی دان و خواردیان...

پاشان داستانی ئادەم و حەواشی، ڕاست بەو شێوەیەی مەلا سەلام بۆ وی باس کردبوو، بۆ گێڕانەوە، تەنیا ئەو وردەکاری‌یانەی باس نەکرد، کە بۆخۆی بە شێوەی جۆراوجۆر بیری لیّ‌کردبۆوە و لە مێشکی خۆی دا وەردی دابوونەوە. بە شەوق و زەوقەوە بۆ سەیران و دایە حۆریی باس کرد کە بە تەواوی دەزانیّ ئەو وێنەیە باسی چ دەکا: بڕوانن! ئەوە بەهەشتە، هێندەی پیّ‌ناچیّ ئەوان سێوەکەی دەخۆن و پاشان لە بەهەشتێیان دەردەکەن و دێنە خواریّ بۆ سەر ئەو عەرزەی خۆمان. ئەوە هەورێکە، ئێستا بایەکی گەرمی دیّ و باران دەست بە بارینیّ

دەکا. ئەوەیان، ئەوە خاڵخاڵۆکەیەکە حەوت خاڵی ڕەشی لە پشتێن و دوای ئەوەی ئەوان دێنە سەر عەرزی، لە نارەحەتی‌یان دەیانپارێزێ و ئەو چۆمەش کە دەی‌بینن کەفێ دەکا و بە نێو گوڵان دا دێتە خوار، ئەوە ڕووباری خۆشبەختی‌یە!

بەو شێوەیە هەر ئەو قسەی کرد و سەیران و دایە حۆریش گوێیان بۆ ڕاگرت و جار بە جاریش سەرسامتر دەبوون. ئەو جار حەمەد بە ئۆگری‌یەکی زۆرترەوە چوو بۆ لای وێنەی حەزرەتی عەلی. دەو وێنەیەی دا ئیمام سمێڵەکانی شۆڕ بوونەوە، چاوی گەورەن و برۆی ڕەش و پڕن. ئەو بۆخۆی ئەو وشترەی لی‌دەخوڕی، کە تەرمی خۆی لە سەر دابەسراوە. حەمەد گوتی:

ــ بۆچی ئەو عەکسە دوڵدوڵیشی تێ‌دا نیە، نازانم. هەموو کەس دەزانێ کە حەزرەتی عەلی بە بێ دوڵدوڵی بۆ هیچ‌کوێ نەدەچوو.

پێشتر مەلا سەلامیش هەر وای گوتبوو. دایە حۆرێ لێرە دا وەجواب هات، لە حاڵێك دا بە وردی وێنەکەی خستبوە بەر سەرنج و گنجی دە نێوچاوانی کەوتبوون، گوتی:

وا دیارە دوڵدوڵ پێشتر ڕۆیشتوە و لە بەر دەرگای بەهەشتێ چاوەڕوانی حەزرەتی عەلی‌یە، هەر بۆیەش وێنەگەرەکە دوڵدوڵی لە گەڵ نەهێناوە. بۆت بمرم عەلیی ستەملی‌کراو! عەلیی چاوڕەشی چاوجوان! ئەتۆ گوللەیەکت وە سەر دڵی کەوت و هەر بۆخۆشت تەرمی خۆت بردە بەهەشتێ. ئاخ ڕۆڵە خۆشەویستەکەم! ئەتۆ هەمیشە لە گەڵ پێغەمبەری گەورەمان بووی کە هەمیشە نووری لێ هەڵدەستا و ناوەکەشی گەورە و پیرۆز بوو! ئەو وێنانە ئەوەندە گەورە و پیرۆزن، کە هیچ بەڵایەك ناتوانێ سەر بەو ماڵەی دا بکا! تەنیا وێنەیەك کە جێگای بەتاڵە وێنەی حەزرەتی محەممەد، واتە پێغەمبەری گەورەمانە.

ــ ئەمن بە دوای وێنەی حەزرەتی محەممەد دا گەڕام و زۆریشم پرسیار کرد. نیە. چونکە هیچ‌کەس نەی‌توانیوە وێنەی حەزرەتی محەممەدی بکێشێ. دەموچاوی هەر نوورە و ناکێشرێتەوە. ئەوانەم لە مەلا سەلامی بیستوون.

دایە حۆری هێندێك دە حەمەد و سەیرانێوە ڕاما و گوتی:

ــ ڕۆڵەکانم، ئێوە هێشتا لاون، باشە کاتێك وەك منتان لی‌دێ، کە پێیەکم لە سەر لێوی قەبری‌یە، بۆخۆتان بەروبوویەکتان دەبێ.

پاشان ڕووی دە حەمەدی کرد:

ــ ئەتۆ چەند کەست کوشتوون... بەڵام حەزرەتی عەلی لێت خۆش دەبێ، تەنانەت ئەگەر هەرگیز داوای بەخشینیش نەکەی. بۆخۆم ئەوەم بە خەون دیوە. دەو خەوەی دا حەزرەتی عەلی

کاتێك منی دی، بزەی هاتێ. ئەو بەڕەحمە و لە هەموو پیاوچاکانیش چاکترە. ئەویش وەختی خۆی هیندێك ئینسانی خراپی کوشتوون. خودا لێشی‌خۆش بوو و بردیشی‌یە بەهەشتێ... بەڵێ حەزرەتی عەلی لێت خۆش دەبێ و دەرگای بەهەشتێت بۆ دەکاتەوە. ئەویش ڕاست وەك تۆ پێی‌خۆشە هەموو هەژارەکان نانیان هەبێ!

دایە حۆری هەر چاوی لە وێنەکەی دەکرد و قسەی دەکرد، هەتا حەمەد چوو، بنقۆڵی گرت و بردی بۆ لای وێنەکانی دیکە: بڕوانە، ئەوەش هەژدیهایە، بزانە سەری چەند جوانە! بەڵام کلکی وەك کلکی هەژدیها گەورەی حەوت دەریایان بەسامە... بەڵام دایە حۆری هەر لە بیری وێنەکەی حەزرەتی عەلی دابوو کە دە وێ دا عەلی تەرمی خۆی بەرێ دەکرد.

ــ لەو وێنەیەی دا، دیمەنکە کاتی بەیانی‌یە و تازە وڵات ڕووناك دەبێ. ئەو زەوی‌یە هەمووی گەنمە و شەونم لە سەر گوڵەگەنمەکان نیشتوە. هێندەی پێ‌تاچێ تاو هەڵدێ و هەموو دنیا دە ڕووناکی‌یەکی زێڕین دا مەلە دەکا. شنە بایەك دێ و گوڵە گەنمەکان ڕادەژێن. لەو گەرما قورسەی چوکووراوایە دا جیکەی سیسران وڵاتی پڕ دەکا و بەرەبەری ئێواران هەوری سپی لە ئاسمانێ پەیدا دەبن، لە سەر دەریایە شەماڵی دێ و هەورەکانیش سێبەرمان لە سەر دەکەن...

دایە حۆری گوتی:

ــ بەڵێ چوکوراوا خاکێکی پڕ پیت و بەرەکەتە!

دیسان بێ‌دەنگ بۆوە. تەنیا شتێك کە ئەوی بە خۆیەوە خەریك کردبوو و هەروا دەیەویست چاوی لێ‌بکا، وێنەکەی حەزرەتی عەلی بوو.

ــ ئەو کەشتی‌یەی لێرە دەی‌بینن، ناوی "یاڤووزەشێتە"یە. لە نێو کەشتی‌یەکان دا لە هەمووان جوانترە، هەر حەوت دەریایان دەگەڕێ و کاتێك تۆپەکانی وەکار دەکەون، دوژمن شێت دەبێ. دووکەڵەکەی کە بەو دووکەڵکێشە گەورەی دا دێتە دەر، دەگاتە تەشقی ئاسمانی...

بەڵام دایە حۆری باسی کەشتیی شەڕکەری پێ‌خۆش نەبوو.

ــ ئەوەش مستەفا کەمالێ پاشایە، بەرگی تایبەتیی خۆی دەبەر دایە، قەمچی‌یەکی بە دەستەوەیە و لە پەنا ئەسپەکەی ڕاوەستاوە...

لێرە دا دایە حۆریی کۆنەساڵ هێندێك بزووت، بە وردی چاوی لە وێنەکەی کرد و دەستی بە سەر شووشەی چوارچێوەکەی دا هێنا. دوایە پرسی:

ــ ئەرێ بە ڕاستی ئەوە بۆخۆیەتی؟

ــ بەڵێ، دایە گیان.

دایە حۆری هەر چاوی لە وێنەی مستەفا کەماڵی دەکرد پاشان نیگای دەگوێزتەوە بۆ سەر حەمەد و سەیرانیّ. نێوچاوانی تێکدەنا، لێوەکانی دەلەرزین و دیسان چاوی لە مستەفا کەماڵی دەکردەوە:

ـ ئەسپەکەی سوورێکی مەیل بە قاوەیی‌یە...

گنجی نێوچاوانی زیادتر بوون، دیار بوو هێندێك دوودڵە.

ـ یەخەشی پەڕاوێزی زێڕینی لیّدراوە، راست وەك سەرشانەکانی.

پاشان شەقاوێك کشایەوە و گوتی:

ـ پاش ماوەیەکی دیکە دەیدوێنم.

حەمەد دەستی گرت و بردی بۆ لای دوایین وێنە.

ـ لێرە دا ڕیزە چیایەکی سەوزی گەورە دەبینی، کە زۆر زۆر درێژ بوونەوە و هەتا ئاسۆ ڕۆیشتوون. ئاسمانی سەریان شینێکی تۆخە. پەڵەهەورێکی سپی لە نێوەڕاستی ئاسمانییە و لە بن ویش، ئەسپێکی بۆرە لە سەر ڕەوەزێکی تیژ لە بەردە سماتەی، قیت ڕاوەستاوە و ملی بەرەو ئاسمان درێژ کردوە.

دایە حۆری بە دیتنی ئەو وێنەیەی گەش بۆوە، بزەیەکی هاتیّ و گوتی:

ـ دەی خۆ ئەو ئەسپەی دەناسمەوە، ئەوە ئەسپە شێتەکەی خۆمانە! بەڵام بۆچی بۆر بووە؟

ـ زۆری باس دەکەن... خەڵکی ئێرە باسی ئەو ئەسپەی نەبیّ، باسی چی‌دیکە ناکەن، تەنانەت نانخواردن و ئاوخواردنەوەشیان لە بیر چۆتەوە. دەڵێن ئەسپەکە دوای ئەو ڕووداوەی زیندوو بۆتەوە...

دایە حۆری بە پۆزێکەوە گوتی:

ـ دیارە خەڵك دەبیّ باسی بکەن، ئەوە شتێکی سروشتی‌یە. خەڵکی شاخیش هەموو باسی ئەو کارە سەیر و دەگمەنانە دەکەن کە ئەو ئەسپە دەیانکا. ئەتۆش ئەو شتانەت بیستوە؟

ـ بیستوومن، دایە گیان.

ـ ئەگەر وا بیّ ئەوشتانەی ئێمە بیستوومانن، ڕاستن. باشە ئەدی بۆ دەو وێنەیەی دا کوێت نیە و بۆرە؟

ـ دەڵێن کاتێك زیندوو بۆتەوە، ڕەنگی گۆڕاوە. دەشڵێن لەو کاتی‌یەوە ئیدی زۆر دەحیلێنیّ!

ـ ئەمنیش وام بیستوە...، لە قسان بەیانی زوو هێندە توند حیلاندوویەتی، هەموو خەڵکی شاری وێکڕا وەخەبەر هاتوون و پێیان وا بووە دنیا خەریکە سەروبن دەبیّ! ئەدی کوڕم

پێم بڵێ کێ ئەو وێنەیەی کێشاوەتەوە؟ ئەتۆ زانیوتە ئیدی، هەر دوای چەند ڕۆژان چل پیاوی خودای هاتوون و ئەسپە کوژراوەکەیان لە گەڵ خۆیان بردوە. داخوا ئەو کاتەی ئەسپەکە تێهەڵچووە بۆ ئاسمانێ، وێنەگەرەکە دیویەتی و وێنەکەی کێشاوە؟ ئەدی ئەو وێنەگەرە کێیە؟

ــ هونەرمەندێکی گەورەیە و پیاوێکی باشیشە. نووری لە ڕوخساری هەڵدەستێ. بۆخۆشی هاتوچۆی مەرقەدی شێخی گەورە، مەولانا جەلالەدینی لە کۆنیایە دەکا و مریدی وییە...

دایە حۆری سەری لەقاند و گوتی:

ــ لە دوور ڕا دیارە کە ئەو وێنەگەرە دەبێ ئینسانێکی مەبارەك بێ. لە قەدیمەوە ئەوانەی وێنەی پیاوی گەورەیان کێشاونەوە، هەموویان پیاوی چاك بوونە...

ــ هەر دوو ڕۆژ دەبێ ئەو وێنەیەی بۆ کێشاومەوە.

ــ ئەگەر وا بێ، دەبێ ئەسپەکەی دیبێ... لە لای خۆمان لە شاخی، خەڵك بەیتیان بۆ داناوە و بە گۆرانی پێیهەڵدەڵێن. عەلی ئازادی شایەر دێ بە دێ دەگەڕێ و ساز بە دەستەوە، دەگاتە هەرکوێیەك دادەنیشێ و بە ئەسپەکەی هەڵدەڵێ. بە قەدەر سەری دەرزییەش لە کەس ناترسێ!

ــ شایەرێك کە بە شتێکی ڕاست هەڵبڵێ، لە خودای نەبێ، لە کەس ناترسێ!

ــ ماشەڵڵا خودایە، باوەڕ کە دەمزانی ئەو ئەسپە شتێکی تایبەتییە... ئەو دەمی کە ژاندەرمان ئەتۆیان بریندار کردبوو، هاتەوە بەر دەگای من و سێشەو و سێ ڕۆژان، بە بێ ئەوەی لە جێی خۆی جووڵەی بکا، هەر لە وێ ڕاوەستابوو. کاتێك زانی کە من هەر تێینەگەیشتووم، لێم ناڕەحەت بوو و ڕای کردە سەر دوندی ڕەوەزێکی. ویستم لێی نیزیك ببمەوە، بەڵام ئەو توورە بوو و لێیدا ڕۆیی. ئەو کاتی کوێت بوو. جا بزانە، ئەمن دنیایەکم تووك و نزا لێکرد. هێندەم تووك لێکرد زمانم ئیشك بوو. نەمدەزانی... ئاخر ئەو کاتی پێمڕابوو شێتە... دەبێ خودا ئێستا چم لێبکا؟ چ ماوە لەو ئەسپەی بکەم کە ئێستا دەبینم باڵی لێڕواون و لە گەڵ چلسوارەی غەیبی، حەوت ساڵحان و هەموو مەلایکان، لە ئاسمانان دا دەخولێتەوە!

هەر ئەو ئەسپە بوو دە فریای تۆ هات و ژیانی نەجات دای. هەر ئەو ئەسپە بوو کە بوو بە هۆی ئەوەی دایە سوڵتان بێ بۆ لات. ئێستا تێدەگەم... یاڕەبی خودا کوێرم کا و زمانم لاڵ بێ، چونکە ئەمن ئاوام ئەو ئەسپە ئازار داوە!

پاشان هەردووك دەستی دە دەوری سەری وەرێنان و گوتی:

ــ خوایە گیان، ئەمن بۆ وام کرد!

کاتێك سەری هەڵێنا، چاوەکانی پڕ ببوون لە ئاو:

ـ ئێستا گوێم لێ بگرە، بزانە چت پێدەڵێم حەمەد...

هێندێك بێدەنگ بوو، بیری کردەوە و پاشان گوتی:

ـ ئەوە هەر لە سایەی ئەو ئەسپەیەوەیە کە ئەتۆ توانیوتە بێیە ئێرە، ئێمەش ئەوە هاتووین، لێرە هەمووومان لێك کۆبووینەوە و کەسیش نەیزانیوە! بابانم خرا بێ، بۆ دەبێ ئەمن نەمزانیبێ کە ئەسپێکی سەرشێت ـ زمانم سووتێ، ئیدی قەت پێی ناڵێم شێت ـ دەتوانێ شتی ئاوا سەیر و پڕ لە ڕەمز و رازی لێوەدەرکەون. بریا هێندێك زیاترم بیر کردبایەوە. بڕوانە، ئەسپە بۆرەی کوێرۆغڵی، گوێدرێژەکەی حەزرەتی عوزەیر و دولدولی حەزرەتی عەلی... کە وا بوو دەبوو هێندێك زیاتر ورد بووبامەوە و تێگەیشتبام کە ئەو ئەسپە چییە... بەڵام ئیدی دەرچوو! قوڕی دنیایەم وە سەری...

ـ دایە حۆری مەگری، خۆ ئەوەیان ئەسپەکەی من نیە.

دایە حۆری دیسان گەش بۆوە:

ـ ڕاست دەکەی! وایە، ئەمەیان ئەسپەکەی ئێمەیە! ئەوەش زەرەری بۆمان نیە و بە پێچەوانەوە هەر خێر و بەرەکەتی بۆمان دەبێ. ئاخ! بەڵام ئاخر بۆ دەبوو ئەمن ناڕەحەتی بکەم؟ بۆچی دڵیم شکاند؟

ئەو جار سەیران هاتە نێو باسەکەیەوە:

ـ خۆ تۆ نەتدەزانی بۆ ئەسپەکە هەر لە بەر دەرکێ ڕاوەستابوو، ئەسپی دیش خۆ زۆر وا دەکەن.

پاشان چوونە نێو ژوورەخەوە گەورەکەی. دایە حۆری چاوی لە هەموو شتەکان کرد، تەختەکان، لێفەکان، سەرین و باڵنجەکان، فەرشەکان و پەردەکان و... هەمووی جوان چاو لێکردن و یەکە یەکە دەستی لێدان.

ـ هەموو شتەکان زۆر جوانن! یاخوا ڕۆڵە خودا یارتان بێ، تێیدا بحەسێنەوە، بە یەکەوە لە سەر یەك تەخت و یەك سەرینی پیر بن و ناڕەحەتی و لێکهەڵبرانتان وەرێنەیە!

ئەو جار حەمەد بردییە ژوورەکەی خۆی، ئەو ژوورەی بۆ دایە حۆری دانرابوو. تەختێکی جوان و لێفەیەکی پەڕاوێز گوڵدۆزیکراوی بۆ کڕیبوو. چەند جاران دایە حۆری دەستی لە سەرلێف، لێفە و باڵنجەکان دا و پاشان هێندێك نێوچاوانی گرژ کرد. حەمەد گوتی:

ـ دایە گیان ئەوە چییە؟

ـ کوڕم خۆ ئەمن ناتوانم لە سەر ئەو تەختەی بخەوم! ئەوەی لابە! یەك دۆشەکم بۆ لە سەر عەرزی دانێ.

ـ ئەو مافوورەیەش هەر لێرە هەڵگرە و لبادێکم بۆ بێنە. ئەو جار ئەمن دەمەوێ وێنەی حەزرەتی عەلیم لە ژوورەکەی هەڵواسرێ. عەلیش وەك تۆ کوڕی منە.

ـ بەڵێ دایە گیان، هەر ئێستا ئەوانەت بۆ جێبەجێ دەکەم!

ـ پێویست نیە پەلەی بکەی، خۆ من بە تەما نیم سبەی بڕۆم. دواتر بەکاوەخۆ بیکە.

ـ باشە دایە گیان.

چوونەوە نهۆمی خوارێ. حەمەد ژووری دانیشتنێی نیشان دان. هەر چوار لای دیوارەکانی ژوورەکە بە هێڵێکی نەخشاوی ڕاست و ڕێك رازابوونەوە و لبادێکی جوانیش لە نێوەڕاستی ژوورەکەی ڕاخرابوو.

ـ ژوورێکی زۆر جوانە و لبادەکەش لبادی چاکە، ئەدی ئەو مێزە کە پەیکەرەی لە سەر دروست کراون...

حەمەد ڕای کرد، دەورییەکی مسی هێنا و لە سەر کورسیلەیەکی دانا. دەورییەکە چەند ئایەتی قورئانێی بە شێوەیەکی زۆر جوان و ورد تیّدا نووسرابوو.

دایە حۆری گوتی:

ـ دیتووتانە ئەو دەورییە چەندە جوانە؟

ئەو جار دەستی بەرەو ئاسمان بەرز کردەوە و شوکری خودای کرد.

لەو ماوەیەی دا کە سەیران خەریکی ئامادەکردنی فراوینەکەی بوو، حەمەد و دایە حۆری باسی دێ، شاخ، مەلا فەرهاد و زۆر لەو شتانەیان کرد کە بیرەوەریی خۆش و ناخۆشیان لە دڵیان دا زیندوو دەکردنەوە. دایە حۆری هەواڵی خۆشی پێبوون. لەو دەمەی دا موسلیمیش هاتە ژوور. کوڕەکە هەموو گیانی دە ئارەقەی دا خووسابوو و وەك چەوەندەریش سوور هەڵگەڕابوو.

ـ هەموو شتەکانم هێنانە ژوورێ، ئەسپەکانیشم تاقەت کردن و خولێکیش بە نێو دارپرتەقاڵەکان دا گەڕام. هەوەڵ جار کە ئەو دارانەم دیتن، تازە گوڵیان کردبوو و ئێستا پێیانەوە بووە. بەرەکەیان بە قەد سەری قامکە گەورەم دەبێ و تەواو شینیشن.

موسلیم لە سەر سفرەی دانیشت و وەك گورگی برسی دەستی بە خواردنێ کرد.

دایە حۆری لە حاڵێك دا چای دەپیاڵەیەکی شووشەی نەخشین دا دەخواردەوە و پیاڵەکەی لە لێوی نێزیك دەکردەوە، گوتی:

ــ سبەینێ شۆرباوێکی خۆشتان بۆ لێدەنێم، نەعنەشی دەبەر دەکەم. ئەرێ ئێرە نەعنەی لێیە؟

ــ هەر لە ماڵێ هەمانە. پێش ئەوەی ئێوە بێن، هەر شتێکی پێموابووبێ پێویستە، کڕیومە.

دوای ئەوەی خولێکی دیکە بە نێو تەواوی ژوورەکان دا گەڕان و هەموو شتێك و هەموو کەلێن و قوژبنی ماڵەکەیان چاو لێکرد، هاتنە حەسارێ و لە بن دارێکی گەورە کە لە بەر دەرگای ژوورێ بوو، دانیشتن. هێندەی پێنەچوو دایە حۆری پلاوی بۆ لێنان. بۆنی ڕۆنی قرچاو وڵاتی پڕ کرد. حەمەد هەستی بە ئاسوودەیی و خۆشبەختی‌یەکی زۆر دەکرد. لەمێژ بوو، ئارەزووی خواردنی چێشتەکانی دایە حۆریی کردبوو.

بەرەبەری ڕۆژاوایە نانیان خوارد، دانیشتن، هێندێکی دیکەیان قسە کرد و پاشان دایە حۆری چووە دیوەکەی خۆی. ماندوو بوو و خەوی دەهات. حەمەد تەختەکەی لابردبوو و لبادێکیشی بۆ ڕاخستبوو. دۆشەکێك لە قولینچکێکی هەڵپەسێرابوو. دایە حۆری کە سەیری لێفەکەی کرد، دیتی لە ئاوریشمی‌یە، سەری سوڕ ما. بیری کردەوە: کوڕەکە چاکی کرد ژیانی چەتەگەریی بەجێهێشت. کێ بە بیریشی دا دەهات کە کوڕی برایمەڕووتی هەژار بەو ڕۆژەی بگا. خۆزگە دایکی مابا و ئەوانەی بە چاوی خۆی دیبا! دەستی بە سەر لێفەکەی دا هێنا و کاتێك سەری هەڵێنا، چاوی بە وێنەکەی حەزرەتی عەلی کەوت، کە بە دیواری‌یەوە هەڵواسرابوو، هەر ئەو وێنەیە کە ئیمام وشترێکی لێدەخوڕی کە تەرمی ویی بە پشتێوە بوو.

لە وێنەکەی چووە پێشێ و بە وردی تێیەوە ڕاما، ئەو جار دیتی کە حەزرەتی عەلی بزەیەکی لە سەر لێویە:

ــ ڕۆڵە گیان، سوڵتانە گەورەکەم کە ڕوخسارت دەڵێی گوڵە، خودا ئەو گەورەیی‌یەی پێبەخشیوی کە تەرمی خۆت بۆ خۆت هەڵگری. ڕۆڵە قارەمانەکەم، خۆ بە خۆڕایی ناویان نەناوی" شێری خودای"! ئاخر هەر بۆخۆت نەبووی کە تەرمی خۆت لە پشتی وشترەکەی بار کرد؟ هەر بۆخۆشت بەڕێت نەکرد؟ ئەتۆ عەلیی گوڵڕوخسارەکەم، دوڵدوڵسوارەکەم، شێرەکەم، عەمرەکەم، ئەتۆ دەبێ بزانی کە ئەو کوڕەم حەمەد، ڕاست وەك تۆ بە هەژاران ڕادەگا و هەوڵ دەدا یارمەتیی برسی‌یەکان بدا. هەروەك تۆ، لەو ڕۆژەیەوە لە دایکی خۆی بووە، نەیزانیوە

ئاسوودەیی چییە،... دایکییان کوشت... بەڵام ئەمن هەر وەك دایکی وی وام. ئەویش عەبدی خانی کوشت و چاکیشی کرد کوشتی، چونکە ئەو پیاوێکی زۆر زاڵم و پیس بوو. ئەتۆش زۆر کەسی ستەمکار و پیست کوشتوون. دەزانم گوناهە ئینسان عەبدی دیکەی خودای بکوژێ، بەڵێ وایە، بەڵام ئەو پیاوێکی بێبەزەیی بوو، دڵڕەق و خوێنخۆر بوو. ئەتۆش بەو شمشیرە دوو سەرەت زۆر کەست کوشتوون. بەڵام حەمەدی بەستەزمان، ئەگەر ئەمن نەبام، قەت عەبدی خانی نەدەکوشت، خەریك بوو خۆی تەسلیمی دەوڵەتێ دەکردەوە، ئیدی ئەمنیش یەخەم گرت و چاوم دە چاوی بڕی: ئەوە بۆ کوێ دەچی حەمەد، کوڕم، دڵ چۆلەکە، ژنانیلەی ترسەنۆك، دەڵێی مشکی پشیلەت دیوە، ئەو بۆ کوێ دەچی؟ بە تەمای بڕۆی و دە بەر شەپی عەبدی خانی دا بەجێمان هێڵی؟ بۆچما ئەو خەڵکە هەژارە ئەو کاتەی ئەتۆ عەبدیت لەو دێیەی ڕەپێ دەنا، بۆ نانی شەوێ موحتاج بوون؟ ئەدی بە تەمای ئێستا بۆ کوێ بچی؟ بەڵێ ئاوام پێگوت. خودا هەڵناگرێ ئەویش ئەمنی ناهومێد نەکرد، عەبدیی کوشت و ئیدی دواتر ئەو هەمووە ڕووداوەی بە سەر هاتن. هەمووشی ئەمن سەبەبکار بووم. ئەمن هەموو تاوانەکانی حەمەدی وە ئەستۆ دەگرم. ئەو قەت هیچی نەکردوە، هیچ! جا ئیدی نازانم ئێوە دەڵێن چی؟ نازانم. حەمەد هەر کاری چاکی کردوە، بەڵام ئەگەر لە شوێنێکی وردە تاوانێکیشی کردبێ، ئەوە من وە ئەستۆی خۆمی دەگرم. خۆ بۆخۆت دەزانی کە ئەسپەکەی، ڕاست وەك دوڵدوڵی تۆ، چۆتە لای چلسوارەی غەیبی، ئێستا یەکتری دەناسن و لە نێو هەورە سپییەکان بە دوای یەك دا دەحیلێنن. حیلاندنەکەیان هەموو بەیانییان خەڵکی ستەمکار دەترسێنێ. دەزانم بۆخۆت ئاگات لەو شتانە هەیە! عەلی، دەزانم. لەمێژە ئەوانەت زانیوە و ئێستا تەنیا من یەك شتت داوا لێدەکەم. بۆخۆت دەبینی ئەسپەکەی چەندە جوانە! حەمەدی کوڕم هەرگیز یەك تاڵە مووشی لە سەری هەژار و بێتەنوایان لار نەکردۆتەوە و هەر بەو زووانەش منداڵیان دەبێ... ئەو یاوەرە، خودا غەزەبی لێگرێ، خەجیجی لێکوشت. منداڵەکەشی ئیراز بۆ شوێنێکی برد، هەر خودا دەزانێ کوێیە.... دەبێ ئەمن ڕۆژێکی بە مستەفا کەماڵ پاشای کە یەخەی گوڵدۆزیی زێڕکفتە و سەرشانەکانیشی هەر وەتر و ئەسپێکی سووری داوێن تاریکی هەیە، بڵێم کە هێندێك شتمان لە بەین دان، دەبێ باسیان بکەین. باوەڕ ناکەم دەستم بە سینگییەوە نێ و بە هێندم نەگرێ. لێیدەپرسم: ئەرێ ئەگەر کابرا ژنێکی بکوژێ، یان تەنانەت هەر لێی دا، ئەوە دەکرێ پێیبڵێی ئینسان؟ بەڵێ هێندێك شت هەن کە دەبێ لە گەڵ وی باسیان بکەم. عەلی، ئەتۆ بۆخۆت دەزانی کە ئەمن چاوم لە دەستی تۆیە، لێرەش و لە دنیای دیکەش، کە وابوو وریا بە

ژانەسەریٚ بۆ حەمەدی من دروست نەکەی! ئەگەر ڕۆژێکیش تووشی شتێکی خراپ هات، دەبیٚ بی‌بەخشی! بۆچما ئەتۆ شێری خودای نی و هەر بۆخۆت تەرمی خۆت نەبردە سەر گۆڕ و حەمەدۆکیش هاوڕێی تۆ نیە؟ گوێم لیٚبگرە، حەزرەتی عەلی‌یە چاوڕەشەکەم، ئەوە حەمەدۆکی خۆم بە تۆ دەسپێرم. ئەمن هەمیشە ئاگام لێی بووە و لە چاوی خۆمم خۆشتر دەویٚ، بەلاّم لە ئێستاوە ئەتۆ دەبیٚ ئاگات لێی بیٚ و بە تۆی دەسپێرم! بۆخۆشت دەزانی کە ئەمن ئەتۆم زۆر پیٚ گەورەیە.

پاشان دەستەکانی بۆ لای وێنەکەی هەلێنان و بە شێوەیەکی توندترگوتی:

ــ خۆ گوێت لیٚ بوو حۆریی پیر گوتی چی، شێرەکەم؟ وە نیە؟ حەمەدۆکم شتێکی لیٚبیٚ، ئیدی قسەت لە گەلّ ناکەم و قەتیش چاوت لیٚناکەمەوە. هەتا ماویشم ئیدی پێتنالێم شێری خودای! ئەو کاتی یەخەت دەگرم، عەباکەت لە بەر دادەدڕم و بزگوڕ بزگوڕی دەکەم! لەو دنیایەش و لە دنیای دیش! خۆ گوێت لێیە دەلێم چی، ئەوە ڕوو بدا، قەت لە دەستم دەرناچی! جا ئەگەر تۆسقالێك هەستی بەخۆداشکانەوەت دە بەر دا بیٚ، قەت ناتوانی جارێکی دی چاو لە چاوم کەی! ئەو مالّە جوانەت دیوە، کە حەمەد پێکی‌یەوە ناوە؟ ئەوە پێتدەلێم نەیەلّی قەت ئەو مالّەی لیٚتێکچیٚ!

ئەو جار سەری بەردایەوە و لە سەرەخۆ داواکەی دووپات کردەوە:

ــ ئەو مالّە جوانەی لە بەلاّیان و لە چاوی نەیارانی حەمەدی من بپارێزە! تیٚدەگەی دەلێم چی؟! بی‌پارێزە!

ئەو شێوە دواندنە هەم دەستووردان بوو، هەم پاڕانەوە و هەم وشیارکردنەوەش.

بە هەستێکی برێك ئالۆزەوە لە سەر لبادەکەی، لە تەنیشت دۆشەکەکەی دانیشت و لێفە ئاوریشمەکەی بە خۆی دادا. لە پڕ دلّی پڕ بوو لە هۆمێد و شادی: دەی، جا ئەگەر حەزرەتی عەلیش ئاگای لە حەمەدۆکی نەبیٚ، خۆ ئەسپەکەی هەیە. خەریك بوو بلّیٚ" ئەسپە شێتەکەی". ئەسپەکە دەی‌پارێزیٚ، خەمت نەبیٚ، ئەو ئەسپە هەموو بەیانان بە سەر شار و دێیان دا دەحیلێنیٚ...

دایە حۆری هەستا:

ــ حەمەد، وەرە ئێرە!

حەمەد دەسبەجیٚ هات، دەرگای کردەوە و گوتی:

ــ بەلّیٚ دایە حۆری، چت دەویٚ؟

ـ وەرە، کارم پێتە!

ـ بەڵێ!

دایە دەستی بۆ وێنەکەی عەلی درێژ کرد و گوتی:

ـ بڕوانە! ئەو وێنەیەت لە شوێنێکی باش هەڵنەواسیوە، لە لای لاقمە و لەوانەیە عەلی تووڕە بێ! بیهێنە لە لای سەرمی هەڵواسە!

حەمەد چووە خوارێ و هێندەی پێنەچوو بزمارێك و چەکوچێکی هێنا و هاتەوە.

ـ وشیار بە عەلیی کوڕم ئازار نەدەی، ئەو هاوڕێتە. چاو، بزەی سەر لێوی چەندە جوانە! ئەها، ئەوێ باشە... زۆر باشە...

کاتێك حەمەد ڕۆیی، پلیتەی چراکەی داکێشا، فوویەکی لێکرد، کوژاندییەوە و چوو دە جێگایەوە. دۆشەکەکە زۆر نەرم و خۆش بوو، بەو حاڵەش خەوی لێنەدەکەوت. پێشتر هەر سەری گەیشتبا سەر سەرینێ، نوستبوو و تۆپت هاویشتبا وەخەبەر نەدەهات. دیسان لە گەڵ عەلی دەستی بە قسەکردنێ کردەوە و هێندێکیشی دوعا بۆ دوڵدوڵی خوێندن. دایە سوڵتانیشی لە بیر نەچوو. پاشان بیری لەوەی کردەوە کە چ ئامۆژگارییەك بۆ سەیران و حەمەدی پێویستە بیکا... پڕتەقاڵەکان بۆنیان زۆر خۆش بوو! موسلیم بۆی گێڕابۆوە کە گوڵی دارەکەی وەك هەوری سپی چوونە. هەروەها باسی دەریایەی بۆ کردبوو، کە ئەگەر ڕاستی کردبێ، ئەویش بۆنی دارپڕتەقاڵانی لێدێ. تەنانەت عەرز و زەویی چوکووڕاویەش هەر ئەو بۆنەی لێ دەهات. موسلیمیشی خۆشدەویست. سبەینێ دەبێ بۆ ویش بپاڕێمەوە و داوا لە ئیمامی عەلی بکەم، کە ئەویش دە بن باڵی خۆی بگرێ و بیپارێزێ. پاشان پەشیمان بۆوە: ڕەنگە پاراستنی دوو کەسان عەلیی ماندوو کا، حەمەد لە پێشترە. دوایە هەر بەو بیرانەوە خەوی لێکەوت.

بەیانی هەردووك ژن لە کاری چێشتلێنانێ وەخۆ کەوتن. دەو یەك شەوەی دا سەیران ببووە ژنێکی دی. چاوەکانی، ڕوخساری، دەستەکانی و لە سەیەك سەر تا پێی خۆشی و شادیی لێدەباری و ئەو بەکەیفبوونەی وی دایە حۆریشی دەبزواند. بەیەکەوە گۆشتیان کوتا و شۆرباوکفتەیان لێنا. زۆر چێشتی دیکەشیان لێنان و بۆ ڕازاندنەوەی سفرەی ئێوارێ هەموو هەوڵی خۆیان دا. ئاخر میوانێکی زۆریان دەهاتن. دایە حۆری دە دڵی خۆی دا دەیگوت: ئەو هونەرمەندەش کە وێنەی حەزرەتی عەلیی کێشاوەتەوە دێ و هەر خوداش دەزانێ کە دبێ چەندە پیاوێکی تێگەیشتوو بێ! لە هەموو شتێکی زیاتر پێیخۆش بوو ئەو دەستانە ببینێ کە ئەو هونەرەیان لە دەست دێ و سەری لە وە سوڕمابوو کە چۆن ئەو دەستانە دەتوانن هەم

حەزرەتی عەلی و هەم شتی دیکەی وەك دار، گورگ و باڵندان ئاوا زیندوو نیشان بدەن. وانیە، دەبێ چاوی وی وەك چاوی ئێمەمانان نەبن. بێگومان چاوی وی لە توانایان دا هەیە شتی نەهێنی و نەدیویش ببینن.

هەموویان چاوەڕوان بوون ئێوارە دا بێ و میوانەکانیان بێن.

لە پێش دا زەکی نەژاد لە گەڵ ژنەکەی و سێ منداڵان هات. ژنی مامۆستای فێرگەی زۆر جحێڵ بوو، قژی کورت بوو، هەر بە قەد سەری پیاوان دەبوو و سەرنجی دایە حۆری ڕاکێشا، بەڵام زۆریشی پێ سەیر نەبوو. ژنەکە چارشێوی پێوە نەبوو، تەنوورەیەکی زۆر کورتی دەبەر دا بوو، پانیەی کەوشەکانیشی زۆر بڵیند بوو و دایە حۆری بیری لەوە دەکردەوە کە ئەو ژنە بڵێی چۆن بتوانێ خۆی بە سەرپێوە رابگرێ و بڕوا. پاشان بەرۆکیشی زۆر ئاواڵە بوو و دەکرێ بڵێی مەمکی بە دەرەوە بوون... ئای... بەڵام ئاخر ئەوانە هەموویان میوانی حەمەدۆکی بوون و نەدەبوو دایە حۆری بیری خراپی سەبارەت بە وان بە مێشك دا بێ. هەر بۆیەش بەرەوپیریان چوو و بێ ئەوەی لێیدیار بێ چۆن بیر دەکاتەوە، بەو پەڕی ڕێزەوە پێشوازیی لێکردن. مامۆستای فێرگە دیارییەکیشی بۆ حەمەدی هێنابوو: سینییەکی زێوی زۆر جوانی کۆن و عەنتیکە کە بە خەتی عەرەبی هێندێك شتی لە سەر نووسرابوو. دایە حۆری لە دڵی خۆی دا گوتی ئەو سینییە زۆر بە نرخە، چونکە ناوی خودای لە سەر نووسراوە! هەموویان زۆر ڕێکوپێك بوون و دایە حۆریش هەمووانی بە گەرمی بەخێرهاتن کرد. کەیفیشی بە منداڵەکان هات و هەر یەکەو هەنارێکی پەمەیی گەورەی دانێ، کە لە دێی خۆیان ڕا هێنابوونی. ئەگەر چی ئەوانەی بۆ حەمەدی خۆشەویستی خۆی هێنابوو و هێندێکیشی پێناخۆش بوو کە دەیبەخشین...

پاشان وێنەگەرەکە هات. هەموو پێیان دەگوت مامۆستا. ئەو سندووقچەیەکی زێرکفت و قورئانێکی پێبوو. دوای ئەوەی قورئانەکەی ماچ کرد و لە سەر سەری دانا، دانییە دەست دایە حۆری. دایە دەستی لەرزین و بە زەحمەت توانی سندووقچەکەی ڕاگرێ، ئەویش پێیخۆش بوو هەوەڵی قورئانەکەی ماچ کا و دوایە وەریگرێ. حەمەد غاری دا پێشێ، قورئانەکەی وەرگرت و لە سەر تاقەیەکی دانا. دایە حۆری چیدیکەی تاقەت نەهێنا و لە بەر لاقی مامۆستای وێنەگەر وە عەرزی کەوت. هێندێکیان ئاوی سارد دایە. کاتێك هێدی بۆوە، لە بەرامبەر وێنەگەرەکەی دانیشت، بەڵام نەیدەوێرا ڕاستەوخۆ چاو لە چاوی و تەنانەت لە دەستەکانیشی بکا. هەر چاوی لە دوگمە سەدەفەکانی بەرۆکی باڵتۆکەی دەکرد. دوای ماوەیەك چاوی لە دەستەکانی کرد، قامکە باریکەکانی و نینۆکە درێژەکانی چاو لێکرد. هەم قامك و نینۆکی و

هەم باڵتۆکەی پەڵە پەڵەی ڕەنگیان پێوە بوو. کاتێکیش سەرەنجام چاوی لە چاوی کرد، لەرزی. کاتێك مامۆستا چاوی لە چاوی کەسێکی دەبڕی، دەسبەجێ دەیزانی ئەو کەسە چیی دە دڵی دایە، چیی بە سەر هاتوە و لە مەودواش چیی بە سەر دێ...

ئەو جار مەلا سەلام لە گەڵ ژنەکەی هاتن. ژنی مەلا سەلامی دەسماڵێکی لە سەر بوو، کە هەموو تووکی سەری داپۆشیبوو و کراسێکی درێژی دە بەر دابوو، کە تەنانەت سەری قامکی لاقیشی دیار نەبوو. ئەوانیش دەستاونگێك، سەماوەرێك و دەستێك ئیستیکانی چکۆلەیان بۆ هێنابوون. ئیستیکانەکان هێلێکی زەردی جوانیان پێدا هاتبوو. هەموو ئەوانەی لە وێ بوون، بە میوان و خانەخوێوە سەماوەرەکە و دەستە ئیستیکانەکەیان زۆر پێجوان بوون.

سەیران لە نێوەڕاستی ژووری سفرەی ڕاخست. ژنەکانی دیکەش بۆ ناندانانەکەی یارمەتییان کرد. ژنی زەکی نەژادی مامۆستا لە جێی خۆی نەبزووت و لە گەڵ پیاوان نانی خوارد و ژنەکانی دیکە لە چێشتخانەکەی کۆوە بوون و لە گەڵ منداڵان نانیان خوارد.

دوای ئەوەی مامۆستای وێنەگەر و مەلا سەلام نوێژی عیشایان کرد، ژنەکانی دیکە و منداڵەکانیش هاتنەوە نێو پیاوەکان و لە گەڵ وان دانیشتنەوە، بەڵام زۆریان قسە نەدەکرد و زیاتر هەر گوێیان بۆ مامۆستای فێرگە ڕادەگرت کە بەردەوام، وەك ئەوەی وتار بدا، قسەی دەکرد و وەك بۆخۆی دەیگوت لە سەر پردی شاهێنی، لە بەرەی ئانتێپێ، بە تاقی تەنێ لە بەرامبەر گورهانێك سەربازی فەڕانسەیی دا ڕاوەستابوو، هاوسەنگەری ڕەشماری پارتیزانی بە ناوبانگ بوو و لە پێش چاوی وی ئەو شەڕکەرە ئازایە کوژرابوو. دەیگوت ڕەشمار خوێندەوار نەبوو، بەڵام لە هەموو پیاوە ئاقڵەکانی ئەستەمبوولێ ئاقڵتر بوو. ئەو لە هەموو کەس باشتر دە ژیان و دەروونی ئینسانەکان دەگەیشت. ئەو چەتەیەکی وەك کوێرۆغلی بوو، لە دەوڵەمەندانی دەستاند و دەیدا بە هەژار و داماوان... بەگ و ئاغاکان کە لە پێش دا هەڵاتبوون، یان هاوکاریی دوژمنیان کردبوو، زەوی و عەرزەکانیان لە نێو خۆیان دا دابەش کرد و هەموو شتێك وەك پێش شەڕێی لێهاتەوە. هەژارەکان برسی مانەوە، بە دەستی ئاغا و بەگەکان چەوسێندرانەوە و وەك مێشومەگەزی پۆل پۆل بە نەخۆشی لەرزوتا مردن... بەڵام مستەفا کەماڵ پاشا هیچی لەو بارەیەوە نەدەزانی، چونکە ئەو ئاغا و بەگانەی دەوریان دابوو، لە ڕووناکاییان دوور کردبۆوە.

وتەکانی زەکی نەژادی مامۆستا وەك شەپۆلی دەریایە بە دوای یەکتر دا دەهاتن.

دایە حۆری ورد گوێی ڕاگرتبوو و هاوکات چاویشی لە چاوی مامۆستای نەدەترووکاند: ئەها ئێستا تێدەگەم. ئێستا دەزانم گرفتەکە چییە! ئێستا دەزانم مستەفا کەماڵ پاشا کێیە.

ئێستا کە میوانەکان ڕۆیشتن، دەزانم چ بەو ژێنرالّەی بلێم کە ئەو دەرەجانەی بە سەر شانی‌یەوەن. دەبێ وشەکانم وەك تیری تیژ بن! بەلاّم ئیدی زێدەڕەویش ناکەم. لە گەلّ ئەوەش ئەو دەبێ پیاوی چاك بێ، چونکە وێنەگەرەکە وێنەی ویشی کێشابۆوە. خۆ مامۆستای فێرگەش کە ئاوا توند باسی ئاغا و بەگانی دەکرد، نەی‌دەویست مستەفا کەمالّی تاوانبار بکا. ئێستا دەزانم بۆ مستەفا کەمالّ ژاندەرمەی ناردۆتە سەر حەمەدۆکی و چۆن بووە ڕێگای داوە کە یاوەر خەجێ بکوژێ... ڕاوەستە با میوانەکانمان برۆن... هەر سەیران و حەمەد نوستن، دەبێ دوو قسەی حیسابیی لە گەلّ بکەم! بۆ دایە حۆری زەحمەت بوو هەموو قسەکانی مامۆستا زەکیی باوەڕ بکا! مستەفا کەمالّ پاشاش جووتیێرێك بوو وەك هەموو جووتیێرەکانی دیکە، بۆخۆی گوتبووی، کاتێك مندالّ بوو شوانی‌یەتیی دەکرد و کێشکی لە مەزرایە دەکێشا کە قەلەڕەشە نەیەن حاسلّەکەی بخۆن... بەلّێ، دەبێ هەموو شتێکی پێ‌بلێم و ڕاستی‌یەکانی بۆ باس بکەم، بۆ مستەفا کەمالّی، وای پێ‌بلێم کە هەتا ماوە لە بیری نەچێتەوە! دەبێ پێی‌بلێم ئەتۆ کە کوڕی بیوەژنێکی نەدار بووی، ئەتۆ کە کێشکت لە مەزرایە دەکێشا و قەلت دەردەکردن، ئێستا لەشکرێکت دەبەر دەستی دایە، کە سەربازەکانی هەموو خەلّکی نەدار و هەژارن. بەو حالّەش ئەتۆ هیچ دەربەستی وان نی و لە بەرامبەر دا لێتگەڕاوە ئاغا و بەگەکان هەموو دنیایە دیسان دە نێو خۆیان دا دابەش بکەنەوە! ئەتۆ نەدەبوو هەلّسوکەوتت ئاوابێ! ئاغا و بەگ چ سوودێکیان بۆ تۆ هەیە؟ ئەو کاتی کە شوان بووی، جارێکیان ئاوڕ وە سەر دای؟ هەر بە فکریان دادەهات ماندوونەبوونیشت لێ‌بکەن؟

ئێستا زەکی نەژاد باسی شەڕ لە گەلّ یۆنانی‌یەکانی دەکرد. لەو شەڕیش دا ئەو قارەمانەتیی نیشان دابوو. ئەوکاتی جارێکی ڕووبەڕوو مستەفا کەمالّی دیبوو. دەی‌گوت پیاوێکی مووزەرد بوو وچاوە شینەکانی زۆر جوان بوون.

دایە حۆری لە دلّی خۆی دا گوتی: ئەگەر وا بێ ئەو وەك وەلی‌یە زەردی خۆمان دەچێ. وەلی‌یە زەردیش لە شەڕی داردانێلی لە گەلّ بووە و کاتێك هاتەوە، لاقێکی لە دەست دابوو. ئەو پیاوێکی بەهێز، کەللەشەق و زۆر ڕاستگۆ بوو. ئەگەر وا بێ هەموو مووزەردە چاوشینەکان وەك یەکن و ڕەنگە نەکرێ دەمە تەقە و باسی لە گەلّ بکەی. بەلاّم هەرچۆنێك بێ، هەتا دەمرم هەر لە مستەفا کەمالّی تووڕەم. خودا زەلیلم کا ئەگەر جارێکی دیکە قسان لە گەلّ ئەو داوەلّەی بکەم! ئەو چەشنە ئینسانانە قەت گوێ لە پیاوی ناگرن. سوێندێ دەخۆم تازە چاو لە وێنەی ئەو کابرایەی ناکەم، کە ڕێگای بە یاوەرێکی خۆی داوە خەجیجێ بەستەزمان بکوژێ.

ئەو جار هونەرمەندەکە قسەی کرد و پێی‌وابوو شتێك جێگای داخە و دەبێ لە گەڵ مامۆستا زەکی باسی بکا: باشە ئەتۆ دەڵێی مستەفا کەمالێش وەك ئێمەیە و تەنانەت قەڵەڕەشەی لە مەزرایە دەرکردوون، بەڵام ئەتۆ کە لە نێزیکەوە چاوت پێی‌کەوتوە، بۆ لێت نەدەپرسی کە لای ئێمە دەگرێ، یان نا؟ ئا یان نا؟ بۆچی ڕێگات دەدا بکەوێتە لای ئاغا و بەگان؟ باشە ئەتۆش لەوەی دا کەمتەرخەمیت نەکردوە؟

دایە حۆری تەواو هاتبوە سەر ئەو باوەڕەی کە ئیدی چاو لە مستەفا کەماڵی نەکاتەوە.

شتێك مابوو کە ئەو پێی‌خۆش بوو بی‌زانێ و دەبوو ئەو پرسیارەشی لە مامۆستای وێنەگەر کردبا: ئەتۆ کە حەزرەتی عەلی، کوێرۆغڵی و تەنانەت بۆڕاقی پێغەمبەریشت کێشاوەتەوە، بۆچی وێنەی ئەو پیاوەشت کێشاوەتەوە؟ باشە قسەکانی مامۆستای ڕاست نین؟ خۆ ئەوە گومانی تیّ‌دا نیە کە ئەوان خەجیجیان کوشت. وێڕای ئەوەی دایە حۆری گوێی دابووە مامۆستای وێنەگەر، ئەو پرسیارانەشی دە خەیاڵ دا دەهاتن و دەچوون. ئەو لایەنی باش و خراپی هەڵ‌دەسەنگاند، بەڵام هەر بە تەواوی ساغ نەدەبۆوە کە چۆن لەو ژێنراڵەی بڕوانێ کە دەرەجەی زێڕی بە سەر شانی‌یەوە بوون. پاشان وای لیّ‌هات کە ئیدی بیر لە هیچ نەکاتەوە.

کاتێك میوانەکان ڕۆیشتن، سەری دەسووڕا. باسە دوور و درێژەکەی مامۆستا زەکی ماندووی کردبوو. بێجگە لەوەش دیتنی مامۆستای هونەرمەند ئەوەندەی شوێن لە سەر دانابوو، کە سەرانسەری ئەوێ ئێوارێ نەی‌توانی ئارام دانیشێ. کاتێك چووە ژوورەکەی خۆی، چاوی لە وێنەی مستەفا کەماڵی هەر نەکرد. لە دڵی خۆی دا گوتی: چش، ناڕەحەت دەبێ، با ببێ، بەڵام منی دایە حۆریی خەڵکی چیای هەزارگای، ئیدی چاوی لیّ‌ناکەمەوە!

بێ ئەوەی تەنانەت چاو لە وێنەی عەلیش بکا، وەك ئەوەی کە ئەویش بە بەشی خۆی لە کوژرانی خەجیّ دا سەبەبکار بووبیّ، فووی لە چراکەی کرد و خەوت. ڕۆژی دواتر، بەیانی زوو وەخەبەر هات و کاتێك ڕووناك بوو، خێسەیەکی لە مستەفا کەماڵی کرد کە وەك جاران، لە جێی‌خۆی، لە پەنا ئەسپەکەی، ڕاوەستابوو.

حەمەد بەڵێنی پیّ‌دابوون بیان‌با دەریایان نیشان بدا. موسلیم ئەسپەکانی ئامادە کردن، هەموویان خۆیان ساز کرد و چوونە دەرێ.

حەمەد هەوساری ئەسپێکیانی دایە دەستی دایە حۆری و ئەویش وەك ژنێکی جحێڵی بە گورد خۆی هاویشتە سەرزینی و سوار بوو. دیارە سەیرانیش هەر لە زووەوە سوارێکی چالاك و بە ئەزموون بوو و بەو شێوەیە هیچ‌کامیان پێویستی‌یان بە یارمەتی نەبوو.

ڕێگاکە بە قەراغ خرێکی وشك دا دەڕۆیی. کاتێك دەریایان لیٚوەدیار کەوت، دایە حۆری لە ئەسپەکەی هاتەخوار، پاشماوەی ڕێگاکەی بە پێیان بڕی و هەتا نەگەیشتنە لێواری دەریایە، ڕانەوەستا. ئەو بەیانی‌یەی دەریا سەیر ئارام بوو. تەنیا هێندێك وردە شەپۆل بە نەرمی لە لێوارەکانیان دەدا. دایە حۆری دەستی دە بەر کەلەکەی نابوو و چاوی لە ئاوەکەی دەکرد، کە لە بەر شۆقی ڕۆژێ دەبریقایەوە و هەتا چاو هەتەری دەکرد، نەدەبڕایەوە. سەیرانیش هەروا حەیران و مات، چاوی لەو دیمەنە جوانەی دەکرد. بۆنی خوێ و تاوێ دە هەوای دا هەست پیٚدەکرا.

ــ ماشەڵلاّ، حەمەد، ڕۆڵە، ئینسان لە بەرامبەر دەریایە دا زۆر چکۆڵە دەبێتەوە. وەك نووکی دەرزی‌یەی لیٚدێ! ئەو دەریایەی تۆ، زۆرم دەترسێنێ!

هێندێك واوەتر تەپۆلکە چیمەنێك لە نێو خیزەکەی بەرز ببۆوە. دایە حۆری چوو و لە سەر چیمەنەکەی دانیشت. سەیرانیش چوو لە تەنیشتی دانیشت. دیسان هەردووکیان ماوەیەکی زۆر بێ ئەوەی چاو بترووکێنن، دە دەریایە ڕامانەوە. حەمەد هەوڵی دا قسەیان لە گەڵ بکا، بەلاّم نەکرا، چونکە هەر گوێشیان لیٚنەدەبوو. موسلیم ئەسپەکانی لە سەر چیمەنێکی خۆشلەوەڕ بەرەڵاّ کرد و بۆخۆی چووە نێو باغە پڕتەقاڵێکی‌یەوە. حەمەدیش لە لای پنگەڵە ئاسیاوەکەی خۆی دانیشت. پنگەکان تۆویان کردبوو و ئێستا بۆنیان زۆرتر بوو. حەمەد هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا. چڵە پنگێکی لە پێش بوو، لە بن پەپوولان دا ون ببوو.

حەمەد چڵێك پنگەی لیٚ کردەوە و بردی‌یە لای دایە حۆری:

ــ بڕوانە دایە، پنگی ولاّتی خۆمان هاتۆتە ئێرە...

ویٚنەدەچوو دایە قسەی حەمەدی گوێ لیٚبوویێ. حەمەد چڵە پنگەکەی لە کن لاقی وی دانا و بۆخۆی بۆ لای ڕۆژاوایە ڕۆیی. سێبەرەکەی لە سەر خیزی، یان لە سەر گۆمیلکە ئاوان دەکەوتە پێشی. خیزەکە زۆر جۆری گوێماسیلکە تیٚدا بوون، هەروەها وردە شووشە، شووشەی بەتاڵ، توێکڵە داری سوور، چیلکەوچاڵ، کەوشەکۆن، قەوزەی وشك و زۆر شتی دیکەی لیٚبوون، بەلاّم حەمەد هیچی نەدەدی. دوور، لە لێواری ئەوبەری، هەوری سپی سپی کە وەك هەڵمی سووك بوون، بەرز دەبوونەوە و دەئاوسان. بیری کردەوە: ئەرێ ئەوە سەیران و دایە حۆری چی‌یان بە سەر هاتوە؟ خۆ هەر لە جێی خۆیان ڕەق بوونە. دەڵێی دارت لە سەری داون، هەر دە دەریایەوە ڕاماون و هیچ ناڵێن! جا ئەوە ئەگەر بەیانی زوو هاتبانە ئێرە و دەریایان دیبا کە بە تەواوی ئارامە، هەتا چاو بڕ دەکا، هەر ئاوە، وەك ئاوێنەی دەبریقێتەوە و خۆی دە شۆقی ڕۆژێ وەردەدا، باڵلێکدانی ماسیگران لە دوورەوە سەرنج ڕادەکێشێ و زۆر جوانیی تایبەتیی دیکە خۆ

دەنوێنن، ئەوە قەت نەیاندەتوانی ئێرە بەجێبێڵن، هەر وا مات و حەیران دەمانەوە و ئاگایان لە هیچ نەدەما، تەنانەت نانخواردن و ئاوخواردنەوەشیان لە بیر دەچۆوە.

ورده ورده ڕۆژ بڵیندتر بوو، سێبەری حەمەدیش بچووکتر بۆوە و هاتە بن لاقانی. دیسان دەستی بە ڕۆیشتنێ کردەوە و دەنگی پێیخۆی بیستەوە. هەستی کرد هێشتا لە گەڵ خانووەکەی، دەریا، باغە پرتەقاڵەکان و بۆنی توندی ئەو دارانە ڕانەهاتوە... گومانی نەبوو کە مەلا سەلام پیاوی چاك بوو، بەڵام هێندێك جەفەنگباز بوو. زەکی نەژاد، مامۆستای فێرگە زۆر توند بوو، بەڵام زۆر جاران دەتگوت مندالە. ئەوانی دیکەش کە لەو شارەی بوون و حەمەد ناسیبوونی، بە تایبەت ئەوانەی کە تا رادەیەك خوێندەوارییان هەبوو، هەر بەو شێوەیە بوون. حەمەد پێیوابوو کە هیچیان پیاوی بە تەواوی مانا نەبوون. حاکم ، موفتی، ئاغاکان و بەگەکان بە دڵی حەمەدی نەبوون. ئەوانە هەرکامە و بە شێوەیەك سەیر دەهاتنە بەرچاو... دەبێ ئەوانە هەستێکیان لە دەروونی دا هەبێ، کە شوێن دەخاتە سەر دڵیان و ژیانیان تێکدەدا. بەڵام بۆچی؟ حەمەد خۆی تەنیا لە مامۆستای وێنەگەر نێزیك دەدی. ئێرە لە گەڵ دێی خۆیان جیاوازیی هەبوو، لە گەڵ بەشی ئاسنگەرەکانیش! ئاسنگەرەکان ئاسنیان سوور دەکردەوە و هەر شتێکی پێیان خۆش با، لێیان دروست دەکرد. کاتێك خەریکی کار بوون، دنیایەك پریشکە ئاوریان بە دەورە دا بڵاو دەبۆوە و ئەوانیش پڕ بە گەروویان پێدەکەنین. کە کوتکیان هەڵدەسووراند و پارچەئاسنیان لە سەر دەزگای دەکوتان، حەمەد لە تەمەشاکردنیان تێر نەدەبوو... مامۆستای وێنەگەر کاری بە کاری ئەو دنیایەی نەبوو، هەر دەتگوت خەڵکی ئەو دنیایەی نیە. وەیدەچوو تازە لە بەهەشتێ ڕا بەربوویێتەوە، بە شێوەیەکی کاتی ماوەیەك لێرە بێ و دوایەش کە هەزار شاکاری پێشکەشی ئەو دنیایەی کرد، بگەڕێتەوە وێ. ئینسانێکی شۆخی دلاوالە بوو. بێگومان لە بەهەشتێ، لە جێگای خۆی، منداڵی کۆ دەکردنەوە، دەچوونە دزیی هەڵووچە، پرتەقاڵ و گوێزان و پاشان بە گیرفان و بەرزگی هەڵمساوەوە خۆیان لە نێو پنچکان دەشاردەوە و بە ئاسوودەیی میوەکانیان دەخوارد... کاتێك مامۆستای هونەرمەند لە کارگەکەی خۆی دا کاری دەکرد و بە قامکەکانی شکڵ و ڕەنگی جۆراوجۆری دەخولقاند، عادەتی وا بوو کە بە ترس و گومانەوە چاوی لە دەوروبەری خۆی دەکرد. کاتێك قەڵەمە موووینەکەی بە سەر سەفحەی تابلۆکەی دا دەکێشا، دەتگوت بە شێوەیەکی نیوەنهێنی ئەو کارەی دەکا، یان وەك ئەوەی کە میوە دزێتییەکەی بە پارێزەوە بخوا. ئەگەر سریوەیەك هاتبا، هاندانێکی کتوپری هەست پێکردبا، ڕوومای یەکسەر دەگەشایەوە و هێندەشی پێنەدەچوو

خۆشحاڵی‌یەکەی دەبوو بە خەم و ئەو خەمە و ماتبوونێکی دەمودەست لە سەر تا پێی دا دیار دەبوو و دە کارگە و وێنەکانیشی دا ڕەنگی دەدایەوە. دیارە هەمیشە وا نەبوو و ئەو شادی و ماتی‌یە جاروبار...

حەمەد چاوی بە سێبەرێکی ڕەش لە سەر دەریایە کەوت، سێبەرەکە لە لای ماسیگرەکان کە دایمە لە نێوان ئاسمان و سەر دەریاکەی دەخولانەوە، بەرز دەبوونەوە و دوایە لە ئاوەکەیان دەدایەوە، وەدیار کەوت. بە وەی وەبیر کابرای نەناسراو کەوتەوە. بڵێی ئەو کێ بێ و لە کوێ ڕا هاتبێ؟ بڵێی جارێکی دیکەش خۆی لێ وەدەرخاتەوە؟ ئەو کابرایە جۆرێکی نیگەران دەکرد، کە هەمیشە بیری لە وەی دەکردەوە تەقەی لێبکا، بەڵام نەك بۆ ئەوەی بی‌کوژێ، بەڵکوو بۆ ئەوەی بریندداری کا، بی‌گرێ و بزانێ کێ‌یە و چیی دەوێ. پێی‌خۆش بوو ئەو گرفتەی لە لای مامۆستای وێنەگەر و دایە حۆری باس بکا، بەڵام نەی‌دەوێرا. نەشی دەزانی بۆ... دەت‌گوت هێزێکی نەهێنی زمانی لە گۆ دەبرد...

بەڵێ، بە بڕوای وی لەو دنیایەی دا وێنەگەرەکە تەنیا کەسێك بوو کە مرۆڤێکی تەواو بوو. ئەو پیاوە پیرە وەك دارێکی وا بوو کە هەموو بەهاران گوڵی دەکرد، دارێکی گەورەی پڕ لکوپۆپ کە گوڵی ڕەنگاوڕەنگ و جۆراوجۆری پێوە دەبوون...

ئەو کاتەی دایە حۆری لە گەڵ حەزرەتی عەلی قسەی دەکرد، حەمەد لە پشت دەرکەی خۆی گرتبوو و ئاگای لێبوو چی‌دەگوت. لە ڕاستی دا ئەو لە گەڵ عەلی، وەك ئیمامی گەورە، ئەو کەسەی پێی‌دەڵێن شێری خودای، نەدەدوا و دەکرێ بڵێین وەك منداڵێکی حەوت ساڵەی قسە لە گەڵ دەکرد... بەڵام دایە حۆری دەی‌زانی چیی دەوێ، چۆنی باس دەکا و بێ‌گومان حەزرەتی عەلیش دڵی وەك دڵی منداڵێکی حەوت ساڵە پاك بووە و شایانی خۆشویستن بووە. ئەسپەکەی وی هێشتاش بە دەوری دنیایە دا غار دەدا، ڕاست وەك ئەسپی ئەسکەندەری. وێنەگەرەکە وێنەی ئەسکەندەریشی کێشابۆوە، بەڵام حەمەد نەی‌وێرابوو داوای لێبکا پێی‌بفرۆشێ. وای هەست کردبوو کە وێنەگەرەکە پێی‌خۆش نیە هونەری خۆی بفرۆشێ و تەنانەت کاتێك تابلۆیەکی لێ‌دوور دەکەوتەوە، نارەحەتیش دەبوو و بە پیچەوانەوە کاتێك وێنەیەکی تەواو دەکرد، زۆر خۆشحاڵ دەبوو. ئەو وێنەی زۆر جۆراوجۆری کێشابوونەوە: گوڵی جۆربەجۆر، ئاسك، کەڵەکێوی، مزگەوت، ئەسپ، دیمەنی جۆراوجۆر لە شاری مەککەی، دەرودەشت بە دەریا، خۆر و ماسیگران لە سەر ئاوێوە، قەڵای کوێرۆغڵی، ڕەوە ئاسك کە لە سەر شاخان بە نێو هەوران دا دەفڕین، حاجیلە کە چاویان وەك ڕەژی‌یە ڕەش، دەندووکی‌یان درێژ و لاقیشیان درێژ بوون... پیاو کاتێك دەچێتە نێو کارگەکەی لاقی نیە بێتەوە

دەرێ، چونکە هەموو دنیا بە دەریا و بۆنەکەیەوە، عەرز و باڵندەکانی، هەموو چەشنە دەعبا و گیانلەبەرێك و ڕووناکایی و هەوری لە پێش چاوی دەبێ و دەتوانێ هەرچەندی بڵێی دانیشێ و چاو لەو دیمەن و شتەجوانانە بکا! دەریاکەی وی بۆ جوانی‌یە لە وی دیکە، ئەوی ڕاستی، نامێنێتەوە، عەرزەکەی، دارەکەی، ڕووناکایی و گوڵەکانی زۆر لە وانە جوانترن کە لە دەرێ هەن. ئەو بۆنە خۆشەی ئەو بە شێوەی هەڵمی سەر دەریایە نیشانی دەدا، بەهێزتر و دەگمەنترە لەو بۆنەی دەریای نێوەڕاست هەیەتی. بۆعەترێك لە دارپرتەقاڵ و گوڵەکانی وی بڵاو دەبێتەوە، کە زۆر مەستی‌هێنەرترە لەو بۆنەی گوڵ و داری نێو باغەکان هەیانە. بەڵێ، هەر کەس بچێتە کارگەی مامۆستای وێنەگەر و بەرهەمی ئەو هونەرە بەرزەی ببینێ، مات و حەیران دەبێ.

لە پڕ حەمەد وشیار بۆوە و دیتی مەودایەکی زۆر لە شوێنی خۆیان دوور کەوتۆتەوە. هەر بۆیە گەڕایەوە. ڕەنگە دایە حۆری و سەیرانیش وەخۆ هاتبنەوە و کاتێك دیتبێتی‌یان ئەو دیار نیە، بۆخۆیان ڕۆیشتبنەوە. دەستی بە ڕاکردن کرد، بەڵام هەر هێندێك واوە هات، دیتنی. هەر لە شوێنی خۆیان مابوونەوە و هەر واش سەیری دەریایەیان دەکرد. حەمەد لێیان چووە پێشێ:

ــ ئەرێ ئەوە چتان لێ بە سەر هاتوە؟ دەڵێی سیحرتان لێ‌کراوە! هەر کەس بۆ یەکەم جار دەریایە ببینێ، ئاوای لێ‌دی و نایەوێ بەجێی‌بێڵێ!

دایە حۆری گوتی:

ــ بێ‌دەنگ بە! جارێ قسان مەکە!

حەمەد چڵە پنگەکەی بۆ لای ڕاداشت، بەڵام دایە حۆری ڕۆبووە دەستی، لە دەستی دەرێنا و فڕێی‌دا. دوایە بە ڕووگرژی‌یەوە پێی‌گوت:

ــ وس... بڕۆ، هەتا هەرات لێ‌نەکەم مەیەوە ئێرە!

ــ باشە دایەگیان...

سەیران دانیشتبوو، ئەژنۆی وەبەر چەنەی دابوو، دەتگوت نە هیچ دەبیسێ و نە هیچ دەبینێ. کاتێك حەمەد دوور کەوتەوە، دایە حۆریش وەك ویی کرد.

ڕۆژ لە ئاسۆی ئاوابوون نێزیك بۆوە و وردە وردە ون بوو. حەمەد و موسلیم لە سەر چیمەنەکەی پشت ژنەکان دانیشتبوون و چاوەڕوانی وان بوون.

کاتێك ڕۆژ بە تەواوی ئاوا بوو، دایە حۆری هەستا، خۆی لە بەریەك کێشایەوە و قرچەی لە هەموو لەگەکانی لەشی هات، خیزی لە خۆ تەکاند و چوو بۆ لای حەمەدی. دەتگوت لە خەوێکی دوور و درێژ وە ئاگا هاتوە:

ــ خودا بە منت بێڵێ، ڕۆڵە!

دوایە چڵە پنگەکەی کە پێشتر فڕێی دابوو، هەڵیگرتەوە و بۆنی کرد:

ــ ماشەڵڵا بۆنی چەندە خۆشە!

سەیرانیش هاتەلایان. سوار بوون و بەرەو ماڵ بوونەوە. ئێستا دەریا خورۆشابوو، شەپۆلە قورسەکانی کەفیان دەکرد، بەڵام نە سەیران و نە دایە حۆری، هیچیان ئاوڕیان نەدایەوە و چاویان لێ‌نەکرد.

کە گەیشتنەوە ماڵێ، تاریکی کردبوو. دایە حۆری لە بەر بێڵایە لە سەر حەمەدی کە ئەسپەکانی بردبوونە تەویلەی و تاقەتی دەکردن، ڕاوەستا. کە حەمەد گەیشتێ، دەستی دە نێو دەستی خۆی گرت و بە سۆز و خۆشەویستی‌یەوە کە بە ڕوونی دیار بوو لە قووڵایی دڵی ڕا دێ، گوتی:

ــ کوڕی من، شەهێنی من، حەمەدۆکی من. سوپاست دەکەم کە ئێمەت بردە وێ. ئەو چاکەیەم قەت لە بیر ناچێتەوە کە تۆ لە گەڵ منت کرد. ئای ئەو دەریایە چەندە شین و گەورە بوو. کەفی شەپۆلەکانی‌شی چەندە سپی بوون. کاتێك پیاو کە لە کن دەریایە ڕادەوەستێ، هەرتۆزێکی لێ‌دێتەوە!

ــ دایە گیان، جا پێش تاوهەڵاتێ نەتدیوە، ئەو کاتی یەکسەر سپی‌یە... شین نیە. وەك هەوری سپی‌یە.

ــ باشە ئەگەر ئێمە چووین زوو نەبوو؟

ــ دەبێ زووتریش لە وێ بی، ئەو دەمی هەتا چاو بڕ دەکا، هەر دەبریقێتەوە...

ــ ئینسان ناتوانێ چاوی لە سەر هەڵگرێ!

ــ نا، دایە گیان، پیاو ناتوانێ چاوی لێ‌بکاتەوە.

دوای نانخواردنێ خەوتن. سبەینێ بەیانی زوو لە خەوێ هەستان. ئەوڕۆژێ بڕیاریان دابوو بچن قەڵاکۆنێکی نێوەڕاستی دەشتێ و باغەکانی دەور و بەری ببینن. دایە حۆری لە گەڵیان نەچوو. وەك ئەوەی دەچوو ئەو دەریا گەورە و ئەو دەشتە پانوبەرینەی چوکووراوایە ترساندبێتی‌یان، هەموو شتێکی سەیر دەهاتە بەرچاو.

حەمەد و سەیران بەری بەیانی وەڕێ‌کەوتن. لە ڕێگایە وەك منداڵان هەر یەکتریان ڕەپێ‌نا و گەمەیان کرد. کاتێك ڕۆژ وەدەرکەوت، بە نێو مەزرا گەنمێکی دا دەڕۆیشتن. گەنمەکە هەتا سینگیان دەهات. هەتا چاو بڕی دەکرد گوڵە گەنمە شەوغاوی‌یەکان وەکوو زێڕی لە بەر تیشکی هەتاوەکەی دا دەدرەوشانەوە. سەیران وەك منداڵان هەر هەڵبەز دابەزی بوو و بە نێو گەنم، گیا و گوڵان دا کە بۆنی

خۆشیان وڵاتی پڕ کردبوو ڕای دەکرد، جار جار گوڵێکی بە دەستەوە دەگرت، لقە گیایەکی هەڵدەپساند، یان مێشێکی دەگرت و دە مستی دا ڕایدەگرت. هێلانەیەکی دیتەوە، سێ هێلکەی بچووکی خاڵخاڵی تێدا بوون و پاشان توێژە مارێکی وشکی لە بن پنچکێکی هەڵگرتەوە. وا لە گەڵ عەرد و سروشتی چوکووراوایە تێکەڵ ببوو، کە ترسی دڕوووداڵیشی دە دڵی دا نەبوو. هەموو شتێکی دەدی، قالۆچەیەك کە پشتی لە ڕەنگی سوور و شین دا دەبریقایەوە، پەڕی باڵندەیەکی کە لە وێ کەوتبوو و بە کزەبایەك دەهات و دەچوو و... هەموو شتێکی دەدی و سەبارەت بە هەموویشیان پرسیاری لە حەمەدی دەکرد. سەرەنجام گەیشتنە دەریایە: هەموو دەوروبەریان وەك ڕەنگی ئاوەکەی شین دەچوو. لە قەراغ دەریایە درێژ بوون. تەواوی لەش و گیانیان لە ئاگری ئەوین دا دەسووتا، وەك ئەو ڕۆژەی کە لە بێلایە ماڵێ دا دوای ماوەیەکی زۆر چاویان بە یەك کەوتەوە و بە یەك گەیشتنەوە. مژێکی چڕ و خەست کە تیشکی ڕۆژێشی تێدەچوو، دایپۆشین. لەو شوێنەی کە هەموو شتێك شین دەچوو و دەو هەوا نەرم و هێدییەی دا لەشیان وەك پۆلووی ئاوری گەرم داهاتبوو.

تاوێك دواتر شەماڵێکی توند هەڵیکردێ، دەریا خرۆشا و هەورە سپییەکانی دەم ئاسۆ دە تیشکی ڕۆژێ دا ئاوسان. حەمەد و سەیران دەمێك بوو لە نێو مژە خەستەکەی، لە سەر چیمەنێ، لە پەنا دوو سێ پنچکان و لە پاڵ پنگەڵەکەی، ڕووتوقووت لێكهاڵابوون و کاتێك مژەکەی دە نێو خۆی گرتبوون، بە تەواوی ڕەوی، وەخۆ هاتنەوە، جلەکانیان دەبن هەنگڵێ نان، بە پیکەنین و قریوەقریو داپەڕینە نێو دۆڵێ و لە وێ خۆیان پۆشتە کردەوە. سەیران گوتی:

ــ دەریا بۆنی وەنەوشەی لێدێ، تەنانەت مەزرا گەنمەکەش بۆنێکی سەیر دەدا و کە سەیریشی دەکەی، وەك دەریایەك شۆق و ڕووناکایی دەچێ. شتی ئێرە هەمووی بۆنێکی تایبەتییان هەیە...

حەمەد سێ پرتەقاڵی لێکردنەوە و دانی بە سەیرانێ. پرتەقاڵەکان هێشتا کاڵ و شین بوون:

ــ ئەوانە گەورە دەبن، دوایەش ڕەنگیان دەگۆڕێ و شیرین دەبن.

سەیران بۆنی بە پرتەقاڵەکانەوە کرد و گوتی:

ــ بڕوانە دەریا چەندە گەورەیە! بەڵام ئەمڕۆ ئیدی لێی ناترسم. دوێنێ وەك شتیکی سەیرم دەهاتە بەرچاو، سەرم دە گێژەوە دەهات... وەڵڵاهی ئاوەکەش بۆنی پرتەقاڵی لێدێ.

کاتێك شەماڵەکە توندی کرد و شەپۆلەکان کەفی سپییان ڕێتێشت، ڕۆژ بەرەو ئاوابوون چوو و سیسرە و ئەو مێشومەگەزەی کە کاتی ئێواران پەیدا دەبن، دەستیان بە جیڕەجیڕ و هازوهووزێ کرد.

کاتێك گەیشتنەوە ماڵێ، دایە حۆری لە بەر دەرکێ ڕاوەستابوو چاوەڕوانیان بوو.

ـ ڕۆڵە، دەزانم زۆرتان برسی‌یە. پڵاوم لێ‌ناوە، گۆشتم سوورکردۆتەوە و دۆکلیوی بە پنگێشم بۆ لێ‌ناون.

حەمەد هەردووك دەستی دایە حۆریی ماچ کرد و گوتی:

ـ دەستت خۆش بێ دایە گیان، یارەبی خودا ئەتۆمان لێ‌نەستێنێ.

دایە حۆری و سەیران چێشتی خۆش خۆشی وەك دۆکلیوی بە پنگێ، کە بۆنی مێرگ و دەراوی شاخیی دەدا، کفتەی ساواری و پڵاوی بۆنداریان لێ‌دەنان. حەمەد ڕۆژ بە ڕۆژ بە کەیفتر و خۆشحاڵتر دەبوو. دایە حۆری و سەیران لە گەڵ خێزانی مەلا سەلامی چوونە شاری و هەرچی پێویستیان بوو، کڕی‌یان. سەیران ملوانکە و بازنەی زێڕ، چەند لەچکەی حەریر و دەسماڵی چیتی گوڵداری بۆخۆی کڕین. لبادێکی جیکجیکیی زۆر باشیشی هەڵگرت و قەوارەیەکیشی پارچە کڕی کە بۆ حەمەدی بکاتە کراس. چەرخێکی تازەی بەرگدروونێشیان هەبوو. تەنانەت سەیران جووتێك کەوشی پانیە بڵیندیشی، لە وانەی دە پێی ژنی مامۆستا زەکی دا دیبوونی، کڕی. کاتێك باسی وەی هاتە پێش کە داخوا دەتوانێ پێیانەوە بڕوا، زەردەیەکی هاتێ و گوتی:

ـ خراپ نیە هەمن، ڕۆژێکی فێر دەبم پێیانەوە بڕۆم.

ڕۆژی دواتر کراسەکەی بۆ حەمەدی دروو. پاشان هێندێك کراس، سوخمە و دەرپێی دیکەشی دروون و ئەو جار هەستی کرد کە سندووقێکیشی پێویستە کە ئەو شتانەی تێ‌بنێ. وا دیار بوو حەمەد بیری لە وەی نەکردبۆوە. سەیران سێ سندووقی داری هەڵبژارد. دەرەوەی سندووقەکان بە وێنەی باڵندە، ئاسك و گوڵی زۆر جوان ڕازابوونەوە. ئاسکە چاوڕەشەکان لە دەشتێکی دا بە نێو گوڵەباغە کێویلان دا ڕایان دەکرد.

ڕۆژێکی چوونە کەبابخانەکەش، کەبابیان بە ترش و شیوتەوە خوارد و ماستاویان لە گەڵ خواردەوە. حەمەد تاریفی کەبابی ئەو کەبابخانەیەی بۆ سەیرانێ کردبوو، بەڵام کەبابەکە زۆر لەوەی خۆشتر بوو کە ئەو گوتبووی و تاریفی زیاتری هەڵدەگرت. سەیران جووتێك گۆرەویی ئاوریشمی چاکیشی کڕی. لە ژیانی دا گۆرەویی ئاوا جوانی نەدیبوون.

ئەو زۆری کەیف بەوە دەهات بچێتە بازاڕی و شتی بکڕێ، هەر بۆیە هێندەی نەکێشا ئاسیاویی لە گەڵ هەموو خاوەندوکانەکان پەیدا کرد. هەموو خۆشیاندەویست و تەنانەت کاتێك بە وێ دا تێ‌دەپەڕی، ئەوانی هەرە بەساڵداچووشیان ئاخیان هەڵدەکێشا و ـ بە شێوەیەك کە زۆر جاران بۆخۆشی گوێی لێ‌دەبوو ـ دەیانگوت: " ماشەڵڵا! بە ڕاستی ژنێکی جوان و شۆخوشەنگە. وەڵڵاهی لە هەموو ژنی سەر ئەو دنیایەی جوانترە. بە ڕاستی خوای گەورە زۆر

به دروستکردنی‌یه‌وه خه‌ریك بووه، که ئه‌و شته جوانه‌ی لیٚ په‌یدا بووه. بابه له دوور ڕا ده‌دره‌وشێته‌وه، وه‌ڵڵاهی له په‌ری‌یه‌کانی به‌هه‌شتێش جوانتره"!

سه‌یران زۆر زوو له گه‌ڵ ژیانی شاری ڕاهات، ژیانێك که به ته‌واوی بۆ وی تازه بوو. کاتێك زۆری وه‌ڕه‌زیی گونده‌که‌ی خۆی ده‌کرد، حه‌وتووی جارێك ده‌چووه نێو شاری و سه‌ری بازاڕی ده‌دا. له گه‌ڵ خێزانی مامۆستای هونه‌رمه‌ند ببوو به هاوڕیٚ و سه‌لیقه و ئیشتیایان له گه‌ڵ یه‌ك ده‌هاته‌وه. جاری وا بوو له به‌یانی‌یه‌وه تا ئێواریٚ وێکڕا له نێو شاری ده‌بوون، چاویان له وێنان ده‌کرد و قسه‌یان له گه‌ڵ ئه‌و دێهاتی‌یانه ده‌کرد که له گونده‌کانی ده‌وروبه‌ر ڕا ده‌هاتن. سه‌یران هه‌ستی ده‌کرد که دێهاتی‌یه‌کان زۆر زیاتر له شاره‌یی‌یه‌کانیش سه‌رنجیان ده‌دایه و پێیان جوان بوو. هه‌ر ده‌تگوت جنۆکه‌یان دیتوه، یان له گه‌ڵ په‌ری‌یه‌کی قسه ده‌که‌ن. که خۆشحاڵ ده‌بوو و پیٚده‌که‌نی، دوو قووڵکه‌ی له سه‌ر ڕوومه‌تانی په‌یدا ده‌بوون، که ئه‌وه‌نده‌ی دیکه‌شیان جوان ده‌کرد و بۆخۆشی ئه‌وه‌ی ده‌زانی و له دڵی خۆی دا ده‌یگوت هه‌رکه‌س له ته‌نگانه‌ی ڕزگار بیٚ و ده‌ست به ژیانێکی تازه و خۆش بکا، دیاره ڕۆژ به ڕۆژ جوانتر ده‌بیٚ. زۆر له جاران زیاتر ده‌چووه به‌ر ئاوێنه‌ی و چاوی له خۆی ده‌کرد. هێندێك دڵه‌خورپه و نیگه‌رانیی هه‌بوو، به‌ڵام نه‌ی‌ده‌وێرا ئاشکرای بکا: ئه‌ریٚ بڵێی حه‌مه‌د به ڕاستی پێی‌وابیٚ ئه‌و جوانه؟ بڵێی هه‌تا سه‌ر هه‌ر وا ئاشقی بیٚ و خۆشی بویٚ؟ پێی‌خۆش نه‌بوو ئه‌و شتانه له گه‌ڵ دایه حۆریش باس بکا، چونکه ده‌ی‌زانی ئه‌گه‌ر ئه‌و پرسیارانه‌ی لیٚبکا، یه‌کجیٚ به سه‌ری دا ده‌ڕووخیٚ.

هه‌موو ڕۆژیٚ، یان ده‌کریٚ بڵێی زۆربه‌ی ڕۆژان، له کاتێك دا خه‌ریکی سه‌روبه‌رکردنی ماڵیٚ ده‌بوو، شیووکوڵی ده‌کرد، به باغچه‌ی ڕاده‌گه‌یی، یان درووومانی ده‌کرد، شه‌پۆلێك خۆشحاڵیی به سه‌ر دا ده‌هات، ده ده‌روونی ده‌گه‌ڕا و سه‌رانسه‌ری له‌ش و گیانی ده‌خۆیه‌وه ده‌پێچا، جا ئیدی هه‌رچیی به ده‌سته‌وه با، دای‌ده‌نا، به ده‌وری خۆی دا ده‌سووڕا و هه‌ستی به خۆشبه‌ختی‌یه‌کی بیٚوێنه ده‌کرد، ڕای‌ده‌کرده لای دایه حۆری، ده‌تریقایه‌وه، به ده‌وری دا سه‌مای ده‌کرد، پیٚده‌که‌نی و باوه‌شی پیٚدا ده‌کرد:

ــ دایه حۆری گیان، وا دیاره چاره‌نووس وای کردبوو که ئه‌من سه‌ره‌نجام ئه‌و خۆشبه‌ختی‌یه‌ی ببینم...

دایه حۆریش که وه‌ك وی هه‌ستی به خۆشحاڵی و به‌خته‌وه‌ری ده‌کرد ده‌یگوت:

ــ شوکور بۆ خوای کچی خۆم! ده‌بیٚ هه‌ر سوپاسی وی بکه‌ین، که ئه‌و فه‌رحانی‌یه‌ی پیٚبه‌خشیوین! خودای گه‌وره و به توانا، که یۆسفی له بنی چاڵاویٚ نه‌جات دا، ئاوڕی وه سه‌ر ئێمه‌ش داوه‌ته‌وه!

هەر لەو کاتەش دا دایە حۆری کاتێك لە جوانیی کەموێنە و خۆشحاڵیی ویی ورد دەبۆوە، هێندێك دڵنیگەران دەبوو.

دایە حۆری دەیزانی ئەو ژنە جوان و شۆخە لە بەرچی نیگەرانە، بەڵام بە هەموو توانایەوە هەوڵی دەدا وەدەرینەخا. کاتێك بە لای وێنەکەی کوێرۆغلی دا دەڕۆیی، ڕووی تیدەکرد و بە سەری دا دەڕووخا. باشە حەزرەتی عەلیش کەموکووڕیی خۆی هەبووە، بەڵێ تەنانەت ئەویش هەیبووە، بەڵام ئاخر ئەو لە نوێژێ دا، لە میحرابی مزگەوتێ دا بە شمشێری لە سەر دڵیان دا، یانی لە کاتێك دا لە ماڵە خودای و لە خزمەت خودای خۆی دابوو، شمشێرێکی وێکەوت و ئیدی تەواو بوو... بەڵام ئێستاش دڵی زۆر لە مستەفا کەماڵی پڕ بوو. لە وێ ئێوارێوە یەك جاریشی چاو لە وێنەکەی نەکردبوو. بەڵێ زۆری قسە دە دڵی دا بوون پێیبڵێ و دەترسا ئەگەر ڕۆژێکیش هەرچی دەدڵی دایە هەڵیڕێژێ، ئیدی لە داخان وەخۆ نەیەتەوە.

بێ دەنگ ماوەیەکی کورت لە بەرامبەر وێنەکەی کوێرۆغلی ڕاوەستا. بە ڕاستی ئەو لە سەر ئەو ئەسپە بۆرەی زۆر جوان بوو، ئەو چاوە شینانەی چەندە سەرنجڕاکێش بوون! ئەدی ئەو ئاسمانە شین و نەرمە کە وەك سەرلێفێکی حەریر ساماڵ و شین بوو. سمی ئەسپەکەی لە سەرەوەی هەوران بوو، دەتگوت دەفڕێ و هەڵۆی باڵزێڕینیش بە دەوریەوە دەفڕین. دایە حۆری تا ئێستا بە چاوی خۆی قەت هەڵۆی باڵزەردی زێڕینی نەدیبوو. خۆ شتی وا هەر نیە حۆریی ماڵوێران! باشە ئەدی بۆ مامۆستای وێنەگەر ئەوەی دروست کردوە؟ بڵێی درۆ بکا و هەر لە خۆڕا شتی وا بکێشێتەوە کە بۆخۆشی چاوی پێینەکەوتوە؟ ئەو جار دیسان تووڕە بوو، هەڵۆ باڵزێڕینەکانی لە بیر چوونەوە و ڕووی دە کوێرۆغلی کردەوە: کوڕی مەیتەری، ئەتۆش پیاوێکی خراپ بووی، برۆ لە پێش چاوم ون بە! ئەتۆ کوێرۆغلی لە دەوڵەمەندانت دەستاند، دەتدا بە هەژاران، ئەوەت باش بوو، وانیە؟ ئاغا ستەمکارەکانت ناچار دەکردن هەڵێن و زەویەکانی وانت بە سەر جووتێران دا دابەش دەکرد، ئەوەشت باش بوو، وا نیە؟ ئەتۆ ئەو ئاغا دڵڕەقە دڕندەیەت کوشت و بە ڕاستیش کارێکی باشت کرد، وا نیە؟ ئەگەر وا نیە دەنگێ بکە! جا قوڕت وە سەری خوێڕیلکەی کوڕی مەیتەرە کوێرەی! ئەتۆ کە کاروانت دەگرت و هەموو وڵاغ و بارەبەرەکانی کاروانەکەشت بە سەر خەڵکی دا دابەش دەکرد، ئەتۆ کە بە زەبرێکی شیری، دڕندە و ستەمکارەکانت دوولەت دەکردن و کۆتاییت بە ستەمیان دێنا، پێم بڵێ ئەو کاتەی ئەتۆ لە "چاملیبێل"ی حوکماتت دەکرد، دنیاکە باشتر نەبوو؟ ئەو کاتەی گورگ و مەڕ پێکەوە ئاویان دەخواردەوە، ئەو کاتەی کە ئینسانەکان فەقیر و دەوڵەمەندیان نەبوو، ئەو کاتەی

هەتیوەکان و نەخۆشەکان پەنایەکیان هەبوو و نانیان هەبوو بیخۆن؟ باشە هەموو کەس ئەوکاتی ڕێزی نەدەگرتی و هەموو بە دڵ خۆشیان نەدەویستی؟ بۆچما ئەتۆ کوێرۆغڵیی قارەمانی وان نەبووی و خودای گەورەش هەر لە بەر خاتری خزمەت بە داماوان و خەمخۆریی هەژاران نەیکردییە نەمر؟ نەیکردییە هاوڕێی چلسوارەی غەیبی و حەوت ساڵحان؟ نەی کردییە هاودەمی خدری زیندە کە بە سواری ئەسپی بە سەر دەریا و وشکاییدا دەڕوا؟ بەڵام کاتێك بوویە نەمر، ئیدی پێویستیت بە هەژار و چەوساوان نەما. ئەو جار چت کرد؟ چووی وڵاتی خۆت بەجێهێشت. هەستای چوویە کن چلسوارەی غەیبی و لە وێ کارت ئەوەیە دادەنیشی و لە کووپەی گەورە گەورە شەڕابی تێدەکەی و پێیدا دەکەی. ئیدی دەربەستی داماوان نی. مەسەلەیەك هەیە دەڵێ... دەڵێ چی؟ با بزانم وەبیرم دێتەوە؟ ئەها، دەڵێ:" کەسێك ئەسڵی خۆی لە بیر بچێتەوە، بە حەلاڵی لە دایکی خۆی نەبووە و بیژووە، وا نیە؟ بەڵێ، هەر گەیشتیە نێو نەمران، کاتێك لە وەی دڵنیا بووی کە ئیدی نامری، بابی خۆت لە بیر چۆوە، یۆسفی ماڵوێرانت فەرامۆش کرد، یۆسفی مەیتەری کوێری چارەڕەش، کە ئەمەگی بە ئەستۆی تۆوە زۆر بوو. ئیدی هەر بیرت لە و چەوساوانە نەکردەوە کە هێندەیان پێویستی بە تۆ هەبوو! هەستای لە گەڵ چل فریشتە و حۆرییان چوویە شاخی لای کووپە شەڕابەکان، لە وێ لێیدانیشتووی، دەخۆیەوە و تێداخنی! هەر بیر لە خۆت دەکەیەوە و بەس! هەر بۆیەش ئێستا ئیدی دنیا پڕ بووە لە خراپە، درۆ و بێعەدالەتی و هەژارەکان نانی شەوێیان نیە زگی منداڵیانی پێ تێر کەن، بەڵام ئەتۆ گوێشت نابزوێ و هەر دەڵێی هیچ نابینی... ئێستا دەوڵەمەند و بەگ و ئاغا چاوی فەقیران دەردێنن، بە زیندوویی کەوڵیان دەکەن و دە چاڵاوێیان داوێن، ئەتۆش مووت لێ نابزوێ... باشە جا ئەتۆ هەر لە وێ دانیشە، ئاوا جوان و بە دیمەن لە سەر ئەسپەکەت خۆت بنوێنە، بە سەر هەوران دا بفڕە و بای دە بن باڵانت بکە... لە حاڵێك دا لێقەوماوەکان خوێن دەگرین. باشە کوڕی مەیتەرە کوێرەی خودا ژیانی هەتا هەتایەی بۆیە دایەی کە ئاوا بکەی؟ دیارە خودا بۆیەی کردییە نەمر کە پشتی بێئەنوایان بگرێ و لە بەرامبەر ستەمکاران دا بیانپارێزی... بۆ ئەوەی لێقەوماوەکان هەتاهەتایە لە ئاسایش و هێمنایەتی دا بژین... بەڵام ئەتۆ... ئەتۆ... ئەرێ بە ڕاستی ئەتۆ بۆخۆت شتێکت دەگوت، چ بوو؟ ئەها ، ئەوە بوو، دەتگوت ئەگەر ئینسان هەزار ئاغا و بەگان بکوژێ، دووهەزاری دیکەیان دێتەوە جێ. نەکا هەر ئەوەش ئەتۆی ترساندبێ! ئەدی ئەگەر وایە بۆچی ناڵێی دەتوانم سێهەزار، شەشهەزار، یان دە هەزاریشیان لێبکوژم. باشە بیرت لە وەی نەکردۆتەوە کە ئەگەر

لێیان بدرێ، بەرەبەرە ئەوانیش تەواو دەبن، یان لانی کەم لە ترسان بێدەنگ دادەنیشن! بۆچما قەتت بیر لە وەی نەکردۆتەوە؟ نازانم ، ئەگەر بڵێی دەترسم، ئەوەش شەرمە. ئاخر کوڕی کابرا کوێرەی دەبێ ئەتۆ لە بارەگای خودای شەرمێ بکەی، ئەو خودایەی کە ژیانی هەتا هەتایەی پێبەخشیوی. وا نیە؟ ئەتۆ ئەسپەکەت ناردوە یارمەتیی هەژاران بکا! بەڵام ئەسپەکە هەر ولاغێکی بێدەسەڵاتە، زمانی نیە، دەروەستی ئاغا و بەگان نایە و یارمەتیی لێقەوماوانی پێنادرێ. قەت بیرت لە وانە نەکردۆتەوە؟ بەڵام با ئەوەش بڵێم هەر ئەوەندە کە ئەو ئەسپە لە نێومانە هەر باشە و هێندێك وورەمان بەرز دەکاتەوە...

جار جار، بە تایبەت ئەو کاتانەی زۆری لۆمەی کوێرۆغڵیی دەکرد، لە پڕ بەزەیی پێدا دەهات: ئەرێ بەڵکوو ئەو بەستەزمانە بە ڕاستی مردبێ، یان نەخۆش بێ و دە جێیە دا بێ! ستەم و بێعەداڵەتی خەریکە دنیایە دادەگرێ و بارودۆخی مرۆڤ ڕۆژ بە ڕۆژ نالەبارتر و ناخۆشتر دەبێ. کە وابوو ئەگەر کوێرۆغڵی، قارەمانی قارەمانان شتێکی بە سەر نەهاتبا و دەرەتانی هەبا، خۆی وەدەرخست و هەرچی دیاردەی ناڕەوا بوو ڕایدەماڵی. جاروبار بیری دەکردەوە: بڵێی کوێرۆغڵی ئێستا لە سەر عەرزی نەبێ و نەچووبێ دە قالبی مستەفا کەماڵییەوە؟ بەڵام ئەو بیرەی هەر زوو لە خۆی دوور دەکردەوە.

تەنانەت هێندێك ڕۆژان ئەوەندە دەترسا کە ڕقی خۆی بە سەر ئادەم و حەواش دا دەڕشت و پێیدەگوتن پیرۆزتان بێ، بۆخۆتان لەو بەهەشتە خۆشەی سەر عەرزێ، لەو دەم چۆمە خۆشەی، لە گەڵ ماری بۆی دانیشتوون! بڕوانە، بڕوانە، هەر بزگوڕێکیشیان پێوە نیە، ڕووتوقووت... وەڵلاهی خۆ جوانیش نین و دەکرێ بڵێم ناحەزن. عەمریان نەمێنێ ئەرێوەڵلا، چوون گەلامێوێکیان لە سەر جێی شەرمییان داناوە، باشە لەو چۆلوهۆلەی کە بێجگە لە خۆتان کەسی دیکەی لێ نیە، کێ دەتانبینێ! خودا چاوتان لێبستێنێ، خۆ دەتوانن هەر چەندی پێتانخۆشە بە قوونڕووتی بگەڕێن! ڕەنگە ترسی ئەوەتان هەبێ کە شەیتان بتانبینێ، بەڵام خۆ شەیتان لەمێژە دیتوونی و هەموو کەلێن و قوژبنی لەشتانی چاوپێکەوتوە، ئیدی چتان ماوە لێی بشارنەوە. جا بە کاوەخۆ لەشی خۆتان وەدەرخەن و مەترسن. ئەوەتا زاریشتان ڕەشە! ئەوە خەتای هونەرمەندەکەی نیە. دەزانن کێ دەڵێم؟ مامۆستای وێنەگەر! ئەوەی وێنەکەی کێشاوەتەوە! پێویست ناکا ئیدی، ئەمن بۆخۆم چاك دەزانم! ئەو هەرگیز درۆ ناکا! ئەو پیاوی خودایە. ڕاستە ئەویش لە تۆرەمەی ئێوەیە، بەڵام ئەو بە هیچ شێوەیەك وەك ئێوە ناچێ. ئێوە دەو بارۆدۆخەی ئێستاتان دا چ شتێکتان نیە شانازیی پێوە بکەن! ئەو ئێوەی چۆنی هەن

کێشاوەتەوە، ناحەز و درۆیین! ئێوە خۆتان لە بەر دنەدانێکی بۆ ڕانەگیرا و بۆ سێوێکی کە تامی ئاوی ساردی نەبوو، فریوی مارێکی خوێڕیتان خوارد! سێوەکەتان خوارد و ئێمەشتان بە خۆتانەوە بەدبەخت کرد! ئێستا دەبێ ئێوە لەو چەرمەسەرییەی ڕزگارمان کەن، ئەوەتا منداڵەکانتان یەکتری دەخۆن، یەك خوێنی یەکێ دەخواتەوە و ئەوەش هەموو خەتای ئێوەی ساویلکەی ناحەزە، کە بە سێوێکی بێ نرخ فریوتان خوارد. بزانن ئەو کارەتان چیی لێکەوتەوە: دەوڵەمەند فەقیری دەخوا. ئەرێ کابرا چیی گوت؟ ئەوەی بەردەوام تووڕەیە؟ پێموایە ناوی زەکی‌یە! ئەو دەیگێڕایەوە کە هەموو هاوینان لەو دەشتەی هەزار منداڵ لە پێناوی چەڵتووك ڕەنێوهێنانێ دا دەمرن، تەنیا بۆ ئەوەی خاوەنزەوی‌یەکان بەرهەمی زۆریان وەگیر کەوێ. خۆزگە یەك منداڵیشتان نەبان و پێشم خۆشە بزانم بە ڕاستی ئێوە لەو منداڵانەتان ڕازین؟ نەوەکانتان لە برسان دەمرن، بەڵێ لە برسان، ئەوانیش لە دەریایەك خوێن دا مەلە دەکەن... ئەمن تا هەم سەبارەت بەو تاوانەی لێتانخۆش نابم. خۆش نیە ئاوا بە ناحەزیتان دەبینم، بەڵام وێنەگەرەکە باشی کردوە ئاوای کێشاونەوە، ئاوا ناحەز.

سەیران کاتێك لە دایە حۆری ورد بۆوە و دیتی کە لە بەرامبەر وێنەکان ڕادەوەستێ، بەو شێوەیە قسەیان لە گەڵ دەکا و بە سەریان دا دەبۆڵێنێ، گوتی:

ـ دایە گیان خۆ ئەوانە ئینسانی ڕاستی نین، ئەوانە هەر وێنەن و گوێیان لە گلەیی‌یەکانی تۆ نابێ!

ـ ئەوە دەڵێی چی؟ چۆن ئەوان گوێیان لە من نابێ؟ شتی وا مەڵێ، گوناهە! ئەوانە هەم دەبیسن و هەم زۆر چاکیش دەزانن ئەمن دەڵێم چی! ئەدی ئەگەر نە دەبیسن و نە تێدەگەن ئەمن دەڵێم چی، بە کاری چ دێن؟

حەمەد لە ئۆگریی دایە حۆریی بە دواندنی وێنەکان سەری سوڕمابوو. ئەو پیرێژنە پیتۆڵە کە بە قەد جندۆکەیەکی دەزانی، ڕۆژ بە ڕۆژ عادەتی زیاتر بە دواندنی کەسایەتی‌یەکانی نێو وێنەکان دەگرت و ئیدی تووڕە با، شاد با، یان ناڕەحەت با، جیاوازیی نەبوو و ئەو کارەی هەر دەکرد. سەیرە! بێگومان دەبێ ئەو کارە مانایەکی بۆو ژنەی هەبێ و مەبەستێك هەیە کە ئەو وە دوای دەکەوێ. دوور نیە ژیانی ئێرەی پێخۆش نەبێ و لە تاوان نەزانێ چ بکا، جا دەچێ خۆی بە وەیەوە خەریك دەکا...

حەمەد بۆخۆی هەموو شتێکی دەوروبەری بۆ نوێ بوون. ژیان لەو شارەی بە هەموو دەنگۆ و کێشەکانی‌یەوە تایبەتی بوون و دیارە ئەو هەوڵی دەدا لەو دنیا تازەیەی بگا. ئەگەر زەکی

نەژاد و مامۆستای وێنەگەری نەناسیبا، قەت دەو کێشانە نەدەگەیشت و وای لیٚ‌نەدەهات کە وەك لە مانگیٚ ڕا بەربوو‌بێتەوە، وا بیٚ. هەروەها ئەگەر ئەوانی نەناسیبا، قەت وا زوو نەدەکەوتە لایەکی و دە کێشەکان وەرنەدەدرا. لە گەڵ زەکی نەژادی بەردەوام دە هاتوچۆ دا بوو. لە لای ئەو عەرزوحاڵنووسی ڕا دەچوو بۆ لای یەکی دیکە، چاوی بە شارەداری دەکەوت، بن کاغەزانی ئیمزا دەکردن. مامۆستای هونەرمەند فێری کردبوو ناوی خۆی بنووسیٚ. حەمەد زوو فێریٚ نووسینی ناوی خۆی بوو و هەموو جارێکیش کە دەی‌نووسی، دڵی وەك ئەو کاتەی یەکەم ماچی دە ژیانی خۆی دا کردبوو، لیٚی‌دەدا. وێنەگەر هەروەها بە نیاز بوو فێری خوێندن و نووسینێشی بکا. پیٚی‌گوتبوو بە سیٚ مانگان فێر دەبی، دوای ئەو سیٚ‌مانگەی دەتوانی بە جوانی بنووسی و بخوێنی‌یەوە و بێجگە لە وەش ئەو کاتی هەر چی لەو دنیایەی دا دەگوتریٚ، تیٚی‌دەگەی و دنیاش باشتر دەناسی! حەمەد پیٚی‌وابوو سەرلە نویٚ لە دایك دەبێتەوە و ئەو جار لە دنیایەکی دا کە ئەوەندەی نویٚ بوو، بەزیاتریشەوە نەناسراو بوو. ئۆگرییەکی کەموێنەی بە زەکی نەژادی‌یەوە هەست پیٚ‌دەکرد، ئەو پیاوە بە ڕاستی سەیر و جیاواز بوو، قەت لە ئامانجی خۆی دوودڵ نەبوو و بۆ ویش وەك برای لیٚ‌هاتبوو. هەربۆیەش حەمەد هێندێك شەرم دەی‌گرت کە ناچار بوو کەسایەتیی ڕاستەقینەی خۆی لە لای بشارێتەوە و پیٚی‌نەڵیٚ لە ڕاستی دا کێیە.

مامۆستای وێنەگەر وەك هەژارەکان و تەنانەت لە وانیش زیاتر حەمەدۆکی یاغیی خۆش‌دەویست. کاتێك زەکی نەژاد بۆی گێڕایەوە کە ئەسپەکە زیندوو بۆتەوە و دواتر ون بووە، بیٚ ئەوەی تەنانەت یەك وشەشی بە زار دا بیٚ، مات بوو و دە بیرانەوە ڕۆچوو. ئەریٚ بڵێی ئەگەر بزانیٚ ئەو کەسەی هەر ئێستا لە بەرامبەری ڕاوەستاوە، حەمەدۆکە، چ بکا ؟ بڵێی شاد بیٚ، باوەشی پیٚ‌دا بکا، یان لە ترسان دڵی بتۆقیٚ؟ نا نا، ئەو ترس ناناسیٚ. ئەو کە پیاوێکی ئەوەندە بە جەرگ و بە ئەزموونە و ئەو هەمووە کوێرەوەرییەی لە ژیانی دا دیتووە، چۆن دەترسیٚ؟ پیاو ئەگەر پیٚی‌بڵیٚ مەرگت لە پێشە و تەنیا شەقاوێکت مەودا لە گەڵ مەرگ هەیە، دیسان ناترسیٚ، قاقایەکی دەکێشیٚ و بیٚ ئەوەی چاو بترووکێنیٚ، دەچێتە پێشی! حەمەد لە ژیانی خۆی دا بێجگە لە نایب ڕەجەب و عەلی‌یە شەلی کەسی وا بە غیرەت و ئازای نەدیبوو. دیارە ئینسان لە هەرچی زیندەوەری سەر ئەو عەرزەیە ترسەنۆکترە، بەڵام بەو حاڵەش هێندێکی لە ڕادەبەدەر ئازاشی لیٚ‌هەڵدەکەون، وەك دایە حۆری، وەك مەلا فەرهادی... هە لە سایەی ئەو ئینسانە ئازایانەشەوەیە کە دنیا هەر وا ماوە. بە ڕاستی دایە حۆری یەکجار ئازا بوو، ئەو دایە حۆرییەی کە هەموو ڕۆژیٚ لە گەڵ حەزرەتی عەلی و خودی خوداش دەدوا!

ئەو پێشنیوەڕۆیەی ڕۆژ بە قەدەر سێ ڕمبان بڵیند ببوو و مژ سەر عەرزیی گرتبوو. حەمەد بە سواری دەچوو بۆ سەردانی مامۆستای وێنەگەر و بەڕێوە خەریکی بیرکردنەوە لە خەڵکی ئەم شارە، مەلا فەرهاد و ئەسپەکە بوو کە دەگوترا هەموو بەیانی‌یان بە سەر شار، گوند، شاخ و دەشتێ دا دێ، و بە شێوەیەکی سەیر دەحیلێنێ. ڕێگاکە بە نێو داران دا دەڕۆیی و لە هەر دووك بەری ڕێگایە دار پرتەقاڵ و لیمۆ بەریان گرتبوو و هەر بە هەلکەوت دەنکێکت لەو میوانە کە هێشتا لە سەری قامکی گەورەی دەستی گەورەتر نەبوون، لێ‌کردبایەوە، بۆنی دەو بەینەی دەگەڕا. باشە لکەکان چۆن ئەو هەموو بەرەی کە ڕۆژ بە ڕۆژ گەورەتریش دەبن، بە خۆیانەوە ڕادەگرن؟

مەودایەکی دوور پێش خۆی تاپۆیەکی لە نێوەڕاستی ڕێگاکەی بەدی کرد و دەسبەجێ کابرای گۆرینی ناسی‌یەوە. سەرەتا بیری کردەوە با بە پڕتاو بۆی بچم و بی‌گرم، بەڵام دواتر بیرەکەی گۆڕا و هێندێك ڕەوتی ڕۆیشتنەکەی شل کردەوە، کابراش شلی کردەوە. حەمەد ڕەق ڕاوەستا، کابراش وەك ویی کرد. حەمەد وەڕێ کەوتەوە، کابراش وەڕێ کەوتەوە. دەتگوت هەودایەکی نەدیو بە یەکتری‌یەوە بەستوونەوە. لە دڵی خۆی دا گوتی دەی‌خافڵێنم و بە دوای خۆم دا هەتا بەر دەرگای ماڵیی دەبەم، بەڵام لە بەر ئەوەی کە لەوانەیە دایە حۆری بترسێ، لەو فکرەی گوزەرا. تەواوی دانی بەیانی هەر ئەو بەزمە درێژەی کێشا. سەرەنجام حەمەد تووڕە بوو، خۆی خستە سەر ئاوزەنگی‌یان و بە پڕتاو بۆی چوو. ئەسپە عەرەبی‌یە ڕەسەنەکەی دەتگوت دە بنی دا باڵی گرتوە. کابرا هەوەڵێ بە پەلە هەڵات، بەڵام زوو تێ‌گەیشت ئاوا لە بەری دەرناچێ و لە نەکاو لە نێوەڕاستی جادەی، بەرەوەڕووی حەمەدی، ڕاوەستا. کاتێك حەمەد نیزیکەی دە هەنگاوێکی مابوو بگاتە سەری، دەستی بۆ دەمانچەی برد، بەڵام نەیپەرژا، کابرا دەستی خۆی وەپێش خست و سێ گوللەی لە سەر یەك ڕاست لە نێوچاوانی ئەسپەکەی دا. پاشانیش خێرا خۆی دە جۆگەی پەنا ڕێیە هاویشت و بەرەو لای دەریایە پالاوتی. حەمەد لە سەر ئەسپەکەی پەڕی، بەڵام بێ ئەوەی تەنانەت یەك دەقیقەش کات بە فیڕۆ بدا کەلاکی ئەسپەکەی بەجێ‌هێشت، خۆی دەجۆگەی هاویشت و بە ڕاکردن بە دوای کابرای دا کە وەك کەروێشکێ بازرە ببوو، ڕۆیی، بەڵام تۆزیشی نەشکاند و لە خۆڕا هەموو گوللەی نێو دەمانچەکەی بە دوا دا بەتاڵ کرد.

بەو شێوەیە گەیشتنە خڕەکەی نێزیك دەریایە. پۆلە پنگەکە بۆنی دەهات. حەمەد زۆر ماندوو بوو و ناچار بوو شلی کاتەوە. کابرا هێندە دوور کەوتبۆوە هەر بە ئاستەم دیار بوو.

حەمەد گەڕایەوە. کە گەیشتەوە کن کەلاکی ئەسپەکەی، ئێوارە بوو، مامۆستا زەکی نەژاد لە وێ ڕاوەستابوو، هەر حەمەدی دی، گوڕاندی:

ـ ئەمگوت حەمەد! ئەمگوت دەبێ وشیار بین؟ ئەو شاکیر بەگە پیاو کوژە، خوێنمژە! ئەمن دەمزانی لێت دەخەفتێ و بۆی هەلکەوێ پێتەوە دەدا! دیارە ئەو بە تەمایە بتکوژێ، بەلام ئەمن لەمێژە دە نیازی وی گەیشتووم و دەزانم خەریکی چ کەلەکێکی‌یە! برای من، ئێستا دەزانی لە گەلّ کێ تێکهالاوین و چ چەشنە خەلکێکمان دوژمنن؟ ئێستا زانیت کە هەمیشە گیانی ئێمە لە مەترسی دایە و هەرچی دۆستی ئێمەش بێ، هەر مەترسیی لە سەرە؟ لە مە بە دواوە دەبێ ئێمەش وشیارتر بین و پارێزگاری لە خۆمان بکەین. ئەگەر ئەوە نەقەومابایە، قەت نەمدەتوانی بە دۆستانمان بلێم کە چ مەترسی‌یەکمان لە سەرە... ئەتۆشم هەر بۆ حالّی نەدەکرا. دوژمنەکانی ئێمە زۆر دڕندەن، دێو و درنجن...

ـ بەلێ دەزانم ئەوانە دوژمنی ئێمەن، بەلام کاکە نەژاد ئەوەی ئێستا ڕووی داوە شتێکی دیکەیە!

پاشان لە سەرەخۆ هەموو مەسەلەی ئەو کابرایە ـ لەو کاتەوە لێی‌پەیدا ببوو تائێستا ـ ی بۆ گێرایەوە:

ـ تێناگەم، نازانم بۆ! بەلام ئەتۆ کە پیاوێکی ئاقلّ و بە ئەزموونی ڕەنگە بۆت لێکبدرێتەوە. باشە ئەو دەیتوانی لەجیاتیی ئەسپەکەی، ئەمن بکوژێ، یانی گوللەکان لە جیاتیی نێوچاوانی ئەسپەکەی ڕاست لە سەری من دا... بەلێ ئەو کە ئاوا ئەنگێوە بوو، دەیتوانی. دەشی‌زانی ئیدی لە بەرم دەرناچێ، دەگەمە سەری و تەقەی لێدەکەم، هەر بۆیەش ئەسپەکەی کوشت و دیارە هیچ ڕێگایەکی دیکەی بۆ دەربازبوون شك نەدەبرد. بە واتایەکی دیکە بە ئەنقەست پاراستمی، بەلام بۆ؟ بۆ دەبێ وا بێ؟

لە سەر تەپۆلکەیەکی قەراغ جادەی دانیشتن و هەتا شەوێ بیریان کردەوە، بەلام هەرچەندی ورد بوونەوە، وەلامێکیان بۆ ئەو پرسیارە نەدۆزی‌یەوە. سەرەنجام هەستان. حەمەد زین و لغاوەکەی لە ولاغەکەی کردەوە، مامۆستا لغاوەکەی هەلگرت و حەمەدیش زینەکە و گەڕانەوە دێی. مامۆستا زەکی گوتی:

ـ بە ڕاستی سەیرە، ئەمن لە ژیانی خۆم دا گەلێکم بارۆدۆخی پڕمەترسی دیون و شەڕیشم زۆر کردوە. لە حەوت بەران بووم، بەلام قەت تووشی شتێکی ئاوا سەیر نەهاتووم. فکرم بۆ شتێکی دەچێ، لەوانەیە ئەتۆ لە ولاتی خۆت، لە دەشتی ئاناوارزای، دوژمنت هەبووبێ و هەر بۆیەش هاتبی‌یە ئێرە، وایە؟

حەمەد گوتی:

ـ ئەمن هیچ دوژمنم نین!

ــ دەنا ئەگەر وابێ، ئەوە زۆر شتێکی سەیرە... ئەتۆ پێتوایە پێشتر ئەو کابرایەت دیوە و دەیناسییەوە، وا نیە؟

ــ بەڵێ وایە، ئەمن هەست دەکەم ئەو کابرایەم پێشتر دیتوە، بەڵام هەرچەندی بیر دەکەمەوە، نازانم کێیە...

ــ سێ گوللەی ڕاست لە نێوچاوانی ئەسپەکەت دان. دەشیتوانی لە تۆیان دا... زۆر سەیرە...

ــ بەڵێ وایە...

ــ ئێستا دەتەوێ چ بکەی؟

ــ هیچ، بەڵام نابێ دایە حۆری بەو مەسەلەیەی بزانێ. نابێ، بۆی دەبێتە فکر و ناڕەحەتی دەکا...

ــ شتێکی ئاسان نیە، نا، بێجگە لە وەش ئەگەر بزانێ کابرای نەناسراو ئەو ئەسپەی کوشتوە، کە تۆی سوار بووی و ئەتۆش هیچت پێنەکراوە، ئەوە ئیدی دەستمان لیهەڵناگرێ و هەر سەرکۆنەمان دەکا، ئیدی قسەمان لە گەڵ ناکا و بە خوێڕی و ترسەنۆکمان دادەنێ... وا چاکترە کەلاکی ئەسپەکەی دە نێو پنچکان دا بشارینەوە. لەوانەیە یەکێك بیبینێ و بیناسێتەوە، باش نیە...

گەڕانەوە، بە زەحمەت و ماندووبوونێکی زۆر کەلاکەکەیان ڕاکێشا نێو مێشەیەکی و لە نێو پۆلە پنچکێکی چڕوپڕ کە مەودایەکی زۆری داگرتبوو، شاردیانەوە.

ــ دوو ڕۆژی پێناچێ قەل و داڵ یەسك نەبێ لێینایەڵنەوە.

حەمەد لە پڕێك قیژاندی:

ــ بڕوانە مامۆستا، ئەوەتا کابرا، لە هۆوەی... دیتووتە؟

ئەوەی گوت، ڕایکردە پێشێ و سێ گوللەی پێوە نان. کابرا سەرەنگرێ بوو و کەوت.

ــ مامۆستا زەکی هاواری کرد:

ــ لێتدا حەمەد... ئەنگاوتت...

بەڵام کابرا دەسبەجێ هەستایەوە و ڕای کرد. هەردووکیان بە دەمانچەی ڕووتەوە کەوتنە سەری و هەتا قەراغ دەریایە لە دووی نەبوونەوە، بەڵام کاتێك گەیشتنە ئەوێ، ئیدی تاریك داهات و هیچ شتێك نەدەبینرا. تەنانەت ئاوی دەریاکەش ڕەش هەڵگەڕابوو.

هیچ ڕێگایەکی دیکەیان بێجگە لە گەڕانەوە نەبوو. هەردووکیان ماندوو و تووڕە بوون.

زەردەگەرمای چوکووراوایە، قورس و خنکێنەر، وەك بەردی، خۆی بە سەر دەشتی بێسنوور دا خستبوو و هەموو شتێك دە تیشك و ڕووناکی دا شەبەقی دەدایەوە. دوور هەتا دەشتە

بەرزەکانی ئاناوارزای، لە وێ ڕا بۆ میسیسێ، بنارەکانی کۆزان و ناوچەی یۆرێگی هەر بەو شێوەیەی بوو.

چەند ساڵ بوو کرێکار لە مەڕاشێوە دەهاتن، لەو مەزرایانە کاریان دەکرد و چەڵتووکیان ڕەنێو دێنا. بە هەزاران هێکتار چەڵتووك لە نێوان دەریای نێوەڕاست، سەرەوەی چۆمی جەیهانێ و تۆپراك ـ کالەی چێنرابوو. ئاو هەموو گوندەکانی گەمارۆ دابوو و ئەو ئاوە هێندەی هەڵم هەبوو و ئەوەندەی مێشوولە لیٚپەیدا دەبوو، کە سەر چوکووڕاوایە تەماوی دەبوو. خەڵك لە بەر مێشوولان شەوانە خەویان لیٚنەدەکەوت و مەڕومالاٚتیش هەر وەتر زەوت نەدەبوون. حاڵی ئەسپەکان لە وانی دیکە شڕتر بوو و زۆر جار مێشوولە هێندەیان پێوە دەدان کە هەموو لەشیان دە خوێنێ دا شەلاٚڵ دەبوو.

مەزرای چەڵتووکی شاکیر بەگی لە ئی هەمووان گەورەتر بوو. کەس بۆی ڕوون نەبوو کە ئەو بەگە ساڵی چەند هێکتاری دیکە وەسەر ئاوێ دەگێڕێ و دەیکاتە باتلاٚغ. تەنانەت بۆخۆشی نەیدەزانی. لە هاوینێ دا خەڵکەکە هەمووی تاولەرزی دەگرت. خەڵکی ئەو دێیانە کە کەوتبوونە نێوەڕاستی مەزرا چەڵتووکەکان زۆریان ڕەنج دەکێشا و وەك مێشومەگەزی دەمردن، بە تایبەت منداڵیان. گۆڕستانەکانی ئەو دەشتەی پڕ ببوون لە گۆڕی تازە.

مامۆستا نەژاد و مەلا سەلام، دوای کوژرانی ئەسپەکەی حەمەدی، زۆری پیٚنەچوو سەرێکی ئەودیوی سنووریان دا و ئەسپێکی جوانی ڕەسەنیان بۆ کڕی. ئەسپەکە ڕەگەزنامەی حەوت پشتی لە گەڵ بوو. حەمەد ئەسپەکەی زۆر وەبەر دڵی کەوت. هەموو ڕۆژێ سواری دەبوو، دەچووە شاری و لە وێ لە گەڵ مامۆستا زەکی بە سەر عەرزوحاڵنووسەکان دا دەگەڕا کە بەردەوام نامەی شکایەت و ڕەخنەیان بۆ خەڵکی دەنووسی و بەڕێیان دەکردە پێتەختێ.

ئەوێ نیوەڕۆیە هەردووکیان بە یەکەوە چوونە بازاڕێ. لە گەڵ جەلالی پینەچی و ڕەفعەتی خەیات چوون سەری وەلی زیندرووبان دا و لە وێ هەتا ئێوارێ دانیشتن و باسی ئەوەیان کرد کە چ بکەن تا بتوانن پێشی بەلاٚی چەڵتووکی بگرن. چەندین ساڵ بوو ئەو خەڵکە هەوڵی دەدا زەویی کەمتر بکرێنە چەڵتووك، بەلاٚم بیٚسوود بوو. ئێستا ئیدی سیٚهێندی جاران چەڵتووك دەچێنرا. بە پێی یاسا، چەڵتووکچاندن لە نێزیك ئاوەدانییە قەدەغە بوو، بەلاٚم ئەم هاوینە زۆر دێ کەوتبوونە نێو ئاوێ، وەك دوڕگانیان لیٚهاتبوو، دەوریان ببووە باتلاٚغ و تەریك کەوتبوونەوە. بە پێی بڕیار و یاسا دەبوو ئەو زەوییەی چەڵتووکی لێ دەکرێ، لانی کەم سێ کیلۆمیتر لە شوێنی ژیانی خەڵکی دوور بێ، بەلاٚم ئێستا وای لیٚهاتبوو حەساری ئەومالاٚنەش کە کەوتبوونە قەراغ گوندەکان، پڕ ببوون لە ئاو.

مامۆستا زەکی خەڵکی ئەو گوندانەی کە کەوتبوونە وەزعێکی ئەوتۆوە، هان دەدا و یارمەتی دەکردن کە هەموو ڕۆژێ تێلگراف بنێرن بۆ ئەنکەرە و شکایەت بکەن.

وەلی زیندروو پیاوێکی بە دین و چاك بوو. ڕیشێکی کورپەی هەبوو، قەت نوێژی نەدەچوو، قەتیش کاری بە کاری خەڵکی نەبوو، بەڵام کاتێك باسی چەڵتووکی دەکرا، تووڕە دەبوو. ئەو ڕۆژەی ئەویش لە گەڵ حەمەد، مامۆستا زەکی و موفتی لە دوکانی زەینوللا ئەفەندی دانیشتبوو و چای دەخواردەوە. لە نەکاو شاکیر بەگ بە پەلە هاتە ژووری، هێندە تووڕە بوو کە چاوی لە ژێرڕا هاتبوون و خەریك بوون دەرپەڕن. شاڵوارە سورمەیی‌یەکەی سواری‌یەی، چاکەتەکەی و کراسە ئاوریشمەکەی دە تۆزێ دا بۆر ببوون. قەمچی‌یە دەسك کارەبا زێوکفتەکەی دە دەستی دا هەڵدەسووڕاند و ئەوەندە ڕەق دەهاتە بەرچاو دەتگوت پەیکەرەیەکی بەردینە... کە هاتە ژوور گوڕاندی:

ـ ها مامۆستا! پێم بڵێ بزانم بۆ دەستم لە یەخەی ناکەیەوە؟ ئاخر ئەمن چەڵتووکی دەچێنم یان ناچێنم بە تۆ چی؟ لە موڵك و مەزرای چەڵتووکی من دا گوند وەبن ئاوێ دەکەون، یان ناکەون، بە تۆ چی؟ بۆچما نازانی هەموو ئەو موڵك و مەزرایانەم بە پووڵ کڕیون؟

مامۆستا زەکی زۆر بە لەسەرەخۆیی ـ بە شێوەیەك کە بۆخۆشی پێی سەیر بوو کە چۆنە دەتوانێ ئاوا خۆی ڕاگرێ ـ وەڵامی دایەوە:

ـ بە پێی یاسا قەدەغەیە کابرا لە نێو دێی چەڵتووکی بچێنێ و دەوری سەدان ماڵان بکاتە باتلاغ!

ـ ئەمن پووڵم داوە. ئەمن گوندەکانیانم بۆ ئەو هاوینەی کڕیوە. ئەتۆ خەریکی دەرسگوتنی خۆت بە و دەم دەو کارانە وەرمەدە. لە بیرت بێ ئەتۆ مامۆستایەکی ڕووتی و هیچی دی! کاری خۆت بکە و خۆ دە شتێك هەڵمەقوتێنە کە پێوەندیی بە تۆوە نیە... دەڵێی نا، بچۆ بیانبینە، ئەو تاوانبارانە پێش ئەوەی بچنە لای حاکمی و شکایەت بکەن، خۆیان دە قوڕێ وەرداوە!

ـ باشە ئەوان بۆ دەبێ خۆ دە قوڕێ وەردەن؟ خۆ ئەوە ئەتۆی ناچارت کردوون دە قوڕێ دا بژین! بۆ دەبێ ئەوان درۆ بکەن؟ ئەوە درۆ نیە! ئەگەر ئەوە درۆیە، ئەدی ئەو هەموو مێشوولەیە کە وەك پەڵە هەوران بە سەر دێیەکانەوەن و وەك گورگی برسی کەوتوونەتە گیانی خەڵکی و ئەو هەموو خەڵکەی بە مالاریای دەمرن، چ لێ‌دەکەی؟ بە ڕاستی ئەوانەش درۆن؟

شاکیر بەگ چاوی سووڕاندن، لاقی وا دەعەرزی کوتان هەموو ژوورەکە لەرزی‌یەوە و گوڕاندی:

ـ چاوی خۆت ورد کەوە مامۆستای بەڕێز! هێندە بەو میداڵە تەنەکەیەی سەر سینگت مەنازە! هەمیشە یەك لە یەکێ بەهێزتر هەر هەیە! پشت بەو خوێڕی‌یانەی دەوروبەریشت مەبەستە!

ئەو جار وەرسوورا و رووی دە حەمەدی کرد:

ـ ئەو جار ئەتۆش، ئەتۆ کە تازە هاتوویە ئێرە و کەس نازانێ کێی و بۆ هاتووی، با پێت بڵێم، وا چاکە پێت لە بەرەی خۆت زیاتر ڕانەکێشی! دەنا دەڵێم لێکۆڵینەوەت لە سەر بکەن!

لەو بەینەی دا چاویان دە چاوی یەکتر بڕی، بەڵام شاکیر بەگ تابی نەهێنا و زوو ڕووی وەرگێڕا، بەو حاڵەش نەیتوانی لە جەغزی ڕوانینی چاوی حەمەدی ڕزگار بێ. چاوی حەمەدی برووسکێکی وەك ئاورینگی ئاسنیان لێدەبۆوە. شاکیر بەگ سەری لێشێوابوو و بە نێو فرۆشگەکەی دا ڕاوێچکەی دەکرد، بەڵام برووسکەکە لە کۆڵی نەدەبۆوە. ناچار چووە دەرێ. لە وێ خەڵکێکی زۆر کۆ ببوونەوە و دەچوون بۆ لای حاکمی شکایەتێ بکەن. بەگ دەستی بۆ لای وان ڕاداشت و گوتی:

ـ مامۆستا، وەرە دەرێ و ئەوانە ببینە، ئەو جووتێرانە کە پێتانگوتوون خۆ دە قوڕێ هەڵکێشن. فەرموو وەرە بیانبینە! ئەوانە هەر ئینسان نین، پەیکەرەیەکن و لە قوڕێ دروست کراون... بەڵێ، بە ڕاستی پەیکەرەی قوڕن...

بەڵام ئەوەش سوودێکی بۆی نەبوو. ڕوانینی حەمەدی هەر لە سەر بوو و ئۆقرەی لێبڕیبوو . ئەو جار ترسێکی ڕە دڵینیشت، کە بە هیچ شێوەیەك بەری نەدەدا. بە نێو ئاپۆرا قوڕاوییەکەی دا و بە پەلە خۆی گەیاندە بن دارە گەورەکەی سەر کانییەکەی نێوەڕاستی شاری. نۆکەرێك کە سەربەرگێکی زلی دەبەر دا بوو، ئەسپەکەی بۆ ڕاگرتبوو. بەگ خۆی هاویشتە سەر زینی، ئەسپی چوارناڵ تاو دا، خێرا بەرەو دەشت دوور کەوتەوە و پەڵە هەورێکی لە تەپوتۆز لە دوای خۆی بەجێهێشت.

زەکی نەژاد گوتی:

ـ ئەو کابرایە بە تەواوی شێت بووە! تەواوی گوندەکانی ئەو دەشتەی کردۆتە باتلاغ و جووتێرەکان هەتا ملان دە ئاوێ دان، کەچی شەرمێ ناکا کە من تاوانبار دەکا، دەڵێ ئەوانم دە قوڕێ ناوە و بوومە هۆی بەدبەختیی وان! ئای لەو مرۆڤە پەستە تاوانبارەی! ئەگەر ئەمن ناوم زەکی نەژاد بێ، بەڵێن بێ وات لێبکەم خوێن بڕشێیەوە شاکیر بەگ!

پاشان دەستی لە سەر میداڵەکەی دانا و گوتی:

ـ ئەو جار ئەگەر ئەو میداڵەش بە ڕاستی تەنەکە نەبێ، دەبێ ئەمن تۆڵەی هەموو ئەو خەڵکە چارەڕەشەت لێ بستێنمەوە!

حەمەد بیری کردەوە: پیاو لە کاتی لێقەومانێ دا دەناسرێ. قەت پێمهوانەبوو ئەو پیاوە کە زۆرتر توورە و هەڵەشە دێتە بەر چاو، ئێستا ئاوا لە سەرەخۆ، ژیرانە و بێمنەت بەرامبەر بە شاکیربەگی دەدوێ. بە ڕاستی مامۆستا زەکی پیاوە، پیاوێکی ئازا و تەواو...

موفتی و زەینولڵلا هەولیان دا مامۆستا زەکی هێور بکەنەوە، چونکە دەیانزانی ئەو پیاوێکی کەللەشەقە و قسەی خۆی دەباتە سەرێ. هەموو سەریان بردبووە بن سەری یەك و سرتوخورتی ئەوەیان بوو کە چ بکەن بارودۆخەکە خراپتر نەبێ و بە ئەزموون دەیانزانی ئەگەر شتەکە ئاوا دەستی پێ‌کرد، زوو پێشی پێ‌نەگیرا و چارەی بۆ نەدۆزرایەوە، ئەوە زۆر خراپ کۆتایی دێ.

شاکیر بەگ خەڵکی ئەو ناوچەیەی نەبوو و لە شاخەکانی ماراشێ ڕا هاتبوو. لە ماڵەکەی خۆی ڕەگەزنامەیەکی گەورەی هەڵواسیبوو. ڕەگەزنامەکە بە قەد دەرگایەکی گەورە بوو و دە چوارچێوەیەرکی زێڕین گیرابوو. دارێك بوو لکەکانی دە ئەژمار نەدەهاتن و هەمووش زێڕکفت بوون. بەڵگەنامەیەکی درێژیشی بە پەناوە درابوو. شاکیر بەگ دەی‌گوت کە بە ڕەچەڵەك دەچێتەوە سەرپاشا دولکادیرلی‌یەکانی هەوەڵێ و بەڵگەشی ئەو ڕەگەزنامەیە و ئەو بەڵگەنامەیە بوو کە لە ئەوعی خۆی دا ئەك کەموێنە، بەڵکوو تاقانەش بوو. تەنانەت قەسری تۆپکاپییش شتی ئاوا جوانی لێ نەبوو. ئەو بەڵگەیەکی حاشاهەڵنەگری دیکەشی هەبوو: قەڵای پایاسێ لە خوارەوەی گاورکۆی هەڵکەوتوە، لە نێوان دەریا و شاخەکەی. شەوانە بۆنی دار چنار و سەروان لە شاخی ڕا دەهات و بۆنەکە هێندە نێزیك بوو، دەت‌گوت دارەکان لە پەناتن، دەتوانی دەستیان لێ‌دەی و بە ڕۆژیش بۆنی خۆشی خوێی لە دەریاکەی خوارەوەی قەڵاکەی ڕا دەهات. عوسمانی‌یەکان قەڵاکەیان کردبووە بەندیخانە و ئەوێ شوێنێکی دەوڵەتی بوو. زوو، زۆر بەندیی سیاسی لێرە دەکوژران، تەرمەکانیان یان دە دەریایە داوێژران و دەبوونە خۆراکی ماسی‌یان، یان لە شاخی فرێ‌دەدران و گورگان دەیانخواردن. بەڵام پێش ئەوەی قەڵاکە وەدەست عوسمانی‌یان بکەوێ و پێش ئەوەی هێزی نوێخوازەکان بێنە وێ، ئەو قەڵایە ئی عەشیرەتی کوچووك ـ عەلی‌ئۆغلیی بوو و ئەو عەشیرەتە باجیان لەو کاروانانە وەردەگرت کە بە ڕێگای ئاوریشم دا، لە میسر، دیمەشق و ئۆرشەلیمەوە دەهاتن. بەڵام شاکیر بەگ دەی‌گوت ئەوە درۆیە و دەی‌گوت:

ـ بەگەکانی کوچووکئۆغلی پیاوی دولکادیرلی‌یەکان بوون و دولکادیرلی‌یەکان کە هەزار ساڵی تەواو باجیان لە سەر ڕێگای ئاوریشم وەرگرتوە، باب و باپیرانی من بوون!

لەو ناوچەیەی هیچ‌کەس نەی‌دەتوانی بڵێ کە بە ڕاستی بنەچەکەی شاکیر بەگی دەچۆوە سەر پاشاکانی دولکادیرلی، بەڵام شاکیر بەگ گوێی نەدەدا ئەو شتانە. دەی‌گوت ئەوانە هەموو قسەن. ئەمن بەڵگەنامەم لە ماڵێ هەڵواسیوە و ڕەگەزنامەیەکم هەیە بە قەد دەرگایەکی گەورەیە.

شاکیر بەگ دوای شەڕی سەربەخۆیی یەکسەر هاتبوە ئەم شارەی و بێ ئەوەی پرس بە کەس بکا خانوویەکی دوونهۆمی سپیی جوانی بە دوازدە ژوورەوە و بە حەسار و باغێکی پڕ لە

داریرتەقاڵەوە داگیر کردبوو و لە گەل بنەماڵەکەی تێی‌دا دانیشتبوو. سەعاتە زێڕەکەی کە زنجیری زێڕیشی پێوە بوو، هێندە گەورە بوو، بە زەحمەت لە نێو مستی دا جێگای دەبۆوە. هەمیشە قەمچی‌یەکی دەسك کارەبای زێوکفتکراوی بە دەستەوە بوو. چەند ڕۆژ دوای هاتنی بۆ ئەم شارەی سەری حاکمی دا و سەعاتێکی بە زنجیری زێڕەوە بۆ وی برد، کە لە سەعاتەکەی خۆشی باشتر بوو. حاکم لەو دلاّوالەیی‌یەی شاکیر بەگی هێندە سەرسام بوو و هێندەی کەیف پیّ‌هات، کە هەر ئەویّ ئێواریّ لە شاکیر بەگی میوان بوو و لە خانووە سپی‌یەکەی وی کە باغێکی گەورەی پرتەقاڵیشی بە ڕووبەری سەد دۆنمەوە بە بەرەوە بوو میوانداریی لیّ‌کرا و هەر ئەو شەوەش زۆری باسی ئەو ئەرمەنی‌یەی بۆ کرد، کە پێشتر خاوەنی ئەو مۆڵك و خانووەی بوو.

حاکم یەکجار زۆر کەوتە ژێر شوێنەواری ئەو پیاوە بەگزادە خاوەن کەسایەتی و بە ئەدەبە و کاتێکیش چاوی بە ڕەگەزنامەکە و ئەو بەلگەنامە بەهێزەش کەوت، کە لە ماڵەکەی بە دیواری‌یەوە بوون، ئیدی هەر بە تەواوی ئۆگری بوو و ئەوەندە شاکیر بەگی گەورە و بە شکۆ هاتە بەر چاو، کە تەنانەت چێشت و نانە بە تام و ڕێکوپێکەکە و فینجانە قاوەکەی پێشیشی لە بیر چۆوە.

حاکمی پیر کە لە زەمانی قەیسەری‌یەوە زۆر دەور و زەمانی جۆراوجۆری دیبوون، زۆر زوو بۆ شاکیر بەگی وەك بابێکی لیّ‌هات و هەر لە ڕۆژی هەوەلێوە قەدر و ڕێزێکی زۆری لیّ‌گرت. ئاخر شاکیر بەگ هەر نەی‌دەزانی درۆ چی‌یە و قسەکانی هەمیشە ڕاستوڕەوان و دلّسۆزانە بوون...

دوای چەند ڕۆژان شاکیربەگ چووە لای حاکمی کە زۆری خۆش‌دەویست و دەی‌زانی ئەویش زۆری ڕێز بۆ دادەنیّ. بازنەیەکی عەنتیکە و ملوانکەیەکی زێڕیشی کە پلپلەکانی یاقووت و مرواری بوون و دەیانگوت زووتر لە خەزێنەی مەهاراجەیەکی هیندی دا بوونە و لە هیندووستانیّ ڕا هێنراون، بە دیاری بۆ خێزانی برد. حاکم کاتێك دیاری‌یەکانی دی بە سەرسوڕمانەوە گوتی: ئەو مرواری و یاقووتانەی بە ملوانکەکەیەوەن، هەموویان ئەسلّن و دەقیمەت نایەن. هەر بۆیە بیری کردەوە: ئەگەر پێم‌وابیّ کە شاکیر بەگ ئەو شتە دەگەمن و بە نرخانەم لە بەرامبەر داگیرکردنی خانووەکە و باغە پرتەقاڵەکەی دا دەداتیّ، هەلّەیە، چونکە هەموو ئەو ئاغا و بەگانە کە خەلاّتی بەشداربوون لە شەڕیان دا پیّ‌دراوە، دەلّێن لە فلاّنە و فیسارە بەرەیەی شەڕمان کردوە، بریندار بووین و شتی وا، دەتوانن هەمیشە سووك و هاسان بینە خاوەنی خانوو، زەوی و موڵك و باغ و ئەوەندەی پێیان خۆشە لەو جۆرە شتانە پەیدا کەن. نەخێر ئەو دیاری‌یانە تەنیا ئەوە دەگەیەنن، کە ئەو بەگزادە دولکادیرلی‌یە نەجیب و گەورەیە بە ڕاستی منی خۆش دەویّ و ڕێزم بۆ دادەنیّ. دەنا چ پێویستی‌یەکی بەوە هەیە ئەو دیاری‌یانە کە بۆ وەی دەبن لە گەنجی شایان دا ڕاگیرێن، بدا بە من؟ جا جەنابی حاکم ئەوەی دە چاوی دابوو و لە پێناوی ئەو بەگە نەجیب و بەڕێزەی دا، کە وەك کوڕی خۆی وا بوو، ئامادە بوو گیانیشی دابنیّ...

هێندەی پێ‌نەچوو شاکیر بەگ هاتەوە ماڵی حاکمی و سەری دایەوە. ئەو جار مافوورەیەکی پەڕاوێز زێڕینی بۆ هێنابوو کە لانی کەم سێسەد ساڵی تەمەن بوو. دەی‌گوت ئەمن شتی ئاوابە نرخم بۆ حاکمی خۆم نەبن، بۆچمن؟ شتی وا بە نرخ هەر شایانی ئەو حاکمە نەجیب و خۆشەویستەیە کە بنە و بنەچەکەشی کەسایەتیی گەورە و نەجیبزادە بوون. ئەوەش لە سیما و هەڵسوکەوتی ئەو پیاوە گەورەیەی دا دیارە! بروانە چەند پیاوێکی مەند و لەسەرەخۆیە، چەندە بە دیمەنە، دەستەکانی چەندە جوانن و بە کورتی چەندە پیاوێکی ڕێکوپێك و لەبەردڵانە؟ وەڵلاهی بەگایەتیی لە هەموو گیانی دەبارێ! ئەو دیارییە تازەیە حاکمی مەست و شەیدا کرد، چونکە ئەو کەیفی زۆر بە مافووران دەهات و دەشی‌ناسین: بێ‌گومان هەموو ئاناتۆلی مافوورەیەکی وای تێدا نیە! هەر لەو حاڵەش دا شاکیر بەگ ڕاستی دەکرد، حاکم ئێستا باوەڕی بە پێشینە و بنەچەکەی خۆی کردبوو: بەڵێ وایە بابو باپیرانی من بەگزادە و نەجیبزادە بوون و گومانی تێدا نیە ڕەگەزنامەی گەورە و بەڵگەنامەی بەهێزی وەك شاکیربەگیشیان هەبووە! بە شاکیر بەگی گوت:

ــ دۆستی بەڕێز و خۆشەویستم، باشە بۆ هێندە ئەزیەتێ دەکێشی؟ ئاخر کوڕم تۆ کە میراتگر و پاشماوەی ڕەسەنی دولکادیرلی‌یانی، بۆ هێندە ئەرکی ئێمە دەخەیە سەر خۆت؟

کاتێك ئەو قسانەی دەکردن، گەرووی دەگیرا و قسەکەی باش بۆ نەدەهات. دەستیشی دەلەرزین و قسەکانی پچڕ پچڕ دەکردن. بەڵام وردە وردە هاتەوە سەرەخۆ، بزەیەکی هاتێ، نەرم و هێدی دەستێکی بە سەر گۆشەیەکی مافوورەکەی دا هێنا و پێش ئەوەی دانیشێتەوە، لە حاڵێك دا چاوەکانی لە خۆشی‌یان دەدرەوشانەوە، گوتی:

ــ شاکیر بەگ، کوڕم، نووری چاوم، هەر ئەمڕۆ دەبێ بچین سەرێکی سەرۆکی تاپۆی بدەین...

ــ بەڵێ، فەرمایشتی جەنابت زۆر بەجێ‌یە جەنابی حاکم. دیارە دیارییەکی بچکۆلانەشم بۆ سەرۆکی تاپۆی داناوە.

ــ نا، پێویست ناکا، ئەگەر هەر پێشتوایە دەبێ بیدەیەی، شتێکی زۆر گران نەبێ، با هێندەت زەرەر لێ‌نەکەوێ کوڕم... جا ئیدی کەیفی خۆتە... بەڵام داوات لێ‌دەکەم ئەگەر دیارییەکەت دایە، لە لای منی مەدەیە، وا باشترە...

ــ زۆر باشە جەنابی حاکم، چۆنی دەفەرمووی، وا دەکەم.

ــ وەڵلاهی ئەتۆ هێندە ڕووخۆش و باش و ڕێکوپێکی هەموو کەس ئۆگرت دەبێ و هەر کەس جارێکت ببینێ پێی‌خۆشە دیسان چاوی پێتبکەوێتەوە و دۆستایەتیت لە گەڵ دابمەزرێنێ، دەبێ هەر واش بێ، تایفەکەتان دەسەڵاتدار و پاشای گەورە گەورەی هەبوون و ئەتۆ لە وان کەوتوویەوە.

ـ وەك بۆخۆت دەزانی جەنابی حاكم، بە ڕەحمەت بێ دایكی محەممەداغای باڵادەست، واتە ئەو محەممەداغایەی ڕووی دە هەر شوێنێكی دەكرد، دەیگرت، لە دولكادیرلی‌یان بوو. ئەوەش لە كتێبەكانی مێژوو دا، چ لە توركیە و چ لە ئورووپایە، نووسراوە. مەبەستم ئەوەیە كە لە هەموو شوێنێكی، لە چیای تووڕووسیێ، لە دەشتی چوكووراوایە و لە هەموو ئورووپایەش خەڵك دەزانێ كە دایكی ئەو سوڵتانە باڵادەستەی، خودا بە ڕەحمەتی خۆی شادی كا، پووری من، یانی خوشكی بابی من بووە!

ـ دەزانم بەگم، دەزانم! بۆخۆم ئەو كاتەی مێرمندالّ بووم ئەو مێژووەم خوێندۆتەوە...

ماوەیەكی زۆر قسەیان كرد و لە سەر ئەو باسەی ڕۆیشتن. شاكیر بەك كەیفی ساز بوو. حاكمیش گۆشەیەكی چاوی هەر لە مافوورەكەی بوو و بزەی سمێلانی دەهات.

ئەوێڕۆژێ شاكیر بەگ سەری سەرۆكی تاپۆی دا و دیارە گوتیشی كە لە لای جەنابی حاكمی ڕا هاتوە. كاتێك خەڵكیان لە دەورە نەما، سەعاتێكی زێڕی سویسیی بە زنجیرێكی زێڕی گەورەوە ـ كە بە زەحمەت دە دەستی دا جێی دەبۆوە ـ پێشكەشی سەرۆكی كرد. سەرۆك لە سەرەتاوە هێندەی پێ سەیر بوو باوەڕی نەدەكرد و بە سەرسوڕماوی‌یەوە دەیەویست شتێك بلێ، بەڵام زاری بۆ هەڵتەپچڕا و یەك وشەشی بۆ نەگوترا. پێی‌وابوو ئەوەی دەی‌بینێ موعجیزەیە. هەتا ئێستا كەس لە پەنجا لیرەی زیاتر نەدابۆیە، بەڵام ئەو سەعاتەی شاكیر بەگ بۆی هێنابوو، دە قیمەت نەدەهات و بۆخۆی سامانێكی گەورە بوو.

شاكیر بەگ هەر بە وەندەش ڕانەوەستا و پێی‌گوت بۆ ئێوارێ لە ماڵێ میوانی وی‌یە. پاشان هەستا و خواحافیزیی لێ‌كرد. سەرۆكیش هەستا و لە گەڵی چووە دەرێ، بەڵام سەعاتەكەی هەر لە نێو دەستی دا بوو و نەی‌دەتوانی چاوی لە سەر هەڵگرێ. شاكیر بەگ ئیدی وەبیری نەهێنایەوە كە بانگهێشتنەكە بۆ ئێوارێیە، قۆڵی دە قۆڵی كرد و گوتی:

ـ سەرۆكی بەڕێز، داوات لێ‌دەكەم سەعاتەكەی دە باغەڵت نێ، چونكە خەڵك بە دەستتی‌یەوەی ببینن، قسان دەكەن... جا كاتێك چوویەوە ماڵێ، بە كاوەخۆ لە گەڵ خێزانی بەڕێزت چاوی لێ‌بكە...

سەرۆكی تاپۆ كە سەعاتەكەی هێشتاش هەر دە نێو دەستی دابوو، وەك ئەوەی دوودڵ بێ، چاوێكی لە سەعاتەكەی كرد و پاشان چاوێكیشی لە شاكیربەگی كرد و گوتی:

ـ یانی بە ڕاستی بەگم ئەو سەعاتەی دەدەی بە من؟ یانی ئەو سەعاتە ئێستا ئی منە؟

ـ بەڵێ، بەڵێ، بۆچما ئەوە چی‌یە؟ ئەوە دیاری‌یەكی یەكجار بچووكە كە بە هیچ شێوەیەك شایانی جەنابت نیە.

سەرۆك قسەی بۆ نەدەهات:

ـ شایانی من نیه؟ بۆ من؟ یانی ئەو سەعاتە ئی منە؟

ئەو جار وەك ئەوەی لەوە بترسێ کە نەکا لە پڕ کەسێك لێیّ برفێنێ، بە پەلە دە باغەڵێی ڕاکرد، دوایە لە وێی دەرهێنایەوە و دە باغەڵێکی دیکەی نا و سەرەنجام بۆ ئەوەی دڵنیا بێ، لە بن چاکەتەکەیەوە دە باغەڵی جلیقەکەی نا و دوگمەی لە سەر داخست و گوتی:

ـ بەگی گەورەم ئەدی ئێستا دەفەرمووی بۆ کوێ بچین:

ـ ئەگەر پێتخۆش بێ، دەچین بۆ ماڵی ئێمە...

ـ بەڵێ بەڵێ، جێیخۆیەتی و دە خزمەتت دام. ئەوە بۆ من شانازییەکی گەورەیە کە بە خزمەت جەنابت گەیشتووم و دیارە زۆرم پێخۆشە ماڵی ئێوە ببینم...

ـ ڕاستت عەرز بکەم خانووەکەمان کۆنە، دەمەوێ دەستێکی پێدا بێنم و هێندێکی ساغ کەمەوە، بۆ ئەوەی لانی کەم تا ڕادەیەك شایستەی ناو و ناوبانگی بابو باپیرانم و تایفەی دولکادیرلییان بێ. ئەو جار ڕەنگە بۆخۆشت بزانی کە میری گەورە، محەممەد پاشای باڵادەست ئامۆزای ئێمە بووە...

هەتا گەیشتنە جێ، شاکیر بەگ هەر باسی خزمایەتی و پێوەندیی خۆی و پاشای باڵادەستی بۆ کرد و گوتی ڕەنگە مستەفا کەماڵیش هەر لەو تایفەی بێ و ئەوەشی لێ زیاد کرد کە خەڵکی تووڕووسی زۆرتر مووزەرد و چاوشینن. تا کاتێك نەگەیشتنە ماڵە شاکیر بەگی، سەرۆك وەخۆ نەهاتبۆوە و هەر دە بیری سەعات و زنجیرە زێڕەکەی دابوو.

کاتێك چوونە ژوورێ، پێش هەموو شتێك سەرۆکی تاپۆی سەری لە شکۆ و گەورەیی ڕەگەزنامە و بەڵگەنامەکەی شاکیر بەگی سوڕ ما. ئەو بەڵگەنامەیە کە هەر شانازی و سەروەریی لێدەباری، نەخشی شمشێرێکی دولکادیرلییانی لە سەر بوو و چەند ئایەتی قورئانێشی بە خەتێکی زۆر جوان لێنووسرابوو، هەر لە میر و پاشا گەورەکان دەوەشایەوە. ماڵە شاکیر بەگی تەنانەت شمشێری سەلاحەدینی ئەییووبی و ئەو نوسخە قورئانەشی لێبوو کە ئەو سوڵتانە گەورەیە بۆخۆی لێیخوێندبوو.... سەرۆکی تاپۆی کاتێك چاوی بەو هەموو شتانە کە ڕەسەنایەتی و گەورەیی شاکیر بەگ و عێل و تایفەکەی وییان نیشان دەدا، کەوت، هێندەی نەمابوو بکەوێتە عەرزی و بێهۆش بێ و لەو بەینەش دا شاکیر بەگ هەر باسی بنە و بنەچەکەی خۆی بۆ دەکرد و شانازییەکانی خۆی و دولکادیرلییەکانی دەخستە بەر چاوی. سەرۆکیش وا حەبەسابوو و بە شێوەیەك لە بەرامبەر ئەو بەگەی دا بچووك ببۆوە، هەموو گیانی لە ئارەقەی دا شەڵاڵ ببوو و هەر بیری لە وە دەکردەوە چۆن هەڵسوکەوت بکا کە شەرمەساری بە دواوە نەبێ...

شاکیر بەگ ڕاست لەو کاتە دا گوتی:

ـ سەبارەت بەو خانووەش جەنابی حاکم دەفەرموێ... ئەمن پێمٶایە، جەنابی سەرۆکی خۆشەویستم، کە...

سەرۆك بە پەلە هاتە نێو قسەکەیەوە:

ـ شتێکی ئاسایییە قوربان، دڵنیا بە! لە سبەینێ زووتر نیە هەراجێکی ڕێکدەخەین... هەر جەنابیشت بەو هەراجەی دەزانی و بەس، هەر ئێوە و جەنابی حاکم... ئاخر جەنابی حاکم بۆخۆی ئێوەی ناردۆتە لای من و ڕایسپاردووی، وا نیە؟

ـ بەڵێ، بە تەواوی وایە.

ـ زۆر باشە، کە وابوو سبەینێ، بەگی خۆم... هەروا نرخێکی کەمی بە کەیفی تۆ لە سەر دادەنێین... هیچکەسیش بەو مەسەلەی نازانێ، دڵنیا بە! ڕێگا نادەین یەکی دی پێبزانێ و نرخەکەی زیاد کا...

ـ ڕێگام بدە سوپاست بکەم جەنابی سەرۆکی تاپۆی.

سندووقدار، دەفتەردار و فەرماندەری ژاندەرمەش هەموویان، هەرکام بە نۆرەی خۆی و لە گەڵ خێزانی خۆی هاتن و سەری بنەماڵەی شاکیر بەگیان دا. هەر کامەشیان دەهاتن، بەگ بانگهێشتنێکی تایبەتیی ڕێکدەخست. سفرە و خوانی لە ڕازاوەیی دا وێنەی نەبوو، وەك دەڵێن شیری مریشکێ نەبێ، هەموو شتێکی لەسەر بوو. تەنانەت شووشەیەك شامپاینی هەرە باشی فەڕانسەویی لە بەر خاتری حاکمی کڕیبوو. خواردنەوەی هەرە گران و خۆش، چێشتی بە تام و بانگهێشتنی دۆستانە چەندین مانگان هەر وا بەردەوام بوو. بە ڕاستی ئەو بەگە کە بەردەوام لەو کۆبوونەوانە دا باسی ئەوەی دەکا لە تایفەی دولکادیرلییانە و محەممەد پاشای باڵادەست ئامۆزای بووە، دەبێ پیاوێکی گەلێك گەورە و دەست و دڵاواڵە بێ، کە دەتوانێ بانگهێشتن و ڕێوڕەسمی ئاوا گەورە گەورە ساز کا و دیاریی ئاوا نایاب و بە نرخ بدا بەو کارمەندە برسییە بەستەزمانانە کە بە هەزار زەحمەت سەرەتا لە شەڕێکی جیهانی و پاشان لە شەڕی سەربەخۆیی ڕزگارییان هاتوە.

ئەوەی کە هیچ کەس شکی نەدەکرد، ئەمە بوو کە خەرجی هەمووی ئەو خوانە ڕازاوانە و دیارییە گرانانە بە ئەستۆی زەینولڵا ئەفەندییەوە بوو. زەینولڵا ددانی بە جەرگی خۆی داگرتبوو و هیچی لەو بارەوە نەدەدرکاند، چونکە لە ڕووی ئاگادارییەوە ئەوەی کردبوو و دەیزانی چۆن بە قازانجی خۆی کەلك لەو بارودۆخە و لەو بەگە وەرگرێ و هەر بۆیەش سەری چوویا، ئەو نەهێنییەی نەدەدرکاند. شاکیر بەگ بە پووڵی زەینولڵای ئەو خەرجانەی دەکرد و ئەویش کە بازرگانێکی بە ئەزموون بوو و وەك ڕێویش زیرەك و کەڵەکباز بوو، دەیزانی کەنگێ و چۆنی لێوەرگرێتەوە و وەك دەڵێن مریشکی بداتێ و قازی

لێ‌بستێنێتەوە. هەر یەکەم جار کە شاکیربەگی دی، زانی ئەو چ پیاوێکە و کە چاوی بە ڕەگەزنامە و بەڵگەنامەکەش کەوت، سەری کیسەی بۆ شل کرد، ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتری شایی پێی بوو و پێی‌وابوو ئەو کاری زۆر گەورەی لە دەست دێن. شاکیر بەگ هەر ڕۆژی هەوەڵێ کە هاتە ئەو شارەی، دەسبەجێ چووبووە لای زەینولڵای و ئەوەش بۆخۆی زۆر شتی دەگەیاند...

زەینولڵا ئەو پرسیارەی سەد جاریش زیاتر لە بەگی کردبوو و هەموو جاریش بە سەرنجەوە بیری لە وڵامەکەی کردبۆوە:

ـ ئەتۆ کاتێك پێت دەو شارەی نا، پێش هەموو کەس هاتی‌یە لای من وا نەبوو؟ پێم‌بڵێ بزانم چۆن بوو ئەو بڕیارەت دا؟

بەگیش بە شانازی‌یەوە قاقای دەکێشا:

ـ ئەمن بۆن دەکەم و خەڵکی چاك دەدۆزمەوە. ئەو مەسەلەیەت نەبیستوە دەڵێن: نەجیب نەجیبزادەی بە چاوان دەناسێ و ڕێیە چل ڕۆژانیش بۆنی هەنگوینی دەکا...

دوای چەند مانگان شاکیر بەگ هەموو شارەکەی بە دەستەوە بوو. سەعاتی زێڕ، پارچەی ئینگلیسی، پەتۆی کشمیر و شتی بە نرخی دیکە بە سەر خەڵکی دا دەبارین. بۆخۆشی باغە هەرە باشەکانی پرتەقاڵی، عەرزە هەرە بە ڕێژەوەکان و مولکە هەرە بە سوودەکانی کڕی. شاکیر بەگ کە بە پێی ڕەگەزنامەکەی پشت بە پشت دەچۆوە سەر ئەبووبەکری خەلیفەی یەکەم، لە پێوەندی لە گەڵ دەستبەسەرداگرتنی خانوو، باغ و عەرز دا سنووری نەدەناسی و هەر چەندی زۆرتری هەبا، بۆ پەیداکردنی ئی دیکە تینوو تر بوو، تەماعی پڕ نەدەبوو و ئەوەی نەکردبا، نەدەژیا. سەرۆکی تاپۆ و سندووقداریش ئی خۆی بوون و هەرکاتێك زانیبایان پارچە زەوی‌یەك هەیە، کە بەگ لەوانەیە کەیفی پێی‌بێ، بێ‌ئەوەی بێڵن کەس پێ‌بزانێ، بە ڕاکردن و هەناسەبڕکە خۆیان دەگەیاندی و ئاگاداریان دەکرد، ئیدی هەر ئەوێ ڕۆژیش هەراجکردنی عەرزەکەی ڕادەگەیەندرا. ڕاگەیاندنەکەشیان بە شێوەیەك دەکرد کە لە بناخە دا کەسێکی وا پێی‌نەدەزانی و لە ڕاستی دا بە دزی دەکرا. دیارە سەرۆکی تاپۆی دەی‌توانی ڕاگەیەندراوەکەی بە بزمارێکی بە دارە گەورەکەی نێوەڕاستی مەیدانی شاری‌یەوە بکوتێ، بەڵام لە بەر خاتری شاکیر بەگی ئەوەی نەی‌دەکرد. بۆچما کەسێکی وا تا ئێستا لە دایکی خۆی ببوو، کە بتوانێ لە بەرامبەر شاکیر بەگی دا سەر هەڵێنێ، بە شێوەیەك ببێتە لەمپەر و پێش بە پلانەکانی بگرێ؟

شاکیر بەگ بەو شێوەیە عەرز، خانوو و باغێکی زۆری کڕین و هاتە سەر ئەو باوەڕەی شتێکی بکا کە لە ماوەیەکی کەم دا پووڵێکی یەکجار زۆری پێ وەسەریەك نێ. ئەو سەردەمە دوو شت لەو ناوچەیەی هەبوون کە پووڵی چاکیان لێ‌دەکەوتەوە: قاچاخچی‌یەتی و چەڵتووك چاندن.

قاچاخچێتی‌یەکە دە پاوانی زەینولڵا ئەفەندیی دا بوو و کەس نەی‌دەتوانی هەر بیریش لەوە بکاتەوە کە بەربەرەکانیی ویی بکا. ئەو قاچاغی هەموو شتێکی دەکرد: چەك، هێرۆیین، زێڕ، ڕەوە ئەسپ، پارچە، جلوبرگ و ماشێن. ئەو پووڵەی وەگیری دەکەوت هەمووی دەدا بە خانوو لە "بۆسپۆرێن"، "بەگۆغلی" و "سیرکەجی". شاکیر بەگ ئازایەتی، زیرەکی و بەهێزیی ئەو پیاوەپیرەی وە بەردڵی کەوتبوو و لە ژیانی خۆی دا ئینسانی ئاوا بە فکر و ڕاپەڕ و وردبینی نەدیبوو،...

هەر هەوەڵ جار کە حەمەدیان دی، زینولڵا شاکیری وشیار کردەوە: لەو کوڕەی دەترسم، دوور نیە جێگای مەترسی بێ، دەبێ چاوێکمان لێی‌بێ، وا دیارە ڕابردوویەکی تا رادەیەك سەختی هەبووە و پیاوی وەك وی پۆلووی بن خۆڵەمێشێن. کە وا بوو دەبێ وشیاری بین...

لە وێڕۆژێوە شاکیر بەگ چاوەدێریی حەمەدی دەکرد، نەك هەر لە بەر قسەکەی زەینولڵای کە دەی‌گوت دەبێ وشیاری بین، بەڵکوو بۆخۆشی هەستی دەکرد لە ڕوانینی ئەو کوڕەی سەیر دەترسی. هەمیشە پریشکە ئاگرێکی دە چاوی دا بوو و شاکیر بەگ هەرگیز لە چاوی کەس ئاوا نەترسابوو...

وەك باسمان کرد شاکیر بەگ ڕێگای قاچاخچی‌یەتی‌یەی نەبوو. دەماوە چەڵتووك، کە قازانجێکی یەکجار زۆری هەبوو! بە ساڵێکی پیاوی دەوڵەمەند دەکرد. خەرجێکی واشی نەبوو. کێڵانی نەدەویست، گێرە و جەنجەڕی پێویست نەبوو. شتڵەکەت دەچەقاند و ئاوت وە سەر دەگێڕا. هەر ئەوەندە. پاییزێش بە هەزاران جووتێر لە شاخی ڕا دەهاتنە خوار و دەکرێ بڵێین بە ئانەزگی کاری ڕەنێوهێنانەکەیان جێبەجێ دەکرد. تەنانەت دوایە هەڵبەستنی جۆگە و بەرەی تازەش بۆ هەڵچۆڕاندنی ئاوەکەی پێویست نەبوو، چونکە کۆنەجۆگە هەبوون و هێشتا دەکرا کەلکیان لێ‌وەرگیرێ.

ئەو ساڵەی شاکیر بەگ و هێندێك چەڵتووکچێنی ماڕاشیی دیکە، ئاویان وە سەر دەشتێ گێڕا و ئەو نێوەیان کردە باتلاغێکی تەواو. شاکیر کۆمەڵە کرێکارێکی بە ئەزموونی لە ماڕاشێ ڕا هێنان کە سەرکرێکارەکەیان ناوی عەلی ددانزێڕ بوو. ئەوێ پاییزێ بەرهەمەکە یەکجار چاکی بری. شاکیر بەگ پووڵێکی زۆری وەگیر کەوت و دەسبەجێ هەموو قەرزەکەی زەینولڵا ئەفەندیی دایەوە. لەمێژ بوو ئەو دەشتە برینجی لێ‌نەدەکرا و مێشوولە و مالاریاشی لێ‌بڕابوو. ئەمساڵ چەڵتووکی شاکیر بەگی دەوری دە گوندانی گرتبوو و چەڵتووکچێنی دیکەش بە هەموویان زەویی دە دێیانیان دە ئاوێ دا نوقم کردبوون. زۆر زوو مێشوولە پەیدا بوون و زیادی‌یان کرد. پۆلپۆل بە حەوایەوە دەگەڕان، لێکدەهاڵان و وەکوو هەوری ڕەشی پێش بارانێ بە سەر گوند و شاران دا دەخولانەوە. لەرزوتا وڵاتی داگرتبوو. ئەو هاوینەی ژمارەیەکی زۆر منداڵ مردن. گۆڕستانەکان سەدان گۆڕی بچووکی تازەیان پێوە زیاد بوو. ئیدی لە شاری و لە گوندی کەس نەی‌دەتوانی شەوانە بێ مێشوولەبەند بخەوێ. سەرانسەری ئەو هاوینەی بەر دەرگای

تاقە دوکتۆری شاری پڕ بوو لەو دێهاتی‌یە نەخۆشانەی کە وەك پەیکەرەی قوڕین لە وێ چاوەڕوانی نۆرە دەبوون. حەساری مزگەوتەکانیش پڕبوون، باغچەکانیش، مەیدان و جادەکانیش هەروا. هەموویان لە بەر ئێشی تاولەرزەکەیان نوشتابوونەوە، دەموچاویان چرژابوون، بە زگی بەتاڵەوە، بە لارەوەلارەوە دەهاتن و دەچوون، یان کەوتبوون و لە تاو ئێشی خۆیان دەیاننالاند.

هەر ئەو هاوینەش بوو کە مامۆستا زەکی نەژاد دەستی بە بەربەرەکانی بە دژی چەڵتووکچێنەکان کرد. کۆمەڵێك کەسیش پشتیوانی‌یان لێدەکرد. شێوەی خەباتەکەشیان ئاوا بوو کە بەردەوام تێلگرافیان بۆ ئەنکەرە بەرێدەکرد و شکایەتیان دەکرد، شارەداریان دەبرد و گۆڕە تازەکانی منداڵەکانیان نیشان دەدا

و وێنەی ئەو هەموو نەخۆشانەیان دەنارد بۆ ئیدارە دەوڵەتی‌یەکان، ئەو نەخۆشانە کە بە هۆی تاولەرزەوە، وشك و رەق هەڵاتبوون و زگیان هەڵمسابوو. بەڵام ئەوانە هەمووی بێسوود بوون. چەڵتووکچێنە دەسەڵاتدارەکان هەر دەهات و رووبەرێکی زۆر زیاتریان دەکردە چەڵتووك و زۆر گوندی دیکەیان وەك باتلاغی لێدەکردن. زەکی نەژاد و هاورێ هاوخەباتەکانیشی بەردەوام تێلگراف، نامە، وێنەی مردووان و گۆڕە تازەکانیان بەرێ دەکردە ئەنکەرەی. بەربەرەکانی‌یەکە توند بوو، بەڵام خاوەنچەڵتووکەکان رۆژبەرۆژ رووبەرێکی زیاتریان دە بەر ئاوێ دەنا، بەرهەمیان زۆرتر دەبوو و دیارە دەوڵەمەندتریش دەبوون.

بەڵام سەرەنجام وای لێهات کە بەسەرهاتی خەباتی مامۆستا زەکی و هاورێیانی بە دژی خاوەن چەڵتووکە ستەمکارەکان و نەخۆشیی تاولەرز، بوو بە نامیلکە و داستان. پێهەڵگوتن و لۆرانەوەی کاتی ناشتنی مردووەکانیش بوون بە بەیت و حەیران و سەرەنجام زار بەزار گەیشتنە گوێی رووناکبیران و خەڵکی دیکە لە ئەستەمبووڵێ. هەر چەند ئەو داستان و بەیتانە بۆ ئەو خەڵکەی و لەو مەودا دوورەی هێندێك ناروون بوون و هەستکردنی راستی‌یەکان و دەردەکانیش وا هاسان نەبوو، بەو حاڵەش بە توندی دەروونی هێندێك نووسەر و رۆژنامەنووسی هەژاند و هەستی هاودەردی‌یەکی توند لە گەڵ دێهاتی‌یە هاونیشتمانەکانیانی تێدا پێکهێنان. هەوڵ و خەباتی مامۆستا زەکی سەرەنجام ئاکامێکی لێوەدەرکەوت: دوکتۆر و پەرستار هاتن و دەرمانی مالاریایان بە سەر نەخۆشەکان دا دابەش کرد، ئەو نەخۆشانەی کە بێجگە لە قوراوی مەزرای چەڵتووکێ ئاوی دیکەیان بۆ خواردنەوەی شك نەدەبرد. هەروەها خوێنیان بۆ تاقیکردنەوە لێگرتن. خوێنەکەیان لە سەر پارچە شووشەی بچووك بچووك پان دەکردەوە، پاشان دەیان نارد بۆ تاقیکردنەوە و دیارە مەبەستیشیان ئەوە بوو کە بزانن چەند کەس گرتوویانەتەوە، بەڵام ئەو کارەش سوودێکی زۆری نەبوو و پێشی هێرشی نەخۆشی‌یەکەی بۆ نەدەگیرا، چونکە زەحمەت بوو کەس لە چنگی ئەو نەخۆشی‌یەی رزگار بێ.

مامۆستا زەکی نەژاد و هاوڕێیانی بەوەی ڕازی بوون کە چەڵتووکچاندنەکە لە چوارچێوەی یاسا دا بێ، بەو مانایە کە ئەو زەوییەی برینجی لێدەکرێ، لانی کەم سێ کیلۆمیتر لە دێی دوور بێ. بەڵام ئەوەش زۆر زەحمەت بوو، چونکە لە سەرەتاوە جۆرێك ئاوەکەیان هەڵبەستبوو کە ئیدی هەموو دێیەکان وەك دورگانیان لێهاتبوو و دە گەمارۆی ئاوێ دا بوون. یاساکە هەر قسە بوو و هیچی دی، یان با بڵێین درۆیەکی گەورەبوو. بەو گەرمایەی کە بە سەر ئەو دەشتەی دا زاڵ بوو و بارۆدۆخێکی لەباری بۆ تاولەرز دەرەخساند، نەخۆشیی مالاریای خەریك بوو خەڵکێکی لەنێو دەبرد. مامۆستا زەکی دەیگوت ئیدی ڕێگا چارە تەنیا ئەوەیە کە بە تەواوی پێش بە چاندنی چەڵتووکی بگیرێ و دیارە بە قسەشی نەدەکرا. هەموو شتێك دە چوارچێوەی تۆڕێك لە پێوەندیی تایبەتی و بەرتیل و گەندەڵی دابوو و تەنانەت کاربەدستی هەرە پاك و دلسۆزیش نەیدەتوانی لە شوێنەواری گەندەڵی و بەسراوەیی بەو تۆڕەی ڕزگار بێ.

بەو حاڵەش زەکی نەژاد و هاوڕێیانی هێندێك خاڵی بە هێزیان لە دەست دا بوو: دوکتۆری شاری کە پیر ببوو، لەو بەینەی دا خانەنشین کرا و دوکتۆرێکی لاو جێگای وی گرتەوە، کە لە بناخە دا بابی جووتێر بوو، کاتی خۆی وەك داخواز لە شەڕی سەربەخۆیی دا بەشدار ببوو و هەر لە شەڕیش دا بێسەروشوێن ببوو و ئیدی نەگەڕابۆوە. ئەو دوکتۆرە پشتیوانیی لە جووتێرەکان دەکرد و شانبەشانی مامۆستا زەکی لەو پێوەندییە دا هەڵدەسووڕا. دوکتور لە هیچ نەدەپرینگایەوە و دەکرێ بڵێین زۆر جار چی وای نەدەما گیانیشی لە سەر ئەو کارەی دابنێ. دەیگوت: ئەو چەشنە چەڵتووکچاندنە لەو دەشتەی کە لە کۆنەوە هەر لۆکە، نارنج و سەوزیی لێ ڕەنێو هاتوە، تاوانە! بەڵام هەرچەندی نامەی شکایەتیان بۆ پێتەخت نارد، هەر بێسوود بوو و وەڵامیان نەدەدانەوە. پێتەخت بیری لەوە نەدەکردەوە کە چەڵتووکی قەدەغە بکا، چونکە برینج سەرچاوەیەکی هەرە گەورەی داهات بوو. بێجگە لە وەش خۆ نیوەی عەرزی چوکووراوایە، کرابا برینج یان نەکرابا، هەر بۆخۆی باتلاغ بوو...

لە پڕ شتێکی تازە ڕووی دا. بەڕێوەبەری بەشی لەشساغی لە وەزارەتخانەی پشتی دێهاتییەکانی گرت. کەسێکیش بوو بە فەرماندەری ژاندەرمەخانەی، کە لە زەمانی شەڕی سەربەخۆیی دا، دوای شەڕی" دوملووپینار"ی، لە دەروازەی شاری ئەزمیرێ، لە گەڵ زەکی نەژادی یەکتریان ناسیبوو و ببوونە هاوڕێ.

هەموو ڕۆژێ دێهاتییەکان بە سەر و گیانی قوڕاوییەوە لە پێش باڵەخانەی شوێنی کاری حاکمی و بەر دەرگای نەخۆشخانە بچکۆلەکەی شاری کۆدەبوونەوە و هەتا تاریك دانەهاتبا، ئەوێیان چۆل نەدەکرد. شاکیر بەگ پێش ئەوەی ئاوێ بەرداتەوە سەر زەوییەکان، بەڵێنی بە

خەلکەکەی دابوو کە هەر کەسە و مێشولە بەندێکی بداتێ، بەلام ئێستا کە هاوین بوو و پۆلپۆل مێشوولە وەك پەلە هەوری ڕەش ئاسمانیان داپۆشیبوو، ئەو بەڵێنەی لەبیر چووبۆوە.

شاکیربەگ هەموو بەرهەڵستکاری و هەڵسوکەوتی جووتێرەکان: مانگرتنیان لە پێش دەرگای حاکمی، لە نێو شەقام و لە حەساری مزگەوتێ، تێلگراف ناردنیان بۆ ئەنکەرەی، ئاگادارکردنی ڕۆژنامەکان لەو باسوخواسە و هەموو ئەو جۆرە شتانەی لە چاوی مامۆستا زەکی نەژادی دەدی و دەی گوت ئەو کابرایە نیشتمان فرۆشە و بێجگە لە خەیانەت شتێکی دیکەی بۆ ئەو وڵاتەی دە باران دا نیە، دەنا جووتێری تورکی بەستەزمان کە دەڵێی مەڕی خودایە، وەك لۆکەی نەرمە و پارووشی لە زاری بکەیەوە وەدەنگ نایە، نەك هەر نارەحەت نیە، بگرە شوکرانەبژێریشە. ئاخر بابم کابرای چەڵتووککار خۆ چاوی لە زەویی خۆڕایی نیە، پووڵی دەدا پووڵ! جا وا هەیە زۆرتر و واش هەیە کەمتر، بەلام هەرچۆنێك بێ، پووڵی هەر دەدا. تاولەرزیش هەمیشە هەر هەبووە و هەر دەشبێ. ئەوە بە چارەنووسی وانەوە گرێدراوە، ئیدی ئەمن بلێم چی؟ بەڵێ منداڵ مردوون، بەلام ئەوەش بە قازانجی وان بووە. برا منداڵ یەکجار زیادیان کردبوو. هەر ژنەی دەرزەنێك منداڵی دەبوو! وا نەبایە چەند ساڵی دی جووتێری تورك هەموو دنیایان دەگرت و دەیانکردە ئی خۆیان...

" جا بۆخۆتان بیری لێبکەنەوە بەڕاستی ئەو کاتی ژیان چۆن دەکرا؟ ئەو پیاوە میهرەبان و ئاقڵ و بێدەنگانە هەرکام دەبوو بە ئاتیلایەك! زەکی نەژاد، ئەو خاینە، ئەو سەگە، چیلکەیەکی دە کونە زەرگەتەی دەوەژێنێ و ئەو زەرگەتە نیوەخەوتووانە کە بە زەحمەت باڵێکیان بۆ دەبزێورێ، وا دەهارووژێن کە کاتێك بە پۆل لە کونێ دێنە دەرێ، وەك گڕی ئاگریان لێدێ".

شاکیر بەگ دەیتوانی مفت و مەرحەبا بە یەکێك لەو جووتێرانە زەکی نەژادی بکوژێ، هەر بە یەکێك لەو جووتێرانەی کە مامۆستا زەکی ببووە ڕێبەریان و بە دژی ئاغا و بەگەکان هانی دەدان. کوشتنێکی ئاوا زەحمەت نەبوو... دەی ڕاستە ئەو بەڵێنی بە جووتێرەکان دابوو کە مێشولەبەندیان بداتێ، بەلام ئاخر ئەوانە کوا دەیانزانی بە کاری بێنن؟ دەبوو ئەو مامۆستا ساویلکەیە ئەوەی زانیبا! ئەوان هەر شەوی هەوەڵێ مێشولەبەندەکەیان پڕ دەکرد لە مێشوولە و دوایەش وەك پێشوو، لە قولینچکێکی هەتا بەیانی بۆی دەنوستن. لە بەر ئەو کوڕە لاوەی نەبا کە پریشکە پۆلای لە چاوی دەبنەوە و وەك سێبەری بە دوای زەکی نەژادییەوەیە... شاکیر بەگ دەیتوانی بە هاسانی شەڕی زەکی نەژادی لە سەر خۆی کەم کاتەوە. بە تایبەت ئێستا کە خەلکی شارەکەش لە هەموو شتێکی وەڕەز ببوون و ئاپۆرای جووتێرە قوڕاوییە بەرهەڵستکارەکان زۆری ئەزیەت دەکردن... دەبێ هەر واش بکا، چونکە ئەو مامۆستا نەگبەتە ژانەسەرێکی زۆری دروست کردبوو. شاکیر بەگ هەوڵی دابوو تێیبگەیەنێ کە ئەوە مەترسیی بۆی هەیە، بەلام ئەو خۆبەزلزانە کەللەڕەقە هەر گوێشی پێنەبزووتبوو و هەروا درێژەی بە هەڵلای خۆی دابوو. خۆ خوا هەڵناگرێ شاکیر بەگ

زۆریش توند و ستەمکار نەبوو، تا ئێستا تەنیا چەند جووتێری کوشتبوو، کە دیارە ئەوانیش هەموویان خاین و تاوانبار بوون... دەی ئەسپی زۆر مسکێنیش جاری وا هەیە جووتەی داوێ، بەڵام ئەو زەکی نەژادە هەر تێ‌تەگەیشتوە و پێشموانیە هەرگیز تێ‌بگا! نەخێر بێ‌سوودە، ئاخر هەتا کەنگێ دەبێ ددان بە جەرگی خۆی داگرێ. بە ڕاستی تاوانی خۆی بوو! ئەگەر لە بەر ئەو زەینولڵا ئەفەندی‌یەی نەبوایە، لە مێژ بوو مامۆستا زەکی کوژرابوو و پەسکیشی نەمابوون... دیارە لەو کوڕەش، ئەو کوڕەی ڕوانینەکەی ئاوا سەیر بوو، دەترسا. بە ڕاستی لێی‌دەترسا. ئەو کوڕە دەبێ کێ بێ؟ خوارزای مەلا سەلامی‌یە، باشە دەبێ چۆن پیاوێك بێ؟ ڕەنگە وردە وردە زیاتر بناسرێ و دواتر وەڵامی ئەو پرسیارانە دەرکەون...

زەینولڵای پیری بە ئەزموون گوتی نابێ بە هیچ شێوەیەك بیر لە کوشتنی مامۆستا زەکی بکرێتەوە. ئەو پێوەندیی لە گەڵ ئەنکەرەی هەیە. ئەوانەی لە کاتی شەڕ دا هاوسەنگەر بوون، قەت یەکتریان لە بیر ناچێتەوە، ڕاست وەك قەرەچی‌یان! بی‌کوژی دەسبەجێ تاوانبار دەکرێی، چونکە هەر ئێستا شکایەتێکی زۆر بە دژی تۆ تۆمار کراون و بێ‌گومان تووشی کێشەی دەبێ، شاکیر بەگ... زەینولڵاش دڵی لەو کوڕەی دەترسا، بەڵام وەك بۆخۆی دەی‌گوت: هەتا بۆمان ڕوون نەبێتەوە ئەو کوڕە کێیە، نابێ بیر لە کوشتنی مامۆستا زەکی بکەینەوە. بەردەوام دووپاتی دەکردەوە: کوشتنی وی تەنیا گێروگرفت و ژانەسەرمان بۆ زیاد دەکا! بەڵام ئاخر زەکی نەژاد هەر دێ و ڕژدتر دەبێ و زیاترمان کێشە بۆ دروەست دەکا...

لەو بەینەی دا شتێك ڕووی دا کە شاکیر بەگ قەت چاوەڕوانیی نەدەکرد: کۆمیسیۆنی کۆنترۆڵی چەڵتووکی هەرێم بڕیاری دا ئاوی هەموو ئەو زەوی‌یانەی چەڵتووکیان لێ کرابوو، هەڵبڕێ و پارێزگاریش ژێر بڕیارەکەی ئیمزا کردبوو. شاکیر بەگ لە ژیانی خۆی دا ئاوا تێ‌تەشکابوو و نەدۆڕابوو. لە تاوان هەر شێت بوو، غاری دا تێلگرافخانەی و کۆمەڵێك تێلگرافی شکایەت و ڕەخنەی نارد بۆ ئەدەنە و ئەنکەرەی، بەڵام ئەوە سوودێکی نەبوو. ژاندەرمان کە دەستووری‌یان درابۆیە ئاوەکەی ببڕن، کاری خۆیان کردبوو و لەسەر جۆگەکانیش خێوەتیان هەڵدابوو و بە تفەنگەوە کێشکیان دەکێشا. فەرماندەکەیان سەرجووخەیەکی سەرسپی بوو، کە بە شێوەی کاتی ئەو بەرپرسایەتی‌یەی پێ‌سپێردرابوو. شاکیر بەگ کە چاوی پێی‌کەوت زۆر خۆشحاڵ بوو: ئەو نەوعە کەسانە زوو چەور دەکرێن. جا بزانە چۆنی هەڵدەوەشێنمەوە و ئەو جار با مامۆستا زەکیش هەر بۆخۆی ئاسنی سارد بکوتێ! شاکیر بەگ سەرجووخەی بانگ کردە ماڵێ، پێنج مەڕی قەڵەو و شەڕابێکی زۆری دانێ. هەر ئەوێ شەوێ ژاندەرمەکان گۆلەکانیان بەردانەوە، ئاوەکەیان هەڵبەستەوە و مەزرا چەڵتووکەکان پڕ بوونەوە لە ئاو. بەگ تاریفی سەرجووخەی دەکرد: پیاوی وا کەم وەگیر دەکەوێ، مرۆڤی وەك

خۆی خۆشمەشرەف هەر نیە و پیاو حەز دەکا هەر لە گەڵی دانیشێ و قسەی لە گەڵ بکا. بە ڕاستی ئەو ژاندەرمانە هۆیان دایەوە و سوپاسیان دەکەم...

ڕۆژی دواتر زەکی نەژاد هەواڵەکەی بیست و حاکم، دوکتۆر و سەرهەنگی فەرماندەی ژاندەرمەی ئاگادار کردن. سەرهەنگ لە گەڵ یاوەری سوار بوون و دوای ئەوەی ڕووداوەکەیان بۆ حاکمی باس کرد چوونە شوێنەکەی. تەمەشایان کرد ژاندەرمە لە بن داران بۆی خەوتوون و ئەوەندە مەستن، هەر ئاگایان لە خۆیان نیە. ئەو بەینە پڕ بوو لە یەسکی مەڕی کوڕووساوەوە و شووشە شەڕابی بەتاڵ. کاتێك سەرهەنگ ئەوەی دی، لە حەیفان دینی لە کن نەما. سەرجووخە ــ کە بە زەحمەت دەی‌توانی بە پێوە ڕاوەستێ و چەستی بۆ لیّدا ــ ی بانگ کردە لای خۆی و بە سەری دا گوڕاند: ئەو یۆنیفۆڕمانە لە بەر خۆتان داکەنن و یاڵڵا بڕۆن، ئیدی نەتان‌بینمەوە! دەسبەجێ جلە سەربازی‌یەکانی لە بەر داماڵین و ڕووتوقووت بەڕەڵای کردن. ئەو ژاندەرمانە هەموویان دەرکران و هەر ئەوێ ئێوارێ دەستەیەك ژاندەرمەی دیکە شوێنی وانیان گرتەوە و دیارە ئاوەکەش بڕایەوە. شاکیر بەگیش دەسبەجێ خۆی گەیاندە سەرجووخە دەرکراوەکەی، بردی‌یە لای خۆی، کردی‌یە پیاوی خۆی، پوولێکی چاکی دایە و کردی‌یە سەرۆکی ئاودێرەکانیش. ئەو کابرایەش چووە لای فەرماندە تازەکەی و بە زەبری بەرتیلی سووك و هاسان ڕازیی کرد بە قسەی شاکیر بەگی بکا. بەو شێوەیە تەنیا چەند ڕۆژان ئاوەکە بڕا و دواتر دیسان بەردرایەوە و دەشتەکە هەمووی پڕ بۆوە لە ئاو...

ڕۆژی دواتر بەیانی زوو جووتێرەکان هاتنەوە لای مامۆستا زەکی و ئەویش ئیدارەکانی ئاگادار کردەوە. سەرهەنگی سەرۆکی ژاندەرمەی دیسان بە تووڕەیی‌یەوە خۆی هەڵدا سەر ئەسپی و بە پرتاو چووە شوێنەکەی. شانۆکە ڕاست وەك پێشوو بوو: ژاندەرمەی مەستی کەوتوو، یەسك و شووشە شەڕابی بەتاڵ لە هەموو شوێنێکی... جارێکی دیکەش سەرهەنگ هەموو هێزەکەی گۆڕی.

زەکی نەژاد باوەڕی وا بوو کە ئەو دەستە نوێیە باشتر و ڕێکوپێکتر دەبن، بەڵام وا نەبوو. زۆری پێ‌نەچوو دێهاتی‌یەکان هاتنەوە و پەنایان بۆ هێنایەوە و دیسانیش هێزەکەیان گۆڕی، بەڵام شاکیر بەگ بڕیاری دابوو بە هیچ شێوەیەك نەکشێتەوە و قسەی خۆی بەرێتە سەرێ: هەموو خەتای ئەو مامۆستا زەکی‌یەیە، ئای ئای، کوڕە خۆ بۆ خۆی هەموو ڕۆژێ لە بەیانی‌یەوە تا ئێوارێ بە سەر جۆگەکان دا دەگەڕێ و چاوەدێریی کاری ژاندەرمەکان دەکا!

مامۆستا زەکی بە سەرهەنگی دەگوت:

ــ لە شەڕی دوملوپیناری سەربازە ئازاکانی ئێمە سەرەنجام دوژمنیان تێكشکاند و ئێستاش هەر ئەو سەربازانەن کە شاکیر بەگ دەیەوێ بە هەر شێوەیەك بێ، لە مەیدانی‌یان وەدەرنێ!

سەرهەنگیش کە گومانی دەوەدا هەبوو، کە سەرکەوتنێکی زیاتریان لە پێش دابێ، دەیگوت:

ــ ئەوانەی لێرە لە گەڵمانن، سەربازەکانی بەرەی دوملوپیناری نین، هەر ژاندەرمەن. ئە دوو شتە زۆر لێك جیاوازن!

بەو شێوەیە شاکیر بەگ لە بەرامبەر سەرهەنگی دا ڕاوەستا و بەربەرەکانیی کرد، هەتا ڕۆژێکیان لە پڕ بڵاو بۆوە کە مامۆستا زەکی نەژاد کوژرا. سەرهەنگ بەو ڕووداوەی یەکجار زۆر تێکچوو و دەستووری دا کە دەبێ هەرچی زووتر قاتڵ بدۆزرێتەوە و سزا بدرێ. ئەو دەیزانی تاوانبارەکان کێن، بەڵام ئەوەشی دەزانی کە هەرگیز ناتوانێ بە ڕوونی قامکیان لە سەر دابنێ و تاوانەکەیان لە سەر جێبکاتەوە. سەرهەنگی نارەحەت و دڵبەسۆ لە حالێك دا بە پەلە بە سواری ئەسپەکەی لە شاری وەدەر دەکەوت، گوڕاندی:

ــ ئەو دەستە چەپەڵ و نیگریسە هەموویان بە لەعنەت بن، ئەو بێشەرەفە تاوانبارانە!

کاتێك حەمەد و موسلیم گەیشتنە قەراغ دەریایە، لای نیوەڕۆیە بوو. هەوا یەکجار گەرم بوو و هەردووکیان نارەقەیەکی زۆریان کردبوو. بۆ ئەوەی بگەنە سەر تەرمەکەی، ناچار بوون بە نێو حەشیمەتەکەی دا ڕێگا بکەنەوە. گوللەیەك لە سەر دڵی درابوو و لای چەپی دە خوێنێ دا شەڵاڵ بوو. هەردووك لاقی دە ئاوێ دا بوون و شەپۆلەکان تا سەر چۆکی دەهاتن. مامۆستا زەکی لە وێ کەوتبوو، چاوەکانی هەر وا ئاواڵە بوون و ددانەکانی لە ژێر تووکی سمێڵەکانییەوە کە هێندێکیان چووبوونە نێو زارییەوە دیار بوون و دەستی ڕاستیشی لە سەر برینەکەی دانابوو.

هەموو دۆست و هاوڕێکانی لە وێ بوون. هەموویان هەر کە هەواڵەکەیان زانیبوو، بە پەلە خۆیان گەیاندبووە ئەوێ. هەموو تووڕە بوون و هەمووشیان یەکدەنگ شاکیر بەگیان بە قاتڵ دەزانی و ناویان دێنا.

ناشتنی زەکی نەژادی بوو بە ڕێوڕەسمێکی بە شکۆ. شەقامەکان پڕ لە خەڵك بوون. تابووتەکە دە ئاڵایەکییەوە پێچرابوو و میداڵەکانی مامۆستای بە ئاڵاکەیەوە قایم کرابوون. شاکیربەگ کراسی ڕەشی دەبەر کردبوو و لە گەڵ سەرجووخە دەرکراوەکەی کە ئێستا پیاوی خۆی بوو، لە وێ بوو.

لە حەساری مزگەوتێ لە گەڵ حەمەدۆکی شانبەشان کەوتن و لە پەنا یەك ڕاوەستان، بەڵام هیچیان چاوی لە وی دیکە نەکرد. تاقە یەك جووتێریش دیار نەبوو. دەتگوت هەموو پەیکەرە قوڕینەکان بە ڕوخسارە زەردە لەرزوتالێدراوەکەیانەوە بوونە دووکەڵ و بە حەوای دا چوون...

هاوڕێیەکی زەکی نەژادی وتارێکی پڕ لە هەستی دا و لە قسەکانی دا باسی قارەمانەتی و ئازایەتیی ویی لە شەڕی دا کرد و پێی لە سەر ئەوە داگرت کە ئەو لە پێناوی خەبات بە دژی چەڵتووکچاندن و

بڵاوبوونەوەی نەخۆشیی مالاریا دا گیانی خۆی بەخشیوە. لە کۆتایی قسەکانیشی دا گوتی: ئەو هەرگیز وەدوای قازانجی تایبەتیی خۆی نەکەوت و هیچ شتێکی بە تەنێ بۆخۆی نەدەویست.

حەمەد لە حاڵێك دا لە بیرکرنەوە دا نوقم ببوو، لە گەڵ موسلیمی گۆڕستانەکەیان بەجیٚهێشت. دەتگوت خوێن دە دەمارانی دا بەستوویەتی. خەنجەرت لە سەر دڵی دابا، خوێنی لیٚنەدەهات. دەتگوت بە خەوەوە دەڕوا و نەیدەزانی لاقی لە کویٚ دادەنیٚ. کاتێك لە ماڵیٚ نێزیك بوونەوە، حەمەد لای دا و بە ڕێگایەکی دیکە دا ڕۆیی، بیٚئەوەی بزانیٚ دەچتە کویٚ. لەو جۆرە بارودۆخانە دا حەمەد نە هیچی دەدی و نە هیچیشی دەبیست...

لە نێوەڕاستی ئەو خڕەی کە ئێستا ئاوی پیٚدا نەدەهات و لە سەر ڕێگای دەریایە بوو، ڕاوەستا و نێوچاوانی تێكنا. دەتگوت هەوڵ دەدا شتێکی وەبیر بێتەوە. لە نەکاو ڕوخساری گۆڕا و زیاتر بۆ لای دەریایە چوو. ڕوخساری بەردەوام دە ئاڵوگۆڕ دابوو، سپی هەڵدەگەڕا، سوور هەڵدەگەڕا، جارجار گرژ دەبوو و دوای تاوێکی وەك منداڵێکی کە دە خەویٚ دابیٚ، هێدی دەبۆوە...

چووە نێو پۆلە پنگەکەی، ڕاوەستا و دیسان بیری کردەوە، دەمێك نێوچاوانی تێکدەنا و دەمێك وەك ئەوەی بڕیارێك بدا، توند دەبوو و لە جێی خۆی جووڵەی نەدەکرد. موسلیم لە سەر تەپۆڵکەکەی نێزیك ویٚ چاوەڕوانی بوو.

ئێوارە داهات، ڕۆژ بەرەو ئاوا بوون چوو و هەوری سپی لە ئاسمانیٚ پەیدا بوون. شەماڵ هەڵیکردیٚ، دەریا تووڕە بوو و شەپۆلەکان توندتر بوون، کەفێکی سپییان دەکرد و کەفەکە بە سەر بەردەکانی قەراغ دەریایە دا دەڕژا. ئەو جار ڕۆژ بە تەواوی ئاوا بوو و تاریك داهات. دەریا گرماندی و ئاوەکە ڕووناکایی بە سەرەوە نەما، بەڵام حەمەد هێشتا جووڵەی نەدەکرد. کاتێك هەواکە بە تەواوی تاریك بوو، موسلیم لێی چووە پێشیٚ، بەڵام نەیدەزانیٚ چیی پیٚبڵیٚ. یەك دوو خولی بە دەور دا سووڕا، چڵە پنگێکی هەڵپساند و چەند جار بە بەر لووتی دا هێنای و بردی، بەڵام بیٚسوود بوو و هاوڕێکەی هەر جووڵەی نەبوو.

موسلیم گوتی:

ـ ئەوە پنگە، بۆنیی پێوە کە!

حەمەد بۆنەکەی هەڵمیسی و ئەو جار موسلیم لە تاریکاییە دا دیتی کە بزەیەکی هاتیٚ.

موسلیم باسکی حەمەدی گرت:

ـ با بڕۆینەوە، ئێستا دایە حۆری و سەیران نیگەرانن و دەڵێن بۆ دەبیٚ دوای ڕێوڕەسمی ناشتنەکەی نەگەڕابنەوە؟

ـ ڕاست دەکەی، ئەوان دەبیٚ نیگەران بووبن. با بڕۆین...

بەرەو ماڵ بوونەوە. موسلیم زۆری پێ‌خۆش بوو بیدوێنێ، بەڵام نەی‌دەوێرا. سەرەنجام خۆی پێ‌ڕانەگیرا و بە دەنگێکی بەرز، وەك هاواری منداڵێك كە لە تاریكی دەترسی، گوتی:

ـ كاحەمەد، كا حەمەد، تكایە گوێم لیٚ‌ڕاگرە!

حەمەد وەڵامی دایەوە:

ـ گوێم لێیە موسلیم، پێم بڵێ بزانم دەڵێی چی!

ـ ئەمن شاكیر بەگی دەكوژم! دەی‌كوژم و هەڵدێم، دەچمەوە گەڵ دەستەی حەمەدۆكی. ڕاستی‌یەكەی ئەمن هەر زگماك چەتەم، ناتوانم چی‌دی لەو شارەی، لەو نێو باغە پڕتەقاڵانە بژیم، تكات لیٚ‌دەكەم لێم گەڕێ با ئەو كارەی بكەم...

حەمەد وەڵامی نەدایەوە و لە جیاتی‌یان باوی هەنگاوی توندتر كرد.

موەسلیم قیژاندی:

ـ دەزانم شاكیر كوشتویە. شاكیر مامۆستا زەكی كوشتوە، وا نیە؟ دیارە وایە و دەزانم ئەتۆ بڕیارت داوە بۆخۆت بی‌كوژی، بەڵام نابێ ئەتۆ وا بكەی، ئەتۆ نابێ چیدی حەمەدۆك بی. دوێنێ گوێم لە سەیرانێ بوو بە دایە حۆریی دەگوت زگی پڕە. بۆ دەبێ ئەتۆ شاكیر بەگی بكوژی؟ پێویست نیە ئەتۆ بی‌كەی، ئەدی ئەوە نیە ئەمن لێرەم. مامۆستا زەكی ئەوەندەی دۆستی تۆ بوو، نی منیش بوو. فێری خوێندنەوە و نووسینی كردم. ئێستا دەتوانم لە سەر كاغەزێكی بنووسم "موسلیم". لێم‌گەڕێ با ئەو كاتەی بەگ لە ژێر دارە گەورەكەی مەیدانی شاری قەننەی دەكێشێ، بی‌كوژم... قەرار بێ هەر هەوەڵ گوللەی ڕاست لە سەر دڵی دەم. پاشانیش لێی سواری ئەسپە عەرەبی‌یەكەم دەبم و ئیدی كەس تۆزم ناشكێنێ!

موسلیم هەر قسەی دەكرد و هەوڵی دەدا حەمەدی ڕازی بكا ڕێگای ئەو كارەی پێ‌بدا، بەڵام حەمەد ڕانەدەوەستا، هەر ددانی دەچیڕەوە دەبرد و دەڕۆیی. موسلیم بە دوای دا ڕای كرد، بە هەردووك دەستان ئێخەی گرت و گوڕاندی:

ـ وەڵامم بدەوە! ئیجازەم دەدەی بی‌كوژم، یان نا؟

حەمەد دەستی موسلیمی لە بەرۆكی خۆی پچڕیەوە و درێژەی بە ڕۆیشتنەكەی دا، لە پێشووش خێراتر. هەنگاوەكانیشی پتەوتر هەڵدێنایەوە.

## (١٣)

پاییز گەڵای هەموو دارانی سوور هەڵگێڕابوو و ڕووناکایی‌یەکی زێڕین لە پاییزەخۆری نەرم و نیان کەوتبوە سەر لێڕەواری گەورە و پانوبەرین، کە چاو نەی‌دەتوانی سنووری بۆ دابنێ. گیای وشك و لالە کێویلکەی سوور و بنەوش لە قەڵشی عەرزی و لە نێو بەردێکی هاتبوونە دەر و دەتگوت بە هێزی خۆیان بەردەکەیان قەڵشاندوە. مەلا فەرهاد و هاوڕێکانی هۆڵە مەڕێکیان لە نێو قووڵایی دارستانەکەی دا خاوێن کردبۆوە، کردبوویانە بنکە و لێرە مابوونەوە. بەردەوام هەموو جۆرە هەواڵێکیشیان پێ‌دەگەیشت. هەرچەشنە ڕووداوێك لە تووڕووس، چوکووراوا و تەنانەت لە ئەنکەرەش هاتبایە پێش، ئەوان لێی ئاگادار دەبوون. زیندووبوونەوە و فڕینی ئەسپە کوێتی زۆر شتی بۆ وان هاسان کردبوو. هەموو خەڵکی شاخی، چ ژن و چ پیاو، پیر و لاو، کاریان بۆ دەکردن و بەو شێوەیە ئەوان زۆر خێرا بە هەواڵ و ڕووداوەکانی ئەو دەوروبەرەیان دەزانی. هەر ژاندەرمە لە شاری وەدەرکەوتبان، ئەوان ئاگادار دەبوون. دەتگوت باڵندە هەواڵەکانیان بۆ دێنن.

دیارە ئەوان بە نەهێنی لە وێ مابوونەوە و مەلا فەرهاد جێگاکەی ئاشکرا نەکردبوو. هەمیشە نیگابانیان هەبوون و هەر پەیامێکیش دەهات، پێشتر بە سەر سێ کێشکان دا تێ‌دەپەڕی، جا دەگەیشتە لایان. ڕەوەزە بەردی بنەوشیی گەورە گەورە پشت و ڕاست و چەپی هۆڵەکەیان گرتبوو و لای خوارەوەشی خڕێك بوو بە قەد چۆمێکی ئاو پێ‌دا دەڕۆیی. داستانی ئەسپەکەی و ئەوە کە لە پێش دا هەر کەلاکێك بووە، کە بە پاڵەپەستۆ لێیان خوڕیوە، بەڵام دوای گوللەبارانکردنی زیندوو بۆتەوە، بۆتە حودوودێك، چلسوارەی غەیبی لە گەڵ خۆیان بردوە، فڕیوە و ئێستاش بە سەر شار و دێیان دا دەفڕێ و دەحیلێنێ، بیری مەلا فەرهادی بە

خۆیەوە خەریك کردبوو. باشە ئەو داستانە بە کوێ دەگا؟ سەرەنجام خۆی و حەمەدۆك چی‌یان بە سەر دێ؟ جاروبار هەواڵی حەمەدی پێدەگەیشت. بە قسەی خەڵکی ئەو وازی لە چەتەگەری‌یە هێنابوو، شاخی بە جێهێشتبوو و بۆخۆی لە گوندێکی دانیشتبوو. هیچ‌کەس ئامادە نەبوو بڵێ ئەو گوندە ناوی چی‌یە. تەنانەت بە مەلا فەرهادیشیان نەدەگوت! یان هەر بە ڕاستی ئەوانیش نەیان دەزانی حەمەد لە کوێ دەژی. مەلا فەرهاد لە دڵی خۆی دا پێکەنینی دەهات. ئەو بۆخۆی حەمەدی بەرێکردبوو و ناردبوویە لای دۆستێکی، کە بڕوای تەواوی پێی‌هەبوو. ئەو دۆستە دەی‌زانی چۆن هەڵسوکەوت لە گەڵ خەڵکی جۆراوجۆر بکا و دەی‌توانی شتی شاراوە لە دەروونی وان دا ببینێ. هەروەها دەی‌زانی ئینسانی وەك حەمەدی ناتوانێ بە یەکجاری مل بۆ ئەو چەشنە ژیانە ڕاکێشێ و پێبەندی ئەو بارۆدۆخە تازەیەبێ و بێگومان ڕۆژێکی هەوای شاخی لە کەللەی دەداتەوە و یاغی دەبێتەوە. مەلا فەرهادیش گومانی لەوەی دا نەبوو. تەنیا کاتێك بیری لە بایرامۆغلیی دەکردەوە، هێندێك دوودڵ دەبوو. باشە ئەو کابرایە چۆن دەی‌توانی ئەو هەموو ساڵانە ئەو ژیانەی قبووڵ بکا، بە جلی شڕی ڕیشاڵ ڕیشاڵەوە، وەدوای دووگای لاواز بکەوێ و دێمەکارێکی وشکارۆی قاقڕ بکێڵێ و بەو حاڵەشەوە نانی شەوێی نەبێ؟ ڕەنگە ئێستا بەو ژیانەی ڕاهاتبێ، هەرچەند لە وانەشە لە هەموو کەس و هەموو شتێك بێزار بێ. دوور نیە حەمەدیش ئێستا وای بە سەر هاتبێ و گۆڕابێ. بەڵام وەڵڵاهی زەحمەتە. ئەو دوو پیاوانە هیچیان ناتوانن بە یەکجاری لەو هەموو شتانە ببڕێن و ئیدی بیریان لێنەکەنەوە. ئەوانە گڕێکیان دە سینگی دایە، قەت ناکوژێتەوە، کز دەبێ، بەڵام هەرگیز بە تەواوی خامۆش نابێ و هەر بینا دیسان بە تینی هاوڕێیەتی و ئەوین، بڵێسەی کێشا و بەرز بۆوە. بایرامۆغلی و حەمەد هەوڵیان دەدا ئەو ئاگرەی لە دڵی خۆیان دا خامۆش بکەن، بەڵام تەنیا کاتێك دەیانتوانی دەو کارەی دا سەرکەون، کە سینگی خۆیان بقەڵەشنەوە و دڵیان فڕێدەنەدەری...

نیگابانی کێشکی لای ڕۆژاوایە هاتە لای مەلا فەرهادی و گوتی:

ـ مامۆستا، حەوت پیاو ئەوە دێن بۆ لای ئێرە، لێیان گەڕیم، یان پێشیان پێبگرم؟

ـ لێیان گەڕێ بابێن، ڕەنگە ئەوانیش بیانەوێ ببنە چەتە، وایە؟

ـ بەڵێ... مامۆستا سەیرە، هەموویان باڵایان بە قەد یەکە، هەموویان مووزەرد و چاو شینن! هەموشیان تفەنگ و فیشەکدانی چاکیان پێن، کەوشی چاکیان دە پێ دان و سەربەرگی ماڕاشیی قەراغ زەردی نەخشینیشیان دە بەر دان. هەموویان وەك یەك دەچن، هەر بۆت لێکنەناکرێنەوە.

مەلا فەرهاد قاقایەکی کێشا و گوتی:

ـ ئەلبەت هەمووشیان ناویان حەمەدۆکە، وایە؟

ـ بەلێ، وایە! زۆر سەیرە مامۆستا، ئێستا ئیدی خەلکی ئەو شاخانە هەموویان ناویان حەمەدۆکە!

مەلا فەرهاد دیسان پێ‌کەنی و گوتی:

ـ بیستوومە، ئەمنیش پێم سەیرە!

مەلا فەرهاد بە لای سەرەوە دا کە شاخ بوو، چوو بۆ لایان و کاتێك گەیشتە ڕاست بە ڕاستی وان کە لە خوارەوەی شاخەکەی ڕاوەستابوون و چاوەڕوانی وی بوون، خۆی لە نێو داران وەدەرخست و چووە خوارێ، هەتا لە بن ڕەوەزێکی لە پەنایان وەدەرنەکەوت نەیانزانی:

ـ ڕۆلەکانم بەخێربێن!

هەموویان لە بەری هەستان، وەلامی سلاوەکەیان دایەوە و لە حالێك دا دەستیان لە سەر سینگیان دانابوو، بە ڕیز لە پێشی ڕاوەستان.

مەلا فەرهاد گوتی:

ـ کوڕینە، ئەمن لێتان ناپرسم بۆچی هاتوون و چۆن بووە بڕیارتان داوە ڕەگەل ئێمە کەون، چونکە وەلامەکەی دەزانم. بڕواشم وایە هەموو هەژارەکانی ولاتی ئێمە، هەموو ئەو کەسانەی باب، برا، یان مامیان چۆتە شەڕێ و ئیدی نەگەڕاوەتەوە و هەموو ئەو کەسانەی ستەمیان لێ‌دەکرێ، ڕەنج دەکێشن و پشت و پەنایەکیان نیە، دەبوو بێن و ببنە چەتە. دیارە هەموو کەس نابێتە چەتە و هەمووش وە شاخی ناکەون، بەلام دەزانم ئێوە ئاگرێکتان لە دلی دایە، کە ئێوەی گەرم داهێناوە و هێناونی‌یە ئێرە! زۆر باشە! بەلام با هەر ئێستا شتێکتان پێ‌بلێم و زۆر بە وردیش بیری لێ‌بکەنەوە: ئێمە حەمەدۆکمان لە گەل نەماوە، یانی بزانن حەمەدۆك نەك هەر لە گەل دەستەی ئێمە، کە دەستەی وین، نەماوە، بەلکوو لە شاخیش نەماوە.

لاوێکیان وەجواب هات و گوتی:

ـ قەیدێ ناکا مەلا فەرهاد، ئێمە لە ڕێیە کە دەهاتینە ئێرە تووشی بووین و قسەشمان لە گەل کرد. حەمەد ئێستا لە هەموو شوێنێکی‌یە!

ڕوخساری مەلا فەرهادی لە خۆشی‌یان گەشایەوە:

ـ زۆرم پێ‌خۆش بوو، کە وا بوو ئێوە بۆخۆتان دیتووتانە و قسەتان لە گەل کردوە؟

ـ بەلێ ئێمە چاومان پێی کەوتوە...

مەلا فەرهاد لە نەکاو لە یەکێکیانی پرسی:

ـ ئەتۆ ناوت چی‌یە؟

ـ حەمەد...

مەلا فەرهاد قاقایەکی کێشا و پاشان نێوچاوانی تێکنا و بە شێوەیەکی وشك و توند گوتی:

ـ ئێستا زۆر بە باشیم گوێ لێ بگرن، حەمەدەکان! تەنانەت یەك وشەش لە وەی دەیڵێم، لەبیر مەکەن: پێش هەموو شتێك دەبێ بزانن حەمەدبوون هەر وا هاسان نیە!

ـ دەزانین، مەلا فەرهاد.

ـ ئەوە کارێکی سەختە، حەمەد هەمیشە لە گەڵ مەرگ بەربەرەکانی دەکا و گیانی هەمیشە دە مەترسی دایە.

ـ دەزانین...

ـ کە وا بوو دەبێ هەر ئێستا سوێندێ بە خودای و بە قورئانێ بخۆن کە بە دەستووری من بجووڵێنەوە و لە قسەی من دەرنەچن.

ـ سوێندێ دەخۆین...

ـ ڕاوەستن، ئاوا بە پەلە نابێ. ڕاوەستن بە تەواوی بزانن ئەمن دەڵێم چی، پاشان سوێندێ بخۆن. هێندێك مەرج هەن کە دەبێ قبووڵیان کەن. لەوانەیە دوای ئەوەی زانیتان ئەو مەرجانە چن، بۆتان نەکرێ و هەر لێرە ڕا بگەڕێنەوە!

ـ سوێندێ دەخۆین کە هەموو مەرجەکان قبووڵ بکەین، مەلافەرهاد ئێمە بە ئاگاداریی تەواوەوە هاتووین و دەزانین بارودۆخمان چۆن دەبێ و دەبێ چ بکەین.

ـ گوێتان لێبێ، ئێوە هەرگیز نابێ ستەم و زۆر لە هەژاران بکەن! دەبێ هەمیشە بە ڕێز و میهرەبانی‌یەوە لە گەڵیان بدوێن و هەرکەس پێویستیی بە یارمەتی هەبێ، یارمەتیی بکەن.

ـ ئێمە سوێندێ بە خودا و بە کەلامی خودای دەخۆین کە ئەو شتانە هەموو وەبەر چاو بگرین.

ـ کاتێك ئێوە دەوڵەمەندان ڕووت دەکەن، نابێ یەك دیناریشی بۆخۆتان هەڵگرن، دەبێ هەمووی بە سەر هەژاران دا دابەش کەن و ئەو کەسانەش وەپێش خەن کە لە هەمووان داماوترن.

ـ بە ناوی خودای سوێندێ دەخۆین وا بکەین...

ـ نابێ قەت گومانتان لەو شتانە داهەبێ کە سەبارەت بە هێز و گەورەیی کوێرۆغلی، حەزرەتی عەلی و ئەسکەندەری جووتشاخی گەورە گوتراون. هێز و شانازیی وان هێز و شانازیی ئێمەیە. هەر چەتەیەکی گەورەیی و شانازیی قارەمانانی ڕابردوو بە هێند نەگرێ و سووکایەتیی پێبکا، دەبێ دەسبەجێ هەر هاوڕێکانی خۆی گوللەبارانی کەن. بە پێی یاسای خوا و هەر چوار کتێبی پیرۆزی ئەو کەسەی بێڕێزی بە کەرامەت، شەرەف و نامووسی هاونەوعی خۆی، واتە ئینسانەکانی دیکە بکا، دەبێ بکوژرێ.

ـ بەڵێ، دەبێ بکوژرێ مەلا فەرهاد.

ـ ئێوە مافی ئەوەتان نیە تەنانەت فلووسێکیش لە خەڵکی داوا بکەن، پاروەوە نانێکیان بە زۆری لێ‌بستێنن. بۆ وێنە ئەگەر داوای مەڕێکتان لە شوانێکی کرد، دەبێ لە پێش دا نرخی مەڕەکەی بە زیادیشەوە بۆ حیساب کەن و بی‌دەنێ. تەنانەت ئەگەر شوانەکە بۆخۆشی نەیەوێ پارەتان لێ‌وەرگرێ، نابێ قبووڵی بکەن و دەبێ پووڵی هەر بدەنێ!

ـ دەستوورت لە سەر چاوان مەلا فەرهاد.

ـ با شتێکی گرینگی دیکەشتان پێ‌بڵێم، ئەوەش باش وەرگرن! خەڵکی شاخی حەمەدۆکی دەپەرستن و بە ئینسانێکی پیرۆزی وەك حەزرەتی خدر و حەزرەتی عەلیی دەزانن. ئێستا ئەسپەکەی وی بە ئاسمانێوە و دەفڕێ، لەو شار بۆ ئەم شار و بەردەوامیش دەحیلێنێ.

ـ دەزانین مەلا فەرهاد، ئەسپەکە دەحیلێنێ و دەفڕێ!

ـ ئێستا هەمووتان دەزانن کە کاتێك دێنە نێو دەستەی ئێمە ئەرك و بەرپرسایەتی‌یەکی زۆرتان دێتە سەر شانی؟

ـ بەڵی و هەر بۆیەش هاتووینە لای ئێوە.

ـ شاخەکان ماڵی ئێمە و جێگای متمانەی ئێمەن، بەڵام ئەوە شتێکی ئاشکرایە کە هاوکات ئەوەندەی دۆستمان هەن، هەر بەو ڕادەیە دوژمنیشمان هەن. ئێمە یەکەم حەمەدۆکی ئەو شاخانە نین. لەوەتا دنیا هەیە ئەو شاخانە حەمەدۆکیان لێ‌نەبڕاون. هەمیشە حەمەدۆکەکان بەهێز کراون و یارمەتی‌یان کراوە، چونکە هێشتا ستەم، خراپە، هەژاری و بێ‌عەداڵەتی بە سەر دنیایە دا زاڵە و ئینسانەکان خوێنی یەکتر دەمژن. ئێمە دەبێ هەتا هەتایە بە دژی ستەم و چەوساندنەوە بوەستین، یان لەوانەشە ڕۆژێکی... نازانم بڵێم چی...

لێرە دا چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك و دەنگی لەرزی:

ـ لەوانەیە ڕۆژێکیش بتوانین بە سەر هەموو چەوسێنەر و ستەمکاران دا زاڵ بین و دەسەڵاتیان لە دەست دەربێنین... ئەو ڕۆژە ئیدی نە هەژاری دەمێنێ، نە نەخۆشی، نە چەوساوە و نە چەوسێنەریش...

نەی‌توانی چی‌دیکە بەو شێوەیە قسە بکا، بۆ ئەوەی لاوەکان دەموچاوی خەمناك و فرمێسکەکانی نەبینن، سەری داخست و چاوەکانی دە عەرزی بڕین. تاوێکی چاك سەری هەڵنەهێنا و پاشان کاتێك سەریێ بەرز کردەوە، ڕاست دە ڕوخساری کوڕەکانەوە ڕاما و گوتی:

ــ ئەو ڕۆژە دەبێ وەدی بێ، ئینسانەکان هەمیشە بۆ وەدیهاتنی ئەو ڕۆژەی خەباتیان کردوە و مافی خۆشیانە بەرهەمی خەبات و ئامانجە لەمێژینەکانی خۆیان وەدەست بێنن و ببینن کە گورگ و مەڕ لە ئاشتی و ئاسایش دا بە یەکەوە ئاوێ دەخۆنەوە...

ئەو جار دەنگەکەی هێندێك خەماوی بوو:

ــ دوور نیە ئێمە بۆخۆمان هەرگیز ئەو ڕۆژەی نەبینین. لەوانەیە لەو شاخەی بکوژرێین، تەنانەت گۆڕێکیشمان بە نسیب نەبێ و قەل و داڵ تەرمەکەمان بخۆن...

لێرە دا لە پڕێك سینگی هێنا پێشێ، سەری بەرز کردوە و ملی هەڵێنا. گنجی دە بالاّی دا نەمابوو و پتەو و قورس وەك ڕەوەزەکەی بەرامبەریان دەهاتە بەرچاو:

ــ بەڵام هەر چۆنێك بێ، تا ئەو کاتەی نەختە هێزێکمان دە بەر دا ماوە، خەبات دەکەین و زەبر لە چەوسێنەران دەوەشێنین...

ــ بەڵێ، مەلا فەرهاد زەبریان لێدەدەین...

مەلا فەرهاد ئارام بۆوە، بزەیەکی هاتێ، تفەنگەکەی هەڵگرت و لە سەر بەردێکی دانیشت. ئەو جار بە درێژی بۆی ڕوونکردنەوە کە چۆن دەبێ هەڵسوکەوت لە گەڵ دێهاتی‌یەکان بکەن و هەروەها ئامۆژگاریی کردن کە دەبێ زۆر وشیار بن، چاو و گوێیان بکەنەوە و دەرفەت بە مەترسی نەدەن کتوپڕ بەرۆکیان بگرێ. بۆیگێڕانەوە کە بۆچی چۆتە سەر سوڵتانۆغڵی‌یە زەردی و ڕاست پووڵی لە وی ئەستاندوە. باسی سروشتی هەموو ئاغا و بەگانی بە گشتی بۆ کردن و بە تایبەت خوو ڕەوشتی بەگ و ئاغاکانی دەشتی چوکووراوایە، وەك عەبدی خان و عەلی‌سەفابەگی پێناساندن. سێ لەو کوڕانە دەیانزانی. پاشان لێی پرسین:

ــ زۆر دەستەی حەمەدۆکی هەن. ئێوە تا ئێستا چەند دەستەتان دیون؟

ــ سێ دەستەمان پێشك دێن.

ــ هەرسێك دەستان بە چاکی دەناسن؟

ــ دیتوومانن قسەمان لە گەڵ کردوون.

ــ زۆر باشە، پێوەندیی خۆتان لە گەڵ وان ڕاگرن و بەردەوام لە گەڵ ئێمەش دە پێوەندی دا بن... ئەدی پێم بڵێن بزانم ئەو دەستانەش دەناسن کە دوژمنی ئێمەن و دەیانەوێ ئێمە سەرمان بە لەشی‌یەوە نەمێنێ؟

لاوەکان دەسبەجێ ناوی ئەو چەتانەیان هێنان کە دژی دەستەی حەمەدۆکی بوون.

مەلا فەرهاد گوتی:

ـ زۆر باشە، کە وا بوو وشیار بن و هەورەها لە بیرتان نەچێ کە سوڵتانۆغڵیـیە زەردە و پیاوەکانی ویشمان دوژمنن... هەروەك دوژمنی هەموو هەژار و لێقەوماوانیشن.

ئەو جار مەلا فەرهاد هەستا. کوڕەکانیش هەستان و بە ڕێکوپێکی لە بەرامبەری ڕاوەستان.

ـ ئێستا دەتوانن بڕۆن. داوای سەرکەوتنتان بۆ دەکەم! ئەمن سڵاوی ئێوە بە حەمەدۆکی دەگەیەنم. خەونم پێوە دیوە و دەزانم هەر بەو زووانە چاوم پێیـدەکەوێتەوە.

کوڕەکان یەکە یەکە دەستی مەلا فەرهادیـیان ماچ کرد و پاشان ڕۆیشتن.

ڕۆژی دواتر دیسان نیگابانەکان ئاگاداریان کردەوە کە ڕاست وەك ڕۆژی پێشوو، کۆمەڵێك حەمەدۆکی نوێ هاتوون و دەیانەوێ بیبینن. مەلا فەرهادیش چووە لایان و لە خوارەوەی ڕەوەزەکان چاوی پێیان کەوت. حەوت کەس بوون، کەوا و پانتۆڵی زەرد و جلیقەی شینکیـیان دەبەر دا بوون. جلیقەکانیان بە دابی ئالیپۆی چل دوگمەیان لێدروابوون، دووربینی تازەیان دە ملی دابوون، سەرکڵاوەی بە گوڵێنگی بۆریان لە سەر بوون، باڵتۆی ڤادماڵیان دەبەردابوون کە قەراغی یەخەیان بە دەزووی زەرد داگیرابۆوە و قەراغی ڕەخت و فیشەکدانەکانیشیان هەر وا بوو. خەنجەرەکانیان، دەمانچەکانیان و پشتێنەکانیشیان کە لە ئاوریشمی تریپۆلی بوون، هەموویان وەك یەك بوون. بۆخۆشیان هەموو وەك یەك دەچوون و دەتگوت وەك یەك لە قالب دراون. بەقەد یەك درێژ بوون، پانایی شانانیان هەر یەك بوو، سمێڵیان وەك یەك دانابوون، چاویان یەکڕەنگ بوون و هەمووشیان پاتەیان دە پێ دا بوون. ئازایەتی، هێز و ورەیان لە چاوان دەباری و دیار بوو هیچیان لە مردنێ ناترسن. مەلا فەرهاد قسەکانی پێشووی بۆ ئەوانیش دووپات کردەوە و ئەوانیش وەك دەستەی پێشوو و تەنانەت چاتریش گوێیان بۆ ڕاگرت و بەڵێنیان پێدا لە سەر ئەو ڕێوشوێنە بڕۆن کە ئەو نیشانی دابوون. مەلا فەرهاد لە خۆشیـیان فرمیسکی دە چاون گەڕابوو.

یەکێك لە کوڕەکان لە لایەن ئەوانی دیکەشەوە وەقسە هات و گوتی:

ـ بە ڕاستی ئێمە تا ئێستا نەماندەزانی ئەو کارە هێندە گرینگە. بەڵێ دوژمن تا ئێستا زاڵ بووە و ئێستاش هەر زاڵە، بەڵام هەرچۆنێك بێ، ڕۆژێك هەر تێك دەشکێ، چونکوو ئێمە زۆرین، ئەوەندە زۆر کە دە ئەژمار نایەین، وەك باڵندەی ئاسمانێ و وەك مێرووی سەر عەرزێ... ئەو چیا بەرزانە، ئەو ڕەوەزە گەورانە و ئەو ڕژد و هەڵدێرە ئاستەمانەش هەر لە گەڵ ئێمەن. ئێمە دەبێ سەرکەوین و ئەو کاتە ئیدی هەتا هەتایە ستەم و زەبروزەنگ کۆتایی پێدێ!

مەلا فەرهاد پێی لە سەر قسەی لاوەکە داگرتەوە گوتی:

ـ ستەم و نابەرابەری نابێ بمێنێ! بەڵێ نابێ ئەو شتانە بمێنن!

دوای وان زۆر دەستەی دیکەش هاتن. هەموو دەستەکان حەوت حەوت دەهاتن. هەموویان وەك یەك دەچوون. پێڵاویان، جلیان، ڕەختیان و دووربینی هەر دەستەیەی هەمووی یەك ڕەنگ و یەك جۆر بوون. مەلا فەرهاد هەموو جارێ ئەو ئەرك و ڕێوشوێنانەی بۆ باس دەکردن و ئەوانیش گوێیان دەدایە، قبووڵیان دەکردن و بەڵێنیان دەدا لێیان لانەدەن. بۆ وێنە مەلا فەرهاد دەیگوت:

ـ ڕۆڵەکانم، زوو، کاتێك ئاغاکان، بەگەکان یان پاشاکان لە سوڵتانی هەڵدەچەرخینەوە و یاغی دەبوون، دواتر کە سوڵتان بە سەریان دا زاڵ دەبۆوە، نەی دەهێشت حوکمی کوشتنیان بدرێ، بەڵکوو جێگا و پلەی گەورەی دەدانێ و دەیکردنە وەزیر، وەکیل، پارێزگار و شتی لەو بابەتە. لە نێو چەتانیش ئی وا هەڵکەوتوون کە ناوی "مەهدی"یان لە خۆ ناوە و مەبەستیشیان ئەوە بووە کە دنیایە بە تەواوی بگۆڕن و زۆڵم و ستەم نەهێڵن. بەڵام ئەوانە کاتێك شکاون و گیراون، سوڵتان خۆی تێنەگەیاندوون و بەزەییشی پێیان دا نەهاتوە، بۆ؟ چونکوو ئەو چەتانە بۆخۆیان هەژار بوون و دۆستی هەژارانیش بوون. هەر بۆیە کاتێك ئەوانە بە دیل گیراون، هێناویانن پاشوپێش سواری کەرێیان کردوون، بە نێو شاری دا گێڕاویانن، هەموو خەڵکیان هێناوەتە سەیرێیان. پاشان چاویان دەرهێناون یان بە زیندوویی کەوڵیان کردوون و چوار پێنج ڕۆژان هەتا کابرا هیلاك بووە، ڕایانگرتوون و ئەو جار کوشتوویانن... ئەو پیاوانەش ئازا بوونە، خۆیان ڕاگرتوە، بەچۆك دا نەهاتوون و هاواریان نەکردوە و ئاخر قسەشیان ئەوە بووە: "یاخوا دەور و دەسەڵاتت وەدیبێ بابە سوڵتان، مەهدیی گەورە"!... جا ئێوەش دەبێ ئەوەتان لە بیر بێ، ئێستا کە هاتوون و لە گەڵ ئێمە کەوتوون، مانای ئەوەیە کە ئەگەر ڕۆژێك بە سەرمان دا زاڵ بن و بە دیلمان بگرن، وەك ئەوانەی بۆم باس کردن، پاشوپێش سواری کەرێمان دەکەن و ئەوەمان بە سەر دێنن کە بیستتان، کە وا بوو...

ـ ئەوەی دەزانین...

ـ جا ئەگەر وایە ئەوەش بزانن کە حەمەدۆکمان لە گەڵ نەماوە... بەجێیهێشتووین، لێمان تووڕەیە، نازانین لەبەر چی... بەڵام ئەوەی دەزانین ئاخرەکەی دێتەوە لامان...

ـ مامۆستا حەمەدۆك لە شاخییە...

ـ مامۆستا ئیمە کاتێك دەهاتینە ئێرە، لە سەر ڕێگایە چاومان پێیکەوت، لە سەر بەردێکی دانیشتبوو و تفەنگەکەی خاوێن دەکردەوە!

ـ بەڵێ مامۆستا... حەمەدۆك هەر لەو دەوروبەرانەیە... لە گەڵ دەستەیەکی گەورە لەو شاخانەی ئەوبەری دیتوویانە...

ـ ڕۆژی خۆی ئێمەش خۆڕاگر دەبین و دەڵێین : "یاخوا دەور و دەسەڵاتت وەدی بێ، بابە سوڵتان، مەهدیی گەورە".

نیوە شەو بوو، پیاوێك لە چەکدارەکان هات و مەلا فەرهادی وەخەبەر هێنا:

ـ پیاوەکانی سوڵتانۆغڵی لە گەڵ ژاندەرمان لەوخوارەوانە لە دۆڵێکی دەوری دەستەیەك لە حەمەدەکانیان داوە، جا نازانین ئەوانیش چی‌یان بە سەر هاتوە. بێ‌گومان پێویستیان بە یارمەتی‌یە!

مەلا فەرهاد لە جێیە دەرپەڕی و بە پەلە خۆی کۆ کردەوە. پیاوەکانی دیکەش هەموو ئامادە بوون و وەڕێ‌کەوتن. باران وەك گۆزەی سەرەوژێر دەباری. کاتێك گەیشتنە نێزیك دۆڵەکەی، هەموویان دە ئاوێ دا خووسابوون.

پێش ئەوەی وڵات ڕووناك بێ، گەیشتنە شوێنی تێكهەڵچوونەکەی. وڵات بێ‌دەنگ بوو. مەلا فەرهاد هاوڕێکانی لە دەوروبەری دۆڵەکەی لە پشت ڕەوەز، بەرد و دەوەنان دامەزراند. لە گەڵ ڕووناکبوونێ تەقە لە خوارەوە ڕا دەستی پێ‌کرد.

مەلا فەرهاد بە هاوڕێیانی خۆی گوت:

ـ دەست لە پیاوەکانی سوڵتانۆغڵی مەپارێزن، بە قەستی کوشتنێ پێیانەوە نێن و هەموویان بکوژن. دیارە ئەوان بەرگی ئاسایی‌یان دەبەر دایە و دیارن. کە وا بوو هەرچی بەرگی سەربازیی دەبەر دا نەبوو، لە وانە و بی‌کوژن. بە یارمەتیی خودای، نابێ بێڵن یەك کەسیشیان دەرچێ! بەڵام ژاندەرمەکان، لە چۆکان بەرەژێریان دەن، ئەگەر بتوانن ڕاست لە چۆکیان دەن، چاکتریش! چونکە دواتر ئیدی هەتا دەمرن، ناتوانن بێنەوە شەڕێ. دەنا لە باسکانیان دەن و هەر چۆنێك بێ، لە بیرتان بێ مەیانکوژن، چونکە بە کەیفی خۆیان نەهاتوون، بە زۆر هێناویانن و ناچارن دەستووری گەورەکانیان بەڕێوە بەرن. زۆر باشە ئێستا بە ئەسپایی بۆیان دەچینە خوارێ و تا نەگەینە سەر سەریان، نایەڵین پی‌بزانن. ئەرێ ڕاوەستن بزانم... کامەتان عەلی کەرتیشی دەناسن؟

شاهێن گوتی:

ـ ئەمن دەی‌ناسم!

ـ زۆر باشە شاهێن گیان، ئەگەر ئەو لەگەڵ بێ، دەبێ ئەتۆ مشووری وی بخۆی، هەر کەمێکی بریندار کە و هیچی دی! پێم‌خۆشە بەدیلی بگرین. ئەگەر برینداریش بوو، برینەکەی بۆ دەرمان

دەکەین و لە گەڵ خۆمان دەیبەینە نێو دێی. لە وێ لە نێوەڕاستی دێی دەیکوژین، بەڵام لە پێش دا ئەوەندەی دەتوانین ئەشکەنجەی دەکەین، چاوی دەردێنین و بە زیندوویی کەوڵی دەکەین. دەزانم ئەوە خراپە، زوڵمە و حەمەدۆکیش هەرگیز لە گەڵ ئەو شێوە هەڵسوکەوتە هاودەنگ نیە و بە تایبەت ئەوەی لە ئێمە کە دەستەیەکین ناوی ویمان بە سەرەوەیە قبووڵ ناکا... بەڵام ئاخر ئەوان ئەوە هەزار ساڵە ئاوا ڕەفتار لە گەڵ ئێمە دەکەن... ئەدی بۆ دەبێ ئێمە جارێکی لە گەڵ سەگێکی پیس لە وان هەر بەو شێوەیە هەڵسوکەوت نەکەین، کە ئەوان لە گەڵ ئێمەی دەکەن؟ داخی بە جەرگم حەمەدۆك قەت ئیزنی شتی وامان پێ‌نادا... بەڵام دەی جارێ با بزانین! هەوەڵێ با ئەو سەگەی بە دیل بگرین، جا دوایە بیری لێ دەکەینەوە چی لێ‌بکەین...

مەلا فەرهاد و دەستەکەی بە تەواوی دۆڵەکەیان گەمارۆ دا. حەمەدەکان لە نێو دۆڵەکەی، لە نێو ڕەوەزێکی گەورە دا کە کەوتبوە نێوەڕاستی چۆمی و هەرچوار دەوری ئاوی چۆمەکەی پێدا دەڕۆیی، مابوونەوە و ئازایانە شەڕیان دەکرد.

ئەوێ ڕۆژێ ژمارەیەکی زۆر لە ژاندەرمەکان بریندار بوون و زۆریش لە پیاوەکانی سولتانۆغلی کوژران. هەتا ئێوارێ شەڕ بوو و کاتێك تاریك داهات، تەقەکە بڕایەوە. شەوێش هەتا بەیانی دەنگی ناڵەی برینداران لە دۆڵەکەی نەپسایەوە...

کاتێك وڵات ڕووناك بوو، مەلا فەرهاد و هاوڕێیانی چوونە خوارێ و بریندارەکانیان کۆ کردنەوە. برینی هەموو ژاندەرمەکان سووك بوو، هەموویان لە ئەژنۆ بەرەژێر پێکرابوون.

مەلا فەرهاد ڕووی تێ‌کردن و گوتی:

ــ بمانبوورن، ژاندەرمە بەڕێزەکان. ئێوە بە قەستی کوشتنێتان پێوە دەنایین، بەڵام ئێمە دەمانەویست تەنیا ئێوە بریندار کەین، بەو حاڵەش هەرئێمە داوای لێبووردن لە ئێوە دەکەین...

پاشان بە سەر بریندارەکان دا گەڕا و یەکە یەکە لە حاڵی هەموویانی پرسی و دیسانیش بۆی دووپات کردنەوە کە ئەوان ئەو پەڕی هەوڵی خۆیان بۆ پاراستنی وان داوە و گوتیشی ئەگەر بە ڕاستی مەبەستمان کوشتنی ئێوە با، وەك ئەو کەلاکانەی دەیانبینن، لەو عەرزەی دەمانخستن... و ئیشارەی بە تەرمی کوژراوەکان کرد کە هەموویان لە پیاوەکانی سولتانۆغلی بوون.

ــ ببوورن، ژاندەرمە بەڕێزەکان، ئێستا ئێمە چەك و ڕەختەکانتان لێ‌دەکەینەوە. لەوانەیە ئەوانەی ئێوە زۆرمان بە کار نەیەن... بەڵام لە پێش دا ئی پیاوەکانی سولتانۆغلی کۆ دەکەینەوە، کە تەرمەکانیان لێرە کەوتوون. بێ‌گومان ئەوان هەم فیشەکیان زۆرتر پێن و هەم تفەنگەکانیشیان لە ئی ئێوە باشتر و تازەترن.

لەو کاتە دا حەمەدەکان هاتن. دەست و لەشیان دە خوێنێ دا شەڵاڵ بوون. هاتنە لای مەلا فەرهادی و گوتیان سێ هاورێیان کوژراون. مەلا فەرهاد ژماردنی. هیچیان لێ‌کەم نەببۆوە، ئێستاش حەوت بوون.

ـ ئەدی کوژراوەکان کوان؟

ـ نەماون، ون بوون، غەیب بوون...

مەلا فەرهاد لە ژێر لێوانەوە گوتی:

ـ بەڵێ... ئەوەش موعجیزەیەکی دیکە: سێیان کوژراون و دەسبەجێ سێی دیکە، ئەویش لەو هەلومەرجە دژوارەی دا جێگای وانیان پڕ کردۆتەوە. ئیدی نە ئەو پرسیاری کرد و نە ئەوانی دیکەش چیدی لە سەر ئەو باسە ڕۆیشتن.

کۆمەڵێك لە پیاوەکانی سوڵتانۆغڵی نەکوژرابوون، بەڵام بریندار ببوون و لە وێ لە لای یەك کۆیان کردبوونەوە. مەلا فەرهاد چووە لایان، ڕووی تێ‌کردن و گوتی:

ـ باشە ئێوە بۆچی ئاوا ئامادە بوون گیانی خۆتان فیدای ئاغای بکەن؟

لەو کاتەش دا ئەوەندەی ڕق هەستابوو، کە نەی دەزانی چۆن ددان بە جەرگی خۆی داگرێ. بریندارەکان ئیدی نەیاندەناڵاند، تەنیا چاویان بەردابوونەوە، گوێیان لە قسەکانی وی ڕادەگرت و هیچیان نەدەگوت. مەلا فەرهاد لە داخی وەی کە ئێستا ئیدی بۆی نەدەکرا سەروگوللەیان لێ‌دا و بیانکوژێ، وەخت بوو شێت بێ. ڕەگی ملی هەموو هەستابوون، چاوی لە ژێرڕا هاتبوون، بە سەری دا گوڕاندن، جنێوی پێ‌دان و تفی لێ کردن.

لە نەکاو یەکێکیان کە جووتێرێکی کز بوو، هەردووك لاڕوومەتی بە قووڵ داچووبوون، تەمەنی دەوری سی ساڵ بوو و تا ئێستا کز لە قولینچکێکی هەڵکورمابوو و دەستەکانی لە سەر زگی دانابوون، هەستا پێ و لە حاڵێك دا تووڕەیی و داماویی بە یەکەوە لە چاوی دا دیاربوون تفی لە مەلافەرهادی کردەوە و گوتی:

ـ یاڵڵا زوو بە گوللەیەکم لێدە و بمکوژە! لە کنەخۆ نەتۆ مەلای! یاڵڵا دەی بمکوژە، بەڵام تفم دە نێوچاوانی مەکە! هەرچی دەگەڵمان دەکەی بی‌کە، بەڵام مافی ئەوەت نیە ئاوا بێ‌ڕێزیمان پێ‌بکەی! بەڵێ تەنانەت ئەگەر زۆریش تووڕە بی، هەر حەقت نیە خەڵکی ئاوا لێ‌بکەی! چارەنووسی ئێمە مردنە و زۆر باشە فەرموو بمانکوژە، بەڵام سووکایەتیمان پێ‌مەکە!

مەلا فەرهاد کە تا ئێستا ئاوری لێ‌دەباری، لە حەژمەتان هەموو گیانی دەلەرزی و لە تووڕەیی‌یان بەحاڵ خۆی بە پێوە ڕادەگرت، بە بیستنی ئەو قسانە لە پڕ وەك ئاوێکی ساردی لە

سەر ڕا تا بەری پێی پیّداکەی، سارد بۆوە. خاو بۆوە و هیچ نیشانەی تووڕەیی دە ڕوخساری دا نەما، شەرم دایگرت و پێیعەیب بوو ڕوو بۆ لای هاوڕێیانی وەرگێڕێ. چاوی بەردانەوە، لە سەرەخۆ بۆ لای کابرای چوو، بە ئارامی قۆڵی گرت، لە جێی خۆی دایئیشاندەوە و گوتی:

ــ ڕۆڵە گیان، بمبوورە، ، بە ڕاستی داوای لێبووردن دەکەم...

کابرا گەش بۆوە و بۆ ساتێك نیشانەی ترسی لە ڕوخساری ڕەوی.

مەلا فەرهاد درێژەی بە قسەرکانی دا:

ــ بەڵام دەبێ بزانی بۆچی ئەمن هێندە تووڕە بووم. باشە بۆچی دەبێ ئێوە بە قسەی سوڵتانۆغڵی بێن و ئێمە بکوژن؟ چاو لەو هەموو تەرمانە بکەن کە لە سەر عەرزی کەوتوون! توخودا ئەوانە هەرکامیان دە سوڵتانۆغڵییان ناهێنن؟ باشە کاتێك ئینسان لەو هەلومەرجە دا کە دەیبینن، بیر لەوە دەکاتەوە، چۆن ڕقی هەڵنەستێ و ناچار نەبێ بەو شێوەیە ڕەفتار بکا، کە من ئێستا کردم؟

کابرا دیسان وەجواب هاتەوە و گوتی:

ــ بەڵام ئەتۆ نابێ ئاوا هەڵسوکەوت بکەی!

ــ بۆ نابێ؟ ئاخر ئێوە و ژاندەرمە جیاوازیتان زۆرە. ژاندەرمە دەبێ دەستوور بەرێوە بەرێ و هەرچیی فەرماندەکەی پێی دەڵێ، جێبەجێی بکا. بەڵام ئێوەچی؟ خۆ ئێوە ژاندەرمە نین!

ــ مەلا فەرهاد، وەزعی ئێمە لە ژاندەرمەکان خراپترە. ژاندەرمەساڵێك، دوو ساڵان ناچارە ئەو کارەی بکا، بەڵام ئێمە هەتا دەمرین، ناچارین بە قسەی سوڵتانۆغڵی بکەین. بابمان، باپیرمان، بابی باپیرمان و بنە و بنەچەکەمان هەموویان نۆکەری بابو باپیرانی سوڵتانۆغڵی بوون! توخوا تاوان نیە ئەو بەستەزمانانەتان کوشتوون، کە بۆ نانی شەوێ موحتاج بوون؟

ــ ئەوان بۆ کوشتنی ئێمە هاتبوون. ئەمانکوشتبان، بۆخۆمان تیّدا دەچووین.

ــ ئەوان بیّتاوانن. ئەوانیش ئاغاکەیان فەرەمانی داونێ بێن و شەڕ لە گەڵ ئێوە بکەن!...

کابرا چی دیکە نەیتوانی قسە بکا. لە نەکاو دەستەوئەژنۆ دانیشت. نێوچاوانی خستە سەر چۆکانی و بە کوڵ دەستی بە گریانێ کرد، گریانێکی وا کە هەموو لەشی لە گەڵ گریانەکەی دەلەرزییەوە و دەتگوت دەکوڵێ. مەلا فەرهاد لە وێ ڕاوەستابوو، چاوی تیّبڕیبوو و نەیدەزانی چ بکا. سەرەنجام چوو لە لای دانیشت، دەستی بە شانی داهێنا، لە وەزعی برینەکەی پرسی، دڵخۆشیی دایەوە و پێی گوت کە لەمەودوا هەوڵ بدا ڕابردووی خۆی قەرەبوو بکاتەوە. کابراش ئەو جار هێندێك هاتەوە سەرخۆ، هەستا و دەستی مەلا فەرهادی ماچ کرد. مەلا فەرهاد ڕووی دە ژاندەرمەکان کرد و گوتی:

ـ ئەریٚ ئێوە عەلی کەرتیشتان لە گەڵە؟
یەکێك لە ژاندەرمەکان گوتی:
ـ نا، ئەو لەو دێیەی خواریٚ بەجیٚ ماوە و لە ویٚ خەریکی ئازاردانی خەڵکەکەیە. هەر بۆیەش لە گەڵمان نەهات. ئەگەر بۆخۆتان بچنە دێی، بیٚگومان دەیدۆزنەوە... مەلا فەرهاد وا باشە بچن و بە چاوی خۆتان ببینن کە ئەو کابرایە چ بە سەر خەڵکی بەستەزمانی ئەو گوندە دێنیٚ.
ـ زۆر باشە، ئێوە لێرە دەمێننەوە، ئەمن هێندێك پیاوان بە وەڵاغەوە دەنێرم سوارتان کەن و بتانبەنە شاری. لە وێش بچنە لای دوکتۆری.
ـ خودا ڕاوەستاوت کا مەلا فەرهاد، یارەبی لە بەڵایان دوور بی!
ـ ئامین..
ژاندەرمەیەك لە حاڵێك دا لە بەر ئێشی برینەکەی دەیناڵاند،گوتی:
ـ داوایەکمان لێت هەیە مەلا فەرهاد:
ـ فەرموو...
ـ ئێمە لە نێو خۆمان دا باسی ئەوەمان کردوە کە... ئێستا کە ئێمە بریندار بووین، لە مردن گەڕاوینەوە... ئەو هەموو ناڕەحەتی‌یەمان بەسەر هاتوە... بریا تونیبامان... ئەوەندەی دەژین... مەبەستم ئەوەیە ... بریا ئەو ئاواتەمان وەدیهاتبا و... حەمەدۆکمان چاوپیٚکەوتبایە. دەزانی.. کاتێك دەورەی خزمەتی ئێمە تەواو دەبیٚ و دەگەڕێینەوە نێو خزمەکانمان... کاتێك دەگێڕینەوە کە ئێمە لە کاتی شەڕ لە گەڵ دەستەی حەمەدۆکی دا بریندار بووین، خەڵکی دێیەکەمان ... لێمان دەپرسن حەمەدۆکتان دی؟ چۆن پیاوێك بوو؟.. ئاخر بۆخۆت دەزانی ئیدی ئێمە بەوحاڵەیەوە هەتا ماوین شەل دەبین،... دواتریش خۆ ئەو ئاواتەمان وەدی نایە و چاومان پیٚی ناکەویٚ!
مەلا فەرهاد پێکەنی و گوتی:
ـ ڕاست دەکەن!
پاشان چوو بۆلای یەکێك لە حەمەدەکان، کوڕێك سەربەرگێکی دڕاوی خوێناویی دەبەر دا بوو و سەری ڕووت بوو. قۆڵی گرت، هێنایە پێشیٚ و گوتی:
ـ فەرموو، ئەوە حەمەدۆکە!
ـ خودا بتبەخشیٚ مەلا فەرهاد! دەستت ماچ دەکەین! خودا تەمەنت درێژ کا و خودا تەمەنی حەمەدۆکیش درێژ کا!

دوو ڕۆژ دواتر مەلا فەرهاد بە خۆی و هەموو دەستەکەی و حەمەدەکانەوە چوونە نێو گوندی سووتماناوایە. بەیانی زوو بوو کە خۆیان گەیاندە نێو دێ. خەڵکی دێیەکەی هێندە ئەشکەنجە کرابوون، هەموویان شەلوکوت ببوون، دەگریان و دەیاننالاند. بەوحاڵەش کاتێك زانیان مەلا فەرهاد هاتوە، هەموویان خۆشحاڵ بوون، پێشوازییان لیٚکرد و لێیهالاًن. لە نێو هەموو لاوانی دێیەکەی دا تەنانەت یەك کەسیش وەگیر نەدەکەوت کە ساغ بیٚ و بتوانیٚ بە سەر پێوە ڕاوەستیٚ. زۆربەیان هێشتا دە جێیە دابوون. هێندێکیان بە شەقەی دەرۆیشتن و هێندێکیان دایك، باب، یان کەسێکی دیکەیان دەچوونە بن باڵیان و دەیان هێنان. جەفەر لە مردن بوو. مەلا فەرهاد لە بن سەری دانیشت و بە دەنگە خۆشەکەی دەستی بە قورئانخوێندنیٚ کرد. دوو سەعاتی لە سەر خوێند.

ئەوڕۆژیٚ هەینی بوو. مزگەوتی گوندەکەی منارەی نەبوو. مەلافەرهاد کە دەیەویست بانگ بدا، چووە سەر بانێکی بەرز و بانگی دا. خەڵکی دێ کۆوە بوون و داوایان لیٚکرد کە پێشنوێژیی نوێژی هەینیشیان بۆ بکا.

مەلا فەرهاد قبوولی کرد. دەنگی ئەوەندە خۆش و بە گوڕ بوو، مرۆڤ سەری لێیسوڕ دەما. وەك خوڕەی ئاوێکی بە تەوژم دەچوو کە لە سەران دێتە خواریٚ، بە سەر ڕەوەزە سەربەرزەکان دا قەڵبەزەی دەبەستیٚ، دەڕژێتە سەر بەردان، خۆی بە قەدی داران دادەدا و پاشان بە نێو دارستانە چڕوپڕەکان دا بڵاو دەبێتەوە. کاتێك دەستی بە خوێندنەوەی خوتبە کرد، گوڕاندی و گوتی:

ــ خودا مرۆڤی بۆ ئەوە دروست نەکردوە کە بچەوسێنرێتەوە. نە خوا و نە پێغەمبەری خوداش ئەو ستەمەیان پیٚقبووڵ ناکریٚ، کە لە دنیای ئێستا دا هەیە! بە زەحمەت یەك لە هەزاری خەڵك زگی خۆیان پیٚتێر دەبیٚ! ئەوانە کە ستەمیان لیٚدەکریٚ و ناوێرن بە گژ ستەمکار دا بچنەوە، دڵنیا بن مەترسیی ئەوەیان لە سەرە کە بە بیٚئیمانی بمرن! باش بزانن دەرگای بەهەشت بۆ ئەو کەسانە دەکەوێتە سەر پشتیٚ، کە دژی ستەم و چەوساندنەوە ڕادەوەستن و خەبات دەکەن!

مەلا فەرهاد لێکدا لێکدا بۆ دروستیی قسەکانی بەڵگەی لە ئایەتەکانی قورئانیٚ دەهێنایەوە و پاشانیش بە دەنگە خۆش و دڵگرەکەی باسی ڕوحم و کەرەمی خودای بۆ ئەو کەسانە کرد، کە ژیانی خۆیان فیدای ڕاستی و عەدالەت دەکەن.

کاتێك خوتبەکان و نوێژەکەی تەواو کردن، هەموو گیانی شەلاًلی ئارەقەی بوو. پاشان گەڕایەوە لای جەفەری کە حاڵی خراپتر ببوو. دیسان لە بن سەری دانیشت، چاوی لە سەریەك دانان و بە دەنگێکی بە سۆز دەستی بە قورئانخوێندنیٚ کرد. هۆش و بیری بە شێوەیەك لە گەڵ

خوێندنەکەی تێکەڵ ببوو، کە ئەگەر دوای ماوەیەك وشیاریان نەکردبایەوە کە کاتی ناخواردنە و هەموو لە سەر وی ڕاوەستاون، هەر دەیخوێند و ئیدی ڕوون نەبوو کەی کۆتایی پێدێنا.

هەموو هاوڕێیانی مەلا فەرهادی و خەڵکی دێی بە پیر و جحێڵەوە لە دەوری یەك لە حەساری مزگەوتێ کۆ ببوونەوە. ئەو سەرەوسەری حەسارەکەی سفرە ڕاخرابوون. میوانەکان دوو ڕۆژ بوو نانیان نەخواردبوو و زۆر برسی بوون. نان و چێشتێکی زۆر خۆش و بەتام ئامادە کرابوو و هەموو تێروپڕیان خوارد. تەنیا مەلا فەرهاد نەیدەتوانی باش بخوا و دەبوو هەر پاروەوە و پەرداخێك ناوی بە سەر داکا، دەنا بۆی قووت نەدەچوو. ناچار بوو هێندێك جار ڕاوەستێ و هەر نەخوا.

عەلی کەرتیش دوو حەوتوو پێشتر هاتبووە دێیەکەی و گورهانێك ژاندەرمەشی لە گەڵ ببوو. کە هاتبووە نێو دێی، بە گەف و هەڕەشە و گوڕەشەوە هاتبوو. وەك چەوەندەری سوور هەڵگەڕابوو و وەك سەگی هار دەیمڕاند. سەرەتا دێیەکەی گەمارۆ دابوو، نەیهێشتبوو کەس لە دێی وەدەرکەوێ و هەمووی لە حەساری مزگەوتێ کۆ کردبوونەوە. ژاندەرمان هەموو ماڵەکانیان پشکنیبوون، هۆڵ و تەویلەکانیش گەڕابوون، تەنانەت چاڵاوەکانیشیان چاو لێکردبوون. کاتێك هەموو خەڵکی دێی لە حەساری مزگەوتێ کۆ ببوونەوە، عەلی کەرتیش هەروا لە گۆترە کوڕێکی منداڵکاری هەستاندبووە سەر پێ، لە نێو حەشیمەتەکەی هێنابوویە دەری و لێیپرسیبوو:

ـ کوڕە ناوت چییە؟

ـ ناوم چییە؟ ناوم حەمەدە.

ـ ها... حەمەد؟ ناوێکی دیکەت نیە؟

ـ نەخێر.

ـ یاڵڵا وەرن لە سەر پشت ڕایکێشن!

ژاندەرمەکان کوڕەیان لە سەر پشت ڕاکێشابوو، هەردووك بەلەکیان بە گوریسی لێك قایم کردبوون و هەتا ڕوخساری سپی ببۆوە، لێیاندابوو. ئەو جار کاتێك دیبووی کوڕەکە زۆری نەماوە بێهۆش بێ، لێدانەکەی ڕاگرتبوو و لێیپرسیبوو:

ـ ئێستا ناوت چییە؟

کوڕە کە بە زەحمەت قسەی بۆ دەکرا، گوتبووی:

ـ حەمەد.

دیسان دەستیان بە لێدانیی کردبۆوە، بەڵام کوڕەکە تەنانەت یەك جاریش نەیناڵاندبوو.

دوای لێدانێکی زۆری دیکە دیسان کەرتیش لێیپرسیبۆوە:

ــ ناوت چی‌یە؟
ــ حەمەد...
ئەوە جار عەلی کەرتیش بۆخۆی وەریگەڕابۆیە و ئەوەندەی توانیبووی لێی‌دابوو، بەڵام کوڕەکە یەك وشەی دیکەی بە زاری دا نەهاتبوو. پاشان عەلی لەبەری پاڕابۆوە، بەڵێنی پێ‌دابوو ئەگەر قسە بکا، هەرچی دەیەوێ بی‌داتێ، ژنی بۆ بێنێ و خەرجی داوەتەکەشی بۆ بدا و ئەو جار لێی‌پرسی:
ــ دەی بابزانم ئێستا ناوت چی‌یە؟
ــ حەمەد.
دیسان ئەوەندەی توانیان لێیان دا، کەرتیش بۆخۆی لە لێدانی ماندوو ببوو. ئاخرەکەی بەری دا و دیارە بۆشی بەچۆك دا نەهات. لە حەیفان نەی‌دەزانی چ بکا. هەر لێوی خۆی دەکرۆشت: ئای جووتێری کافر! بەڵام کەرتیش وەك خەڵکی دیکە نەبوو و دەبوو پێیان نیشان دا کە چۆن دەتوانێ کاری خۆی بە ناکام بگەیەنێ و خەڵك بزانێ کە ئەو سەربازێکی تەواوە. سەربازێك کە ئامادەیە گیانی خۆی بۆ نیشتمان فیدا بکا و ئەگەر پێویست بێ، دەتوانێ خوێنی هەموویان بڕێژێتە سەر عەرزی.
سێ شەو و ڕۆژان لاوەکانی ئەو گوندەی کوتا و هەمووی نیوەگیان کردن. بەڵام هەرچی کردی بێ‌سوود بوو. لاوێك لە بەر دەستی دا مرد و هەتا مردیش هەر گوتی ناوم حەمەدە. کەرتیش شێت ببوو. ئەو بۆخۆی لە ئەسڵ دا جووتێر بوو و لەمێژساڵیش بوو کاری ببووە ئەشکەنجە کردن. ئەوەی پێ‌خۆش بوو، چونکوو پێی‌وا بوو ئەرکی سەرەکیی ژاندەرمان ئەوەیە کە خەڵکی ئەشکەنجە بکەن. باوەڕی وابوو کە لێدان لە بەهەشتێ ڕا هاتوە و ئەگەر لێدان نەبێ ئەو وڵاتە تێکدەچێ. ئەگەر ئەو جووتێرانە لێیاننەدرێ و دەسەڵاتێکیان بە سەرەوە نەبێ، کە لێی‌بترسن، هەموو شتێك تێکدەچێ و دەبێتە تێکەڵپێکەڵێك هەر مەگەر خودا بۆخۆی بزانێ.
عەلی کەرتیش وەك گەردەلوولی هەڵدەسووڕا و بە ئەشکەنجەدانی جووتێران خزمەتی نیشتمانی دەکرد. تا ئێستا و لە چەندین ساڵی ڕابردوو دا خەڵکێکی زۆری لە جووتێرەکانی چیای تووڕووس، نێوەڕاستی ئاناتۆلی و ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوای ئەو ناوچەیەش ئەشکەنجە کردبوو، بەڵام هەرگیز گرفتی لەو چەشنەی ئێستای بۆ پەیدا نەببوو. ئەوە چەندمانگ بوو هەرچی پرسینەوەی لە گەڵ دەکرد، ناوی حەمەد بوو. هێندەی لێ‌دەدان خوێنیان لەبەر دەڕۆیی، بە کوتانێ لاڵ و کەڕی دەکردن، بەڵام هیچیانی بۆ بەردەست نەدەکران و هەموویان هەر حەمەد بوون. زۆر سەیر بوو کوشتباشتن، نە هاواریان دەکرد، نە دەیانناڵاند و بەردەوامیش دەیانگوت ناویان حەمەدە و هیچی دی. نی وایان تێدا بوون تەنانەت هەتا دەمردن هەر بزەیان دەهاتێ و هەر دەشیانگوت ناویان حەمەدە. دەکرا بڵێی خەڵکی دوو سێ

دێیان هەر لە سروشتی خۆیان دا کەللەشەق بوون، بەڵام... خۆ ناووناوبانگی زەبروزەنگی عەلی کەرتیشی بە هەموو چوکووراوایە دا بڵاو ببۆوە و هەموو کەس دەیزانی کە ئەو تا چ ڕادەیەك بێبەزە و دڵڕەقە. بەو حاڵەش سەیر بوو کە ئەو خەڵکە بۆ وێنە عەلی، حوسێن و برایمی‌یان تێدا نەمابوون و هەموویان ببوونە حەمەد. لەو قەرارەی هێندەی پێ‌نەدەچوو هەموو ژن، کچ، منداڵی سەر پشتی لانکێ و تەنانەت ئەوی دە زگی دایکیشیان دابوون دەبوونە حەمەد... بەڵێ، ڕاستە ئەوان زۆر کەللەشەق بوون، بەڵام ئاخر عەلی کەرتیش، دەوڵەت، یاوەر، عیسمەت پاشا لە ئەنکەرەی و مارشاڵ فەوزی پاشاش هەر وا دەستیان هەڵنەدەگرت و قبووڵیان نەدەکرد. ئاخری خودا یان بە وان دەدا، یان بە ئەوانی دی... جا کێ بەهێزترە... با بزانین چۆن دەبێ! بڵێی جووتێرێك کە ئازایەتیی خۆی بە بێدەنگبوون و وەڵامنەدانەوە نیشان دەدا، بێ‌باتەوە، یان بەگێکی گەورە؟

هەر چۆنێك بوو عەلی کەرتیش بڕیاری خۆی دابوو. قسەی تێ‌دا نەبوو یان دەبوو یەکێ بدۆزێتەوە کە بەرگەی لێدانێ نەگرێ و دان بەوە دا بێنێ کە ناوی حەمەد نیە، یان خۆی بکوژێ.

کاتێك جەفەریان هێنا لای، کەرتیش زۆری پێ‌خۆش بوو. پێی‌وابوو ئیدی بە مرادی خۆی گەیشتوە. جەفەر مێرمنداڵێکی حەڤدە ـ هەژدە ساڵەی کزەڵە بوو، لە بەر لاوازی‌یان ملی بستێك درێژ ببۆوە و ڕوخسارێکی ڕەنگپەڕیوی هەبوو. ژاندەرمەکان لە سەر دارێکی دیبوویانەوە. لە ترسان لە وێ خۆی شاردبۆوە و وەك مێژۆکەی دەلەرزی:

ـ ناوت چی‌یە؟

جەفەر لێبڕاوانە وەڵامی دایەوە:

ـ حەمەد.

ـ حەمەدی چی خوێڕیی مردەلۆخە؟

ـ حەمەد.

کەرتیش سەرەتا هەوڵی دا بە قسەی خۆش، بە جنێو و هەڕەشان بە چۆکی دابێنێ، بەڵام سوودی نەبوو و پاشان وەك هاونیشتمانێك کە هەست بە بەرپرسایەتی دەکا، هەموو زانست، ئەزموون و توانای خۆی لە ئەشکەنجە کردنی دا بەکارهێنا، بەڵام بێجگە لەوە یەك وشەی دیکەی لێ‌نەبیست... نەخێر، ئەوکوڕە کە ڕواڵەتێکی هێندە لاواز و مردەلۆخەی هەبوو، لە ڕاستی دا دێو و درنج بوو و دوژمنی نیشتمان بوو. بە هیچ شێوەیەك دانەهات و لە قسەی خۆی پاشگەز نەبۆوە.

یانی چی؟ بستە منداڵێك لە بەرامبەر پیاوی دەوڵەتێ دا ئاوا هەڵسوکەوت بکا و ناوی خۆی نەڵێ؟ ئەمە وەك ئەوە وا بوو کە هێز و کارایی کۆماری تورکیە کە لە بەرامبەر هێزە

گەورەکان دا خۆی ڕاگرتبوو و نەبەزیبوو، گاڵتەی پێبکرێ. ئەوەتا سەرجووخە عەلی کەرتیش، ئەو پیاوە بە شەڕەفە، گەورەترین و لێزانترین ئەشکەنجەگەری ئەم سەردەمەی وڵات، هەموو هەوڵی خۆی لە گەڵ ئەو کوڕەی داوە، بەڵام سوودێکی نەبووە!

سەرجووخە عەلی بیری کردەوە:

ئێستا بۆ ئەوەی ئەو جووتێرە خاینانە بە چۆك دابێن، دەبێ هێندێك شێوەی تازە بدۆزینەوە! وا دیارە ئەو شێوە ئازار و ئەشکەنجەیە کە تا ئێستا بە کار هێنراون، کۆن بوون و ئیدی لە کەلك کەوتوون. وڵاتێك کە هونەری ئەشکەنجەکردنی تێدا گەشە نەکا، ئاخرییەکەی دەڕووخێ و تێدا دەچێ... جا ئەگەر تورکیەش تێکچێ، ئەوە تاوانی ئێمەیە. ئێمە خوێنمان لە ڕێگای ڕزگاریی نیشتمان دا داوە، بەڵام توانای ئەوەمان نیە ئەو هەتیوە چلکنە دێهاتییانە ناچار کەین کە شتێکی دیکەیان بێجگە لە وشەی حەمەد بە زار دا بێ!

بە ڕاستی ئەو هەتیوە نیوەمردوە لەڕوڵاوازە بۆ سەرجووخە عەلی کەرتیشی ژانسەرێکی سەیر بوو: ئێستا ئیدی لەوانە بوو ناوبانگ و شانازییەکانیشی هەموو بشۆڕێنەوە و ئابڕووشی بچێ. باشە ئەو جار چۆن ئەو بتوانێ لە لای باڵادەستە خۆشەویست و بەڕێزەکانی سەر بەرز کاتەوە؟

لە حاڵێك دا چیی وای نەمابوو لە داخان بتەقێ مڕاندی:

ــ بەری دەن با بڕوا!

ژاندەرمەکان جەفەریان بەردا، بەڵام جەفەر ئیدی گیانێکی وای دەبەر دا نەمابوو و بە ئاستەم هەناسەی دەهات. دوای نیو سەعات چاوەکانی هەڵێنان، بەڵام ئیدی نەیتوانی لە جێی خۆی ببزوێ و خەڵکەکە هەر ئەو کاتی زانیان کە لە ژێر ئێش و ئازاری ئەو لێدان و ئەشکەنجەیە هەڵناستێتەوە و کاری تەواوە.

ئێواری کوڕێکی چکۆڵە هاتە لای مەلا فەرهادی و پێی‌گوت:

ــ مامۆستا، جەفەر حاڵی زۆر خراپە...

مەلا فەرهاد چوو و دیسان لە بن سەری دانیشت، هەتا دواهەناسەی کێشا، دەستی دە نێو دەستی خۆی گرت و قورئانی لە سەر خوێند. لەو بەینە دا ئەو کوڕە مێرمنداڵە تەنیا جارێك چاوی هەڵێنا. مەلا فەرهاد دنیایەك پرسیار و قسەی دە نیگای دا خوێندەوە کە وێدەچوو یەکێك لە پرسیارەکان و پرسیاری هەرە گرینگییان ئەوە بێ: باشە بۆ دەبێ ئەو هەموو ستەمە دەرحەق بە من بکرێ؟ بۆ دەبێ ئەمن وام بە سەر بێ؟

ئەوە شتێك بوو کە لانی کەم مەلا فەرهاد پێی‌وابوو دە چاوی ئەو کوڕەی دا دیتوویەتی.

# (١٤)

شار لە دڵەڕاوکێیەکی ناخۆش دا بوو. تەنانەت هێنانی ناوی ئەسپەکوێتی حەمەدیش کە مۆرە مەبارەکەکەی دە زاری دا بوو، تێکەڵی دەستەی چلسوارەی غەیبی ببوو و لە وێ لە گەڵ ئەسپەبۆرەی خدری زیندە غارغارێنی دەکرد، قەدەغە بوو. هەر بە چاك، یان بە خراپ کەس نەدەبوو ناوی ئەو ئەسپەی بە زاری دا بێ. کەسێك ناوی هێنابا، دەبوو سزای توند بدرێ، لە پێش دا بە قەمچی‌یان لێی بدەن و دواتر لە ژێرزەمینی ژاندەرمەخانەی دا کە هەتا چۆکان ئاوی تێدابوو، زیندانی بکرێ. دوای ئەوەش مەحکەمە بکرێ و بە تاوانی دروستکردنی مەترسی بۆ هێمنایەتیی ناوچەکە، لانی کەم ماوەی سێ مانگ بگیرێ. ئەوەش لە لایەن دادەستێنەوە بە ئاشکرا ڕاگەیەندرابوو و جاڕیش درابوو. زۆر کەس لەو پێوەندی‌یە دا برابوونە ژاندەرمەخانەی و گیرابوون، ڕۆژەکانی هەوەڵێ لێیاندابوون، هەموو گیانیان دە خوێنێ دا شەلاڵ کردبوون و دواتریش بە زگی برسی‌یەوە دە ژێرزەمینەکەیان کردبوون و ناچاریان کردبوون لە سەرزگ دەو نێو ئاوەی دا بێن و بچن. ئەو زەبروزەنگە وای کرد کە هەموو ئەو داستان و ئەفسانانە کە سەبارەت بە ئەسپی حەمەدۆکی لە سەر زار و زمانان بوون، کۆتایی‌یان پێهات. هیچ‌کەس دووپاتی نەدەکردنەوە و هەر دەتگوت قەت ئەو شارە باسێکی ئاوای لێنەبووە. هیچ بەیانی‌یەکی حیلەی ئەسپەکەی نەبیسرایەوە و ئەسپەکەش بە سەر هەوران دا نەفڕی‌یەوە. تەنانەت دواتر وەك ئەوەی دەچوو کەس لە بیری نەمابێ کە خەڵکی‌یان لە سەر ئەوەی کە تەنیا باسی ئەسپەکەی کردوە، دەگرت و هەتا دەیانتوانی تێیانهەڵدەدا. ئەوەش لەبیر چووبۆوە کە خەڵکیان هەر بەو تاوانانە ناچار دەکرد چەند ڕۆژان دە ئاوی پیسی ژێرزەمینی ژاندەرمەخانەی دا بتلێنەوە. هەر لە بناخە دا دەتگوت تا ئێستا کەس لە سەر شتی وا نەگیراوە.

ماوەیەکی کورت بەو شێوەیە بە سەرچوو، بەڵام زۆری نەکێشا دیسان دەنگۆکان، ئەو جار زۆرتریش، هەم لە نێو شار و هەم لە گوندەکان بڵاو بوونەوە. هەواڵ و داستانەکان وەك برووسکەی دەگەیشتنە خەڵکی و ڕۆژ بە ڕۆژیش گەورەتر دەبوونەوە. ئەو شتانە لە نێو ژنان بە تایبەت زۆر بوون. ڕۆژ نەبوو باسی موعجیزەیەك، یان شتێکی سەیری لەو بابەتە سەبارەت بەو ئەسپەی نەیەتە گۆڕێ.

چاوەشە کەچەڵ کە لووتێکی زلی هەبوو، بەیتێکی لە سەر ئەو شتە سەیرە تازانەی ئەسپەکوێتی دروست کردبوو. سازەکەی دەست دابۆیە، بە گوندان دا دەگەڕا و بەیتەکەی بۆ خەڵکی دەگوت. گەورە دەسەڵاتدارەکان کە بۆخۆیان ڕێوشوێنەکەیان دانابوو، ئاگایان لە هەڵسوکەوتی چاوەشە کەچەڵی هەبوو، بەڵام چونکە خەڵکی شاری لە ترسی سزادانێ نەیاندەوێرا ئەو دەنگۆیانە پەرە پێبدەن، کەس بە ئاشکرا باسی ئەسپەکەی نەدەکرد، بەیتەکەشیان نەدەگوتەوە و وا دیار بوو شارەکە هێمنە، پێیان باش نەبوو خۆی تێ‌گەیەنن و دەستووری گرتنی بدەن.

بەڵام ژنان گوێیان بەو قسانە نەدەبزووت و دە بەزمی خۆیان دا بوون. حوسنی خانم و ژنی یاوەری، ژنی خەلیل بەگی گەورە، ئی قازی، ئی پارێزگاری، ئی دادەستێنی و بە کورتی ژنی هەموو گەورەکان کۆ دەبوونەوە و ڕۆژ هەتا ئێواری باسی ئەسپەکەیان دەکرد. ئەوان هێندەیان باسی حەمەدۆك و ئەسپەکەی پێ‌خۆش بوو، کە هەڕەشە، گیران، زیندان، ئەشکەنجە و شتی وایان هەر پێ فشە بوو. تەنانەت بیریان لە مردنیش نەدەکردەوە! گومان دە وە دا نەبوو کە خواش یارمەتیی دەدان، چونکە هەموو ڕۆژێ هەواڵی تازە سەبارەت بە حەمەدۆك و ئەسپەکەی هەر دەگەیشتە وان. کەسیش نەی‌دەزانی چۆن دێ و بە کوێ دا دەگاتێ.

ئەو هەواڵ و باسانەی لە هەمووان سەرسوڕهێنەرتر بوون، هەمیشە لە لای ژنەکەی سندووقداری بوون، لە لای ئەو ژنە جوانەی کە تەنیا کاتی گێڕانەوەی هەواڵەکە وەقسە دەهات، دەنا بێ‌دەنگ دادەنیشت، چاوی دەبڕییە خەڵکەکە و گوێی لە قسەی وان ڕادەگرت. هەر خوداش دەی‌زانی ئەو لە کوێوە و چلۆن ئەو قسە و باسانەی بۆ دەهاتن. ژنەکان شەیدای بیستنی ئەو قسانە بوون و هەرچەند لە سەریشیان ڕۆیشتبان و دووپاتیان کردبانەوە، ماندوو نەدەبوون...

" هەموو شەوێ، ڕاست دوای ئەوەی شار چۆڵ دەبێ، کۆیەك نوور لە سەر پردێ، لەوجێیەی ئەسپەکەی لێ گوللەباران کرا، دەتەقێتەوە. ڕووناکی‌یەکە لە پێش دا سوورێکی تۆخە، پاشان وردە وردە زەرد هەڵدەگەڕێ، کەسك دەبێ، بنەوش دەبێ و ئەو جار وە سەر ڕەنگی شین دەگەڕێ، بە تەپکەکەی هەڵدەچێ و لە سەر تەپکی گەورە دەبێتەوە. زۆر گەورە دەبێتەوە و دەکووژێتەوە، بەڵام

دیسان هەڵدەبێتەوە و تەواوی تەپکەکەی وەك نوێژی نیوەڕۆیە ڕووناك دەکا. ئەو جار لە هەموو لایەکی ڕا ماینی جوانی ڕەسەن پەیدا دەبن، کە بە غاردان دێنە پێشێ. ماینەکان زۆر شۆخن، کلکیان درێژە و سەر و کلکیان وەك یەك بەرز ڕاگرتوە. ماینەکان ڕادەوەستن، پاشان پاشوویان هێندێك لە بەریەك بڵاو دەکەن و میزی دەکەن. ئەسپە کوێت دێ، هەوەڵێ بۆن بە عەرزیەوە دەکا و پاشان بە پاشی ماینەکانەوە. دوای ئەوە سەری بەرەو ئاسمان بەرز دەکاتەوە و جار جار دەحیلێنێ. ئەو جار یەك بە یەك سواریان دەبێ و هەتا بەیانی لە هەمووان دێ..."

دەیانگوت لەو کاتەوە کە ئەسپەکوێت دێتە سەر تەپکەکەی، ژن و کچیش دەچنە وێ، دەوارندەوری تەپکی ڕادەوەستن و چاو لە گەمەی ئیشقبازی و تێکەڵبوونی وی لە گەڵ ماینەکان دەکەن. ئەسپەکوێت ئەوەندە نەرموگەرم هەڵسوکەوت دەکا، مرۆڤ سەری سوڕ دەمێنێ. هیچ ئینسانێك تا ئێستا شتی وای نەدیوە. پاشان بەری بەیانی، ئەو کاتەی ئاسۆ ڕووناك دەبێ، ئەسپەکە خاو دەبێتەوە، تاوێکی چاك بێجووڵە ڕادەوەستێ، یاڵ و کلکی شۆڕ دەبنەوە و لە جێی خۆی جووڵەی ناکا. هێندەی پێناچێ لە نەکاو وە خۆ دەێتەوە، خێرا دەسووڕێ و لەپێش چاو ون دەبێ. ساتێك دواتر حیلەی لە سەر شاخان دەنگ دەداتەوە...

کاتێك تەواوی خەڵکی شاری و تەنانەت ژنەکانیش لە دەنگۆ و باسوخواسی ئەسپەکەی وەڕەز بوون، لە پڕێك سەرنجی هەمووان پەڕیە سەر هەواڵی حەمەدەکان. هەواڵەکە ئەوەندە ترسێنەر بوو کە نەك هەر ئەم شارە، بەڵکوو ئەدەنە، ئەنکەرە و هەموو وڵاتی حەبەساند. لە گوندەکانی توورڕووسی هەموو لاوەکان و منداڵەکان ناوی خۆیان گۆڕیبوو و ناوی حەمەدیان لە سەر خۆیان دانابوو. دەیانگوت ئێستا ئەو بەزمە لە دەشتێش هەیە. شەپۆلێك دڵەڕاوکێ شاری داگرتبوو و تەنانەت ئەوانی هەرە بە ئەزموون و ئاقڵیش دەو شتەی نەدەگەیشتن. موڕتەزاغا کاتێك لە نێو شاری ئەو هەواڵەی بیست، زەندەقی چوو. بە پەلە چۆوە ماڵێ، عەلیە شەلی بانگ کرد و لێی پرسی چار چیە و ئەو جار چۆنمان لە چنگ ئەو هەژدیها حەوتسەرەی ڕزگاری دەبێ؟ هێندێك گەورەی شاریش لە وێ بوون.

ــ ئەمن ڕۆژی هەوەڵێ گوتم، هاوارم کرد و گوێیان لێنەگرتم. گوتم با هەتا مارەکە گەورە نەبووە، سەری پان کەینەوە!

خەڵکەکە سەریان لەقاند و گوتیان:

ــ قسەکەت ڕاست بوو موڕتەزاغا، گوێمان نەدایەی و بۆخۆمان پەتەکەمان دە ئەستۆی خۆمان دا کرد.

هەر ئەویٚ ڕۆژیٚ خەلیل بەگ، یاوەر، زولفۆی سندووقدار، دادەستێن، قازی، پارێزگار، مەلا دۆران و هەموو ئاغاکانی دەوروبەر و بەگی عەشیرەتەکان لە دەفتەری کاری شارەداری کۆ بوونەوە. ڕۆستەم بەگیش کە پیاوێکی بە زاکوون بوو، زۆر کەسی ئەو شارەی فێری خوێندنەوە و نووسین کردبوو، عەرزێکی یەکجار زۆریشی لەو ناوچەیە هەبوو و قارەمانی دەورەی شەری سەربەخۆییش بوو، لە ویٚ بوو. بە یەکەوە دانیشتن و ڕاوێژیان کرد، چ بکەن؟ وەڵامێکیان بۆ نەدۆزرایەوە.

زولفۆ گوتی:

ئەمن ناتوانم ئەو هەواڵەی بۆ عارف سایم بەگی بنووسم، چونکە لێمان تووڕەیە. ئەوەندە تووڕەیە کە کاتێك ئەمن بە دەستی خۆم ئەو ڕۆژانە چەند سەبەتە هەنجیری زۆر باشم چنیبوو و بۆم ناردبوو، هەر چاویشی لیٚ نەکردبوون. هەرچەند هەنجیریشی زۆر پیٚخۆشە و هەموو دەزانن هەر باسی هەنجیری لە لا بکەی، زاری پڕ دەبیٚ لە ئاو. وەك بۆیان گێڕامەوە بە گۆچانی دە سەبەتە هەنجیرەکانی کوتاوە وەك دە کۆپەینی کوتیٚ. جا وەرە، ئەو هەنجیرانەم ئەمن بە دەستی خۆم ڕەنیٚو هێناون و وەك گیانی خۆم ئاگام لێیان بووە، کە چی ئەو بەو شێوەیەی وەڵام داومەوە! دوای ئەو هەڵسوکەوتەی بە ڕاستی ئەمن ناوێرم خۆی لیٚدەم... تەنانەت ئەگەر بشمکوژن، ناوێرم خۆمی نیشان دەم.

ڕوستەم بەگیش لە حاڵێك دا چەنەی وە سەر گۆچانەکەی دابوو گوتی:

ـ ئەوە ڕاستە، وایە. بەو حاڵەی ئەتۆ باست کرد و ئەگەر ئاوای ڕوانیبێتە هەنجیرەکانت، نابیٚ ئەتۆ خۆتی نیشان دەی و قسەی لە گەڵ بکەی، بەڵام ئاخر وەزعەکە مەترسیدارە. ئەو بارۆدۆخە وەك کاتی شەڕی سەربەخۆیی ناسك و گرینگە. دەبیٚ ئێمە عارف سایم بەگ و دەوڵەتیٚ لەو بارودۆخەی بگەیەنین. ئێستا ئیدی شتێك دە گۆڕیٚ دایە، کە تا ئێستا لە مێژوو دا نموونەی نەدیتراوە.

مورتەزاغا نەڕاندی:

ـ ئەمنیش هەر دەمەویست ئەوەی بڵێم! دەمگوت با سەری مارەکەی پان کەینەوە. ئەوە قسەی بابو باپیرانمانە، کە عوسمانییەکان بوون. زۆر پێش ئەوەی حەمەدۆك لەو شاخانەی ئێمە ڕاوڕاوێنیٚ بکا، مرادپاشای گۆڕکۆڵ کە حەمەد بە پیاوی ویش نەدەبوو، پەیدا بوو. مراد پاشا خێرا، وەك برووسکەی، گۆڕی هەڵدەکۆڵێن. لە کێوەکانی توورووسی، لە دەشتی چووکووراوایە و هەتا سیواس و مالاتیاش، بەردی لە سەر بەردی نەدەهێشت، دەگەڕا و سەری هەموو مارەکانی دەپەڕاند! جا ئیدی مەڵیٚ ئەو کابرا پیاوچاکە ئاقڵ نەبوو!

خەلیل بەگی گەورە هەولّی دا قسەکەی ببڕێ، بەلاّم مورتەزاغا بە وەی توورە بوو:

ــ هەموو خەتای تۆیە کە ئێمە تووشی ئەو دەردەسەرییانە دەبین! هەر ئەو کاتی کە عەبدیخانی مالّوێران کوژرا، ئەمن گوتم کە دەبێ ئێمە وشیار بین... گوتم ئاگاتان لە خۆتان بێ و ئەو کاتی مارەکە چکۆلّە بوو!

خەلیل بەگ زۆر بە لەسەرەخۆیی گوتی:

ــ ئەوانە هەموو حیکایەتن. دەبێ ئێمە ئەو کێشەیەی چارەسەر بکەین کە ئێستا دە گۆڕێ دایە. دەبێ ڕێگایەك بدۆزینەوە.

مورتەزاغا کە لە حەیفان وە هەناسەبڕکە کەوتبوو، سینگی هەر دەفی دەدا، ڕەگی ملی هەستابوون و چاوی لەژێررا هاتبوون، گوراندی:

ــ دە لێمانگەڕێ با بیدۆزینەوە. وا دیارە نازانی ئەمن پیاوم لە شاخی هەن!

خەلیل بەگ قاقا پیکەنی:

ــ مەبەستت ئەو شەلەی هاوڕێتە؟

بەلاّم زوو پێکەنینەکەی بڕییەوە، گرژ بوو و گوتی:

ــ مورتەزا، ئەتۆ نازانی و دەبێ وشیارت بکەمەوە، کاتێك ئەتۆ یەکێك لەو مارانەت دە باخەلّی خۆت دا ڕاگرتوە، ئیدی ئەو قسانە بۆ دەکەی؟ با پێت بلّێم، ئەمن هیچ ئەو شەلە لەبنەوەبڕەم خۆشناوێ. ئەمن بە تەواوی هەست دەکەم کە سەرەهەودای هەموو ئەو داستانانە دەگەنەوە لای وی...

مورتەزاغا لە تووڕەییان دەرپەڕی، تفی دە عەرزی کرد و بۆلّەیەکی لێهات کە کەسی لێحالّی نەبوو. پاشان هێندەی گوڕاند کە ئیدی ماندوو بوو و لە جێگای خۆی بۆی کەوت:

ــ ئێوە تەنیا ئێرەییم پێدەبەن. ئێرەیی بەو پیاوە بە وەفایەشم دەبەن. ئەو کابرایە بۆ من وەك برا وایە. قەلاّی منە! پارێزەری منە! کەسێکە حەمەدۆك تەنانەت ناوێرێ چاو لە سێبەرەکەشی بکا. هەزار حەمەدیش بن، باکی لێیان نیە! ئەوەش بۆخۆتان دەزانن کە...

شارەدار هەولّی دا ئەهوەنی بکاتەوە:

ــ تکایە خۆت نارەحەت مەکە. تووڕەبوون لە تۆ ناوەشێتەوە، مورتەزابەگ! خەلیل بەگ مەبەستی ئەوە نیە گالّتەت پیبکا...

سەرەنجام مورتەزا هەستی کرد کە ناچارە داوای لێبووردن بکا. تەواوی لەشی وەسەر نارەقەی گەڕابوو:

ـ ببوورن، مەبەستم ئەوە نەبوو... خەلیل بەگ دۆستێکی چاکە، لە برام لێم نێزیکترە، دەزانم هەرگیز خراپەی بۆ من ناوێ... دۆستان، گرفتەکە زۆر گەورەیە، تەنانەت مەسەلەی مەرگ و ژیانە، هەر لە بەر ئەوەش بوو کە من ویستم ئاگادارتان کەمەوە. لە بناخە دا بوون و مانی ولاتی ئێمە دە مەترسی دایە. ئێستا هەموو کەس ناوی حەمەدە و ڕەنگە ئێستا شوێنەواری ئەو شتەی لە سەر ئایندە زۆر بەرچاو نەبێ، بەلام باوەڕ بکەن مەسەلەکە گرینگ و جێگای تێڕامانە. شتی لە وەش ترسێنەرتر هەیە: دەلێن لاوە چەتەکان لە دەستەی حەوت کەسی دا خۆیان ڕێکدەخەن. هەموو دەستەکانیان حەوت حەوتن، کەس نازانێ لە کوێڕا دێن، هەموو سەرتاپێ چەکدارن. تفەنگ، ڕەشاش و نارنجۆکیان پێن و دەچن لە شاخی ڕەگەلێ حەمەدۆکی دەکەون. دەلێن هەموویان یەك شێوە هەلسوکەوتیان هەیە، ئامانج و شێوەی ڕێکخستن و بەڕێوەبردنیان یەکە، ڕەنگی موویان یەکە، ڕەنگی دەست و چاویشیان هەریەکە و لە هەموو شتێکی سەیرتر ئەوەیە کە هەمووشیان ناویان حەمەدە. هەر خودا دەزانێ بۆ؟ ئەوان کە دەچنە لای حەمەدۆکی پێیدەلێن: هاتووین بە قسەی تۆ بکەین و دەستووری تۆ بەڕێوە بەرین! پاشان حەمەدۆکی تاوانبار و مەلا فەرهاد لە شاخی فێری تەقەکردنیان دەکەن و دوای ئەوەی بە چاکی فێرە شەڕ بوون، بە چیاکانی توورووسی دا بلاویان دەکەنەوە! ئێستا ئەوان لە هەموو زنجیرە چیای توورووسی هەن و زۆر کەس لە کێوپارەی تووشی دەستەی حەوت کەسیی ئەو حەمەدانە بووە و دەلێن هەموویان وەك یەك دەچن، هەموویان وەك یەك ئازان و هەمووشیان ئەنگێوەیەکن گوللەی نابوڕن. دەلێن چاوی قورینگی لە غاردانێ دا دەنگێون. ئەوان ڕێگاکان دەگرن، ڕێبواران ڕووت دەکەن و هەر کچێکیان وەگیر کەوێ دەستدرێژی دەکەنێ. یەك مالە دەولەمەندیش لە شاخی نەماون و هەموویان هەلاتوون و لە ترسان هاتوونە دەشتێ کە پێیان وایە هێمنترە! ئەمن تەنیا دەمەویست لەو شتانە ئاگادارتان بکەمەوە و هیچی دی. ئێستا سوپاستان دەکەم کە ئاوا بە باشی گوێتان لێڕاگرتم. بەلام داواتان لێدەکەم و بە دلێش چاوەڕوانیم لێتان هەیە کە قسە بە عەلییە شەلی برام نەلێن، چونکە بە ڕاستی لە گیانی خۆشم خۆشتر دەوێ...

لێرە دا مورتەزا دەستەکانی هاویشتنە پشت چۆکان، تێکیبەزاندن و یەکە بە یەکە دە چاوی هەمووانەوە ڕاما.

خەلیل بەگی گەورە گوتی:

ـ ئەمن لە پێش دا، لە قوولایی دلمەوە سوپاسی مورتەزاغای بەڕێزمان دەکەم کە زۆر بە جوانی لەو گرفت و کێشانە کە بەرۆکیان پێگرتووین، ئاگاداری کردینەوە. بەلێ، بارودۆخەکە بە ڕاستی دژوارە و و پێش ئەوەی وای لێبێ دەروەستی نەیەین، دەبێ بەپیرییەوە بچین و ڕێگاچارەیەکی بۆ

ببینینەوە. دەی با بە ڕاستی قسە بکەین. ئەوەی دەزانین کە نابێ نە چاومان لە وە بێ عارف سایم بەگ یارمەتیمان بکا و نە دەوڵەت. ئەوان یارمەتیمان ناکەن و هەر دەربەستی وەش نین کە لەو شاخانە چ ڕوو دەدا. ناشزانم داخوا دەتوانین پێتەخت بێنینە سەر ئەو باوەڕە کە بارودۆخی کێوپارەی ئاوا خراپە؟ تەنیا هومێدمان لای خۆی عارف سایم بەگ بوو کە نوێنەرمانە، بەڵام ئەوە ئەو ئاوای پشت تێکردووین. بە ڕاستی نازانین بێ ئەوەی لە پێش دا لە گەڵ وی قسە بکەین، چۆن ناوەند لە گیروگرفتەکە بگەیەنین. ئەگەر تێلگرافێکی بۆ وەزیری نێوخۆ بنێرین، پێش هەموو کەس عارف سایم بەگ لێی ئاگادار دەبێ و هەر وەتر ئەگەر بۆ مستەفا کەماڵ پاشا، عیسمەت پاشا و مارشاڵ... بە هەر حاڵ بۆ هەرکەسی بنێرین، ئەو لە هەمووان زووتر پێ‌دەزانێ.

زولفۆ گوتی:

ـ بەڵێ بە دزی وی تێلگراف بەرێ‌ناکرێ و شکی تێ‌دا نیە ئەو هەر دەزانێ. بەو شێوەیە تەنانەت ئەگەر خەڵکی ئەو شارەش هەموویان ناوی خۆیان بنێن حەمەدۆك، دیسان هەر نابێ بێ‌پرسی وی تێلگراف بەرێ بکەین.

ڕوستەم بەگی مامۆستای فێرگە گوتی:

ـ باشە با بۆخۆمان لە بەرامبەر دوژمنەکەمان دا ڕاوەستین. پێشتریش خۆ ئاوامان کردوە... با شتێکتان بۆ باس بکەم دۆستان و بەڕێزان! سوڵتانۆغڵی‌یە زەردە کە ئاغایەکی گەورەیە و زەویی یەکجار زۆرە، دیارە بە قەد شایەکیش بە دەسەڵاتە، هێزێکی بە دژی حەمەدۆکی دروست کردوە و پیاوەکانی وی خەریکن ئەو شاخانە بە دەستەی ئەو چەتەیەی تەنگ دەکەن و گوشارێکی باشیان بۆ هێناون.

مورتەزاغا قاقا پێکەنی:

ـ هەیماڵتە ئاغا! ئەو خەبەرە کۆن بووە! هەر دوێنێ شەوێ دەستەی حەمەدۆکی تاقیان لە پیاوەکانی سوڵتانۆغڵی بڕیوە. هێندەیان لێ‌کوشتوون، قەلودالی توورووسییش بە گۆشتی ئینسانی قایل نین. سوڵتانۆغڵی بۆخۆشی کونەمشکی لێ‌بۆتە قەیسەری و لە کەلێنیکی دەگەڕێ، خۆی تێ‌دا بشارێتەوە!

ـ جا ئەگەر وا بێ ئیدی وەزعەکە هەر زۆر نالەبارە...

ڕۆستەم بەگی مامۆستا چرژا و ترس و دڵەخورپە لە ڕوخساری دا وەدەرکەوت. بە ئاشکرا لێوی لەرزین و بە ئەسپایی، بێ‌ئەوەی دەنگ بەرز کاتەوە، گوتی:

ـ پێشنیارێکم هەیە!

شارەدار گوتی:

ـ فەرمووبزانین چ پێشنیارێك؟

ـ بەڕێزانم، ئەوە کە هەموو لاو و مێرمنداڵێك ناوی خۆی ناوە حەمەد، بەلایەکە تا ئێستا لە نۆسەد ساڵی ڕابردوو دا نموونەی نەبووە. بە بڕوای من ئەوە ئیدی چەتەگەری نیە و سەرەتای دەستپێکردنی شۆڕشێکی گەورە و بەرینە. ئەو دەستە گەڕۆکانە کە ئالای ئەو شۆڕشەیان هەلکردوە و لە دەوری ناوێك کۆ بوونەتەوە، بە خۆڕایی نیە و ئەوە دەگەیەنێ کە کۆمەڵی مرۆڤایەتی خەریکە تووشی بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕانەی پڕ مەترسی دەبێ. ئەویش چ بزووتنەوەیەك! بزووتنەوەیەك کە دوای بزووتنەوەی سپارتاکووسی تا ئێستا دنیا بە خۆیەوە نەدیتۆتەوە! وێ دەچێ ئەوانە تێکبشکێن، چونکە بە هیچ شێوەیەك بۆ وەرێخستنی شۆڕشێکی ئەوتۆ ئامادەکارییان نەکردوە. دەمەوێ بڵێم کە ئەمن زۆر کتێبم لەو بوارانە دا خوێندوونەوە. ئەوەی ئێمە پێیدەڵێین خەڵك، زۆر شتی وا دەزانن کە ئەوان هەر ڕێشی تیّ‌تابەن، بەلام ئەو تۆوەی ئەوان ئەمڕۆ دەیچێنن، لە عەرزی دا شین دەبێ، ڕیشە دادەکوتێ و سەرەنجام ڕیشەکان وا بەهێز دەبن کە هیچ‌کەس پێی‌هەڵناکێشرێن. حەمەدۆك و هاوڕێیانی و ئەوانەش کە دواتر تێکەڵی دەستەی وی دەبن، چاك دەزانن کە لەوانەیە زۆری پێ‌نەچێ تێکبشکێن و بکوژرێن، بەلام پێشبینیی ئەوەش دەکەن کە ئەو تۆوەی ئەوان دەیچێنن، وا دەچێ دە دڵی عەرزییەوە، کە هیچ کەس ناتوانێ دەری‌بێنێتەوە و نەیەڵێ ڕەگاژۆیە بکا. ئاخرەکەشی ئەوان ئەو دنیایەی سەروبن دەکەن... ئەو هەموو جووتێرانە کە ناوی خۆیان دەنێن حەمەد و هەر بەو ناوەش دەستەکانیان پێکدێنن و خۆیان ڕێکدەخەن... بە ڕاستی جێگای ترسن و ئەمن لەوە دەترسم کە لە ئەنکەرە کەس لەو مەترسییەی نەگا و نەزانن چ بیر و مەبەستێکی سامناك خەریکە بۆ دوارۆژ ڕیشە دادەکوتێ...

خەلیل بەگ کە ڕەنگی پەڕیبوو وەلامی دایەوە:

ـ بەڵێ، بە ڕاستی بەدبەختی‌یەکی گەورەیە. لە سەر عەرزێکی ڕاوەستاوین، کە بنی مینڕێژ کراوە.

یاوەر کە سوور و شین هەڵگەڕابوو، گوتی:

ـ ئەتۆ بارودۆخەکەت زۆر بە جوانی بۆ ڕوون کردینەوە و جێگای پرسیارت نەهێشتەوە. ئەمن دەسبەجێ هێزێکی باش سازدەکەم و دەی‌نێرمە سەریان. فەرماندەری ئەو هێزە نوێیە ئەفسەرێکی جحێڵە و عەلی‌کەرتیشیشیان بۆ بەلەدییە ڕەگەڵ دەخەم. ئەو جووتێرانە دەبێ تی‌بگەن ئەوە کە هەموو خۆیان کردۆتە حەمەدۆك، چۆنیان لە سەر دەکەوێ! سەرهەنگ، خودا ڕاوەستاوی کا، دەستەیەك ژاندەرمە و هێندێك فیشەك و پێویستیی دیکەی بۆ ناردووین. بەڕێزان، ئێوە نابێ بترسن، لە چی دەترسن؟ تەنانەت ئەگەر ئەو حەمەدانە، ئەو برسی‌یە لەڕولاوازانە کە هەر یەسك و پێستن، ئەوەندەش زۆر بن، کە نەك هەر

شاخەکانی توورووسی، بەڵکوو هەموو دنیاش پڕ کەن، دیسان هەر بە سەریان دا سەردەکەوین و تەفروتوونایان دەکەین. چۆن پیاو سەری ماری پان دەکاتەوە، هەر بەو شێوەیەش ئێمە سەری وان پان دەکەینەوە. هەر وەك جەنابی شارەدار گوتی بێ‌تەوەی پێتەخت ئاگادار بکەین، دەتوانین بۆخۆمان ئەو کارە جێبەجێ بکەین. ئەگەر هەتا ئێستا نەمانتوانیوە کۆتایی بەو گرفتە بێنین، لەبەر ئەوە بووە کە ژاندەرمەمان کەم بوون، بەڵام ئێستا ئیدی هێزی تەواومان هەیە و بڕیاری کارەکەشمان داوە. دڵنیا بن زۆری پێ‌ناچێ کە سەری ئەو چەتانە بە دارەتووەکەی نێو بازاڕییەوە دەبینن...

ئەو قسانەی یاوەری هێندێکی دڵخۆش کردن و تا ڕادەیەکی زۆر ئارام بوونەوە.

ـ یاوەر ڕاست دەکا!

ـ هەر زەبرێکی توندیان وێ‌کەوێ، ئیدی خۆ ناگرنەوە...

ـ ئەو کاتی دان بە ناوی ڕاستی خۆیان دا دێنن!

ـ تەنانەت حاشا لە بیروباوەڕی خۆشیان دەکەن!

ـ لێدان و کوتانی سەرجووخە عەلی کەرتیشی کاری خۆی دەکا...

ـ عەلی دەبێتە هەورێکی ڕەش و بە سەر تووروووسی دا دەڕژێ...

ـ وایان لێ‌دەکا هەموو دار، بەرد و تەنانەت چۆمەکانیش هاوار بکەن و بڵێن" ئەمن حەمەد نیم"!

ـ دەماریان دەردێنێ!

ـ وەڵڵاهی وایان لێ‌دەکا کە هەتا دنیا بە دنیایە کەس نەوێرێ منداڵی خۆی ناو بنێ حەمەد و تەنانەت محەممەدیش! ئەگەر لە شاریش تووشی کەسێکی بن و لێی‌بپرسن ناوت چی‌یە، بڵێ حەمەدم، کلکیان دە نەڕەی پشتیان دەگرن و هەتا گوێیان دەگیرێ هەڵدێن!

بەو قسانە یاوەر ئەوەندە هەڵمسا و لەخۆبایی بوو، دەت‌گوت هەر ئێستا لە شەڕێکی گەورە دا سەرکەوتوە. هەستایە سەر پێ و گوتی:

ـ بەڕێزان، لە سەر ئیزنی ئێوە هەر ئێستا فەرمان دەدەم هێزەکانمان بۆ بەڕێوەبردنی ئەو ئەرکەی وەرێ‌کەون!

ـ سەرکەوتوو بن، ئیشاڵڵا هەنگاوتان پتەو بێ و بە سەر دوژمن دا زاڵ بن!

هەموویان هەستانە سەر پێ و بە نیشانەی سوپاس و پێزانین دەستی وی‌یان دە نێو دەستی خۆیان گرت. یاوەر خواحافیزی کرد و و وەدەرکەوت. دوای وی ڕوستم بەگ دانیشتنەکەی بەجێ‌هێشتت. کاتێك ڕۆیی چاوی بەردابوونەوە و بیری دەکردەوە. وا دیار بوو زۆر شایی بە قسەکانی یاورەری نەبوو.

ئەوانی دیکە دڵنیا بوون کە یاوەر هەر وەك گوتبووی دەتوانێ دەماری حەمەدەکان دەربێنێ و ئەو گرفتەی چارسەر بکا. دەیانگوت ئێستا کە یاوەر هێزی زیاتری بە دەستەوەیە و بۆخۆشی ئاوا لە سەر برینەوەی ئاسەواری حەمەدان شێلگیرە، ئیدی کارەکە جێبەجێ دەبێ و جێگای نیگەرانی نیە. هەر بۆیەش کە هەستان هەموویان چوونە چێشتخانەی نەزیفۆغڵی و بەو شێوەیە شەوەکەیان بردە سەر.

نیوەشەوێ مورتەزاغا هاتەوە ماڵێ. حوسنی خانم بە نیگەرانییەوە چاوەڕوانی بوو. داستانی حەمەدەکان ئەویشی نیگەران کردبوو، بەڵام نەیدەزانی بۆ ئەو بەزمە پەیدا بووە. هەر ئەوەندەی دەزانی کە خەڵکی شاخی هەموویان تەنانەت پیری سەد ساڵەشیان ئەو ناوەی لە سەر خۆی داناوە. باشە یانی چی؟ ئەوە چ سوودێکی هەیە؟ بەڵام هەرچۆنێك بێ ئەوە پێوەندیی بە خۆیانەوە هەیە، با ناوی خۆیان بنێن حەمەد، ئەحمەد یان هەر ناوێکی دیکە کە بۆخۆیان کەیفیان پێ‌دێ! ئەوە بە خەڵکی دیکە چی؟ چ زیانێك بە خەڵکی شاری دەگەیەنێ؟ ئەو خەڵکە بۆ هێندە لەو شتەی دەترسن؟

مورتەزا هاواری کرد:

ــ بارودۆخەکەمان زۆر خراپە خانم گیان! ئەوانەی ئەمن پێشبینیم کردبوون و هەمیشە دەمگوتنەوە، ئەوە هاتنە دی. ئەوانە ئەو کاتەی من هاوارم دەکرد کە بەڵایەکی گەورەمان بە سەر دێ، قسەکەمیان بە هێند نەگرت و ئێستا کە هەموو خەڵك ناوی حەمەدە، کونەمشکیان لێ‌بۆتە قەیسەری و نازانن بچنە بن داوێنی چ شێخ و پیاوچاکێکی! ئەوانە ئەوەندە گەوجن، دە قسەی ڕوستەم بەگیش نەگەیشتن. ئەو کابرایە نموونەی لە مێژوو بۆ هێنانەوە، بۆی بەراوەرد کردن و پێی‌گوتن ئەو بارودۆخەی ئێمەی تێ‌داین، چەندە ناسك و دژوارە! بەڵام تێی‌نەگەیشتن و گوێیان نەدایە... ناوێرن پێتەخت تێبگەیەنن کە لێرە چ ڕوو دەدا. کوڕە وڵاتەکەشمان تێ‌دا چوو! تەواوی کەلێن و کولێنی تووڕووسی پڕ بوون لە حەمەد...

حوسنی خانم گوتی:

ــ دەی باشە جا ئەوە چییە؟ با هەموو ناوی خۆیان بنێن حەمەد، یان هەرچییەکی پێیان خۆشە... با ناوی خۆیان بنێن عیسمەت پاشا... چ دەبێ؟

ــ چۆن... زۆر خراپتر دەبێ! ڕوستەم بەگ ئاکامی ئەو دیاردەیەی چاك بۆ لێکدانەوە، وای بۆ ڕوون کردنەوە، هەموویان لە ترسان لەخۆ میزتن. قسە لە تۆوەکەیە. دەزانی تۆوی چی؟ ئەوان تۆوەکەی دەچێنن. تۆوەکە ڕەگاژۆیە دەکا و بە کەس هەڵناکێشرێ، شین دەبێ و هەتا نێوەڕاستی قووڵایی عەرزیش ڕیشەی دەچنە خوار! تۆوەکە، خانم گیان، تۆوەکە!

ــ بۆ خاتری خودای ئەوە چ چەشنە تۆوێکە؟

ـ تۆوی حەمەدۆکی خانم.. ڕوان و هەڵدانی ئەو تۆوەش نەمانی ئێمە و سەروبن بوونی ماڵ و دەسەڵاتی ئێمەی لە گەڵە.

حوسنی خانم تێنەگەیی بە ڕاستی ئەوە چ نەوعە تۆوێکە کە لە حەمەدەکان دەڕژێ. لە سەریشی نەڕۆیی... زۆریش جیاوازیی نەبوو کە ئەو تێیبگا، یان تێینەگا، هەر ئەوەندە هەستی بە ترسێك لە دەروونی خۆی دا کرد، کە نەیدەزانی چی‌یە و بۆچی دەبێ هەبێ: مورتەزاغا هێندێك زیادی خواردۆتەوە و ڕەنگە سبەینێ کە دێتەوە سەرەخۆ بە تەواوی بۆی ڕوون کاتەوە کە ئەو تۆوە ژاراوی‌یە چی‌یە. بەڕاست... عەلی‌یەشەلیش ئەمڕۆ هێندێك گۆڕابوو و دە فکر دابوو. ئەها، لەوانەیە ئەو ئاڵۆزی‌یەی ویش پێوەندیی بەو تۆوە ژاراوی‌یەوە هەبێ، کە هێندە لە عەرزی دا ڕەگاژۆیە دەکا. بڵێی حەمەدۆك هێرش بکاتە سەر شاری؟ بڵێی ئەگەر ئەوەی بکا، ماڵیان تاڵان بکا و هەموویان بکوژێ؟ هەرچەندی بیری کردەوە بە هیچکوێ نەگەیی. ئەری خۆ بە ڕاستی نابێ ئەوەندەش لەو کوڕە جووتێرەی بترسن. بابی من قەت ئاوا نەبوو. دەی با چی‌دی بیری لی‌تەکەمەوە.

خانم ئیدی هێندەی بیر لەو مەسەلەیە نەکردەوە، بەڵام پیاوەکان ساتبەسات نیگەرانتر دەبوون و زیاتر دەترسان.

ـ عەلی‌یە شەل لە کوێیە؟

ـ لە ژوورەکەی خۆیەتی، نوستوە.

ـ چۆن دەتوانێ لە ڕۆژێکی وەك ئەمڕۆ دا بنوێ؟ کاتێك وڵات پڕ بووە لە حەمەد و ئێمە لە ترسان وەك مێژۆکەی دەلەرزین. لە ڕۆژێك دا کە ئێمە خەریکین لە دەریایەك خوێن دا نوقم دەبین و ڕیشەی تۆوەکەش گەیشتۆتە نێوەڕاستی قووڵایی عەرزی؟

ـ خۆت ناڕەحەت مەکە، ئاغا گیان، ئەمشۆ کاتێك ئەتۆ لە خەوێ دا بووی، ئەو بەستەزمانە دەمانچەی ڕووتی بە دەستەوە بوو، تفەنگە ماوزەڕەکەشی بە شانی‌یەو بوو و کێشکی لە ئێمە دەکێشا. لە سەری شەوێوە هەتا بەیانی هەر چاویشی لێکنەناون. نیوەشەوێ هەستام، ئیستیکانە چایەکم دایە. بە ڕاستی ئەو برا دڵسۆزەی تۆ بۆ تۆ زۆر بەکەلکە...

مورتەزاغا بە ئەسپایی دەرگاکەی کردەوە:

ـ عەلی گیان، برای خۆشەویستم!

ـ عەلی ڕاپەڕی، دەستێکی بە شتومەکەکانی بەری داهێنا و دەسبەجێ هات لە پێش ئاغای ڕاوەستا. هەر بە جلەوە نوستبوو و شەوێش گوێی لە قسەکانی ئاغا و خانمێ ببوو. دەمانچەکەی هەر بە قەدی‌یەوە بوو.

ــ کاکه عەلی، خەوت لیٚ‌کەوت؟
ــ بەڵێ، وێژینگێکم دا...
مورتەزاغا نەرمتر و دۆستانه تر گوتی:
ــ ئەمشەویش هەر نه نوستی؟
ــ دوێنیٚ به ڕۆژ نوستم، ئاغای گەورەم.
لەوەتا هاتبۆوه و له ویٚ دەژیا، ئاوا نێوانیان خۆش بوو. هەم ئاغا، هەم حوسنی خانم و هەم ئەوانی دیکەش که له ماڵیٚ دا بوون، ڕێزێکی زۆریان بۆ عەلی دادەنا. وای لیٚ‌هاتبوو بۆخۆی هەستی به چەشنه گوشارێك دەکرد و ئەو هەموو ڕێزگرتنەی به زێدەڕەوی دەزانی. تەنانەت ئامادە بوو واز له کوشتنی ئاغاش بێنیٚ. جاروبار شەرمی دەکرد که لەو ماڵەی ئەو هەموو ڕێز و پیٚ‌ڕاگەیشتنەی دەدی، بەڵام ئەو هەر دژی مورتەزای بوو. هەر نەبیٚ شتێك زۆر ڕوون و ئاشکرا بوو. وەك چۆن دایه حۆری حەمەدی خۆش‌دەویست، حوسنی خانمیش ئەوی خۆش‌دەویست و ئامادە بوو له پێناوی خۆشی و ئاسایشی وی دا هەموو کارێك بکا! دەیزانی چ چێشتێکی پیٚ‌خۆشه، بۆخۆی بۆی لیٚ‌دەنا. ناوی هەموو منداڵەکانی و تەمەنیشیانی دەزانی. هەموو جاری دەچوو پارچەی باشی بۆ دەکڕین، به دەستی خۆی جلی بۆ دەدروون، گیرفانەکانیشی بۆ پڕ دەکردن له پووڵ و بۆی بەریٚ‌دەکردنه دیٚ. پێنج کولێجه و پێنج کراسی ئاوریشمی هەره باشی بۆ ژنەکەی کڕیبوو و بۆی ناردبوو، بەڵام ئەوه چاك بوو که هەتا ئێستا چاوی بەو ژنه پلتۆخەی نەکەوتبوو. خانم تەنانەت نۆکەرێکی خۆی ناردبوو له ئەدەنەی سیٚ جووت کەوشی پانیەبلێندیشی بۆ کڕیبوو. هەموو سەری مانگان کوللێرەشەکری و کێك و شیرنیاتی هەره خۆش و نایابی دەکڕی و بۆ منداڵەکانی عەلیی دەنارد. به کورتی پیاوێك هەمیشه له بەینی ماڵی خانمیٚ و گوندەکەی عەلی دا ده ڕێیه دا بوو و شتی بۆ دەبردن. له ماڵێش هەموو قەدری عەلی‌یان له سەر چاوان بوو و هەرچی ویستبای، بۆیان جێبەجیٚ دەکرد. هێندەی له گەڵ چاك بوون، که ئیدی عەلی وای لێك‌دەداوه که ئەوان به ڕاستی خۆشیان دەویٚ و ئەو کارەیان له بەر بەرژەوەندیی خۆیان نیه، هەرچەند ئەو ڕێویەیه بیره شەلە قەت دۆست و دوژمنی لیٚ‌تەدەگۆڕا. وردە وردە ئەو حاڵوهەوایه دەبووه هۆی ئەوه که کۆنەرقێك که عەلی له زووەوه بەرامبەر به ئاغای له دڵی دابوو، بڕەویٚ. بۆخۆی ئەوەی نەدەویست و له بەرامبەر هەستی خۆی دا ڕادەوەستا. هێندێکی شەرم دەکرد: ئاخر هەرکەس له جێی وی بایه، ئەو هەموو قەدرەی گیرابا و ئاوا چاکەی له گەڵ کرابا، چۆن له جیاتیی وەی له سەر بەلێنی خۆی سوور بیٚ و ئەو کابرایەی بکوژیٚ، که ژنێکی میهرەبان و دڵسۆزی وەك حوسنی خانمێ هەیه، پارێزگاری لیٚ‌تەدەکرد و تەنانەت گیانی خۆشی له ڕێی دا فیدا نەدەکرد. به ڕاستی ئەو بیره ناکۆکانه ئاڵۆزیان کردبوو. هێندێك جاران بیری دەکردەوه: ئاخ، بریا هەر ئەو شەوەی حەمەد ئاغای کانی‌یه گوڵانی دەکوشت، لیٚمگەڕابا مورتەزاغاشی کوشتبا. ئەی چی؟! گوللەیەکی لیٚ‌دەدا، ئەمنیش ئیدی ئاسوودە دەبووم و پێویست نەدەبوو ئێستا

ئاوا ڕەنج بکێشم. نەخێر ئەو بابە لەو کونەیەوە بێ، دڵم بەرایی نادا بی‌کوژم و دیارە ئیدی هەم خەجاڵەتی خۆم دەبم و هەم دەبمە گاڵتەجاڕی عالەمێش!

ــ عەلی گیان دەزانی خەریکە چمان بە سەر بێ، براگیان! دەزانی چ بەدبەختی‌یەکمان دە ڕێ دایە؟ دەبێ هەواڵی حەمەدەکانت بیستبێ!

ــ بەڵێ، ئاغا بیستوومە.

ــ ئەتۆ چۆنی بۆ دەچی؟ ئەوە چ بەزمێکە؟

ــ وەڵڵاهی باش نازانم... ڕاستی‌یەکەی ئەوەیە کە ئەمن پێم‌وانیە ئەوە هێندە جێگای ترس بێ. باشە تەنانەت ئەگەر هەرچی دەو دنیایەش دا هەن، بە باڵندە، مێشومەگەز، مێرووله و ماسیشەوە ناوی خۆیان بنێن حەمەد، دەبێتە چی؟ ئەوە کوێی گرینگ و ترسێنەرە؟ جووتێرەکانی ئەو شاخانەی ئێمە هێندێك خۆشن. یەکێکیان بۆلای ڕاست بچێ، هەموویان دەچنە لای ڕاست! هەر ئەوەندە یەکیان ناوی خۆی نا حەمەد، ئیدی هەموو دەبنە حەمەد!

ــ خانم، بڵێ دوو چامان بۆ بێنن. ئەگەر عەلیی برام قاوەی دەخواتەوە، با قاوەی بۆ وی بێنن.

حوسنی خانم بۆ خۆی چای بۆ هێنان. مورتەزا درێژەی بە قسەکردن دا:

ــ عەلی ئەتۆ لە هەڵە دای، چونکە وەزعەکە ڕۆژبەڕۆژ خراپتر دەبێ. بۆخۆت ئاگاداری ئەمن هەمیشە ئامۆژگاریم ئەوە بووە کە دەبێ وشیار بین! کاتێك گورگ دمی گەیشتە خوێنی و کەر تامی توێکڵەشووتی کرد، ئیدی درەنگە! هەر بە خۆت دەڵێم، تۆخوا چەند جار هاوارم کردوە و ئەوەم دووپات کردۆتەوە؟ چەند جارم گوتووە کە بابە ئەی هاوار مار هەتا چکۆڵەیە دەبێ سەری پان کەیەوە؟

چاوی دە چاوی عەلی بڕی و چاوەڕوانی وەڵام بوو.

ــ ئاغا ڕاست دەکەی هەم ئەمن و هەم هەموو خەڵکی دیکەش ئەوەی دەزانین...

ــ ئێستا بۆخۆیان دەبینن کە بە هۆی نەزانیی ئەوانەوە هەموومان ماڵوێران دەبین و منداڵەکانمان هەتیو دەبن...

مورتەزا لێرە دا ڕەنگێکی هێنا و برد و سەری بەردایەوە. دەتگوت هەناسەی سوار بووە. پاشان دیسان چاوی لە چاوی عەلی کردەوە، وەك ئەوەی کە بیەوێ نیشانەی دڵسۆزی و هاودەردیی دە چاوی وی دا ببینێ.

ــ دەزانم ئەتۆ ئەمنت خۆش‌دەوێ، عەلی!

حوسنی خانم لێرە دا وە قسە هات:

ـ ئەوە دەڵێی چی ئاغا؟ دەی ئەوە ڕوون و ئاشکرایە کە ئەتۆی خۆش دەوێ! بۆچما ئەو لە جێی برای تۆ نیە؟

ـ ئاغا، ئەمن ئەتۆم زۆر خۆشدەوێ.

ـ بە دڵ خۆشت دەوێم؟

ـ بەڵێ.

ـ ئەوەم دە چاوت دا دی، عەلی. ئەوە یەکەم جارە ئەوەی ئاوا بە ئاشکرا دە چاوت دا دەبینم.

حوسنی خانم گوتی:

ـ لە خۆڕا وا دەڵێی، عەلی هەمیشە ئەتۆی خۆشویستوە.

ـ بەڵێ، ئاغا وایە...

ـ ئامادەی لە ڕێگای من دا خۆت بە کوشت بدەی؟

حوسنی خانم گوتی:

ـ جا ئەوە قسەیە، مورتەزا؟ برا هەمیشە ئامادەیە خۆی فیدای برای بکا!

عەلی لە پێش دا هێندێك زمانی گیرا، وەك ئەوەی شەرم بیگرێ، ئارەقێکی هێنا و برد و گوتی:

ـ هەتا ڕۆژی خۆی دانەیە، بۆت دەرناکەوێ ئاغا.

ـ ئەتۆ ڕاست دەکەی عەلی، کاتێك قسە لە مردن و ژین بێ، پیاو ناتوانێ درۆ لە گەڵ خۆی بکا، چونکوو دوایە مرۆڤ لە بارەگای ویژدانی خۆی دا شەرمەسار دەبێ.

ـ ئەمن گومانم لەوە دا نیە کە عەلی ڕۆژی خۆی لە فیدا کردنی گیانیشی بۆ ئێمە درێخی ناکا.

ـ خودا پشتیوان بێ عەلی، ئەمن باوەڕم بە وەی هەیە هەر وەك چۆن باوەڕم بە خودای هەیە... حەمەدۆك قەت هیچی پێناکرێ...

ـ بە پشتیوانی خوای ئاغا...

ـ وا دیارە ئەتۆ هەر بە منداڵی چاوترسێنت کردوە، وا نیە؟

ـ بەڵی، کاتێك منداڵ بوو، زۆرم لێدەترسا...

ـ چاکت ترساندوە، دەزانم. ئەڵبەت ئەگەر کەسێك بە منداڵی لە کەسێکی ترسا، ئیدی هەتاهەتایە هەر لێیدەترسێ. ترسەکە هەتا مردنێ تەواو نابێ و ئەوەش کاری خودایە... بۆ وێنە هەر ئەمن بۆخۆم ئەگەر ناوی چەتەی دەبیسم، هەر لە ترسان وەختە گیانم دەرچێ... پێتوایە لە بەرچی ئاوام؟

لە نەکاو بێدەنگ بوو، ڕووی بۆ لای حوسنی خانمێ وەرگێڕا و بزەیەکی هاتێ، حوسنیش بزەی هاتێ.

ـ بەڵێ، دەزانی بۆ ئاوا دەترسم؟ چونکە کاتێك ئەمن منداڵ بووم، چەتان سێ برا، دوو ئامۆزا و حەوت کەسی دیکەی تایفەکامانیان کوشت. ئەو کاتی ئەمن هەر شەش ـ حەوت ساڵ دەبووم. کاتێك بیستم، زیڕاندم و بە غاردان چوومە ئەوێ. تەمەشام کرد هەموو تەرمەکان لە وێ کەوتبوون و لە دەریایەك خوێن دا شەلاڵ ببوون. یەکێك لە تەرمەکان چاوی دەرپەڕیبو، تەنیا ڕەگێکی وەك داوە دەزووی پێوە مابوو و بە ڕوخساری مردووەکەیەوە هەڵاوەسرابوو. یەکی دیکەیان مێشکی بە عەرزی دا بڵاو ببۆوە. یەکیان تێ‌دا بوو برینێکی گەورەی دە سینگی ببوو، برینەکە زاری ئاواڵە کردبۆوە، دڵی بە نێو برینەکەی دا دیار بوو و هێشتا لێی‌دەدا... چەتەکان هەر لە وێ بوون و قاقا پێ‌دەکەنین. دەتگوت چاو لە شانۆی دەکەن...

لێرە دا قسەکانی تەواو کرد. لەو بەینەی دا ئارەقەی بە نێوچاوانی دا دەهاتە خوارێ:

ـ قەت نەمتوانیوە ئەو بەسەرهاتە ناخۆشەی بگێڕمەوە، نەمتوانیوە...

دوو دڵۆپ فرمێسك بە سەر ڕوومەتی دا هاتنە خوار و چەنەیان تەڕ کرد. عەلی زۆر بەو بەسەرهاتەی تێكچوو. بە زەحمەت ددانی بە جەرگی خۆی داگرت و هێندەی نەمابوو لە تاوان خۆی بە سەر لاقی ئاغای بکێشێ و هۆڕ هۆڕ بۆی بگری.

حوسنی خانم بێ‌دەنگ دانیشتبوو و حەبەسابوو. ئەو زۆر چاك ئاگاداری بەسەرهاتی بنەماڵەی کاراداغلیسی بوو، بەڵام قەت باسێکی سەبارەت بەو کارەساتە سامناکەی نەبیستبوو. بڵێی مورتەزا هەر ئێستا هەمووی بۆ خۆی ساز کردبێ؟ زەحمەتە، ناکرێ، ئاخر کابرا درۆش دروست کا، خۆ ناتوانێ بە درۆیەکەی خۆی ئاوا فرمێسك هەڵڕێژێ و بگری! بە سەرسوڕمانەوە هەروا چاوی لە زاری مێردەکەی بوو و سەرەنجام کاتێك ئەو گریا، ئەمیش ئەوەندە دڵی پڕ بوو، بە خۆی نەبوو دەستی کرد بە گریانێ. سەیر ئەوە بوو ئەو جار خۆی پێ ژیر نەدەبۆوە. هێندەی نەمابوو سەری بە هەنیسکانەوە هەڵقەنرێ. کاتێك عەلی دیتی حوسنی خانم، ئەو ژنە شۆخە ناسك و نازدارە کە بە ڕاستی شای جوانان بوو، ئاوا دەگریا، خۆی پێ‌ڕانەگیرا و گوتی:

ـ مەگری خانم، تو خوا مەگری... ڕاوەستە با ئەمن شتێکتان پێ‌بڵێم:

فرمێسکەکانی حوسنی خانمێ کتوپڕ، وەك ئەوەی بە مقەستێ قەڵتت دابن، بڕانەوە و ئەویش و مورتەزاش هەردووکیان گوێیان بۆ عەلی شل کرد.

ـ خانم گیان، دەتوانی قورئانەکەتان بێنی؟

حوسنی خانم قورئانی هێنا و دایە دەست عەلی، ئەویش سێ جاران قورئانەکەی ماچ کرد و لە سەر سەری دانا. پاشان سەری داخست و لەسەرەخۆ گوتی:

ـ نازنم بلێم چی... نازانم چۆن ئەو شتەتان بۆ باس بکەم، کە تا ئێستا بە کەسم نەگوتوە؟ نازانم لە بەرامبەر ئەو هەموو چاکە، میهرەبانی و خۆشەویستی‌یەی ئێوە دا چۆن وەڵام بدەمەوە؟ چتان لێ‌بکەم؟ چۆنتان بۆ باس بکەم؟

وەك منداڵانی لێ‌هاتبوو، نەی‌دەزانی بی‌ڵێ، یان نەی‌ڵێ. بڕیاری بۆ نەدەدرا، دوودڵ بوو.

ـ بە ڕاستی نازانم چ بکەم، بەڵام هەر بۆم ناکرێ لێتان بشارمەوە...

مورتەزاغا کە سەری سوڕ مابوو، گوتی:

ـ چۆنت پێ‌باشە، وا بکە، عەلی! بۆچما ئەتۆ برای من نی و ئەو کچەی گەورە تورکمانی دەنگشێری بەناوبانگیش لە جێگای خوشکت نیە؟

ـ خودا شاهید و ئاگادارە کە ئەگەر ئەمن هەستم نەکردبا ئێوە ئاوا ناڕەحەت و نیگەرانن، هەرگیز، هەتا دەمردم، ئەو نەهێنی‌یەم لە لای هیچ‌کەس ئاشکرا نەدەکرد. بەڵام دڵاوالەیی ئێوە، چاکەی ئێوە، قەدر و ڕێزگرتنی ئێوە و برایەتی و دۆستایەتیی ئێوە ناچارم دەکا و هیچ ڕێگایەکم بێجگە لە ئاشکراکردنی ئەو ڕازەی لە لای ئێوە بۆ ناهێڵێتەوە!

سەرەنجام بڕیاری دا. هەستایە سەر پێ و قورئانەکەی لە پێش دانان:

ـ دەستتان لە سەر ئەو کتێبە پیرۆزەی دا بنێن...

هەردووکیان دەستیان لەسەر قورئانەکەی دانا، دەستیان دەلەرزی.

ـ ئەوەی ئەمن دەی‌ڵێم، دووپاتی بکەنەوە...

ـ ئێمە کە دەستمان لە سەر ئەو کتێبەی، کە کەلامی خوایە داناوە، لە خزمەت خودای و کەلامی خودای دا سوێندێ دەخۆین کە ...

هەر دووکیان سوور هەڵگەڕابوون و وە دڵەخۆرپە کەوتبوون. وتەکانی عەلی‌یان دووپات کردنەوە و گوتیان هەتا لە سەر دنیایە مابین، ئەو نەهێنی‌یەی عەلی‌یە شەل لە لای ئێمە ئاشکرای دەکا، لە لای کەس نادرکێنین و هەر لە دڵی خۆمان دا ڕای‌دەگرین...

ـ بڵێن: قەت ئەو نەهێنی‌یەی بۆ کەس ئاشکرا ناکەین، هەتا دەمرین، نە بۆ زیندووانی دەگێڕینەوە، نە تەنانەت بۆ گڵ و بەردیش... ئەو نەهێنی‌یەی دەبێ لە گەڵ خۆمان بەرینە قیامەتێ، لە گەڵ خۆمان بی‌بەینە دە قەبری‌یەوە...

ـ دەبی لە گەڵ خۆمانی بەرینە قەبری‌یەوە...

عەلی هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، هەستی بە چەشنە سووکبوونێکی دەکرد. ڕەنگی پەڕیبوو و دەستەکانی دەلەرزین.

ـ ئێستا با ئەمن سوێندتان بۆ بخۆم!

ئەو جار بۆخۆی دەستی لە سەر قورئانەکەی دانا. هەموو گیانی دەلەرزی و ئارەقە دلۆپ دلۆپ بە نێوچاوانی دا دەهاتە خوار:

ئەمن لە بارەگای خوای سوێندێ بەو قورئانەی دەخۆم کە ئەوەی دەیڵێم ڕاستە و درۆی تێدا نیە!

مورتەزاغا وەخت بوو دڵی بتۆقێ، دەتگوت خنکا، هاواری کرد:

ـ دە بیڵێ و ڕزگارمان کە، دەی شتێکت لە زاری بێتە دەر! ئەمن چیدی تاقەت ناهێنم.

حوسنی خانم قورئانەکەی سێ جاران ماچ کرد و پاشان بردی دە سندووقە تایبەتی‌یەکەی نایەوە. دەسرە ئاوریشمە ڕیشووداره‌کەشی بە سەر سندووقەکەی دادایەوە.

ـ عەلی، قسە بکە...

ـ لە چەند مانگ لەمەو پێشەوە، کوڕی برایمەڕووت و دوونەی کە بە حەمەدۆك بە ناوبانگە، دەستی لە چەتەیی‌یە هەڵگرتوە و لە گەڵ سەیرانی خێزانی و ژنە جیرانەکەیان کە ناوی حۆری‌یە و جادووگەرێکە تای نیە، ئەم وڵاتەیان بە جێ‌هێشتوە، یانی لەو نێوەی نەماوە و پێش ڕۆیشتنیش بە هاوڕێکانی گوتوە کە ئەو ئیدی هەرگیز نابێتەوە چەتە. دەستەکەشی بە مەلا فەرهادی سپاردوە، کە هیچکەس نازانێ کێیە، چ کەسە، لە کوێ ڕا هاتوە و ئینسانێکی چۆنە! تەنیا ئەوەندەی دەزانم کە مەلا فەرهاد موسوڵمانێکی بە بیروباوەڕە و قەت یەك نوێژی ناچێ...

دەو بەینەی دا عەلی بە زەحمەت هەناسەی بۆ هەڵدەکێشرا. مورتەزا و حوسنی خانمیش حەبەسابوون. مورتەزا تفی قووت دا و گوتی:

ـ یانی... باشە... یانی دەتەوێ چ بڵێی، عەلی؟

ـ دەمەوێ بڵێم.... ئەوە یانی حەمەدۆك لەو شاخانە نەماوە!

ـ یانی ئێمە ڕزگار بووین، عەلی؟

ـ بەڵێ بە ڕاستی وایە، ئاغا.

ئاغا و خانم ماوەیەکی باش لە خۆشی‌یان هەر حەبەسابوون، بە حەواوە ڕاوەستابوون و پێ‌دەکەنین.

ـ کوڕە هەر ئەوەندە نیە کە ئیدی بۆخۆمان ڕزگار بووین و لە خۆمان ناترسین، بەڵکوو، شەرەف و نامووس، ماڵ و سامان و تەنانەت گیان وماڵی جیرانەکانیشمان ڕزگار بوون.

ئەو جار وەبیریان هاتەوە بە پێوەن و دانیشتن.

ئەو قسانەی عەلی ئەوەندە چاوەڕواننەکراو بوون، کە جاریٚ بۆ ماوەیەك هیچیان قسەیان بۆ نەدەهات و بیٚدەنگ لە بەرامبەر یەکتر دانیشتبوون. هەردووکیان چەند جار سوپاسی عەلی‌یان کرد. قسەیان، چاولیٚکردنیان و هەموو هەڵسوکەوتێکیان بەرامبەر بە عەلی پڕ لە منەتباری و خۆشەویستی بوو.

ــ عەلی، بە ڕاستی حەمەد نابێتەوە چەتە؟

ــ نەخێر، هەر لە بناخە دا ئەو پێی‌خۆش نەبوو ببیٚ بە چەتە و قەتیش پێی‌خۆش نەبوو خەڵکی بکوژیٚ. دەی‌گوت، ئەگەر ئێمە هەزار ئاغایانیش بکوژین، دووهەزاری دیکەیان دێنە جیٚ و ئەوانی تازەش لە وانی کۆن خراپترن. کە وابوو بارودۆخەکە ناگۆڕیٚ و هەزاریشت کوشت چت بۆ ناکریٚ. ئەمن بەشبەحاڵی خۆم پێم‌وایە حەمەد قەت ناگەڕێتەوە شاخی.

ــ لە زووەوە گوتوویانە "خوویەك گرتت بە شیری تەرکی ناکەی بە پیری". کەسێك بە شتێکی ڕاهات، بۆی تەرك ناکریٚ. شکی تیٚدا نیە دەگەڕێتەوە و دەبێتەوە چەتە!

ــ نە خێر، وا نیە، ناتوانیٚ!

ــ بۆ ناتوانیٚ؟

ــ چونکە خێزانی زگی پڕە. زۆری نەماوە منداڵی ببیٚ. کاتێك ئەوان عەلی‌یە قەلەمیان کوشت، مەلا فەرهاد هەموو پووڵەکەی وی دا بە حەمەدی. دەڵێن ئەو کابرایە ئەوەندەی پووڵی نەغد و زێڕ پیٚبووە کە ئەو شارەی پیٚدەکڕدرا. بیستوومە حەمەد خانوێکی چاکی بە حەسار و باغەوە بۆخۆی کڕیوە.

ــ تا ئێستا ئەمن هەر ئەوەم بیستوە کە کابرای چەتە ناتوانیٚ پاشماوەی ژیانی لە دەشتیٚ و لە ئاسایش دا بەرێتە سەر. تەنانەت ئەگەر گیرفانیشیان هەمیشە پڕ لە زێڕ و زێو بیٚ، ناحەجمن و ئاخرەکەی هەر دەچنەوە شاخی... چەتەیەك لە ئەزمیریٚ هەبوو، ناوی چاکیر جالی بوو. ئەو کابرایە چاردە ساڵان یاغی بوو و لە شاخی ژیا. ئەوەندەی ئاغا و بەگ کوشتبوو، دەی‌توانی لە سەری وان منارەی دروست کا! سوڵتان چوار جارانی بەخشی، زێڕێکی زۆری دایە و ژنیشی بۆ هێنا، کردی‌یە حاکم و تەنانەت پاشاش، بەڵام هەموو جاریٚ چاکیر جالی هەڵدەهات و دەچۆوە شاخی. نەخێر عادەت تەرك نابیٚ! چۆوە شاخی، سەر کار و پیشەی خۆی. خەڵکی ڕووت دەکرد، مزگەوتی دروست دەکردن و هەرچی‌یەکیشی لە دەوڵەمەندان دەستاند، دەی‌دا بە هەژاران. ئاخرەکەی لە چیای کارینجای گوللەیەکی ویٚکەوت و کوژرا.

ــ لەوانەیە وا بیٚ ئاغا، بەڵام من باوەڕ ناکەم حەمەدۆك دوای ئەو هەموو کوێرەوەری‌یەی دیتوویەتی، بگەڕێتەوە شاخی. ئێستا کە هەموو شتێکی هەیە و خۆشی بۆ دەگوزەریٚ، ئەگەر ئەقڵی هەبیٚ، قەت کاری وا ناکا. ئەقڵیشی هەیە. دەزانی زۆر جاران دەی‌گوت چی؟

ــ دەی‌گوت هیچ چەتەیەك تا ئێستا نەی‌توانیوە دەسەڵاتی بە سەر هەموو دنیایە دا هەبیٚ!

مورتەزاغا بە سەرسوڕمانەوە گوتی:

ـ سەیرە، ئەوانەی هەموو زانیوە و چەندین سالّیش یاغی بووە و لە شاخی ماوەتەوە!

ـ ئەو ناچار بوو وا بکا!

حوسنی گوتی:

ـ ڕاستە، چارەیەکی دیکەی نەبووە! بەلاّم عەلیی برامان ڕاست دەکا. پیاو ئەگەر لێی گەڕێن بە ئاسوودەیی دانیشێ و ماڵ و بەڕێچوونی باشیشی هەبێ، شێت بووە بچێتەوە شاخی؟

مورتەزاغا ئەو هەواڵەی زۆر پێخۆش بوو و دیارە هەستی بە هێندێك هێمنایەتیش دەکرد، بەلاّم باوەڕی نەدەکرد و ترسی لە دڵی هەر نەدەچووە دەر:

ـ لە هەرکوێیەك بێ، لە دوای ئابنەوە و نایەڵن بە ئاسوودەیی بژی!

ـ لەو جێیەی ئەو لێی‌دەژی، کەس نای‌ناسێ. دەڵێن ناوی خۆی گۆڕیوە.

بەلاّم مورتەزاغا هەر لە سەر قسەی خۆی بوو:

ـ ئەمن هەر ئەوەی دەزانم، تا ئێستا چەتە نەبووە شاخی بەجێ‌هێشتبێ و توانیبێتی لە دەشتێ هەڵکا. هەرگیز شتی وا نەبووە و نابێ...

ـ ئەتۆ لە هەڵە دای ئاغا!

ـ بۆ؟

ـ با ئەمن پرسیارێکت لێ‌بکەم: لەوەتا ئەو شاخانەی ئێمە هەن، یاغیی دڕتر و سامناکتر لە بایرامۆغڵی هەبووە؟

حوسنی خانم گوتی:

ـ ڕاست دەکا! چەتەی ئازاتر لە ویمان هەبووە؟

مورتەزاغا هێدی بۆوە و گوتی:

ـ وایە، نەبووە.

هێندە ڕەق ڕاوەستابوو، ئێستا نەی‌دەزانی لە سەر کامە قاچی ڕاوەستێ.

ـ دەی خۆ ئەو نەچۆتەوە شاخی و ئەوە چەندین سالّیشە هاتۆتەوە. هەر ئاوڕیشی نەداوەتەوە لای شاخی!

مورتەزاغا لێرە دا وەك لە خەوێکی قورس وەخەبەر هاتبێ، ڕووی دە عەلی کرد و گوتی:

ـ دەزانی عەلی، بە ڕاستی ئێمەش بەزەیی و ویژدانمان نەماوە و بە تەواوی ئەو کابرایەمان لە بیر چۆتەوە، کە لەو پەڕی نەداری و چاولەدەستی دا لە گوندەکەی خۆی دەژی. لە بەردی بن چالاّوێ تەنیا

ترە! دەبێ هەرچی زووتر سەرێکی بدەین. ئەمن پێشتر چووم و سەرم داوە. دە کۆخێکی دا دەژی، سەگ ناتوانێ تێیدا بژی. ماڵەکەی ئەوەندە ڕووتە، کەری لێکەوێ، ددانی دەشکێ! زەوییەکی هەیە، بەڵام پووڵی نیە جووتێك گا بکڕێ و جووتیان پێکا. ڕۆژ هەتا ئێوارێ بە خۆی و ژنەکەی و منداڵەکانی بە پاچ و پێمەڕەی عەرزیان هەڵدەکەند و دەیانکێڵا. کە ئەوم دەو بارودۆخەی دا دی، بە ڕاستی وەخت بوو دڵم بۆی بتۆقێ. هێندێکم قەند و چا بۆ بردبوو. هێندەی پێخۆش بوو، هەر دەستی ماچ دەکردم. جلەکانی بەری هەموو دڕاون و ڕیشۆڵ ڕیشۆڵ بوون... ئێمە دەبێ سەرێکی بدەین. دەبێ هێندێکیشی قەند، چا و شتی دی بۆ بەرین. دەبێ قەند و چای زۆر بۆ بەرین، چونکە ئەو هەر لە کاتی مێرمنداڵییەوە چای زۆر پێخۆش بووە. یا ڕەبی کەس ئاوا نەدار و چاولەدەست نەبێ!

ـ حوسنی خانم چاوەکانی پڕ بوون لە ئاو و گوتی:

ـ ئیلاهی ئامین، چ لە سبەینێ زووتر نیە کراس و دەرپێیەکی بۆ دەدرووم. ئەتۆش مورتەزا دەبێ پانتۆڵە وادماڵەکەتی بۆ دانێی. خۆ بۆخۆت ئیدی دە پێی ناکەی و هەروەها باڵتۆ ئالیپۆکەشت کە لەمێژە هەتە و هێشتا باسکت تێهەڵنەکێشاوە...

عەلیش زۆر دڵی پڕ ببوو:

ـ هەر وەختێکی پێتخۆشە، دەچین سەری دەدەین، ئاغا! ئەمنیش زۆرم پێخۆشە ئەو شێرەپیاوەی ببینمەوە، کە وەك حەزرەتی عەلی دلێر بووە.

ئاغا ڕاما و بیری کردەوە: ئەو هەموو حەمەدە دەیانەوێ چ بکەن؟ ئەو دێوەزمانە کە دەیانەوێ ڕیشە لە نێو دڵی عەرزی داکوتن، چییان دەوێ؟ لە نێو ئەو هەموانە دا یەکیان هەر لێهەڵدەکەوێ کە جێگای حەمەدی بگرێتەوە. بڵێی مەبەستیان ئەوە نەبێ، کە بە هەزاران و دەیانهەزاریان ڕۆژێك بە وڵاتی وەرین و بەو شێوەیەش کە باسیان دەکرێ ئاوا بە دەستو تفەنگ ئازا و تەڕدەستن، هەموو شارەکان بگرن و داریان لە سەر بەردی نەهێڵن؟ بڵێی ڕۆژێکی وا سەری کەس بە لەشیەوە بهێڵن؟ بڵێی یەك ژن و کچ بمێنێ کە دەستدرێژیی نەکەنە سەر؟ دیارە خەڵکی کێوپارەی زۆریان کەیف بە ژنە خڕوخۆڵ و سپیوسۆڵەکانی شاری دێ... بە ڕاستی ئەگەر ڕۆژێکی ئەوتۆ دابێ و ئەوانە بە سەر شاران دا زاڵ بن... شتی وا زۆر جار زووتر ڕوویان داوە... بەڵام کاتێك چەتە زۆر دەبن، ئەو جاردەوڵەت دە سەریانەوە ناچێ و لەشکریان دەنێرێتە سەر، نەك هەر مراد پاشا گۆڕکۆڵێك، بەڵکوو هەزار! لەوانەیە هەر باشیش بێ کە چەتەکان ئاوا دەستیان پێکردوە، چونکە ئەو جار ئیدی وایان لێدەدەن، ڕەگ و ڕیشەیان دەردێنن و ئیدی بۆ هەتا هەتایە دەبڕێنەوە و ناویشیان نامێنێ... دوای زەبرەکەی مراد پاشای، ئیدی هەتا سێسەد ساڵان، لە چیای تووڕوسی کەس وستەی لێنەهاتوە و هەتا یاغیبوونی

کۆزانۆغڵی وڵات نارام بووە. بەڵام کۆزانۆغڵی خۆ چەتە نەبووە، بەگێکی گەورە بووە، بە دوای دەسەڵاتەوە بووە و زانیوتی چۆن دەبێ لە بەرامبەر ئەو خوێڕیانەی ئێرە دا بجووڵێتەوە...

مورتەزا سەری هەڵێنا و گوتی:

ــ بریا حەمەدەکان هەر وا زیادیان کردبا، جا ئەو جار بە چاکی مشوورمان دەخواردن. دەبێ ئێمە پێیان نیشان بدەین کە دارێك نین بەو بایانە بلەرزین. ئێمە کە شەڕی سەربەخۆییمان کردوە، سینگمان کردۆتە مەتاڵی ئاسن و لە بەرامبەر دوژمن دا ڕاوەستاوین، دەتوانین ئەوانەش هەر وەك داگیرکەرەکان تەفروتوونا بکەین، چاڵاوەکانمان لە کەلاکی وان باخنین و مراد پاشا چیی لێ‌کردن، ئێمەش هەر ئاوایان لێبکەین... دەبێ پێیان نیشان بدەین کە ئاوایان دە سەرەوە ناچێ!

پاشان بە فیزەوە چاوێکی لە عەلی کرد. لەخۆباییبوونی بە قسەکانەوە دیار بوو:

ــ وا نیە ... کاعەلی؟

مورتەزا نەیەویست قینێك کە لە دەروونی دا بوو بیشارێتەوە:

ــ لێم‌پرسی وا نیە، پاڵەوانە شەلە، شێری شاخان؟ بۆچما وا نیە؟ ئەوی هەرە سامناکیان حەمەد بوو ئیدی؟ عەلی، چاوەکەم!

عەلی دای‌نواند. مورتەزاش کە ئێستا بە سەری دا زاڵ بوو، ئەوەی پێ‌خۆش بوو.

ــ ئەوی جێگای ترسیان حەمەدۆك، ئەو چەتە خوێنخۆرە بوو کە ئێستا ئەویش نەماوە.

عەلی سەری بەردایەوە و وەڵامی دایەوە:

ــ نەخێر، لە شاخی نەماوە.

ــ کە وا بوو لەمڕۆوە ئەتۆش ئیدی هیچ نی. دەوری تۆش بە سەر چوو!

ــ چۆنی دەڵێی با وا بێ، ئاغا.

مورتەزا ئاغا هەستا سەر پێیان. خۆی لە بەر یەك کێشایەوە و دەستی بە هاتوچۆ لە ژوورەکەی دا کرد. بە ئەنقەست لاقی توندتر لە عەرزی دەدا، تا تەقەی ناڵچەی کەوشەکانی باشتر بێ:

ــ بەڵێ دیارە چۆنی ئەمن دەی‌ڵێم هەر وا دەبێ!

چەند جاران کە ئەوسەرەوسەری دەکرد و دەگەیشتەوە لای عەلێ، ڕووی تێ‌دەکرد و بە دەنگی بەرز ئەو وتەیەی دووپات دەکردەوە:

ــ بەڵێ، بەڵێ، دەزانم هەرچی ئەمن بیڵێم وا دەبێ. ئەڵبەت هەر دەبێ بە قسەی منیش بێ، خۆ ئیشاڵڵا بە قسەی تۆ نابێ، پاڵەوانە شەلەیماڵوێران...

لەو کاتە دا ڕاوەستا و لاقێکی توند دە عەرزی کوتا:

ـ خانم، بە کارەکەران بڵێ جێگاوبانی ئەو شەلە سەقەتەی لە ژووری من لابەن و بیبەنە نهۆمی خواریٚ. بەڵام لە ژوورێکی خاوێن بۆی دانێن، چونکە وەك بۆخۆت دەڵێی ئێستاش برای منە!

حوسنی خانم لە نێو شیپانەی دەرکێ دا ڕاوەستابوو و بە چاوی مورتەزای حاڵی کرد کە بێتە دەرێ قسەی لە گەڵ بکا.

مورتەزاغا ڕووی دە خانمێ کرد و گوتی:

ـ دەزانم بۆ بانگم دەکەی و دەتەوێ چم پێبڵێی. باشە ئەوە دێم.

لە بەرامبەر عەلی ڕاوەستا و چاوی دە چاوی بڕی، عەلیش سەری بەردایەوە و خۆی کۆ کردەوە. نەیوێرا هیچ بڵێ.

قەت بە خەیاڵی دا نەدەهات کە شتەکان و قسەکان ئاوا خێرا بگۆڕێن. زۆر پەشیمان بوو لەوەی نەهێنییەکەی بەسەرهاتی حەمەدۆکی بۆ ئاغای گێڕاوەتەوە. لە دڵی خۆی دا گوتی: جا چاو ئەمن چم کرد؟ ئای لەو مەلعوونەی، ئای لەو بەرازە هیچ و پووچەی!

کاتێك مورتەزا زانی جارێ تا ڕادەیەکی باش عەلیی تێکشکاندوە، بە سەری دا زاڵ بووە و تۆڵەی لێکردۆتەوە، چوو بۆ ژوورێکی دیکە بۆ لای خانمێ.

ـ ئاغا تکات لێدەکەم، ئاغا داوات لێدەکەم، زیاتری شوو لێهەڵمەکێشە! کوڕە حەمەد دیسان پەیدا دەبێتەوە! لاقت ماچ دەکەم، ئاغا، تکات لێدەکەم ئاوا ناحەزی لە گەڵ مەجووڵێوە. باشە ئەتۆ دەڵێی ڕوحم و بەزەییت لە دڵی دا نەماوە.

ئاغا بە دەنگێکی بۆڕ گوتی:

ـ بەزەیی بۆ کەسێك دەبێ، کە شیاوی بەزەیی و ڕوحم بێ!

عەلی لە ژوورەکەی دیکەوە ئەو قسانەی زۆر چاك گوێ لێدەبوو.

ـ پیاوی چاك بە ئاغا! هیچ دوور نیە حەمەدۆك بگەڕێتەوە شاخی و ئەو کات دیسان حەوجێمان بە وی دەبێتەوە...

ـ حەمەدۆك ئیدی ناگەڕێتەوە!

ـ چووزانی؟

مورتەزاغا قاقایەکی توندی کێشا:

ـ ئەتۆ دەڵێی شێت بووی خانم، حەمەدۆك ئێستا ئەوەندە دەوڵەمەند بووە، کە ئەگەر هەموو ئەو شاخانەی بە ملکایەتی بدەیەی، پێیان تێنانێتەوە! مەترسە، ئەمن دەزانم ئەو جووتێرانە چۆنن... بۆ دوو دیناران هەموو شتێکی دەکەن!

ـ تکات لێدەکەم ئاغا، ئەمشۆ لە ژوورەکەت وەدەری مەنێ!

ـ ئیدی تاقەتم نەماوە، خانم. لەمێژە وەڕەزی کردووم. بۆگەنیوی لە هەموو گیانی دێ، لە لاقی، لە زاری، لە پاشی، بە کورتی وەختە قڕ بم و چیدی ناتوانم. یەك دەقیقەی دیش نابێ لە ژووری من بێ!

ـ ئەدی بۆ تا ئێستا لە لای من باست نەکردوە. دەمناردە حەمامێ... ئاخر خۆ بەستەزمانە وەڵڵاهی زۆر خاوێنە و هەموو ڕۆژێش خۆی پاك و خاوێن دەشوا. ئەو قەلەندەرە هەر جارەی سەعاتێك زیاتر دە حەمامێ دا دەبێ و هیچ جارێکیش سابوونێك بەشی ناکا. هەرچی سابوونی لە بازاڕی کڕیبوومن، تەواوی کردوون. ئەمن دەزانم خودا هەڵناگرێ، زۆر خاوێنە و زۆریش چاك بە پاکوخاوێنی خۆی ڕادەگا.

ـ نەخێر، بۆگەنی دێ! یەك چرکەی دیکەش دە گەڵ ئەو بەرازەی دەو ژوورەی دا نابم. دیتووتە چۆن هەڵسوکەوت دەکا؟ هەر دەڵێی ماڵە خۆیەتی! بابم وەك ئاغایان بەڕێدەچێ و بۆشی چۆتە سەر. ئەسپێکی حوددوودی دە بن دایە، هەموو شتێکی هەیە، بۆخۆی بۆتە ئاغا و ئەمنیش بە هیچ دانانێ! هەر جارێکیش ناڵێ ماڵت ئاوەدان بێ! بێچاووڕووە، بۆگەن و پیسە!

ـ باشە ئەو کاری بە تۆ چییە، ئاغا؟ وەڵڵاهی ئەو بەستەزمانە زۆر بێدەنگ و مسکێنە. خۆ هەرچی لێیبکەی و پێیبڵێی، قەت وەدەنگ نایە. لێشی تووڕە بی، دلگران نابێ، هەر بزەی دێتێ!

ـ ناکا وە دەنگ بێ و تووڕەش بێ، خانم. ئێمە سەرمان دە گۆشتەکەو و پلاو و هەنگوینی گرتوە، ئەویش هەنگوینی ئالاکۆی! لە سەر خوانێکی دەخوا، هیچ سوڵتانێك نیەتی. باشە ئەوەندەی ئێمە بۆ ویمان خەرج کردوە، بۆ کەسی دیمان کردوە؟ دیتووتە لەوەتا ئەو لێرەیە، خەرجمان چەندە چۆتە سەرێ؟ ئاوا بچینە پێش، سێ مانگی دیکە دەکەوینە سەر ساجی عەلی. بە ڕاستی بەخت یارمان بوو کە ئەم ڕووداوە هاتە پێش و ئەو سوێندەمان خوارد...

ئەوێ شەوێ تا بەیانی ئەو ژن و پیاوە باس و کێشەیان بوو. بەری بەیانی حوسنی خانم بڕیاری خۆی دا:

ـ گوێت لێبێ ئاغا، عەلیی برام ئەمشۆ لێرە، لە ژووری تۆ دەبێ و ناگوێزێتەوە خوارێ. ئێستا دەریکەی، یەك ڕۆژی دیش لەو ماڵەی دا نابم و دەچمەوە ماڵە بابم... بەو قورئانەی خودا بۆ پێغەمبەری بە خەڵات ناردوە وا دەکەم! جا ئیدی بۆ خۆت دەزانی، چ دەکەی بکە!

عەلی هەتا بەیانی هەر لە ژوورەکەی دیکە بوو و هەموو قسەکانیانی گوێ لێبوون. هەستابووە سەرپێ و دەیەویست بڕوا، بەڵام کاتێك گوێی لە دوابەشی قسەکانی حوسنی خانمێ بوو کە بە تووڕەیییەوە بە مورتەزای گوتن، بڕیارەکەی گۆڕی و چاوەڕوان مایەوە، تا بزانێ چ ڕوو دەدا.

مورتەزا سەرەنجام نەرم بوو و لە وەڵامی حوسنی خانمێ دا گوتی:

ـ ئەوە بەیانی‌یە. ئەمن دەچمە دەرێ و گەڕێك بە بازاڕی دا دەگەڕێم. پێی‌بڵێ بچێ لە جێگای خۆی بنوێ...

حوسنی خانم باوەشی پی‌دا کرد و گوتی:

ـ خودا ڕاوەستاوت کا ئاغا، گیانت ڕزگار کردین!

ـ باشە... چونکە ئەتۆ وات پێ چاکە، با چەندی پێی‌خۆشە لێرە بێ!

ـ ئاغا، عەلی پیاوێکی کەم نیە و جێگای خۆی دەزانێ. پێموا نیە دوای ئەو شتانە، ئەو قسانەی کە تۆ پێت گوت و ئاوا شکاندت، پێی‌خۆش بێ لێرە بمێنێتەوە. ئەتۆ هەڵەیەکی گەورەت کرد... تەنیا لە وانەیە لە بەر دڵی من چەند ڕۆژی دیش لێرە بێ...

ـ بەڵام نابێ ئیدی لە ژووری من بێ. بۆگەنی دێ!

ـ باشە با وابێ، بەڵام ئەوەش بزانە نایەڵم خراپی بۆ بگوزەرێ. هەر چاکەی لە گەڵ دەکەم، دۆشەکی تووکی قووی بۆ ڕادەخەم و لە جاران زیاتری پێ‌ڕادەگەم و قەدری دەگرم.

پێش ئەوەی ئەو قسانە بکا، دەرگای ژوورەکەی بە ئەنقەست کردەوە، تا عەلی گوێی لێ بێ. دوایەش چوو بۆ لای عەلی و نەرم و میهرەبان باسکی گرت و پێی‌گوت:

ـ کاعەلی گیان هەستە! ئەمشۆ بۆ تۆ شەوێکی ناخۆش بوو. ئاغا هێندێك زیادی خواردبۆوە، دەبێ قسەی لێ وەدڵ نەگرین.

پاشان بردی‌یە ژوورێکی دیکە، دەرگای پێوە دا، چووە بن گوێی و گوتی:

ـ کاك عەلی، ئەوانە هەموویان وەك یەکن. ئەمن قەتیان تێ‌ناگەم. بە کوفلەکوونێکی دەگۆڕێن و خۆیان نەبێ، هیچی دیکەیان پێ هەو نیە. بە پێی بەرژەوەندیی خۆیان دەسووڕێن... فێڵەبازن... پیاوی تایفەی ئێمە وەك وانە نین! هەر لە بناخە دا دزەکان و پیاوە هەرە ترسەنۆکەکانیش لە وانە چاترن... نەخێر، بە ڕاستی ئەمن نازانم خەڵکی ئێرە بۆ ئاوان؟ بەڵام ئاخر ئەمن چم پێ‌دەکرێ؟ بە داخەوە چارەنووسی من هەر ئەوەیە کە دەبێ لە گەڵیان هەڵکەم...

کە ئەو قسانەی دەکرد، خەم و خەفەت لە دەنگی دا هەست پێ‌دەکرا. دەت‌گوت شین بۆ مردووی دەگێڕێ. دوای ئەو قسانە لە ژوورەکەی وەدەرکەوت و عەلیی بەجێ‌هێشت.

ئەو بەیانی‌یەی مورتەزاغا ڕیشی لە هەموو ڕۆژێکی باشتر تاشی. ماوەیەکی باش لە بەر ئاوێنەی ڕاوەستا و چاوی لە خۆی کرد. زۆر لەمێژ بوو شتی وای هەر لە بیر نەبوو. ئەو جار سمێڵەکانی چەور کردن و هەڵی‌پێچان، چاکەت و پانتۆلێکی شینی لە ئەستەمبووڵێوە بۆ هاتبوون، دەبەری کردن. کراواتێکی سووری بەست، کەوشی تازە بۆیاغکراوی بریقەداری دەپێ‌کردن و بە فیزەوە بە بازاڕی دا

هاته خوار. هێشتا دەرابەی دوکانەکان هەڵنەدرابوونەوە. چەند سەگی بەرەڵا لە قەراغ جادەی کەوتبوون و کاتێك مورتەزا بە لایان دا تیٚدەپەری، تەنیا سەریان هەڵدێنا و پاشان دەخەوتنەوە.

مورتەزا دەیزانی کە ئەمرۆش حاجی حەنەفی پێش هەموو کەس دەرگای دوکانەکەی دەکاتەوە. سی ساڵ بوو ئەو کابرایە دوکانی هەبوو و هەمیشەش پێش هەموو کەس دەیکردەوە. لە بەر دەرگای دوکانیٚ ئەو دووانە تووشی یەك بوون. حاجی حەنەفی دوعایەکی لە ژێر لێوانەوە خوێند و دەرابەکەی هەڵدایەوە. خرەی دەرابەکەی دە هەموو بازاری گەرا و دەنگی دایەوە.

ــ بەخێر بێی مورتەزاغا، ئەمرۆ زۆر زوو هاتوویە دەر، چی‌یە، خێرە شکور؟

ــ ئەمنیش وەك تۆ عادەتمە، هەمیشە زوو دێمە دەر.

حاجی حەنەفی کە وەك جندۆکەی زیرەك و پیتۆڵ بوو، زوو زانی ئاغا قسێکی دە دڵی دایە و تەنیا مەبەستی لەو زووهاتنەدەرەی ئەوە بووە کە بیٚ و قسەکەی بۆ باس بکا. حاجی ریشێکی پانی هەبوو و دایم و دەرهەم، شەو و رۆژ، هەتا دەنوست لە ژێر لێوی‌یەوە دوعای جۆراوجۆری دەخوێندن. هەموو ساڵێ دەچووە حەجیٚ و زیارەتی ماڵی خودای دەکرد. هێندێك کەسیش دەیانگوت هەر جارەی لە سەفەری حەجیٚ دێتەوە، هێندێك شتی قاچاغ بۆ فرۆشتنیٚ دێنیٚ. بەشێك لە بەر بەدینی‌یەکەی، بەشێکیش لە بەر ئەوەی دوکانەکەی وی سەری ماروێرووی تیٚدا بوو و هەموو شتێکی لەلا وەگیر دەکەوت، دوکانەکەی دەتگوت شانەمێشەنگوینە، هەر جمەی دەهات. هێندەی موشتەری هەبوو، بە خۆی و سیٚ وەرگێرکەی پیٚنەدەوەستان خەڵکی بەریٚکەن.

حاجی دوکانەکەی کردەوە، بەردەستی رێکوپێك کرد، بە دەسرەیەکی خاو کورسی و رەفەکانی سرینەوە و دوایین دوعای خوێند. ئەو جار کورسی‌یەکی هێنا، لە بەرامبەر ئاغای دانیشت و گوتی:

ــ با چایەکەی وەسەر نێم، بە یەکەوە ئیستیکانێك چا بخۆینەوە.

ــ حاجی زەحمەتیٚ مەکێشە، ئێستا قاوەخانەکان دەکرێنەوە.

ــ ئاغا گیان، گەورەت کردووم کە تەشریفت هاتۆتە دوکانی من!

حاجی حەنەفی کە لە بناخە دا خەڵکی" دارەندە"ی بوو، لە لای خەڵکی ئەو شارەی زۆر خۆشەویست نەبوو و مورتەزاغاش لە دەروونی خۆی دا زیاتر رقی لێی بوو، تا ئەوەی خۆشی بویٚ.

ــ هاتووم هێندێکت قسە لە گەڵ بکەم. ئەو حەمەدانەی باسیان دەکەن، هیچیان هیچ نین.

ــ ئەو قسانە هەموو درۆن، ئاخر چۆن کۆمەڵێك رێگر دەتوانن لە بەرامبەر وڵاتی ئێمە دا راوەستن؟ تەنانەت ئەگەر هەزار، دە هەزار، یان سەدهەزاریش بن! یان ئەگەر هەموو تورکیەش پر بیٚ لە حەمەد، چی‌یان پیٚدەکریٚ؟ سەربازەکانی ئێمە کە لە بەرامبەر هێزە گەورەکان دا خەباتیان کردوە،

تێکیانشکاندوون و ئێستاش بەرگری لە ولاّت دەکەن، دەشزانن چۆن تۆوی چەتانیش لەو ولاّتەی ببڕن. جا چەتە با میلیۆنێکیش بن، دەروەستی دەوڵەت و لەشکری دەوڵەتی هەر نایەن!

ــ بەڵێ، بەڵێ، هەر تەنیا هەزار کەسی وەك مراد پاشای گۆڕکۆڵمان هەبن(خودا لێیخۆش بێ و جێگای لە بەهەشتی خۆی بداتێ)، کە بە ڕاستی چیای تووڕووس بپشکنن و خاوێنی بکەنەوە، جۆگەی خوێن وەڕێدەکەوێ و هەرچی چاڵاو هەن پڕ دەبن لە کەلاك!

ــ بەڵێ، وایە ئاغا...

ــ ئەو حەمەدۆکەش هێندە بە بەڵێن و خۆڕاگر نیە و هەر هێندێکی پووڵ بدەیەی، واز لە یاغیگەریێتیە دێنێ. دایکی خۆشی بە پووڵ دەفرۆشێ.

ــ ئاغای گەورە و بەڕێزم، ئەتۆ ئەگەر هێندێکم پووڵ بدەیەی، بۆ وێنە ئەوەندەی ئەسپەکەت لە کابرای پێکڕی، ئەمن دەچمە شاخی، هەر بەو پووڵەی هەموو ئەو چەتانە دەکڕم، دەیانهێنمە شاری و لێرەش هەموویان دێن و دەست و لاقی تۆ ماچ دەکەن!

ــ چۆن؟ بە ڕاستی شتی وا دەبێ؟

ــ سوێندت بۆ دەخۆم کە دەبێ.

ــ بە حەمەدۆکیشەوە؟

ــ بەڵێ، ئەو لە پێش هەمووان دا. ئەمن ئەو شاخانە چاك بەڵەدم ئاغا. ئەو کاتەی لاو بووم و وردە شتی وەك ئالقەرێز و دوولایی دەرگا و شتی وام دەفرۆشت، دێبەدێ ئەو سەرانە گەڕاوم. خەڵکی وێ زۆر نەدارن و چونکە بێجگە لە ماش، گیا و کوولەکە هیچی دیکەیان نیە بیخۆن، زگیان وەك دەهۆڵی هەڵدەمسێ و دەمرن. وەك مێشومەگەزی زۆرن، هەر وەك مێشومەگەزیش زۆر دەمرن! ئەمن بیستوومە کە حەمەدۆك و ئەوانی دیکە ڕەعیەتی عەبدیخانی بوونە، کە پێموایە ئەتۆش دەتناسی. ئەو کاتی ئەو حەمەدە دەهاتە بازاڕی، بە جل و بەرگی ڕیشاڵ ڕیشاڵ و پینەکراوەوە وەك قەرەچییان دەهات و دەچوو. ئەو جووتێرانە زۆریان لە برسان دەمردن... جا بیری لێبکەوە ڕەعیەتی ئەو ئاغایەی چەندە بەدبەخت و ماڵوێران بوون!

ــ ئەوەی سەبارەت بە حەمەدۆکی گوتت، بە ڕاستی...

ــ ئەمن بەڵێنت پێدەدەم، هەر سبەینێ دەچمە شاخی، بە پووڵێکی، زۆریش نا... دەیکڕم و دەیهێنمە لات... هەر لەوی هیچ نیگەران مەبە...

بێگومان حاجی حەنەفی پیاوێکی زۆر ڕاستگۆ نەبوو، بەڵام دەبێ ڕاست بکا، چونکوو ئەو تێکەڵاویی زۆری لە گەڵ جووتێران هەبوو، دەیناسین، لە گەڵیان ژیابوو، بە خووخدەیان ئاشنا بوو و دەیزانی چۆن بیر دەکەنەوە...

ورده ورده هەموو دەرابەکان هەڵدرانەوە و بازاڕ بە تەواوی کرایەوە. دێهاتی‌یەکان کە بە شێوەی ئاسایی زوو دەگەیشتنە شاری، لە بازاڕی دا دەگەڕان و لەم دوکان بۆ ئەو دوکان دەچوون. شاگرد قاوەچیی قاوەخانەی بەرامبەر دوکانی حاجی بە دوو چای ڕەشی تازەدێمەوە لە سەر کەشەفێکی، وەژوور کەوت. مورتەزاغا چای خۆی یەکبین پێداکرد و چونکە چایەکە زۆر گەرم بوو، زمانی سووتا. پاشان وەدەرکەوت. بەگەکان کەمتر بەیانان بە دەماخ و بەکەیف بوون، بەڵام ئێستا لەو بارودۆخەی دا دەبێ کابرا لە خەوێ هەستابێ. مورتەزاغا بە پەلە چوو بۆ لای ماڵی خەلیل بەگی گەورە، کە خانوویەکی جوان و سەرنجڕاکێش بوو. بەگ لە سەر هەیوانێ دانیشتبوو و بە حەوسەلە قومی لە چای دەدان.

مورتەزا لە دەرێ ڕا هەرای کرد:

ـ خەلیل بەگ، خەلیل بەگ، ئەرێ خەلیل بەگ، وا دیارە ئەمڕۆ زوو هەستاوی!

دەرگا کرایەوە و مورتەزاغا بە پەلە لە پلیکانان وە سەر کەوت. خەلیل بەگ لە بەری هەستا، چاکوخۆشیی لە گەڵ کرد و جێگای لە لای خۆی نیشان دا. کلفەتێکی گەنج کە داوێنی کراسەکەی زۆر کورت بوو، چای بۆ هێنا. مورتەزاغا ئەوەندە بۆ گێڕانەوەی هەواڵەکەی بە پەلە بوو، خەریک بوو ئاگر بگرێ و دەسبەجێش خاوەماڵ هەستی پێکرد. مورتەزاغا دەستی بە قسان کرد:

ـ هەموو ئەو حەمەدانە و خودی حەمەدۆکیش... ئیدی هیچ نین، هەر بۆ ئەوەی نابێ ئیدی باسیشیان بکەی...

ـ پێم بڵێ بزانم چت بیستوە؟

ـ ناتوانم. سوێندی داوم بۆ کەس نەگێڕمەوە... ئەو شەلە ناجسنە، ئەو خوێڕی‌یە... ئەو سەگە هارە دەستی پێبە قورئانێ داداوم کە نەیگێڕمەوە... هەر ئەوەندە دەتوانم بڵێم کە دوژمنی هەرە گەورەی ئێمە ئێستا ئیدی لە شاخی نەماوە و قەتیش ناچێتەوە شاخی! سەبارەت بە حەمەدە قەستی‌یەکانیش...

پێداهات وشە بە وشە باسی شەوی پێشووی لە گەڵ حوسنی خانم و عەلی‌یە شەلی هەموو گێڕایەوە. لە کۆتاییش دا گوتی: بە خۆشی‌یەوە زۆری وەك مرادپاشای گۆڕکۆڵمان لە نێو لەشکر دا هەیە، کە هێشتا خۆیان وەدەرنەخستوە.

ـ ئەوە دەڵێی چی مورتەزا؟ بە ڕاستیتە، یان گاڵتە دەکەی؟

ـ ئەگەر میلیۆنێك حەمەدیش دروست بن، چ نیە، چونکە هیچیان نامێنن و لە نێو دەچن... لەشکری قارەمانی ئێمە ڕیشەی ئەو تاوانبارانە لە بنەوە هەڵدەکێشی و تێیان دەگەیەنێ ڕاپەڕین یانی چی!

ـ ئەو قسانەت لە کوێ ڕا هێناون مورتەزا؟

ـ تەنیا ئەوەندەت پێدەڵێم کە ئیدی نە تۆوەکە دەمێنێ و نە ڕەگ و ڕیشەکان! شتێکی دیش ئەوەیە کە نێوەڕاستی قووڵایی عەرزێ بۆتە گڕکان و ڕەگ و مەگان هەموو دەسووتێنێ!

ـ مورتەزا، پیاوی چاك بە تێمبگەیەنە مەبەستت چییە؟

ـ ڕوستەم بەگی مامۆستا قسەی قۆڕ دەکا. حەمەدۆك ئیدی نەماوە، تەواو بوو، دە کوولەکەی تەڕیش دا نەماوە. ئەمن بەو بەیانە زووەی بۆیە هاتووم تا ئەو هەواڵەت بدەمێ! ئیدی پێویست نیە ئێمە بترسین، پێویست نیە لە گیان و ماڵمان ئەمین نەبین.

ـ ئەمن هەر نازانم دەڵێی چی!

مورتەزا ددانی دەچیڕەوە بردن و گوتی:

ـ ئاخ ئەگەر لە بەر ئەو سوێندەی نەبوایە... یەکسەر حاڵیم دەکردی... بەڵام ئەمن سوێندم خواردوە و بە داخەوە ناتوانم هیچ بڵێم!

ـ باشە حەمەد چیی لێهاتوە، مردوە؟

ـ نا...

ـ هەڵاتوە؟

نەخێر.

ـ ئەدی چیی بە سەر هاتوە؟

ـ نازانم... ناتوانم بیڵێم، سوێند دراوم!

پاشان قسەکانی حاجی حەنەفیی گێڕانەوە کە چۆن جووتێرەکان بە ڕەگە گیای دەژین و چلۆن چەتەکان ئامادەن لە بەرامبەر پوولێکی کەم دا خۆیان تەسلیم کەن و حەمەدۆکیش ئیدی...

ـ گوێت لێبێ، مورتەزا، برا گیان، بۆ خاتری خودای، ئەمن ئێستاش تێنەگەیشتم کە دەتەوێ چ بڵێی... باشە ئاخر ئێمە خۆمان شێت نەکرد و ڕامانەنەگەیاند کە ئامادەین سێهەزار لیرەی بدەین بە ئەسپێکی قۆتری کەلاك. بۆچما بەو زەحمەت و کوێرەوەرییەی کە بۆخۆت دیتت، ئەسپەکەمان پەیدا نەکرد؟ بۆچمانەو ئەسپە قۆترە دوای گوللەبارانکردنی نەبوو بە یەکێك لە

ئەسپە هەرە پیرۆزەکان؟ باشە بۆچما هەر ئەو ئەسپە نیە کە ئێمە وامانلێکرد باڵ بگرێ، بە سەر سەرمان دا بخولێتەوە و بحیلێنێ؟ ئێستا بۆ خاتری خودای پێم بڵێ چت دەوێ و دەڵێی چی؟

ـ ئاخ، زمانم بەسراوە! دەمەوێ بۆت بگێڕمەوە، بەڵێ، هەر بۆیەش هاتووم، ئیدی، بەڵام ئاخر سوێندم خواردوە! لە گەڵ سوێندەکەی چ بکەم؟

ئاخرەکەی پچڕ پچڕ هەموو هەواڵەکەی بۆ گێڕایەوە کە: حەمەد لەو ناوچەیەی نەماوە، ئێستا لە شوێنێکی ئەم دنیایە بۆخۆی بۆتە خاوەنی خانوو و زەوییەکی زۆر و زێڕ و پوولێکی زۆریشی وەسەریەك ناوە و پاشان گوتی:

ـ بلێی کەسێك کە ئاوا دەوڵەمەند بووبێ، جارێکی دیکە...

خەلیل بەگ لە حاڵێك دا نێوچاوانی تێکئنابوو و وێدەچوو گوشاری بۆخۆی هێنابێ تا باش لە قسەکەی بگا، گوتی:

ـ بەڵێ، بۆ دەبێ کەسێکی وا ببێتەوە چەتە؟

ـ ئێستا دە مەبەستەکەم گەیشتی.

ـ نەخێر، هیچ تێنەگەیشتم.

ـ دەی باشە، ئەمن دەڕۆم... خواحافیز!

مورتەزا ئەوەی گوت و وەدەرکەوت. چۆوە نێو شاری.

لە نێو شاریش مورتەزا ئاغا تووشی هەر کەس دەبوو، هەوڵی دەدا بەو شێوەیە پچڕ پچڕ بۆی بگێڕێتەوە، بەڵام خەلکەکە دەتگوت گۆڕاون و هیچکەس تێینەدەگەیی. تەنانەت کاتێك ڕاستەوڕاست هەموو شتەکەی بۆ دەگێرانەوە، دەحەبەسان، سەریان ڕادەوەشاند، دەبیرەوە دەچوون و بە ڕێی خۆیان دا دەڕۆیشتن، بێئەوەی تەنانەت بەڵێیەکیشی بۆ بلێن و بزانێ تێگەیشتن، یان نا. نا، بێسوودە! وا چاکە بچمەوە لای عەلی‌یە شەلی و داوای لێبکەم هەرچی دەیەوێ بێدەمێ، وەبالی سوێندەکەم لە ئەستۆی هەڵگرێ. ڕای کردە لای موفتی:

ـ ئەرێ جەنابی موفتی، دەکرێ پیاو لە سوێندێ پاشگەز بێتەوە؟

موفتی گوتی:

ـ نا، هەرگیز، کەسێك سوێندی خوارد، ئیدی سوێندی خواردوە و تەواوە! پاشگەزبوونەوە نیە!

ئەوێ ڕۆژێ هەر کەسی دەو بازارەی دابوو، گرژ بوو. یەك کەسیش زاری هەڵنەدەپچڕا، تەنانەت دێهاتی‌یەکانیش. هەرچی مورتەزا هەوڵی دا و خۆی ماندوو کرد، بە هیچکوێ نەگەیشت. دە دڵی خۆی دا گوتی، هەموو ئەو خەلکە شێت بوون، خۆ دەڵێی یەکێکیشیان مێشکی نەماوە و گوێشیان

نیە! ئەو جار ڕقی هەستا و بڕیاری دا بۆخۆشی دەمی داخا و یەك وشەشی لە زاری نەیەتە دەر. لەو کاتە دا جوولە جوولێك لە نێو بازاڕی پەیدا بوو. مورتەزا ملی هەڵێنا تا بزانێ ئەوە چی‌یە: چەند ژاندەرمە بە پێیان بە جادەی دا دەهاتن، هەوساری ئەسپەکانیان بە دەستەوە بوون و بە دوای خۆیان دا ڕایاندەکێشان. هەر ئەسپەی تەرمێکی بە سەرەوە بوو. خەڵك لە دوکانان دەهاتنە دەر و چاویان لەو دیمەنەی دەکرد. هەواڵەکە زار بە زار دەگەڕا: سێ لەو تەرمانە ئی حەمەدەکانن، ئەوانی دیش دەبێ هەر لە دەستەی حەمەدی بن و هیچ دوور نیە حەمەد بۆخۆشی لە گەڵ بێ...

مورتەزاغا خۆی پێ ڕانەگیرا و هاواری کرد:

ـ نا، حەمەدۆکیان لە گەڵ نیە. ئاخر ئەمن ئەو بەیانەی پێمنەگوتن؟ بەڵام ئێوە تێناگەن! حەمەدۆك لەو بەینەی نەماوە، نا! ڕۆیوە!

لە نێو بازاڕەکەی دەنگێکی دیکە، بێجگە لە دەنگی سمی ئەسپەکان کە لە سەر سەنگفەڕشی شەقامەکەی ئاوازی دەدایەوە، نەدەبیسرا. خەڵکەکە هەموو چاویان لە مورتەزای کرد. ئەویش زۆری پێخۆش بوو و دیسان توندتر هاواری کرد:

ـ حەمەدۆك لەو دەوروبەرانە نەماوە!

کوژراوەکان زۆر بوون. ئەوانەی دەیانەویست بزانن چەند تەرمن، ژماردیانن: یەك، دوو، سێ، پێنج، پازدە... بەڵام ئەوەیان نەدەزانی کە بەشی هەرە زۆریان چەتە نەبوون، بەڵکوو پیاوەکانی سوڵتانۆغڵی‌یە زەردەی بوون...

ژاندەرمەکان بە نێو شاری دا تێپەڕین، چوونە حەساری ژاندەرمەخانەی و تەرمەکانیان هێنانە خوار. هەموویان بە دیواری‌یەوە ڕیز کردن و ڕەخت و تفەنگەکانیشیان بە ملیانەوە هەڵواسی.

مورتەزا هێشتا ڕقی نەنیشتبۆوە. بە پەلە ڕۆیشتەوە ماڵێ. حوسنی خانم بە پیری‌یەوە هات. مورتەزا لە دوورەوە نەڕاندی:

ـ خەڵکی ئێرە هەموویان شێتن! ئەمن هەوڵم دا حاڵی‌یان کەم چ قەوماوە، بەڵام خۆ تێناگەن. ئاخری بە ڕوونی شتەکەم پێگوتن! خۆزگە ئەو سوێندەمان نەخواردبا! هەرچی ئەمن پێشبینیم کردبوو، وەدی دێ! فەرموو بچۆ حەساری ژاندەرمەخانەی و تەرمی حەمەدان بژمێرە! هەر دەڵێی مراد پاشای گۆڕکۆڵ هاتۆتەوە!

# (١٥)

لە باغەکان نارنج، پرتەقاڵ و لیمۆ ڕۆژ بە ڕۆژ گەورەتر دەبوون. هەموو ڕۆژێ بەیانی حەمەد دەچووە دەرێ و لە هەموو دارەکان، دار بە دار، ورد دەبۆوە، چاوی لە بەرەکەیان کە هێشتا کاڵ بوو دەکرد، بۆنی پێوە دەکردن، بۆنەکەی هەڵدەمیسین و لە سەرەخۆ دەستی پێدا دێنان. وای لێ‌هاتبوو هەر بە هەڵکەوتیش بۆنی بە گەڵای دارێکی‌یەوە کردبا، دەیزانی ئەوە چ دارێکە.

ڕۆژێکی بە دڵەخورپەوە نارنجێکی لێ‌کردەوە. نارنجەکەی دە دەستی دا دێنا و دەبرد. بۆنێکی زۆر خۆش بە دەوری دا بڵاو دەبۆوە. ئەوجار هەموو ڕۆژێ دەچووە دەرێ، میوەیەکی لێ‌دەکردەوە، دە نێو دەستی دا ڕای‌دەگرت، چەند سەعاتان لە بن دارێکی درێژ دەبوو و بۆنی بە میوەکەیەوە دەکرد.

ئەوێرۆژێ، بەیانیی زوو حەمەد لە دەرێ بوو. دەستی بۆ لیمۆیەکی برد، بەڵام لە جیاتیی ئەوەی کە لێی‌کاتەوە، هەر بەوەندە ڕازی بوو کە دە نێو دەستی بگرێ و پاشان بۆن بە بەری دەستی خۆیەوە بکا. ترۆپکەکەنی گاورکۆی بە سەر باغەکان دا، لە دوورەوە، دیار بوون و دەت‌گوت لەو بەرزایی‌یەی ئاسمانێ دەلەرێنەوە. گوڵە گەنمی هەڵمساوی پڕ دەنك، دە پانایی زەوی‌یەکی گەورە دا بە ئەسپایی ڕادەژان. تەسکە تەمێك کەوتبووە سەر زەوی‌یەکەی، دنیا لە شۆق و ڕووناکی دا مەلەی دەکرد و هەتا بۆ لای دەریایەش چووبای، ئەو ڕووناکی‌یە بەهێزتر دەبوو.

حەمەد چووە نێو زەوی‌یەکەی. گەنم هەتا سینگی دەهات و مژەکەش وردە وردە خەریك بوو دەڕەوی. چووە لێواری دەریایە، بەڵام نە دەریای دەدی، نە ئەو شۆق و ڕووناکی‌یە کە چاوی لە بەر هەڵنەدەهات، نە ماسیگرەکان و نە پەڵەهەورە نەوی‌یەکانی سەر شەپۆلەکان. بۆنەکەی بۆ هاتەوە. ئەو بۆنە زۆر ناسیاو بوو. خرمەی وردە بەردەکانی بن پێی لە کاتی ڕۆیشتنێ دا

نەدەبیست. پنگەکان لە نێو خڕەکەی دا وشك هەڵاتبوون و ڕەنگێکی مسیی‌یان بەخۆوە گرتبوو. پەپوولەیەکی گەورە کە بە قەد باڵندەیەکی دەبوو، باڵەکانی شین و ئەدار بوون و لە بەر تیشکی ڕۆژێ دەتروسکانەوە، لە سەر لکە پنگێکی خەوتبوو. حەمەد بەئەسپایی دانیشت، پێی‌خۆش نەبوو پەپوولەکەی وە ئاگا بێنێ و هەڵی‌فڕێنێ. دەستێکی بۆ برد، بەڵام زوو دەستی کێشایەوە، لکە پنگەکە هێندە وشك و ڕەق بوو، دەتگوت ئاسنە و بە ئاوری سوورت کردۆتەوە. پنجە گەزکەزکێك لە نێزیك پنگەکەی هەڵکەوتبوو، گوڵەکانی وەریبوون و گەڵاکانی سوور هەڵگەڕابوون. جاڵجاڵووکەیەك تۆڕێکی گەورەی لە نێوان لکە پنگەکە و گەزگەزکەکە دا تەنیبوو، تۆڕێکی تەنك کە بەو بەیانی‌یەی ئمێکی پێوە بوو. تۆڕەکە هێندێك مێشومەگەزی پێوە ببوون. مێشێکی چکۆڵەیان دە نێو دا بوو، پشتی خاڵخاڵی سەوز و بنەوش بوو و لە بەر ڕووناکایی‌یە دەترووسکایەوە. جاڵجاڵووکەکە بۆ خۆی دیار نەبوو. حەمەد تاوێك ڕاوەستا بزانێ جاڵجاڵووکەکە خۆی وەدەر دەخا؟ بەڵام چاوەڕوانی‌یەکەی بێ‌سوود بوو. وێدەچوو جاڵجاڵووکەکەش وەك پەپوولەکەی سەر لکە پنگەکەی هێشتا وەخەبەر نەهاتبێ. بایەك لە لای دەریایەوە هات و شەپۆلەکان بە نەرمی لە لێوارەکانیان دا. باڵندەیەك خوێندی. ئەو جار سیسرە وەخۆکەوتن. جیکە و سیکەی سیسران، وەك کۆرسێکی گەورە دەنگی هەموو شتێکی دیکەی وەبن خۆ دا. ئیدی نە جریوەی باڵندان، نە قرچەی لکوپۆی وشکهەڵاتووی پنچك، گیا و گەڵایان لەو گەرمایەی دا، نە هاشەی هێدیی شەپۆلەکان و نە خشەی نەرمونیانی گوڵەگەنمەکان لە کاتی وێککەوتن دا نەدەبیسرا. هەتا گەرما زیاتر دەبوو دەنگی تاری سیسرانیش زیاتر دەهات و لە مێشکی حەمەدی دا ئاوازی دەدایەوە. خۆر ساتبەسات بەرزتر دەبوو، نیسێکانیش کورتتر و کورتتر دەبوونەوە و ئاخرەکەشی هێندە کورت بوونەوە، کە هەر نەختێکیان لێ‌مابۆوە. عەرز وا سوور بۆوە، دەستی نەدەوێرایە. شۆقی ڕۆژێ ئەوەندە بە هێز بوو، کە چاوی لە بەر هەڵنەدەهات و حەمەد چەند جاران ناچار بوو چاوی بقووچێنێ. هێشتا جاڵجاڵووکەکە هەر دیار نەبوو. پەپوولەکەش کە ڕەنگی لە بەر ئەو سوورەتاوەی وە سەر شینێکی تۆخ گەڕابوو، هەر نەبزووتبوو. ئێوارەیەکی درەنگ، زریان هەڵی‌کردێ، هەورە سپی‌یەکانی سەر دەریایە بەرەو ئاسمان، کە وردە وردە تاریك دەبوو، بەرز بوونەوە. جیکەی سیسران کە لەگەڵ هاشەی با و خشەی لکوپۆپی گژوگیا و پنچکان و گرمەی شەپۆلان، کە ئێستا ئیدی نەستوورتر ببوون، بەگوڕ خۆیان بە لێوارەکان دا دەدا و کەفی سپی‌یان دەچاند، تێکەڵ دەبوو. ڕۆژ ئاوا بوو و لەو بەری دەریایەوە کەشێکی نارنجی پەیدا بوو و بە سەر مەزرا گەنمەکەی کە تائێستا وەك زێڕی

زەرد دەدرەوشایەوە، کشا و پاشان هەموو شتێك ڕەنگی پەمەیی گرت، بوو بە بنەوش و دیسان بۆوە بە نارنجی‌یەك کە پەمەیی و سەوزەکەشی لە پەنا دا دیار بوو. حەمەد دەستی بە لکە پنگەکەی دا هێنا و پەپوولەکە کەوتە عەرزی. لە ویّ چاوە گەورەکانی زەق کردبوون، باڵەکانی پان کردبوونەوە و بیّجووڵە وەك منداڵێکی مردوو کەوتبوو. ئیدی لەشی نەدەبریقایەوە. ئێوارە بە سەر دا هات و جاڵجاڵۆوکەکە هێشتا وەدەر نەکەوتبوو. حەمەد بیری کردوە: بەڵکوو دەعبایەك خواردبێتی، بۆ وێنە ، پەڕەسێلکەیەك، چۆلەکەیەك، یان مارمێلکەیەك... لەوانەی کە زمانیان سوور و درێژە، یان بۆقێك لەو بۆقە چاوزەقانە، دەنا لە بەیانی‌یەوە ئەمن لێرەم، هەر دەبوو خۆی نیشان دابام.

حەمەد هەستا و بە نێو گەنمەکەی دا بەرەوماڵ بۆوە. مچورکێکی بە مازەی پشتیّ داهات. ڕاست کاتێك گەیشتەوە ماڵیّ، بانگی شێوانی دا. دایە حۆری لە سەر بەرماڵی بوو، نوێژی دەکرد و حەمەدی نەدی. سەیران بە ڕووخۆشی و خۆشحاڵی‌یەوە ماندوونەبوونی لیّکرد و حەمەد بە دیتنی سەیرانیّ دڵی کرایەوە. سەیران سفرەی ڕاخست، دایە حۆریش لە نوێژیّ تەواو بوو و هاتە سەر سفرەی لە پەنا حەمەدی دانیشت. حەمەد سەری بەردابۆوە و هۆشی نەبوو چاکوخۆشیی لە گەڵ بکا. پاروێکی دە زاری نابوو، خەریك بوو قووتی دەدا و هیچ ئاگای لە دەورەوبەری خۆی نەبوو. دەتگوت دە خەویّ دا دەڕوا، یان با بڵێین وەك ئەوەی دەچوو کە نەی‌دەزانی چ دەکا. پاشان بیّدەنگ هەستا و چوو خەوت. ئەوە چەند ڕۆژ بوو حەمەد دەو حاڵەی دا بوو. هەڵدەستا، سەری بەردەدایەوە، وەدەردەکەوت، بە نێو زەوی‌یە گەنمەکەی دا دەڕۆیی، دەچووە قەراغ دەریایە و ئێواریّ دەگەڕایەوە، نانی دەخوارد، دەسبەجیّ دەچوو دەخەوت و بەیانیی ڕۆژی دواتر هەڵدەستا ڕاست چی ڕۆژی پێشوو کردبووی، دووپاتی دەکردەوە. ڕۆژ هەتا ئێواریّ بە تاقی تەنیّ لە دەریّ بوو و ئێواریّ کە تاریك دادەهات، دەگەڕایەوە. نەدەچووە لای هیچ‌کەسیش، تەنانەت سەری مەلا سەلامیشی نەدەدا. دەتگوت لە هەموو خەڵکی تووڕەیە. سیّ جاران تووشی پیاوەکەی ببۆوە، هەر ئەو پیاوەی کە ئەسپەکەی لیّکوشتبوو. یەکەم جار تاریکوڕوونی بەیانی لە نێو زەوی‌یە گەنمەکەی تووشی ببوو. کابرا لە سەر تەپۆلکەیەکی نێو زەوی‌یەکەی، لە پەنا پنچکێکی خۆی‌مات کردبوو و لەو کاتە دا کە وڵات هێشتا ڕووناك نەببوو، زۆر زلتر وەبەرچاو هاتبوو. حەمەد هەر خۆشی تیّنەگەیاندبوو، بە پەنای دا ڕۆیشتبوو، ئەوەندەی لیّنێزیك ببۆوە کە باسکی وە باسکی کەوتبوو و گوێی لە دەنگی هەناسەکێشانی ببوو. پیاوەکە وەدوای حەمەدی کەوتبوو. حەمەد ئاوڕی لیّنەدابۆوە.

تیشکێك وەك ڕووناکایی چەند برووسکێك بە دوای یەکدا دە سەری گەڕابوو و لە گەڵ بریقەی گوڵەگەنمەکانی مەزراکەی تێکەڵ ببوو. ئەگەر لەو کاتی دا کەسێکی لە لا بوایە، دەیدی کە ئاورینگێك، وەك پریشکە ئاگرێك کە لە پۆڵای ببێتەوە، لە چاوی وی دا دیار بوو. حەمەد زانی کابرا بە دوایەوە، چونکە دەنگی قرچە و چرپەی چیلکە وچاڵی لە ژێر پێی کابرای دا دەبیست. جاری دووهەم کە کابرای دی، لە کاتێك دا بوو کە لە قەراغ دەریایە بوو. حەمەد لەوێ دانیشتبوو و دە ئاسۆوە ڕامابوو. دەریا ئارام بوو و ئاوەکە هەر دەبریقایەوە. بەشێکی ئاوەکەی لە ژێر نیسێی تەپکەکانی قەراغێ دا بوو. هەموو شتێك بێدەنگ بوو و مرۆڤ تەنانەت گوێی لە دەنگی هەناسەی عەرزیش نەدەبوو.

ماسیگرمیەکی تەنیا لە ئاسمانێ دەخولایەوە و کە تێتهەڵدەڕوانی لە تیشکی ڕۆژێش سپیتری دەنواند. بۆنێك بە دەم سروەی بەیانییەوە لە لای دەریایە ڕا دەهات، کە حەمەد نەیدەزانی چ بۆنیکە. سارد بوو. حەمەد خۆی کۆ کردەوە و هەڵکورما. لە نەکاو دەنگی پێیانی لەسەر خیزەکەی هەست پێکرد. بە گۆشەی چاوی دا لاقی کابرای دی. قایشی کەوشەکانی لە پێستی خۆشنەکراوی گای بوون و لاقی لە خیزەکەی دا ون دەبوون. تیشکێکی شین لە ئاسمانێ ڕا هاتە خوار و یەکی هەر لەو ڕەنگەش لە دەریایە بەرز بۆوە. شاخەکانی ئەوبەری کە لە دوورەوە دیار بوون، وە سەر ڕەنگی شین گەڕان. هەموو شتێك شین بوو. عەرز، دار، باڵندە و تەنانەت مەزرا گەنمەکەش کە هەتا ئێستا لە ڕەنگی سپی دا دەترووسکایەوە و دەبریقایەوە. ئەو ڕووناکییە شینە هەتا ناخی دەروونی حەمەدی چووە خوارێ. کابراش کە لە وێ ڕاوەستابوو و دە ڕەنگی شین دا نوقم ببوو. لە دەشتێ ڕا هەتا چیاکان، ڕێك ڕەنگی شین وڵاتی پڕ کردبوو. ڕەنگە شینەکە بەرە بەرە بە سەر تەپك، مەزرا و دارستانەکان دا دەهات و دەخۆی دا ون دەکردن. دەتگوت ئەو ڕەنگە شینە لە سەرچاوەیەکی بێسنوورەوە دێ و قەت بنەی نایە. کۆمەڵە سەگێك لە خوارەوەی چیای دوڵدوڵ دەستیان بە وەڕینێ کرد. هەموو بە یەکەوە دەوەڕین و تەنانەت ئەوانیش شین هەڵگەڕابوون و هەر دەهات و شینتر دەبوون. تەنانەت چیای دوڵدوڵیش کە ترۆپکەکانی هەر بەفریان پێوە بوو، شین ببوو. لە پڕێك ماسیگرە تەنیاکە کە بەرز بە سەر دەریایە دا دەفڕی، ئەوی بوو، باڵی لە ئاوێ وەردان و ڕاست بە سەر ئاوێ دا، ئەوی ئەوی، فڕییەوە، هەر بە قەدەر ڕمبێکی بڵیند بوو و ئەو جار بەرە بەرە بە تەواوی سپی بوو و هاوکات دەریاکەش سپی و بریقەدار بۆوە.

"بڵێی شۆقی ڕۆژێی بە سەر دا کوژابێتەوە،

بڵێی زەوی دە بن پێی دا چەمابێتەوە،

بڵێی مێرووان چاوە شینەکانی حەمەدۆکی منیان خواردبێ؟"

مێرووەکان ڕێچکەیان بە نێو پووشی دا دروست کردوە و لە ژێر بارە قورسەکەیان دا نوشتاونەوە، بەڵام کۆڵ نادەن، ڕیزێکی درێژیان بەستوە و دەنکە دانەوێڵەکانیان بەرەو ماڵیان ڕەکێش دەکەن. سەرە بڕاوەکە چاو دەگێڕێ، چاوەکان لە قوولکەی خۆیان دێنە دەر و بە خەم و بێدەسەڵاتی‌یەوە دەڕوانن. دڵۆپ دڵۆپ خوێن لە سەرە بڕاوەکەی دەچۆڕێ. دڵۆپەکان گەورەن و بەردەکەی سوور هەڵدەگێڕن. سەرەکە بە سەر ڕمبێکی‌یەوە کراوە و ئەو دڵۆپە خوێنانەی لێی‌دەچۆڕێن، ئەو کابرایەی سوور هەڵدەگێڕن، کە ڕمبەکەی بەرز کردۆتەوە، هەروەها سەنگفەرشی نێو بازاڕی شاری و گیاوگۆڵ و چیمەنە شینەکەی قەراغ دەریایەش سوور دەکەن. خوێن هەر دەڕژێ و دێتە خوار، دەڵێی لە کانی‌یەکی بێ‌بن ڕا دێ. خەڵکی شاری بۆ دیتنی ئەو شانۆیەی هاتوونە دەرێ و حەشیمەتەکە ئەوەندە زۆرە، هەموو چڕ پاڵایان وێکداوە و دەرزی هەڵاوێی، ناکەوێتە عەرزی. هەموو ئەو حەشیمەتەش لە خوێنێ دا سوور هەڵدەگەڕێن. خوێن کەفێ دەکا و دیواری خانووەکان و لەشی خەڵکەکەی دادەپۆشێ.

" داخوا مێرووان چاوە شینەکانی حەمەدۆکی منیان خواردوە...؟"

مێرووەکان بە نێو ئەو دەریای خوێنە دا ڕێچکەی خۆیان کردۆتەوە. هەرچی گیاوگۆڵە، سوورە. قوولکەی چاوەکانی ئەو سەرەی بە ڕمبەکەیەوە، هەر خوێنی لێدەڕژێ. مێرووەکان بە سەر پشتی ئەو کەسەی دا کە ڕمبەکەی بە دەستەوەیە، ڕێچکەی دەبەستن، بە سەر ملی دا دەچن بۆ سەر باسکی ڕاستەی و لە باسکی ڕاستەیەوە بۆ ڕمبەکەی کە سەرەکەی پێوە کراوە. بە ڕمبەکەی دا هەڵدەچن و خۆ دەگەیننە چاوەکانی سەرە بڕاوەکەی... خۆێن لە چاوەکان سەر دەکا و هەڵدەڕژێ...

تووکی پێستەگای بە کەوشەکانەوە ڕاست دەبنەوە. کابرا هەر وا ڕاوەستاوە. سێبەرەکەی دەکەوێتە سەر دەریایە کە سپی‌یەکی تۆخە. دەریا حەجمیوە و نابزوێ، گیا ڕاناژێن، گەڵاکان نالەرێنەوە و مێرووەکانیش لەمسەرەوسەری ئەو دەریا سپی‌یەی، لە سەر ڕێگای خۆیان ڕاوەستاون وبە لاقی پشتەوەیان بە چاویان دا دێنن. هەموو چاویان نووقاون. لە نەکاو هەموو ئەو شتانە دەگۆڕێن. دەڵێی گەرما، ڕووناکی و هەموو پووش و پنچکەکان یەکجێ دەتەقنەوە و بەینی دەریا، دەشت و شاخەکان پڕ دەبن لە باغی دار هەناران. هەنارەکان هەمووی دە گوڵێ دان. تیشکی تاو لە بەرزایی و لێژەکان دا شەبەق دەداتەوە، هەموو هەنارەکان یەکجێ گوڵ دەکەن و کێو و دەشتێ پڕ دەکەن، گوڵێکی سوور وەك پتی خوێنێ. ڕەنگی گوڵەکان دەپەڕێتە سەر دارەکان و مەزرا، گەنمەکەش و دارەکانیش سوور دەبن. سێ ماری سووری درێژ لە نێو

دارهەنارەکان دێنە دەرێ. منداڵێکی چکۆڵە لە سەر چنگان دێتە پێشێ و کلکی مارەکان دەگرێ. مارەکان لێك دەهاڵێن و گەمەی لە گەڵ دەکەن. سەیران بە زیڕە زیڕ لەولا ڕا دێ و هەوڵ دەدا مارەکان لە منداڵەکەی دوور کاتەوە. مارەکان ڕەش دەبن، دواتر بنەوشی دەنوێنن و پوولەکەی پشتیان دەبریقێتەوە. سەیران تووڕە دەبێ، چونکە مارەکان و منداڵەکەی پێ لێك هەڵنابڕێن...

ئاوی دەریایە وەك ئاوێنەی دەترووسکێتەوە، ڕاست هەتا چاو هەتەرێ دەکا، ماسیگرەکە دەفڕێ، تێ‌هەڵدەچێ و بەرز دەبێتەوە. تووکەکانی سەر کەوشەکان لە پەنا وی درێژتر دەبنەوە. هەموو شتێك بێ‌دەنگە، تەنانەت دەریاش کڕ بووە...

سەرەکە بە ڕمبەکەیەوە و دەی‌بەن، نیشانی خەجێی بدەن. بەفرێکی توند دەبارێ. خەجێ پێ‌دەکەنێ. گڕی ئاگر لە نێو ئەشکەوتەکەی دا بڵێسەی دەدا و خەجێ هەردووك دەستی وەبەر مەمکانی دەدا. مەمکی گەورەن و دە لەپی دەستی دا جێ‌یان نابێتەوە. خوێن لە سەرە بڕاوەکەی دەڕژێ، دەبێتە تۆفان. مەمکی خەجێ خوێنیان لێ‌دەچۆڕێ.

پڕتەقاڵەکان ساتبەسات سوورتر بوون و هەنارەکانیش، کە هەناری وا لە دنیایە دا کەمن، پەمەیی بوون و گەیشتن. دایە حۆری لە خۆشی‌یان وەخت بوو بفڕێ. لە گەڵ مامۆستای وێنەگەر لبادێکیان لە حەسارێ، لە سەر چیمەنی بن دارەکان ڕاخستبوو، دانیشتبوون و هەردووکیان دوعایان دەخوێندن. سەیران دەستی کوڕێکی چکۆڵەی گرتبوو و بە یەکەوە لە بن دارهەنارەکان گەمەیان دەکرد، یەکتریان ڕاو دەنا و پێ‌دەکەنین. هەنارە گەورە پەمەیی‌یەکان بە دارێود قەڵشیبوون، دەنکەکانیان کە وەك پتی خوێنێ سوور بوون، بە سەر دەستی سەیران، کوڕەکە و مارەکان دا ڕژان. دایە حۆری بە دارەکان دا گەڕا و هێندێك هەناری هەرە جوان و باشی هەڵبژاردن، لێی‌کردنەوە و دە کۆشێی کردن. هێندە خۆشحاڵ بوو، هاواری کرد. هاوارەکەی لە هەموو لایەکی‌یەوە دەبیسرا. دەی‌گوت: کوڕە چاو! بڕوانن! ئەرێ تا ئێستا کەس هەناری وا چاك و جوانی دیون؟

لە نەکاو دایە حۆری لە جێی خۆی حەبەسا و ڕاوەستا.

" ئەرێ ئەوە مێروولان چاوە کاڵەکانی حەمەدۆکی منیان خواردوە؟

ئەی هاوار، خۆ تەنانەت یەك ئەسپیشم نەماوە،

یەك کوڕیشم دە ماڵێ دا نەماوە،

ڕۆڵە گیان بەو بەیانەی، لە بەر ئەو سوورەتاوەی بۆچی نوستووی؟"

هەرا و پێکەنینەکەی لە نەکاو بوو بە شینگێڕان. دڵۆپە خوێنەکان، گەرووی سەرە بڕاوەکەی سەر ڕمبەکەی پڕ دەکەن و چاوەکانی وەختە لە جێیێ خۆیان دەرپەڕن. دایە حۆری سەرە بڕاوەکەی دە باوەش دەگرێ و هەموو گیانی دە خوێنێ وەردەدرێ. ئەو هەنارە سوورە گەورە جوانەکان فڕێ دەدا. ڕوو دە شاخی دەکا. سەرە بڕاوەکەشی هەر وا دە باوەش دایە، پێی‌هەڵدەڵێ، شینی بۆ دەگێڕێ و دە گەڵ خۆی دەبا.

" هێندە جوان بوو، دڵم نەدەهات پڕ بە چاوان لێی‌بڕوانم،
هێندە ناسك بوو، نەم‌دەوێرا لێوم لە ڕوومەتی دەم،
ئاخرییەکەی ماچم نەکرد، سەریان بڕی. "

دایە حۆری لە سەر شاخی ڕاوەستاوە و دەگری. ئەو شینگێڕیی خۆی لە گەڵ گابەردەکان و لوتکەکان کە ماڵ و هێلانەی حەمەدۆکەکەی بوون، دەکا. جووتێری دێهاتی لە دەوری کۆ دەبنەوە. جووتێران لە هەموو لایەکی ڕا دادەوەرن. هەموویان لە دەوری دایە حۆری کۆ دەبنەوە و ئالقەیەك بە دەوری دا دروست دەکەن. دایە حۆری لە نێوەڕاستی ئالقەکەی ڕاوەستاوە، هەموو گیانی خوێنی لێ‌دەچۆڕێ، سەرە بڕاوەکەی بە سینگی‌یەوە ناوە و دەلۆرێتەوە، دەڵێی منداڵی نێو لانکێ دەلاوێنێتەوە. شینگێڕی‌یەکەی ئەوندە خەماوی‌یە، جەرگی ئینسانی دەبرژێنێ. ئەوانەی لە وێن هەموو دەگرین و شینی لە گەڵ دەگێڕن...

دیسان ڕووناکی‌یە شینەکە هاتەوە و حەمەد دە ڕەنگی شین دا نوقم بوو. نیسێی کابرای کە لە پەنای بوو و کەوتبوە سەر ئاوێ، کورت ببۆوە و ئەویش هەر شین بوو. حەمەد هەستا و لە لێواری ئاوە شینەکەی نێزیك بۆوە، پاشان چووە خڕەکەی و لە لای لکە پنگە وشکهەڵاتووە مسیرەنگەکەی هەڵترووشکا، بەڵام زۆر لە وێ نەمایەوە و هەستا. پیاوەکە لە وێ بوو و شانبەشانی ڕاوەستابوو. حەمەد دەستی بە ڕۆیشتنێ کرد، پیاوەکەش هەر وای کرد. کاتێك حەمەد گەیشتە باغە پڕتەقاڵەکەی، ڕاوەستا و پیاوەکەش ڕاوەستا. لە وێ گیا هەتا پشتێندێ دەهات و مێشی شینی چکۆڵە لە سەر گوڵە هێرۆ و پنچکە وشکەکان نیشتبوون. حەمەد چووە نێو باغە پڕتەقاڵەکەی. لەو ماوەیەی دا یەك جاریش ئاوڕی نەدایەوە. دوایە کاتێك لە باغەکەی هاتە دەر و هاتەوە سەر ڕێگایە، لە لای هێندێك پنچکە توودڕکان، کە بە پەنا پۆلە دارچنارێکی سەر ڕێگایەوە شین ببوون، ڕاوەستا. لە وێ ئاوڕی دایەوە. پیاوەکە لە بەرامبەری ڕاوەستابوو. حەمەد هێندە لە نەکاو ئاوڕی دایەوە کە پیاوەکە ئاڵۆز بوو، نەی‌وێرا چاو لە چاوی بکا، بەڵام هەڵنەهات، هەر لە وێ مایەوە و چاوەڕوان بوو بزانێ حەمەد چ دەکا. دیارە هەر

ئەو کابرای گۆڕین بوو. حەمەد چاکی دەناسی و دەیزانی هەوە، بەڵام ئاخر ئەو کابرایە بۆ ئاوا دەکا و چیی دەوێ؟ حەمەد دیسان ڕووی لێ وەرگێڕایەوە. ڕقی هەستابوو و نەیدەزانی چۆن ئەو گرێیەی بکاتەوە. بەرەو ماڵ بۆوە.

حەمەد لە ماڵێ نێزیك بۆوە و کابراشی هەر بە دووەوە بوو. لە بەر دەرکێ حەمەد ئاوڕی دایەوە، کابرا ڕاوەستابوو و لەشی ڕادەژا، دەتگوت کەشتی‌یە لە دەریایە دا ڕادەژێ...

دایە حۆری نوێژەکەی کرد. ئەم دوایی‌یانە ئیمان و باوەڕی زۆر بە هێز ببوو، بە شێوەیەك کە شوێنی لە سەر سەیرانێش دانابوو. ئەویش لە پەنا وێ بەرماڵی ڕادەخست و نوێژی دەکرد.

لە تاریکایی شەوێ دا کەشتی‌یەك هات. کەشتی‌یەکە چراکانی هەموو هەڵکردبوون و چراخانێکی سەیری لە سەر ڕێگای خۆی لە نێو دەریایە دروست کردبوو. ئاوێکی ڕوونی بریقەدار لە دوای کەشتی‌یەکەی بەجێدەما. حەمەد ئاوڕی دایەوە لای چەپی خۆی، بەڵام کەوشە چەرمەگا خۆشنەکراوەکان لە وێ نەمابوون. ئاوڕی دایەوە لای ڕاستە و پشتەوەشی، هەر هیچی نەدی. هەستی بە بەتاڵی‌یەك لە دەروونی خۆی دا دەکرد کە ئەو بەتاڵی‌یە هەر دەهات و گەورە دەبۆوە. ماسیگرە تەنیاکە کە بە بەرزایی ڕمبێك بە سەر دەریایە دا دەفڕی، باڵی ڕەق ڕاگرتبوو و دەتگوت خەوی لێکەوتوە. سێبەرەکەی کەوتبوە سەر ئاوێ. کزەبایەکی دەهات. کەوشە چەرمەگایەکان دیار نەبوون و ئاوەکەش ئیدی بریقەی نەدەدا. هەورەکان هەڵمسان، بەرەو ئاسمان بەرز بوونەوە و تیشکی ڕۆژێ بە سەر زەوی دا ڕژا. نیسێکان درێژ بوونەوە، گەرما دەستی پێکرد و عەرز وردە وردە سوور بۆوە. با توندی کرد، گێژەڵووکە لە سەر ڕێگاکەی هەستان، تەپوتۆزیان لە گەڵ خۆیان لوول دا و بەرزیان کردەوە. گێژەڵووکەکان جار جار تەنك بوون و جاری واش هەبوو ئەستوور دەبوون. گوڵەگەنم، جۆ و... ڕێلێدەخشان، خشەیان دەهات و دەشتی بێسنوور ببووە دەریایەك ڕووناکیی زێڕین و شەپۆلی دەدان. سیسرەکان دەستیان بە تار لێدانێ کرد و دەشتیان لە جیڕە و جیکەی خۆیان پڕ کرد. ماسیگرە تەنیاکە ئەوەندەی توانی بەرز بۆوە، لەو سەرەی چەند جار خولاوە و ون بوو، بەڵام کەوشە چەرمەگا خۆشنەکراوەکان هەر دیار نەبوون. حەمەد هەستی بە تەنیایی کرد. باڵندەیەکی ڕەشی دەنووکدرێژی چاوگەشی سەرباڵشینی جوان لە وێ نیشت. کە نیشت، ماوەیەك بێجووڵە لە جێی خۆی مایەوە و پاشان مژێکی شینی بە دەورەی خۆی دا بڵاو کردەوە. مژەکە دەشتی داگرت و چیاکانی ئەوبەریشی گرتەوە. مارێکی درێژی شین هات و لە کن باڵندەکەی پاپۆکەی خواردەوە. درێشووکە درێژ و سوورەکەی دیار بوو. باڵندەکە خوێندی و لە گەڵ خوێندنی وی درێشووکەی مارەکەش درێژ بۆوە، بەڵام باڵندەکە نەبزووت. مارەکە سەرەنجام سووڕا و بەکلك لەقاندن لە وێ دوور کەوتەوە. پاشان ئێوارە

داهات. خۆر گوم بوو، بەڵام کەوشە چەرمەگا خۆشنەکراوەکان هەر پەیدا نەبوونەوە. حەمەد چوو لە کن چڵە پنگەکەی دانیشت. پەپوولە مردووەکە هەر لە وێ بوو و لەو سەرە ئێوارەیە دا دیمەنێکی خەماویی دروست کردبوو. حەمەد دەستی بە گوڵی وشکی پنگەکەی دا هێنا، بۆنەکەی هەڵمیسی و هەر لەو کاتەش دا هەستی بە بۆنی دەریا، گیا و دارەکانی دیکەش کرد...

حەمەد هەستی کرد زۆری برسی‌یە. هەستا، چاوێکی بە دەوری خۆی دا گێڕا، بەڵام تەنانەت سێبەرێکیشی بە دەوری خۆیەوە نەدی، کە وەڕێش کەوت، چ دەنگێکی لە ڕێگایە دا لە پشتەوەی خۆی نەبیست. لە سەر ناخواردنێ هەڵکورمابوو و دەستی بە کەوچکەکەیەوە ڕەق ببوو. نە سەیران و نە دایە حۆریش هیچیان پێ‌نەگوت. وەك شەوانی پێشوو بە خەواڵوویی چوو دە جێگایەوە. لە جێگاکەش دا چاوەڕوان بوو کەوشە چەرمەگا خۆشنەکراوەکان دەرکەونەوە. بەڵام ئیدی کابرا نەهاتەوە و حەمەد ساتبەسات هەستی بە بەتاڵایی‌یەکی زۆرتر لە دەروونی خۆی دا دەکرد. وای لێ‌هاتبوو بیری خۆی بۆ کۆ نەدەبۆوە و تروسکە ڕووناکایی‌یەکەی نێو سەریشی نەمابوو...

حەمەد چۆوە قەراغ دەریایە. ئاوەکە ساف و ڕوون بوو. ماسیگرەکە لە سەر ئاوەکەی لەنگەری گرتبوو و ڕەق ڕاوەستابوو. کەشتی‌یەکە بە هەموو چرا ڕووناکەکانی‌یەوە بە سەر ئاوەکەی دا خزی و دوور کەوتەوە.

کەس نەی‌دەزانی چەند شەو و ڕۆژە ئەو بەو شێوەیە دەژی. کەشتی‌یە پڕ لە چرا و شۆق و شەبەقەکە کە دەت‌گوت کۆیەکی گەورە لە تروسکە و ڕووناکی‌یە، هەموو جارێ بە سەر ئاوە ڕوونەکەی دا دەخزی و دواتر هەتا ڕۆژ دەبۆوە و گەرما دادەهات، ئەستێرەکان لە سەر دەریایە دەدرەوشانەوە. کەوشە چەرمەگا خۆشنەکراوەکان کە تووکێکی سووری درێژیان پێوە بوو، هەر پەیدا نەبوونەوە و سێبەری کابراش کە لەو کاتانە دا لە پەنای ڕادەوەستا، قەت نەکەوتەوە سەر دەریایە. لە پڕێك حەمەد ئەوەی بە خەیاڵ داهات، کە نەکا کابرا تەقەی لێ‌کرابێ و کوژرابێ و هەربۆیە بە پەلە هەتا ئەو جێیەی ئەسپەکەی لێ‌کوژرابوو، ڕای کرد. بە بیری دا دەهات کابرا لە وێ کەوتبێ، بەڵام هیچی نەدۆزی‌یەوە و دیسان بە دەروونێکی ئاڵۆزتر و بەتاڵترەوە گەڕایەوە. پێی‌وابوو ئاخری ئەو ئاڵۆزی‌یە دەی‌کوژێ! ئەوە سەد قات لە ترس، دڵەخورپە و ناڕەحەتی خراپتر بوو، هەر لە مردنێش خراپتر بوو. بڕیاری دا بچێتە کەبابخانەکەی، کە هەوەڵ جار کابرای لە وێ دیبوو. کاتێك هات، زوو بوو و بازاڕ نەکرابۆوە. حەمەد لە بەر دەرگای کەبابخانەی چاوەڕوان مایەوە. ئاخرەکەی دەرابەی دوکانان بە خڕە خڕ هەڵدرانەوە و کابرای کەبابچیش دوکانەکەی کردەوە. وا دیار بوو ئێوارەی پێشوو خاوێنی

کردۆتەوە و بەجوانی گەسکی داوە. کابرا ئاورگی پڕ کرد لە دار و ئاگری دا، گۆشتی کوتا، پێوازی چاك کرد، بیباری شین و تەماتەی چاك کرد و گۆشتەکەی لە شیش دا. ئەو جار شاگردەکانی هاتن، هەر یەکە و پێشبەندێکی سپیی گەورەی لە خۆ دا و دەستیان بە کارێ کرد. حەمەد لە وێ دانیشتبوو، ئانیشکی لە سەر مێزەکەی دادابوون و چاوی بڕیبوە قەڵبەزەی ئاوی ژێر چنارە بەرزکەی. هێندێك ماسی لە نێو ئاوی جۆگەکەی دا، کە لە سەرەوە ڕا دەهات و بەرەوخوار بۆ لای ئاشی دەچوو، ڕاست و چەپ دەهاتن و دەچوون. ماسیگرە سپی‌یەکە، ڕاست وەك چۆن بە سەر دەریایە دا دەفڕی، هەر ئاواش ئێستا بەرز بە سەر شاری دا دەفڕێ. حەمەد دانیشتبوو و هیچی نەدەگوت، وەك ئەوە وا بوو کە کابرای کەبابچی و شاگردەکانیشی نەدیبێ، کە دەهاتن و دەچوون و کاریان دەکرد. شاکیر بەگ چوار جاران بە وێ دا هات و ڕۆیی، بەڵام حەمەد وەك ئەوەی کە هەر نەشی‌دیتبێ، لە جێگای خۆی نەبزووت. نیوەڕۆیە نانیان بۆ هێنا، کەباب، جەعفەری، پیواز، بیباری شین و سوور و سماقیان لە گەڵ ماستاوێ بۆ دانا. بۆنی کەبابی کە ئەو بەینەی پڕ کردبوو، دەگەیشتە ئەو بەستەزمانانە کە لەرزوتایان گرتبوو و کۆمەڵ کۆمەڵ، لەڕولاواز، بە لەشی قوڕاوی و تۆزاوی‌یەوە، لە نێو مزگەوتێ، حەساری مزگەوتێ، نەخۆشخانەکە و کووچە و کۆڵانی دەوروبەری ئەوێ، لە نێو خۆڵێ و لە سەر عەرزی کەوتبوون و هەموویان زەرد، لەڕولاواز و کەلەلا، لە بەر ئێشی خۆیان دەیاننالاند.

کابرای کەبابچی دەستێکی دیکەشی کەباب بۆ حەمەدی هێنا و ئەویش بێ‌ئەوەی دەنگێ بکا، خواردی. بۆنی ئەو کەبابەی ئەوەندە خۆش بوو، پیاو لێی‌تێر نەدەبوو.

دوای نیوەڕۆیە کەبابچی‌یەکە گوتی:

ــ لەمێژە کابرا نەهاتۆتە ئێرە.

حەمەد وەك ئەوەی بەو قسەیەی لە خەوێ وەخەبەر هاتبێ، سەری هەڵێنا و چاوی لێ‌کرد. کەبابچی‌یەکە دووپاتی کردەوە:

ــ لەمێژە نەهاتۆتەوە ئێرە.

حەمەد هێندێك بزووت و چاوەکانی بریسکانەوە:

ــ مەبەستت ئەو کابرایەیە کە پێڵاوەکانی لە چەرمەگای خۆشنەکراون؟ پێڵاوەکانی تووکنن، تووکەکەیان سوورە؟ وایە؟

ــ نازانم پێڵاوەکانی چۆنن؟ بەڵام سەرنجم داوەتێ و دەی‌ناسمەوە. وا دیارە ئەتۆ و ئەو نێوانتان زۆر خۆش نیە...

حەمەد پرسی:

ـ دەزانی لە کوێیە؟
کاتێك ئەو پرسیارەی کرد بە حاڵ هەناسەی دەهات.
ـ لەمێژە نەهاتۆتەوە ئێرە.
ـ تازە ناشیەتەوە؟
ـ وەڵلاهی نازانم!
ـ ناوی چی‌یە؟ دەی‌ناسی؟
ـ هەر جارێکم دیتوە... دواتر نەم‌دیوەتەوە.
ـ سبەینێ... بلێی سبەینێ نەیەتەوە؟
ـ ئەوەش نازانم!

ڕۆژی دواتر، بەیانی زوو، حەمەد لە بەر دەرگای کەبابخانەکەی ڕاوەستابوو. دیسان دەرابەی دوکانەکان بە گرموهۆڕ هەڵدرانەوە، ماسی‌یەکان دە جۆگەکەی بن دارچنارە بەرزەکەی دا مەلەیان کرد و لە گەڵ ئەمسەر و ئەوسەر کردنی خۆیان ئەمدیو و ئەودیو دەکرد و لە ئاوی جۆگەکەی دا کە وەك چاوی قرژاڵی ڕوون بوو، دەبریقانەوە. ماسیگرەکە دە ئاسمانێ هەڵچوو و خولی لێ‌دان. خۆر لە سەری گاورکۆی دا و کەبابچی‌یەکە هات، دەرگای کردەوە، پیوازی ورد کرد و بۆنی گۆشتی کوتراوی تێکەڵاو لە گەڵ پیواز و بیباری سووری وردکراو ئەو بەینەی پڕکرد. شاگردەکان پێشبەندی‌یان لە خۆ بەستن، ئاورگیان پڕ کرد لە ڕەژی، ئاگریان دا، باوەشێنیان کرد و گەشاندیانەوە. کەبابچی‌یەکە شیشە کەبابەکانی لە سەر ئاگری دانان. تا وایان کرد بوو بە قاوەڵتوونێکی درەنگ و کابرا هەوەڵدەست کەبابی بۆ حەمەدی دانا، حەمەدیش بێ ئەوەی متەقی لێ‌بێ، نانەکەی خوارد. دیسانیش وەك ڕۆژان بۆنی کەبابی بە دەوروبەری کەبابخانەی دا بڵاو بۆوە و گەیشتە نێو ئەو خەڵکە نەخۆشەی کە کۆمەڵ کۆمەڵ لە نێو مزگەوتێ، حەساری مزگەوتێ، نەخۆشخانە و کووچە و کۆڵانی دەوروبەری ئەوێ کەوتبوون و لە بەر تەوژمی لەرزوتا دەیاننالاند. دوای نیوەڕۆیە دیسان کەبابچی‌یەکە دەستێك کەبابی دیکەی بۆ هێنا. حەمەد بێ ئەوەی هەست بە برسێتی بکا و نیشتیای لە کەبابی بێ، بە پەلە هەرچی لە سەر سینی‌یەکەی بوو، بە سەوزی، کەباب، نان و تەماتەوە هەمووی خوارد و قامکەکانی لستنەوە. کات تێ‌پەڕی، حەمەد هەر وا بێ‌دەنگ لە وێ دانیشتبوو و چاوی بڕیبوە دارچنارە گەورەکەی کە جۆگە ئاوەکەی بە بن دا دەڕۆیی.

کەبابچی‌یەکە هاتەلای و گوتی:

ـ لەمێژە ئەو کابرایە نەهاتۆتەوە ئێرە.

حەمەد ڕاچڵەکی:

ـ کاڵەموویینەی چەرمی گای دەپیٚدان. لە قەراغ دەریایە بوو. لە پەنا من ڕاوەستابوو و ئەمن بۆخۆم چاوم بە لاقی کەوت. لاقی ڕاست لە تەنیشت من بوون.

ـ ئەمن نازانم چی دەپێدابوون. جارێك نەبێ نەمدیوە، ئەویش ئەو ڕۆژەی بوو کە تۆ بە دوای دا ڕات کرد.

ـ پێتوایە ئێستا دەبێ لە کوێ بێ؟

ـ ئیدی نەهاتۆتەوە ئێرە.

ـ بڵێی نەشیەتەوە؟

ـ نازانم.

ـ ناوی چی‌یە؟

ـ نازانم.

ـ بەلکوو سبەینێ بێتەوە...

ـ جا چووزانم.

ـ کاڵەموویینەکانی پێی لە چەرمی گای هەڵبەسراون...

بەیانیی ڕۆژی دواتریش، هەر لەو کاتی دا، حەمەد چۆوە ئەوێ، بەڵام کابرا نەهاتبۆوە.

حەمەد گوتی:

ـ پێڵاوەکانی کاڵەموویینەن...

ـ لە چەرمی گای...

ـ بڵێی بێتەوە؟

کەباچی‌یەکە گوتی:

ـ هەر خوا دەزانێ!

بۆنی کەبابی شەپۆل شەپۆل لە دوکانەکەی وی ڕا بە دەوروبەر دا بڵاو دەبۆوە.

سەیران، لە بەر مێشوولان، تۆڕی لە ژوورەخەوەکان هەڵواسیبوون، بەڵام حەمەد هەر هەستیشی پێنەکردبوو. کە دەچوو بخەوێ، تۆڕەکەی هەڵدەدایەوە، دەچوو یەکسەر درێژ دەبوو و خەوی لێدەکەوت. مێشوولە پۆلپۆل وەك پەڵەهەوران دەهاتن. هەموو بەیانی‌یان سەیران دەیدی کە هێندێك مێشوولە تەنانەت بە تۆڕەکەش دا هاتوونە ژوورێ. مێشوولەکان زۆر پیس

بوون، ئینسانیان دەخوارد. تەواوی لەشی سەیران و ئەوانی دیش دەخورا و نێوچاوان و دەست و دەموچاویان هەڵدەمسا.

حەمەد لە کەبابخانەکەی ڕا چوو بۆ دوکانی زەینولڵا ئەفەندی و لە وێشەوە بە نێو مەزرای چەڵتووکی دا، بە ڕێگایەکی دا ڕۆیی کە بەرەو چیا دەچوو. چووە سەر گۆڕی مامۆستا زەکی و لە وێڕا چوو و گوندەکانی دەوروبەر هەموویان لە کابرای گەڕا و هەر دووپاتی دەکردەوە:

ـ جلیقەیەکی چل دوگمەی ئالیپووی دەبەر دایە، جلیقەیەکی شین...

ـ کەسێکی ئاوام نەدیوە، نایناسم...

ـ ددانێکی زێڕە، سمێڵی باداون، تانەیەکی لە سەر چاوییە، پانتۆڵێکی شینی دەبەر دایە، پشتێنێکی ئاوریشمی بەریشووی سپیی دە پشتێ دا، گۆرەوییەکانی سوورن، کاڵەمووینەی دەپێدان، ئەنگوستیلەیەکی دە قامکی دایە، جێبرینێکی بە ڕوومەتییەوە و دیارە جێبرینی چەقۆیە. کەوایەکی خەتخەت و کراسێکی ئاوریشمیشی دەبەر دایە و برۆی زۆر گەورە و پڕن...

ـ نەخێر، کەسێکی وا ناناسم، نازانم...

ـ ئەگە دەڕوا ڕادەژێ و کاتێك ئاوڕ دەداتەوە، بە سەر لاقێکی دا دەسووڕێ. گوێی شۆڕن و سەرەوەی لەشی لە قەدەر لاقانی گەورەیە. قامکی ئەستوورن، بەڵام نێوقەدی باریکە.

ـ نایناسم، نەمدیوە...

چەڵتووك بڵیند ببوو، دەگەیشتە چۆکێ و مەزرا هەموو شین دەچوون. حەمەد هەر وا بە دوای کابرایەوە بوو و دێ بە دێ، تەپك بە تەپك و مەزرا بە مەزرا لێیدەگەڕا، بەڵام نەیدەدۆزییەوە. هەرچی وێرانە و کەلاوە هەبوون، قەڵای پایاسێ و تەنانەت ئەدەنەشی لێگەڕا، نەیدۆزییەوە. زۆر ناهۆمێد ببوو.

وای لێهات چوو و بنارەکانی ئاناوارزاشی لێگەڕا. دڕوو هیچ دەست و لاقییان نەهێشتبوو. پاشان ڕێگایەکی خۆڵەپۆتەی گرتە بەر، کە لاقی دەگوێزتنەوە، خۆڵەکە کە لە بەرتاوێ سوور ببۆوە، هەڵدەستا و لە لاقولەتەر و سەروچاوی دەهاڵا و دەیسووتاند.

ڕاست لەو کاتە دا تووشی پیاوەکەی بوو. حەمەد زۆر خۆشحاڵ بوو، چاوێکی لێکرد، بۆ لای چوو و هەتا نەگەیشتە بنی، ڕانەوەستا:

ـ سەلامون عەلەیکوم!

پیاوەکە وەڵامی سڵاوی حەمەدی نەدایەوە. حەمەد ڕقی هەستا و ڕووی لێوەرگێڕا، بەڵام پیاوەکە تێیتەقاند و ڕۆیی. حەمەد زۆر نارەحەت بوو و خۆی لۆمەکرد کە بۆچی هەر

دەسبەجێ نەیگرتوە و دوای ئەو هەموو گەڕانەی هێشتوویەتی ئاوا سووکوهاسان لە دەستی دەرچێ. ئەوێڕۆژێ هەتا تاریك داهات، حەمەد هەر بە دوای کابرایەوە بوو. ئەو بە نێو پنچك، قامیشەلێن و درِوودالّی دا هەلّدەهات و حەمەدیش لە دوای نەدەبۆوە. ئاخرەکەش لێی ون بوو. سێ ڕۆژی تەواو لێیگەڕا، بێسوود بوو. کابرا ببووە تنۆکە ئاوێك و دە عەرزیـیەوە ڕۆچووبوو. کە هاتەوە لە ڕادەبەدەر شەکەت بوو. تازە ڕۆژ وەدەردەکەوت، موسلیم لە بەر دەرگای دەرێ پشتی وەدیواری دابوو، دانیشتبوو سەری بەربۆوە سەر سینگی و هەر ئاوا خەوی لێکەوتبوو. دیار بوو چاوەڕوانی وی بووە. حەمەد بە ئەسپایی بە تەنیشتی دا ڕۆیی و نەیهێشت پێیبزانێ. گوێی لێبوو دایە حۆری بۆلاندی:" بێ و نەبێ ئەوە کوڕە مالّوێرانەکەی برایمە ڕووتیـیە، هاتۆتەوە! باشە ئەوە بە کەلکی چ دێ؟ دیار بوو ئاخرەکەی هەر وای لێدێ! ئەوە نیە شێت بووە و وەك مەجنوونی بە دەشت و کێوان دا دەگەڕێ؟

ئەو قسانە وەك خەنجەری کاریان لە جەرگی حەمەدی کرد، نەچووە ژێر مێشولەبەندەکەیەوە و هەر وا لە وێ بۆی درێژ بوو. سەیران بەخەبەر بوو، بەلاّم وەرسووڕا، پشتی تێکرد و لێفەکەی بە سەر سەری خۆی کێشا.

بەو شێوەیەی حەمەد سێ شەو و ڕۆژان کەوت. ژنەکان نان و ئاویان بە دمیـیەوە دەکرد، بەلاّم یەك قسەشی لە گەلّ نەدەکردن. مەلا سەلام، مامۆستا وەلی و ڕەفعەتی پێنەچیش هاتن بۆ لای، بەلاّم هۆشی نەبوو هیچیان بدوێنێ.

بەیانیی ڕۆژی چوارەم حەمەد هێندێك گەش بۆوە. هەستا و بە ڕووخۆشیـیەوە نانی بەیانی خوارد، بەلاّم هێشتا قسەی نەدەکرد. پاشان هەستا و وەدەرکەوت. دایە حۆری لە داخان دەهری ببوو و توند بۆ ئەوەی ئەویش گوێی لێبێ، هاواری کرد:

ــ یاڕەبی خودا ئەو مامۆستا زەکیـیەی نەبەخشێ! یاڕەبی لە گۆڕەکەشی دا نەحەسێتەوە! هەموو تاوانی ویـیە! لەوەتا ئەو مردوە، کوڕەکە وەك شێتانی لێهاتوە! خەلّك دەلّێن لە پیاوێکی دەگەڕێ، ڕۆژ هەتا ئێوارێ بە دوای دا ڕا دەکا، ڕێگایان دەپشکنێ، دەچتە قەراغ دەریایە، مەزرایانی لێ دەکا و تەنانەت چۆتەوە بناری ئاناوارزاشی لێگەڕاوە! ڕۆلّە بەستەزمانەکەم، ئاخر خۆ من پێمگوتی نەچی بۆ لای ئاناوارزای، ئەوەیە ئیدی! بۆچما ئەو گۆرانیـیەت نەبیستووە: لە ئاناوارزای ئەسپان قەلّەمباز داوێن ــ کراسەکەی وی بە خوێنێ سوور بووە ــ لە کوڕی من گەڕێ ــ کوڕی من کوڕی ئەو عەشیرەتەیە ــ گۆچانی پیریـیە بۆ ئەو کوێرە بەستەزمانەی هەلّگرە...

بۆچما ئەمن ئەو گۆرانی‌یەم بۆ نەگوتووی؟ بۆچما ئەمن نەمگوتوە هەژدیهاکەی ناناوارزای لە کەس خۆش نابێ؟ بۆچما پێم‌نەگوتبووی کە هەرگیز ڕوو دە ناناوارزای مەکەوە! ئاخر ئەوانەم هەموو پێ‌نەگوتبووی و وشیارم نەکردبوویەوە؟

دایە حۆری ئیدی کێردی گەیشتبوە ئێسکانی و دەیەویست داخی خۆی بە هەتیوی برایمەڕووتی بڕێژێ، کەزمانی بەسرابوو و قسەی نەدەکرد: وەڵڵا بابە ئەو هەتیوە لەوەتا فێری نوستنی سەر تەختی بووە، سواری ئەسپی عەرەبیی ڕەسەن دەبێ و وەك عەلی‌یە شەلی چەکمان هەڵدەکێشێ، خۆی لێ‌گۆڕاوە و شێت بووە! بەڵێ ئەو بەناوبانگ بوو، پێیان دەگوت حەمەدۆك و ئەسپەکەی مۆری پێغەمبەری بە مەلاشوویەوە بوو، بەلام دایە حۆری، ئەو پیرێژنە پەکی بە ئەسپ و مۆری پیرۆز و شتی وا نەدەکەوت! ئەو هەتیوە لە بیری نەماوە کە بستە منداڵێکی چارەڕەش بوو، بۆخۆم باڵم بە سەر کێشا و ئێستاش دەزانم چی لێ‌بکەم. ئەو هەتیوە بە تەواوی شێت بووە، بە شاخ و دۆڵان دا دەگەڕێ و دەیەوێ کابرایەکی بدۆزێتەوە. دەڵێ کابرا ددانی زێڕە، زنجیری سەعاتەکەی زێڕە... هیچ دوور نیە کەوشەکانیشی زێڕ نەبن! ئاخر هەتیوە بێ‌ئەقڵە، ئەتۆ چت لەو پیاوەی دەوێ؟ وەڵڵاهی دەبێ دایە حۆریت ئەتۆش و ئەو پیاوە ددانزێڕە سمێڵزێڕە زنجیرزێڕەشت دە قولینچکێکی پەستێوێ و واتان بە سەر بێنێ کە نەزانن زیندوون یان مردوون... ئەتۆ ئەو کچە ماڵوێرانەت هێناوەتە ئێرە، دەو شوێنە گەرمەی دا، لە غەریبی‌یە دا، داتناوە و ئێستاش خۆی تێ‌ناگەیەنی خوێڕی! کاتێك دایە حۆریی سەر بەقوڕی ماڵوێرانت ئەم خانووەی دی و وێنەی حەزرەتی عەلیی لە شوێنی شیاوی خۆی بە دیواری‌یەوە دی، گوتی ئۆخەی ئەوە کوڕەکە ئاقڵ بووە و پێی‌وابوو ئیدی لە لای دەحەسێتەوە. دە بڵێم ڕۆڵە چت لێ‌تەیە؟ ئاخ... یارەبی خودا بتپارێزی. ئای خوایە... ئەوە دەڵێم چی؟ ڕەبی لاڵ بم، زمانم بە بڕین چێ و ئیدی نەتوانم تووك و نزایان بکەم! دایە حۆری هێناوەتە ئێرە، ئەو نێو گەرمایەی، مێشوولەی لێن وەك گورگی بە خوێن تینوون، بۆخۆشی یان نایەتەوە، یان ئەگەر دێتەوە، قڕوقەپ دادەنیشێ و قسەیەکمان لە گەڵ ناکا. ئای خوایە، لێرە، لەو دەشتەی چوکووڕاوایە، لەو گەرمایەی، مێشوولان لێمان بوونە گورگ و خەریکن قووتمان دەن، بەلام لەوەتا لێرەم، ئەو خوێڕی‌یە ئاوڕێك وە دایکە حۆریی خۆی نادا! چاو... ئەو هەتیوە چووە لە لای وێنەگەری ئەکسی داحەوا و بابادەمی کریوە، داحەواش چ داحەوا... مەمکی بستێك دەرپەڕیون، بابە ئادەمیش خۆ دێرە دا هەر وەك بەشەرانیش ناچێ و لەشی وەك بەرازی کێوی تووکنە. مامۆستای وێنەگەر بە قەد مریشکێکی تووك پێوە هەڵواسیوە. ئەو هەتیوە خوێڕی‌یە پێی‌وایە بە وانە بۆتە شتێك و خۆی پێ‌بەشایی‌یە... جا تۆخوا

ئەوەش وێنەیە، وەڵڵاهی هیچیان هیچ نین! تەمەشا کە... چوون سێوێکیان لە بەینی ئەوە دوو گێلانە داناوە و مارێکی بە قەد مارەکانی ئاناوارزاشیان لە گەڵە، حەوا کە ڕووتوقووتە و هەر گەڵایەکی بە سمتی‌یەوە هەڵواسیوە لە گەڵ ئادەمی بە کێشە هاتوە، ئادەمیش پشتی تی‌کردوە و نایەوێ بەو حاڵەی بی‌بینێ...

بەو شێوەیە دایە حۆری هەر دەی‌بۆڵاند، جنێوی دەدان، تووك و نزای دەکردن و تەوس و پلاری داویشت. تەنانەت ئەگەر سەیران نەگەیشتبایە، نێوبژیوانیی نەکردبایە و هێوری نەکردبایەوە، لەوانە بوو دایە حۆری ئەوەندەی شوو لێ هەڵکێشابایە و هێندەی قسەی ناحەز بە زاری دا هاتبایە، کە ئیدی نەی‌توانیبا، چاو لە چاوی حەمەدی بکاتەوە و دوایەش کە پەژیوان دەبۆوە، ناڕەحەت دەبوو و بە چۆکی خۆی دادەدا. هەر بۆیە سەیران لە بەری‌دەپاڕایەوە و دەی‌گوت:

ـ دایە حۆری، دایە حۆری گیان! کچێ بۆ خاتری خودای، ئاوا خەمێ داگری و خۆت ناڕەحەت کەی، دەمری و حەمەد و ئێمەش هەموو ماڵوێران دەکەی! دایە گیان حەمەد ناڕەحەتە، گرفتی هەیە، بەڵام دەبێ سەبر بگرین و ددان بە جەرگی خۆمان داگرین. خودا گەورەیە و ئیشاڵڵا هەر بۆخۆی ڕێگایەك بۆ ئەو کۆسپەش دەدۆزێتەوە!

ـ باشە.، ئەو کابرایە کە حەمەد بە دوای دا دەگەڕێ، کێ‌یە؟ ئەو بابانوێرانە چ کەسە کە حەمەدی منی ئاوا عەوداڵ کردوە؟

ـ نازانم دایە گیان... بەڵام ڕاوەستە، هێندەی پی‌ناچێ حەمەدۆك وشیار دەبێتەوە و وازی لێ‌دێنێ. دیارە حەمەد ناڕەحەتی‌یەکی هەیە دایە!

ـ باشە، دەبێ چ ناڕەحەتی‌یەکی هەبێ؟

ـ نازانم، دایە.

دایە حۆری دەمودەست خاو بۆوە، ڕق و تووڕەیی چی‌یە، دە دڵی دا نەما و لە تەوس و پلارەکانیش کە دە حەمەدی گرتبوون، پەژیوان بۆوە:

ـ ڕۆڵە گیان، ئەدی ئەو بۆ نایە گرفتەکەی لە گەڵ ئێمە باس بکا! هەر بزانم ناڕەحەتی‌یەکەی چی‌یە، هەموو هەوڵی خۆمی بۆ دەدەم و خۆشمی بە قوربان دەکەم. هەر چی هەمە و نیمە بە قوربانی ویی دەکەم. بەڵێ بەڵێ... خۆشمی دە سەر دەگێڕم! ڕەبی تووکم لە سەری زمانی بێ، ئەو زمانە بە بڕین چێ تووك لە حەمەدی دەکا. حەمەدۆکی من، گوڵی سووری من، کە خودا وەك شێری خۆی، وەك حەزرەتی عەلیی دروست کردوە، ئێستا گرفتی

هەیە. ئاخر هێندە خۆی بخواتەوە، پێدەچێ! خوا نەخواستە دڵی ڕادەوەستێ! خودا بمانپارێزێ! ئاخر کچم دەبێ گرفتەکەی چ بێ؟ تەمەشا کە: خانووی چاك دەڵێی، هەیەتی. خانووی دەڵێی قەسری پاشایە و ئەو حەسار و باغەجوانەشی هەیە! ئەگە بە بازاڕی دا دەڕوا، تەواوی ئەو دوکاندارانە لە بەری هەڵدەستن! خۆ ناشزانن ئەو حەمەدۆکی بەناوبانگە. با هەر نەشزانن و هەر ئەو و من و خۆت بزانین و دیارە خواش دەزانێ... دە باشە، با ئەو کابرا ددانزێڕە پێڵاوزێڕەی هەر نەدۆزێتەوە! ئەگەر نەیدۆزییەوە چ دەقەومێ؟

ـ ئەمن پێموایە یەکێك ئەو کابرایەی دەناسێ و حەمەدیش ناسیویەتەوە.

دایە حۆری تووڕە بوو و دەستی دەکەلەکەی نا:

ـ ڕۆڵە گیان، سەیران، بووکە جوانەکەم، چیدی وەك پشیلەی بە دەوری دیزەی گۆشتی دا مەمیاوێنە! ڕۆڵە با چی دیکە خۆمان فریو نەدەین! هەتا کەنگێ ئەوەی بشارینەوە؟! بۆ چاومان بقووچێنین؟ ئێمە دەزانین بۆچی حەمەد وا دەکا و گرفتەکەش چی‌یە!

سەیران سوور هەڵگەڕا، ئارەقێکی ساردی هێنا و برد و سەری بەردایەوە:

ـ وایە، دایە گیان، شاردنەوەی بێسوودە. حەمەد وازی شاخیی هەستاوەتەوە، بەڵام هێشتا بە تەواوی ساغ نەبۆتەوە. هەر بۆیەش ناڕەحەتە و خەریکە دیق دەکا... ئاخر ئەی هاوار ئێمە چمان لێکردوە؟ بۆ دەیەوێ بەجێمان بێڵێ؟

پاشان سەری وە سەر دەستی دایە حۆری کرد و لە پڕمەی گریانێی دا:

ـ ئاخر چمان لێکردوە؟ ناڕەحەتمان کردوە؟ خۆ قەت نەیگوتوە لێمان ناڕەحەتە! دوو مانگیش دەبێ قسەی لە گەڵ نەکردووین! دە با بڕواتەوە شاخی و ببێتەوە حەمەدۆك، بەڵام چی‌دی ئێمەش و خۆشی ئازار نەدا. با چیدی وە دوای ئەو پیاوە ددانزێڕەی نەکەوێ! با چی دیکە خۆی شەکەت و شەلاڵ نەکا! بەسە با چیدی زووخاومان پێهەڵنەهێنێ... دایە گیان... تۆخوا دایە، ئەمن چم لێکردوە؟

دایە حۆرێ هیچی نەگوت، ڕاوەستا تا سەیران گریان و قسەکانی تەواو بوون و کوڵی دڵی خۆی ڕشت. تەنیا دەستی بە سەری دا دێنا و دەیلاواندەوە. دوای ئەوەی سەیران ئارام بۆوە و دانیشت، ئەویش چوو لە پەنای دانیشت، دەستی هاویشتە سەر شانی و بە ئارامی گوتی:

ـ کچم، کیژۆڵە جوانەکەم، گوڵە سووورە چارەڕەشەکەم، ئەمن ئەو حەمەدەی لەو کاتەوە لە دایکی خۆی بووە، دەناسم. بە منداڵی لە گەڵی بووم، تا گەورە بووە، هەر ئاگام لێی‌بووە و بە گەورەییش قەت لێی‌بێخەبەر نەبووم. هیچ‌کەس ئەو کوڕەی وەك من ناناسێ. ئەمن دەزانم ئەو

بیر لە چی دەکاتەوە و دەنێو خۆی دا چ دەکێشیٚ! کچم، بە خوا ئەگەر مردنی ماموٚستا زەکیش بە سەر دا نەهاتبا، هۆیەکی دیکە هەر دەبوو کە حەمەد لە شاخی بداتەوە. گوڵەکەم، کیژە شیرینەکەم، گوێم لیٚبگرە. ئەوە تاوانی تۆ نیە! ئەگەر حەمەد ئەو ماوەیەش توانیویەتی خۆی ڕابگریٚ و لێرە بمێنیٚتەوە، لەبەر ئەوەیە کە تۆ و منی زۆر خۆشدەویٚ. تەنانەت لە خۆشی زیاتر خۆشدەویٚین! ئەو دەروونی لە گەڵ ئەو ژیانەی نامۆیە و لە گەڵ زوڵم و ستەم دەرنابا! کەوابوو بڕوانە کچم، لە جیاتیی ئەوەی ئەو هەر یەسکو پێستێك بیٚ و بە سەر پێوە بیٚ و بچیٚ، یان وەك دەستەنوێنی قەرەچییان لە ویٚ پان بێتەوە، لە جیاتیی ئەوەی بە دەروونێکی خەماوی و ئالۆزەوە لە جێوبانی نەرموگەرم و لێفەی حەریر دا بتلێتەوە، لە جیاتیی ئەوەی کە لە حەیفی ئەو شتانەی دەی بینیٚ، دڵی بتۆقیٚ، یان دە نێو خۆی دا زووخاویٚ هەڵێنیٚ، نەخۆش بکەویٚ و دە جێیە بکەویٚ، وا چاترە بچێتەوە شاخی و لە ویٚ وەك هەڵۆیەك، شەهێنێك، یان پڵینگێك بڕیٚ! کچم، لە هەوەڵێوە چارەی ئێمە ئاوا نووسراوە. پێتوانەبیٚ تاوانی تۆیە. لێیگەڕیٚ با ڕۆژێکی تاریکوڕوونی بەیانی، لێی سواری ئەسپی بی، تفەنگیٚ دە شانی کا، فیشەکدانان چەپ و ڕاست لە خۆ بەستیٚ و بڕواتەوە شاخی!

سەیران فرمێسکەکانی سڕینەوە و گوتی:

ــ بەڵیٚ، ڕاست دەکەی دایە، وا چاکترە بچێتەوە شاخی و بەو حاڵەی لێرە نەمێنێتەوە! وەك پڵینگێك، وەك شەهێنێك، بڕواتەوە ماڵی خۆی کە چیایە. ئەو دەمەی لە بەرزایی ئاسمانیٚ دەفڕیٚ، وەك ڕۆژیٚ دەترووسکێتەوە، نەك ئەو کاتەی کە نزم دەبیٚ و ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر بەرەو نشێو دەکشیٚ. ئەو دەبیٚ بە سەر چیا بەرزەکان دا بفڕیٚ، لە سەر لووتکەی کێوەکان بترووسکێتەوە و لە وێوە تیشکی بگەیەنێتە دڵی من و گەرمم داهێنیٚ. ئەمن هەتا ماوم چاوەڕوانی دەبم. ئەمن دەمەویٚ ببێتەوە حەمەدۆك، ببێتەوە پڵینگی چیای هەزارگای. وەڵڵاهی ئەمن هیچم لیٚنەکردوە، وا نیە دایە حۆری؟ ئەمن دڵیم نەیەشاندوە. هەمیشە ڕێزم گرتوە و قەت شتێکی وام نەکردوە، پێیناخۆش بیٚ. وانیە دایە حۆری؟ توخوا وەڵامم دەوە بزانم قەت ئەمن دڵی ویم یەشاندوە؟

دایە حۆری دەستی دەستۆی کرد، بە خۆیەوە گوشی و وەك منداڵان ڕایژاند:

ــ گوڵەکەم، کیژە خوێنشیرینەکەم، بەستەزمانەکەم، مسکێنەکەم. خودا ئەتۆی زۆر باش دروست کردوە. دڵیشت وەك ڕوخسارت جوانە گوڵەکەم! ناسکۆڵەکەم، ئەتۆ قەت خراپ نەجووڵاوییەوە. ئەتۆ خاوەنی دڵێکی زۆر گەورە و میهرەبانی...

ئەو جار سەیرانی بەردا و گوتی:

ـ کیژە چاو ئەستێرەکەم، هێندێك پیاوی دیکەش هەن، کە وەك حەمەدی وان. کاتی خۆی بەتالآغای یۆرووك بە منی گوتوە کە کرمێکی شەبەقدار لە دلّی حەمەدۆکی دا هەیە، ئەو کرمە بە دایم دلّی وی دەخوا، ئەگەر ئەوان ئەو کرمەیان بۆ بکوژرێ، وەك ئی بایرامۆغلی، ئیدی دەرووخێن... هەر بە زیندوویی دەمرن، وەك بایرامۆغلی... وەك ئێستای حەمەدی!

ـ شوکرانەبژێرم دایە حۆری، شوکری خودای دەکەم، مەڕێکی دەکەمە قوربانی. خۆ ئەمن هەلّەیەکم نەکردوە، وا نیە؟ خودا بۆخۆی دەزانێ ئەمن قەتم دلّ نەیەشاندوە!

دایە حۆری قسەکەی بڕی:

ـ بەسە بێدەنگ بە، ئەتۆ چت پێدەکرێ؟ ئەوە کاری خودایە! خودا ئەو کرمە شەبەقدارەی دە دلّی حەمەدی هاویشتوە!

پاشان یەکتریان دە ئامێز گرت و سەیران هەردووك دەستی دایە حۆریی ماچ کرد.

داوی ئەوە هەردووکیان چوونە چێشتخانەکەیان و دەستیان بە چێشتلێنانێ کرد. چی حەمەد پێی خۆش بوو لێیان نا. هیچیان چی دیکە هەستیان بە خەم و پەژارە نەدەکرد و لە خۆشی‌یان دەت‌گوت فڕین. لای ئێوارێ حەمەد بە لارەوە لارەوە، وەك کەسێکی دە خەوێ دا بڕوا، هاتەوە. کاتێك سەیران و دایە حۆری لە حەسارێ گوێیان لە دەنگی پێی بوو، هەردووکیان ڕایانکردە دەرێ، بە پیری‌یەوە چوون، دە ئامێزیان گرت و ماچبارانیان کرد. قابلّەمەکان لە سەر ئاوری بوون و بۆنێکی خۆشیان لێ‌هەلّدەستا. دایە حۆری بێ ئەوەی بیر بکاتەوە، یەکبین قسەی دەکرد، باسی ڕیحانەکانی خۆی دەکرد کە تازە شەتلّی کردبوون و تاریفی بۆنەکەیانی دەکرد، باسی هێلانە پەڕەسێلکەکەی هەیوانێی دەکرد، دەی‌گوت بێچووە پەڕەسێلکەکان زاریان دادەپچڕن، هەتا دایکیان شتیان بۆ تێ‌دەکا. هەروەها باسی شار و ئەو پیاوەشی کرد کە زنجیری سەعاتەکەی زێڕ بوو... سەیری کرد حەمەد گەش بۆوە، ئەویش لە سەر قسەکەی ڕۆیی... خەلّکی شاری دەلّێن خوارزای مەلا سەلامی سەیری بە سەر هاتوە: ڕۆژ هەتا ئێوارێ بە دوای کابرایەکی دا دەگەڕێ کە هەم ددانی زێڕە و هەم زنجیری سەعاتەکەی. دەلّێن خەو و خۆراکی لێ‌هەلّگیراوە، بەلاّم ئەوەی ئەو لێی‌دەگەڕێ، هەر لە بناخە دا نیە... دایە حۆری لەو باسەی ڕا چووە باسێکی دیکە. گوتی شەش مریشکی هێلکەکەرم کڕیون و ئێستا هەر شەشیان کورکن، هەر یەکەو پڕی کۆشێکم هێلکە وەبەرناون و لە سەر هێلکان کەوتوون. ئەو جار باسەکەی گۆڕی و چووە سەر تاریفی هەنگوینی شاخی، گوتی هێندە بە قەوەتە هەر کەس بی‌خوا قەتی لە بیر ناچێ. پاشان باسی دەریایەی کرد و گوتی هێندە پانوبەرینە، شەوانە کە چاوی لێدەکەی و دەتەوێ ئەو سەری ببینی، تەمەشا دەکەی لە گەلّ ئەستێران تێکەلّ بووە و ئیدی ئەستێرە نەبێ، هیچ شتێك نابینرێ.

سەیران لێرە دا وە قسە هات و گوتی:

ــ ڕاست دەکەی دایە، ئەمنیش شەوێکی چاوم لە دەریایە کرد و دیتم دەریا پڕی ئەستێرەیە! دەتگوت ئاسمان خڕوپتوونی دە دەریایە کەوتوە!

حەمەد بە قسەی ژنەکان خۆشحاڵ دەبوو و بەدەم ناخواردنەوە بە تەواوی گوێی بۆ ڕاگرتبوون. قسەکانی بە دڵ بوون و هەستی دەکرد جار بە جار زیاتر دەکرێتەوە و هەست بە خۆشی دەکا. لەگەڵ ئەوەش کە دیسان قسەی نەکرد، بەڵام بە ڕوونی دیار بوو کە گۆڕاوە. چاوەکانی گەشتر ببوون. جارجار بزەیەکی دەهاتێ و لێوەکانی دەکرانەوە. دوای نانخواردنێ هەستا و چوو لە ژێر مێشوولەبەندەکەی درێژ بوو. سەر وە سەر سەرین کردن و خەوتنی یەك بوو.

سەیران لە سەرەخۆ گوتی:

ــ بڕوانە دایە حۆری، چەند جوان نوستووە! چاو چۆن لێوەکانی هەڵقرچاندوە؟ هەر دەڵێی منداڵێکی پاك و ساکارە! ئەرێ قەت کەس چەتەی دیوە ئاوا پاك و بێتاوان بخەوێ؟

ــ بەڵێ، ئێستا چەتەی وەك ئەو حەمەدۆکەی خۆمان، کە ئەوە لە پێش چاومانە و پێشتریش کوێرۆغڵی. ئەوانە چونکە هەمیشە دڵیان پاك بووە، کاتێك خەوتوون وەك منداڵێکی پاك و بێتاوان چوون! حەزرەتی عەلی، ئیمامی چاوکاڵمان، ئەوەی کە بە شێری خودای بەناوبانگ بووە، ئەویش هەر وەك حەمەدۆکی بووە: دەڵێن ئەویش کە نوستوە، لێوەکانی ئاوا وەك منداڵان هەڵقرچاندوە. ئەوانەی دڵیان ڕووناکە، لە دەروون دا وەك منداڵێکی پاك و ساکارن، وەك ئەو حەمەدۆکەی خۆمان! هەربۆیەشە تووشی ئەو هەموو ناڕەحەتی و کۆسپانە دێن!

سەیران و دایە حۆری چوونەدەرێ و لە حەسارێ دانیشتن. دایەحۆری دەستی بە گۆرانی گوتنێ کرد. گۆرانی‌یەکی کۆنی زۆر خۆشی دەگوت کە سەیران قەتی نەبیستبوو. هەوەڵێ سەیران هەر گوێی دەدایە، بەڵام زۆری پێنەچوو کە ئەویش وە لۆرانەوە کەوت و لە بەری گێڕایەوە.

هەوا زۆر گەرم بوو. کزەبایەکی هات. کزەبایەکە بۆنی شاخی پێوە بوو.

هەتا پاییز داهات، کار و پیشەی حەمەدی ئەوە بوو کە لە بەینی لێواری دەریایە، دوکانی زەینولڵا ئەفەندی و کەبابخانەکەی دا دە هاتوچۆ دا بێ، لە قەرغ دەریایە دانیشێ و چاو ببڕێتە ئاوە شینە بریقەدارە بێسنوورەکەی، ماسیگرە تەنیاکە کە بەرز دەبۆوە بۆ ئاسمانێ، خڕەکە کە پنگەکانی لێ بوون و پەپوولە مردووەکە کە هێشتا هەر لە وێ کەوتبوو. جاروبار بە نێو چەڵتووکەجاڕی دا دەچوو بۆ قەڵای پایاسێ و گوندەکانی دەوروبەری وێشی بە سەر دەکردەوە. بە کورتی هەموو دەوروبەری شارەکەی دەگەڕا، تەنانەت هەتا بناری گاورکۆش دەچوو. لە وێ خەڵك باسی مستۆ پاشایان بۆ کرد.

مستۆ پاشا زوو چەتە ببوو و قەڵایەکی لە سەر ڕەوەزە بەردێکی بەرز دروست کردبوو. ئەو قەڵایە ئێستاش مابوو. دەیانگوت مستۆ پاشا یاغی بووە، هەر کاروانێکی بێرە دا ڕۆیوە، باجی لێوەرگرتوە و بەشێکی باجەکەشی بۆ سوڵتانی ناردوە. مستۆ پاشا خزمی کووچیکعەلی ئۆغلی بوو کە ئەویش بە پێی بڕیاری سوڵتانی گەورە وەك بەگێکی عەشیرەتی ئوێزەرلی قبووڵ کرابوو.

حەمەد چووە قەڵای پایاسێش کە ئەو کاتی زیندان بوو. دیوارە ئەستوورەکانی ئەو قەڵایەی پیاویان لێدەتۆقی. ڕۆژێکیان کاتێك ئاوی دەریایە بە تەواوی ڕوون بوو، کەشتی‌یەکی گەورەی چاوپێکەوت کە لە شۆق و ڕوناکایی دا دەدرەوشایەوە و وای دەهاتە بەر چاو کە لە نێوان ئاسمان و دەریایە دا ڕادەژێ. کەشتی‌یەکە ماوەیەکی زۆر جووڵەی نەدەکرد، پاشان چراکانی کووژانەوە و وردە وردە لە ئاوێ دا نوقم بوو و ون بوو... حەمەد بە نێو چەڵتووکە جارەکەش دا دەڕۆیی. مەزراکە هەمووی شین دەچوو و پڕ بوو لە سیسرە. مێشوولە حەشریان دەکرد و نەك هەر ئینسانەکانیان وە ئامان هێنابوون، بەڵکوو هێندەی نەمابوو ئەسپ، مەڕ، مانگا و ماڵاتی دیکەش کە شەوانە لە دەرێ دەمانەوە، هەڵلووشن. وا لە ماڵاتی بەستەزمان دەهاڵان و دەمیان تێدەنان، هەموو گیانیان خوێنی لێدەچۆڕا. گۆڕستانی گوندەکان ڕیز ریز گۆڕی تازەیان پێوە زیاد دەبوو. لە هێندێك گوندان کە گۆڕستانەکانیان بەرتەسك بوو، جێ‌نەمابوو مردووی لێبنێژن. خاوەنزەوی‌یە گەورەکان کە وادەیان دابوو بە پووڵی خۆیان مێشوولەبەندان بۆ خەڵکی گوندەکان بکڕن، گوێی خۆیان ئاخنیبوو، تەنانەت یەك مێشوولەبەندیشیان بۆ هیچ‌کەس نەکڕیبوو و دەتگوت مێشێکیشیان لێ میوان نیە. خەڵکەکە دەنێو قوڕوقاڵی پڕ لە مێشوولە دا دەتلانەوە و مێشوولەش ڕۆژ بە ڕۆژ پتر دەبوون و زیاتر بڕستیان لێدەبڕین. پیاو، ژن و منداڵی جووتێرەکان هەر یەسکو پێستێکیان لێ مابۆوە.

بەو حاڵەش ئێستا ئیدی کەس لە دوکانی زەینوڵڵا ئەفەندی باسی بارودۆخی گوندەکان و مردنی مامۆستا زەکیی نەدەکرد. دەتگوت کەسێك بە ناوی زەکی نەژاد هەر قەت نەبووە، یان ئەوەی کە دەگوترا ئاو وەسەر گوندەکان گەڕاوە، خەڵك دە قوڕوقاڵی دا دەژین و میشوولە خەریکن پیاوی دەخۆن، هەر گاڵتە بووە! حەمەد سەری سوڕمابوو. مامۆستا زەکی پێش مردنیی زۆری باسی ئەو وەزعەی بۆ کردبوو، بەڵام ئەوەی دەی‌دی زۆر لەوە خراپتر بوو کە ئەو لێکی‌دابۆوە و کارەساتەکە ئێستا زۆر ڕوونتر خۆی دەنواند. جووتێرەکان دە قوڕوقاڵی دا دەژیان و تاولەرز حەشری دەکرد. کوژرانی مامۆستا زەکی جووتێرەکانی چاوترسێن کردبوو.

دوکانی زەینوڵڵا ئەفەندی ئێستاش مەکۆی ئێوارانی گەورە گەورانی شاری بوو. لە وێ کۆ دەبوونەوە، خزمەتیان دەکرا، چایان دەخواردەوە و قسەی خۆیان دەکردن. دیارە کاتێکیش لە وێ

وەدەردەکەوتن، هەرکامە و بە شێوەیەك دەنگۆیان وەدوو دەخرا و بە خراپ باسیان دەکرا: ئەوە دزە، ئەوە تاوانبارە، ئەوەی دی ساختەچی و فێڵبازە، ئەوەیان بەرچاوتەنگە... دیارە ئەوانەی هاتوچۆی ئەویشیان دەکرد، هەموویان دەیانزانی کە پاشەملە باسیان دەکرێ و کاتێك لە دوکانەکە هاتنە دەرێ، هەر هاونشینەکانی خۆیان باسیان دەکەن و دەنگۆیان وەدوو دەخەن. حەمەد لەو شتەی سەری زۆر سوڕ دەما، بەڵام قەت پێیخۆشنەبوو لەو بارەوە پرسیار لە مەلا سەلامی یان کەسێکی دیکە لە هاوڕێکانی مامۆستا زەکی بکا. حەمەد دەیزانی کە زۆر جاران باسی خۆشی لەو دانیشتنانە دا دەکرێ. سەرەتا خەڵك گوتبوویان کە حەمەد بە دووی کەسێکییەوەیە کە ددان، سمێڵ و کەوشەکانی زێڕن، بەڵام دوای ماوەیەکی پیاوەکەیان کردبووە کچێك و کچەکەش پرچی زێڕ بوو، ملوانکەی زێڕی دە ملی دا بوو و ئەنگوستیلەی زێڕیشی دە قامکێ دا بوو. حەمەد ئەوەشی دەزانی کە زۆر دەنگۆیان سەبارەت بە سەیرانێش ساز کردبوون، بەڵام کەس نەیدەوێرا بۆی بگێڕێتەوە.

هەتا هاوین تەواو بوو، حەمەد لە گەڵ ئەو دەنگۆ و قسەوباسانە ژیا و بیستنی. لەو بەینەی دا هێندێك کەسیش هەبوون کە حەمەد باوەڕی پێیان بوو و بەدڵ ڕێزی دەگرتن. ئەوانەش مەلا سەلام، وەلیی زیندروو و ڕەفعەتی پینەچی بوون، کە حەمەد لەوەی دوایەیان هێندێك دوودڵ بوو. سەرەنجام هاوین بەسەرچوو و پاییز داهات.

بێجگە لە دایە حۆری، سەیران و تا ڕادەیەك مەلا سەلامیش کەس نەیدەزانی حەمەد بیر لە چی دەکاتەوە و ئەویش ئەمەی پێخۆش بوو، بەڵام ئەوە کە نەیدەتوانی ساغ بێتەوە و بڕیاری یەکجارەکی بدا، زۆری ئازار دەدا. مەلا سەلام یەك ـ دوو جاران ویستبووی ڕاست و ڕەوان قسەی لە گەڵ بکا و نیازی دڵی بزانێ، بەڵام هەر زوو تێگەیشتبوو کە حەمەد کەم و زۆر نایەوێ گرێی دڵی بکاتەوە و قسان بکا، هەر بۆیە وازی لێهێنابوو.

کە پاییز داهات، چەڵتووك گەیشت. گوڵی چەڵتووکەکەی بە لاسکێوە هەڵمسان و چەڵتووکەجاڕەکان وەك ئەو زەوییانەی گەنمیان لێدەچێندرا زەرد هەڵگەڕان. خەڵکێکی زۆر کە بە سەپان گیرابوون، لە شاخی و لە دەشتێ ڕا داوەرین. هەموو کز و کەلەلا و هەر یەکەو کۆلێك پێ. لە قەراغ زەوییەکان خێوەتیان هەڵدان و کۆخیان دروست کردن. پاشان دەستیان دا داسان، چوونە نێو چەڵتووکەجاڕی، کە هەتا ئەژنۆیان بە قوڕێوە دەبوون و دەستیان بە چەڵتووکدروونێ کرد. سەپانێکی زۆر بەو شێوەیە ڕۆژ هەتا ئێوارێ، لە تاریکوڕوونی بەیانییەوە هەتا تاریکانێ، کاریان دەکرد. چەڵتووکەجاڕ دەتگوت دەریایە. قوڕ هەتا چۆکێ دەهات و لە نێو ئەو قوڕوزەلەقەی دا پۆلپۆل ژن، پیاو، منداڵ، پیر و جحێڵ کاریان دەکرد. گرموهۆڕی کولۆشکوتان گوێی پیاوی کەڕ دەکرد. برینجەکە

دوای کوتان و خاوێنکردنەوە لە عەرابەی گەورە گەورە کە کەڵ یان گایان تێدەکران، یان لە داشقەی کە ئەسپی قوڕاوی ڕایان دەکێشان، بار دەکران و بەرێدەکرانە جەیهان و ئەدەنەی.

لە بەرەبەری تەواوبوونی بەرهەمکۆکردنەوەکەی دا، بارانی چوکووراویە دەستی بە بارینێ کرد. هەموو ساڵێ هەر وا بوو. بارانەکە پسانەوەی نەبوو، و ڕۆژ بە ڕۆژ خراپتر دەبوو. گرمەی هەوران و شەبەقی برووسکان نەدەبڕایەوە. ڕەشەبا خێوەتی سەپانانی هەڵدەکەند و کۆخەکانی تێکەوە دەپێچان. ئەوانیش ناچار بە پەلەپەل خۆیان کۆ کردەوە، بەشێکیان بەرەو شوێنی ژیانی خۆیان لە دەشتەکان و چیاکان بوونەوە و بەشێکیشیان دەستەوەستان و بێدەرەتان هاتنە نێو شاری و لە بن دیواری مزگەوتێ و حەساری شارەداری مانەوە. حەمەد ئاگادار بوو کە ئەوانە ئەو سەپانانە بوون کە خاوەنزەوی‌یەکان پووڵیان نەدەدانێ و ئەوانیش هەوڵیان دەدا حەقەکەیان بستێنن. حەمەد خەفەتی بۆ ئەو خەڵکە بەستەزمانەی دەخوارد، پێی‌خۆش بوو بزانێ ئاخری کارەکەیان بە کوێ دەگا و چی‌یان بە سەر دێ. هەر بۆیە بەیانی زوو هەستا، چووە شاری و لە وێ چووە نێو سەپانەکان کە لە بەر بارانێ هەڵدەلەرزین. پاشان ئەوان بۆ ئەستاندنی پووڵەکەیان بۆ لای ئاغا و بەگەکان وەڕێکەوتن، ئەویش نەهاتەوە و لە گەڵیان چوو. دەو حاڵەی دا حەمەد لاوازتر ببوو، بەڵام چالاکتر و توندوتۆڵتری دەنواند. کە لێتدەڕوانی وەك خەنجەرێکی تیژت دەهاتە بەرچاو و چاوەکانیشی گەورەتر ببوون. ئەو گۆڕانە توند و تیژە، دایە حۆری و سەیرانی دەترساند. مەلا سەلامیش نیگەران بوو.

دایە حۆری ناڵاندی:

ـ گوڵەکەم، کیژە جوانەکەم، حەمەد دەست داتەوە تفەنگێ و بچێتەوە شاخی چاترە لە وەی لێرە بمێنێتەوە و نەختە نەختە بمرێ... من و تۆ، دوو بە دوو دەتوانین کاروباری خۆمان جێبەجێ بکەین و بە تایبەت ئێستا کە موسلیم لێرەیە، گرفتمان نابێ. خوا بکا ئەو هەر چی زووتر بڕوا، ئێمەش دڵمان هێندێك دەحەسێتەوە و هێندە نیگەران نابین...

ـ ئیشاڵڵا دایە حۆری، ئیشاڵڵا...

سەپانەکان لە بەیانی‌یەوە تا ئێوارێ لە بەر دەرگای ئاغا و بەگەکان چاوەڕوان بوون، بەڵام هەرچی هەوڵیان دا و کووڕووزانەوە، کەس لێی‌نەپرسین و کەسیش دەرگای لێنەکردنەوە. ئەگەر بە هەڵکەوت ئاغایەکیش بە لایان دا دەهات، دەپاڕانەوە و دەیانناڵاند:

ـ ئاغا گیان، دەستت ماچ دەکەین! لاقت ماچ دەکەین! ئاخر ئێمە کارمان بۆ کردووی و ڕەنجمان کێشاوە. بەزەییت پێمان دابێ و حەقی خۆمان بدەیە! ئاغا گیان، ئاخر ئێمە چۆن بێ‌پووڵ بچینەوە؟ خۆ نانی شەوێمان نیە! چاومان لێکە ئاغا! بۆخۆمان و ژن و منداڵمان هێندەمان کار بۆ کردووی، لە

پیّکەوتووین و هیچمان وەك بنیادەمی ناچین! هەمووومان بە پیر و جحێڵەوە نەخۆشین. ئاخر بمانبینە لە بەر ئەو بارانەی چمان لیّهاتوە؟ بۆخۆت دەبینی چەند بیّتەنواین!

ئاغاکەش بە لالووتی وەڵامی دەدایەوە:

ــ برینجەکە نەفرۆشراوە، کۆمپانییەکە هێشتا پوولّی نەداومیّ...

وەڵامی ئاغاکان لە وەی زیاتر نەبوو. بەشێك لە سەپانەکان سەرەنجام وازیان لە پوولّەکەیان هێنا و بە چاوی بە فرمێسکەوە شارەکەیان بە جیّهێشت.

لەو بارەوە شاکیر بەگ لە هەموو ئاغاکان بیّچاوورۆتر بوو و کەم و زۆر گوێی نەدەدا بە سەپانە بیّتەنواکان. ئەو کۆمەڵە سەپانەی کاریان بۆ وی کردبوو و دیارە زۆریش بوون، لە بەیانییەوە تا ئێواریّ بە دوایەوە بوون. بەستەزمانانە ڕێگایەکی دیکەیان نەبوو، ئاغا بۆ هەر لایەکی نێو شاری چووبا، وەدوای دەکەوتن، دەپاڕانەوە و کە ئەویش وەڵامیّ نەدەدانەوە تووك و نزایان لیّدەکرد، کاتێك دەچووە قاوەخانەی، لە بەر دەرگا ڕادەوەستان و چاوەڕوانی دەبوون، کە بەرەوماڵیش دەبۆوە، بە دوای دا دەڕۆیشتن و لە دەرەوەی حەساریّ کۆ دەبوونەوە. کە دەچووە لای شارەدار، یان دوکانی زەینولّلا ئەفەندیش، ئەوان لە دەرەوە ڕادەوەستان و بە لەشی قوڕاوی و خووساوەوە لە ویّ ڕادەوەستان.

وای لیّهاتبوو خەڵکی شارەکەی لە گەڵ ئەو بەزمەی ڕاهاتبوون، نە خۆیان دە سەپانەکان دەگەیاند و نە پێشیانەوە ماندوو بوون. هەر زەینولّلا ئەفەندی باسی دەکردن و ئەویش بەوەوە ماندوو بوو کە گۆیا سەپانەکان ڕوومای شارەکەیان تێکدابوو، هەڵسوکەوتیان پاشکەوتووانە بوو و ببوونە هۆی ناڕەحەتیی خەڵکی شارەکە. تەنیا مامۆستای وێنەگەر و هاوڕێکانی زگیان بە سەپانەکان دەسووتا و کاتێك لە ماڵەکانی خۆیان کۆ دەبوونەوە، باسیان دەکردن و بڕوایان وابوو کە هەم دەوڵەت و هەم بەگەکان ستەم لە سەپانەکان دەکەن.

ئەوڕۆژی حەمەد بەیانیی زوو ــ هەر وەك ڕۆژانی پێشوو ــ خۆی گەیاندە نێو شاری. لە قاوەخانەی لە گەڵ ڕەفعەتی پینەچی چایەکی خواردەوە و دەو خەڵکە شڕوشپڕێوەیەوە ڕاما، کە لەو بەری قاوەخانەکەی لە ترسی بارانەی خۆیان دە بن گوێسوانە و پەنا و پەسیوان پەستاوتبوو. لە نەکاو خەڵکەکە بزووت، بە ئارامی، بە شەنە، پێمەڕە، پاچ و تەنانەت بەرد و گۆپاڵەوە لە بن دارچنارە بەرزەکەی مەیدانیّ کۆ بوونەوە. وردە وردە خەڵکی دیکەشیان تێکەڵ بوون و لە هەموو لایەکەوە سەپانی ڕووتوڕەجاڵ داوەرین. هەتا نیوەڕۆیە لە ویّ بوون و جەنگەی نیوەڕۆیە ئەوەندە زۆر بوون، مەیدانەکە هەڵینەدەگرتن، حەساری مزگەوت و شەقامەکانیشیان پڕ کرد و لە دەوری خانووی شارەداری کۆ بوونەوە. لەو کاتە دا خەڵکی شاریش هاتنەدەر، چاویان لە حەشیمەتی سەپانەکان بڕی

و چاوەڕوان مانەوە بزانن چ ڕوو دەدا. لە پڕ سەپانەکان بوونە سێ بەش، یان چوار بەش و هەر بەشەی ڕووی دە لایەکی کرد، بەڵام هێشتا هیچیان نەدەگوت، هەموویان وەك کەڕولاڵان بێدەنگ بوون، تەنیا دەنگی زلقەی پێیان لە نێو قوڕوزەلەقێ دا دەبیسرا. سەردەستەی کۆمەڵێکیان پیاوێکی ڕیشسپیی کزەڵەی بە سالداچووی پشتکووڕ بوو. حەمەد ناسی‌یەوە: زۆر ڕۆژان ئەو پیاوەی دەدی کە پێشی بە شاکیربەگی دەگرت و لە بەری دەپاڕایەوە تا حەقەکەی بداتێ.

ـ بڕوانە کاك ڕەفعەت... بڕوانە... خەریکن شتێکی بکەن. وەرە، با بچین بزانین چ دەقەومێ... کاتێك حەشیمەتێکی ئاوا زۆر بە بێدەنگی دەبزوون، دەبێ...

سەپانەکان چوونە بەر دەرگای شاکیر بەگی و ڕاوەستان. لە دەرگایان دا، بەڵام کەس نەی‌کردەوە. جارێکی دیش لێیان دایەوە، دیسان هەر نەکرایەوە. ئەو جار هەموویان ڕامالیان بۆ دەرگاکە برد و بە پاڵەپەستۆ کردیانەوە:

ـ شاکیر بەگ، ئێمە دەبێ بڕۆینەوە گوندەکانی خۆمان و چیی دیکە ناتوانین ڕاوەستین! پیاوی چاك بە مەی‌کە ناخۆشی و حەقی خۆمان بدەیە!

بەڵام هەرچی هاواریان کرد، وەڵام نەبوو.

ـ شاکیر بەگ، کوڕە ئەتۆ خراپ حاڵی بووی، ئێمە حەقی خۆمانت لێدەستێنین...

سەرەنجام ژنێك هاتە سەر هەیوانێ و هاواری کرد:

ـ شاکیر بەگ لە ماڵ نیە، بەیانی وەرنەوە.

لە دوورەوە دیار بوو ژنەکە ترساوە، هەر ئەوەندەی گوت و بە پەلە خۆی دە ژووری کوتایەوە. خەڵکەکە ئیدی وەك سێلاوێ خرۆشان و هەڵیانکوتا سەر ماڵەکەی. ئاغا خۆی دزی‌یەوە، بە پشتەوە دا خۆی گەیاندە ئەسپەکەی و بە پڕتاو بۆی دەرچوو. هێندێك لە سەپانەکان وەدوای کەوتن، بەڵام نەی‌گەیشتنێ.

سەپانەکان بە خانووی وەربوون. لە پێش دا خەڵکی نێو ماڵەکەیان وەدەرنان، هەرچی ژن و پیاوی تێی‌دابوون، لە حەساری کۆیان کردنەوە و پاشان دەرگا و پەنجەرەیان شکاندن، دیوار و میچیان ڕووخاندن و هەتا دەوری نیوەڕۆیە خانوویان بە سەریەکدا ڕووخاند و هیچیان پێوە نەهێشت. گورهانێك ژاندەرمە هاتن پێشیان بگرن، بەڵام بۆیان نەکرا تەنانەت شەقاوێکیش نێزیك ببنەوە و خەڵکەکە گوێی نەدانێ. ناچار لە پشت دیواری حەسارێ دامەزران و گوللەیان هەڵتۆقاندن، بەڵام سەپانەکان هەر گوێیان لە تەقەکەش نەبوو و خەریکی کاری خۆیان بوون. سەرەنجام خانووەکەیان لە گەڵ عەرزی تەخت کرد و ئاداریان بە سەر پاداری‌یەوە نەهێشت.

دوای ئەوە سەپانەکان هەر وا بێدەنگ و بەکاوەخۆ، بە پەنا ژاندەرمەکان دا، کە لە پشت دیواری حەسارەکەی مەتەرێزیان گرتبوو و لە ترسان وەخت بوو زەندەقیان بچێ، ڕۆیشتنە دەرێ، بە نێوەڕاستی مەیدانێ دا تێپەڕین و بەرەوە چیا ملی ڕێگایان گرت.

ئەویرۆژی سەپانان خانووی پێنج ئاغایانیان تەفروتوونا کردن. نە کەس کوژرا و نە کەسیش بریندار بوو. خەلکی شاریش لە مالەکانیان نەهاتنە دەرێ و خۆیان لەو کێشەیەی بە ساحێب نەکرد.

ئێوارێ، کاتێك سەپانەکان شاریان بەجێهێشت، خەلك هاتنە دەرێ و ئالۆزی پەیدا بوو.

حەمەد ئەوەندە دلخۆش بوو، نەی دەزانی چ بکا. بە ڕاکردن خۆی گەیاندەوە مالێ:

ــ دایە حۆری! سەیران! وەرن، وەرن بزانن چ قیامەتێکە!

ژنەکان ڕایان کردە دەرێ و حەمەدیان دە باوەش گرت.

ــ بیستووتانە چ قەوماوە؟

ئەو حەمەدۆکەی دوومانگ بوو یەك وشەشی بە زاری دا نەهاتبوو، ئێستا نۆبەی کەسی نەدەدا زار بکاتەوە. بە تاموخوێ هەموو ڕووداوەکەی بۆ گێڕانەوە و لەو کاتە دا راوێژی قسەکردنی وەك پێشنوێژەکە، یان شایەرە کەچەلی دەچوو. ورد ورد دەیگێڕایەوە، هەر لێینەدەبرییەوە و هەر بەشەی بەسەرهاتەکەی چەند جار دووپات دەکردەوە. پاشان ڕای کردە لای مەلا سەلامی و لە وێش هەر بەو شێوەیە، بە شەوق و زەوقەوە، باسی ڕووداوەکەی کرد. دوایە هاتەوە مالێ:

ــ دایە حۆری، دایە حۆری گیان، بزانە ئەمن چەندە بێڕەحمم! لەوەتا مامۆستا زەکیی هاوڕێم نەماوە، سەری خێزانی و مندالەکەیم نەداوە! جا تۆخوا بە منیش دەلێن پیاو؟!

ــ نا حەمەد گیان، ئەتۆ نارەحەت بووی و هۆشت لە خۆت نەبوو، ڕۆلەکەم!

ــ هەر ئێستا دەچم سەرێکیان دەدەم. موسلیمیش لە گەل خۆم دەبەم! دوایەش لە گەل خۆمان دەیانهێنینە ئێرە. نابێ ئیدی بچنەوە و دەبێ لەمەودوا لە گەل ئێمە بژین. نانێکم هەبێ لە گەلیان لەت دەکەم...

هەر ئەوێ ئێوارێ خێزانی مامۆستا زەکییان هێنا لای خۆیان. ئەوێ شەوێ هەموویان خۆشحال بوون. دایەحۆری، سەیران، موسلیم، خێزانی مامۆستا زەکی و حەمەد، هەموویان دەتگوت تازە لە دایکی خۆیان بوون...

بارانەکە لێیکردەوە. ئەو سەپانانەی مابوون و هێشتا زۆریش بوون، بە جل و بەرگی شڕۆل و شپڕێوەوە وەك مێرووان بە دوای یەك دا بەرەو دەشتە دوورەکان و چیاکان ڕیزیان بەستبوو. حەمەد کە هێشتا لە خۆشیی ئەو ڕووداوەی هەر شاگەشکە بوو، چووە مالی مەلا سەلامی و وەك مندالێك کە لە لای بابی گڕنە لە شتێکی بگرێ، گوتی:

ــ هاتووم ئەسپێکی چاکم بۆ بکڕی. ئەسپێکی بۆرەی جوانی عەرەبیم دەوێ؟

ــ ئەتۆ خۆ ئەسپێکی ڕەسەنی چاکت هەیە. لە بیرت نیە؟ ئەسپە ئەمرەکەت دەڵێم! ئەوەی هەموو بەیانان، وەختی ڕۆژهەڵاتێ، بە ئاسمانێ دا، بە سەر شار و گوندان دا دەفڕێ و دەحیلێنێ!

ــ بەڵێ وایە، بەڵام ئێستا دەستم وێی ڕاناگا! ئەگەر دەستیشم وێی ڕا بگا، چونکە ئەو ناسراوە، گرفتم بۆ دروست دەبێ. نا، ئەو بۆ ئێستا نابێ...

ــ دەی باشە، ئەسپێکی بۆرەی چاکت لە لای حاجی سولەیمانی بۆ دەکڕم، کوڕم. زۆریشی پێخۆش دەبێ، سەودای لێبکەین. دیارە ئەسپی وی بەنێوبانگن و تایبەتین. دەڵێن هەموویان لە تۆوی ئەسپی کوێرۆغڵێن!

هەر ئەوێڕۆژێ ئەسپیان کڕی و دەسبەجێ بردیانە لای زیندرووی. ئەو زیندرووەش بۆخۆی شتێکی تایبەتی بوو. زینی بۆ بەگەکانی هەوشار، ماڕاش و ئانتێپی دەدروو. ئەڵبەت هەتا وڵاغەکەی نەدیبا و دڵنیا نەبوایە کە ڕەسەنە، ڕەخت و زینی بۆ نەدەدروو. زینێك بە ئاوزەنگیی زێوکفتەوە، تەڕلکێك و لغاوێکی زێوکفتیان لێ کڕی.

حەمەد کاتێك ئەسپەکەی هێنایەوە ماڵێ و تاقیکردەوە، بە دڵی نەبوو. چۆوە و گۆڕییەوە. چەند جاران ئەو بەزمەی دووپات کردەوە. ئەسپێکی لە لای حاجی دێنا و دوایە دەیبرد بە یەکی دیکەی دەگۆڕییەوە. دوا جار حاجی گوتی:

ــ کاکە ئیدی هەمووت بە تاقیکردوونەوە. هەر ئەوەم ماوە و لەوەشم باشتر و ڕەسەنتر نیە! ئەوە ڕەگەزنامەکەیەتی. بڕوانە، تەنانەنەت سوڵتانی یەمەنێش ئەسپی وای دە بن دا نەبووە. وەڵڵاهی ئەوە لە وێ بێ، کەس چاو لە ئەسپی کوێرۆغڵی و حەمەدۆکیش ناکا! ئەوە لە بەر دڵی مەلا سەلامی پێتدەفرۆشم و لە بەر خاتری وی نەبێ، قەت دڵم نایە لە دەرکی خۆمی دوور کەمەوە. ئەوەشت پێبڵێم، ئەمن ئەسپی هەر لە بەر قازانجێ نافرۆشم و بە هەموو کەسیشی نافرۆشم! تەمەشای سوارەکەی دەکەم، سوارچاك نەبێ، نایدەمێ! بڕۆ پیرۆزت بێ و خێری لێ ببینی!

کاتێك وەستای زیندرووش ئەسپەکەی دی، سەری سوڕ ما. زین و لغاوێکی نایابی بۆ ئامادە کرد. هەر بۆخۆشی ئەسپەکەی زین و لغاو کرد. کە تەواو بوو، بە ئەسپەکەی دا هەڵڕوانی و گوتی:

ــ فەرموو سواری بە! هیوادارم لە خەبات و بەربەرەکانیی خۆت دا سەرکەوی!

حەمەد کە ئەوەی بیست، زۆری پێ‌سەیر بوو: باشە ئەو چووزانێ کە من بە نیازم دەست بە خەبات و بەربەرەکانی بکەمەوە؟ وەڵڵاهی ئەو سەنعەتکارانە هەموویان شێخ و پیاوچاکن.

کاتێك بە سواری ئەسپەکەی گەیشتەوە ماڵێ، هەموو بە پێشوازی‌یەوە چوون. دایە حۆری ماوەیەکی باش ئەسپەکەی لاواندەوە، ڕنەکی کرد و دوایەش بۆ ئەوەی چاووزار کاری لێ‌نەکا، سێ کووژەکەی وە نێوچاوانی، سێی وە کلکی و سێی وە یاڵی خستن.

حەمەد ئەوێڕۆژێ داوای کوولەکەی سوورەوەکراوی کرد. بۆیان لێ‌نا، چەند ڕۆژان لە سەر یەك، نیوەڕۆیە و شەوێ، کوولەکەی سوورەوەکراوی بە گوێز و قەیماغەوە خوارد. پاشان لە گەڵ سەیرانێ سێ شەو و ڕۆژان لە ژوورەخەوەکەی خۆیاندا بوون، دەرگایان لە سەر خۆ داخست و نەهاتنە دەرێ. لەو بەینە دا جاروبار سەیران بیری دەکردەوە کە داخوا دایە حۆری و خێزانی مامۆستا زەکی دەبێ چیی پێ‌بڵێن، بەڵام هەرچۆنێك بوو، گوێی نەدایە و تەنانەت لە و ماوەیە دا جلەکانیشی دەبەر نەکردەوە و بە ڕووتی لە پاڵ حەمەدی دا مایەوە. حەمەد لە بەری پێی ڕا هەتا تۆقی سەریی نوقمی ماچان دەکرد. دەت‌گوت هەردووکیان دەیانەوێ ئەو ساتانە لە مێشکی خۆیان دا تۆمار بکەن و دواتر کە لێکهەڵدەبڕێن بەهەشتی ئەو چەند ڕۆژ پێکەوەبوونەی وەبیر خۆیان بێننەوە.

بەیانی‌یەکی زوو حەمەد ئەو بەهەشتەی بەجێ‌هێشت. لە ژوورەکەی هاتەدەرێ، سوار بوو، چوو لە شاری، لە لای زەینوڵڵا ئەفەندی تفەنگێکی بکڕێ. بە زەینوڵڵای گوت کاڕابینێکم دەوێ، تازە و جوان بێ و هێشتا تەقەی پێ‌نەکرابێ. زەینوڵڵا تفەنگێکی تازەی پێ‌فرۆشت. تفەنگەکە ئەوەندە جوان بوو، هەر بریقەی دەهات. حەمەد هەروەها ڕەختێکی زێوکفت و زێڕکفتی کاری نالیپۆ و سەرکڵاوەیەکی گوڵێنگداریشی کڕی. بەیانیی ڕۆژی دواتر چوو بۆ لای قەراغ دەریایە. دەریا وەك هەموو بەیانی‌یەکی دیکە ئارام بوو و تا چاو هەتەری دەکرد، دەبریقایەوە. ماسیگرەکە لە شوێنی خۆی خولی دەدان و لەگەڵ هەر خولدانێکیش بەرزتر دەبۆوە، هەتا لە بەرزایی ئاسمانێ لە پێش چاو ون بوو، حەمەد هەر چاوی لێ‌کرد. ڕۆژ هاتە دەر و بۆنێکی توند لە ئاوەکەی ڕا هات. حەمەد چوو لە تەنیشت چڵە پنگە وشکهەڵاتووەکەی نێو خڕەکەی دانیشت. لاشەی پەپوولەکەی هەر وا بە شێوەیەکی خەمبزوێن لە وێ کەوتبوو. حەمەد داهاتەوە، لکێکی لە چڵەپنگەکەی کردەوە و بۆ لای لووتی برد. پێی‌خۆش بوو بزانێ ئێستا بۆنی چۆنە! هێشتا بۆنی هەر مابوو. حەمەد تفەنگەکەی لە شانی هێنایە خوار و هەرچەندی فیشەکی تێی‌دابوون، لە دەریایەی بەتاڵ کردن. ئاوەکە دەنگی تەقەکەی کپ دەکرد و هێندێك

واوەتر کەس گوێی لێ‌نەدەبوو. حەمەد لە تفەنگەکەی ڕازی بوو. تفەنگی چاك بوو، نۆرەی نەدەکرد و لە دەست و شانانیش خۆش بوو.

کە گەڕایەوە ماڵێ، داوای گۆرەوی و زەنگاڵەکانی کرد. دایەحۆری ئەو گۆرەوی و زەنگاڵانەی بۆ چنیبوو. گۆرەوی‌یەکان میرزایی چنرابوون، نەخشی کۆترەشینکەیان تێدا بوو و ڕاست وەك ئەو گۆرەوی‌یانە دەچوون، کە کاتی خۆی خەجیج بۆی چنیبوو. کاتێك ئەوەی وەبیر هاتەوە، دڵی گوشرا، نەی‌توانی سەر بەرز کاتەوە و چاو لە چاوی سەیرانێ بکا. گۆرەوی‌یەکانی دەپێ‌کردن، زەنگاڵی لە سەر هەڵکێشان و پاتەکانیشی دەپێ‌کردن. فیشەکدان، دووربین و سەرکڵاوەکەی لە گەڵ دەسرەیەکی ئاوریشم کە سەیران بۆی گوڵدۆزی کردبوو، دە خورجێنێ نان و خورجێنەکەشی لە پاشتەرکی زینەکەی قایم کرد. ئەو جار سواربوو:

ــ دایە حۆری، سەیران، داواتان لێ‌دەکەم گەردنم ئازا کەن! لەوانەیە ئەمن قەت نەگەڕێمەوە و چاومان بە یەکتر نەکەوێتەوە، یان بگەڕێمەوە، بەڵام ئیدی نەتانبینمەوە. هەرچۆنێك بێ، بمبوورن! خودا ئاگاداری هەمووتان بێ! لە گەڵ تۆشمە براژن( ڕووی دە خێزانی مامۆستا زەکی کرد) ! پاشان منداڵەکانیشی ماچ کرد و لە حەسارێ هاتەدەر.

مەلا سەلام لە بەر دەرگای ماڵی خۆیان چاوەڕوانی بوو. حەمەد دابەزی و دەستی ماچ کرد.

ــ مامۆستا گیان، دایە حۆری، سەیران و ئەو ژن و منداڵەی هەوەڵ بە خودای و دوایەش بە تۆ دەسپێرم...

ــ حەمەد، پێشتریش پێم‌گوتووی نیگەرانی ئەوانە مەبە. چاوم لێیانە! ئەمن مەلا سەلامم پێ‌دەڵێن! ئەوەی بوێرێ دە من ڕۆبێ، هێشتا لە دایکی خۆی نەبووە. لە بیرت بێ ئەمن هاوڕێی مەلا فەرهادیم... برۆ بەخێرچی، ڕۆڵە، خەمی بنەماڵەکەت نەبێ، دڵەڕاوکێت نەبێ و دەربەستی ئەو شتانە مەبە...

پاشان حەمەدی دە ئامێز گرت، هەردووك لاچاوی ماچ کرد و گوتی:

ــ هەموو ڕۆژێ ئەو وەختانە هەموویان لە دوکانی زەینوڵڵای کۆ دەبنەوە. خودات لە گەڵ بێ و داوای سەرکەوتنت بۆ دەکەم!

حەمەد سوار بوو و ڕکێفی لە ئەسپی دا. تفەنگەکەی لە کن لاقی بە تەنیشت ئەسپەکەیەوە هەڵواسیبوو و چونکە ئاتەگی سەربەرگەکەی بەسەر کشابوو، دیار نەبوو. کە گەیشتە بەر دەرگای دوکانی زەینوڵڵای، لغاوی هەڵەنگاوت، خۆی فڕێدایە خوارێ و توند و لە نەکاو دەرگای دوکانەکەی کردەوە. ڕووناکایی‌یەکی دەسەری دا دەگەڕا و ئاورینگێکی وەك ئاورینگی

پۆلای لە چاوان دەبۆوە. ئەوانەی لە لای زەینولڵای دانیشتبوون، ترسان و لەو کارەی حەمەدی سەرسام مان. حەمەد لە پێش شاکیر بەگی ڕاوەستا، دەمانچەی هەڵکێشا و تێیڕاخوڕی:

ــ بڕۆ دەرێ، شاکیر! یاڵڵا بۆ دەرێ...

یەکجێ سەروچاوی شاکیربەگی وەك ڕوخساری مردووان سپی بۆوە. هەستا و بە لینگەلەرزە و بە لارەوە لارەوە چووە دەرێ. حەمەد بردیە نێوەڕاستی مەیدانەکەی. لەو بەینەش دا دەوری مەیدانەکەی پڕ بوو لە خەڵك. خەلکەکە بێ‌تەوەی یەك وشەشیان لە زاری بێتە دەر، چاویان لەو دیمەنەی دەکرد. حەمەد شاکیر بەگی لە ژێر دارپەلکە گەورەکەی ڕاگرت، چاوی دە چاوی بڕی و گوتی:

ــ"ئەم گوللەیە بە تۆڵەی مامۆستا زەکی" و قامکی لە پەلەپیتکەی بزاوت. ئەوەشیان لە تۆڵەی ئەو منداڵانەی بە لەرزوتا مردن...

جارێکی دیکەش پەلەپیتکەی کێشا. لەو کاتە دا بزەیەکی لە سەر لێوان بوو و ئارام و خوێنسارد دەهاتە بەرچاو:

ــ ئەوەش بە تۆڵەی ئەو سەپانانەی دەتچەوساندنەوە و فێڵت لێ‌دەکردن!

شاکیر بەگ ڕەتی بەست، نوشتایەوە و بە عەرزی دا کەوت. حەمەد چووە سەری، داهاتەوە و سەیرێکی کرد: کابرا حەیاتی لێ‌بڕابوو. هەرسێك گوللە لە پەنا یەك وە کەلەکەی کەوتبوون.

ئەو جار حەمەد لە پێش چاوی ئەو خەڵکە مات و حەیرانەی تێ‌یەوە ڕامابوون، لە سەرەخۆ چۆوە لای ئەسپەکەی و سوار بۆوە. ئەسپ وەك برووسکەی دەربەڕی، بە نێوەڕاستی مەیدانێ دا تێ‌کشا و لە وێ دوور کەوتەوە. ساتێك دواتریش دەنگی سمی ئەسپەکەی کە لە سەر سەنگفەرشی مەیدانێ ئاوازی دەدایەوە، دەبیسرا.

هەمووی ئەو شتانە ئەوەندە بە خێرایی ڕوویان دا، کە خەلکەکە هەتا ماوەیەك نەیان دەزانی چ قەوماوە و چ بکەن. کاتێك ژاندەرمان پێیان زانی، حەمەد دەمێك بوو لە شاری وەدەرکەوتبوو و بەرەو چیا بنەوشی‌یەکان ئەسپی دەئاژوا. نیوەشەوێ گەیشتە سەر ڕێگای حەمیدەدێی. لە وێوە ئیدی ئەوەندە شارەزا بوو کە ئەگەر تاریکەشەوی ئەنگوستەچاویش بوایە، دەیزانی بواری چۆمی جەیهانی لە کوێیە و چۆن دەبێ لە ئاوەکەی بپەڕێتەوە.

کاتێك گەیشتە ماڵی جەلیلۆغلی، کە لە شوێنێکی پەنا و سەختی نێو ڕەوەزەکانی بناری چیای حەمیدێ دا بوو، پیاوێکی بە دوای مەلا فەرهادی دا نارد و بڕیاری دا هەتا مەلا فەرهاد دەگاتێ، لە وێ بحەسێتەوە.

## (١٦)

دارستانی بێدەنگ تیشکباران دەکرا. هەزاران شەبەقی زەرد و ڕووناك خۆیان دە پەنا داران دەخزاند و شینایی‌یان دە بن خۆیان دا ون دەکرد. پەڵە و خاڵی سوور سوور بە نێو داران دا دەفڕین. ڕەوەزەکان دیار نەبوون. جاروبار لووتکەیەکی بنەوشی، سوور، یان سپی، لە کێوە سەوز و زەردەکان وەدەردەکەوت، تیشکی ڕۆژێی دەمژی و هەوای پڕ لە شەبەق و بریقانەوە دەکرد.

دووبەدوو لە سەر بەردێکی پان، لە تەنیشت کانی‌یەکی ڕوون و لە بن سێبەری پەلکێکی بەرز دانیشتبوون. گەڵایەکی زەردهەڵگەڕاو کە پەڵەی سووریشی تێدا بوون، لە داری بۆوە، چەند جار لە حەوای خولاوە و پاشان لە نێوانیان کەوت. ئاوی کانی‌یەکەی زۆر نەبوو، بەڵام زۆر ڕوون و جوان بوو و دوای ئەوەی کە لەکانی‌یەکە جیا دەبۆوە، دەڕژایە سەر تەختەبەردێکی کە هێندێك لە خوارەوەتر هەڵکەوتبوو. مەلا فەرهاد سیگارێکی هەڵبەست. توتنێکی زەرد و جوانی دەکێشا و ئەو توتنەش حەمەد لە خوارێ ڕا بۆی هێنابوو. لەو کاتەوە کە یەکتریان گرتبۆوە، مەلا فەرهاد زۆر پرسیاری لە حەمەدی کردبوون، حەمەدیش بەردەوام وەڵامی پرسیارەکانی دابۆوە:

ـ باشە حەمەد، ئەتۆ داستانی ئەسپەکەی خۆت بیستۆتەوە؟

حەمەد پێکەنی و گوتی:

ـ بەڵێ بیستوومەتەوە!

ـ ئاخر هەموویان بۆ گێڕاویەوە؟

ـ بەڵێ، شتی سەیر سەیریان لێساز کردوە. ئەو هەواڵانە هەتا لێرەوە، یانی لە شاخی ڕا دەگەنە لای دەریایە، هەزار شاخوباڵیان بۆ دروست دەکرێ. دەڵێن بەیانی‌یان بە سەر دەریای بێسنوور دا، بە سەر هەوران دا، هەموو تاریك و ڕوونی بەیانی‌یان...

ـ دەفڕێ و خەڵك گوێیان لە حیلەی دەبێ. وانیە؟

ـ بەڵێ ئەسپێکە دە هێندی ئەسپی ئاسایی دەبێ و یاڵە درێژەکانیشی ڕەهەوران دەخشێ...

تا ئێستا هەواڵێکیان لە شاری‌یەوە بۆ نەهاتبوو و حەمەد لە دڵەڕاوکێ دا بوو.

مەلا فەرهاد گوتی:

ـ حەمەد گیان، خەمی بنەماڵەکەت نەبێ. مەلا سەلامی هاوڕێمان بە تاقی تەنێ بە لەشکرێکی دەبێ. ئەو پیاوە هەم بە دڵە و هەم ئازایە! کەس نایوێرێتێ. خۆ بۆخۆت لە منی باشتر دەناسی و ئەو بەینەی لەگەڵی بووی و دیتووتە! دە ئیدی هیچ نارەحەت مەبە و لێیان دڵنیا بە!

ـ بەڵێ، دیارە وایە! ئەمنیش پێموایە ئەگەر ئەو دنیایە کە مامۆستا زەکی نەژادی بەستەزمانی تێدا دەکوژرێ، وەبەر غەزەبی خودای ناکەوێ و بە سەریەك دا نایە، لە بەر خاتری پیاوچاکانی وەك مەلا سەلامی‌یە... سوور دەمزانی ئەمن ئەو کابرایەم نەکوشتبایە، بۆخۆی دەی‌کوشت. زۆر بە کوژرانی مامۆستا زەکی تێكچوو. دیارە هیچی نەدرکاند، بەڵام لە کاتی ناشتنی وی دا ئاگام لێ‌بوو چۆن ئاسابوو. هەر ئەو کاتیش من بڕیارم دا شاکیر بەگی بکوژم. بەڵێ ئەگەر من لە وێ نەبوایەم، مەلا سەلام بۆخۆی شاکیر بەگی دەکوشت و ئێستا بە جێگای من، ئەوت لە لا دەبوو. ئەو کاتی ژنەکەی، کە یەکجار زۆریشی خۆش دەوێ، بە تەنیا دەمایەوە. بە ڕاستی کاتێك ئاگادار بوو کە من بڕیاری کوشتنی شاکیریم داوە، زۆر خۆشحاڵ بوو. باوەڕت بێ، هێشتا ئەمن بۆخۆم بە تەواوی لە سەر ئەو کارەی ساغ نەببوومەوە، کە ئەو بە چاولێکردنێکی تێ‌گەیشتبوو سەرەنجام ئەو کابرایەی دەکوژم. دیارە ئەمنیش لە چاوانی ڕا زانیم کە قسەی تێدا نیە تۆڵەی مامۆستا زەکی دەکاتەوە و لەوانەیە ئەگەر ئەوەشی کردبا، بۆ یەکەم جار لە ژیانی دا دەستی بە خوێنی کەسێکی سوور بوایە. لێرە دا حەمەد بە پەرۆشەوە چاوی لە دەستەکانی خۆی کرد و مەلا فەرهادیش هەستی پێ‌کرد.

ـ دەڵێی ئێستاش ڕانەهاتووی؟

ـ لە گەڵ کوشتنێ؟ ناوەڵڵا، قەتیش ڕانایەم... کوشتن، جا فەرق ناکا کێ‌بکوژی... هەر ناخۆشە و ئەمن ناتوانم پێی‌ڕابێم...

ـ مرۆڤ بۆی هاسانە لە گەڵ هەموو شتێك ڕابێ، بەڵام لە گەڵ کوشتنێ زەحمەتە. هەر جارەی کەسێك دەکوژرێ، پیاو کزەی لە جەرگی دێ.

ـ ئەو مامۆستا زەکی‌یەی کوشتیان، زۆر زانا بوو و زۆری لە دنیایە و لە ژیان دەزانی. بۆخۆشی لە شەڕێ دا زۆری لە دوژمن کوشتبوو.

ـ بیستوومە کە ناوبراو زۆری کوێرەوەری و نارەحەتی دیبوو و لە سەردەمی شەڕیش دا هاوسەنگەری کۆمەڵێك یاغیی بە ناوبانگی وەك ڕەشمار، شاهێن و گزیك دۆرانی بووە.

حەمەد ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:

ـ بە ڕاستی مردنی وی کارەسات بوو! ئەمن بۆخۆم دوای ئەوەی ناسیم و لە گەڵی بوومە دۆست، هەستم دەکرد دە هێندەی جاران بەهێزم و باوەڕم بەخۆمە. ئەگەر ئەوم نەدیبا، دۆستایەتی و زانستی وی کاری تێنەکردبام و هێندێك شتی لێ فێر نەبووبام. پێمۆایە...

هات بڵێ:" بە گەوجی دەمردم"، بەڵام نەیگوت و بێدەنگ بوو، چونکە ئاخر زانستی مەلافەرهادیش شوێنی لە سەر وی دانابوو و زۆر شتیش لە وی فێر ببوو. لە پڕ دەستی مەلا فەرهادی گرت و گوتی:

ـ کاکە گیان، تەنانەت ئەو فێری کردم ناوی خۆشم بنووسم!

هەموو جارێ کە باسی ئەوەی دەکرد کە دەتوانێ ناوی خۆی بنووسێ، شەرمی دەکرد و وەك منداڵان سوور هەڵدەگەڕا. مەلا فەرهاد زۆری کەیف پێهات و لە کاتێك دا بزەیەکی شادی لە سەر لێو بوو، بیری کردەوە: ئەگەر لە بەر عەیبەی دنیایە نەبێ، ئەو کوڕە وەك ئەسپەکەی خۆی پێیخۆشە بچێتە سەر دوندی چیای دوڵدڵی، لە وێ ڕا بگوڕێنێ و بڵێ: خەڵکینە ئەمن ئێستا دەتوانم ناوی خۆم بنووسم!

ـ بەڵام ئێمە، مەلا فەرهاد...

ـ بەڵێ، ئێمە چی؟ ...

ـ ئێمە لە گەڵ ئەو ئەسپە شێتەی چ بکەین؟ کوڕە خەڵك دەڵێن کاتێك بەیانییان دەفڕێ، وا دەحیلێنێ، کە ئەو ڕەوەزانەی هەزاران ساڵە هەن، دەڕووخێن. ڕەنگە ئەو دەنگۆ و داستانانە بە سوودی ئێمەش بن، وانیە مەلافەرهاد؟

ـ زۆر جاران بیرم لە وەی کردۆتەوە. لەوانەیە ئەوە نەك هەر خراپ نەبێ، بەڵکوو سوودیشی هەبێ. ئاخر دەبێ شتێك دە گۆڕێ دابێ، کە سەرنجی خەڵك بۆ لای ئێمە و هەڵسووڕانی ئێمە ڕابکێشێ. خەڵك ئەو داستانانەیان ساز کردوە، کە بیانکەنە بیانوو بۆ تاریفکردن و باسکردنی ئێمە. دەبێ ئەوانەت هەموو بیستبێتەوە. پێشنوێژی گوندێکی لە نێو خەڵکی تاریفی منی دەکرد. باوەڕ کە شتی وای دەگوت کە ئەمن ئیدی هیچم پێنەدەگوترا، لە جێی خۆم دانیشتبووم، زارم ڕەق هەڵاتبوو و سەرم سوڕ مابوو...

پاشان مەلا فەرهاد گوتی:

ـ بەڵام بە ڕاستی نازانم بڵێم چی...

حەمەد باسی شارەکەی بۆ کردبوو و بە وردی هەرچی بە سەری هاتبوو، دیبووی و لەبیری مابوو، بۆی گێڕابۆوە، بەڵام هێشتا باسی ئەوەی بۆ نەکردبوو کە چۆن سەپانەکان خانووی ئاغاکانیان تەفروتوونا کردن. پێی‌خۆش بوو ئەوەیان وەك بیرەوەرییەکی تایبەتی هەر ئی خۆی بێ. بیرەوەریی ئەو ژن و پیاوانە کە لە تۆقی سەریان ڕا هەتا بەری پێیان شەلاڵی ئاوی بارانەی بوو و جلەکانیان بە لەشیانەوە نووسابوو. ئەو ئینسانە مەندە بێ‌دەنگە قوڕاوی‌یانە کە بە بەرچاوی‌یەوە دەهاتن و دەچوون، کە وەك هەڵۆی بێ‌دەنگ بوون و بە شێوەیەك کە لە خەیاڵیش دا ناگونجێ، خۆڕاگر و بە سەبر بوون، بەڵام کاتێك خرۆشان و هێرشیان کردە سەر ماڵی بەگەکان، ئەوەندە ئازا و بە دەستوبرد بوون، کە لە چاولێکنانێك دا ئەو خانووە گەورانەیان لە گەڵ عەرزی تەخت کردن و ئاداریان بە سەر پاداریانەوە نەهێشتن. ئەو هێزە گەورە و سامناکە حەمەدی حەیران کردبوو. کوڕە هەر ئەوەندەی بڵێی یەك و دوو، خانووی شاکیربەگیان تەفروتوونا کرد... ئەگەر ئەو خەڵکە، ئەو حەشیمەتە بێ‌ئەژمار و بێ‌دەنگە، بیانەوێ بجووڵێن، ئەو شاخ و دەشتانە هەمووان پڕ دەکەن، هیچ هێزێك بەرگەیان ناگرێ و هیچیشیان لە بەر دەستی ئاسی‌یە نابێ! تەنانەت شاخ، ئاوهەڵدێر، دەریا، با، باهۆز و سێڵاویش پێشی هێزێکی ئەوتۆی پێ‌ناگیرێ... ئاخ، بریا مەلا فەرهاد لە وێ بوایە و بەچاوی خۆی ئەو شانۆ حەماسی‌یەی دیبایە! گێڕانەوە و دیتن جیاوازی‌یان زۆرە و هەر کەس بە چاوی خۆی نەی‌دیبێ، نازانێ ئەو هێزە چ بوو، چ قیامەتێکی کرد و چۆن هەرچی‌یەکی هاتە سەر ڕێگای ڕای‌ماڵی. حەمەد لە وتڕۆژێوە کە ئەو ڕووداوەی دیبوو، لە خەیاڵی خۆی دا هەمیشە بیری لەوە دەکردەوە، کە بڵێی ڕۆژێکی ئەو خەڵکە بێ‌ئەژمارە لە شاخی ڕا بچنە خوارێ و دەشت و دەریایە وەبن خۆیان دەن...

حەمەد ئەدەنە و جەیهانێ بەڵەد بوو، باسی ئەستەمبووڵ و ئەنکەرەشی بۆ کرابوو و دەی‌زانی ئەو دوو شارە زۆر گەورەن: بەڵام حەشیمەتەکە لە ژێر ڕێژنەی باران و لە حاڵێك دا هەموو گیانیان تەڕ بووە و لە بەری پێیان ڕا هەتا تۆقی سەریان قوڕاوی‌یە، ڕێ دەبڕن، دەچن خۆیان دە شارەکان داوێن و دەیانگرن. ڕێبەرەکانیشیان دەبێ ئەو پێنج کەسانە بن: مەلا فەرهاد، مامۆستا زەکی نەژاد، مەلا سەلام، ڕەشمار و شاهێن بەگ... شاهێن بەگ پیاوێکی زۆر ئاقڵ، ئازا و زیرەك بوو. لە گەڵ کۆمەڵێك لە هاوسەنگەرەکانی لە سەر زگ دە سەنگەرێ دا، لە بەرێکی پردێ ڕاکشبوون. بۆخۆی ڕەشاشێکی دابەستبوو و قامك لە سەر پەلەپیتکە لە پشتی درێژ ببوو... بڕیاری دابوو: فەڕانسەیی‌یەکان تەنیا دەتوانن بە سەر تەرمی من دا بڕۆن و بچنە نێو ئانتێپی. هەموو هاوڕێکانی لە سەر ئەو پردە و دە نێو ئەو سەنگەرە دا کوژران.

کاتێك ئێواره داهات، تەنیا شاهێن بەگ بە خۆی و ڕەشاشەکەیەوە مابوو و ئەو قارەمانە بە تاقیتەنیٚ پێشی لەشکرێکی گرتبوو. تاریکانیٚ ئەویش کوژرا و فەرانسەییەکان بە سەر تەرمی وی دا پەڕینەوە بۆ ئانتێپیٚ...

ئەوە شاهێن بەگ لە پێشەوەی کۆمەلێك لەو حەشیمەتەی دەڕوا و دەنگی شێرانەی دە گەلٚ دەنگی خەلکەکەی بۆتە یەك. مەلا فەرهاد لە سەر منارەیەکی ڕاوەستاوە و ڕووی دە خەلکییە، دەلێی وتاری نوێژی هەینی دەدا. وشەکانی کە باڵ دەگرن و دەگەنە گوێی هەموو خەلکی دنیایە، جوان، تازە و شکۆدارن... دەلیٚ خەلك، جا خەلکی هەر شوێنێك بن، دەبیٚ بتوانن ڕاپەڕن و لە هەر شوێنێك پێویست بیٚ، دەبیٚ ڕاپەڕین بکریٚ. باشە جیاوازیی مرۆڤێك و مێشێکی دە چی دایە؟ تا ئەو کاتەی مرۆڤ وەك گیانلەبەرێکی دەستەوەستان و بیٚدەسەلات لە ژێر چەوساندنەوە دا هەر بنالێنیٚ، تا ئەو کاتەی مرۆڤ لە بەرامبەر ستەم و چەوساندنەوە دا ڕانەپەڕیٚ و بە گژ ستەمکاران دا نەچێتەوە، چارەنووسی لەوە باشتر نابیٚ کە هەیەتی... خودا بە بەندەی خۆی گوت ڕاپەڕە، ئەویش بە دژی بەهەشتیٚ ڕاپەڕی. خوا بە مرۆڤی گوت ڕاپەڕە، ئەوانەی فەرمانی وییان بە جیٚ گەیاند، بوونە خۆشەویستی وی و ئەوانەش کە فەرمانی خوایان وەپشت گویٚ خست ــ کە زۆرتریش بوون ــ دۆزەخیان بە نسیب بوو و خوداش ئەو شوێنەی هەر بۆ وان دروست کرد... جا هەتا ئینسان لە بەرامبەر ترسی خۆی دا ڕانەپەڕیٚ، لە بەرامبەر دلّی خۆی دا ڕانەپەڕیٚ، بارودۆخی لە وەی هەیە خراپتر دەبیٚ، لە ژێر سووکایەتی دا ورد دەبیٚ، ترس بە سەری دا زالٚ دەبیٚ، یەسك و پێستیشی دادەگریٚ و ئیدی ئەوکاتی لە ئینسانەتی دەشۆرێتەوە و لە کرمێکیش بیٚدەسەلاتتر دەبیٚ... کرمەکە نە چاوی هەیە و نە گویٚ، نە زمانی هەیە و نە زار، بەلاّم خۆ ئینسان هەموو ئەوانەشی هەن! بە ڕاستی ئەگەر ڕاپەڕینیش وەك خەو، خواردن و زاوزیٚ نەبێتە بەشێکی سروشتیی ژیانی مرۆڤ، ئەوە ئایندەی لە ئەمڕۆشی خراپتر دەبیٚ و ئیدی نازانیٚ بیرکردنەوە، ئەوین، هەست، دۆستایەتی و برایەتی چن! ئیدی ناتوانیٚ هەست بە درەوشانەوەی خۆر و ئاسمان بکا و ببینیٚ کە

عەرز، گورگەکان، بالندەکان و چۆمەکان چەندە جوانن و کاتێك کە خۆر لە ئاسۆ دێتە دەر، دیمەنێکی چەندە دلگر دەخولقیٚ و لە بناخە دا ئیدی گەرمای دە دلّی دا نامێنیٚ... خوا بە ئینسانەکانی گوت من ئێوەم بۆیە دروست کرد، کە هەستنە سەر پیٚ، بەلاّم ئێوە نافەرمانیتان کرد، ئێوە چوونە ژێر باری سەرکوت و زەبروزەنگ، لە پێش دا سەرکوت و زەبروزەنگی خۆتان و دوایەش ئی خەلکی دیکە. ئێوە چوونە ژێر هەموو چەشنە سەرکوتێك و ئەو شتانەش کە دۆزیتاننەوە، فێریان بوون و وەدیتان هێنان، بەو ملکەچی و خۆبەدەستەوەدانەوە گریٚدران. ئێوە

هەمیشە، پێشتر، ئێستا و بۆ هەتا هەتایەش چوونە ژێر بار، ملتان کەچ کرد و ئەوانەش کە خۆیان بە دەستەوە نەدا، لە لایەن ئێوەوە مەحکووم کران، دوور خرانەوە و کوژران. بۆ ئێوە ملکەچی بۆتە شێوەیەك لە ژیان و وەك خواردن، خواردنەوە و ئیشقبازیکردن بۆتان بۆتە سروشتی و پێیەوە ڕاهاتوون. ئێوە مردووون، لە کرمان خراپترن... و لە سبەی دوارۆژ دا چارەنووسێکی خراپترتان دە ڕێ دایە...

مەلا فەرهاد بە دەنگی بەرز و شەوق و حەزێکی زۆرەوە مەبەستی خۆی دەربڕی، دەنگی ئەوەندە خۆش بوو کە کاری لە قوولایی دڵی ئینسانەکان دەکرد و تەنانەت شاخ و بەردیشی دەجوولاندن. چاوە گەشە جوانەکانیشی پڕ بوون لە فرمێسك:

تا کات بە سەر نەچووە، سەرتان بەرز کەنەوە، ئەی هاوار ئینسانەکان، مەترسن، ڕاپەڕن و دژی ئەو ترس و سامە هەزار ساڵەیە خەبات بکەن! بەڵام پێش هەموو شتێك ئەو زنجیرانە بپسێنن کە دڵی ئێوەیان گرێداوە! پاشان زنجیرەکانی دیکەی ئەم جیهانە بپسێنن! بە دژی هەر چی ناحەزی، دڵڕەقی و ستەمە خەبات بکەن و ڕێگا بۆ دەسەڵاتی چاکەکان و عەداڵەتخوازەکان خۆش کەن! جا ئەگەر ڕۆژێك هەر ئەو چاکانەش سووڕان و بوون بە خراپ و ستەمکار، دەبێ فێر بین دژی ئەوانیش خەبات بکەین، یانی دژی ئەوانە کە ڕۆژێك پێمانوابوو باشن! گوێم لێبگرن ئینسانەکان، ئێوە نە کرمن، نە مێروون و نە مێشومەگەزن... مەبەستی خودای لە خولقاندنی ئێوە تەنیا ئەوە بووە کە ڕاپەڕن، یانی کە ئێوە فێر بن ڕاپەڕین چییە... خودا بە نرخترین دیاریی بە ئێوە بەخشیوە، ئەو دیارییەش هیوایە، هومێدە، ئەو هومێدەی لە دڵت دایە... ئەوە لە هەموو چەکێکی دیکە بەهێزترە و هەر بەو هومێدەوە دەتوانی ڕاپەڕی. ئەگەر ئەتۆ بەو هومێدەوە کە خوا پێیداوی، ڕاپەڕی، تەنانەت مەرگیش دەستەمۆ دەکەی...

حەمەد ئەوەندە بە ڕێز و خۆشەویستییەوە دە مەلا فەرهادی هەڵڕوانی، کە ئەو پێیسەیربوو:

ــ ئەرێ ئەوە چییە حەمەد؟ بۆ ئاوا تێمەوە ڕاماوێ ڕۆڵە؟ پێمبڵێ بزانم ئەوە بیرت لە چی دەکردەوە؟

ــ شوکر بۆ خودای، شوکرانەبژێرم خوایە گیان! وەرە کاکە گیان هەردووکمان لە بەرامبەر ئەوەی دا کە ئەمڕۆ هەمانە و بینایی چاوان پێی بەخشیوین، شوکری وی بە جێبێنین و منەتباری بین!

ئەو شێوە ئاخاوتنەی حەمەدی شتێکی تازە بوو، مەلا فەرهاد قەت نەیدیبوو ئەو ئاوا گەرموگوڕ قسە بکا.

حەمەد ماویەك بێدەنگ بوو و بیری کردەوە. پاشان گوتی:

ـ پێمڤایە ئەویش هەر ئەو قسانەی تۆی کردن، بەڵام ئەمن وەکی دەو قسانەی تۆ دەگەم، قەت دە قسەی وی نەگەیشتم.

ـ کێ؟ مەبەستت کێیە؟

ـ مامۆستا زەکی نەژادی دەڵێم. کوشتیان، بێتاوان کوشتیان. ئەویش هەر ئەو قسانەی تۆی دەکردن، بەڵام ئەو تووڕە دەبوو، ئەتۆ قەت تووڕە نابی!

ـ ڕق لە بناخە دا شتێکی خراپ نیە و دڵی ئینسانی خاوێن دەکاتەوە، بەڵام بەو حاڵەش ئێمە دەبێ خۆی لێبپارێزین، چونکە تووڕەیی یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی خوای گەورەیە. ئێمە ئینسانێکی بێدەسەڵاتین و هیچی دی. ئێمە کە هەر وەك مارمێلکەیەکی لاواز بە دەوری خۆمان دا دەخولێینەوە، کوا مافی ئەوەمان هەیە تووڕە بین؟ ئێمە ئێستاش فێر نەبووین لە سەر خۆمان وەجواب بێین و ڕاپەڕین!

ـ ئەمن شوکرانەبژێرم مەلا فەرهاد، شوکری خودای دەکەم بۆ ئەوەی کە لانی کەم دەتوانم بیر بکەمەوە!

ـ منیش دەڵێم سوپاس بۆ خودای.

هەستانە سەر پێ و بە سەر خیزی قەراغ چۆمەکە و گەڵای وەریوی دارەکان دا ڕۆیشتن. زۆری پێنەچوو گەیشتنە هەورازێکی بەرداوی. هەموو دەوروبەریان گابەردی تیژتیژ بوون. دارەکانیش لە سەرێ ڕا هەتا خوارێ پڕ، بەرز و ئەستوور بوون و نێزیکەی هەموو گەڵاکانیان زەرد هەڵگەڕابوون. هەورێکی زەردی تەسك لە سەر دارستانەکەی بوو و لەسەرەخۆ دەبزووت. مەلا فەرهاد ملی باریکەڕێی سەخت و چڕی گرتبوو و لە پێش هەموانەوە دەڕۆیشت، ئەوانی دیکەش بە دووی وی دا ڕیز ببوون و چوست و چالاك، وەك ئەوەی بە ڕێگایەکی ڕاست و ڕەوان دا برۆن، هەنگاویان هەڵدێنایەوە. هەمیشە مەلا فەرهاد توند دەڕۆیی و سەیریش ئەوە بوو ماندووبوونی نەبوو. عەرزی ڕاست بوایە، دارستان بوایە، شاخ و بەردەڵان بوایە و ڕەوەز و هەڵدێر بوایە، بۆ وی هەر یەك بوو و هەر لە پێنەدەکەوت. هەر وەلی شەماڵ دەیتوانی ڕقەی دەگەڵ بکا و ئەوانی دیکە زۆر جاران بۆ ئەوەی بەجێنەمێنن، ناچار بوون بە تەنگەنەفەسییەوە بە دوای دا غار دەن. کاتێك گەیشتنە سەری هەورازی، لەشیان شەڵاڵی ئارەقەی بوو:

ـ دەبێ لەو کانییەی خوارێ ڕاوەستێن، بحەسێینەوە و نانی بخۆین. کانییەکە ئەوەتا لەو دیوییە!

حەمەد لە حاڵێك دا هەناسەی سوار ببوو، گوتی:

ـ لە هەر شوێنێکی پێتخۆشە ڕادەوەستین، هەر نەبێ با پشوویەك بدەین!

لە لێژاییەکە چوونە خوارێ. گەیشتنە سەر کانییەکەی کە لە نێوان حەوت دارە سەروی ئەستووری بەرز هەلکەوتبوو. بەو دارانەیان دەگوت" حەوت برالان". ئاوەکە لە نێو بەردێکی هەڵدەقوڵی، جۆگەلەی دەبەست و دەڕژایە نێو پلووسکێکی دار، کە هەر لە دار سەروی ساز کرابوو و دواتر بە سەر تاتەبەردێکی سپی دا دەچووە خوارێ. شۆقی ڕۆژێ بە پەنا لکی دارەکان دا لە ئاوی سەر بەردەکەی دەدا و شەبەقێکی جوانی دەدایەوە. پاشان ئاوەکە لە خوارەوەتر بە مێرگێکی بژوێن دا تێدەپەڕی، دەڕژایە نێو دۆڵێکی خوارەوەی کێوەکە و لە گەڵ ئاوی چۆمێکی تێکەڵ دەبوو.

حاجیی توندوتۆڵ کە بەرپرسایەتیی هەلگرتن و دابەشکردنی تێشووی بەستۆوە بوو، توورەکەی پڕ لە نانوپێخۆری لە شانی کردەوە، کەولێکی ماڕاشیی دەرهێنا و لە سەر چیمەنێکی تەخت ڕایخست. کەولەکە بە قەدەر سەرلێفێکی گەورە بوو. پاشان نان، کولێرە ناسکەی بە گەنمی، گۆشتی سوورەوەکراو، پەنیر و هێلکەی کوڵاوی دانا.

مەلا فەرهاد گوتی:

ـ حەمەد، ئەوە گۆشت مەڕە،دەزانم ئەتۆ پێت خۆشە...

ـ خودا ڕاوەستاوت کا کاکە، ئەتۆ هەمیشە دە فکری من دای!

هەموویان نانیان خوارد و لە ئاوی سارد و سووکی کانییەکەیان خواردەوە. پاشان قاسم بوو بە کێشکچی و ئەوانی دیش لە بن دارەکان بۆی درێژ بوون. تاوێك بوو خەویان لێکەوتبوو، مەلا فەرهاد ڕاست بۆوە، چووە خوارەوەتر سەرنجێکی دۆڵەکەی دا، بە چاوان، ورد دەوروبەری خۆیان و ڕەوەزە سەختەکانی چیای ڕووبەڕوویانی پشکنی. حەمەد و کوڕەکانی دیکەش هەستابوون و ئەوانیش بە گومانەوە لە دەوروبەری خۆیان دەڕوانی.

مەلا فەرهاد گوتی:

ـ چ نیە، ئەو دەور و بەرە کەسی لێنیە.

پاشان گوتی با بڕۆین و بۆخۆی چوست و چالاك بەرەوخوار داپەڕی و ئەوانی دیکەش دم لە سەر پشت وەدوای کەوتن.

ڕێگایەکی بەرداوی، چڕ و سەخت بوو. بەرەوسەر، بە نێو ڕەوەزان هەڵکشان. شوێنەکەیان هێندە بەرز بوو، هەلۆیان وەك چۆلەکان دەدیتن. دوای ئەوەی لە هەموو ڕەوەزەکان وەسەرکەوتن، گەیشتنە دارستانێکی کە هەمووی دارسەرو بوو. دارەکان هێلانەیەکی زۆریان لە

سەر بوون. نێو دارەکانیش پڕ لە کانی و جۆگەلە ئاو بوو. لە قەراغ کانی و جۆگەکان پنگەڵ گوڵی کردبوو و بۆنێکی خۆشی پنگی ئەو دەوروبەرەی داگرتبوو. ڕێوییەکی کلك بەڵەك لە سەر کانییەکیان ئاوی دەخواردەوە و کاتێك چاوی بە وان کەوت لە جێی خۆی حەبەسا، ڕەق ڕاوەستابوو، چاوی دە وان بڕیبوو و نەیدەزانی چ بکا. دۆڵێك لە نێزیکیانەوە بوو. مێگەلێك حەیوانە کێوی لە دۆڵەکەی دا دەلەوەڕان. حەیوانەکان کاتێك هەستیان بە وان کرد، تێکڕا سەریان هەڵێنا و چاویان تێبڕین. ترس و دڵەڕاوکێ بە ڕوونی بە چاویانەوە دیار بوو.

مەلا فەرهاد تفەنگەکەی لە شانی هێنایە خوار، لوولەی دە لای مێگەلەکەی کرد و گوتی:

ـ حەمەد، پێتخۆشە یەکیانت بۆ بکوژم؟

حەمەد دەستی وەبەر لوولەی تفەنگەکەی دا و بە پەلە گوتی:

ـ نا، نا، پێویست نیە! ئەوە مێگەلە کێویی دایە سوڵتانییە و دەچتەوە خانەقای چلچاوی!

مەلا فەرهاد ئەوەی پێخۆش نەبوو، بەڵام هیچی نەگوت. حەیوانەکانیش و ڕێوییەکەش هەردووك لایان هەروا ڕەق ڕاوەستابوون و تێیان هەڵدەڕوانین. دەنگی هەڵۆ، پەلکوور و شەهێنان لە نێو ڕەوەزەکان دەهات.

گەیشتنە پاناوکێك. شوورەدیوارێکی بە وشکەبەرددانراوی کۆنی بە سەریەك دا ڕووخاو، لە دەوری پاناوکەکەی دەبینرا. وا دیاربوو سەردەمێك ئەو شوێنە کێڵرابوو. مەلا فەرهاد لە بن لێوییەوە گوتی، ئای لەو عەرزە بە ڕێژەو و پیتوبەرەکەتەی! قسەی تێدا نیە ئەو عەرزە هەر نەبێ یەك و چلی دەبڕێ. پاشان ئاخێکی هەڵکێشا و بیری کردەوە:" ئەو عەرزە ئی من بوایە، تەماتە، بیبار و باینجانم لێ دەکرد. تەماتە و بیباری ئێرە دەبێ کەموێنە بن... ئاو و هەوای ئێرەش ئیدی هەر لەو پەڕی خۆشی و خاوێنی دایە! کوڕە ئەگەر ئی من بوایە، شووتی، کوولەکە و خەیارم لێدەکرد. بۆنی خەیاری ئێرە دەبێ زۆر خۆش بێ، بۆنی گیاوگۆڵ و گوڵەکانیشی هەر وا. هەر دەست لە گوڵێکی دەی، بۆنەکەی دە هەموو گیانت دەگەڕێ و تێکەڵاوی خوێنت دەبێ! ئاخ، بریا وا بوایە! خانوێکی بچکۆلانەشم هۆ لەوەی، لە تەنیشت ئەو پەلکە ئەستوورەی! لەبن ئەو ڕەوەزە بەردەی دروست دەکرد و ژنێکی کەڵەگەتی گەردنکێلی چاوڕەشیشم دێنا..."

حەمەد دەمێك بوو سەرنجی دابووە مەلافەرهادی، کە لە وێ ڕەق ڕاوەستابوو، چاوی لە دەوروبەری خۆی دەکرد و لە دەریای خەیاڵاتی خۆی دا نوقم ببوو:

ـ مەلا فەرهاد، ئەوە بیر لە چی دەکەیەوە؟

مەلا فەرهاد وەخۆ هاتەوە و ئاوڕی دایەوە. چاوەکانی پڕ ببوون لە ئاو:

ـ حەمەد، دەزانی هەر ئێستا بیرم لە چی دەکردەوە؟ دەمگوت ئەگەر ئەوەندە عەرزە دوورەدەست و تەریککەوتووەشم بوایە، خانوێکی بچکۆلانەی جوانم لێدروست دەکرد، گوڵ، ڕیحانە، نەعنە و سەوزیی جۆراوجۆرم دەچاند... لایەکم هەر دەکردە خەیار...

حەمەدیش ئاخێکی هەڵکێشا و وەڵامی دایەوە:

ـ بە داخەوە ئێمە قەت ئەوەمان بە نسیب نابێ! قەت خاوەنی ژیانێکی ئاسوودەی ئاوا نابین و قەتیش هیچمان نابێ! ئاخر تەنانەت گورگیش کونێکی هەیە کە بەماڵی خۆی دەزانێ، بەڵام ئێمە هەتا هەین، بێجگە لە ئەشکەوت و بن بەردان پەنا و پەسیوێکی دیکەمان نابێ!

مەلا فەرهاد پێکەنی:

ـ قەیدێ ناکا حەمەد، زۆر گرینگ نیە! ژیانی ئێمەش ناخۆش نیە و لایەنی باشی خۆی هەیە. خودا دەزانێ ئەو کەسەی خاوەنی ئێرە بووە و ئەو زەوییەی ڕەنێو هێناوە، چی بە سەر هاتوە. هەر خودا دەزانێ بۆ ئەو کابرایە ناچار بووە ئەو خاکەی، کە بە ڕاستی دەبێ سەربەسەر بە زێڕی هەڵکێشی، بەجێبێڵێ؟ هەر ئەو عەرزەی کە ئێستا ئێمە لە سەری ڕاوەستاوین و خۆزگەی بۆ دەخوازین...

مەلا فەرهاد بە نێو زەوییەکەی دا ڕۆیی و ئەوانی دیش بە دوای دا ڕۆیشتن، گەیشتنە جۆگەیەکی، ئاوی جۆگەکەی زۆر و بلاو بوو، بەڵام بەردەبازی تێدا بوون. بە سەر بەردەبازەکان دا لە جۆگەکەی پەڕینەوە. لە پشت ڕیزەدارێکی ئەو بەری جۆگەکەی چاویان بە زەوییەکی گەورەتر کەوت. پیاوێکی پیر لەوسەری زەوییەکەی جووتی دەکرد. مەلا فەرهاد بە دیتنی ئەو پیاوەی زۆر شاد بوو و بە ڕاکردن چوو بۆلای. حەمەد و هاوڕێیانی دیکەشی بە دوای مەلا فەرهادی دا ڕایان کرد.

ئەو جووتەگایەی دە بەر نیری دابوون، لە کابراش پیرتر بوون. پیرە یەکی ملدرێژی ملچرچاوی بوو و گایەکانیش لە بەر لاوازی و کەنەفتی‌یان هەموو پەراسوویان دیاربوون. پیرێژنێکی کزەڵۆکەش لە وێ، لە بن دارێکی هەڵکورمابوو. پیرێژن ئەوەندە لاواز بوو، بایەکی بە قەوەت هاتبایە، دەیبرد. ژنەکە کاتێك چاوی بەو کۆمەڵە خەڵکەی کەوت، کە لە نەکاو بە وێ وەربوون، بە سەرسوڕمانەوە چاوی تێبڕین.

ـ سەلامون عەلەیکوم...

ـ وەعەلەیکوموسسەلام... ئەی... کوڕە ئەوە خۆ مامۆستا مەلا فەرهادە! دە ڕەبی بەخێر بێی!

ـ زۆر سوپاس مامە گیان، خەڵکی کام دێی؟

کابرا بە چەنەی ئیشارەی بۆ لای خوارێ کرد و گوتی:

ـ خەڵکی ئەو گوندەی خوارێم!

هەموو چەتەکان چاویان لە لای خوارێ کرد. چ گوند دیار نەبوون، تەنیا باقە دووکەڵێکیان دی کە لە نێو دارستانەکەی خوارەوەتریان هەڵدەستا.

ـ کە وابوو گوندەکەی تۆ لەو خوارەوەیە؟

ـ بەڵێ وایە، ئێوەش ئەگەر پێتان خۆش بێ، دەتوانن ئەمشۆ میوانی ئێمە بن.

ـ با شتێکت لێ بپرسم، ئەو زەوی‌یە چاکەی سەرەوە ئی کێ‌یە؟

ـ ئی منە.

ـ باشە ئەدی بۆ نای‌کێڵی؟ خۆ بە ڕاستی خاکەکەی ئەوەندە چاکە دەبێ سەربەسەربە زێڕیی هەڵکێشی.

ـ بڕوانە مامۆستا، ئەو گایانەت دیتوون؟ ئەوانە ئیدی ئامووریان پێ‌ناکشێ، ئەوە ئاموورەکەیە پاڵ بە وانەوە دەنێ! بەو گایانەوە ناتوانم بە زەویی سەریش ڕابگەم. هێزیان دەبەردا نەماوە و دەبێ ئاگام لێیان بێ. ئەوانەم لێ‌بمرن، لە برسان دەمرم...

لە لایەك بەزەیی و لە لایەکیش نەفرەت و ڕقێکی گەورە دەروونی حەمەدیان هەژاند. مەلا فەرهاد پێشتریش بۆی باس کردبوو کە جووتێری خەڵکی شاخی چەندە بێ‌دەرەتان و بێ‌ئەنوان.

ـ شاهێن!

شاهێن یەکجێ لوولەی تفەنگێی دە گایەکان گرت، دوو گوللەی تەقاند و هەردووك گای کوشتن. پیرێژن وەك پڵینگی بریندار دەرپەڕی و خۆی بە مەلا فەرهادی دادا. مەلا فەرهاد بە ئەسپایی باوەشی پێ‌داکرد و دای‌نیشاند، بەڵام ژنە هێور نەبۆوە و بە خڕکە بەرد و تەپاڵە و سندەگڵان مەلا فەرهادی داگرت:

ـ مەلای ڕدێن بە گوو، دە ئێمەش بکوژە! ئێستا ئەو گایانەت بۆ لێ‌کوشتین؟ ئەو جار ڕوو دە کوێ کەین! دە بمانکوژە، با ئێمەش لە دەست ئەو ژیانە تاڵەی ڕزگار بین.!

پیرێژن بە یەخەی کراسی مەلا فەرهادی‌یەوە نووسابوو و بەری نەدەدا، هەر هاواری دەکرد: دەی، ئێمەش بکوژە، دەی! حەمەد زۆری هەوڵ دا لە مەلا فەرهادی بکاتەوە، بۆی نەکرا، چنگی لە چنگی هەڵۆی بە قەوەتتر بوو و وای گرتبوو بەری نەدەدا.

پیاوە پیرەکەش، هەر لە جێی خۆی، لە پشت ئاموورەکەی دانیشتبوو، دەستی دە چۆکانی وەرێنابوو، چەنەی وە سەر چۆکی دا بوو و ڕادەژا.

ئاخرەکەی شاهێن هات، هەرچۆنێك بوو ژنەی لە مەلا فەرهادی پچڕییەوە و بردی لە لای دارەکەی دایینیشاندەوە:

ـ دایە گیان ، بەسە لە سەرەخۆ بە! جنێوان مەدە، پەشیمان دەبی‌یەوە!

پاشان چوو پیرەپیاوەکەی هەڵستاند، چووە بن باڵی و بردی بۆ لای مەلا فەرهادی. مەلا فەرهاد کیسەیەکی کەسکی چیتی لە گیرفانی خۆی دەرێنا و ڕووی دە حەمەدی کرد:

ـ پێم بڵێ بزانم، حەمەدۆك، دوو گای چاك چەندی دێنن؟ ئەمن پووڵی دوو گای چاك دەدەم بەو پیاوەی!

حەمەد وەڵامی دایەوە:

ـ پێنج سکەی زێڕ!

ـ نا، ئیدی واش نا ڕۆڵە! پیاو بە پێنج سکەی زێڕ گاڕانێك گایان دەکڕێ!

ـ قەیدێ ناکا پێنجەکەی بدەیە، بەستەزمانە مرد و زیندوو بۆوە. بی‌دەیە مەلا فەرهاد.

ـ وەڵلاهی زۆرە، بەڵام خۆ ناکرێ قسەی حەمەدۆکی سەرۆکی بەناوبانگمان بشکێنین. ئێستا کە ئەو دەستووری داوە، پێنجەکەی دەدەینێ!

پیرێژن و پیرەپیاوەکە هەردووکیان چاویان دە کیسەکەی بریبوو.

مەلا فەرهاد پێنج سکەی زێڕی لە کیسەکەی دەرێنا و گوتی:

ـ دەستت بێنە، بەو پووڵەی دەتوانی حەوت گای چاك بکڕی. بگرە! ئەوە یەك، ئەوە دوو، ئەوە سێ، ئەوە چوار و ئەوەش پێنج... تەواوە؟

پیرە پیاو دەستی دەلەرزی و سەرسوڕمان و خوشحاڵی وای لێ‌کردبوو کە بە زەحمەت دەیتوانی بە پێوە ڕاوەستێ. هەر وا دەستی ڕاگرتبوو و حەبەسابوو.

ژنەکە تێی‌ڕاخوڕی:

ـ مردووت مرێ، پووڵەکەی دە گیرفانت نێ، بۆ واق ماوی؟

پیاوەکە ئێستاش دەستی دەلەرزی، کیسە تووتنێکی چەرمی پێ‌بوو، سکەکانی دە وێ هاویشتن. پیرێژن ڕای کردە لای مەلا فەرهادی و بە چاوی بە فرمێسکەوە ئامێزی تێ‌وەرێنا و دەستی ماچ کرد. پاشان چوو هەردووك لاچاوی حەمەدیشی ماچ کرد. چاوە پڕ فرمێسکەکانی هومێد و شادی‌یان لێ‌دەباری. پاشان ڕووی دە مەلا فەرهادی کرد و گوتی:

ـ مامۆستا گیان، ئەتۆ پیاوی خودای! وەڵلاهی بە پێڵاوەوە دەچیە بەهەشتێ. خەڵك دەڵێن مەلا فەرهاد شێخە، بەڵام ئەمن باوەڕم نەدەکرد و ئێستا ئیدی بە تەواوی دەزانم وایە.

مامۆستا مەلا فەرهاد، لە ئێستاوە ئەمنیش بە پیاوی خودات دەزانم و بۆت دەپاڕێمەوە خوا بتپارێزێ! داواشت لێ‌دەکەم ئەو ڕێگایەی هەڵتبژاردوە، بەری‌مەدە. دڵنیا بە خودا تۆڵەت بۆ دەکاتەوە و بزانە کە هەر لە ئێستاوە دەرگای بەهەشتێت بۆ لە سەر پشتێیە!

پیرێژن هەر وا دوعای بۆ دەکردن، دەپاڕایەوە و هەتا زیاتریش دەپاڕایەوە، کوڵێکی زیاتر دەی‌گرت. مەلا فەرهاد هیچی نەدەگوت و ژنەکەش هەر وا درێژەی بە قسە و پاڕانەوە دەدا:

ـ بریا هەموو پیاوچاکی دیکەش شوێن و پلەیان وەك تۆ بوایە، کە هەر لە ئێستاوە ئاشکرایە لە بەهەشتێ جێگات بۆ دیاری کراوە!

دەو بەینەی دا ڕووی وەرگێڕا و چاوی بە حەمەدی کەوتەوە. بە بزەوە چاوێکی لێ‌کرد و پاشان دەستی گرت و گوتی:

ـ بە قوربانی تۆ بم، ڕۆڵە جوانە قارەمانەکەم! ئەتۆ لە سەر ئەو عەرزەی بووی بە شمشێری خودای. خودا ئەتۆی خۆش دەوێ و هەر بۆیەش ئاوا باش و ئازای دروست کردووی! ڕەبی ڕۆڵە لە بەڵا، ئاڕەحەتی و گوللەی دوژمنان دوور بی!

یەکبەیەك چووە لای هەموو چەتەکان، ئەحواڵی پرسین و دوعای بۆ کردن و دیسان هاتەوە لای مەلا فەرهادی:

ـ مامۆستا، دەبوو گایەکانمان بە شێوەی ئاسایی کوشتبایەوە و گۆشتەکەیانمان بە سەر ئاوەدانی‌یە دا داروبەخش کردبایە، بەشی هەموو دێیەکەی دەکرد.

ـ هەی ماڵتە خوشکم، ئەو گایانە هەر یەسك و پێست بوون و گۆشتیان پێوە نەبوو. چت لێ‌دەکردنەوە و دەتدا بە خەلکی؟

ـ شتێکیان هەر لێ‌یەیدا دەبێ. باشە خۆ دەبێ ئەمن شتێکتان بۆ ساز کەم! ئەرێ مامۆستا گۆشتی ئەو گایانە حەڵاڵە؟

مەلا فەرهاد گوتی:

ـ بەڵێ حەڵاڵە.

ـ وڵاغ بە گوللەی بکوژرێ، گۆشتی حەڵاڵە.

پیرێژنەکە چوو بۆ لای مێردەکەی و سرتەیەکی دەگەڵ کرد. پیرە پیاو هێشتا وەخۆ ئەهاتبۆوە و کیسەکەی توند دە نێو دەستی گرتبوو. پیرێژن وشیاری کردەوە و پاشان دووبەدوو بەرەوخوار ڕۆیشتن بۆ لای دێی. هێندە بە گورجی ڕۆیشتن، مەلا فەرهاد باوەڕی نەدەکرد کە ئەوە هەر ئەو دوو ئینسانە پیرە شەکەت و کەلەلاکەی ساتێك پێش ئێستان.

ـ ئێستا بۆ کوێ بچین مەلا فەرهاد؟
ـ ئەوانە دەیانەوێ میوانداریت لێبکەن...
هەردووکیان شانبەشان بەرەو گوندەکە چوونە خوارێ، بەڵام حەمەد بە زەحمەت لە گەڵ مەلا فەرهادی دەردەچوو و هەربۆیەش زوو هەموو لەشی وە سەر ئارەقەی گەڕا، بزەیەکی هاتێ لە دڵی خۆی دا گوتی، بابە ئەو مەلا فەرهادە باڵی بە لاقانەوەن.
ئێوارێ گەیشتنە دارستانێکی پشت دێی. دارستانەکە بە شاخێکی سەرەوەی گوندەکەیەوە بوو. حەمەد بیری کردەوە کە وا باشە مەلا فەرهاد تاوێك لێرە ڕاوەستێ. هەر واش بوو و مەلا فەرهاد لە وێ دەستووری پشوودانێکی کورتی دا:
ـ کوڕینە ئەم گوندە پێی دەڵێن "کانی‌یە بای". لێرە هێندێك دەحەسێینەوە.
حەمەد خۆی بە عەرزی دادا، هەناسەی سوار ببوو و هەر دەفی دەدان. مەلا فەرهاد لە پەنای دانیشت، دەستی لە سەر شانی دانا و گوتی:
ـ چ نیە کوڕم، زۆری پێناچێ لە گەڵ ژیانی چەتەگەری‌یە ڕادێی.
ـ بەڵێ، ڕادێم، مەلا فەرهاد...
دووکەڵێکی زۆر لە کولانەی ماڵەکان دەهاتە دەر و  بە سەر دارستانەکەی دا بڵاو دەبۆوە. گاڵوبوغری خەلکی دێی لە گەڵ زەڕەی کەران و سەوەڕی تێکەڵ دەبوو. کەڵەبابێك خوێندی، خوێندنێکی بێوەخت، وا دیار بوو کاتی لێگۆڕابوو.
مەلا فەرهاد گوتی:
ـ ئەو گوندە زۆر کۆنە. "نەبەزگوند "یشی پێدەڵێن.
پاشان بە پێکەنینەوە بە سەرهاتی گوندەکەی بۆ گێڕانەوە:
سەردەمی نوێکردنەوەی، پێش ڕاپەڕینە گەورەکەی، تورکمانەکان بەربەرەکانی‌یان دەکرد و پێیان خۆش نەبوو لە جێگایەکی دیاریکراو نیشتەجێ بن و ببەسرێنەوە. حاکمی ئەدەنەی بڕیاری دا کە گوندەکانی ناوچە شاخاوی‌یەکان چۆڵ بکرین و هەموو خەلکەکەیان لە دەشتێ کۆ بکرێنەوە و نیشتەجێ بکرێن. لە سۆنگەی ئەو بڕیارەی دا ئەو گوندانەی بەربەرەکانی‌یان کرد، تێکڕووخێنران و ژاندەرمان  پیاو، ژن و منداڵیان بە زۆر بردنە خوارێ و دە دەشتێیان کردن. هەموو گوندەکانیان بە خەلکەکەی چۆل کرد و لە دەشتێ بە پووش و قامیشی خانوویان پێساز کردن، بەڵام هێشتا شەش مانگی پێنەچووبوو خەلکەکە ئەو خانووە قامیش و پووشانەیان بەجێهێشت،  گەڕانەوە شوێنی خۆیان و سەر گوندە تێکڕووخاوەکانیان. ئەو کێشە و بەربەرەکانی‌یەی نێوان حاکم و تورکمانەکان ماوەیەکی

دوور و درێژ هەر هەبوو. ئاخری تورکمانەکان سەرکەوتن و لەو بەینەش دا سەدانهەزار پیاو و ژن لە دەشتیٚ دەستبەسەر کرابوون و وەك مێشومەگەزی بە تاولەرزی دەمردن. هێندێك لە جووتێرەکان خۆیان پیٚڕانەگیرا و سەرەڕای ئەو تاولەرزەی کە بە ڕاستی حەشری دەکرد، ملیان بۆ بڕیارەکە ڕاکێشا و لە دەشتیٚ مانەوە. حاکمەکە دواتر لە ئەدەنەی ڕۆیی، بەڵام کاربەدەستانی دوای ویش دەستیان لە ئازاردانی ئەو خەڵکەی هەڵنەگرت. هەر ژاندەرمە دەهاتن خانووی گوندەکانی شاخیان دەڕووخاندن و ئەوانیش دروستیان دەکردنەوە. دەیانگرتن، دە بەندیخانەیان دەکردن، بەڵام جووتێرەکان کۆڵیان هەر نەدا و ئەو جار هاتن لە شوێنە هەرە بەرز و هەرە شاخاوییەکانی ناوچەکە گوندیان دروست کردن. لە دۆڵ و شیوی وایان ئەو گوندانە دروست کردن، کە تەنانەت دۆزینەوەشیان زەحمەت بوو. لەو شوێنانە لە جیاتیی خانووی، دە چادر، کەپر و کۆخان دا دەژیان، بەڵام دیسان لە کۆڵیان نەبوونەوە، ژاندەرمە دۆزیانەوە و بردیانن دە دەشتێیان کردنەوە.

گوندی واش هەبوون کە دەسەڵات دەروەستیان نەهات و یەکێکیش لەو گوندانە ئەو کانییەبایە بوو، کە هەر نەبەزی و خۆی ڕاگرت. جووتێرە تووڕووسییەکان پێیانخۆش بوو لە چیاکانی خۆیان لە برسان بمرن، بەڵام لە دەشتیٚ نەژین، چونکە قەت نەیانتوانی لە گەڵ گەرما و مێشوولەی دەشتیٚ ڕابێن و هەموو جاریٚ هەڵدەهاتن و دەهاتنەوە سەر گوندە سووتێنراو و رووخاوەکانیان. ئەو بەزمە بەو شێوەیە درێژەی هەبوو هەتا ئاخرەکەی دەوڵەت ماندوو بوو، گوێی خۆی لیٚئاخنین و هەم خۆیان و هەم چیاکانیانی لە بیر خۆی بردەوە...

مەلا فەرهاد دوای ئەوەی لە گێڕانەوەی بەسەرهاتی گوندەکەی بۆوە، گوتی:

ـ کوڕینە، جا ئێستا هەستن بڕۆینە نێو دێی. بیٚگومان ئێستا ئەوان دەزانن ئێمە لێرەین و دەشزانن ئێمە باسی چ دەکەین! خەڵکی گوندی کانییە بای ئەوەندە وشیارن، ئاکریٚ شتێك لەو شاخانە بقەومیٚ، یان کەسێك، تاقمێك بێرە دا تیٚپەڕن و ئەوان نەزانن. مێروولەیەك لەو شاخانە بجووڵیٚ، ئەوان ئاگادارن. بە تایبەت بۆنی ژاندەرمان زوو دەکەن و هەر ژاندەرمە لە جێی خۆیان جووڵان و ڕوویان دێرە کرد، خەڵکەکە هەستیان پیٚدەکەن. بۆ؟ چونکە ژاندەرمە ساڵانێکی زۆر وەدوایان کەوتوون و ڕەپێیان ناون. خەڵکی ئەو گوندەی لە منداڵی حەوت ساڵەوە هەتا پیری حەفتا ساڵە لە گەڵ ئێمەن و ئەو جووتێرانە چاو و گوێی ئێمە لە هەموو ناوچەکەن. گەڵا خشەی بیٚ، پێش هەموو کەس ئەوان دەزانن. ئازا و نەترسیشن، نە لە ژاندەرمان دەترسن و نە لە پیاوی دایرەی باجئەستاندنیٚ! زۆریش ڕیزی دایە سوڵتانی دەگرن...

کاتێك چونە نێو دێی، بابە جەفەر دەست لە سەر سینگ، بە پیریانەوە هات. حەوت لاوی توندوتۆڵ و شۆخیشی لە گەڵ بوون. لاوەکان هەموویان چاکەت و پانتۆڵی قاوەییان دەبەر دا بوون و سەربەرگەکانیان یەك بوون. دووربین، تفەنگ، خەنجەر و ڕەختیان یەك بوون و بۆخۆشیان وەك یەك دەچوون. بابە جەفەر کاتێك مەلا فەرهاد و هاوڕێیانی بەخێرهاتن دەکرد، دەستی ڕاستی هەر لە سەر سینگی بوو. دوای بەخێرهێنانێ بە شانازییەوە گوتی:

ـ ئەو کوڕانە حەمەددەکانی دێی ئێمەن! ئێستا ئەوان دە خزمەت تۆ دان و چییان پێ‌بسپێری ئامادەن جێبەجێی بکەن.

مەلا فەرهاد حەمەدۆکی وەپێش دابوو و بۆخۆی لە دوایەوە دەڕۆیشت، هەربۆیەش هەم بابە جەفەر و هەم هەموو خەڵکی ئاوەدانییە دەسبەجێ ناسییان.

تەواوی خەڵکی گوندەکەی لە نێوەڕاستی دێی کۆ ببوونەوە، کڕ و بێ‌دەنگ ڕاوستابوون و چاوەڕوان بوون. کە میوانەکان گەیشتنێ، هەموو بەخێرهاتنیان کردن. حەمەدیش وەڵامی دەدانەوە. لەو کاتە دا بێ‌ئەوەی بە خۆی بزانێ دەستی لە سەر سینگی دانابوو و هەتا نەهاتنە دیوەخانی بابە جەفەری لێی نەکردەوە، تەنیا کاتێك تفەنگەکەی لە شانی کردەوە، زانی و لە دڵی خۆی دا پێکەنی.

شەو بە سەر دا هات، وڵات تاریك بوو، سفرە ڕاخرا و نانیان دانا. چەند جۆرە چێشتیان هێنان، خوانیان پێ‌ڕازاندنەوە و هەموو بە یەکەوە نانی شەوێیان خوارد.

دوای نانخواردنێ هەموو خەڵکی دێی بۆ چاوپێکەوتنی میوانەکان لە ماڵە بابە جەفەری کۆ بوونەوە. بێجگە لە دیوەخانەکەی هەموو ماڵەکە و تەنانەت حەسارەکەش پڕ لە خەڵك بوو. لای نیوەشەوێ بابە جەفەر سازەکەی کە بە دیوارییەوە هەڵواسرابوو، هێنایە خوار و دەستی بە مەقام و بەیتگوتنێ کرد. بەیتەکان باسی خۆشی و ناخۆشی و کەوتن و هەستانەوەی خەڵکەکەیان دەکرد. نە حەمەد و نە مەلا فەرهاد تا ئێستیا بەیتبێژێکی ئاوایان نەدیبوو. کاتێك بەری بەیانی ساز بێ‌دەنگ بوو، دەتگوت دەروون و ڕووحی هەموویان بە ئاوێکی پاك شۆراوەتەوە و تازە لە دایکی خۆیان بوون...

بابە جەفەر سیگارێکی داگرساند و سمێڵە درێژەکانی بادان. ئەو سمێڵانە قەتیان مقەست وێ‌نەکەوتبوو:

ـ هەواڵێکی خۆشم بۆ ئێوە پێیە. ئەو گوندەی ئێمە جێگایەکی پیرۆزە، هەمیشە چاکی بۆ هاتوە و هیممەت و بەرەکەتی پیاوچاکانی لێ‌نەبڕاوە. هەر بۆیەش دەسەڵاتی عوسمانی بە

هەموو هێزی خۆیەوە نەیتوانی هەرگیز بە سەرمان دا زاڵ بێ. هەزار جار زیاتریش هێرشمان کراوەتە سەر و نەبەزیوین. ئەوەتا ئێستا حەمەدۆکیشمان میوانە و هەر بۆیە...

مەلا فەرهاد پێکەنی:

ـ بابە جەفەر ئەوەی گوتت ڕاستە، بەڵام کوا ئەوە هەواڵە!

ـ هێندێکم سەبر لێبگرە، دەگەمە وێش... هەر پێش ئەوەی ئێوە بێنە ئێرە، ئەسپێك هاتە ئەم گوندەی ئێمە. ئەمن عادەتم وایە پێش تاوهەڵاتێ هەڵدەستم. بەیانی‌یەك کە هەستام، ئەسپێکی کوێتم لە بەر دەرگای ماڵێ چاو پێکەوت. ئەسپەکە ڕاوەستابوو، سەری بەردابۆوە و پێشووی ڕاستەی بە زگی‌یەوە نووساندبوو. زۆرم پێسەیربوو! گوتم ئەو ئەسپە دەبێ ئی کێ بێ و لێرە چ بکا؟ هەر لەو کات دا جیرانەکانم بە پەلە هاتن و گوتیان ئەوە ئەسپی حەمەدۆکی‌یە. پێم گوتن بۆلای نەچن و دەستی لێنەدەن، نەوەك تووڕە بێ، بفرێ و لێرە دوور کەوێتەوە! گوتم هەر خۆی تێمەگەیەنن، لێی‌گەڕێن چ دەکا، بکا. بەڵێ، ئەسپەکە ڕۆژ و شەوێکی تەواو بەو شێوەیەی ڕاوەستابوو و بۆ هیچ‌کوێ نەچوو. وردە وردە لێێ نێزیك بووینەوە، تفاقمان بۆ برد، نەی‌خوارد، ئاومان لە پێش دانا، نەی‌خواردەوە.

خەڵکی دێی هەموو هاتن و لە دەوری کۆ بوونەوە، بەڵام سڵ نەبوو و نەڕۆیی، پاشان خەڵکەکە بڵاوەیان کرد، بەڵام ئەسپە کوێت هەر لە وێ بوو و هەر وا پێشووی ڕاستەی وەبەر زگی‌دابوو و ڕاوەستابوو.

ـ ئەسپەکە سێ‌شەو و ڕۆژان هەر لە وێ ڕاوەستابوو؟

مەلا فەرهاد گوتی:

ـ ئاخر ئێرە گوندێکی پیرۆزە و جیاوازیی لە گەڵ جێی دیکە هەیە...

ـ ئەگەر وا بێ لەوەی دا لە سەر قسەی منی؟

ـ بەڵێ، بەڵێ، ئێمە پێمانوایە گوندی ئێوە شوێنێکی مەبارەکە، ڕاست وەك خانەقای چلچاوی!

بابە جەفەر سەری بەردایەوە، دەستی لە سەر سینگی دانا و دیسان گوتی:

ـ ئەوەی بۆتان دەگێڕمەوە، دەقاودەق ڕاستە! ئەسپەکە نەڕۆیی و هەر وا لە شوێنی خۆی بەو حاڵەی بۆم باس‌کردن، مایەوە. سەری سێ ڕۆژەی مریەمی کچم سەتڵێکی ئاو بۆ برد و لە پێش دەمی دانا. ئەسپە کوێت ئاوەکەی هەموو خواردەوە، بەڵام هەر لە شوێنی خۆی نەبزووت. ئێوارێ بە خەڵکەکەم گوت، براینە ئەو ئەسپە کە چەند ڕۆژە میوانمانە، وا دیارە ئێرەی پێخۆشە و نایەوێ بەجێمان بێڵێ، با ئێمەش قەدری بگرین و بەخێوی کەین! ڕەشمەیەکم دا دەست مریەمێ وگوتم: کچم

کاتێك ئاوەکەت بۆ برد، سڵ نەبوو و خواردیەوە. وا دیارە نەتۆ دەناسیێ. ئێستا وردە وردە بۆ لای بچۆ، بزانە دەتوانی ڕەشمەی کەی؟ مریەم بە ئەسپایی بۆ لای چوو، خەڵکێکی زۆر ڕاوەستابوون و چاوەڕوان بوون بزانن ئەسپەکە ڕەشمەی دەدا. مریەم لێی چووە پێشێ، وردە وردە گەیشتە تەنیشتی، دستی بە یاڵ و نێوچاوانی دا هێنا و لاواندیەوە. ئەسپەکە جووڵەی نەکرد. مریەم خێرایەکی ڕەشمەی کرد... بەڵێ ئەسپەکە هاتبووە ئەم گوندە پیرۆزەی و دەیەویست لە لای ئێمە بمێنێتەوە. ئەوەش هەر کاری خوای بوو، بەڵام لە پێش دا دەتگوت ئێمە کوێرین. ئەو ئەسپە سێ شەو و ڕۆژان ڕاوەستا و چاوەڕوان بوو! دەبوو ئێمە هەر هەوەڵڕۆژێ دامانکردبایە و نەمانهێشتبا لە دەرێ مابایەوە! دیارە ئەسپی حەمەدۆکی بۆ وەی نابێ دە تەویلەی کەی و دەبێ جێگایەکی خاوێنی بۆ تەرخان کەین! بیر لە وەی بکەنەوە، ئەسپێك کە شاخ، ڕەوەز و دۆڵودەرەی دە بن پێی دا دەلەرزن، سەر بۆ گورگ، باڵندە و بەرد و داریش دانانوێنێ، کە غار دەدا، باقە باقە ئاورینگی لە سمی دەبنەوە، ئەوە ئاوا نەرم و هێدی هاتۆتە گوندی ئێمە و سەری ئێمەی داوە. جا دەبێ ئێمەش قەدری بگرین و نەیەڵین خراپی بۆ بگوزەرێ. ئیدی لە وێڕۆژێوە لاوەکانمان بە وێنجە و گیای شینی قەراغ کانی و جۆگان بەخێویان کردوە و لێی خافڵ نەبوون. ئەگەر پێتانخۆشە تاوێکی دی دەچین و چاوتان پێیدەکەوێ.

حەمەد گوتی:

ـ زۆرم پێخۆشە بیبینم.

بابە جەفەر وەپێشیان کەوت. لەوبەری حەساری خانوێکی جوان دروست کرابوو. چوونە وێ. نێو خانووەکەی ڕووناك و خۆش بوو و هیچ وەك تەویلەی نەدەچوو. ئەسپەکە لە وێ بوو، توورەکەیەکی بە سەرەوە بوو و بە کرمە کرم لە ئالیکی نێو توورەکەکەی دەخوارد. ئەوانیش لە بێلایە ڕاوەستان و تاوێکی چاك چاویان لێکرد.

حەمەد لە بن لێویەوە گوتی:

ـ ئاوا!... کە وابوو ئەوەش هەر...

پاشان لە حاڵێك دا دەبیرەوە چووبوو، ڕۆیشتەوە لای دیوەخانێ.

لە نێو دەرگای دیوەخانێ پیاوێك بە پیریەوە هات، پیاوێکی چوارشانە، بەخۆوە و ئەوەندە کەڵەگەت کە سەری وە دارەکانی بەری میچی دەکەوت. پیاوەکە سەربەرگێکی سووری دەبەردا بوو و جووتێك کەوشی قایشی سووری زۆر گەورەشی هەبوون. کەوشەکانی لە دیوی دەرێ، لە بەر دەرکەی داکەندبوون. حەمەد دەسبەجێ وەبیری هاتەوە کە دەبێ ئەو کابرایەی زووتر لە شوێنێك دیبێ. کابرا ڕووبەڕووی وی لە سەر چۆکان دانیشت، بە ڕێزەوە دەستی لە سەر ڕانی دانان و گوتی:

ـ شێخی ئێمە دایە سولتان، سلاو لە خۆت و هاورێیانت دەکا حەمەدۆك و دەفەرموێ چاوەڕوانی ویم، بێ و سەرم بدا...

کابرا هەر ئەوەندەی گوت و هیچی دی. پاشان ڕاست بۆوە، هەردووك دەستی چەپ و ڕاست بە سینگییەوە نان، پاشەوپاش هەتا بەر دەرگا چوو، خۆی کووڕ کردەوە، چووە دەرێ، کەوشەکانی دە پێ کردن و لێیدا ڕۆیی.

مەلا فەرهاد لەمێژ بوو دەیزانی خەڵکی کانییە بای تایفەیەك بوون کە هەموویان خاوەنی یەك بیروباوەڕ بوون. بە گەورەکانیان دەگوت "بابە" و هەر ئەو بابانەش سەرۆك و ڕێبەریان بوون و خەڵکەکە لە قسەیان دەرنەدەچوون. ئەوان بنەچەکەیان دەچۆوە سەر بابە ئیسحاقی خەلیفەی بابە ئەلیاسی شێخی تورکمانەکان و کۆمەڵی دارتاشان. ئەو شێخە، واتە بابە ئیسحاق، لە سەدەی دوازدە، دەوروبەری ساڵی ۱۲۰۰ ، بە دژی دەسەڵاتی سەلجووقییەکان ڕاپەڕی. بابە جەعفەر ئێستا گەورەی ئەو تایفەیەی بوو و تەواوی کتێبەکانی "ئیسحاقییان"ی هەبوو.

مەلا فەرهاد بە جحێڵی، لە خانەقایەکی، چاوی بە کتێبێکی کەوتبوو. ئەو کتێبە بەسەرهاتەکانی شێخ ئیسحاق و خەلیفەکانی ویی تێدا تۆمار کرابوو. دوای ئەوە مەلا فەرهاد تۆگریی بەو شێخە و خەلیفەکانی پەیدا کردبوو و ئیدی هەموو ئەو کتێبانەی خوێندبوونەوە کە باسی یەکەم ڕاپەڕینی ئاناتۆلییان تێدا کرابوو.

شۆڕشەکە لە چیاکانی تووڕووسەو دەستی پێکرد. دارتاشەکان بە دژی هەژاری و دەستتەنگی ڕاپەڕین و هەر وەها مەبەستیان ئەوە بوو کە زوڵم و زەبروزەنگ لە سەر خۆیان لابەرن. ئەوانە دەستیان دا تەوەرزین، تەور، بیور، شەنە و تەشوێیان و بە شاخ و دەشتێ وەربوون. دروشمەکەیان ئەوە بوو:" بابە سولتان ڕێبەرمانە حوکمی وی لە سەر سەرمانە!". زۆر گوند و شاریان گرتن و لە گەڵ تورکمانە ڕاپەڕیوەکان هێندێك کۆمەڵەیان دروست کردن. کۆمەڵەکان لە سەر بناغەی دەسەڵاتی یاسا و عەداڵەت پێکهاتبوون. دەسەڵاتی وان هەموو دەشتەکانی ئاناتۆلیی دەگرتەوە، لە ئەدیامانێوە هەتا مالاتیای، لە قەیسەرییەوە هەتا سیواسێ و دوورتر، هەتا کۆنیای کە ناوەندی دەسەڵاتی سەلجووقییەکان بوو. ئەوان سوێندیان بە ئالا و نیشانەی خۆیان کە تاجێکی سوور بوو، خواردبوو کە دنیایەك لە سەر بناخەی عەداڵەت، ئازادی، یەکسانی و برایەتی دروست بکەن.

سوپای سەرتاپێ چەکداری سەلجووقییەکان بەرگەی حەشیمەتی ڕاپەڕیوی کە هەر تەور، بیور، تەشوێ، شەنە و پاچیان پێبوون، نەدەگرت و لە پێشیان وەك بەفری دەتوایەوە. سرووود

و مەقامی زۆر خۆشی وا لە دەشتەکانی ئاناتۆلی دا دروست بوون و کەوتنە سەر زار و زمانان، کە تا ئەو کاتی وێنەیان نەبوو. ئەو سروود و مەقامانە باسی یەکسانی و برایەتی‌یان دەکرد. هەموو خەڵك، پیر و لاو، ژن و پیاو، گەورە و بچووك داوەتیان دەکرد و شێوە هەڵپەڕینی زۆر جوان بوونە باو. سەرانسەری دەشتێ، بە گیا، گوڵ، چۆم، جۆگە، زەوی، زیندەوەر و مێشومەگەزیشی‌یەوە لە خۆشی‌یان، لە شایی‌یە جوانی و گەرمیی هەستی ئینسانی، وەك حەوجۆشی سەر ئاوری دەکوڵێن. هێندەی نەمابوو خەڵکی ڕاپەڕیو کۆنیاش بگرن و ئەگەر ئەوێیان گرتبایە، سوڵتانیشیان بە دیل دەگرت و دەیانتوانی هەم ئەو و هەم پیاوەکانی لە سەر ناحەقی، گەندەڵی و ستەم مەحکەمە بکەن. شەڕ تاریکوڕوونی بەیانی دەستی پێکرد. خەڵکەکە هەمووی دەیکرد. تەنانەت ژن و پیاوی پیر و پەککەوتەش بە گۆچانەوە هاتبوون. نەخۆشان جێگایان بەجێ‌هێشتبوو و هەموویان بە یەکەوە یارمەتیی پیاوە شەڕکەرەکانیان دەکرد. ئەوە شەڕی مان و نەمانێ بوو، یان دەبوو سەرکەون، یان بمرن. بەڵام شتێك دە گۆڕێ دا بوو کە ئەوان لێی‌بێ‌خەبەر بوون و ئەویش ئەوە بوو کە سوڵتانی سەلجووقی‌یەکان لە لایەن قەیسەری ڕۆمێوە لەشکرێکی گەورەی هاتبوە یارمەتی‌یە، کە ئەو لەشکرە لە ئی خۆشی تەیارتر بوو و سوار و پیادەی لە بەری پێیان هەتا تۆقی سەریان چەکدار بوون.

شەڕێکی زۆر بێ‌بەزەیی‌یانە دەستی پێکرد. شەڕکەرە هەرە تەیار و بە دەستوبردەکان کە تەوربەدەستەکان بوون و لە ڕیزی پێشەوە بوون، پێش هەمووان کوژران، پاشان پیاوەکانی دیکەش هەتا کوژران، ئازایانە شەڕیان کرد. یەك کەسیش لەو مریدانەی شێخ ئیسحاقی هەڵتەهات، تەنانەت پیر و نەخۆش و منداڵیش هەتا دوا هەناسە و تا ئەوکاتەی شمشیری ستەم جەستەی لەت کردن، بەربەرەکانی‌یان کرد. ئەو جار نۆرە گەیشتە ژنان کە لە بەرامبەر هەوری ڕەشی ستەم دا ڕاوەستن. ژنەکان لە پیاوەکانیش زیاتر خۆیان ڕاگرت، بە چنگ و ددان بەرگری‌یان کرد و هەتا ئاخر کەسیان نەکوژرا، لە شکری جەور و ستەم نەی‌توانی بێتە پێش. گۆرانی‌یە زیندووە هەستبزوێنەکان ببوونە لاوکی شینگێڕی و لاواندنەوە. لەشکری ستەم و زۆرداری، شەڕکەرە دڕندە سەلجووقی و ڕۆمی‌یەکان سینگی بلوورین، قژی زەرد و شەمامەی مەمکی شۆڕەژنانیان وەبەر سمی ئەسپان دان، بە سەر کۆمەڵ کۆمەڵ تەرمی ئەو شۆخانە دا تێپەڕین و دەوری ئەو قەڵا بچکۆلەیان دا کە بابە ئیسحاقی تێدا بوو. لە دەوری قەڵایە خوێن هەتا چۆکی ئەسپی سەربازەکان دەهات. زۆری پێ‌نەچوو دیواری قەڵاکەیان ڕووخاند و چوونە ژوورێ. بابە ئیسحاق عەبایەکی سەوزی دەبەر دا بوو، ئەسپێکی بۆرەشی دە بن دا بوو و لە نێو ئاڵقەیەك نوور، لە وێ ڕاوەستابوو. سوارە پۆشتە و پەرداخەکانی دوژمن شمشێریان

ڕاوەشاندن، نیزەیان ڕاست کردنەوە و لە حاڵێك دا تیرهاوێژەکانیان وەك بارانێ تیریان بە سەر شێخی دا دەباراند، هێرشیان کردێ. بابە ئیسحاق بە دەنگە بەهێزەکەی هاواری کرد: ئێستا ئیدی بەرگریکردن سوودی نیە، ئێمە تێكشکاوین. پاشان گوڕاندی: "حوکمت وەدی بێ بابە سوڵتان!". دەنگی ئەوەندە بە سام بوو، کە خەڵکەکە هەمووی لەرزین. پاشان خۆی هاویشتە سەر ڕکێفێ و ئاوزەنگیی لە ئەسپی توند کرد. ئەسپەکە فڕی، لە ئاسمانێ بوو بە پەڵە هەورێك، چەند جار بە سەر حەشیمەتەکەی دا خولاوە و بەردەوام دووپاتی دەکردەوە:" حوکمت وەدی بێ بابە سوڵتان!" و پاشان لە پێش چاو ون بوو.

لە وێڕۆژێوە هەورێکی سپی بە سەر ئاناتۆلی دا دێ و دەچێ و سەرەنجام ڕۆژێك...

بابە جەفەر سێ ڕۆژانی ڕاگرتن و نەیهێشت لە گوندەکەی وەدەرکەون:

ـ ئەم گوندە پێگەی گەورەپیاوانی وەك بابە سوڵتان، بابە ئیسحاق و بابە ئەلیاسی‌یە. کاتێك پیاوێکی گەورەی وەك حەمەدۆکیش دێتە ئێرە و میوانی ئێمە دەبێ، نابێ لە سێ ڕۆژان کەمتر لێرە بێ. ئەگەر زووتریڕوا، چلسوارەی غەیبی، حەوت ساڵحان و هەموو شێخ و پیاوچاکی دیکە دەڕەنجن. دەزانن کاتێك ئەسپەکەم لە بەر دەرگای خۆمان دی، چم گوت؟ دەسبەجێ بە منداڵەکانم گوت: خۆتان ئامادە کەن، پیر و شێخەکانی ئێمە هەر ئەو ڕۆژانە حەمەدۆکی دەنێرنە لامان! بەڵێ ئاوام گوت. ئەوەش وەڕاست گەڕا، ئەوە نیە پیاوچاکانی ئێمە، ئێوەیان هێناوەتە لای ئێمە! جا ئێستا هەتا ئەوان ئیزنتان نەدەن، نابێ لێرە بڕۆن!

لەو سێ ڕۆژانە دا حەمەد چەند جاران سەری ئەسپەکەی دا و زۆری بە دەورە دا هات و چوو. پێیخۆش بوو بزانێ ئەسپەکە چ دەکا. داخوا دەیناسێتەوە، یان بە دیتنی وی ئاڵوگۆڕێکی بە سەر دا دێ؟ بەڵام ئەسپەکە تەنانەت یەك جاریش سەری بەرز نەکردەوە و چاوی لێنەکرد. حەمەد لێیورد بۆوە، چاوەکانی گەورە و خەماوی بوون.

پێش ئەوەی لە گوندەکەی وەدەرکەون، حەمەد چوو و سەری ئەسپەکەی دایەوە. ئەمجار ئەسپەکوێت سەری بەرز کردەوە و چاوی لێکرد. حەمەد زەوق و خۆشحاڵیی دە چاوی ئەسپەکەی دا بە دی کرد. مەلا فەرهاد و هاوڕێکانی دیکەشیان هەر هاتبوون.

خەڵکی گوندی بە گەورە و چکۆڵەوە بۆ بەڕێکردنیان هاتبوون. بابە جەفەر باوەشی بە حەمەدی داکرد و گوتی:

ـ حەمەدۆك، شێری من، بەخێرچی! خوات لە گەڵ بێ! چلسوارەی غەیبی، حەوت ساڵحان، هەموو شێخ و مەشایەخی دیکە و حەزرەتی عەلیش بە شیری دووسەرەوە پشتیوانت بن! خەمی ئەسپەکەت نەبێ، با ئیدی بە شاخانەوە نەبێ و هەر لێرە، لە لای ئێمە بێ. وەك گلێنەی چاوی

خۆمان ناگامان لێی دەبێ. ئەو ئەسپە دیاریی پیاوچاکانە، پیرۆزە و بە قەدەر دولدولی حەزرەتی عەلی لە لای ئێمە بایەخی هەیە!

ئیدی مالآواییان کرد و دوور کەوتنەوە. حەمەدۆك لە پێشێ دەڕۆیی. مەلا فەرهاد خۆی گەیاندێ و گوتی:

ـ خەلکی ئەو گوندەی وەك ئی جێی دیکە نین. زۆر خاوێن و ڕێکوپێکن... هیچ وەك جووتێری گوندەکانی دیکەی ئەم دەوروبەرە ناچن. زەویشیان زۆر نیە ها...

ـ بەلآم زۆر ئازا و زیرەکن و لە کۆنەوە دارتاشییان هەر کردوە. باوەڕ کە هێندە دەستڕەنگینن، دەتوانن پەیکەرەی ئینسانی بە شێوەیەك لە داری دروست کەن، کە پەیکەرەکە دەنگیشی هەبێ.

قاسم هاتە نێو باسەکەیانەوە:

ـ ئەمن بۆخۆم دیتوومە کەلەکێوییان دروست کردوون، ئەسپیان دە حالّی ڕمبازییە دادروست کردوون، کەرگەدەنی یەکشاخییان تاشیون، هەلّۆیان لە حالّی فڕینێ دا دروست کردوون و...

ـ قسەی قاسمییە. ئەو خەلکە لە کۆنەوە دارتاش بوون، لانکی یەکجار جوانیان دروست دەکردن و گەلّوازەی زێڕ و زێویان وێ دەخستن. مندالّی پاشا و بەگان دەو لانکانە دا دەخەوتن و دەتوانم بلّێم لانکی وایان دروست دەکردن، دەقیمەت نەدەهاتن. هەموو ئەو کەرەسە دارینە بەنرخانەی مالّی دەولّەمەندان دەڕازێننەوە، بەرهەمی دەستی ڕەنگینی ئەو دارتاشانەن، هەروەها مینبەری مزگەوتەکانیش. ئەو جار ئەوانە هەنگوینیش ڕەنێو دێنن. وا دیارە ئەسپەکەی تۆ زۆر ئاقلّە کە ئەو گوندەی بۆ مانەوەی خۆی هەلّبژاردوە.

حەمەد کەیفی زۆر ساز بوو. لە خۆشیان دلّەکوتەی هاتبۆیە... بەلآم خەمێك ئەو خۆشییەی لێتێکدەدا... هەمیشە سەیرانی شۆخوشەنگی بەو گەردنە درێژەیەوە کە دەتگوت ملی سۆنەیە، دەهاتە پێش چاو. ئاخ بریا هەوالّێکی سەیرانێی زانیبا! زۆری بۆ بە پەرۆش بوو، بەلآم لە ڕووی هەلّنەدەهات تەنانەت لە لای مەلا فەرهادیش باسی بکا. پێشی سەیر بوو کە بۆچی مەلا فەرهاد باسی سەیرانێی نەدەکرد. حەمەد چاوەڕوان بوو مەلا فەرهاد سەبارەت بە سەیرانێ پرسیاری لێبکا و هەر کاتێك ئەو ئاوڕی دەدایەوە، پێی وا بوو ڕاست ئەو شتەی لێدەپرسێ. بەلآم وا نەبوو. ئاخێکی هەلّکێشا: بریا موسلیمیشم لە گەلّ خۆم هێنابایە، لانی کەم لە گەلّ وی دەکرا هەموو ڕۆژێ، هەر کاتێك پێم خۆش بوایە، باسی سەیرانێ بکەم... بەلآم دیسان هەر باشە کە شەو و ڕۆژ ڕوخساری ویم

دێتە پێش چاوی و  قەت لە بیری وی هەڵنابڕێم. بە ڕاستیش جاروبار دیتنەکەی هەر لە خەیاڵ دا نەبوو، بەڵکوو سەیران زەق و زیندوو لە پێشی ڕاوەستابوو و بە چاوە جوانە خومارەکانی کە جاروبار خەماوی و هێندێك جاریش گەش و پڕ لە شادی بوون، تێیهەڵدەڕوانی. حەمەد لە دڵی خۆی دا دەیگوت، سەد بریا لە گەڵ خۆم هێنابام و ئەویشم لە گەڵ ئەسپەکەی لەو گوندەی دانابا. پاشان شەرم دایدەگرت و دەیگوت: بەڵام ئاخر ناکرێ! لە قووڵایی دڵییەوە وەڕەزیی سەیرانێی دەکرد و کاتێك بیری لەوە دەکردەوە کە چەندەی لێ دوور کەوتۆتەوە، ئێشێکی سەیری لە هەموو لەشی دا هەست پێدەکرد. ئیدی گوێی لە قسەکانی مەلا فەرهادیش نەدەبوو، کە بە زەوقەوە باسی بابە ئیسحاق و تایفەی دارتاشانی بۆ دەکرد...

ئەوێ شەوێ لە هۆبەی یورووکیيان مانەوە. خەڵکی عێلەکەی کە پێشتر ئاگادار ببوون حەمەدۆك و هاوڕێیانی لە گوندی کانییە بای بوون، ئێستا بۆ لای خانەقای چلچاوی دەچن و دەشیانزانی ڕێگاکەیان بە لای وان دایە، پێشوازییەکی باشیان لێکردن و داوەتێکی گەورەیان بۆ ساز کردن. خەڵکەکە لە چادرێکی گەورە دا کە بە تایبەتی بۆ مێوانداری تەرخان کرابوو، کۆبوونەوە. قسە زۆر کران و زۆر باس هاتنە گۆڕێ، باسی ئەسپەکەش کرا، ئەوە کە خەڵاتی بۆ سەری دیاری کرابوو و ئەسپێکی لەڕی بەستەزمان لە جیاتیی وی گوللەباران کرابوو، بەڵام هەر ئەو ئەسپە تاریکوڕوونی بەیانی زیندوو بۆوە، بوو بە ئەسپێکی بۆری یالدرێژ و سپیی وەك ئەسپی کوێرۆغڵی و پاشان حیلاندی، وە ئاسمانێ کەوت و بە سەر شاری دا فڕی... ئەوە کاری حەوت ساڵحان و شێخ و پیاوچاکانی چلچاوی بوو کە بە کوێریی چاوی بەگەکانی شاری، ئەو کەلاکەیان زیندوو کردەوە! حەمەد لەو بارەیەوە هیچ قسەی نەکرد، تەنیا گوێی دابوونێ. بیری لە وەش دەکردەوە کە دایە سوڵتان بۆ دەبێ بانگی کردبن. زۆر جاران لە گەڵ دایە حۆری باسی خانەقاکە و دایە سوڵتانی کردبوو. باسی ئەو گوڵە شینانەیان کردبوو کە لە نێوەڕاستی گابەردان دا شین دەبوون  و ئەو ڕووناکاییەش کە ئاورینگی شینی لێدەبۆوە و وەك پەڵە هەورێکی بە سەر خانەقاکەیەوە بوو، هەروەها هەورەکەی دیکەش کە بە سەر لووتکەی شاخی دا دەخولاوە و شەبەقی شینی دەدا.

ئەو شەوە مانگ لە ڕەنگێکی گەشی شینباو دا دەرکەوت، دنیای لە شەبەقی خۆی پڕ کرد و ئەستێرەی گەش گەشیش کە ئاورینگی شینیان لێدەبوونەوە، هەموو ئاسمانیان داگرت. شەو نوقمی ڕەنگی شین بوو. بیری ئاڵۆز و تێکەڵپێکەڵ دە سەری حەمەدی دا دەهاتن و دەچوون: مامۆستا زەکی نەژاد، شارەکە کە هێندە لێرە دوور بوو و ژیانی سەیری خەڵکەکەی. وێنەی عەلی، وشترەکەی و تەرمی خۆی لە سەر وشترەکەی، مریدە خۆبەختکەرەکانی بابە ئیسحاقی

که قارەمانانە لە دەشتێ شەڕیان کرد و گیانی خۆیان فیدا کرد، ژنەکان کە پێشیان بە دوژمن گرت و تا ئاخر کەسیان شەڕیان کرد ــ دیارە سەیرانیش ئەگەر لە گەڵ وان بوایە، بێگومان وەکوو وان ئازایانە شەڕی دەکرد ــ ئەدی عەلی‌یە شەلی شای شوێنگێڕان... ئەو لە وێ بوایە، دەبوو بە یەکێك لە ڕێبەرانی ڕاپەڕینەکە... مەلا فەرهاد، بەتتالآغا سەرخێڵی یۆرووکەکان و زەکی نەژاد...

دەشتی کۆنیای لە حەشیمەتێ جەی دەهات... شێخ و پیرەکان، بابو باپیران، خزمو کەسەکان و مریدەکانی دایە سوڵتانی بە عەبای سپی‌یەوە، کۆمەڵ کۆمەڵ وەك شەپۆلی دەریایە، لە شاخ و دەشتێوە، لە دەریای ڕەشەوە، لە دەوروبەری گۆلی وانێوە، و لە دەریای نێوەڕاستەوە، شەپۆل شەپۆل دەهاتن و خۆیان بە لەشکری خوانەناسان دادەدا.

هێندە زۆر بوون دە ئەژمار نەدەهاتن. دەتگوت لە عەرزی هەڵدەقوڵێن و لە ئاسمانێ دەبارن. دەهاتن و بەگژ ئەو لەشکرە پۆشتە و پەرداخەی دا دەچوون کە سەرتاپێ چەکدار و زرێپۆش بوو و لێی نەدەپرینگانەوە. هەوەڵ شەپۆلی شەرکەرە سپیپۆشەکان، کە پیاویان عەبای سپی‌یان دە بەر دا بوو و ژنیان دەسماڵی سپی‌یان بە سەرەوە بوو، لە حاڵێك دا هاواریان دەکرد:"حوکمت وەدی بێ، بابە سوڵتان!" کەوتنە عەرزی و لە نێو لافاوی خوێنی کەفکردوو دا ون بوون. پاشان شەپۆلی دیکە بە دوای یەك دا هاتن... هەموویان کوژران... بەڵام خەڵکەکە لە کەمێی نەدەدا. وەك مێرووی نێو شارە مێروان و وەك باڵندەی ئاسمانێ، شەپۆل شەپۆل هەر دەهاتن و دەهاتن و هەمووشیان دەکوژران... سەرکردەی پیاوە شەرکەرەکان زەکی نەژاد بوو. ئەویش عەبایەکی وەك بەفری سپیی دە بەر دا بوو. هەروەها مەلا فەرهاد و عەلی‌یە شەلیش کە وەك ڕێوی‌یە وشیار و زیرەك بوو و حەمەدۆکی هێمن، بە ڕاپەڕ و لە سەرەخۆ و زۆر کەسی دیکەی ئاواش لە گەڵ بوون. هەموویان بەرگی سپی‌یان دەبەر دا بوو، بەرگێکی ئەوەندە سپی، کە لە بەر شۆقی ڕۆژێ دەترووسکایەوە. بابە ئیسحاق ئەسپە بۆرەی خۆی دە بن دا بوو، کوێرۆغڵی و خانی کۆسە، هەردووك ژیر، چالاك و بەزاکوون، لە وێ بوون و خەڵکی هەژار و چەوساوەی حەفتاوحەوت وڵاتی سەردنیایەشیان بە دووەوە بوون... ژنەکانیش هەموو وەڵاخی بۆرەیان دە بن دابوون. دایە سوڵتان، دایە حۆری و سەیرانیش هەر کامە نێزەکیان بە دەستەوە بوو، لە پێش هەمووان بوون و ژنی حەفتاوحەوت وڵاتی سەرعەرزێیان لە گەڵ بوون. لکی دەسماڵی سپیی ژنەکان وەك ئاڵای لە بەر بای دەلەرایەوە... ژنان دەوری پیاوە زرێپۆشە سەرتاپێ چەکدارەکانی شا و سەربازە بەکرێگیراوەکانی دیکەیان دا و لە هەموو لایەکی‌یەوە تینیان بۆ هێنان. لەشکری دوژمن نەی‌دەتوانی لە بەرامبەر ئەو هەموو خەڵکەی دا خۆی ڕابگرێ، هێندەی پێ‌تەچوو لە شکری شای شکا و وەك بارێزەی لە بەر پێی ئەسپان دا کەوتن. ژنان چەکەکانیان لێ‌کردنەوە و هەڵیان‌هێنان. شەقە شەقی نێزە، شمشیر، مەتاڵ و پارچە کەرەسەی ئاسنی دیکە

ولاتیان پڕ کردبوو! مەلا فەرهاد لە سەر منارەی هەرە بەرزی مزگەوتی گەورەی کۆنیایە سەبارەت بە دامەزراندنی یەکسانی، عەدالەت و بەرامبەری قسەی دەکرد و بەلگەی لە ئایەتی قورعانێ دەهێنانەوە. دەنگی ئەوەندە دلگر و خۆش بوو کە دلّی مرۆڤی وە جۆش دێنا... پاشان مامۆستا زەکی نەژاد جێگای وی گرتەوە. مامۆستا زەکی میدالێکی زێڕی بەند سووری بە سینگی‌یەوە بوو. دەستی چەپەی بە سەر دلّی گرتبوو کە تنۆك تنۆك خوێنی لێ‌هەلّدەقولّی و عەبا سپی‌یەکەی سوور دەکرد. زەکی بە دەنگێکی زولالّی بەرز هاواری کرد: ئێمە زۆرین! ئەگەر ئێمە یەك بگرین، شاخان لە بن دێنین و گەورەترین و پۆشتەترین لەشکر تێکدەشکێنین، دەی‌کەینە تۆز! وەك ئەوەی ئەم بەیانی‌یە دیتان! دوای ئەو قسەیە مامۆستا زەکی لە سەر منارەکەی ڕا بەرەو زەوی فڕی. لەو کاتە دا ئەو بەو عەبا سپی‌یە خوێناوی‌یەوە وەك بالّندەیەکی بریندار دەچوو، کە توانای فڕینی لێ‌بڕابێ. پێش ئەوەی بگاتە عەرزی، خەلّکەکە ڕایان کردە پێشێ و گرتیانەوە. نەمابوو، بەلاّم لەشی بۆنی گولّباغی لێ‌دەهات... هەتا چاو هەتەرێ دەکا، دەریا بوو، دەریایەکی یەکجار پان و بەرین، ئاوێکی مەند و ڕوون... ماسیگرەیەکی تەنیا لە ئاسمانێ دەخولاوە. ماسیگرەکەش سپی بوو و لە بەر شۆقی ڕۆژێ دەترووسکایەوە... لە نەکاو مامۆستا زەکی لە پێش ماسیگرەکەی وەدەرکەوت. هەموو گیانی دە خوێنێ دا شەلاّل بوو. دەستی هەر بە سەر برینەکەیەوە بوو. ڕووی دە حەمەدی کرد و گوتی: کارێکی چاکت کرد برام! چاکت کرد تۆلّەت ئەستاندەوە! بەلاّم ئەو هەموو خوێنەی دیکە کە دەڕژێ، ڕەنگە تۆلّەیان نەکرێتەوە و خوێنی تۆش هەر لەوانەیە قەت نەستێندرێتەوە. ڕۆژێك دادێ کۆمەلاّنی خەلّك هەموو یەك دەگرن، ڕاست وەك ئەو ڕۆژەی کە مالّی شاکیر بەگیان تێکڕووخاند. ئەو کات دەبزوون، ڕاپەڕینێکی گەورەی وا دروست دەکەن کە هیچ هێزێك پێشی پێ‌ناگیرێ... لێرە دا مامۆستا زەکی بێ‌دەنگ بوو، نوشتایەوە و لە قەراغ ئاوێ کەوت. ئەسپێکی بۆرە لە دریایە سەری وەدەرنا، هاتە دەرێ، بە ددانی ڕۆبووە تەرمی مامۆستا زەکی، لە سەر پشتی خۆی دانا و گەڕایەوە نێوەڕاستی دەریایە...

ئەوێ شەوێ حەمەد هەر خەونی دیتن، هەمووی لەو چەشنە خەونانە. کە چی کاتێك وەخەبەر هات، ماندوو نەبوو، حەسابۆوە و لەشی وەك لەشی چۆلەکەیەکی سووك بوو، بەلاّم کاتێك وەڕێ‌کەوتنەوە، لە بیری نەمابوو دوێنێ شەوێ چی‌یان خواردوە و باسی چی‌یان کردوە. هێندە خێرا دەڕۆیی کە تەنانەت مەلا فەرهادیش نەی‌دەگەیشتێ. ئاخرەکەی مەلا فەرهاد ڕای کرد و قۆلّی گرت:

ـ ئەری حەمەد، ڕۆلّە، ئەوە چ دەکەی؟ هەر بیر دەکەیەوە و دەڕۆی! ئاگات لە ئێمە نیە و دەلێی ئێمەت لە گەلّ نین! ئەوە بیر لە چی دەکەیەوە؟ ئاخر ئێمە ئەوە دەپسێین، خۆ بە غاردانیش ناتگەینێ!

حەمەد ماوەیەکی باش تێیەوە ڕاما. ڕوانینەکەی بێ‌هێز و تەماوی بوو. دەتگوت دە هۆشەوە چووە، بەلاّم سەرەنجام وەخۆ هاتەوە، بزەیەکی هاتێ و گوتی:

ــ مەلا فەرهاد، دەزانی چی؟ ئەو مریدە لەخۆبووردووانەی بابە ئیسحاقی...
ــ ئەها... بیرت لە وان دەکردەوە؟
ــ بەڵێ، ئەوان لە دەشتی کۆنیایە، هەر لە بن دیوارەکانی شاری، تێکشکان. بەڵام ئەگەر زۆری دیکەیان هاتبانە یارمەتی‌یە، لەشکری هەژاران ئەوەندە زۆر بووبا، کە پیاوەکانی شایان دە نێو خۆیان دا ون کردبا و وایان کوشیبان کە نەیانزانیبا چۆن لە نێو ئەو حەشیمەتەی بێنە دەرێ و گیانی خۆیان ڕزگار کەن، ئەو کاتی چۆن دەبوو؟
ــ دیارە، ئەو کاتی سوپای بابە ئیسحاقی سەردەکەوت...

حەمەد هەستی بە چەشنە شانازی‌یەك دە دەروونی خۆی دا کرد. دەتگوت ئەوە هەر ئێستا مریدە نازاکانی بابە ئیسحاقی دەبینێ کە بە سەر لەشکری سەلجووقی‌یان دا زاڵ بوون و ڕاویان دەنێن. باوەشی کردەوە، مەلا فەرهادی توند دە ئامێز گرت و لە بن لێوی‌یەو گوتی:
ــ مامۆستا زەکی نەژاد... خەڵات کرابوو، میداڵێکی زێڕی سووری هەبوو. بەندی میداڵەکەشی سوورێکی ڕێ ڕێ بوو...

بۆ پاشنیوەڕۆیە گەیشتنە خانەقای چلچاوی. سێ پیاوی جحێڵ کە هەر سێکیان سەربەرگی سوور، کڵاوی سەوز و کەوشی سووریان دە بەر دابوون، بە پێشوازی‌یانەوە هاتن و لە بەر دەرگای دەرێ بەخێرهاتنیان کردن. حەمەد و هاوڕێیانی تفەنگ، دەمانچە، خەنجەر و بەکورتی هەموو چەك و ڕەختەکانیان لە لای وان دانان و چوونە ژوورێ. لە بێلایە هەموویان چۆکیان دادان، دوعایان خوێندن و بەو شێوەیە ڕێزیان لە خانەقاکەی گرت. دایە سوڵتان لە بەریان هەستا، ڕوخساری هەر وەك پێشوو سپیلکە و ئارام بوو. مەلا فەرهاد بیری کردەوە:"تا ئێستا هیچ شێخێکی خانەقای چلچاوی لە بەر چەتە و یاغی‌یان، تەنانەت ئەگەر بەگ و پاشاش بووبن، هەڵنەستاوە و ئاوا بە پیریانەوە نەهاتوە!". ئەوە زۆر گرینگ بوو کە دایە سوڵتان ئەو نەریتەی شکاندبوو. حەمەد و هاوڕێیانی یەك بە یەك چۆکیان لە بەرامبەر دایە سوڵتانی دادا و ڕێزیان گرت. پاشان دایە سوڵتان بە ئیشارەی دەستی جێگای نیشان دان و هەموویان دانیشتن. لەو کاتە دا یەکێك لەو پیاوانە کە سەربەرگی سووریان دە بەر دا بوو، هات و سندووقێکی سەوزی بچووکی لە پێش دایە سوڵتانی دانا. دایە سوڵتان سندووقەکەی هەڵێنا، سێ جاران ماچی کرد، لە سەر سەری دانا و پاشان کردی‌یەوە.

سندووقەکە کراسێکی تێدابوو کە بە شێوەیەکی زۆر ورد و جوان قەد کرابوو، بە خەتێکی زەعفەرانیی زەردی جوانی عەرەبیی ورد، وەك ڕێچکە مێرووی، نەخشابوو. ئەو جار مەلا فەرهاد و حەمەد تێگەیشتن کە دایە سوڵتان بۆچی بانگ کردوون.

کراسەکە نەوەد و نۆ هەزار و نۆسەد و نەوەد و نۆ ئایەت و دوعای جۆراوجۆری لە سەر نووسرابوو. هەر وەها هەموو ناو و سیفاتی خودای لە سەر دەخوێندرایەوە. هەر کەس ئەو کراسەی دە بەر دا بوایە، لە هەموو نەخۆشی‌یەکی پارێزراو دەبوو، لە گوناهان پاك دەبۆوە، تووشی هیچ ڕووداوێکی مەترسیدار نەدەبوو، گوللە کاری لێ‌نەدەکرد، شمشێر نەی‌دەبڕی، ئاو نەی‌دەخنکاند، ئاگر نەی‌دەسووتاند، کەلەبچە دە دەستی دا دەپسا، زیندان وە خۆی نەدەگرت و دیواری بە سەر یەك دا دەڕووخان...

دایە سولتان کراسەکەی بە هەردووك دەستان گرت، سەری هەلێنا و گوتی:

ــ شتومەکەکانت داکەنە، حەمەدۆك!

حەمەد دەسبەجی هەستا، چاکەت و کراسەکەی بەری داکەند، سندووقێکی گوێز لە وێ بوو، لە سەر سندووقەکەی دانان و لە حالێك دا نیوەی سەرەوەی لەشی ڕووت بوو، لە وێ ڕاوەستا.

ــ ئەتۆش مەلا فەرهاد، قورئانێ بخوێنە!

مەلا فەرهاد دەستەکانی هەلێنان و دەستی بە قورئانخوێندنێ کرد. زایەلەی دەنگی خۆشی مەلا فەرهادی لە نێو خانەقاکەی دا دەروونی ئینسانی دەلاواندەوە.

پیاوە سوورپۆشەکە چۆکی دادا و کراسەکەی لە پێش حەمەدی ڕاگرت. کراسەکەی سپی بوو و زۆریش تەنك بوو. حەمەد ڕاوەستابوو، چاوەڕوانی دەستووری دایە سولتانی بوو و مەلا فەرهادیش هەر وا قورئانی دەخوێند. پیاوەکە هەردووك شانی حەمەدی گرت و ئیشارەی پێ کرد کە لە بەرامبەر دایە سولتانی چۆك دابدا، حەمەدیش وای کرد. پاشان دایە سولتان کراسەکەی هەلگرت، لە حالێك دا بەردەوام دوعای دەخوێندن، سێ جاران بە دەوری سەری حەمەدی دا گێڕای و پاشان بە دەستی خۆی دە بەری کرد. ئەو جار دەستی حەمەدی گرت، هەلی ئەستاند، دەستی بۆ لای جلەکانی کە لە سەر سندووقە گوێزەکەی بوون ڕاداشت و پێی‌گوت جلەکانی دە بەر بکاتەوە. حەمەد خێرا کراس و چاکەتەکەی خۆشی دەبەر کردەوە و بە ئیشارەی دایە سولتانی لە سەر جێی خۆی دانیشتەوە:

ــ ئەو کراسە ئی سولتان سەلاحەددینی گەورە بووە و لە شەڕەکان دا لەشی ئەو پیاوە گەورەی لە برینی چەکی خاین و خوانەناسان پاراستوە. سولتان سەلاحەددین هەر بۆخۆشی ئەو کراسەی بەو خانەقایەی ئێمە بەخشیوە و تا ئێستاش هیچ‌کەس دە بەری نەکردۆتەوە. نێزیکەی مانگێك پێش ئێستا سولتان سەلاحەددین هاتە لای من، بەرگێکی سەوزی دە بەر دا بوو و گەلاپەلکێکی سووری گەورەشی بە دەستەوە بوو. هێندێك ڕەگ لە گەلاکەی دەبوونەوە کە دەگەیشتنە ئەمسەرەوسەری دنیایە. سەلاحەددین چاوێکی لێ‌کردم و گوتی: دایە سولتان، ئەو کراسەی لە خانەقای چلچاویم داناوە، ئی حەمەدۆکی‌یە و دەبێ بدرێ بە وی. داوات لێ‌دەکەم بە دەستی خۆت دە بەری کە! پاشان بوو بە ڕووناکی‌یەکی سەوز و لە پێش چاوم ون بوو. ئەمن دەمزانی ئەتۆ لە شاخی نەماوی، حەمەدۆك! بەلام

چاوەڕوان مامەوە، چونکە ئەوەشم دەزانی کە زۆری پێناچێ دەگەڕێیەوە، دێیە لای من و داوای ئەمانەتی‌یەکەی خۆتم لێدەکەی. ئێستا ئەوە تۆ بە کراسەکەی خۆت گەیشتی و هیوادارم کە خودای گەورە لەو خەباتە دا کە دەی‌کەی، پشت و پەنات بێ، دەست و چەکت بەهێز کا و بتپارێزێ!

پاشان لە جێی خۆی هەستا و ئەوانەی لە گەڵی لە نێو خانەقاکەش دا بوون، هەموو هەستان. دایە سوڵتان بۆ لای دەرگاکە چوو، بەڵام لە بێلایە دا ڕاوەستا، ئاوڕی دایەوە و ڕووی دە مەلا فەرهادی کرد:

ـ خودا یار و پشتیوانی تۆش بێ مەلافەرهاد! هێندێك قسەم هەن، تکایە بە وردی گوێم بۆ شل کە...

چاوی دە چاوی مەلا فەرهادی بڕی و پاشان دەستی لە سەر شانی دانا:

ـ باشم گوێ لێ بگرە... ئەمن هێندەم نەماوە و زۆری پێناچێ دەڕۆم. بەو زووانە بەرەو دنیایەکی دیکە سەفەر دەکەم. هەر بۆیەشە سوڵتان سەلاحەددین هاتۆتە لام و داوای لێکردووم کراسەکە بە خاوەنی خۆی بگەیەنم... خانەقای چلچاویش هەرەس دێنێ و تەواو دەبێ. بەڵێ، تەواو دەبێ... بەڵام مەلا فەرهاد، با ئەوەت پێبڵێم، ئەمن ئەو خانەقایەی بە تۆ دەسپێرم! ئاگات لێی بێ، با تا ئەو کاتەی وێران نەکراوە، لە ڕێوشوێنی خۆی لانەدا و ڕێزی بپارێزرێ...

مەلا فەرهاد لە بەرامبەر دایە سوڵتانی دا چۆکی دادان، سێ جار دەستی ماچ کرد و لە سەر سەری دانا. پاشان گوتی:

ـ دایە سوڵتان، بەڵێنت پێدەدەم ئەوەندەی دەتوانم لەو بارەوە درێخی نەکەم و وەك چاوی خۆم بیپارێزم. ئەو خانەقایەم لە گیانی خۆم خۆشتر دەوێ و زۆری بایەخ پێدەدەم!

دایە سوڵتان هەردووك شانی مەلافەرهادی گرت و هەڵی‌نەستاند، لە گەڵ خۆی برد بۆ مزگەوتێکی کە لە نێزیك چۆمێکی بچووك دروست کرابوو، گومبەزێکی بەردینی یەکجار جوانی لە سەر بوو و سەری گومبەزەکەی تیژ دە ئاسمانێ هەڵچووبوو. لە وێ بە یەکەوە نوێژیان کرد.

دوای ئەوەی لە نوێژێ بوونەوە، سێ پیاوە سوورپۆشەکە هاتن، بەرانێکی گەورەیان لە بن منارەکەی لە عەرزێونا و کوشتیانەوە. خوێن لە گەرووی بەرانەکەی بە لووزەو دەڕژا، بەڵام لینگەفرتەی تا ماوەیەك هەر بەردەوام بوو. دایە سوڵتان قامکەکانی دە خوێنی بەرانەکەی وەردان و بە نێوچاوانی مەلا فەرهاد، حەمەدۆك و هەموو هاوڕێیانیانی داهێنان و بەو شێوەیە دوعای بۆ کردن و داوای ساغی و خۆشیی بۆ کردن. پاشان بە پیاوە سوورپۆشەکانی گوت:

ـ گۆشتی ئەو مەڕەی بدەن بە هەژار و دەستتەنگەکانی ئەو گوندەی خوارەوەمان!

دوای ئەوە گابەردەکان قەڵشینەوە و گوڵێکی گەشی شینیان لێڕوا. ئەو گوڵانە هەموو ڕەوەزەکانی ئەو بەینەیان شین هەڵگێڕا.

## (١٧)

زۆلفۆ زۆر توورە بوو. ئەرێ بە ڕاستی کێ ئەوانەی ئاوا دەوڵەمەند کردوە؟ بەڵێ، بۆخۆشی دەوڵەمەند بوو، بەڵام بە ڕاستی لە سایەی کێوە ڕۆستەمی مامۆستای خوێندنگە، خەلیل بەگی گەورە و مەلا دۆران، قەباڵەی ئەو هەموو عەرزەیان وەگیر کەوتووە؟ هەر دەڵێی میراتی بابو باپیریانە بۆیان ماوەتەوە. بە ڕاستی کێ یارمەتی کردوون؟ هەر بۆخۆی نەبووە ئەوەی کردوە؟ بەڵێ هەر بۆخۆی بووە و ئەگەر ئەو یارمەتیی نەدابان، ئەو عەرزانە، کە سەربەسەر زێڕیان دێنا، هەموویان

دەبوونەوە ئی دەوڵەتێ، یان وەدەست ئەو سەربازە کۆنانە دەکەوتن کە نە شارەزای ناوچەکە بوون و نە دەشیانزانی ناوی ئەم شارە چییە! بەڵێ، ئەو پیاوانە کە ئەو عەرزە چاکانەیان وەگیر کەوتبوو، هەموویان قەرزداری وی بوون. ئەو عارف سایم بەگە، هەر ئەوی دەڵێم! چۆنی ئەو هەموو گوندە و ئەو هەموو عەرزە، کە لە سەر یەك جێی بیست و هەشت هەزار دۆنم بنەتۆون، وە دەست کەوتوە؟ ئێستا کە هەموو خەڵکی شاری گیانیان دە مەترسی دایە و شەو و ڕۆژ لە ترسی مردنێ خەویان لێناکەوێ، هەر ئەو عارف سایم بەگە پشتی تێکردوون و تەنانەت نایەڵێ ئەو خەڵکە پێوەندی بە پێتەختیشەوە بکەن و داوای یارمەتی بکەن. بۆخۆی لە وێ بۆی دانیشتوە، دە مەترسی دا نیە و خۆشیشی بۆ دەگوزەرێ، ئیدی پەکی بەو خەڵکەی ناکەوێ. ڕاست نەقڵی هەژدیهاکەیە کە دە کانییەکەی دا کەوتوە و نایەڵێ یەك تنۆکیش ئاو بۆ خەڵکی بچێ! نە خێر نابێ ئاوای دە سەرەوە بچێ! با هەر لە گەڵ خەڵکی ئەو شارەی و زولفۆی، کە ئەو هەموو چاکەیەی لە گەڵ کردوە و ماڵ و سامانەکەی لە سایەی وییەوە وەگیر کەوتوە، کێشەی بکا و ئازاریان بدا! ئاخر وەڵامی چاکەی هەر خراپەیە ئیدی! دیارە ئاخرەکەی سوود لەو

هەڵسوکەوتەی خۆشی وەرناگریّ و ئیّستا کە ئاور لەو خەڵکەی ناداتەوە و تەنانەت چارەنووسی زولفۆی براشی بۆ گرینگ نیە، کە پیّش هەمووان لەوانەیە دەو دەریاخویّنەی دا بخنکیّ، کە حەمەدۆك لە چیای توورووسی‌یەوە وەڕیّی‌خستوە، ڕۆژیّك پەشیمان دەبیّتەوە! بەڵیّ ڕۆژیّك دادیّ کە ئەو عارف سایم بەگە دیّ، خۆ بە سەر کەوشەکانی زولفۆی دادەدا، لە بەری دەپاڕیّتەوە یارمەتیی بکا و لە نابوودبوون ڕزگاری کا! بیّجگە لە وەش خۆ ئەو هەموو دەنگۆیەشی بە دووەوەیە... هەموو خەڵکی چوکووڕاوایە دەزانن کە جەنابی نویّنەر هەم لە گەڵ فەڕانسەیی‌یەکان و هەم لە گەڵ ئینگلیسی‌یەکان پیّوەندیی هەبووە، بە دژی مستەفا کەماڵ پاشای یارمەتیی کردوون و تەنانەت هەوڵی داوە ئەو بش‌کوژریّ. دیارە ڕاستی و دەنگۆ هەمیشە جیاوازی‌یەکیان هەر هەیە و عارف سایم بەگیش کە پیاویّکی بە ئەزموون و زیرەکە، ئەوەی لە هەموو کەس باشتر دەزانیّ. بیّ‌گومان ئەو باوەڕی بە مستەفا کەماڵ پاشای، کە هەمیشە پشتی گرتبوو، هەبوو، بەڵام کاتیّك مەسەلەی مردن و ژین بیّتە پیّش، براش باوەڕ بە یەکتر ناکەن... ئەگەر ئەو دەنگۆیانە بە گویّی مستەفا کەماڵ پاشای بگەنەوە، ئیدی عارف سایم بەگ ماڵویّران دەبیّ و تەنانەت زولفۆش بەو هەموو عەقڵ، هەڵسووڕی و زیرەکی‌یەیەوە ناتوانیّ یارمەتیی بکا. بەڵیّ، بەڵیّ، کاتیّك مەسەلەی مەرگ و ژین دە گۆڕیّ دا بیّ و بە تایبەت ئەوە پیّوەندیی بە کەسیّکیشەوە هەبیّ، کە دەسەڵاتداری وڵاتە و دەستی بە سەر هەموو کەس دا دەڕوا، ئەوە هەر چەشنە دڕدۆنگی و گومانیّك هەزار و دەهەزار جار گەورەتر و گرینگتر دەبیّ. هەر زولفۆشە کە دەتوانیّ پیّش ئەوەی درەنگ بیّ و کارەکە لە بەرەگە بچیّتە دەر، عارف سایم بەگی لەو کیّشە گەورەیەی ڕزگار کا!

زولفۆ چەند ڕۆژ بوو نەخەوتبوو و هەر بیری دەکردەوە. دەیەویست ڕیّگایەك بدۆزیّتەوە، کە بەو ڕیّگایەی دا بتوانیّ کاریّکی وا بکا عارف سایم بەگ بۆچوونی بگۆڕیّ، بۆخۆی بیّتە شارەکە و چارەسەریّك بۆ مەسەلەی حەمەدۆکی بدۆزیّتەوە. باشترین ڕیّگاش ئەوە بوو کە دۆخیّك بڕەخسیّ حەمەدۆکی یاغی بچیّتە سەر عارف سایم بەگی، کاریّکی بکا ئابڕووی وی لە هەموو چوکووڕاوایە بچیّ و لە ئاکام دا جەنابی نویّنەر داچڵەکیّ و ترسی وەی ڕیّبنیشیّ کە هەم کارەکەی و هەم گیانی خۆشی بدۆڕیّنیّ.

ڕۆژیّکیان هیّندیّك گەورە گەورەی شاری لە ماڵی خەلیل بەگی گەورە کۆ بوونەوە. ئەو کۆبوونەوەیە بە دزیی پاریّزگار، حاکم و دادەستیّنی کرا و بەڵیّنیش درا کە هەرگیز هەواڵی ئەو کۆبوونەوەیە بە وان نەگا. پیّنج کەس لەو کۆبوونەوەیەی بوون: زولفۆ، خەلیل بەگ، ڕۆستەم

بەگی مامۆستای خوێندنگە، مەلا دۆران و مورتەزاغا. سەعات سێی شەوێ لە سەر شتێك ساغ بوونەوە. هەر لە وێش هەموویان دەستیان بە قورئانێ دادا کە یەك وشەش لەو بڕیارە و هەواڵی ئەو کۆبوونەوەیە لە لای کەس نەدرکێنن و هەر کەس بیدرکێنێ، پیاو نەبێ ئەگەر بە دەستی خۆی ژنی خۆی نەکوژێ. زولفۆ، جەبارە درێژی ڕەعیەتی خۆی لە گەڵ خۆی هێنابوو. هەمان جەباری کۆنە هاوڕێی حەمەدۆکی! پلانەکە ئەوە بوو کە حەمەدۆکی بە جەباری بکوژن.

جەباریان بانگ کردە ژوورێ.

جەبار هاتە ژوورێ. دیار بوو خۆی بۆ ئەو چاوپێکەوتنە ئامادە نەکردوە. سیمای ئاڵۆز و جلوبەرگی نارێك بوو و ڕیشیشی نەتاشیبوو. کە هاتە ژوور هەموو لە بەری هەستان و لە مۆبلێکی نەرم دا دایاننیشاند. جەبار کاتێك لە سەر مۆبلەکەی دانیشت، هەردووك دەستی لە سەر چۆکانی دانان، چونکە نەیدەزانی چییان لێبکا و لە کوێیان دابنێ. وەك کەسێکی کە تازە لە تاریکاییەوە ڕا هاتبێتە ڕووناکاییەوە، چاوی هەڵنەدەهاتن، هەر بۆیە هەڵیدێنان و دەینووقاندنەوە. سەرەتا بەگەکان هیچیان نەگوت. دستووریان دا قاوەیان هێنا. جەبارە درێژ هەر نەیدەتوانی چاو هەڵێنێ، دەستەکانیشی ساتبەسات قورستر دەبوون و ماسوولکەکانی ئەوەندە وێکهاتبوون، خەریك بوو هەموو گیانی لە بەر یەك هەڵوەشێ. قاوەیەکیان لە پێش دانا. جەبار دەستی بۆ فینجانە قاوەکەی برد، بەڵام دەستی وا دەلەرزی، نەیتوانی هەڵیگرێ. ناچار مورتەزاغا یارمەتیی کرد، قاوەکەی بۆ لە سەر مێزێکی بچووکی تەنیشت مۆبلەکەی دانا.

سەرەنجام زولفۆ گوتی:

ـ ها، جەبار، ئێمە بەو نیوەشەوەی کۆ بووینەوە و ئەتۆمان بانگ کردوە، لەخۆڕا نیە! دەمانەوێ کارێکمان بۆ بکەی.

جەبار بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو لێبڕاوانە وەڵامی دایەوە:

ـ ئەگەر مەبەستتان ئەوەیە حەمەدۆکتان بۆ بکوژم، ئەمن هەرگیز ئەو کارەم لە دەست نایە. لە بناغە دا ئەو ئیدی بە کەس ناکوژرێ!

ـ مەبەست حەمەدۆك نیە.

بەڵام جەبار گوێی لە قسەی وی نەبوو و قسەکەی خۆی درێژە دا:

ـ دایە سوڵتان کراسە سیحراوییەکەی پێبەخشیوە! ئەسپەکەشی زیندوو بۆتەوە! چلسوارەی غەیبی و حەوت ساڵحان بانگیان کردۆتە لای خۆیان... ئیدی هیچ گوللەیەك کاری لێناکا، هیچ ئاوێك نایخنکێنێ و هیچ ئاگرێك نایسووتێنێ! باشە ئێوە باسی ئەو کراسە سیحراوییەتان نەبیستوە؟

زولفۆ وەڵامی دایەوە:

ـ ئەڵبەت بیستوومانە...

ـ ئەگەر وا بێ وا چاکە واز لە من بێنن، دەنا دەمانچێکم لێدەن و بمکوژن! تکا دەکەم، بمکوژن! منداڵەکانیشم بکوژن! ئەمن حەمەدۆکم پێناکوژرێ، حەمەدۆك هاوڕێی هەرە نێزیکی من بووە، ئەگەر بشمکوژن، ناتوانم! بۆشم بکرێ، هەر کاری وا ناکەم! ئەمن چۆن حەمەدۆکی دەکوژم؟ ئێستا ئەو بۆتە شێخ، بۆتە پیاوی خودای! چۆن ئەمن دەتوانم پیاوچاکێکی ئاوا بکوژم؟ پیاوچاکێك کە ئەسپەکەی دوای ئەوەی گوللەباران کرا، زیندوو بۆوە و فڕی!

مورتەزاغا باسکی جەباری گرت، ڕایتلەکاند و گوتی:

ـ بێدەنگ بە، ئێمە مەبەستمان حەمەدۆك نیە، بۆ وا هەڵدەچی؟

ـ گوتم ئەوە کاری من نیە. تەنیا بایرامۆغلی ڕەنگە شتێکی وای لە دەست بێ. دیارە ئەویش زەحمەتە بتوانێ کارێکی ئاوا بکا، بەڵام لەوانەشە بۆ ئەوەی دووبارە ناو دەرکاتەوە و خەڵك بڵێن توانیویەتی چەتە و یاغی‌یەکی وەك حەمەدۆکی بکوژێ، کە لە خۆی بەناوبانگتر بووە و تەنانەت وەك پیاوچاکیش ناسراوە، بیکا! ئەمن چەتان چاك دەناسم. قەت کرمی یاغیگەری‌یەیان دە سەری دا نامرێ و دەرفەتێکی لەباریان بۆ هەڵکەوێ، هەڵدەدەنەوە!

خەلیل بەگی گەورە وە جواب هات و لەسەرەخۆ گوتی:

ـ ڕاست دەکەی، ئەو کرمە قەت نامرێ.

مورتەزاغا هەوڵی دەدا جەباری بێدەنگ کا و جەباریش هەر دەپاڕایەوە و دەی‌گوت کاری من نیە. خەلیل بەگ هێندێك دەنگی بەرز کردەوە:

ـ بەڵێ، جەبار، قسەی تۆیە! هەر بۆیەش ئێمە دەمانەوێ داوا لە بایرامۆغلی بکەین ئەو ئەرکەمان بۆ بەرێوە بەرێ...

جەبار وەك ئەوەی لە خەو ڕاپەڕیبێ، گوتی:

ـ چۆن؟...

ـ سبەینێ، یان دووسبەی بایرامۆغلی دەنێرینە شاخی و ئەو حەمەدۆکمان بۆ دەکوژێ...

جەبار زۆری تاریفی ئازایەتی و تەردەستیی بایرامۆغلی کرد. سوێندی خوارد گوتی ئەو لە کوێرۆغڵیش ئازاترە. پاشن لەسەرەخۆ گوتی:

ـ دیارە حەمەد کراسە سیحراوی‌یەکەی دە بەر دایە، بەردەکەش، ئەو بەردە پیرۆزەی ئاورینگی لێدەبنەوە، ئەویشی پێیە و بێجگە لە وانە، ودمی خانەقای چلچاویشی پێیە...

بەڵام چووزانم، لەوانەیە بایرامۆغڵیش کراسێکی سیحراویی وا، بەردێکی ترووسکەداری وا و ودمێکی بەهێزتر لە ئی حەمەدیشی پێبێ!

مورتەزاغا بە دەنگێکی بەرز تێیڕاخوڕی:

ــ باشە، لە وانە گەڕێ، ئێستا ئێمە لە تۆمان دەوێ کە...

جەبار بە پەلە پەڕییە نێو قسەکەیەوە:

ــ بەهیچ شێوەیەك ناچمە دەستەی بایرامۆغڵیەوە! قەتیش وە دوای کوشتنی حەمەدی ناکەوم!

ــ ئێمە داوای ئەوەمان لێنەکردووی!

ــ بەڵێ؟ ئەدی ئاغا گیان چیتان لە من دەوێ؟

مورتەزا بە شێوەکی نەرم و دۆستانە گوتی:

ــ لەسەرەخۆ بە برا گیان! دڵنیا بە داواکەی ئێمەت هێندە پێخۆش دەبێ، کە هەر دەسبەجێ قبووڵی دەکەی! جارێ قاوەکەت بخۆوە و بحەسێوە...

پاشان ئاغاکان بێ ئەوەی خۆ دە جەباری بگەیەنن و تێکەڵی قسانی کەن، دەستیان بە قسەوباس لە گەڵ یەکتری کرد. کچێکی قاوەچیی جوان هاتە ژوورێ، شەش فینجان قاوەی دە کەشەفێکی زێو دا هێنا و پێش هەمووان قاوەیەکی لە پێش جەباری کۆنەچەتە دانا. ئێستا ئیدی دەستەکانی جەباری لە کاتی قاوەخواردنەوەی دا نەدەلەرزین و کاتێك بە شێوەیەکی ئاسایی لە سەر چۆکانی دانانەوە و بە پەنجەرەی بەرامبەری دا ئارام تەمەشای دەرێی کرد، هەموویان زانیان کە هێدی بۆتەوە.

زولفۆ بەگ لەسەرەخۆ دەستی بە قسان کرد:

ــ گوێت لێبێ جەبار، ئێستا پێت دەڵێم ئێمە چمان لێت دەوێ...

ــ فەرموو ئاغا، ئەمن دە خزمەتتان دام و ئامادەم تەنانەت گیانی خۆشم بۆ ئێوە بەگەکانی خۆم فیدا بکەم. وەڵلاهی پێم بڵێن لەو بانەی ڕا خۆ هەڵدێرە، بەڵێن بێ دەسبەجێ بیکەم.

ــ دەبێ چەند پیاوان پەیدا بکەی، پیاوی وا کە لە گەڵت یەکدڵ و یەکزمان بن و بە تەواوی باوەڕت پێیان بێ.

ــ ئەوە هاسانە ئاغا، وەك ئاوخواردنەوەی جێبەجێی دەکەم!

ــ چەکیش لەستۆی ئێمە! تفەنگی کارابینی ئەڵمانیی واتان دەدەینێ، تەقەیان پێتەکرابێ! هەرچەندی فیشەکی بشتانەوێ، هەیە! هەر یەکەو ئەسپێکی ڕەسەنی عورفایی یایلاییتان بۆ دەکڕدرێ...

ـ بەڵێ ئاغام!

ـ جەبار، بڕیارمان داوە عەرزیشت بدەینێ، پووڵیشت بدەینێ و چیی دیکەشت دەوێ، دریخیت لێ‌نەکەین...

ـ عەرزم دەوێ ئاغا، لە هەموو شتێك پێویستتر هەر عەرزە...

ـ زۆر باشە، کاتێك چەك و کەرەسەکانتان وەرگرت و پۆشتە و پەرداخ بوون، دەبێ هێرش بکەنە سەر ماڵی عارف سایم بەگی...

ـ بە سەرچاوان ئاغا!

ـ چاکم لێ تێگەیشتی جەبار؟ گوتم تەقە لە ماڵی عارف سایم بەگی دەکەن! بە چاکی بیستت؟ دەزانی ئەو کێیە؟

ـ جا چۆن ئاغا دەکرێ عارف سایم بەگی نەناسم؟ زۆر چاکی دەناسم!

ـ چۆنی دەناسی؟

ـ بێ‌بەلا بی ئاغا! عارف سایم بەگ ئەو کەسەیە کە یاسای لێخۆشبوونی دەرکرد. ئەو کەسەیە کە لە هەمووتان گەورەتر و گرینگترە... هەمووتان لێی دەترسن! هێندەی لێ دەترسن، ئەگەر دەی‌بینن، کونەمشکتان لێ دەبێتە قەیسەری! هەوە ئیدی؟

هەموو ئاغا و بەگەکان قاقایان کێشا و پێکەنین.

ـ ڕاست بۆخۆیەتی جەبار!

ـ بەڵێ، ئەو ئێستا لە ئەنکەرەی دەژی، لە لای مستەفا کەماڵ پاشای. هەموو کەس لێی دەترسن، حاکمیش لێی‌دەترسێ!

ـ بەڵام خۆ ئەتۆ لێی‌ناترسی؟

ـ چۆن لێی‌ناترسم؟ بەرێوەڵڵا منیش لێی دەترسم!

ـ ئەدی چۆن هێرش دەکەیە سەر موڵك و ماڵی وی؟

ـ ئێوەم لە پشت بن، دەی‌کەم... ئاغام، بە پشتیوانی ئێوە دەتوانم هێرش بکەمە سەر موڵك و ماڵی وی و تەنانەت دەشتوانم لە نێوەڕاستی جادەی ماشێنی پێ‌ڕاگرم، بی‌هێنمە خوارێ و وەك پرپۆڵەی بلاوی کەم!

ـ باشە دە خۆت ڕادەبینی ئەو کارەی بە بێ‌دەنگی، بێ ئەوەی ئابڕووچوونی لێ‌بکەوێتەوە و شەڕ و هەرای بە دوا دا بێ، جێبەجێ بکەی؟

ـ بەڵێ بەگم، دەی‌کەم و زۆریشم پێ هاسانە...

ـ ناشترسی؟

ـ مردن برا گەورەیە، پیاو ڕۆژێك هەر دەمرێ، ئاغا.

عارف سایم بەگ کوێخایەکی هەیە: سەرجووخە حاجی عەلی.

ـ دەیناسم، ئاغا. ئەو حاجی عەلی‌یەی دەڵێی کە لە نێوەڕاستی شاری شەش کەسی کوشتن و چونکە پیاوی عارف سایم بەگی بوو، یەك شەویش بەندیخانەی نەدی.

ـ عارف سایم بەگ کردوویەتە جێگری خۆی و زۆری خۆش دەوێ.

ـ دەزانم، ئاغا.

ـ زۆر باشە، دەبێ ئەوی بکوژی.

جەبار گەش بۆوە:

ـ بەسەرچاو ئاغا، دەیکوژم.

ـ ئەوەی بزانە حاجی عەلی زۆر شەڕکەر و ئازایە و ئەنگێوەی چاکیشە. کوشتنی هەروا هاسانیش نیە.

ـ خەمت نەبێ، ئاغا، ئەوە لە ئەستۆی من.

ـ زۆر باشە. ئێستا با باسی شتێکی گرینگتر بکەین.

ـ فەرموو، بەگم.

ـ زۆر باشم گوێ لێبگرە!

ـ بە تەواوی لەش و ڕووحەوە گوێم لێتە بەگم.

ـ بابی عارف سایم بەگی ماوە و زۆر...

ـ بەڵێ، بەڵێ، دەیناسم. بە سەرچاو، ئەویش دەکوژم.

ـ نا، نابێ ئەوی بکوژی.

ـ زۆر باشە، نایکوژم، ئاغا.

ـ ئەو سەعاتێکی زێڕی دە باغەڵێ دایە، سەعاتێکی یەکجار جوان و بە نرخ...

ـ دیتوومە ئاغا، زۆرم دیتوە.

ـ لە کوێت دیتوە؟

کاتێك دەستم لە چەتەیی‌یە هەڵگرت، بوومە کرێکاری وی و لە مەزرای وی کارم دەکرد. نۆکەر و کرێکاری دیکەشی زۆر بوون. هەموو بەیانی‌یان ڕادەوەستا و دەبوو ئێمە پێش ئەوەی بچینە سەر کار، بە پێش وی دا بڕۆین و دەستی ماچ کەین. ئەو کاتی دەمدی سەعاتەکەی بە

دەستەکەی دیکەیەوە بوو و چاوی لێدەکرد. دەڵێن ئەو سەعاتە و بەندی سەعاتەکەشی ــ کە زێڕە و کیلۆیەکیش زیاترە ــ لە لای مستەفا کەماڵ پاشایەوە بە دیاری بۆ هاتوە.

ــ تەواوە، ڕاست وایە، جا جەبار دەبێ ئەو سەعاتەی لەو کابرایەش بدزی.

ــ بەڵێ، ئەو سەعاتەش لە وی دەدزم و بۆ تۆی دێنم.

ــ نا، نا، جەبار، بۆت هەیە سەعاتەکەش بۆخۆت هەڵگری.

ــ لە وەی باشتر نابێ، ئاغام! باشە هەڵیدەگرم و وای دەشارمەوە شەیتانیش ئیدی نەیدۆزێتەوە.

ــ باشە، وا دیارە لە ئەرکی خۆت بە تەواوی حاڵی! ئێستا بچۆوە ماڵی خۆت و سەر کاری خۆت. سبەینێ، یان دووسبەی من بۆخۆم دێم بۆ لات و چاومان بە یەکتر دەکەوێ.

ــ دەستووری جەنابت لە سەر چاومە ئاغا.

مورتەزاغا بەستەیەك پووڵی ئەسکیناسی لە باغەڵی دەرێنا و دای بە جەباری. ئەویش پووڵەکەی دە گیرفانی نا و ڕۆیی.

دوای جەباریش بەگە گەورەکان نەنوستن و هەتا بەیانی هەر باسەکەیان درێژە دا.

ئەو فکرەی زولفۆی زۆر ژیرانە بوو. بلێی ئەگەر ئەو پیلانەش جێبەجێ بێ، عارف سایم بەگ هەر وا گوێی خۆی باخنێ، حەمەدۆکی بە هێند نەگرێ و هێزێکی گەورە بە سەر توورووسی دا بۆ ڕیشەکێش کردنی ئەو یاغییانە بڵاو نەکاتەوە. بێجگە لە وەش ئەو کارە خۆ هیچ مەترسیی تێدا نەبوو، تەنانەت ئەگەر جەباریش کوژرابا، بە قازانج بوو و چ زیانێکی تێدا نەبوو. جەبار ئێستاش هەر دۆستی هەرە نێزیکی حەمەدی بوو و هەموو خەڵکی ئەم ناوچەیە ئەوەیان دەزانی. ڕێگا لە وەی باشتر نەبوو کە ئەو کارەی بە جەباری بسپێرن و بشیکەنە دەنگۆ کە حەمەدۆك ئەو زەبرەی لە نوێنەری گەورە، عارف سایم بەگ، داوە. دیارە عارف سایم بەگ پەکی بە کوژرانی کوێخاکەی نەدەکەوت و ئەو زەبرەی زۆر پێوە دیار نەدەبوو، بەڵام قەت ئەوەی لە بیر نەدەچوو کە چەتەیەك ئەو سەعاتەی لە بابی بدزێ، کە مستەفا کەماڵ پاشا بە دیاری بۆی ناردبوو.

چەند ڕۆژ دواتر لە پڕ بەسەرهاتی عەنبەر بەگی هاتە پێش و ئاغاکانی خۆشحاڵ کرد. ئەو ڕووداوە بۆ وان یەکجار خۆش بوو و ڕاست ئەوە بوو کە ئەوان لەمێژ بوو خەونیان پێوە دەدی و ئاواتیان بۆ دەخواست.

عەنبەر بەگ لە نێو شاری دا مرۆڤێکی ناسراو بوو. خەڵك خۆشیان دەویست و ڕێزیان بۆ دادەنا. ئەو نەوەی بەگی سەرعێلی سومباسلییان بوو. ئەو بەگە لە گەڵ ڕاپەڕینی کۆزانۆغلی

بوو، بەڵام کاتێك دواتر ئەحمەد کۆزانۆغڵی خۆی بە دەستەوە دا، ئەو ملی بۆ دەسەڵات نەوی نەکرد، هەتا مرد، هەروەك یاغی لە شاخی مایەوە و ئێستا گۆڕەکەی ببووە زیارەتگەی تورکمانان. ئەو بەگە ئەوەندە لە نێو خەڵکی وڵاتی خۆی خۆشەویست بوو، کە ئێستاش عێلەکەی ڕێزێکی تایبەتیی هەبوو و گەورەکانی ئەو عێلەش لە هەموو ئاغا و بەگەکانی دیکە لە نێو خەڵکی دا خۆشەویستتر بوون.

عەنبەر بەگ لە کاتی مردنی بابی دا جحێڵ بوو، چاوەکانی شین بوون و لاوێکی شۆخ بوو. بابی، پێش ئەوەی بمرێ، بانگی کردە لای خۆی و کردییە جێنشینی خۆی. عەنبەر بەگ پێیناخۆش بوو، زۆر گریا، پاڕاوە کە ئەو ئەرکەی پێنەسپێرن و گوتی:" ئەوە کاری من نیە. ئەمن بۆ سەرعێل نابم! بشمکوژن ناتوانم بە خەڵکی هەژار بڵێم دەبێ بەرهەمی ڕەنجی خۆیان بدەن بە من! ئەمن ناتوانم ستەم لە کەس بکەم! بابە گیان، من داوای هیچت لێناکەم، تەنیا ئەوەندەم دەوێ کە ئەو ئەرکەی لە سەر شانی من دانەنێی و ئەوەم لە گەڵ بکەی، هەتا هەتایە منەتبارت دەبم و هەر دوعای بەخێرت بۆ دەکەم". بابیشی کە دە سەرەمەرگێ دا بوو و نەیدەتوانی زیاتری قسە لە گەڵ بکا، بە کوڕە هەرەچکۆڵەکەی گوت کە ئەرکەکە قبووڵ بکا و ئەویش کە شتێکی وای لە خودای دەویست، دەسبەجێ قبووڵی کرد.

لەو کاتییەوە ئیدی عەنبەربەگ بە ڕەنجی شان و پیلی خۆی ژیا. ئاشێکی هەبوو و بۆخۆشی ئاشەوان بوو. گەنمی بۆ خەڵکی لێدەکرد و بە بەرهەمی ئەو ئاشەی خۆی بەخێو دەکرد. هەمیشە تەواوی لەشی ئارداوی بوو.

ئەگەر ئەو جارەی سێڵاو هەڵنەستابا، ئاشەکەی بەسەریەك دا نەڕووخاندبا و لە گەڵ خۆی نەبردبا، ئەوە قەت عەنبەر بەگماڵی نەدەهاتە شاری و لە وێ نەدەژیا. لە خوارەوەی ئاشەکەی باغە هەنارێکی چکۆڵەی هەبوو، کە باغچەیەك و پارچە زەوییەکیشی بە سەرەوە بوو. براکەی چیدیکەی نەدابۆیە، لە گەڵ ئەوەش کە لە سایەی عەنبەربەگییەوە ببوو بە بەگ و عەنبەر بەگیش بەشەمیراتی خۆی زۆر زیاتر دەکەوت. بەو حاڵەش قەت کێشەی لە گەڵ براکەی نەکرد. لە سەر یەك ئەو پیاوێکی مەند و بە وەج بوو، کێشەی لە گەڵ هیچ کەس نەبوو و قەتیش بە خراپە باسی کەسی نەدەکرد.

عەنبەر بەگ زۆر ئۆگری باغ و زەوییەکەی بوو. پێیخۆش بوو هەر بۆخۆی کاریان تێدا بکا پێیان ڕابگا. ئەمامی هەرە چاکی پەیدا دەکرد، دەیچەقاند و بە وەخت هەموو کارەکانی دەکرن. هەر بۆیەش دوای چەند ساڵێك باغە هەناری وی نێوبانگی دەرکرد، هەنجیری لە هەنجیری

هەموو شوێنێکی دیکە شیرنتر بوون و هەروەها باغێکی ترێی زۆر جوانیشی دروست کرد. پاشماوەی زەوی‌یەکەشی دەکردە تەماتە، بیبار، باینجان، خەیار، ترۆزی و کاڵەك و شووتی و هەموو ساڵێ بیستانێکی زۆر باشی دەبوو. کەرێکی هەبوو. هەموو ڕۆژی کەرەکەی لە بەرهەمی باغەکەی، لە سەوزی و میوە بار دەکرد بۆ فرۆشتنێ دەی‌هێنایە بازاڕی شاری. شتەکانی ئەوەندە باش بوون، دەسبەجێ دەفرۆشران. ئاخرەکەی هات خانوێکی بچکۆلەی لە پەنا کلیسایەکی دۆزی‌یەوە و هاتە تێی. خانووەکەش هەر نی کلیساکەی بوو، دیوارەکانی بۆریە بوون و سەری بە پووش و قامیشی داپۆشرابوو، بەڵام جێگایەکی خاوێن و خۆش بوو. حەسارێکی بە دەورەوە دروست کردبوو و نێو حەسارەکە پڕ بوو لە گوڵەباغ، لاولاو، گوڵە شەوبۆ، ڕیحانە و زۆر چەشنە گوڵی دیکە.

کاتێك شەڕی یەکەمی جیهانی دەستی پێ‌کرد، خەڵکی شارەکەی بوونە دوو بەش، مسوڵمان و فەلە. ئەو ئەرمەنی‌یانەی لە ترسان شارەکەیان چۆل دەکرد، هاتن بۆ لای عەنبەربەگی. سێ گەڕەکی شارەکەی ئەرمەنیی لێ دەژیان و زۆربەشیان سەنعەتکاری وەك ئاسنگەر، پینەچی، بازرگانی دەوڵەمەند و خاوەنزەوی بوون. هەموویان باوەڕیان بە عەنبەر بەگی هەبوو و هەر بۆیەش هەرچی دراو، زێڕ، زیو، خشڵ و کەرەسەی بە نرخیان هەبوو، بە نەهێنی کۆیان کردنەوە سەر یەك، لە لای وی‌یان دانان و گوتیان هەتا شەڕ تەواو دەبێ، دۆخەکە ئاسایی دەبێتەوە و ئەوان دەگەڕێنەوە، بۆیان ڕاگرێ. هەموو دەیانزانی عەنبەر بەگ پیاوێکی دەستپاك و ئەمینە و مادام ئەو ماڵ و سامانە لە لای وی بێ، کەس خۆی تێ‌ناگەیەنێ، دەپارێزرێ و دیارە ناشفەوتێ.

دوای ئەوەی فەلەکان ڕۆیشتن، خەڵك باسی ئەو زێڕ و زیو و شتانەیان بە گوی گەیی، بەڵام عەنبەر بەگ شتێکی ئەوتۆی پێوە دیار نەبوو. ئەو هەر وەك جاران لە بازاڕی خەریکی سەوزە و میوەفرۆشتنی خۆی بوو و تەنیا ئاڵوگۆڕێك کە بە سەر ژیانی وی داهات، ئەوە بوو کە خانووە حەسیرەکەی چۆل کرد و چوو دە خانووی جیرانەکەیەوە. بەسەرهاتی ئەو ئاڵوگۆڕەش ئەوە بوو کە جیرانێکی فەلەی بە ناوی ئارتین هەبوو. بە یەکەوە جیرانەتی‌یان زۆر خۆش بوو و کاتێك ئارتین ناچار بوو ماڵوحاڵی خۆی بە جێ‌بێلێ، داوای لە عەنبەرخانی کرد کە بچێتە نێو خانووەکەی وی‌یەوە. خانووەکەش زۆر گەورە، خاوێن و جوان بوو. ماوەیەکی زۆر پێ‌چوو و فەلەکان نەگەڕانەوە. ئاخرەکەشی دەرکەوت کە ئەوان هەرگیز ناگەڕێنەوە ئەو شارەی و کە وا بوو ئیدی کەسیش نەبوو داوای خانووەکەی لە عەنبەر بەگی بکاتەوە. دەوڵەت، ماڵ، زەوی و

سامانی فەلەکانی هەڕاج کرد و ماڵەکەی نارتینیش کە عەنبەربەگی تیّدا بوو، هەر هەراج کرا، بەلاّم هیچکەس نەبووە موشتەری ئەوخانووەی و بە پوولێکی کەمی هەراجی‌یە بوو بە ملکی عەنبەر بەگی. دیارە ئەو مرۆڤە باش و ڕوحسووکە هەر وەك جاران ساکار و بیّئازار بوو و خەریکی کار و کاسبیی خۆی بوو. ئیدی خەڵکیش دوای ماوەیەك مەسەلەی زێڕ و پووڵی فەلەکانیان لە بیر چۆوە و باسی ئەو شتەی هەر نەما.

شەوێکیان یەکێك لە دەرگای ماڵی عەنبەر بەگی دا. ساڵانێکی زۆر بوو شتی وا ڕووی نەدەدا. عەنبەر بۆخۆی چوو و دەرگای کردەوە. کە دەرگاکەی کردەوە، چاوی بە دەستەیەك چەتەی سەرتاپیّ چەکداری پۆشتە و پەرداخ کەوت، کە هەموویان سەرکلاّوەی سووریان لە سەر بوو. عەنبەر بەگ نە ترسا و نە پێشی سەیر بوو. هەر وا هێدی و لە سەرەخۆ گوتی:

ــ فەرموون، براکانم، فەرموون وەرنە ژووریّ. بەخێربێن، سەر چاوان!

دوو چەکداریان لە دەریّ ڕاوەستان و کێشکیان کێشا، ئەوانی دی هەموو چوونە ژوور و بە ڕیز لە دیوەخانیّ دانیشتن.

مەلا فەرهاد دەستی بۆ لای یەکێك لە چەتەکان ڕاداشت و گوتیّ:

ــ عەنبەر بەگ، ئەو کوڕە جحێڵە حەمەدۆکە!

عەنبەر بەگیش دەسبەجیّ قسەکەی لیّوەرگرتەوە:

ــ بۆخۆشت دەبیّ مەلا فەرهاد بی!

ــ بەڵیّ، وایە.

عەنبەر بەگ دەستەکانی بەرەو ئاسمان بەرز کردنەوە و بە خۆشحاڵی و شادی‌یەکی زۆرەوە گوتی:

ــ هەزار جار شوکور خوایە، بۆ ئەو ڕۆژەی نیشانی منت داوە! بە ڕاستی ئەگەر ئێستا کەسێك گوتبای هەر ئاواتێکت هەیە، بیڵیّ تا بۆت وەدیبێنم، دەمگوت تەنیا ئاواتم ئەوەیە حەمەدۆکی ببینم. یارەبی بەخێر بێن. پێم بڵێن لە پێش دا چتان بۆ بێنم! برسیتانە، یان لە پێش دا قاوەی دەخۆنەوە؟

مەلا فەرهاد وەلاّمی دایەوە:

ــ سوپاست دەکەین، هیچ ناخۆین!

لەو کاتە دا حەمەد شەرمی کرد و هەموو گیانی وە سەر نارەقەی گەڕا.

عەنبەر بەگ دووپاتی کردەوە:

ــ چۆن؟ هیچ ناخۆن و هیچیش ناخۆنەوە؟ هەر هیچ؟...

ــ نەخێر، هیچ!
ــ یانی چی؟ بۆ؟ ئاخر ئێوە میوانی منن و خوا بۆ لای منی ڕەوانە کردوون...
مەلا فەرهاد بە شێوەیەکی تا ڕادەیەك وشك وەڵامی دایەوە:
ــ نەخێر، هیچ ناخۆین!
ــ ئاخر بۆ؟
ــ چونکە ئێمە هاتووین تاڵانت کەین و ئەو زێڕ و پووڵەت لێبستێنین کە فەلەکان لە لای تۆیان بەجێهێشتوە.
عەنبەر بەگ قاقایەکی کێشا:
ــ حەك ماڵت ئاوەدان بێ! لە بەرئەوەی چ ناخۆن؟ خۆ ئەمن بۆخۆم لەمێژ بوو چاوەڕوانی ئێوە بووم و زۆرم پێخۆشە کە هاتوون ئەو ئەمانەتییەم لێوەرگرنەوە. کارێکی زۆر باشتان کردوە کە هاتوون. باوەڕم پێبکەن ئەو پووڵ و زێڕە لە سەر من بار بوو و نەمدەزانی چیی لێبکەم؟ دیارە هەتا گیانم دە بەر دا مابێ، کەس ناتوانێ دەستی بۆ بەرێ، بەڵام ئەدی ئەگەر مردم؟ ئەو پرسیارەم زۆر جار لە خۆم کردوە کە بە ڕاستی چ لەو پووڵ و زێڕەی بکەم و تەنیا وەڵامێکم بۆ دۆزراوەتەوە: بیدەم بە ئێوە لە هەموو شتێکی دی باشترە، چونکە کەس ناتوانێ وەك ئێوە ئەو پووڵ و زێڕەی بە سەر خەڵکی چاولەدەست دا دابەش بکا. کوڕە هەر زۆریشتان منەتبارم. ئێوە ئەرکێکی گەورە لە سەر شانی من لادەبەن. دەزانن ئەمن چەند لەمێژە ئەو پووڵ و زێڕەم ڕاگرتوە و وەك گیانی خۆم پاراستوومە؟
پاشان بە پێکەنینەوە گوتی:
ــ دەبێ یەکێکم لە گەڵ بنێرن یارمەتیم بکا. بە تەنێ بۆم نایە.
ــ قاسم، لە گەڵی بچۆ.
حەمەد سەری داخستبوو، هەموو گیانی ببووە ئارەقە و پێیعەیب بوو سەر هەڵێنێ.
قاسم و عەنبەربەگ چوونە دەرێ، چرایەکیان لە گەڵ خۆیان برد و چوونە ژوورێکی کە تەختی عەرزی ژوورەکەی لە بەردی مەڕمەڕ بوو. یەکێك لە بەردەکان بە خەتێکی سووری کاڵ نیشانە کرابوو.
ــ ئەو بەردەی دەرێنە...
قاسم هەوڵی دا بەردەکەی دەرێنێ، بۆی نەکرا.
ــ با یەکی دیش بانگ کەین.

مەلا فەرهاد بۆخۆی هات. عەنبەر بەگ گوتی:

ـ هەر ئەو شەوەی گویزتمانەوە ئەم ماڵەی، زێڕ و پووڵەکەم لێرە دە قوولکەی نا و سەریشم بەو بەردە مەڕمەڕە جوانانە داپۆشی. ئەو پاچەی بێنە، بەڵکوو بە دمی پاچەکەی بەردەکە هەستێ.

پاش ماوەیەلك هەوڵدان بەردەکەیان لابرد و سەری چاڵەکەی وەدەرکەوت:

ـ ئێستا دەبێ گڵەکەی بدەنەوە، ڕەنگە بە دەستیش بدرێتەوە... قوولکەکە زۆر قووڵ نیە... ئەوە ئەمن چراکەم گرتوە، ئێوەش بیدەنەوە...

هێندێکی دیش خەریك بوون و گڵەکەیان دەردا. لە پڕ گەیشتنە کووپەیەکی گەورە. کووپەکە بە قیتەوە زۆر بە جوانی دە قولکەکەی خرابوو و سەریشی بە قوڕی دادرابوو.

ـ بیهێننە دەرێ و بیبەن. ماڵتان ئاوەدان بێ. ئەو پووڵ و زێڕە بۆ من هەر ئازار و نارەحەتی بوو. ئیدی ئەو جار ئاسوودە بووم!

هاتنەوە دیوەخانێ و قاسم کووپەکەی لە وێ دانا.

ـ بیکەوە و لە سەر ئەو لبادەی هەڵیڕێژە!

هەر مەلا فەرهاد کووپەکەی سەراوبن کرد، سکەی زێڕ، ملوانکەی زێڕ، بازنە، پاوانە و ئەنگوستیلە ڕژانە سەر لبادەکەی. هەمووی ئەو خشڵانەش بە بەردی بە نرخ و گرانبایی وەك یاقووت، لەعل، یاقیق و جەواهێراتی دیکە ڕازابوونەوە. هیچکام لە چەتەکان تا ئێستا خەزێنەکی ئاوا بە نرخیان نەدیبوو، هەر بۆیە هەموویان واقمابوون و بێ ئەوەی یەك وشەشیان لە زاری بێتە دەر، دەو هەموو زێڕ و جەواهێراتەیەوە ڕامابوون.

مەلا فەرهاد دەستی بە قسان کردەوە:

ـ عەنبەر بەگ، هەموو ئەو زێڕ و جەواهێراتەی دەدەی بە ئێمە؟

ـ بەڵێ، هەمووی ئی خۆتانە!

ـ شتی وا نابێ!

عەنبەر بەگ و مەلا فەرهاد زۆریان قسە کرد. مەلافەرهاد داوای دەکرد عەنبەر بەگ بەشێکی ئەو پووڵ و زێڕانە بۆخۆی بگێڕێتەوە و ئەویش قبووڵی نەدەکرد، ئاخرەکەی مەلا فەرهاد ئەنگوستیلەیەکی زۆر باشی جوێ کردەوە، کە ئەقیمەکەی یاقووتێکی گەورە بوو و دایە دەست عەنبەر بەگی:

ـ لانی کەم ئەوەیان هەڵگرە.

ـ ناتوانم!

ــ ئەتۆ ساڵانێکی زۆر ئەو خەزێنەیەت پاراستوە و ئێستا مافی خۆتە بەشێکی لێ‌هەڵگری.
ــ بە هیچ شێوەیەك ناتوانم!
ــ ماشەڵڵا چەندە لە سەر بڕیاری خۆت سووری. زۆر باشە، ئەگەر وابێ و تۆ هیچ لەو زێڕ و پووڵەی هەڵنەگری، ئێمەش هیچ لە گەڵ خۆمان نابەین. هەستن کوڕینە با بڕۆین، یاڵڵا!
عەنبەر بەگ قاقایەکی کێشا:
ــ نا، کاکە ڕاوەستن، بۆکوێ دەچن؟ باشە ئەمن ئەو ئەنگوستیلەیەم ئەوە هەڵگرت، بەڵام هەر ئێستاش ئەوە دامەوە بە مەلا فەرهادی و داوای لێ‌دەکەم لە لایەن منەوە بی‌دا بە منداڵێکی کە دایك و بابی دە شەڕێ دا کوژرابن.
ــ ئەنگوستیلەکەی هەڵگرە و بۆخۆت بی‌دە بە منداڵێکی وا.
ــ باشە، دەی‌گێڕمەوە و دەی‌دەم بە کچی نایب داوسی.
عەنبەر بەگ ئەنگوستیلەکەی دە گیرفانی نا. پاشان قاوەیان هێنا و هەر کەس قاوەی خۆی خواردەوە، بەڵام لەو بەینەی دا عەنبەر بەگ هیچی نەدەگوت و هەر بیری دەکردەوە.
ــ ئەوە بیر لە چی دەکەیەوە، بەگ؟ خۆ ناڕەحەت نی؟
ــ پیاو حەمەدۆکی میوان بێ، چۆن ناڕەحەت دەبێ؟ ئەگەر ناڕەحەتیش بێ، حەمەدۆکی ببینێ، ناڕەحەتی‌یەکەی دەڕەوێ. بەڵام بۆچی؟ شتێکم دە دڵی دایە...
ــ چت دە دڵی دایە، لێمان مەشارەوە! ئێمە دە بەر دەستت داین و هەرچی‌یەکت بوێ بۆت جێبەجێ دەکەین. بۆ وێنە ئەگەر بتەوێ براکەت تالان کەین و تۆڵەی تۆی لێ‌بستێنینەوە، بێ سێ‌ودوو دەی‌کەین!
ــ نا، نا، لە وی گەڕێن! ئەو هەر لە دوای مردنی بابمەوە بەشی خۆی ناڕەحەتی بۆ پەیدا بووە!
ــ ئەدی چی‌یە دە دڵت دایە و نای‌درکێنی؟
ــ باشە ئێوە هاتوون و ئەو خەزێنەیەتان لێ ئەستاندووم، کە هەمووی ماڵی فەلەکان بووە، کە کۆیان کردۆتەوە و لە لای منیان بە ئەمانەت داناوە. خەڵکیش بە مەسەلەکەیان زانیوە. جا ئێستا چۆن ئەو خەڵکە باوەڕم پێ‌دەکەن کە ئێوە هاتوون و پووڵ و زێڕەکەتان لێ‌ئەستاندووم.
ــ بۆیان بگێڕەوە...
ــ قەت باوەڕم پێ‌ناکەن.
ــ دەبێ باوەڕت پێ‌بکەن! ئەوە نیە ئێمە خۆمان گەیاندۆتە ئێرە و...
ــ کەس دیتوونی، دوایە شاهیدی بدا، کە بەڵێ حەمەدۆك چووە سەر عەنبەر بەگی و تالانی کرد؟

ـ باشه، چ بکەین؟ خۆ ئیشاڵڵا ناشتکوژین!

ـ کوژرانم پێخۆشترە لە وەی ئابڕووم بچێ و دوایە خەڵك بڵێن درۆ دەکا، ڕووت نەکراوە و بۆخۆی خەزێنەکەی خواردوە. ئەمڕۆ کەس باوەڕی بە کەس نیە و دیارە کاتێکیش دنیا وای لێهات کە ئینسانەکان ئاوا بەرامبەر یەکتری درۆزنگ بوون، ئیدی ژیان زۆر ناخۆش دەبێ! پیاوی چاك بن ڕێگایەك بدۆزنەوە کە خەڵك لێم درۆزنگ نەبن و ئاوام چاو لێنەکەن.

لێرە دا حەمەد وە قسە هات:

ـ ناڕەحەت مەبە عەنبەر بەگ، ئێستا ئەوەشت بۆ جێبەجێ دەکەم!

پاشان لە پڕ ڕاست بۆوە.

ئێستا ئەو حەمەدە کورتەباڵایە لە پێش چاوی عەنبەر بەگی بە قەد حووجێکی لێهاتبوو و لە دڵی خۆی دا گوتی:" ئەوەی پێیدەڵێن حەمەدۆك، ئەوەیانە، نەك ئەوی پێشوو".

عەنبەر بەگ هەستا، چووە بەر دەرگای ژوورەکەی دیکە کە ژن و منداڵی لێبوون و ئێستا لە دەرگاکەوە بە ترسەوە چاویان دە وان بڕیبوو و بە دەنگێکی بەرز گوتی:

ـ زووبن، ئەو گۆنی‌یە پڕ لە زێڕ و پووڵەم بۆ بێنن، کە بە میرات لە بابمەوە بۆ من بەجێماوە.

پاشان غاری دایەوە لای حەمەد و هاوڕێیانی و گوتی:

ـ کاکە فەرموون، پووڵ و زێڕەکەی بەرن و کارتان بە من نەبێ. هەر ئەوەندەم لە بابمەوە بە میرات بۆ بە جێ مابوو و ئەویش بۆ ئێوە. ئەوەش بزانن بابو باپیری من هەردووکیان ئازا بوون. هەموو چەتە و یاغی‌یەکان، تەنانەت کۆزانۆغڵیش، خۆیان بە دەستەوە دا، بەڵام باپیری من نەیکرد. فەرموو ئەو زێڕە هەمووی بۆ تۆ!

گۆنی‌یەك لە وێ بوو، تەیموور هەموو زێڕەکانی دە گۆنی‌یەکەی کرد، زارکی بە بەنێکی توند بەست و بە شانی دادا. هێندە قورس بوو، بە زەحمەت بۆی هەڵدەگیرا. عەمبەربەگ یەکبەیەك هەموویانی دە ئامێز گرت و لەو کاتە دا چاوەکانی پڕ ببوون لە ئاو:

ـ هەتیو و بێوەژنتان لە بیر نەچن، ئەوانەی باب و مێردیان دە شەڕێ دا کوژراون. ئەوان لە هەموو کەسی دی زیاتر شیاوی وەن کە یارمەتی‌یان پێبکرێ!

حەمەد بە دوای وی دا گوتی:

ـ هەروەها ئەو پیرێژنانەش کە کوڕەکانیان دە شەڕێ دا کوژراون!

لە پلیکانان چوونە خوارێ و عەمبەر بەگ دەرگای بۆ کردنەوە:

ـ خودا پشتیوانت بێ حەمەدۆك، هیوادارم لەو خەباتە دا سەرەکەوی!

حەمەد گوتی:

ـ زوو لە بەر دەرگاکەی لاچوو، بچۆوە سەرێ و خۆت حەشار دە! مەیەڵە هیچکەستان لە بەر پەنجەران بن...

عەمبەر بەگ بە پەلە چۆوە سەرێ، زانی حەمەد چ دەکا. لە نەکاو ماڵەکە وەبەر دەسرێژ درا. گوللە بە سەر دەرگا و پەنجەران دا بارین. حەمەد و مەلا فەرهاد گوڕاندیان:

ـ عەنبەر بەگ بیکەوە! ئێمە دەستەی حەمەدۆکین! یان زێڕ و پووڵەکەمان دەدەیەی یان دەتکوژین!

عەنبەر بەگیش پەنجەرەیەکیانی کردەوە و لە بەر پەنجەرەکەی ڕا بە هەموو هێزی خۆی هاواری کرد:

ـ بۆچی دەستم لیٚهەڵناگرن؟ زێڕ و پووڵەکە هەر ئەوەندە بوو کە بردتان! وەڵڵاهی یەك سکەش چی‌یە دە ماڵێم دا نەماوە...

خەڵکی شاری بە گرمەی تفەنگان وەخەبەر هاتبوون و کاتێك گوێیان لەو گوڕە و هاوارەی بوو، زانیان کە حەمەدۆك بە سەر ماڵی عەنبەر بەگی داداوە و تالانی کردوە. ئیدی هەر کەس سەری دە بن لێفەی خۆی نایەوە و تاقە کەسێکیش نەیوێرا سەر وەدەر نی. ژاندەرمان کاتێك گوێیان لە تەقەی بوو، ئاڵۆز بوون و وە جموجۆڵ کەوتن، بەڵام تا ئەوان وەخۆ هاتنەوە، چەتەکان لەمێژ بوو وەسەر تەپکەکان کەوتبوون و لەوێوە تەقەیان بە سەر شاری دا دەکرد.

ژاندەرمە و چەتەکان لە نێو دارستانی ناکارسازی تێکهەڵچوون و شەڕ لە شەوێوە تا بەیانی درێژەی کێشا. تاریك و ڕوونی بەیانی حەمەد نەخافڵ بە سەر وەکیل باشی نایب عاسمی دا کەوت:

مەلافەرهاد گوڕاندی:

ـ نەبزووی نایب!

نایب عاسم لە جێی خۆی ڕاوەستا و دەستەکانی بەرز کردەوە. تەیموور غاری دا پێشێ، تفەنگەکەی هەڵگرت و دەستووری پیٚدا دەمەوڕوو درێژ بێ. حەمەد لە سەر زگ خۆی گەیاندە لایان:

ـ دەمناسیەوە، نایب؟

ـ چۆنت ناناسمەوە حەمەدۆك! کەس هەیە وەك تۆ بچێ؟ بەڵام نەمن پێموابوو وازت لە چەتەگەری‌یە هێناوە.

ـ گەڕامەوە نایب. باشیش بوو هاتمەوە، ئەگەر نەهاتبامەوە ئێستا لێرە چاوم بە دیداری تۆ ڕوون نەدەبۆوە.

ـ کارێکی باشت نەکرد بە سەر شاریت دادا حەمەد!

ـ نایب، ئێمە بە سەر شاریان دانەداوە.

خۆیان کووڕ کردەوە و بە ماتەماتە خۆیان گەیاندە نێو کەندالێکی. بەردێکی گەورە لە پێش کەندالەکەی بوو و ئیدی لە وێ گوللە نەیدەگرتنەوە. پالیان وە بەردەکەی دا. نایب سیگارێکی دا بە حەمەدی. هێندێك واوەتر تەیموور لە پشت بنەدارێکی گەورە درێژ ببوو، تەقەی دەکرد و ئاگای لێیان بوو.

حەمەد گوتی:

ـ تەیموور وشیار بە نەیانکوژی! لە بیرت بێ نایب لێرەیە و لە بەر خاتری وی نابێ کەس بکوژرێ.

تەیموور بزەیەکی هاتێ و وەلامی دایەوە:

ـ سێم ئەنگاوتوون، بەلام هەر لە باسکیانم داوە و هیچی دی.

نایب دووپاتی کردەوە:

ـ پێم بلێ بزانم حەمەد، بۆ بە سەر شاریت دادا؟ پێتوا نەبوو ئەوە بۆ تۆ سوودی نیە و بە زیانتە؟

ـ ئێمە بۆ تالانکردنی عەنبەراغای هاتبووین. بۆچما نازانی چەندە خەلکی هەژار و برسی لەو گوندانەی شاخی هەن؟ نازانی چەندە مندالی بێدایك و باب هەن؟

نایب گوتی:

ـ دەزانم حەمەد، جا ئەو زێڕ، خشل و پوولەی لێتان ئەستاند زۆر بوو؟

ـ یەکجار زۆر، پڕ بە گۆنییەکی! دوایە دە خورجێنێکی گەورەمان کرد و وە پاشتەرکی ئەسپیمان هەلواسی، هەردووك لای خورجێنی پڕ کردبوو.

ـ ئاغا و بەگەکان زۆرتان لێدەترسن و ئێستا ئیدی بەو کارەی هەر تۆقیون. هەستاون جەباری کۆنەهاوڕێتیان ناردۆتە سەر گوندی عارف سایم بەگی.

ـ بێگومان دوایەش دەلێن حەمەدۆك بووە بە سەری داداون...

ـ جا عارف سایمیش لەشکرتان دەنێرێتە سەر... ئەو ناوچەیە تووشی چەرمەسەری و گێرەوکێشەیەکی گەورە دەبێ...

ـ هەر هەژار و بێئەنواکانیش لێیان دەقەومێ و تووشی کوێرەوەری و ڕەنج دەبنەوە.

لە نەکاو نایب چاوی بە کراسەکەی حەمەدی کەوت:

ـ ئەو کراسەی خەڵك باسی دەکەن ئەوەیە، حەمەد؟

ـ بەڵێ ئەوە کراسە پیرۆزەکەیە.

ـ حەمەد، ئەمن زۆر دەترسم.

ـ بۆچی؟ لە چی دەترسی نایب؟

ـ خەریکن بچنە سەر دایە سوڵتانی. زۆری باس دەکەن. ڕقیان لێیەتی و دەیانەوێ بیگرن.

ـ کەس ناتوانێ خۆ دە دایە سوڵتانی بگەیەنێ!

ـ هیوادارم وا بێ، بەڵام ئەمن نیگەرانم.

حەمەد چاوی لە نایبی کرد و تێیهەڵڕوانی. دەتگوت دەیەوێ پرسیارێکی لێبکا.

نایب گوتی:

ـ چییە حەمەد؟ دەتەوێ شتێکم لێبپرسی؟

ـ ئەرێ نایب، ئەتۆ پیاوێکی بە ناوی زەکی نەژاد دەناسی، کە مامۆستا بووە، لە شەڕی سەربەخۆیی دا ئازایەتیی زۆری نواندوە و میداڵی وەرگرتوە... لە گەڵ ڕەشاری چەتەش هاوسەنگەر بووە، هێندێکیش دەشەلی...

ـ ئەیچۆن! قارەمانێکی گەورە بوو، بۆخۆی شێرێك بوو! خەڵکی ئەم ناوچەیە هەموو دەیناسن. ئەو هێزەی لە خاربوغازێ شەڕیکی سەخت و ئازایانەیان لە گەڵ فەڕانسەییەکان کرد، ئەو فەرماندەریان بوو. هەروەها لە داردانێلیش شەڕێکی قورسی لە گەڵ یۆنانییان کرد.

ـ خەبەرت هەیە کوشتوویانە؟

ـ بەڵێ، ئەو هەواڵەشم پێگەیشتوە کە قاتڵەکەشی کوژراوەتەوە. دەڵێن ئەوەی قاتڵەکەی کوشتۆتەوە، ناوی حەمەد بووە.

لێرە دا نایب چاوێکی لە حەمەدی کرد، وەك ئەوەی پرسیارێکی بۆ هاتبێتە پێش. گوللە ویزەیان دەهات و بە سەریان دا دەڕۆیشتن.

حەمەد گوتی:

ـ نایب، ئەو حەمەدەی باسی دەکەن، خوارزای مەلا سەلامی، ئەوە ئەمن بووم.

نایب دەستی لە سەر پشتی حەمەدی دانا و گوتی:

ـ کارێکی زۆر باشت کرد حەمەد، زۆر چاك بوو تۆڵەی ئەوە پیاوە ئازا و قارەمانەت کردەوە.

ـ نایب، پێتوایە دایە حۆری و سەیران لە وێ مابن؟

ـ بەڵێ، مەلا سەلام پیاوێکی بە ئەزموون و ئازایە. هاوڕێی مەلا فەرهادیە ئیدی.
ـ دەزانم.
پاشان حەمەد باسەکەی گۆڕی:
ـ کە وا بوو ئێستا جەباری هاوڕێم بۆتە حەمەدۆك؟
ـ ناچاریان کردوە، دەنا پێی خۆش نیە. هەوەڵێ زۆریان بۆ هێنابوو کە ئەتۆ بکوژێ، بەڵام بە هیچ شێوەیەك قبوولّی نەکردبوو.
ـ ئاگام لێیە. ئەدی عەلیـیە شەل چۆنە؟ هەر لە شاری ماوە؟
ـ بەڵێ، دەبینی ڕۆژێك لە لای مورتەزاغایە و ڕۆژێکی دیکە لە لای مەلا دۆرانی. بریا دیبات. کڵاوی بە گەوەڕ لە سەر دەنێ و سواری ئەسپی عەرەبیی هەرە باش دەبێ! دە ژیانی خۆم دا کەسی وا زیرەك، ئازا و خۆڕاگری وەك ویم نەدیوە! هەست دەکەم یەکجار زۆریش خۆی بە قەرزداری تۆ دەزانێ.
ـ بەڵێ وایە، ئاخر ئەو زۆر جاران لە لای من داوای لێبووردنی کردوە و دەڵێ تاوانی من بوو خەجیج کوژرا.
هەتا وڵات ڕووناك بوو حەمەد و نایب، لە گەرمەی شەڕێ دا و لە کاتێك دا بەردەوام ویزەی گوللانیان لە بن گوێی دەهات، بە یەکەوە قسەیان کرد. پاشان تەیموور هاتە لایان و گوتی:
ـ بڕوانە کا حەمەد ئەو ژاندەرمانە چەندە کەمتەرخەمن، خۆ شەڕێ نازانن و هەر خۆ وەدەردەخەن. وەڵڵاهی ئەگەر بموێ و دەستیان لێ‌نەپارێزم، یەکە بە یەکە سەری هەموویان وەك هەرمێی لە بەر یەرك بڵاو دەکەم.
ـ نا، نا، تەیموور، شتی وا نەکەی!
وەکیل باشی عاسم هەستا سەر پێ. ڕەخت و فیشەکدانەکەی ڕاستەوپاستە کرد و خۆی تەکاند.
ـ ئەمن ئیدی دەڕۆم...
حەمەد گوتی:
ـ هیوادارم هیچ‌کەس بە یەکەوەی نەدیبێن. تا ئێستاش هیچ‌کەس نازانێ کە ئێمە دۆستین، وا نیە؟
ـ نا، کەس نازانێ. بشزانن شتێکی وا نیە و زۆر دەربەست نیم.
حەمەد بە ڕێزێکی زۆرەوە دەستی نایبی ماچ کرد و نایبیش ئەوی دە باوەش گرت:
ـ حەمەد گیان، ئەوە ئەو جاریش چاومان بە یەکتر کەوتەوە. ئای چەندە شادم کە دەزانم ئەتۆ تۆڵەی مامۆستا زەکیت کردۆتەوە! جا ئیدی ئەو جار بش‌مرم، داخم نیە.

خودا پشت و پەنات بێ!

نایب ڕۆیی. حەمەد بە هاوڕێکانی گوت تەقەی ڕابگرن، نەوەك نایب گوللەیەکی وێلەکیی وێبکەوێ. دیارە ژاندەرمەکانیش وردە وردە لە پاشەکشێ بوون و تەقەیان بڕیبۆوە. مەلا فەرهاد گوتی:

ــ کوڕینە، دەچینە ماڵە ئۆمەتی و دەخەوین. دەزانم ئێستا چاوەڕوانمانە و پێشوازییەکی باشمان لێدەکا. ژاندەرمەش جارێ هەتا لانیکەم حەوتوویەکی دیکە خۆیان بۆ خڕ نابێتەوە و ناتوانن بێنەوە شاخی.

حەمەد گوتی:

ــ ئەو نایبە بە ڕاستی مرۆڤێکی سەرنجڕاکێشە. گومانم نیە کە ئەو دۆستێکی نێزیکی مامۆستا زەکی بووە.

لە ڕێگایە دا، تا گەیشتنە جێ، بە یەکەوە هەر باسی وەکیل باشی عاسمیان کرد. مەلا فەرهاد دەیگوت:

ــ پیاوی وەك نایبی بۆ ژاندەرمە نابێ. ئەو دەبوو لە گەڵ ئێمە بێ!

ــ دەی خۆ ئێستاش هەر لە گەڵ خۆمانە!

ــ چی؟ بریا...

هەر لە ماوەی سێ چوار ڕۆژان دا ئەو هەواڵە لە کۆزانێ هەتا عوسمانیەی، لە دۆرتیۆلی هەتا ئەدەنەی و لە سەرانسەری دەشت و شاخی بڵاو بۆوە: حەمەدۆك چۆتە نێو شاری، خەزێنەی عەنبەر بەگی تالان کردوە و پڕ بە گۆنییەکی زێڕ، زێو و جەواهێراتی دیکە لێتەستاندوە و بەڵێنی داوە لە مەودواش هەر جارە و بە سەر بەگێکی دا بدا و هەموو ئەو پووڵ و زێڕەش بە سەر بنەماڵەی هەتیوان، بێوەژنان و ماڵومنداڵی نەداری ئەو سەربازانە دا دابەش دەکا کە لە شەڕی قەفقاز و داردانێلی دا کوژراون و نەگەڕاونەوە.

هێندێکان بەو هەواڵەی زۆر خۆشحاڵ بوون و هێندێك زۆر ناڕەحەت. کاتێك دایە حۆری ئەو هەواڵەی بیست، خەو و خواردنی لێهەڵگیرا. کاری ببووە ئەوە هەر دەچووە بن وێنەکەی حەزرەتی عەلی، ئەو وێنەیەی کە تەرمی ئیمامی لە سەر وشترەکەیە و ئیمام هەر بۆخۆشی وشترەکەی لێدەخوڕێ. ڕووی دە وێنەکەی دەکرد، لە گەڵی دەدوا، دەپاڕایەوە و تەنانەت جاری وا بوو هەڵدەپەڕی. نەیدەهێشت سەیران و خێزانی مامۆستا زەکیش بخەون. موسلیمی بەستەزمانیش کە شەو و ڕۆژ تفەنگی بە دەستەوە بوو و کێشکی لە ماڵێ دەکێشا، خەوی لێتاڵ ببوو.

سێ چوار ڕۆژ دواتر هەواڵ هات کە چەتان چوونە سەر گوندی عارف سایم بەگی. وەك بڕووسکەی بە سەریان دا داون. لە وێش حەمەدۆك پڕ بە خورجێنێك زێڕ و پووڵی بردوە و گەڕاوەتەوە شاخی. هەواڵەکە بە وەش کۆتایی نەدەهات. دەگوترا کە لەو بەینە دا کوێخای عارف سایم بەگیش کوژراوە، ئەویش کێ؟ نایب حاجی عەلی! ئەو حاجی عەلی‌یەی کە زەمانی شەڕێش لە هەموو بەرەکان لە گەڵ عارف سایم بەگی بوو. هەر ئەو حاجی عەلی‌یەی شەش پیاوی لە نێوەڕاستی شاری کوشتن و چونکە پیاوی ئەو بەگەی بوو، تاقە شەوێکیش لە گرتووخانەی نەمایەوە. بەڵام ئیدی ئەوە کارەکەی تێکدا. حەمەدۆك هەڵەی کرد، هەڵەیەکی گەورە، هەڵەیەکی وا کە عارف سایم بەگ چاوپۆشیی لیّناکا. حەمەد بابی عارف سایم بەگی نوێنەری گەورەی هەموو هەرێمەکەی ڕووت کردبوو و سەعاتە زنجیرزێڕەکەی کە دیاریی مستەفا کەماڵ پاشای سەرۆککۆمار بوو و مۆری وی لە سەر بوو، بردبوو: دیارە ئەو سەعاتە کە مۆرێکی ئەوتۆی لە سەر بوو، شیاوی قارەمانانی وەك مەلا کەریم، شاهێن بەگ و ڕەشماری بوو، کە ئەوانەش ئێستا نەمابوون و لە وانەی ماویشن، دەکرێ بڵێین هەر کەسێکی وەك بایرامۆغلی کە پیاوێکی بەوەج بوو، بۆ ئەوەی دەبوو ئەو سەعاتەی بدرێتێ...

ئیدی حەمەدۆك پێیّ لە بەڕەی خۆی زیاتر ڕاکێشاوە. بیّگومان عارف سایم بەگ کە ئێستا زۆر تووڕەیە، لەشکرێکی وەسەر دەگێڕیّ و بە دیلی دەگریّ. بەڵام ئاخر ئەوە زۆریش هاسان نیە و ئەو لەشکرەش ناتوانن حەمەدی بشکێنن، چونکوو حەمەد کراسەکەی سوڵتان سەلاحەدینی دە بەر دایە، هەر ئەو کراسەی کە سەلاحەدین بۆخۆی، لە کاتێك دا بە شیری ڕووتەوە خۆی بە دوژمن دادەدا، دە بەری دابووە. هەر لە سایە ئەو کراسەشەوە بووە کە سەلاحەدین توانیویەتی بە تاقی تەنیّ بەرگری لە ئۆرشەلیمیّ بکا، نەیەڵیّ خاچپەرستان بیگرن و ئەو شوێنە پیرۆزە بکاتە کوشتارگەی وان. خانەقای چلچاوی ئەو کراسەی تەنانەت نەداوە بەو شازدە پیاوچاکانەش کە چوونە شەڕی یۆنانی‌یەکان و ئیدی نەشگەڕانەوە. ئەو کراسە بۆ پیاوێك دەبیّ کە شیاوی بیّ و خانەقای چلچاویش حەمەدۆکی هەڵبژاردوە، هەر ئەو حەمەدۆکەی کە بە شمشێرەوە، وەك پڵینگ خۆی بە نێوەڕاستی زنجیرە چیای تووڕووس دا کردوە...

بەگە گەورەکانی شاری کۆبوونەوەیان لەسەر کۆبوونەوە دەگرت و کەیفیان زۆر ساز بوو. ئەو بارودۆخە بۆ وان خێر و بەرەکەت بوو. بیّگومان هەر بەو زووانە عارف سایم بەگ خۆ دە مەسەلەکە هەڵدەقوتێنیّ و ئەو هەرێمە پڕ دەکا لە ترس و دڵەڕاوکیّ. نە ئەو کە کاربەدەستێکی باڵادەست و گەورەیە و نە لە سەریەك دەوڵەتیش چی دی ئەوەیان پیّ قبووڵ دەکریّ، کە

چەتەیەکی وەك حەمەدۆکی درێژە بە ئاژاوە و ڕاوڕووتی خۆی بدا. نا، ئیدی کاتی ئەوە هاتوە کە داستانی حەمەدۆکی کۆتایی پێبێ. ئێستا خەڵك تەنانەت باسی حەمەدۆکیان وەك یاغی‌یەکی بەنێوبانگ زۆر نەدەکرد و لە چوکووراوا، تووڕووس و هەموو ئاناتۆلی باس هەر باسی ئەو کراسە پیرۆزەی بوو کە دە بەر وی دا بوو. گرفتەکەش ئێستا هەر حەمەدۆکێك نەبوو، شاخەکان هەموویان پڕ لە حەمەدۆك بوون. ئاخ... هەمووش تاوانی ئەو دایە سوڵتانەیە. بەڵێ ئەوانە هەموو دە بن سەری وی دان. ئای ئەو ژنە چەند وریا و زۆرزانە! یاغی، چەتە، دز، قاچاخچی و تەنانەت پیاوکوژی هەرە خوێنخۆریشی دە بەر دەستی دان و ئەو کەسانەیان پێ لە نێو دەبا کە بە نەیاری خۆیان دەزانێ و بە نیازە تۆڵەیان لێبستێنێتەوە. لە خەڵکی شاری و تەنانەت لە ئاغا و بەگە گەورەکانیش ئاقڵترە. پێگەی کۆمەلاتی و ئەزموونی ڕابردووی وای لێکردوە کە خەڵکی باش دەناسێ و دەتوانێ چۆنی بۆخۆی پێی‌خۆش بێ، خەڵکی هەڵسووڕێنێ، کاریان پێ بکا و کەلکیان لێوەربگرێ. بزانە چی کرد؟ ئاخر کێ ئەوەی پێدەکرێ؟ بارگینێکی نیوە تۆپیوی قۆتڕی زیندوو کردەوە، کردیە ئەسپێکی بۆرەی ڕەسەن و وای لێکرد چلسوارەی غەیبی بە عەبای سپی‌یەوە پەیدا بن، هەڵی‌کێشن بۆ ئاسمانێ و بی‌بەنە لای خۆیان و حەوت ساڵحان...

زولفۆ بزەیەکی هاتێ و گوتی:

ـ جا ئەوە تاوانی خۆمان بوو. بۆچما هەر ئێمە نەبووین مەسەلەی مۆری پیرۆزی سەر مەلاشووی ئەسپەکەمان دروست کرد؟

مورتەزاغا تووڕە بوو:

ـ ئەوە دەڵێی چی؟ یانی ئێمە بە دەستی خۆمان مۆرەکەمان بە مەلاشووی ئەسپەکەیەوە نا؟ بە ڕاستی پێتوایە ئەوە درۆ بوو و هەر بۆخۆمان سازمان کردبوو؟

ـ ئەیچۆن! بۆخۆمان ئەو بەزمەمان دروست کرد و داستانی مۆرەکەمان بڵاو کردەوە! وا نەبوو؟ ئەدی ئەگەر ئێمە نەبووین، کێ بوو سێهەزار لیری خەلات بۆ گرتنەوە و هێنانی ئەسپەکەی دیاری کرد؟ ئەتۆ بێنی پوولێکی ئاوا زۆر بکەیە خەلات بۆ ئەوەی ئەسپێکی پیرۆزی سیحراویت بۆ بێنن و دوایەش لە جیاتیی وی قۆتڕێکی کەلاك بەری، بەو بەزم و هەڵلایەی گوللەبارانی بکەی، دەبێ چاوەڕوانی وەش بی کە ئەو ئەسپە بە دوعا و نزا زیندووش بکرێتەوە و..

ـ ئەها، وەڵڵا بابە تەواوە... جا بۆ ناڵێی ئێمە هەر بۆخۆشمان ئەسپەکەمان زیندوو کردەوە؟

هێندەی نەمابوو مورتەزاغا و زولفۆبەگ پێکهەڵبرژێن، ڕوستەم بەگی پیرە مامۆستا گەیشتێ و نێوبژیوانیی کردن:

ـ بەگەکانم، ئاغاکانم، ئێوە هاورێی دێرینی یەکترن. سوود و زیانتان بە یەکەوە گرێ دراوە و هەر ئێوە بۆخۆشتان دەبێ پشتی یەکتر بگرن، کە وا بوو چۆن دەبێ ئاوا لە یەکتر تووڕە بن و کێشەی بکەن؟ ڕاستی‌یەکەی ئەوەیە هەموومان دڵناسک بووین، لە مەسەلەی ئەو ئەسپە دا هیچمان تاوانبار نین. گرفتەکە ئەوەیە کە ئێمە هەمیشە لە جیاتیی ئەوەی لوولەی چەکەکانمان دە لای دوژمنی کەین، هەمیشە دە لای خۆمان کردوە. ئەگەر وا نەبا، حەمەدۆك هەر لە بناغە ڕا نەدەبوو! بەڵام ئێمە قەت ئەوەندەی پێویستە بیرمان لە حاڵی خۆمان نەکردۆتەوە، بیرمان لە کۆمەڵ و ئەو یاساو ڕێوشوێنانەش نەکردۆتەوە، کە بناغەی ژیانی کۆمەڵی ئێمەیان لە سەر دامەزراوە و هەمانن. لە دەهەزار ساڵ، یان سەدهەزار ساڵ پێش ئێستاوە، مۆر و نیشانەی پیرۆزی لە چەشنی مۆرەکەی ئەسپی حەمەدۆکی، هەر هەبوونە. ئەسپەکانی ئاشیل، ئەسکەندەری گەورە، حەزرەتی محەممەد، حەزرەتی عەلی و کوێرۆغڵیش لەو نیشانانەیان پێوە بووە. ئەگەر حەزرەتی عیساش ئەسپی بوایە، بێ‌گومان خەڵك ئەو نیشانە ڕووناکەیان لە سەر شەویلکەی ئەو ئەسپەش دەدی! لە بیرتان نەچێ بەگەکانم، ئەسپی ئاشیلیش کە شەش یان حەوتهەزار ساڵ پێش مێژوو و ژماردنی ساڵەکان هەبووە و ئاشیل لەشەڕی ترۆیای دا سواری بووە، هەر ئەو نیشانەیەی دە زاری دا بینراوە. کەلاوەکانی ئەو قەڵایەی ئێستاش لە نێزیك داردانێلی هەر ماون. کە وا بوو نابێ بڵێین ئەوە هەر دەنگۆ بووە و ئێمە دروستمان کردوە! دەبێ ئیدی لە گەڵ یەکتریش تەبا و هاودەنگ بین... ئێستا کە حەمەدۆك بە سەر گوندی عارف سایم بەگی داداوە، خزمەتێکی گەورەی بە ئێمە کردوە! شتێکی گرینگتر ئەوەیە کە بابی ئەو کاربەدەستە گەورەیەشی ڕووت کردوە و سەعاتە تایبەتی‌یە گرانبایی‌یەکەی لە بەرۆکی پچڕیوە. جا لە وەی باشتر دەبێ؟ بەڵێ حەمەدۆك بە سەر شارەکەشمانی داداوە، بەڵام ئەوە شتێکی زۆر گرینگ نیە، چونکە ئەم شارە زۆر جار کەوتۆتە بەر هێرشی یاغی‌یان و ئەوە یەکەم جاری نیە! خۆ بۆخۆتان دەزانن کە زۆر ئاغا و بەگی گەورەمان لە نێوەڕاستی ئەم شارە کوژراون، بەڵام بارودۆخەکە گۆڕانێکی ئەوتۆی بە سەر دا نەهاتوە! بردنی ئەو سەعاتە تایبەتی و بە نرخەی لە هەمووی وانە گرینگترە... ئێمە دەبێ هەموومان منەتباری حەمەدی دوژمنی گەورەمان بین کە ئەو کارەی کردوە. سەبارەت بە دایە سوڵتانیش دەبێ بڵێم مەترسیی وی لە دزینی سەعاتێکی ئەوتۆ زۆر گەورەترە. مریدەکانی وی ڕوو دە چەتەگەری‌یە دەکەن و کۆمەڵ کۆمەڵ دەبنە حەمەدۆك. بەڵکوو ئێمە بتوانین لەو نوختەیە کەڵك وەرگرین... بریا بۆمان کرابا عارف سایم بەگی لەو بارەوە تێ‌بگەیەنین... ئەویش وەك ئێمە دەبێ لەو بوارە دا شارەزا بێ. ئاخر بابی جارچی بووە و هەربۆیەش بێ‌گومان وەك ئێمە لە مەسەلەی ڕاپەڕین، چەتەگەری، شێخ و مریدان و شتی وا حاڵی‌یە. ئێستا ئێمە دەبێ بیر لە وە بکەینەوە کە کاتێك لە گەڵی دادەنیشین، چۆنی لە گەڵ بدوێین، چۆن داخ و ڕقی لە دەروونی دا ببزوێنین و بە چ لایەك دا هانی بدەین. ئەوەشتان لە بیر نەچێ کە عارف سایم بەگ بە هیچ شێوەیەك،

تەنانەت ئەگەر گرانیشی لە سەر بکەوێ، نایەڵێ ئەنکەرە بەو حەیسوبەیسەی ئێرە بزانێ، چونکە ئەگەر پێتەخت لەو مەسەلانە ئاگادار بێ، خراپی بە سەر دا دەشکێتەوە. ئەو ئەزموونی پێشتری لەو بارەوە هەیە. بە بڕوای من ئێمە دەبێ بیترسێنین. وای لێبکەین لە گیانی خۆشی بترسێ...

ــ قسەکەت ڕاستە. دەبێ وا بکەین.

ــ بەڵام لەوانەشە ئەگەر لە خۆی بترسێ، ئیدی پێی دەو شارەی نەنێتەوە!

ــ وای لێبێ، ئیدی ئێمە حاڵمان شڕ دەبێ...

زولفۆ لە جێی خۆی ڕاست بۆوە و لە حاڵێك دا لە سەر پانیان ڕادەژا، گوتی:

ــ خەمتان نەبێ، ئەمن عارف سایم بەگی چاك دەناسم. هەر ببزوێ، دەزانم چی بە دڵی دا دێ. ئەو هەمیشە لە کورتیی دەبڕێتەوە، ڕاست دەچێتە سەر باسی سەرەکی و بەو شێوەیە ترس دەوەستێنێ. گومانم لەوە دانیە کە ئێمە دەتوانین ترسی ڕێبخەین. پێشم وایە هەتا بۆخۆی هەست بە مەترسی نەکا، ئەگەر تەواوی دنیاش وێران بێ، مووی لێنابزوێ!

ــ ئەوەمان لە بیر نەچێ، حەمەدۆك سەعاتە بە نرخەکەی، کە دیاریی مستەفا کەماڵی بووە، لە بابی ویی ئەستاندوە و بێگومان داویشیەتی بە بایرامۆغڵی، کە پێی وا بووە تەنیا کەسێکە ئەو خەڵاتەی لێدەوەشێتەوە!

ــ بەڵێ، گومان لە وە دا نیە کە بردنی ئەو سەعاتەی زۆر لە دڵ گران هاتوە و پێیوایە بێڕێزییەکی گەورەی پێکراوە.

ــ ئەها، دەبێ ئێمە ڕاست لە سەر ئەو نوختەیە پێداگرین. ئەوە کارتی هەرە باشی ئێمەیە و دەبێ بە وەخت لە عەرزی دەین.

زولفۆ گوتی:

ــ ئێوە ڕاست دەکەن، وەك گوتم ئەمن زۆر چاکی دەناسم! زۆر خۆی پێ گەورەیە! پێیوایە خودایەکە و لە سەر عەرزییە! دیارە ئەوەی قەت پێ قبووڵ ناکرێ کە یەکێك پەیدا بێ، دەسەڵاتی وی بە هێند نەگرێ و خۆی لە وی پێ باشتر و باڵادەستتر بێ.

بەو شێوەیە چەند ڕۆژێك ئەوان هەر بە دەوری یەکەوە بوون، بیریان دەکردەوە و لێکیان دەداوە کە چۆن هەڵسوکەوت لە گەڵ عارف سایم بەگی بکەن و چۆنی هان دەن و بیترسێنن کە باشتر ئەوان بە مەبەست بگەیەنێ. هەموو لە سەر ئەو باوەڕە بوون کە نابێ هیچ ڕێگایەك، یان کەرەسەیەك، بۆ گەیشتن بەو مەبەستە پشت گوێ بخەن.

مورتەزاغا گوتی:

ـ مێشێك بە تەنێ ئەوەندە پیس نیە، بەڵام بێزی پیاوی هەڵدەستێنێ. ئێمە دەبێ پیش بەو شتە بگرین...

ڕۆستەم بەگی کۆنە مامۆستا گوتی:

ـ حەمەدۆك مێشێکی بچکۆلە نیە، بەلکوو پڵینگێکە ئێمەی لە نێو چڕنووکی خۆی دا ڕاگرتوە، باهۆزێکە هەڕەشە لە ئایندەی نیشتمانەکەمان دەکا.

خەلیل بەگی گەورە لێرە دا وە قسە هات و کۆتایی بە باسەکەش هێنا:

ـ بەو حاڵەش ئێمە نابێ بستە هەتیوێکی بوودەڵەی چەتە هێندە گەورە بکەینەوە.

ئەوێڕۆژێ مورتەزاغا زۆری قسە نەکرد. هەر دە بیری عەلی‌یە شەلی دا بوو. ئاخر ئەو شەوەی عەلی لە لای وی و حوسنی خانمێ دەستی بە قورئانێ دادابوو کە حەمەدۆك ئیدی وازی لە چەتەیی‌یە هێناوە و شاخی بەجێ‌هێشتوە، بەڵام ئێستا دەرکەوتبوو کە وەکیل باشی عاسم و پیاوەکانی بە چاوی خۆیان حەمەدۆکیان لە شەڕی دا و لە شاخی دیبوو. باشە چ باسە؟ ئەو شەلە نەگبەتە چۆنی ئەو مەسەلەیە بۆ لێکداوەتەوە؟ مورتەزاغا تا دەرفەتی وەگیر کەوت کە هاوڕێکانی بەجێ‌بێڵێ، وەخت بوو لە عەیبەتان دڵی بتۆقێ. ئیدی دوای قسەکانی خەلیل بەگی بە پەلە هاتە دەر و وەدووی پێوشوێنی عەلی کەوت...

# (١٨)

وەڵڵاهی لێت توورەم، عەلی گیان! باشە ئەوە چ بوو ئەتۆ لە گەڵت کردین، بە قوربانت بم! ئاخر ئەمن چەندت لە بەر پاڕامەوە! حەمەدی منت بۆ ناردەوە شاخی؟ هەر ئەتۆ نەبووی تەرمی خۆت لە سەر وشتریٚ دابەست و بۆخۆشت وشترەکەت لیٚخوڕی، عەلی گیان؟ بۆچما هێز و دەسەڵاتی تۆ سنووری بۆ دادەنریٚ؟ یان دەتەویست فریومان دەی، عەلی گیان؟ باشە ئەتۆ کە ئەو شێرە دوو سەرە، واتە زولفەقارت هەیە، تۆ کە دولدولسواری، تۆ کە یاری نێزیکی پێغەمبەری خوای، پێمبڵیٚ بزانم بۆ دەبیٚ ئێمە تووشی ئەو هەموو ڕەنج و کوێرەوەرییە ببین؟ عەلی گیان، خۆ دەزانم لە تۆ زیرەکتر و زۆرزانتر هەر نیە! دەو دنیایەی دا کەس هەیە بتوانیٚ تابووتێکی بە تەرمی خۆیەوە لە سەر پشتی وشتریٚ دابەستیٚ و هەر بۆخۆشی وشترەکەی لیٚخوڕیٚ؟ پێمبڵیٚ وا هەبووە بۆخۆت جارێکی ئەو پرسیارەی لە خۆت بکەی؟ ئاخر یان تابووتەکە بەتاڵە و کەسی تیٚدا نیە، یان یەکی دی وشترەکەی لیٚدەخوڕیٚ! ئەوجار بڵێی ئەو پیاوە کورتەبالاٚ بڕۆبڕە سمێڵدرێژ و بادراوە کە شەکەت و کەلەلا بە ڕێگایە دا دەڕوا، پیاو دەڵیٚ ئێستا نا ئێستا سەرەنگریٚ دەبیٚ و دەکەویٚ، ئەتۆ بی؟ ئاخر یان ئەتۆ حەزرەتی عەلی نی، یان وێنەگەرەکە وێنەکەتی خراپ کێشاوەتەوە... دەزانی ئەمن بەردەوام لێتپاڕاومەوە و هەزار جارم پەنا بۆ هێناوی کە ئاگات لە حەمەدی من بیٚ و لە بەلاٚ و کوێرەوەرییان بیپارێزە. ئەگەر ئەتۆ بە ڕاستی ئیمامی عەلی بوایەی، ئەمنت ناهومێد نەدەکرد و وەلاٚمت دەدامەوە! باشە عەلی گیان ئەگەر ئەتۆ بە ڕاستی عەلیش بی، لەمەودوا چۆن دەتوانی چاو لە چاوم کەی؟ ئاخر بڕوانە، بزانە حەمەدی من چۆن ئەو خانووەی ڕێکوپێک کردوە، چۆنی ڕازاندۆتەوە و وێنەی تۆشی چەند بە ڕێزەوە لەو جێگا پاك و خاوێنەی هەڵواسیوە. دەزانی بۆچی وای کردوە؟ چونکە باوەڕی بە تۆیە و تۆی لە لا گەورەیە. ئەو جار دەزانی زۆری پیٚناچی حەمەد دەبێتە باوکی منداڵێکیش. باشە دڵت بەو منداڵەی ناسووتیٚ؟ چۆن دەبیٚ ئەتۆ ئاوا بیٚبەزەیی بی؟ بە قوربانت بم،عەلی، قارەمانی گەورە! لە دڵی خۆمان دا تەختێکمان بۆ تۆ ساز کردوە، کردوومانیە شا و

پێمانگوتووی شاعەلی، ناومان ناوی شێری خودای. دەی چۆن دەبێ بێڵی ئێمە تووشی ئەو هەموو بەڵا و چەرمەسەرییەی بین، عەلی گیان؟ لەوانەیە ئەوەندەشت دەرەتان و دەسەڵات نەبێ، کە ئەو داوایانەی ئێمە قبووڵ بکەی! چووزانم، لەوانەشە هەر بە ڕاستی مردبی... ڕەنگە قەت ئەتۆ ئەو وشترەت لێ تەخوڕیبێ و قەتیش تەرمەکەت دە نێو ئەو تابووتەی دا نەبووبێ... دەی ئەگەر وابێ، بۆچی جار بە جار خۆ دە کاری ئێمە هەڵدەقوتێنی و ئەو هەموو خەمەمان تووش دەکەی؟ هومێدبەخشین پیرۆز و باشە، بەڵام ئەگەر کابرا توانای نەبوو ئەو هومێدە بە ئاکام بگەیەنێ، ئەوە خراپە. هیوابڕاوبوونیش لە مردنێ خراپترە عەلی گیان! مرۆڤ هەر دەمرێ و چارەنووسی لەوە زیاتر نیە، بەڵام ئەگەر هیوا نەبوو، ژیانیش مانای نیە. ئەتۆ بۆ ئێمەت هیوابڕاو کرد؟ ئەتۆ کە ئیمامی، نابێ بەزەییت بە ئێمە دا بێ، عەلی گیان؟ ئەدەکرا ئەو شاکیر بەگە بێدینە ـ ڕەبی دە قەبریش دا نەحەسێتەوە ـ لە سەر ڕێی حەمەدۆکی قوت نەبووبایەوە؟ باشە ئەگەر حەمەدۆك ئەو کابرایەی نەکوشتبایە، ئەدی کێ تۆڵەی مامۆستا زەکی، کە سێ هەتیوی لە پاش بەجێ ماوە، کردبایەوە؟ کێ مافی ئەو هەموو خەڵکە هەژارەی لە وی ئەستاندبایەوە؟ دەتوانی وەڵامم بدەیەوە؟ حەمەد بە پێی ڕێوشوێنی هەر چوار کتێبە پیرۆزەکان ئەو جینایەتکارەی کوشت و بە ڕاستیس چاکی کرد. ئەو ئەرکی خۆی بەرێوە برد. ئەمنیش، ئەمنی پیرێژن، لە سەر گۆڕی ئەو ستەمکارەی، کە هەر ڕۆژی هەوەڵێ پڕ بووە لە مار و دووپشك، سەمایە دەکەم. بەڵێ بە دەنگی دەهۆڵ و زوڕنای سەمایە دەکەم، با هەر کەس دەهێنێ پێی سەیر بم و پێم پێبکەنێ! نا ئیدی کارم پێت نیە. لێت تووڕەم! ئیدی بە ڕێی خۆم دا دەڕۆم و چیدی چاو لەو ڕوخسارە گرژەت ناکەم. چاو نێوچاوانت چۆن تێکناوە! ڕەنگە ڕوخسارت لە ڕاستی دا ئاوا گرژیش نەبێ، بەڵام ئیدی ئەمن تا هەم، قەت هاوارت ناکەمێ. قەت نالێم هاوار خاوەنی شیری دووسەر و تا لە سەر ئەو دنیایەش مابم نامەوێ چاوم پێت بکەوێتەوە! بۆتۆ ئاوا باشە! کەسێك خەڵکی هیوابڕاو کا، دەبێ هەر وای بەسەر بێ! عەلی گیان، خاوەنی شمشیری دووسەر، ئیمامی گەورە، ئەمن چیدی خۆم پێڕاناگیرێ و لێرە دەڕۆم! دوای ئەوەی تۆ یارمەتی حەمەدیت نەکرد، کە لە ماڵی خۆی دامەزرێ و لێتگەڕا بڕواتەوە شاخی، ئیدی من ناتوانم لە ماڵی وی بمێنمەوە. دەڕۆم و قەتیش نایەمەوە چاو لەو ڕوخسارە تووڕە و گرژەی تۆ بکەمەوە! عەلی، ئەتۆ وەك پێویستە گوێ نادەیە ماف و بایەخی ئینسانەکان و هیوابڕاویان دەکەی! هەر خوای گەورە بۆخۆی دەزانێ تا ئێستا چەندی دیکەی وەك ئێمەت ناهۆمێد کردوە و لێتگەڕاون لە ئێمە خراپتر تووشی ڕەنج و کوێرەوەری بن! دیارە حەقیشە وایان لێ بێ، ئەو گەمژانە ئەگەر پشتیان بە تۆ نەبەستبا و هومێدیان بە تۆ نەبوایە، وایان لێ نەدەهات!

دایە حۆری هەرای کرد:

ــ ئەرێ سەیران، کچم، پێمایە ئەتۆ دەسماڵێکی ڕەشت هەبوو، لە وانەی خەڵك بۆ شین و تازیەی بە سەرخۆیانی دادەدەن!

ـ بەڵێ دایە گیان، هەمە...

ـ بۆمی بێنە...

سەیران سندووقە دارگوێزەکەی کردەوە، دەسماڵەکەی دەرێنا و بۆی برد. لەو بەینەی دا هەر بیری دەکردەوە کە دایە حۆری دەبێ ئەو دەسماڵەی بۆ چ بێ، بلێی هەواڵێکی ناخۆشی نەبیستبێ؟

ـ ئەو کورسی‌یەی بێنە و بچۆ سەری...

پاشان دەستی بۆ وێنەی عەلی ڕاداشت و گوتی:

ـ ئەو دەسماڵەی بە سەر ئەو وێنەیەی دابدە. چی دی پێم‌خۆش نیە ڕوخساری ئەو پیاوە دلڕەقەی ببینم.

سەیران داواکەی جێبەجێ کرد و پاش ئەوەی وێنەکە بە دەسماڵەکەی داپۆشرا، دایە حۆری لە بەرامبەری ڕاوەستا و گوتی:

ـ کاتێك خەڵك بەهێند نەگیرێن، هیوابڕاو بکرێن و کاتێك پیاو خەڵکی تووشی کوێرەوەری و نارەحەتی‌یە بکا، بارودۆخەکە ئاوای لێ‌دێ. بەڵێ، ئەو کاتی ئێمە هەموومان دەبێ چارشێوی ڕەش بە خۆمان دادەین!

پاشان پشتی دە وێنەکەی کرد، چوو بۆ لای دەرگا و بە سرتە، بە شێوەیەك کە ئیمام گوێی لێ‌نەبێ، بە سەیرانی گوت:

ـ کچم، وەرە با بچینە حەسارێ. هێندێك شت هەن دەبێ باسیان بکەین...

لە پلیکانان چوونە خوارێ. دایە حۆری سەیرانی بردە قولینچکی هەرە سەرووی باغچەکە، زاری بردە بن گوێی و دیسان بە سرتە پێی‌گوت:

ـ ئەمن لە گەڵ عەلی بە کێشە هاتووم و ڕاست و ڕەوان هێندێك قسەم پێ‌گوتوە، بەڵام هەرچۆنێك بێ، ئەو هەر نیمامی خۆمانە... هێندێك شت هەبوون دەبوو پێکەوە باسیان بکەین، بەڵام ئیدی نابێ دڵی بێشێنین. بۆمان نیە لێی‌تووڕە بین. لە وانەیە ئەویش لەو بارەیەوە هیچی لە دەست نەهاتبێ ئیدی. وشیار بە ڕێز و حورمەتی بپارێزی...

ـ وا دەکەم، دایە...

ـ هەوڵ بدە نارەحەتی نەکەی.

ـ بە سەر چاو دایە.

ـ ئەگەر ئەمن ڕۆیشتم...

ـ بۆچما بە تەمای بچیە کوێ، دایە؟

ـ دەچمەوە کێوپارەی، بۆ لای حەمەدۆکی خۆم.

ـ ئەدی ئێمە لێرە بێتۆ چ بکەین؟

ـ ئێوە پێویستتان بە من نابێ. بۆخۆت لە گەڵ خێزانی مامۆستا زەکی بمێنەوە و ژیانی خۆت بکە. ئەو ژنە زۆر ژنی چاکە. بە قەد وەکیلێکی دەزانێ. وەك ڕەوەزان قورس و قایمە و وەك حەمەدۆکی بەهێز و ئازایە. لێرە ژیانێکی خۆش و هێمنتان بە یەکەوە دەبێ. دانیشن و منداڵی خۆتان بەخێو کەن. مەلا سەلام باغێکی میوەتان بۆ دەکڕێ. دەزانم، حەمەد کاتی ڕۆیشتنێ کیسەیەکی پڕ لە سکەی زێڕی داوەتێ و ئیدی خەمی پووڵێتان نابێ.

ـ دایە حۆری، بە قوربانت بم، ئاخر چۆنم بە تەنێ لێرە بەجێدێڵی؟

ـ کچم، ئەمن بڕیاری خۆم داوە و بشمەبەستی‌یەوە لێرە بەند نابم. حەمەدی من بە تەنێ لە وێ دەبێتە خۆراکی گورگ و قەل و داڵان! ڕۆڵە نازدارەکەی من، ئەگەر دایە حۆریی خۆی لە لای نەبێ یارمەتیی بدا و پشتی بگری، لە وێ، بە تەنێ، لە نێو ئەو هەموو یاغی، جەردە، ژاندەرمە و دز و پیاوخۆرانە، چۆن دەردەبا؟

پاشان سەری بردە بن گوێی سەیرانێ و گوتی:

ـ گوێم لێ بگرە! حەمەدۆکی من، کوڕە خۆشەویستەکەی من کە لە نێو پیاوان دا تاقە، سمێڵی زۆر جوان دەبێ. بابیشی و خزمەکانیشی وا بوون. هەر بە تایفە سمێڵیان جوانن، بەڵام ئەو هێشتا منداڵە! باشە تا ئێستا کەست دیوە بڵێ حەمەدی ئێمە وەك حەمەدۆکی بە نێوبانگ دەچێ؟

سەیران بە خۆی نەبوو لە قاقای پێکەنینێی دا و دایە حۆریش بە وەی توورە بوو و قیژاندی.

ـ بۆ پێمپێدەکەنی سەلێتە؟ پێتوایە ئەمن ئیدی قەت حەمەدی نابینمەوە؟ وەڵلاهی دەبێ بۆ حەمەدی بگێڕمەوە و بڵێم پێمپێکەنیوی! ئەوە لە کەنگێوە وات لێهاتوە بە دایە حۆری پێ‌بکەنی؟

سەیران بە دەستی دانووسا و گوتی:

ـ دایە گیان جا چۆن ئەمن بە تۆ پێ‌دەکەنم؟ بە خودای بە تۆ پێ‌نەکەنیوم!

تاوێکی باش دەستەوداوێنی بوو و لە بەری پاڕایەوە هەتا دایە حۆری هێمن بۆوە:

ـ جا ئەگەر وایە هەستە ساز بە، دەچین سەرێکی مامۆستای وینەگەر دەدەین. ئەدی نەجلە لە کوێیە؟ دەبێ ئەویش لە گەڵمان بێ، ئەمن زۆرم باوەڕ بەو ژنەیە، چونکە ژنێکی ئازایە. دیارە هێندێك بە قسەیە، بەڵام ئەگەر ئەو لێرە نەبوایە، قەتم بەتەنێ، لەو غەریبایەتی‌یەی بەجێ نەدەهێشتی.

فایتوونچی‌یەکیان جیران بوو. موسلیم پێش ئەوان، چوو کابرای بە فایتوونەوە هێنا و لە بەر دەرکێ چاوەڕوانیان بوو. ژنەکان سواری فایتوونی بوون. دایە حۆری کراسێکی ئاوریشمی جوانی دە بەر کردبوو. حەمەد ئەو کراسەی بە دیاری بۆ هێنابوو. هەروەها لاقی پڕ بوو لە پاوانە و خڕخاڵ، خەزێمێکی مرواریی دە کەپۆی کردبوو، دەسماڵێکی سپیی بە

سەری دادابوو و پشتێندێکی شاڵی یەکجار جوانی لە پشتێ بەستبوو. دەتگوت دەچێتە سەر داوەتێ...

فایتوونەکە لە بەر دەرگای کارگەی مامۆستای وێنەگەر ڕاوەستا. مامۆستا بە پیریانەوە هات، بە خۆشحاڵی‌یەکی زۆرەوە بەخێرهاتنی کردن، باسکی دایە حۆری گرت و لە دابەزینێ دا یارمەتی کرد. ئەوە دایە حۆریی زۆر خۆشحاڵ کرد و هەستی بە سەربەرزی کرد. بە یەکەوە چوونە ژوورێ و مامۆستا لە سەر مۆبلێکی دایەنیشاند. کوڕێکی شاگرد قاوەچی لە قاوەخانەکەی تەنیشتیانەوە قاوەی بۆ هێنان. دایە حۆری لە حاڵێك دا چاوی بڕیبووە نێو فینجانەکەی، بە ئیشتیاوە قاوەکەی خواردەوە. پاشان چاوە زیندووە گەشەکانی دە مامۆستای بڕی:

ـ ئەرێ سەبارەت بە وێنەکەی عەلی... ئەوە بە ڕاستی وێنەی وییە؟

ـ بەڵێ وێنەی وییە...

دایە حۆری چاوێکی لێکرد، بزەیەکی هاتێ و بە شێوەیەکی وشیارانە گوتی:

ـ یانی ئەتۆ کاتێك ئەو وێنەیەت دەکێشایەوە، عەلیت دەدی؟

ـ نا، نا، ئەمن قەت ئەوم نەدیوە!

دایە حۆری پێکەنی:

ـ باشە، ئەگەر قەتت نەدیوە، چۆنت وێنەکەی کێشاوەتەوە؟

ـ دیارە ئەمن قەتم ئەو نەدیتوە و وێنەکەیم لە ڕووی ئەو وێنە کۆنانەی لە زووەوە هەبوون، کێشاوەتەوە. ئەو وێنانەش ئی ئەو وێنەگەرانەن کە لە سەردەمی کۆن دا ژیاون، جا ئەوان یان بە ڕاستی حەزرەتی عەلی‌یان دیتوە و وێنەکەیان کێشاوەتەوە، یان ئەگەر قەتیشیان چاو پێی‌نەکەوتبێ، لە ڕووی هێندێك نیشانەوە کە بیستوویانە و لە بیری خۆیان دا کۆیان کردوونەوە، وێنەکەیان کێشاوەتەوە. لە بناغە دا کاری ئێمە هەر ئاوایە.

ـ ئەها... پێموایە ئێستا تێگەیشتووم. ئێوە نەخشان لێکتر هەڵدەگرنەوە، ڕاست وەك ئێمە، کە کاتێك بەڕەی دەکەین، یان لبادی دەگێڕین، نەخش و شێوەکان لە یەکتر وەردەگرین.

ـ دەکرێ بڵێم، بەڵێ، هەر شتێکی ئاوایە...

دایە حۆری ڕووی بۆ لای سەیرانێ وەرگێڕا. ئێستا ئەو بە تەواوی دە مەسەلەی وێنەکەی گەیشتبوو: ئەو وێنەیە لە ڕووی وێنەیەکی کێشراوەتەوە، کە ئەویش لە وێنەیەکی دیکەی پێش خۆی هەڵگیراوەتەوە. کە وا بوو حەزرەتی عەلیی ڕاستی، ئەوی بەناوبانگی دولدولسوار هیچ گلەیی‌یەکی لە سەر نەبوو و هەر بۆیەش ئێستا حۆری زۆر لەوە پەشیمان بوو کە لە خۆڕا ئەو

هەمووەی بە سەر ڕۆیشتوە و گلەیی و گازەندەی لێیبووە. بەڵام ئێستا وەختی شتێکیدیکە بوو، ڕەنگ بوو دەرفەتی وای بۆ هەڵنەکەوێتەوە:

ـ مامۆستا، داوایەکم لێت هەیە. هەرچەندی بتەوێ دەتدەمێ. پووڵم زۆرە. قەتم داوای پووڵی لێ نەکردبوو، بەڵام حەمەد کاتێك دەڕۆیی پووڵێکی زۆری دامێ...

ـ پووڵ و حەقدەستم بۆ گرینگ نیە و ئەگەر داوایەکیشت هەیە لە سەر چاومی دادەنێم، دایە حۆری!

ـ دەمەوێ وێنەی ئەسپێکیم بۆ بکێشیەوە، ئەسپی حەمەدۆکی. بۆخۆت دەزانی ئیدی...

ـ چۆنی پێت خۆش بێ، وای دەکێشمەوە.

ـ ئەسپەکە بە ئاسمانێوە دەفڕێ. سەری سمەکانی هەورێکی سپی دەنگێون.

ـ بە سەر چاو.

ـ باشە، خۆ وێنەی ئەو ئەسپەت نیە، هەتا لە ڕووی بکێشیەوە!

ـ نەخێر، نیمە.

ـ ئەدی لە ڕووی چیی دەکێشییەوە؟

ـ لە ڕووی ئەو نیشانانەی بیستوومن و دە مێشکم دا ڕامگرتوون.

ـ دەبێ لە کاتێك دا بێ، کە دەحیلێنێ. دەبێ سەری بۆ ئاسمانێ بەرز کردبێتەوە و کونەلووتی ئاواڵە بن.

ـ بەڵێ، دەبێ بحیلێنێ و...

ـ دەبێ هەر لەو کاتە دا کە ئەسپەکە دەفڕێ، حەمەدی منی سوار کەی!

ـ بەڵێ، بێگومان.

ـ نێوچاوانی ئەسپەکەی دەبێ زەردێکی زێڕین بێ، لە ڕەنگی یەخە بریقەدارەکەی مستەفا کەماڵ پاشای. چەند چوارگۆشەی زێڕین و گەڵا بەڕوێکیش.

ـ ڕاست وای دەکێشمەوە.

ـ حەمەد کە سواری ئەسپەکەی بووە، دەبێ کاڕابینێکی بە شانییەوە بێ، ئاسنەکەی بترووسکێتەوە...

ـ بەڵێ، کارابینەکەشی دە شانی دا دەبێ.

ـ باشە قەتت بەو شێوەیەی دیتوە؟

ـ قەت.

ـ ئەدی چۆنی دەکێشییەوە؟

ـ دەیهێنمە نێو بیری خۆمەوە.

ـ ئەها...

دایە حۆری بە وردی بۆی باس کرد کە وێنەی حەمەدی دەبێ چۆن بێ. جلەکانی، سەربەرگە نێخە زەردە گوڵدۆزیکراوەکەی، خەنجەرە چەرکەسی‌یە دەسك زێوکفتەکەی و ڕەخت و فیشەکدانەکەی.

ـ ئەدی بە باشی ڕوخساریت وەبیر دێتەوە؟

ـ بەڵێ.

ـ دەتوانی وای بکێشی‌یەوە کە ڕاست وەك خۆی بچێ؟

ـ وای دەکێشمەوە بە موو لە گەڵ خۆی جیاوازیی نەبێ.

ـ کوڕی من هەمیشە بزەی دێتێ، قەت وەك عەلی ڕووگرژ نیە. دیتووتە کە پێ‌دەکەنێ؟

ـ ئەی‌چۆن؟

ـ لە دوورەوە گوێت لە پێکەنینی حەمەدی من دەبێ.

ـ وایە.

ـ بەڵام حەمەدی من نابێ زۆر پێ‌بکەنێ. دەبێ بزەی بێتێ، بزەیەکی سەربەرزانە، وەك شۆڕەسوارێکی قارەمان.

ـ بەڵێ، بزەی لە سەر لێوان دەبێ.

ـ سەرکڵاوەی لە سەر مەنێ! لێی جوان نیە، کڵاویش نا! چونکە ئەمن پێم‌وایە بە کڵاوەوە وەك ئەو عەلی‌یە شەلە ئەگبەتەی دەچێ. با سەری ڕووت بێ، کاکۆڵی بە شانە کرابێ و ڕژابێتە نێوچاوانی.

ـ زۆر باشە.

ـ کەنگێ وێنەکەم بۆ تەواو دەکەی؟

ـ هەر کاتێکی بڵێی... بەڵێن بێ شەو و ڕۆژ کاری لە سەر بکەم.

ـ خودا ڕاوەستاوت کا!

دایە حۆری هەستا سەر پێ و دەستی مامۆستای وێنەگەری ماچ کرد.

ـ شەرمەسارم مەکە حۆری خانم! ئەوە چ دەکەی؟

مامۆستا هەستی کرد دایە حۆری دەیەوێ شتێك بڵێ، بەڵام لە ڕووی هەڵنایە.

ـ هەر داوایەکی دیکەت لێم هەیە، بی‌ڵێ! دە ڕوو دا مەمێنە!

دایە حۆری وەك کچۆڵەیەکی مێرمنداڵ سوور هەڵگەڕا:

ـ وەڵڵاهی مامۆستا تووشی زەحمەتێکی زۆرم کردی.

ـ هیچ زەحمەتێکت تووش نەکردووم. هەر شتێکیشت دەوێ پێم بڵێ! بە دڵ پێمخۆشە کار بۆ تۆ بکەم و وێنەت بۆ بکێشمەوە.

ـ بە ڕاستی؟ یانی بۆت زەحمەت نیە؟ ئەگەر وایە وێنەیەکی دوڵدوڵی حەزرەتی عەلیشم بۆ بکێشەوە، بەڵام با بۆ خۆی دە گەڵ نەبێ، نە لە سەر زینی و نە لە پەنا دوڵدوڵیش. یانی هەر تێدا نەبێ!

ـ ئاخر چۆن دەبێ دوڵدوڵی تێدا بێ، بەڵام حەزرەتی عەلی تێدا نەبێ؟ شتی وا دەبێ؟

ـ بۆ نابێ؟ دەبێ. ئەو کاتی هەر وێنەی دوڵدوڵی دەبێ و هیچی دی! ئەگەر پێشت خۆشە، ئەو وێنەیەی حەزرەتی عەلیشم بۆ ئامادە بکە، کە بۆ خۆی وشترەکەی لێدەخوڕێ.

مامۆستا پێکەنی و گوتی:

ـ باشە دەی، قسەم نیە، چۆنی دەڵێی با وا بێ!

ـ وێنەیەکی ئەو ژنەشم دەوێ! ئەو ژنە، ئەتۆ بڵێ، ئەوەی لە هەموو ژنێکی سەر ئەو دنیایەی جوانترە. ئەوە کە بە ڕوخسار ژنێکی یەکجار جوانە و بە لەشیش هەژدیهایە. سوورەگوڵێکی گەورەشی لە پەنا بێ. با سەرپشتی پڕ بێ لە پووڵەکە.

ـ ئەو وێنەیە هەر لە بناغە دا بەو شێوەیە دەکێشرێتەوە کە ئەتۆ دەڵێی.

ـ باشە، پێموایە شێوەیەکی بڕێك جیاوازتری ئەو وێنەیەشت هەیە، وا نیە؟

ـ بەڵێ، وایە! یەکی زۆر جوانم هەیە، کە ڕاست لە بەر ئەسڵەکەی هەڵگێراوتەوە.

ـ پاشان وێنەیەکی بابە ئادەم و دایە حەواشم دەوێ.

ـ لە وی یەکی ئامادەم هەیە.

ـ بەڵام دەبێ لە وی وێنەیەکم بۆ ئامادە بکەی، کە ئەو گەڵایەیان بەو شوێنەیەوە نەبێ. ئەو گەڵایە ڕاست نیە، یانی ئەوان گەڵایان بە وێوە نەبووە!

مامۆستای وێنەگەر قامکەکانی دە نێو ڕدێنی ڕاکرد و لە کاتێك دا بیری دەکردەوە، گوتی:

ـ باشە بۆ ئەو گەڵایەیان پێوە نەبێ؟ چووزانی ڕاست نیە؟

ـ ئاخر دەزانم وا نیە. پێم بڵێ بزانم، ئەو کاتی چ لە بەهەشتێ و چ لە سەر عەرزی، بێجگە لە وان کەسی دیکەی لێبووە، هەتا شەرمی لێ بکەن؟ باشە ئەدی چ پێویستی کردوە ئەوان ئەو گەڵامێوە گەورە و پانەی بە وێوە بنێن؟

ـ ڕاست دەکەی، ئەمن قەت بیرم لەو بەشەی نەکردبۆوە.

ـ ئێستا تێگەیشتی؟ جا ئەگەر وابێ، کاتێك وێنەیەکی دیکەت لێ کێشانەوە، هێندە گێل نەبی بچی گەڵایەکی پانیان بە بەر موسوولڵدانی‌یەوە هەڵواسی!

ـ قەت شتی وا ناکەمەوە.

دایە حۆری وەرسوورِا، لە بەر پشتێندی کیسەیەکی دەرێنا، پاشان ڕووی دە وێنەگەرەکە کردەوە، کیسەکەی بۆ ڕاداشت و گوتی:

ـ ئەو کیسەیە پوولێکی زۆری تێدایە. چەندی هەڵدەگری، هەڵگرە! پێتخۆشە هەر هەمووی هەڵگرە! ئەمن بێپوولْ نابم، کورەکەم بۆم دەنێری.

مامۆستا کیسەکەی لێوەرگرت، کردیەوە، هێندێکی لە پوولەکەی دەرێنا، زاری کیسەکەی بەستەوە و دایەوە دەستی. دایە حۆری زانی هێندەی نەگێراوەتەوە، بەڵام وە سەر خۆی نەهێنا. لەو کاتە دا لە دڵی خۆی دا دەیگوت: بە ڕاستی مرۆڤێکی سەیرە، سوور دەزانێ خۆی فریو دەدا، بەڵام ئێستا زۆر شتم سەبارەت بە وێنەکەی عەلی بۆ دەرکەوت. ئێستا دەزانم ئەو وێنەیەی بە ئێمەی فرۆشتوە، وێنەی ڕاستی ئیمامی عەلی نیە و ئەو عەلی‌یە هەر فرێ بە سەر حەزرەتی عەلی‌یەوە نیە. هەر ئەو وێنە قەڵبەش بوو کە ماڵوێرانی کردین! جا ئەگەر وێنەی حەمەدیش وەك ئەو عەلی‌یە قەڵبەی بچێ، ئەوە ئەمن دەزانم و ئەو! دوور نیە حەمەد پێش ڕۆیشتنێ پوولی بۆ ویش بەجێهێشتبێ، کە هێندەی خاتر گرتین و پێشوازیی لێکردین.

ـ هەوڵ دەدەم بە زوویی وێنەکانت بۆ ئامادە کەم!

ـ ئەو وێنانە لە گەڵ خۆم دەبەمە شاخی، لە پێش دا نیشانی دایە سوڵتانیان دەدەم و دواتر با ئەوانی دیکەش بیانبینن...

پاشان بیری کردەوە: هەر خودا بۆ خۆی دەزانێ ئەگەر وەستای وێنەگەر بزانێ کە ئەو حەمەدەی ئەو وێنەکەی دەکێشێتەوە، هەر ئەو حەمەدۆکە بەناوبانگەیە کە خەڵك باسی دەکەن، چۆن کار لە سەر ئەو وێنەیە دەکا و چۆنی دەرازێنێتەوە!

فایتوونەکە هەر لە بەر دەرگا ڕاوەستابوو. مامۆستا تا لای فایتوونەکەیان لە گەڵ چوو و بەڕێی کردن. لەو ماوەیە دا کە دایە حۆری بێپسانەوە لە گەڵ وێنەگەرەکە دەدوا، نە موسلیم و نە دوو ژنە جحێڵەکان نەیانوێرا تەنانەت زار هەڵپچڕن و یەك قسەش بکەن.

کوژرانی شاکیر بەگی باس و هەرایەکی زۆری لە نێو شاری نایەوە. بەشێك دەیانگوت دەستی خۆش بێ کوشتی، زۆر بە جێ بوو. بەشێکی دیکەش دەیانگوت، باشە چۆن دەبێ هەتیوێکی بوودەڵە لە نێوەڕاستی شاری و لە پێش چاوی هەموو خەڵکی، بەو شێوەیەی شاکیر بەگی بکوژێ؟ دەوڵەت چ وەڵامێکی بۆ ئەو ڕووداوەی هەیە؟ بەشی زۆری خەڵکەکەی لایەنی حەمەد و مامۆستا زەکی‌یان دەگرت و بەشێکیش دەترسان. هەر بۆیەش بۆ وێنە ئەو سەپانانەی لە وێ مابوونەوە،

بەراتیان نەدرابۆیە و تا ئێستا هەر ئەمڕۆ و سبەینێیان پێ‌کرابوو، بە پەلە، هەر دەسبەجێ دوای کوژرانی شاکیر بەگی حەقەکەیان درا. نۆکەر و دەستوپێوەندەکانی شاکیر بەگی وستەیان نەهات، لە جێی خۆیان نەبزووتن، هیچ چەشنە دژکردەوەیەکیان نیشان نەدا و خۆیان دە ماڵ و منداڵی حەمەدی نەگەیاند. موسلیم مەتەریزێکی لە بەر دەرگایە دروست کردبوو، هەمیشە فیشەکی دە بەر لوولەی تفەنگێ دابوو و شەو و ڕۆژ دەو سەنگەرەی دا کێشکی دەکێشا. بەڵام هیچ نەقەوما. مەلا سەلام لە کۆنەوە ڕێز و خۆشەویستی‌یەکی زۆری لە نێو خەڵکی ئەو شار و ناوچەیە دا هەبوو و تەنانەت بەرەبەرە هاوکات لە گەڵ ڕووداوەکانی ئەو دوایی‌یانە، خۆشەویستتر و خاوەنرێزتریش ببوو. هەر ئەوەندە لە نێو بازاڕی وەدەرکەوتبا، دوکانداران یەکە یەکە لە دوکانەکانیان دەهاتنەدەر و زۆر بە گەرمی چاکوخۆشی‌یان لە گەڵ دەکرد...

بێجگە لە مامۆستای وێنەگەریش، هیچ کەس شکی وەی نەکرد کە ئەو حەمەدە مێرمنداڵەی شاکیر بەگی کوشت، هەر ئەو حەمەدۆکی یاغیی بەنێوبانگە. ئەو دەیزانی، بەڵام ئەو نەهێنی‌یەی دە دڵی خۆی دا ڕاگرت و قەت لە لای کەس نەیدرکاند. بەڵێنی دا بوو هیچ کەس ئەوەی لێ‌نەزانێ و ئەو ڕازەی لە گەڵ خۆی بەرێتە بن گڵێ.

هەر مامۆستای وێنەگەریش بوو هاتە سەر ئەو باوەڕە کە باغێکی پرتەقاڵی بۆ سەیرانێ بکڕێ. بۆخۆی بیری کردەوە: کابرای یاغی هەمیشە دە مەترسی دایە و درەنگ یان زوو گوللەیەك دەیپێکێ و دەکوژرێ، وا باشە ڕۆژێکی وا ئەو ژنە جوان و جحێڵە شتێکی هەبێ پێی بەڕێ بچێ و چاولەدەست نەبێ. چوو لەو بارەوە دە گەڵ مەلا سەلامی قسەی کرد، بەڵام بە هیچ شێوەیەك حەمەدۆکی تێکەڵی باسەکەی نەکرد.

دەوڵەت هێندێك باغی لەو دەوروبەرەی هەبوون کە دەیفرۆشتن و نرخیان زۆر گران نەبوو. لە نێو ئەو باغانە دا لە سەر یەکێ ساغ بوونەوە و وە هەوڵی کڕینی کەوتن. ڕووبەری باغەکەی شازدە دۆنم بوو و دارەکانی زۆر ساغ، جوان و بەهێز بوون. کەس نەیوێرا بە سەر سەوداکەیان هەڵوێستێ و زۆری پێ‌نەچوو سەیران قەباڵەی باغەکەی دە باغەڵێ دابوو.

مامۆستای وێنەگەر شەو و ڕۆژ بێ‌وچان کاری کرد و بە چەند ڕۆژان وێنەکانی بۆ دایە حۆری ئامادە کرد. بە تایبەت وێنەی حەمەدی دایە حۆریی شاگەشکە کرد:

ــ ئای خوایە! ماشەڵڵا! کچینە وەرن بڕوانن! مامۆستا مەلا سەلام! قەت شتی ئاوا جوانتان دیتوە؟ ئەوە حەمەدی منە بە سواری ئەسپەکەی بە ئاسمانێ دا دەفڕێ! بە نێو هەوران دا دەفڕێ! بە ڕاستی چاکی کێشاوەتەوە! هەر ڕاست حەمەدی کوڕمە!

دایە حۆری لە تەماشای وێنەکان تێر نەدەبوو. هەر لە وێ لە لایان ڕاوەستابوو، جار جار چاوی دەگوشین و دیسان تیٚیانەوە ڕادەما. هێندێك جار بە تاسەو خۆشەویستی‌یەوە چاوی لیٚدەکردن و جاری واش بوو لیٚیان تووڕە دەبوو و بۆڵەی لە سەر دەکردن. ماندووش نەدەبوو.

دوای چوار پێنج ڕۆژان چاوی لە وێنەکەی ئادەم و حەوای کرد. بە ڕاستی ئەو جار مامۆستا گەڵامێوە پانەکەی لابردبوو و هەموو لەشیان بە تەواوی دیار بوو. ئەندامی پیاوانەی بابە ئادەمی درێژ و مەیلەو سەوز بوو. دایە حۆری بە دیتنی ئەو دیمەنەی حەیران ما و لە دڵی خۆی دا گوتی، خوا بمانپارێزیٚ، چەندە دەترسم! ئەندامی ژنێتیی دایە حەواش جوان بوو و وەك گوڵەباغێکی تازەپشکووتو دەچوو. دایە حۆری ئەوەیانی پیٚ باشتر بوو و لەو کاتە دا بیری لە سەیرانیٚ کردەوە: ئەو ژنە وەك دایە حەوای جوانە، بەڵام ئەو جار ئەو بیٚتەنوایە بڵێی چ بکا و چۆن ژیان بەرێتە سەر. ئەو ژنێکی جوان و جحێڵە و تینووی خۆشەویستی‌یە، بەڵام مێردەکەی بەجێی‌هێشتوە و چۆتەوە چیاکانی خۆی...

کاتێکیش چاوی لە ژنە هەژدیهاکەش کرد، کە سەر پشتی بە پووڵەکەی زێڕین داپۆشرابوو، خێرا بانگی سەیرانیێ کرد و گوتی:

ــ وەرە ئەو دەسماڵە ڕەشەی لە سەر ئەو وێنەیەی لابەرە! ئەم وێنەیەی عەلی دەبیٚ وەك وی بچیٚ، ئەمەیان دەڵێم کە تازە کێشراوەتەوە، چونکە حەمەدی ڕاست وەك خۆی کێشاوەتەوە، دەبیٚ ئەوەشیان هەر وا بیٚ. ئەو عەلی‌یەی ژێر دەسماڵەکەی هەر هەناسەی نایە و چەند ڕۆژیشە دامانپۆشیوە... ئەو وێنەیەی عەلی، کە مامۆستا تازە بۆی کێشاومەوە، هەر وەك ئەوی پێشوو دەچیٚ، بەڵام دە وێنەکەی من دا ئیمام بزەی هاتۆتیٚ!

کاتێك سەیران دەسماڵەکەی لە سەر وێنەکەی کردوە، دایە حۆری لە کاتێك دا بزەی دەهاتیٚ، لە سەرەخۆ و بە شەرمەوە، وەك کیژۆڵەیەکی مێرمنداڵی زۆرزان ڕووی دە وێنەکەی کرد، پاڕایەوە و داوای لێبووردنی لە ئیمامی عەلی کرد.

چاوەکانی سەیرانیٚ پڕ ببوون لە فرمێسك:

ــ ئەریٚ دایە گیان، بە ڕاستی بە تەمای بەجێمان بێڵی؟

ــ بەڵیٚ کچم، ئەمن ئیدی دەبیٚ بڕۆم!

ــ ئاخر دایە ئەمن منداڵم دەبیٚ...

ــ ئەو منداڵە کاتێك لە دایك دەبیٚ، پێویستیی بە من نابیٚ... بە موسلیمی بڵیٚ ئەسپێکم بۆ ساز کا. بەیانی زوو، ئەو کاتەی زەردە لە سەران دەدا، دەڕۆم.

پاشان چاوێکی بە دەوروبەری خۆی دا گێڕا و دە دوڵدوڵی‌یەوە ڕاما کە سەری سووڕاندبوو و ئاوڕی دابۆوە دوای خۆی. نیشانەی ترسان لە چاوی دوڵدڵی دا دەبینرا. بە ڕاستیش ئەو هێسترە بێ ئیمامی عەلی ئەوەندە سەرنجڕاکێش نەبوو...

ــ سەیران، دەزانی ئەوەیان وێنەی دوڵدوڵی حەزرەتی عەلی‌یە. با هەر بێرەوە هەڵواسرێ و جوانت ئاگا لێی‌بێ.

ــ بە سەر چاو دایە حۆری...

لە ماوەیەك لە مەو پێشەوە دایە حۆری خەریکی خۆسازکردن بوو و شتی زۆر کڕیبوو. سەیران هەموو شتەکانی بۆ پێچایەوە، دە گۆنی و بوخچانی نان و ئامادەی کردن. نەجلە و مەلا سەلامیش هێندێك دیاری‌یان بۆ کڕیبوو. ئەوانیشیان پێچایەوە ئەو جار وێنەکانیان دە کاغەز و پەڕۆیانەوە پێچان، هەتا نەشکێن و ڕەنگیان نەشەمزێ و ئەوانیشیان دە بارەکە دا جێ کردەوە.

ــ دایە گیان، بڵێی ئەو هەموو شتانەت بۆ بچن؟

ــ دەچن، هەر نەبێ بە لاتەنیشتی ولاخەکەیانەوە هەڵدەواسم و...

لە پڕ دایە حۆری دڵی پڕ بوو، چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك، بەلام هەرچۆنێك بوو خۆی ڕاگرت و لە پرمەی گریانێی نەدا. پاشان لە بن لێویەوە لە سەرەخۆ گوتی:

ــ نازانم، کیژە جوانەکەم، نازانم.

## (١٩)

لە بەیانی‌یەوە ئاغا، بەگ و کاربەدەستە گەورەکانی شاری، لەو بەری پردێ ڕاوەستابوون، حەشیمەتێکی زۆری خەڵکی شاریش لە پشت وانەوە ڕیز ببوون. هەموویان بە پێشوازی عارف سایم بەگی‌یەوە هاتبوون و چاوەڕوانی هاتنی وی بوون. ڕاست پێش کاتی ناخواردنی نیوەڕۆیە، لە دوورەوە، تەپوتۆزێکی زۆر لە سەر ڕێگایە وەدیار کەوت و چەند کەسێك کە ئەرکی چاوەدیری‌یان پێ‌سپێردرابوو، بە پەلە هاتن و ئەو هەواڵە خۆشەیان بە حاکمی ڕاگەیاند. گەورەپیاوانی شاری کە لە لایەکەوە لەمێژ بوو چاوەڕوان مابوونەوە، ماندوو بوون و لە لایەکی دیکەشەوە دەترسان عارف سایم بەگ هەڵسوکەوتی ناخۆشیان لە گەڵ بکا، بە کەیف و دڵخۆش نەبوون. سەرەنجام ماشێنەکان لە نێو تەپوتۆزێ دا وەدیار کەوتن، زۆری پێ‌نەچوو گەیشتنە نێزیك پردێ و ئیدی بێ ئەوەی لە لای ئەو ئاغا و بەگانە و ئەو هەموو خەڵکەی لە بەیانی‌یەوە هاتبوون و لە وێ چاوەڕوان بوون، ڕاوەستن، ڕاست لێیان خوڕی بۆ نێو شاری. تەنانەت خەڵکەکە لە بەر تەپوتۆزێ کە شووشەی پێش ماشێنەکەی داگرتبوو، هەر دەموچاوی عارف سایم بەگیشیان بە تەواوی نەدی. بەڵام بەو حاڵەش هەستیان بەوە کرد کە نوێنەری گەورە نێوچاوانی تێك‌نابوو و ڕوخساری پارێزگاریش کە هەر لەگەڵ کاروانەکەی بوو، لە ئی وی ترش و تاڵتر بوو.

کاربەدەست و گەورەکان هەموو بە پەلە خۆیان بە شاری دا کردەوە و حەشیمەتەکەش بە دوایان دا هات. عارف سایم بەگ لە حەساری خەلیل بەگی گەورە دابەزیبوو و پارێزگار و سەرۆکی ژاندەرمەش کە لە گەڵ وی هاتبوون، ماشێنەکانیان هەر لە وێ ڕاگرتبوو. خێزانی خەلیل بەگی هەر چاوی بە ماشێنەکان کەوتبوو، بە پەلە غاری دابووە دەرێ و بە پیر میوانەکانی‌یەوە کە هەموو گیانیان تۆزاوی بوو، هاتبوو. پێش ئەوەی گەورەکانی شاری بگەنە

جێ، ئەوان تۆزیان لە خۆیان تەکاندبوو و دەموو چاویان شوتبوو. کە ئەوانیش گەیشتنە لای تازەهاتووەکان، بە ڕیز چوونە پێشێ، یەك بە یەك دەستیان دەدەستی نان و بەخێرهاتنیان کردن:

ــ بەخێر هاتن، بەخێر هاتن، سەر چاوانمان...

پارێزگار و سەرۆکی ژاندەرمەی وەڵامیان دانەوە و چاکوخۆشیيان لە گەڵ کردن، بەڵام عارف سایم بەگ یەك وشەشی بە زار دا نەهات. هەر وا بە نێوچاوانێکی پڕ لە گرێوگۆڵەوە چوو بێدەنگ لە جێی خۆی دانیشت.

پێشخزمەتان دەسبەجێ شەربەتی هەنگوینی، میوە، قاوە و ماستاویان هێنا. عارف سایم بەگ لە شتەکانی خواردەوە، بەڵام دوای ئەوەش هەر وا بێدەنگ بوو. هیچکەس و تەنانەت پارێزگاریش نەی دەوێرا هیچ بڵێ.

پاشان سفرە ڕاخرا،خواردن و چێشتی جۆراوجۆری لە سەر دانران، ئارەق و شەڕابیان هێنا و دەستیان بە ناخواردنێ کرد، بەڵام هیچکەس زاری هەڵنەپچرا و تەنیا زرینگەی کەچکان و خرمەی قاپ و دەوریيان بێدەنگیی دەشکاند.

ڕۆژ بەرەو کۆتایی چوو و ئێوارە داهات، بەڵام کەس هەر هیچی نەگوت، وەك دەڵێن: دەتگوت هەموو بە زیندوویی نێژراون.

نانی شەوێ دانرا، عارف سایم بەگ دیسان بێ ئەوەی تەنانەت چاو لە دەوروبەری خۆشی بکا، چووە سەر سفرەی و دەستی بە خواردن و خواردنەوەی کرد. هەر پێیوا نەبوو ئەو ژوورە یەك کەسیشی لێیە. ئەوانی دیکەش چاویان لە وی کرد و بەو شێوەیە نانی شەوێش خورا.

هەموو دەیانزانی ئەو گەردەلوولەی چاوەڕوانی بوون، هەربینا دەستی پێکرد و هەر بۆیەش پێیان خۆش بوو زووتر ئەو بێدەنگییە بەسامە تەواو بێ و هەرچۆنێك بێ لەو بارودۆخە، کە ساتبەسات ناخۆشتر دەبوو، ڕزگار بن.

ڕاست سەروبەندی نیوەشەوێ عارف سایم بەگ دواقومی ئارەقەکەی پێدا کرد و پاشان بە هەموو کەیفی خۆی پێکە بەتاڵەکەی بە مێزەکەی پێش خۆی دادا. تەقەکە لە نێو ژوورێ دا دەنگی دایەوە. پاشان هەستا. ئەوانی دیش لەبەر وی هەموو هەستان. ئەو جار سەری هەڵێنا، چاوێکی لە دەوری خۆی کرد، گۆچانەکەی بە دەستەوە گرت و وردە وردە بۆ لای دەرگاکەی چوو. خەلیل بەگ ڕای کردە پێشێ و دەیەویست دەرگای بۆ بکاتەوە، بەڵام عارف سایم لە نێو شیپانەی دەرکێ دا ڕاوەستا، ئەو جار هەنگاوێك کشایەوە و بە دەستی خانەخوێی تێگەیاند کە خەوی دێ و پێیخۆش نیە چیدی لە وێ بێ. پاشان چووە ژوورەکەی تەنیشتێ، بێ ئەوەی

جلەکانی بگۆڕێ و کەوشەکانی داکەنێ، لە سەر تەختێك کە بۆی ئامادە کرابوو و نوێنوبانێکی خاوێنی پێدادرابوو، کەوت.

ڕۆژی دواتر، بەیانی زوو لە خەوێ هەستا. وا دیار بوو هێندێك هاتبۆوە سەرەخۆ و تەنانەت یەك دوو قسەشی لە گەڵ خانەخوێکەی کرد. هێشتا بە تەواوی نانی بەیانی‌یان نەخواردبوو، حاکم کە لە لای پارێزگاری خەوتبوو و یاوەر کە لە لای سەرۆکی ژاندەرمەی خەوتبوو، لە گەڵ هەموو گەورە پیاوانی شاری پەیدا بوون، یەك بە یەك بە ڕێز و ئەدەبەوە بە پێش نوێنەری گەورە دا هاتن، سڵاویان لێ‌کرد کڕنۆشیان بۆ برد و دەوارانداور لە دیوەخانێ دانیشتن. دوای ئەوەی هەر کەس لە جێی خۆی دانیشت، عارف سایم بەگ سێ جاران سەری گۆچانەکەی دە عەرزی کوتا، یەکە یەکە چاوی دە چاوی هەمووان بڕی و بە شێوەیەکی هێدی و لە سەرەخۆ دەستی بە قسان کرد:

ـ پێم بڵێن بزانم دۆستان، بۆچی ئێوە چەتەتان ناردۆتە سەر ماڵ و مولکی من؟ بۆچی نایب حاجی عەلیتان لێ بە کوشت داوم، کە کوێخام بوو و دەتانزانی ئەمن چەندەم خۆش دەویست؟ بۆچی تەنانەت چەتەکانتان ڕاسپارد، کە ئەو سەعاتە بەنێوبانگەی لە لایەن سەرۆککۆماری سەربەرزمانەوە بە دیاری درابوو بە من، بدزن؟ پێم بڵێن بزانم بۆ؟!

دیسان یەك بە یەك چاوی دە چاوی هەموویان بڕی‌یەوە. دەتگوت هەڵۆیە بە سەریان دا دەڕوانێ. هەموویان، تەنانەت حاکم و یاوەریش حەبەسابوون و زمانیان لاڵ ببوو.

ـ بەڵێ، پێتان وابوو ئەگەر وا بکەن، ئەمن باوەڕ بەو داستانەی دەکەم! بە ڕاستی کێهەتان پێش هەمووان ئەو بیرەی کردەوە کە چەتان بنێرێتە سەر مولکی من؟ خۆ ئەمن بۆخۆم زۆر چاك دەزانم چۆن ئەو کەسە تاوانبارەی بدۆزمەوە و لە گەڵ وی لێکی دەرکەین. جا خودا یان بە من دەدا، یان بە وی!

مەلا دۆران نازایانە وە جواب هات:

ـ کەسێك ئەوەندە دڵڕەق و ناپیاو بێ چەتان بنێرینە سەر تۆ، ناکرێ خەڵکی ئەو شارەی ئێمە بێ!

ـ بێ‌دەنگ بە مەلا دۆران. دەتەوێ شتەکەی بشاریەوە؟ ئەتۆ مرۆڤێکی زیرەك و کەڵەك بازی و هەموو چەشنە پیلان و فێڵ و تەڵەکەیەکت لە دەست دێ، بەڵام ئەو شتەی ئێستا ڕووی داوە و ئێمە لە گەڵی بەرەورووین، ئەوەندە گلاو و خوێڕی‌یانەیە، ئەتۆش پەی پێ‌نابەی! کەس ئینسانی ناپیاوی لەو چەشنەی، تا ئێستا نەدیون! کە وا بوو لە سەری مەڕۆ، چونکە تەنانەت

کەسێکی وەك تۆش نازانێ ئەوانە چەندە نارەسەن و دووڕوون. ئەوانە ئەوەندە کەڵەکبازن کە تەنانەت پیاوێکی هەزارتوێی وەك تۆش بە شاگردیشیان نابێ.

عارف سایم بەگ وا هەڵچووبوو، هیچیانی نەدەپاراست. هەرچی جنێو و قسەی سووك هەبوو، پێی‌گوتن. ئەوانیش وستەیان لێبڕابوو، لە سەر کورسی‌یەکانیان دانیشتبوون، دەلەرزین، چاویان دە عەرزی بڕیبوو و ئاواتیان دەخواست کونە مشکێکیان وەگیر کەوێ خۆی تێدا حەشار بدەن!

عارف سایم بەگ پێکەنی. پێکەنینەکەی تاڵ و بە گازەندە بوو:

ـ با ئەمن بۆخۆم ناوی ئەو پیاوە ئازایەتان بۆ ئاشکرا بکەم، کە چەتەی ناردوونە سەر ماڵی من. پێتان وایە ئەو کەسە دەبێ کێ بێ؟ ئەو پیاوە دۆستی هەرە نێزیکی خۆم زولفۆیە...

زولفۆ وەك ئەوەی لە نەکاو خەنجەری وێکەوتبێ، ڕاچڵەکی و ڕاستەوە بوو:

ـ قەت شتی وا نابێ، بەگم! وا نیە. ئەوەی بە سەر موڵکی تۆی داداوە، حەمەدۆکە. ئێمە لەو شتەمان کۆڵیوەتەوە و سوور دەزانین ئەو وای کردوە. ئێستا حەمەدۆك چەتەیەکی ساکار نیە، بەڵکوو ڕێبەری ڕاپەڕینێکە. ئەو کە هێرشی کردۆتە سەر گوندی ئێوە، ڕاست مەبەستی ئەوە بووە کە نیشان بدا لە بەرامبەری ئێوە، دەوڵەت و مستەفا کەماڵ پاشای دا ڕاوەستاوە و دژایەتیتان دەکا! هەر بەو شێوەیەش چۆتە سەر عەنبەر بەگی، بە زۆری خۆی دە ماڵی ئەو بەگە جوامێرەی ڕۆ کردوە، زێڕ و زێوێکی زۆری خەڵکی کە لە ڕاستی دا خەزێنەیەك بووە، لە کۆنەوە لە لای بووە و بۆ خاوەنەکانیانی ڕاگرتوە، بە تالان بردوە... ئێمە سەبارەت بە مەسەلەی هێرش بۆ سەر موڵك و ماڵی ئێوەش، هەروا دانەنیشتووین دەست لە سەر دەست دابنێین، چاوەڕوانی هاتنی جەنابت بین و هیچ نەکەین. ئەمن بۆخۆم لەو شتەم کۆڵیوەتەوە و بە وردی چۆنیەتیی ڕووداوەکەم بۆ ڕوون بۆتەوە. ڕاستی‌یەکەی ئەوەیە کە حەمەدۆك لە گەڵ چوار هاوڕێی خۆی ئەو کارەی کردوە. مەلا فەرهادیشی لە گەڵ نەبووە. بۆخۆشی ئەوەی درکاندوە کە مەبەستی لە بردنی سەعاتەکەی چ بووە. خەڵك بە گوێی خۆیان گوێیان لێبووە، گوتوویەتی ئەو سەعاتە لە قارەمانان دەوەشێتەوە نەك ـ حاشایەکی ئێوە ـ لە جینایەتکاران. پاشان سەعاتەکەی لە بابی بەرێزت ئەستاندوە و داویەتی بە بایرامۆغلی. ئێستا سەعاتەکە بە بەرۆکی بایرامۆغلی‌یەوەیە. خۆ لێکۆڵینەوە لەوەش کە ئەو قسەیەی من وایە یان نا، زەحمەت نیە، دەتوانی بۆخۆت بپرسی...

ـ قەت ئەمن بە هەڵە ناچم، زولفۆ! ئەمن ئێوە باش دەناسم. ئەوەندەم ئەزموون هەیە، بزانم لە کوێوە هێرشم کراوەتێ و کێ هێرشی کردوومێ! ئەو فکر و پیلانە ئی تۆ نەبێ، ئی کەسی دیکە نیە!

ـ هەرگیزای هەرگیز! قەت شتی وا مەفەرموو! باشە قوربان، هەر ئەوەندە دەلێم: بلێی ئەمن چووبمە لای بایرامۆغلی و سەعاتە بەنێویانگەکەی مستەفا کەمالْ پاشام دابێتیێ؟
ـ لەوانەیە وات کردبێ، بەلام ئەمن دەزانم ئەو سەعاتە لە لای بایرامۆغلی نیە و لە لای یەکێك لە ئێوەیە!
ـ چۆن شتی وا دەبێ قوربان!
ـ چاکت دەناسم زولفۆ! بە تۆش هەتلە نابم!
ـ بەلام قوربان ئەتۆ حەمەدۆکی ناناسی و پێت وایە ئەو هەر چەتەیەکی ساکارە!
ـ ئەو مێرمنداڵێکی بەستەزمانی دڵپاکە، کە تووشی کۆمەلێك کارەسات و ڕووداوی ناخۆش بووە. هەر ئەوەندە و هیچی دی.
زولفۆ هاواری کرد:
ـ قوربان، چۆن شتی وا دەفەرموی. ئەو ئالای ڕاپەڕینی هەلکردوە و هەر ئێستا ئێمە دە مەترسی داین، بە تایبەتی جەنابت بۆخۆت. ئەو ڕایەلکەیەکی سیخوڕیی بە هێزی لە چیا دروست کردوە و دەتوانێ تەنانەت هەر لێرەوە گوێی لە دەنگی هەناسەی ئێمەش ببێ.
بەو قسەیەی عارف سایم هێور بۆوە و قاقا پێ‌کەنی:
ـ شتی وا هەر نابێ!
ئەوانی دیکەش هەرکام بە نۆرەی خۆی ئەوەندەی توانی‌یان باسەکەیان خەست کرد: " لە هەموو شوێنێکی زنجیرە چیای تووڕووسی، پیاو و منداڵ، لە حەوت ساڵەوە تا حەفتا ساڵە، ناوی خۆیان ناوە حەمەد. هەر بەو نێوەی دەستەیان دروست کردوون. حەوت حەوت، هەموویان وەك یەك کەڵەگەت، جلوبەرگی وەك یەك. ڕەنگی چاویان، شێوەی کەپۆیان، ڕەنگی تووکی سەریان هەمووی وەك یەك، بوونە چەتە و کۆمەڵ کۆمەڵ چوونە گەڵ حەمەدۆکی. ئەو دەستانە هێندە زۆرن، ناژمێردرێن. هەمووشیان دڕ و دەستکەرەوەن و لە حەمەدۆکیش خوێنخۆرترن. ئەوان دژی دەسەلاتن و حەمەد و هاوڕێیانی هەموو دەوڵەمەندەکانی دەشت و چیایەیان ڕووت کردوون و پووڵ و ماڵی وانیان بە سەر هەژار و دەسکورتان دا دابەش کردوە. ئەگەر ئەوان مەودایان پێ‌بدرێ و بەو شێوەیە بچنە پێش، ئەوە وڵاتەکەمان دەکەنە بۆلشویکی. دایە سوڵتان بەردە برووسکەی داوە بە حەمەدۆکی و ئەو بەردە لە برووسکەی دەی‌پارێزێ، ئەنگوستیلە سیحراوی‌یەکەشی داوەتێ و هەروەها حەمەدی بانگ کردوە و لە ڕێورەسمێکی جوان و بە شکۆ دا کراسێکی پیرۆزیشی دە بەر کردوە. ئەو کراسە ئی سوڵتان سەلاحەدینی ئەییووبی بووە... "

بەلاّم هەرچەندی هەولّیان دا باسەکە قوولّ کەنەوە و عارف سایم بەگی وشیار کەنەوە و بیترسێنن، بیّسوود بوو. ئەو قسەکانی وانی بە هێند نەدەگرت، بەلّکوو پێیان پیّدەکەنی و گالّتەی پیّدەکردن. لە هەمووی ئەو قسانە زیاتریش، گالّتەی بە داستانی حەوت حەمەدی یەکرەنگ، یەکبەرگ، یەکچەك و یەکشێوە دەهات، قاقای دەکێشا و دەیگوت شتی وا خۆشی قەت نەبیستوە. دەی رەنگە مەترسیش دە گۆڕیّ دابیّ، بەلاّم ئەگەر ئەوە راست بیّ، کورە هەر زۆر جێگای سەرنجە! باشە بۆ دەستەی حەوت کەسی، بەلاّم دە کەسی و چاردە کەسی نا؟ ئەو هەموو خەلّکە یەکرەنگ و یەکشێوەیە چۆن یەکتریان گرتۆتەوە و دەستەیان پێکهێناون؟ بۆچی هەموویان ناویان حەمەدە؟ بۆ؟ وەلاّمەکەی هەر ئەوەیە کە بەلّیّ، بەو شتانە دەیانەویّ پالّەوانەکانی شاری ئێمە بتۆقێنن. هەر لەو کاتەش دا بیری کردەوە: ئەوانە تا رادەیەکیش راست دەکەن. حەمەدۆك ئیدی زۆری شوو لیّکێشاوە. لە چەتەیەکی ئاسایییەوە رۆژ بە رۆژ زیاتر خەریکە ببێتە رێبەری بزووتنەوەیەکی. لەوانەیە پێویست بیّ پێش ئەوەی کار نە بەرەگە بچێتە دەر، شتێك بکریّ! پێش ئەوەی مستەفا کەمالّ پاشا ئەوەی بە گویّ بگا کە...

ئەگەر پێتەخت و مستەفاکەمالّ پاشا ئەوەی بزاننەوە، کە راپەڕینێك خەریکە لە چیای تووڕووسی دروست دەبیّ، کار و پلانی عارف سایم بەگی لە دادیّ دا چەتی دەکەوێتیّ... نوێنەری هەرێمێکی راپەڕینی بە دژی دەولّەتیی تیّدا دروست بووبیّ، زەحمەتە کورسییەکەی بۆ بپارێزریّ. خۆ ئەگەر عارف سایم بەگیش ئاوا لیّبکەویّ و هەلّتەبژێردرێتەوە، ژیان بۆ وی چ مانایەکی نامێنیّ...

ــ شتێکی دی... یەکێك لە ئێوە ئەسپێکی قۆتری لەری پەیدا کردوە، گوتوویەتی ئەوە ئەسپی حەمەدۆکییە و ئێوەش چوون ئەو ئەسپەتان گوللەباران کردوە! باشە ئەو بڕیارەتان بۆ داوە؟

ــ خەلّك دەیانگوت گیانی حەمەدۆکی دە بەر ئەو ئەسپەی دایە... پێمانوا بوو ئەگەر بیکوژین...

ــ بەلاّم گرانتان لە سەر تەواو بوو. وا نیە؟

ــ بەلّیّ، بە داخەوە وایە.

ــ ئەسپێکی کەلاکی لەڕولاواز بوو بە حودوودێك...

ــ هەموو بەیانییان بە سەر شاری دا دەحیلێنیّ...

ــ دێهاتییەکانی ئەو دەوروبەرەی بایەخ بۆ ئێوە دانانێن!

ــ ئاخ، بەلّیّ!

ــ ئەوە بۆ وەی نابیّ خۆمانی پێوە نارەحەت کەین... ئێمە قەت بایەخمان بۆ ئەوان دانەناوە و لە مەودواش دایناناێین! باشە ئێوە بۆچی هێندە لە حەمەدی دەترسن؟

ـ چونکە پیاوکوژە، ئاغا و بەگان تالآن دەکا و دەشیانکوژێ. پێش وی کەس نەیوێراوە خۆ دە بەگان بگەیەنێ، بەلآم ئەو جیاوازە. ئەو خوێنڕشتنی پێخۆشە و خەریکە ڕاپەڕینێك دروست دەکا. خەڵك ئەوەندەیان ئێمە ناخۆش دەوێ، کە ئەگەر ئەو ڕاپەڕینە سەر بگرێ، هەموو شارەکان تێکدەڕووخێنن و کارەساتێك دەخولقێ خوێن سەران ببا!

ـ دۆستان، وا دیارە لە وەی دەترسن کە ڕۆژێك حەمەدۆك بە سەر شاری دا زاڵ بێ و سەری هەمووتان ببڕێ، وا نیە؟

ـ خەلیل بەگی گەورە وە قسە هات. ددانە سپییەکانی وەدەرکەوتن:

ـ بەڵێ، وایە. ئێمە دەترسین! لە گیانمان دەترسین، لە موڵك و ماڵمان دەترسین و لە شەڕەف و شانازیشمان دەترسین!

ـ مەترسن! کۆماری تورکیە ئەوەندە دەسەلآت و هێزەی هەیە کە دەرەقەتی چەتەیەکی بێ! بەڵێ، دەرەقەتی سەدان یاغی و جەردانیش دێ!

ـ حەمەدۆك خەریکە بزووتنەوەیەکی خەڵکی دروست دەکا! خۆ سوور دیارە خەریکی ئەوەیە! ئەوەندەی زێڕ و زێو کۆ کردۆتەوە، ئێستا خەزێنەی وی بە قەد خەزێنەی سووریەی دەبێ. بۆ ئەوەی خەڵکی بە تەواوی لە گەڵ بێ، لە گەڵ هێزە هەرە کۆنەپەرستەکانی نێو وڵات و ئەندامانی دەستە ئایینییە قەدەغەکراوەکان هاوکاری دەکا.

هەموویان بیروڕایان یەك بوو: حەمەدۆك خەریکە ڕاپەڕین پێك دێنێ... تەنیا مورتەزاغا بێدەنگ دانیشتبوو و خۆی لە تێهەڵڕوانینی عارف سایم بەگی دەپاراست. هەر چاوی دە چاوی عارف سایمی ئالقابا، ئاشکرا دەبوو و جەنابی نوێنەر دەیزانی کە ئەو دەستی دەو هێرشەی دا بووە، کە کراوەتە سەر گوندەکەی وی. ئەگەر کار گەیشتبا ئەو جێگایەش، ئەوە عارف سایم بەگ ڕایدەسپاردە حەمەدی مورتەزای بکوژێ و ئەویش گوللەیەکی وای لە نێوچاوانی دەدا، کە کەللەی لێکبلاو بێ و مێشکی وەك کەتیرەی بە دیوارییەوە بنووسێ.

لە پڕ جەنابی نوێنەر توند بوو و بە هەردووك دەستانی دەسکی وەکازەکەی کوشی:

ـ گوێتان لێبێ دۆستان، ئەو خەڵکە ڕاپەڕینیان پێناکرێ، تەنانەت ئەگەر سەدهەزار حەمەد و سەدهەزار ئەسپی لەو شێوەیەشیان لە گەڵ بن، هەر پێیان ناکرێ. ئەوان سەدان ساڵە دە نەداری و هەژاری دا دەژین و هەمیشە چەوسێنراونەوە، تێیانهەڵدراوە و نەیانهێشتوە وەك ئینسانی بە ڕاستی بژین. ئەوانە نەك هەر ناتوانن ڕاپەڕین بکەن، هەر ناتوانن چاویش هەڵێنن. بۆ؟ چونکە ترساون و دەشترسن! لە خۆڕا هەڵمەچن و زەندەقتان

ئەچێ. با ئەوەش بڵێم لە بناخە دا ڕوون نیە کە حەمەدۆك هەر هەش بێ! بە ڕاستی کەس دەزانێ حەمەدۆك هەیە یان نیە...

خەلیل بەگی گەورە گوتی:

ـ چۆن نیە؟ هەیە. ئەو شەوەی چووبووە سەر ماڵی عەنبەر بەگی، ئەو بە چاوی خۆی دیتوویەتی. چۆن؟ هیچ گومان لە وە دا نیە کە حەمەدۆك هەیە...

مەلا دۆرانیش گوتی:

ـ هەموو دێهاتی‌یەکان بە چاوی خۆیان دیتوویانە. عەلی‌یە شەلیش چاکی دەناسێ.

ئیدی مورتەزاغا خۆی پێ‌ڕانەگیرا و لە قولینچکێ ڕا هاواری کرد:

ـ وەڵلاهی ئاخرەکەی هەموومان دەکوژێ!

عارف سایم یەك دوو جار سەری وەکازەکەی دە عەرزی کوتا و گوتی:

ـ زۆر باشە، ئێستا خەریکین بە شتێك دەگەین! بەڵێ، لەوانەیە حەمەدۆك نیازی کوشتنی ئێوەی هەبێ، بەڵام ئەمن دیسان دەیڵێمەوە و هەزار جاری دیکەشی دووپات دەکەمەوە، جووتێرەکان بە ژیانی کۆیلەتی، چەوساندنەوە و سووکایەتی‌پێکران ڕاهاتوون، هەر قەت وەك خەڵك دانانرێن و بۆ ئێوە مەترسی دروست ناکەن!

پاشان سەری بەردایەوە، ساتێك بیری کردەوە و گوتی:

ـ کوا؟ با ئەوان ئەو پیاوە بوایەن ڕاپەڕینیان بکردایە و سەری هەموومانیشیان بڕیبایە...

مورتەزا دیسان هاواری کرد:

ـ وەڵلا دەنا ڕاست وا دەکەن!

عارف سایم خۆی سڵ نەکرد. ڕوون نەبوو قسەکەی مورتەزاغای گوێ لێبووە، یان نا:

ـ هەتا حەمەدۆکی بە دیل نەگرین و ئەوانە نەدۆزمەوە کە بە سەر موڵك و ماڵی منیان داداوە، لەو شارەی نارۆم. ئەمن ئەو کارەی دەکەم، بەڵام ئەو کەرەسە و هێزەی دەو کارەی دا وەگەڕ دەخرێ، نابێ لە ڕادەی خۆی دەرچێ. نامەوێ هەڵاوبگرێکی زۆر بنێینەوە. ئەگەر بەوەندەی دەروەست هاتین و کارەکە جێبەجێ بوو، ئەوە باشە، دەنا لەشکری وەکار دەخەم و ڕەگوڕیشەی حەمەدۆکی لە بن دەردێنم. تەنانەت ئەگەر پێویست بێ، دار لە سەر بەردی تووڕووسی نایەڵم و وا دەکەم خوێن بێ و سەران بەرێ!

ئەو جار تووڕەیی‌یەکەی ئەوەندەی دیکەش توند بوو، کەفی بە لالێوان دا هاتە خوار و وای لاق دە عەرزی کوتا، کە خانووەکە لە ژێر پێی دا لەرزی:

ـ چ لە سبەینێ زووتر نیە، دەست پێدەکەم! جا یان خودا بە من دەدا، یان بەو حەمەدۆکە خوێڕی‌یەی!

سەروچاوی سەیر گرژ ببوو و تووکی سەری ڕاست ببۆوە. فەرمانی دا:

ـ بڕۆن، عەنبەرم بۆ بێنن!

خەلیل بەگی گەورە گوتی:

ـ دەفەرمووی هەر ئێستا بیهێنن؟

ـ بەڵی، هەر ئێستا، بێڕاوەستان.

عارف سایم هەستا، چووە هەیوانێ، یەك دو جار ئەو سەرەوسەری هەیوانەکەی کرد و هاتەوە ژوورێ. ڕوخساری وەك بەردە سماتەی ڕەق ببوو. هەر کەس لەو کاتەی دا چاوی پێکەوتبایە، دەیگوت ئیدی حەمەدی دەکاتە پرپۆڵە.

عەنبەر بەگ هات و دەست لە سەر سینگ لە بەرانبەر عارف سایم بەگی ڕاوەستا. ئەوەشی زۆرتر لە ترسەوە بوو، تا هەستکردن بە پاراستنی ڕێز و حورمەتی جەنابی نوێنەر. هەموو خەڵکی چوکووڕاوایە دەیانزانی ئەو کابرایە چەندە دڵڕەق و بێبەزەیی بوو. لەبیریان مابوو کە چۆن ئەوانەی ڕقی لێیان بوو، وە بەر ماشێنێی دەدان و هەروەها لەبیریان بوو کە چۆن گوندێکی سەد و سی ماڵیی چۆل کرد و خەڵکەکەی ئاوارەی شاخی کردن. ئەو کابرایە ئەگەر هاتبا سەری، دەستی لە هیچ نەدەپاراست. لە ئەشکەنجە کردن و لێدان و تێهەڵدانی جووتێران دا نێوبانگی هەبوو و تەنانەت لە دەرەوەی ئەو ناوچەیە و لە سەرانسەری وڵاتیش باسی دڵڕەقی و بێ بەزەیی وی دەکرا. خەڵك هەر بە بیستنی ناوی دەلەرزین. هەر بۆیە کاتێك بەگ و ئاغا گەورەکانی شاری زانی‌یان کە عارف سایم بۆخۆی جڵەوی کارەکەی بە دەستەوە دەگرێ، تا ڕادەیەك هێور بوونەوە.

ـ وەرە لە بەرامبەرم دانیشە، عەنبەر بەگ!

کورسی‌یەك ڕاست ڕووبەڕووی وی دانرابوو، وەکازەکەی بۆ لای کورسی‌یەکەی ڕاداشت. عەنبەر بەگ دەستبەجێ هات و لە سەر کورسی‌یەکەی دانیشت.

ـ پێم بڵێ بزانم، عەنبەر بەگ! دەزانم ئەتۆ کەسێکی کە حاشات لە بەگایەتی‌یە کردوە و کاتێك باوکت لە سەرەمەرگێ دا پێی‌گوتی دەتکەم بە جێنشینی خۆم، قبووڵت نەکرد و گوتت ئەمن ناتوانم خەڵکی بێدەسەڵات و هەژار بچەوسێنمەوە. وایە؟

ـ بەڵێ، قوربان.

ـ پاشان بوویه ناشەوان. ڕاستە؟
ـ بەڵێ، ڕاستە قوربان.
ـ ئەدی دواتر؟
ـ قوربان باغێکم هەیە، دارهەنار و هەنجیرم هەن. ڕەزێکیشم هەیە...
ـ عەرزێکی چکۆڵەشت هەیە، دەیکەیە بێستان و سەوزی؟
ـ ئەرێوەڵڵا بەگم، ئەوەندەشم بەسە، بەڕێدەچم.
ـ ئەتۆ زۆر زیرەکی ها! پیاوێکی پاك و بێخەوش! بەڵام دەزانم وا نیە و خۆت وا نیشان دەدەی، بۆڵشویکی کەڵەکباز! وا دیارە لە مەدرەسەیەکی چاك خوێندووتە.
ـ نەخێر، قەتم نەخوێندوە، بەگم.
ـ چۆن بڵێم؟ کورت و کرمانجی ئەتۆ بنیادەمێکی سەیری. ڕەسەنی! ئێستا وەڵامی پرسیارەکانم بدەوە: ئەتۆ حەمەدۆکت بە چاوی خۆت دیوە؟
ـ بەڵێ، دیتوومە بەگم.
ـ بە سەر ماڵەکەی تۆشی داداوە، وەك چۆن هاتۆتە سەر ئێمە؟
ـ بەڵێ، بەگم.
ـ هەموو زێڕ و پووڵەکەی برد؟ ئەو زێڕ و زێو و خشڵەی دەڵێم کە خەڵك بە ئەمانەت لە لایان دانابووی؟
ـ بەڵێ.
ـ چەند دەبوو، مەبەستم ئەوەیە بایی چەندی دەبوو؟
ـ بایی زۆری بوو، یەکجار زۆر، بەگم.
ـ چەند؟
ـ نازانم، بەگم.
ـ باشە، قەت ئەو هەموو خشڵ و زێڕ و جەواهێراتەت نەژماردبوو، یان نەتقەبڵاندبوو، بزانی بایی چەندی دەبێ؟ لانی کەم هەر بۆ وەی بزانی!
ـ پێمڕا نەبوو ئەوە کاری منە. شتەکە نی خەڵکی بوو، کە وابوو ئەمن بۆ بزانم خەڵك چەندی هەیە؟
ـ هەمووشت دە دەستی حەمەدۆکی کرد؟
ـ هەمووی. تەنیا ئەنگوستیلەیەك نەبێ، ئەویش ئەو بە زۆری وێیدامەوە و گوتی دەبێ هەڵیگری. ئەمنیش بێدەسەڵات بووم. حەمەد چەتەیە و دەیتوانی ئازارم بدا... ئەنگوستیلەکەش ئەوەیە قوربان...

عەنبەر بەگ ئەنگوستیلەیەکی لە گیرفانی دەرێنا و دایە دەستی عارف سایم بەگی. ئەویش بە وردی چاوی لێ‌کرد و لە سەر مێزەکەی تەنیشتی خۆی دانا.

ـ پێتوایە ئەو حەمەدۆکەی هاتبووە سەر تۆ، ئەوی ڕاستی بوو؟ هەر ئەو حەمەدۆکە بوو کە خەڵك باسی دەکەن؟

ـ بەڵێ دڵنیام بۆخۆی بوو.

ـ بۆم بگێڕەوە بزانم مرۆڤێکی چۆن بوو، ڕوخسار و قەدوباڵای چۆن دەهاتە بەرچاو؟

ـ جا چۆنت بۆ باس بکەم، بەگم...

دەستی لێکئاواڵە کردەوە و هەڵیهێنا، وەك ئەوەی بە بستی شتێکی بپێوێ:

ـ بستە مێرمنداڵێك، هەر ئەوەندە درێژە... چوارشانەیە، ددانی سپین، شەرمێونە و زۆر کەم قسە دەکا، تەنیا بە گەرمی و بە میهرەبانی چاو دە چاوی پیاوی دەبڕێ... هیچ وەك پیاوکوژان ناچێ. دەڵێی ئەو کوڕە مێرمنداڵە لە باڵ خۆی دا هەمیشە هێندێك پرسیار دێنێ و دەبا، وەك ئەوەی کە: چ قەوماوە، بۆ ئەمن لێرەم، کێ ئەو تفەنگەی دەستۆ ڕاکردم، کێ ئەمنی کردە چەتە و بۆ بوومە چەتە؟... ئەگەر هەر زوو پێیان نەگوتبام ئەوە حەمەدۆکە، ئەو حەمەدۆکەی عەبدیخان، عەلی سەفا بەگ و مەحموداغای کانی‌گوڵانی کوشتوە، کابرا دەستی بۆ بە قوڕئانێش دادابام، قەت باوەڕم نەدەکرد ئەوە حەمەدۆك بێ...

ـ جا ئەو حەمەدۆکە هەر بەو زووانە دێتە ئێرە و لە نێوەڕاستی شاری گوللەیەکی لە نێوچاوانی مورتەزاغای دەدا و دەی‌کوژێ...

مورتەزاغا ناڵاندی:

ـ خودایە هەر بۆخۆت بمپارێزی.

ـ زۆری لێ‌دەترسێی مورتەزاغا؟

مورتەزا دیسان ناڵاندی:

ـ یەکجار زۆر قوربان!

ـ لەوانەیە گوللەکەی ڕاست لە چاوت دا...

ـ خودا بمانپارێزێ، قوربان!

ـ دەی، ئەدی ئەوکوڕە مێرمنداڵەی باسی دەکەی، ئەنگوستیلەیەکی دە قامکی دابوو کە نەقیمەکەی بەردێك بێ و تاجێکی تێ‌دا هەڵکەنرابێ؟ هەروەها داخوا کراسێکی دە بەر دا بوو کە نۆسەد و نەوەد و نۆ ئایەتی بە ڕەنگی زەردی زێڕین و بنەوش لی سەر نووسرابێ؟

ـ بەڵێ، بەگم.

ـ کە وا بوو ڕاستە، حەمەدۆکێك هەیە!

ـ بێگومان، بەگم.

ـ کوڕێکی چکۆڵەی شەرمێون، نا؟

ـ قوربان ئەوەندە شەرمێونە لە ڕووی هەڵنایە چاو لە چاوی پیاوی کا. کە کووپە زێڕەکەم لە پێش دانا، هەر تێمەوە ڕاما، هیچی نەگوت و کاتێك یەکێکی دیکە لە چەتەکان کووپەکەی هەڵڕشت، هێشتا ئەو لە ڕووی هەڵنەدەهات دەنگێ بکا. لە پێش دا ئەو پێی‌خۆش نەبوو هیچ لەو خشڵ و زێڕەی هەڵگرێ و دەی‌گوت ئەتۆ ساڵانێکی زۆر ئەو سامانەت پاراستوە و ئێستاش مافی خۆتە هەمووی بۆخۆت هەڵگری و پێشی‌گوتم دەبێ هەڵی‌گرییەوە. دەت‌گوت بردنی ئەو خشڵ و زێڕەی بە باش نازانێ.

لێرە دا عارف سایم قسەکەی پێ‌بڕی و گوڕاندی:

ـ ئەدی بۆ هەڵتنەدەگرتەوە؟ وا دیارە خودا خودات بووە ئەو زێڕ و پووڵەی بەرن و ناچارت کردوون بی‌بەن. لە حاڵێك دا ئەوە ئیدی ماڵی دەوڵەتێ بووە؟ ئەمن بە تاوانی خەیانەت بە ماڵی خەڵکی دەت‌گرم و دە بەندێت دەکەم!

ـ جا خۆ قوربان خەڵك هیچی نەچووە!

دەنگی عەنبەربەگی لە سەرەخۆ بوو، بەڵام هێندێك ترسی تێ‌دا بەدی دەکرا. عارف سایم نێوچاوانی تێکنا و وەکازەکەی دە عەرزی کوتا:

ـ چۆن؟

ـ چونکە حەمەدۆك بڕیاری داوە ئەو گەنجەی بە سەر ئەو لاوانە دا دابەش بکا، کە بابەکانیان لە شەڕەکانی قەفقاز و داردانێلەکان، واتە لە شەڕی یۆنانی‌یەکان دا کوژران و نەگەڕاونەوە.

ـ ئەها، هەر لە بەر ئەوەش ئەتۆ زێڕ و پووڵەکەت قبووڵ نەکردەوە؟! پێت وا نەبێ ئێمە ناتناسین، چاکت دەناسین و دەشزانین ساتوسەودات لە گەڵ هێندێك کەسی بێگانە هەیە...

عەنبەر بەگ زۆر ترسا، ڕوخساری سپی هەڵگەڕا و لێوەلەرزەی هاتێ:

ـ نا قوربان، نا، بە هیچ شێوەیەك! ئەمن پێوەندیم بەکەسەوە نیە و هیچ ساتوسەودایەکیشم لە گەڵ بێگانان نیە...

عارف سایم بەگ سینگی دەرپەڕاند، چاوی لە سەر یەك دانان و گوڕاندی:

ـ ئەوە دەڵێی چی؟ ئێمە ئاگاداریمان بە سەر هەڵسوکەوتی هەموو کەس دا هەیە، بە تایبەت کەسێکی وەك تۆ! ڕاپۆرتمان لە سەر هەمووتان هەیە...

ـ بەڵام... ئەمن قەت پێوەندیم بە بێگانانەوە نەبووە بەگم... ئەگەر مەبەستیشت کۆنسوولی ئەمریکایەیە کە ئەو دوایی‌یانە هاتبوو بۆ لای من، دەبێ عەرزت بکەم هاتبوو چاو لە باغە هەنارەکەم بکا. ئەو هەر لە بناغە دا ئاشقی هەنار و دارهەناری‌یە و ئەمنیش بردم بە نێو باغەکەم دا گێڕام. هەر ئەوەندە. لە ویش زیاتر لە ژیانی خۆم دا چاوم بە هیچ بێگانەیەکی نەکەوتوە!

ـ ئەها... جا بزانە ئێمە هەموو شتێکمان پێ‌دەگاتەوە. وا باشە بۆخۆشت ئاگادار بی کە ئێمە چاوەدێریمان بە سەر کەسانی وەك تۆ دا هەیە. هەر بزوون، دەزانین چ دەکەن!

ـ قوربان، کەڕ و لاڵ بم، کوێر بم، خودا نەم بەخشێ، ئەگەر جارێکی دیکە! چاوم بە بێگانەیەکی بکەوێتەوە.

عەنبەر بەگ زۆر دەترسا. هەموو گیانی دەلەرزی. نەی‌دەزانی ئەو کابرایە چیی لێی دەوێ و چیی بە سەر دێنێ.

ـ عەنبەر بەگ مەترسە، ئەمن لێت ڕازیم! هەتا ئەمنیش بێنم کەس ناتوانێ تووکێکت لە سەری کەم کا، بەڵام ئەتۆ هەڵەیەکی گەورەت کردوە کە کاتێك حەمەدۆك دەی‌گوت زێڕەکە بۆخۆت...

عەنبەر بەگ ئەو هێوربوونەوە و گفتە هێدی‌یەی عارف سایمی هێندە پێ‌خۆش بوو، کە ڕانەوەستا قسەکەی تەواو بێ و گوتی:

ـ قوربان، سوور دەمزانی کە ئەوان زێڕەکەم نادەنەوە. حەمەد کوڕی چاکە، ئەو بە ڕاستی بوو و بە وی با دەی‌دامەوە، بەڵام ئەو مەلا فەرهادە دڕندەیە نەی‌دەهێشت. تازە ئەو پووڵە لە چنگ وی نەدەهاتەوە دەر! کاتێك حەمەد کووپەکەی لە پێش من دانایەوە، ئەو مارزە وای چاو لێ مۆڕ کردمەوە، هەر وەخت بوو زەندەقم بچێ. دەمزانی هەر دەستم بۆ لای کووپەی بردبایە، بە گوللان دابێژدابێژی دەکردم!

عارف سایم بەگ قاقایەکی کێشا:

ـ باشە، ئێستا تێ‌گەیشتم شتەکە چۆن بووە!

ـ بەڵێ، قسەی تێ‌دا نەبوو مەلا فەرهاد دەی‌کوشتم. باش بوو ئەقڵ یاریدەی کردم و دەستم لە کووپەکەی نەدایەوە! ئەو جار ئیدی قەت لە گەڵ یەك کەسی بێگانەش قسە ناکەم!

ـ لە گەڵ خەڵکی هەر کوێیەکی قسە دەکەی بکە، کەیفی خۆتە و کەس ڕێت لێ ناگرێ!

ـ بۆخۆت گەورە و خاوەندەسەڵاتی بەگم... کە وا بوو تووشی نارەحەتی نابم و گێرە و کێشەم بۆ دروست نابێ، وا نیە؟

عارف سایم ئەنگوستیلەکەی بە دەستەوە گرت و چاوی تێبڕی:

ـ ئەو ئەنگوستیلەیە...

ـ جەنابی نوێنەر، ئەمن ئەو ئەنگوستیلەیەی پێشکەشی جەنابت دەکەم! پێشموایە هەر لە قامکی جەنابت جوانە!

ـ زۆر باشە، لێت قبووڵ دەکەم و دەیدەم بە خانمی خێزانم. دەڵێم عەنبەر بەگ ئەوەی بە دیاری بۆ ناردووی.

ـ بەڵێ قوربان زۆر باشە. خێزانت لە لای ئێمە خاوەنرێزە. زۆرت سوپاس دەکەم ئەگەر سڵاوی منیشی پێبگەیەنی!

ـ لە ئێستاوە دەبێ ئەمن و تۆ بە یەکەوە خەم لە مەسەلەی حەمەدۆکی بخۆین...

ـ بەڵێ قوربان...

عەنبەر بەگ هەستا، لە سەرەخۆ وەك ئەوەی هێزی دە بەر دا نەمابێ، دەرگای کردەوە، لە پلیکانان چووە خوارێ و ڕۆیی. تا مەودایەکی زۆر لە ماڵی خەلیل بەگی دوور نەکەوتەوە، نەهاتەوە سەرخۆ. هەر وا کە دەڕۆیی، بیری دەکردەوە و لە دڵی خۆی دا دەیگوت:" کوڕە سندانم لێدا ئەگەر جارێکی دی کۆنسوول و مۆنسوولان ببینم! چاوم دەر بێ ئەگەر قسە دە گەڵ بێگانەیەکی بکەم! کوڕە ئەوە ئەمن هەڵەیەکم کرد، یەك جار چاوم بەو کابرا کۆنسوولە ئەمریکی‌یەی کەوت. ئەو کابرا درێژە سەرمازووەی کە دەڕۆیی، دەتگوت قرژاڵە، ئیدی دنیا خرا بوو! بەڵام ئەو مەبەستی زۆرتر حەمەدۆك بوو و ترسەکەشی هەر لە وییە. وا دیارە جەنابی نوێنەر بۆخۆی جڵەوی کارەکەی بە دەستەوە گرتوە و ئەو جار حەمەد زەحمەتە لە دەست ئەو کابرایەی، کە ڕاست مراد پاشا گۆڕکۆڵی سەردەمی ئێستایە، ڕزگار بێ. ئەو کابرایە.دار لە سەر بەردی تووڕووسی نایەڵێ و هەموو وڵاتی وێران دەکا. باشە چۆن ڕاسپێرمە حەمەدی و لەو ئاڵوگۆڕانە ئاگاداری کەمەوە؟ هەر وا چاکترە حەمەدۆك ماوەیەك خۆی ون کا... خوا نەخواستە نەخافڵ شتێکی لێبێ، کارەسات دەبێ".

عارف سایم بەگ، سەرۆکی ژاندەرمە و حاکمی ناردەوە شوێنی خۆیان و دەستووری پێدان سەبارەت بە بارودۆخی ئێستای حەمەدۆکی، لێکۆڵینەوەیەکی ورد و قووڵ بکەن. ئەو جار هەموو ئەوانەی کە سکاڵایان لە حەمەدۆکی هەبوو، کۆ کردەوە. پێش هەمووان سوڵتانۆغڵی‌یە

زەردەی بانگ کرد و بە یارمەتیی وی زانیارییان لە سەر حەمەدۆك، مەلا فەرهاد، شاهێن، تەیموور، و قاسمی کۆ کردەوە. هەرچەندی زانیارییەکان زیاتر دەبوون، عارف سایم بەگ زیاتر سەری سوڕ دەما و هەر دەیگوت: بڕاونە ئێمە ئاگاداریمان لە سەر ئەو خەڵکە چەند کەمە، وا دیارە ئەوانمان نەناسیوە.

ماڵە خەلیل بەگی گەورە ببووە "ناوەندی بەڕێوەبردنی چالاکییەکان". تۆڕێکی گەورە لە تەتەرە چالاکەکان، بۆ هێنان و بردنی هەواڵ و ڕاپۆرت پێکهاتبوو و شای شوێنگێڕان، یانی عەلییەشەلیش، کە پیاوی مەلا دۆڕانی بوو، لە نێوەندی ئەو تۆڕە دا بوو. عارف سایم بەگ، عەلیی زۆر وە بەر دڵی کەوتبوو و بە تەواوی باوەڕی پێی هەبوو، بە شێوەیەك کە هەتا ڕاوێژی لە گەڵ وی نەکردبایە، هیچی نەدەکرد. کاتێك مورتەزاغا زانی کە عەلی بۆتە ڕاوێژکار و جێمتمانەی نوێنەری گەورە، لە داخان وەخت بوو بتەقێ. لە دڵی خۆی دا دەیگوت: ئەمن ئەو شەلە خوێڕییەم هێنا شاری، بە هەمووانم ناساند و کردمە پیاو. ئێستا دوور نیە ئەو نەگبەتە بگاتە پێتەخت و تەنانەت ببێتە فەرماندەری گشتیش!

زۆری پێنەچوو ئاکامی هەوڵ و تەقەلای عارف سایم بەگی دەرکەوت. ئێستا ئیدی ئەو دەیزانی حەشارگەکانی حەمەدی کوێن و ئەو گوندانە و ئەو کەسانەش کە پەنای دەدەن و دەیپارێزن، کامانەن و کێن. هەروەها ئەوەشی بۆ ئاشکرا بوو، کە حەمەدیش ڕایەڵکەیەکی زانیاری و هەواڵوەرگرتنی بۆخۆی هەیە و هەرچی لە شار، دەشت و چیای ڕوو بدا، دەسبەجی بە وی دەگاتەوە. بەڵام پیاوەکان و تەتەرەکانی حەمەدۆکی یەك لە دوای یەك دۆزرانەوە و بە دزی گیران و خرانە ژێر چاوەدێرییەوە. تەنانەت نەیانزانی لە سەر چیش گیراون...

ئەگەر ژاندەرمە باڵیشیان لێڕوابان، دیسان بۆیان نەدەکرا شوێنی حەمەدۆکی، حەمەدۆکێك کە ئاوا لە نێو خەڵکی خۆشەویست بوو، هەڵگرن، بیدۆزنەوە و بیگرن. کە وابوو دەبوایە کۆنە یاغییان بێننە یارمەتیی خۆیان: هەر ئەوان دەروەستی حەمەدۆکی دێن. پێش هەمووان بایرامۆغڵیی کۆنە یاغی و قارەمانی شەڕی سەربەخۆییان بە بیر دا هات. بلێی ئەو مل بدا بچێتە شاخی و شەڕی حەمەدۆکی بکا؟ پێویستە هەرچۆنێك و بە هەر شێوەیەك بێ، ڕازی بکرێ و دەگونجێ ئەو کات بکرێتە فەرماندەی کۆمەڵە چەتەیەکی دیکەی وەك جەبارە درێژی کۆنە هاوڕێی حەمەدی، بلە یەکچاو، ڕەمۆ کەڵەباب و نووری گوڵەش...

کاتێك قسەیان لە گەڵ ئەو کەسانە کرد و شتەکەیان بۆ باس کردن، تێگەیشتن کە دروستکردنی دەستەیەکی ئاوا و تەنانەت هاوکاریکردنی وانیش بە بایرامۆغڵییەوە بەسراوەتەوە. ئەو ڕازی بێ

بچێته شەڕی حەمەدی، زۆر هاسان، وەك ئاوخواردنەوەی ئەوانی دیکەش ڕەگەڵ دەکەون! جا ئیدی حەمەد لە بەرامبەر ئەو کۆنە یاغی‌یانە دا چی پێ‌دەکرێ؟ ئەو بە شاگردی وانیش نابێ و تەنانەت ئەگەر خانەقای چلچاویشی لە پشت بێ، بە وانە ناوەستێ!

پلانێکی خەست و هەمەلایەنە داڕژابوو، کاردروستایی بۆ هەموو شتێك کرابوو و ئەو جار کاتی ئەوە بوو کە دەست بە جێبەجێکردنی پلانەکە بکرێ. عارف سایم بەگ یاوەر و وەکیل باشی عاسمیشی لە بیر نەچوو. لە گەڵ وانیش ڕاوێژی کرد و بە وردی بە هەموو بەشەکانی پلانەکەی دا چۆوە. ڕاپۆرتچی‌یەکانی حەمەدی کە عەلی کەرتیش ناوی لێ‌نابوون" سیخوڕ"، هەموو ژووره تاکەکەسی و گشتی‌یەکانی گرتووخانەی ژاندەرمەخانەیان پڕ کردبوو. عارف سایم عەلی کەرتیشیشی بە کەیفێ بوو. دەی‌گوت ئەو کابرایە کە تەواوی ژیانی خۆی لە ڕێگای ئەرکی خۆی دا بەخت کردوە، لە ڕادەبەدەر جووتێرەکانی چەوساندۆتەوە و سووکایەتیی پێ‌کردوون، جووتێریش زۆریان ڕق لێیەتی، هەر لە دایکی خۆی بەربۆتەوە سەرباز بووە و پیاوێکی زۆریش کارزانە! ئەگەر عارف سایم بەگ فەرمانی پێ‌دابا کە تەواوی خەڵکی تووڕووسی، لە منداڵی حەوتساڵەوە تا پیری حەفتا ساڵە، لە بن زەبری قەمچی‌یان دا بکوژێ، دەسبەجێ دەی‌کرد و هەر بیریشی لێ‌نەدەکردەوە!

عارف سایم بەگ هەستی بە سەربەرزی و شانازی دەکرد: قەت تا ئێستا بارودۆخێك نەڕەخسابوو کە خەباتێکی ئاوا ڕێکوپێك دژی دوژمن ڕێك‌بخا. تەنانەت کاتی شەڕی سەربەخۆییش کە فەرماندەری هێزی بەرگری بوو، شتی وای نەدیبوو!

ـ خەلیل بەگ، هاوڕێکانت بانگ کە. ئێستا کاتی ئەوەیە کە بڕیار بدەین چۆن بایرامۆغڵی ڕەگەڵ خۆمان خەین. کاتێکی زۆرمان نیە و پێش ئەوەی زستان دابێ، دەبێ ئەو کارەی کۆتایی پێ‌بێنین... هەوارچی‌یەکان لە کوێستانان داگەڕاون، وا نیە؟

ـ خەریکن دەگەڕێنەوە.

ـ ئەوان لە وێ نەمێنن، حەمەدۆك دەستی وە بەشی هەرە زۆری پشتیوانەکانی ڕاناگا و لاواز دەبێ.

زولفۆ و مەلا دۆران، ڕۆستەم بەگی مامۆستا، پارێزگار، عەلی کەرتیش، یاوەر، نایب و هەموو کاربەدەستەکان هاتبوونە ماڵی خەلیل بەگی. تەنیا مورتەزاغا سەرەڕای ئەوەی لێی‌گێڕدرابۆوە، دیار نەبوو. خەلیل بەگ نیگەران بوو. ئاخر مورتەزا هەمیشە پێش هەمووان خۆی دەگەیاندە ئەو چەشنە کۆبوونەوانە.

وه دوای کەوت و دۆزییەوە:

ـ سەیرە مورتەزا! ئەوە چ قەوماوە؟ لە وەتا نوێنەری گەورە لە ماڵی ئێمەیە، ئەتۆ خۆمان لێنادەی! بۆ؟

ـ بۆ چی، هاتووشم...

ـ بەڵام ئێستا خۆت دە کونێکی دا مات کردوە، کەس ناتدۆزێتەوە.

ـ وایە، ئاخر ئەمن زۆر دەترسم...

ـ لە چی دەترسی؟

ـ لە عارف سایم بەگی. وا هەست دەکەم هەموو شتێکی دەزانێ... سەبارەت بە هێرش بۆ سەر ماڵەکەی... سەیرم چاو لێدەکا، دەزانێ چم دە دڵی دایە! هەتا ئەو لە وێ بێ، نایەم. هەست دەکەم هەر چاوی بە من بکەوێ، هەموو شتێکی بۆ دەردەکەوی.

ـ ماڵت نەشێوی بۆ ئەقڵت، مورتەزا! ئەوە شێت بووی؟ ئەو چۆن هەست بە شتی وا دەکا؟ چووزانێ ئێمە چمان کردوە؟

ـ نازانی چۆنم چاو تێدەبرێ... ڕوانینەکەی دە سینگی ئینسانی ڕۆدەچێ و... هەموو شتێکی بۆ ئاشکرا بووە...

ماوەیەکی باش پێچوو، هەتا خەلیل بەگی گەورە توانی مورتەزاغای لە کەلی شەیتانی بێنێتە خوار و هێندێك ترسی بڕەوێنێ.

عارف سایم دەستی بە قسان کرد: دۆستان، ئەمن بایرامۆغلی چاك دەناسم. کاتێك یاوەر بووم و ئەویش یاغی بوو، زۆر جاران بۆی وەدەردەکەوتم. بایرامۆغلی پیاوێکی ئازا، بە جەرگ و نەترسە. هەروەها مرۆڤێکی بە بەڵێن و متمانەیە. ئەوەندەی لاو بووم، کاری من ڕاوی یاغی‌یان بووە. زۆرم گرتوون و هێندێکیشم کوشتوون، بەڵام پیاوی ئازای وەك بایرامۆغلیم قەت نەدیوە. بە بڕوای ئێوە چ بکەین کە ئەو لەو گەلاڵەیەی دا ڕەگەڵ ئێمە بکەوێ؟

خەلیل بەگ گوتی:

ـ مورتەزاغا دۆستی نێزیکی وییە. با ئەو لە لایەن ئێمەوە بچێتە لای و باسی لە گەڵ بکا.

ـ ئەتۆ لەو بارەیەوە ەڵێی چی مورتەزا؟ دادەی وەرە پێشی با بتبینین.

مورتەزا لە قولینچکێ هاتە دەرێ و لە سەر کورسی‌یەکی لە تەنیشت عارف سایی دانیشت، بەڵام سەری هەڵنەهێنا و چاوی لە چاوی نەکرد.

ـ باشە، دەچمە ماڵێی، بەگم، ئەگەر ڕازی بوو، دەیهێنم بۆ ئێرە. بەڵام باوەڕ ناکەم ڕازی بێ.

ـ دەبێ بزانی چۆنی قسە لە گەڵ دەکەی. دەبێ نوختە لاوازییەکانی بناسی. دەبێ بزانی ئەو شەرەف و نێوبانگی خۆی زۆر پێگرینگە و هەر بە وانەشەوە دەژی. ئەو دەستی لە چەتەیی‌یە هەڵگرت و لە شەڕی سەربەخۆیی دا بەشدار بوو، بۆچی؟ بۆ ئەوەی نێوبانگ دەرکا. ئەمن نازانم کەسێك کە هێندەی کەیف بەخۆهەڵکێشان و نێودەرکردنێ هاتوە، چۆن توانیویەتی ئەو هەموو ساڵانە بێدەنگ لە گوندە تەریکەکەی خۆی دانیشێ و لەو پەڕی دەسکورتی و هەژاری دا بژی.

مورتەزاغا گوتی:

ـ دە نەداری و چارەڕەشی‌یەکی سەیر دا دەژی! ئەوەندە دەسکورتە تەنانەت ناتوانێ سەرەڕای ئەوەی چای زۆر پێخۆشە، پاکەتچایەك و کیلۆ قەندێکی بۆخۆی بکڕێ!

ـ کە وا بوو...

ـ گۆنی‌یەکی پڕی قەند و چا بۆ دەبەم و پێی‌دەڵێم: ئەوە عارف سایم بەگ لە ئەنکەرەوە بۆی هێناوی... دەبێ دەستێك چاکەت و پانتۆڵی شین، جووتێك چەکمە، کلاوێکی بە گەوەڕ، دەرپێیەك، کراسێك، جووتێك گۆرەویی ئاوریشم و دەسرەیەکی ئاوریشمی سووریشی بۆ بەرین.

ـ وا دیارە لە منی باشتر دەناسی... باشە، بی‌هێنە ئێرە، ئەمن بۆخۆم جێبەجێی دەکەم.

مورتەزاغا هەر چی پێویست بوو کڕی، سوار بوو و ڕۆیی. ئەسپێکی کوێتی جوانیشی برد.

بایرامۆغڵی زۆر بە گەرمی پێشوازیی لێکرد. مورتەزا کاتێك دیارییەکانی دەدایە، دەستی بۆ لای ئەسپەکەی ڕاداشت و گوتی:

ـ هەموو ئەو دیاری‌یانە عارف سایم بەگ بۆی ناردووی!

بایرامۆغڵی ئەوەندە خۆشحاڵ بوو، لە خۆشی‌یان لێوی دەلەرزین:

ـ ئێمە یەکتری چاك دەناسین، هەر بۆیەش ئەو دیاری‌یانەی بۆ ناردووم! ئەو کاتەی یاوەر بوو، زۆر جاران وە شوێن من دەکەوت و تێكهەڵچووغان دەبوو. دواتریش لە سەردەمی شەڕی سەربەخۆیی دا، لە بەرەی هاچینی بە یەکەوە بووین. کە وا بوو ئەمنی لە بیر نەچۆتەوە و دە بیری من دا هەیە... دیارە کۆنە هاوسەنگەر بۆ پیاوی، لە براش نێزیکترە. ئێستا ئەو کۆنەهاوڕێیەی من پیاوێکی بە دەسەڵاتە، وا نیە؟

ـ بە دەسەڵات؟! بایرامۆغڵی، ئەو هێندەی دەست دەڕوا کە دەتوانێ لە سەر مردن و ژیانی هەمووی ئێمە بڕیار بدا. هەر هەموو شتێکی پێدەکرێ. دەتوانێ بۆ وێنە یەکێ لە سێدارە بدا، یەکێ خەنی کا و یەکێ دە قوڕێوە بەرێ. چی پێخۆش بێ، دەتوانێ بی‌کا!

ـ بیستوومە کۆمەڵێك چەتە چوونە سەر مولکی وی. بڵێی کێ بن؟ دەبێ شێت بووبن کە ئەو کارەیان کردوە!

ـ دەڵێن حەمەدۆك بووە...

ـ حەمەدۆك ئاقڵە! ئەو کەسێك نیە بچێ میزی بە دیواری مزگەوتێ داکا!

ـ حەمەد سەعاتەکەشی دزیوە، ئەو سەعاتەی مستەفا کەماڵ پاشا بە خەڵات دابووی بە عارف سایم بەگی. دەڵێن گوتوویەتی ئەو سەعاتە بە نرخە کە پیاوێکی گەورەی وەك مستەفا کەماڵی کردوویەتە خەڵات، تەنیا لە قارەمانێکی وەك بایرامۆغڵی دەوەشێتەوە. دەشڵێن نیازی وایە بێتە لات و سەعاتەکەت پێشکەش کا!

بایرامۆغڵی بەو قسەیەی ئەوەندە تووڕە بوو، دەتگوت پریشکە ئاوری لە تووکی سەر و ڕدێنی دەبنەوە! مورتەزاش کە ئەوەی دی تۆقی: ئای بۆ خاتری خودای. بڕوانە ئەو کابرا بەستەزمانە کە دەڵێی مەڕی خوایە و هێندە بێدەنگ و مسکێنە، چۆن گۆڕا و وەك پڵینگی لێهات! مورتەزا ئەوەی زۆر پێسەیر بوو، لە وێ حەبەسابوو و نەیدەزانی چ بکا. بایرامۆغڵیی کۆنە یاغیش لە داخان دەکوڵی، وەك شێری نێو قەفەسێ لە حەساری دەهات و دەچوو و لە بن لێویەوە هەر ورتە ورتی بوو. ئاخرەکەی هێدی بۆوە و چۆوە لای مورتەزای کە لە ترسان هەموو گیانی ئارەقەی لێدەتکا. بزەیەکی هاتێ و گوتی:

ـ عارف سایم بەگ پیاوێکی ئاقڵە و پێموا نیە باوەڕی بەو چەشنە دەنگۆیانە کردبێ!

مورتەزاغا پشوویەکی هاتەوە بەرێ و زانی لە مەترسییەکی بە ڕاستی ڕزگار بووە:

ـ بێگومان نا! بەڵام لەوانەیە ئەگەر لە گەڵم نەیەی بچین بۆ لای، باوەڕ بکا. بۆخۆشت دەزانی ئەو هەموو شتێکی لە دەست دێ!

ـ بەڵێ... با جارێ بڵێم چایەکی بە ڕەنگمان بۆ ساز کەن.

پاشان چوو بارەکەی کردەوە و کاتێك چاوی بە دیارییەکان کەوت سەری سوڕ ما. هەروا کە چاوی دە شتەکان بڕیبوو، گوتی:

ـ بە ڕاستی جەنابی نوێنەر هەموو ئەو شتانەی بۆ ناردووم؟

ـ بەڵێ، ئەو ئەسپەشی بۆ ناردووی.

بایرامۆغڵی هەستا، گەڕێك بە دەوری ئەسپەکەی دا سووڕا، بە لەپی دەستی لە ملی دا، تێیهەڵڕوانی، دەستی بە یاڵی دا هێنا، شەویلکەی هەڵپچڕی و چاوی لە ددانانی کرد:

ـ ماشەڵڵا ئەسپی چاکە! ئەسپی وا بابیش نایدا بە کوڕی خۆی، براش نایدا بە برای! بە ڕاستی یاوەر لە ماوەی ئەو چەند ساڵانە دا ئەمنی هەر لە بیر بووە!

ئەو جار چوو بۆ لای موڕتەزاغای و دەستی لە سەر شانی دانا:

ـ وا دیارە کەسێك هەیە ئەمنی لە بیر بێ! ئای، یاوەری ئازا!

چاوەکانی بایرامۆغڵی وەك چاوی منداڵێکی کە کۆمەڵێك کەرەسەی گەمەکردنی بۆ کڕدرابێ، دەدرەوشانەوە:

ـ سبەینێ شتومەکی جوان دەبەر دەکەم و خۆم ڕێکوپێك دەکەم، جا سواری ئەو ئەسپە ڕەسەنانە دەبین و دەچینە لای یاوەر عارفی خۆشەویستی خۆم. بڵێی ئەویش وەك من پیر بووبێ...

ئەو جار موڕتەزاغا زۆر خۆشحاڵ بوو. دەسبەجێ نامەیەکی کورتی بۆ عارف سایمی نووسی و ئاگاداری کردەوە کە کارەکەی سەرکەوتوو بووە و بە کوڕە جووتێرێکی مێرمنداڵ دا بۆی نارد. دەسخۆشانەیەکی باشیشی دا بە کوڕەکەی و گوتی زوو نامەکەی بگەیەنێ. لاوەکە دەسبەجێ وەڕێکەوت، ڕۆژی دواتر دوای نیوەڕۆیە گەیشتە شاری، چووە ماڵی خەلیل بەگی گەورە و نامەکەی دایە دەستی.

عارف سایم گوتی:

ـ دەبێ بایرامۆغڵی وەك سەرۆکدەوڵەت پێشوازیی لێبکرێ. دەبێ وای بەپیرەوە بچین مات و سەرسامی کەین!

دەستووریان دا وڵاتیان خاوێن کردەوە. گوڵی هەرە جوانیان لە باغچەکانی شاری چنی، ناردیان لە گوندەکانی دەوروبەریش چی گوڵی بە نێوبانگ و گەش هەبوون هێنایانن و شاریان پێ ڕازاندنەوە . تاقیان لە شەقامی سەرەکیی شاری دروست کردن. نێو بازاڕ ڕێکوپێك کرا. دوکاندارەکان، سەنعەتکارەکان و هەرچی شوێنێکی کار و پیشەی لە نێو شاری هەبوو، دیواری دەوروبەری خۆیان بە ئاڵا، پارچە و گوڵی جۆراوجۆر جوان کرد. هەموو کەلێن و قوژبنی شاری لە بەر خاوێنی‌یان دەترووسکانەوە. تاجە گوڵی ڕەنگاوڕەنگ لە سەر دەرگا و پەنجەران دران. ئەو شارە بچکۆلە لە ڕاستی دا وەك باغی گوڵانی لێهاتبوو. خەڵك جلە هەرە جوانەکانیان دە بەر کردبوو و چاوەڕوان بوون. عارف سایم بەگ سوارێکی بە پیرەوە ناردبوون. ئەرکی ئەو سوارەی ئەوە بوو کە کاتێك چاوی بە موڕتەزاغا و بایرامۆغڵی دەکەوێ، بە خێرایی بگەڕێتەوە و عارف سایمی ئاگادار بکا، تا بە وردی بزانێ کەی ئەوان دەگەنە جێ.

مەیدانی شاری ئاوپڕژێن کرابوو و یەك سەگ و پشیلەش بە دەرەوە نەبوون. ئەو سەگە بەرەڵایانەی بە شێوەی ئاسایی لە نێو شاری ڕاوڕاوێنیان بوو، بێ‌سەروشوێن کرابوون.

ئەم بەیانی‌یە عارف سایم زوو هەستابوو و ریشی رێکوپێك تاشیبوو. کراسێکی ئاوریشمی دە بەر کردبوو و کراواتێکی سووری لە سەر بەستبوو. دەرزیی کراواتەکەی زێڕ بوو و نەقیمێکی ئەڵماسی تێ‌دا بوو. کڵاوێکی جوانی لە سەر بوو و دەستەوانەی سپیی دە دەستی کردبوو. کەوشەکانی بۆیاغ کرابوون و هەر بریقەیان دەهات، وەکازە زێڕ کفتکراوەکەی بە دەستەوە بوو و لەو جلانە دا سام و هەیبەتێکی تایبەتیی هەبوو. هەروەها هەموو کاربەدەست و بەگەکان جلو بەرگی تایبەتیی جێژن و پێشوازیی ڕەسمی‌یان دە بەر دا بوو، هەموو لە حەسارى ماڵی خەلیل بەگی کۆ ببوونەوە و چاوەڕوانی پارێزگاری بوون.

ئەو منداڵانەی دەچوونە خوێندنگە، دەهۆڵکوتەکان، زوڕناچی‌یەکان، ئەندامانی تیپی تۆپی پێ و شەڕکەرە پیرەکان هەرکامە و بە جلی تایبەتیی شێوە کۆن یان نوێی خۆیەوە و کۆمەڵێکیش بە سەر بەرگی مەراشی‌یەوە لە وێ ئامادە بوون. شەڕکەرە بە ساڵداچووەکان میداڵە زێڕە بەندسوورەکانیان دەستۆ دابوو و چەکەکانیان کە بریتی بوون لە شمشێری ژەنگاوی، دەمانچەی زۆر کۆن و هەموو چەشنە تفەنگە کۆنێکی وەك تاپڕ، ساچمەزەن و تفەنگی وا کە ئاسنەکەیان ژەنگ ڕزاندبووی و دارەکەیان مۆرکە لێی‌دا بوو، پێ‌بوون. هێندێکیان دووربینیشیان دە ملی دا بوون. لەمێژیش بوو تیپی هەڵپەرکێی" فاراندۆل" بە جلکی تایبەت و کەوشە سوورەکانیانەوە لە سەر ڕێگای سەرەکی، لە خوارەوەی تەپکی ڕاوەستابوون.

عارف سایم بەگ بۆ دوایین جار چووە بەر ئاوێنەی و چاوی لە خۆی کرد، سمێڵەکانی بادان، سینگی دەرپەڕاند و بە کاوەخۆ بە پلیکانەکان دا، کە لە بن پێی جیڕەیان دەهات، چووە خوار. هەموو ڕایان کردە پێش وی. جەنابی نوێنەر ڕەق ڕاوەستا و بێ ئەوەی چاو لە خەڵکەکەی بکا و بایەخیان پێ‌بدا، دەستی ڕاستی درێژ کرد و ئەوانیش هەرکەس بە نۆرەی خۆی بە هەردووك دەستان دەیانگرت و ماچیان دەکرد. دوای ئەوەش عارف سایم ماوەیەك لە نێو دار هەنار و پرتەقاڵەکانی حەسارەکەی دا قەدەمی لێ‌دا، لە گەڵ هەر هەنگاوێکیش کە هەڵی‌دێنایەوە، سینگی زیاتر دەردەپەڕاند و چەنەی زیاتر دە حەوای دەکرد. هەر بۆیە دە ئاخری دا وای لێ‌هاتبوو نەی‌دەزانی لاق لە کوێ دادەنێ، لە عەرزی، یان لە ئاسمانێ. گەورەکانی شاریش لە بن دیواری ڕاوەستابوون، چاویان لێ‌دەکرد و بیریان دەکردەوە، بە بێ ئەوەی جووڵەی بکەن، یان یەك وشەشیان بە زار دا بێ.

ڕاست پێش کاتی ناغواردنی نیوەڕۆیە سوارێك بە پرتاو هاتە نێو حەسارەکەیەوە، بە شێوەیەکی زۆر جوان و تەردەستانە لغاوی ئەسپی لە پێش جەنابی نوێنەر هەڵەنگاوت، ئەسپی ڕاگرت و گوتی:

ـ ئێستا دەگەنێ قوربان!

عارف سایم بە دەستراوەشاندنێکی، وەك چۆن پیاو مێشێکی لە خۆی دوور دەکاتەوە، وەلامی کابرای سواری دایەوە و بۆخۆشی چوو بۆ لای ماشێنەکەی. شۆفێرەکەی دەرگای بۆ کردەوە. عارف سایم بە خەلیل بەگی گەورە، زولفۆ و مەلا دۆرانی گوت دە گەلّی سواربن و دوای ئەوەی ئەوانیش سوار بوون، ماشێن لە سەرەخۆ وەرێ‌کەوت. بەگ و ئاغاکانی دیکەش بە پێیان بە دوایان دا هاتن و بە دوای وانیش دا پیاو، ژن، مندالّ و پیرەکان وردە وردە دەهاتن.

ئەو خەلّکە بەو شێوەیە لە شاری وەدەرکەوتن و دوای نیو سەعات ڕێپێوان گەیشتنە گۆڕاییی‌یەکی. لە ڕێگایە دا بە پەنا مندالّەکانی خوێندنگە دا کە لە بەر ئەوەی لەمێژ بوو ڕاوەستابوون، ماندوو ببوون، شەڕکەرە کۆنەکان بە بەرگە شڕوشپڕێوە ڕەنگاوڕەنگە کانیانەوە، تیپی تۆپی پیێ بە جلکی زەرد و شینی خەتخەتی ڕاهێنانەوە و ڕیزی ژاندەرمان کە سینگیان دەرپەڕاندبوو، وەك پۆلای ڕەق و ڕاست راوەستابوون و چاویان دە ئاسۆ بڕیبوو، تێ‌پەڕین.

عارف سایم بەگ و هاوڕێکانی تاوێك دە ماشێنەکەی دا مانەوە و کاتێك سەری مورتەزاغا و بایرامۆغلّی لە سەر پنچکەکانی ئەوبەری ڕێگاکەیەوە وەدەرکەوت، بە کەبکەبە و دەبدەبەوە، لە ماشێنێ هاتە خوار و لە پێش دەستەی پێشوازی ڕاوەستا. بایرامۆغلّی ئەسپەکەی ڕاگرت و هاتە خوارێ. دوو هاوسەنگەری کۆن یەکتریان دە ئامێز گرت و هاوکات دەهۆلّ و زوڕنا دەستی بە لێدانێ کرد.

هەر لەو کاتە دا کە ئەو دووە باوەشیان بە یەك دا کردبوو، عارف سایم بەگ سەری بردە بن بن گوێی بایرامۆغلّی و بە سرتە پێی‌گوت:

ـ خێرا سوار بەوە، چاکوخۆشی‌یەش لە گەلّ هیچ کەس مەکە و ڕاست لێ‌خوڕە بۆ پێشێ. بێ‌ئەوەی ئاوڕ لە خەلّکی بدەیەوە، سینگت دەرپەڕێنە، سەرت هەلّێنە و وەك فەرماندەیەك کە دەستەی خۆی دەپشکنێ، بە پێش دەستەکە دا بڕۆ و ڕێوشوێنی پشکنین بە جێ‌بگەیەنە!

بایرامۆغلّی زانی مەبەستی چی‌یە. دەسبەجێ سوار بۆوە و بێ ئەوەی چاو لە دەوروبەری خۆی بکا، بە پێش دەستەی پێشوازی دا ڕۆیی. مورتەزاغاش وەك وی کرد و بە دوای وی دا ڕۆیی.

هێشتا بایرامۆغلّیی کۆنە یاغی لە ڕێوشوێنی پشکنینێ نەبۆوە، کە کۆنەشەڕکەرێك تفەنگەکەی لە سەر شانی هێنا خوارێ و هاواری کرد، ئاگادار بن! دوژمن هێرش دەکا و پاشان تفەنگێکی بە لای شاخی‌یەوە نا. عەرز و ئاسمان بە دەنگی تەقەکەی ئاوازیان دایەوە و بۆنی تیژی بارووتی دە ولاّتی گەڕا. بە دوای وی دا هاوڕێکانیشی هۆشیان لە خۆیان بڕا و تەقەیان کرد. گوللەکان دە نێو خۆیان دا تەقین. هەوا پڕ بوو لە دووکەلّ، هێندێکیان کەوتنە عەرزی و

نیشانیان دا کە ئامادەن جارێکی دیکەش لە ڕێگای نیشتمان دا خۆ بەخت کەن. دەسبەجێ ڕیزێکی دیکە هاتنە پێش و جێگای ئەوانی کەوتوویان گرتەوە کە سینگی خۆیان لە بەرامبەر دوژمن دا کردبوە قەڵغان. خوێن ڕژا و بۆنی باڕووتی هەموو لایەك و شوێنێکی داگرت. ئەو جار شیر و نیزە کەوتنە کار و شەڕەکە گەرم بوو. ئەو شەڕکەرە دێرینانە هێند بە ئۆگری و هەستەوە لە کاری خۆیان دا نوقم ببوون، کە زۆر کەس لە وانەی لە وێ بوون، پێیان وا بوو بە ڕاستی سەردەمی کۆن گەڕاوەتەوە. ئۆ کۆنە شەڕکەری سەر و ڕیش سپی بریندار ببوون و خوێنیان ڕژابوە سەر خۆڵێ...

کاتێك بایرامۆغلی لە پشکنینێ بۆوە، ساتێك لە نێزیك خەلکەکەی ڕاوەستا و بە بێدەنگی چاوی لەو گەمەیەی کرد. ئەوەشی سەیرتر هاتە بەرچاو کە دیتی ڕۆستەمە کورد سواری ئەسپێکی لەڕی بێ زین ببوو و ئەو کابرایە کە سەردەمێك قارەمانێك بوو، شیرێکی ژەنگاویی بە دستەوە بوو کە هەر خوا دەزانی چۆنی پەیدا کردبوو. شیرەکەی ڕادەوەشاند، هاواری دەکرد و دە ئەسپەکەی ڕادەخوڕی. ئەسپی بەستەزمان ئەگەر پەراسووشت هەڵدڕیبان، لە جێی خۆی نەیدەتوانی ببزوێ. دیارە هەر بزووتباش دەکەوت و هەر چوار لاقی دە حەوای دەبوون...

ماشێنی عارف سایی بەرەو شار وەڕێکەوتەوە. بایرامۆغلی و مورتەزاغاش بە سواری هەرکام لە لایەکی ماشێنەکەی دەڕۆیشتن. خەلکەکەی دیکەش، بە شپڕێوی بە دوایان دا دەهات. تیپی هەڵپەڕکێی فاراندۆڵ بە دەلینگە فشەکانیانەوە، شەڕکەرە دێرینەکان، یاریکەرەکانی تۆپی پێ، سەربازەکان و خەلکی ئاسایی، هەموویان بێ ئەوەی بزانن بۆچی، دلشاد و شاگەشکە بوون. دەتگوت سەردەمی شەری سەربەخۆیی‌یە و ئەوان کاتێك بایرامۆغلی‌یان دی، بە جارێك کردیانە هەراو هوڕاکێشان و دیارە ئەویش کە ئەو چەشنە پێشوازی‌یەی لێکرابوو هەستی بە شادی و خۆشبەختی‌یەکی بێوێنە دەکرد...

ماشێنی عارف سایی گەیشتە سەری مەیدانی شاری. شۆفێرەکە ڕای‌گرت، هاتە خوارێ و دەرگای کردەوە. جەنابی نوێنەر هاتە دەرێ، وشك و ڕاست وەك پەیکەرەیەك. بایرامۆغلیش دابەزی. یاوەر لە لایەکی عارف سایی دەڕۆیی، بایرامۆغلی لە لایەکەی دیکەی و بەو شێوەیە گەیشتنە نێوەڕاستی مەیدانێ. ئەو خەلکەی لە نێو شەقام و کۆڵانەکان کۆ ببوونەوە، بە دیتنی وان چەپڵەیان لێدا و هوڕایان کێشا. بە بن تاقەکان دا ڕۆیشتن. لە سەر تاقێکیان بە خەتی گەورە نووسرابوو:" بەخێر بێی بایرامۆغلی" ، بەڵام چونکوو بایرامۆغلی خوێندەوار نەبوو و نەی دەزانی بخوێنێتەوە، عارف سایم دەستی بۆ درۆشمەکەی ڕاداشت و نووسراوەکەی بۆ

خوێندەوە. بایرامۆغلی لە خۆشی‌یان هۆشی لی‌ڕابوو: بەڵێ ئەو وڵاتە ئەوی لە بیر نەچووبۆوە کە خوێنی خۆی لە ڕێگای خەڵك دا دابوو! چاوی پڕ بوون لە ئاو، بە خۆشەویستی و ڕێزەوە لە عارف سایم بەگی ڕوانی و هەر لەو کاتەش دا بیری کردەوە: چاك نەبوو ئەو کاتی، لە چیای کۆنوور، ئەم کابرا سەدسیما و هەزارتوییەم، نەکوشت.

پاشان هاتنە نێو مەیدانەکەیەوە. خەڵکەکە کە ئەوانیان چاوپی‌کەوت هەموو بە یەکەوە گوڕاندیان:" قارەمانی ئێمە بەخێر بێ! بەخێربێی ڕزگاریدەری ئێمە! بەخێر بێی بایرامۆغلی!" لە نێو ئەو هەراوهەنگامەیەش دا لاوەکان سەمای فاڕاندۆڵیان دەکرد و گۆرانیی "بایرامۆغلیی قارەمان"یان دەگوت. ئەو کاتەی بایرامۆغلی بە شاخی‌یەوە بوو، خەڵك ئەو گۆرانی‌یەیان بۆ دروست کردبوو و پێیان هەڵدەگوت. بایرامۆغلی لەمێژ بوو بۆخۆشی گۆرانی‌یەکەی لەبیر نەمابوو و ئێستا کاتێك بیستی‌یەوە، چاوی پڕ بوون لە ئاو، فرمێسکەکانی بە گۆنای دا جۆگەلەیان بەست، بە سەر سمێڵی دا شۆڕ بوونەوە و بە چەنەی دا هاتنە خوارێ.

کاتێك عارف سایم بەگ ئەوی دەو حاڵەی دا دی، دڵی پێی سووتا، پیلی گرت، قامکی بۆ لای ماشێنەکەی ڕاداشت و گوتی:

ــ سوار بەوە، ئەو جێژنە لە بەر خاتری تۆیە و وا زووش تەواو نابێ!

کاتێك گەیشتنە بەر دەرگای ماڵی خەلیل بەگی گەورە، ڕاست کاتی جەمی نیوەڕۆیە بوو و خواردن ئامادە کرابوو. عارف سایم بەگ بە ڕێزەوە، لەگەڵ ئەوەی دەیزانی بەشێك پێیان ناخۆشە، بایرامۆغلیی لە سەرەوە، لە جێگایەکی گونجاو بۆ گەورە پیاوان دانا، بە دەستی خۆی ئارەقی ڕاکیی بۆ تی‌کرد و دایە دەستی. لەمێژ ساڵ بوو بایرامۆغلی ڕاکیی نەخواردبۆوە، تەنانەت هەر لە بیریشی نەمابوو تام و بۆنی چۆنە. عارف سایم پێکەکەی هەڵێنا و گوتی:

ــ ئەو پێکەی بە سلامەتیی بایرامۆغلی، قارەمانی شەڕی سەربەخۆیی، هەڵۆی ئەمری توورڕووسی، ئەو قارەمانەی مستەفا کەماڵ پاشا لە گلێنەی چاوی خۆی خۆشتر دەویست، دەخۆمەوە!

ئەوانەی لە وێ بوون هەموو چاویان لە وی کرد و پێکەکانیان بە سلامەتیی بایرامۆغلی پی‌دا کرد:

ــ بە سلامەتی هەڵۆی ئەمری توورڕووسی!

کاتێك لە نانخواردنێ بوونەوە، نوێژی ئێوارێ ببوو. شەربەت و قاوەیان هێنا و پاشان میوانەکان یەك بە دوای یەك دا خواحافیزی‌یان کرد و ڕۆیشتن. تەنیا ئەوانە مانەوە کە جەنابی.

نوێنەر بۆخۆی پێی‌گوتبوون بیێننەوە. دوای ئەوە، عارف سایم بەگ بایرامۆغلیی هێنا، لە لای خۆی دای‌نیشاند، دەستی دە دەستی نا و گوتی:

ـ داوایەکمان لە تۆ هەیە، بایرامۆغلی.

بایرامۆغلی قسەکەی لە زاری وەرگرتەوە:

ـ سەبارەت بە حەمەدۆکی‌یە؟ وا نیە؟

ـ بەڵێ وایە. ئەو تاوانبارە خاینە کە بە حەمەدۆك ناوبانگی دەرکردوە، ئەو پیاوکوژە خوێنخۆرە، ئیدی بێ‌تامی کردوە. بۆخۆت دەزانی...

لێرە دا چاوێکی لە بایرامۆغلی کرد و ئەویش سەرێکی ڕاوەشاند و ویستی وەڵام بداتەوە:

ـ نەخێر، وەك ئەمن بزانم...

ـ ئەتۆ لە من باشتریش دەزانی، لە گەڵ داوای لێبووردن لە فەرماندەری بەڕێز کە لێرەیە، دەبێ بڵێم ژاندەرمەکان تا ئێستا دەروەستی نەهاتوون و نەیانتوانیوە کۆتایی بە کێشەی حەمەدۆکی بێنن. ئەوە بۆتە ناسۆرێك بە بنەهەنگڵی وڵاتی ئێمەوە و ڕێز و سەروەریی ئێمەی لە پێش چاوی هەموو دنیایە زەدەدار کردوە! ئەو لە دەرەوەی سنوورەکانیشمان ناوبانگی کردوە. ئینگلیسی، فەڕانسەیی و ڕووسیش هەموو دەی‌ناسن! ئەوانیش کە دەزانن ئێمە گرفتێکی بچووکی ئاوامان بۆ چارەسەر نابێ، وەك وڵاتێکی بێ‌دەسەڵات و لاوازمان چاو لێ‌دەکەن! ڕاستی‌یەکەی ئەوەیە ئەگەر بارەکە هەر بەو پێودانەی بڕوا، وڵاتەکەمان، ئەو وڵاتەی کە ئێمە، من و تۆ، بۆ ڕزگارکردنی خوێنمان داوە، تێك‌دەچێ. فەڕانسەیی‌یەکان، ئینگلیسی‌یەکان و تەنانەت ڕووسەکانیش کە دەزانن ئێمە مەسەلەی حەمەدۆکیمان بۆ چارەسەر ناکرێ، دیسان دێنەوە و دە بن چۆکی خۆیانمان دەنێنەوە. کە وا بوو پێویستە ئەتۆ، بایرامۆغلی، دیسان دەست دەیەوە چەکی! ئێمە لە بەرامبەر حەمەدۆکی دا دەستەوەستانین و چمان دە گەڵی پێ‌ناکرێ، هەر بۆیەش داوا لە لە بەوری چالاکی تووڕووسی، واتە بایرامۆغلی، کە وەك شێری دەگرمێنێ، دەکەین، یارمەتیمان بکا! ئەتۆ بە تاقی تەنێ دەتوانێ نیشتمانەکەمان لە ژێر چنگی ئەو جەردەیەی بێنی‌یە دەرێ!

بایرامۆغلی سەری هەڵێنا و دەستی لە سەر چۆکی عارف سایم بەگی دانا:

ـ ئەمن بە حەمەدۆکی ناوەستم! هیچ کەس پێی‌ناوەستێ...

عارف سایم بۆڵاندی:

ـ یانی چی؟ بۆچی پێی‌ناوەستی؟ یانی بستە منداڵێکی ئاوا لە بەرامبەر قارەمانێکی وەك بایرامۆغلی دا ڕادەوەستێ و بە هیچیشی نازانی؟ بەڵێ، بیستوومە ئەو هەتیوە تووتکە سەگە

گوتوویەتی، بایرامۆغلی تەنیا چەتەیەکی کەردزە و ناتوانیّ خۆی لە گەڵ من لە ڕیزێکی دابنیّ! لە هەموو جێیەکیش ئەوەی گوتوە!

ــ دیسان دەڵێم هیچ کەس بە حەمەدی ناوەستیّ!

ــ ئەگەر وا بیّ، کاتێك ئەو دەڵیّ بایرامۆغلی بە مێشێکیش حیساب ناکەم، ڕاست دەکا؟

ــ بەڵیّ، ڕاست دەکا...

ــ چۆن شتی وا دەبیّ؟ بۆچما ئەتۆ بایرامۆغلی نی؟

ــ ئاخر ئەویش حەمەدۆکە...

ــ باشە جا حەمەدۆك و بایرامۆغلی وەك یەکن؟

بایرامۆغلی هەناسێکی قووڵی هەڵکێشا:

ــ ئاخ! ئەو حەمەدۆکە، حەمەدۆك! هەموو دێهاتی‌یەکانی چوکووڕاوایە و تووڕووسی و لە ئاناتۆلی، هەتا دیمەشق و بەغدایەش پشتی دەگرن. هەموو حەمەدیان پیّ پیاوچاکە، پێیان شێخە. بایرامۆغلی چی‌یە؟ بەردێکە دە بنی چالاویّ دا و هەر کەسیش پێی‌نازانیّ. ساڵانێکی زۆرە کەس لێی‌نەپرسیوە! بایرامۆغلی مردوە و ئیدی قەت نایەتەوە... باشە مردویّکی ئاوا کوا پێشی حەمەدۆکی پیّ دەگیریّ؟ ئەمن سنووری خۆم دەناسم، قەت کاری وا ناکەم، ناچم خۆم بکەمە گاڵتە جاڕی خەڵکی، بچم حەمەدی ڕاو بنێم و ببمە خۆراکی سەگ، گورگ و قەلوداڵان! وای دابنێین کە من بتوانم بە سەر حەمەدی دا زاڵ بم، بی‌کوژم، یان بی‌گرم، ئەو دەم ئەو جووتێرە حێڵدرێژە کەوش قایشانە کە بە ڕاوڵەت هێندە شەرمێونن ناتوانن سەر هەڵێنن و چاو لە چاوی پیاوی کەن، هێندەم تف لیّ‌دەکەن، دە تفیّ دا دەم‌خنکێنن و تەرمەکەم لە سەر سەرگوێلکیّ فڕیّ‌دەدەن! نا بابە، ئەوە کاری من نیە و هیچ کەسیش حەمەدۆکی پیّ لە نێوناچیّ!

ــ بایرامۆغلی نەبیّ! بایرامۆغلی پێی‌لە بەین دەچیّ! بایرامۆغلی کۆڵەکەیەکی بەهێزی کۆماری تورکیەیە، کە توانیویەتی بە سەر گەورەهێزەکان دا زاڵ بیّ و هەروەها پشتویەنای سەربازەکان، ئەفسەرەکان، ئاغاکان و بەگەکانە! باشە ئەو ڕەشووڕووتانە لە بەرامبەر ئێمەی ئاوا بەهێز دا چی‌یان لە دەست دیّ؟

ــ ئەدی ئەگەر وایە بۆ چەندین ساڵە نەتان‌توانیوە ئەو بستە منداڵەی ــ وەك بۆخۆت دەڵێی ــ بگرن؟ بۆ نەتان‌توانیوە کوڕە جووتێرێکی کە خوێندەواریشی نیە و ئاوا کەوتۆتە بەرامبەرتان بگرن؟ ئێستا بۆ هاتوون داوا لە کابرایەکی پیری وەك من دەکەن کە لە جیاتیی ئێوە بچیّ بی‌گریّ؟

عارف سایم بەگ هەستایە سەرپێ، بە لەقان وەرگەڕا دەوروبەری خۆی و دەستی بە گوتنی قسەی ناحەز و سووکایەتی بە بایرامۆغلی کرد. بایرامۆغلیش لێیﻧەپێچایەوە، هەستا سەرپێ و دە هێندی قسەی سووك و جنێو بە عارف سایمی دایەوە. ئەوانەی لە وێ دانیشتبوون، لە ترسان زاریان هەڵتەدەپچڕا، خۆیان چکۆڵە کردبۆوە و چووبوون دە قولینچکانەوە. دیارە ڕقیان زۆر لە بایرامۆغلی هەستابوو، بەلام تا ڕادەیەك زگیشیان پێیدەسووتا. لە دڵی خۆیان دا دەیانگوت ئیدی بایرامۆغلی تێدا چوو. چۆن؟ یانی کەسێك بوێرێ ئاوا سووکایەتی بە جەنابی نوێنەر، کە ئەو هەمووە شانازی و ڕێزەی هەیە، بکا و چاوەڕوانی ئەوەش بێ کە هەر وا بۆی دەرچێ؟ وەڵلا عیزرائیلیش ڕوحی نەکێشێ، ئەو دەیکێشێ. تەنانەت عیسمەت پاشاش بۆی نیە لە بەرامبەر وی دا ئاوا بجووڵێتەوە. باشە بایرامۆغلی بایرامۆغلییە، بەلام ئیدی مافی ئەوەی نیە ئاوا بە ئاشکرا و لە پێش چاوی خەلکی دیکە سووکایەتی و گاڵتە بە کەسێکی وەك عارف سایم بەگی بکا.

جەنابی نوێنەر هەر وا بە لێشاو جنێو و قسەی سووکی لە زاری دەهاتنە دەر و بایرامۆغلیی کۆنە یاغیش کەم و زۆر نەیدەپاراست و جار لە جارێ خراپتری پێدەگوت. دەو بەینەی دا جار جار عارف سایم بەگ ڕادەپسا و دەیەویست خۆ بە بایرامۆغلی دادا، بەلام خەلیل بەگ دەستبەجێ دەچووە بەینیانەوە و نەیدەهێشت...

جەنابی نوێنەر ڕانەدەوەستا، سوور هەڵگەڕابوو، پشووی سوار ببوو و هەر دەفی دەدان. دەو حاڵەی دا لە بایرامۆغلی چووە پێشێ و گوتی:

ــ ئەها، ئەتۆ بووی، وا نیە؟ بەڵێ ئەتۆ بووی حەمەدۆکت ناردە سەر ماڵی من! چەتەی بەدبەختی ماڵوێران! مریشك دز! بەڵێ ئەتۆ بووی گوتت کوێخای من بکوژن! حەمەد سەعاتەکەی بابیشمی هەر داوە بەتۆ! ئەو سەعاتەی بابم لە دەستی مستەفا کەماڵ پاشای وەرگرتبوو! هەموو ئەو تالانکردن و تاوان و کوشتنانە دە بن سەری تۆ دان! حەمەدۆکەکانیش هەموو ئەتۆ دروستت کردوون! ئەتۆ هاوڕێی بە نرخمان کە دەڵێی دەستم لە یاغیگەرییە هەڵگرتوە، لە دێیەکەی خۆم دانیشتووم و بە پارووە نانێکی ڕازیم!

هەر دەی گوڕاند و قامکی ڕادەوەشاند. هێندەی نەمابوو قامکی دە چاوی بایرامۆغلی ڕۆکا و کوێری کا:

ــ لە دارت دەدەم! هەر لە نێوەڕاستی ئەو شارەی لە دارت دەدەم! پێتوایە دەتوانی لە دەستم دەرباز بی؟ جا با ئەو کاتی کە کەلاکەکەت بە دارێوە ڕادەژێ، ئەو دێهاتییە تاوانبارانە هەر بگرین، لە دەورت قوڕی وە سەر خۆ بکەن و بەیت و حەیرانانت بۆ ساز کەن!

پشوویەکی هاتەوە بەر، ددانی دە چیڕەوە بردن و گوتی:
ـ دەبێ تەمبێت کەم، بەڵێ، دەبێ هەڵتواسم! پیاوکوژ! سەگی گلاو!
ـ سەگی گلاو بۆخۆتی و بابتە!
بێباکی و لەسەرەخۆیی بایرامۆغڵی عارف سایمی مات و حەیران کردبوو. بایرامۆغڵی دەیزانی کە ئیدی هیچیان دە بەین دا نەماوە و عارف سایمیشی چاك دەناسی و ئاگادار بوو کە ئەو کابرا دڵڕەقە هەموو چەشنە ستەم و دڕندەیی‌یەکی لە دەست دێ. لە دڵی خۆی دا گوتی دەزانم وام دە سەرەوە ناچێ، بەڵام لە بەری دانانوێنم. قیروسیا، چ دەبێ، با ببێ. هەر بۆیە بە دەنگێکی بەرز و نێرانە گوتی:
ـ چاکم گوێ لێ بگرە یاوەر عارف! دەزانم ئەتۆ چی و تاج ڕادەیەك دەسەڵاتت هەیە! چت لە دەست دێ بی‌کە! لە دارم دە! لەتویەتم کە! هەر بەکە پرپۆڵە! منەتم پێت نیە و دەست مەپارێزە! ئەمن بۆ تنۆکە خوێنێکی ناپارێمەوە! بەڵێ، ئێستا دەسەڵاتت هەیە و ئەوانەت پێ‌دەکرێن، بەڵام ئەمن لە چیای کۆنووری ئەتۆم ناسیوە و زانیومە چ پیاوێکی! وەبیرت نایە ئەو کاتی چۆن خۆت داویشتە بەرپێم، لە بەر پێم دا وەك سەگ دەتلایەوە، لاقت ماچ دەکردم و ئامادە بووی قوونیشم ماچ کەی، بۆ ئەوەی بتبەخشم! وەڵڵا لە وێ ئابرووی هەموو مرۆڤێکت برد و ئەمن لە جیاتیی هەموو ئینسانەکان شەرمم لە خۆم دەکرد کە دەمدی کەسێك ناوی خۆی ناوە ئینسان، بەڵام تا ئەو ڕادەیە زەبوون، خوێڕی و ترسەنۆکە کە ئاوا لە بەر پێی من دەتلێتەوە و دەپاڕێتەوە!
عارف سایم هەڵی‌کێشا دەمانچەی، سێرەی لە بایرامۆغڵی گرت و گوللەیەکی تەقاند، بەڵام خەلیل بەگی گەورە کە لە پشتی ڕاوەستابوو دەستی وەبەر دەستی دا و گوللەکە وە دیواری کەوت:
بایرامۆغڵی کە لە جێێ خۆی نەبزووت و هەر سەریشی لا نەدا، قاقایەکی کێشا و گوتی:
ـ بە وەی دەمترسێنی، یاوەر عارف؟ پێتوایە ئەمن وەك تۆ، بۆ دوو تنۆکە خوێنان دەپاڕێمەوە و خۆم دەکەمە پەڵەی شەرمی سەر داوێنی هەموو ئینسانەکان؟ دەی تەقەم لێکە خوێڕی! ئەتۆش خەلیل بەگە وردە لێی‌گەڕێ با بە کەیفی خۆی سێرەم لێبگرێ، با گوللەکەی بە فیڕۆ نەچێ!
مووڕتەزاغا و زولفۆ هەستان، باوشیان بە عارف سایم بەگی داکرد، بردیانەوە جێگاکەی خۆی و دایاننیشاندەوە. جەنابی نوێنەر نارەقەی ڕەش و شینی دەرکردبوو و وەك مێژۆکەی دەلەرزی. هێنایان دەسرەیەکیان بە عەتر و ئاوێ تەڕ کرد، نارەقەکەیان لێ سڕی‌یەوە،

سەروچاوی‌یان پێ فێنك کردەوە و ڕاکی، قاوە و چایان لە پێش دانا. بایرامۆغڵی بۆ لای دەرگا چوو کە بڕوا. عارف سایم بەگ هاواری کرد:

ـ مەیەڵێ بڕوا! ئێمە هاوڕێی کۆنی یەکترین! قەیدێ ناکا، شتی وا لە بەینی دۆست و هاوڕێیان دا دێتە پێشێ!

بایرامۆغڵیش کە گوێی لە وەی بوو، گەڕایەوە و دانیشتەوە. بزەیەکی هاتێ، زۆر خۆشحاڵ بوو کە لە بەڵایەکی گەورە ڕزگار بووە و دوای ساتێك گوتی:

ـ ڕاست دەکا، ئێمە هاوڕێی کۆنین.

عارف سایم گوتی:

ـ قاوەی بۆ بایرامۆغڵی بێنن! دۆستایەتیی ئێمە زۆر کۆنە و بەو شتانە تێك‌ناچێ... ئێمە، من و ئەو، نیشتمانمان ڕزگار کردوە...

بایرامۆغڵی بە دوای وی دا گوتی:

ـ شانبەشانی یەکتری... بە یەکەوە...

ـ نەدەبوو ئەو بچێتەوە شاخی و ئێمە بە جێ‌بێڵێ...

ـ ئەمن دانیشتم. هیچ یاغی‌یەك هێزی لە بڕان نەهاتووی نیە...

ـ بایرامۆغڵی هەی‌بوو...

هەردووکیان هێدی ببوونەوە. ئەو جار یەکتریان ماچ کرد و دستیان بە جەفەنگ و گاڵتەکردنێ کرد. قەت باوەڕت نەدەکرد کە ئەو دووانە ساتێك پێشتر خەریك بوون یەکتر بکوژن... دەستیان بە قسان کردەوە و باسی حەمەدی هاتەوە گۆڕێ.

بایرامۆغڵی گوتی:

ـ چونکوو من و تۆ دۆستین و زیاتریشین، پێم‌خۆشە درۆت دە گەڵ نەکەم و ڕاست و ڕەوان بۆچوونی خۆمت لەو بارەیەوە بۆ باس بکەم. کێشەی حەمەدۆکی بە ناردنی سەربازی زۆرتر و لە سەر یەك بە شەڕ چارەسەر ناکرێ، عارف سایم بەگ!

ـ بۆ ناکرێ؟

ـ چونکە ئەو بەردە تروسکەدارەکەی پێیە.

عارف سایم بەگ قاقای کێشا:

ـ ئەو بەردە بە کاری چ دێ؟

ـ کەسێك ئەو بەردەی پێ‌بێ، گوللە کاری لێ‌ناکا.

ـ چۆن باوەڕ بەو شتەی دەکەی؟ کاتی خۆی بە تۆشیان وا دەگوت.

ـ جا ئێستاش گوللە کارم لیٚ ناکا. هەر ئێستا بە چاوی خۆت نەتدی؟

هەموویان پیٚکەنین، بەڵام پێکەنینەکەیان زۆر لە دڵەوە نەبوو.

ـ ئاخر حەمەدۆك دوعا و ودمی خانەقای چلچاویشی پێیە و ئەو شتانە لە هەموو بەلایەکی دەپارێزن...

ـ لێمانگەڕیٚ بایرامۆغلی، بۆ خاتری خودای... بە ڕاستی ئەتۆ باوەڕت بەو شتانە هەیە؟

ـ ئەو جار دایە سوڵتان کراسی سوڵتان سەلاحەدینیشی داوتیٚ. کەسێك ئەو کراسەی دەبەر دا بیٚ، نابینریٚ...

ـ گاڵتەم پیٚدەکەی بایرامۆغلی، وا نیە؟

ـ نا گاڵتە ناکەم. بۆچما ئەو بارگینە لەڕولاوازەی گوتیان ئەسپی حەمەدیە و هێنایان نە پێش چاوی خەڵکی گوللەبارانیان کرد، زیندوو نەبۆوە و نەبوو بە ئەسپێکی پیرۆز؟ هەڵنەفری بۆ ئاسمانیٚ؟ هەموو بەیانییان بە سەر سەری ئێمە دا، بە سەر شار و گوندان دا نافڕیٚ و ناحیلێنیٚ؟ خەڵك هەمووی لە گەڵ حەمەدۆکیە و پشتی دەگرن. خانەقای چلچاوی، هەموو شێخ و پیاوچاکەکان و هەموو تیرە دینییەکان بە سوننی و شیعەوە خۆشیان دەویٚ و لە گەڵ وین. پێشتریش کە من یاغی بووم، یارمەتیی منیان دەکرد، دیارە هەموویان نا، هێندێکیان. جا لە جیاتیی وەی کە لێرە دانیشین و بە گژ یەك دا بچین، وا باشترە بیر لە چارەسەرێکی ڕاست و گونجاو بۆ ئەو گرفتەی بکەینەوە.

عارف سایم بەگ گوتی:

ـ بە زیندوویی، یان بە مردوویی، دەبیٚ حەمەدی هەر بگرین!

هەر وا دانیشتن، هەتا بەری بەیانی ڕاکی، قاوە و چایان خواردەوە و سەبارەت بە حەمەدی قسەیان کرد، بەڵام ئیدی بە ئارامی و بیٚتەوەی پێکهەڵپرژێن و بەگژ یەك دا بچن. عارف سایم بەگ بە ڕاستی بایرامۆغلیی وە بەر دڵی کەوتبوو و بیری دەکردەوە: ئای ئەو کابرایە چەندە ئاقڵ، نازا و دڵسۆزە و چەندە پاك و میهرەبانە! باوەڕی هێندە بە خودای هەبوو و هێندە پاك و بیٚخەوش بوو، کە عارف سایم سەری سوڕ مابوو و دڵنیا بوو کە ئەو دەستی لە هەموو شتێك کێشاوەتەوە. ئەریٚ بە ڕاستی ئەو پیاوە دڵپاکە چۆن توانیویەتی یاغی بیٚ و ساڵانێکی زۆر بە شاخییەوە بیٚ؟ هەموو جاریٚ کە دە شەڕیٚ دەکەوت، بە شێوەیەکی سەیر، کە زیاتر وەك موعجیزەی دەچوو، ڕزگار دەبوو. بۆ وا بوو؟ خۆ منداڵێکیش دەیتوانی جارێکی گوللەیەکی پێوە نیٚ و بیکوژیٚ.

بەری بەیانی، پێش مەلابانگدانێ لە پڕ شتێکی وەبیر هاتەوە، ڕوخساری گەش بۆوە، بە پانایی‌یە بەری دەستی لە نێوچاوانی خۆی دا و بە دەنگی بەرز گوتی:

ـ ئەها، هێندەی نەمابوو لە بیرم بچێ! چاو ئەمن چەندە بە هۆشم؟ وەڵڵاهی تاوانی بایرامۆغلی‌یە کە شتی هەرە گرینگی لە بیر بردمەوە... دا تۆخوا خەلیل بەگ ئەو تفەنگ و فیشەکدانەی بێنە، با دیاریی بایرامۆغلی بدەینە دەست خۆی!

خەلیل بەگی گەورە، کە دەت‌گوت لەمێژە چاوەڕوانی ئەو قسەیە، دەسبەجێ هەستا، چوو لە ژوورەکەی تەنیشتێ کاڕابینێکی بە فیشەکدانەوە هێنا و دایە دەستی عارف سایم بەگی. ئەویش وەك ئەوەی شتێکی پیرۆز و گرینگی بە دەستەوە بێ، بە ئەسپایی ڕەخت و تفەنگەکەی لە سەر کۆشی دانان. لەو حاڵەی دا بە تەواوی وشیار ببۆوە و ڕوخساری ئەوەندە مەند و پڕ لە شانازیی دەنواند، دەت‌گوت دەیەوێ بڵێ: کێوە بچووکەکانم بۆخۆم پەیدا کردوون و ئەوانی هەرە بەرز و گەورەشم لە بابم بۆ بە میرات ماوەتەوە. لە حاڵێك دا هەردووك دەستی لە سەر تفەنگ و فیشەکدانەکەی دانابوون، چاوی دە چاوی بایرامۆغلی بڕی و گوتی:

ـ بایرامۆغلی، بەڵێ، یان نەخێر؟ وە دوای حەمەدۆکی دەکەوی و دەی‌گری، یان نا؟

دەسبەجێ وەڵامێ درایەوە:

ـ نەخێر!

ـ با، دەی‌کەی! بە شانازیشەوە دەی‌کەی! گوێم لێ‌بگرە: ئەو تفەنگ و ڕەختە لە لایەن مستەفا کەماڵ پاشایەوە بە دیاری بۆ تۆ ناردراون. ئەو منی ڕاسپارد کە سڵاوی ویشت پێ‌بگەیەنم و گوتیشی: بایرامۆغلی کەسێك نیە لە حەمەدۆکان بترسێ، جا چ گەورە بن و چ بچووك. ئەگەر حەمەدۆك حەمەدۆکە، بایرامۆغلێش هاوڕێ و هاوسەنگەری منە. چۆن یاغی‌یەك دەتوانێ کێوەکانی من لە شوێنێك بکاتە مەیدانی ڕاوڕاوێنی خۆی، کە بایرامۆغلیی لێ‌دەژی؟

پاشان بە هەردووك دەستان بە ئەسپایی تفەنگ و فیشەکدانەکەی هەڵگرتن و لە سەر کۆشی بایرامۆغلی دانان. خۆر تازە لە ئاسۆ سەری وەدەرنابوو، ئاسنی نوێ و خاوێنی تفەنگەکەی لە ژێر باریکە تیشکێك کە لە کەلێنی پەنجەرەوە لە ژوورەکەی دابوو، بریقەی دەدا و بایرامۆغلیی کۆنە یاغی ئەی دەتوانی چاوی لێ‌بکاتەوە. قەراغی فیشەکدانەکەش زێڕکفت بوو. کاتێك بایرامۆغلی سەری هەڵێنا، چاوەکانی پڕ ببوون لە ئاو:

ـ مستەفا کەماڵ ئەمنی لە بیر بوو...

پاشان بە دەنگێکی کز و لەرزۆکەوە گوتی:

ـ چاو لە من کە! تۆخواکەی! بە ڕاستی پێموابوو کەس نەمنی لە بیر نەماوە و وەك بەردی بن چالاوێم لیٚ‌هاتوە... جەنابی ژێنراڵ منی لە بیرە... من و ئەو... کاتی خۆی... یاوەر عارف، بۆخۆت دەزانی کە من هەمیشە دە خزمەتت دام. ئەمن هاوسەنگەری وی بووم... هەزار ڕوحیشم بوایە، هەمووم بە قوربان دەکرد... بەڵێ، ئاوا، بۆخۆت دەزانی... حەمەدۆك...

پاشان قاقایەکی کێشا و چەند جاران لە سەر یەك گوتی:

ـ ئەو حەمەدۆکە، ئەو بستە مندالە...

## (٢٠)

که گەیشتە سەر بەرزاییەکەی، دێیەکەی لێ وەدەرکەوت. بیری کردەوە: بە ڕاستی ئەو دێیە ئاوا بچووك و خانووەکانیشی ئاوا نزم بوون؟ تەنانەت عەلیکۆش کە سەری دە هەوران دابوو، لە بەر چاوی وی بچووك دیار بوو. ئەوە زۆر سەیر بوو.

هەر کە چاوی بە گوندەکەی کەوت، دڵی کەوتە لێدانێکی توند و شاگەشکە بوو. ئاوزەنگیی لە ئەسپی توند کرد، بەڵام چونکە بارەکەی زۆر بوو، ئەسپەکە نەیدەتوانی بە کەیفی وی لینگ دا و ئەگەر توندیش ڕۆیشتبا، بارەکە لار دەبوو، هەر بۆیە یەکبەخۆی دەیقیژاند و ئەسپەکەی هێور دەکردەوە، بەڵام کاتێك ئەسپەکە بە تەواوی لە غار دەکەوت، دیسان ئاوزەنگیی توند دەکردەوە و قامچی لێ‌هەڵدەسووڕاند.

بەڵێ، دیارە ئەو شارە، بە دەریا بێ سنوورەکەیەوە، بە گوندەکانییەوە، بە باغە پرتەقاڵەکانییەوە، بە خانووە ڕازاوەکەی حەمەدییەوە، بە سەیران، مەلاسەلام، مامۆستای وێنەگەر و ئەوانی دیکەشەوە بە ڕاستی خۆش بوو، بەڵام ئەو یەکجار زۆری وەڕەزیی ئەو دێیەی خۆی کردبوو! ئەوەندەی وەڕەزی کردبوو، چی دیکە خۆی پێ‌ڕانەدەگیرا... ئەگەر حەمەد مابایەوە، ئەو هەستە هێندە زیندوو نەدەبۆوە، یان ئەوەندەی پاڵ پێوە نەدەنا، کە ناچار بوایە دەریخا. کاتێك بۆنی شاخی بۆ هات و چاوی بە ماڵەکانی گوندەکەی کەوتەوە، بە تەواوی تێگەیی کە ئەو شوێنەی ئاوا بە توندی تاسەی دەکرد، ئێرە بوو.

دیسان ئاوزەنگی توند کرد و دەنگی ئەسپەکەی دا:

ــ یاڵڵا، کوڕی گاوری! یاڵڵا!

لە پڕ حاجی وەلیی کوڕی ساڵە یەکدەستی لە نێو پنچکان هاتە دەر، خەریك بوو دۆخینەکەی دەبەستەوە. دایە حۆری پێی‌خۆش نەبوو دەو حاڵەی دا قسەی لە گەڵ بکا و ئەسپەکەی دەنگ دا بۆ ئەوەی لێی ڕەد بێ و دوور کەوێتەوە:

ـ یاڵڵا، نەگبەت، یاڵڵا!

بەڵام وەلی کە لە نێوەڕاستی ڕێگاکەی ڕاوەستابوو، لە پڕ ئاوڕی دایەوە و کاتێك چاوی بە وی کەوت، دەستی بە غاردانێ کرد. دایە حۆری تووڕە بوو، قەمچی هەڵسووڕاند و کەوتە سەری. زۆری پێنەچوو گرتی‌یەوە و هاواری کرد:

ـ خوێڕی ڕاوەستە! بۆچی هەڵدێی؟

کوڕەکە نەیوێرا چی دی هەڵێ و ڕاوەستا. چاوی لە ژێرڕا هاتبوون، دەتگوت خەریکن دەرپەڕن.

ـ هەتیوە بیژووە نەگبەتە، بۆچی هەر منت دی، دەرپەڕی؟ ئاخر ئەتۆ حاجی وەلیی کوڕی برایم یەکدەستی نی؟

وەلی وەڵامی نەدایەوە. هەر چاوی لێدەکرد و قسەی بۆ نەدەهات.

ـ ئەوە بۆ وا لاڵ بووی؟ زەرگەتە بە زمانی‌یەوە داوی، خوێڕی؟ بۆ وەك کێوی‌یان هەر وا ڕاوەستاوی و چاوم لێدەکەی؟

بەڵام هەرچەندی هەوڵی لە گەڵ دا، کوڕە زاری هەڵنەپچڕا. دایە حۆری تووڕە بوو:

ـ وەلی نەگبەت، دەڵێی خودا ئەمنی خۆشنەویستوە کە تووشی تۆ بووم. پێم بڵێ چ قەوماوە؟ گوندەکە بە قوڕێ گیراوە؟ بابت مردوە؟

ئاخرەکەی کوڕە زمانی کرایەوە:

ـ بابم نەمردوە.

ئەو جار گوتی:

ـ ئەمن ناوم حاجی وەلی نیە...

ـ ئەدی ناوت چی‌یە؟

ـ حەمەد...

دایە حۆری کە تا ئێستا لە داخان دەتگوت لێکەوە بوو، قاقا پێکەنی:

ـ ئاوا! وا بڵێ... دە ئەگەر وایە هێندێك هەنگاو هەڵێنەوە و خێراتر بڕۆ... ڕاست دەچینە بەر دەرگای ئێمە و تۆ دەبێ یارمەتیم بکەی ئەم بارەی لەو ئەسپەی بکەمەوە.

وەلیی مێرمنداڵ بە قسەی دایە حۆریی کرد، وە پێشی کەوت و باش ڕۆیی، هەتا گەیشتنە نێو دێی، بەڵام لە لای ماڵی دایە حۆری ڕانەوەستا. دایە حۆری هاواری کرد:

ـ ڕاوەستە گێلە! بۆچما نازانێ ماڵی من ئێرەیە؟ وەرە ئەسپەکەم بۆ بگرە!

وەلی گەڕایەوە و لغاوی ئەسپەکەی بۆ دایە حۆری گرت، بەڵام هەر وا تێیەوە ڕادەما و تێی‌هەڵدەڕوانی. دایە حۆری بیری کردەوە: پەنا بە خودای، دەبێ شتێك ڕووی دابێ، بەڵام چی؟!
لە ئەسپەکەی هاتە خوارێ و لغاوەکەی لە وەلی وەرگرتەوە:
ــ ئەو بوخچەیەی لە پاشتەرکێم دابەستوە، بکەوە، زۆر بە ئەسپایی بی‌هێنە خوارێ و دوایە بی‌بە ژوورێ. ئەوە هێندێك شووشەی تی‌دان، یەکیان بشکێ، چاوت دەردێنم!
وەلی زۆر بە ئەسپایی بوخچەکەی هێنایە خوارێ، وێنەکانی هێنایە دەر و لە سەرەخۆ بە دیوارییەوە نان.
ــ ها ئەو کلیلەی! دەرگاکەم بۆ بکەوە!
وەلی کلیلەکەی وەرگرت، دەرگاکەی کردەوە، لە پێش دا وێنەکان و دوایە شتومەکەکانی دیکەشی بردە ژوورێ. لەو کاتەش دا بیری دەکردەوە: ئەوەی ئەو ئەسپەی بار کردوە، بە ڕاستی پسپۆڕ بووە! ئەوە باری سێ ئەسپانە، نەك ئی یەکێ!
ــ ئەسپەکەی لەو کۆڵەکەیەی ببەستەوە!
دایە حۆری چووە ژوورێ و تەمەشایەکی نێومالەکەی کرد. دەسبەجێ بۆنێکی ناسیاوی وەبەر لووتی کەوت. ئەو بۆنە لێرە نەبێ، لە هیچ کوێ نەدەهات و بەو بۆنەی مالەکە بەخێری دێنایەوە. لە دلی خۆی دا گوتی: بلێی هیچ شوێنێك لێرە جوانتر، گەرموگوڕتر و خۆشتر بێ؟ بێ‌گومان نیە! ئەو جار پەنجەرەکانی کردنەوە. کۆلەکە ئەستووره مۆرکەلێدراوەکەی نێوەڕاستی ژوورێ کە لەمێژساڵ بوو میچی خانووەکەی ڕاگرتبوو، بریقایەوە. ئالاش و ئالووداره‌کان دە قورمی دا نوقم ببوون و ڕەش هەڵگەڕابوون. جالجالۆوکە هەموو کەلێن و قوژبنی میچەکەی تەنیبوو. دەستێکی بە سەر بەرەکانی داهێنا، کە بۆخۆی کردبوونی و هەروەها دەستەنوێنەکانی، جاجم و فەرشەکانی و هەموو شتەکانی دیکەشی بە سەر کردەوە و دەستی لە سەر هەر کامیان دادەنا، دەی‌گوت: ئای چەندم وەرەزی کردبووی.
لە پڕ حاجی وەلیی وەبیر هاتەوە و چۆوە دەرێ. ئەسپەکە ڕێکوپێك بە کۆلەکەیەوە بەسرابۆوە، بەڵام کوڕەکە دیار نەبوو. یەك دوو جنێوی بۆ وەلی و بابوباپیریشی بەڕێ‌کرد. لەو کاتە دا دیسان بیری چووە سەر بارودۆخی دێیەکەی و سەری سوڕ ما. ئاخر زۆر سەیر بوو. هیچ‌کەس بە دەرەوە نەبوو، نە کەرێك دەی‌زەڕاند، نە کەلەشێرێك دەی‌خوێند و نە سەگێك دەوەڕی! دەت‌گوت ئەو دێیە بۆتە گۆڕستان. چووە دەرێ، گەڕێکی بە نێو دێی دا لی‌دا و هاتەوە، بەڵام یەك کەسیشی چاو پی‌نەکەوت. هەروا کە دەهات و دەچوو، هەر بۆلەی دەهات و ئەوەندەی توانی جنێوی بۆ خەلکی

دێی بەڕێدەکرد، کە ئاوای بەپیرەوە هاتبوون. دەیگوت قەرار بێ دەرگا لە یەك کەسی ئەو دێیەی نەکەمەوە، کە ئاوا دەرگایان لە سەر من داخستوە و بە پیرمەوە نایەن. دیارە پێشی خۆش نەبوو بۆخۆی بچێتە ماڵەکان و بزانێ چ بە سەر ئەو خەڵکە بێتەمەگەی هاتوە.

دوو سەتڵی بە دەستەوە گرتن و چوو بۆ کانیەیە ئاوێ بێنێ. گوتیشی بەڵکوو لە ڕێی کانیەیە تووشی کەسێکی بم، بەڵام نا، وڵات چۆڵوهۆڵ بوو. لە سەر کانیەیە دانیشت و تاوێکی چاك حەسایەوە. دەنگی خوڕەی ئاوی کانیەکەی نەبێ کە لە پەنای دەرژا خوارێ، هیچ دەنگێکی دیکە نەدەبیسرا. دنیا هەمووی لە ژێر تیشکی ڕۆژێ دا دەبریسکایەوە. لەو بەری، لە خرێ گێوژان، دووکەڵە شینکەیەکی باریك دە حەوای هەڵدەچوو. باشە ئەو خەڵکە چیی بە سەر هاتوە؟ بۆ ئەو دێیە کەسی تێدا نەماوە! خۆ ئەگەر ئاگاشیان لێنەبووبێ کە من هاتوومەوە، دەبێ کوڕی یەکدەستی پێی گوتبن!

بڕیاری دا چی دیکە بیر لەوە نەکاتەوە. لە دڵی خۆی دا گوتی، چاویان دەرێ با هەر نەزانن. سەتڵەکانی پڕکردن و کاتێك گەیشتەوە ماڵێ، جوان ماڵەکەی گەسك دا و خاوێنی کردەوە. نوێنوپانەکەی تۆزتەکێن کرد، تەونە جاڵجاڵۆکەی لە کەلێن و کولێنان کردەوە، مافوورەکانی بردنە حەسارێ، تەکاندنی و هێنای ڕایخستنەوە. پاشان وێنەکانی لە بوخچەکەی دەرهێنان. زۆر خۆشحاڵ بوو کە هیچیان نەشکابوون. وێنەکەی حەمەدی، ئەوەی کە حەمەد تێیدا سواری ئەسپە جوانەکەی ببوو، بە کۆڵەکەیەوە هەڵواسی، دیواری ئەوبەری وێنەی حەزرەتی عەلی وەبەر کەوت و دایە حۆری کاتێك وێنەکەی هەڵدەواسی، گوتی ئیمام ئەو لادیوارە هەمووی بۆ تۆ! وێنەکەی ئادەم و حەواشی بە بزمارە گەورەکەی لای ڕاستەی ئاورگەکەی داکرد و لە لای چەپی ئاورگەکەش وێنەی ژنە جوانەکەی هەڵواسی، ئەو ژنەی بە سەر بنیادەم و بە لەش هەژدیها بوو... پاشان یەك بە یەك لە بەرامبەریان ڕاوەستا و تێروپڕی چاو لێکردن.

هێشتا بارەکەی نەکردبۆوە. بە تووڕەیی لاقی دە عەرزی کوتا و گوتی: نەهاتن، چاتر! با هەر نەیەن و بەخێرهاتنم نەکەنەوە. کاتێك گوێی لە دەنگی خۆی بۆوە و زانی چەندی تووڕەیی پێوە دیارە، پێیسەیر بوو. ڕووی دە وێنەکەی حەزرەتی عەلی کرد و بە شێوەیەکی هێندێك هێدیتر گوتی:

ــ ئەو هەموو شتە جوانەم بە دیاری بۆ هێناون، بەڵام وەڵڵاهی یەك شتیشیان نادەمێ!

بەو حاڵەش خێرا خێرا دەچووە بەر دەرگا و چاوی لە دەرێ دەکرد بزانێ داخوا کەس دیار نیە، بێ سەری بدا! کاتێك ئیدی بە تەواوی ناهۆمێد بوو، لە قەراغ ئاورگەکەی دانیشت، نێوچاوانی تێکنا و دە بیرانەوە ڕۆچوو.

دوای ماوەیەك دەنگی پێیانی گوێ لێبوو، وا دیار بوو کەسێك، یان هێندێك کەس بۆ لای ماڵەکەی وی دێن. دڵی داخورپا و ڕای کردە لای دەرگاکەی. لە وێ چاوی بە کۆمەڵێك پیرێژن کەوت کە بۆ لای دەهاتن، بەڵام وەك کەروولاڵان، یەك وشەشیان لە زاری نەدەهاتە دەر. هەموویان چاویان بەردابۆوە و دەسماڵی ڕەشیان بە سەرەوە بوو. کە گەیشتنە بەر دەرگاکەی بە دەنگێکی سەبر، لە بن لێویانەوە گوتیان:

ـ دایە حۆریی چارەڕەشی قەلەندەر، بەخێر بێیەوە!

ـ سوپاستان دەکەم ژنەکان، بەڵام بۆ نەمن چارەڕەش و قەلەندەرم؟ ئێوە بۆچی دەسماڵی ڕەشتان بە سەرەوەیە؟

ژنەکان وەڵامیان نەدایەوە. هەر وا سەریان داخستبوو و ورتەیان لە بەر نەدەهات.

دایە حۆری ڕقی هەستا و ئیدی هیچی لێنەپرسین. چوو لە جێی خۆی دانیشتەوە و تەنانەت چاویشی لێنەکردن. سەرەنجام یەکێك لە ژنەکان بێدەنگیی شکاند و گوتی:

ـ دایە حۆری گیان، بۆ لێمان توورە دەبی. حۆریی چارەڕەشی ماڵوێران! دەڵێی بۆچی دەسماڵی ڕەشمان لە سەر ناوە؟ باشە ئەدی چمان کردبایە؟ دەبوو هەڵپەڕیبباین؟

دایە حۆری حەبەسا و پشتی بە دیوارەکەیەوە ڕەق بوو. زۆری پێخۆش بوو بزانێ چ قەوماوە، بەڵام وای لێهاتبوو نەیدەوێرا پرسیارەکانی دووپات کاتەوە. بەڵام بێدەنگی سوودێکی نەبوو، دەبوو هەر بزانێ چ قەوماوە:

ـ پێم بڵێن بزانم چ قەوماوە؟ چمان بە سەر هاتوە، کە من ئاگام لێنیە؟

هەر ئەو ژنە کە قسەی کردبوو، وەڵامی دایەوە:

ـ کوێر بم دایە حۆری، وەجاخکوێر کەوتییەوە! کوێر بم زگت سووتا! بۆچما ئەو هەواڵە تاڵەت نەبیستوە؟ کوێربم حەمەدۆکیان کوشتوە! ئەوە چەند مانگە ئێمە ڕەشپۆشین.

دایە حۆری وشیار بۆوە:

ـ چەند مانگە حەمەدۆکیان کوشتوە؟

ـ پێنج ـ شەش مانگ دەبێ زانیومانە...

چاوەکانی دایە حۆری گەش بوونەوە:

ـ ئەدی دەبێ لە کوێ کوژرابێ؟

ـ لەو خوارەی، لە چوکووڕاوییە! دەڵێن ژاندەرمە و بەکرێگیراوی بێدین لە باتلاغی ئاکچەسازی دا گەمارۆیان داوە و لە لای دەشتی ڕا بۆی چوون. حەمەد لایەکی هەژدیهای گەورە

گەورە بووە، لایەکی باتلاغی ناکچەسازی، کە بە قەدەر دەریایەکی پانوبەرینە و پێشیشی ژاندەرمە و چەکداری بێدین. جا ئیدی حەمەدی بەستەزمان چ بکا؟ دەڵێن لە تاوان خۆی بە باتلاغی دا کردوە و باتلاغیش قووتی داوە و خنکاوە. کوێرم، تەرمەکەشیمان بۆ نەهاتۆتەوە! ئەو کورە قارەمانەمان هەر وا ڕۆیی و لە دەست چوو! ئێستا بۆت ڕوون بۆوە بۆچی ئێمە ڕەشپۆشین؟ لە وێڕۆژێوە کە ئەو هەواڵەمان بیستوە، هەموومان، هەموو ژنی ئەم دێیەی خۆمان و گوندەکانی دیکەی ئەم دەوروبەرەش هەر دەسماڵی ڕەشیان بە سەرەوە بووە و ئیدی داشی‌نانێین!

دایە حۆری هەستا و هێدی و لە سەرەخۆ باسی باغە پڕتەقاڵەکان، خانووە جوانەکەی حەمەدی، ئەو ئاوە بێسنوورەی ناویان ناوە دەریا، مامۆستا زەکی نەژاد،مەلا سەلام، سەپانە چەوساوەکان کە لە چەڵتووکەجاڕەکان دا تووشی نەخۆشیی تاوئەرز دەبوون، شاکیر بەگ، مامۆستای وێنەگەر و شارەکە بە خانووە سپی‌یە جوانە دووقاتەکانی‌یەوەی کرد... بە درێژی هەمووی بۆ باس کردن و هێندەش پوخت و پاراو قسەی کرد، کە ئیدی پێویستیی بە شێکردنەوە نەبوو... لە ئاخری دا گوتی:

ــ شاکیر بەگ، ڕەبی دە قەبریش دا نەحەسێتەوە، لە عەبدیخانیش خراپتر بوو! ئەمن لە حەمەدیم ڕاسپاردوە و هەر بەو زووانە دێتە ئێرە....

لێرە دا چاوێکی لە ژنەکان کرد. وا دیار بوو هیچیان باوەڕیان تەنانەت بە وشەیەکیش لە قسەکانی وی نەکردوە. ئەو جار هەستا سەرپێ و چوو لە لای وێنەکەی حەمەدۆکی کە بە کۆڵەکەکەیەوە هەڵواسرابوو، ڕاوەستا و گوتی:

ــ هەستن، وەرن چاو لەو وێنەیەی بکەن! ئەو وێنەیە ڕاست وەك حەمەدی ناچێ؟

ژنەکان هاتن و لە لای وێنەکەی ڕاوەستان.

ــ ئەگەر حەمەد دە باتلاغی دا خنکابێ، چۆن وەستای وێنەگەر کە خزمەتکاری گۆڕی پێغەمبەری‌یە، دەتوانێ بی‌کێشێتەوە؟ پێم بڵێن بزانم چۆن؟

ژنەکان لە وێنەکەی کۆ بوونەوە و هەرکام هەوڵی دەدا ملی زیاتر هەڵێنێ و وێنەکەی باشتر ببینێ.

ــ ئەمە بە ڕاستی حەمەدۆکی خۆمانە! ئەوەش ئەسپەکەیەتی کە بە سەر هەوران دا دەفڕێ! دیتووتانە؟! ئەوە دەحیلێنێ، پیاو گوێی لێنابێ، بەڵام بە ڕوونی دیارە دەحیلێنێ!

دایە حۆری زیاتری شی کردەوە:

ــ جا چ بوو پیاو گوێی لێنابێ! گرینگ ئەوەیە دەحیلێنێ. لە خودام تەڵەبە قەت ئەو ئەسپە لە حیلە نەکەوێ!

ژنەکان خۆشحاڵ بوون و هەموویان دایەحۆرییان دە ئامێز گرت. پاشان دەسماڵە ڕەشەکانیان فڕێدان، دانیشتن وئیدی زمانی پرسیارانیان کرایەوە. دەتگوت یەکجێ بەندێك پساوە و ئاو ڕژاوەتە دەرێ.

زۆری پێنەچوو هەموو خەڵکی دێی لە پێش دەرگای ماڵی دایە حۆری کۆ بوونەوە. سەقەت و کەمەندام و تەنانەت کوڕی زەڵەشیان ــ کە بە جێویان کەوتبوو ــ لە گەڵ خۆیان هێنابوو. خەڵکەکە لە بەر دەرگا لێکئاڵابوون و دایە حۆری ناچار بوو بچێتە سەر تەپۆڵکەیەکی تا هەموو بتوانن بی‌بینن و قسەکەیان گوێ لێ‌بێ.

دایە حۆری دوای ئەوەی هێندێك شتی بۆ گێڕانەوە گوتی:

ــ ئەوانەی لێرە ڕاوەستاون، گوێ بگرن! هێندێکم دیاری بۆ هێناون! دیارە شتەکان زۆر بە نرخ نین، بەڵام هەرچۆنێك بێ، دیارین ئیدی...

بە یارمەتیی دوو کچان بوخچە و گۆنی‌یەکانی کردنەوە. هەرچی تازە دەزگیران بوون، یان تازە زەماوەندیان کردبوو، دیارییان بۆ هاتبوو. هەر کەس بە نۆرەی خۆی بانگی دەکردن و دەی‌دانی.

باری دایە حۆری بە ڕاستی زۆری شت تێدا بوو. بازنە، بەرموور، ئەنگوستیلەی زێو، تەسبیح، خرخاڵ، پاوانە، گۆیەرۆك، دەسرەی هەوری، ئاوریشم، حەریر، شەدە، پارچەی ڕەنگاوڕەنگ، گۆرەویی جوان جوان بۆ منداڵان و گەوران، موورووی شین بۆ چاووزاری، کووژەکە، موورووی ئاڵ و شەوە، دەرزیی درووماکنێ، میل، دەزوو و غەرغەرە و زۆر شتی دیکەی ئاوای هێنابوو... بۆ هەر کەسەی شتی بابەتی خۆی هێنابوو و هەموو ڕازی بوون.

دیاری دابەشکردنەکە هەتا ئێوارێی خایاند. دایە حۆری ئەوەندە ماندوو ببوو، ئەی دەتوانی بە سەر پێوە ڕاوەستێ. دوای هەمووان دیاریی کچە نەخۆشەکەی زەڵەی دەرێنا، کراسێکی درێژ کە تەختی سوور بوو و گوڵی سپیی تێدا بوو. جووتێك گۆرەویی ئاوریشم، جووتێك کەوشی جوان، دەسماڵێکی سەوز، جووتێك گوارە کە ئەقیمی یاقیقیان تێدا بوو و شەش بازنەی ڕەنگاوڕەنگیشی بۆ هێنابوو. کچە نەخۆشەکە بە چاوی پڕ لە فەرمێسکەوە لە کەوشەکانی ڕوانی کە قایشەکەیان بریقەی دەهات. دایە حۆری داهاتەوە و دەستی بە سەری دا هێنا:

ــ چاك دەبی ئیشاڵڵا، ڕۆڵە گیان، چاك دەبی کچە جوانەکەم، گوڵەکەم. دڵنیا بە چاك دەبی‌یەوە، بە لاقی خۆت دەڕۆی و وەك سۆنەی ملدرێژ لەنجەی دەکەی.

ڕۆژی دواتریش بەر دەرگای دایە حۆری هەر چۆل نەبوو. کچی دێی کۆمەڵ کۆمەڵ دەهاتن و چاویان لە وێنەکان دەکرد. بە بێ‌دەنگی تێیانەوە ڕادەمان، لێیان ورد دەبوونەوە و سەر تا

خواری ئەو وێنانەیان، خاڵ بە خاڵ، دەپشکنی. لە پێش دا بە سەر وێنەی بابادەم و دایەحەوای دا بازیان دەدا و هەر لە بنەوە ڕا چاویان لێ دەکردن، بەڵام دواتر بە سرتە و قرتە قرت باسیان دەکرد، بۆ یەکتریان دەگێڕایەوە و دەحیلکانەوە.

دیارە هەموویان حەمەدۆکیان دەناسی، بیستبووشیان حەزرەتی عەلی تەرمی خۆی، لە کەژاوەی وشترێ ناوە و ڕایگوێزتوە، بەڵام ئەو ژنە جوانە چاو و برۆ ڕەشە کە برۆی تێکەڵ ببوونەوە، زمانێکی درێژ، سوور و دووفلیقانەی هەبوو و گرێکی سووری لە زاری دەهاتە دەر، بە لای وانەوە شتێکی زۆر سەرسوڕهێنەر بوو. ماوەیەکی زۆری نەکێشا داستانی سەیروسەمەرە، سەبارەت بەو وێنەیەی، لە دێی دا کەوتنە سەر زار و زمانان.

حەمەد لە باتلاغی ئاکچەسازی دا ماوتەوە و چەند دەستە ژاندەرمە و جووتێری پیاوکوژ و دڵڕەقیش کە لانی کەم لە چل دێیان ڕا هاتوون، دەوریان داوە. دەوروبەری حەمەدۆکی پڕە لە ماری ڕەشی گەورە گەورەش. حەمەد بە تاقی تەنێ لە نێو ئەو هەموو مار و حەشیمەتە شەڕکەرەی دا کە مەبەستیان تەنیا گرتن، یان کوشتنی ویە، ماوەتەوە. چ بکا؟ باڵیشی هەبن دەرباز نابێ! پشتی باتلاغە و پێشی ئاورە، چونکە ژاندەرمە درندەکان و جووتێرە زۆڵەکان ئاگریان دە پووش و درووەجاڕی بەرداوە و پووش، قامیش، چەقڵەشینکە، کیفار و کەرتەشی بە یەکەوە دەسووتێن. بایەك هەڵدەکاتێ، گڕی بێئامانی ئاگرەکە هەر دێ و زیاتر بەرەو ڕەوەزەکانی ئاناوارزای هەڵدەکشێ و هێندەی نامێنێ حەمەدی هەڵلووشێ. حەمەد لە دوێنێ ئێوارێوە بێ وچان شەڕی کردوە و تەقەی بە ڕاست و چەپی خۆی دا کردوە... ئێستا تەنانەت قولینچکێکی بچووکیش نەماوە خۆی تێدا حەشار بدا! لایەکی ئاگرەکەیە، کە هەر دێ و زیاتر دێتە پێش، لایەکەی دیکەی مارن، لایەکی دیکەی باتلاغ و زەلکاوە و دیارە ڕەوەزە ڕژدەکانی ئاناوارزاش وەك دیواری وان. سەرەڕای ئەوەش ژاندەرمە و جووتێری هار لە هەموو لایەکی ڕا ئاڵقەی گەمارۆکەیان تەنگتر کردۆتەوە... لە نەکاو حەمەد وەخۆ دێتەوە و دەبینێ هەر ئەوەندە فیشەکەی پێماوە کە دە عەمباری تفەنگەکەی دان. ئەوانیش داوێ. پاشان چاوێك لە تفەنگەکەی دەکا: چیی لێبکەم خۆ ئیدی بە کار نایە! فڕێی دەداتە نێو باتلاغەکەی. هەر دەمانچە و خەنجەرەکەی پێماوە و ئەوە مار و ئاور و ژاندەرمەش دەورەیان داوە و دەنگی ژاندەرمانی زۆر لێ نێزیکە کە تێیڕادەخوڕن. ڕاست لەو کاتە دا گرمەیەك دێ و هەورێکی سپی لە لای قوولایی باتلاغێ ڕا پەیدا دەبێ. هەورەکە خڕە و وردە وردە ئەوی دەبێ. ئەوە ئیدی ئاورەکە خەریکە حەمەدی دە خۆیەوە پێچێ و ژاندەرمە و ماریش هێندەیان نەماوە

بی‌گەنێ. حەمەد بڕیار دەدا خۆی دە نێو زەلکاوە ڕەشەکەی هاوێ و دەڵێ با ئاوا بمرم نەك بکەومە دەستی ئەو دڕندانە! ڕاست لەو کاتە دا دەنگی ژنێکی بە گوێی دەگا:" ئەی‌کەی حەمەد! خۆت دە وێ ناوێی! ئەمن ئەوە گەیشتمێ!" حەمەد سەر هەڵدێنێ، دەبینێ ژنێکی جوان، جوانترین ژنی دنیایە لە نێو هەورەکەی دێتە دەرێ. پوولەکەکانی لەشی لە بەر شۆقی ئاورەکەی شەبەق دەدەنەوە. حەمەد لە پێش دا، کە ئەو شتە سەیرەی دەبینێ، دەترسێ و ئەو جار پاشەوپاش بۆ لای ئاگرەکەی دەکشێتەوە. ژنە جوانەکە هاوار دەکا: ڕاوەستە حەمەدۆك! حەمەدۆکیش ڕادەوەستێ. ژنەکە دەڵێ: مەترسە حەمەدۆك ئەمن دۆستی تۆم. حەمەد بە دوودڵی‌یەوە دەڵێ: ئەمن ناترسم. هەر لەو کاتەش دا بیر دەکاتەوە: خۆ هەر لێرە دەرناچم، دەی با بزانم ئەوە کێیە و دەڵێ چی! ژنەکە نەویتر دەبێ و ئەو جار حەمەد چ ببینێ؟ ژنێکی جحێڵی جوان، شاژنێك کە هیچ ژنێکی دیکە ئەو دنیایەی بە قەد وی جوان نیە. حەمەد زۆری پێ سەیر دەبێ. لێی‌دەپرسێ: ئەتۆ کێی؟ جندۆکەی؟ پەریی؟ ژنەکە قاقا پێ‌دەکەنێ و دەڵێ: نە پەریم و نە جندۆکەم، جوانی جوانانم، لە قەڵای ئاناوارزای دا دەژیم و ئێستا هاتووم گیانی تۆ ڕزگار کەم! دەست بە پرچم بگرە، با لێرە بڕۆین... حەمەدۆك دەست بە پرچی دەگرێ و چاوی دەقووچێنێ. هەورێکی سپی دە خۆیانەوە دەپێچێ و ئیدی حەمەد ئاگای لە هیچ نامێنێ، کاتێك دوای ماوەیەك چاوی هەڵدێنێ، پێتان وایە چ دەبینێ؟ تەمەشا دەکا لە نێوەڕاستی باتلاغی لە جەزیرەیەکی، لە بەر دەرگای قەسرێکی‌یە. قەسرەکە سەروبەر لە شووشەیە و لە بەر شۆقی ڕۆژێ دەترووسکێتەوە. دەورەبەری قەسرەکەی پڕە لە کانی کە ئاوێکی زوڵاڵی ساردیان لێ‌هەڵدەقوڵێ، هەزاران چەشنە گوڵی جوان و باڵندەی ڕەنگاوڕەنگی لێن و تووکی هێندێك لە باڵندەکان لە ڕەنگی ڕۆژێیە. ئاسکی چاوڕەشی لێن، دەڵێی چاوت بە کلی ڕشتوون. حەمەدۆك تەماشا دەکا ئەسپەکەی خۆشی لە وێیە، زۆری پێ‌سەیر دەبێ...

جوانی جوانان حەمەدی دەباتە حەمامێ و بە دەستی خۆی پاکوخاوێن دەیشوا. ئاوەکە بۆنی گوڵەباغ، نەرگس، وەنەوشە و بەیبوونی لێ‌دێ. هەر ئەو دەمی دەست لە گەڵ یەکتری تێکەڵ دەکەن. جوانی جوانان پێی دەڵێ: حەمەدۆك گیان،لە نێو پیاوی هەمو دنیایە ئەتۆم هەڵبژاردوە و لەمێژە ئاشقت بووم، بەڵام ئەتۆ لە پێش دا خەجێ و دواتریش سەیرانت ویستوە و هەر بۆیە قەت دەرەتانم نەبوە بێمە لات و ئەوینی خۆمت بۆ ئاشکرا بکەم. دیارە چارەنووس ئاگۆڕێ و ئاخرەکەی پێت‌گەیشتم. کاتێك زانیم لە مەترسی دای، خۆم پێ‌ڕانەگیرا و خۆم گەیاندێی! تازە ئیدی ناتوانم لێت دوور بکەومەوە و ناشهێڵم بۆ هیچ‌کوێ بچێ! حەمەد گیان

ئیدی ئەمن و تۆ نی یەکین و دەمەوێ منداڵمان بە یەکەوە ببێ. قسەکانی ئەو ژنەی بە قووڵی کاریان لە دڵی حەمەدی کرد، بەڵام پرسیارێکی لە دڵی دابوو و دەبوو بیدرکێنێ. هەر بۆیە لە وەڵام دا گوتی: باشە، ئەمنیش ئەتۆم خۆشدەوێ و پێم خۆشە لە گەڵت بم، بەڵام ئەگەر منداڵمان ببێ، داخوا ئەوانیش وەك دایکیان، ڕوخساریان جوان و خوارەوەی لەشیان وەك هەژدیهای دەچێ و پوولەکەی زێڕیان بە لەشی‌یەوە دەبێ؟ ژنە جوانەکە قاقا پێ‌کەنی و گوتی: نا، حەمەد گیان، وا نابێ. ئەوان هەموو لەشیان وەك تۆ دەبێ. دوای ئەوە ئەو دووانە چل شەوان دەستەملانی یەکتر بوون و لە قەسرە شووشەکەی نەهاتنە دەر. دوای چل شەوان حەمەد وەخۆ هاتەوە، هەستا و گوتی: جوانی جوانان، ئەمن دەبێ بڕۆم. جوانێ گریا، خوێن گریا، لە جیاتیی فرمێسك تنۆك تنۆك خوێن بە چاوی دا هاتە خوار و گوتی: ئەتۆ ئەمنت خۆش ناوێ، بۆیە بەجێمدێڵی. وا دیارە وەڕەزیی سەیرانێت کردوە. ئەگەر وایە دەتوانم بچم سەیرانێش بێنمە ئێرە و هەموومان بە خۆشی بە یەکەوە بژین. دڵنیا بە من و ئەو زۆر چاك پێکدێین و کێشەمان نابێ. ئەگەر خەمی دایە حۆریتە، ئەویشت بۆ دێنم. بە کورتی هێندە لە بەر حەمەدی پاڕایەوە، کە حەمەد وازی لە ڕۆیشتنێ هێنا و لە لای مایەوە... ماوەیەك پێ‌چوو... حەمەد وردە وردە زەرد هەڵگەڕا و لاواز بوو. ئەو جار ڕۆژ بەڕۆژ کزتر دەبوو. جوانی جوانان زانی کە حەمەد وەڕەزە و ناتوانێ هەتا هەتایە لە لای بێ. زانی ئەگەر بە زۆر ڕای‌گرێ، زۆری پێ‌ناچێ دەمرێ و لە دەست دەچێ. هەر بۆیە پێی‌گوت حەمەد گیان برۆ، کوێت پێ‌خۆشە، بچۆ، بەڵام ئەمنت لە بیر نەچێ و ئەوەشت پێ‌بڵێم کاتێك منداڵم بوو، دەبێ بێیەوە و بی‌بینی. ئەوکات دەزانی منداڵەکە ڕاست وەك بابی خۆی دەچێ!... حەمەد بەنێنی پێ‌دا بە قسەی بکا. پاشان جوانی جوانان ماچی کرد، لە باوەشی گرت و بە خۆیەوە گوشی، چوونەوە سەر جێگایە و سێ شەو و سێ ڕۆژان دەستەملانی یەکتر بوون و هەر یەکتریان دە ئامێز گرت و ئیشقبازی‌یان کرد. وا دە گەڵ یەکتری تێکەڵ ببوون، کە هیچ هۆشیان نەمابوو و عەرز و ئاسمانیشیان لە بیر چووبۆوە! لەوەتا دنیا هەیە، هیچ ژن و مێردێك ئاوا گەرموگوڕ لە گەڵ یەکتری جووت نەبوونە! دوای ئەوە جوانی جوانان حەمەدی بەڕێ‌کردو سێ شتی بۆ یادکردنەوە دایە. یەکێکیان ئەو وێنەیەیە کە ئێستا لە لای دایە حۆری‌یە و پێشی گوتبوو: با ئەو وێنەیەی منت لە لا بێ و کاتێك چاوت لێ‌کرد، منت وەبیر بێتەوە! ئەو جار سێ تاڵە مووی لە پرچی کردەوە، وێی دا و گوتی: ئەوانە باش هەڵگرە، هەتا ئەو مووانەت پێ‌بێ، کەس زەفەرت پێ‌نابا و لە هەموو بەڵایەکیش دەپارێزرێی! هەروەها گوڵێکی سووری لە باغچەی هێنا و پێی‌گوت: ئەو گوڵە قەت

سیس نابێ و قەتیش بۆنی تەواو نابێ، کاتێك دڵت ڕەش دەبێ و دەگیرێ، بۆن بەو گوڵەیەوە بکە، دەسبەجێ ڕووناکی دەکەوێتە دڵت، قەت خەمێ هەڵناگری، دوودڵ نابی و هەموو شتێکی دەوروبەرت لە هومێد و ڕووناکی دا دەدرەوشێتەوە. ئەو جار حەمەد جوانی جوانانی بەجێهێشت و وێنەکەشی هێنا، دای بە دایە حۆری و ئەویش ئەوە بە دیواری ژووریەوەی هەڵواسیوە."

ـ ئیدی لەوێڕۆژێوە ئەو جوانە بەستەزمانە چاوەڕوانە حەمەد بچێتەوە لای!

ـ بەڵام ئەو چۆتەوە شاخی...

ـ خودا قەت هەموو شتێکی نادا بە وانەی بۆخۆی دروستی کردوون! کابرا زۆریش خۆشبەخت بێ، دەبێ شتێکی هەر کەم بێ!

ـ حەمەد شێتە!

ـ ئەو بەختەی؟ ئەو جوانەی وەگیر کەوتوە، کە چی دوایە وەڕەز بووە!

ـ پیاو یاغی بێ، ئاخری هەر وای بە سەر دێ...

ـ چاو لەو شێتەی! جا وەرە دە قەسری شووشە دا بژی...

ـ ژنیشت جوانی جوانان بێ...

ـ بیەوێ منداڵی نێت ببێ...

ـ منداڵەکەش ڕاست وەك خۆت بچێ...

ـ دەبوو لەو شوێنەی کە بە ڕاستی باغی بەهەشتێ بووە، مابایەوە و بۆ خۆت تا دەمردی، بە خۆشی ژیابای...

ـ کوڕە نەدەبوو، ئاخر ئەو کوڕی برایمە ڕووتی‌یە ئیدی...

ـ گیا لە سەر پنجی خۆی شین دەبێ. بابی وا هەر کوڕی وای لێدەبێ!

ـ بەڵام ئەو جوانە خۆ باسکی نین، چۆن توانیویەتی حەمەدی دە باوەش گرێ؟

ـ ئەدی چۆن توانیویانە جووت بن؟ خۆ هەژدیها لاقی نین!

ـ بڕوانە، گوڵێکی دە لووتی دایە...

ـ بۆ وەیە قەت ناهومێد نەبێ...

ـ ئەدی باسکەکانی کوان؟

ـ بێگومان لەو دیوین، لەو لایە ڕا دیار نین...

ـ لاقیشی هەن...

ـ بەڵام پیاو نایانبینیّ.

ـ بیّگومان شتەکەشی هەیە!

ـ لەو وێنەیەی دا دیار نیە.

ـ لە وێنەی نادەم و حەوای دا دیارە.

ـ جوانیّ پێی‌خۆش نەبووە وەدەری‌خا...

پاشان حوسێن چاوەش پەیدا بوو. لەمێژساڵ بوو ئەو کابرایە ڕووی دەو دێیەی نەکردبوو. حوسێن هەمیشە خێروبەرەکەتی لە گەڵ بوو. دەچووە هەر دێیەکی خۆشی و فەرحانی ڕووی دە ویّ دەکرد. خەڵکەکە زۆر بە گەرمی پێشوازی‌یان لیّ‌کرد و نەیانهێشت حەوتوێکی بڕوا. لەو ماوەیەی دا هەر شەوەی لە ماڵێکی بانگهێشتنیان دەکرد و بەردەوام گوێیان دەدا بەیت و گۆرانی‌یەکانی. حوسێن حەیران و بەیتی وای دەگوتن، کە ئەو خەڵکە قەتیان نەبیستبوون. کاتێك گوێیان لەو بەیتە تازانە بەو دەنگە خۆشەی دەبوو، دەچوونە نێو دنیایەکی دیکەوە، دنیایەکی نویّ، شیرین و پڕ لە هومێد و ئاوات. لە دوایین ڕۆژەکانی مانەوەی لەو گوندە دا دەمودەست "بەیتی حەمەدۆك و جوانی جوانان"ی دروست کرد. کاتێك دەستی دەدا سازەکەی، ساز ناڵەی لیّ‌هەڵدەستا و ئەو بەیتە تازەیەی لە گەڵ دەگوت، هەموو لێی کۆوە دەبوون و بە دەنگی خۆشی وی سەرخۆش دەبوون. حوسێن سیّ شەو و ڕۆژان بە دوای یەك دا ئەو بەیتەی گوت و دەنگ و شێعرەکانی وی کە بە سۆزێکی تایبەتی ئەو بەسەرهاتە ئاشقانەیان دەگێڕایەوە، وای کار لە خەڵکەکەی کرد کە ئەو جار ئەوانەش کە بە دوودڵی‌یەوە دەیانڕوانیە ئەو داستانەی، ئیدی شکوگومانیان ڕەوی و ئەو جار بە تەواوی هاتبوونە سەر ئەو باوەڕەی کە بەیتی "حەمەدۆك و جوانی جوانان" بە تەوای ڕاستە. هێندەی پیّ‌تەچوو بەیتبێژ و گۆرانیبێژەکانی دیکەی چوکووڕاوایەش ئەو بەیتەی فێر بوون، گوتیانەوە و بەیتەکە بە تەواوی دەشت و گوندەکانی کێوپارەش دا بڵاو بۆوە. "عەلی زارقایش" کە بەیتبێژێکی بەنێوبانگ و زیرەك بوو، دەسبەجیّ بەیتەکەی فێر بوو. چوو حەمەدی لە گوندی وەنەوشەی دیتەوە. خەڵکی وێش لە وی کۆ بوونەوە و سیّ شەو و ڕۆژان ئەو بەیتەی بۆ گوتن. بەیتەکە هێندە جوان هۆنرابۆوە و عەلیش بە سۆز و هەستێکی وا تایبەتی‌یەوە دەی‌گوت، کە خەڵکەکە مات و حەیران ببوون. حەمەدۆك بۆخۆی سەری بەردایەوە و بە بیّ‌دەنگی، بە وردی گوێی دا بەیتەکەی. کە بەیتەکەش کۆتایی هات، چاوەکانی پڕ بوون لە ئاو. هەر ئەوەندە! ئیدی نە کەس وێرای هیچ پرسیارێکی سەبارەت بە جوانی جوانان لیّ‌بکا و نە ئەویش بۆخۆی یەك وشەی لەو بارەوە باس کرد.

ماوەیەك پیّ‌چوو و دایە حۆری هەستی کرد کە ئیدی وەك جاران خەڵکەکە زۆر نایەن سەری بدەن و وێنەکان چاو لیّ‌بکەن. ئێستا هەر دوو ـ سیّ کەس دە ڕۆژیّ دا دەهاتن و هیچی دی. لە ئاخری دا تەنیا

ئامینە گوڵە مابۆوە کە هەموو ڕۆژێ هەر دەهات. ئامین هەموو ڕۆژێ، بەیانیيان خۆی جوان دەکرد، دەهاتە ماڵی دایە حۆری، دەچوو لە پێش وێنەکەی ئادەم و حەوای ڕادەوەستا و هەتا ئێوارێ هەر چاوی لێدەکردن. ئامینە گوڵە وەك سەرتۆپی جوانانی ئەم گوندە و هەموو گوندەکانی چیای تووڕووسی نێوبانگی دەرکردبوو. لە هەمووی ئەو هەرێمەی دا کچ نەبوو بە قەدەر وی جوان بێ. ئامین کچێکی کەڵەگەتی باریکەڵە بوو، چاوی گەورە و ئاسکانی بون، مژۆڵی درێژ بوون، کە پێدەکەنی، دوو قوولکەی لە لاڕوومەتانی وەدەردەکەوتن، گەردنی وەك گەردنی سۆنەی درێژ و لووس بوو و هەر کەس دیبای دەسبەجێ ئاشقی دەبوو. پێکەنینی گەرم و دەنگی ئەوەندە سیحراوی بوو پیاوی حەیران دەکرد. دایە حۆری پێیوا بوو ئەو لە سەیرانێ جوانترە و زۆر جاران بە بیری دا دەهات: بریا ئامین بووکم بوایە، بەڵام دەسبەجێ چاکی و خۆشەویستیی سەیرانێی وەبیر دەهاتەوە، شەرم دایدەگرت و ئەو بیرەی لە خۆی دوور دەکردەوە.

لە هەوەڵەوە ئامینیش وەك هەموو ژن و کچەکانی دیکەی دێی، ئادەم و حەوای پێسەیر بوو و بە ڕووتبوونەکەیان پێکەنینی دەهات، بەڵام کاتێك دایە حۆری تێیگەیاند کە چونکە ئەوان بە تەنێ لە بەهەشتێ بوون و کەسی دیکە نەیدیون، بۆیان هەبووە ڕووتو قووت بگەڕێن و گرفتێك دە وەی دا نەبووە، ئیدی پێیسەیر نەبوو، بەڵام هەر بیری لە ئەندامی پیاوەتیی بابادەمی دەکردەوە، کە زۆر گەورە بوو. ئی دایە حەوای وەك گوڵێکی پشکووتوو دەچوو و دیارە چاوەڕوانی ئی بابادەمی بووە، ئەیچۆن! خۆ ئەو بەهەشتەی سەر عەرزێ پیاوی دیکەی لێنەبووە. دوای چەند ڕۆژی دیکە ئامینە گوڵە پێیوابوو ئاڵەی دایە حەوای دەبیسێ و وای بە بیر دا هات کە بابە ئادەمیش لێی نێزێك دەبێتەوە و لە سەری درێژ دەبێ. ئامین بە تەنێ لە ماڵ بوو. بە پەلە ڕای کرد، دەرگاکەی پێوە دا، لە سەر عەرزی درێژ بوو و چاوی لە سەر یەك دانان، ناڵە و مشەی ئادەم و حەوای دە گەڵ ئی ئامینێ تێکەڵ دەبوو، بەڵام لە پڕ ئادەم هەستا، چوو بۆ لای ئامینێ و دە باوەشی گرت. ئەویش خۆی شل کرد و شەرمیشی لە حەوای نەکرد، کە چاوی لێدەکردن. زۆری نەکێشا و کاتێك ئامین گەیشتە بەهەشتی هەڵچوونی ئیشتیا و حەزی خەیاڵی خۆی، بێحاڵ لە وێ کەوت.

لە وێڕۆژێوە ئامینە گوڵە بۆی ببوو بە عادەت، دەیڕوانی بزانێ کەنگێ دایە حۆری دێتە دەرێ و کەنگێ دەچێتەوە. هەر دایە حۆری ماڵەکەی بەجێدەهێشت، ئامینە گوڵە دەگەیشتە وێ، چاوی لە سەریەك دادەنا و ڕادەوەستا. وای دەهاتە بەر چاو کە ئیدی بابادەم خۆی دە حەوای نەدەگەیاند و ڕاست دەهاتە لای وی. حەوتوویەك دواتر وای لێهاتبوو کە ڕقی لە حەوای دەبۆوە و ئاواتی دەخواست کە ئەو لە نێو وێنەکەی دا نەمێنێ، چونکە بۆ خۆی زۆر تاسەی ئادەمی دەکرد و شەو و ڕۆژ بیری لێدەکردەوە. ئامین قەت لەو وێنەیەی خافڵ نەبوو و کاتێکیش دەڕۆیی، هێندەی پێنەدەچوو دەهاتەوە و چاوی لێدەکردەوە. بە کورتی هەتا تاریکانێ کە ئەو دەم وێنەکە باش دیار نەدەبوو، دڵی نەدەهات

بەجێی‌هێڵێ. زۆر جاران بۆ ئەوەی تاسەی خۆی دابمەرکێنێ، دەستی بە سەر شووشە ساردەکەی دا دێنا. دایە حۆری کە لە ئامینێ حاڵی ببوو، هەر پێ‌دەکەنی و تەنیا دەی‌گوت: ئەتۆ لە تاوی بابادەمی خەریکە شێت بی، ئامین! پاشان ئاخێکی هەڵدەکێشا و دەی‌گوت: ئاخ جحێڵی!

تاکەی ئەو دۆخە بەردەوام بوو؟ دایە حۆری و ئامین وای پێوە ڕاهاتبوون کە ئیدی هەستیان بە شتێکی ئەوتۆ نەدەکرد. بەڵام خەڵکی دێی دەستیان بە قسان کرد. ئامینە گوڵە قسەکانی بیستنەوە و ئەو جار ناچار بوو هێندە لە سەر یەك نەیە و ئاخرەکەشی بڕیاری دا ئیدی قەت چاو لە وێنەکەی نەکا. بەڵام گرفتێکی گەورە ئەوە بوو کە ئەو جار نەی‌توانی بە سەر حەز و ئارەزووەکەی دا زاڵ بێ و تووشی بێوازی و بێ‌ئیشتیایی‌یە بوو، بە شێوەیەك کە ئیدی نە هیچی بۆ دەخورا و نە هیچی بۆدەخورایەوە و نە دەی‌زانی چ بکا. لەو بەینەی دا و لەو حاڵە ئاڵۆزەی دا هەستی کرد کە هەموو لاوەکانی ئەو گوندەی ئاشقی وین و ئەو جار سوکنایی هاتێ و دڵی ئاسوودە بوو. بیری لە گەنج سەلیمی کردەوە. گەنج سەلیم لاوێکی جوانچاکی چوارشانەی قژلوولی سمێڵزەرد بوو و خەڵکی دێیەکەی جیرانیان بوو. سەلیمیش چەکی هەڵگرتبوو و لە گەڵ شەش هاوڕێی هاوتەمنی خۆی لە شاخی بوو و هەموویان ناوی خۆیان نابوو حەمەد. ئامینە گوڵە وەڵامی لێ‌نارد. دوای سێ‌ڕۆژان سەلیم هات. لە باغەهەنارێکی خڕێ گێوژان یەکتریان دی. ئامینە گوڵە ڕووت بۆوە و چاوەکانی لە سەر یەك دانان و بابادەمیش سواری بوو. ئامین بە چۆکانی دە کەلەکەی سەلیمی دەکوتا و بە خۆیەوە دەگوشی. شەو و ڕۆژێکی تەواو لە سەر چیمەنێ هەر یەکتریان هەڵشێلا و ئیشقبازی‌یان کرد. پاشان سەلیم چۆوە شاخی و ئامینی بە مراد گەیشتوو و شەکەتی بەجێ‌هێشت.

ڕۆژی دواتر ئامینە گوڵە هاتەوە دێی و ڕاست چووە ماڵە دایە حۆری. دایە هەر چاوی بە ڕوخساری کەوت، زانی چ باسە. ئامین لە بەرامبەر وێنەکەی ئادەم و حەوای ڕاوەستا و تاوێکی باش تێیانەوە ڕاما. پاشان ڕۆیوە وێنەکەی لە جێی خۆی کردەوە و بە عەرزێی دادا. تابلۆ شکا و شووشەکەی بوو بە هەزار لەت، بەڵام دایە حۆری نە ئەلفێ هەتا بێی نەگوت. پاشان ئامینە گوڵە بێ ئەوەی تەنانەت سەر هەڵێنێ و چاوێکیش لە دایە حۆری بکا، وەدەرکەوت و ڕۆیی، چۆوە ماڵی خۆیان، شتومەکەکانی دە بوخچەیەکی‌یەوە پێچا، بوخچەی دەبن هەنگڵی نا و بە غار ڕووی دە نێو دارهەنارەکانی خڕێ گێوژان کرد. سەلیم لە وێ چاوەڕوانی بوو، دەستیان دە دەستی یەك نا و ڕۆیشتن بۆ دێی سەلیمی.

کەس گوێی لە وەی نەبوو، کە ئامین ڕەدوو کەوتبوو و مێردی بە کوڕێکی بێگانەی خەڵکی گوندێکی دیکە کردبوو، بەڵام سەبارەت بە شکاندنی تابلۆی وێنەی بابادەم و دایە حەوای هەموو کەس لێی قەڵس بوو و لەو بارەوە قەتی لێ خۆش نەبوون...

# (٢١)

مالّی خەلیل بەگی گەورە ببوو بە بنکەی سەرەکیی بایرامۆغلی و هێندەی هاتوچۆ دەکرا، دەتگوت شانە زەرگەتەیە. یاوەر، ڕۆستەمی مامۆستای فێرگە، مەلا دۆران، زولفۆ و عەلی‌یەشەل کارەکانیان لە نێو خۆیان دابەش کردبوو. هەرکەس کاری خۆی دیار بوو و دەی‌زانی چ دەکا، بەلاّم مورتەزاغا هەر بەو دەوروبەرە دا ڕای دەکرد هەلّدەسوورا، ئەوەندە ماندوو بوو، نارەقەی لە بەری پێی دەتکا و خۆی دە هەموو کارێکی هەلّدەقوتاند.

بایرامۆغلی و عارف سایم بەگیش لەو بەینەی دا زۆر سەرقالّ بوون. شەو و ڕۆژ بە یەکەوە ڕاوێژیان دەکرد و بارودۆخەکەیان هەلّدەسەنگاند. ئەو دوو ڕێوی‌یە کە باش بەلّەدی چیا بوون، دەیانەویست هەرچۆنێك بێ، فیلێك بدۆزنەوە، بۆ ئەوەی بتوانن حەمەدۆکی دە داو خەن و بی‌گرن. بیر لە هەموو شتێك کرابۆوە، بە وردی هەموو بەشەکانی پلانەکەیان خستبوە بەرباس و هەموو کەلێن و قوژبنی مەسەلەکەیان لێکدابۆوە. بەو شێوەیە کە پێشبینی کرابوو و بە پێی ئەو هەوالاّنەش کە بەردەوام بۆیان دەهاتن، حەمەدۆك ئیدی نەی‌دەتوانی لەو تەلّەیەی لە لایەن بایرامۆغلی‌یەوە بۆی دانرابۆوە، دەرباز بێ.

عارف سایم بەگ لە دوای سولتانۆغلی‌یە زەردەشی ناردبوو و کاتێك ئەویش هات شێست سواری چەکداری کارامەی دە گەلّ بوو. عارف سایم بەگ بۆخۆی، لە حالێك دا خۆی دابووە سەر وەکازە زێرکفتەکەی، تا حەساریّ بە پیری‌یەوە چوو. سولتانۆغلی‌یە زەردە چوست و چالاك، وەك لاوێکی مێرمندالّ لە ئەسپەکەی دابەزی، غاری دا پێشیّ و باوەشی بە جەنابی نوێنەر دا کرد. ئەو دوو هاوڕێ و هاوسەنگەرە لەمێژ بوو یەکتریان نەدیبوو:

ــ ئەو سوارانە هەریەکەو بۆخۆی غەنیمی سەد حەمەدۆکانە و بەو حالّەش...

سوارەکان دابەزین و دەستووریان پی‌درا بۆخۆیان بحەسێنەوە.

عارف سایم بەگ و سولتانۆغلی قۆڵیان دە قۆڵی یەکتر کرد و لە پلیکانی دیوەخانێ وەسەرکەوتن. بایرامۆغلی لە سەرێ پێشوازی لە سولتانۆغلی کرد و بە هەردووك دەستان تۆقەی دە گەڵ کرد. ئەو دەمەی بایرامۆغلی چەتەیەکی بەنێوبانگ بوو، جارێکیان هەوڵی دا پووڵی لە سولتانۆغلی بستێنێ، ناردییە لای و داوای پووڵێکی لێ‌کرد، گوتبووشی ئەی‌نێرێ تووشی کێشەی دەبێ و هێرشی دەکرێتە سەرێ. سولتانۆغلی وەڵامی دابۆوە: با بایرامۆغلی بۆخۆی بێ و پووڵەکەی بەرێ. ئیدی بایرامۆغلی نەی‌وێرا قەرە لە قەرەی بەگی بداتەوە...

ـ بایرامۆغلی دەی‌زانی پیاوەکانی من چۆنن؟ دەی‌زانی هەر کامەو هەڵۆیەکن و هەریەکی لانی کەم سێ‌کەسیان کوشتوە. جا چ ئەنگێوەیەکیشن؟ هەموویان لاقی قورینگی لە حەوای دەنگێون! هەر لە بایرامۆغلی بپرسە! ئەو بایرامۆغلی‌یە کە تای لە شاخی پەیدا نەبۆتەوە ـ بۆ وەشم نیە بلێم بەرەوڕوویە و تاریفی بکەم، ها ـ ، بە ڕاستی یاغیی وا بە سام و بە دەسەڵات لە هەموو چیای تووڕووسی قەت نەبووە! یان هەر لەوانەیە لە دنیایە دا نەبووبێ... بەڵێ، جا تەنانەت بایرامۆغلیش بەو سام و هەیبەتەیەوە دەخۆی ڕانەدیوە بێتە سەر من...

بایرامۆغلی پێ‌کەنی:

ـ ڕاست دەفەرمووی، وایە، ئەمن لێتدەترسام.

ـ نەخێر، ئەتۆ لە کەس نەترساوی، بەڵام شتەکەت بەراوەرد دەکرد و...

ـ ئاخر ئەگەر شتەکەم بەراوەرد دەکرد و هەروا تاوم نەدەدایە، لەخۆڕا نەبوو...

بایرامۆغلی بە تەواوی گۆڕابوو. ئەو بایرامۆغلی‌یە کۆنە یاغی‌یەی کە جاران وەك منداڵان شەرمێون بوو، لە جێی خۆی دادەنیشت و هیچی نەدەگوت، ئێستا ببووە ئینسانێکی دیکە. هەڵسووڕ و چالاك وەك باشووی گۆشتخۆری چنگ تیژ، چاوزیت وەك ڕێوی فێڵباز، کەپۆی خوار و تیژی هەڵۆیانە، سمێڵی گەورە، درێژ و شۆڕ و نێوچاوانێکی گرژ و بەسام...

عارف سایم بەگ ڕووی دە سولتانۆغلی کرد و هاوکات کە دەستی بۆ مۆبلێکی ڕادەداشت و فەرمووی دەکرد دانیشێ، گوتی:

ـ بەڵام حەمەدۆك هێرشی کردە سەر قەڵای دونکادیرلی‌یان و چاکیشی وێرا!

سولتانۆغلی دانیشت و هەردووك دەستی لە سەر ڕانانی دانان. بایرامۆغلی لە پەنا وی و عارف سایمیش لە بەرامبەریان دانیشت.

ـ بەڵێ... حەمەدۆك بە ڕاستی ئازایە. ئەو هاتە سەرقەڵای من، لە حاڵێك دا بایرامۆغلی لە هەموو ماوەی یاغیگەریی خۆی دا قەت نەی‌وێرا لێی‌نێزیك بێتەوە!

پاشان بە شێوەیەکی تەشەراوی‌یەوە گوتی:

ـ ئەرێ بابە ئەو حەمەدۆکە چی‌یە؟ بڵێی ڕوستەم نەبێ، ڕۆستەمی کوڕی زاڵی؟

جەنابی نوێنەر بە بزەیەکەوە گوتی:

ـ ئەوەی ئەو دەی‌کا، هەر بە ڕۆستەمی دەکرێ.

بەڵام هەر دەسبەجێ دوای ئەوە ڕوخساری گرژ بوو و گوتی:

ـ باشە سوڵتانۆغلی، کاتێك حەمەد تاڵانی کردی و ڕۆیی، ئەتۆ دەسبەجێ پیاوت وەدوو خستن، وا نیە؟

ـ بەڵێ، وا بوو...

ـ ئەدی چەند جاران پیاوەکانتی هەتلە کرد و چەندی لێ‌کوشتن؟

سوڵتانۆغلی چاوی شۆڕ کردنەوە و گوتی:

ـ شازدە کەسی لێ‌کوشتن.

ـ هەر لەو پیاوانەش بوون کە ناوایان پێ‌هەڵدەڵێی؟

ـ وەڵڵاهی سەیرە ئیدی، نازانم بڵێم چی! سیحرە، موعجیزەیە؟ ئینسان سەری لێ‌دەرناچی!

ـ ئەمن نە باوەڕم بە سیحرەهیە و نە بە موعجیزە، سوڵتانۆغلی! ڕاستی‌یەکەی ئەوەیە ئەو کوڕە یەکجار زیرەکە و نازاشە، ئەتۆش چت لە گەڵی پێ‌نەکراوە!

ـ ئەمن دان بەوە دا دێنم کە دەروەستی نەهاتووم، بەگم! ئێستاشی دەگەڵ بێ، وێناچێ کەس پێی‌بوەستێ. دیارە کاتێك ئەمن لە شاخەکانی دەورەبەری خۆم نەتوانم بی‌کوژم، یان داوی خەم، ئەوە بەو مانایەیە کە کەسێکی دی بە هیچ شێوەیەك شتێکی وای پێ‌ناکرێ!

عارف سایم بە سەرسوڕماوی‌یەوە گوتی:

ـ یانی بایرامۆغڵیش پێی‌ناکرێ؟

ـ نەخێر، تەنانەت ئەویش بۆی ناکرێ!

قاوەیان بۆ هێنان. ماوەیەك هەموویان بێ‌دەنگ بوون و تەنیا دەنگی قاوە هەڵقوڕاندنەکەیان دەهات.

لە پڕ عارف سایم بەگ بێ‌دەنگی‌یەکەی شکاند و بە نێوچاوانێکی گرژەوە گوتی:

ـ بۆچی بۆی ناکرێ؟

دەنگی دەلەرزی. دیار بوو ڕقی هەستابوو و نەی‌دەویست نیشانی بدا.

ـ چونکە ئەنگوستیلەکەی خانەقای چلچاوی پێیە...

ـ ئەها...

ـ چونکە کراسەکەی سولتان سەلاحەدینی گەورەی دە بەر دایە، هەر ئەو کراسە کە سەلاحەدین لە شەڕی خاچپەرستان دا دە بەری دابوو! چونکە بەگم ئەم دوایی‌یانە خانەقای چلچاوی بۆتە بەرگدرووخانەیەکی بە ڕاستی و کار و پیشەیان بۆتە ئەوە کە کراسان بۆ حەمەدۆکان بدروون!

ـ بەڵێ دەکرێ، چی‌دیش؟

ـ چونکە بەگم، پێرێ بەیانی کە من دەهاتم، ئەسپی حەمەدۆکی وەك هەموو بەیانان لە سەر هەورێکی ڕا، لە ئاسمانێ حیلاندی و دەنگەکەی وەك گرمەی هەوری لە شاخان ئاوازی دایەوە!

ـ ئەوەش دوور نیە... منیش ئەو حیکایەتانەم بیستوون...

ـ چونکە بەگم، ئەمن پیاوەکانم وە دوای حەمەدی خست، کە بی‌کوژن، بەڵام ئەو پێش ئەوەی ئەوان بۆیان بکرێ، شوێنیشی ببیننەوە، کتوپڕ پێشی پێ‌گرتن و شازدەی لێ‌کوشتن. تەنانەت هێشتاش بۆم ڕوون نیە چەند دەستەن و چەند کەسن. بەگم ئەمن دەڵێم ئێمە زۆر زەحمەتە بتوانین حەمەدی لە جووتێرەکانی تووڕووسی بستێنین. چونکە بابەکان، مەلا سوننی‌یەکان، ژنەکان و کچەکانی سەرانسەری ئەو هەرێمە حەمەدۆکی وەك شێخ، وەك ئینسانێکی پیرۆز چاو لێ‌دەکەن. چونکە بەگم...

ـ بەو جۆرەی ئەتۆ باسی دەکەی، لەخۆڕا ئەمن لێرەم، وانیە؟ سولتانۆغلی، مەبەستت ئەوەیە کە بایرامۆغلی و عارف سایم بەگ دەستەوەستانن و هیچیان لە دەست نایە؟ دەتەوێ بڵێی وا چاکترە هەستم بڕۆمەوە ئەنکەرەی و داوا لە مستەفا کەماڵ پاشای بکەم لەشکری وە سەر تووڕووسی بگێرێ، وایە؟

ـ تکایە بەگم، بە هەڵەم لێ‌تێ‌مەگە... مەبەستم ئەوە نیە...

ـ نەخێر زۆر چاکت لێ‌تێگەیشتووم. بە پێی ئەو لێکدانەوەیەی تۆ هیچ ڕێگایەکی دیکە نیە.

تا ئێستا بایرامۆغلی ددانی بە جەرگی خۆی داگرتبوو و هیچی نەگوتبوو، ئێستا وە قسە هات، سینگی بردە پێشی و گوتی:

ـ سولتانۆغلی ئەوانەی دەیانڵێی تا ڕادەیەك ڕاستن. جووتێرەکان دەی‌پەرستن و ئەسپەکەشی هەموو بەیانی‌یان بە سەر تووڕووسی دا دێ و دەحیلێنێ، بەڵام ئەوەت لە بیر نەچێ سەردەمێك خەڵك دەیانگوت گوێیان لێ‌بووە ئەسپی منیش حیلاندوویەتی.!

وا دیار بوو بایرامۆغلی زۆر ناڕەحەت بوو، بۆیە ئاوای قسە دەکرد، سولتانۆغلی‌یە زەردە زانی زێدەڕەویی کردەوە:

ـ وایە، ئەسپەکەی تۆش دەیحیلاند...
ـ ئەنگوستیلە بەبرووسکەکەشم پیێبوو.
ـ وا بوو.
ـ کراسی سولّتان سەلاحەدینی ئەیووبیشم دە بەر دابوو...
ـ ڕاستە، ئەویشت دە بەر دابوو، هەر بۆیەش ماوی!
عارف سایم بەگ قسەکەی پیێبڕین:
ـ بۆ خاتری خودای سولّتانۆغلّی! یانی ئەتۆش باوەڕت بەو شتانە هەیە؟
سولّتانۆغلّی قامکی بۆ لای پەنجەرەی ڕاداشت:
ـ ئەمنیش باوەڕم پێیئەبیێ، خۆ خەلّکی شاخی باوەڕیان پێیەتی و گرفتەکەش دە وەی دایە!
بایرامۆغلّی ددانی دەچیڕەوە بردن و گوتی:
ـ با باوەڕیان پێیهەبیێ، بۆخۆم دەزانم چۆنیان تیێدەگەیەنم! ئەمن...
سولّتانۆغلّی هەناسەیەکی هەلّکیێشا و گوتی:
ـ ئیشالّلا! هیوادارم وا بیێ. ئەمن دەزانم ئەتۆ بایرامۆغلّییە گەورەی و ئەو بیێچاووڕووانە ئەگەر وەك حەزرەتی عەلیش ئازا بن، هەر تۆزت ناشکیێنن... هەر بۆیەشە بە خۆم و پیاوەکانمەوە هاتووم کە یارمەتیت بکەم...
بایرامۆغلّی تیژ گوتی:
ـ سوپاس!
عارف سایم بەگ لە حالّیێك دا دە بیرەوە ڕۆچووبوو، هەستا و گەورە پیاوەکانی دیکەی بانگ کرد، کە تا ئیێستا لە ژوورەکەی تەنیشتیان دانیشتبوون. سولّتانۆغلّییە زەردە هەموویانی دەناسین. ئەوانیش کاتیێك زانیان سولّتانۆغلّی بە خۆی و پیاوەکانییەوە هاتۆتە یارمەتییان، زۆر خۆشحالّ بوون.
پاشان قەدەرۆغلّی هاتە ژووریێ. ئەو بەگە مولّك، مەڕومالّات و برینجەجاریێکی زۆری هەبوو و سەرعیێلی عەشیرەتیێکی بوو کە نۆ دیێیان هەبوون. ئەویش وەك سولّتانۆغلّی ڕەگەزنامەیەکی بە دیوارییەوە هەلّواسیبوو، کە دەریدەخست بنەچەکەی وی پاشا بوون... قەدەرۆغلّی میێژووی بنەمالّەی خۆی بیێگریێ دەبردەوە سەر یەك. بابوباپیرانی لە بەگە هەرە گەورەکانی بۆسووکییان و ئۆغووزییان بوون، بە دولکادیرلی بەنیێوبانگ بوون و سالّی ١٣٣٩ لە بەشی هەرەڕۆژهەلّاتیێ حوکوومەتیێکی میرنشینیان دروست کردبوو. ئەو حوکوومەتە لە

میرنشینەکانی دیکە بەهێزتر بوو. بەگی هەرە گەورەی ئەو تایفەیەی ناوی کاراجە بەگ بوو و ناوچەکانی ئادیامان، مالاتیا، هارپووت، ئانتاکیا، ماراش، ئانتێپ لە گەڵ زولکەدیری‌یەی بە سەر هەرێمە میرنشینەکەی وانەوە بوون. ساڵی ١٥٢٣، کاتێك عەلی بەگ، دوایین سەرۆکیان، مرد، میرنشینەکەیان بە دەستی عوسمانی‌یەکان رووخا، بنەماڵەکە هەموو لە بەین چوو و ناو و ناوبانگی دولکادیرلی‌یان دوای سێسەد ساڵی پڕ لە شانازی، لەبیرچۆوە. دواتر هێندێك کەس پەیدا بوون کە دەیانگوت میراتگری ئەو تایفەیەن، بەڵام هیچیان نە ڕەگەزنامەیان هەبوو و نە بەڵگەیەکی وا کە قسەکەیان بسەلمێنێ. ئەو جار زۆر دواتر هێندێك دولکادیرلی پەیدا بوونەوە، بەڵام شتێکیان کەم بوو و ئەویش هێز و پووڵی زۆر بوو. ئەو کات مەلایەك لە ماراشێ هەبوو، ناوی مەلا تەحسین بوو، زانستی ئاینی لە دیمەشقێ خوێندبوو و خەتخۆشێکی سەیریش بوو. کاتێك مەلا تەحسین گەڕایەوە نیشتمانی خۆی، خەتخۆشی باوی نەمابوو، بەڵام مەلا تەحسین دەیزانی چۆن پووڵی پەیدا کا و تەنانەت زۆر دەوڵەمەندیش بێ: هەر کەس پازدە سکەی زێڕی بۆ هێنابایە، ڕەگەزنامەیەکی وای بۆ دەنووسی، کە کابرا ڕاست دەچۆوە سەر ڕەگەزی دولکادیرلی‌یان، ڕەگەزنامەکە بە مۆر و نیشانەی زێڕینی پاشایانە دەڕازایەوە و کەس شکی نەدەکرد کە ئەوە لە سەر بناخەیەکی ڕاست نەنووسرابێ. ئاخرەکەی هێندەی لەو ڕەگەزنامانە نووسین، کە هەموو زنجیرە چیای تووڕرووسی پڕ بوو لە دولکادیرلی‌یان...

هەر حەوتوویێك پێشتر حەمەدۆك هاتبووە سەر قەدەرۆغلی و کۆمەڵێك تفەنگ و کیسەیەکی سکەی زێڕی لە کۆنەوە ماوەوەی لێ‌تەستاندبوو. بەگێکی دیکەشی دە گەڵ بوو، کە ناوی کاراجە بوو و بە ناوی باپیرە گەورەیان کرابوو. دەشتی گوندێشلیی خوارەوەی ماراشێ هەمووی ئی وی بوو. ئەو بەگە ڕەوە ئەسپ، مێگەلە مەڕ و گاڕانێکی زۆری هەبوو و هەموو ساڵێ مالاتێکی زۆری لە ئالێپوو و دیمەشقێ دەفرۆشتن. زێڕێکی زۆری کۆ کردبوۆە، لە ڕاستی دا خەزێنەیەکی زۆر بە نرخ و بە نێوبانگی هەبوو. ئەویش ڕەگەزنامەی گۆرینی هەبوو، بەڵام ئی وی لە ئی خەڵکی گەورە تر بوو و هەمووشی زێڕی تێ‌گیرابوو. مۆری سوڵتانی تێ‌دا بە گوڵ ڕازابۆوە و هێندە جوان و دەگمەن بوو کە لە دوورەوە سەرنجی مرۆڤی بۆ لای خۆی ڕادەکێشا. قسەی تێ‌دا نیە مەلا تەحسین کیلۆیەك زێڕی لە نووسین و ڕازاندنەوەی ئەو ڕەگەزنامەیەی دا دە کار کردبوو.

زۆر ئاغا و بەگی دیکەش کە هەرکام سەرۆکی تایفە و عەشیرەتێکی بوون، بە سوار و پیادەی چەکداری خۆیانەوە هاتبوون. حەمەدۆك چووبووە سەر زۆربەیان، پووڵ و زێڕی زۆری

لیّ‌تەستاندبوون و بە سەر هەتیو و بیوەژنی سەردەمی شەڕ و داماوانی دیکەی دا دابەش کردبوو. هەموو بەگەکان لە حەمەدۆکی بێزار بوون و نەفرینیان دەکرد.

پاشن بلە یەکچاویشیان هێنا. ئەویش ساڵانێکی زۆر یاغی بوو و دوایە خۆی تەسلیم کردبۆوە، عەرزێکی لە ئاناوارزای کڕیبوو، چوار ژنی هەبوون و ڕەوەدێك منداڵ و لە گەڵ ماڵومنداڵی خۆی خەریکی ژیانی خۆی بوو. جەبارە درێژ و ڕەمۆش، کە ئەوانیش پێشتر هەر یاغی و لە گەڵ دەستەی بایرامۆغڵی بوون، هاتنە گەڵیّ. ڕەمۆ بە " ڕەمۆ کەڵەباب" بە نێوبانگ بوو، چونکوو ئەو کاتەی چەتە بوو، کاتێك ئاغا و دەوڵەمەندەکانیان ڕووت دەکردن، بە زۆری جلی پیّ‌دادەکەندن، لە سەر عەرزی ڕاست درێژی دەکردن، دەچووە سەر پشتیان، دەستی لێك‌دەدان و وەك کەڵەبابی دەی‌خوێند. نورییە گوڵەش، کەئەویش کۆنەیاغی بوو و بۆ دڕندەیی و بیّ‌بەزەییی‌یە بە نێوبانگ بوو، ڕەگەڵ کەوت. لە زووەوە خەڵك دەیان‌گوت: یاخوا کەس نەکەوێتە بەر دەستی نووریی‌یە گوڵەی.

بەو شێوەیە خەڵکێکی چەکداری بە ئەزموونی زۆر لە شاخی‌یەوە، لە دەشتێوە، لە ماڕاش و لێوارەکانی دەریایەوە، کۆ کرابوونەوە و ئامادەی دەستپێکردنی چالاکی بوون. مەبەستی عارف سایم بەگی ڕوون بوو: هەرچی زووتر دەبیّ ئەو داستانە کۆتایی پیّ‌بیّ و حەمەدۆك کە ئیدی لە ڕادەبەدەر گەورە بۆتەوە و ناوبانگی دەرکردوە، ئاسەواری ون بیّ و تەنانەت لە بیر و مێشکی خەڵکیش بسڕدرێتەوە.

دوای لێکۆڵینەوە و بیرکردنەوەی پێویست، بایرامۆغڵی بەرەو چیا وەڕیّ‌کەوت. عەلی‌یەشەل، جەبار و هەموو کۆنە یاغی‌یەکانی لە گەڵ بوون و هەروەها پیاوەکانی سوڵتانۆغڵی‌یە زەردە و بەگەکانی دیکە و هێندێك چەکداری داوخوازی دەشتیّ و شاخی لە گەڵ دەستەی وی بوون و دیارە سەرۆك و فەرماندەری هەموویان هەر بایرامۆغڵی بوو. ئەو چەکدارانە هەموویان ئاواتیان ئەوە بوو حەمەدۆکی بکوژن و ناویان بچێتە مێژووەوە. عەلی‌یە شەل، ڕۆستەم و بلە یەکچاو هەرکام ئەسپی خۆیان پیّ‌بوو و سوار بوون، بەڵام ئەوانی دیکە هەموویان بە پێیان بوون.

کاتێك ئەوانە لە شاری وەدەر کەوتن، تووشی پیاوێکی خۆیان بوون، کە ئەرکی کۆکردنەوەی زانیاری بە ئەستۆوە بوو و ئەو پێی‌ڕاگەیاندن کە حەمەدۆك دوای ئەوەی هەواڵی پیّ‌گەیشتوە کە بایرامۆغڵی بۆی وەدەرکەوتوە و لێی‌دەگەڕیّ، کشاوەتەوە لای کیرکسووی. بایرامۆغڵی تۆڕێکی زانیاریی دامەزراندبوو و هەتا لەگەڵ چەندکەسی هەڵسووڕی نێو ئەو تۆڕەی دا پێوەندیی

نەگرتبایە، دڵنیا نەدەبوو و بڕیاری نەدەدا. دەیزانی دوور نیە کەسی دیکە بتوانن خۆیان دەو تۆڕە دا جێبکەنەوە و بە هەڵەی بەرن. بۆخۆی لە سەردەمی چەتەگەرییە دا زۆر جار دوژمنی بە لارێ دا بردبوو و ماندووی کردبوو. حەمەدۆك زۆر هەڵسووڕ بوو، هەزار گوێ و هەزار چاوی هەبوون و ئەگەر بایرامۆغڵی بە وشیاری هەوڵی بۆ بەرەوڕووبوون لە گەڵی و دەداو خستنی نەدابا، دەیتوانی ساڵانێکی زۆر بەو نێوە دا بێ و بچێ، ئەویش بخولێنێتەوە و قەتیش خۆی نیشان نەدا. ئێستا وا دیار بوو تۆڕی زانیاریی بایرامۆغڵیی بە ساڵداچوو هەر نەبێ لە ئی حەمەدۆکی لاو نەدەمایەوە. بێجگە لە وەش حەمەدۆك زۆر بەگی کوشتبوون و ڕووت کردبوون، لاو بوو و شایی بە خۆی بوو، نە هیچ نەدەترسا، خۆی لە جێی کوێرۆغڵی، چاکیرجالی و تەنانەت ڕەشماریش دەدی، لە هیچ نەدەپرینگایەوە و بە پێویستیشی نەدەزانی زۆر خۆی بشارێتەوە. هەروەها وا دیار بوو هێندێك لە ڕادەی خۆی زیاتر متمانەی بە جووتێرەکان و ئەو لاوە مێرمندالانە هەبوو، کە ناوی وییان لە خۆیان نابوو. هیچ دوور نەبوو لە نێو ئەو کوڕانە دا ئی وا هەبن، کە بە زیانی حەمەدی هەڵسوکەوت بکەن. بایرامۆغڵی بەشبەحاڵی خۆی پێی وابوو کە ئەو دنیایە کەسێکی وای تێدا نیە کە بە ڕاستی متمانەی پێبکەی. جووتێرەکان سەدان ساڵ بوو لە ژێر ئەشکەنجە، کوێرەوەری، چەوسانەوە، شەڕ و نەخۆشی جۆراوجۆر دا دەیانناڵاند، ئیدی هەستی وەفاداری و بەڵێنپاراستنیان تێدا نەمابوو و ئەو بەرەوبەرەکێنیان دەکرد! زانیبایان حەمەد دەیدۆزێنێ، دەسبەجێ سەریان دەبڕی، بە دارێیانەوە دەکرد و بۆ بایرامۆغڵییان دێنا. هەر بایرامۆغڵی بۆخۆی، بۆچما ئەگەر متمانەی بە جووتێرەکان کردبایە، قەت چیای بەجێدەهێشت، کە بە ماڵ و هێلانەی خۆی دەزانی؟ ئەو هەموو پیاوانەی بۆ دە گەڵ بوون؟ شەڕی بیست کەسێك چەتە ئەو هێزە گەورەیەی دەویست؟ دوو گورهان ژاندەرمە بە فەرماندەرایەتیی یاوەر فاڕوقی، دووی دیکە بە فەرماندەرایەتیی سەروان عیززەت نووری و دووش بە فەرماندەرایەتیی سەروان عەلی گاوری بە لایەکی دیکە دا هەڵیانکوتابووە سەر کێوپارەی. باشە ئەوە بە ڕاستی هەڵە نەبوو؟ پەنجا پیاوی هەڵسووڕ بۆ ڕاوی ئەو چەتانە بەسە. عارف سایم بەگ و بایرامۆغڵی دەیانەویست لەشکرەکە زۆر بێ و مەبەستیش ئەوە بوو کە جووتێرەکانی تووڕووسی چاوترسێن بکەن. توانیبایان بەو هەموو ژاندەرمە، چەکدارە داوخوازە و لە هەمووانیش گرینگتر و بەرچاوتر بە بایرامۆغڵی خۆی، ترس، ئاڵۆزی و دڵەڕاوکێ بخەنە نێو جووتێرەکان، ئەوی دیکە هاسان دەبوو. مێژوو نیشانی داوە جووتێر لە ڕابردووش دا لە ژاندەرمەی هەر ترساون و هێزی زۆری نیزامی تەنیا شتێك بووە کە بە چۆکی دا هێناون.

بۆ ئێواریێ ئەو هێزە گەیشتە مێرگێکی خوارەوەی کانی‌یە گوڵان. لە وێ مانەوە خێوەتیان هەڵدان، مەڕ و جوانەگایان کوشتنەوە و لە مەنجەڵی گەورە گەورە دا پڵاویان لێنا. خەرجی خواردنی ئەو پیاوانە کە لە گەڵ بایرامۆغلی بوون، لە سەر ئاغا و بەگەکان بوو. عارف سایم بەگ پێی‌گوتبوون ئەو پیاوانەی وی گیانی خۆیان بۆ دەوڵەتێ دە مەترسی ناویشتوە، بەڵکوو لە پێناوی پاراستنی گیانی بەگەکان دا سینگی خۆیان بە گوللەیەوە ناوە، کە وا بوو هەر ئاغا و بەگیش دەبێ هەموو خەرجی وان بدەن.

سوڵتانۆغلی و هێزەکەی سێ‌شەو و ڕۆژان لەو شوێنە مانەوە. بۆنی پڵاوی دەدێمنراو و کەبابی سەر ئاوری دەگەیشتە گوندی کانی‌یە گوڵان، بەڵام لە تەواوی ئەو ماوەیە دا تەنانەت یەك کەسیش لە دێی ڕا نەهاتە خواریێ بڵێ بەخێرێن، یان لێیان بپرسێ بۆ کوێ دەچن. خەڵکی دێیەکەی لە ماڵێ نەدەهاتنە دەر و کەس لە نێو دێی نەدەبینرا. بایرامۆغلی ئەوەی پێ‌سەیر بوو. ئاخرەکەی خۆی پێ‌ڕانەگیرا، یەکێکی ناردەسەرێ، بۆ لای نایبە زەردی کە دۆستی خۆشەویست و لەمێژینەی خۆی بوو. نایب بە کابرای دا وەڵامی بۆ ناردبۆوە و گوتبووی، لە لایەن منەوە لە بایرامۆغلی بپرسە، بەڵام پێی‌بڵێ، مەگەر هەر چاوم پێی‌نەکەوێ! لە خودام تەڵەبە خۆم نیشان بدا! دەبێ دەردێکی بدەمێ ماست بێ و لە پێش سەی ڕۆکەی! یانی ئێستا ئەو هێندە بێ‌چاوورِوو بووە، کە ئاوا بکا؟ بێ‌گومان ئەو ڕووهەڵماڵاوی‌یەی لە عارف سایم بەگی فێر بووە! کە چوویەوە بۆ لای، لێی‌بپرسە و پێی‌بڵێ خۆشم لە چارەی نایە و پێم‌خۆش نیە چاوم بە چاوی بکەوێ...

بایرامۆغلی پیاوی دیکەی ناردنە لای، بەڵام بێ‌سوود بوو. ئەو جار ڕۆستەمە کوردی نارد. نایب ڕۆستەمی زۆر خۆش‌دەویست، بەڵام ئێستا کە ئەو چووە ژووریێ و چاوی پێی‌کەوت، نە چاوی لێ‌کرد و نە دواندیشی. ڕۆستەم ماوەیەك ڕاوەستا و هەوڵی دا بی‌دوێنێ، بەڵام سەرنەکەوت و بە دڵشکاوی گەڕایەوە ئۆردووگاکەکەیان:

ـ هەر زاری هەڵنەپچڕی و نەی‌دواندم! چاویشی لێ‌نەکردم! بایەخی سەگێکیشی پێ‌نەدام. مات و بێ‌دەنگ لە تەنیشت ئاورگی دانیشتبوو، دەت‌گوت پەیکەرەیەکی بێ‌گیانە.

بایرامۆغلی بە تووڕەیی هەستا سەر پێ:

ـ بۆخۆم دەچم، بزانم ئەو کابرایە بۆ وا دەکا!

سوار بوو و لە گەڵ ڕۆستەمی چوون بۆ نێو دێی.

لە بەر دەرگای ماڵی نایبی لە وڵاخی دابەزی، دەرگای کردەوە، چووە ژووریێ و گوڕاندی:

ـ ئافەرین نایبە زەرد! بە ڕاستی دۆستایەتی ئاوا دەبیٚ! لە کنەخۆ ئەمن و تۆ برا بووین...

نایبە زەرد چوارمێردەکی، لە سەر کەوڵێکی، لە پەنا ئاوری، دانیشتبوو، دە گڕی ئاورەکەیەوە ڕامابوو و متەقی نەدەکرد، نە خۆی بزاوت و نە چاویشی لیٚکردن، تەنیا هێندێك زیاتر پشتی دانەواند و لە ئاورەکەی چووە پێشیٚ.

ـ ئەوە منم، بایرامۆغلیم، نامبینی؟

نایب کەمێك شانی هەڵتەکاند.

ـ نایب، میوانت هاتوون، میوان دیاریی خودایە! نامانبینی؟

بەڵام نایب خۆی هەر نەبزاوت. لە هەموو ژیانی دا بایرامۆغلی نەکەوتبووە دۆخێکی ئاواوە و کەس ئاوای هەڵسوکەوت نە گەڵ نەکردبوو. چۆن دەبیٚ نایبە زەرد وا بکا؟

ـ گوتم ئێمە میوانین و میوان دیاریی خودایە. هاتووین سەرت بدەین! تێگەیشتی دەڵێم چی، یان بە تەواوی شێت بووی سەگە زەرد؟

نایب کە ئەوەی بیست، وەك گوللەی دەرپەڕی، لە پێش بایرامۆغلی ڕاوەستا و بە بزەیەکی تاڵەوە گوتی:

ـ شێت؟ ئەگەر شێت لە دنیایە هەبن، پێم بڵیٚ بزانم کەس بە قەد تۆ شێتە؟ خەڵکینە بزانن! ئەوە بایرامۆغلیی بەنێوبانگە، کە سەردەمێك عەرزی لە بن پێی دەلەرزی، ئەو کەسەیە کە وەك هەڵۆ سەربەرز و بیٚمنەت بوو. ئەو کەسەیە کە گوڕەی وەك گوڕەی حەزرەتی عەلی، شێری خودای بوو. هەر ئەو پیاوەیە کە لە دەشتیٚ و لە شاخی نانی هەژارانی دەدا! بەڵام ئێستا وەرن بایرامۆغلیی گەورە ببینن. ئێستا بۆتە منداڵۆکەی بەردەستی ئاغا و بەگان و هاتوە لە شاخی حەمەدۆکیان بۆ بکوژیٚ، لە گەڵ ژاندەرمە و پیاوەکانی سوڵتانۆغلییە زەردە، قەمبەرۆغلی و کادیۆغلیی ستەمکار دەستی تێکەڵ کردوە، هاتوە حەمەدۆکی بگریٚ، بە زیندوویی کەوڵی کا، چاوی دەرهێنیٚ و بیٚداتە دەستی سوڵتانۆغلی... بریا ئەمن ئەو کاتەی لە داردانێلی کەشتییە شەڕکەرەکان لێمان پەیدا دەبوون و وە بەر تۆپانیان دەداین، کوژرابام و ئەم ڕۆژەم نەدیبایە! خۆزگە لەو شەڕانە دا لەتوپەتیان کردبام و بستە گۆڕێکیشم لە سەر ئەو دنیایەی نەبا، بەڵام بایرامۆغلیم ئاوا بە ڕووخاوی و زەبوونی نەدیبا! دەڵێن "گورگ ئەگەر پیر بوو، دەبێتە مەسخەرەی سەگان." بریا بایرامۆغلی بە جحێلی مردبای و نەگەیشتبایە ئێستا!

پاشان بە هەردووك دەستە بەهێز و گەورەکانی ڕۆبووە یەخەی بایرامۆغلی. لەو حاڵەی دا چاوەکانی پڕ ببوون لە ئاو و هەموو گیانی دەلەرزی:

ـ پێم بڵێ بزانم، ئەوە لەشکرت لە کێ کردوە بایرامۆغلی؟ دەچی‌یە کوێ؟ دەچی حەمەدۆکی دەکوژی؟ لە هەڵە دای بایرامۆغلی! ئەوە حەمەدۆك نیە دەی‌کوژی، گوللە بە ژیانی لاوەتی خۆتەوە دەنێی و لاوەتیی خۆت دەکوژی! حەمەدۆك نیە، بایرامۆغلی‌یە، کوێرۆغلی‌یە، ڕەشمارە، حەزرەتی عەلی‌یە دەکوژرێ! هەموو ئەو دڵانە دەکوژی کە بۆ عەداڵەت لێ‌دەدەن و دژی ستەم خەبات دەکەن! بایەخە ئینسانی‌یەکان دەکوژی! چیای تووڕووسی دەکوژی! بە ڕاستی لە ڕووت هەڵدێ چاو لە چاوم کەی؟ وەڵامم دەوە، بایرامۆغلیی ئازای بەناوبانگ! گوێم لێ‌بگرە بایرامۆغلی، ئەتۆ دەستت لە یاغیگەری‌یە کێشایەوە، چووی دانیشتی و ون بووی! ئەتۆ مردووی، بەڵام خەڵکی تەواوی زنجیرە چیای تووڕووسی ڕێزت دەگرن، لە لایان گەورەی، شێعر، حەیران، بەیت و گۆرانیت بۆ دروست دەکەن و پێت‌هەڵدەڵێن! بە یاد و ناوی تۆوە سەمای فارانذۆڵ دەکەن! بەڵام ئەو جار ئەو گۆرانی، بەیت و سەمایانە تەواو دەبن و دەبنە ئی خەڵکی دی... ئەو خەڵکە مێژووی تۆ و ناوبانگی تۆ هەم لە دڵی خۆی و هەم لە سەر ئەو عەرزەی دەسڕێتەوە! گوێت لێ‌بوو، بایرامۆغلی؟

دوای ئەو قسانە هەستا و وەدەرکەوت. خۆر دەدرەوشایەوە و کزەبایەکی سارد لە سەران ڕا دەهات. نایبە زەرد لە سەر کۆلکەدارێکی، لە بن دارگوێزە گەورەکەی قولینچکی حەسارێیان دانیشتبوو و دە بیرانەوە ڕۆچووبوو. لەوێوە خێوەتەکانی هۆردووەکەی دیار بوون. بایرامۆغلی بە لارەوە لارەوە هاتە دەرێ و چوو بۆ لای نایبە زەردی. شەپکەی کڵاوەکەی چاوەکانی و بەشێکی ڕوخساری شاردبۆوە. هێندێك چووە پێشێ، ڕاوەستا، دەت‌گوت دەیەوێ شتێك بڵێ، بەڵام ڕووی وەرگێڕا و گەڕایەوە. هەموو گیانی دەلەرزی و بە زەحمەت دەی‌توانی بە پێوە ڕاوەستێ. لغاوی ئەسپەکەی لە دەستی ڕۆستەمی وەرگرت، بەڵام لاقەکانی هێندە دەلەرزین، کە نەی‌دەتوانی خۆ باوێتە سەر ئەسپەکەی و سوار بێ. چاوی دە ڕەشەوە دەهاتن، نێوچاونی گنج ببوو و لێوەکانی دەلەرزین. لەسەرەخۆ، لە حاڵێك دا سەری داخستبوو، لغاوەکەی دە دەستی دا بوو و ئەسپەکەی بە دوای خۆی دا دەکێشا، گەڕایەوە بۆ لای هۆردووەکەی. ڕۆستەمە کوردیش هەر چووە خێوەتەکەی وی و لە پەنای دانیشت.

لە نەکاو بایرامۆغلی گوتی:

ـ نایبە زەرد ڕاست دەکا. ئێمە دەچین لاوەتیی خۆمان دەکوژین، کراسی کۆنەبزووتنەوەی خۆمان لە بەرمان دادەدڕین. نایب دۆستە و پیاوی چاکە، دەنا دەبوو تفی دە چاوی کردبام.

ڕۆستەمە کورد ئاخێکی هەڵکێشا و لە سەرەخۆ گوتی:

ـ بەڵێ، من و تۆ هەردووکمان خەریکین بچین ئەو گوڵانەی ئێرە، لە شاخی، شین بوون و هەر بۆخۆشمان پێشتر چاندوومانن، پێشێل بکەین! هەر بریا ئەو ڕۆژەی چەکمان دادەنا، مردباین و نەگەیشتباینە ئێستا و ئەو بەڵایەی ببینین کە تووشمان بووە!

ـ ئێستا ئیدی ناتوانین بڵێین نا، وانیە ڕۆستەم؟

ـ نەخێر، ئێستا ئیدی درەنگ بووە، کاکە...

ـ ئەگەر بڵێین نا و نەیکەین، چ دەبێ؟

ـ خەڵك دەڵێن بایرامۆغڵیی گەورە وەدوای کوڕێکی منداڵکار کەوتبوو کە ناوی حەمەدۆك بوو، دەیەویست کوڕکەی دەداو خا و بیگرێ، بەڵام دواتر ترسا و گەڕایەوە. ئەو کاتی دەبینە گاڵتەجاڕی خەڵکی و ئەوەش زۆر ناخۆشە و لە داخان دەمری... خەڵك ئەوکاتی باوەڕ ناکەن کە ئێمە دڵمان بەرایی نەوادە شەڕی حەمەدۆکی بکەین و ئەو گوڵەی پەڕ پەڕ بکەین کە بۆخۆمان تۆوەکەیان لە شاخی چەقاندوە! ئەو کاتی ئیدی کەس نازانێ کە بایرامۆغڵی پێیخۆش بوو بمرێ، بەڵام تەقە لە لاوەتیی خۆی نەکا...

ـ ڕاست دەکەی کەس باوەڕ ناکا. بەڵێ ئەو ڕێگایەی چارەنووس خستوویەتە پێش ئێمە، لە وەی زیاتر نیە! وا دیاری کراوە کە حەمەد بە دەستی ئێمە بگیرێ!

بایرامۆغڵی لە حاڵێك دا هەر وا نوقمی بیرکردنەوە بوو، بە دەرگای چادرەکەی دا چاوی لە لووتکەکان کرد، کە هەر وا بەفریان پێوە بوو و سپی دەچوون. کاتێك ڕووی دە ڕۆستەمی کردەوە، چاوەکانی ئاویان تێگەڕابوو، ڕوخساری گرژ ببوو و گنجی نێوچاوانی زۆرتر وەدەرکەوتبوون. بۆڵەیەکی لێهات و وەك ئەوەی لە گەڵ خۆی بێ، لە بن لێویەوە گوتی:

ـ هیوادارم حەمەدۆك یەکسەر بمانپێکێ، ئەو دەمی هەر نەبێ شەرەف و ئابڕووەکەمان پێدەمێنێ.

ڕۆستەمە کوردیش دەسبەجێ گوتی:

ـ هیوادارم وا بێ!

بایرامۆغڵی بە پیاوەکانی گوت خێوەتەکان بخەن. کۆ کردنەوەی ئەو خێوەتانە ئەستۆی کوێخای دێی بوو و بایرامۆغڵی پێیخۆش نەبوو لەمەو دوا چەکدارەکانی تێکەڵاوی خەڵکی بن.

ئەو هێزە شەو و ڕۆژێك بەڕێوە بوو. لەو بەینەی دا بەردەوام تەتەر دەهاتن هەواڵی تازەیان دێنان. بایرامۆغڵی هەرلە سەر زینی ئەسپەکەی ماوەیەك ڕادەما و بە بیرێکی ئاڵۆزەوە گوێی دەدانێ و پاشان ملی ڕێگایەی دەگرتەوە.

کاتێك گەیشتنە سەری شاخی، لە لای ڕاستە، لە نێو دۆڵێکی دا، گوندێکیان بەدی کرد. پیاوەکان ماندوو و برسی بوون. دووکەڵ لە کولانەی ماڵەکان دەهاتەدەر. شوێنێکی بەرتەسکی ئاواڵە لە نێو دێی هەڵکەوتبوو کە گیای سەوزی لێ بوو، دوو دار پەڵکی گەورەی لێڕوابوون و جۆگەیەکیشی بە نێوەڕاستی دا دەهات.

کاتێك خەڵکی دێیەکەی چاویان بە وان کەوت، چوونەوە نێو ماڵەکانیان و دەرگاکانیان داخست. بایرامۆغڵی دیتی کە لە چاولێکنانێك دا یەك کەسیش بە دەرەوە نەما.

چوونە بەر دەرگای خانوێکی کۆن کە دیوارەکانی بە گڵەسپی سواغ کرابوون و وێدەچوو ماڵی کوێخای دێی بێ. کەس بە پیریانەوە نەهات. بایرامۆغڵی وەك کەروڵاڵانی لێهاتبوو: قەتم ئاوا هەڵسوکەوت لە گەڵ نەکراوە. جاران کە یاغی بووم، کاتێك ڕووم دە دێیەکی دەکرد، مەیدانە ئەسپێك بە پیرمەوە دەهاتن، جێژنیان بۆ دەگرتم، خەڵك خودا خودایان بوو بچمە ماڵێیان و کاتێك لە دێیەکی دەمامەوە، هەموو ماڵەکان بانگهێشتنیان دەکردم.

ڕەمۆ کەڵەباب هەرای کرد:

ـ ئەرێ ماڵێ، کەستان لە ماڵ نیە؟

دەنگی زۆر بەرز بوو و هەراکەی تووڕەبوونی تێدا دیار بوو. دیسان هەرای کردەوە، وەڵام نەبوو و هەموو دەرگاکانیش داخرابوون.

بایرامۆغڵی وەك ماری فیشکاندی:

ـ دەرگاکەی لە ڕەسمە بەرن و بیکەنەوە!

سێ ـ چوار چەکدار بەیەکەوە دە دەرکەی ڕۆهاتن، لە ڕەسمەیان برد و کردیانەوە. پاشان چوونە ژوورێ و چەند پیاویان هێنایە دەرێ، یەکێکیان پیرەمێردێك بوو ڕیشی سپیی درێژی هەتا سەر سینگی دەهات.

بایرامۆغڵی دە پیاوەکان ڕاخوڕی:

ـ ئەو پیاوە ڕیشسپییەی بەردەن!

کاتێك پیاوەکەی ناسییەوە، دینی لە کن نەما. گیانی وا دەلەرزی، ئەسپەکەشی دە بنی دا دەستی بە لەرزینێ کرد. ئەو پیاوە پاشا ئەحمەد بوو کە لە کۆنەوە دیوناس و دۆستی نێزیکی یەکتر بوون. پاشا ئەحمەد خانوو و مەزرایەکی گەورەی لە دەشتێ هەبوو و لە زووەوە لە گەڵ هەر کەس دوابا، دەیگوت ئەمن لە تایفەی دولکادیرلییانم، تەنیا من لەو تایفەیەی ماومەوە. هێندێك کتێبم هەن، ئەوەیان تێدا نووسراوە، کاغەزی سەرژمێری و مۆری سولتانیم هەیە، بەڵام کەس بۆی نەدەسەلماند، چونکە ڕۆژ بە ڕۆژ ئەوانەی وایان

دەگوت و ڕەگەزنامە و مۆر و بەلگەشیان هەبوون، بەردەوام زیادیان دەکرد. ناخرەکەی لە داخی ئەو خەلکەی پاشا ئەحمەد مالەکەی پێچایەوە، لە دەشتێ ڕۆیی و هاتە ئەم گوندەی کە بنەمالەکمیان زوو لێرە ڕا هاتبوون و هێشتا بەشێك لە خزمەکانی هەر لێبوون. ئەم گوندەش پاشا ئەحمەد مەزرا و مالی خۆی هەبوو و دوای ئەوەی ئەو گوندەی دامەزرا، بوو بە کوێخا. بایرامۆغلی ئەوەی ئەدەزاکە.

ـ ئەحمەد پاشا ، ئەمنت ئەناسی‌یەوە؟

پاشا ئەحمەد بە ڕوویەکی گرژەوە وەلامی دایەوە:

ـ ناسیمی‌یەوە! ئەمن چۆن دەبێ ئەتۆ ئەناسمەوە؟

ـ باشە، دەبێ ناوام هەلسوکەوت لە گەلّ بکەی؟

پاشا ئەحمەد بزەیەکی تالّی هاتە سەر لێوان:

ـ برۆ بایرامۆغلی! هەر ئێستا لێرە برۆ! ئەمن و تۆ نانێکمان بە یەکەوە خواردوە و دیارە دۆست بووین، بەلام ئێستا پێت دەلێم برۆ، لە کۆلمان بەوە. برۆ حەمەدۆکی بکوژە! دە برۆ دەی بایرامۆغلی، دۆستی دێرینم، کە وەك هەلۆی سەربەرز و بەرزەفڕ بووی و وەك شەهێنی چابوك بووی! برۆ قارەمانی قارەمانان! برۆ حەمەدۆکی بگرە و بی‌کوژە...

ـ زۆر سەیرە پاشا ئەحمەد، ئەمن بیستوومە کە حەمەدۆك هاتۆتە سەرت و هەرچی هەتبووە لێی‌ئەستاندووی، وایە؟

پاشا ئەحمەد سەری هەلێنا و بە چاوە سەوزە بچووکەکانی سەیری بایرامۆغلیی کردو گوتی:

ـ بەلێ ڕاستە، حەمەدۆك هاتە مالێم و هەرچی زێڕ و زێوی کۆنم هەبوو، لێی‌وەرگرتم و بە سەر ئەو مندالانەی دا دابەش کرد کە بابەکانیان لە شەڕێ دا کوژرابوون.

بایرامۆغلی حەیران مابوو. هەردووکیان چاویان دە چاوی یەکتر بڕی. پاشا ئەحمەد دیسان گوتی:

ـ بە ڕێی خۆت دابڕۆ، بایرامۆغلی، حەمەدۆکی بکوژە، بەلام لە پشتەوە ڕا تەقەی لێبکە، چونکە ئەوە زیاتر لە کەسایەتی و ناوبانگی تۆ دەوەشێتەوە.

پاشان بە دەنگی بەرز پێ‌کەنی. پێکەنینێکی تالّ و ڕووی وەرگێڕا و چۆوە ژوورێ. نێو دێیەکە هەر وا چۆل بوو و تەنیا چەند مندالّ لە قولینچکێکەوە چاویان تێبڕیبوون، بەلام ئەوانیش کە زانیان چەکدارەکان دیتوویانن، ڕایان کرد و ون بوون. دەستەیەك مریشك و کەلەباب لە سەر کۆ خۆلەمێشێکی چینەیان دەکرد و بالەکانیان لە نێو تۆزێ دا دەبریقایەوە.

بایرامۆغلی لەو گەڕانەی دا تووشی زۆر هاوڕێی کۆنی دیکەی بوو و هەلسوکەوتی هیچ کامیان لە گەلی، لە نی نایبە زەرد و پاشا ئەحمەدی باشتر نەبوو. هەر قسە و تانە و

تەشەرێکی ئەو کۆنە هاوڕێیانە وەك خەنجەرێ کاری لە دڵی ئەو کۆنە یاغی‌یەی دەکرد. ڕۆژ بە ڕۆژ جووتێرەکان خراپتریان لە گەڵ دەجووڵانەوە، قسەی سووکیان پێ‌دەگوتن و بە چاوی سووك لێیان دەڕوانین. بۆ یەك جاریش کەس قسەیەکی خۆشی دە گەڵ بایرامۆغلی نەکرد، بەڵام خەڵکەکە و بە تایبەت دۆستە هەرە نێزیکەکانی خۆی لەو گوندانەی چیای، لێیان نەدەپێچایەوە و هەر لۆمەیان دەکرد. ئەو جار بایرامۆغلی دەرسێکی تازە سەبارەت بەو دێهاتی‌یانە کە تا ئێستا بە دووڕوو و بێ‌بەڵێنی دەناسین، فێر بوو...

قاسیدێك بە هەناسە بڕکە گەیشتێ:

ـ ئەو ڕێگایەی گرتووتانە، ڕاستە. یاوەر عەلی گاور و سەروان عیززەت نووری لەو سەرەی حەمەدۆك و دەستەکەی وی‌یان گەمارۆ داوە. نیو سەعاتی دی ناکێشێ، دەگەنە وێ...

کابرای قاسید باوەڕپێکراوی بایرامۆغلی بوو، سەردەمی شەڕی سەربەخۆییش هەر ڕاپۆرتچی خۆی بوو و قەت هەڵەی نەکردبوو. کابرا گوتی:

ـ ئەوان ڕێگای پاشەکشەیەیان لە حەمەدۆکی بەستوە. هەر ئەم لایە ماوە کە بە تەواوی نەگیراوە. ئەگەر ئێوە بەو ڕێگایەی دا وەسەرکەون، بێ‌گومان حەمەدۆکی دەگرن.

بایرامۆغلی سپی هەڵگەڕا، ڕووی دە عەلی‌یە شەلی کرد:

ـ ئەتۆ دەڵێی‌چی عەلی؟ وایە؟

ـ شتی وا نابێ! ئەو شوێنەی من هەڵمگرتوە، بە هیچ شێوەیەك بۆ ئەو لایە ناچێ.

پاشان دەستی بۆ لای پێچەوانەی وێ ڕاداشت:

ـ شوێنی چەتەکان ئاوا دەڕوا.

هێزەکە گەڕایەوە و بۆ ئەو لایە ڕۆیی کە عەلی دەستی بۆ ڕاداشتبوو...

شەڕ لە نێوان یاوەر عەلی و سەروان عیززەتی لە لایەك و دەستەی حەمەدی لە لایەکی دیکەوە دوو ڕۆژان درێژەی کێشا. ئەگەر بایرامۆغلی بە قسەی قاسیدەکەی کردبایە، ئەوە حەمەد و هاوڕێکانی بە تەواوی دە گەمارۆ دەکەوتن و یان دەکوژران، یان دەگیران. زۆر زەحمەت بوو بتوانن دەروەستی ئەو هەموو هێزەی بێن. عەلی‌یە شەل و بایرامۆغلی چاکیان دەفریا هاتن...

کاتێك بایرامۆغلی هەواڵی پێ‌دەگەیشت کە حەمەدۆك لە ئاکچەکۆیە، ئەو دەچوو بۆ عەلیکۆیە و ئەگەر حەمەد لە چیای کۆنووری دیترابا، ئەو دەچوو بۆ چیای فەقێی. جووتێر کەیفیان بە وەی دەهات و ئەو جار بە دەهۆڵ و زوڕناوە بەرەوپیری دەچوون، داوەتیان بۆ دەگرت، بانگهێشتنیان دەکرد و ڕێزیان دەگرت. بایرامۆغلی ئیدی خۆشەویست ببۆوە، کۆنە دۆستەکانی

لووتیان لیٚ‌هەڵتەدەنگاوت و پشتیان تیٚ‌تەدەکرد، بە پیٚچەوانەوە لە دوورەوە بەرەوپیری دەچوون، دە ئامیٚزیان دەگرت و یادی ڕابردوویان لە گەڵ دەکردەوە.

زستان بە سەر دا هات، بیٚ ئەوەی بایرامۆغڵی تەنانەت یەك جاریش لە گەڵ حەمەدۆکی تیٚکئاڵقابن و لیٚکیان دابیٚ. لە حاڵیٚك دا ژاندەرمەکانی ژیٚر فەرمانی سەروان عیززەت نووری، کە هیٚزی یاوەر هالیشیان گەیشتبووە یارمەتی‌یە، چەندین جار لە گەڵ چەتەکان تیٚکهەڵچووبوون و زیانی بەرچاویشیان پیٚ‌گەیشتبوو، بەڵام چی‌یان دە گەڵ حەمەدی پیٚ‌نەکرابوو و کەسیشیان بۆ بە دیل نەگیرابوو.

دە ئاخری دا خەبەر بە شاری گەیشتەوە کە بایرامۆغڵی خۆ لە شەڕی گەڵ حەمەدی دەبویٚریٚ و بە کورتی نای‌کا. گەورەپیاوەکان زۆر تووڕە بوون. عارف سایم بەگ نامە لە سەر نامە بۆی دەنارد و بە ترسەنۆك و خویٚریی ناو دەبرد. خەڵکیش دەیانگوت، بایرامۆغڵی ناویٚری قەرە لە قەرەی حەمەدۆکی بدا. تەنانەت کاتیٚك تووشی بووە، ئاڵای سپیی بە دەستەوە گرتوە، حەمەدیش پیٚی عەیب بووە بی‌کوژیٚ و ڕیٚی داوە بڕوا...

ئەو زستانە بەفریٚکی زۆری لە گەڵ بوو. لووتکەکان، دارستان، بنارەکان، گوندەکان و چۆمەکان هەموو دە بەفری دا ون ببوون. هاتوچۆ زۆر زەحمەت بوو، بەڵام فەرماندەرەکان کە ئیٚستا یاوەر فاروق و هیٚزە دەستچنکراوەکەی ویشیان هاتبووە گەڵیٚ، لە سەر ئەوەی سوور بوون کە حەمەدۆکی پیٚش ئەوەی بەهار دا بیٚ، دە داو خەن و بی‌گرن. هەر بۆیەش سەرەڕای ئەوەی سەرماکە توند بوو و دەست و لاقی خۆیان و پیاوەکانیان لە سەرمان سڕ دەبوو، هەدایان نەدەدا، هەر وا دەگەڕان و شاخ بە شاخ و ئەشکەوت بە ئەشکەوتیان دەپشکنی. عارف سایم بەگ ئیدی بە کردەوە لەو شارەی جیٚگیر ببوو، لە ویٚوە دەستووری بۆ دەوروبەر دەنارد و چاوەدیٚریی بە سەر کاروبارەکان دا دەکرد. هەموو فەرماندەرەکان دەیانزانی ئەگەر لەو پیٚسپیٚراوی‌یە دا سەرنەکەون و نەتوانن پیٚش بەهاریٚ کۆتایی بە گرفتی حەمەدۆکی بیٚنن، ئەوە ڕیٚگای پیٚشکەوتن و گەشەکردنیان دەبەسریٚ و تەنانەت کارەکەشیان دەچیٚ. خەڵکی شاریش گاڵتەیان بە بایرامۆغڵی دەکرد و پیٚی‌پیٚ‌دەکەنین. ئەمەش ئەوی زۆر تووڕە دەکرد.

ڕۆژیٚکیان بەیانی زوو لە خەویٚ هەستا و بانگی عەلی‌یە شەلی کرد:

ـ هەستە عەلی، بە پەلە خۆت دە بەر کەوە و وەرە لای من.

عەلی دەسبەجیٚ وەڵامی دایەوە:

ـ لیٚرەم و ئامادەم، بایرامۆغڵی.

ـ دەبێ هێرش بکەین. خەڵك پێمانپێدەکەنن! هەر ئێستا نامەیەکی عارف سایم بەگیم پێگەیشتوە، پەیامێکی مستەفا کەماڵ پاشای تێدایە و لە پەیامەکەی دا نووسراوە: ئەرێ ئەوە بایرامۆغڵی چ دەکا؟ چۆن دەبێ تا ئێستا هاوسەنگەری من نەیتوانیبێ کۆتایی بە ئاژاوەی بستەمنداڵێکی بێنێ! کە وابوو عەلی، دەبێ ئەمرۆ نیشان بدەی کە عەلی‌یە شەلی شای شوێنگێڕانی. لە تۆم دەوێ دە ماوەی سێ ڕۆژان دا حەمەدۆکم بۆ بدۆزی‌یەوە!

ـ بۆت دەدۆزمەوە...

هەموو ڕۆژێ، بێپسانەوە هەواڵی تازە سەبارەت بە حەمەدۆك و دەستە جۆراوجۆرە حەوت حەمەدەکان، بە بایرامۆغڵی دەگەیشت، کە ئێستا پێوەندیی دە گەڵ ژاندەرمەکان گرێدابۆوە. ئەو هێزانە بست بە بستی شاخ، دەشت و گوندەکانیان دەپشکنی. لە نەکاو هەواڵیان بۆ هات کە حەمەد لەو سەری تووڕووسی جێگیر بووە. ژاندەرمە هەڵیانکوتایە سەر ئەوێ، بەڵام هەر لە وێ ئاگادار کران کە حەمەد لە خوارەوەی ماڕاشی لە دەشتی گوندیشلی بە سەر چەند شوێنانی داداوە. هەم بایرامۆغڵی و هەم فەرماندەرە نیزامی‌یەکان ئەوەیان زۆر پێسەیر بوو، ئاخر حەمەدۆك چۆن دەتوانێ ئاوا خێرا جێگۆڕکێ بکا و هەر ڕۆژەی لە شوێنیکی زەبر بوەشێنێ؟ بەڵام وا دیار بوو حەمەدۆك بە وەش دەستی هەڵنەدەگرت. هەر ئەوێ ڕۆژێ، لە سێ شوێنی جیاواز، کە مەوداشیان لە گەڵ یەك زۆر بوو، هاوکات، هێزەکانیان لە گەڵ حەمەدۆکی تێكهەڵچووبوون. دیارە بایرامۆغڵی دەیزانی ئەوە چ شێوەیەکە حەمەد بەکاری دێنێ. بۆخۆشی کاتی خۆی ئەو فێڵەی دەکرد، هێندێك دەستەی دیکەی دروست کردبوون و هەمیشە کاتێك بۆخۆی مەودای هەڵسووڕانی بەرتەسك دەبۆوە، ئەوان لە پشتەوە و لە چەند شوێنی جیاواز ڕا شەڕ و پێکدادانیان هەڵدایساند و دۆخەکەیان ئاڵۆز دەکرد. ئەو شێوەیەکی دیکەشی دەزانی، کە زۆرجاران سوودی باشی لێوەرگرتبوو و ناوی نابوو" تۆڕی جاڵجاڵووکەی." دەیەویست ئێستا ئەو فێڵەی لە حەمەدۆکی دەکار کا: دەزانم حەمەد زۆرتر لە کوێ دەردەکەوێ و دەمێنێتەوە، لە وێ مات دەبم، ڕاست وەك جاڵجاڵووکەی دە تۆڕەکەی دا، خۆ ماندوو ناکەم و بێ هەست چاوەڕوان دەبم! زۆری پێناچێ دێ و دە تۆڕێ دەکەوێ...

دوای بیرکردنەوە و لێکۆڵینەوەیەکی ورد، بایرامۆغڵی عەلیکۆ و دەوروبەری وێی هەڵبژارد. بە فەرماندەرەکانی گوت ژاندەرمە و چەکدارەکانی خۆیان لە گوندەکانی وێ دامەزرێنن و تەنیا گورهانی عەلی گاوری بجووڵێ و هەڵسووڕێ. ئەو ئەفسەرە شتێکی سەیر بوو. ماندوو نەدەبوو و بە دایم پیاوەکانی هەڵدەسووڕاند و دەیگێڕان. بە ئاستەم سۆسەی شتێکی کردبایە، ئیدی وەك

ژەنگەسوورەی دەهارووژا و گوند بە گوندی ئەو ناوچەیەی دەگەڕا. دیارە حەمدۆکی نەدەدۆزییەوە و هەر بۆیەش گوشاری دەخستە سەر جووتیێرەکان و ئازاری دەدان. بۆ ئەشکەنجە کردنیٚ عەلی کەرتیشیش دەستی لە دوو نەدەکرد...

بایرامۆغلی بە مشە گۆشت مەڕ و گۆشت جوانەگای دەدا بە هێزەکان و ڕای‌سپاردبوو لە شاری ڕا زۆریان ئارەقی ڕاکی بۆ هێنابوون و ئەوەش بەشێك لەو فێڵەی بوو کە خەریکی بەکارهێنانی بوو. ئەڵبەت بە نهێنی لە گەڵ فەرماندەرەکان قسەی کردبوو و خواردنەوەی ئارەقی هەم لە ژاندەرمەکان و هەم لە پیاوەکانی خۆی قەدەغە کردبوو، بەڵام بە ڕواڵەت وا دەردەکەوت کە چونکە زستانە و بەفر دەعەرزی دایە، ئیدی ئەو هێزانە چالاکی ڕادەگرن و زستانەکەی بە خۆشگوزەراندن و حەسانەوە دەبەنە سەر. هێزەکەی عەلی گاوریش قەت چی بە دەستەوە نەدەهات و ئەوەش بۆ پلانی "تۆڕە جاڵجاڵووکە"ی بایرامۆغلی بەقازانج بوو.

دوای شەڕ و پێکدادانێکی کە شەش سەعاتی خایاند، یاوەر عەلی گاور و هێزەکەی پاشەکشەیان کرد و چوونە دێیەکی کە لە نێوەڕاستی شاخی و لە نێو دۆڵێکی ڕەوەزاوی دا هەڵکەوتبوو. هەموو چوونە ماڵی ئاغای دێیەکەی، ژاندەرمەی ماندوو و شەکەت لە دیوەخانیٚ دەستیان بە چاخواردنەوەی کرد و یاوەریش لە گەڵ ئاغای لە قاتی سەرەوەتر دانیشتبوو، ئارەقی دەخواردەوە و هەرچی بە زاری دادەهات بەو یاغی‌یە ڕەوەکەی دەگوت کە بە هیچ شێوەیەك دە قاف نەدەکەوت و کەس بۆی نەدەگیرا، کە لە پڕ دەرگا کەلێنی کەوتیٚ، گرمەی گوللەیەکی هات، دەرگا کەوتە سەرپشتیٚ و دەنگێکی بەرز تێیان ڕاخوڕی:

ـ نەبزوون! ئەمن حەمەدۆکم!

یاوەر پێکەکەی دانا و لە سەرەخۆ دەستی هەڵێنان. ئاغاش وەك وی کرد. چەتەکان یاوەریان بردە قاتی خواریٚ. ژاندەرمەکان هەموو چەك کرابوون و قۆڵبەست کرابوون.

حەمەد گوتی:

ـ تفەنگ و فیشەکەکانتان لیٚ‌دەستێنین، دەزانین بە کاری ئێوە نایەن، حەیفە بە ئێوە بن، بۆ ئێمە باشن، چونکە دەکاریان دەکەین. وایە یاوەر؟

یاوەر وەڵامی دایەوە:

ـ قەی ناکا، با وابیٚ، بەڵام شتێك هەیە بۆ من ڕوون نیە. ئەگەر پێتانوایە ئێمە تەوەزەلین و حەیفە ئەو تفەنگانەمان پیٚبن، ئەدی بۆ بە سەر ئەوانە دا نادەن کە لە خوارەوەی عەلیکۆی، لە گوندێکی دانیشتوون، هەر دەخۆن، دەنوون و بە سێلاویش ڕاکی هەڵدەقوڕێنن. خۆ ئەوان

تفەنگ و فیشەکیان زۆرتر لە ئێمە پێن، پوولێشیان زۆر پێیە! تەنانەت ڕەشاشیشیان پێن و دیارە ئەو ڕەشاشانە بۆ ئێوە لەو تفەنگانەی ئێمە پێویستتریشن.

ــ فەرماندەری وان بایرامۆغلی‌یە. پیاو تێی‌ناگا خەریکی چ فێلێکی‌یە!

ــ ئەو تەنیا کابرایەکی سەرخۆشی ترسەنۆکە و پیاوی شەڕێ نیە!

ــ ئەتۆ پێت وایە، ئەوانەی باشی دەناسن، پێیان وا نیە!

ــ ئێستا ئەمن ناسیومە، هەر کەس وەك منی نەناسیوە. بزانێ ئەتۆ لە لای ڕاستی دەچێ بۆ لای چەپ. خەڵك هەموو پێی‌پێ‌دەکەنن و ئیدی ئەو کەسایەتی‌یەی پێشوو نیە. بە ڕاستی خوێڕی‌یە! ئەگەر لە ترسی قسەی خەلکی ویڕابای، لەمێژ بوو چەکەکەی دادەنا و دەگەڕایەوە گوندەکەی خۆی. ئەرێ ئەتۆ قەت شتی وات دیوە کە کابرای چەتە چەك دانێ و پازدە ساڵان لە بن داوێنی کراسی ژنەکەی دا خۆ بشارێتەوە؟

حەمەد وەڵامی نەدایەوە.

ــ ئێوە دەنێرمەوە شاری، خۆشت و ژاندەرمەکانیشت، بە دەست و لاق بەسراوی و دەتاندەمەوە دەستی عارف سایم بەگی. با بتبینێ چ قارەمانێکی؟

ــ دەبوو بایرامۆغلێت ئاوا ناردبایەوە کە دەڵێی مریشکی ترسەنۆکە! وات کردبا، نێویانگت زیاتر دەڕۆیشت!

ــ لە هەموو ئەو دنیایەی کەس بایرامۆغلی بە زیندوویی بۆ ناگیرێ!

حەمەدۆك یاوەر و ژاندەرمەکانی بە تەحسین تاژی و دوو هاوڕێی دیکەی ئەسپارد. تەحسین ماوەیەك بوو هاتبووە گەڵ دەستەی حەمەدی، ببووە شەڕکەرێکی چاك، باوەڕی زۆر بە حەمەدۆکی هەبوو و تەنانەت ئامادە بوو لە ڕێگای پاراستنی وی دا خوێنی خۆشی بڕێژێ.

تەحسین زۆری پی‌خۆش بوو بەسەرهاتەکانی خۆی بۆ هاوڕێکانی بگێڕێتەوە و بە ڕاستی ئەوانیش کەیفیان بە قسەگێڕانەوەی وی دەهات. هەر جارێکیش بەسەرهاتەکەی دەگێڕایەوە، شاخوباڵی تازەی لی‌دەنا و تاموچێژێکی نوێی دەدایە. بۆی دەگێڕانەوە کە چۆن بە غاردان چۆتە شاری و هەواڵی کوژرانی حەمەدی بۆ ئاغا و بەگان بردوە، چەندیان مزگێنی داوەتی و چۆن کەبابچی‌یەکەش نەی‌هێشتوە نان و کەبابی بخوا و لە کەبابخانەی وەدەری ناوە، چۆن ژنان لە سەر تەرمی عوسمانی گریاون، کە پێیانوابووە حەمەدە، چۆن ئەسپی حەمەدی لە سەر دارێکی ڕای‌گرتوە و نەی‌هێشتوە بێتە خوارێ هەتا وەخت بووە هەموو گیانی بی‌بەستێ و لە سەرمان بمرێ و چۆن دوایە لەو سەرما و باوبۆرانە سەختەی دا لە مردن ڕزگار بووە و ڕەق هەڵتەپیاتوە.

هێنده لەو ئەسپەی دەترسا، کە هاورێکانی ئێستاش گاڵتەیان پێدەکرد و جاری وا بوو لە پڕێك دەیانگوت: ئەها ئەسپە کوێت هات و ئیدی تەحسین وەك مێژۆکەی دەلەرزی و کونەمشکی لێدەبوو بە قەیسەری. دەیگوت: ئەری ئەو حەمەدۆکە بۆچی ئەو ئەسپەی بەرەڵا کردوە؟ خۆ وەڵڵاهی ئەوە لە عەلی کەرتیشی چەمووشتر و ناجسنترە.

ــ ئەسپە کوێت روحی حەمەدۆکی دە بەر دایە!

ــ بەو شێوەیەی باسی ئەسپەکەی مەکە، حەمەد گوێی لێبێ، پێیناخۆش دەبێ...

ــ ئەو ئەسپە وەك باشووی وایە...

ــ باشوو چاوی دەردێنێ.

ــ حەمەدۆکیش ئەو دەمی چاوی تۆ دەردێنێ!

ــ خودا بکا باشوو چاوی ئەو ئەسپەی بکۆڵێ، با حەمەدۆکیش چاوی من دەرێنێ!

ــ ئەسپەکە بە ئاسمانێ دا فڕی.

ــ خۆ گوللە بارانیان کرد.

ــ زیندوو بۆوە و بوو بە ئەسپێکی ئەفسانەیی!

ــ هەر بۆیەش لە باشووی ناترسێ!

ــ بەدی! هەر گیانلەبەرێکی سەر ئەم عەرزە لە شتێکی هەر دەترسێ!

ــ هەڵۆش بۆی ناکرێ ئەو ئەسپەی بترسێنێ!

ــ باشە باشوو لە گەڵ ئەسپێکی کە دەفڕێ، چیی پێدەکرێ؟

ــ دەترسێ، زۆر لە باشووی دەترسێ.

بەفر لە چۆکێ بوو. یاوەر لە گەڵ تەحسین تاژی و دوو هاورێکەی دیکەی، بەرەوخوار، بۆ لای دەشتێ وەرێکەوتن. گەیشتنە دێیەکی و لایاندا. لە وێ تەحسین دەستی یاوەری کردەوە:

ــ ئەمن باوەڕ بە قەولی تۆ دەکەم. ئەتۆ بە ڕاستی پیاوی و دەزانم هەڵنایەی.

ــ نا، بەڵێنت پێدەدەم هەڵنایەم، بەڵام ئەگەر دەکرێ، ئەسپێکم بۆ پەیدا کەن.

ــ بۆت پەیدا دەکەم، بەڵام بەو شەرتەی کاتێك چووینە نێو شاری دەستت ببەستمەوە.

ــ بەڵێنت پێ دەدەم.

ئەسپێکی زینکراویان بۆ هێنا.

کاتێك گەیشتنە دەوروبەری شاری، یاوەر عەلی گاور لە ئەسپەکەی دابەزی و دەستی بۆ لای تەحسینی ڕاداشت. تەحسین دەستی بەستەوە و گوتی:

ـ فکری وەی نەکەی، لێرە بمگری، یان تفەنگەکەم لێبستێنی! نەڵێی ئێرە شارە و دەسەڵاتم هەیە! ئەوەی بکەی، ئیدی حەمەد لە هەر شوێنێك بتبینێ، لێتخۆش نابێ و دەتکوژێ. پاشان دەزانی ئەمن ئێستا قاسیدم و چم لە سەر نیە.

یاوەر عەلی گوتی:

ـ وایە، دەزانم.

دوو کەسەکەی دیکە لێرەوە گەڕانەوە شاخی.

کاتێك گەیشتنە نێو شاری، تەحسین پێی‌گوت:

ـ پێتخۆشە پەتکەکەی شل کەمەوە؟ دەتوانم تفەنگەکەی خۆشمت بدەمێ، جارێ پێتبێ!

ـ نا، تفەنگم پێویست نیە، بەڵام ئەگەر دەکرێ، دەستم بە تەواوی بکەوە.

ئەو جار شانبەشانی یەك دەڕۆیشتن.

یاوەر عەلی ساتێك دواتر لە تەحسینی پرسی:

ـ پێمْوایە پرسیارێکت دە دڵی دایە! ئەگەر وایە بپرسە، وەڵامت دەدەمەوە!

ـ ئەرێوەڵلا... پرسیارەکەم ئەوەیە یاوەری خۆم... دەزانم دەگەڕێیەوە شاخی، بەڵام هەر دەسبەجێ دەگەڕێیەوە، یان جارێ نا؟

ـ هەر دەسبەجێ دەگەڕێمەوە.

ـ بۆ چی؟ ئێستاش بە تەمای حەمەدی بکوژی؟

ـ دەمەوێ بە دیلی بگرم و دیارە ئەگەر بە زیندوویی بۆم نەگیرا، بی‌کوژم.

ـ یاوەرم جا بۆ ئەوی دەکوژی؟ خۆ تاوانبار یەکی دیکەیە...

ـ کێ تاوانبارە؟

ـ ئەسپەکە...

ـ کامە ئەسپ؟

ـ ئەسپە شێتە، ئەسپی حەمەدۆکی. دەزانی هەر تاوانێك دەکرێ، کوشتن، تاڵانکردن... هەمووی تاوانی ئەو ئەسپەیە... ژیانی حەمەدی بە ژیانی ئەو ئەسپەیەوە گرێدراوە. دەڵێن هەتا ئەو ئەسپە زیندوو بێ، هیچ‌کەس حەمەدی پێ‌ناکوژرێ...

ـ ئەمنیش ئەوەم بیستوە...

ـ یاوەرم، ئەو ئەسپەی بکوژە! دیارە ئەگەر بۆت بکرێ، چونکە وەك برووسکەی دەردەپەڕێ... خەڵکیش قووت دەدا.

ــ خەڵکی قووت دەدا؟

ــ بەڵێ! جا ئەگەر ئەتۆ دەروەستی وی بێی، حەمەدی هەر بە دەستان دەگری!

ــ زۆر باشە، دەیکوژم، بەڵام ئەمنیش داوایەکم لە تۆ هەیە.

ــ چ داوایەك یاوەرم؟

ــ وەرە گەڵ من! کارێکی وا دەکەم ببەخشرێی. ئەمن دەزانم کە تۆ هیچ تاوانێکت نەکردوە.

ــ یاوەری خۆم، ئەمن تازە یاغی بووم و لە شاری ناتوانم بژیم.

ــ بۆ ناتوانی؟

ــ هاورێکانم چاوەڕوانمن. ناتوانم بەجێیان بێڵم...

ئەو جار هەتا گەیشتنە جێ، تەحسین هەر باسی ئەسپە شێتی بۆ یاوەری کرد. ئاخرەکەی بەڵێنی لێئەستاند کە کاتێك گەڕایەوە شاخی، هیچ نەکا هەتا ئەو ئەسپەی دەکوژێ. پێشی گوت هەرکاتێك ئەسپەکەت کوشت، لەوانەیە ئەمنیش واز لە چەتەگەرییە بێنم و ئیدی ببمە خزمەتکاری تۆ.

تەحسین و یاوەر عەلی ڕاست چوونە نێو حەساری ماڵی خەلیل بەگی گەورە. یاوەر لە حەسارێ ڕاوەستا. عارف سایم بەگ لە بەر پەنجەرەی دانیشتبوو. تەحسین بە لووشمە لووشم چووە پێشێ، بە شێوەی سەربازان چەستی نیّدا و سڵاوی کرد:

ــ ئەمن لە لایەن حەمەدۆکییەوە هاتوومە لای جەنابت. ڕایئەسپاردووم یاوەری بدەمەوە دەستی ئێوە! دەشیگوت: لە لایەن منەوە سڵاوی لێبکە و پێیبڵێ ڕێزم بۆی هەیە. دەبێ بمانبوورێ، ئەوە یاوەرمان بە سڵامەتی بۆ ناردەوە، ژاندەرمەکانی دیش هەموویان لە گوێزێ ساغترن، بەڵام چەك و تەقەمەنییەکانییانمان پێویست بوون، هەربۆیە لێمان ئەستاندن! بۆخۆی دەزانێ دەوڵەت چەك و تەقەمەنیی زۆرە، بەڵام ئێمە نیمانە! گوتیشی چەك بۆ دەکارکردن دروست کراوە و ئەوان هەر لە بناخە دا ئەو چەکانەیان پێویست نەبوو...

ــ کە دیارە ئەو قسەیە درۆش نیە... بەڵام ئەتۆ کێی؟

ــ جووتێرم.

ــ ئەگەر جووتێری، ئەو تفەنگە چییە پێتە؟

ــ حەمەدۆك پێیداوم، بۆ ئەوەی یاوەر وە بیری هەڵاتنێ نەکەوێ. پێشت خۆشە بزانی ناوم چییە؟ ناوم حەمەدە.

مورتەزاغا کە لە پشت عارف سایم بەگی دانیشتبوو، چاوێکی لێکرد و بە دەنگی بەرز گوتی:

ـ کورە ئەوە تەحسین تاژییە!

تەحسین تاژی خێرا گوتی:

ـ ئەمن ناوم حەمەدە. وا دیارە تۆ ئەمنت لە گەڵ یەکی دیکە لێگۆڕاوە.

ـ بە هیچ شێوەیەك! ئەتۆ تەحسینی، تەحسین تاژی.

ـ ئێمەی جووتێر هەموومان وەك یەك دەچین. تێکەڵت کردوە و پێتوایە ئەمن یەکی دیکەم.

ـ کورە زۆر سەیرە! بۆچما ئەتۆ نەبووی هاتییە لای ئێمە و گوتت حەمەدۆك کوژراوە؟ وەبیرت نایە عەلی کەرتیش چۆنی دارکاری کردی؟

ـ لە خۆڕا خۆت ماندوو دەکەی ئاغا! پێمگوتی ئەمن ناوم حەمەدە...

مورتەزاغا دەستی هەڵێنەدەگرت، هەتا جەنابی نوێنەر وەجواب هات:

ـ بەسە مورتەزا. ئەو کورەت هەرگیز بۆ نابێتە تەحسین تاژی!

مورتەزا گوتی:

ـ با، دەبێتێ...

دەستی دە باغەڵی نا، سێ ئەسکیناسی سەد لیری دەرێنا و نیشانی تەحسینی دان.

ـ دەزانی ئەوانە چن؟

ـ چۆن نازانم، سێ ئەسکیناسی سەد لیری، لە سەر یەك دەکاتە سێسەد لیر.

ـ زۆر باشە، ئەوانەت دەدەمێ.

تەحسین سەری بەردایەوە. پوولێکی زۆر بوو و نەیوێرا چاوی تێبڕێ. چاوی پڕ بوون لە ئاو. بەو پوولەی دەیتوانی سی گاجووتان بکڕێ!

ـ نامەوێن!

ئەوەی گوت و ڕۆیی. بە پەلە لە شاری وەدەرکەوت. هەر غاری دەدا و دەتگوت هەژدیها ڕێیدەکەوێ. چەند پوولێکی زۆر بوو! سی گاجووتی بە کەیف، یان سێسەد لیر!

هەر ڕۆژی دواتر یاوەر و پیاوەکانی گەڕانەوە شاخی. ئەو جار زۆریش بە تووڕەیییەوە. یاوەر سوێندی خواردبوو کە حەمەدۆکی هەر دەبێ بگرێ، بە دەست بەسراوی بیباتە شاری و تەسلیمی عارف سایم بەگی بکا، دوایەش هەر ئەوێ شەوێ ئازادی کا. بەڵام ئیدی هەر ئەو جارە و هیچی دی! جارێکی دیکە بیگرێتەوە، دەیبا لە نێوەڕاستی شاری، یان لە لای پردێ لە سێدارەی دەدا. بەڵام... بەڵام دەبێ پێش هەموو شتێکی ئەسپەکەی بکوژێ، چونکە قەولی بە تەحسین تاژی داوە.

" بایرامۆغلی حەمەدۆکی بۆ ناگیرێ، مەلایکە بێ، شێری سەحرایە بێ، پڵینگی دارستانی بێ، یان ڕۆستەمی زاڵی بە نێوبانگیش بێ، هەر بۆی ناگیرێ، تەنانەت ئەگەر بییتە حەزرەتی عەلی و شمشێری دووسەریشی پێ بێ! بایرامۆغلی پیر بووە، زۆریش، چاوەکانی چاك نابینن، سێرەی بۆ ناگیرێ، قامکی پەلەپیتکەی بۆ ناکێشرێ و کەسێکی وا کوا دەتوانێ شەڕ لە گەڵ حەمەدۆکی بکا! بەڵام وەك دەڵێن جێیەك مەلای لێ‌نەبێ، بە کەڵەبابی دەڵێن بڵقاسم! ئەو کاتەی بایرامۆغلی میری چیا بوو، حەمەد هەر لە دایکیش نەببوو! بەڵام ئەو پیرە پیاوە ئێستا پێی‌وایە ئەگەر حەمەد جارێکی بە سەر دا بدا، شاخ، دارستان، ئاوهەڵدێر و ڕەوەزەکانیشی هەموو بە سەر دا دێن! هەر بۆیە هەر باسی حەمەدی بکەن، هەتا گوێی دەگیرێ هەڵدێ.

حەمەدۆك پێی‌ناخۆشە بایرامۆغلی ڕەگەڵ ژاندەرمان کەوتوە، پێی‌ناخۆشە ئەو چووە دەستی دەگەڵ عارف سایم بەگ و ئاغا و بەگەکانی دیکە تێکەڵ کردوە و بۆتە دوژمنی وی. هەمیشە لە خودای دەپاڕێتەوە بمرێ، بەڵام تووشی چارەنووسێکی وەك ئی بایرامۆغلی نەبێ! دەڵێ بە گوللەی خوێڕی‌یەکی بکوژرێم کە دەستدرێژیی کردبێتە سەر خوشکی خۆی، پێم خۆشترە لە وەی دوارۆژم وەك وی بێ! دەڵێن لە سەریەك لە سەریەك ڕای‌دەسپێرێتێ و دەڵێ: چی دی لە بەرم هەڵ‌ممیە، دەبێ ئەمن و تۆ هەر لەو شاخانە لێکی دەرکەین. ڕۆژێك بوو ئەو کێوانە لە بن پێی تۆش دەلەرزین. ئەوکاتی کراسە پیرۆزەکە دە بەر تۆ دا بوو، وەك ئێستای من. بایرامۆغلی، یانی گیانی خۆت هێندە خۆش دەوێ، کە هەوڵ دەدەی کونێکی بدۆزی‌یەوە، وەك ماری بخزێیە نێوی و خۆتی تێ‌دا بشاریەوە؟ ئاخ بایرامۆغلی، هەڵۆیەك بە سەر لووتکەی هەرە بەرزی چیاوە دەفڕێ، باڵی لێك‌دەدا و هەموو دنیای دە بن باڵی خۆی دا دەبینێ. لەوانەیە هێندێك ئینسانی ئازای وا هەبن، کە لە مردنێ بترسن، بەڵام من نا! درەنگ یان زوو ئەمنیش دەمرم و دەزانم دنیا بە کەس نامێنێ. بایرامۆغلی ژیان لە شەرەف و سەربەرزی بە نرختر نیە. ئاخ بایرامۆغلی!"

لە شاران و لە دێیان خەڵك کۆ دەبوونەوە، باسی بایرامۆغلی‌یان دەکرد و قسەی ناحەزیان پێ‌دەگوت. بەیتیان بۆ دروست کردبوو و لەو بەیتانە دا بە ترسەنۆك و بێ‌وڕە ناو دەبرا. خەڵك کە گوێیان لەو بەیتانە دەبوو، گاڵتەیان بە بایرامۆغلی دەکرد و پێی‌پێ‌دەکەنین. ئەو بەیتانە بە گوێی عارف سایم بەگی گەیشتنەوە. ڕۆژێکی چاوەشە کەچەڵی خەڵکی گوندێکی شاخیی بانگ کردە لای خۆی و بەیتەکەی پێ‌گوت. دەو بەیتەی دا چاوەشە کەچەڵ حەمەدی هێندە بەرز کردبۆوە، گەیاندبوویە ئاسمانێ و بایرامۆغلیشی وا نزم کردبوو، دە قوڕێیەوە بردبوو. بە فەرمانی عارف سایم بەگی، سامی تورگوتی مامۆستا، ئەو بەیتەی لە هەوەڵێ ڕا تا ئاخرێ نووسی‌یەوە.

ئەو قسە ناخۆش و ناحەزانە بە گوێی بایرامۆغلیش گەیشتنەوە. جاری وا بوو پێکەنینی پێ‌دەهاتن، جاری وا بوو ناڕەحەت دەبوو و هێندێك جاریش تووڕە دەبوو و لە داخان شەوانە

خەوی لیّنەدەکەوت. بەیتێك سەبارەت بە وی لە سەر زمانان بوو، کە عەلی زارقایش دروستی کردبوو و بایرامۆغلێش زۆری سەرنج دابۆیە. دەو بەیتەی دا بەیتوێژ بەسەرهاتی منداڵیی بایرامۆغلیی دەگێڕایەوە. باسی ئەوەی دەکرد کە چۆن بابی چووبووە شەڕێ و نیدی نەگەڕابۆوە. باسی هەموو ئەو چارەڕەشی و کوێرەوەرییانەی دەکرد، کە بە سەر دایك و خوشکەکانی هاتبوو. باسی یاغیگەری وی و ئەو زاڵمە ملئەستوورانەی دەکرد کە بە دەستی وی کوژرابوون. لێرە دا ئەو لە ڕیزی کوێرۆغلی، ڕەشمار، بابە ئیسحاق و گەنج عوسمانی دانرابوو. بەیتوێژ پێیهەڵدەگوت، ستایشی قارەمانەتیی وی دەکرد و وەك پاڵەوانێکی بە دڵ و جوامێری دەناساند. ئەو جار کە دەهاتە سەر باسی ئەو سەر دەمەی کە بایرامۆغلی دوای شەڕی سەربەخۆیی دەستی لە شاخی هەڵگرت و وەك مرۆڤێکی ئەمین، ڕاست و تەریککەوتۆوە لە ماڵە خۆی دانیشت، هەم وشەکان و هەم ئاهەنگی بەیتەکە گەرموگوڕ و نەرمونیان بوون و پڕ بوون لە هەستی دۆستایەتی، ئاوات و خۆشەویستی. بەڵام کاتێك دەگەیشتە سەر ئەو باسە کە بایرامۆغلی بڕیاری دا بۆ شەڕی حەمەدۆکی بچێتە شاخی، بەیتەکە دەبوو بە خەم، دەبوو بە حەسرەت و داخ و ئەوانەی گوێیان لیّدەبوو، زۆر نارەحەت دەبوون و دڵیان بە بایرامۆغلی دەسووتا. لێرە دا بەیتەکە دەبوو بە بەیانی پەژارە و خەم، داوای دەکرد بیسەر ورد بێتەوە، لە قووڵایی دەردەکە بگا و لە نەکاو توند دەبوو، دەبوو بە تووڕەیی، دەبوو بە گلەیی و گازەندە، دەبوو بە سەرکۆنە و بە سەر ئەو کۆنە یاغییەی دا دەباری. ئەوجار بەیتوێژ وەبیر بایرامۆغلیی دەهێنایەوە کە ئەو بۆ ئەوە نەدەبوو هێندە دابشکێ و لە هەموو شتێك باشتر ئەوەیە کە هەرچی زووتر بمرێ و ئەو پەڵە شەرمەی لە مێژووی ژیانی بسرێتەوە. ئەو جار داخ، حەسرەت و تووڕەیی تەواو دەبوو، گاڵتە و قسەی سووك دەهاتە گۆڕێ و سەرەنجام بەیتەکە بە شینگێڕییەکی ناخۆش بۆ بایرامۆغلی کۆتایی پیّدەهات...

بایرامۆغلی دەستووری دا:

ـ لە ماوەی دوو ڕۆژان دا دەبێ عەلی زارقایشم بۆ بێننە ئێرە، نەهات، تەرمەکەی بێنن. پێیبڵێن سازەکەشی لە بیر نەچێ...

پێش ئەوەی دوو ڕۆژەکە تەواو بێ، عەلی لە وێ بوو. بایرامۆغلی بە نێوچاوانێکی گرژەوە چوو بۆ لای:

ـ شایەر بەخێربێی!

ـ وا دیارە بەخێر هاتووم، بایرامۆغلی...

کاتێك عەلی زارقایش چاوی بە نێوچاوانی گرژی یاغیی کۆنەساڵ کەوت، ئەویش نیوچاوانی لە وی زیاتر تێکنا و گرژ بوو.

ــ بیستوومە بەیتێکت داناوە و ناوت ناوە "بەیتی بایرامۆغلی!"

ــ وایە.

ــ بۆم بڵێ، بزانم چۆن بەیتێکە.

ــ بۆت دەڵێم بایرامۆغلی.

ــ یەك وشەشی لێنەپەڕینی!

عەلی زارقایشی شایەر و بەیتبێژ بزەیەکی هاتێ، سازەکەی بە سینگی‌یەوە نا و دەستی پێکرد. خانووەکە زۆر گەورە بوو و پڕ بوو لە خەڵك، بەڵام کەس سریوەی نەدەهات و هەموو خەڵکەکە بە هەموو هەست و بیریانەوە لە گەڵ بەیتەکەی تێکەڵ ببوون. بایرامۆغلی چوارمێردەکی دانیشتبوو، پشتی وە دیواری دابوو، دەستی ڕاستی بە پشتێنەکەیەوە بوو، گوێی دابووە بەیتەکەی و مووی لێنەدەبزووت.

بەیتەکە زۆر بوو و ئەوەندە خۆش بوو کە خەڵك نەیانزانی چۆن شەوەکە بە پەنا لەرەی دەنگی عەلی و وشە بە سۆزەکانی بەیتەکەی دا تێپەڕی. کاتێك کەڵەبابی بەیانی خوێندی، عەلی لە بەیتەکەی بۆوە. لە گەڵ ئاخر وشەی بەیتەکە، دوو دڵۆپ فرمێسك لە چاوەکانی بایرامۆغلی هاتنەدەر، بە سەر ڕوومەتی دا شۆڕ بوونەوە و دە سمێڵە پڕەکانی دا ون بوون. ئەو جار بە دەنگێکی هێدی کە بە زەحمەت دەبیسرا گوتی:

ــ زارخۆش... یاخوا ئەو دەنگەت نەڕزێ و ئەو توانایی‌یەت هەر وا گەشە بکا! وشەکانت زۆر جوانن، ڕاستن، حەقن، ڕەوان و ئازایانەن. هەتا شایەر و بەیتبێژی وەك تۆ هەبن، جوانی و حەق و ڕاستیش هەر دەمێنن!

ــ ئەمن زۆرت سوپاس دەکەم، بایرامۆغلی...

شایەرەکە هەستا و ئەوانی دیکەش هەموو هەستان. بایرامۆغلی قۆڵی عەلیی گرت و لە گەڵ خۆی بردی‌یە دەرێ. مانگ هێشتا تەسکە شەبەقێکی مابوو و بەفرەکە کە ڕەنگێکی شینی کاڵی بە خۆیەوە گرتبوو، لە بن پێیان دا سیڕەی دەهات. ئەو دوو پیاوە لە سەرەخۆ هەنگاویان هەڵدێنایەوە و سێبەرەکانیان وەپێشیان کەوتبوون. بایرامۆغلی بە گەرمی باسکی بەیتبێژەکەی گوشی:

ــ باش دەبوو ئەو بەیتە ئاوا کۆتایی نەهاتبا! پێت وانیە عەلی؟

ـ با... زۆر باش دەبوو ئاوا نەبا...

ئەوجار لە حاڵێك دا بەیەكەوە باسی شایەر و گۆرانیبێژە كۆنەكانی وەك كاراجۆغلی، دادالۆغلی و ئاشق خەلیلیان دەكرد، هاتنەوە ژووریّ. كەترییەكی پڕ لە ئاوی كولّیو لە قولینچكێكی ئاورگیّ لە سەر پۆلووان بوو و چادانێك چای دێمكراوی لە تەنیشتیّ دانرابوو. قابلّەمەیەك نیسكێنە لە قونینچكێكی دیكەی ئاورگەكەی دانرابوو، هەلّم بە سووچێكی سەری قابلّەمەكەی دا لە چێشتەكەی هەلّدەستا و بۆنی نەعنەی بە دیوەكەی دا بلاّو دەكردەوە. سفرە ڕاخرابوو و قالبێك ڕۆنی كەرەی تازە كە لە پەنا پێخۆری دیكە دانرابوو، ئیشتیای پیاوی دەكردەوە.

بایرامۆغلی بە جوانی ئەو ڕۆژەی دەهاتەوە بیر، كە بابی دەستی دا تفەنگیّ و چووە شەڕیّ. دوو برا و سیّ خاڵیشی هەر دەچوون. دایكی، باپیری و تەواوی خەلّكی دێی لە گەلّیان چوونە شاری. هەموو لە مزگەوتی شاری كۆ بوونەوە، خۆیان ساز كرد و شتومەكیان تێكنان.

پێنج مانگێگ دواتر، هێندێك شتومەك و ئاسنامەی بابی بایرامۆغلی و خزمەكانی‌یان ناردەوە. وردە وردە دەركەوت كە ئەوانەی خەلّكی كێوپارەی بوون و چووبوونە شەڕیّ، یەكیشیان نەماوە و هەموو كوژراون. دێیەكە تەنیا پیرەپیاو، پیرێژن، نەخۆش، منداڵ و پەككەوتەی تیّدا مابوون. ئەو جار ژنان هەموو كاری مەزرایەشیان كەوتە ئەستۆ.

ڕۆژێكی بایرامۆغلی لە گەڵ دوو خوشكی كە لە خۆی گەورەتر بوون، لە مەزراكەی خۆیان كە لە دۆڵێكی خوارەوەی دێی بوو، گێرەیان دەكرد. پاشنیوەڕۆیەكی درەنگ سیّ پیاوی چەكدار پەیدا بوون. گوتیان تینوومانە و داوای ئاوییان كرد. كچەكان لە گۆزەی كە لە بن سێبەری پنچكێكی دانرابوو، ئاویان بۆ تیّكردن و دایاننیّ. دار بەڕوویەك لە ویّ بوو، پیاوەكان لە بن سێبەری داربەڕووەكەی بۆی كەوتن. دوای ماوەیەك یەكێكیان كە سمێلی شۆڕ و درێژ بوون، ڕووی دە دایكی كرد و گوتی:

ـ ئەریّ ژنەكە ئەتۆ ئەو كچە جوانانەت لە كویّ گەورە كردوون؟ چاو، هەر دووكیان هێندە ناسك و سپین، هەر دەڵێی تاویان نەدیوە! وا دیارە چارەنووس ئێوە و ئێمەی بۆ یەكتر داناوە! ئەو هاوڕێیەی من، ئەو سمێلزەردە، وەختە بۆ تۆ شێت بیّ، خەنی بوو كاتێك زانی مێردەكەت لە شەڕیّ دا كوژراوە و ئەتۆ ئێستا بیوەژنی! جا وا چاكە ئێستا دەستی تۆ دە نێو دەستی وی نێم. ئەتۆ بۆ وی و من و ئەو هاوڕێیەی دیكەشم هەر كامەو یەكێك لە كچەكانت هەلّدەگرین!

هەرچەندی دایكەكە پاڕاوە، تووك و نزای كردن، گریا و هاواری كرد، بیّسوود بوو. پیاوەكە دەستی توند بە دمی گرت و كێشای بۆ لای خۆی. دووەكانی دیكەش خوشكەكانی‌یان گرت و

بۆ ئەوەی نەتوانن هاوار کەن لە عەرزی‌یان دان. بایرامۆغلی تەمەنی هەر چاردە ساڵ بوو و بێجگە لە وەی دەستدرێژیکەرەکان وەبەر بەردان بدا، هیچی دیکەی لە دەست نەدەهات. یەکێك لە پیاوەکان تووڕە بوو و تەقەی لێ‌کرد. بایرامۆغلی بێ‌هۆش بوو، لە بن پنچکێکی کەوت و کاتێك وەهۆش هاتەوە دیتی خوێنی هەر وا لە بەر دەڕوا. گوللەکە ڕانی کوناودیو کردبوو. کراسەکەی لە بەر خۆی دادڕی، برینەکەی پێ‌بەست و هەرچۆنێك بوو، خۆی گەیاندەوە دێ. خەڵکی دێی دە فریای هاتن، برینەکەین بۆ دەرمان کرد و خزمەتیان کرد. زۆری پێ‌نەچوو بایرامۆغلی هاتەوە سەر پێ و هێشتا برینەکەی بە تەواوی چاك نەببۆوە، گەڕایەوە شوێنی خەرمانەکەیان. گێرەی کرد، خەرمانی هەڵاویشت، و گەنمی ڕەنێو هێنا و هێنایەوە ماڵێ. هیچ‌کەس نەی‌دەزانی دایکی و خوشکەکانی چی‌یان بە سەر هاتوە و لە کوێن. کوڕەکە لە داخان و لە نارەحەتی‌یان دەت‌گوت شێت بوو. ڕۆژێکیان دەمانچەی بابی لە قەدی بەست، چووە شاخەکانی دەوروبەری خۆیان و دەستی بە ڕاهێنانی خۆی لە تەقەکردنێ دا کرد. بە داخەوە یەك گوللەشی نەدەپێکا. سێ گای فرۆشتن و کاڕابینێکی چاکی بە ڕەختەوە کڕی. چەك ئەو سەردەمەی زۆر گران نەبوو، چونکە ئەوانەی چەکیان پێ‌هەڵدەگیرا، یان لە شەڕێ بوون و یان کوژرابوون. پیرە پیاوێك لە دێیەکەیان بوو، ناوی حەیدەرە کورد بوو. حەیدەرە کورد هەر سێ کچی هەبوون و کەسی دی، زووتر لەو دیوی چیاکانەوە هاتبوو و لە گەڵ کچەکانی دە خانوێکی گەورەی دا دەژیا. دەنگۆ هەبوو کە حەیدەرە کورد چەند کووپە زێڕی لە نێو خانووەکەی دا دە بن گڵی خستوون. حەیدەر دەوڵەمەند بوو و خاوەنی ڕەوە ئەسپ و مێگەلە مەڕێکی زۆر بوو و هەروەها نێزیکەی پەنجا تاژیی ڕەسەنی، لاق و ملدرێژی، باریکی سوور و ڕەشیشی هەبوون. حەیدەرە کورد ئەنگێوەیەکی بەنێوبانگ بوو. بایرامۆغلی بە چاوی خۆی دیتبووی حەیدەر بە فیشەکێکی هەڵۆیەکی سووری لە ئاسمانێ، لە بەرزایی‌یەکی زۆر، دە فڕینێ دا، بەردابۆوە. هەموو کەس دەی‌زانی حەیدەر چ ئەنگێوەیەکە و قەت فیشەکی بە خەسار نادا، هەر بۆیەش نە چەتە و دز و نە خەڵکی دیکەش دە خۆیان ڕانەدەدی بە مەبەستی خراپەوە چاو لە لای ماڵی وان کەن. بایرامۆغلی تفەنگەکەی بە دەستەوە گرت و چوو بۆ لای حەیدەرە کوردی:

ــ مام حەیدەر، هاتووم تفەنگهاویشتنم فێر کەی. دەمەوێ ببمە ئەنگێوەیەکی وەك تۆ!

ــ تفەنگەکەت تفەنگی چاکە. هیوادارم چاکی فێر بی و بتوانی چاکی کار پێ‌بکەی. کوڕم ئەتۆ کێی؟

ــ کوڕی بایرامیم، ئەوەی چووە شەڕێ و نەگەڕایەوە.

حەیدەر بایرامی دەناسی و زۆریشی خۆشدەویست:

ـ مافی خۆتە کوڕم، کاری چاك دەکەی! ئەتۆ لە هەموو کەس زیاتر پێویستیت بە وەیە ببیە ئەنگێوەیەکی کارامە. ئێستاش دایکت و خوشکەکانت هەر بێسەروشوێنن؟

کە باسی دایك و خوشکە ونبووەکانی کرا، کوڕە وەخت بوو لە شەرمان بمرێ و وەك چەورەندەری سوور هەڵگەڕا:

ـ شتێکم زانیوە، کاری نەبی کوڕی گوڵمەزی بووە!

حەیدەرە کورد ڕقی هەستا، لە داخان خوێن دە ڕەگانی دا کوڵی، ملی هەڵمسا و هاواری کرد:

ـ ئەو بێناموسە خوێڕی‌یە! نەبی ویستوویەتی تۆڵەی خۆی لە بابت بکاتەوە. بایرام پیاوێکی ئازا بوو و ئەویش هەتا بڵێی بێوڕە و هیچ و پووچ. دەی... دەبا دەست بە کارەکەمان بکەین!

لە وێڕۆژێوە حەیدەر ئەوی هەر بە بایرامۆغلی، واتە کوڕی بایرامی بانگ کرد، وردە وردە خەڵکی دیکەش وایان پێگوت و ناوە ڕاستی‌یەکەی بە تەواوی لە بیر کرا.

مانگێکی تەواو بە یەکەوە خەریکی ڕاهێنانێ بوون. دوای ئەو ماوەیە ڕۆژێکیان حەیدەرە کورد دەستی بە سەری بایرامۆغلی دا هێنا و گوتی: هیوادارم خودا پشت و پەنات بێ و گوللەت جەرگی ناحەزان بدڕێ! ئێستا ئەتۆ تفەنگچی‌یەکی چاکی، کەس وەك تۆ نانگێوێ و تەنانەت لە منیش ئەنگێوەتری! لە هەموو ئەو هەرێمەی، بە دەشت و شاخی‌یەوە، کەسم پێشك نایە دە خۆی ڕاببینێ کێبەرکێت دە گەڵ بکا.

بایرامۆغلی دە تەقەکردنێ دا زۆر کارامە ببوو، بەڵام هێشتا لە نەبی گوڵمەزۆغلی دەترسا. کە شەو دادەهات دەرگای لە سەرخۆی دادەخست و شەوێش لە ترسان خەوی لێنەدەکەوت. نەیدەوێرا لە دێش وەدەرکەوێ. زۆری هەوڵ دەدا بە سەر ترسەکەی دا زاڵ بێ، بەڵام بێسوود بوو. ڕۆژێکیان دایك و خوشکەکانی هەڵاتن و خۆیان گەیاندەوە ماڵەکەی خۆیان. کە گەیشتنەوە، یەکجار شەکەت بوون و بۆ بایرامۆغلی‌یان گێڕایەوە کە دەرفەتێکی لەباریان بۆ هەڵکەوتوە، ئیدی ڕانەوەستاون، هەڵاتوون و هاتوونەوە. بایرامۆغلی وەخت بوو لە خۆشی‌یان باڵ بگرێ و مەڕێکی کردە قوربانی، بەڵام هێشتا دوو حەوتوو بە سەر ڕاکردنی ژنەکان دا تێنەپەڕیبوو، کە شەوێکی، دە نیوەشەوێ دا، نەبی گوڵمەزۆغلی بە دوو پیاوەکانەوە پەیدا بوو، بە خەنجەری ڕووتەوە خۆی دە ماڵێ ڕۆکردن و بە زۆری، بە ڕاکێشڕاکێش ژنەکانی بردنەوە. بایرامۆغلی بە شوێنێکی نێو بڕ دا پێشاوبڕەی لێدانەوە و لە سەر ڕێگایە بۆسەی بۆ دانانەوە. مانگەشەوێك بوو وەك ڕۆژێ. پیاوەکان بەژنەکانەوە بە پێشی دا تێپەڕین، ژنەکان هێشتا هەر

دەگریان و هاواریان دەکرد، بەڵام بایرامۆغڵی وا دەلەرزی کە دەستی تفەنگی نەدەگرت و قامکی پەلەپیتکەی بۆ نەدەکێشرا.

دواتر زۆر جاران هەر بەو شێوەیە ژنەکان هەڵدەهاتن و دەهاتنەوە، بەڵام زۆری پێنەدەچوو نەبی گوڵمەزۆغڵی لە گەڵ پیاوەکان دەهاتن و بە پرچڕاکێشان دەیانبردنەوە. جارێکیان دایکی ئیدی ئەوەندە تووڕە بوو، کە خۆی پێڕانەگیرا و بە سەر بایرامۆغڵی دا قیژاند:

ــ ئەتۆ پیاو نی! جەرگ و هەناوەت خرا بن ڕۆڵە! بریا ئەتۆم هەر نەبووبا! ئێمە ئەوە دە جار هەڵاتین و هەموو جارێ گوڵمەزۆغڵی دێ و بە زۆری دەمانباتەوە! ئەتۆش چاو شۆڕ دەکەیەوە و مته‌قت لێنایە! سەیرە، خەڵکیش دەڵێن لە هەموو کەس ئەنگێوەتری و نێوبانگی تفەنگچی‌یەتیت لە شاخ و دەشتێ دەنگی داوەتەوە. ڕۆڵە خوێڕی‌یەکەم! جرجە مشکی ترسەنۆك! هەر نەبی چاترە، ناپیاوی بێناموس!

بایرامۆغڵی هیچی نەگوت. وەڵامی خوشکەکانیشی نەدایەوە، کە ئەوانیش تووك و نزایان لێدەکرد. سەری بەردایەوە و بێدەنگ بوو. پاشان لە دێی وەدەرکەوت. کەلێنەدارێکی دیتەوە، سێ شەو و ڕۆژان دەو کەلێنە دارەی دا مایەوە، نە هیچی خوارد و نە هیچی خواردەوە. دوای ئەو سێشەو و ڕۆژەی چووە لای حەیدەرە کوردی و قسەی لە گەڵ کرد:

ــ دەترسم، دەترسم بکوژرێم. ئەوەندە دەترسم پەلەپیتکەم بۆ ناکشێ. پێمخۆشە خۆم بکوژم، بەڵام ئەو بیرە ترسەکەم زیاتر دەکا! چ بکەم، ئەوە شێت دەبم! خوێڕی‌یەکی وەك من خۆشی پێناکوژرێ!

حەیدەرە کورد دەستی بە سەری دا هێنا، قاقایەکی کێشا و گوتی:

ــ وا نیە، پێتدەکرێ! پیاو بۆیە خەڵکی، یان خۆی دەکوژێ، چونکە دەترسێ. ئەو کەسەی زۆر زۆر دەترسێ، سەرەنجام ڕۆژێك لە سنووری ترس دەچتە ئەو دیو و ئینسانێکی ئازا و بێباکی لێهەڵدەکەوێ! ئێستا کە هاتوویە لای من و بۆخۆت دەڵێی کە ترس هەموو لەش و گیانتی داگرتوە، ئەوە بەو مانایەیە کە ترس ئیدی چی‌دیکەی لە گەڵت پێناکرێ! برۆ کوڕم، داوای سەرکەوتنت بۆ دەکەم و دڵنیام هەر بەو شێوەیە بچیە پێش، گوڵمەزۆغڵی هیچ، دەتوانی سوڵتانیش بکوژی! تەنیا یەکجار پەلەپیتکەی بکێشە و ئیدی بۆخۆشت پێت سەیر دەبێ، کە چەندە خێرا دەکەویە سەر گەڕ و ئەوەندە دەسکەرەوە دەبی، کەست دەرەوەست نایە!

پاشان... پاشان هێندەی نەکێشا دایك و خوشکەکانی هەڵاتنەوە و گوڵمەزۆغڵی هات بردنی‌یەوە. بایرامۆغڵی سپی هەڵگەڕابوو، لە پشت کۆڵەکەی خانووەکەی، هەڵکورمابوو و تێیانەوە ڕامابوو. دایکی هەر ئاوڕیشی لێنەدایەوە.

ڕاست وەك جارەکانی پێشوو، دوای ئەوەی ئەوان لە دەرگایە چوونەدەر، بایرامۆغلی هەستا، لە پشت پێڕکی تفەنگ و فیشەکدانەکەی دەرێنا. فیشەکدانی لەخۆ بەست و تفەنگی بە دەستەوە گرت، وەك دە خەویٚ دا بڕوا وا بوو، بە ڕێگا نێوبڕەکەی دا خۆی گەیاندە پێشیان و لە شوێنەکەی جاران بۆسەی بۆ دانانەوە. دیسان ترس و سام تەواوی لەشی داگرتبوو، دەلەرزی، دەتگوت تای لێیە، لەشی وە سەر ئارەقەی گەڕابوو و ددانی ددانی نەدەگرت. تاریکە شەو بوو و ئەستێرەکان شەبەقێکی کزیان هەبوو، بەلاّم ئەو بە باشی نەبی و دوو کەسەکەی دیکەی لە دایك و خوشکەکانی بۆ لێكدەکرایەوە. نەبیٚ لە پێشیٚ دەڕۆیی، ژنەکان بە دوای وی‌یەوە بوون و دووەکانی دیکەش لە دواتر بوون. کە چاوی بە تارمایی نەبی کەوت، ئەوەندە ترسا، سەری دەگێژەوە هات، بەوحالّەش سێرەی گرت، پەلەپیتکەی کێشا و دەسبەجیٚ بە دوای وەش دا، لوولەی تفەنگێیٚ دە وانی دی کرد و پێیەوە نان. ئیدی ترسی شکا، دەرفەتی نەدانیٚ و وەك بارانەی بە سەری دا باراندن. لەو لاشەوە تەقە کرایەوە، بەلاّم ئیدی بایرامۆغلی گوێی لیٚ نەبوو. خەلّکی گوندی بە بیستنی تەقەکەی هەموویان وەخەبەر هاتبوون، چووبوونە دەریٚ، لە پشت دار و ڕەوەزان خۆیان حەشار دابوو و سەیری شەڕەکەیان دەکرد. کاتێك ولاّت ڕووناك بوو، بایرامۆغلی فیشەکی پی‌ئەما. شەکەت و ماندوو سەری وە سەر بنە دارێکی کرد و یەکجیٚ خەوی لیٚکەوت. ژنەکان چوونە سەری، بە هەرسێکان هەلّیان‌گرت و بردیانەوە مالیٚ. هەر بە گوللەی هەوەلیٚ نەبیٚ پێکرابوو، بریندار ببوو، بەلاّم دواتر هەلاّتبوو و دەرباز ببوو. کەلاکی دووەکانی دیکەش لە ویٚ کەوتبوو. کەلاکەکان دە خوێنیٚ دا شەلاّلّ ببوون. کاتێك بایرامۆغلی وەخەبەر هات و بۆیان گێڕایەوە کە نەبی بە برینداری دەرباز بووە، دەمانچەی لە خۆ بەست و بە ڕاکردن وە دوای کەوت. گولّمەزۆغلی کە بە وەی زانی لە گوندی خۆشیان هەلاّت، بەلاّم بایرامۆغلی لە دووی نەبۆوە. لە ئەسکەندەروونیٚ گەیشتە سەری و لە نێوەڕاستی شاری تەقەی لیٚکرد، بەلاّم گوللەکەی بە هەلّە چوو و وەنێوچاوانی کابرایەکی کەوت کە ڕاست دە وەختی دا لە پەنا نەبی بوو. نەبی خۆی ون کرد، بایرامۆغلی شوێنی هەلّگرت، بە دوای دا چوو بۆ ئانتاکیای و لەویٚ دیسان لێی ون بۆوە. بایرامۆغلی ماندوو نەدەبوو و هەر بە دوای دا دەگەڕا. شەوێکی، لە شوێنێکی دیکە کتوپڕ بە سەری دا کەوت. ئیدی دەستی بۆ دەمانچەش نەبرد، یەکجیٚ خۆی پیٚدادا و دە بن خۆی نا، بەلاّم خەلّك گەیشتنە فریای نەبی و بایرامۆغلی‌یان لە سەر هەلّپچڕی. نەبی دیسان بۆی دەرچوو. بەرەو ئالیپۆ پالاّوتی و لە وێوەش چووە دیمەشقیٚ، بەلاّم بایرامۆغلی وەك سیبەری هەر بە دوایەوە بوو. هەر ئەشی‌دەگەیشتیٚ و بۆی نەدەکوژرا.

جارجاریش دەی‌گوت بلێی ئەو جار بی‌گەمێ، بوێرم تەقەی لێ‌بکەم؟ ئەبێ چووە ئەدەنەی، بایرامۆغلێش چوو و سەرەنجام ئەو هاتەوە شارە چکۆلەکەی خۆیان و بایرامۆغلێش بە دوای دا گەیشتێ. ئەوێرۆژێ بازار بوو و خەڵك ئەوەندە زۆر بوو، دەرزیت هەڵاویشتبایە، وە عەرزی نەدەکەوت. بایرامۆغلێ کوڕی گوڵمەزی لە نێزیك پردێ، ڕاست ئەو شوێنەی ئەسپەکەی حەمەدۆکی چەندین ساڵ دواتر لێ گوللەباران کرا، دۆزی‌یەوە.

ئەبێ پێش وی دەمانچەی هەڵ‌کێشا، بەڵام بایرامۆغلێ دەرفەتی پی‌نەدا قامك بگەیەنێتە پەلەپیتکەی، وەك باشووی دای‌هاتێ و دەستی دە تینتینۆکەی نا، بە دەستەکەی دیکەشی هەڵی‌کێشا خەنجەرێ و خەنجەری هەتا بن دەسکان لە سینگی ئەبێ بردە خوارێ. گوڵمەزۆغلێ دەسبەجێ پی‌ڕاهات، بەڵام بایرامۆغلێ دەستی لێ‌هەڵ‌نەگرت، دیسان وە بەر خەنجەرانی دایەوە و تەواوی لەشی ئەنجنی. خەڵك لە دەوروبەریان کۆ ببوونەوە و بی‌ئەوەی هەوڵێ نێوبژیوانی‌یە بدەن، حەیران و بێ‌دەنگ چاویان لێ‌دەکردن. هەموو لەشی بایرامۆغلێ، لە بەری پێی ڕا هەتا تەپڵی سەری خوێنێ لێ‌دەتکا. سەرەنجام هەستایەوە و لە دەوروبەری خۆی ڕوانی. هیچی نەدەگوت و وەك ئەوە دەچوو هەر هۆشیشی لە خۆی نەبێ. لە نەکاو ناوڕی دایەوە، چاوێکی لە مردووەکەی کرد کە دەخوێنێ خۆی دا نوقم ببوو. کە دیتی خەڵك لە دەوری تەرمەکەی کۆ بوونەوە و پاڵەپەستۆی یەکتر دەدەن، ترسا، ڕەتی برد و خەریك بوو لە تەنیشت مردووەکەی وە عەرزێ کەوێ. وی‌دەچوو خوێن گرتبێتی، بەڵام خۆی گرتەوە و نەکەوت. لەو کاتە دا دەمانچەکەی وە بیر هاتەوە، دەری‌هێنا و دەراغێکی تەواوی لە مردووەکەی بەتاڵ کرد. پاشان زۆر بە لە سەرەخۆیی دەراغێکی دیکەی دەرێنا، خستی‌یە سەر دەمانچەکەی، وەرسووڕا و ڕووی دە جادەی سەرەکیی نێو شاری کرد. هەموو پێیان وا بوو دەچێتە ژاندەرمەخانەی و خۆ بەدەستەوە دەدا. بایرامۆغلێ هەتا نێزێك ژاندەرمەخانەی چوو، بەڵام لە وێ بە خێرایی چووە کۆڵانێکەوە، بە ڕاکردن بە نێو کۆڵانەکەی دا تی‌پەڕی و خۆی گەیاندە نێو دەوەنان، ئەوەندەی بلێی یەك و دوو لە تەپکی وەسەرکەوت، ناوەژوو بۆوە، خۆی گەیاندە دارستانی و لە دۆڵێکی دا کانی‌یەکی خۆشی دیتەوە. لە سەر کانی‌یەکەی ڕاوەستا و تێروپڕی ئاو خواردەوە. خوارەوەی کانی‌یەکەی قامیش و پنگەڵانێك بوو ماری تی‌نەدەچوو، خۆی دەنێو پنگەڵانەکەی ڕاکرد، شوێنێکی قووڵی دۆزی‌یەوە و درێژ بوو. زۆری پی‌نەچوو ناگای لەخۆ برا و وەك کۆلکەدارێك لە وێ کەوتبێ وا بوو. ژاندەرمە زۆری لێ‌گەڕان، بەڵام نەیاندۆزی‌یەوە.

هەواڵی کوژرانی گوڵمەزۆغلێ کەوتە سەر زار و زمانان و نێوبانگی بایرامۆغلێش تەواوی چیای تووڕووس و چوکووڕاوای داگرت. ئیدی بایرامۆغلێ یاغی بوو. دوای ماوەیەك هێندێك کەسی

دیکەشی ڕەگەڵ کەوتن، کە هەموویان ئازا و بە ورە بوون و بۆخۆی دەستەیەکی پێکهێنا. بایرامۆغلی سالانێکی زۆر چەتە بوو. خەڵك خۆشیان دەویست و پێگەیەکی بەهێزی لە نێو خەلکی شاخی دا هەبوو. بایرامۆغلی لە دەوڵەمەندانی دەستاند و دەیدا بە هەژاران. شایەر و بەیتبێژی هەموو گوندەکان پێیانهەڵدەگوت، بەیت و گۆرانی‌یان بۆ دادەنا و شایی‌یان بۆ دەگێرا. هێندەیان خۆشدەویست دەیانهێنا ڕیزی کۆێرۆغلی، گەنج عوسمان و ئەسکەندەری جووتشاخی گەورە. وای لێهاتبوو دەیانگوت بایرامۆغلی دەستی بەسەری هەر نەخۆشێکی دا بێنێ، چاك دەبێتەوە و هەر لەشبەبارێك لە ناوی قاپێکی بخواتەوە، کە ئەو قومێکی لێخواردبێتەوە، ئیدی ئێشی لە قالبی دەبڕێ. کاتێك شەڕی سەربەخۆیی دەستی پێکرد، بایرامۆغلیش وەك ڕەشمار و یاغی‌یە بەنێوبانگەکانی دیکەی وك گیزیك دۆران، عەلی عەفە یۆرۆکی، یۆکچەن عەفە و دەمیرچی عەفەی لوولەی چەکەکەی دە دوژمنی کرد و لە شەڕی هاچین، کاربوغاز و ماموورەش دا بەشدار بوو. کاتێك شەر تەواو بوو، چەکی دانا و چۆوە گوندەکەی خۆی. لە ماڵی دنیایە تەنیا یەك سکەی زێڕی هەبوو. بەو زێڕەی جووتێك گا و نیروئامووری کڕی. چاشی زۆر پێخۆش بوو، بۆیە پاشماوەی پوولەکەی دا بە قەند و چا. لەو کاتەوە بایرامۆغلی خەریکی کشتوکاڵ بوو، بەڵام ئەوەی پەیدای دەکرد، بە زەحمەت بەشی ژیانێکی نەمر نەژیی خۆی و بنەماڵەکەی دەکرد و نەیدەتوانی ئەوەندەی قەندوچا پێبکڕێ، کە هەموو ڕۆژێ چای بخواتەوە. دایکی مابوو، مێردی کردبۆوە و سێ منداڵی لە مێردە تازەکەی هەبوو. هەروەها خوشکەکانیشی مێردیان کردبوو.

بایرامۆغلی ئاگای لە بەسەرهاتی حەمەدۆکی هەبوو. لەو کاتەوە حەمەد ببوو بە چەتە و نێوبانگی بلاو ببۆوە، کە بە دوای عەبدیخانی‌یەوە بوو هەتا کوشتی، کە بەرپرەکانیی عارف سایم بەگی دەکرد و پاشان مەحموداغای کانی‌یەگولانی کوشت، هەمووی ئەوانە شوێنەوارێکی قووڵیان لە سەر وی دانابوو و ئەو کۆنە یاغی‌یە حەمەدۆکی یەکجار زۆر خۆشدەویست، ئەو حەمەدۆکە لاوەی کە ناو و ناوبانگی لە وی زیاتر دەرکردبوو و زۆر شتیشی کردبوو کە ئەو کاتی خۆی نەیتوانیبوو بیانکا. بۆخۆی دەیگوت ئەمن دەورم نەماوە، ناوم ون بووە و خەڵك منیان لە بیر چۆتەوە، بەڵام حەمەدۆك جیاوازیی هەیە. ناوی وی هەتا دنیا دنیایە، هەر دەمێنێ و ون نابێ. ئەو هەموو هەڵسووڕان و چالاکی‌یەکانی حەمەدی بە ئۆگری‌یەوە دەخستە بەر باس، لێکی‌دەدانەوە و هەمیشە دەیگوت حەمەد بە سەر ترس دا زاڵ بووە، ڕاست وەك من! ڕۆژێك منیش لە سنووری ترس پەڕیمەوە و ئیدی تووشی نەبوومەوە. ئەو لە ماوەی شەڕی سەربەخۆیی دا قەت تووشی ترس نەهاتەوە، چونکە تاکێك بوو لە نێو کۆمەڵێك سەرباز دا، یان با بڵێین چونکە دەیزانی ترس چی‌یە و دەڵێ چی. کاتێکیش گەڕایەوە

گوندەکەی خۆی و ژیانێکی یەکجار هەژارانەی دەستپێکرد، ئیدی قەت ترسی بە بیر دا نەهاتەوە، تا ئەو ڕۆژەی فەرمانی پێدرا وەدوای حەمەدی بکەوێ و بی‌گرێ...

زانیاری‌یەکان وردە وردە پوختەتر دەبوون و ئێستا دەیانزانی حەمەد لە کوێیە: حەمەدۆك ئەوە لە گوندی" دوورەڕێ" و لە لای بابە گوڵەیە. بایرامۆغلی و فەرماندەرەکان لە بناری عەلیکۆی کۆبوونەوەیەکیان گرت و بڕیاریان دا هەموو ئەو هێزانە کە بە شێوەی بڵاو دەگەڕان، کۆ بکەنەوە، بیانخەنە سەر یەك و ئەوەندەی دەکرێ خێرا و کتوپڕ بچنە سەر ئەو گوندەی و گەمارۆی بدەن. بە ڕواڵەت پلانەکە ئەوە بوو، بەڵام ژاندەرمان پێش وڵات ڕووناکبوونێ چوونە دەوروبەری گوندی "تاقەدار"ێ و مەبەستی سەرەکیش هەر ئەو گوندە بوو و ئەوی دی بۆ هەڵخەڵەتاندن بوو. حەمەد کە هەستی کردبوو ئەوان خەریکن هێرش بکەنە سەر گوندی دوورە ڕێی، بە کوێرە ڕێگا و نێوبڕان دا هێندێك پێشتر هاتبوە گوندی تاقەدارێ و لە ماڵی بابە وەلی بوون. دەستەکەیان نۆزدە کەس بوو. هەمووش پیاوی هەڵبژاردە، شەڕکەر و بە ئەزموون.

لە نەکاو پیاوێکی خەڵکی دێی هاتە ژوورێ و گوتی:

ـ دەوری دێی گیراوە!

مەلا فەرهاد گوتی:

ـ ئاخری بایرامۆغلی فریوی داین. لە کنەخۆ بە سەری هەڵدەتۆقاندین، بەڵام وا دیارە ڕاست سێرەی لێگرتووین و ئێماندەدا. با هەرچی زووتر وەخۆ کەوین و نەیەڵین هەموو لایەکمان لێبگرن...

حەمەد کە ڕەنگی هێندێك سپی هەڵگەڕابوو، بەڵام هەر وا لە سەرەخۆ بوو و نەخەجڵابوو، گوتی:

ـ ڕاوەستن! دەبێ پلانێك دانێین. بە بێ بیرکردنەوە لە دێی بچینە دەرێ، بایرامۆغلی وەك مێشان قڕانمان تێدەخا.. دەوروبەری دێی ڕووتەنە...

مەلا فەرهاد فیشەکدانەکەی هەڵگرت و گوتی:

ـ حەمەد ئێمە گەمارۆ دراوین. هەستن ڕۆڵە، زوو بن، ئەگەر هیچ ڕێگای دەربازبوونیش نەمابێتەوە، دەبێ شەڕێ بکەین و بە زیندوویی نەمانگرن!

حەمەد هەر وا ئارام و لە سەرەخۆ گوتی:

ـ سەبر بگرە مەلا فەرهاد. نەتبیستوە دەڵێن: پەلەکردن کاری شەیتانی‌یە!

لە نێوەڕاستی ژوورێ دانیشت، چەنەی خستە سەر دەستی و بیری کردەوە، بەڵام مەلا فەرهاد نەدەحەجمی.

هێندەی پێنەچوو حەمەد سەری هەڵێنا و گوتی:

ـ بابه وەلی!
ـ فەرموو حەمەدۆك!
ـ دەبێ یارمەتیمان بدەی!
ـ سەر و ماڵمت دە ڕێ دایە حەمەدۆك.
ـ بنێرە خێرا نۆزدە پیاوی جحێڵ بێنە ئێرە.
هەر دوای ساتێك نۆزدە پیاو لە وێ ئامادە بوون.
حەمەد پێی‌گوتن:
ـ برایان، ئێمە وئێوە جلەکانمان دەگۆڕینەوە. دەی خێرا کەن، با زوو بیانگۆڕین.
ئەو جار مەلا فەرهاد گەش بۆوە،
چوو دەستی لە سەر شانی حەمەدی دانا و گوتی:
ـ ئێستا تێدەگەم مەبەستت چی‌یە، قسەی تۆیە! لەوەی زیاتر ڕێگایەکی دیکەمان لە پێش نیە.
حەمەد گوتی:
ـ بەڵێ ناچارین وا بکەین و ئەوەش فکری چاکە، بەڵام ئەدی چ لە منداڵان بکەین... منداڵ قسەی تێدا ڕاناوەستێ و درۆش نازانێ!
ـ نیگەرانی منداڵان مەبن، لە بەختی باشی ئێوە هەموویان سووریژەیانە و دە جێگایە دان!
مەلا فەرهاد گوتی:
ـ بە ڕاستی ئەمنیش هەر لە منداڵان نیگەرانم، وایە، منداڵ نازانێ درۆ بکا و هەرچی لێی‌بپرسی، ڕاست وەڵامت دەداتەوە.
بابە وەلی گوتی:
ـ تۆسقاڵێك بیر لە منداڵان مەکەنەوە و تەنیا هۆشتان بە لای خۆتانەوە بێ. وەك گوتم منداڵەکان نەخۆشن و ئەگەر حەزرەتی عەلیش پێیان بڵێ، لە جێگایە نایەنە دەر. بێجگە لە وەش ئەمن چی‌یان پێ‌بڵێم، دەی‌کەن و لە قسەم دەرناچن.
حەمەد گوتی:
ـ زۆر باشە بابە وەلی. ئەوەش چەك و ڕەختەکانمان! لە بەر دەستانیان مەهێڵە، با نەیان دۆزنەوە!
ـ خەمی وانیشت نەبێ. دەبێ لە شوێنێکیان دانێم، بۆخۆشم بە زەحمەت پێی‌بزانمەوە.
ـ باشە ئەگەر هەموو خەلکەکەیان لە شوێنێکی کۆ کردەوە، بڵێین چی؟ ئەگەر جەبارە درێژیان لە گەڵ بێ، دەتناسێتەوە، ئەو کات بڵێی تەسلیمی بایرامۆغلێت نەکا؟

ـ حەمەد بە دڵنیاییەوە گوتی:

ـ جەبار دۆستی منە و دەنگێ ناکا.

ـ عەلییەشەلیش هەر وا.

حەمەد بزەیەکی هاتێ و چی دی نەگوت.

ـ ئەدی مووسا زریان؟ قسەی تێدانیە ئەو شوێنی ئێمەی تا ئێرە بۆ هەڵگرتوون. دەبێ ئەویش بتناسێ!

ـ دەمناسێ.

ـ بە ڕاستی ئەو بایرامۆغلییە لە تاعوونی خراپترە، بیژوویەکی پیسی هیچوپووچە. بریا هەر زوو کوشتباما‌ن...

ـ کێ پێیوابوو ئەو کابرایە کە هێندە گەورە بوو، خۆی ناوا سووک بکا، ببێتە سەگ و پاسی عارف سایم بەگ و ئاغاکانی دیکە بکا؟ ئەدی مووسا زریان... ئەو خوێڕییەش بۆ بڕە پووڵێکی سەری دەدوو ناوین و دەستمان لێهەڵناگرێ؟ دەبوو ئەویشمان کوشتبایە! حەیف بە قسەی عەلییە شەلیم نەکرد... بە قسەی ویم کردبایە، ئێستا وامان بە سەر نەدەهات...

مەلا فەرهاد گوتی:

ـ ئەمن هەر ترسی منداڵەکانم هەیە. هەر یەکێکیان وەدەرکەوێ و...

حەمەدۆك گوتی:

ـ کاکە، خەڵکی ئێرە عەلەوین. تەنانەت منداڵەکانیشیان هەرگیز لە قسەی "باب"ـەکانیان دەرناچن. دڵنیا بە بشیان کوژن، هیچ نادرکێنن.

ـ ئەدی ئەگەر یەکێکی خوێڕی، سیخوڕێك، سووکێکی لە لای بایرامۆغلی ڕاپۆرتی لێداین و ئاشکرای کردین؟

ـ بێگومان بابە وەلی بیری لەو شتانە کردۆتەوە!

ـ بەڵێ، تەنیا مووسا زریان جێی ترسە...

ـ هیچ ناقەومێ، مەترسن!

مەلا فەرهاد گوتی:

ـ پەنا بە خودای!

دێیەکە بێدەنگ و مات بوو. هەموو چاوەڕوان بوون بزانن کاتێك بایرامۆغلی دێ، چ دەکا. دوور دەنگی چەقولووری سەگان و زەڕەی کەران دەهات.

سەرەنجام هێزەکە گەیشتە نێو دێی. مووسا زریان لە پێشێ دەڕۆیی و عەلی‌یە شەلیش شانبەشانی دەهات و یەك شەقاوی لێ‌جیا نەدەبۆوە. بایرامۆغلی بە سواری بوو و یاوەرەکان، سەروان خەلیل، عیززەت نووری و وەکیل باشی عاسمیش لە گەڵ وی دەهاتن و هەموو چاویان بڕیبووە مووسای شوێنگێڕ کە لە گەڵ هەر هەنگاوێکی گۆچانەکەی دە عەرزی دەکوتا و بە چاوان دەوروبەری دەپشکنی. شوێنەکە هەتا دەرگای حەساری بابە عەلی و ئەو دیوەخانە گەورەیەی شوێنی کۆبوونەوەی خەڵکی ئاوایی بوو، هاتبوو:

ـ چەتەکان نۆزدە کەسن، هاتوونە ئەو ماڵەی و دوایە نەهاتوونەوە دەر، بابە وەلی!

ـ مووسا زریان، ئەتۆ دەڵێی چەتەکان چوونە دەو ماڵەیەوە و دوایەش نەهاتوونەوە دەر، لەو قسەی خۆت دڵنیای؟

مووسا زریان بە دڵنیایی‌یەوە وەڵامی دایەوە:

ـ بەڵێ، بابە وەلی. ئەوان هەر دە وێ دان.

ـ جا ئەگەر وایە فەرمووبچۆ ژوورێ، بزانە وایە!

ـ بە تەمام هەر واش بکەم و جا دەبینی هەموویان دێنمە دەر، دیارە بە حەمەدۆکیشەوە.

مووسا لە دەرگا چووە ژوورێ، گۆچانەکەی بە سەر شوێنەکان دا هێنا و لێیان ورد بۆوە، بەڵام خێرا هاتەوە دەرێ.

ـ ئەو چەتانە گومانی تێ‌دا نیە هەر لەو دێیەن، هەمووی دوو سەعات نابێ لەو ژوورەی هاتوونە دەر. خۆ نیشاڵڵا باڵیشیان لێ‌نەڕواوە، هەڵفڕیبن و ڕۆیبن. دڵنیام هەر لە نێو دێی، لە شوێنێکی خۆیان شاردۆتەوە...

ئەو جار مووسا بە تالووکە کەوتە پشکنینی ئەو شوێنانەی کۆڵانەکان کە گومانی لێیان‌هەبوو. شوێنێکی هەڵدەگرت، هەتا لای دەرکێکی دەبرد، دوایە بە غار دەگەڕایەوە و دەچوو بۆ دەرکێکی دیکە. هەتا دوای نیوەڕۆیە ئەو غارغارێنەی کرد و دوای ئەوەی هێندە ماندوو بوو ئارەقەی لە بەری پێی دەتکا، گەڕایەوە لای بایرامۆغلی:

ـ ئەو نۆزدە چەتانە هەر لەو دێیەی دان و بۆ هیچ‌کوێ نەچوون. حەمەدۆکیشیان لە گەڵە. دڵنیام دە خانووەکان دا خۆیان شاردۆتەوە و ئەگەر بگەڕێین، دەیاندۆزینەوە. شوێنەکان تێکەڵ بوون و لە هەموو بەر دەرگا و کۆڵانەکان هەن. دڵنیام سەری هەموو ماڵەکانیان داوە...

بایرامۆغلی لێی پرسی:

ـ باشە مووسا، بۆ ئەوان چوونە هەموو ماڵەکان؟ چی‌یان بەو هەموو ماڵانە داوە؟

ـ دیسان مووسا ڕای کردەوە نێو دێی و بە چاوەکانی کە وەك چاوی هەڵۆی زیت و وریا بوون، وڵاتی پشکنییەوە، بە گۆچانی شوێنەکانی هەڵسەنگاند و تاقیکردنەوە و پاشان هاتەوە لای بایرامۆغلی:

ـ ڕەنگە بەقام پێتەکەی، بەڵام ئەمن پێتدەڵێم حەمەد و دەستەکەی لێرە، دەو دێیەی دان. هەموو شوێنێکی بە وردی گەڕاوم و ئەو دەوروبەرەشم باش پشکنیوە. شوێنەکان لێرە نەڕۆیشتوونە دەر. ئەوان لێرە ماونەوە و لە دێیێ دا بڵاو بوون...

بایرامۆغلی هێندێك بیری کردەوە، پاشان یاوەر فاڕوقی بانگ کرد و پێی‌گوت:

ـ یاوەر، بە هێزەکەی خۆت بڵێ ماڵبەماڵی ئەو دێیەی بپشکنن. پاشان دەستوور دەدەین خەڵکەکە هەمووی لەو مەیدانە گۆڕەی نێوەڕاستی دێی کۆ ببنەوە. ئەمن باوەڕم بە مووسا زریانی نیە، بەڵام بۆچی، بەڵکوو قسەکەشی ڕاست بێ و حەمەدۆك لێرە بێ.

پاشان ڕووی دە مووسا زریانی کرد:

ـ ئەتۆ حەمەدی دەناسی، وانیە؟

ـ بەڵێ، دەیناسم، بایرامۆغلی.

ـ کە وابوو ئەگەر بیبینی...

ـ دەسبەجێ دەیناسمەوە، بایرامۆغلی.

یاوەر گوتی:

ـ ئەمنیش مەلا فەرهادی دەناسمەوە.

دەستەیەك ژاندەرمە ماڵەکانیان پشکنی و هەموو پیاوەکانیان هێنان و نە مەیدانەکەی نێوەڕاستی دێی کۆیان کردنەوە. دوای حەوت کەسان حەمەدیان هێنا مەیدانەکەی. کە هێنایان، لاقی ڕووت بوون و چاکەت و پانتۆڵێکی دڕاوی شڕۆڵی دە بەر دا بوو و کراسەکەشی لە پشت ملییەوە هەتا سەر پشتی دڕابوو. حەمەد لە سەرمان خۆی کۆ کردبوۆوە و لاقەکانی شین هەڵگەڕابوون. کاتێك مووسا زریان چاوی پێی‌کەوت، غاری دا پێشێ و گوتی:

ـ ئەوە هەوە! ئەوە حەمەدۆکە!

بەڵام عەلییە شەل دەسبەجێ گەیشتە سەری و سەبرێك پێی‌گوت:

ـ هەتیو، یەکجاری دی بڵێی ئەوە هەوە، هەر لێرە، دەسبەجێ دەتتۆپێنم!

دەنگی عەلی هەر چەند سەبر بوو و هەر بە گوێی مووسای گەیشت، بەڵام ئەوەندە لێبڕاوانە و بەسام بوو، کە مووسا یەکجێ تەرمی خۆی هاتە پێش چاوی و هەستی کرد هەر ئێستا

دەی‌نێژن. هێندەی نەمابوو چۆکی بنوشتێنەوە و بکەوێتە عەرزی. لە سەر حەمەدی ڕاوەستا و نەی‌دەزانی چ بکا. ئاخرەکەی ڕۆبووە بەرۆکی کوڕە جووتێرێکی مێرمنداڵ و هاواری کرد:

ـ ئەوەتا، ئەوە حەمەدۆکە!

دیار بوو لەوەی کە ئەو فێڵەی بۆ دیترابۆوە و توانیبووی خۆی لە دەست عەلی ڕزگار بکا، زۆر خۆشحاڵ بوو. ڕاست دەو ساتەی دا وەکیل باشی عاسم و حەمەد چاویان تێک‌ئاڵقا و هەردووکیان بزەیان هاتێ.

سەعاتێك دواتر هەموو پیاوەکانیان هێنابووە شوێنی کۆبوونەوەکەی. مەلا فەرهاد و دوو سێ پیاوی دیکەیان دوای هەمووان هێنان. ئەو چووبووە نێو نەخۆشان. نەی‌دەتوانی بە پێوە ڕاوەستێ و بە لارەوە لارەوە هات لە سەر قولینچکی بەردە پانەکەی تەنیشت چاڵاوەکەی دانیشت. ئەویش وەك حەمەدی چاکەت و پانتۆلێکی شڕی دەبەر دا بوو، بەڵام ڕیشی تاشیبوو و ڕەنگی وا سپی ببۆوە، دەت‌گوت ساڵێکە نەخۆشە. هەزار ناسیاوت هێنابا، نەیان دەگوت، ئەو مستە یەسك و پێستە شڕۆڵ و مردەلۆخەیە مەلا فەرهادە. نە یاوەر و نە ئەو دێهاتی‌یانەش کە هەرگیز مەلا فەرهادیان بە بێ ڕیشە ڕەشە درێژ و پڕەکەی نەدیبوو، قەت شکیان نەدەکرد کە ئەوە مەلا فەرهاد بێ.

ژاندەرمان هەموو ماڵەکان گەڕان و ئەو لاوەش کە مووسا زریان گوتبووی ئەوە حەمەدۆکە، درا دەست عەلی‌کەرتیشی. عەلی بێ سێ و دوو وەری‌گەڕایە. لاوەکە هاواری کرد باشە، ئەمن ناوم حەمەدە و حەمەدۆکیش بۆخۆمم. عەلی باوەڕی پێ‌نەکرد و لەوەش ڕقی هەستا کە ئەو گوتی ناوم حەمەدە، ئەو جار دارکاری‌یەکی چاکی کرد هەتا بڵێ ئەمن حەمەد نیم. ئاخرەکەی عەلی کەرتیش هەموو گیانی کوڕەی ڕەش و شین کردەووە و حەوت پەراسووشی شکاند. کوڕەکە بێ‌هۆش بوو، بەڵام هەتا لە زمان کەوت، هەر گوتی حەمەدۆکم.

عەلی کەرتیش چووە لای یاوەر فاڕوقی:

ـ یاوەر ئەو کوڕە حەمەدۆك نیە. ئەمن ئەوە هەموو گیانیم شکاندوە، دەڵێم بڵێ حەمەدۆك نیم، بەڵام هەر وا ناڵێ!

یاوەر دەرهەڵبوو و گوڕاندی:

ـ کە وا بوو لە جیاتیی حەمەدۆکی گوللەبارانی دەکەین! حەوت گوللەی لە سینگی دەدەین و دوەایە دەڵێین لە شەڕێ دا کوژراوە!

یاوەرعەلی گاور هەرچۆنێك بوو یاوەر فاڕوقی هێدی کردەوە و نەی‌هێشت لاوەکەی بکوژێ. مووسا زریانیش هەر بە نێو دێی دا ڕای دەکرد و وەك شێتان هاواری دەکرد:

ـ وەڵڵاهی حەمەدۆك لێرەیە، هەر لەو دێیەیە و لە نێو ئەو خەڵکەی دا خۆی حەشار داوە! دەتوانم دەست بە قورِئانیّ دادەم، بەڵام چونکە زۆر لەمێژە نەمدیوە، نەمناسیـیەوە. دەزانم زۆر کەس لە ئێوە دەیناسنەوە، بەڵام ناوێرن دەنگیّ بکەن!

رِۆژ بە دەرەوە بوو و بەفرەکە لە بەر تیشکی رِۆژیّ دەبریقایەوە. مووسا یەکبەیەك رِای دەکردە لای خەڵکەکەی و لێی دەپرسین:

ـ توخوا رِاستم پیّبڵێ، حەمەدۆك لێرەیە؟ دەنا بزانم دەتوانی دەست بە قورِئانیّ دادەی، بڵێی ئەمرِۆ حەمەدۆکم نەدیوە؟

دە ئاخری دا بەرۆکی عەلیـیە شەلی بە هەردووك دەستان گرت، رِایوەشاند و گوتی:

ـ ئەتۆش حەمەدۆکت نەدی؟

عەلی خۆی لە دەستی رِاپسکاند و وەڵامی دایەوە:

ـ نەخێر، ئەمنیش نەمدیوە. حەمەد ئێرە نەماوە. سواری ئەسپەکەی بووە و رِۆیوە!

مووسا زریان دیسان بەرۆکی عەلیی گرتەوە. چاوی لە ژێررِا هاتبوون و هێندەی نەمابوو دەربەرِن، رەگی ملی وەك ئالۆوداری هەستابوون:

ـ دەتکوژم. بەو دەستانەی خۆم دەتکوژم! ئەتۆ ئێرەییم پیّدەبەی، چونکە ئەمن لەتۆ شوێنگێرِ ترم، چونکە لەتۆ بە ئەزموونتر و شارەزاترم! هەموو جاریّ دەگەمە سەر حەمەدی و لە دەستمی دەردێنییەوە! هەر پێتخۆشە سووکایەتیم پیّبکەی، گاڵتەم پیّبکەی و وام لیّبکەی خەڵك پێمبڵێن بیّئەقڵ و شێتە. بەڵام ئەوەی بزانە هەر دەتکوژم، رِۆژی خۆی دەتکوژم!

ـ بمکوژە، بەڵام ئەگەر کوشتتم، چت پیّدەگا؟ پێتوایە خەنیت دەکەن و لە دنیای دیش یەکسەر دەچییە بەهەشتیّ؟

ـ دەتکوژم، ئەتۆ چاوت بەرایییە نادا شوێنگێرِێکی لە خۆت باشتر ببینی! بۆیە هەموو جاریّ نێچیرەکەم لە چنگ دەرباز دەکەی...

مووسا لەوپەرِی توورِەیی و ئاڵۆزی دا، لە نەکاو بەرۆکی عەلیی بەردا، چۆکەکانی فیزان، بە سەر زێدەدیوارێکی تەنیشتیان دا کەوت و دەستی کرد بە گریانیّ. عەلییە شەل بەزەیی پێیدا هات و لە پەنای دانیشت:

ـ کاك مووسا، ئەتۆ لە هەڵە دای! ئەتۆ شوێنگێرِێکی گەورەی، یەکجار گەورەی و شوێنگێرِی وەك تۆ وشیار هەر نەبووە و قەتیش نابیّ! ئەمن هیچ، هەباسە کەچەڵیش بە بەرِیپێی تۆ نابیّ! چۆن ئەمن ئێرەیی بە تۆ دەبم؟ وا نیە...

مووسا دەستی دە دەستی عەلی نا، چاوەکانی گەش بوونەوە و ڕیشە تەنکەکەی هێندێك لەرزی:
ــ بە ڕاستیتە عەلی، یان گەمەم پێدەکەی؟
ــ دەستت بۆ بە قورئانێ دادەدەم، بەڕاستیمە، ماڵت نەشێوێ!
ــ کە وابوو هەر بۆیەت بوو گیانی حەمەدۆکی ڕزگار کەی!
ــ بەڵێ، هەر ئەوە بوو!

عەلی‌یە شەل ئەوی بەجێ‌هێشت و هاتەوە لای بایرامۆغلی. دوو بە دوو لە قولینچکێکی دانیشتن. بایرامۆغلی گوتی:

ــ دەزانم حەمەدۆك لێرەیە. ئەو کوڕە بە ڕاستی شێتە و خۆی ناپارێزێ! نازانم بڵێم چی! پێم‌وایە یان لە ڕادەبەدەر دە خۆی ڕادەبینێ، یان ئەمن بە هێند ناگرێ و لێم ناترسێ!

عەلی نەی دەزانی چ بڵێ و چۆنی وەڵام بداتەوە، هەر بۆیە بێدەنگ مایەوە و هیچی نەگوت.

دوای ئەوە ئیدی فەرماندەرانی هێزەکە، ژاندەرمەکان و چەکدارەکانی دیکەی خۆیان کۆ کردنەوە و گوندی تاقەداریان بەجێ‌هێشت. هەر ئەوان ڕۆیشتن، ئەو منداڵانەی سووریژەیان بوو و دە جێیە دابوون، دەرپەڕینە دەرێ و بە نێو دێی وەربوون. شەپۆلێکی خۆشحاڵی گوندی داگرت. ئەوێڕۆژێ پێنجشەممە بوو. بابە وەلی هەموو خەلکەکەی لە عیبادەتگەی گوند کە شوێنی ئاسایی کۆبوونەوەی خەلکەکەش بوو، کۆ کردەوە، گەرم و بە سۆز سازی لێدا و بەیت و شێعری وای گوتن، کە تائێستا کەس نەی‌بیستبوون. داوەتێکی خۆش ساز بوو. ژنە باریکەڵە باڵابەرزەکان و پیاوە ڕەشەسمرە کەڵەگەتەکان بە دەور هەڵدەپەڕین. بابە وەلی لە گۆرانی‌یەکانی دا هاواری ئیمامی عەلی و دوازدە ئیمامانی دەکرد، باسی کوێرۆغلی، یۆنس عەمرە شاعیری گەورەی تورکمەن، حاجی بەکتاش وەلی، عەبداڵ مووسا، چلسوارەی غەیبی، حەوت ساڵحان و سێ کەسەی دەکرد و پێی‌هەڵدەگوتن. ژن و پیاو هەتا بەیانی داوەتیان کرد و بەردەوامیش هاواریان دەکرد: "دەور و دەسەڵاتت وەدی بێ بابە سوڵتان." چیای توورووسیش دەوراندەور، بە دارەوە، بە کانی و ئاوهەڵدێر و ڕووبارەوە، ئەستێرەکان، گورگەکان و مێرووەکان هەموویان بەو حەوت حەمەدانەیان هەڵدەگوت کە بەدەستی ژاندەرمەکان کوژرابون: هەر تەرمێك بە سەر پشتی ئەسپێکەوە شۆڕ ببۆوە و لە سەر هەر تەرمێکیان باڵندەیەکی شین دەفڕی. کاتێك کاروان ڕادەوەستا، ئەوانیش لەنگەریان دەگرت و ڕادەوەستان و کاتێك ئەسپەکان وەڕێدەکەوتنەوە، ئەوانیش بە سەر تەرمەکانەوە وەڕێدەکەوتنەوە. هەتا تەرمی حەمەدەکان گەیشتە شاری، ئەو حەوت باڵندەیە هەر لە سەریان دەگەڕان، جەغز و هێڵی شینیان دروست دەکردن و لە حەساری

ژاندەرمەخانەش چوونە نێو دارهەنارە گەورەکەی ئەوێوە، پاشان هاتنە دەرێ و شەبەقیکی شینیان بە سەر تەرمەکان دا، کە بە دیواری‌یەوە ریز کرابوون، بڵاو کردەوە...

بایرامۆغلی دوای بەجی‌هێشتنی گوندی تاقەداریّ، پشتی دە عەلیکۆی کرد و بەرەو رۆژاوا چوو. هەر دەستە ژاندەرمەش بە لایەك دا رۆیی، بەڵام حەمەدۆك بۆ هەر لایەك چووبایە، هەر دەگەڕایەوە بنارەکانی عەلیکۆی. بایرامۆغلی بە پێی پلانی "تۆڕی جالّجالّووکە"ی دەجووڵایەوە و بەو شێوەیە دەبوو لە " خرِیّ رنووان" حەمەدۆکی دە داو خا. بە پێی ئەزموونی خۆی دەی‌زانی بۆ چەتەیەك کە پشت بە شاخی ببەستیّ و بیەویّ ماوەیەك لە ئاوەدانی‌یە دوور بیّ، جێگا لە" خرِیّ رنووان" کە لە شوێنێکی دوورەدەست و لەبناری عەلیکۆی هەلکەوتبوو، باشتر وەگیر ناکەویّ. ئەو شوێنە کۆمەڵە ئەشکەوتێکی لیّبوو، کە نێویان بە قەدەر قەلایەکی بەرفرەوان و گەورە بوو و کاتێك بەفر و کرێوە دەستی پیّدەکرد، ئیدی ژاندەرمە بە تووتووش رووبان دە ویّ نەدەکرد. پاشان کابرا دەو دۆڵەی دا بە دەگمەن دەدۆزرایەوە، چونکە

ئەشکەوتەکان زۆر بوون و هەمووشیان وا بە دەرەوە نەبوون، کە هەموو کەس پێیان‌بزانیّ. تەنیا بایرامۆغلی، بلەیەکچاو، رەمۆ کەڵەباب و رۆستەمەکورد باش شارەزای ئەویّ بوون و بە یارمەتیی شوێنگێری بەنێوبانگی وەك مووسا زریان و عەلی‌یە شەلی، کە شوێنی باڵندەیان لە ئاسمانیّ هەلّدەگرت، دەیانتوانی یەك بە یەك ئەو ئەشکەوتانە بدۆزنەوە و تەنانەت راست بچنە سەر ئەو ئەشکەوتەی کە چەتەکانی تیّدا جێگیر ببوون!

ــ گوێتلیّبیّ عەلی‌یە شەل، باش بوو نەمانتوانی حەمەدۆکی لە تاقە داریّ بە دیل بگرین، وا نیە؟

ــ بەلیّ وایە، بایرامۆغلی...

هەردووکیان سوار بوون و شانبەشانی یەك دەرۆیشتن. بایرامۆغلی هەر بیری دەکردەوە. جاری وا بوو لغاوی هەلّدەنگاوت، رووی دە عەلی دەکرد، دەتگوت دەیەویّ پرسیارێکی لیّبکا، بەڵام نەی‌دەکرد و دیسان وەرِیّدەکەوتەوە. جاری ئاخری لە حالێك دا خۆی لە سەر ئەسپی کوور کردبۆوە و دەستی بە ملی ئەسپەکەی دا دێنا، وە قسە هات:

ــ عەلی‌یە شەل!

ــ بەلیّ، بایرامۆغلی...

ــ کامەیان حەمەدۆك بوو، ئەو کورە چوارشانەیە کە مووسا زریان خەریك بوو دەستی بۆ لای رادێریّ، یان ئەوی درێژی رەقەڵە؟

ـ ئەوی هەوەڵێیان بوو...

ـ ئاگام لێبوو دەو کاتی دا ئەتۆ شتێکت بە مووسای گوت...

ـ پێمگوت زارت هەڵپچڕێ، دەتکوژم! مووسا زریان پیاوێکی ئاقڵە و هەر چاوی لێکردم، دە سەروبنی شتەکەی گەیی...

ـ دەزانم، ئەمنیش چاوم لێی بوو.

ـ وایە.

ـ باشە بە پێویستت زانیبا، ئەمنیشت دە گەڵ دەکوشت؟

ـ قسەی تێدا نیە...

ـ زۆر باشە، جا ئەگەر وا بێ، عەلی‌یە شەل جوان گوێم لێڕاگرە، بزانە دەڵێم چی:

سبەینێ، یان ئەوپەڕەکەی دووسبەی، حەمەد خۆی دەگەیێنێتە خڕێ ڕنووان. لە وێ دە داوی دەخەم و بە دیلی دەگرم. مووسا زریان شوێنەکەی هەڵدەگرێ، دیارە بێ شوێنگێڕیش دۆزینەوەی حەمەدی هاسانە. ئەمن دەزانم دەچێتە ئەشکەوتی دووهەم کە لە هەموو ئەشکەوتەکانی دیکە باشترە، چونکە کانی‌یەکیشی تێدایە. هەر لە ئێستاوە با پێتبلێم هەتا دەگەینە وێ و شوێنەکەی گەمارۆ دەدەین، نابێ یەك هەنگاویش لە من دوور بکەوی‌یەوە و ئەوەی لە لای هیچکەس، تەنانەت لە لای مووسا زریانیش باس ناکەی. لە قسەم دەرچی، بێ سێودوو دەتکوژم. تێگەیشتی؟

ـ تێگەیشتم...

عەلی‌یە شەل گومانی دە وەی دا نەبوو کە حەمەد و هاوڕێیانی ڕاست دەچنە خڕێ ڕنووان و پێیان وایە دەکرێ ماوەیەکی باش لە وێ بحەسێنەوە. ژاندەرمەکان زۆر بوون و دەیان توانی بە چەند ئالقە گەمارۆیان بدەن، حەمەد لە یەك دووانێکیشیان دەرچووبا، لە وانی دی دەرنەدەچوو. بایرامۆغلی پیاوێکی شارەزا و بە ئەزموون بوو، هەر بۆیەش توانیبووی سالانێکی زۆر لە چیا بمێنێتەوە و دەوڵەت زەفەری پێنەبردبوو. تەڵەی ئەو جار سەخت و بەسام بوو. نۆزدە کەس قەت دەرومستی لەشکرێك ژاندەرمەی پڕ چەك و ئەو هەموو کۆنە یاغی‌یە کارامانە نایەن... عەلی زۆر ئالۆز بوو و نەیدەزانی چ بکا، بەلام ئەوەی دەزانی کە ئەگەر بیەوێ خۆ بشارێتەوە، بایرامۆغلی دەستی لێناپارێزێ و دەیکوژێ.

شەو بە سەر داهات و مانگ هەڵات. مژێکی شینی ڕوون بە سەر علیکۆ و "گۆڕێ گولان" کشابوو. بەفرەکە لە بەر تیشکی مانگێ دەبرووقایەوە. بایەکی ساردی دەهات. پێش تاریکوڕوونی بەیانی قاسیدێك هات و ئەو هەواڵەی هێنا کە حەمەدۆك و دەستەکەی بۆ لای عەلیکۆی چوون.

بایرامۆغلی ڕووی دە عەلی کرد و گوتی:

ـ ئەمگوت عەلی؟ ئەمگوت دەزانم دەچێتە کوێ؟

عەلی بە نارەحەتی‌یەوە سەبرێك وەڵامی دایەوە:

ـ قسەکەت ڕاست بوو، بایرامۆغلی...

کاتێك وڵات ڕووناك بوو، مانگ لە لای ڕۆژاوایە بوو و شەبەقی برابوو. ئەو جار سەری عەلیکۆی دە ڕەنگێکی مەیلەوسوور دا وەك شووشەی دەترووسکایەوە و شەبەقێکی سپیی لە ڕەنگی بەفرەکەش گۆڕایی‌یەکانی ڕووناك کردبوو.

هێزەکە گەیشتە گوندێك و لە وێ وچانێکی دا. بایرامۆغلی بە پەلە پیاوی ناردنە لای هەموو قۆڵەکان و شێوەی هێرشەکەی بۆ ڕوون کردنەوە. هیچ‌کەس مافی ئەوەی نەبوو لەخۆوە بڕیار بدا و هەموو دەبوو دەستوور لە وی وەرگرن.

شەوی دواتر بایرامۆغلی هێزەکانی دابەش کرد و هێرشەکەی دەست پێ‌کرد. بۆخۆی و دەستەکەی لە لای خوارێوە، یاوەر فارووق و ژاندەرمەکانی لە لای چەپەوە و یاوەر عەلی گاور لە لای ڕاستەوە دە خڕێ ڕنووان دا چوونە پێش. بۆ ئەوەش کە ڕێگای پاشەکشە لە حەمەد و دەستەکەی ببەسرێ و ئەگەر کەسێکیان لەو ئالقەیە دەرچوو، دیسان دە داو کەوێتەوە، هێزەکانی یاوەر عالی و سەروان عیززەت نووریش لە دەوروپشت و سەرەوەتری وان دامەزران.

لە بوولێلی بەیانی دا مووسا زریان ئەشکەوتی شوێنی حەسانەوەی چەتەکانی دۆزی‌یەوە و بۆ بایرامۆغلیی دەستنیشان کرد. پلانی بایرامۆغلی ئەوە بوو کە هەتا لێیبیان نەچێتە ژووری، پێ‌نەزانن و ئەو کات هەموویان دە خەوێ دا بگرێ، دەستیان ببەستێ و بیانباتەوە شاری.

دەو دەمی دا تەیموور کێشکچی بوو و کاتێك ئەوان نێزیکتر بوونەوە، پێی‌زانی. بە پەلە چۆوە نێو ئەشکەوتەکەی. لە ژووری ئەشکەوتەکەی، لە دەوری ئاوری هاوڕێیانی دە نێو پێخەفە گەرمەکانیان دا نوستبوون:

ـ هەستن کوڕینە، گەمارۆ دراوین!

ـ کێ گەمارۆی داوین؟

ـ ژاندەرمە!

حەمەد لە جێیە دەرپەڕی‌یە دەرێ:

ـ نابێ ژاندەرمە بن. ژاندەرمە قەت ناوێرێ بێتە ئێرە. دەبێ بایرامۆغلی بێ.

دەستیان دا تفەنگان و لە نێو قەڵەشتە بەرد و پشت گابەردە گەورەکانی پێش دەرکی ئەشکەوتەکەی مەتەرێزیان گرت. لە لای خوارەوە ڕا یەکێك گوڕاندی:

ـ دەست مەبزێوە حەمەدۆك! لە هەموو لایەك ڕا گەمارۆ دراوی و دەرناچی! خۆت بە دەستەوە بدە!
ـ ئەها، ئەوە تۆی بایرامۆغلی؟
ـ ئەتۆ کێی؟
ـ ئەمن حەمەدۆکم.
ـ حەمەد چەکەکەت دانێ. خۆت بە دەستەوە نەدەی، لە دار دەدرێی!
ـ بۆخۆت ئەو کاتەی یاغی بووی، قەتت خۆ بە دەستەوە دا؟
بایرامۆغلیی کۆنە یاغی وەڵامی نەدایەوە. ساتێك وڵات کڕ و مات بوو و لە نەکاو بەر دەرکی ئەشکەوتەکەی وە بەر دەسرێژ درا. حەمەد و هاوڕێکانی سەنگەریان گرت. گوللە وەك بارانێ لە خوارەوە، سەرەوە، ڕاستە و چەپەوە بە سەریان دا دەڕژا.
ـ باش دە داو کەوتووین، مەلا فەرهاد...
ـ هەر دەرفەتێکمان دەست کەوێ دەردەچین. لە بیرتان بێ گوشار بخەنە سەر دەستەی بایرامۆغلی کە لە لای خوارەوە ترن. ئەوان هێندێك بکشێنینەوە، ژاندەرمە خۆیان پێڕاناگیرێ.
ـ کشاندنەوەی بایرامۆغلی زەحمەتە. ئەوی دە گەڵی‌یەتی وەك بلە کوێر، ڕەمۆ کەڵەباب، ڕۆستەمە کورد و دۆستەکەی خۆمان جەبار، هەمووی کۆنە یاغی و شەڕکەری بە ئەزموونن! پیاوەکانی سوڵتانۆغلی‌یە زەردەشی دە گەڵن. جا خۆ ئەگەر هەر ژاندەرمە بان، دەرچوونەکە زۆر زەحمەت نەبوو...
شەڕەکە توند بوو. هەر لە دەسرێژی هەوەڵێ دا سێ هاوڕێی حەمەدۆکی برینداربوون. لە هەموو لایەکی ڕا گوللە دەهات. وای لێ‌هاتبوو نەیاندەزانی چۆن خۆ حەشار دەن کە گوللە نەیانگرێتەوە و بەرەو کام لا تەقە بکەن.
ئێستا ئیدی دەمێك بوو ڕۆژ هەڵاتبوو و لە ئاسمانێ بەرز ببۆوە. ساوێکی پاك بوو و دار و ڕەوەزە سپیپۆشەکان لە بەر ڕووناکایی ڕۆژێ دەبریسکانەوە. نە مژێك، نە تەمێك و نە شتێك کە دیمەنی دۆڵەکەی لێڵ کا، هیچ شتێکی وا نەبوو. تەنانەت بەرد دە بن ئاوی ئاوهەڵدێرەکەی خوارەوەی دۆڵێ دا دیار بوون. ویزەی گوللان، کە وە بەردان دەکەوتن و بۆ شوێنی دی هەتلە دەبوون، زایەڵەی دەسرێژی تفەنگ و ڕەشاشی و بۆنی تیژی بارووتی، ئەو دۆڵەی وەك جەهەننەمێ لێ‌کردبوو.
هەتا دەهات شەڕ گەرمتر دەبوو و هەردووك لا بێ‌بەزەیی‌یانە لێکیان دەدا. حەمەد و هاوڕێیانی مەودای پشوودانیان لێ‌بڕابوو و بۆ ساتێکیش تەقەیان بێ‌دەنگ نەدەبوو. حەمەدۆك و مەلا فەرهاد خۆیان کێشایە نێو ئەشکەوتەکەی، ماوەیەکی کورت ڕاوێژیان کرد و دۆخەکەیان هەڵسەنگاند: نەیانتوانیبا ئاڵقەی گەمارۆکەی بشکێنن، ئیدی ڕێگای دەربازبوونیان نەبوو،

چونکە بەو شێوەیەی ئەوان ناچار بوون تەقە بکەن، هێندەی پێنەدەچوو فیشەکیشیان تەواو دەبوو و ئەو کات یان دەبوو خۆ بە دەستەوە بدەن، یان خۆ بکوژن.

حەمەد دوو کەس لە هاورێیانی لە بەر دەرگای ئەشکەوتێ و لە دوو شوێنی قایم دا هێشتەوە و ئەوانی دیکەی بانگ کردنە ژوورێ. ڕەشاشی ژاندەرمان بێوچان دەیگرماند و بارانی گوللەیان بە سەر دا دەباری.

حەمەد ڕووی دە هاوڕیکانی کرد و لە سەرەخۆ گوتی:

ــ هاوڕێیانم، دەرچوون لەو داوەی ئەمڕۆ بۆیان داناوینەوە، دژوارە و دوور نیە ئەمڕۆ، ڕۆژی کۆتایی ژیانی هەموومان بێ. ئەمڕۆ بایرامۆغلیمان لە بەرامبەر دایە. ئێمە بێجگە لە وەی هەوڵ بدەین ئالقەی گەمارۆکەیان بشکێنین، ڕێگایەکی دیکەمان لە پێش نیە، بەڵام ئەوە کارێکی زۆر پڕ مەترسی‌یە. ئەو ڕەشاشە بەردەوام گوللەمان بە سەر دا دەڕێژێ و ئەوانیە هیچمان لەو ئالقەیەی دەرنەچین. ئەو جار ئەنگێوەی چاکیشیان دەگەڵن. پێتان باشە چ بکەین؟ بڵێی باشتر بێ ڕاوەستین و چاوەڕوان بین تاریك دا بێ، جا هێرش بکەین؟ بەڵام ئەوانیە ئەو کاتیش دەرنەچین و هەر ناچار بین لێرە بمێنینەوە...

لای سەرەوەیان تاقی کردەوە، بەڵام دەسرێژێکی وا توندیان لێ‌کردن، هەر نەیانهێشت سەر هەڵێنن و بە پەلە گەڕانەوە نێو ئەشکەوتێ.

دواتریش چەندین جار و هەر جارەی لە لایەکەوە هەوڵیان دا ڕێگایەك بکەنەوە، بەڵام بێ‌سوود بوو. دەوریان دەتگوت بە دیوارێکی ئاگرین گیراوە.

یاوەر فارۆق کە دیار بوو ئەو بارودۆخەی زۆر بە کەیفی‌یە، هەرای کرد:

ــ حەمەدۆك، لە خۆڕا خۆت ماندوو دەکەی. دڵنیا بە خۆت بە دەستەوە بدەی، یان نا، تازە لە دستمان دەرناچی و کارت تەواوە!

بایرامۆغلی ئەو تەشەرەی یاوەر فارۆقی زۆر پێناخۆش بوو و لە داخانی سوور هەڵگەڕا، بەڵام ئیدی هیچی پێنەدەکرا. لە دڵی خۆی دا گوتی: ناخ ، حەمەد هەر ئەوەندە بە قسەم بکا و خۆی بە دەستەوە بدا، دەسبەجێ باڵی بە سەر دەکێشم و لە گوللەی ژاندەرمان دەیپارێزم...

بەرە بەرە ئالقەی گەمارۆ لە دەوری حەمەد و هاورێیانی تەنگتر بۆوە، ڕەشاشەکە جێگای گوێزتەوە، هاتە پێشتر و لە ئەشکەوتەکەی نێزیکتر بۆوە. دۆخەکە هەر بەو بوارەی دا چووبا پێش، ئیدی کەس دە ئەشکەوتێ دا هەڵی‌نەدەکرد.

بایرامۆغلی بۆخۆی ئەو کاتەی یاغی بوو، زۆر جاران دە گەمارۆ کەوتبوو و هەموو جاریش لەو ڕێگایەوە دەرباز ببوو، کە ڕاست لەو قۆڵەی دابوو کە فەرماندەری شەڕەکەی لێ‌بوو. ئێستا

بیری دەکردەوە کە ئەگەر ئێستا لە جێی حەمەدۆکی بوایە، چیی دەکرد. ڕێگای هەرە باش ئەوە بوو کە بە پەنا گابەردە کانی پێش زارکی ئەشکەوتێ دا خزیبان و خۆیان دە چۆمەکەی هاوێشتبایە کە دە قووڵایی دۆڵی دا بوو. لەوانە بوو ئەگەر لە سەرمان ڕەق نەبوویان، دەرباز بن، بەڵام ئاخر دەروبەری چۆمەکەش هەر لە ژێر چاوەدێری دا بوو...

ئێوارە داهات و تا دەرەنگتر دەبوو، تەقە لە لای حەمەد و هاوڕێیانی‌یەوە کەمتر دەبۆوە. بە ڕوونی دیار بوو فیشەکیان زۆر کەم پێ‌ماون و ئەو جار دەربازبوون کەمتر ڕێی تێ‌دەچوو.

بایرامۆغلی هاواری کرد:

ـ حەمەدۆك، کوڕە ئازاکەم، حەمەد، ڕۆڵە گیان، زۆرم بیر کردۆتەوە و ناتوانم دەربازت کەم. ڕۆڵە خۆت بە دەستەوە بدە. دەستم بە سینگی‌یەوە مەنێ و داواکەم قبووڵ بکە! ڕۆڵە نامەوێ بە کوژراویت ببینم! خۆت بە دەستەوە بدە، بەڵکوو بیرێکمان کردەوە و دەروویەکمان دۆزی‌یەوە...

ـ پیرە سەگ! ئەوە منم، مەلا فەرهاد! چی دیکە هاوار مەکە! خۆبەدەستەوەدانی چی؟ بش‌کوژرێین، شتی وا ناکەین! ئەتۆ بووی بە سەگێکی خوێڕی و پاسی ئاغا و بەگان دەکەی! خۆت کردۆتە دوژمنی خۆت! دڵنیا بە خوداش ئاوات لێ‌خۆش نابێ و هەم ئەم دنیایە و هەم دنیای دیکەشت لێ‌دەبێ بە جەهەننەم، دە ئاوری دا دەسووتێی و بە سزای خۆت دەگەی!

ـ حەمەدۆکیش وەڵامی دایەوە، بەڵام بە ڕێزەوە پەیامی خۆی گەیاند:

ـ بایرامۆغلی، خۆبەدەستەوە دان دە سروشتی ئێمە و یاسای ئێمە دا نیە. بۆخۆشت دەزانی ئێمە دەست نادەین و ئەوەش چاك دەزانین ئەتۆ نەبوایەی، ئێمە گەمارۆ نەدەدراین! پێم‌خۆشە ئەوەشت بێتەوە بیر کە ئەگەر ئێمە بکوژرێین پەشیمان دەبی‌یەوە و هەتا هەی ئازار دەکێشی!

مەلا فەرهاد لە تووڕەیی‌یان هەموو گیانی دەلەرزی. قسەکەی بە حەمەدی بڕی و گوڕاندی:

ـ بایرامۆغلی! بایرامۆغلی! دەك زمانم بە بڕین چێ کە ئاوات ناو دێنم، چونکە ئەتۆ کوڕی بایرامی بابی خۆت نی، ئەتۆ بیژووی! سبەینێ کە تەرمی ئێمە باری کەران دەکەن، دەیانبەنەوە نێو شاری و بە نێو شاری دا دەیانگێڕن، دەرپێی ژنەکەت بە دارێکی‌یەوەکە، بی‌کە ئاڵای سەرکەوتن و سەمای پێوە بکە! گرینگ نیە ئێمە دەمرین. پیاو هەر جارێك دەمرێ، بەڵام دوای ئێمە ئەتۆ هەر ڕۆژەی جارێك دەمرێ و زیندوو دەبی‌یەوە!

ژاندەرمەکان بێ ئەوەی سەرنج بدەنە ئەو شەڕەقسەیە، تەقەیان ڕاگرتبوو. هێندێکیان لە سەنگەرەکەیان دا نانیان دەخوارد و هێندێکیشیان قامك لە سەر پەلەپیتکە ئامادەی دەسرێژکردنەوە بوون. هەر چرپەیەك هاتبا، ڕەشاشەکە دەی‌قڕاند.

ئەویٚ شەویٚ هەتا بەیانی بایرامۆغڵی چاوی لە سەریەك دانەنان. کە بیری لەوە دەکردەوە حەمەد هەموو لایەکی لیٚگیراوە و دەرەتانی دەرچوونی نیە، کزەی لە هەناوی هەڵدەستا. هەتابەیانی هەر بیری کردەوە و کاتیٚك ولاٚت ڕووناك بوو، هەستا سەر پیٚیان و لە حالیٚك دا بزەیەکی لە سەر لیٚوان بوو، ڕووی دە ڕۆستەمەکوردی کرد و گوتی:

ــ ڕۆستەمە کورد، ئەمن و تۆ لەمیٚژە هاوڕیٚی نیٚزیك و تەنانەت برا و هاوپشتی یەکترین و دڵ و گیانمان تیٚکەڵ بووە، وا نیە؟

ــ بەڵیٚ وایە!

ــ باشە، ئیٚستا لەو بارودۆخە دا ڕیٚگامان لیٚك جیا دەبیٚتەوە. ئەمن دەچمە گەڵ حەمەدۆکی...

ــ بایرامۆغڵی، حەمەد لەو داوەی دەرناچیٚ و ئەتۆشی دە گەڵ دەکوژریٚی...

ــ دەزانم ڕۆستەم!

عەلی‌یە شەل هەستا و گوتی:

ــبایرامۆغڵی، منیش لە گەڵتم!

نووری گوڵەش هەستا:

ــ منیش!

ڕەمۆ کەڵەبابیش هەستا:

ــ منیش!

ئەو جار جەبارە دریٚژیش هەستا:

ــ منیش بایرامۆغڵی!

بایرامۆغڵی قۆڵی جەباری گرت:

ــ ئەتۆ نابیٚ لە گەڵ ئیٚمە بیٚی، ئەتۆ خۆت کردە حەمەد و هیٚرشت کردە سەر ماڵی عارف سایم بەگی، هەر بە ناوی ئەویشەوە کوٚخاکەیت کوشت و سەعاتەکەی مستەفا کەماڵیشت هیٚنا... پیٚم بڵیٚ بزانم ئەو سەعاتەت چ لیٚکرد؟

ــ پیٚمە...

جەبار دەستی دە باغەڵی ڕاکرد، سەعاتەکەی لە کیسەیەکی دەریٚنا و دایە دەست بایرامۆغڵی. ئەویش هیٚندیٚکی تیٚوە ڕاما، بە دەستی هەم سەعاتەکە و هەم زنجیرە زیٚڕە نایابەکەی هەڵتەکاند ــ وەك ئەوەی هەڵی‌سەنگیٚنیٚ بزانیٚ چەندە قورسە ــ و پاشان زنجیرەکەی بە یەخەی کەواکەیەوە هەڵواسی و سەعاتەکەشی دە باغەڵی جلیقەکەی نا و گوتی:

ـ هەرچەندی فیشەکی لێرە هەیە، کۆی کەنەوە و بیانهێنن!

ڕەمۆ کەڵبباب، عەلی‌یە شەل و نووری گوڵە فیشەکەکانیان دە کیسان کرد و هەڵیانگرتن. بایرامۆغڵی دەسرۆکمیەکی سپیی بە سەری لوولەی تفەنگێوە کرد، هەستایە سەر پێ و سێ جاران توند هەرای کرد:

ـ حەمەدۆك ئەوە هاتم! ئەتۆ خۆت تەسلیمی من دەکەی و ئیدی کەس کاری پێت نیە. ئەوە هاتم! هەر بۆخۆم دێم!

فەرماندەکان گوێیان لەو هەرایەی بوو: باشە، ئەگەر وا بێ، ئەوە حەمەدۆك بێ شەڕ و خوێنڕشتنی زیاتر خۆی بە دەستەوە دا و ئێستا بایرامۆغڵی چەکی دەکا و بە خۆی و دەستەکەیەوە دەیهێنێتە خوارێ.

بایرامۆغڵی لە گەڵ عەلی‌یە شەل و ڕەمۆ و نووری بە قەراغ دۆڵێ و بە کەلێنە ڕەوەزان دا وەسەر کەوتن و خۆیان گەیاندە سەرێ. تەقە بڕابۆوە و وڵات بێ‌دەنگ بوو. بایرامۆغڵی گەیشتە پێش زارکی ئەشکەوتەکەی، ئەوێش جۆرێك هەڵکەوتبوو لە خوارێ و لە تەنیشتانەوە دیار نەبوو. حەمەدۆك غاری دا دەرێ و بە پیر بایرامۆغڵی‌یەوە هات. کە گەیشتنە یەکتری، بە هەردووك دەستان دەستی بایرامۆغڵی گرت، ماچی کرد و لە سەر سەری دانا. بایرامۆغڵیش باوەشی بە حەمەدی دا کرد و ماچی کرد. هاوڕێیانی حەمەدیش یەکە بە یەکە هاتن و دەستی بایرامۆغڵی‌یان ماچ کرد. پاشان هەموویان چوونە نێو ئەشکەوتەکەی و بایرامۆغڵی دەسبەجێ لە گەڵیان کۆبۆوە و ڕاوێژی دە گەڵ کردن. لەو کاتە دا ڕوخساری گرژ ببوو و توند ولێبڕاوانە قسەی دەکرد:

ـ باش گوێم لێبگرن، ئێستا ئێمە ڕادەوەستین هەتا ئەوان تەقە دەست پێدەکەنەوە. ئاگادار بن، هەرچی ئەمن دەیڵێم، دەبێ بێ سێ‌ودوو بە قسەم بکەن، کاتی پرسیار و دەمەتەقەش نیە و هەر کەس بە قسەم نەکا دەیکوژم. ئەو دۆڵەی خوارێتان دیوە؟ دەمەچۆمەکەی دەڵێم! ئەوێ نەبێ، هیچ‌کوێ ئاواڵە نیە. ئەو ئێوارەی هەمووتان دەبێ بە ئەسپایی بڕۆنە خوار و هەتا دەگەنە گۆڕاییەکەی خوارێ، کە لێرەوە نابینرێ، هەر بە خڕێ دا بڕۆن و قەراغ چۆمی بەرنەدەن. بەڵام دەبێ زۆر بە وشیاری بڕۆن، نەوەك ژاندەرمە لە خوارەوەتریش هەبن. لەوانەیە ئەو دەستە حەمەدانەی خۆشتان بە یارمەتیی ئێوەوە هاتبن و کە واوەتر چوون، تووشیان بن. ئەمن هەتا ئێوە تێدەپەڕن و لە مەترسی ڕزگار دەبن، بەردەوام تەقە دەکەم و سەرقاڵیان دەکەم. سبەینێ بەیانیش دەچمەوە نێویان و سوێندیان بۆ دەخۆم کە حەمەد بە دیلی گرتبووم...

هیچ‌کەس قسەی دە قسەی دا نەکردەوە.

فەرماندەرە ژاندەرمەکان لە هەموو قۆڵەکان تەقەیان ڕاگرتبوو و پێیان سەیر بوو کە چۆن بوو هیچ هەواڵێك لە بایرامۆغڵی نەبۆوە و ئەو لە ئەشکەوتێ نەهاتەوە دەرێ. دوودڵ بوون و

نەیاندەزانی چ بکەن. هەتا ئێوارەدرەنگانێك هەروا دەستیان ڕاگرت وتەقەیان نەکرد، ئەوجار گومانیان لەوە دا نەما کە بایرامۆغلی بە بارمتە گیراوە و حەمەد فێڵی لێ کردوە. هەر بۆیە بە توندی شەڕەکەیان دەست پێکردەوە و بە ڕەشاش و چەکەکانی دیکەیان ئەشکەوتەکەیان وەبەر دەسڕێژ دایەوە.

نێو ئەشکەوتەکە هێندێك بەردی گەورە و کۆلکەداری ئەستووری لێ بوون. بایرامۆغلی دەستووری دا بەرد و کۆلکە دارەکانیان بەرەو زارکی ئەشکەوتەکەی پاڵ نا و سەنگەری دەرکی ئەشکەوتەکەیان قایمتر کرد. پاشان گوتی:

ـ وەڵامی تەقەکەیان مەدەنەوە.

مەلا فەرهاد گوتی:

ـ ئاخر دێنە پێشتر و ئاڵقەی گەمارۆکە بچووکتر دەکەنەوە.

ـ گرینگ نیە، دەزانم ناوێرن زۆر بێنە پێش.

سەرەنجام ڕۆژ ئاوا بوو. لەو کاتە دا کە خۆر خەریك بوو لە ئاسۆ دا خۆی دەشاردەوە، سەری بەفرەکەی وەك یاقووتی سووری دەنواند. ئەو کاتی بایرامۆغلی دە یاغی‌یەکان ڕاخوڕی:

ـ ئەو جار زۆر بە توندی و بە هەمموو لایەکی دا تەقەی بکەن.

هەمموو بەیەکەوە دەسڕێژیان کرد. دەتگوت ڕەشاشیان لە زارکی ئەشکەوتێ دابەستوون. ژاندەرمە وایان سەرلێشێوا، پێیان وا بوو ئەوە نەك دەستەیەك یاغی، بەڵکوو سەدان کەس بەرەوڕووی وان تەقە دەکەن.

ـ بەسە چی‌دی تەقە مەکەن...

ـ ئێستا کاتی ئەوەیە بڕۆن... یاڵڵا زووبن بەشی زۆری فیشەکەکانتان بۆ من بەجێ‌هێڵن و بەو شوێنەی دا کە بۆم دیاری کردن بڕۆن... دەی زوو بن یاڵڵا...

تازە تاریکایی دەهات بە سەر وڵاتی بکشێ. هەم ئاسمان و هەم بەفرەکە پێش ئەوەی بە تەواوی دە تاریکی دا ون بن، ڕەنگێکی بنەوشی‌یان بە خۆوە گرت، ئاسۆش تەسکە تەمێکی شین، نارنجی و سووری بە سەر کشا و ئەویش زۆری نەکێشا ون بوو و ئیدی تاریکایی هەمموو شوێنێکی داگرت.

بایرامۆغلی دووپاتی کردەوە:

ـ دە بڕۆن دەی ڕۆڵەکانم، خودا پشت و پەناتان بێ!

حەمەد لە بەرامبەر بایرامۆغلی ڕاوەستا و هەردووکیان دە یەکتری ڕامان. چاوی بایرامۆغلیی کۆنە یاغیی بە ئەزموون گەش ببوونەوە و شادی و ئاسوودەیی‌یان پێوە دیار بوو. لەو کاتە دا لێوەکانی

بزووتن، زەردەخەندەیەکی هاتێ و ڕوخساری زیاتر کرایەوە. حەمەد بە هەردووك دەستان دەستی ڕاستی بایرامۆغڵی گرت، گوشی، سێ جاران بە ڕێز و خۆشەویستی‌یەوە ماچی کرد و لە سەر سەری دانا. مەلا فەرهادیش هاتە پێشی و دەیەویست ڕاست وەك حەمەدی بکا، بەڵام بایرامۆغڵی دەستی کێشایە دواوە و گوتی:" نا مامۆستا، نابێ" و دە باوەشی گرت. پاشان حەمەد و هاوڕێیانی یەکە یەکە هاتنە دەر، بە پەنا بەردان دا خزین و خۆیان دە خڕێ هاویشت. ژاندەرمەکان هەستیان بە جموجوولێك کرد، بەڵام نەیانزانی چ خەریکە ڕوو دەدا، زۆرتر خۆشحاڵ بوون و پێیانوا بوو بایرامۆغڵی چەتەکانی چەك کردوە و دەیانهێنێتە خوارێ. هەر بۆیە بەشێکی زۆریان لە سەنگەرەکانیان هاتبوونە دەری و هەراو هوریایان دەکرد. لە نەکاو دەسرێژیان لێ‌کرا و گوللەیان بە سەر دا بارین. زۆران بریندار بوون و هەموویان بە پەلە خۆیان دە سەنگەران هاویشتەوە، بەڵام زەندەقیان چووبوو، ڕیزەکانیان شێوابوو و ناڵۆزی‌یەکی سەیریان لە نێو پێکهاتبوو. بایرامۆغڵی بێ‌وچان تەقەی دەکرد، فیشەکیشی بە خەسار نەدەدا و هەر دەسرێژێکی دەی‌کرد، یەك ــ دووێکی لێ دەخستن.

ئیدی ئەو جار ژاندەرمەش وە دەست هاتنەوە و شەڕێکی گەرم هەتا بەیانی درێژەی هەبوو. تەقەکە ئەوەندە غالب بوو، ژاندەرمە دەنگی تفەنگی دەستەکانی خۆیان و لایەنی بەرامبەریان لێ‌تێکەڵ دەبوو و پێیان وا بوو لانی کەم کۆمەڵێك تفەنگچی لەو بەری ڕا تەقەیان لێ‌دەکەن. حەمەد و هاوڕێیانیشی لە مێژ بوو دەرباز ببوون. سەرەنجام کاتێك ڕۆژ وەدەرکەوت، وەکیل باشی عاسم چووە لای یاوەر فاروقی و گوتی:

ــ یاوەرم، ئەتۆ زانیوتە لە دوێنێ ئێوارێوە ئێمە بە هەموو ژاندەرمەکانمانەوە لە گەڵ یەك تاقەکەسی شەڕ دەکەین؟

ــ ڕاستی‌یەکەی ئەمنیش وردە وردە گومانم لێ‌پەیدا ببوو، بەڵام ئاخر تەقەکە لەو لاوە جۆرێك توند و بێ‌پسانەوەیە، وەك سەد کەس تەقەی بکەن وایە. ئەگەر وا بێ، بڵێی کێ بێ لە وێ مابێتەوە؟

ــ بایرامۆغڵی نەبێ، کەسی دیکە نیە. بێ‌گومان کاتێك هەستی کردوە حەمەد ڕێگای دەربازبوونی بۆ نەماوەتەوە...

ــ سەیرە وەکیل باشی! ئەمن پێموابوو حەمەدی ناخۆش دەوێ. بۆخۆی وای دەگوت و دەی‌گوت لێی‌بێزارم... دەیەویست بە زیندوویی بی‌گرێ! باوەڕ ناکەم ئەو بێ ئاوا فریوی دابین...

ــ یاوەرم، ئەو بێ، یان ئەو نەبێ، جیاوازی‌یەکی زۆری نیە. چونکە هەرچۆنێك بێ، ئێمە ناچارین لە وێی بێنینەخوارێ، جا بە گرتن، یان بە کوشتن! دەبێ پەلەش بکەین. زوو وەخۆ نەکەوین، تێ‌دا دەچین! بێ‌گومان حەمەدۆك ئێستا دەستە حەمەدەکانی دیکەی کۆ کردوونەوە و

هەر بینا بە هێزێکی حەساوەوە بە سەری دادابن. ئەو کاتی ئێمە دەکەوینە گەمارۆ، دەربازبوونمان دژوار دەبێ و نابڕوومان دەچێ.

ـ ڕاست دەکەی وایە، بەڵام هەتا بێدەنگی دەکەین و دەیهێنینە خوارێ، شڕمان دەکا.

ـ چارەیەکی دیکەمان نیە، هەر دەبێ وا بکەین. حەمەد بگەڕێتەوە سەرمان، یەکمان لێنایەڵێ. ڕقی کوشتنی ژنەکەشی هەر لێمانە. وەڵلاهی پێش کوشتنێ، پەتێکمان دە ملی دەکا، بە پێخواسی و بە ڕووتوقووتی، دەو بەفرەی دا ئەوسەرەوسەری تووڕووسیمان پێدەکا.

سێ فەرماندەرەکەی دیکەشیان بانگ کردن و ڕاوێژیان لە گەڵ کردن. هەموویان هاتبوونە سەر ئەو باوەڕە کە ئەوەی لە ئەشکەوتێ دا مابۆوە و تەقەی دەکرد، هەر یەك کەس بوو. یاوەر عەلی گاور دڵنیا بوو کە ئەو کەسەی ماوەتەوە، حەمەدۆکە:

ـ ئەوە بێجگە لە حەمەدۆکی کەسی دیکە نیە و هەر بۆخۆشم دەچم و بە زیندوویی، یان بە مردوویی دەیهێنمە خوارێ و تۆڵەی ئەو سووکایەتی‌یەی لێدەکەمەوە، کە پێی‌کردم!

هەر بۆیە فەرمانی بە گورهانەکەی خۆی دا کە بە ڕەشاش و چەکی دیکە بە توندی تەقە دەست پێبکەنەوە، بەڵام هەرچەندی هێرشەکەیان توندتر کرد و گوللەیان زیاتر باراند، بۆیان بێدەنگ نەکرا. سەیر بوو، ئەو کابرایە ئەوەندە تەردەست بوو ڕەشاشەکەش دەروەستی نەدەهات.

حەمەد و هاوڕێیانی زۆر لە شوێنی تێکهەڵچوونەکە دوور نەبوونەوە، کە تووشی چەند دەستە حەمەدان بوون، هەموو حەوت حەوت، جلوبەرگی وەك یەك، تفەنگی وەك یەك و ڕەخت و فیشەکدانی وەك یەك. حەمەد بە دیتنی وان زۆر خۆشحاڵ بوو و دە بیری خۆی دا گوتی ڕەنگە بە یارمەتیی ئەو لاوانە بتوانین بایرامۆغلی ڕزگار بکەین...

ـ هاوڕێیان، هەر ئێستا دەگەڕێینەوە سەرێ. ئەگەر پێشنیوەڕۆیە خۆمان بگەیەنینەوە ئەوێ، دەتوانین ژاندەرمە و بەکرێگیراوانی بەگ و ئاغاکان گەمارۆ بدەین و گیانی بایرامۆغلی ڕزگار کەین...

مەلا فەرهادیش گوتی:

ـ بەڵێ، با پەلەی بکەین! دەبێ بە هانایەوە بچین.

ڕۆستەمە کورد گوتی:

ـ ئەمن بایرامۆغلی دەناسم! تازە کەس بۆی ڕزگار ناکرێ! دەزانم دەست نادا و دەکوژرێ...

حەمەدۆك گوتی:

ـ هەرچۆنێك بێ هەر دەچین، یاڵلا با بڕۆین!

بەرەو سەر هەڵگەڕانەوە. هێندە گورجوگۆڵ بوون، کەس نەیدەتوانی بڵێ ئەوانە کە هێندێك بریندارێشیان دە گەڵ بوون، هەر ئەو کۆمەڵە یاغی‌یەن کە تازە لە ئاڵقەی گەمارۆیەکی سەخت دەرچوون و لە دوێنێشەوە هیچیان نەخواردوە.

شەڕەکە تا ئێوارێ هەر هەبوو. بارانی گوللە و تەقینەوەی نارنجۆکان دەوروبەری ئەشکەوتەکەی وەك جەهەننەمێ لێ‌کردبوو. ئیدی ئەوە هەر بایرامۆغلی بوو دەری دەبرد، دەنا بەو حاڵەی بەربەرەکانی نەدەکرا. ئەو کۆلکە دارە سەخت و ئەستوورەی کردبوویە سەنگەر، پڕ ببوو لە گوللە. ئارەقە بە نێوچاوانی دا دەهاتە خوار و دەچوو دە چاوانی‌یەوە، تەنانەت دەرفەتی وەی نەبوو چاویشی بگوشێ. بە دوو ــ سێ تفەنگان تەقەی دەکرد، یەکیان گەرم دادەهات، ڕۆدەبووە ئەوی دی و وچانی نەدەدا. لە نەکاو بێ‌ئەوەی بیر بکاتەوە، هەستایە سەر پێ و بە سەرسوڕمانەوە لە دەوروبەری خۆی ڕوانی. دەتگوت نازانێ لە کوێیە. هەر لەو ساتە دا چاوی بە یاوەر عەلی گاوری کەوت کە کتوپڕ لە پەنا بەردێکی پێش ئەشکەوتێ قوت بۆوە، بە خێرایی لوولەی تفەنگێی دە سینگی بایرامۆغلی کرد و پێی‌دا هێنا. گوللەکە ڕاست وە سەر دڵی کەوت و لە نێو شانی هاتە دەرێ. بایرامۆغلیش پێش ئەوەی بکەوێتە عەرزی تەقەی لێ‌کردەوە و ئەوەندەی دی کە یاوەر عەلی سەرەنگەرێ بوو و بەربۆوە، ئیدی بۆخۆشی کەوت. سەری بە سەر کۆلکەدارەکەی دا شۆڕ بۆوە و چاوی پڕ بوون لە خوێن.

لەو لای وەکیل‌باشی عاسم هاواری لێ‌بڵێند بوو:

ــ نەمگوت! ئەوە یاوەر عەلی ئەنگوا. خوا بکا نەمرێ.

ئیدی تەقە نەمابوو. یاوەر فاڕوق و وەکیل باشی ڕایان کردە سەر یاوەر عەلی. گوللەکە وە شانی کەوتبوو. لەولاتر، لە زارکی ئەشکەوتێ، بایرامۆغلی بە سەر کۆلکەدارەکەیەوە تەواو ببوو و هەموو گیانی دە خوێنێ دا شەلاڵ بوو. وەکیل باشی عاسم چووە سەری، داهاتەوە، بە وردی چاوێکی لێ‌کرد و گوتی:

ــ نەماوە. حەیفی کرد، پیاوێکی زۆر ئازا بوو. چاوەکانی هەر وا ئاواڵەن!

بە ئارامی دەستی بە پیلووی چاوەکانی بایرامۆغلی دا هێنا و لێکی‌نان.

لەو کاتە دا دەستەی حەمەدی گەیشتنەوە دەوروبەری وان و تەقە دەستی پێ‌کردەوە.

یاوەر فاڕوق گوتی:

ــ با هەرچی زووتر لێرە دوور کەوینەوە، بانگ کەن یەکێك بێ، برینی ئەو بریندارەی ببەستێ.

برینپێچێك بە پەلە هات و برینی یاوەر عەلیی دەرمان کرد و پێچای. یاوەر عەلی گوتی:

ــ ئەگەر بایرامۆغلی ویستبای، دەی‌توانی ئەمن بکوژێ. ئەمن بە قەستی کوشتنێم پێوەنا، بەڵام ئەو وای نەکرد، بۆ؟ خۆ چاوم لێ‌بوو بە زاری پڕ خوێنەوە تێی‌هەڵڕوانیم، ڕووبەڕو سێرەی

لیٚگرتم و چاویشمان تێکنالقان. هەر ئەو کاتی زانیم سێرەی لە شانم گرتووە و لە سەر دڵم نا. باشە بۆ پێی‌خۆش نەبوو بمکوژێ؟

ــ چونکە ئەو بێجگە لە نەبی گوڵمەزۆغلی، قەت بە قەستی کوشتنێ تفەنگی بە کەسەوە نەناوە!

یاوەر عەلی گوتی:

ــ ڕاست وەك حەمەدۆکی.

یاوەر فارۆق وەڵامی دایەوە:

ــ ئەرێوەڵڵا ڕاست وەك حەمەدۆکی!

ــ باشە ئێستا چۆن لە دەست حەمەدی خۆمان ڕزگار کەین؟

یاوەر عەلی‌گوتی:

ــ هەوا خەریکە دەگۆڕێ، سەیر کە وڵات تاریك دەبێ و لە بارودۆخێکی ئاوا دا زەحمەتە دەستی حەمەدیمان وێ‌ڕابگا.

ــ ڕاست دەکەی، هەتا هەواکەش ناخۆشتر بێ، بە سوودی ئێمەیە.

لە نەکاو هەڵی‌کردە باوبۆرانێکی هەر مەپرسە. بەفری بە باوە دێنا و بە سەروچاوی پیاوی دادەدا. پیاو دوو شەقاو واوەتری خۆی نەدەدی و سەرماکەش حەشری دەکرد. وڵات تاریك بوو و ئیدی تەقەش بڕایەوە. یاوەر فارۆق گوتی:

ــ وا بزانم بە ساغی دەردەچین، دیارە ئەگەر لە سەرمان ڕەق نەبین.

وەکیل باشی گوتی:

ــ دەبێ هێزەکانمان لە نێو ئەشکەوتەکان کۆ کەینەوە، دەنا لە سەرمان دەمرن.

ــ ئەدی ئەگەر حەمەدۆك هەڵی‌کوتایە سەر ئەشکەوتەکانیش؟

ــ پێموانیە حەمەدیش بەو سەرمایەی شەڕەکە درێژە بدا و لەو دەوروبەرەی بمێنێتەوە. تەنانەت ئەگەر مەترسیی ئەویشمان هەر لە سەر بێ، بێجگە ئەوەی ڕێگایەکی دیکەمان نیە. ئەمن پێموایە حەمەد دەکشێتەوە و تا سێ ڕۆژی دی دەچێتە شاخی ئاخچەی.

بەفر و بۆرانەکە هەر دەهات و توندتر دەبوو. کەس لە دەرێ ژیانی بۆ نەدەکرا. ژاندەرمەکان بریندارەکانیان هێنانە نێو ئەشکەوتێ، ئاوردوویان کۆ کردەوە، بە چەند جێ ئاوریان کردوە و لە دەوری ئاوری بۆی کەوتن. تەرمی لە خوێن دا شەڵاڵی بایرامۆغلێش هەر لە وێ بوو، لە زارکی ئەشکەوتێ، سەری بە سەر کۆڵکە دارەکەی دا خوار ببۆوە، لاقی نوشتابوونەوە، چۆکی وەبەر زگی دابوو و بە ڕوونی نیشانەی ئارامی و لێبڕاویی بە ڕوخساری‌یەوە دیار بوو.

## (٢٢)

کاتێك هەواڵی کوژرانی بایرامۆغلی بە عارف سایم بەگی گەیشت، ئەو تازە لە ئەنکەرەی گەڕابۆوە. ماشێنەکەی بە هۆی قوڕوزەلەقی ڕێگاکانەوە بە قوڕێ سواغ درابوو و بۆخۆشی شەکەت و ماندوو بوو. کاتێك بەسەرهاتەکەیان بۆ گێڕایەوە، گوتی:

ـ سوور دەمزانی ئەو ناجسنە هیچوپووچە وا دەکا!

هەر چەند ڕواڵەتی وای نیشان نەدەدا، بەڵام لە ڕاستی دا هەواڵەکەی ئەوەندە پێخۆش بوو کە ماندوویەتیی ڕێگایەی لە لەشی دەرچوو. هەستی کرد ئەرکێکی لە سەر شانی لاچووە، چونکە ئەو کەسەی بە ناچاری هێنابوویە یارمەتیی خۆی، نەمابوو و هەر بۆیەش لە دڵی خۆی دا بە شیوەیەك منەتباری حەمەدی بوو.

سفرەیان دانابوو و گەورەکانی شاری لە ژوورەکەی تەنیشتێ چاوەڕوانی وی بوون، ئەویش دەیزانی، بەڵام سەرەڕای ئەوە هەر لە ژوورەکەی دا دەهات و دەچوو، چاوی بەردابوونەوە و دە بیرەوە ڕۆچووبوو.

سەرەنجام خەلیل بەگی گەورە بە پارێزەوە دەرگای کردەوە و چوو بۆ لای:

ـ فەرمووبووت یاوەر فارۆق بێتە لات. ئێستا ئەو هاتوە و چاوەڕوانی ئەمری جەنابتە.

ـ پێیبڵێ بێتە ژوورێ!

یاوەر فارۆقیان بانگ کرد. ئەویش کاتێك هاتە ژوورێ لاقی جووت کردن، سێ جاران لێکی دان و بەو شێوەیە سڵاوی سەربازیی کرد، بەڵام جەنابی نوێنەر تەنیا خێسمەیەکی لێکرد و هەر وا درێژەی بە ڕاوێچکەکردنەکەی دا. تاوێکی باش هەر وا هات و چوو و پاشان چوو لە سەر مۆبلە تاکە تایبەتیەکەی خۆی دانیشت و گوتی:

ـ وەرە یاوەر، لە تەنیشتم دانیشە و هەموو بەسەرهاتەکەم بۆ بگێڕەوە.

یاوەر لە سەر مۆبلێکی ڕووبەڕووی وی دانیشت، دەستەکانی بە نیشانەی ڕێزگرتن ـ ڕاست وەك دێهاتی‌یەکان ـ لە سەر ڕانەکانی دانان و دەستی بە گێڕانەوەی ڕووداوەکان کرد. چۆن لە گەڵ بایرامۆغلی بە دوای حەمەدی دا گەڕابوون، هەڵسوکەوتی بایرامۆغلی چۆن بوو و چی‌یان کردبوو، هەمووی گێڕایەوە. جارجار عارف سایم بەگ قسەکەی دەبڕی، هێندێك پرسیاری دەکردن، داوای ڕوونکردنەوەی دەکرد، یاوەریش بۆی ڕوون دەکردەوە و جاری وابوو ناچار دەبوو لە سەرڕا ڕووداوەکە بگێڕێتەوە. هەردووکیان وا سەرقاڵی قسەکردن بوون، کە هەم خەڵکەکەی دیکە و هەم برسی‌یەتی و خوانی ئامادەکراویان لە بیر چووبۆوە. یاوەر قسەی دەکرد و عارف سایم بەگ گوێی لێ‌دەگرت. جارجار نیشانەی سەرسوڕمانی لە ڕوخسار دا بەدی دەکرا و هێندێك جاریش تووڕە دەبوو. سەرنجی دەدا وشە بە وشەی بەسەرهاتەکە و هیچی وە پاش نەدەدا. لە ئاخری دا گوتی:

ـ بایرامۆغلی لەوە زیاتری بۆ نەدەکرا. هەر ئەو چەشنە مردنەش لە گەڵ ناووناوبانگی وی دەهاتەوە. بە ڕاستی پیاوێکی ئازا بوو و حەیف بوو جۆرێکی دیکە بمرێ!

یاوەر خەریك بوو باسی وەی بۆ بکا کە هەموو پیاوەکانی تووڕووسی ناوی خۆیان ناوە حەمەد، بەڵام عارف سایم بەگ زوو قسەکەی پی‌بڕی و گوتی:

ـ بۆخۆم دەزانم، پێویست ناکا باسی بکەی!

ئەو جار یاوەر مەسەلەی خانەقای چلچاو و دایە سوڵتانی هێنایە گۆڕێ، بەڵام عارف سایم دەرفەتی پی‌نەدا و گوتی:

ـ دەزانم، دەزانم، ئەوەش دەزانم!

ـ بەڵام ئەمن هەتا هەم منەتبارت دەبم ئەگەر تەنیا دوو دەقیقەم ئیزن بدەی سەبارەت بەو مەسەلەیە هێندێك شتت عەرز بکەم: دایە سوڵتان وای لە بایرامۆغلی کرد خەیانەتمان پی‌بکا. بایرامۆغلی سەردانی خانەقاکەی کرد و هەر دەسبەجێ دوای چاوپێکەوتنی لە گەڵ دایە سوڵتانی بڕیاری دا لای حەمەدی بگرێ و پشت دە ئێمە کا.

ـ وانیە یاوەر. بایرامۆغلی دەبوو ڕابردوو، ناو و ڕێزی خۆی ڕزگار کا. هەر ئەو ڕۆژەی لە شاری وەدەر کەوت، دەی‌زانی خەڵك چیی پی‌دەڵێن و چ چارەنووسێکی دە ڕێ دایە.

ـ نابێ وا بێ! چونکە وەك ئەمن تێی‌گەیشتبووم ئاواتی ئەوە بوو حەمەدی بکوژێ. بۆخۆی لە لای من باسی دەکرد!

ــ بەڵام لە کۆتایی دا، کاتێك دیتی ئیدی حەمەد هەموو ڕێگایەکی لێبەسراوە و مردن نەبێ چی لە پێش نیە...

ــ وایە جەنابی نوێنەر. بەڵام دایە سوڵتان قسەی دەڕوا و خەڵکەکە بێتەملاوئەولا بە قسەی دەکەن. ئەوەش بۆتە کۆسپی سەر ڕێگای ئێمە و وای کردوە ئێمە لە بەرامبەر حەمەدی دا چمان پێنەکری!

لە پڕ عارف سایم بەگ هەستی بە برسیەتی‌یەکی توند کرد و بە خەلیل بەگی گوت:

ــ ئێستا کاتی ئەوەیە لە گەڵ دۆستانمان نانی بخۆین!

هەموو چوونە ژووره گەورەکەی دیکە کە خوانەکەی لێبوو. عارف سایم بەگ زولفۆی دە نامێز گرت و دەستی لە گەڵ هەمووان لێدایەوە:

ــ فەرموون دانیشن، دۆستان...

زۆر چێشتی خۆشی جۆراوجۆر لە سەر سفرەکەی دانرابوون. پێشخزمەتان ڕاکی‌یان بۆ تێدەکردن و سەهۆڵاویشیان دە تونگەی نەخشین دا بۆ دانابوون.

ئەو ئێوارەیە عارف سایم بەگ زۆر بەکەیف بوو. ئەو کە پێشتر هەر لاتاوی داویشتن، گاڵتەی بە خەڵکی دەکرد و گرژ و یەسکگران دەهاتە بەرچاو، ئەمڕۆ پێدەکەنی و خۆشحاڵی دەنواند. بە ئۆگری و سەرنجەوە گوێی بۆ قسەی هەمووان ڕادەداشت. هەتا بەیانی دانیشتن، خواردیان، خواردیانەوە و خۆشیان ڕابوارد. عارف سایم ڕێگای دەدا هەر کەس چیی پێخۆش بوو، بیڵێ. دەیانگوت: دوای خەیانەتی بایرامۆغڵی حەمەد دەسڕۆیشتووتر دەبێ، قەدر و ڕێزی زیاتر دەبێ و ناوبانگیشی زۆرتر دەڕوا. خۆ پێشتریش لە لای جووتێرەکان هەر خۆشەویست بووە و وەك چاوی خۆیان پاراستوویانە. ئەوەش هەمووی لە سایەی سەری دایە سوڵتان و شایەر و بەیتبیژی وەك عەلی زارقایشی‌یەوەیە...

لای بەیانی وردە وردە نارەقەکە کاری لە عارف سایم بەگی کرد. وەختی وا ڕوخساری ڕەش هەڵدەگەڕا، هەڵدەستا و لە ژووریێ دا دەستی بە ڕاوێچکان دەکرد. ئەوانەی لە وێ بوون، هەموو چاویان لێدەکرد، نەشیاندەوێرا قسە بکەن و دەیانزانی هەر ئێستا هەڵدەچێ و دەیکاتە گرمە و هەرا.

عارف سایم ماوەیەك هات و چوو و کاتێك ڕاوەستا، ڕۆژ ببۆوە. لە پڕ ڕووی دە یاوەری کرد و گوڕاندی:

ــ یاوەر، لە تۆم دەوێ سبەینێ، تێگەیشتی سبەینێ و نەك دووسبەش، دایە سوڵتان و هەرکەسی دیکەش کە بۆ ئاڵۆزی دروستکردن، یاغیگەری و شێواندنی زەینی خەڵك لە خانەقای

چلچاوی کۆبوونەوە، بگری و بیانهێنی بۆ ئێرە! هەموو ئەو بەیتبێژ و گۆرانیبێژانەش کە بە حەمەدیان هەڵگوتوە، دەگری و لە پێش هەمووانیش دا عەلی زارقایشی قۆڵبەست دەکەی. دەبێ یەکە بە یەکە تێیانگەیەنم ئاژاوەنانەوە یانی چی. ئێمە لە حەوت بەران، لە گەڵ حەوت وڵاتان بەشەڕ هاتووین، تا ئەو وڵاتەمان ساغ کردۆتەوە و پاراستوومانە، ئێستا بێڵین چەتە و شایەران بە یارمەتی سۆفی، خانەقا و شێخان لێمان تێکدەن! نەخێر، ئەو جار مستی کۆماریان وە سەری دەکەوێ! لە تۆم دەوێ دەسبەجێ ئەو جندەیەی، ئەو مارە ژاراوییەی بگری! شایەرەکانیش... بۆخۆم عەلی زارقایشی باش دەناسم. لە شەڕی سەربەخۆیی دا لە گەڵمان بوو. دەستێکی تفەنگ بوو و دەستێکی سازەکەی... ئێستاش چووە ڕەگەڵ چەتان کەوتوە؟

زولفۆ گوتی:

ــ جەنابت ڕاست دەکەی. ئەوە هەموو دە بن سەری دایە سوڵتانی دایە و ئەویش بۆخۆی لە دەرەوە دەستوور وەردەگرێ. ئەوەتا ئێستاش باوەڕی پاشکەوتووانە هەر ماوە. چەتە، شایەر، بەیتبێژ، مەلا و حاجی هەن و بەردەوام دژایەتیی کۆمارە لاوەکەمان دەکەن! ئەوانە بە پڕوپاگەندەی ڕووخێنەر و کۆنەپەرستانە کە ڕیشەیان دە سەدان ساڵ پێش ئێستا دایە دەیانەوێ لاوازمان کەن! دوژمنی سەرەکیی ئێمە حەمەدۆك نیە، بەڵکوو باوەڕی کۆنەپەرستانە و پاشکەوتووانەیە!

مامۆستای فێرگە سەری بۆ لەقاند و گوتی:

ــ بەڵێ، نەزانی و کۆنەپەرستی!

مورتەزاغا خۆی تێکەڵی باسەکە کرد:

ــ وایە، دەنا چەتەیەکی وەك حەمەدۆکی چۆن بە تەنێ ئەو شتانەی پێدەکرێ؟ هەتا هەموو هێزە نەیارەکان ڕیشەکێش نەکەین، نیشتمانەکەمان بە تەواوی ڕزگار نابێ!

خەلیل بەگیش سەرێکی بۆ لەقاندەن و گوتی:

ــ هەتا ئەوانە هەبن، نایەڵن ئەو وڵاتە لە بەڵایان دوور بێ!

مەلا دۆرانیش دەستێکی بە ڕیشی دا هێنا و گوتی:

ــ بیری پاشکەوتووانە و کۆن هێشتا برەوی هەیە، بەڵام زۆری پێناچێ باوی نامێنێ و تێکەوە دەپێچرێ، بە دایە سولتان و حەمەدۆکی، یان با بڵێم بە هەزار حەمەدۆکانیش، ئەو ڕەوتە بەرەو دوا ناگەڕێندرێتەوە.

خەلیل بەگی گەورە کە وەك ڕێوییە مات ببوو، چاوی لە سەریەك دانابوون، گوێی ڕاگرتبوو و چاوەڕوانی دەرفەتێکی لەبار بوو کە باسەکەی خەستتر کا، ئەو دەرفەتەی قوازتەوە و گوتی:

ــ هیوادارم مستەفاکەماڵ پاشا نەزانێتەوە کە ئەو ڕووداوانەی ئێرە سەرچاوەیان دەچێتەوە سەر باوەڕی پاشکەوتووانە و شتی وا. بۆخۆتان دەزانن ئەو لەو چەشنە شوێنەوار و دژکردەوانە زیاتر دەترسێ، تا ئەو دوژمنەی بە سانایی تێکیشکاند و دە دەریایەی کرد. ئەو هێزەی کە مستەفا کەماڵ بە دژی وەستا و تێکیەوە پێچا، ئێستا لە هەرێمەکەی ئێمە، خۆی لە پشت ناوی یاغیگەری و چەتەبازاری حەشار داوە و وڵاتی ئاڵۆز کردوە!

ئەو تەوسە عارف سایم بەگی شێت کرد، لە داخان هەستایە سەرپێ، لاقی دە عەرزی کوتا و گوتی:

ــ ئەوە ئەمن دەترسێنێ خەلیلە چکۆڵە؟ مەبەستت ئەوەیە کە من ئەو دژکردەوە و بزووتنەوانەی مستەفا کەماڵ پاشا لێیان نیگەرانە، بە هێند ناگرم؟ بەڵێ بەڵێ، وات لێهاتوە بە ئاشکرا هەڕەشەم لێدەکەی. جا گوێ بگرە با من پێت بڵێم، هەر تۆ نا، هەمووتان کە لێرەن چاك گوێم لێبگرن. ئەوەی ئەمن دەیبینم تەنیا دژکردەوە و بزووتنەوە نیە، ئەوە ئێوەن کە چەتەتان دروست کردوون! ئێوەن بەخێویان دەکەن و چەك و تەقەمەنییان بۆ دابین دەکەن! بێجگە لە حەمەدۆك و یەك ـ دوێکی دی، هەرچی چەتەی لە شاخی هەن، پیاوی خۆتانن! هەم بە دژی دەوڵەتێیان کار پێدەکەن و هەم بۆ ئەوەی زۆرتر گوشار بخەنە سەر خەڵکەکەی، کەڵکیان لێوەردەگرن! گوێتان لێبوو؟!

عارف سایم یەکبەخۆی دەیگوڕاند، ڕوخساری گرژ ببوو، دەستی ڕادەوەشاند و چاوەکانی دەتگوت گۆمی خوێنێن.

زولفۆ هەستا، غیرەتی دە بەر خۆی نا و لە حاڵێك دا بەڕوونی ئارەقەی ترسی بە ڕوخسارییەوە دیار بوو، چووە پێشێ، قۆڵی گرت و بە دەنگێکی کز گوتی:

ــ بەگم، تکات لێدەکەم ئارام بە. تووڕەبوون بۆ دڵت باش نیە! دڵنیا بە خەلیل بەگی گەورە مەبەستی ئەوە نەبووە کە جەنابت فەرمووت. باوەڕ کە بەگم، ئێوە بە هەڵە لە قسەکەی وی گەیشتن.

لەو دەمەی دا خەلیل بەگ خزیبووە قولینچکێ، نەیدەزانی چ بکا و چۆن خۆی لە ڕق و تووڕەیی عارف سایمی ڕزگار کا.

هەستان و قسەکردنی زۆلفۆی ترسی ئەوانی دیکەشی تا ڕادەیەك شکاند، وە قسە هاتن و هەموویان پێیان لە سەر ئەوە داگرت کە خەلیل بەگ مەبەستی ئەوە نەبووە. دوای ئەوە خەلیل بەگیش تووڕە بوو، چوو لە بەرامبەر عارف سایم بەگی ڕاوەستا و هاواری کرد:

ــ بەگم ، بەگم، ئەتۆ لە ماڵی منی و تا ئێستا هیچ کەس لە ماڵە خۆم قسەی پێنەگوتووم! بەڵام قەیدێ ناکا، قوربانی چاوی تۆ بێ و بزانە بە هەڵەم لێ تێگەیشتی! ئەمن مەبەستم ئەوە نەبوو!

خەلیل بەگ هێندەی هاوار کرد و ئەو قسانەی دووپات کردەوە، کە عارف سایم بەگ هێدی بۆوە، وەك ئەوەی لە خەویٚ دا بوویێ و تازە وەخەبەر هاتبێ. خەلیل بەگی گەورە دەرفەتی لە دەست نەدا و گوتی:

ـ بەڵێ، ئێرە ماڵی منە و لەو ماڵەی دا هیچکەس، نە بۆخۆم و نە کەسی دیکەش، بۆی نیە تەنانەت ڕەخنەیەکی بچووکیش لە جەنابی نوێنەری خۆشەویستی ئیمە بگرێ!

عارف سایم بەگ گوتی:

ـ بە ڕاستیتە؟

ـ سوێندێ دەخۆم بە ڕاستیمە.

ئەوانی دیش هەرکام بە نۆرەی خۆی پێی لە سەر ڕاستبوونی قسەی خەلیل بەگی داگرتەوە. ئەوجارعارف سایم بەگ وردە وردە هێدی بۆوە و گوتی:

ـ یاوەر! هەر وەك پێشتر پێمگوتی ئەو ژنە و ئەو شایەرانە دەبێ بگری و بیانهێنی بۆ ئێرە. هەر هەرچی شایە و بەیتبێژە، جا چ شایەری شاخی و چ شایەری دەشتێ، هەمووان بگرە و بیانهێنە. یەکیان وەپاش خۆ مەدە! یاوەر، بۆخۆت دەبێ ئەو ژنەی بگری، گوێت لێیە؟

کاپیتان هەوڵی دا بە شێوەیەك وەڵامی بداتەوە، کە جەنابی نوێنەر بارودۆخی ئێستای هەوا و ڕێگاوبانی هەرێمەکەی بێتەوە بیر:

ـ قوربان، گوندەکەی دایە سوڵتانی لە شوێنێکی زۆر چڕ، سەخت و شاخاوی هەڵکەوتوە و دووریشە. ئێستا بەو زستانەی و بەو بەفر و سەرما سەختەی زۆر زەحمەتە پیاو بگاتە ئەوێ...

بەڵام عارف سایم قسەکەی بڕی و گوتی:

ـ هەرچی زووتر دەبێ بیهێنی، فەرمانت پێدەدەم...

پاشان چاوی دە یاوەری بڕی، بە پەنجەکانی هێندێك چەنەی خوراند و بیری کردەوە:

ـ سێ ڕۆژت مۆڵەتە! پێمگوتی ئەوە فەرمانی منە! شایەرەکانیشت لە بیر نەچن! هەمووان خڕ کەوە، بیانهێنە دە کونێکیان کە! ئەوەش هەر فەرمانی منە، یاوەر فاڕوق! دووپاتی دەکەمەوە دەبێ بۆخۆت بچیە خانەقای چلچاوی، ئەو ژنەی بگری و بیهێنی بۆ لای من.

ـ چۆنی دەفەرمووی، باوابێ.

ـ سبەینێ، بەیانی زوو دەبێ وەڕێکەوی! سەرکەوتوو بی!

یاوەر دەستی هەڵێنا، لاقی لێکدان، بەڵێ قوربانێکی گوت و وەدەرکەوت.

ـ پێمانوابوو بایرامۆغلی دەتوانێ شتێك بکا، بەڵام پلانەکەمان ئاکامێکی نەبوو. ئێستا دەبێ ڕێگای دیکە بۆ بەربەرەکانی لە گەڵ حەمەدی بدۆزینەوە. دەبێ توندتر بجوولێینەوە و

زەبروزەنگ بە کار بێنین. بە ڕوونی دیارە خەڵك چەتەکان بە ڕۆڵەی خۆیان دەزانن، بەڵام بە پێی ئەزموونی خۆم دەزانم کاتێك خەڵك خۆیان و قازانجیان بکەونە ژێر گوشار و مەترسی‌یەوە، بێ سێ‌ودوو ڕۆڵەکانی خۆیان دەکەنە قوربانی. کاتێك دایە سوڵتانمان گرت و هێنامانە ئێرە، ناکامی ئەو کارە باشتر دەردەکەوێ.

زولفۆ گوتی:

ـ ئەو ژنە زۆر پیرە و زۆر شتم دەربارەی وی بیستوە. دەڵێن گوتوویەتی کە خودا بە سەری کردۆتەوە و بۆخۆی ئاگادارە کە زۆری پێ‌ناچێ تێکەڵی کۆمەڵی چلسوارەی غەیبی دەبێ! زۆریشی بڕوا بە خۆی هەیە و وێ‌ناچێ حەمەدۆکی بە دەستەوە بدا، یان بە زیانی وی بجووڵێتەوە...

عارف سایم بەگ گوتی:

ـ ئەگەر پێویست بێ، دەوڵەت زەبروزەنگ دەنوێنێ.

دوای ئەو قسەیە هەستایەوە سەر پێ و دە ژوورەکەی دا دەستی بە ڕاوێچکان کردەوە. لە کاتی هاتوچۆکردن دا دەستی بە بەرۆکی گرتبوو و زنجیری سەعاتەکەی دە نێو قامکانی دا دێنا و دەبرد. لە پڕ لە لای مەلا دۆرانی ڕاوەستا، چاوی دە چاوی بڕی و گوتی:

ـ لە مەودوا شەرەف و ئابڕووی من دە گرەو دایە و بۆخۆم دەزانم چ دەکەم! جا یا خوا بە من دەدا، یان بە حەمەدۆکی!

مەلا دۆران دەسبەجێ لە جێی خۆی هەستا و وەڵامی دایەوە:

ـ جەنابی نوێنەر، ئەوە چ دەفەرمووی؟ سەگێکی وەك حەمەدۆکی ڕێی‌ناکەوێ جەنابت شەرەفی خۆتی بۆ دە گرەو نێی. چۆن وا دەفەرمووی قوربان؟ پیاوێکی گەورەی وەك تۆ نابێ تەنانەت بە هیچ شێوەیەك هەتیوێکی بەرەڵای دێهاتیی وەك وی بە نەیاری خۆشی بژمێرێ!

ئەوانی دیش هەموو بە یەکەوە هەستانە سەر پێ و گوتیان:

ـ وایە، ناکرێ و نابێ! ئاخر حەمەدۆك چی‌یە؟ بۆچما ئەو هەر دێهاتی‌یەکی ڕووتەڵەی شڕۆڵ نیە؟ هەتیوێکی بەرەڵای وا ڕێی ناکەوێ لە بەرامبەر جەنابت دا هەر ناویشی بهێنرێ.

عارف سایم بەگ بە سەری قامکی شادەی هێندێك زنجیری سەعاتەکەی کێشا و گوتی:

ـ سوپاستان دەکەم دۆستان! سوپاس بۆ ڕێز و خۆشەویستیتان! فەرموون دانیشنەوە! بۆخۆتان دەزانن ئەمن نوێنەری ئەم ناوچەیەم و هەروەها دەشزانن کە تەنانەت دەشت و چیاکانی ئەم هەرێمەش من بە قارەمانی شەڕی سەربەخۆیی دەزانن! دەبێ هەرچۆنێك بێ، پێش ئەوەی

ناووناوبانگم زیاتر زەدەدار بێ، ئەو کوانەی بدڕم و لە بەینی بەرم. باشە، ئەگەر سەرۆککۆمار ئەو ڕووداوانە ببیستێتەوە، پێیسەیر نابێ کە بۆ دەبێ قارەمانێکی شەڕی سەربەخۆیی ئەو فیتنەیەی پێنەکوژێتەوە؟ جا با لە هەموو کەسیشی لێ نێزیکتر بم، چۆن لە ڕووم هەڵبێ خۆمی نیشان بدەمەوە؟ ئەگەر پێمبڵێ: وا دیارە کوێرۆغڵییەك لە ناوچەکەتان پەیدا بووە کە بە زۆر لە دەوڵەمەندان دەستێنێ و دەیدا بە هەژاران، ئەوەی ئێمە پێماننەکراوە، ئەو دەیکا و هاواری عەدالەت و حەقخوازیی بەرز کردۆتەوە... بەڵێ، ئەگەر مستەفا کەماڵ پاشا ئاوا بمداتە بەر لۆمە، ئیدی ئەمن چۆن سەرم هەڵبێ؟ دۆستان، ئەوە مەسەلەی دێهاتییەکی ڕەشورووت نیە کە لە شاخی دا بخولێتەوە و هەڵبەز دابەزێکی بکا، ئەوە کەسێکە هەرێمەکەی منی ئاڵۆز کردوە و لە ڕاستی دا دوژمنی منە. هەر بۆیە بڕیارم داوە، بە هەر نرخێك بێ، هەرچۆنێك بێ و هەرچی زووتر لە بەینی بەرم. دیارە لە بەینی نەبەم، ئەو من لە بەین دەبا!

کاتێك بەگ و ئاغاکانی دیکە ئەوەیان بیست هەموویان بە یەکەوە هەستانەوە سەر پێ:

ــ قبووڵمان نیە قوربان! بە هیچ شێوەیەك قبووڵ ناکەین جەنابت هەتیوێکی بێژووی بەڕەڵا بە دوژمنی خۆت بژمێری! شتی وا نابێ!

ــ فەرموون دانیشن دۆستان، تکا دەکەم، دانیشن!

پاشان بۆخۆشی دانیشتەوە و لەسەرەخۆ درێژەی بە قسەکانی دا:

ــ با شتێکتان پێبڵێم، ئەمن لەو ژنەی نیگەرانم. پێموا نەبوو ژنێك مافی ئەوەی هەیە ببێ بە شێخ، خانەقای هەبێ و لە وەش زیاتر خۆی بە هەڵبژاردە و پیرۆز بزانێ. دیارە ئەو ژنە زۆر نەترسە... هیوادارم لە بەرامبەر یاوەری دا بەربەرەکانی نەکا.

زولفۆ گوتی:

ــ چاکی دەناسم و لە وەش دەترسم کە ئامادە نەبێ خۆ بە دەستەوە بدا. ئەو لە هیچ شتێك ناترسێ.

مورتەزاغا قاقایەکی کێشا:

ــ لەوانەیە کێشەی دروست کا، بەڵام ئەوە نیە یاوەر عەلی کەرتیشی لە گەڵە! خۆ هەر کەس چاوی بە وی بکەوێ لە ترسان لەخۆ دەمیزێ.

خەلیل بەگی گەورە گوتی:

ــ دایە سوڵتان لە مردنێ ناترسێ. ئەمن بنە و بنەچەکەی دەناسم، کە هەر لە کۆنەوە بە سەر ئەو خانەقایەی ڕاگەیشتوون. ئەوان لە بناغە دا باوەڕیان وایە کە هەرکەس لەو

بنەماڵەیەی بێ، بە قارەمان لە دایك دەبێ! شازدە کەسیان لە شەڕی سەربەخۆیی دا بەشدار بوون و بۆخۆشتان دەزانن هیچیان نەگەڕانەوە و هەموویان کوژران!

مورتەزاغا بزەیەکی هاتێ و گوتی:

ــ گوتم عەلی کەرتیشیش دەچێ!

ئەوانی دی سەریان بەردوایەوە و لە ترسی وەی نەوەك شتێکیان لە دەم دەرچێ جەنابی نوینەر پێی ناخۆش بێ، هیچیان نەگوت. عارف سایم باسەکەی درێژە دا وگوتی:

ــ ئەو شایەرانەش لە کۆڵ خۆمان کەینەوە!

ــ ئەوەی دەبێ بە عەلی کەرتیشی بسپێرین!

عارف سایم هەستا سەر پێ. چوو بۆلای مورتەزاغای و دەستی لە سەر شانی دانا. مورتەزا هەوڵی دا هەستێ، بەڵام عارف سایم شانی داگرت، قاقایەکی توندتر لە ویی کێشا و گوتی:

ــ بەڵی وایە، یاوەر عەلی کەرتیشی لە گەڵە!

ئەو جار چۆوە جێگای خۆی، دانیشتەوە و لە بن لێوییەوە گوتی:

ــ ئاخ، هەزار ئاخ! خەڵك هەر دە زمانی دەسەڵات دەگا و زمانی دیکە نازانێ. دەبێ وردیان کەی!

پاشان قامکی گەورەی لە سەر مێزەکەی داگرت، سووڕی دا و گوتی:

ــ دەبێ وایان ورد کەی، بیانکەیە پرپۆڵە...

زولفۆش بە دوای وی دا دووپاتی کردەوە:

ــ بەڵێ، دەبێ بیانکەینە پرپۆڵە.

خەلیل بەگی گەورەش گوتی:

ــ ئەو خەڵکە تەنیا لە زمانی دەسەڵات و تێهەڵدان حاڵی دەبن!

ڕۆستەم بەگیش هەڵیدایە:

ــ لە سەردەمی شەڕیش دا ئەگەر ترسی کوژران، لێدان و نووکی سەرنێزەی دە گۆڕێ دا نەبوایە، یەك کەسیشیان نە دەچووە شەڕێ! ئێمە بە تۆبزی دەمانبردنە شەڕ و ناچارمان دەکردن بەرگری لە نیشتمانەکەیان بکەن!

عارف سایم بەگ بۆ ئەوەی هێندێك باسەکە هێور کاتەوە، گوتی:

ــ ئای، بە ڕاستی سەرجووخە عەلی کەرتیشی خۆمان چاکی لێ‌دەزانێ...

ئەو جار مەلا دۆران قسەی کرد:

ـ ئێستا جووتێرەکان بە تەواوی یاغی بوون و زەحمەتە پشتی حەمەدی بەردەن. عەلی‌یە شەلی شوێنگێڕ تازە لە شاخی هاتۆتەوە. بۆخۆتان دەزانن ئەو لە گەڵ ئەو کەسانە بوو کە بە دوای حەمەدی‌یەوە بوون و دەیانەویست بەدیلی بگرن، دوایەش توانی خۆی لە دەست حەمەدی ڕزگار کا... ئەو دەی‌گوت حەمەدۆك مرۆڤێکی بە سام و بە زاکوونە و جووتێرەکان دەی‌پەرستن. وەکوو ئەو دەی‌گێڕایەوە و دیارە ئەمن بۆخۆشم لەو بەشەی دا هەر وای بۆ دەچم، دێهاتی‌یەکان دەتوانن لە بەرامبەر هێزەکانی ئێمە دا، با زۆریش بن، خۆ ڕابگرن، قەتیش پشتی حەمەدی بەرنادەن و بە دەستی‌یەوە نادەن...

عارف سایم بەگ سەری لەقاند و گوتی:

ـ خەمت نەبێ مەلا دۆران، ئێستاش نەی‌کەن، دواتر کە زەبروزەنگمان نواند، هەر ناچار دەبن بی‌کەن! دەبینی هەر بۆخۆیان دەی هێنن و دەی‌دەنە دەستمان. ئەمن تا ئێستا پێم‌خۆش نەبووە بە زمانی توندوتیژی بیاندوێنم و هەر چاوپۆشیم لێ‌کردوون، بەڵام بگاتە یەسکانم و بە ڕاستی لێیان‌تووڕە بم، یەك تووڕووسیش بە ساغی نایەڵم و هەمووان شەلوکوت دەکەم! ئەو کاتی ئیدی نەك هەر دێنە سەر ئەو باوەڕە کە حەمەدۆکی بە دەستەوە بدەن، بەڵکوو لە سەر ئەوەی کە کێ زووتر حەمەدی بۆ ئێمەدەستنیشان بکا، بە شەڕیش دێن! جا قسەکەی منت لە بیر بێ، هێندەی پی‌تاچێ ئەو جووتێرانە لەو حەسارەی ڕیز دەبن و یەکە یەکە دێن بەری پێم ماچ دەکەن، بەڵام پێش هەموو شتێك دەبێ سەبری ئەو ژنە و بەیتبێژ و شایەرەکان هێندێك بشکێنمەوە. هەر وەك دۆستان باسیان کرد، ئەوانە بە زمانی زەبروزەنگ نەبێ، تی‌ناگەن و بە تۆبزی و بە زەبری نووکی سەرنێزە و لوولەی تفەنگێش نەبوایە، یەك کەسیان نەدەچووە شەڕێ! ئێوە بۆخۆتان دەبینن کە ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر تووڕە دەبم و دەشزانن ئەگەر بە ڕاستی تووڕە بم، چ دەکەم؟

لێرە دا ڕاوەستا، یەك بە یەك چاوی لە چاوی هەموان کرد و دەستی بە قسان کردەوە:

ـ دەزانن دۆستان، ئەمن زۆر باش دەتوانم هەر ئەو جووتێرانەی حەمەدی دەپەرستن، وا لێ‌بکەم کە لێی‌بێزار بن! کارێکی وا بکەم کە ئەو حەمەدۆکە بێتە بەر دەرگای من، بپاڕێتەوە کە من لە دەست ئەوانی ڕزگار بکەم و نەهێڵم بی‌کوژن! هەر بۆیە دەڵێم: هەر بژی سەرجووخە عەلی کەرتیش!

مورتەزاغا گوتی:

ـ بە ڕاستی بژی عەلی کەرتیش! تەواوی ئەو دنیایەی بگەڕێی کەسی لە وی لێزانتر نادۆزی‌یەوە.

ـ نیه، به ڕاستی تای نیه!

مەلا دۆران گوتی:

ـ ئەگەرعەلی‌یە شەل جێی باوەڕ بێ، ئەوە...

عارف سایم بەگ دەسبەجێ قسەکەی بە مەلا دۆرانی بڕی و گوتی:

ـ سبەینێ بەیانی دەبێ بی‌نێرنە لای من، کارم پێیەتی... دۆستان، وا بزانم عەلی کە بە شای شوێنگێڕان بە ناوبانگە، ئێستا پیاوی مەلا دۆرانی‌یە؟

قوتووە زێڕەکەی لە باغەڵی دەرێنا، سیگارێکی داگرساند و یەکیشی بۆ مەلا دۆرانی هاویشت. مەلا دۆران لە حەوای گرتی‌یەوە.

ـ قوربان، ئەو دوو شوێنگێڕی هەن!

ـئەوی دیکە کێیە؟

ـ مووسا زریان.

ـ ئەویشم دەبێ بۆ بنێرن، سبەینێ بەیانی هەردووکیان لێرە بن!

عارف سایم هەستایە سەر پێ و خۆی لەبەریەك کێشایەوە. پاشان ڕووی دە خەلیل بەگی کرد، بزەیەکی هاتێ و گوتی :

ـ خۆ مەبەستت ئەوە نەبوو هەڕەشەم لێ‌بکەی؟

خەلیل بەگ بە پەلە وەڵامی دایەوە:

ـ قوربان قسەی وا بۆ دەفەرمووی؟ قەت شتی وا نابێ! عەرزم کردی ئەمن چۆن ڕێگا بە خۆم دەدەم هەڕەشە لە جەنابت بکەم!

ئەوانی دیش هەموو یەکدەنگ قسەکەی خەلیل بەگیان دووپات کردەوە:

ـ قوربان شتی وا نابێ!

ئێستا ئیدی وڵات ڕووناك ببوو. عارف سایم بەگ چووە بەر پەنجەرەی، لە ئاسۆی ڕوانی و هەر لەو کاتەش دا هەستی بە ماندوویی‌یەکی زۆر کرد و بڕیاری دا بچێ بخەوێ. وەرسووڕا و گوتی ڕۆژباش دۆستان و پاشان دەرگای ژوورەخەوەکەی خۆی کردەوە، چووە ژوورێ، کەوشەکانی داکەند و خۆی هاویشتە سەر جێگاکەی. هەر سەری وە سەر سەرینێ کرد، خەوی لێ‌کەوت.

ئەو ڕۆژەی یاوەر و دەستەکەی بەرەو چیا وەڕێ‌کەوتن، تاووساو بوو. هەوایەکی نەرم و خۆشی هەبوو. هەر یاوەر سوار بوو و ئەوانی دیکە بە پێیان دەڕۆیشتن. عەلی کەرتیشیش پیادە بوو. ڕۆژی دواتر جەنگەی نیوەڕۆیە بەفر و بۆرانێکی توند هەڵی‌کردێ. هەتا سەر پشتێندێ دە بەفری دەچەقین و

بارنێكی دەكرد، چاویان هەڵنەدەهات. ترسێكی گەورەیان ریێیشت. لای ئێواریێ هەرچۆنێك بوو، خۆیان گەیاندە گوندێكی چكۆلە و لە مەترسیی بەهیلاكچوون لەو بەفر و سەرمایەی دا رزگار بوون، بەڵام ئەوەندە ماندوو بوون كە نەیاندەتوانی یەك هەنگاوی دیكەش هەڵێننەوە. چەند رۆژان دە رێیە دا بوون تا گەیشتنە خانەقای چلچاوی. یاوەر هێندە ماندوو ببوو لە داخان نەیدەزانی چ بكا و لە بەر خۆیەوە جنێوی هەم بە دایە سوڵتانی و هەم بە عارف سایم بەگی دەدا و دەیگوت ئەو دووانە ئێمەیان تووشی ئەو بەدبەختی و كوێرەوەرییەی كردوە:

ــ ئەرێ سەرجووخە عەلی، وا دیارە ئەوە گەیشتینە ئەو خانەقا بەقوڕیێگیراوەی؟

عەلی كەرتیشی شەكەت و ماندوو كە بە بیری داهاتبوو جنێو دان بە خانەقای چلچاوی بەدبەبەختی بە دواوەیە، بە ناقایلی وەڵامی دایەوە:

ــ بەڵێ، ئەو ئاوەدانی‌یە هەوە!

یاوەر زانی عەلی كەرتیش لە بەرچی ناقایلە. بۆخۆشی دوای جنێوەكەی هەستی كرد مچوركێكی پێداهات، بەو حاڵەش قاقایەكی كێشا و بە گاڵتە رووی دە عەلی كرد و گوتی:

ــ ئەرێ عەلی بیستوومە دەڵێن كاتێك مرۆڤ لەو خانەقایەی نێزیك دەبێتەوە، ئەو رەوەزە سەختانەی سەرێ دەقەڵشن و گوڵی شین شینیان لێدەرِوێ. ئەدی ئەو گوڵانە كوان؟

ــ لە گابەردەكان دا شین دەبن!

ــ باشە كوان؟

ــ ئێمە نایانبینین!

ــ ئەدی ئەو باڵندەیەی دەڵێن لە سەر خانەقایە دەخولێتەوە؟

ــ قسەی تێدانیە هەیە و هەر ئێستا لە سەر خانەقایە دەفرِێ، بەڵام ئێمە نایبینین.

ــ ئەدی هەورە بەناوبانگەكە؟

ــ ئەو هەورە هەمیشە بە سەر لووتكەی ئەم چیایەوەیە.

ــ ئەدی ئاوی ئەم جۆگانە بۆ هەڵناگەرێتەوە و سەرەوژوور نابێتەوە؟

ــ چۆن یاوەری خۆم؟ ئەوەنیە ئاوەكە دەچێتەوە لایەكەی دیكە!

ــ ئەوە شێت بووی عەلی؟

ــ نا،نا یاوەری خۆم، شێت نەبووم و تەواو ئاگام لە خۆمە!

ــ ئەتۆ چۆن باوەرِ بەو شتانە دەكەی؟

ــ باوەرِم پێیانە ، یاوەری خۆم!

ـ ئەدی ئەگەر هەر ئێستا فەرمانت پێبدەم کە دەبێ بێ بیرکردنەوە دایە سوڵتانی بکوژی و تەرمەکەی بە شانت دادەی و بۆم بێنی، چ دەکەی؟

ـ فەرمانەکەت بەڕێوە دەبەم، یاوەری خۆم.

ـ لە گەڵ ئەوەش کە پێت وایە ئەو ژنە کەسایەتی‌یەکی پیرۆزە و تەنانەت شێخیشە؟

ـ یاوەری خۆم، ئەرك ئەرکە، جا با پێوەندیی بە ژنە شێخێکی گەورەشەوە هەبێ. من خوا دەپەرستم، بەڵام فەرمانی فەرماندەری خۆشم بەڕێوە دەبەم.

ـ ئاخر بیر لەوە ناکەیەوە کە گوناهبار دەبی؟

ـ ئەمن گوناهبار نابم، یاوەری خۆم.

ـ ئەدی کێ؟ ئەمن سەرجووخە؟

ـ نا، هەرگیز، یاوەری خۆم! نا ئەتۆش چت لە سەر نیە، ئەتۆش فەرمانت پێدراوە و ئەرکی خۆت بەڕێوە دەبەی.

ـ ئەدی گوناهەکە ئی کێیە و کێ تاوانبارە؟

ـ ئەمن ناتوانم ناوی کەس بێنم. بێگومان یاوەری خۆم لە من باشتر دەزانێ.

ـ دیارە مەبەست ئەوە نیە دایە سوڵتان بکوژرێ، بەڵام هەرکەس ئازاری پێبگەیەنێ دە ئاگری جەهەننەمێ دا دەسووتێ، وا نیە؟

ـ بێگومان وایە، یاوەری خۆم.

ـ ئەگەر وا بێ، قوڕت وە سەری بووە.

ـ ئەمن بۆ قوڕم وەسەری بووە، یاوەر. عەرزم کردی ئەمن تەنیافەرمان بەڕێوە دەبەم.

لە پشت حەساری خانەقایە، لە بەر دەرگایە، لە پەنا گومبەزە کۆنەکەی کە مێژوویەکی لەمێژینەی پێوە دیار بوو، ڕاوەستان.

یاوەر گوتی:

ـ بڕۆ ئەو ژنەی بگرە و بیهێنە دەر!

ـ چۆنی تۆ بڵێی، یاوەری خۆم.

سەرجووخە عەلی کەرتیش چەند هەنگاو چووە پێشێ، چۆکی دادن و بەردەپانە سپی‌یە سواوەکەی بەر دەرگایەی سێ جاران ماچ کرد. کە چووە حەسارێ، بەردێکی دیشی هەر لە ڕەنگ و قەوارەی ئەو بەردەی چاو پێکەوت. ئەوەیان لە نێوەڕاستی حەسارەکەی بوو. لە لای ئەو بەردەش دیسان چۆکی دادا و بە شێوەی پێشوو ماچی کرد. ئەو جار چووە بەر دەرگای

ژووریّ که دەرگایەکی گەورە بوو و لە ویّش چۆکی دادا. دەسبەجیّ دەرگاکە کرایەوە و پیاویّکی جحیّلی کەڵەگەتی لیّهاتە دەریّ. پیاوەکە عەلی بردە ژووریّ. دایە سولْتان بەرگیّکی جوانی دە بەر دا بوو و لە ژوورە گەورەکەی خانەقایە دانیشتبوو. عەلی لە حالّیّك دا هەستی بە هەڵچوونیّکی توند لە قووڵایی دەروونی دا دەکرد، خۆی هاویشتە بەر پیّی دایە سولْتانی و سیّ جاران لاقی ماچ کرد، پاشان هەستا و ئەو جار دەستی گرت و سیّ جاران ماچی کرد.

دایە سولْتان دەستی لە سەر شانی عەلی دانا و گوتی:

ــ خودا بتبەخشیّ، رۆڵە!

عەلی کەرتیش شیّوابوو، لە بەر خۆیەوە هەر دوعای دەخویّند و تەواوی گیانی دەلەرزی.

دایە سولْتان بزەیەکی هاتیّ و گوتی:

ــ ئەمن ئامادەم سەرجووخە عەلی. وەك دەبینی جلم دە بەر کردوە و چاوەڕوانی ئیّوە بووم. چەند رۆژە چاوەڕوانتانم، بەلاّم ئیّوە زۆرتان پیّچوو.

ــ لە بەر ئەوەی بوو کە بەفرەکە زۆر قورس بوو، خاتوون سولْتان.

عەلی کەرتیش هەر وا دەلەرزی.

ــ ئەگەر بە پەلەی، هەر ئیّستا دەکریّ وەڕیّکەوین، دەنا رەنگە وا باشتر بیّ بە یاوەری بلیّی با بیّنە ژووریّ، قاوەیەکی بخۆنەوە و کەچکە شۆرباویّکیش بخۆن. دەریّ زۆر ساردە و لە خانەقای ئیّمەش عادەت وا نیە میوان بە برسیّتی بڕوا و لانی کەم دەبیّ کەچکە شۆرباویّکی گەرم بخوا.

ــ ئەوە دەچم پیّی‌دەڵیّم.

بە ڕاکردن هاتەوە دەریّ. گەرووی گیرابوو و بە زەحمەت هەناسەی دەهات:

ــ یاوەر، دایە سولْتان داوا دەکا دابەزن، لیّرە نانی بخۆین و دوایە برۆین. دەڵیّ پیّمان خۆشە لانی کەم کەچکە شۆرباویّکی گەرم بخۆن! پیاوی چاك بە با بە قسەی بکەین! کورە شۆرباوی خانەقایە متفەڕکە و دەڵیّن هەرکەس جاریّکی شۆرباوی خانەقای چلچاوی بخوا، خودا لە هەموو بەلاّیەکی دەپاریّزیّ!

ــ پیّویست ناکا عەلی، بی‌هیّنە دەریّ با برۆین.

ــ یاوەری خۆم، کەچکە شۆرباویّك، شتیّکی وا نیە و کاتیّکی زۆریش ناگریّ. خۆ ئیّمە هەر هاتووین... ئیّستا کە ئەو هەموو ڕیّگایەمان پیّواوە و بەو شەکەتی‌یەی گەیشتووینە ئیّرە، بۆ ئەو شۆرباوە متفەڕکەش نەخۆین؟ نەتبیستوە دەڵیّن زیارەتی خانەقای چلچاوی نیوە حەجیّکە، یانی بە نیوە زیارەتیّکی مەکەی دەبیّ. ئەوەی بەخت یاری بیّ و بۆی بڕەخسیّ کەچکیّك لە شۆرباوی ئەو خانەقایەی بخوا، خودا لە هەموو بەلاّیەك و لە گونلانیشی دەپاریّزیّ!

ـ گوتم پێویست ناکا، زوو کە بیهێنە دەرێ...

سەرجووخە عەلی چۆوە ژوورێ و لە حالێك دا چاوی بە هەموو کەلێن و قوژبنی ژوورەکەی دا دەگێرا و بێدەسەلاتی بە شێوەی قسەکردنیەوە دیار بوو گوتی:

ـ دایە سولتان، یاوەر نایە، بێسوودە، دەبێ هەر ئێستا برۆین!

ـ ئەدی بۆ ئاوا چاو دەگێری؟ چت پێویستە؟

عەلی کەرتیش وەك منداڵێکی شەرمێون کە دەیەوێ داوای شتێکی بکا، بەڵام دڵنیا نیە دەیدرێتی، گوتی:

ـ باشە، ئەمن بۆخۆم بۆم هەیە کەچکێك لەو شۆرباوە متفەرکەی بخۆم؟

مەنجەڵێکی ڕەش لە قولینچکێکی لە سەر ئاورگی بوو و شۆرباوەکەی نێوی هەڵمی لێهەڵدەستا. بۆنێکی خۆش لە گەڵ هەڵمەکەی بڵاو دەبۆوە. دایە سولتان قامکی بۆ لای مەنجەڵەکەی ڕاداشت. کەچکێکی دار لە تەنیشت مەنجەڵەکەی بوو. عەلی پڕ بە کەچکەکەی شۆرباو لە مەنجەڵەکەی هەڵێنجا و بێ ئەوەی ڕاوەستێ یەکجێ هەڵیقوڕاند. زاری بە شۆرباوەکەی سووتا، بەڵام دەرفەتی بیرکردنەوەی نەبوو، بە پەلەگەڕایەوە لای دایە سولتانی و گوتی:

ـ ئێستا دەبێ برۆین... باش بوو ئەمن هەرچۆنێك بوو لە شۆرباوەکەشم خوارد، ئەوانی دیکەش کەیفی خۆیانە... حەیف ئەوان نازانن خانەقای چلچاوی چەندە گەورە و پیرۆزە و چەند موعجیزە و شتی سەیر و دەگمەن لێرە دیتراون... خودایە گیان قەت شوکری تۆ تەواو ناکەم کە توانیم تامی شۆرباوی ئەو خانەقا پیرۆزەی بکەم!

لەگەڵ دایە سولتانی پیر لە حەسارێ هاتنە دەر. یاوەر کاتێك ئەوانی چاو پێکەوت، گرژ بوو، چاوی دەرپەڕاندن و فەرمانی دا:

ـ کەلەپچەی دە دەستی کە!

عەلی کەرتیش چاوێکی لێکرد و لە سەرەخۆ گوتی:

ـ ئەوە ژنە! پیریشە! بێجگە لە وەش ئەوە دایە سولتانە، پیاو چۆن کەلەپچەی دە دەستی دایە سولتانی دەکا...

یاوەر سوورهەڵگەڕا و گوڕاندی:

ـ بێدەنگ بە! گوتم هەر ئێستا کەلەپچەی کە!

دایە سولتان بزەیەکی هاتێ و لە سەرەخۆ دەستەکانی بۆ لای عەلی ڕاکێشا:

ـ وەرە پێشێ ڕۆڵە، ها، ئەوە دەستم کەلەپچەیان تێکە...

عەلی کەلەپچەی دە دەستی دایە سولتانی کرد، بەڵام هەموو گیانی دەلەرزی. ئەو پیاوەی دەرگاکەی کردبۆوە، هاتە لایان. ئەو سەربەرگێکی ماراشی دە بەر دا بوو و توورەکەیەکی گەورەشی لە کۆڵێ بەستبوو.

دایە سولتان رووی دە یاوەری کرد و گوتی:

ــ ئەوە ناوی بنیامینە و کوری هەرە بچووکی بنەماڵەی سەرپەرست و چاوەدێری ئەم خانەقایەیە. شوانە، لەو سەرانە مەری دەلەوەڕێنێ و ئاگای لێیان دەبێ... ئەگەر رێگا بدەی ئەویش لە گەڵمان دێ.

یاوەر نێوچاوانی تێکنا و بە رووگرژییەوە گوتی:

ــ چ پێویست دەکا بێ؟

دایە سولتانی پیر لە سەرەخۆ و دیسان بە بزەیەکەوە وەڵامی دایەوە:

ــ رێگاکە زۆر دوورە و بەفرەکەش زۆرە... لەوانەیە نەتوانم برۆم و بۆتان ببمە باری زەحمەت... زۆر باش دەبێ ئەگەر بێڵێ ئەویش لە گەڵمان بێ.

بنیامین وەك پەیکەرەیەکی بەردین، بەرز و بەهێز راوەستابوو و جووڵەی نەدەکرد. چەکمەیەکی سووری دە پێ دا بوو و زەنگاڵی خوریی هەتا سەر چۆکان هەڵکێشابوو.

ــ دەی باشە با بێ...

وەرێکەوتن. یاوەر بە سواری لە پێش دا دەرۆیی. بنیامین، عەلی کەرتیش، کە هێندێك نارەحەت بوو و ژاندەرمەکانیش کە بە دوایانەوە بوون، هەرچەند کەوش و چەکمەی تایبەتیی زستانێیان دە پێدا بوون، باشیان رێگا بۆ نەدەبرا. تەنیا دایە سولتان کەوشی بەفرێی دە پێ دا نەبوو و هەر بۆیەش زوو زوو هەڵدەخلیسکا و چونکە دەستیشی دە کەلەپچەی دا بوون، خۆی بۆ نەدەگیرایەوە و هەر چەند بنیامین هەوڵی دەدا یارمەتیی بکا، هەر دەکەوت و نەیدەتوانی برِوا.

بنیامین چوو بۆ لای عەلی کەرتیشی و بە سرتە پێیگوت:

ــ ناچارم لە کۆڵێی کەم. زۆر پیرە! بەو شێوەیە قەت ناتوانی هەتا شاری تاقەت بێنێ!

سەرجووخە عەلی رِای کردە لای یاوەری و قسەکەی بنیامینی بۆ دووپات کردەوە، بەڵام یاوەر نە چاوی لێکرد و نە وەڵامیشی دایەوە. نێوچاوانی تاڵ بوو، دە بیرەوە رۆچووبوو و خەمناك و نیگەران بوو، بەڵام وێدەچوو نارِەحەتی‌یەکەی هێندێك هۆی دیکەی هەبن. کەرتیش جارێکی دیکەش قسەکەی گوتەوە، بەڵام یاوەر هیچ گوێی‌نەدایە. ئاخرەکەی عەلی هاتەوە لای بنیامینی و بە چاوی پرِ لە فرمێسکەوە گوتی:

ـ قبوولّی ناکا.

هێندێکی دیکه هاتن. ئەو جار بەفر و کرێوە توندتر بوو. هێندێك لە دارەکان کە بەفرێکی زۆریان لە سەر کەوتبوو، چی دی خۆیان ڕانەدەگرت، قرچەیەکی توندیان لیّ‌دەهات و دەشکان. بارنی دەکرد. دەمو چاوی یاوەر و پیاوەکانی لە سەرمان سڕ ببوون، دەست و لاقیشیان هەر وەتر. سمێڵیان شووشە سەهۆڵی گرتبوو. دەیانزانی لە دۆڵەکەی بچنە خواریّ، دەگەنە دێیەکی، بەڵام بەو حاڵەی هەتا نیوەشەوێش زەحمەت بوو بگەنیّ.

بنیامین دایە سوڵتانی بە عەلی کەرتیشی ئەسپارد و بۆ خۆی غاری دا پێش یاوەری و بە هەموو هێزی خۆی گوڕاندی:

ـ یاوەر، گوێت لیّ‌بیّ، دایە سوڵتان ناتوانیّ چی‌دیکە بڕوا. لە کۆڵمی دەکەم... نا، نا، لە سەر کۆڵم سەرمای دەبیّ، لە باوەشی دەکەم...

یاوەر وەڵامی دایەوە:

ـ زۆر باشە، وا بکە!

بنیامین سەربەرگەکەی لە بەر خۆی داکەند و دایە سوڵتانی تێوە پێچا. دایە سوڵتانی پیری بەستەزمان یەك وشەشی بە زاری دا نەهات. سڕ ببوو، دە بووڕەوە چووبوو و زیاتر وەك تەرمێك دەچوو، تا مرۆڤێکی زیندوو.

ئێوارە داهات. بەفر و بۆرانەکە ساتبەسات توندتر دەبوو و نەی‌دەهێشت سەر هەڵێنن. هەموو جیّ‌پیّ و ڕێچکەکان پڕ ببوونەوە و ئەگەر بنیامینیان دە گەڵ نەبوایە، بیّ‌گومان سەریان دەرنەدەکرد، لە ویّ لە پەسارێك، یان خڕێکی دا دەچەقین، بەهیلاك دەچوون، بەفریان بە سەر دەکشا و تا بەهارێکی درەنگ هەر تەرمەکانیشیان نەدەدۆزرانەوە. بە یارمەتیی بنیامینی سەرەنجام پێش ئەوەی ڕۆژ بێتەوە، خۆیان گەیاندە گوندەکەی و ڕزگار بوون.

تازە گەیشتبوونە سەری دێی، لە نەکاو یەکێك لێی لە چەخماخی تفەنگیّ دان و دەنگێکی بەهێز تێیان‌ڕاخوڕی:

ـ یاوەر فاڕوق! ئەمنم، حەمەدۆك! داوای خۆبەدەستەوەدانت لیّ‌ناکەم و لە بەر دایە سوڵتانیش پێم‌خۆش نیە تەقەت لیّ‌بکەم! بۆسەشم بۆ دانەناوی‌یەوە! تیّ‌بگە، لە بەر خاتری دایە سوڵتانی دەتبەخشم! هەرچی زووتر دایە سوڵتانمان بدەوە!

یاوەر لە ترسان و لە داخان وەخت بوو ڕوحی دەرچیّ. ددانی دەچیڕەوە بردن، بەڵام هیچی پیّ‌نەدەکرا، بانگی بنیامینی کرد:

ـ بنیامین خێروبەرکەتەکەی نێو باوەشت بدە بەو چەتانە، خێرا کە!

پێش ئەوەی یاوەر قسەکەی تەواو کا، بنیامین خۆی گەیاندبووە پەنا گابەردێکی و لە وێ هەڵتروشکابوو، دایە سوڵتانی هەر وا دە باوەش دا بوو، بەڵام ئەو ژنە پیرە بەستەزمانە هیچ هۆشی نەبوو.

حەمەد و هاوڕێیانی خۆیان گەیاندە لایان:

ـ دایە سوڵتان دە چ حاڵێك دایە بنیامین؟

ـ وەڵڵاهی ئەوە بەو شێوەیەیە کە دەیبینی، بەڵام شوکور ماوە...

چەتەکان پەتۆ و باڵتۆی زیادییان هێنابوون. دەسبەجێ دایە سوڵتانیان دە پەتۆ و باڵتۆیانەوە پێچا و بەرەو گوندێکی دیکە کە هەر لەو دۆڵەی دابوو و لە قەراغ چۆمێکی هەڵکەوتبوو، وەڕێکەوتن. نیوەڕۆ نەببوو گەیشتنە وێ. ژنان دەسبەجێ ژووورێکیان بۆ دایە سوڵتانی ئامادە کرد. جێگایان بۆ ڕاخست، سۆبەیان پڕ کرد لە دار و ژوورەکەیان گەرم داهێنا، چایان لێنا و هەنگوێنیان لە گەڵ ڕۆنی کەرە لێکدا و دایانێ. زۆری پێنەچوو دایە سوڵتان هاتەوە سەرەخۆ. حەمەدی بانگ کردە لای خۆی:

ـ کوڕەقارەمانەکەم، گوڵە سوورە جوانەکەم! ئەمنت لە دەستی ژاندەرمان هێناوەتە دەر و ڕزگارت کردووم، بەڵام چم لێدەکەی؟ بۆ کوێم دەبەی؟ دەمکەیە چەتە؟ پێتوایە ئەمنی پیری پەککەوتە دەتوانم چەکی هەڵگرم و یاغی بم؟

ـ چۆنی ئەتۆ بڵێی وا دەکەم دایە سوڵتان.

ـ بمبە، بمدەوە دەستی ژاندەرمەکان. دەزانم ئەوەت پێناخۆشە، بەڵام وا چاکترە کوڕم!

ـ مەلا فەرهاد کە لە تەنیشت حەمەدی ڕاوەستابوو، گوتی:

ـ باش نیە بتدەینەوە دەستی ژاندەرمان. عارف سایم بەگ دەتکوژێ دایە سوڵتان! فەرمانی گرتنی تۆ ئەو داویەتی...

دایە سوڵتان بزەیەکی هاتێ و گوتی:

ـ مردن و ژین هەر بە دەست خودایە ڕۆڵە!

ـ دایە گیان، تکات لێدەکەم! ئەوان قسەت پێدەڵێن، ئازارت دەدەن، سووکایەتیت پێدەکەن!

ـ دەزانم، بەڵام ئەوە شتێکە خوا وەڕێی هێناوم...

حەمەد، مەلافەرهاد و هەموو خەڵکی دێیەکەی زۆری لە بەر پاڕانەوە کە واز لەو بیرە بێنێ و خۆی تەسلیمی ژاندەرمان نەکاتەوە، بەڵام ئەو لە بڕیاری خۆی پاشگەز نەبۆوە. ناچار

پیاوێکیان ناردە لای یاوەر فاڕوقی کە هێشتا لە گوندەکەی دیکە مابۆوە و پێیان ڕاگەیاند کە: ئێمە خەڵکی ئەو گوندەی بۆخۆمان دایە سوڵتانی دێنینە شاری و لە کن ئاشی حەسەنە ڕەشی دەیدەینە دەست خۆت!

بەیانی ڕۆژی دواتر هەواکەی خۆش کرد و بەفرەکە لێیکردەوە.

یاوەر فاڕوق وەڵامی لیێناردنەوە:

ــ بە هیچ شێوەیەك قبووڵ ناکەم خەڵك بیهێننە شاری و بیدەنە دەستم. با هەر لێرەوە لە گەڵ خۆم بێ، بەڵام ئاگامان لێی دەبێ.

دایە سوڵتان قبووڵی کرد لە گەڵ ژاندەرمەکان بچێ. ئەو جار ئەسپێکی چاکیان بە ڕەخت و زینی چەرکەسییەوە بۆ ئامادە کرد. دایە سوڵتانیان لە سەر ئەسپەکەی دابەست و دە چەند پەتۆی نەرم و گەرمیشیانەوە پێچا. بنیامین هەوساری ئەسپەکەی دەکێشا. یاوەر زۆری پیخۆش بوو کە ئەو پیرێژنە کز و بیهێزە بۆخۆی هاتۆتەوە بەر دەستی. بیستبوویەوە کە دایە سوڵتان بە قسەی حەمەد و هاوڕییانی نەکردوە و خۆی تەسلیمی ژاندەرمەکان کردۆتەوە. هەر بۆیە ئەو جار کەلەپچەشی نەکرد. تەنیا شتێك کە یاوەری ئازار دەدا حەمەدۆك بوو، کە دەروەستی نەدەهات و جار نەبوو سووکایەتییەکی پیئەکا. لە قووڵایی دڵی دا هەستی دەکرد لە حەمەدۆکی بێزارە.

ئەو هەواڵە کە دایە سوڵتان بە فەرمانی عارف سایم بەگی گیراوە، ئێستا دەرییە دایە و دەیبەن بۆ شاری، بە هەموو گوندەکانی تووڕووسی دا بڵاو بۆوە. خەڵکی هەموو گوندەکانی سەر ڕێگایە دەهاتن بیبینن. پیرو لاو، ساغ و نەخۆش، گەورە و چکۆڵە هەموو دەهاتنە سەر ڕێگایە، بە ڕێزێکی زۆرەوە ڕادەوەستان، دوعایان دەکرد و جێ سمی ئەسپەکەی وییان ماچ دەکرد. هێندێکیان دەگریان، ئاخر ڕووداوەکە هێندە ناخۆش بوو، دڵیان هەڵینەدەگرت و لە پرمەی گریانێیان دەدا. هەمووش ئاگادار بوون کە حەمەدۆك پێشی بە یاوەری گرتوە و دایە سوڵتانی لیێئەستاندۆتەوە، بەڵام ئەو پیرێژنە پاك و خواناسە نەیویستوە هەڵێ، داوای کردوە بیدەنەوە دەست ژاندەرمەکان و هەروەها بۆخۆشی دەستی بۆ درێژ کردوون کە کەلەپچەی تیکەن. هەواڵەکە بە پەلە بڵاو بۆوە، بە چەند ڕۆژان هەموو چوکووڕاوی گرتەوە و تەنانەت گەیشتە لێوارەکانی دەریای نێوەڕاستیش.

ژاندەرمەکان تا گەیشتنەوە شاری پێنج جاران تووشی کڕێوە، باڕن و سەرمای توند بوون، بەڵام هەرچۆنێك بوو، بە شەکەتی گەیشتنەوە. دایە سوڵتانیش سەرەڕای ئەوەی سوار بوو، لەو ڕێگا

دوورەی کە زۆرتری سەخت و هەوراز و لێژ بوو، زۆری ئێش و ئازار کێشا. کەس پێیوانەبوو بگاتە شاری و دەیانگوت لە ڕێیە دا دەمرێ، بەڵام هەر چۆنێك بوو خۆی ڕاگرت و گەیشتێ.

لەو ماوەیە دا عارف سایم بەگ شەو و ڕۆژ چاوەڕوانی گەیشتنەوەی وان بوو و ئەو ڕۆژانەی هیچ هەواڵێك لەوبارەوە نەبوو، لە داخان سواری ماشێنەکەی دەبوو و دەچووە ئەدەنەی! تەنانەت جارێکیانِ هەتا ئەنکەرەش چوو.

لە ئەنکەرەی بە ئەنقەست دەی پرسی، گوێی ڕادەگرت و ورد دەبۆوە بزانێ داخوا ئەو شتانە لە وێش باس دەکرێن و کاتێك دیتی لە وێ کەس ناوی حەمەدی نایەنێ، هێندێك وە کەیف هاتەوە و گەڕایەوە بۆ شارە بچکۆلەکەی، بەڵام هەر نیگەران بوو و لە دڵی خۆی دا دەیگوت، زۆری پێناچێ داستانی ئەو چەتانە و هەموو ئەو شتانەش کە بە ڕاستی مایەی نابڕووچوونن، دەگەنەوە پێتەخت. هەر بۆیەش گرژ و نارەحەت بوو، خەوی کەم بوو و زۆر لەگەڵ بەگ و ئاغاکانی شاری بە کێشە دەهات و قسەی پێدەگوتن. نەشی دەهێشت دەوری چۆل بێ و دەبوو شەو و ڕۆژ ئەوانی لە لا بێ.

عارف سایم بەگ ئەوەندە چاوەڕوانی گەڕانەوەی یاوەری بوو، بە تەواوی حەجمینی لێهەڵگیرابوو. وەڕەز بوو و نەی دەزانی چ بکا. بە ڕاستی زۆری نەمابوو بە تەواوی تێکچێ، کە لە پڕ هەواڵیان دایە یاوەر گەیشتۆتەوە، دایە سوڵتانیشی گرتوە و نە گەڵ خۆی هێناوە. ئیدی دەسبەجێ دەرپەڕی، چووە ژاندەرمەخانەی و لە پشت مێزەکەی یاوەری دانیشت. پاشان گوڕاندی:

ــ هەر ئێستا یاوەرم بۆ بێننە ئێرە! دەی یاڵڵا، ڕامەوەستن!

یاوەر بە پەلە هاتە ژوورێ، توند لاقی جووت کرد، چەستێکی لێدا:

ــ یاوەر دە خزمەتت دایە جەنابی فەرماندەر...

بیستبووی کە جەنابی نوێنەر زۆر چاوەڕوان ماوەتەوە، پێیوایە درەنگ هاتۆتەوە و لێیقەڵسە.

عارف سایم بەگ بە تەوسەوە گوتی:

ــ ئەوە لە کوێ بووی؟ ئێمە زۆر چاوەڕوان بووین و دەبا ئەتۆ زۆر زووتر بە خۆت و بەندییەکەتەوە گەڕابایەوە! بیستوومە حەمەدۆك یاوەری بە شەڕەف و قارەمانی ئیمەی بەدیل گرتبوو، ئەویش لە ترسان و لە بەر پاراستنی شەڕەف و ئابرووی خۆی دایە سوڵتانی دابۆوە دەست وی! دیارە ئەگەر ئەوە بە شەڕەف و ئابڕووپاراستن بژمێردرێ! بەڵێ، باش بووە لانی کەم لە بەر پیرێژنێ نەیکوشتووی. هیوادارم ئەو ژنەت بە چاکی گەیاندبێتەوە ئێرە و ئەوەندەت لێنەدابێ، کە لە کەلك کەوتبێ...

ـ قوربان، ئەو زۆر پیره...

ـ ئێستا له کوێیه؟

ـ له نهۆمی خوارێ، له ژێر چاوەدێری دایه.

ـ دەبوو ده لێفه و دۆشەکی پەڕی قوو دا خەواندبات، ئاخر ئەو گیانی تۆی ڕزگار کردوه!

ـ قوربان، ئەو زۆر نەخۆش و بێتاقەته...

ـ دوور نیه دوکتۆر و حەکیمی ئەو دەوروبەرەشت بۆ ئەو سیحربازەی کۆ کردبنەوه و داوات لێکردبن، بێنه سەری و دەرمانی کەن!

ـ لەوەی دەترسام هەر له ڕێیه دا بمرێ و نەگاته ئێره، قوربان. دەترسام بۆم نەگاته لای جەنابت!

عارف سایم بەگ چاوی ده چاوی بڕی و دیسان تەوسێکی تێگرت:

ـ دەترسای، بەڵێ! باشه بۆخۆشت دەڵێی...

یاوەر هەر وا دەستی هەڵێنابوو، لاقی جووت کردبوون و ئاماده له حاڵی ڕێزگرتنی نیزامی دا وەستابوو.

عارف سایم بەگ فەرمانی دا:

ـ ئەو جندەیەی بێننه ئێره!

له کاتی دەستووردانەکەی دا وەك ماری فیشکاندی. یاوەر ڕاچەنی. هێندەی پێنەچوو دایه سوڵتانیان هێنایه سەرێ. دوو ژاندەرمه چووبوونه بن پیلی‌یەوه.

ـ بەری دەن...

ژاندەرمەرکان له بن پیلی هاتنەدەرێ و دەستیان لێبەردا. دایه سوڵتان کەوته عەرزی. ئەو ژنه پیره پاك و بەرێزه سپی هەڵگەرابوو، شەکەت و بێهێز بوو، پرچی ئاڵۆز ببوون، چاوی بەقووڵدا چووبوون و هەر ڕەگ و پێستێکی لێمابۆوه. دەستێکی به دیواری و دەستێکیشی به پێچکی کورسی‌یەکی تەنیشت دیواری گرت و هەوڵی دا هەستێتەوه، بەڵام بێسوود بوو و نەیتوانی.

ـ سەرجووخه عەلی، بچۆ بن پیلی و هەڵی‌ئەستێنەوه، با به پێوه بێ!

سەرجووخه عەلی کەرتیش که له بەر دەرگایه ڕاوەستابوو، به غار چووه پێشێ و له گەڵ ژاندەرمەیەکی دیکه به ئەسپایی دایه سوڵتانیان هەڵستانده سەر پێ و یارمەتی‌یان کرد به پێوه راوەستێ.

ـ پێم بڵێ بزانم پیرێژن، دەڵێن ئەتۆ سیحربازی و خەڵکی ئیمانداری خۆشباوەڕ هەڵدەخەڵەتێنی.

ـ هەرگیز من خەریکی سیحر و جادوو نەبووم. ئەو کەسەی شتی وا دەڵێ، درۆ دەکا. ئەوەی ئێمە دەیڵێین هەرگیز سیحر و جادوو نەبووە و نابێ و کەسی ئێمەش سیحرباز و جادووگەر نەبووە!

ـ ئەوەش دەڵێن کە ئەتۆ کەشف و کەرامەتان دەنوێنی و خانەقاکەشتان شوێنێکی پیرۆزە و موعجیزەی لێ ڕوودەدەن. دەبێ ئەتۆ بۆخۆت گوتبێتت کە شازدە کەس لە خانەقای چلچاوی ڕا بە دڵخوازی خۆیان چوونە شەڕی سەربەخۆیی و هەر ئەوانیش بوون کە دوژمنیان شکاندوە و سەرکەوتنیان بۆ ئەم وڵاتە بە دیاری هێناوە. گوتووتە دیلە یۆنانی‌یەکان گێڕاویانەتەوە و گوتوویانە کە ئێمە یەك سەربازی تورکمان نەدیوە و ئەوانەی ئێمەیان تێكشکاندوە و بە سەرمان دا زاڵ بوون، تەنیا شازدە پیاوی سەوزپۆش بوون! ئەوە ڕاستە؟

دایە سوڵتان دوو ـ سێ گنجی هێنانە نێوچاوانی و لە سەرەخۆ گوتی:

ـ بەڵێ، ڕاستە، خۆ تەنیا سەربازە یۆنانی‌یەکان نەبوون، کە پیاوە سەوزپۆشەکانی ئێمەیان دیبوو، بەڵکوو ئی خۆشمان چاویان پێیانکەوتبوو. هەموو چیایی و چوکووراوایی‌یەکان، ئەوانەی لە شەڕی سەربەخۆیی دا بەشدار بوون و لە بەرامبەر دوژمن دا شەڕیان کردوە، دیتوویانن! ئەگەر لێشیان بپرسی بۆت دەگێڕنەوە کە پیاوە سەوزپۆشەکان لە هێڵی هەرە پێشەوەی بەرەی شەڕ دا بوون!

ـ باشە ، باشە، ئەدی ئەو پیاوچاکە سەوزپۆشانە چی‌یان بە سەر هات؟ هەموویان کوژران؟

دایە سوڵتان زانی عارف سایم بەگ تا چ ڕادەیەك تووڕەیە و هەر زووش هەستی بە تەوس و پلارەکانی کرد، کە هاوکات لە گەڵ بزەی ناشیرینی سەر لێوی بە قسەکانی‌یەوە خۆیان دەنواند. ئەویش لە دڵی خۆی دا تووڕە بوو و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا. جەنابی نوێنەر بە ژاندەرمەکانی گوت کورسی‌یەکی بێنن و لە سەر کورسی‌یەکەی دای‌نیشێنن. دایە سوڵتان ئەو جار وەڵامی دایەوە.

ـ هیچ‌کامیان نەکوژران. پیاوچاکانی خانەقای چلچاوی قەت دە شەڕێ دا ناکوژرێن و هەر بە سەرکەوتوویش دێنەوە!

ـ ئەدی ئەو قارەمانانە ئێستا لە کوێن؟

ـ ئەوان چوونە گەڵ چلسوارەی غەیبی.

ـ ئەها، هەر بەو چەشنە درۆیانەیە کە تۆ خەڵکی دڵپاك و بە ئیمان فریو دەدەی و سواریان دەبی!

ـ ئەمن کارم بە وەی نیە ئەتۆ باوەڕ دەکەی، یان نا! کەیفی خۆتە، باوەڕ ناکەی، مەیکە!

عارف سایم بەگ بە مستی، بە هەموو کەیفی خۆی لە مێزەکەی دا، هێندە توندی لیّدا پەنجەرەکەش لەرزی:

ـ ئاخر کەنگیّ ئەم ولاّتە لە دەست درۆودەلەسەی ئێوە ڕزگار دەبیّ؟ کەنگیّ؟

ـ ئێمە درۆزنمان تیّدا نیە. هەزار ساڵ دەبیّ درۆ ڕووی دەو جێگا پیرۆزەی نەکردوە! ئینسانی ناڕاست لە نێو ئێمە دا جێی نیە، تەنانەت دارەکانیشمان خوار نین... ئەو خانەقایە ئی چلچاوییە، ئی پیاوچاك و شێخە چاوکاڵە حەقخوازەکانە!

ـ ئەدی ئەو کەشف و کەرامەتانەی دەیاننوێنی؟

ـ نە من و نە کەسی دیکەی خانەقای چلچاوی، کەسمان نەیگوتوە کەشف دەنوێنیّ، یان موعجیزەی هەیە...

ـ دەڵێن ئەتۆ مردوان زیندوو دەکەیەوە و برینداران چاك دەکەیەوە، تەنانەت ئەگەر کەسێك جەرگ و دڵی بە گوللەی لەتوپەت بووبیّ، بێتە لای تۆ چاکی دەکەیەوە! حاشا لە وەش دەکەی؟ توانای ئەو شتانەشت نیە؟

ـ ئەمن خۆم هیچ چەشنە دەسەڵات و هێزێکی نادیار و ناسروشتیم نیە. موعجیزە و هێزی نادیار و ناسروشتی دە گوڵان دا، دە داران دا، دە گیاوگۆڵ و مێشومەگەزی دایە. موعجیزە دە دەروونی ئینسانەکان دایە. ئەوەی نەخۆشەکان چاك دەکاتەوە ئەمن نیم، بەڵکوو ئەو دەرمان و مەڵحەمانەن کە من بە پێی ئەزموون و زانیاریی خۆم لە سەدان و هەزاران چەشنە گیا و داران دروستیان دەکەم.

ـ هەر بەو دەرمان و مەڵحەمانەش بوو برینی حەمەدۆکیت چاك کردەوە، وایە؟

ـ بەڵیّ، وایە.

ـ ئەگەر ئەتۆ جادووگەر نی، بۆچی کراسە بەنێوبانگەکەت داوە بە چەتەیەکی وەك حەمەدۆکی! مەبەستم ئەو کراسەیە کە نۆهەزار و نۆسەد و نەوەد و نۆ ئایەت و دوعای لە سەر نووسراوەتەوە!

ـ بۆ ئەوەی لە برینی گوللەی پارێزراو بیّ!

ـ یانی ئەتۆ پێتخۆش نیە ئەو پیاوکوژانە، کە هەر کامەو لانی کەم پازدە کەسیان کوشتوە، گوللەی دەوڵەتێیان ویّکەویّ؟

ـ هەر خودا بۆخۆی دەزانیّ کیّ بە ڕاستی پیاوکوژ و تاوانبارە...

ـ ئەتۆ نوشتووت بۆ نووسیون و ئەنگوستیلەشت داونێ، تا لە ترس، دڵەڕاوکێ و نەخۆشی‌یانیش دووربن و گوللەش کاریان لی‌نەکا...

ـ ڕاستە...

ـ بێجگە لە وەش خانەقاکەت، ئەو ناوەندەی کۆنەپەرستی‌یەت، کردۆتە حەشارگەی ئەو تاوانبار و پیاوکوژانە!

ـ نەخێر، هیچ‌کەس داوای لی‌نەکردووم لە وی بی‌شارمەوە.

ـ کردووتە، ئەتۆ شاردووتنەوە، بەڵگە و شاهید زۆرن... ئەتۆ... ئەتۆ...

ئارەقەی ڕەش و شینی دەرکردبوو و بە دەموچاوی دا دەهاتە خوارێ. ڕەگی ملی هەستابوون. لە داخان وەخت بوو بخنکێ. ئیدی خۆی پی‌ڕانەگیرا، لاقی دە عەرزی کوتان و بە هەموو هێزی خۆی گوڕاندی:

ـ بەڵێ کردووتە! شاردووتنەوە! بڵێ کردوومە و ددانی پی‌دا بێنە کە کردووتە... یاڵلا پیرێژن...

لێی چووبووە پێشێ و قامکی لە پێش چاوی ڕادەوەشاند:

ـ یاڵلا زمانت بگەڕێ... ددانی پی‌دا بێنە... چونکە ئێمە خانەقاکانتانمان خڕ کردوونەوە، فەقیر و ڕووتانمان لێ هان دەدەن. پێیان دەڵێن دژی دەوڵەت ڕاپەڕن. وانیە؟ دە قسە بکە ژنەتیو! قسە بکە... دەی... یاڵلا!

ئەوجار هێندێك بی‌دەنگ بوو. چاوەڕەوان بوو بزانێ دایە سوڵتان دژکردەوەی چۆن دەبێ، بەڵام ئەو هێدی و لە سەرەخۆ، بی‌ئەوەی ڕاچەنێ، یان نیشانەی ترسی پێوە دیار بێ، تەنیا تێی‌هەڵدەڕوانی. ڕوانینیەکەی بی‌منەتی پێوە دیار بوو. وەك ڕوانینی کەسێك بوو کە لایەنی بەرامبەری بە هێند ناگرێ و ئەو توند و تیژی‌یەش کار ناکاتە سەر ورە و هەڵوێستی. عارف سایم بەگ هەستی کرد لە بەرامبەر ئەو ژنەی دا زۆر چکۆڵە بۆتەوە، هەربۆیەش لە داخان ناگری گرت و گوڕاندی:

ـ زمانت بگەڕێ، قەحبە! هەرچی پیاوی ئەو شاخانەیە، وەسەرت پەڕیون!

سێبەری زەردەخەندەیەك بە سەر ڕوخساری دایە سوڵتانی کشا و سەری خوار کردەوە.

ـ بە هێندم ناگری، سەڵێتە! یاڵلا قسە بکە، قسە بکە، جندە!

عارف سایم بەگ هەستا، لە ژوورەکەی دا دەستی بە ڕاوێچکان کرد، چەند جاران ئەو سەرەوسەری ژوورەکەی کرد و پاشان هاتەوە، لە پێش دایە سوڵتانی ڕاوەستا، لاقی دە عەرزی کوتان و قسە و جنێوەکانی دووپات کردنەوە. دایە سوڵتان ئیدی یەك وشەشی بە زاری دا نەهات، چاوی دە شوێنێکی ژوورەکەی بڕیبوو و مات ببوو.

ـ کەس تا ئێستا لە گەڵ من، لە گەڵ عارف سایم بەگی، ئاوا نەجووڵاوەتەوە! ئەتۆ سووکایەتیم پێدەکەی! ئەتۆ جنێوان دەدەی! ئەها ئێستا لێوت دەبزوون، بەڵام بە دەنگ هیچ ناڵێی! پێتوایە نازانم دەڵێی چی؟ یان نازانم بێدەنگی‌یەکەت یانی چی؟ پێمبڵێ بزانم ئەتۆ کێی، پیرە قەحبە! دەزانم لە بن لێوتەوە جنێو بە دایکم و خێزانم دەدەی. دایکیشم مردوە. ئەتۆ چی، جندە؟ بەڵێ، هەمووم گوێ لێیە. دەزانم لێوت دەبزوێ، دەڵێی چی... بە ڕاستی پێتوایە ئەتۆ کێی؟ با ئەمن پێتبڵێم، ئەتۆ جندەیەکی هەموو ڕۆژێ لە شاخی سەد شوانت وەسەر پەڕیون! قەتیش تێر نابی!

عارف سایم ئاگای لە خۆی نەمابوو، هەر دەیگوڕاند و جنێوی دەدان. تووڕەیی‌یەکەشی ساتبەسات زیاتر دەبوو. سەرەنجام دەمانچەی هەڵکێشا و لە سەر لاچاوی دایە سوڵتانی دانا. چاوی سوور هەڵگەڕابوون و ددانی دەچیڕەوە دەبردن:

ـ جندە، قسەکانت بخۆوە! دەنا مێشکت بەو دەمانچەیەی بڵاو دەکەم! بێدەنگی بەسە، یاڵلا قسان بکە! هەرچی دەیڵێی بیڵێ، ئاوا زارت دامەخە! ئەو بێدەنگی‌یەت جنێوە، سووکایەتی‌یە بە من، گاڵتەکردنە بە من! نایەڵم بەو بێدەنگی‌یەت سووکایەتیم پێبکەی وبمشکێنی. ئەوقسانەی ئێستا کردتن، حاشایان لێبکە! بڵێ ئەمن وام نەگوتوە! دەی یاڵلا، زارت بکەوە!

دایە سوڵتان هەروا مات و بێدەنگ بوو و هیچ گۆڕانێکی بە سەر دا نەهات. عارف سایم بەگ دەمانچەکەی بە لاچاوی‌یەوە دەگوشی، بەڵام بە ئاشکرا دەستی بە دەسکی دەمانچەکەیەوە دەلەرزی. کاتێك زانی دایە سوڵتان هەر هیچ ناڵێ، بە جارێك دەرهەڵبوو و دیسان دەستی بە جنێو و هەڕەشان کردەوە:

ـ دەبێ قسان بکەی، جندە! دەنا دەتکوژم! بە شەڕەفم دەتکوژم! یاڵلا زمانت بگەڕێ و چی‌دی لە بن لێوتەوە جنێو بە دایکی خوالێخۆشبووم مەدە! دەی، قسە بکە دەی. دەزانم بەو بێدەنگی‌یەت پێتخۆشە بمشکێنی، ئازارم بدەی، سووکم کەی! دە بەسە! تکات لێدەکەم، جندە...

دایە سوڵتان سەری هەڵێنا و تێیهەڵڕوانی. ڕوانینەکەی دیسان پڕ لە بێ‌منەتی و بەهێندنەگرتن بوو، وەك ئەوەی چاو لە شەیتانۆکەیەك یان لە مێشوولەیەکی بکا. وەك ئەوەی کەسێکی بە دەسەڵاتی گەورە چاو لە کابرایەکی سووکەڵەی دەستەوەستان بکا. دەتگوت بە زمانی بێزمانی دەڵێ: "عارف سایم بەگ، جەنابی نوێنەر، ئەتۆ هێندە سووك، بێبایەخ، زامانشر و خوێڕیی، کە مرۆڤ بە وەڵامدانەوە و قسە لەگەڵ کردنت هەست بە چووکبوونەوە دەکا". عارف سایم بەگی دڵڕەق تێكشکابوو و نەیدەزانی چ بکا. وەك شێتان بە دەوری خۆی دا ڕوانی، ویستی بگوڕێنێ، بەڵام دەنگی دەرنەهات. ئەو بارودۆخە بۆ وی یەکجار ناڵەبار بوو. بە پەلە بارودۆخەکەی دە مێشکی خۆی دا هەڵسەنگاند و

تیٚگەیشت دایە سوڵتان لێی‌ناترسیٚ و هەر لە جیٚ دا پێی‌خۆشە ئەو قامك بە پەلەپیتکەی دەمانچەکەی دا بێنیٚ و بی‌کوژیٚ. کە بیری لەوە کردەوە، ئەوەندەی دیکە تێك‌چوو. وەك ئاسمانی بە سەر دا برووخیٚ، وا بوو. ناچار دەمانچەکەی لە سەر لاچاوی دایە سوڵتانی لابرد و دە کیفەکەی لاقەدی نایەوە. دەستی بە ڕاوێچکان کردەوە و هێندێك هێدی بۆوە. دەسرەیەکی لە گیرفانی دەرێنا و ئارەقەی نێوچاوانی پیٚ‌سڕی‌یەوە. چەند دەقیقەیەك هەر وا بیٚ‌دەنگ هات و چوو و کاتێك هەستی کرد تا ڕادەیەك وەخۆ هاتۆتەوە، لە جێگای خۆی لە بەرامبەر دایە سوڵتانی دانیشتەوە:

ـ پیرێژن، بزانە چت پیٚ‌دەڵێم و بزانە ئەوەی پێشت دەڵێم بە ڕاستیمە: یان ئەوەیە حاشا لەو قسانە دەکەی کە تاوێك لەمەو پێش پێت‌گوتم، یان شتێکت بە سەر دێنم کە تا ئێستا لە هیچ شوێنێکی بە سەر هیچ ژنێکی دیکە نەهاتوە! پێنج دەقیقان ڕادەوەستم، جا ئەو کاتی یان وەقسە دێی، کە بە سوودی خۆتە، یان... جا بزانم حەکەدار، کە شوانی ئەو شاخانەت هەموو بە خۆت فێر کردوون، هەر وا بیٚ‌دەنگ دەبی؟

سەعاتەکەی لە گیرفانی دەرێنا و لە سەر بەری دەستی دانا. ئەو کەسانەی لە نێو ژوورەکەی دا بوون، هەموویان بیٚ‌دەنگ بوون، تەنانەت دەنگی هەناسەشیان نەدەهات. تەنیا چرتەی سەعاتەکەی دەبیسرا. چرکەژمێری سەعاتەکەی وردە وردە دەبزووت و دەو بەینەی دا عارف سایم بەگیش جار جار چاوی لە دایە سوڵتانی دەکرد و جارجاریش تەماشای سەعاتەکەی دەکردەوە. دایە سوڵتانی پیر لە جێی خۆی دانیشتبوو، هێدی، بیٚ‌دەنگ و هەست، دەت‌گوت بە کورسی‌یەکەیەوە ڕەق هەڵاتوە. هیچ ئاڵوگۆڕێکیش دە ڕوخساری دا نەدەدیترا. ڕوانینی جەنابی نوێنەریش هەر وا لە نێوان دایە سوڵتان و سەفحەی سەعاتەکەی دا دەگەڕا. سەرەنجام پێنج دەقیقەکە کۆتایی هات.

ـ ئەها، وا دیارە بڕیارت داوە قسە نەکەی و وەجواب نەیەی، قەحبە... گەمەم پیٚ‌دەکەی و پێشت وایە هەر وات بۆ دەچێتە سەر؟ پێت وایە ئەمن ئاوات لیٚ‌دەگەڕێم!؟ ئەمن کە لە شەڕی سەربەخۆیی دا...

قسەکەی تەواو نەکرد و پێی‌وا بوو پێویست نەبوو ئەوەی بڵیٚ. تا ئێستا هیچ کاتێك ئاوا خۆی بە تێشکاو و بیٚ‌دەسەڵات نەهاتبووە بەرچاو. دیسان گوڕاندی:

ـ جادووباز، ئەتۆ هەر سیحربازی و هیچی دی... ئەتۆ قسەی سووك بە دایکم و خێزانم دەڵێی... جندە...

ساتێك بیٚ‌دەنگ بوو و دیسان دەستی پیٚ‌کردەوە:

ـ هیچ ناڵێی، ها؟ لە پێش چاوی خۆم گاڵتەم پیٚ‌دەکەی؟ زۆر باشە، بەڵام ئیدی ئەمنیش بۆخۆم کارم پێت نیە. بڕوانە پیرێژن، بزانە چت پیٚ‌دەڵێم! خۆ ئەو ژاندەرمانەت دیتوون...

ڕووی دە یاوەر و ژاندەرمەکانی کرد:

ــ بمبوورن بەڕێزان... گوێت لێبێ پیرێژن، ئەو ژاندەرمەخانەیە زیاتر لە سەد ژاندەرمەی لێیە، هەموویان پیاوی بە هێزن و تەمەن دەوروبەری بیست ساڵن. لە پێش دا دەتدەمە دەست سەرجووخە عەلی و ئەگەر ئەویش قوفڵی زمانتی بۆ نەشکا، بە وانی دیکەت دەسپێرم. فەرمانیشیان پێدەدەم هەموویان وەسەرت پەڕن. دیارە ئەتۆی چرچ وپیریان بە کەیفێ نیە، بەڵام هەرچۆنێك بێ، جحێڵن و فەرمانی من بەڕێوە دەبەن. ئەوان ئەرکی خۆیان جێبەجێ دەکەن... تێگەیشتی؟ جا ئەگەر ئەوەت پێخۆشە، قەیدێ ناکا هەر هیچ مەڵێ و بێدەنگی مەشکێنە! مەشڵێ شێخم، دەستم لێدەپارێزن، مایەم بۆ دادەنێن، یان ناوێرن دەستم بۆ بێنن! ئەوە دە فریات نایە. کوڕەکانی ئێمە ژنە شێخیان پێخۆشترن، چونکە پێیانوایە لەبارترن. دەی ئەو جار پێمبڵێ جندەی خانەقای چلچاوی، کە لە شاخی دە گەڵ سەد شوانان نوستووی، دیسانیش هەر قسە ناکەی و بەو شێوەیە گاڵتە بە من دەکەی و دەمشکێنی؟

عارف سایم بەگ ماوەیەکی باش هەوڵی دا، تووڕە بوو، جنێوی دا، گرژ بوو، نارەقەی ڕشت، گوڕاندی، هاتوهاواری کرد و تەنانەت وای لێهات کە کەوتە پاڕانەوەی: هەر زار بکاتەوە و تەنیا یەك وشەی بە زاری دابێ، لێیخۆش دەبم و بەڕێیدەکەمەوە. یەك وشە، تاقە یەك وشە... بەڵام دایە سوڵتان هەر وەك خۆی بوو، بێدەنگ و خامۆش، مەند و نارام. دەتگوت دیواری پۆڵای بە دەوری خۆی دا کێشاوە.

ــ سەرجووخە، لە زووەوە گوتوویانە کەسێك بە دەستی خۆی، خۆی بکوژێ، تاوانە بۆی بگری،(ئەوەی نەزانێ بۆ حاڵی خۆی بگرێ، گۆڕ بە گۆڕ دەبێ) وایە؟

ــ بەڵێ، جەنابی فەرماندەر.

ــ سەرجووخە، ئەو ژنە شێخە زمانی بەسراوە. لە تۆم دەوێ وەزمانی بێنییەوە و ناچاریشی بکەی لە بەر ئەو جنێوە پیسانەی بە منی داون، داوای لێبووردن بکا و حاشایان لێبکا...

ــ هەر چۆنی جەنابتان بڵێن، جەنابی فەرماندەر.

ــ وشیار بە! نەچی بیکوژی، یان سەقەتی کەی! ناخر دەبێ ئێمە بە ساغی و ڕێکوپێکی بیدەینە دەست ژاندەرمەکان!

ــ قوربان وا نامێنێ. باوەڕ بکە وا وە قسە دێ ئیدی هەر بۆشت بێدەنگ نابێ. ڕەشبین مەبە، جەنابی فەرماندە، حاشا لە جنێوەکانیش دەکا.

ــ زۆر باشە، ئێستا لێرەی بەرە دەرێ. کاتێکیش قسەی کرد و داوای لێبووردنی کرد، بیهێنەوە لای من. دەبێ کە هێناتەوە، ئیدی بێدەنگ نەبێ و وەك بولبولی بخوێنێ!

دیاره ئەگەر بە تۆش وە قسە نەهات، ئەوە دەیدەینە دەست ژاندەرمەکان. دواتریش ئەگەر هەر جێبەجێ نەبوو، تیکنیکی هەرە تازەی ئوروپایەی لە سەر تاقی دەکەمەوە وە قسەی هەر دێنم... سبەینێ سەعاتی دە، دەبێ هەر ئەلێرە، لەو شوێنەی ئێستا لێی دانیشتوە، وەك قشقەڵەێ بۆم بقرێنێ... ئەوەشت پێبڵێم بیکوژی، یان بۆت وە قسە نەیە، ئیدی بۆخۆم دەزانم چت لێدەکەم! لانی کەمەکەی دەبێتە ئەوە بۆخۆت لە هۆوەندەی بکەوی و زمانت نەگەڕێ!

ــ قوربان، دڵنیا بە کارێکی وا دەکەم زمانی بکاتەوە و قسان بکا!

ــ یاوەر، ئەتۆش دە ژاندەرمەی بەخۆوە و بەهێزمان بۆ هەڵبژێرە!

ــ تێگەیشتم قوربان.

ــ بەڵام ڕەنگە ئەوەندە، بۆ وی، دەو تەمەنەی دا، کەم بێ. کە وا بوو دەی دیش با ئامادە بن.

ــ چۆنی دەفەرموون، با وابێ.

ــ سەرجووخە عەلی، ئێرەی لابە و کاری خۆت دەست پێبکە.

ــ قوربان، بەردیش بێ، وەقسەی دێنم.

ژاندەرمەکان قۆڵی دایە سوڵتانیان گرت و هەڵیانئەستاند. لاقی نەبوو و نەیدەتوانی بە سەرپێوە ڕاوەستێ. بردیان لە ژێرزەمینێیان دانا. ئەم ژێرزەمینە کە بەندیخانە بوو، تەنیا فتیلەیەکی لێهەڵکرابوو. کە دەستی دایە سوڵتانیان بەر دا، کەوتە سەر عەرزەکەی کە سمیت کرابوو. ژوورەکە نمدار بوو و بۆنی شەی لێدەهات.

عەلی کەرتیش دە ژاندەرمەکان ڕاخوڕی:

ــ خێرا بن کورسییەکی بۆ دایە سوڵتانی پاك و پیرۆزم بێنن. هەردووك چاوم کوێر دەبن ئەگەر دایە سوڵتانی لە سەر ئەو سمیتەی ببینم. یاڵلا بڕۆن کام مۆبڵ لە هەمووان نەرمتر و باشترە، بیهێنن و بۆی دانێن!

پاشان دایە سوڵتانی هەڵێنا، چووە بن پێلی و بە پێوە ڕای گرت. ئەو ژنە پاك و پیرۆزە هەر یەسك و پێست بوو و وەك پەڕی باڵندان سووك بوو، هەر بۆیە هەڵگێڕ وەرگێرکردنی زەحمەت نەبوو.

ــ دایە سوڵتانی گەورە و بە ڕەحم، ژنە شێخی پاك و پیرۆز، بمبوورە، ئەمن ئامادەم لە ڕێگای تۆ دا خۆم فیدا کەم. هیچ تاوانی من نیە کە تۆیان هێناوەتە دەو کونەیەوە، تاوانی یاوەریش نیە، تەنانەت تاوانی عارف سایم بەگی نوێنەری بەڕێزیشمان، کە لە ئەنکەرەوە هاتوە، نیە! ئاخ جوانترین و پاکترین دایکی سەر ئەم عەرزە، ئەمن بە ڕووح و گیانەوە باوەڕم بە تۆ هەیە، ئەمن ئەو شانازییەم وەگیر کەوتوە کە لە بەر دەرگای خانەقای چلچاوی چۆکم

داداوە و چوارچێوەکەیم ماچ کردوە. ئەمن بێتاوانم... فەرمانەکە لە ئەنکەرەوە دێ، لە شارە هەرە گەورەکەمانەوە! هەر فەرمانێك لە وێشەوە بێ، دەبێ جێبەجێ بکرێ. ئەو فەرمانانە دەکرێ بڵێین وەك فەرمانی خودای وان! لە بەرت دەپاڕێمەوە، داوات لێدەکەم تۆڵەمان لێمەکەوە. ئەو پێیگوتی جندە، بەڵام ناسیباتی، وای پێنەدەگوتی. ئەو نازانێ ئەتۆ کێی، دەنا چۆن وات پێدەڵێ. هەر بۆخۆشی عادەتی بە گرژی و جنێودان گرتوە و لە گەڵ هەموو ژنانی دیکەش کە وەك تۆ خاوەنی کەسایەتین و جوان و پاکن، هەر وا دەجوولێتەوە و پێیان دەڵێ قەحبە! دەڵێی چی خووی بەوە گرتوە. کابراش خووی بە شتێکی گرت، بۆی تەرك ناکری(خوویەك گرتت بە شیری تەرکی ناکەی بە پیری)! لە بەرت دەپاڕێمەوە، داوات لێدەکەم دایە سوڵتان حاشا لەو جنێوانە بکە...

ژاندەرمەکان گەڕانەوە، مۆبلێکی کۆنی شڕی تۆزاوییان لە گەڵ خۆیان هێنابوو. عەلی کەرتیش دایە سوڵتانی لە سەر مۆبلەکەی دانیشاند.

ــ فەرموو لە سەر ئەو مۆبلەی دانیشە. ژنی گەورە و پیرۆزی وەك تۆ جێی خۆیەتی لە سەر کورسیی پاشایان دانیشێ!

عەلی کەرتیش زۆری ئاگا لە خۆی نەبوو، شلەژابوو، هەروا بە دەوری دایە سوڵتانی دا هەڵدەسووڕا و قسەی دەکرد. لە پڕ بانگی کردە ژاندەرمەکان و گوتی:

ــ بڕۆنە ماڵی ئێمە! بە خێزانم بڵێن دۆشەکێکی زۆر باش، سەرلێفێکی خاوێنی سپی و لێفەیەکی خورێمان بۆ بنێرێ. پێیبڵێن دایە سوڵتان گەورەی کردووین و ئەمشەو میوانمانە. هەروەها پێیبڵێن شۆرباوێکی خۆشیش لێبنێ.

پاشان لە پێش دایە سوڵتانی چۆکی دادان، دەستی گرت، سێ جاران ماچی کرد، لە سەر سەری دانا و هەستایەوە. هەستی کرد نێو ژوورەکە زۆر تاریکە و هەر بۆیەش غاری دا پڵیتەی فتیلەکەی هەڵکێشا و دیسان چۆوە لای دایە سوڵتانی، کڕنۆشی بۆ برد، دەستەکانی چەپ و ڕاست لە سەر سینگی دانان و بێدەنگ ڕاوەستا. دایە سوڵتان سەری هێندێك بەرز کردەوە، دەتگوت چاو لە وی دەکا، تەنانەت بزەیەکی ساکاری بێگیانیشی هاتێ. عەلی کەرتیش ڕای کردە پێشێ و هەردووك دەستی دە دەستی خۆی گرتن:

ــ زۆر باشە، وا دیارە دەتەوەێ حاشا لە جنێوەکان بکەی! نەخێر، نایکەی؟ تکات لێدەکەم لە بەر خاتری من بیکە، دایە! هەموو شتێکت بە قوربان دەکەم، هەرچی هەمە با فیدای سەرت بێ، ژنەکەم و منداڵەکانیشمت دە سەر دەگێڕم! دیتت ئەو کابرا ڕەزاگرانە لەو سەرەی

چی پێ‌گوتی؟ گوێت لێ‌بوو؟ ئەگەر دیسان هەر هیچ نەڵێی، ئەتۆ دەکوژێ و ماڵەکەشم بە سەر من دا دەڕووخێنێ! هەر نەبێ بەزەییت بە من دابێ، دایە سوڵتان! ئەوە خێزانیشم بە ژاندەرمەکان دا شۆرباوێکی خۆشت بۆ دەنێرێ. خۆ ئەتۆ چەند ڕۆژە تاقە پاروێکیشت نەچۆتە دیوی زگی! ئەمن زۆر سەرقاڵ بووم، بەڵام هەر بیرم لە وەی دەکردەوە کە ئەتۆ هیچت نەخواردوە و دەبێ خواردنێکی باشت بۆ بێنم. پێم‌بڵێ چت پێ‌خۆشە دایە سوڵتان؟ هەنگوین؟ جەرگی برژاو؟ مریشکی سوورەوەکراو؟ ئەتۆ هەر ئەوەندە بڵێی چت پێ‌خۆشە، ئەمن لە پشتی شێرانیش بێ، بۆت دێنم! ئاخ... ئەگەر ئێمە لە سەرەوە فەرمانی گرتنی تۆمان بۆ نەهاتبایە، ئەمن هەرگیز چاوم بەرایی نەدەدا لە شوێنێکی ئاوات ببینم! دە فەرموو خاتوونی چاوجوانی پیرۆز، پێم‌بڵێ ئیشتیات لە چی‌یە؟ چ دەخۆی؟ چت پێ‌خۆشە؟ دەسبەجێ بۆت ئامادە دەکەم.

دایە سوڵتانی پیر لە سەر مۆبڵە کۆنەکەی خۆی خڕکردبۆوە و هیچی نەدەگوت. بۆخۆی چکۆڵە بوو، بەڵام چاوەکانی گەورە بوون. عەلی کاتێك چاوی دە چاوی ئەڵقا، ترسا، ڕاچڵەکی و چی وای نەمابوو لە وێ ڕا بکا. ئەو تێڕوانینە وەك خەنجەرێ کاری لە جەرگی دەکرد و نەشی دەتوانی خۆی لە دەست دەرباز کا.

ــ دایە سوڵتان، دەستم بە دامێنت، بەزەییت پێم‌دابێ، هێندەم ئازار مەدە! گوتوومە دۆشەکت بۆ بێنن، چێشتی خۆشت بۆ ئامادە دەکەم... تۆخوا بمبوورە! لە ئەنکەرەوە فەرمان بە ئێمە دەدەن، لە شارە هەرە گەورەکەوە، دەنا ئەمن دەم‌هێشت دێرە دا بی؟ دەو کونە گورگەی دا؟ ئەمن بەندەیەکی بێ‌دەسەڵات و بەسزمانی ئەو خوایەی زیاتر نیم، تکات لێ‌دەکەم، لەو بەندە چارەڕەشەی ببوورە!

گەڕێك بە دەوری مۆبڵەکەی دا سووڕا. لاقی لە دوو نەدەهاتن، چۆکی دەفیزان و هەموو گیانی دەلەرزی. دیسان لە پێش دایە سوڵتانی چۆکی دادان و دەستەکانی ماچ کردەوە. لەشی وا دەلەرزی، ناچار بوو هەستێ و لە ژوورەکەی بچێتە دەر. کێشکچیی گرتووخانەکەی لە بەر دەرگایە ڕاوەستابوو. عەلی ڕووی تێ‌کرد و گوتی:

ــ دەزانی ئەو ژوورە کێی تێ‌دایە ئیدی؟ دایە سوڵتانە دە وێ دایە. تا دێمەوە،چاکت ئاگا لێی‌بێ! دەرگاکەی چاك داخە... چاوەکانی... ئاگات لە خۆت بێ... چاوەکانی... هەر کات پێی‌خۆش بێ، دەتوانێ لێرە بێتە دەر و بڕوا... دەتوانێ... وەك ئاوخواردنەوەی بۆی دەکرێ... هەموو دەرگاکانی بۆ دەکرێنەوە... دیواری هەموو بۆ دەقەڵەشنەوە! چاکت ئاگا لێی بێ! ئای لەو چاوانە، بریا دیباتن...

سێ ـ چوار ژاندەرمەی وە دوو خۆ دان و لە وێ دور کەوتەوە. تێڕوانینی دایە سولتانی دەستی لێهەڵنەدەگرت. هەستی دەکرد ئەو تێڕوانینە بە سام و تیژەی هەر لە سەرە، جار بە جار زیاتر ئالۆزی دەکا و دەروونی دەشێوێنێ. دەتگوت لاق و دەستیشی ئیفلیج کردوە. هەر دوعای دەکردن و دەپاڕایەوە: یاڕەبی دەرگاکان بشکێن، دیوارەکان بە سەر یەك دا بڕووخێن، دایە سولتان لەو کونە گورگەی بێتە دەرێ و بڕوا! باشە ئەگەر ئەو ژنە شێخ بێ و خاوەنی موعجیزە بێ، ئەوەی بۆ هاسانە. هەر وا دەڕۆیی و بیری دەکردەوە. یاڕەبی خودایە وا بێ! هەتا ئەمن دەگەڕێمەوە لە وێ نەمابێ و ڕۆیشتبێ. ئەو جار ئیدی ئەمن ئاسوودە دەبم و تووشی بەلآیان نابم. ئەو جار ئیدی ترسی تووك و نزای شێخ و پیاوچاکانم نامێنێ...

گەیشتەوە ماڵەکەی خۆی. لە هەیوانی پێش دەرکێ تووشی خێزانی بوو:

ــ ئەوە چی‌یە عەلی؟ چ قەوماوە؟ دایە سولتان چ بەلآیەکی بە سەر هێناوی؟ بێ‌گومان هێشتا قسەی نەکردوە و ددانی بە هیچ دا نەهێناوە!

عەلی پشووی سوار ببوو و هەر دەفی دەدان. بە پەلە خۆی بە سەر کورسی‌یەکی دادا و دانیشت. ژاندەرمەکانیش شڵەژابون و ترس و دڵەڕاوکێ بە ڕوخساریانەوە دیار بوو. عەلی بە هانکە هانك گوتی:

ــ ئاو، ئافرەت، هێندێکم ئاو بۆ بێنە... ئای چاوی... چاوی...

ــ چاوی چی‌یەتی؟ یانی چی؟

ــ پەرداخێکم ئاو دەیە...

خێزانی قاپێك ئاوی بۆ هێنا و عەلی یەکجێ ئاوەکەی پێداکرد:

ــ هێندێکی دیکەشم بۆ بێنە...

ژنەکە چەند جاران خێرا خێرا ڕای کرد، قاپەکەی پڕ کرد و بۆ عەلی و ژاندەرمەکانی هێنا. سەیر بوو تێریان نەدەخواردەوە. دەتگوت هەموویان چەند ڕۆژە ئاوایان نەخواردۆتەوە و لە تینوان وشك بوون.

دوای ماوەیەك عەلی هێندێك هاتەوە سەرخۆ و بە ژنەکەی گوت:

ــ خێرا کە ژنەکە، خواردەمەنیمان چ هەیە بۆم بپێچەوە تا بۆی بەرم. دایە سولتان لە برسان دەمرێ. چەند ڕۆژە نە هیچی خواردوە و نە هیچیشی خواردۆتەوە. ئەو بمرێ، ئەمنیش دەمرم، بمرێ هەر ئیدی بۆ هەموومان باسی سەرە... بمرێ، بەردمان بە سەر دا دەبارن... بمرێ، دنیا خرا دەبێ، سێڵاو هەڵدەستێ، بوومەلەرزە دێ، وڵات ئاو دەیبا... بۆ خاتری خودای ژنەکە! هەر لە سایەی شێخ و پیاوچاکانەوەیە دنیا وەك خۆی ماوە و خرا نەبووە! ئێمە لە گەڵ

ئەو ژنەی خراپ جوولاوینەوە، بێڕێزیمان پێکردوە و پێمانگوتوە جندە! ئاخر چۆن شتی وا دەبێ؟ ئەویش بە قسەمان ناکا و قسەکانی پێشووی خۆی ناخواتەوە! چێشت و خواردەمەنی چمان هەیە؟ سەرلێفێکی سپیی خاوێن و دۆشەکێکی نەرمیشم بۆ بێنە. هیچ دوور نیە دەرگاکانی بە سەر دا بکرێنەوە و دیوارەکانیشی بۆ بقەڵشنەوە و ئەگەر خودا بکا وابێ، ئەمنیش ئەو بەزمەم لە کۆڵ دەبێتەوە، گوناهبار نابم و لە دنیا و قیامەتان ڕزگاریم دێ...

ژنەکەی دەستی دە کەلەکەی نا، لە پێشی ڕاوەستا و تێیڕاخوڕی:

ـ عەلی، عەلی، ئاگات لە خۆت بێ! ئەتۆ سەرجووخە عەلیت پێ دەڵێن و وەك خەڵکی دیکە نی! ئەتۆ کۆڵەکەی ئەو دەوڵەتەی! خۆ ئەتۆ پێتنەگوتوە جندە، بە تۆ چی وای پێگوتراوە؟ ئێمە چ کارێکی خراپمان کردوە؟ ئەگەر ئەو شێخیش بێ، دەبێ بزانێ کە ئەویش هەر ژنێکە وەك ژنانی دی و زیاتر نا... ئەویش مافی ئەوەی نیە جنێو بە دایك، خێزان و خوشکانی ئەو دەوڵەتەی بدا. ئێستاش کە ئەوەی کردوە، ئامادەش نیە حاشا لە قسەکەی بکا و داوای لێبووردن بکا، کە وا بوو...

عەلی هاواری کرد:

ـ وست بە ژنەکە، بێدەنگ بە! داوا بکە خودا بتبەخشێ! بۆ خاتری خودای، جارێکی دیکە قسەی وات لە زاری نەیەنە دەر! خانەقای چلچاوی زۆر پیرۆز، گەورە و بە دەسەڵاتە. بۆ خاتری خودای بێدەنگ بە!

ژنەکەی دەسبەجێ وەڵامی دایەوە:

ـ ئەمن پەکم بە وەی ناکەوێ کێ گیراوە و کێ قسەی پێگوتراوە. ئەتۆش هێندە خۆت ناڕەحەت مەکە. ئێمە لەو شتانە دا تاوانبار نین. ئێوە لە شوێنی هەرە سەرووەوە فەرمانتان بۆ هاتوە. با ئەو ژنە بۆخۆی هەوڵ بدا ئەو کێشەیە لە گەڵ پێتەخت ببڕێتەوە...

ـ کچێ ئافرەت، پێمگوتی ئەو قسانە مەکە! زمانت بە مەڵاشووتەوە دەنووسێ و منداڵەکانمان تووشی چارەڕەشییە دەبن! پیاوی چا بە ژنەکە کاتێك مەبەستت دایە سوڵتانە، مەڵێ ئەو ژنە! بۆچما نازانی ئەو شێخە، پیرۆزە و سوڵتانە! خۆزیا چاوەکانیت دیبا... بێدەنگ بە. ئەتۆ هەتا گوێیان دە گوناهان دا نوقم دەبی. گوتم زوو بە برۆ شتێکم بۆ بپێچەوە با بۆی بەرم.

ـ بێدەنگ نابم! بۆ بێدەنگ بم! ئەویش ژنێکە وەك من و ئەو هەموو ژنانەی دیکە و دەبێ قەدری خۆی ڕاگرێ!

دەنگی ژنەکەی پڕ بوو لە ڕق و تووڕەیی. عەلی کەرتیش هەستایە سەر پێ، چاوی دە چاوی بڕی و لە سەرەخۆ گوتی:

ـ پێمگوتی بێدەنگ بە کچی!

ژنەکە زانی نابیّ چی دیکەی لە سەر بڕوا، بیّ‌دەنگ بوو و چوو لێفە، دۆشەك و سەرینێکی خاوێنی هێنان و لە وێی دانان.

عەلی کەرتیش بە ژاندەرمەکانی گوت:

ـ ئێوە ئەو نوێنویانە بەرن، منیش شۆرباوەکەی دێنم. لە بیرتان بیّ نابیّ بە هیچ شێوەیەك خۆتان نیشانی یاوەر و عارف سایم بەگی بدەن. ئەگەر لە ڕێگایە تووشی کەسێکی دیکە بوون و لێی‌پرسین بڵێن ئەوانە بۆ یاوەری دەبەین...

ژنەکە بە لالووتی لە چێشتخانەی دانیشتبوو، بەڵام ئێستا دوای ئەو دەمەقاڵەیە لە گەڵ مێردەکەی هێندێك پەژیوان بوو و هەستی بە ئالۆزیی دەروون و مەترسی دەکرد. تاقە دوعایەکی دەزانی و هەتا شۆرباوەکە وەکوڵ هات، ئەو دوعایەی دە جار دووپات کردەوە. عەلی کەرتیشیش هەر بیری لە چاوەکانی دایە سوڵتانی دەکردەوە، کە لە کۆڵی نەدەبوونەوە و لە بەر چاوی ون نەدەبوون. لە پڕ وەخۆ هاتەوە، چووە چێشتخانەکەی و گوتی:

ـ چ بوو، ئەو شۆرباوە هەر ساز نەبوو؟

ـ با، ئەوە دەکوڵیّ.

ـ بۆ خاتری پیر و پێغەمبەران زووبە... ئای ئەو چاوانە چم لیّ‌دەکەن...

ئیدی چی دیکەی نەگوت و لە سەر کورسی‌یەکی دانیشت، بەڵام تاقەتی نەهێنا. کوورەی دەروونی وا داییسا، حەجمینی لیّ‌هەڵگیرابوو. هەستا بەرماڵێکی هێنا. بەرماڵەکە پێستە ئاسکێکی جوان بوو، کە خۆش کرابوو و کردبوویانە بەرماڵ. بەرماڵەکەی ڕاخست. چوو دەسنوێژی هەڵگرت و هاتەوە نوێژی کرد و هێندێك دوعای خوێندن. نوێژەکە هێندێکی هێدی کردەوە.

شۆرباوەکە دەمێك بوو گەیشتبۆیە. خێزانی قابڵەمەیەکی چکۆڵەی لیّ‌هەڵێنجابوو، پێچابوویەوە و بۆی لە ویّ دانابوو. کاتێك عەلی لە نوێژەکەی بۆوە، هەستا، دەستی دا چێشتەکەی و گوتی:

ـ ژنەکە مەترسە، خوا گەورەیە. ئەو خوایەی کە یۆسفی لە بنی چاڵاویّ دا پاراست و ڕزگاری کرد، ڕەحمێکیش هەر بە ئێمە دەکا.

ـ وایە، عەلی گیان، خودا بۆخۆی گەورەیە، سەرجووخەی خۆشەویستم! خۆ ئێمە چی خراپمان نەکردوە و خراپەشمان بۆ کەس نەبووە. دەوڵەت بۆخۆی ژنە شێخێکی ئاوا گەورە دەگریّ، دە گرتووخانەی دەکا و پێشی دەڵیّ جندە. ئەوە خۆ تاوانی ئێمە نیە. ئەوەتا ئێمە ئەوەندەی بۆمان کراوە، خزمەتمان کردوە و ڕێزمان گرتووە. چاو ئەو شۆرباوەی بۆم لیّ‌ناوە! وەڵلاهی هەرکەس بۆنی ئەو شۆرباوەی بۆ بچیّ، زاری پڕ دەبیّ لە ئاو.

ژنەکە پاشان سەری بەردایەوە، تفی نێو زاری بە زەحمەت قووت دا و گوتی:
ـ عەلی، ئەو شۆرباوە خۆشەم لێناوە... بەشی دایە سوڵتانیم لێ هەڵێنجاوە و بەشی خۆشمان دە دیزەکەی دا ماوە. ئەتۆ قەت لە وەختی جەمیّ دا لە ماڵ نی و لە گەڵ ئێمە نانی ناخۆی. بۆ هێندێك ڕاناوەستی؟ منداڵەکانیش هەربینا هاتنەوە. با ئەمجار هەموومان بە یەکەوە نانی بخۆین!
ـ ئاخ ژنە بەسزمانەکەم... نازانی چەند پەرێشانم... یەك پارووشم بۆ قووت نادرێ. دەبێ بچمەوە گرتووخانەی. دایە سوڵتان لە برسان دەمرێ! چەند ڕۆژە هیچی نەخواردوە... قەت داوای هیچیشی نەکردوە و ئێمەش بۆخۆمان بیرمان لە وەی لێ نەکردۆتەوە...
عەلی لە ماڵێ وەدەرکەوت و ڕۆیی. کاتێك گەیشتەوە ژاندەرمەخانەی، تەمەشای کرد هەموو ژاندەرمەکان لە بەر دەرگای ژووری بەندیخانەکەی کۆ بوونەوە.
ـ ئەوە چی‌یە؟ چ قەوماوە؟
ـ هیچ نەقەوماوە، سەرجووخە.
ـ ئەدی یاوەر لێرەی داناون؟
ـ نا... هەموو هاووتووین بزانین چۆن دەرگاکان دەکرێنەوە و دیوارەکان دەقەڵشێنەوە.
ـ دەی، جا؟
ـ وەڵڵاهی دەمێکە چاوەڕوانین، چمان نەدیوە...
کێشکچی دەرگای گرتووخانەکەی کردەوە. دایە سوڵتان هەر وا دەنێو مۆبلەکەی دا خۆی خڕ کردبۆوە، هەڵکورمابوو و چاوی لە عەرزەکەی پێش خۆی بڕیبوو. لە پێش چاوی عەلی چکۆڵەتریش ببۆوە، بەڵام چاوەکانی گەورەتر و ئاواڵەتر ببوون.
ـ کوڕە زوو بن، لە سەرێ ڕا مێزێکی بێنن، کەوچکێکی زێویش بێنن.
ـ دایە سوڵتان، بە قوربانت بم، بە نۆکەرت بم، بخۆ. دە سەرت گەڕێم بخۆ. ڕەبی کوێربم، لاڵ بم، جا چاو ئێمە چەندە زاڵمین! خۆ ئەتۆ چەند ڕۆژە هیچت نەخواردوە.
عەلی کەرتیش نەیدەتوانی لە شوێنێك ڕاوەستێ. ناچار بوو ڕۆیشتە دەر، تاوێك لە نێو بازاڕی گەڕا و لە بەر دەرگای قاوەخانەی هەڵوێستەیەکی کرد. خەڵك هەموو بە ترسەوە چاویان لێدەکرد، بۆ هەر شوێنێکیش چووبا، چاوە گەورە بەسامەکانی دایە سوڵتانی هەر بە دووەوە بوون... ئاخ بۆ ئەو چاوانە لێم نابنەوە...
دایە سوڵتان بۆنێکی خۆشی بۆ هات، کونەلووتەکانی کرانەوە و دە قاپە شۆرباوەکەیەوە ڕاما. دەستی بۆ کەوچکەکەی درێژ کرد، بەڵام زوو دەستی کێشایەوە. دەتگوت دەستی بۆ پۆلووی ئاوری

بردوه. بۆنی شۆرباوەکەی ئەوەندە خۆش بوو کە لە سوێیان وەخت بوو ببووڕێتەوە. سێ جاران دەستی درێژ کرد و هەرسێك جارانیش بێ ئەوەی دەست لە شۆرباوەکەی دا، دەستی کێشایەوە. دایکی خۆی وەبیر هاتەوە کە ژنێکی پرچڕەشی باریکەڵەی کەڵەگەت بوو، ئەو کاتی خانەقای چلچاوی بەڕێوە دەبرد، قەتیش ماندوو نەدەبوو. خێرا خێرا سەری چێشتخانەی دەدا، چاوی لە چێشتەکان دەکرد کە لە مەنجەڵی گەورە گەورە دا لێدەنران و ڕێنوێنی چێشتلێنەر و کابانەکانی دەکرد. هەروەها لە گەڵ دەروێشەکان دەچووە نێو دارستانی و بە باوەشان ئەو گیایانەیان کۆ دەکردنەوە کە بۆ دەرمان دەبوون، دەیانهێنان و بۆخۆی بۆ نەخۆشانی دەکولاندن. کاتێك دەهات و دەچوو، بۆنی خۆش لە جلەکانی دەهات و ئەو نێوەی پڕ دەکرد. هەتا دەرمان و مەڵحەمەکان ساز دەبوون، زۆری پێدەچوو. سەرانسەری بەهاریَ جووتێرەکان بە ژن، پیاو و منداڵەوە دەچوونە شاخی، گوڵیان کۆ دەکردنەوە، دە گۆنیی گەورە گەورەیان دەکردن و دەیان هێنان. هێندێکیان مانگێك و هێندێکیان یەك ـ دوو حەوتوو کاریان ئەوە بوو، دەچوون گوڵی جۆراوجۆریان کۆ دەکردنەوە، دە گۆنییانیان دەکردن، گۆنییەکانیشان دێنا لە لە سەر چیمەنێکی نە حەساری خانەقایە کۆ کۆ هەڵیاندەڕشتن. هەر کۆ گوڵەی بە قەد باڵای پیاوێکی دەبوو. دەروێشەکان گوڵەکانیان بە پێی جۆر و تایبەتمەندییەکانیان لێكدەکردنەوە و دە مەنجەڵان دا دەیانکولاندن. مەنجەڵەکان بە ڕیز لە بن دیواری لە سەر ئاورگان دانرابوون و دەکولێن و کاتێك ئاوەکە خەست دەبۆوە و دەرمانەکە ئامادە دەبوو، شووشەی چکۆڵەی ڕەنگاوڕەنگیان لێپڕ دەکردن. سەردەمی گیا و گولکولاندنەوە و دەرمان سازکردنیَ نەك هەر دیوارەکان و حەسار و دەوروبەری خانەقای چلچاوی، بەڵکوو شاخەکان، ڕەوەزەکان، دارەکان و تەنانەت عەرزەکەش هەر بۆنخۆش دەبوون و ئینسان و مەڕ و ماڵاتیش هەر بۆنی گوڵیان لێدەهات.

جارێکیان، ئەو دەمەی ئەو هەر حەوت ـ هەشت ساڵ دەبوو، لە وەختی گوڵچنینیَ دا، لە گەڵ دایکی چووبووە شاخی. بەهار حەشری دەکرد. وڵات هەمووی گەش وزیندوو بوو. تەپکەکان، لاپاڵەکان، لاخڕەکان، دۆڵەکان و پاناوکەکان هەمووی پڕ بوون لە گوڵ. دایك و کچ ئەوێڕۆژی هەر گەڕان، خوار و ژووریان کرد، ئەمبەر و ئەوبەریان کرد و بناری شاخەکەیان هەموو پشکنی، بەڵام دڵیان نەهات تەنانەت چڵە گوڵێکیش هەڵکەنن. دایکی... دایکی سەیر نۆگر و ئەویندارى هەموو چەشنە دار، باڵندە، گوڵ و لە سەر یەك هەموو بوونەوەرەکانی خوای گەورە بوو. هەر نەخۆشێکی هێنابایانە لای و ئەو دەستێکی بە سەری دا هێنابایە، دەسبەجێ چاك دەبۆوە. لە خانەقاکەیەوە خۆشەویستی خۆی بە هەموو لایەکی ئەم جیهانە دا بڵاو دەکردەوە. شێت، ئیفلیج، ئەقوستان، ناتەواو و هەموو چەشنە نەخۆشێکی دیش و هەروەها ئەوانەی چەقۆیان لێدرابوو، گوللەیان وێکەوتبوو و بە تایبەت ئەوانە کە هەژار و بێتەنواش

بوون و هەر یەسك و پێستێکیان لیّمابۆوە، دەهاتنە لای، برینەکانی بۆ دەرمان دەکردن و چاکی دەکردنەوە. دایە سولتان ئەوەی لە دایکی بە میرات بۆ مابۆوە. ئەویش هەموو بوونەوەرەکانی نێو ئەم جیهانەی خۆش دەویست. هەرکەس داوای یارمەتیی لیّکردبایە، یان لێیقەومابایە و ڕووی تیّکردبایە، بە هانایەوە دەچوو و قەتیش بۆی گرینگ نەبوو ئەو کەسە لە چ نەتەوەیەکە، یان لە سەر چ دین و مەسەبێکە. بەران و مەڕە کێوی، نێری و بزنەکێوی، ئاسك... کەو، کۆترە سپیلکە و کۆترە شینکە لە شاخی ڕا دەهاتن و حەساری خانەقایەیان پڕ دەکرد. تەنانەت دە زستانیّ دا، کاتێك بەفر دەباری، گورگ، سمۆرە و دەعبای کێویی دیکەش، بیّترس، پەنایان بۆ خانەقاکە دێنا و قەتیش هیچکەس تووکێکی لیّ لار نەدەکردنەوە...

تینوێتی تەنگی پیّهەلّچنیبوو. ڕۆژ بە هەموو هێزی خۆیەوە لە سەر گوڵە مێلاقە زەردەکان کە تەواوی ئەو بەرپاڵەیان داپۆشیبوو، دەدرەوشایەوە. ماسییەکان لە نێو کانییەکی دا هەلّدەبەزین، هەموو جاریّ کە لەشیان لە ئاوەکەی وەدەر دەکەوت، دەتگوت خۆ دە شۆقی ڕۆژیّ هەلّدەکێشن... بەفر دەباری، بەلاّم نەخۆشەکان، پەککەوتەکان و سەقەتە بیّئەنواکان هەرچۆنێك بوو بە زگی برسییەوە خۆیان دەگەیاندە خانەقایە. دایکی...

دایە سولتان لە سەرەخۆ ئاوڕی دایەوە لای دەرکەی و قەلاّفەتی عەلی کەرتیشی وەك تارمایی وەبەرچاو کەوت.

ــ دایە سولتان، هێشتا هیچت نەخواردوە؟ یاخوا کوێر بم! ها... ئەستۆم شکیّ ئاوم بۆ نەهێناوی! ئاخر خواردن بە بیّ ئاو چۆن دەخوریّ... ئای کوڕە، کێشکچی، ئاویّ بێنە، زوو کە، ئاو!

دەسبەجیّ ژاندەرمەیەك گەیشتیّ و پەرداخێك ئاوی لە پێش دایە سولتانی دانا.

ــ فەرموو، ئەمەش ئاو. دە فەرموو بخۆوە دایە گیان. خۆ تۆ چەند ڕۆژە داوای ئاوێت نەکردوە! ئاخر ئینسان چۆن بیّئاو دەژی...

عەلی کەرتیش پەرداخە ئاوەکەی دە دەستی دایە سولتانی نا، بەلاّم ئەو دەستەکانی دەلەرزین و نەیتوانی پەرداخەکەی بگریّ. پەرداخەکە کەوتە خوار.

ــ ئاخر دایە ئاوا دەمری! ئاوەکەی بخۆوە و هێندێکیش لە شۆرباوەکەی بخۆ، تکات لیّدەکەم...

لەو کاتەی دا دیسان چاوەکان تێیەوە ڕامان. چ ڕامانێك! ڕاست وەك نووکی خەنجەرێی لە سەر دلّی نیشیّ، بەرگەی تێوەڕامانی ئەو چاوانەی نەگرت و ناچار ڕایکردە دەریّ.

هاشە وخوڕەی ئاوی ئاوهەلّدێران لە دۆلّ و لاپاڵەکان دەنگی دەدایەوە... بەفر لێینەدەکردەوە. هەزاران مرید و ئۆگری خانەقای چلچاوی بە سەر و چاوی بەفراوییەوە لە دەوری تەرمی دایکی کۆ

ببوونەوە. دایکی کۆچی دوایی کردبوو، بەڵام بە مردووییش هەر خێر و خۆشەویستیی بە دەوری خۆی دا بڵاو دەکردەوە. گوڵێکی شینی گەورە لە تەنیشت سەری گوڵی کردبوو و کەس نەیدەزانی ئەو گوڵە چۆن لە وێ پەیدا بووە. تەرمەکەش ڕەنگێکی مەیلەوشینی بە سەر کشابوو و بۆنی گوڵە بۆنخۆشەکانی شاخی لێدەهات. ژنان شینیان دەگێڕا، هێندێکیان دەلۆرانەوە و پێیانهەڵدەگوت. کۆمەڵە ژنێکی دیکە بە باوەشان گوڵی سپی‌یان دێنان و لە سەر قەبرەکەیان دادەنان. گوڵە شینەکە لە بن سەری ئەما و دواتر لە سەر گۆڕەکەی شین بۆوە، هەم گەورەتر و هەم جوانتر. هەموو کەس بە چاوی خۆی ئەوەی دی و گوڵەکەش قەت سیس نەدەبوو. دواتریش هەر مابوو و بە دایم شۆقە شینەکەی هەر هەبوو و دەوروبەری خۆی وەك ڕۆژێ ڕووناك دەکرد... پاشان ئەو سەردەمەی شازدە کەسەکەی ئەو بنەماڵەیە چوونە شەڕێ و نەهاتنەوە، گوڵەکەش ڕۆژێکیان، بەری بەیانی، پێش تاوهەڵاتێ ون بوو. بەڵام شۆقە شینەکە هەر وا مایەوە و دەوروبەری ئەو شوێنەی داگرت... دایە سوڵتان چووە نێو شۆقەکەیەوە، هەتا تاو هەڵات، دە نێوی دا گەڕا. لە گەڵ تاوهەڵاتی شۆقەکە دە کانی‌یەکی گەورە دا کۆ بۆوە. تەختی بنی کانی‌یەکەی یەکپارچە بەردی سپی بوو. لە وێڕۆژێوە ئاوی کانی‌یەکەی هەر شینە، بەردەکانی بنی کانیەکە، ڕەوەزەکانی دەوروبەر و ماسی‌یەکانی نێو کانی‌یەکەش هەر شینن...

دایە سوڵتان بە دوای گوڵە شینەکەیەوە بوو و ڕەنگی شین هەتا نێوقەدی دەهات. گوڵەکە چووە کانی‌یەکەیەوە. دایە سوڵتان هەستی کرد کەوتۆتە نێو دەریایەکی شین. بە زەحمەت هەناسەی بۆ دەهات و لەسەرەخۆ دەی‌ناڵاند. ڕاست لەو کاتە دا سەرجووخە عەلی هاتەوە ژوورێ:

ــ ئای خوایە گیان! کوڕە خۆ هێشتا نە نانی خواردوە و نە ئاوی خواردۆتەوە! دایە سوڵتان، دایە سوڵتان! ئاخر بۆ خاتری خودای بۆچی ناخۆی؟ بۆ ئەو ئاوەی ناخۆیەوە؟ دایە گیان، وەڵلاهی دەمری، دەمری دایە!

عەلی زۆری ناڵاند و لە بەری پاڕایەوە، بەڵام دایە سوڵتان لە جێی خۆی ڕەق هەڵاتبوو و تەنانەت ئیدی جووڵەشی نەدەکرد. چاوەکانی ئەوجار گەورەتریش ببوون. عەلی کەرتیش ترسا و ڕای کردە دەرێ. ڕۆیی، چووە لای پردێ، لە قەراغ چۆمی هێندێك هات و چوو، بە نێو دار و پنچکان دا گەڕا، چەند جاران لە چۆمی پەڕی‌یەوە و ئەوبەرەوبەری کرد، ناوەکە هەتا چۆکانی دەهات، بەڵام ئەو هەستی پێ‌نەدەکرد.

ئەو جار هاتەوە نێو شاری و بێ ئەوەی ئاگای لە خۆی بێ، چووە ژاندەرمەخانەی و لە وێش بە پەلە ڕای کردە خوارێ و چۆوە بەر دەرگای گرتووخانەکەی، بەڵام نەی‌وێرا بچێتە ژوورێ و بە ڕێگای خۆی دا گەڕایەوە:" ئەگەر دایە سوڵتان مردبێ، ئیدی ئەو ماڵوێران دەبێ." ئەو بیرە زیاتری شێواند. ڕۆیشت، چۆوە قەراغ چۆمی، دەسنوێژی هەڵگرت، ڕووی دە قیبلەی کرد و نوێژی کرد. پاشان دەستی بە

دوعایان کرد، هەم پەنای دەبردە بەر خودای و هەم هاواری دایە سوڵتانی دەکرد. چەند جاران دەسنوێژەکەی نوێکردەوە و پاشان چۆکی دادا و دەستی بە نوێژکردن و پاڕانەوەی کردەوە.

ڕۆژ ڕمبێك بڵیند ببوو. خەڵکی دێهاتی دەوروبەر بە پێیان، بە سواری بارگین، یان گوێدرێژی بە سەر پردێ دا دەپەڕینەوە و دەهاتن بۆ شاری. دوو ژاندەرمە بە پەلە ئەو بەری پردێوە دەهاتن. عەلی کەرتیش چاوی پێیانکەوت، بەڵام دەموچاویانی بۆ نێلکنەدەبۆوە.

ــ سەرجووخە، سەرجووخە! ئەوە لە کوێی؟ یاوەر بە دوات دا دەگەڕێ!

کەرتیش وەخۆ هاتەوە، خێرا هەستایە سەرپێ و گوتی:

ــ چی؟ یاوەر دەیەوێ چاوی پێمبکەوێ؟

ــ بەڵێ، هاتە ژاندەرمەخانەی و گوتی عەلی لە کوێیە. ئێمە هەموو ئەو دەوروبەرەت لێگەڕاوین و نەماندەدۆزییەوە!

عەلی کەرتیش بە ڕاکردن چۆوە بۆ لای شاری. وا هەڵدەهات ژاندەرمەکان نەیدەگەیشتنێ. کە گەیشتەوە ژاندەرمەخانەی، هەر چوار پلیکانەی دەکرد بە یەك و بەو شێوەیە وەسەرکەوت و خۆی گەیاندە لای یاوەری.

ــ ئەوە لە کوێی، سەرجووخە عەلی؟

ــ یاوەر... یاوەری خۆم...

ــ لە کوێ بووی؟ هەموو شوێنێکت بە دوا دا گەڕام.

ــ یاوەری خۆم... یاوەری خۆ... م...

قسەی بۆ نەدەهات.

ــ ئەوە چییە عەلی؟ بۆ وات لێهاتوە؟

ــ نوێژم دەکرد... دەپاڕامەوە...

ــ نوێژت دەکرد و دەپارایەوە؟

ــ قوربان، هیچ ناخواتەوە، هیچیش ناخوا. دۆشەکم بۆ بردوە، بەڵام نانوێ. قسەی خۆشی ناخواتەوە! دایە سوڵتان دەمرێ و تاوانەکە دێتە سەر ئێمە! خەڵك دەڵێن ئێمە کوشتمان. عارف سایم بەگیش دەرەجەکانم لێدەکاتەوە...

یاوەر نێوچاوانی تێکنا:

ــ ئەها، وا دیارە نەتتوانیوە وە قسەی بێنی.

ــ نەخێر، نەمتوانیوە...

ــ گومانم لەوە دانیە دەرەجەت لێ دەکەنەوە و بەوەندەشت لەکۆڵ بنەوە، باشە!
ــ قوربان، خەریکە دەمرێ!
ــ گوێ مەدەیە، برۆ خوارێ، کارێکی وا بکە وە قسە بێ و حاشا لە جنێوەکان بکا. هەر وا دەروبەری سەعاتێکی دیکە عارف سایم بەگ دێتە ئێرە و بزانێتەوە نەتتوانیوە وەقسەی بێنی، ئیدی دیارە چت بە سەر دێنێ!
ــ قوربان، ئەوە دەمرێ!
ــ با بمرێ، کەیفی خۆیەتی، بەلاّم پێش مردنێ دەبێ قسە بکا و حاشا لە جنێوەکانی بکا.
عەلی تێگەیشت کە یاوەر هیچ چەشنە یارمەتی‌یەکی لە دەست نایە و ناچار چۆوە ژێرزەمینێ. ئەوەندە ماندوو و نارەحەت بوو، هۆشی لە خۆی برابوو و سەری دەگێژەوە دەهات. ئەگەر کێشکچی‌یەکە یارمەتی نەکردبایە، دەرگای گرتووخانەکەی بۆ نەدەکرایەوە. دایە سوڵتان هەر وا دە نێو مۆبلەکەی دا خۆی کۆ کردبۆوە و مات ببوو. عەلی خۆی دە بەر پێی هاویشت. فرمێسکەکانی بە گوڕ بە سەر دەستی دایە سوڵتانی دا دەرژان.
ــ ئاخر دایە گیان، ئەمن چۆن دەتوانم دەست بە سەر تۆ دا بەرز بکەمەوە، دایە سوڵتان! ئەتۆ بۆنی هەموو گوڵەکانی خانەقای چلچاویت لێ دێ! بۆچما هەر لە زووەوە و لە هەموو کات و سەردەمەکان دا خانەقای چلچاوی شوێنێ لێبووردن، هاودەری و بەزەیی نەبووە؟ بۆچما ئەو شوێنە لە هەموو کات و سەردەمەکان دا پەنا و پشتیوانی ستەملێکراوان، نەخۆش و چاولەدەستان نەبووە؟ باشە بۆچی ئەتۆ ئێستا لە یارمەتی و پشتیوانیی خۆت من بێبەش دەکەی؟ ئەمن چ خراپەیەکم بۆت بووە؟ بۆ حاشا لە قسەکانت ناکەی و ناڵێی من جنێوم نەداوە؟ بۆ هیچ ناخۆی؟ دەزانم ئەتۆ دەمری. بۆخۆت پێتخۆشە بمری. باشە، کەیفی خۆتە، ئەتۆ شێخی و من ناتوانم خۆ دە کاری تۆ هەڵقوتێنم. ڕەنگە وات پێ خۆش بێ. بەلاّم ئەتۆ دەتوانی پێش مردنێ قسە بکەی و بڵێی من جنێوم نەداوە. دایە سوڵتان بۆچما ناکرێ ئەوەندەم یارمەتی بکەی؟ ئاخر دایە سوڵتان ژیانی من و بنەماڵەکەم بە تۆوە بەستراوەتەوە. ئەگەر ئەتۆ پێش ئەوەی حاشا لە قسەکانت بکەی، بمری، ئەوە ئەمنیش دەرەجەکانم دەچن و ماڵومنداڵەکەم ژیانیان تێکدەچێ. دەزانی دایە سوڵتان، ئەوانە بەزەیی‌یان پێدا نایە، وەدەرم دەنێن و ژن و منداڵەکەم لە برسان دەمرن. با ئەوەشت پێ بڵێم ناوام بە سەر بێ، ژنەکەم لە لام دانانیشێ و بە جێمدێڵێ. ژنەکەم کچی پیاوی هەرە دەوڵەمەندی گوندەکەمانە. ئەگەر سەرجووخە نەبوایەم، قەت مێردی پێ نەدەکردم! ئەمن لە منداڵی‌یەوە ئەو ژنەم خۆشدەویست. ماوەیەکی زۆر نۆکەری بابی وی بووم و بە ئانەزگی شەو و ڕۆژ کارم بۆ دەکرد و خزمەتم دەکرد. لە سەر ئەو حاڵەش ڕا ئەو لێی‌دەدام. ڕۆژێ سێ جاران لاقوڵەتەری تێکدەکردمەوە و سەروسەکوتی

دەشکاندم. بە کورتی هەتا دەرەجەکەم وەرنەگرت و نەبوومە سەرجووخە، کچەکەی نەدامیّ... جا ئێستا دەرەجەکانم لیّدەستێننەوە... ئیدی کەمتریش هەڵدەکەویّ بەرتیلی وەرگرم... ئاخر کاری من ئەوەیە خەلکی ئەشکەنجە بکەم... بەلّیّ ئەو جار خێزانم بەجێمدێلیّ، منداڵەکانیش لە گەڵ خۆی دەبا... پێمبلیّ بزانم ئەو کاتی ئەمن چ بکەم؟ جا مەگەر خۆم بکوژم... بەلّیّ ئەگەر ئەتۆ پێش ئەوەی حاشا لە قسەکانت بکەی، بمری، ئەوە وەبالّی منت بەستۆ دەبیّ و بە ئاگری جەهەننەمیّ دەسووتێی. ئەتۆ دەبی‌یە هۆی مردنی من و ئەوەش بەو مانایەیە کە تاوانی کوشتنی بەندەیەکی خوات دێتە سەر و ئەو کات پێت وایە شێخایەتی و پیرۆزبوونەکەت بە کەلك بێن؟ ئەو جار ئەتۆ لە سەر ئەو دنیایەی قەت هەستت بە خۆشبەختی نەکردوە، مێردت نەکردوە و لە دنیای دیکەش شوێنی هەرە خۆشی بەهەشتێت وەگیر دەکەویّ. ئەتۆ جیّخەو و نوێن و بانت هەمیشە ساردوسڕ بووە، کاتێك بیرت لە نێرینە کردۆتەوە، سڕ بووی و تەزووی ساردت بە لەشی دا هاتوە. دیارە ئەتۆ منداڵت نین، بەلاّم زانیوتە کە جێگات لە دنیای دیکە دا بەهەشتە. بەلاّم ئێستا خەریکی ئەو بەهەشتەی لە خۆت دەکەیە جەهەننەم! بۆ؟ چونکە تاوانی مردنی من دێتە سەر تۆ! باشە بۆ دەبیّ ئەتۆ بەهەشتی خۆت لە سۆنگەی گوناهبارێکی وەك من دا لە دەست بچیّ؟ خودا کوشتنی خەلکی بیّتاخۆشە و لێت هەڵناگریّ ئاوام ئیّبکەی! تەنانەت بابوباپیرە گەورە و پیرۆزەکانیشت ناتوانن دە فریات بێن! کە وا بوو قسە بکە، دایە سوڵتان، گوڵەکەم، جوانە بیّوێنەکەم کە بۆنی وەنەوشە و هەموو گوڵە بۆنخۆشەکانی شاخیت لە گەڵ خۆت هێناوەتە ئێرە! بەسە هێندە ئاوا چاوم تیّمەبڕە، چاولێکردنەکەت دەمکوژی! ئەمن ئەمشۆ هەر نوێژم کردوە و دوعام کردوە کە تۆ نەمری، ئەو بیّدەنگی‌یە بشکێنی و حاشا لە جنێو و قسە سووکەکانت بکەی... قسە بکە... خاتوونی من قسە بکە! جوانی جوانان قسە بکە! چاو ئەو نوورەی ئەتۆی دە خۆی وەرگرتوە! تکایە مەمکوژە، بەزەییت پێمدا بیّ!

بەلاّم هەر چەندی پاڕایەوە و لالاّیەوە، نەی‌توانی بیّدەنگی‌یەکەی پیّبشکێنیّ و دایە سوڵتان یەك وشەشی بە زاری دا نەهات. سەرەنجام عەلی تووڕە بوو، دەستی کرد بە هەڕا و هەڕەشان، سەری دە دیواری کوتا و گوڕاندی: قەحبە، جندە، قسە بکە! پێت دەڵێم قسە بکە. بیست پیاو، نا، سەد پیاوی جحێڵت دە پاڵ دەکەم. وا بزانم بە وەی دێیەوە سەرەخۆ، بەلاّم ئاخر بەرگەیان دەگری؟ شڕو شپڕێوت دەکەن! هەموویان جحێڵن و وەك ئەوانە نین کە تۆ پێشتر دیتووتن! عارف سایم بەگی دەناسی ئیدی، لەوانی هەرە بە گورد و بەهێز نەبیّ، هەڵنابژێریّ! دە قسە بکە دەی جندە!

دیسان لە پێشی ڕاوەستا، لاقی دەعەرزی کوتان، خۆی بە دیواری دادا، جنێوی دان و گوڕاندی. بەلاّم بیّسوود بوو. ئاخرەکەی بە داماوی چۆوە سەریّ و بە یاوەری گوت:

ــ قوربان، نەم‌توانی وەقسەی بێنم! ئەو قەحبەیە قسە ناکا.

پاشان چەستێکی لێدا و بە ناڕەحەتی‌یەوە گوتی:
ــ یاوەر، ئەوان دەرەجەکانم لێدەکەنەوە.
ــ بەڵێ، بەداخەوە.
ــ باشە ئەمن چ بکەم یاوەر؟ ئەمن... ئەمن... بمرم باشترە.
ــ بچۆ خوارێ و کارێکی وا بکە ئەو ژنە وە قسە بێ.
ــ بەڵام ئاخر ئەو دە حاڵی خۆی دایە و هەربینا مرد!
ــ هەر ئەوەندە دەمی بکاتەوە... دواتر با بمرێ.
ــ ئەو کات دەرەجەکانی منیش...
ــ ناچاری بکە قسە بکا.

عەلی کەرتیش لە وێ هاتە دەر. ژاندەرمەکان چایان بۆ هێنا. پێنج ــ شەش پەرداخ چای خواردەوە و هێندێك هاتەوە سەرەخۆ. پاشان چۆوە ژێرزەمینەکەی. دایە سوڵتان چاوی لە سەر یەك دانابوون. عەلی ترسا و وایزانی مردوە. ڕای کرد، دەستی دە دەستی خۆی گرت و پەنجەی لە سەر مەچەکی دانا. هەستی کرد دڵی لێدەدا و هێور بۆوە. ئەو جار لە بەر پێی هاتە سەر چۆك و دەستی بە پاڕانەوە کرد:

ــ دایە سوڵتان، ئەمن تەنیا دایکێکم هەبوو و بە نۆکەری لە لای بابی خێزانم گەورە بووم. ئەو پیاوێکی یەکجار تووڕە و تۆسن بوو و هیچ ڕێوشوێن و یاسایەکی نەدەناسی. ئەمن و دایکم بە نانەزگی لە لای وی بووین و جاری وا بوو نانەکەشی تەواو نەدەداینێ. بۆخۆیان هەنگوین و ڕۆنی کەرەیان دەخوارد، بەڵام ئێمە شیرێژیشمان نەبوو بی‌کەینە پێخۆر و بە نانەکەی بخۆین. هەتا نەچوومە سەربازی‌یە، تامی گۆشتیم نەکرد! لە وێ شەوانە نەدەنوستم، دەرسم دەخوێند و پاشان خولێکی تایبەتیشم دی، تا بوومە سەرجوخە. ئەو جار لە خۆشی‌یان پێم وە عەرزی نەدەکەوت. پێش هەموو شتێك، جووتێك کەوش، کراسێك و هێندێك پووڵم بۆ دایکم ناردەوە... لەو ڕۆژەوە بوومە سەرجووخە، کاری من لێدان و ئەشکەنجەی خەڵك بووە، کەم کەس هەیە لە بەر دەستی من دەرچووبێ و دانی بە تاوانی وەپاڵدراو دا نەهێنابێ. بەرد و مردووشم وە قسە هێناون! ئەوەندەم لە خەڵکی داوە، بەری دەستم وەك بنی پاتەیان لێ‌هاتوە، ها، چاویان لێ‌کە! دیتووتن؟ هێندێك کەس بەرگەیان نەگرتوە و دەبەر دەستم دا مردوون. هەوەڵێ ئەو کارەم پێ‌خۆش نەبوو، بەڵام دواتر ڕاهاتم. وای لێ‌هات، لە تەواوی تورکیە دا ئەشکەنجەدەر نەبوو لە من کارامەتر بێ و هەر بۆیەش ئەو جار فەرماندەرەکانم بۆ شوێنی دیکەشیان بەرێ دەکردم. کاری من ئەوە بووە ڕۆژ هەتا ئێوارێ لە خەڵکیم داوە! پێشم کارێکی

زۆر هاسان بووە! ئی وا هەبووە لە بەر دەستم دا وای هاوار کردوە چی وای نەماوە کەڕ بم، بەڵام بڵێم چی، تاوانی من نیە، ئەرك ئەركە ئیدی! لە بناخە دا وشەی "ئەرك" وشەیەكی پیرۆزە، وەك ناوی خوای! ئەو دەستانە کە خەڵکی ئەشکەنجە دەکەن، دەستی من نین. ئەمن ئەو دەستانەم داون بە دەوڵەتێ و ئەویش لە بەرامبەر دا ئەو دەرەجانەی داومی. کە وا بوو من بێتاوانم! ئەوانەش کە لێمداون دز و پیاو کوژ بوون، یانی پیاوخەراپ بوون. ئەمن ڕێگر و یاغیشم دە ژێر ئەشکەنجە دا کوشتوون، مەبەستم ئەوانەیە کە لە دەوڵەتێ هەڵچەرخیونەوە، بەڵام تاوانی من نەبووە. هەر ئێستا ئەگەر لە تۆش بدەم و دەبەر دەستم دا بمری، تاوانی من نیە، چونکە هەر وەك بۆم باس کردی، ئەو دەستانە ئی خۆم نین، ئی ئەو عارف سایم بەگە گەوادەن. دەستی دەوڵەتێن. ماڵم وێران مەکە، ئەتۆ کە لە بنەماڵەی حەسەن بەگی، ئەو حەسەن بەگەی شمشیرەکەی ئەوەندە قورس بوو بە چل وشتران هەڵتەدەگیرا و ئێستا وێنەکەی بە دیواری خانەقاکەتانەوە هەڵواسراوە. ئەو حەسەن بەگەی لە گەڵ سوڵتان سەلاحەدینی ئەیووبی شەڕی کافر و بێدینانی دەکرد و لە گەڵ پێغەمبەری گەورەمان حەزرەتی محەممەد و ئیمامی عەلی بووە، ئەو ئیمامەی خاوەنی شمشیری دووسەر بووە! ماڵم بە قوڕێ مەگرە! ئەمن لە منداڵی‌یەوە ڕەنجم کێشاوە و چارەڕەشیم دیتوە تا بوومە ئەو سەرجووخەیەی ئێستا کە کارم بۆتە ئەشکەنجە و ماڵوحاڵێکیشم بۆخۆم پێکەوە ناوە. بەڵام ئاخر ئەگەر ئەتۆ قسە نەکەی و حاشا لە قسەکانی پێشووت نەکەی، ئەمن ماڵوێران دەبم. خۆ ئەگەر دایە سوڵتان نەبای، زۆر زووم وە قسە دێنای! بەردیش بوایەی، ئاسنیش بوایەی، هەر قسەم پێدەکردی و تەنانەت بە مردوویش وەزمان دەهاتی!

سێبەری زەردەخەندەیەکی کاڵ بە سەر لێوەکانی دایە سوڵتانی دا تێپەڕی و چاوەکانی هەڵێنان. ئەوە ئەختە هومێدێکی خستە دڵی سەرجووخە عەلی‌یەوە: ئەها، ئێستا زار هەڵدەپچڕێ و قسەکانی پێشووی دەخواتەوە!

دەو بەینە دا عارف سایم بەگ، مەلا دۆران، خەلیل بەگی گەورە، حاکم، پارێزگار، قازی، دادەستێن و هەموو گەورەگەورەکانی دیکەی شاری هاتبوونە ژاندەرمەخانەی. هەمووشیان بە کەیف بوون. شوێنی کاری یاوەری تەنگ بوو و جێگای هەمووان نەدەبۆوە، هەر بۆیە لە ژووری ئاغواردن و کۆبوونەوەی گشتی دانیشتن. مۆبلێکیان بۆ جەنابی نوێنەر لە ژووری یاوەری ڕا هێنا و لە لای سەرەوەی ژوورەکەیان دانا. هەموو چاوەڕوان بوون بزانن داخوا عەلی کەرتیش توانیویەتی ئەو پیرێژنە بەستەزمانەی وە زمان بێنێ و حاشای پێ لە قسەکانی پێشووی بکا، یان نەیتوانیوە و ئەو جار دەیدەنە دەست کۆمەڵێك پیاوی بەگورد؟ پێکەنینیان لە نێو ژوورەکە دا دەنگی دەدایەوە...

دوای ئەوەی چایەکیان پیٚداکرد، عارف سایم بەگ گوڕاندی:

ــ ئەو قەحبەیەی بیٚنن، بزانم!

سیغاریٚکی لە قوتووە زێرکفتەکەی دەرێنا و بە مۆدنە زێڕەکەیەوە کرد. دەسبەجیٚ پیٚنج ــ شەش کەس چەخماخیان لیٚدا و سیغارەکەیان بۆ هەڵکرد. عارف سایم بەك ــ دوو قومی لە سیغارەکەی دا:

ــ ئەو جووتیٚرانە! بریا زانیباتان لە کاتی شەڕی سەربەخۆیی دا چییان لیٚکردین!

دوو ژاندەرمە دایە سولٚتانیان هیٚنا. هەردووکیان چووبوونە ژێر باڵی و لاقەکانیشی بە عەرزی دا دەکشان.

ــ دایبنیشیٚنن...

ژاندەرمەکان دایە سولٚتانیان لە سەر کورسییەکی بە پەنا دیوارییەوە دانیشاند. ڕوخساری سپی هەڵگەڕابوو، سپییەکی ئامالٚ سەوز و بە تەواوی نیشانەی مردنیٚی پیٚوە دیار بوو.

لە حەساری خانەقایە مەلۆ گولەکان لە سەر یەك کەڵەکە دەکران... پیاو، ژن، منداڵ، پیر و لاو هەر وا لە شاخی ڕا دەهاتنە خواریٚ و بە گۆنییان، بە چارۆکان و بە باوەشان گوڵیان دیٚنان و کۆ کۆ لە سەر یەکیان ڕۆدەکردن. خەلکەکە سازیان لیٚدەدا، گۆرانییان دەگوتن و سەمایان دەکرد. دەرویٚشان دەفەیان لیٚدەدا. هەموو شەویٚ میٚگەلە مامز بە گوانی پڕ لە شیرەوە، لە چۆمی، کە ئاوەکەی وەك چاوی قرژاڵی ڕوون بوو، دەپەڕینەوە و دوای ئەوەی دەدۆشران، بە شاخی هەڵدەگەڕانەوە و دەچوونەوە لەوەڕیٚ. شاخی هەر مامزەی کوتە شالیٚکی نیشانەی خانەقایەی پیٚوە بوو. شالەکە بە شنەی با دەلەرایەوە. هەوریٚك بە سەر ئەو میٚگەلەوە بوو و بۆ هەر کویٚیەك دەچوون، لە گەڵیان بوو. ئەو جار بەفر دەباری. منداڵان کەسیرە دەبوون، دۆڵ و دارستان دە بەفریٚ دا ون دەبوون و لیٚژ و هەڵدیٚرەکانیش بەفریان بە سەر دەکشا. هەموو وڵات دەبوو بە بەفر و نیدی ئاسمواریٚك ئەو هەموو گوڵە جوانانە کە نیٚویان و دەوروبەریان پڕ بوو لە میٚشومەگەز، نەدەبینرا. وەرزەکان و هەموو لایەکی ئەو هەریٚمە لە بەفریٚ دا ون دەبوون... گەلەگورگیٚك بە دەوری خانەقایە دا دەخولانەوە و زۆر جاران هیٚندیٚکیان بیٚچووە مامز و کیٚویی دیکەیان بە دمەوە بوو. نیٚچیرەکان خویٚنیان لیٚدەتکا و ئەوانەی هیٚشتا مابوون، دەیانبیٚلاند... گورگان شەوانە هەتا بەیانی دەیانلووراند... شمشیری حەسەن بەگی بە دیوارییەوە دەبریقیٚتەوە... گوڵەکان و مەنجەڵە ڕەشە دووکەڵاوییە گەورەکان وەردەگەڕیٚن، خلۆر دەبنەوە و دەکەونە چالاویٚکی قووڵی بیٚبنەوە. بۆنی جیوەی جۆراوجۆر دۆڵ، کیٚو و دارستانی پڕ دەکا. بە هەزاران گورگ لە بەرامبەر خانەقای چلچاوی ڕاوەستاون، ددانیان گڕ کردوە و دەلووریٚنن. یەکیٚکیان قەڵەمبازیٚکی داویٚ، خۆ بە مەنجەڵەکان دادەدا کە پڕ لە گوڵن و دەکوڵن...

ـ پێم بڵێ بزانم پیرێژن، پەشیمان بوویەوە و قسە سووکەکانی خۆت وەرگرتنەوە؟

دایە سوڵتان ڕاچەنی و ڕوخساری هێندێك زیاتر سپی بۆوە.

ـ وەڵامم دەوە پیرێژن!

ماوەیەك چاوی لە زاری دایە سوڵتانی بوو و چاوەڕوان بوو، بەڵام دایە سوڵتان لە سەر کورسی‌یەکەی کووڕ ببۆوە، سەری کەوتبوە سەر سینگی و دەنگی نەبوو.

ـ وا دیارە زمانت ناگەڕێ!

دیسان تاوێك ڕاوەستا، سەری وەکازە زێڕکفتەکەی چەند جاران دە عەرزی کوتا و ئەو جار تووڕە بوو.

ـ حاشا لە قسەکانت ناکەی، ها؟ پێت وا نەبێ ئاوات لە کۆڵ دەبەمەوە! ئەتۆ جنێوت پێدام، پێت گوتم قەحبە دایك، یانی دایکی منت بە جندە ناو برد. ئەمن لەو جنێوانەت خۆش نابم. لەوەتا من هەم، کەس نەی‌وێراوە جنێو بە دایکم بدا!

ئەو جار عارف سایم شێوەی قسەکردنەکەی گۆڕی، هێندێك نەرمتر دوا و گوتی:

ـ ئەگەر وا بێ، گوێم لێبگرە... دایە سوڵتان، جندەی خانەقای چلچاوی. ئەگەر بە قسەم نەکەی، حاشا لە قسەکانت نەکەی و داوای لێبووردن نەکەی، ئەوە ئەو ژاندەرمە جحێڵانەی لە خوارێن و چاوەڕوانی فەرمانی منن، بانگ دەکەم دەستدرێژیت پێبکەن و دیارە ئەو دەمی بە داوێنپیسی دەمری و لە لای خودای شەرمەسار دەبی! فەرمانیشیان دەدەمێ بە بێ شوتن و خاوێنکردنەوە بتنێژن!

ئەو جار زاری کردەوە، دەستی بە جنێوان کرد و هەر چی قسەی سووك و ناحەز بوو پێی‌گوت، بەڵام دایە سوڵتان ئاڵوگۆڕی بە سەر دا نەهات. هەر وا ئارام و بێدەنگ لە سەر کورسی‌یەکەی دانیشتبوو، ڕاست چاوەکانی بڕیبووە پێش خۆی و لێکیشی نەدەنان.

ـ بەڵێ، کە وابوو خاتوونە بەڕێزە شێخ جندەکەمان زار هەڵناپچڕێ؟

ئەوانەی لە وێ بوون، هەموو ڕاچەنین، بەڵام ناچار بوون پێبکەنن. شتی وا چۆن دەبێ و چۆن دەکرێ وەجواب نەیەن؟ شێخ... جندە؟ عارف سایم بەگ لە حاڵێك دا جنێوی زۆر پیسی لە زاری هەڵدەڕژا و لە هیچ قسەیەکی سووك خۆی نەدەپاراست، قاقایەکی کێشا. دیارە هەتا ئەو پێکەنیبا، دەبوو ئەوانی دیکەش پێبکەنن، بەڵام لە پڕ جەنابی نوێنەر بێدەنگ بوو و ئەوانی دیکەش وەك مستت لە دمی دابن، یەکجێ هەموو وستەیان لێبڕا.

عارف سایم بەگ نێوچاوانی تێکنابوو و ڕوخساری ڕەش هەڵگەڕابوو و ئەوانی دیکەش هەوڵیان دەدا، نێوچاوانیان تاڵ بکەن و خۆ گرژ نیشان بدەن.

ــ عەلی کەرتیش!

ــ بەڵێ، جەنابی فەرماندەر!

ــ بۆچما ئەمن پێمنەگوتبووی ئەگەر ئەو ژنەی ناچار نەکەی حاشا لە جنێوەکانی بکا، چاوت دەردێنم و دە تەویلەی کەرانت دەکەم؟

عەلی کەرتیش ڕاست ڕاوەستابوو، هێندە ڕاست کە گنجی دە بەژن و باڵای دا نەمابوو. دەتگوت قیسپت تێبڕیوە:

ــ بەڵێ، جەنابی فەرماندەر!

ــ ئەدی جەنابی سەرجووخە عەلی، ئەو ژنە جندەیە...

لێرە دا بێدەنگ بوو و هێندێك ڕاوەستا، ئەوانی دیکە پێکەنین.

ــ بەڵێ، ئەو خاتوونە جندەیە قسەی سووکی بە دایکم گوتوە...

کە عارف سایم بەگ ئەوەی گوت، هەمووئاغا و بەگەکان ناڕەحەت بوون و سێبەری خەمیان بە سەر ڕوخساری کشا.

ــ بەڵام ئەتۆ کەرتیش، ئەتۆ توانای ئەوەت نەبوو وایلێبکەی داوای لێبووردن بکا و قسەی خۆی بخواتەوە، وا نیە؟ سەرجووخە عەلی، پێت وایە هەر ئێستا یەسکەکانی دایکی ڕەحمەتیم لە نێو گۆڕەکەی دا حاڵیان چۆنە؟

ــ دەلەرزن، جەنابی فەرماندەر!

ــ وایە، بێگومان ئێستا دایکم دە نێو گۆڕەکەی دا دڵشکاو، ناڕەحەت و تووڕەیە، چونکە چ ئەو کاتەی دەژیا و چ دوای مردنیشی قەت جنێوی وای نەبیستۆتەوە! دایکە بەستەزمانەکەم... ئاوا... بەڵام عەلی کەرتیش، سەرجووخەی کۆمار، ئەو کەسەی بەرد، ڕەوەز و ئاسنی وە قسە دێنێ، ناتوانێ زمانی سەڵیتەیەکی ئاوا بکاتەوە. بۆ؟ چونکە لە هێزی دەگمەن و سروشتبەزێنی وی دەترسێ! خەڵك نازانن کە جندان هێزی سروشتبەزێن و کەشفیان نیە! وا نیە عەلی کەرتیش!

ــ بەڵێ وایە جەنابی فەرماندەر!

ــ وایە؟ ئەگەر وایە ئەدی بۆ ناچارت نەکردوە وەقسە بێ؟ گوێ بگرە سەرجووخە، ئەگەر ئەو ژنە قسە نەکا و دان بە تاوانی خۆی دا نەهێنێ، دەرەجەکانت لێدەکەمەوە و پاشان ژاندەرمانیش دە پاڵ وی دەکەم. جا ئەو جار جندە سوڵتان تێدەگا...

هەموو دەیانزانی عارف سایم کەیفی بەو چەشنە جنێوانە دێ، هەر بۆیە لە قاقای پێکەنینییان دا.

ـ ئەو ژنەتیوەی لێرە لابە و سبەینێ ئەو دەمانە بیهێنەوە. تا ئەو کات دەبێ دانی بە تاوانی خۆی دا هێنابێ. یاڵلا لێرەی لابە!

عارف سایم بە ڕوویەکی ترش و تاڵەوە هەستایە سەر پێ، باسکی خەلیل بەگی گەورەی گرت و لە گەڵ خۆی بۆ لای دەرگای برد. ئەوانی دیکەش بە گاڵتە و جەفەنگلێدانەوە وە دوایان کەوتن.

ژاندەرمەکان دایە سوڵتانیان ڕەکێش کرد و بردیانەوە خوارێ. عەلی کەرتیش ڕۆی بۆیە، دە مۆیلە کۆنە دڕاوەکەی هاویشتەوە و بە تووڕەیی‌یەوە گوتی:

ـ دیتت لە سەر تۆ چم بە سەر هات؟ خۆ بە چاوی خۆت دیتت و بە گوێی خۆشت بیستت چییان پێگوتم؟ ئەو جار دەزانی ئەوان دەرەجەکانم لێدەستێننەوە...

پاشان گوڕاندی:

ـ ئەتۆ دەزانی ڕوحم و بەزەیی چی‌یە؟ ویجدانت هەیە؟ دەزانی ئینسانەتی چی‌یە؟ ئاخر بۆچی بەزەییت بە من دا نایە؟ بۆ وا دڵڕەقی؟ خۆ گوێت لێبوو عارف سایم بەگ گوتی ئەتۆ شێخیش نی! ئەتۆ... ئەتۆ...

نەی دەوێرا قسەکەی توند بکا:

ـ ئەتۆ شتێکی دیکەی، وەنیە؟ بەڵام ئەمن هەردووك لاقت دەشکێنم! دە ژاندەرمەت دە باڵ دەکەم! دەزانی دەڵێم چی ئیدی؟ ئێستا قسان دەکەی، یان نا؟

عەلی کەرتیش شانی دایە سوڵتانی گرت و بە تووڕەیی‌یەوە ڕایوەشاند. پاشان بەری دا و چەند شەقاو بەرەو دوا کشایەوە. گەرووی گیرابوو، هەناسەی بۆ نەدەهات و هەموو گیانی وسەر ئارەقەی گەڕابوو...

هەرچی ژنی گوندەکانی دەوروبەر بوون، هەموویان بە داس و بژارچنەوە هاتبوون و بەو دەوروبەرەی وەربببوون. ئەوان گوڵ و گیای جۆراوجۆریان کۆ دەکردنەوە دەیانهێنانەوە و مەنجەڵە ڕەشە گەورەکانیان لێپڕ دەکردن. کاتێك مەنجەڵەکان بە ڕادەی پێویست دەکوڵێن، بەتاڵیان دەکردن و ئەو دەرمانەی دروست دەبوو، دەدرا بەو نەخۆشانەی کە جاری وا بوو هێندە زۆر دەبوون، حەساری خانەقایان پڕ دەکرد. پاشان هێندێك کەڵەکێویی لاواز دەهاتن، کە هەر یەسك و پێستێك بوون و لە گۆڕایی دەرەوەی خانەقایە بۆی دەکەوتن. ژنان دەچوون زاریان هەڵدەپچڕین و لەو گیا کولاوانەیان دەدانێ. کەڵەکێوی‌یەکان هەڵدەستانەوە و دەیانهۆڕاند.

دایە سوڵتان دوایە نەیەی بڵێی وشیارت نەکردمەوە. دەزانم ئەتۆ دەتوانی شەل و کوێرم کەی، ئیفلیجم کەی. دەتوانی بمنێریە جەهەننەمێ. ئەتۆ دەکرێ شێخ بی، ژنە پێغەمبەربی، یان هەر کچی خوای بی، بەڵام ئیدی ئەمن لە توانام دا نیە چی دیکەت بپارێزم! دەرەجەکانم

دەچن و ئەوەش بۆ من کارەساتە! ناتوانم هەموو شتێکم فیدای تۆ بکەم. ئەو جار ئیدی ئامادەم ئەگەر پێویست بێ بە زیندوویی کەوڵت کەم، دایە سوڵتان، یان بە زیندوویی چاوت دەربێنم! ئەمن هێندەم خەڵك دە بەر دەستی دا مردوون و هێندەم شەل و سەقەت کردوون، هەر لە بیریشم نەماوە چەند بوون... دایە سوڵتان، لەمێژ ساڵە ئەمن بوومە ڕەشەبا، بە سەر هەموو ئاناتۆلیم داداوە و هەموو دەشت و شاخی ئەو هەرێمەم وە لەرزین خستوە! زۆر ماڵم بە سەر یەك دا ڕووخاندوون و زۆر گوندم ئاگر تێبەرداون... بە خۆڕایی نەیانکردوومە سەرجووخە عەلی! ئێستا ئەمن لە عیسمەت پاشای خۆشەویستترم، لە مارشاڵ فەوزی و حاکمی ئەدەنەشم زۆرتر لێدەترسن. دەزانی بۆ؟ چونکە تا ئێستا گۆپاڵبەدەستی وەك منیان نەبووە. هیچ کەس لەو دنیایەی دا نەیتوانیوە وەك من خەڵك ئەشکەنجە بکا و لاقوپەلی جووتێرانیان بۆ بشکێنێ!

عەلی کەرتیش لە تەنیشت مۆبلەکەی دانیشت و چاوی دە ڕوخساری دایە سوڵتانییەوە بری. دەتگوت ئەو ژنە پیرە خەریکە بچێتە خەوێکی قووڵەوە. جاروبار چاوی هەڵدێنان، چاوێکی لە دەورویەر دەکرد و نیشانەی سەرسوڕمان لە ڕوخساری دەردەکەوت، وەك ئەوەی پێی سەیر بێ لێرەیە، لە خۆی بپرسێ لێرە چ دەکەم و دەبێ ئێرە کوێ بێ؟ پاشانیش چاوەکانی لێکدەنانەوە.

ــ ئەوانەی دەکەونە بەر دەستی من و دان بە تاوانیان دا ناهێنن، یان دەمرن، یان ئیدی سەقەت دەبن و ناتوانن بە پێی خۆیان بڕۆن، یان پیاویان دە پاڵ دەکرێ و بڕایەوە... ئەتۆ بێجگە لە وەی وە زمان بێی، هیچ ڕێگایەکی دیکەت نیە. ئەوەی نەکەی، لە دەست من دەرناچی... لە بیریشت بێ، ئەو دەستەی لێتدەدا، دەستی من نیە، ئی عارف سایم بەگییە. یان ئەوە ئەمن نیم دەستدرێژیت دەکەمێ، ئەو کوڕە ژاندەرمانەی دیکەش نین، بەڵکوو پیاوە گەورەکانی شارە هەرە گەورەکانن، چونکە ئەوان فەرمان دەدەن، ئێمە بە قسەی وان دەجووڵێینەوە و قەتیشیان نابینین. خودا بۆ خۆی و هەموو خەڵکی ئەو دنیایەش دەزانن کە من تەنیا ئەرکی خۆم بەڕێوە دەبەم و دەسەڵاتیشم نیە بڵێم نایکەم. ئەوجار پیاوێکیش کە نەتوانێ ئەرکی خۆی بەڕێوە بەرێ، پیاو نیە. دایە سوڵتان، ئەو ژاندەرمانەی ئێستا لە سەرێ دانیشتوون، دوو ساڵ ــ سێ ساڵە لە گوندەکانی خۆیان دوور کەوتوونەوە... وا دیارە ناچار دەبم بتدەمە دەست وان... با پێشت بڵێم ئەوان نە باوەڕیان بە خانەقایە هەیە و نە بە شێخی و تەنانەت خواشیان لەبیر نیە... ئەوان لە بەینت دەبەن... دایە سوڵتانی خۆشەویست، تکات لێدەکەم حاشا لەو جنێوانە بکە کە بە دایکی بەگیت داون و داوای لێبووردن بکە... باشە بۆ ئەوەندەم زوڵم لێدەکەی؟ هێندێکت بەزەیی پێمدابێ، دایە سوڵتان! دایە سوڵتان...

ئەو جار لە داخان خۆی پیٚ‌دادا و بە دەستە زبر و قورسەکانی وەریگەڕایە، بەڵام زوو وەخۆ هاتەوە، هێور بۆوە و گوێی بە سینگی‌یەوە نا. دڵی دایە سوڵتانی زۆر توند لیێ‌دەدا، وەك سەعاتی ڕێکوپێك و وا دەردەکەوت گرفتێك دە گۆڕێ دا نیە. عەلی کەرتیش خۆشحاڵ بوو و بیری کردەوە: نا، جارێ نامرێ. جارێکی دیکەش تاقیی کردەوە، ئەو جار سەبرتری لیٚ‌دەدا. عەلی لە جیێ خۆی دەرپەڕی، لە ترسان وەخت بوو دڵی بتۆقێ، بەڵام دڵخۆشیی خۆی دایەوە و گوتی: نامرێ. ئەو ژنە گیان سەختە! بڵێی وا بە هاسانی بمرێ؟ هەر وا بە دەوری خۆی دا دەخولایەوە، بیری دەکردەوە، خێرا خێرا سەری وە سەر سینگی دایە سوڵتانی دەکردەوە و گوێی دەدایەوە لیێدانی دڵی. لە نەکاو بۆنێکی ناخۆشی وەبەر دەمی کەوت و ڕای کردە دەرێ. هەوا تاریك بوو و باران دەباری. چەند خولی بە دەوری حەساری دا لیٚ‌دان. لە قولینچکێکی حەساری، لە لای دار هەنجیرەکەی پەنا دارهەنارە لکوپۆپ ڕووتەکان، چاوی بە قەڵافەتی کەڵەگەت و شانوپیلی بەهێزی دەروێش بنیامینی نیگابانی خانەقای چلچاوی کەوت. ئەو دەروێشە کە پیاوێکی باڵابەرزی چوارشانە بوو، لەو ڕۆژەوە کە دایە سوڵتان هێنرابووە ئەو گرتووخانەیەی، لەو شوێنەی ئێستا ڕادەوەستا و بیٚ‌دەنگ و کڕ، بیٚ ئەوەی جووڵە بکا، چاوی دەبڕی‌یە دەرگای گرتووخانەی و شەوانە چاوەکانی وەك چاوی پشیلەی دەبریقانەوە. عەلی کەرتیش لە بن دارهەنارەکان هەڵوێستەیەکی کرد، پیێ‌خۆش بوو قسەی لە گەڵ بکا، بەڵام زاری بۆ هەڵتەپچڕا. هێندێکی دیکە لە حەساریٚ مایەوە و دیسان ڕای کردەوە نێو گرتووخانەی. سەری دایە سوڵتانی شۆڕ ببۆوە سەر شانی. عەلی چووە پێشی. ڕوخساری دایە سوڵتانی بە تەواوی سپی هەڵگەڕابوو. عەلی ئیدی هەر زەندەقی چوو و دیسان هەڵاتەوە حەساریٚ. دەریٚ تاریك بوو، تاریکەشەوێکی ئەنگوستەچاو و باران بە خوڕ دەباری. چۆوە لای دارهەنارەکان، بۆ لای بنیامینیٚ، بەڵام تاپۆی وی لەو تاریکەشەوەی دا بە زەحمەت دیار بوو. هەوڵی دا بانگی کا، بنیامین، بنیامین، بەڵام نەی‌دەزانی دەنگی لە زاری نایەتە دەر. بنیامین، بنیامین، دایە سوڵتان دەمریٚ، نەی‌گەینیٚ، تەواو دەبیٚ. دەبیٚ بە فریای بگەین. باشە ئەتۆ دەرمانەکەی خانەقای چلچاویت پیٚ نیە؟ ئەو دەرمانەی دەڵێن مردوانیش زیندوو دەکاتەوە... هەر بڕێکی کەمیشت لە گەڵ خۆت نەهێناوە؟ چ بکەین بنیامین؟ چۆنی ڕزگار کەین؟ کوڕە بنیامین، ئەو بمرێ، بە زیندوویی کەوڵم دەکەن! ئەمن کاتێك ژنم هێنا، بەڵێنم دا، سوێندم خوارد هەتا دەمرم هەر سەرجووخە بم. سوێندم خوارد ئەوەندە خەڵکی ئەشکەنجە بکەم، هەتا دەمکەن بە یاوەر، سەرهەنگ، یان تەنانەت ژێنراڵیش. ئەمن ئاوام بە دایە سوڵتانی گوتوە! ئەمن خەڵکی توورووسی و هەموو خەڵکی ئاناتۆلیم دارکاری کردوە. هەر کەسم وە بەر دەست کەوتبیٚ، لە بن گۆپاڵم هاواری لیٚ‌هەستاوە، چاوم دەرهێناون، بە زیندوویی کەوڵم کردوون. بەڵام ئەو خەیاڵ و ئارەزووانە

هەمووی خاو و بێمانا بوون. ئەمن ببمە یاوەر؟! قسەی قۆڕ! تەنانەت نەیانکردوومە گورووبانیش! ئێستا ئەگەر دایە سولتانیش بمرێ، ئەو دەرەجانەشم لێدەستێننەوە...

دایە سولتان دە حالی خۆی دایە، کورە تکات لێدەکەم هەولێك بدە، کارێك بکە، بەلکوو دە فریای کەوی بنیامین! ئەو ڕزگار بێ، ئەمنیش ڕزگار دەبم! پیاوی چاك بە پەلەی بکە! ئەمن نەمهێشتوە کەس دەستی لێدا، هەر کەمێکی لێتووڕە بووم و هیچی دی. باشە ئەو بۆ دەبێ هێندە لە من بێزار بێ، کە بۆخۆی کارێکی وا بکا بمرێ؟ بنیامین، ئەتۆ لە بنەماڵەیەکی گەورەی، شوانی مێگەلەکانی خانەقایەی! شیری مامزانی بدەیە، شیرەی گولانی بدەیە، هەنگوینی بدەیە... چووزانم، هەرچی دەیدەیەی بیدەیە و داوات لێدەکەم مەیەلە بمرێ!

گیانی دە ناوێ دا شەلال ببوو. دیسان ڕای کردەوە ژووری، چۆوە ژێرزەمینێ، لە سەر دایە سولتانی داهاتەوە و چاوی لە ڕوخساری کرد. چەند دلۆپ ئاوی بارانەی لە جلەکانییەوە بە سەر ڕوخساری دایە سولتانی دا تکانەوە و ئەویش چاوەکانی ساتێکی کورت هەلێنان و دیسان وێکی نانەوە. عەلی لە دلی خۆی دا گوتی، نەخێر تازە تەواوە، لە چاوی ڕا دیارە دەمرێ. پاشان بە دەنگی بەرز نالاندی: ئەی هاوار، دەمرێ، دەمرێ... ئیدی چی دیکە نەیوێرا دەستی لێدا، پێیوابوو ئەو جار هەر دەستی وێی کەوێ، گیانی دەردەچێ. دیسان هەلاتەوە حەسارێ و چۆوە لای دارهەنارەکان. هەور دەیانگرماند، و برووسکە لە سەر برووسکەی دەهاتن، لە چاولێکنانێك دا ولاتیان ڕووناك دەکرد و وەك کێردی تیژ تاریکایییان دەقەلەشتەوە. قەلافەتی بنیامینی لە پشت دارەکان ئەو جار زۆر بەخۆوەتر، گەورەتر و بەسامتر دیار بوو و جەغزە شۆقێکی تەسکیشی بەردەوام بە دەورەوە بوو.

سەرجووخە عەلی گەیشتە لای بنیامینی، دەستی درێژ کرد، بەلام ترسا و زوو دەستی کێشایەوە. دیسان ڕای کردەوە لای گرتووخانەی، بەلام هەر دەرگای ژێرزەمینێی کردوە، ترسێکی وای ڕێنیشت، کە نەیوێرا بچێتە ژوور و چاو لە دایە سولتانی بکا. هۆشی لە خۆی بڕابوو. ماوەیەك هەر وا لە ژێر ڕێژنەی باران، ترووسکە ترووسکی برووسکان و لە نێوان خانووەکە، دارهەنارەکان و ئەو جەغزە شۆقەی بە دەوری دەروێش بنیامینییەوە بوو، ڕاوڕاوێنی دەکرد. هەلدەنگووت، دە قوولکە ئاوان دەکەوت، هەموو گیانی تەڕ ببوو و ئاو لە بەری پێی دەچۆڕا، بەلام هەر ڕانەدەوەستا و وەك خولخولەی دەخولایەوە. سەرەنجام بڕیاری دا بچێتە ژوور، دەست لە دەستی دایە سولتانی بدا و بزانێ ماوە یان نا. چووە خوارێ. دەستی دایە سولتانی ساردوسڕ بوون. کاتێك ئەوەی دی، دایە سولتانی لە سەر کۆلی دانا، هێنایە دەرێ و بردی بۆ

ژێر دارهەنارەکان، بەڵام پەشیمان بۆوە و هێنایەوە ژێرزەمینەکەی و لە وێش ڕا دیسان هێنایەوە دەرێ. ئەو جار دایە سوڵتان لە سەر پشتی خزی و کەوتە نێو قوڕوقاڵی حەسارێ. عەلی کەرتیش هەستی بەوە نەکرد، بەڵام کاتێك چۆوە خوارێ و دیتی دایە سوڵتان لە جێی خۆی نەماوە، زەندەقی چوو، بە پەلە هاتەوە دەرێ. غاری دا بن دارهەنارەکان و هەتا دە دەروێش بنیامینی هەڵنەنگووت، نەیزانی. گەڕایەوە و بە دەوری حەساریێ دا ڕای کرد. باران دەباری و ڕەشەبایەکی توندی دەهات. لەوکاتە دا برووسکەیەکی دا و لە بەر شۆقی برووسکەکەی عەلی چاوی بە دایە سوڵتانی کەوت کە لە وێ، لە بەر بارانێ کەوتبوو. دەسبەجێ هەڵیگرتەوە، بە کۆڵێی دادا و بە پەلە بردی بۆ ماڵی دوکتۆری و لە دەرگای دا. دوکتۆر بە خەواڵوویی دەرگای کردەوە و کاتێك سەرجووخە عەلی دەوحاڵەی دا دی، سەری سوڕما. عەلی حەبەسابوو و قسەی بۆ نەدەکرا، بەڵام دوکتۆر زانی چ باسە، پەنجەی لە سەر مەچەکی دایە سوڵتانی دانا و گوتی:

ـ سەرجووخە، بێبەوە ژاندەرمەخانەی. تەواو بووە...

عەلی کەرتیش لە بەرخۆیەوە دووپاتی کردەوە:" تەواو بووە، تەواو بووە." دوکتور دەرگاکەی لە سەر پێوە دا. عەلی لە بەر دەرگایە ماوەیەك مایەوە، چاوەڕوان بوو دیسان دوکتۆر بگەڕێتەوە و دەرگای لێبکاتەوە، بەڵام بێسوود بوو. ڕای کرد بۆ ماڵی خۆیان. ژنەکەی بە سەر و قژی ئاڵۆزەوە دەرگای لێکردەوە و کە چاوی بە عەلی کەوت، دەستی بە هاوار و قیژەقیژێ کرد. عەلی هێندە ئاڵۆز بوو، نیوەی قسەکانیشی نەدەبیست. ژنە دەیقیژاند:

ـ بەجێتدێڵم! دەچمەوە ماڵی بابم و منداڵەکانیش دەبەم! ئەتۆ بە لەشی ناخێرت بەڵێنت پێدام ئەوەندە لە لێدان و ئەشکەنجەی خەڵکی ئازا بی، هەتا دەتکەنە یاوەر، بەڵام وا دیارە ئەتۆ ئەو پیاوە نی! ئەتۆ نەك هەر قەت نابی بە یاوەر، بەڵکوو ئەو دەرەجە بێترخانەی سەرجووخەیی‌یەشت لێدەستێننەوە. ئەتۆ نەتزانی چۆن هەڵسوکەوت لە گەڵ ئەو بەرەڵایەی بکەی! کوشتت... ئەتۆ کوشتت! دەرەجەکانت چوون، ماڵوێران. سەرجووخە عەلی کەرتیش، بۆچما وەبیرت نایە پێشتر چ بووی؟ خۆ نانی شەوێت نەبوو! دایکت لە کەپەکی زیاتری نەدەدایەی! ئەمن پێشتر شتومەکەکانم پێچاونەوە، دەڕۆم و بەجێتدێڵم! درۆزنی دەستەوەستان! دەچمەوە ماڵی بابم و مێرد بە پیاوێکی پیاو دەکەم!

عەلی کەرتیش ماڵی خۆیانی بە جێهێشت و بەرەو ماڵی یاوەری چوو. ئەو ساتبەسات ئاڵۆزتر دەبوو و دەتگوت پڕ بە خەڵێفێك مێشەنگوین دە سەری دا دێن و دەچن و دەهازێنن.

سێ جاران دایە سوڵتانی لە سەر پشتی خزی، دە قوڕوقاڵی سەر ڕێگایە کەوت و هەموو جارێك خێرا هەڵی‌دەگرتەوە و بە پشتێی دا دەداوە. نەی دەوێرا لە دەرگای ماڵی یاوەری بدا و چونکە نەشی‌دەتوانی لە شوێنێك ڕاوەستێ، ناچار بە دەوری ماڵەکەیان دا دەستی بە خولانەوە کرد. بارانەکە توندتری کردبوو، وەك گۆزەی سەروژێر هەڵی‌دەڕشت. تاریکایی‌یەکەش ئەوەندە خەست بوو هەموو شتێکی دە نێو خۆی دا تواندبۆوە...

دەروێشەکان و خەڵکەکەی دیکە پۆل ـ پۆل لە شاخی ڕا دەهاتنەوە و هەرکامەیان گۆزنی‌یەکی پڕ لە گوڵ و گیای جۆراوجۆری پێبوو. گۆزنی‌یەکانیان لە حەساری خانەقایە دادەنان. کاتێك مەنجەڵەکان وەکوڵ دەهاتن، بۆنی جۆراوجۆری خۆشخۆش ئەو دەوروبەرەی دادەگرت. لەو کاتە دا کۆمەڵە باڵندەیەکی سپی، وەك شیری سپی، پەیدا دەبوون و لە سەر مەنجەڵەکان، گومبەزی خانەقایە و ڕەوەزەکانی بەرامبەر بە خانەقایە دەخولانەوە.

بارانەکە وا توند بوو، هەر مەپرسە! گوڵە شینەکان ڕەوەزەکانیان دەقەڵشتنەوە و سەریان دێنایە دەرێ. دەنگێك وەك دەنگی لەرانەوەی پەردەی سازی، لە دوورەوە، لە پشت ئەو چارشێوە شینەی بە سەر وڵات کشابوو، دەهات. بەو دەنگەی گوڵەکان کاڵتر دەبوون. دنیاش برووقە و ترووسکەی لێ‌دەبڕا. بارانەکە یەکجار توند و تاریکی‌یەکە زۆر خەست بوو. ئەو جار بارانەکەش کاڵ بۆوە و ترۆپکی چیا بەرزەکانی ئەو بەریش کە شەو و ڕۆژ ڕووناکی‌یان لێ‌تابڕێ، هەر کاڵ بوونەوە...

ئەو ژنە دە گیانەڵایە دایە، دەمرێ، یاوەر! بردمە لای دوکتۆری، دەرزی‌یەکی لێ‌دا و گوتی چ نیە بی‌یەوە. ئێستا هێناومەتە لای تۆ، یاوەر! دیتووتە چەند تاریکە و چۆن دەبارێ؟ دنێشی ئیدی لێ‌تادا!

هەموو بۆنەکان کاڵ دەبنەوە و بارانەکەش کاڵ دەبێتەوە...

... ئەو جار شازدە پیاوی سەوزپۆشی شمشێر بە دەست، خۆ بە ڕیزەکانی دوژمن دا دەدەن. ئەرێ کێ دەتوانێ ئەو شمشێرەی بەرز کاتەوە، کە بەو دیوارەیەوە هەڵواسراوە؟ بڵێسەی ئاگرەکە بە تەنیشت مەنجەڵەکانەوە بەرز دەبێتەوە و هەوا پڕ بووە لە بۆنی بارانە و بۆخاوی گڵی. تاریکی دەخزێ، کاڵ دەبێتەوە... بڵێی دەرەجەکانم لێ‌بکەنەوە، یاوەر؟

گەیشتنە سەر پردێ و قەراغ چۆمەکەی! سەرجووخە عەلی چوو دە ئاوەکەیەوە، کە هەتا ئەژنۆیانی دەهات. یاوەر دەستی گرت و هەوڵی دا لە ئاوەکەی بێنێتە دەرێ، دوایە بۆخۆشی تێ‌کەوت. سەری دەگێژەوە دەهات و لە نێو ئاوێ بە دەوری خۆی دا دەسووڕا...

ڕۆژ بۆوە و بارانەکە لێی‌کردەوە. خۆر لە کەلێنێکەوە خۆی دەرخست و تەسکە شەبەقێکی بە سەر عەرزی دا بڵاو کردەوە. وڵات ئەوەندە خاوێن بوو و وا بەو هەموو بارانەی شۆرابۆوە، کە هەموو شوێنێك بریقەی دەدا...

کۆمەڵێك خەڵکی دێی کە بەیانی لە گوندەکانی خۆیانەوە دەهاتن بۆ شاری، چاویان پێکەوتبوون: تەرمەکان بە ڕیز لە تەنیشت یەك بوون و دە خوێنیّ دا شەڵاڵ بوون. خەڵکە کە لە حاڵێك دا دوعایان دەخوێندن، خویان گەیاندە شاری. دەسبەجیّ هەواڵەکە بڵاو بۆوە و گۆڕاییی‌یەکەی نێزیك پردیّ پڕ بوو لە خەڵك. زۆری پێ‌نەچوو ماشێنی عارف سایم بەگی وەدیار کەوت و هات لە تەنیشت کوژراوەکان ڕاوەستا. عارف سایم بەگ لە ماشێنەکەی هاتە خوار و چاوی لە تەرمەکان کرد. تەرمی دایە سوڵتانی لە نێوان تەرمی دە خوێن دا شەڵاڵی سەرجووخە عەلی و یاوەر فارِوقی بوو. چاوەکانی لێکنەنابوون و دەت‌گوت ئێستاش دە شتێکەوە ڕاماوە و بە سەرنجەوە دەڕوانیّ. کاتێك عارف سایم ئەو چاوانەی دی، مچوڕکێکی بە تەواوی لەشی داهات و لەرزی، دەستی هەڵێنان و تاوێکی چاك لە ژێر لێوی‌یەوە دوعای خوێندن. لەو بەینە دا ئاغا، بەگ و گەورەکانی شاری گەیشتنیّ. خەلیل بەگ لە پێشیانەوە بوو و ئەوانی دیکەش بە دوای وی‌یەوە دەهاتن. هەموویان میداڵی دەوەری شەڕی سەربەخۆیی‌یان بە خۆیانەوە هەڵواسیبوو. کە گەیشتنیّ، بە ڕێز و حورمەتێکی زۆرەوە لە پێش مردووەکان بە ڕیز ڕاوەستان.

عارف سایم بەگ لە سەرەخۆ گوتی:

ـ هەموو لەشیان دە خوێنیّ دایە!

پاشان چووە پێشتر و لە کوژراوەکان ورد بۆوە:

ـ هەموو گیانیان خوێنە. بە خەنجەرێیان کوشتوون، بەڵام هێندەیان لێداون، پیاو بۆی ناژمێردریّ چەند خەنجەریان وێکەوتوون. ئەدی ئەو ژنەتان دیتوە؟ چاوی هەر وا ئاواڵەن، دەڵێی خەریکە بە چاوان هەڵمانلووشیّ و دیارە ئێستاش ئامادە نیە حاشا لە جنێوەکانی بکا و قسەی خۆی بخواتەوە.

پاشان بزەیەکی هاتیّ:

ـ ئەو جندەیە، دەکریّ بڵێم ژنێکی ئازا بوو. ڕەنگە ئەوە نیشانەی شوێندانانی ئەو ڕەوشتە بەهێزە ئەخلاقی‌یە بیّ، کە سەدان ساڵە بۆ ئێمە بە میرات ماوەتەوە.

مورتەزاغا گوتی:

ـ ئەو ژنە ئەو ڕەوشتەی بە میرات بردبوو! چاو لە چاوی کە! هەر دەڵێی نەمردوە، دەڵێی هەر ئێستا دەژی... بێجگە لەوە پێشڕدەکەنیّ. بە هەموو شتێك پێدەکەنیّ. لە ژیانی خۆم دا مردووم زۆر دیون، بەڵام مردووی ئاوام قەت نەدیوە! ئەو ژنە چۆن دەتوانیّ... بڕوانە! بڕوانە، چۆن پێدەکەنیّ؟ بە یاوەری بەستەزمان، کە دە خوێنی خۆی گەوزیوە، پێدەکەنیّ، بە

سەرجووخە عەلیش پیّدەکەنیّ، ئەو سەرجووخە عەلییەی داروبەرد لیّی دەترسان، ئەو عەلییەی هەموو ئاناتۆلی لە بن گۆپالّی دا هاواری دەهات. ئێستا ئەو چارەڕەشە سەر تا پێی دە خوێنیّ دا نوقم بووە! ئاخ چەند بەستەزمانن!

مامۆستای فێرگە کە ڕوومەتی وەك چەوەندەری سوورهەڵگەڕابوون و دەستەکانیشی دەلەرزین، گوتی:

ـ ئەی هاوار، چەند حەیف بوو! ئاخ مرۆڤە بەستەزمانەکان!

پارێزگاریش دووپاتی کردەوە:

ـ ئاخ و داخ بۆ ئەو بەستەزمانانە، حەیف بوو!

دادەستێن گوتی:

ـ یاوەری ئێمە زۆری خوێن لە بەر ڕۆیشتوە، هەر بەوەش مردوە.

دوکتۆر گەیشتە جیّ و لە حاڵێك دا لە ترسان ڕووحی گەیشتبوە سەر لێوان، دەستی بە پشکنینی تەرمەکان کرد. لەو ماوەیە دا کە ئەو خەریکی کارەکەی بوو، ئەوانی دیکە هەموو بە پێوە ڕاوەستابوون و بۆ ڕێزگرتن لە کوژراوەکان دەستیان لە سەر سینگیان دانابوو. دوکتور دوای پشکنینێکی ورد هەستایەوە سەر پیّ و گوتی:

ـ ئەمن چاوم لێکردن. یاوەر فاڕوقی خۆشەویستمان ڕاست نۆزدە خەنجەری ویّکەوتوون. قاتڵەکە خەنجەری دە برینەکان دا گێڕاوە. سەرجووخە عەلیش هێندەی ویّکەوتوون، هەرچی کردم، بۆم نەژمێردران. بمبوورن! بەڵام تەمەشا کەن، ئەو ژنە هێشتا چاوی لێکنەناون...

دوکتۆر بە دەستی چاوی دایە سوڵتانی لێکنا، بەڵام هەر دەستی لابرد، دیسان کرانەوە. چەند جاری دیکەشی هەوڵ دا، بەڵام بیّسوود بوو.

ـ دیتتان؟ خۆ بۆخۆتان دیتتان...

ئەو خەڵکەی لە ویّ بوون، مات و سەرسام، ڕەق ڕاوەستابوون و چاویان لە چاوە ئاواڵەکانی دایە سوڵتانی دەکرد.

ـ وەك بۆخۆتان دەبینن، هیچ برینی دە لەشی دا نین...

مورتەزاغا هاواری کرد:

ـ بیّگومان تێیدایە، چۆن دەبیّ بریندار نەبیّ؟

عارف سایم بەگیش بە دەنگی بەرز، بە شێوەیەك خەڵکەکە گوێیان لیّبیّ، گوتی:

ـ دەبێ نیشانەی برینانی پێوە بن. قسەی تیّدا نیە شوێنێکی لەشی هەر بریندار بووە، چونکە ئەو یاغیيە کافرەی پێیدەڵێن حەمەدۆك، دەستی لەو ژنە پاك و دیندارەش نەپاراستوە. ئەو دڵڕەقە بیّدینە دایە سوڵتانی خاتوونی بەڕێز و گەورە شێخی خانەقای چلچاوی کوشتوە! قسەی تیّدا نیە کە ئێمە جیّبرین و شوێنی لێدان لە سەر تەرمی پیرۆزی ئەو خاتوونە دەدۆزینەوە!

مورتەزاغا کەیفی زۆر بەو قسەیەی بەگی گەورە هات و قسەکەی دووپات کردەوە:

ـ بیّگومان جیّبرینەکان دەدۆزرێنەوە. ئەو حەمەدۆکە خوێنخۆرە، کاتێك کەسێکی دەکوژێ، لە پێش دا چاوی دەردێنیّ! تۆخوا چاو لە تەرمی یاوەر فاروقی بکەن، کە قارەمانانە لە ڕێگای نیشتمان دا گیانی بەخت کردوە. دیتووتانە ئەو کافرە چۆن قوولکەی چاوانی وەك گۆمی خوێنیّ لیّکردوە! چاوی ئەو شەهیدەی دیکەش هەر وا، ئەویش لە ڕێگای نیشتمان دا خۆی کردۆتە قوربانی! توخوا دیتووتانە چاوە ڕەشە جوانەکانی سەرجووخە عەلی چییان بە سەر هاتوە؟ ئەو سەرجووخە عەلییەی بەلاّی گیانی تاوانباران بوو و لە سەرانسەری ئەم ولاّتە دا، هیچ یاساشکێنێك لە ژێر زەبری کاریگەری دەرنەدەچوو. هیچ گومان ئەوە دا نیە کە حەمەدۆك دایە سوڵتانی پاك و ئیمانداری کوشتوە و لە پێشیش دا هەوڵی داوە چاوەکانی دەربێنیّ!

مورتەزا بە تەما بوو لە سەر ئەو چەشنە قسانە بڕوا و وا زوو لێینەبڕێتەوە، بەلاّم کاتێك دیتی عارف سایم بەگ سواری ماشێنەکەی بوو، بیّدەنگ بوو، غاری دا لای وی و بە مەبەستی ڕێزگرتن لە وی چەند جاران داهاتەوە و کڕنۆشی برد. عارف سایم بەگ بە بزەیەك وەلاّمی دایەوە و ماشێنەکە وەڕیّکەوت.

ئاغا، بەگ و پیاوەگەورەکانی شاریش بە دوای عارف سایم بەگی دا بەرەو شار بوونەوە. لە ڕێگایە دا، هەتا گەیشتنەوە پێش دەرگای ژاندەرمەخانەی، مورتەزاغا هەر ئەوەی بۆ خەڵکەکەی دەگێڕایەوە کە چۆن حەمەدۆك هەمیشە پێش ئەوەی قوربانییەکان بکوژیّ، چاویان دەردێنیّ.

یاوەر عەلی گاور لەو بەینە دا ئەو جووتێرانەی بەیانی زوو تەرمەکانیان دیبوو، بانگ کردبوو و لێپرسینەوەی لە گەڵ کردبوون. هەر بۆیە بۆخۆی چووە لای عارف سایم بەگی و گوتی:

ـ شاهیدەکان هەموو وەك یەك ڕووداوەکە دەگێڕنەوە و قسەیان یەکە، قوربان! بێجگە لە وەی ئەوان دەیگێڕنەوە، شتێکی دیکەم نەبیستوە. پێش هەمووان، بەیانی زوو، پیرێژنێك بە سەر پردیّ دا هاتوە و چاوی بە تەرمەکان کەوتوە. کابرایەکی زۆر زل، درێژ، بەخۆوە و سپیپۆشیشی لە ویّ دیتوە. کابرا چەکمەی سووری دە پیّ دا بوونە، چەقۆیەکی خویناویی بە دەستەوە بووە و بیّجووڵە لە پەنا تەرمەکان ڕاوەستاوە. جووتێرەکانی دیکەش هەر ئەو قسەیە دەکەن...

ـ دەی دواتر چ قەوماوە؟ ئەو کابرا سپیپۆشە بۆ کوێ چووە؟
ـ وا دیارە ون بووە.
ـ ون بووە؟ چۆن ون بووە؟
ـ لە هەمووانم پرسیوە، کەس نازانێ چۆن ون بووە. بەڵام هەرچۆنێك بێ، دەیدۆزینەوە.
ـ گومانم لەوە دا نیە، بەڵام دەبێ ئێمە بزانین کە یاوەر فارِوق، سەرجووخە عەلی و دایە سوڵتان بە دەستی حەمەدۆکی کوژراون. ئەوە سوور و ئاشکرایە. تەنیا ئەوە دەمێنێتەوە کە بزانین هۆی کوژرانەکەیان چ بووە؟ بۆ دەبێ حەمەد ژنێکی بکوژێ، کە برینەکەی چاك کردۆتەوە و هەم ئەنگوستیلە بەناوبانگەکەی داوەتێ و هەم کراسە پیرۆزەکەش؟ ئێوە تەنیا بە دوای ئەو هۆیە دا بگەڕێن...
ـ بەڵێ قوربان، بە سەر چاو، چۆنی دەفەرمووی وا دەکەین و هۆیەکەش دەدۆزینەوە.
ـ وەرە لە لام دانیشە، یاوەر...
دەستی بۆ کورسی‌یەکی پەنا خۆی ڕاداشت. عەلی گاور دانیشت. ئەوانەی لە وێ بوون، هەموو کەوتنە بیرکردنەوە بۆ ئەوەی هۆیەکە بدۆزنەوە. هێندێك جار شتێك دەگوترا و پێشنیارێك بۆ گەڵاڵەکردنی هۆیەکی وێچوو دەهاتە گۆڕێ، بەڵام عارف سایم هیچی پێ هەو نەبوون. ئەو کۆبوونەوە و ڕاوێژکردنە هەتا کاتی نانخواردنی شەوێی خایاند و دوای نانخواردنێش باسەکەیان دەستپێکردەوە.
لە پڕ مورتەزاغا هەستا سەرپێ و لە حاڵێك دا لە خۆشیان بە زەحمەت دەنگی دەهاتە دەرێ و ڕەگی ملی ئەستوور ببوون، هاواری کرد:
ـ دۆزیمەوە، دۆزیمەوە!
عارف سایم بەگ چووە پێشێ، دەستی دە دەستی نا و گوتی:
ـ باشە، بۆمان باس بکە بزانین ئەوەی دۆزیوتەتەوە چی‌یە؟
مورتەزا زۆری کەیف بەو شێوە هەڵسوکەوتەی عارف سایم بەگی هات، بە پۆزەوە چاوێکی بە دەوری خۆی دا گێرا و گوتی:
ـ دەزانی چی‌یە؟ ئەو دایە سوڵتانە...
ـ دەی... دایە سوڵتان... چی دیکە؟
ـ دایە سوڵتان ئەنگوستیلە سیحراوی‌یەکە و ئەو کراسە پیرۆزەی کە نۆهەزار و نۆسەد و نەوەد و نۆ ئایەتی قورئانیی لێنووسراوەتەوە، دابوو بە حەمەدۆکی. وا نیە؟

ـ وایە.

ـ ئەها، جا ئێستا بە وردیم گوێ لێبگرن. عارف سایم بەگی خۆشەویستی ئێمە دایە سوڵتانی بانگ کردە شارەکەمان. ئەویش بانگهێشتنەکەی قبووڵ کرد و هات. بەڵام داوای عارف سایم بەگی لە دایە سوڵتانی چ بوو؟ بەڵێ جەنابی نوێنەر مەبەستی ئەوە بوو داوای لێبکا کە ئەو ئەنگوستیلە و کراسەی بدا بە سەربازەکانی ئێمەش! بۆ ئەوەی ئەوانیش لە بەرامبەر گوللەی حەمەدۆکی دا پارێزراو بن و بە کورتی گوللەی حەمەدۆکیش کار لە وان نەکا!

لێرە دا مورتەزاغا ڕاوەستا، گەرووی پاك کردەوە و چاوێکی بە خەڵکەکەی دا گێڕا:

ـ بەڵێ، دایە سوڵتان سەرەتا ملی نەدا و داواکەی قبووڵ نەکرد، بەڵام دوای ئەوەی بۆیان گێڕایەوە کە عارف سایم بەگ لە گەڵ شازدە پیاوچاکەکانی خانەقای چلچاوی هاوسەنگەر بووە، قبووڵی کرد... دایە سوڵتان بڕیاری دا حوکمی کراس و ئەنگوستیلەکەی حەمەدی بەتاڵ بکاتەوە. کاتێك حەمەدۆك ئەوەی بیستەوە... دەی، دیارە ئیدی چی کرد! خۆی گەیاندە شاری... و دایە سوڵتانی کوشت. هەروەها یاوەر فاروق و سەرجووخە عەلیش کە ویستبوویان پێش بە حەمەدۆکی بگرن و نەهێڵن ئەو ژنەی بکوژێ، هەر لەو پێناوە دا شەهید بوون و گیانی خۆیان فیدای نیشتمان کرد.

چاوی عارف سایم بەگی لە خۆشیان بریقانەوە:

ـ بژی مورتەزاغا! بە ڕاستی ئافەرین بۆ ئەو هۆش و وردبینییەت! سەد ئافەرین دۆستی خۆم!

زولفۆش دەرپەڕێ، چووە لای مورتەزای و دە ئامێزی گرت:

ـ ئەوە حەمەدۆکی ماڵوێران دەکا! بەڕاستی ئەوە فکری چاکە! چەکی حەمەدۆکی بە دژی خۆی دەکار دەکرێتەوە! هەزار ئافەرین، مورتەزا، بژی، بژی مورتەزا!

هەموویان هەستانە سەرپێ و سوپاسی مورتەزاغایان کرد، کە بیر و هۆشی ئاوا بەکار بوو و ڕێگا چارەیەکی ئاوا گونجاوی دیبۆوە.

عارف سایم بەگ مامۆستا جحێڵەکەی خوێندنگەی بانگ کرد، دەقێکی پێئامادە کرد( بۆخۆی دەیگوت و ئەو دەینووسی) و گوتی:

ـ هەرچی زووتر بە تێلگراف ئەو نووسراوەیەی بۆ ڕۆژنامەکان بەرێ بکە. بۆخۆشم سەرۆکی ئیدارەی ئەو ڕۆژنامانە ئاگادار دەکەمەوە و دەستووریان پێدەدەم بەشێوەیەك کە زۆر سەرنجڕاکێش بێ، چاپی بکەن... زۆری پێناچێ حەمەدۆك بە وێنەوە دەکەوێتە نێو لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەکانەوە.

مامۆستاکە سەری بەردایەوە و گوتی:

ـ قوربان، ئەمن بۆخۆم لەمێژە پێمخۆشە وێنەیەکی حەمەدۆکی ببینم. بەڵام پێموانیە ئەو وێنەیە هەبێ. لە ڕاستی دا هەرگیز وێنەی لێ نەگیراوە و پێشم وا نیە دە هەموو ژیانی خۆی دا جارێك چاوی بە کامێرایەك کەوتبێ!

عارف سایم بەگ لە وەڵام دا قاقا پێکەنی و گوتی:

ـ ئەوە پێوەندیی بە ئێمەوە نیە و کاری ڕۆژنامەکانە! کەیفی خۆیانە چۆنی جێبەجێ دەکەن! بێگومان حەمەدۆکێکی سمێڵزلی وا دروست دەکەن، هەر کەس چاوی پێیبکەوێ، بتۆقێ!

ـ هیوادارم بتوانن بە باشی فەرمانی جەنابت جێبەجێ بکەن... ئێستا ئەمن دەچمە پۆستخانەی و وەدوای کاری تێلگرافەکە دەکەوم.

مورتەزاغا هەستا، چوو بۆ لای مامۆستاکە بە شێوەیەك کە دیار بوو خۆی ڕادەنا، دەستی دە گیرفانی نا، کیسەکەی هێنایە دەرێ و چەند ئەسکیناسی دایە دەست ئەو و گوتی:

ـ ئەوەش دەستخۆشانەی تۆ، چونکە کارەکەت زۆر باش بەڕێوە دەبەی!

پاشان سووکە کۆخەیەکی کرد، چوو لە سەر مۆبلێکی لە تەنیشت عارف سایم بگی دانیشت و هەردووك دەستی لە سەر ڕانانی دانان.

ئەو جار جەنابی نوێنەر ڕووی دە هەمووان کرد و گوتی:

ـ ئێستا دەبێ بە ڕاستی قۆڵی لێهەڵکەین! دەبێ پیاوەکانی خۆمان بۆ دێیان بەرێبکەین و هەواڵەکە بە بەربەرینی بڵاو بکەینەوە کە حەمەدۆك دایە سوڵتانی کوشتوە. دەزانن ئەوە شتێکی زۆر پێویستە ئیدی؟

مورتەزا گوتی:

ـ ئەوەی بە خۆم بسپێرە قوربان. دوو ڕۆژم مۆڵەت دە! ئەو جار دەبیسیی‌یەوە کە تەواوی خەڵکی شاخ و دەشتی ئەم هەرێمە حەمەدۆکی تف و لەعنەت دەکەن و دڵنیات دەکەم کە ئیدی ئەو کابرایە لە بەین دەچێ و لە کۆڵمان دەبێتەوە!

ئەوانی دیکەش گوتیان:

ـ بە ڕاستی باش بوو حەمەدۆك ئەو پیرێژنەی کوشت. ئەوە زۆر بە قازانجی ئێمە تەواو بوو. بێگومان ئەو هەواڵە کە حەمەدۆك دایە سوڵتانی کوشتوە، دەسبەجێ بە هەموو وڵاتی دا بڵاو دەبێتەوە...

ـ ئێمە دەتوانین سوودێکی زۆریش لە کوژرانی یاوەر و سەرجووخە عەلی وەرگرین! ئێستا ئەمن دەچمەوە ئەنکەرەی و داوا لە وەزیری نێوخۆ دەکەم سەرهەنگ عەزمی، ئەو کەسەی بە "

باهۆز" بەنێوبانگە، بنێرێتە نێرە... ئەو وەدوای حەمەدی دەکەوێ و زستانیش بێ، دەستی لێهەڵناگرێ. جا ئیدی خەڵکمان لە پشت بێ و سەرهەنگ عەزمیش کارەکەی بەستۆوە بێ، ئیدی حەمەدۆك هەر خۆ ناگرێ و مانگێکیشی پێناچێ لە بەین دەچێ!

ئەوێ ئێوارێ لە سەر ناخواردنێ و لە کاتێك دا پەیتا پەیتا ئارەقی ڕاکیان پێدا دەکرد، باس هەر باسی سەرهەنگ عەزمی بوو، کە خەڵك ناویان نابوو "باهۆز". ئەو سەرهەنگە لە تەواوی تورکیەی ناوبانگی بە ئازایەتی دەرکردبوو. هەرچی جووتێری لەو وڵاتەی هەبوون، هەموو لێیدەترسان. لەوەتا کۆمار دامەزرابوو، ئەو سەرهەنگە بۆ هەموو لایەکی بەرێکرابوو و هەر شوێنێك جووڵەیەك، یان دەنگێکی ناسازی تێدا بەدی کرابا، وەك باهۆز تێکیەوە دەپێچا، وەك ئاگر دەیسووتاند، بە سەریەکی دا دەڕووخاند و ئەو جووتێرە ترسەنۆکە پیاوکوژانەی هەمیشە فیتنە و ڕاپەڕینیان دە بن سەری دایە، تەفروتوونا دەکرد. پیاوێکی وا بە زاکوون بوو، کە تەنانەت مرادپاشای گۆڕکۆڵی بە نێوبانگیش لە بەرامبەر وی دا مەرێ خودای بوو! ئەو جار ئەو پیاوە دەبێتە ڕاوچیی تووڕووسی و هێندە بە سامە، بە هەر شوێنێك دا بڕوا، ئینسانەکان، لووتکە هەرە بەرزەکان، ئاوهەڵدێرە خوڕێنەکان و باڵندە چنگتیژە گۆشتخۆرەکان لە بەری دادێنەوە و کڕنۆشی بۆ دەبەن!

هەموو بە کەیف بوون، پێدەکەنین و خۆشحاڵ بوون. مورتەزاغا ئەوەندە خۆشحاڵ بوو، کە خۆی پێڕانەگیرا، هەستا و دەستی بە سەما کردن و چەقەنەلێدانێ کرد.

عەلیيە شەل ساتێك لە بەر پەنجەرەی ڕاوەستا، گوێی دا گاڵوبوغری نێو ژوورێ، پاشان بە ماتە ماتە لە وێ دوور کەوتەوە. باران وەك گۆزەی سەرەو ژێر دەباری و ئەوەندە تاریك بوو چاو چاوی نەدەدی. ئەمشۆ زۆر لە دوێنێ شەوێ تاریکتر بوو و باران و باکوتەکەش توندتر بوو. عەلی بە پارێزەوە خۆی گەیاندە بەر دەرگای حەساری ژاندەرمەخانەی. بانی خانووەکە تەنەکە بوو و لەو گۆپاڵبارانەی دا تەقەتەق و خرمەخرمێکی دانابۆوە، تۆپت تەقاندبایە، کەس نەیدەزانی. عەلی بایدایەوە لای ڕاستە و بە بن دیواری دا خۆی گەیاندە نێو دارهەنارەکان. بنیامین لە وێ بوو.

ـ بنیامین، ئەمنم، عەلیيە شەل! گوێت لێمە!

پیاوەکە وەڵامی نەدایەوە. نەشبزووت. عەلی دیسان دواندیيەوە. دەستی گرت و کێشای، بەڵام ئەو کابرا کەڵەگەتە چوارشانەیە وەك ڕەوەزە بەردێك لە جێیخۆی چەقیبوو و نەدەبزووت.

ـ بنیامین! بنیامین! ماڵوێران، ئەوە بەو نیوە شەوەی لێرە چ دەکەی؟ وڵات ڕووناك بێ و ژاندەرمە لێرەت ببینن، سەد ڕوحت پێبێ، یەکت پێناپەڵن! لەتوپەتت دەکەن، بنیامین!

عەلی دەستەوداوێنی دەبوو و دەپاڕایەوە، تێیدەکوتا، لێیهەڵدەقورینجاند، تەنانەت بەردێکیشی بە لاقی دادا، بەڵام کابرا قولانجێکیش نەبزووت. هەر ڕاوەستابوو، وەك پەیکەرەیەکی بێگیان، وەك دارێکی ئەستوور، وەك ڕەوەزێك.

ــ کوڕە بنیامین، بە قوربانت بم، شێرەکەم، پڵینگەکەم، دە سەرت گەڕێم... کوڕە پیاوی چاك بە...

هەرچەندی عەلی هەوڵی دا هیچی بۆ لە گەڵ نەکرا و کابرا گوێی لێنەبوو. عەلی زۆر ئاڵۆز بوو. ڕوونی کردبا و ژاندەرمە بنیامینیان لە وێ، لەو حەسارەی دیبایە، دەیانکوشت. عەلی پشتی بە دارەکەی پێشیانەوە دا و دانیشت. بنیامین هێندێك جوولا، ڕاژا، هاتە سەر چۆك، هەردووك دەستی لە سەر دڵی دانان و لە بن لێویەوە دەستی بە ورتە ورتێ کرد. وا دیار بوو خەریکی دوعاکردنێ بوو. عەلی ئەو هەلەی قوازتەوە و گوتی:

ــ بنیامین گیان، دەروێشی خانەقای چلچاوی، کوڕی بنەماڵەی پاکان، شوانی مامزەکان، پیاوچاکە دڵپاکەکەم! گوێم لێبگرە! دایە سوڵتان هێندێك شتی بە من گوتوە. ئەمنی ڕاسپاردوە ڕێنوێنیت بکەم و پێت بڵێم چ بکەی!

بنیامین هەستایەوە سەر پێ. بەردێکی گەورە لە پەنایان بوو. عەلی چووە سەر بەردەکەی، لە وێ ڕا سەری بردە بن گوێی و گوتی:

ــ ئەوە فەرمانی دایە سوڵتانی‌یە! ئەو فەرمووی دەبێ لە گەڵ عەلی‌یە شەلی بڕۆی و چت پێ بڵێ بە قسەی بکەی! ئەمن ئەوە پێم گوتی و تۆش ئەگەر دەروێشی ئەو خانەقایەی و شوانی مامزەکانی، دەبێ گوێم لێبگری! بنیامین ئەمن عەلی‌یە شەلم! وە دوام کەوە با بڕۆین...

عەلی باسکی پیاوەکەی گرت و ئەویش ئەو جار وەك مەڕێکی دەستەمۆ وە دوای کەوت. باران حەشری دەکرد. گرمە و شریخەی هەوران و ترووسکەی برووسکان نەدەبڕایەوە. ئەوان سووکێك لە حەساری ژاندەرمەخانەی هاتنە دەر و بە پەنا دیواران دا خۆیان گەیاندە ئەو بەری مەیدانێ. جادەی سەرەکیی شاری پڕ لە ئاو بوو و ئاوەکە بە خوڕە خوڕ و هاشەهاش سەرەوژێر دەڕۆیشتە خوارێ. هیچ کەس بە دەرەوە نەبوو و لە هەموو شارەکە دا تەنانەت شۆقی چرایەکیش دیار نەبوو. عەلی بنیامینی بە دوای خۆی دا کێشا و بردیە ماڵی مەلا دۆرانی کە لەمێژ بوو بە دڵنیگەرانی‌یەوە چاوەڕوانیان بوو. کاتێك گەیشتنە پشت دەرگایە، مەلا دۆران گوێی لە دەنگی پێیان بوو و دەسبەجێ دەرگای کردەوە. باران هەر وا بە خوڕ دەباری:

ــ زوو کەن، وەرنە ژوورێ...

عەلی بنیامینی وە پیش دا و پاڵی پێوە نا بۆ ژوورێ:

ـ چ قەوماوە عەلی، زۆر نیگەران بووم...

ئەوەتا لە گەڵ خۆمم هێناوە. وەك بەردی لە حەساری ژاندەرمەخانەی چەقیبوو و بۆم لە جێی خۆی نەدەبزووت...

بنیامین خەنجەرێکی چەرکەسیی دەسکزێوی بە دەستەوە بوو و هەردووك لای دەمی خەنجەرەکەی هێشتا بە خوێن بوون.

چوونە نهۆمی سەرەوەتر. سۆبە نێڵ درابوو و لایەکی سوور ببۆوە. بنیامین لە نێوەڕاستی ژووریَ ڕاوەستابوو. لەشی هەموو بە خوێن بوو...

ـ عەلی، شتومەکەکانی لە بەر داکەنە.

دەبوو لە پێش دا خەنجەرەکەی لە دەستی دەرێنن، بەڵام قامکەکانی‌یان بۆ لە دەسکی خەنجەرەکەی نەدەبوونەوە. ئاخرەکەی عەلی گوتی:

ـ جاریَ با واز لە وی بێنم و بۆخۆم خۆم بگۆڕم و هێندێك بێمەوە سەرخۆ. دواتر ئەویش جێبەجیَ دەکەم.

کە هاتەوە پانتۆڵێك و کراسێکی درێژی ماڕاشی دەبەر دا بوو و چەکمەیەکی سووریشی دە پیَ کردبوو. عەلی ئەو جار بە بزەیەکەوە لە بنیامینی چووە پێشی و گوتی:

ـ دەروێش بنیامین! دەروێش بنیامین! ئەوە فەرمانی دایە سوڵتانی‌یە. ئەو فەرمووی دەبیَ خەنجەرەکەت بدەی بە عەلی‌یە شەلی و پاشان سەربەرگ، چەکمە و جلەکانی دیکەشت داکەنی...

بنیامین بیَ سیَودوو خەنجەرەکەی دا بە عەلی، دانیشت، چەکمەکانی لە لاقی دەرێنا و پاشان سەربەرگەکەشی لە خۆی کردەوە. گۆرەوی‌یەکانی وشك بوون.

ـ بنیامین ئەو جار فەرمانی دایە سوڵتانی ئەوەیە، کە دەبیَ پێم بڵێی بزانم پانتۆڵ و جلەکانی دیکەت تەڕ نین...

بنیامین دەستی بە جلەکانی ژێرەوەی دا دا گێڕا و ورتەیەکی لیَهات:

ـ نا...

ـ ئەدی دیوی نێوەوەی سەربەرگەکەت؟

ـ ئەویش دیوی ژوورێی تەڕ نیە!

ـ باشە، وەرە لە بن سۆبەی دانیشە و خۆت گەرم کەوە!

ـ بنیامین هەستایەوە سەر پیَ. هێندە کەڵەگەت بوو، سەری وە بەری میچی دەکەوت. لە بن ئاوری دانیشت، سەری بەردایەوە و ئیدی جووڵەی نەکرد. دەتگوت بە عەرزەکەیەوە دروواوە.

لە سەر مەجومعەیەکی گەورە نانیان هێنا. قاپێك ماشێنە کە هەڵمی لێ‌هەڵدەستا و بۆنی سیر و نەعنەی لێ‌دەهات، هەروەها گۆشتی سوورەوەکراو، پەتاتەی سوورەوەکراو، پلاو و دەوری‌یەك هەنگوین لە سەر مەجومعەکەی بوون.

مەلا دۆران گوتی:

ــ فەرموو دەروێش بنیامین، فەرموو بخۆ! هەر خودا بۆخۆی دەزانێ، چەند ڕۆژت بە برسێتی بردۆتە سەر.

عەلی گوتی:

ــ وایە وەڵڵا! لەوەتا هاتۆتە ئێرە، هەر لەبن ئەو دارهەنارەی بەر دەرگای ژاندەرمەخانەی ڕاوەستاوە و چاوەڕوان ماوەتەوە، کەس نەی‌دیوە، یان با بڵێین کەس ئاوڕی وێ‌نەداوە. جاری واشە ئەگەر کەسێك، یان شتێك بەردەوام لە شوێنێك مایەوە و جێی نەگۆڕی، وەبەر چاوی خەڵکی نایە! دە فەرموو، دەروێش بنیامین، بخۆ!

دەروێش هەر وا سەری دە بەر خۆ نابوو و گوێی لەو قسانە نەبوو. دەتگوت مەجومعەکەشی هەر نەدیوە.

مەلا دۆران جارێکی دیکەش ڕووی تێ‌کردەوە:

ــ دەروێش گیان بخۆ! چێشتەکان سارد دەبنەوە!

بەڵام بنیامین هیچی نەدەبیست و هەر وا لە گەڵ بیر و خەیاڵی خۆی تێکەڵ بوو. ئەو جار عەلی‌یە شەل گوتی:

ــ گوێم لێ‌بگرە، دەروێش! دایە سوڵتان، شێخی خانەقای چلچاوی فەرمووی: پێی بڵێ وەرسووڕێتە لای مەجومعەکەی، ماشێنەی بخوا، برینج، گۆشت و پەتاتەش بخوا. دوای ئەوانە هەنگوینیش بخوا. بەڵام دەی‌فەرموو پەلەی نەکا و بەکاوەخۆ بخوا!

بنیامین تەنانەت بەبێ ئەوەی هەستێتە پێش، لە حاست خۆی سووڕا، کەوچکەکەی دەست دایە و دوای ئەوەی نیوەی شۆرباوەکەی هەڵقوڕاند، پلاوەکە و چێشتەکانی دیکەشی هەموو خوارد.

ئەو جار کاتێك دەیەویست دەست بە هەنگوینەکەی بکا، عەلی وشیاری کردەوە:

ــ ڕاوەستە دەروێش بنیامین! لە پێش دا دەبێ هێندێکی دیکە لەو شۆرباوەی بخۆی، دوایە دەست بکەی بە هەنگوینەکەی!

بنیامین بە قسەی کرد و درێژەی بە خواردن دا. زۆر بە پەلە دەی‌خوارد و وا دیار بوو ئەگەر لێت گەڕابایە و وشیارت نەکردبایەوە، بیری لە دەستکێشانەوە نەدەکردەوە.

ــ بنیامین ئەو جار بەسە...

دەروێش بنیامین دەستی کێشایەوە و لە بن لێوی دا دوعایەکی خوێند:

ـ شوکرانەبژێری دەرگای تۆم خوای گەورە، لە بەرامبەر ئەو رِزق و تێشووە دا کە پێمان دەبەخشیّ و هەتا هەین لێمان‌نابڕی!

ئەو جار دەروێش چاوەکانی کرانەوە و هێندێك سەرسورِمان لە رِوومای دا بەدی دەکرا. چاوی بە دەوروبەری خۆی دا دەگێرِا و دەت‌گوت تا ئێستا نەی‌زانیوە لە کوێ‌یە. پاشان سێبەری زەردەخەندەیەکی بە سەر لێوان کشا، بەلاّم زەردەخەندەکە زوو ون بوو و نێوچاوانی گنجی تێ‌کەوت، دەموچاوی گرژ بوو و رِاچەنی. لە سەرەخۆ هەستایە سەر پیّ و گوتی:

ـ کاعەلی، خەنجەرەکەم کوا؟

ـ ئەوەتا لێرەم داناوە...

بنیامین خەنجەرەکەی لیّ‌وەرگرتەوە و دە کالانەکەی نایەوە. دیار بوو هێندێك هاتبۆوە سەرخۆ.

ـ یارِەبی خودا بتبەخشیّ، کاعەلی...

ـ ئیشالّلاّ تۆش ببەخشیّ، بنیامین...

ئەو جار بنیامین چاوی دە چاوی عەلی برِی و بە نارِەحەتی‌یەوە لە بن لێوی‌یەوە گوتی:

ـ دایە سولّتانیان کوشت... بە ئێدانیّ کوشتیان... دەزانی ئێستا تەرمەکەی لە کوێ‌یە؟

لێرە دا دەنگی کز بوو و چی دیکەی بۆ نەگوترا:

ـ لە مزگەوتێیە...

بنیامین هەستایە سەر پیّ و بە پەلە بۆ لای دەرگا چوو.

ـ رِاوەستە بنیامین!

بنیامین لە جێی خۆی رِاوەستا.

ـ هێندێك رِاوەستە، ئەمنیش لە گەلّت دێم.

دەروێش بنیامین لە سەر عەرزی دانیشت و چەکمەکانی دە پیّ کرد. پاشان هەستا دەرگای کردەوە و بە پەلە وەدەر کەوت. عەلی بە دوای دا رِای کرد.

ـ رِاوەستە بنیامین، دەبیّ ئەمنت لە گەلّ بم! رِاوەستە، با ئەو چرادەستی‌یەی بێنم!

عەلی چۆوە ژووریّ، عەلەتریکێك لە پەنا ناورگی مدبەقیّ دانرابوو، رِۆی بۆیە و هێنای. پاشان قۆلّی دەروێشی گرت، رِۆیشتن و خۆیان گەیاندە مزگەوتیّ. مزگەوتەکە هیچ‌کەسی لیّ‌نەبوو. عەلەتریکەکەیان هەلّکرد، تەرمی دایە سولّتانی دە بەرماڵێکی سپی‌یەوە پێچرابوو و لە نێوەرِاستیّ دانرابوو. کاتێك دەروێش بنیامین گەیشتە لای، کەوتە سەر چۆك و سیّ جاران عەرزەکەی ماچ

کرد. پاشان بەرماڵەکەی لێ کردەوە و سێ جاران دەستی ماچ کرد و لە سەر نێوچاوانی دانا. ئەو جار دە بەرماڵەکەیەوە پێچایەوە، دەیەویست هەڵی گرێ و بیخاتە سەر پشتی خۆی.

ـ ڕاوەستە بنیامین! ئەتۆ ئەو چرایەم بۆ بگرە و ڕووناکاییم بۆ بکە، ئێستا تەرمەکەت بۆ دەپێچمەوە.

عەلی سەربەرگەکەی خۆی داکەند، لە سەر بەرماڵەکەیەوە توند دە تەرمی دایە سوڵتانی‌یەوە پێچا و ئەو جار بە کۆڵی بنیامینی دادا و جوان بۆی قایم کرد. لەشی دایە سوڵتانی هێندە سووک بوو، دەتگوت باڵندەیە دە سەربەرگەکەیەوە پێچراوە. عەلی گوتی:

ـ دەروێش، ئاوا باشترە، دیتووتە چۆن دەبارێ؟ خۆ نابێ تەرمی دایە سوڵتانی تەڕ بێ.

ـ ئەو عەلەتریکەش لە گەڵ خۆت بەرە. کەندوقووڵ دە ڕێگایە دا زۆرن. لە وانەیە لە شوێنێك پێویستت پێی ببێ. پێم بڵێ بزانم دەمانچەت پێ‌یە؟

ـ نا، دەمانچەم پێ‌نیە.

عەلی دەمانچەکەی لە قەدی خۆی کردەوە و لە قەدی بنیامینی بەست. دەراغە زیادی‌یەکانیشی دایە:

ـ ئەوە چاردە خۆرە. وا باشە پێتبێ! زستانە، نەوەك لە ڕێیە تووشی گورگان، یان دەعبای دیکە بی. ئێستا بڕۆ خوات لە گەڵ بێ!

بنیامین دەرگای مزگەوتێی کردەوە و ئەوەندەی بڵێی یەك و دوو لە نێو تاریکایی‌یە دا ون بوو.

ڕێوڕەسمی ناشتنی یاوەر فاڕوق و سەرجووخە عەلی کەرتیشی بە شێوەیەکی زۆر ڕێکوپێك و ڕازاوە بە ڕێوە چوو. قسەکەر دوای قسەکەر بە تین و هەستێکی زۆرەوە قسەیان کرد و بۆ ئەو دووانە کە قارەمانانە گیانی خۆیان لە ڕێگای نیشتمان دا بەخت کردبوو، گریان و نەفرەت و بێزاریی خۆیان لە حەمەدۆك، ئەو دێوەزمە خوێنخۆرە کە ئەوانی کوشتبوو، دەردەبڕی...

عارف سایم بەگ دوای هەمووان چووە سەر سەکۆی قسە کردنێ. ئەو جلێکی ڕەشی دە بەر کردبوو و دەسرەیەکی سپیی گەورەی بە دەستەوە بوو، کە پەیتا پەیتا چاوی پێ دەسڕی‌یەوە. پێش وەی دەست بە قسان بکا، نەرمێك کۆخی و گەرووی خاوێن کردەوە. لەو کاتە دا خەلکەکە وا بێ‌دەنگ ببوون، تەنانەت مێشێکیش بە وێ دا فڕیبایە، دەنگی باڵی دەبیسرا:

ـ هاونیشتمانانی خۆشەویست! حەمەدۆکی پیاوکوژ خۆی گەیاندە شارەکەمان و خاتوونی دیندار و پاك، شاژنی نێو خاسەژنە خواناسەکان، واتە دایە سوڵتانی کوشت! ئەو هەروەها یاوەر فاڕوق و سەرجووخە عەلیی خۆشەویستمانیشی کوشتوە، کە دیارە ئەوانە هەردووکیان

گیانیان لە ڕێگای نیشتمان دا بەخت کردوە. ئەوان هەردووکیان گیانی خۆیان لە کاتێك دا بەخشیوە، کە خۆیان کردبووە مەتاڵی بەرگری لەو ژنە پیرۆزەی، کە پشتاوپشت دەچێتەوە سەر حەزرەتی پێغەمبەر و لە تایفەی وی‌یە! ئەوان ئەرکی خۆیان بەڕێوە برد و بە ڕاستیش ئەرکی ئێمە هەمووومان هەر ئەوە بوو کە ئەو ژنە شێخە دیندارە، بە نرخی لە دەستدانی گیانی خۆشمان بپارێزین! چونکە دنیای موسوڵمانان تا ئێستا بە سەدان، هەزاران، یان با بڵێین میلیۆنان شێخ، پیر و پێغەمبەری بە خۆوە دیتوە، بەڵام هەرگیز ژنی وامان نەبوون کە بگەنە پلەی پێغەمبەرایەتی یان شێخایەتی. ئەو ژنە پاکە تەنیا ژنێك بوو کە خوای تەبارەك و تەعالا ئەو پلە و پایەی پێ‌بەخشیبوو و لە تورکیەی ئێمە هێنابوویە سەر دنیا! چونکە سەرکۆماری ئێمە ڕێزێکی زۆر بۆ ژنان دادەنێ، سەرنجی تایبەتی‌یان دەداتێ و ئێمەش پەیڕەوی لە فەرمانی وی دەکەین، کاتێك ئاگادار بووین دایە سوڵتان لە وێ، واتە لە شاخی مەترسیی لە سەرە و حەمەدۆکی پیاوکوژ نیازی کوشتنی ویی هەیە، گەورەترین ئەفسەری خۆمان، واتە یاوەر فارۆقمان ناردە لای و بانگمان کردە ئێرە. هێنامانە ئێرە بۆ ئەوەی لەمەودوا لە شاری بژی. لێرە ڕێزێکی زۆرمان لێ‌گرت. دە لیفە و دۆشەکی پەڕی قوو دا دەمان نواند، هەموو چەشنە خواردەمەنی‌یەکی خۆش و تەنانەت وەك دەڵێن شیری مریشکێشی ویستبا، بۆی ئامادە دەکرا و لە پێشی دادەنرا! ئەوە ئەرکی ئێمە بوو ئەو ژنە خواناسەی کە یەکەم ژنە شێخی سەر ئەم عەرزە بوو و دیاردەیەك بوو تا ئێستا وێنەی نەدیترابوو، وەك چاوی خۆمان بپارێزین و وەك خەزێنەیەکی گرانبایی ئاگاداریی لێ‌بکەین! دایە سوڵتان زۆر لە پێشوازیی ئێمە ڕازی بوو و زۆری سوپاس کردین! بەڵام حەمەدۆك کە نە خودای دەناسێ و نە باوەڕی بە کەلامی خوای و پێغەمبەری خوای هەیە، بەو کارەی ئێمە ناڕەحەت بوو و بڕیاری دابوو تۆڵە بکاتەوە. هەر بۆیەش خۆی گەیاندە ئێرە و لە کاتێك دا ئەو شەوە بارانێکی یەکجار توند باریوە، برووسکە و باکوتێکی زۆر خەست هەبووە و تاریکە شەوێکی قورس بووە، حەمەدۆك دەرفەتی هێناوە و هەم دایە سوڵتانی خۆشەویست و ئازیزی ئێمەی کوشتوە و هەم ئەو یاوەر و سەرجووخە قارەمانە، کە ئەرکی پاراستنی وی‌یان بە ئەستۆوە بووە...

هاونیشتمانە بەڕێزەکان، خەڵکی قارەمانی شارە خۆشەویستەکەمان! ئێستا ئەمن زۆر ناڕەحەتم! زۆر بە داخم! چونکە ناچارم هەواڵێکیشتان بدەمێ، کە پیاو وا لێ‌دەکا خوێن بگری. ئەویش ئەمەیە کە هەر ئەمشەو حەمەدۆك توانیویەتی خۆی بگەیەنێتە مزگەوتێ کە تەرمی دایە سوڵتانی لێ‌بووە و ئەو تەرمە پیرۆزەی لە گەڵ خۆی بردوە. هێندێك کەس گوێیان لێ‌بووە لە کاتێك دا لە شاری وەدەرکەوتوە

گوڕانلوویەتی: ئەمن تەرمی ئەو ـ ببوورن، لە زمان ئەو پیاوکوژەیەوە دەڵێم ـ جندەیەی داوێمە پێش سەگان، با بیخۆن. ئەو چەتە خوێنخۆرە زۆر قسەی ناحەزی دیشی کردوون، کە بە ڕاستی ئەمن پێمشەرمە بە زمانمیان دا بێنم و لە ڕاستی دا کەسێك کە تۆزێك ویجدانی هەبێ، نەك هەر بە ژنێکی گەورە و پاکی وەك دایە سوڵتانی، بەڵکوو بە ژنی دیکە و تەنانەت بە خراپەیەکیشیان ناڵێ...

لێرە دا عارف سایم بێدەنگ بوو و ڕوومەت و چاوەکانی بە دەسرە سپییەکەی سڕینەوە. جەنابی نوێنەر گریانی دە ئەوکێ مابوو و لە عەیبەتان دەنگی گیرابوو.

ـ بەڵێ، دۆستان، ئەمن پێشتر شانبەشانی شازدە پیاوچاکە سەوزپۆشەکان لە بەرامبەر دوژمنانی ئەم نیشتمانە دا شەڕم کردوە، ئەو پیاو چاکانەی هەموویان لە شەڕ دا شەهید بوون و هیچیان نەگەڕانەوە. ئەوان هەر یەکەو بە لەشکرێکی بوون و هەر لە سایەی ئازایەتیی ئەوانیشەوە بوو کە ئێمە توانیمان دوژمنی تێکبشکێنێن و دە دەریایەی کەین!

لە نەکاو دەنگی بەرز کردەوە:

ـ نا... نەتەوەی تورکی ئێمە هەرگیز ئەو جینایەتەی دەرحەق بەو ژنە خواناس و گەورەیەی کراوە، لە بیر ناچێتەوە و تۆڵەی دەستێنێتەوە. تەنانەت ئەگەر ئەو ستەمە دەرحەق بە ژنێکی ئاسایی و گریان تاوانبار و خراپیش کرابایە، هەر وا بە خۆڕایی نەدەچوو و ئێمە لە بەرێوەبەرانی ئەو جینایەتە خۆش نەدەبووین! وڵاتی ئێمە دەبێ ئەو خەسارانە بە تۆڵەکردنەوە لە حەمەدۆکی دێوەزمەی کافری خوێنخۆر قەرەبوو بکاتەوە!

لەو حاڵەش دا وەك هەڵۆیەك کە باڵی لێکدەدا، باسکی ئاواڵە کردنەوە و هەڵیتەکاندن. خەڵکەکەش دستیان بە هەراوهوریایە کرد:

ـ تۆڵەی دایە سوڵتانی دەستێنینەوە!

ـ بە زوویی حەمەدۆك دەبێ بگیرێ!

ـ بۆخۆمان دەزانین بیگرین چیی لێدەکەین!

کاتێك عارف سایم بەگ لە سەر سەکۆکەی هاتە خوارێ، خۆشحاڵ و ڕازی بوو. هەموو ڕایان کردە پێشێ و سەبارەت بەو وتارە پڕمانایە پیرۆزباییان لێکرد. هێندێکان دە باوەشیان دەگرت و هێندێك دەستیان ماچ دەکرد. ئەویش پێدەکەنی و کەیفی ساز بوو. ئێستا ئیدی هیچ نیشانەیەکی خەم و خەفەتی بە ڕوویەوە دیار نەبوو.

کاتێك حەشیمەتەکە بەرەوشار بۆوە، ئیدی ئەو سواری ماشێنەکەی نەبۆوە، بەڵکوو بە پێیان، لە حاڵێك دا بەشێکی قورسایی لەشی دەدایە سەر وەکازەکەی، سینگی دەرپەڕاندبوو،

سەری هەڵێنابوو و بزەیەکی نە سەر لێوان بوو، لە پێش خەڵکەکەیەوە دەڕۆیشت. بەو شێوەیە بە مەیدانی شاری دا تێ‌پەڕی و لەو بەینە دا بە هیچ شێوەیەکیش ئاوڕی نەدەدایەوە ئەملاونەولای خۆی و ئەوانەی نەدەدی کە لە هەردووك لایان ڕاوەستابوون و بەڕێزەوە دەستیان بۆ لە سەر سینگیان دانابوو و سلاویان لی‌دەکرد.

هەڵمەتی هاندانی خەڵك و پڕوپاگەندە دژی حەمەدۆکی، لە سەر ئەو بناخەیەی کە بەڵێ حەمەدۆك چۆتە شاری و دایە سوڵتانی لە بەر ئەوەی ویستوویە ئەنگوستیلە و کراسە سیحراوی‌یەکەی بدا بە ژاندەرمەکان، کوشتوە. زۆری خێر نەدایەوە. تەنانەت ئەوانەش کە سەرەتا لەوانە بوو تا ڕادەیەك باوەڕیان کردبێ، ئێستا شەرمیان لە خۆیان دەکرد کە چۆن ئەو درۆ گەورانەیان قووت داون! هێندەی پێ‌نەچوو خەڵك زانیان کە یاوەر فاڕوق و سەرجووخە عەلی کەرتیش لە دایە سوڵتانیان داوە و کوشتوویانە. ئەوەش دەگوترا کە ڕۆژێك حەمەدۆك ئەخۆوە هەستی بە دلەڕاوکێیەکی قورس کردوە، دەنگێکی لە شوێنێکی دوورەوە بیستوە و دڵی هەواڵێکی ناخۆشی پی‌داوە. هەر بۆیە بە پەلە لە شاخی ڕا هاتۆتە شاری. کاتێك لە تەنیشت پردێ چاوی بە تەرمی دایە سوڵتانی کەوتوە، خوێن گریاوە و ئیدی هەڵی‌کوتاوەتە سەر ژاندەرمەخانەی. لە پێش دا عەلی کەرتیشی کوشتوە و پاشان یاوەر فاڕوق و بەو شێوەیە تۆڵەی خەجێشی لە یاوەری کردۆتەوە و پاشان تەرمی ئەو دووانەشی هێناوە لەملاونەولای دایە سوڵتانی درێژی کردوون...

چەند ڕۆژ دوای ڕێوڕەسمی ناشتنی یاوەر و عەلی کەرتیشی باسێکی نوێ لە نێو خەڵکی دا سەری هەڵدا: حەمەدۆك و دەستەکەی هاتوونە خوارێ و چلسوارەی غەیبیش بە کراسی سپی‌یەوە وە پێشیان کەوتوون. خۆیان گەیاندۆتە ئەو ئۆردووگایەی تەرمی دایە سوڵتانی لێ بووە و سێسەد ژاندەرمەش کێشکیان لی‌کێشاوە. تەرمی دایە سوڵتانیان لە وێ، لە نێو ئەو هەموو ژاندەرمانە هێناوەتە دەر و بردوویانەتەوە بۆ خانەقای چلچاوی! خەڵکەکە ئەوەیان پێ ڕاست بوو و دەیانگوت ڕاستی ڕەنگە بۆ ماوەیەکی کورت، بەڵام هەتاهەتایە ون نابێ، هەر وەك چۆن ڕۆژ هەمیشە دە بن هەوری دا نامێنێتەوە!

هەر لەو کاتە دا کە عارف سایم بەگ لە گەڵ خەلیل بەگی گەورە، زولفۆ و مەلا دۆرانی دە ڕیی ئەنکەرە دا بوون، بنیامینیش بەرەو چیا و خانەقای چلچاوی دەچۆوە و گەنجینە پیرۆزەکەشی کە وەك چاوی خۆی دەی‌پاراست، بەکۆڵەوە بوو. دەگەیشتە هەر دێیەکی، بۆ خەڵکی دەگێڕایەوە کە چۆن عەلی کەرتیش و یاوەر فاڕوق دایە سوڵتانیان کوشتوە و چۆنیش پێش ئەوەی ئەو ژنە خواناسە دواهەناسەی هەڵکێشێ، بۆخۆشیان کوژراون.

دەروێش بنیامین سەرەنجام دوای چەند ڕۆژ ڕێگا برین و تێپەڕین لە دەیان کێوی بەرز و دۆڵی قووڵی پڕ لە بەفر، گەیشتەوە خانەقای چلچاوی. تاتەبەردێکی شینی پان و درێژ لە حەساری خانەقایە دا بوو، تەرمەکەی بە پێچراوەیی لە سەر ئەو تاتەی دانا و بۆخۆشی لە بن سەری ڕاوەستا و سەری داخست. هێندەی پێنەچوو خەڵکی گوندەکان لە هەموو لایەکی ڕا داوەرین. خەڵکی هەموو چیاو دۆڵەکانی ئەو هەرێمە بەربەرینە، بێ ئەوەی بیر لە بەفرو سەرمای سەخت بکەنەوە، بەرەو خانەقای چلچاوی وەڕێکەوتن...

پێش هەموو کەس سەرپەرستی خانەقایە هات ، لە پەنا دایە سوڵتانی چۆکی دادا و فاتیحای خوێند. ئەو سۆفی‌یە هەموو تەمەنی خۆی بە شوانی‌یەتیی مێگەلەکانی خانەقایە بردبووە سەر و ئێستاش بە سەر کاروباری خانەقایە ڕادەگەیشت. پاشان بابە هەنگوین کە پیاوێکی پیر بوو و تەمەنی لە سەتی تێپەڕیبوو، گەیشتێ. بابە هەنگوین خەڵیفەی خانەقایە بوو و لەو دیوی ئەو چیایانە، لەو بەری چۆمی فوراتێ گەورەی کۆمەڵێك دەروێش بوو. ئەو دەروێشانە لە کاتی زیکر و جەزمبوونێ دا ژەهریان دەخوارد، بەڵام هیچیان لێنەدەهات. بابە هەنگوین شمشاڵێکی دە بەر پشتێندی دابوو، سازێکی بە دەستەوە بوو و کڵاوێکی خوریی گەورەی لە سەر بوو، ڕیشی وەك بەفرێ سپی بوو و هەتا سەر نێوکی دەهات. ئەویش هات و لە حاڵێك دا دەستەکانی چەپ و ڕاست لە سەر سینگی دانابوو و سەری بەرداوبۆوە لە پەنا سەرپەرستی خانەقایە ڕاوەستا.

پاشان دەروێشەکانی خانەقای "دەدە کارگینە"ی هاتن. ئەو خانەقایە لە قەراغ دەریای نێوەڕاست بوو. ئەو دەروێشانەش تایبەتمەندی‌یان ئەوە بوو، کە دەیانتوانی وەك چۆن بە سەر عەرزی دا دەڕۆن، بە سەر شەپۆلەکانی دەریایەش دا بڕۆن. پاشان بەدرەدینی‌یەکان هاتن. ئەوانە خەڵکی لێوارەکانی دەریای "نێژە" بوون و لاقیان لە هەر شوێنێکی دانابایە، جا شاخ بوایە، ڕەوەز بوایە، یان دەشت و شۆرەکات بوایە، ئەو شوێنە گوڵی لێ شین دەبوون، دەسبەجێش گوڵەکان گەورە دەبوون، دەپشکووتن و بۆنی جۆراوجۆریان بە وڵاتی دا بڵاوە دەکردەوە. ئەو جار نۆرەی عەودالەکانی دێرسیمێ هات. بەڵام ئیدی ئەو عەودالانە تایبەتمەندی و تواناکانیان ئەوەندە زۆربوون، دە ئەژمار نەدەهاتن. لە کۆتاییش دا دەروێشەکانی کۆمەڵی حاجی بەکتاشی لە شکلی ژمارەیەکی یەکجار زۆر کۆتری سپی دا پەیدا بوون، هاتن نێوان گومبەزی خانەقایە و ئەو تاتەیان داپۆشی، کە تەرمی دایە سوڵتانی لە سەر دانرابوو. وایان داپۆشیبوو، دەتگوت چارشێوێکی سپی بە سەر ئەو شوێنە دادراوە. کۆمەڵەدەروێشی دیکەش زۆر هاتبوون. دەستەی وا بوون دەیانتوانی شمشیری قووت دەن، زەرگی ئەودیواودیو لە زگی خۆیان دەن، بە سەر کۆیەك

پۆلووی سوور دا بڕۆن، سواری شێری بن، یانبەرد و داری بکەنە دەعبای زیندوو. خەلکێکی زۆر کۆ ببۆوە. هەموو لە پشت یەکتر بە ڕیز ڕاوەستابوون، دەستیان چەپ و ڕاست بە سینگیانەوە بوو و سەریان بەردابۆوە.

ئاسنگەرەکانی ئانتێپێ، پینەچی و جۆلاکانی ماراشی، زێڕینگەرەکانی مالاتیای و هەر کەسی دیکەش بیستبووی دایە سولتان کۆچی دوایی کردوە، سەرەڕای سەرما و زەحمەتی زۆری ڕێگایە، هەموو هاتبوون. کۆمەلێك ژن کە لە بن دەسمالی سپییەوە لەچکەی ڕەشیان لە سەریان بەستبوو و کراسی ڕەنگاوڕەنگیان لە بەر دابوون، دەوری تەرمەکەیان دابوو. هەرچی ژنە دێهاتیی ئەو ناوچەیە بوون، هەموویان لە گەلّ بیستنی ئەو هەوالە پرچیان لە بن دەسمالی سپی دا ــ کە لە سەرەوەی لەچکە ڕەشەکە لە سەریان نابوو ــ شاردبۆوە، کراسی هەرە جوانی خۆیانیان دەبەر کردبوو، خشلّی مرواری، زێڕ، یاقووت، یاقیق و زێویان بە خۆوە هەلواسیبوو و هاتبوونە خانەقایە. ئەوانیش هاتن لە پشت ژنەکانی دیکەوە بە ئالقە ڕاوەستان. وردە وردە خەلك هێندە هاتن و ئالقەکان ئەوەندە زۆر بوون، کە ئیدی حەسارەکە پڕ بوو، پێش حەسارەکە پڕ بوو، خڕەکەی خوارەوە پڕ بوو و وای لێ هات خەلك بەینی خانەقا و ڕەوەزەکانی خوارەوەی خانەقایەشیان پڕ کرد. بێجگە لە سەرپەرستی خانەقایە، بنیامین و مەلا و شێخەکانی خانەقاکانی دیکە، هیچ پیاوی دیکە نەدەهاتنە نێو ئەو ئالقانە کە ژنەکان بە دەوری یەك دا پێکیان هێنابوون. پیاوەکانی دیکە هەموو لە دوورەوە ڕاوەستابوون و پالّیان وێك دا بوو.

پێش هەموو ژنەکان دایە حۆری دەستی بە شینگێڕییە کرد، تەللی خاتوونیشی لە کن بوو. تەللی خاتوون کچی بەگێکی زۆر خۆشناو بوو و لە پێهەلگوتن و شینگێڕییە دا نێوبانگی هەبوو. خوشکەکەشی کە ناوی حەسیبە بوو، شینگێڕێکی وا بوو کاتێك بە مردوویەکی هەلّدەگوت، شاخ دەلەرزی و دار و بەرد دەگریان.

دایە حۆری شێعرێکی بە دەنگ دەگوت. سەرەتا ژنێك لە بەری دەگێڕایەوە و پاشان هەموو ژنەکان بەیەکەوە دووپاتیان دەکردەوە. دایە حۆری ڕادەژا و دەلۆرایەوە و سەدان ژن شێعرەکانی ویان دووپات دەکردنەوە. ئەو شینگێڕییە لە نێو لووتکەکان و ڕەوەزە بەرزەکان دا دەنگی دەدایەوە و نەك هەر ئینسانێك گوێی لێبوایە دەلەرزی و دلّی پڕ دەبوو، بەلکوو عەرز، ئاو، دار، بەرد و ئاسمانیش دەگریان...

دایە حۆری دەلۆرایەوە:

ــ کافرێك لە دایە سولتانی دا و کوشتی، ناپیاوێکی بێدین و ئیمان، یەزیدێك. ئێستا چاوە گەشە جوانەکانی هەلّنایەنێ... ئەو دایە سولتانەی زمانی گورگان، بالّندان، مێروولان و

تەنانت مێشومەگەزانیشی دەزانی... هەرچی گیانلەبەری سەر ئەو عەرزەی بوون دەهاتن و لە خزمەتی دا دەستەونەزەر ڕادەوەستان. شایان دەهاتنە خزمەتی. کێوان دەهاتنە خزمەتی. جۆگە، چۆم و تەنانەت فوراتی گەورە لە بەستێنی خۆی دەهاتە دەرێ، دەشتەکانی بەجێ‌دەهێشتن، وەسەر دەکەوتە سەر شاخە بەرزەکان و هەموویان دەهاتنە ئێرە و لاقی دایە سوڵتانیان ماچ دەکرد! لە بەر خاتری وی شاخەکان هەزار جار دەنگیان دەدایەوە، گوڵ لە بەر پێی دەپشکووتن، ڕۆژ لە بەر وی شەبەقی بە سەر عەرزی دا بڵاو دەکردەوە...

سەدان ژن یەکدەنگ ئەو شێعرانەیان دووپات دەکردنەوە و وا دەهاتە بەر چاو کە شاخەکانیش لە گەڵ دەنگی وان ڕادەژان.

" هەموو گوڵێك ناوی خۆی پێ‌دەگوت. هەموو باڵندەکان، مێرووەکان و مێشومەگەزەکان دەردی دڵیان لە لای دەکرد. هەموو دەعبا و گیانلەبەری دنیایە دەهاتنە لای، تا نەخۆشی و دیاردە خراپ و نیگریسەکان لە خۆیان دوور کەنەوە. دەرمانی لە گوڵ و گیای دروست دەکرد و نەخۆش و برینداری پێ چاك دەکردنەوە. خەمی لە هەموو چاولە دەستێك دەخوارد و یارمەتیی هەموو لەشبەبارێکی دەکرد. ئەو دیوی دیواری ئەوبەری، حەمەدۆك بە ڕوخسارێکی چرژاوەوە، دووربین لە مل دا، فیشەکدانی پەڕاوێز زێڕین بە قەدەوە، سەرکڵاوی بەگوڵینگ لە سەر، سەربەرگی ماڕاشیی تەقەڵزەرد لە بەر دا و تفەنگی کاڕابینی لە سەرپێ بە دەستەوە، ڕاست ڕاوەستاوە، گنجی دە باڵای دا نین، دەڵێی کۆڵەکەیەکە لە ڕووناکی! پێم بڵێن بزانم دۆستان، کێ حەمەدۆکی لە مەرگ ڕزگار کرد و لە کاتێك دا ئیدی بە مردوو دەژمێردرا، دیسان زیندووی کردەوە؟ کێ بوو یاران؟ خزمان کێ بوو؟

" دایە سوڵتان! دایە سوڵتان..." دەنگەکان بوون بە زایەڵە و کێوەکان حەوت جار ئەو دەنگەیان دووپات کردەوە.

دایە حۆری هەستایە سەر پێ و هەموو ژنەکانیش لە گەڵ وی هەستان. ئەو لە تەرمەکەی چووە پێشتر، دەستەونەزەر لە پەنای ڕاوەستا، پاشان داهاتەوە، دەستی دایە سوڵتانی گرت، ماچی کرد و سێ جاران لە سەر سەری دانا. ئەو جار دەستی بە شینگێڕی کردەوە و زۆر بە سۆزتر لە پێشوو لۆرایەوە:

هەستە، دایە سوڵتان، هەستە جوانی جوانان! ئەتۆ نانی برسی‌یان بووی، پشت و پەنای هەژاران بووی! هەستە، بڕوانە ئەو هەموو خەڵکە میوانتن! دە هەستە! ئاخر بابو باپیرەکانیشت، ئەوانەی شمشیری سەلاحەدینیان پێ‌بوو، ئەوانەی لە چیای حەسەنی شەهید بوون، هاتوون. ئیدی ئەو شمشیرە

بە کەس هەڵنایە. ئەو پیاوە سەوزپۆشانەی لە نێو حەشیمەتیٚ دا ون بوون و تێکەڵی چلسوارەی غەیبی بوون، لێرەن، لە لای تۆ ڕاوەستاون! هەستەوە، دایە سوڵتان، هەستەوە، خاتوونە چاو خەزاڵەکەم. هەستەوە و ئەو خەڵکەی ببینە! ئەو هەمموو خەڵکەی هاتوون بۆ ماڵی یەکجاریت بەڕیٚکەن. دەروێش، سۆفی و مریدەکانی حاجی بەکتاش، بابە کارگین، بالیم سوڵتان و عەبداڵ مووسای، هەمموو عێل و تایفەی پیاو چاکان و سوارچاکە شەڕکەرەکان! ژن، پیاو، منداڵ و باڵندەی هەمموو ئاناتۆلیی بیٚسنوور، کێوەکانی وانیٚ، لێوارەکانی دەریای نێوەڕاست و دەریای عەرەبان، هەمموو هاتوون، بتبینن و ماڵاوایی یەکجاریت لیٚبکەن. هەمموو سڵاوت لیٚدەکەن و لە تاوانت خوێن دەگرین. دە هەستە جوانی جوانان. حەك بمرم بۆ ئەو دەستە نەرمانە و ئەو زەردەخەندەیەی هەمیشە لە سەر لێوت بوو. ئەتۆ کانیی خۆشەویستی بوی! دە بڕوانە، ئەو هەمموو خەڵکەی ببینە کە هاتوون بۆ لات! هەمموو لە بەر تۆ هاتوون، تەنانەت حەزرەتی عەلی، ئیمامی چاوڕەشی سمێڵ قەیتانی، خاوەنی شمشیری دووسەر، دوڵدوڵسوار، بابی حەسەن و حوسێنی، هاودەم و هاوڕیی پێغەمبەری، برای هەژاران و دژی ستەمکاران، بەو ڕوخسارە جوان و ناوە خۆشەیەوە لێرەیە! هەستە دایە سوڵتان، بزانە ئەو کەسایەتی‌یە گەورانەی لە لاتن: بەنلی‌بوزی قارەمان پارێزەری دەریایە، خدری زیندە، کە بە دوای ئاوی حەیاتێوە بوو، پیر سوڵتان عەبداڵ بە ئاڵا سەوزەکەیەوە، ئەو کەسەی کە بە گۆرانی‌یەکانی بەردی وە گریان دەخستن. هەروەها شێخ سالتیکە زەرد کە بە سواری کەوڵەمەڕێکی بە سەر حەوت دەریایان دا پەڕیەوە... ئەوەتا حاجی شێخ بەکتاش وەلی لە قیرشەهیری ڕا هاتوە و دە شکڵی هەزار کۆتری سپی دا لێرە ئامادەیە! ئەوەش کاراچۆغلانە کە بە گۆرانی‌یەکانی ناحەزی جوان دەکردن و بڕیاری دا پۆلوێکی سوور لە گەڵ خۆی بەرێتە دنیای دیکە، چونکە دەترسا جەهەننەم ئاگری لیٚبڕابیٚ! ئەوەش دادالۆغلی‌یە کە کێوی ئەرجیاسێی کردە کۆیەك خۆڵەمێش. ئەوەش یۆنس عەمرەیە، کە بە فوویەکی شەوی ئەنگوستەچاوی دەکردە ڕۆژی ڕووناك! ئەوە سەرپەرستی خانەقاکەتە کە شوانی مێگەلە مامزەکانە و ئەوەش کوێرۆغلی‌یە کە بە سواری ئەسپەبۆری هاتوە! ئەو جار ئەوەش حەمەدۆکی کوڕی خۆتە! هەستەوە دایە سوڵتان، بڕوانە! ئەوە بوڕاقە کە بە ڕوخسار ژنە، باڵی مەلایکانی پێوەیە و پێغەمبەری مەزن سواری بووە. ئەوەش ئەسپە عەرەبی‌یە ڕەسەنەکەی گەنج عوسمانی‌یە کە سیٚ ڕۆژان سەری خۆی بە دەستەوە بوو، لە پێش دەروازەی بەغدایە شەڕی دەکرد و پێش هەمموو لەشکرەکەی دەروازەکانی کردنەوە. دوڵدوڵی حەزرەتی عەلی و ئەسپە کوێتی حەمەدۆکیش لێرەن... وا دەحیلێنن دەنگیان عەرز، ئاسمان و شاخ و ڕەوەزان پڕ دەکا... دە هەستەوە دایە سوڵتان..."

دایە حۆری چەند هەنگاو پاشەوپاش کشایەوە و هاتەوە جێی پێشووی. ئەو جار تەللی خاتوون وەپێش شینگێڕەکان کەوت، دەنگی ئەوەندە خۆش و بە سۆز بو جەرگی ئینسانی دەبرژاند. حەسیبەی خوشکی بۆی دەگێڕایەوە و ژنەکانی دیکەش بۆیانیان دووپات دەکردەوە. ئەو شینگێرانە هەتا پاشنیوەڕۆیە درێژەی هەبوو. ئەو جار ژنان تەرمەکەیان بە سابوونی بۆنخۆش شوت، دە کفنی ئاوریشمیانەوە پێچا و و لە تابووتێکی دارگوێزیان نا.

پیاوان تابووتەکەیان هەڵگرت و بردیان بۆ سەر ئەو لووتکە کێوەی کە شەو و ڕۆژ ڕووناکیی لێ‌نەدەبڕا. بناری کێوەکەی پڕ بوو لە خەڵك. لەو کاتە دا ئەو پەڵە هەورەی هەمیشە بە سەر خانەقای چلچاوی‌یەوە بوو، نێزیك بۆوە و هات لە سەر تابووتەکەی ڕاوەستا. سێ‌باڵندەی سپیی باڵدرێژ بەرەو لووتکەی شاخی فڕین و کە گەیشتنە ئەوێ، خۆیان بە نێو ڕووناکایی‌یەکەی دا کرد، پاشان هاتنەوە دەرێ، بەرز بوونەوە و هاتنەوە لە سەر حەشیمەتەکەی لەنگەریان گرت. ئەو جار دەنگی شمشاڵێکی بە سۆز هات، بەڵام کەس نەی زانی لە کوێوە! لە عەرزی‌یەوە؟ لە ئاسمانێوە؟ یان لە شاخەکانەوە دەهات؟ ڕوون نەبوو. ڕەوەزەکان بەو دەنگەی قەڵشینەوە و پۆل پۆل گوڵی شینیان لێ‌هاتنە دەرێ. بۆنی گوڵەکان ئەوەندە خۆش بوو، ئینسانی مەست دەکرد. ئەو بۆنە خۆشە دۆڵ و شاخ و هەوای ئەو بەینەی پڕ کرد.

بەردبڕان لە سەر ئەو لووتکەیەی گۆڕێکی سپی‌یان لە بەردەسماتەی دابڕیبوو، تابووتی دایە سوڵتانیان دەو گوڕەی نا و بەو شێوەیە ئەو ژنە شێخە دڵپاکە نێژرا. مەلا فەرهاد تەلقینی دادا و قورئانی لە سەر خوێند. خەڵکەکە یەك بە یەك هاتن و گوڵیان هاویشتە سەر تابوتەکەی. بە ڕاستی ئەو خەڵکە لەو زستانە ساردەی دا کە بەفر و سەرما حەشری دەکرد، ئەو هەموو گوڵانەیان لە کوێ هێنابوون؟ بە هەر حاڵ ئەو جار گڵیان وە سەر تابوتەکەی کرد، گۆڕەکەیان پڕ کردەوە و ڕۆیشتنەوە، بەڵام هەورە سپی‌یەکە و سێ باڵندە سپی‌یە باڵدرێژەکان هەر لە سەر ئەو لووتکەیەی مانەوە. ئەوێ شەوێ ژمارەیەك ئەستێرە لە سەر ئەو شاخەی ئەوی بوون و لە وێوە شەبەقی خۆیان بە هەموو لایەکی دا بڵاو کردەوە.

شوێنەوارەکانی مردنی دایە سوڵتانی و دەنگدانەوەی ئەو ڕووداوەی، بوون بە هۆی ئەوەی کە مەسەلەی شایەر و بەیتبێژەکان لە بیر بچێتەوە و عارف سایم بەگ ئیدی باسی گرتن و سزادانی ئەوانی نەکردەوە.

## (٢٣)

زۆر پێش ئەوەی ڕۆژ هەڵێ، سەری چیای دوڵدوڵی دەدرەوشێتەوە، شۆقێکی زۆر لە وێ دەدا و ئاوی کانی‌یەکان کە لە کاتی هەڵقوڵینێ دا کەفێ دەکا و هەروەها ئاوی جۆگەکان، چۆمەکان و گۆلەکانیش دەتروسکێتەوە. دەڵێی لاپەڕەیەکی قورئانێ لێبۆتەوە و دەوئاوەی کەوتوە.

شەڕ لە نێوان سەگ و گورگی دا دەستی پێ‌کرد. ئەوان لە سەرەوەی گوندی "سیراپینار"ی بوون، کە دەکەوێتە بناری چیای دوڵدوڵی. لە خوارەوەی دۆڵێ بەفر هەتا پشتێندی پیاوی دەهات و و زەوی و دارستانی داپۆشیبوو. ڕێگا بڕابوون و هیچ‌کەس لەو بەفر و سەرمایەی دا بۆ هیچ‌کوێ سەری دەرنەدەکرد.

لەو شاخانە دەبێ بنیادەم دە جار بمرێ و زیندوو بێتەوە، تا فێر بێ چۆن خۆی لە بەر تەوژمی سروشت ڕاگرێ و درێژە بە ژیان بدا.

سەرهەنگ عەزمی بەگ، کە بە باهۆز و لاقشکێن بەنێوبانگ بوو، بە گورهانێك سەرباز، کەرەسە و شتومەکی سەربازیی تەواوەوە گەیشتە شاری و خۆی و ژاندەرمەکانی پێشوازی‌یەکی گەرموگوڕیان لێ‌کرا. ئاغا و بەگەکان لە خۆشیان شاگەشکە ببوون و بە مەبەستی بەخێرهێنانی وی و دەربڕینی خۆشحاڵیی خۆیان ژمارەیەکی زۆر مەڕ، گا و تەنانەت وشتریشیان سەر بڕی. هەژار و دەستکورتەکانی شاری کە ساڵی جارێکیش گۆشتیان وەگیر نەدەکەوت، ئەوجار لە سایە هاتنی سەرهەنگ عەزمی‌یەوە تامەزرۆیی‌یان شکا و زگیان لە گۆشتی تێر کرد. ئەو زەوقوشەوقە تەنانەت مەلا دۆرانیشی گرتەوە و هەشت جوانەگای کردنە قوربانی. ئاغا و بەگە گەورەکان پێشبڕکێیان بوو و هەرکامەیان هەوڵی دەدا خۆی لە وانی دیکە دەستودڵاوالەتر نیشان بدا. ماڵاتێکی زۆر کوژرابوونەوە، کەلاك پڕی مەیدانی شاری کەوتبوون و خەڵك خەریکی

کەولکردن و دابەشکردنیان بوون. خوێن هەموو مەیدانەکەی داگرتبوو، بەڵام هێشتا کێبەرکێکە تەواو نەببوو و هەر وا ماڵاتی دیکەیان بۆ کوشتنەوەی دێنان. سەرەنجام عارف سایم بەگ وە دەنگ هات:

ــ بەسە، دۆستان! ناوا بچنە پێش، توورپووس و چوکووراوا مەڕیان تیّدا نامێنیّ. لە ئێستاوە ئیدی ماڵات کوشتنەوە قەدەغەیە!

هێندێك لە خەڵکی شاری ئەو قسەیان پیّناخۆش بوو و گوتیان ئەو کابرایە ئێرەیی بە وانی دیکە دەبا.

باهۆز حەوتوویەك لە شاری مایەوە و حەسایەوە، پاشان بە شێوەیەکی بەرین دەستی بە کۆ کردنەوەی زانیاری لە سەر حەمەدۆك و دەستەکەی، کۆمەڵە حەوت حەمەدەکان و دایە سولّتانی کرد. پرسیارەکانی هەموو خزم، دۆست و خەڵکی دەوروبەریشیانی دەگرتەوە و تەنانەت لە حەوت پشتی پێشووشی دەکۆڵینەوە. سەرهەنگ نەخشەی زۆر باشی زنجیرە چیای توورپووسی پیّبوو. ئەو نەخشانە کاتی خۆی ئەڵمانییەکان کێشابوویاننەوە و شتێکی جێگای سەرنج ئەوە بوو کە لە وانە دا هەموو گوندەکانی عەلەوییەکان و سوننییەکان جیا کرابوونەوە و تەنانەت بچووکترین دێش هەڵناوێرابوو. هەروەها ئەو نەخشانە ناوی هەموو عێل و تایفەکان، داب و نەریت و شێوەی هەڵسوکەوتی ئەو عێلانەیان تیّدا تۆمار کرابوو و سەرهەنگ دەیتوانی بە کەلکوەرگرتن لەو نەخشانە ئاگاداریی بە سەر وەزعی هەرێمەکە و ئەو کەس و کۆمەڵ و تایفانە دا هەبیّ، کە پشتی حەمەدۆکییان دەگرت و داڵدەیان دەدا.

بەو شێوەیە سەرهەنگ ئامادەکاریی تەواوی کرد و زانیاریی پێویستیشی کۆ کردەوە، بەڵام یەك ــ دووشت مابوون، کە هەر بۆی ڕوون نەدەبوونەوە: ئاخر حەمەدۆك بۆ دەبیّ دایە سولّتانی بکوژیّ؟ یان دەنا ئەو خەڵکە بۆ دەبیّ هەموویان ناوی خۆیان بنێن حەمەدۆك؟ کاتێك زانی لەوانەیە ساڵێکی دیش لەو شارەی بمێنێتەوە، بەڵام وەڵامی ئەو پرسیارانەی بۆ نەدۆزرێتەوە، بیری لەوە کردەوە کە هەرچی زووتر و لەو نێوەڕاستە زستانەی دا هێزەکەی دەنگ دا بۆ شاخی و چالاکیی خۆی بە مەبەستی گرتنی حەمەدۆك و دەستەکەی دەست پیّبکا. بەڵام داخوا ئێستا بەو بەفر و بۆرانەی، کە ڕێگاش بە دەرەوە نەبوون و هەموو وڵات سپی دەچوو، پیاو لەو شاخانە سەری دەردەکرد و دەیتوانی هەورازە چڕەکان، دۆڵەکان و لاپاڵە پڕ لە ڕنووەکان ببڕیّ و گوندەکان بە دوای حەمەد و دەستەکەی دا بپشکنیّ. خۆ بەفرەکە ئەوەندە زۆرە، گوندەکانیشی قووت داوە.

عارف سایم بەگ پێی‌گوتبوو کە جارێ هێزەکەی لە جێی خۆی نەبزێوی و هەتا بەهار دادێ و وڵات ڕەش دەبێتەوە دەست ڕاگرێ! گوتبووی دەو بەفر و بۆرانەی دا چالاکی ناکرێ و هێزەکە لە بەین دەچێ. یان لانی کەم هەتا ئەو بەفر و باکوتەی دەخا و ڕێگاکان دەکرێنەوە، دەست پێ‌نەکەن. باهۆز زۆری گوێ نەدەدایە عارف سایم بەگی. ئەو پیاوێکی لەخۆبایی بوو، کەمتر قسەی دەکرد، مرچ و مۆن بوو، کەم پێ‌دەکەنی و کاتێك بە ڕێگایە دا دەڕۆیی، سینگی دەردەپەڕاند، سەری هەڵدێنا و ڕاست دەیڕوانیە پێش خۆی.

عارف سایم بەگ زۆر لەو کابرایەی تووڕە بوو و کارەکانی ویشی زۆر پێ‌سەیر بوو، بەڵام بە زەحمەت دەی‌توانی خۆی دە بڕیاری وی هەڵقوتێنێ، چونکە ئەویش هەر وەك عارف سایم بەگی لە لایەن ئەنکەرەوە دەسەڵاتی تایبەتی پێ‌درابوو. هەر بۆیە عارف سایم بەگ هەر ئەوەندەی پێ‌مابوو لە لای ئاغا و بەگەکانی شاری گلەیی لێ‌بکا و ڕەخنەی لێ‌بگرێ.

ـ فەرموون، ئەوە ئەنوەر پاشایەکی نوێیە، هاتووە و سواری ملمان بووە! جیاوازی‌یەکەی تەنیا ئەوەیە کە ئەو جار مەسەلەی بەرەی ڕووسان و شەڕی کێوی ئەڵڵاهوئەکبەری نیە، کە نۆهەزار سەربازمان لە سەرمان مردن، بەڵکوو ئەو جار مەسەلەی گورهانێك ژاندەرمەیە کە لە کێوەکانی تووروسی تەفروتوونا دەبێ و دیسان ئێمە دەبینەوە گاڵتەجاڕی خەڵکی! ئەوەش تاوانی خۆمانە!

ئەو زۆر باش ئاگادار بوو کە سەرهەنگ عەزمی "باهۆز" لە سەرانسەری وڵات دا چالاکیی بەڕێوەبردوە، لە ڕۆژهەڵات، ڕۆژاوا، خوار و ژوور، هەموو شوێنێکی کردوە و هەرجێیەك یاغی و چەتەی بەناوبانگی لێ‌بووبن، باهۆزیان بۆ ناردوە و ڕیشەی ئەو یاغی‌یانەی دەرهێناوە. لە کاتی شەڕ دا چووبایە هەر گوندێك، هەر جووتێرێکی چاو پێ‌کەوتبایە، لاقێکی دەشکاند. ئەو لەو چەشنە شەڕانە دا زۆر پسپۆڕ بوو و وڵاتی لە دەست چەتان ڕزگار کردبوو. عارف سایم بەگ کاتێك بیری لە وە دەکردەوە کە سەرهەنگ عەزمی چەندە لە ئازار و ئەشکەنجەی خەڵکی دا کارامە بوو، نارەحەت دەبوو. ئەسیم چەرکەس لە سەردەمی شەڕی سەربەخۆیی دا چی دەکرد، ئەوەش وا دەکا، بەڵام لە وی زۆر بە زاکوونتر بوو. ئەو شوێنانەی ئەو بە دوای یاغی‌یان دا هەڵی‌دەکوتانە سەرێ، دەبوو بە وێرانە و چڵە گیایەکیشی بە پێوە نەدەما. ئەو گوند و شارانەش کە لە بەر دەستی دەردەچوون، ساڵانێکی زۆری پێ‌دەچوو، تا وەك خۆیان لێ‌بێتەوە.

سەرهەنگ عەزمی هەر لە سەرەتای هێرشەکەی دا توانی پێنج دەستە لە "حەوت حەمەدان" گەمارۆ بدا. هەمووی کوشتن، تەرمەکانی بە سەر پشتی و لاغان دادان و بەرێی‌کردنەوە شاری. هەر گوندێکی دەگەیشتێ، وێرانی دەکرد. ئەو جووتێرانەش کە لە ژێر

لێدان و کوتانی وی دا دەمردن، تەرمی وانیشی هەر دەنارده شاری و دەی‌گوت چەتەن کوشتوومن. خەڵکی گوندەکانی لە نێوەڕاستی دێی کۆ دەکردنەوە، لێی‌دەپرسین ناوتان چی‌یە؟ ئەوەی گوتبای حەمەد ــ ئەگەر هەر بە ڕاستیش ناوی حەمەد بوایە، نیوەمردووی دەکردن، جا بەجێی‌دەهێشتن. دوای ماوەیەك شوێنەواری چەتە و یاغی‌یان نەما. ئەگەر حەمەدۆك و مەلا فەرهادیش جێگۆڕکێیان نەکردبا و خۆیان لێ‌نەبواردبا، بێ‌گومان دە داوی باهۆزی دەکەوتن و لەوانە بوو تووشی زیانی زۆر بن، بەڵام حەمەد وشیار بوو. هەموو دەستە حەمەدەکانی ئاگادار کردبووە کە خێرا چەکەکانیان دانێن، بەرگ بگۆڕن، جارێ بچنەوە گوندەکانی خۆیان و دانیشن.

ئێستا کە دەستە "حەوت حەمەد"ـەکان و قاچاخچی و چەتەکان هیچیان نەمابوون، دەبوو سەرهەنگ عەزمی هەموو هێز و توانای خۆی بۆ دە داوخستنی حەمەدۆك و دەستەکەی، کە دیارە مەبەستی سەرکێش بوون، تەرخان بکا. ئەو بە یارمەتیی ئاغا و بەگەکان رایەڵکەیەکی سیخوڕی دروست کردبوو و ڕایەڵکەکەش باشی کار دەکرد. گوللەیەك لە قولێنچکێکی زنجیرە چیای تووڕووسی تەقیبا، هەواڵەکەی دەسبەجێ بە باهۆزی دەگەیشتەوە.

سەرەڕای بەفری زۆر و بایەکی سارد کە پیاوی دەتەزاند، چەند ڕۆژ بوو سەرهەنگ بە دوای دەستەی حەمەدۆکی‌یەوە بوو و هەرساتێك چاوەڕوانیی وەی دەکرد، لە گەڵیان بەرەوڕوو بێ. بەشێکی بەرچاو لە پیاوەکانی ئەخۆش کەوتبوون و دەست و لاقیان سەرما بردبووی، بەڵام خولانەوەکە بێ‌سوود بوو و ئەو دێوەزمەیە شوێنی هەڵنەدەگیرا. دیارە ئەو هەرگیز بۆ شوێنگێڕییە یارمەتیی لە عەلی‌یە شەل و مووسا زریانی وەرنەدەگرت، بەڵکوو جووتێری دەگرتن و هێندەی لێ‌دەدان، نیوە گیانی دەکردن. ئەوەی لەو بوارە دا بە سەر خەڵکی "دەروازەسوور"ی هات، نموونەی دڵڕەقی و بێبەزەیی ئەو کابرایەی بوو.

سەرهەنگ بیستبووی حەمەدۆك لە دەروازەسووری‌یە. هەر بۆیە خۆی گەیاندە ئەوێ و گوندەکەی گەمارۆ دا. هەموو خەڵکەکەی کۆ کردەوە و ژاندەرمەکان تەواوی کەلێن و قوژبنەکانی ئەو گوندەیان پشکنی، بەڵام هیچیان نەدۆزی‌یەوە. ئەو جار دەستی بە لێدان و ئەشکەنجەی خەڵکەکەی کرد. تەنانەت لە منداڵی سەر پشتی لانکێشی دا. هێندەی لە خەڵکەکەی دا بوو، یەك کەسیشیان نەی‌دەتوانی بە سەر پێوە ڕاوەستێ و دواتر خەڵکی گوندەکانی جیرانیان هاتن، چەند ڕۆژان یارمەتی‌یان کردن و پێیانڕاگەیشتن.

باهۆز ناهۆمێد نەبوو و لە گەڵ ژاندەرمەکان و پیاوەکانی دیکەی درێژەی بە گەڕان دا. کاتێك هەواڵێکی بۆ دەهات، و هەواڵەکە ناڕاست دەبوو، ئیدی... هەر مەپرسە چەند تووڕە

دەبوو. بەڵام ئەو مرۆڤێکی کەللە ڕەق بوو. قسەی یەك بوو، نەدەبوو بە دوو و ئەوەی ویستبای، دەبوو پێی گەیشتبا. ئەو بە مەبەستی گرتنی حەمەدۆك و لێکبڵاوکردنی دەستەکەی هاتبوو و خۆ ئێستا نەیدەتوانی بە دەستبەتاڵی لە توورووسی ڕا بگەڕێتەوە شاری و ببێتە گاڵتەجاڕی خەڵکی. نەخێر، یان مردن، یان گرتنی حەمەدۆکی... بێجگە لە وەش ئەوە دوایین پێسپێردراویی وی بوو و ساڵێکی تەواوی نەمابوو خانەنشین بێ. کە وابوو دەبوو بە سەرکەوتنەوە لەو ڕاوەش بگەڕێتەوە.

سەرهەنگ و حەمەدۆك لە جێگایەکی چڕی "دۆڵەڕەش"ێ، لە نێو هێندێك ڕەوەز کە کەوتبوونە قەراغ دارستانێکی تووشی یەك بوون. کرێوە و باکوتێکی سەیر بوو و قامکی ژاندەرمان بە سەر قۆنداغی تفەنگێوە دەیبەست. بەفر ئەوەندە باریبوو، دارەکانیشی ون کردبوو:

ـ حەمەدۆك، خۆت بە دەستەوە بدە! ئەوە ئەمنم سەرهەنگ عەزمی، ئەوەی بە باهۆز بە نێوبانگە! ئەگەر خۆ بە دەستەوە بدەی، بەڵێنت پێدەدەم سزایەکی کەمت بۆ دانێن. بۆخۆت دەزانی گەمارۆمان داوی و دەربازبوونت نیە. ئەوەش بزانە تا ئێستا یاغی نەبووە، لە دەستی من دەرچێ، دڵنیا بە ئەتۆش دەرناچی. خۆت بە دەستەوە بدەی، نایەڵم بتکوژن، با تاوانیشت زۆر بن! ئەو بەڵێنەت پێدەدەم و هەمیشەش لە سەر بەڵێنی خۆم ڕادەوەستم! بزانە، ئەمن سەرهەنگ عەزمی باهۆزم!

ماوەیەك لە سەر وەڵام ڕاوەستا، بەڵام هیچ وەڵامێك نەبوو.

ـ ئەوە بۆ هیچ ناڵێی، حەمەدۆك... ئەمن کارێکی وا دەکەم لە هاوڕێکانیشت خۆش بن! مەلا فەرهاد، تەیموور، قاسم و دورسوونە کوردەش وەبەر لێخۆشبوون دەکەون...

دورسوونە کوردە یاغییەکی بە نێوبانگ بوو، ماوەیەك بوو لە گەڵ سێ هاوڕێی لە ناوچەی دێرسیمێوە هاتبوو و تێکەڵ بە دەستەی حەمەدۆکی ببوو...

ـ ئەمن هەوڵ دەدەم لێخۆشبوون بۆ شاهێنیش وەرگرم. کوڕە حەمەدۆك، ئەمن سەرهەنگ عەزمیم کە ناوبانگم بە لاقشکێنیش دەرکردوە... کوڕم، باش بیر بکەوە! بە شەڕ بێین، بە زیندوویی دەرناچی، چونکە بە گورهانێك ژاندەرمە لە هەموو لایەکەوە گەمارۆم داون و یەك کەلێنیشم بۆ نەهێشتوونەوە...

دیسان هەر دەنگ نەبوو. سەرهەنگ تووڕە بوو و فەرمانی تەقەکردنی دا. لە گەڵ خرمەی ڕەشاشی، گرمەی ماوزەڕانیش بەرز بۆوە و نێو ڕەوەزەکانیان وەبەر دەسرێژ دان. حەمەد و هاوڕێیانی دەسبەجێ وەڵامیان دایەوە و زۆر توندتر و بە دەستوبردتریش گوللەیان بە سەر دا

باراندنەوە. گوللە یەك لە دوای یەك لە پەنا سەرهەنگی وە عەرزیٚ دەکەوتن، ئەویش سەری بردبووە دە قالبی و نەیدەویرا بە هیچ شێوەیەك سەر هەڵێنێ. چونکە هەر سەری وەدەر کەوتبایە، دەسبەجێ گوللەیەکیان نە نێوچاوانی دابوو.

شەڕەکە تائێواریی خایاند. هیچکامیان لە جێی خۆیان نەبزووتبوون و بیٚپسانەوەش تەقەیان لێکتر کردبوو. چوار ژاندەرمە بریندار ببوون، بەڵام لە چەتەکان کەس بریندار نەببوو. کاتی ئێواریٚ کرێوە و بارنەکە دوهێندەی توند کرد. ئەو جار ئیدی پیاو نەیدەتوانی سەر هەڵێنێ.

حەمەدۆك بە هاوڕێیانی گوت:

ــ تەنیا ڕێگای ڕزگاربوونمان دە وەی دایە بخزێینە نێو دارستانەکەی و خۆ ون کەین. ئەگەر بتوانین هەتا بەیانی بڕۆین، ئەوانەیە خۆ بگەیەنینە گوندەکانی ئەو دیوی دارستانەکەی.

ــ بەڵێ، وایە، بەڵام بەو مەرجەی بتوانین ئەو بەفرە مۆرەی بشکێنین و تا بەیانی ڕیٚ بڕین...

حەمەد وەڵامی دایەوە:

ــ بەڵێ، بەو مەرجەش سەرهەنگ پێش ئێمە نەگاتە گوندەکان و داومان بۆ دانەنێتەوە!

مەلا فەرهاد گوتی:

ــ نا، ئەوان کەرەسە و شتومەکی قورسیان زۆر پێن و ناتوانن لەو دارستانەی دەن. لێشی دەن، حەوتوێك دەکێشیٚ، تا بگەنە ئەو گوندانە.

حەمەد و هاوڕێیانی خۆیان کۆ کردەوە، لە دارستانەکەیان دا و ڕۆیشتن. بەفر هەتا سینگیان دەهات و کرێوە و باکوت حەشری دەکرد. هەتا بەیانی هەر ڕۆیشتن، بەڵام نەگەیشتنە گوندەکان. سەرماکە وای هێرش هێنابوو، هەموو لەشیان بەستبووی. چاو لە بەر کرێوە و بارنیٚ هەڵنەدەهات. دەیانزانی لە گوندێك نێزیك بوونەوە، بەڵام سەریان دەرنەدەکرد و توانای ڕۆیشتنیان بڕابوو. دوو سیٚ گوللەیان دە حەوای کردن.

ئەو شوێنە کەوتبووە نێزیك گوندی "کونە بەرد"یٚ. چەند کەسی خەڵکی گوندەکەی گوێیان لە تەقەی بوو، زانیان داوای یارمەتی دەکەن و بە فریایانەوە چوون. بیٚگومان ئەگەر خەڵکەکە پێیاننەزانیبا و دە هانایان نەهاتبان، ئیدی هەموویان ڕەق هەڵدەهاتن، تەرمەکانیشیان دە ژێر بەفری دا دەمایەوە و تا بەهاریٚ نەدەدۆزرانەوە.

خەڵکەکە گەیشتنیٚ، لە کۆڵیان کردن و هێنایاننەوە دێی، بەڵام دیارە ڕاگرتنی ئەو دەستە گەورە چەتەیە و پیٚڕاگەیشتنیان لە نێو دێی کارێکی هاسان نەبوو. لە وەتا سەرهەنگ عەزمی لە نێو توورووسی دەخولایەوە، دێیەکانش زۆر هێمن نەبوون، خەڵکەکە لە بەر سیخوڕ و

ڕاپۆرتچی‌یان ژیانیان لی‌تاڵ ببوو و تەنانەت برا لە برا و کوڕ لە بابی ئەمین نەبوو. هەر بۆیە دوای ڕاویژ و پرسێکی زۆر، بڕیار درا حەمەد و هاوڕێیانی بچنە ئەشکەوتی "کالێ"، کە لە شوێنێکی لاپەڕ، لە بناری شاخێکی بەرز هەڵکەوتبوو و بۆ مانەوەی وان لەو بارودۆخە دا، زۆر لە بار بوو. دیارە خەڵکی ناوچەکە دەیانزانی ئەشکەوتێکی ئاوا لەو بنارانە هەیە، بەڵام وی‌نەدەچوو کەس فکر بکا بەو زستانە سەختەی حەمەد لە وێ بێ و هەروەها زۆر زەحمەت بوو ژاندەرمەش فکری وێ بکەن و تەمای چوونی وێیان هەبێ.

دوای حەسانەوەیەکی کورت، حەمەد و هاوڕێیانی لە گەڵ چەند لاوی خەڵکی دێی کە باوەڕپێکراوی خۆیان بوون، بە ئەسپایی و بی‌ئەوەی بێڵن کەسی دیکە بیانبینێ، لە دێی وەدەر کەوتن و بەرەو ئەشکەوتەکە چوون. ڕێگاکە دوور و سەخت بوو، بەڵام هەرچۆنێك بوو، دوای ڕۆیشتنێکی سەخت و زۆر گەیشتنێ. بەفر و سەرما ساتبەسات توندتر دەبوو و دەست و لاقیان تەزیبوو. سەیر ئەوە بوو لەو بەفر و بۆرانەی دا چاویان بە کۆمەڵە داڵێك کەوت کە لە سەر ئەشکەوتەکەی دەخولانەوە.

مەلا فەرهاد گوتی:

ـ کاتێك داڵاش ئاوا بە سەر شوێنێك دا بخولێنەوە، نیشانەی ئەوەیە کە زۆر دەعبای کێوی لەو بەینەی بە سەرمایە مردوون و داڵاشەکان بە سەر کەلاکان دا دەگەڕێن.

تەیموور گوتی:

ـ دوور نیە کەلاکی بنیادەمیش لەو دەوروبەرانە هەبێ!

مەلا فەرهاد لە قاقای پێکەنینێی دا:

ـ جا با ئەو جار باهۆز پیاو بێ، بە دوامان دا بێتە ئێرە و شەڕمان لە گەڵ بکا. وەڵڵاهی چۆن نۆهەزار کەسەکەی ئەنوەر پاشای لە "ساریقامیش"ی لە سەرمان ڕەق هەڵاتن، ئەوانیش لێرە دەبنە کۆلکە دار و یەکیشیان ناگەڕێتەوە...

دورسون دەستی بە سمێڵە درێژەکەی دا هێنا و گوتی:

ـ خوا بکا بێ، دەزانم چیی بە سەر دێ!

کوڕەجووتێرەکان وشکەڵەدارێکی زۆریان هێنا، کلێکی گەورەیان پێوەنا و ئاگرێکی چاکیان کردەوە. سەرەتا نێو ئەشکەوتێ پڕ بوو لە دووکەڵ، بەڵام هێندەی پی‌نەچوو دووکەڵەکە تەواو بوو و کڵەکە بوو بە پۆلوو. هەموویان بە چاکی گەرم بوونەوە و جلەکانیشیان وشك کردنەوە. کوڕەکان نانو پێخۆرێکی زۆریان بۆ هێنابوون. کەوڵیان ڕاخست و نانیان دانا: دوو جۆر پەنیر،

هێلکەی کوڵاو، پیواز و کولێرە و نانی گەنمیان دانا. هەروەها گۆشتی وشککراوی کاریلەشیان هێنابوو کە لە سەر پۆلووان کردیانە کەباب و هەموویان بە یەکەوە جەمێکی باشیان خوارد.

دوای نانخواردنێ کوڕەکان گوتیان:

ــ لەو ئەشکەوتەی دا جێگاکەتان زۆر هێمن و خۆشە و بێجگە لە ئێمەش هیچکەس نازانێ ئێوە ئێرەن. نیگەران مەبن، هەموو ڕۆژێ خەلیل (ناوی کوڕێکیان بوو) خۆی دەگەیەنێتە ئێرە، سەرتان دەدا و هەموو پێویستی‌یەکتان بۆ دێنێ.

حەمەد گوتی:

ــ کوڕینە، زۆرتان سوپاس دەکەین و دوعایە دەکەین خودا پشتیوانتان بێ. هەرچی‌یەکیش بۆمان بێنن، ئێمە پێی ڕازین و دەستتان خۆش بێ!

پاشان کوڕەکان ڕۆیشتن. هەرچەند بارِن و کرێوەیەکی توندی دەکرد و زۆری پێ‌نەدەچوو شوێنی پێیان پڕ دەبۆوە، بەو حالەش و لە بەر دڵنیایی زیاتر، هەر کامەو پنچکێکیان بە دوای خۆیان دا دەکێشا و هیچ شوینێکیان لە دوو بە جێ نەدەما.

لە خوارێ، لە نێو دێی کونە بەردێ ئەو خەڵکەی بەو کەین و بەینەیان دەزانی، بە دڵەڕاوکێوە چاوەڕوانی کوڕەکانیان بوون و کاتێك ئەوان گەڕانەوە، دڵیان حەسایەوە، بەڵام هیچیان لێ‌نەپرسین، چونکە دەیانزانی لەو بەینە دا تەنیا یەك حەشارگە بۆ ڕۆژێکی ئاوا دەگونجا و ئیدی باسکردنیشی بە قازانج نەبوو.

هەرچەند بەفر و سەرماکە هەر وا درێژەی هەبوو، خەلیل هەمیشە بە وەخت خۆی دەگەیاندە ئەشکەوتێ و هەموو چەشنە پێویستی‌یەکی ژیانی بۆ دابین دەکردن: نانوپێخۆر، چا، شەکر، قاوە و تەنانەت تووتن و پەڕیشی بۆ دەبردن. هەر دوو ڕۆژ، یان سێ‌ڕۆژ جارێك حەمەد و هاورییانی چاوەڕوانی دەبوون. نێو ئەشکەوتەکە گەرم بوو. هەر دارستانی تەنیشت ئەشکەوتەکەی پڕ بوو لە لقەدار و کۆلکەداری وشك. هەمیشە ئاگرەکەیان دایسا و گرفتێکیان لەو بارەوە نەبوو. هەرچەند هەمیشە ترسی ئەوە هەبوو کە دوژمن ــ ئەویش ئێستا کە دوژمنەکە سەرهەنگ عەزمیی ناسراو بە باهۆز بوو ــ هێرش بکا و لێرەش تووشی شەڕ بن، بەڵام هەموویان لەو ئەشکەوتەی دا هەستیان بە هێمنایەتی دەکرد. تەنیا گرفتێکیان هەبوو، ئەویش ئەمە بوو وردە وردە گیانیان دەخورا و دەت‌گوت هەموو گیانیان پڕە لە قرنوو و ئەسپێ و ئەوەش ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر تینی بۆ دێنان. لە مێژ بوو ڕدێنیان نەتاشیبوو، خۆیان نە شوتبوو و دیارە چڵکن و دژوێن ببوون. ڕیشیان ئەوەندە زۆر بوو، لەوانە بوو کەس نەیانناسێتەوە.

حەمەد ئاخێکی هەڵکێشا. مەلا فەرهاد لێیپرسی:

ــ ئەوە چییە حەمەد، خۆ لە چۆلییانت لێ نەقەوماوە! ئەو ئاخە توندە چ بوو؟

حەمەدۆك قاقایەکی کێشا:

ــ چۆن لە چۆلییانم لێنەقەوماوە؟ چاوێك لەو سەروسەکوتەمان کە! دەزانی چ بۆگەنێکمان لێدێ! وەڵڵاهی باهۆز ــ ئەگەر وای دابنێین بشتوانێ خۆی بگەیەنێتە ئێرە ــ هەر لاق دەو ئەشکەوتەی بنێ، لە بەر بۆگەنێ دەکەوێ!

ــ وەڵڵاهی ئەو کابرا هیچوپووچە هەر بە بۆگەنێ بمرێ باشە! بە ڕاستی کابرایەکی بێڕەحم و نامەردە. نازانم خودا بۆچی شتی وای دروست کردوە...

پاشان مەلا فەرهاد یەك ــ دوو جار سەری ڕاوەشاند و گوتی:

ــ ئەستەغفیروڵڵا! خوایە تۆبە! بەڵام بە ڕاستی ئەمن تێناگەم خوای گەورە بۆچی بنیادەمی وەك سەرهەنگ باهۆزی دروست کردوە، کە دەکرێ بڵێی کۆمەڵی مرۆڤایەتی شەرم لە بوونی ئەو جۆرە کەسانە دەکا! باشە، ئەمن نازانم خودا چۆن قبووڵ دەکا بەندە هەژار و بێدەسەڵاتەکانی لە لایەن ئەو جۆرە کەسە دڕندانەوە بکەونە بەر ئازار و ئەشکەنجەوە؟ بە ڕاستی پێمخۆشبوو ئەو کابرایەی لە نێزیکەوە ببینم و لێیبپرسم ئەو چ سوودێك لە ئازاردان و ئەشکەنجەکردنی خەڵك دەبا؟

تەیموور گوتی:

ــ پێشنیاری من ئەوەیە کە پلانێك دانێین، بە دیلی بگرین و ئەو شتانەی لێبپرسین. باوەڕ کە ئەوە زۆر زەحمەت نیە و دەشکرێ...

ــ زۆر شتی دیکەش هەن کە پیاو پێیخۆشە لێیبپرسێ...

حەمەد گوتی:

ــ ئەمن دەزانم ئەو بیروبۆچوونی چۆنە و چۆن دەڕوانێتە ئەو خەڵکەی! مامۆستا زەکی نەژاد ئەوانەی حاڵی کردووم! کورت و کرمانجی ئەو و هەموو ئەوانەش کە وەك وین، ئێمەیان پێ بنیادەم نیە و تەواو! مامۆستا زەکی زۆر شتی دیشی بۆ ڕوون کردمەوە و فێری کردم... دیارە ئێستاش سەرم لە هێندێکیان دەرناچێ... یانی بۆم ناچنەوە سەر یەك... ئەو زۆر جاران پێیدەگوتم: حەمەد ئەتۆ زۆر شت دەبینی و زۆر شت دەزانی، بێ ئەوەی تێیان بگەی، یان پێویستت بەوە هەبێ، لێیان ورد بییەوە... بەڵام، نازانم، بڵێی وا بێ؟

مەلا فەرهاد گوتی:

ـ لە گەڵ ئەوەش ئەمن پێمخۆشە بیگەمێ، هێندێك پرسیاری لیّبکەم و باشتر لەو دێوەزمەیەی حاڵی بم...

بەفر و بۆران کۆتایی نەدەهات. کێو لە بەر گرمە و هاژەی بای دەلەرزی. بەفر هێندەی دە دەرکی ئەشکەوتیّ کردبوو، هەر کونێکی چکۆڵەی لیّ مابۆوە. بە هەموو توانایانەوە هەوڵیان دەدا نەهێڵن ئاگرەکە کز بیّ و دامرکیّ. حاجی و هەمزە بیّ ڕاوەستان لە دەریّ ڕا کۆلکە و لکە داریان دێنان، هێندێکیان دەخستە سەر کڵەکە و هێدێکیشیان لە قەراغیّ دادەنان، وشك دەبوونەوە.

جارێکیان پێنج ڕۆژان خەلیل نەهات. تێشوویان نەمابوو و ناچار ڕۆژ تا ئێواریّ هەر چایان دەخواردەوە. وردە وردە دڵەڕاوکێیان کەوتیّ: بڵێی خەلیل لە ڕێیە دا سەرما نەیبردبیّ؟ یان بڵێی سەرهەنگ باهۆز هێرشی نەکردبێتە سەر گوندەکەیان و هەموو خەڵکەی لە بن لێدان و کوتانیّ دا نەکوشتبیّ؟

ڕۆژی حەوتەم قەند و چاشیان تەواو بوو و ئەو جار هەر ئاوی کوڵیوییان دەخواردەوە. هەواکەش هەر ناخۆش بوو و کڕێوە و باکوتەکە نەیدەخست. لقی داران لە دەرەوە لە بەر تەوژمی بای دا هاشەیان دەهات و دەیانلووراند. بەفر هەموو وڵاتی پڕکردبوو. هەموویان لە دەوری ئاوری دانیشتبوون و خۆیان دەخوراند.

ـ خۆزگە توانیبامان ئاوێك بە خۆمان داکەین!

ـ ئەمن ئامادەم بمکوژن، بەڵام لە پێش دا خۆم بشۆم، کراس و دەرپێیەکی خاوێن و تازەشۆراو کە بۆنی سابوونی هێشتا لیّبیّ، دە بەر بکەم و جووتێك گۆرەویی خاوێن دە پیّ بکەم!

حەمەد گوتی:

مامۆستا زەکی ئەژاد ڕاست شتێکی ئاوای بۆ گێڕامەوە. دەیگوت لە شەڕی داردانێلیّ وای لیّهاتبوو سەربازەکان چەند مانگ بوو خۆیان نەشوتبوو و گۆرەوییەکانیان بۆگەنێکی ئەوەندە ناخۆشی لیّدەهات، بە گاڵتە لە پێیان دادەکەندن، بەردێکیان تێوە دەپێچان و لە جیاتیی نارنجۆکی دەیانهاویشتنە نێو سەنگەری دوژمنییەوە. دوایەش پیّدەکەنین و دەیانگوت ئەو بۆگەنە لە نارنجۆکی بیّڕەزاترە...

ـ هم... باهۆز نازانیّ بێتە ئێرە چیی بە سەر دیّ... بە گۆرەوییان گێژی دەکەین...

شەو درەنگانێك کێشکچی هەڵینەستاندن و گوتی هێندێك کەس بەرەو ئێرە دێن. دیارە لە برسان هیچیان خەویان لیّنەکەوتبوو. هەموو هەستان، تفەنگیان بە دەستەوە گرت و خۆیان ئامادەی بەرەنگاربوونەوە کرد. لەو کاتە دا دەنگی نووزەی خەلیلیان بیست. ئیدی گەشانەوە.

کۆمەڵێك کۆلکە داری وشکیان بە سەر ئاگرەکە دا کرد. پێشتر دەرگای ئەشکەوتەکەیان بە لکە داران گرتبوو و تەنیا کونێکیان هێشتبۆوە. ئەوەش بۆ ئەوە بوو کە هەم بەفر نەیەتە ژووری ئەشکەوتەکەوە و هەم گەرمتر بێ و ئاگرەکەش لە دوورەوە دیار نەبێ.

کاتێك خەلیل و دوو هاورێکەی هاتنە ژوورێ، ناسینەوەیان زەحمەت بوو. دەموچاویان هەموو بەفر بوو و ریش و برۆ و سمێڵیان یەکتەخت بەستبووی. هەرکامە و کەلاکە مەرێکیان هێنابوو، کە دیارە لە سەر خێشکی چکۆلە بە دووی خۆیان دا کێشابوون. حەمەد و هاورێیانی بێ ئەوەی یەك قسەش بکەن، خێرا کەلاکێکیان لەتلەت کرد، گۆشتەکەیان بە شیشانەوە کرد و لە سەر پۆلووانی‌یان دانان. بۆنی کەبابی هەموو ئەشکەوتەکەی پڕ کرد و ئەوەندەی دیکەش ئیشتیای کردنەوە. پاشان نانیان گەرم کردەوە و هەموو دانیشتن و بە بێ دەنگی، گۆشتەکەیان بە نانەوە خوارد. پاشان چونکە چەند ڕۆژ بوو لە برسان خەویان لیێ‌نەکەوتبوو، هەر تێر بوون، هەر یەکەو بە لایەکی دا کەوتن و خەویان لیێ‌کەوت. کاتێك دوای چەند سەعات خەو وەئاگا هاتن، خەلیل و هاورێیانی لە وێ نەمابوون و چووبوونەوە. ئەوە هێندێك نیگەرانی کردن. مەلا فەرهاد ترسی هەبوو شتێك بە سەر خەڵکی گوندی کونەبەردێ هاتبێ و لەوەش پەشیمان بوو کە بۆچی هێندێك پووڵی لە بری ئەو هەموو زەحمەت و ئەرك کێشانە نەدا بە خەلیلی! خۆ پێشتر دە بیری خۆی دا وای‌دانابوو کە کاتێك خەلیل گەڕایەوە، هێندێك دراوی وەك دەستخۆشانە بداتێ.

حەوتوێکی دیکەش بەو تێشووەی بۆیان هاتبوو، بەڕێ‌چوون و دوای ئەوە دیسان هیچیان نەما و ناچار بوون هەر ئاوی کوڵیو بخۆنەوە. ئەو جار ئیدی وەزعیان زۆر شڕتر بوو و جاری وا بوو هێندەیان خۆ دەخوراند خوێنیان لە هەموو لەشی دەهات. هەر وا چاویان بڕیبووە خوارێ و چاوەڕوان بوون، بەڵام هەواڵێك لە خەلیل و هاورێیانی نەبوو. کرێوە و سەرماکە هێندێك ئەهوەن ببۆوە. ئێستا ئیدی دەبوو بیر بکەنەوە و بڕیار بدەن. ئەگەر چەند ڕۆژی دیکەش هەر وا لە جێی خۆیان بە بێ بژیو مابانەوە، ئاشکرا بوو ئیدی هێزیان لە بەر دا نەدەما، نەیاندەتوانی بۆ هیچ‌کوێ بچن، شەڕیشیان پێ‌نەدەکرا و ئەو کات سەرهەنگ باهۆز بێ ئەوەی تەنانەت گوللەیەکیش بتەقێنێ، دەی‌توانی هەمووان بە دیل بگرێ و ڕوونیش بوو چۆن لە گەڵیان دەجووڵاوە و چیی بە سەر دێنان!

بڕیاریان دا ئەوێ بە جێ بێڵن و بچنەوە خوارێ. خۆیان گورج کردەوە و لە بەفرێیان دا. نێزیك نیوەڕۆیە گەیشتنە سەر شاخێکی کە بە سەر گوندی کونە بەردێی دا دەڕوانی. لە کەلێنە بەردێکی گەورە دا خۆیان مات کرد. گوندەکە زۆر بێ‌دەنگ و خامۆش دەهاتە بەرچاو. نە

دووکەڵ لە کولانکەی ماڵەکان دەهاتە دەر، نە سەگ دەوەڕین، نە کەر دەیانزەڕاند، نە ماین دەیانحیلاند و نە کەڵەباب دەیانخوێند. حەمەد و هاوڕێیانی کاتێك گوندەکەیان بەو شێوەیە دی، زۆر نیگەران بوون. ئەوان هەموویان لە کەڵێنە بەردەکە دا کۆ ببوونەوە، پشتیان بە پشتی یەکەوە دابوو و لە سەرمان ددانیان ددانی نەدەگرت. بەو شێوەیە تا ئێواریٚ لە ویٚ مانەوە و چاوەڕوان بوون. گوندەکە دەتگوت چۆل کراوە و هیچ دەنگێکی لیٚنەدەهات.

حەمەد لە حالێك دا لە سەرمان دەلەرزی، گوتی:

ـ ڕەنگە لە بەر ئەو کەلێنەبەردەی ناوی ئەم گوندە نرابیٚ " کونە بەرد".

ـ نەخێر، لە وانەیە ئەو ناوە لە ناوی تایفەکەیان ڕا هاتبیٚ.

دورسونە کورد هاتە نێو باسەکەیانەوە:

ـ هەردووك بۆچوون هەڵەن. بەسەرهاتی ئەو ناوەی لە کن منە. سەردەمی کۆن پیاوچاکێك دێتە ئێرە بۆ ئەوەی خەلکەکە ئامۆژگاری بکا، بەڵام خەلکی دێیەکەی گوێیان نەداوەتیٚ و باوەڕیان پێی نەبووە. پیاوچاکە کە پێیان دەڵیٚ: ئێستا کە ئێوە بڕوام پیٚناکەن، گوناهی خۆتان لە سەر خۆتان! ئەو جار پیاوچاکەکە دەستی بە کۆلێنی ئەو شاخەی کرد، دار و بەردیش وەك ویان کرد. تەنانەت ئاوی کانی و جۆگەکانیش هەلگەڕانەوە و بەرەوژوور چوونەوە. پاشان پیاوچاکەکە کە دڵی زۆر لە خەلکی ئاوەدانییە یەشابوو، قامکی ڕاست لە سەر ئەم ڕەوەزەی داگرت و قەڵەشتییەوە!

تەیموور گوتی:

ـ کوڕە بابە ئەوە هەر حیکایەتە و هیچی دی...

شاهێن گوتی:

ـ وانیە. ئەمن دەزانم ڕاستییەکە چۆنە: ڕۆژێکی هەژدیهایەك خۆی لە ڕەوەزێکی گەورە دەهاڵێنیٚ و بە درێشووکە دووفلیقانە سوورەکەی کونێکی دە بەدرەکەی دەکا، پاشان سەری دە کونەکەی دەنیٚ، ڕەوەزەکەی بەرز دەکاتەوە و دەیهێنیٚ لێرەی دادەنیٚ. کاتێك خەلکەکە ئەوەی دەبینن، وەك ئەمڕۆ هەر یەکەی بە لایەکی دا هەڵدێن!

قاسم گوتی:

ـ ئەوەشیان هەر حیکایەتە!

باس و دمەقاڵەیەکی سەیریان لە نێو دا دروست بوو. هەر کەس لە سەر قسەی خۆی سوور بوو. وای لیٚهات وردە وردە دەنگیان بە سەر یەك دا بەرز کردەوە. چی وای نەمابوو قسە بە یەکتر بڵێن کە حەمەدۆك ناچار بوو خۆ تیٚهەڵقوتێنیٚ:

ـ بێدەنگ بن! دەڵێی خوا لێی‌گۆڕیون! چ جیاوازی‌یەکی هەیە ئەو ڕەوەزە شێخێك کونی کردبێ، هەژدیهایەك بە درێشووکەی قەڵەشتبێتی‌یەوە، یان شتێکی دیکە بووبێ. ئێستا ئێمە بۆخۆمان دە مەترسی داین و دەبێ بیر لە وە بکەینەوە چ بکەین! خۆ ئەمشۆ لەو کونەی دا بمێنینەوە، هەموو ڕەق هەڵدێین! ئێستا پێش ئەوەی هەوا بە تەواوی تاریك بێ، دەچینە نێو دێی...

دوای ئەو قسەیە حەمەد لە کونە بەردەکەی هاتە دەر و بەرەوخوار ڕۆیی. بایەکی وا توندی دەهات ئەو پیاوە بەهێزانەی بەلا دا دێنا. بەرد بە بەرد شوێنیان گوێزتەوە و بە ماتەماتە خۆیان گەیاندە نێزیك دێی. هێندێکیان مابوو، حەمەد ڕاوەستا. هەموو گەیشتنێ و کۆ بوونەوە. حەمەد گوتی:

ـ دەچینەماڵێکی، وا نەکەین لە برسان و لە سەرمان دەمرین!

مەلا فەرهاد گوتی:

ـ لە وانەیە بۆسەیان بۆ دانابینەوە. تەنانەت دوور نیە هەر ئێستا گەمارۆ درابین.

ـ نا، ئەگەر وا بوایە هەستمان پێ‌دەکرد...

ـ ڕەنگە ژاندەرمەکان لە نێو دێی خۆیان حەشار دابێ و لە نەکاو لێماندەن. ئەو دێیە سەیر چۆل بووە، قەت شتی وام نەدیوە و لەوانەیە ئەوە بۆخۆی نیشانەی مەترسی بێ. پێم‌وایە هەر بگەینە نێو دێی، لێماندەدەن.

ـ بەڵێ، بەڵێ، دوور نیە. بەڵام خۆ ناتوانین هەر لێرەش ڕاوەستین. لانی کەم بۆ ئەوەی سەرما نەمانبا، با بجووڵێین، بە وشیاری گەڕێك بە دەوری دێی دا لێ‌دەین و گوندەکەی تاقی‌بکەینەوە.

خولێکیان بە دەوری گوندەکەی دا لێ‌دا. حەمەد لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە بچنە نێو دێی و خۆ بگەیەننە ماڵێکی، بەڵام مەلا فەرهاد هەر پێی‌وابوو بۆسەیان بۆ داناونەوە. ئاخرەکەی حەمەد گوتی:

ـ باشە ئەوە چ سوودێکی هەیە کە ئێمە هەر بە دەوری دێی دا بخولێینەوە. خۆ لە دەرێ هەر ناحاوێینەوە و لە سەرمان دەمرین. دەنا با بچێنە دێیەکی دیکە، دێیەکی نێزیك ئێرە...

ڕێگای گوندێکی دیکەیان گرتە بەر و ڕۆیشتن. نیوەشەوێ ڕووناکایی‌یەکیان لە گۆڕایی‌یەکی خوارەوە لێ وەدیار کەوت، ئەو جار سەگێکیش وەڕی و بە دوای وی دا یەکی دیش... بە ڕاستی هێندە برسی بوون و هێندەیان سەرما بوو، نەیاندەزانی چۆن بە سەر پێوە ماون. ئەو جار هێندێك هێز و هومێدیان هاتەوە بەر و ئیدی بێ ئەوەی بیر لە بۆسە و شتی وا بکەنەوە، داپەڕینە خوارێ. بەو نیوە شەوەی چرای هەموو ماڵەکان دابیسان. ماڵێکی گەورەیان لە پێشەوە وە بەر چاو هات. لە دەرگایان دا و ماوەیەك ڕاوەستان، بەڵام دەرگایان لێ‌تەکرایەوە. هێندە شەکەت بوون، نەیاندەتوانی خۆ بە سەر پێوە ڕاگرن. دیسان لێیان دایەوە،

بەڵام هەر نەکرایەوە. هێندێك مات بوون و گوێیان ڕاگرت. دەنگی ناڵەناڵی لە ژوورێ دەهات. ڕۆستەمە کورد خەنجەرەکەی هەڵکێشا، بە کونی دەرگا دا ناڵقەرەزی دەرگاکەی هەڵگرت و هەموویان یەکجێ چوونە ژوورێ. هەموو بنەماڵەکە لە دەوری سۆبەی دە جێیە دا کەتبوون و دەیانناڵاند.

حەمەد لە سەرەخۆ گوتی:

ــ ئەو چی‌یە؟ هەمووتان نەخۆشن؟

پیاوێکی ڕیش سپی‌یان تێدا بوو، سەری هەڵێنا و لە حاڵێك دا وەك مێژۆکەی دەلەرزی، هەوڵی دا قسان بکا، بەڵام نەی‌توانی و دە جێیە کەوتەوە. حەمەد گوتی:

ــ هیوادارم خوا چاکتان کاتەوە.

پاشان چوونە ماڵێکی دیکە. لە وێش هەر وا دەرگایان لێ‌نەکرایەوە، دورسون بە نووکی خەنجەرێ، ناڵقەرەزەکەی هەڵگرت. کە چوونە ژوورێ دیتیان خەڵکی ئەو ماڵەش هەموو کەوتوون. ئاگری سۆبەکەشیان دامرکابوو و ژوورەکەیان سارد بوو. یەکێك لەو پیاوانەی لە وێ کەوتبوون، هەستا، بۆڵەبۆڵێکی کرد، کە تەنیا ئەوەندەی لێ‌حاڵی بوون:

ــ ژاندەرمان... نایب ئەلیاس... بچن بۆ لای نایب ئەلیاسی...

لەدەرگای شەش ماڵی دیکەشیان دا، هەموویان هەر ئەو مەرەدەیان بە سەر هاتبوو. سەرەنجام گەیشتنە ماڵی نایب ئەلیاسی. لە ماڵی ئەوانیش سۆبەکە کوژابۆوە، هەموو بنەماڵەکەیان کەوتبوون و ناڵەناڵیان بوو. نایب ئەلیاس کە چاوی بە حەمەدۆك و هاوڕێیانی کەوت بزەیەکی هاتێ و گوتی:

ــ بەخێر بێی، حەمەدۆك! گەورەت کردین. یارەبی خودا! هەر بتپارێزێ، کورم. ئەتۆ سلامەت بی، قەیدێ ناکا ئێمە ئە سەرتۆ هەرچی بە سەرمان دێ، با بێ. حەمەدۆك، ڕۆڵە، ئەتۆ لە لای ئێمە هێندە خۆشەویستی، ئەگەر درۆیێکت دە لاقی ڕاچێ، دڵی ئێمە ژانێ دەکا. دەزانی کاتێك تۆ و هاوڕێیانت لێرە دەبینم، چەندە سەربەرزم؟ ئەو کافرە هێندەی لێ‌داوین، تەنانەت کەسمان توانای ئەوەی نیە ئاوردووی بێنێ و سۆبەکەش هەڵکا! یاخوا بەخێر بێن. زۆر باش بوو هاتن! دەزانم زۆر ماندوو و شەکەتن، بەڵام چار نیە دەبێ بۆخۆتان داری بێنن و سۆبەکەی هەڵکەن. ئاوردووەکە لە قونیچێکی تەویلەی هەڵچنراوە. بەڵام ڕۆڵە، تفەنگەکانتان لە خۆتان دوور مەکەنەوە، چونکە ئەو پیاوکوژە لەو دەوروبەرەی دەخولێتەوە و خوا دەزانێ ئێستا خەڵکی چ گوندێکی دارکاری دەکا!

هەمزە و شاهێن کە هەردووکیان کۆنە شوان بوون و لە وانی دیان کەمتر شەکەتی پێوە دیار بوو، دەسبەجێ هەستان، ئاوردوویان هێنا، سۆبەیان پڕ کرد و زۆری پێ‌نەچوو ژوورەکە گەرم دا هات.

نایب ئەلیاس گوتی:

ــ چایەکیش لیٚ‌نێن. کەتری و چادان و شتی وا لەو گۆشەیەن. خەجاڵەتین کە ئاوا قەدری میوانی دەگرین و ئێوە بۆخۆتان زەحمەتەکە دەکێشن، بەڵام بە داخەوە وەك دەبینن ئێمە کەسمان ناتوانیٚ لە جێیخۆی هەستیٚ. ئەو بیٚ‌دینە لاقولەتەری هەموومانی تێك‌کردۆتەوە.

لە حاڵێك دا میوانەکان دەهاتن و دەچوون و خەریکی ئامادە کردنی جەمی بەیانی بوون، بنەماڵەی نایب ئەلیاسی باڵنجیان وە بەر پشتی خۆیان دابوون و و بە شەرمەوە چاویان لە هەڵسووڕانی ئەوان دەکرد.

نایب ئەلیاس گوتی:

ــ ئەو کابرایە بە ڕاستی باهۆزە، کە هات هەموو خەڵکی ئەو گوندەی تێکەوە پێچا و یەکی بە سەر پێوە نەهێشت. پیاو، ژن، منداڵ، گەورە و چووکی هەموو گۆج و ئیفلیج کردن! پشیلەکانی بۆ گیرابان، ئەوانیشی دارکاری دەکرد! بە ڕاستی وەك بۆرانێکی توند لە گوندی ئێمەی دا! ئای خوایە چی بە سەر هێناین. بەڵام دیسان با وەبیرتان بێنمەوە، بۆ خاتری خوای تفەنگەکانتان با لە بەر دەستتان بن، لە سەر خواردنێش با لێتان دوور نەبن! ئەو مەلعوونە دوور نیە بگەڕێتەوە... لە بیرت بیٚ حەمەدۆك، هەر دیتت، دەبیٚ بی‌کوژی!

حەمەد و هاوڕێیانی لە بن سۆبەکەی دانیشتبوون، شووشە سەهۆڵی سەر برۆ و سمێڵیان تاوێك بوو کردبوویەوە و جل و بەرگەکانیشیان خاو ببوونەوە. ئەو جار بۆگەنیوی ئەش و جل و بەرگەکانیان ژوورەکەی پڕ کرد. نایب ئەلیاس دەسبەجیٚ هەستی بەوە کرد و بۆ ئەوەی میوانەکانی خەجاڵەت نەبنەوە، گوتی:

ــ ناڕەحەت مەبن کوڕینە! ئێمە کاتێك لە کێوی ئەڵڵاهەئەکبەری شەڕمان دەکرد، لە بەر بیٚ‌ئاویان زۆر لە ئێستای ئێوە چڵکنتر و دژوێنتر ببووین. ئێمەش بۆگەنیومان لیٚ‌دەهات و لەشیشمان پڕ بوو لە کێچ و ئەسپیٚ!

پاشان بزەیەکی شیرینی هاتیٚ و دووپاتی کردەوە:

ــ هیچ خەمتان نەبیٚ! ئەوپەڕەکەی سبەی، یان دووسبەی مامە نایب ئەلیاسی خۆتان دەکەوێتەوە سەرپێیان، جا ئاوتان بۆ گەرم دەکا، لفکە و سابوونتان دەداتیٚ و پێتان خۆشە لە بەیانی‌یەوە تا ئێواریٚ هەر خۆتان بشۆن. کاتێك ئەمن بۆخۆم لە شەڕیٚ بووم، جارێکیان برینداربووم و دوای ئەوەی برینەکەم چاك بۆوە، چوومە حەمامی نەخۆشخانەکەی و ڕۆژێکی تەواو هەتا ئێواریٚ هەر خۆم شوت. ئەگەر لێیان‌گەڕابایەم پێم‌خۆش بوو سیٚ شەو و ڕۆژان نەهاتبامە دەر و هەر خۆم شوتبا.

لێرە دا لە ئەکاو ئەو باسەی بڕی‌یەوە و ڕووی دە مەلا فەرهادی کرد:

ــ ئەریٚ خۆ پێتان‌نەگوتم ناوتان چی‌یە! ئەتۆ دەبیٚ مەلا فەرهاد بی، وانیە؟

مەلا فەرهاد پیٚ‌کەنی و گوتی:

ـ بەڵێ، وایە.

ـ ئەتۆش قاسمی؟ ئەتۆش تەیموور یۆرۆکی و ئەوەش کە لەو بەری دانیشتتوە، شاهێنە، وایە؟

ـ نایب ئەلیاس، وا دیارە هەمووان دەناسی!

ـ هەموو کەس دەتانناسێ، کورە ئازا چاوڕەشەکانم! ئێستا با پێتانبڵێم: ئەو ژوورەی سەرەوە هەنگوین، پەنیر و ڕۆنی کەرەی لێیە... بچن بێنن و بخۆن! بەیانیش مامە ئەلیاستان مەڕێکی چاکتان بۆ دەکوژێتەوە!

هەمزە نانەکەی لە سەر مەجومعەیەکی مسی گەورە دانا و هێنای. حەمەد و هاوڕێیانی دەستیان بە نانخواردنێ کرد. هێندە برسی بوون، شەویلکەیان وەك ئاشی دەگەڕا و پاروو بە دووی پاروویدا دە زاریان دەنا. ئەلیاس یەك ـ دوو سەرینی دە بەر پشتی نابوون، لە سەر دۆشەکەکەی دانیشتبوو و تێیانەوە ڕامابوو:

ـ لەسەرەخۆ بخۆن ڕۆڵەکانم! ئێوە چەند ڕۆژە هیچتان نەخواردوە و زۆر برسین. کەسێکیش ئاوا برسی بێ، نابێ زۆری بخوا. چونکە زگتان هەڵدەمسێ و دەگیرێ! ئەو کات ئەگەر باهۆز بێتەوە ئێرە، ناتوانن شەڕی لە گەڵ بکەن و هەمووتان وەك کەوی هەڵوەدای نێو بەفرێ دەگرێ...

کاتێك حەمەد و هاوڕێیانی لە خواردنی جەمی بەیانی بوونەوە، قاوەڵتوون بوو. نە کوپە هەنگوینی تێدا مابوو، نە پێستە پەنیر و نە تەبەك نان. هەرچی هەبوو خواردبوویان. ئەو جار هەموویان خەو دایگرتبوون و لە بن سۆبەی بە دیوارییەوە وێژینگیان دەدان. وا دیار بوو ئامۆژگارییەکەی نایب ئەلیاسیشیان لە بیر چووبۆوە. کاتێك ئەلیاس بیری لەو کەمتەرخەمییەیان کردەوە، تووڕە بوو و گوتی:

ـ بڕوانە، بڕوانە، ئەو جووچکە کەڵەشێرانە! یانی بە ڕاستی ئەو حەمەدۆکە، هەمان چەتەی بەنێوبانگە؟ خۆ وەڵڵاهی ئێستا سەرجووخەیەك لە گەڵ دوو ژاندەرمەی ڕووتەڵە لێیان وەژوور کەون، هەموویان دەگرن، پەتیان دە ملی دەخەن و بە دوای خۆیان دا بەرەو شار ڕەکێشیان دەکەن.

نایب ئەلیاس زۆر لەو کەمتەرخەمییەیان تووڕە بوو و هەر چی بە سەر زاری دا هات، گوتی، بەڵام لە نەکاو ڕقی نیشتەوە، خاو بۆوە و کە زیاتریان لێ ورد بۆوە، زگی پێیان سووتا و بیری کردەوە: خودا دەزانێ ئەو بەستەزمانانە دەو بەفر و بۆرانەی دا بە بێ خەو، خواردن و خواردنەوە، چەندە ڕۆیشتوون، چەند ماونەوە و چەندە شەکەت و ماندوو بوون و ژاندەرمەشیان هەر بە دووەوە بوون. ئەو جار فرمێسکی لە چاوان هاتنە خوار و لە ژێر لێوییەوە گوتی:

ـ یاغیگەری سەخت و ناخۆشە و کاری هەموو کەس نیە... کابرای یاغی ڕوحی لە سەر بەری دەستییەتی... باشە بەو حاڵەش چەتە چیی پێدەبڕێ؟ لە خۆڕا ئەو کوێرەوەری و چەرمەسەرییەی بۆ قبووڵ دەکا؟

لە خۆوە دووپاتی کردەوە:

ـ لەخۆڕا! بەڵام چەتە هەر نابڕێن! هەتا دنیا هەیە یاغیش هەر دەبن! خەڵکی وا هەر دەبن، چەك بە دەستەوە بگرن و لە شاخی دەن!

ئەو جار لە دڵی خۆی دا گوتی، ئەوە شانازی‌یەکی گەورەیە حەمەدۆك میوانی منە. هەموو کەس ئەو شانازی‌یەی پی‌ نابڕێ... ئەو جار وردە وردە ئێشی لاقەکانی لەبیر چۆوە و بەدەم ئەو چەشنە خەیاڵ و فکرانەوە چووە خەوێکی قووڵەوە.

کاتێك حەمەد و هاوڕێیانی وە خەبەر هاتن، نایب ئەلیاس هەستابوو. لاقی هێشتا تا ڕادەیەکی هەر ئەستووربوون، بەڵام جووتێك گۆرەویی میرزایی جوانی هەڵکێشابوون.

حەمەد و هاوڕێیانی ئاوێکیان بە دەم و چاویان دا کرد. ژنەکانی نایبی و بووکەکانی هەستابوونەوە و خەریك بوون نانیان بۆخۆیان ساز دەکرد. بۆنی قاوەی تازەلێنراو ژوورەکەی پڕ کردبوو. نایب ئەلیاس حەمەد و هاوڕێیانی بردە ژووری میوانان و گوتی:

ـ ئاومان بۆ گەرم کردوون. ئێستا کاتی ئەوەیە بە نۆرە بچن و خۆتان بشۆن. دە خەمی سابوونیش دا مەبن و هەرچەندی پێتان خۆشە بە کاری بێنن. لەمێژ نیە گۆنی‌یەکی پڕم سابوونی سپیی بۆنخۆش لە ماراشێ ڕا بۆ هاتوە... کاتێك خۆتان شوت، هەموو وەك لە خەڵێفی مێشەنگوینی هاتبەنە دەر، بۆنی هەنگوینیتان لی‌دێ!

هەتا دوای نیوەڕۆیە هەموو خۆیان شوت و دوایە هەستیان دەکرد وەك باڵندەی سووك بوون.

نایب ئەلیاس بەرانێکی گەورەی بۆ کوشتنەوە. خێزانی پلاو و گۆشتێکی چاکی ساز کرد و کولێرە ناسکەشی کردن. لەو کاتە دا ئاغای دێیەکەیان بە کۆڵێ هێنا. پیاوێك لە کۆڵی کردبوو و چەند جووتێریش کە تا ڕادەیەك باشتر ببوون، لە گەڵی بوون. ئەوانیش هاتن، لە گەڵ حەمەد و هاوڕێیانی دانیشتن. خەڵکەکە بە چاوی ڕێز و خۆشەویستی‌یەوە لە حەمەدیان دەڕوانی و سەرەڕای ئەو بارودۆخە ناخۆشەی تێی‌دابوون، خۆشحاڵ بوون، کە بە دیداری حەمەدۆکی شاد دەبن. هەموو بە یەکەوە، بەکاوەخۆ نانیان خوارد و پاشان وێڕای شوکری خودای، سوپاسی کابانیان کرد کە ئەو چێشتە خۆشەی بۆ ساز کردبوون و هەر وەها سوپاسی خانەخوێشیان کرد.

ئەو جار نایب ئەلیاس هێندێکی دیکەشی لە بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕانەوە و گوتی:

ـ ئەمن دە شەڕێ دا بە دیل گیرام و لە ماوەی دیلی‌یەکەم دا کاریان پی‌دەکردم، ڕێگایان پی‌ خۆش دەکردم، بەردیان پی‌دەشکاندم و سەنگەریان پی‌هەڵدەکەندم، بەڵام هەرگیز کەسم خراپتر لەو باهۆزەی نەدیوە. ئەو کابرایە هەر پێی‌خۆشە خەڵکی ئازار بدا و بیانشکێنێ. پێی‌وایە ئەو خەڵکە بنیادەم نین،

بایەخ بۆ کەسایەتیی هیچکەس دانانیّ، پێیوایە کەس مێشیش نیە! مێرووش نیە، کرمیش نیە! وەك شێتان چاو لە پیاوی دەکا. دیارە کەسێکیش کە بە دایم هەر خەلکی ئەشکەنجە و ئازار دەدا، هەر شێتە ئیدی! هیچ بنیادەمێکی ئاسایی پێیخۆش نیە خەلکی دیکە ئازار بدا، بەلاّم ئەو کەیفی بە ئازاردانی خەلّك دیّ. ئەمن لە زۆر بەرەی جۆراوجۆر شەڕم کردوە، بەلاّم زالمتر لە وەم هەر نەدیوە! شتێکی ڕوونە کە ئەمن بە دژی دێوەزمەیەکی ئاوا کە ئێمەی پیّ ئینسان نیە، ڕادەوەستم. ئاخ، لە بەر چاوی ئەو چەشنە کەسانە بایەخی ئێمە لەو هێسترانە کەمترە کە باری گورهانەکەیان لیّدەنێن. ئەو پیاوکوژە خوێنمژە کاتێك دەنگی نالّەنالّی ئێمەی دەبیست، کەیفی ساز دەبوو و چاوی دەسووڕان! نەخێر هیچ کەس وەك ئەو کابرایەی زالّم، ناپیاو و بێشەرەف نیە... لەو کاتە دا کە پیاوەکانی بە داران لە بەری لاقیان دەدام، ئەویش بەنووکە شەپان وەرمگەڕابۆیە، نە سەری دەپاراستم، نە سینگم، نە دەموچاوم و نە زگم، هەر کەفی دەچاند، جنێوی دەدان و لێیدەدام!

کاتێك باهۆز لە شاری وەدەر کەوت، لە گوندێکی خۆش، کە کەوتبووە سەر ڕێگایەی، لای دا و گورهانە ژاندەرمەکەی دە نێو دێی کرد. کاتێك ژاندەرمەکان لە گوندەکەی وەدەرکەوتنەوە، دێیەکە یەك کەسی وای تیّدا نەمابوو بتوانیّ بە سەر پێوە ڕاوەستیّ. ئیدی ئەوجار سەرهەنگ عەزمی هەتا تووشی دەستەی حەمەدۆکی دەبوو، سەرکەوتنی وەدەست نەدێنا، حەمەد لە دەستی دەرباز دەبوو، یان پیاوەکانی بریندار دەبوون و تیّدا دەچوون، بەرببینی بە جووتێران دەگرت، خەلکی دێیەکی بە تەوای شڕوشپرێو دەکرد و داخی دلّی خۆی بە وان دەڕشت. دەیگوت چ جیاوازییەکی هەیە؟ خەلکی ئەو گوندانە هەموویان درۆزن و کافرن و هەموویان بە ژن، مندالّ، گەورە و چکۆلّەوە حەمەدۆکن.

بەو شێوەیە باهۆز دە بیری ئەوە دا نەبوو کە بەزەیی بە دێهاتییان دابیّ و لێیان خۆش بیّ. دەیگوت هەمووان بنەبڕ دەکەم.

جووتێرەکانی توورووسی دە ترس و دلّەڕاوکێیەکی سەیر دا دەژیان. هەرچەند بەفرێکی زۆر دە عەرزی دا بوو، بە دایمەش کڕێوە و بۆران بوو و سەرما حەشری دەکرد، کاتێك دەیانبیست ژاندەرمە بەرەو دێیەکەیان دێن، دێیان چۆل دەکرد و هەلّدەهاتن. دەچوونە دێیەکی دوور، یان خۆیان لە نێو ئەشکەوتان دا حەشار دەدا و یان شۆڕدەبوونەوە بۆ لای چوکووڕاوایە. خەلکی گوندی کونە بەردێش قیروسیایان لە مالّ وحالّیان کردبوو و پێش ئەوەی باهۆز بگاتە ئەویّ، هەلاّتبوون و هیچ کەس نەیدەزانی چووبوونە کویّ. تەنیا ئەوە ڕوون بوو کە گوندەکەیان چۆل کردبوو و بەپێی ئەو هەوالاّنەش کە بە دوای یەك دا بلاّو دەبوونەوە، زۆر گوندی دیکەش چۆل کرابوون و کەس نەیدەزانی خەلّکەکە چییان بە سەر هاتوە.

مەسەلێکی کۆن هەیە دەڵێ: ترس نەکەر زاڵ بوو، هەموو شتێك تێکدەشکێنێ، تەنانەت شاخەکانیش خۆی لە بەر ناگرن. سەرهەنگ عەزمیش هەر مەبەستی ئەوە بوو ئەو جووتێرە دڕندانە لە ترسان دڵیان بتۆقێ. دەیگوت دەبێ وایان لێبکەم، ئاوات بۆ سەردەمی مراد پاشای گۆڕکۆڵ بخوازن. گۆڕی گیانیان بێ! ئاخرەکەی بۆخۆیان وایان لێدێ حەمەدی دەگرن و بە دەست بەسراوی دەیدەنە دەست وی. بەڵێ، ئەو جووتێرانە ئاوان ئیدی! جاری وایە بۆ ئازایەتی‌یە کەسیان ناگاتێ و هێندێك جاریش لە هەموو خەڵکی دنیایە ترسەنۆکترن.

ـ هەموو عارف سایم بەگ بوو ئەو کابرا دڕندەیەی دە ئێمە بەردا. خۆ ئێمە شتێکی خراپمان نەکردوە! تاوانمان چی‌یە؟ ئەمن عارف سایم بەگی دەناسم. دیتوومە. دەزانم چەندە لەخۆبایی‌یە. بریا هەردووك چاوم کوێر بووبان و قەتم نەدیبایە! بە چاوی سووك لە خەڵکی دەڕوانێ، وەك بەردت پێدادا وایە! ئەمن پێمخۆش نیە کەس بکوژم، چونکە کوشتنی بەندەکانی خوای بە ڕەوا نازانم، تەنانەت ئەگەر زۆریش خراپ بن! ئەمن زۆر شەرم دیون و ئیدی لە شەڕ و خوێنڕشتن بێزارم، بەڵام بە دڵ پێمخۆشە ئەو کابرایەی، ئەو عارف سایم بەگەی بکوژم. ئەو شتانە هەموو دە بن سەری وی دان.

لە بەری پێی ڕا هەتا تەپڵی سەری تووڕەیی لێدەباری:

ـ حەمەدۆك، کوڕم، بە هیچ شێوەیەك لە تۆ تووڕە نیم! ئەوەگرینگ نیە کە لە سەر تۆ ئاوا بە سەر ئەو خەڵکەی دێنن. خودا و پێغەمبەر بە شاهید دەگرم خۆشم دەوێی! ئەو کاتەش کە ئەو کابرایە لەسەر تۆ بێڕێزیی پێ دەکردین و ئێی دەداین، هەر خۆشم دەویستی! ئەتۆ ئەوەی دەکەی، کە دەبێ بی‌کەی! ئەتۆ ڕێگای خۆت هەڵبژاردوە و گەڕانەوەت نیە! دیارە ئەتۆش بە ڕۆژی خۆی یان گوللەیەکت وێدەکەوێ، یان لە دار دەدرێی! لەوەتا دنیا هەیە، کەس نەی‌دیوە پیاوی وەك تۆ بە پیری، بە کۆخەکۆخ و جریەجرپ دە جێیە دا بمرن! بۆخۆشت ئەوەی دەزانی ئیدی؟

حەمەد پێکەنی و گوتی:

ـ بەڵێ، دەزانم.

ـ بەڵێ دەزانی، بەڵام لە شاخی دەمێنیەوە و ستەمکاری وەك عەبدیخانی دەکوژی...

ـ بەڵێ...

ـ بەڵام وا بزانم ئەو جار دەرباز نابی. باهۆز زۆر دڕندەیە...

ـ بۆخۆشم پێموایە.

ـ جار جار بیر لەوە ناکەیەوە لەوانەیە چۆن بمری؟

ـ بۆچی، زۆر جار بیری وا دەکەمەوە.

ـ هەر خوا بۆخۆی دەزانێ تا ئێستا چەند جار مردووی!
ـ زۆر جار! ئەوان هەموو ڕۆژێ جارێك ئەمن دەکوژن...
ـ لێرە، لە شاخی، پیاو تا جارێك زیندوو دەبێتەوە، هەزار جار دەمرێ.
ـ بەڵێ، ئەوە مەسەلێکی کۆنە و ڕاستیشە.
ـ کە وا بوو گوێم لێ بگرە، بزانە چت پێ دەڵێم، حەمەدۆك!
ـ گوێم لێتە، مام ئەلیاس.
ـ ئەو گوندە چۆلکراوانە... زۆر باش بوو نەچوونە نێو گوندی کونەبەردێ. با پێت بلێم، دوور نیە هەر کام لەو گوندە چۆلکراوانە بۆسەیەك بن. باهۆز لە وانەیە لە هەر شوێنەی کۆمەڵێك لە پیاوەکانی خۆی دامەزراندبێ و بۆسەی بۆ دانابنەوە. لە هەموو شوێنێکیش بە سانایی دەتوانێ تەڵەتان بۆ دانێتەوە. دەزانی بۆ؟ چونکە گوندەکان کەسیان لێ نەماوە وشیارتان کاتەوە. ئەو جار کاری ئێوە زۆر سەختتر دەبێ، حەمەدۆك. باهۆز هەوڵ دەدا کانی یەکانی دەوروبەرت وشك کا، هەتا ئاخرەکەی وات لێ بێ وەك ماسی کە ئاوی بە سەر دا وشك دەبێ، لە وشکایی یە زار داپچڕی و ئیدی تەنانەت بۆ گرتنت پێویستیی بە دەستدرێژکردنیش نەبێ و بۆخۆت بچیە بەر دەستی.
ـ بەڵێ، دەزانم، ئەوە تاکتیکی "عەرزی سووتاو"ی پێ دەڵێن...
ـ بژی حەمەد، خوا بتپارێزێ. ڕێگاکەت ڕێگایەکی ڕاستە. ڕێگایەکی پیرۆزە.
ـ خوا تۆش بپارێزێ، مامە ئەلیاس!
ـ خەڵکەکە کاتێك بیستیان تۆ لێرەی، هەموو ژانی لەشی خۆیان لە بیر چۆوە. پێیان خۆشە بتبینن.
ـ زۆر باشە، پێتباشە گەرێك بە دێی دا بگەڕێین و چاکوخۆشی یەکیان لە گەڵ بکەین؟
ـ ئاوا زۆر باش دەبێ و هەموو دەتبینن.
ـ بەڵام با لە پێش دا ڕیشم بتاشم. پێمخۆش نیە خەڵك ئاوام ببینن.
ـ ڕاست دەکەی. ئێستا سەرتاشێکت بۆ بانگ دەکەم. هەر ئێستا.
ناردی سەرتاشێکی لاویان هێنا. کوڕەکە لە کاتێك دا فلچەی بەکەفی بە ڕدێنی حەمەدی دا دێنا و ڕدێنی دەخووساند، سەری بردە بن گوێی و گوتی: "ئەمن لە یەکێك لە دەستە حەمەدەکان دام". ئەویش دارکاری کرابوو و لاقی هێندە دێشان کە بە زەحمەت خۆی بە پێوە ڕادەگرت.
دوای ئەوەی چەتەکان هەموو ڕیشیان تاشی، ڕەخت و تفەنگیان لە خۆ بەستن و چوون بۆ نێو دێی. بەشێکی بەرچاو لە خەڵکەکە لە نێوەڕاستی دێی کۆ ببوونەوە و ئی دیکەش هەر وا

دەهاتن. هەموویان دەشەلین و ئی وا بوو بە گۆچانی دەڕۆیی. حەمەد و هاوڕێیانی لە سەر کانی‌یە ڕاوەستابوون. کانی‌یەکە لەبن دار پەلکێکی گەورە دەهاتە دەرێ. ئاوەکە بەستبووی.

نایب ئەلیاس گوتی:

ـ خوشکان و برایان، ئەوە حەمەدۆکە.

ـ هیچ‌کەس نە یەك وشەی بە زاری دا هات و نە بزووت. بێ‌دنگ ڕاوەستابوون، دەنگی هەناسەکێشانی‌شیان نەدەهات. نایب ئەلیاس قۆلی دە قۆلی حەمەدۆکی کرد و کێشای. حەمەد لە گەلی ڕۆیی، چاوێکیشی هەر لە لای حەشیمەتەکەی بوو و هێندێك ئالۆز ببوو. خەلکەکە بێ ئەوەی بێ‌دەنگی‌یەکەیان بشکێنن، بلاوەیان کرد.

ئەلیاس لە دەوری جحێلی‌یە دا ڕاوچی‌یەکی کارامە بوو. پاشان بردبوویانە بەرەی شەڕ، نۆ سالێ لە وێ مابۆوە و بە ئەنگێوەیەکی چاك ناوبانگی دەرکردبوو. ئێستا لێرە، لە گوندەکەی خۆی مەڕدار بوو و مالاتی بەخێو دەکرد. مەڕ و جوانەگای نایب ئەلیاسی بەناوبانگ بوون. ئەلیاس دەولەمەند بوو و ژیانێکی خۆشی هەبوو.

هەر وا کە قۆلیان دە قۆلی یەکتر دا بوو و بۆ لای مالێ دەچوونەوە، مام ئەلیاس لە سەرخۆ بە حەمەدی گوت:

ـ با پێت بلێم، عەزمی باهۆز لە ئەستۆی من. شەرت بێ سەد گیانی هەبێ، یەکی پێ‌نەیەلم. دیارە ئەو منی نەکوشتوە، بەلام شکاندوومی و سووکایەتی پێ‌کردووم. وای لێ‌کردم لە بەر چاوی مالێ و مندالم و دەروجیرانم وەك سەگ بقرووسکێنم. ئابڕووی بردم.

حەمەد هەولی دا دژایەتیی بڕیارەکەی بکا، بەلام نایب ئەلیاس نەی‌هێشت قسە بکا و گوتی:

ـ هەر بۆیەم پێ‌گوتی کە ئاگادار بی. قسە لێ‌کردنیشی ناوی، بەلام ئەوە لە بەینی من و خۆت دایە و نای‌درکێنی...

ـ تێ‌دەگەم، نایب. بەلێنیشت پێ‌دەدەم کەس لێم‌نازانێ...

ـ زۆر باشە، ئەوە دلنیا بووم کە ئەو نهێنی‌یە دەپارێزی... ئەرێ، پێم‌وایە مەلا فەرهاد زۆر پیاوی چاکە، وانیە؟

حەمەد وەلامی دایەوە:

ـ ئەرێوەللا، نایب ئەلیاس. مەلا فەرهاد دلی زۆر گەورەیە، هەرچەندی بلێی گەورەیە و پڕیشە لە ڕێز و خۆشەویستی. پیاوێکی یەکجار نازاشە. لە ژیانم دا پیاوی ئاقل و پاکی وەك ویم نەدیوە. مامە ئەلیاس هێندێك جار دەروونم دەشێوێ، دەترسم و هەموو گیانم دەلەرزێ. لەو ڕۆژەی دەترسم ئەو بکوژرێ. بە دلێ پێم‌خۆشە دەست لە ژیانی یاغیگەری‌یە بکێشێتەوە، بچێتە

شوێنێکی دوور و لە وێ مەلایەتیی خۆی بکا، ژنیٚ بێنیٚ و ماڵومنداڵێکی هەبیٚ. سەد جاریشم قسە لە گەڵ کردوە و ئەوانەم پیٚگوتوە، بەڵام ئەو قەت هیچ ناڵیٚ و بە قسەشم ناکا.

ـ ئەویش دەستی پیٚ لەو کارەی هەڵناگیریٚ. ئەویش دەزانیٚ دەبیٚ هەزار جار بمریٚ، تا جارێك زیندوو دەبێتەوە... ئەویش وەك خۆتە... لەخۆڕا نازاری مەدە و فکری ئاڵۆز مەکە. ئەگەر بۆخۆی پێشتر پێیخۆش بووبایە، مەلایەتی چی؟ دەیتوانی ببیٚ بە موفتیش! دەیتوانی خانوو و سامانێکی باشی هەبیٚ... بەڵام بۆخۆت دەزانی کە چەندە خەڵك لەو شاخانە، لەو دەشتە پانوبەرینەی خواریٚ و لە هەموو ئاناتۆلی دەچەوسێنەوە. ئەو هەموو هەژارانە دەبینی کە نانی شەوێیان نیە و لە برسان خوێن دەگرین...

ـ بەڵام ئێمە سوودێکمان بۆ وان نیە و زیانیشیان لیٚدەدەین. دیتووتە لە سەر ئێمە چییان بە سەر دێنن؟ هەر ئێستا لە سەر کانییە، کاتێك ئەو خەڵکەم لەو حاڵەی دا دی، ئەوەندە بەخۆدا شکامەوە، کە نەموێرا چاو لە چاویان کەم. وەخت بوو لە شەرمان بمرم. پێمخۆشبوو عەرزەکە لە بن پێم قەڵشیباوە و قووتی دابام!

ـ لە هەڵە دای حەمەد! وانیە! ئەوان زۆریش هەستیان بە سەربەرزی دەکرد. نەتدی جلی چەند جوانیان دە بەر کردبوو و خۆیان رازاندبۆوە؟ سەرنجت نەدایە ژنەکان دەسماڵی پووڵەکەداریان بە سەریان دادابوو، کچەکان و ژنە جحێڵەکان دەسماڵی سوور و ژنە پیرەکانیش دەسماڵی سپی؟

حەمەد پیٚکەنی:

ـ بە راستی ئەوە شتێکی جێگای سەرنج و سەیرە!

ـ بەڵیٚ، هەر وایە!

کاتێك چوونەوە ژووری میوانان، دیتیان ژوورەکە پڕە لە خەڵك. وەلی دۆرانی گۆرانیبێژ سازەکەی بە دەستەوە بوو و چاوەڕوانی وان بوو. کاتێك حەمەد هاتە ژوور، هەموو خەڵکەکە یەکپیٚ لە بەری بڵێند بوون. حەمەد هێندەی شەرم کرد، نەیدەزانی چ بکا. باشە ئەو خەڵکە بۆ ئەویان هێندە پیٚ گرینگ بوو؟ بۆ هێندەیان رێز دەگرت؟ بۆچی وەك برای خۆیان و کوڕی خۆیان خۆشیان دەویست؟ هەر چی بیری دەکردەوە، وەڵامێکی بۆ ئەو پرسیارانە نەدەدۆزییەوە.

کاتێك هەموو لە جێی خۆیان دانیشتنەوە، گۆرانیبێژەکە سازەکەی بە سینگییەوە نا و بە دەنگێکی خەمبزوێن لە گەڵ نەوای سازەکەی دەستی بە گۆرانیگوتنیٚ کرد. دە گۆرانییەکەی دا باسی حەمەدۆکی دەکرد و پێیهەڵدەگوت. دەیکردە هەڵۆی چیا بەرزەکان و سەرهەنگ عەزمیشی دە قورەڕەشێوە دەبرد. هەر بەندێکی بۆ حەمەدی دادەنا و یەکیش بۆ سەرهەنگ عەزمی. حەمەد پاك بوو، جوان بوو، باش بوو و ئازا بوو و لە بەرامبەر دا سەرهەنگیش دڵڕەق بوو، ستەمکار بوو، ناحەز بوو...

حەمەد بەو گۆرانی‌یەی شێوابوو، شەرمی دەکرد و هەموو گیانی دە نارەقەی دا شەلاڵ ببوو. ناچار سەری بردە بن گوێی مەلا فەرهادی و بە سرتە گوتی:

ـ کاکە گیان، تۆخوا داوای لی‌بکە ئەو گۆرانی‌یەی نەلێ.

مەلا فەرهاد هیندێك دەنگی بەرز کردەوە و گوتی:

ـ کاك وەلی، پیاوی چاك بە چیدی ئەو گۆرانی‌یەی مەلێ! بڕوانە! نەتدیوە حەمەد چەندی نارەقە کردوە؟ حەمەد ئەو چەشنە پی‌هەلگوتنەی بە کەیفێ نیە...

وەلی دۆران بە نارەحەتی‌یەوە گوتی:

ـ ناتوانم بی‌بڕمەوە! ناتوانم! خۆ من نۆکەری بابی ئێوە نیم! ئەمن شایەرم و لە هەر شوێنێك چم پی‌خۆش بێ، ئەوەی دەڵێم! پێم‌خۆش بێ، دەتوانم شتی خراپیش بە حەمەدۆکەکەت بڵێم!

ـ دەزانم...

ـ کەس بۆی نیە خۆی دە کاری من هەڵقوتێنێ! حەمەدۆکیش بۆی نیە!

ـ بەڵێ، بی‌گومان...

ئەو قسانە حەمەدۆکیان هێندەی دیکە شێواند و ڕوخساری سوور هەڵگەڕا. ئەو جار مام ئەلیاس هەوڵی دا وەلی ڕازی بکا ئەو گۆرانی‌یەی نەڵێ:

ـ وەلی، لە بیرت بێ حەمەدۆك میوانە!

وەلی بە دەنگی بەرز گوتی:

ـ بە جەهەننەم میوانە!

پاشان چوو بۆ لای دەرگا و ویستی وەدەرکەوێ، بەڵام لە پڕ ڕاوەستا و گوتی:

ـ با ئەوەش بڵێم، ئەو حەمەدە هەر بستە منداڵێکە و هیچ وەك حەمەدۆکی ناچی! ئەوە نابێ حەمەدۆك بێ! خودا دەزانێ ئێستا حەمەدۆك لە کوێیە و لە گەڵ چ دوژمنێکی زاڵم شەڕ دەکا! وەڵلاهی سێ سێوان لە سەر یەك دانێی، بە قەد وەی دەبن. ئەگەر کەسێك کە لە سێ‌سێوان بەرزتر نەبێ، ببێتە حەمەدۆك، دەی ئەوە هەر کەس بۆخۆی حەمەدۆکێکە!

پاشان وەدەرکەوت. لە دەرێ هەر لە نێو بەفرێ دا ڕاوێچکەی دەکرد و لە بەر خۆیەوە دەی‌گوت:

ـ لە هەوەڵێوە هەر پێم‌وابوو ئەوە وەك حەمەدۆکی ناچێ! ئێستا ئەو شاخانە پڕن لە حەمەدۆك! هەموویان شێتن! ئاخر بستە منداڵێك چۆن دەتوانێ حەمەدۆك بێ؟ حەمەدۆك درێژ و بەخۆوەیە، دەڵێی حەزرەتی عەلی‌یە، ڕۆستەمی زاڵە، کوێرۆغڵیی قارەمانە! کەس ناتوانێ پێم‌بسەلمێنێ ئەوە حەمەدۆکە!

" حەمەدۆك هێزێکە دە سروشت دایە ــ پشتێنەکەی ناسنە. کاتێك دەڕوا، زەوی دەلەرزێتەوە ــ گوڵ لە خۆشیان دەپشکوون. لە بەر وی ئاو ڕادەوەستێ ــ هەڵۆ لە ئاسمانێ لەنگەر دەگرن. ئەسپی مردوو زیندوو دەبنەوە ــ چل سوارەی غەیبی و حەوت سالّحان دەیانبەنە لای خۆیان! خەری زیندە بە ڕیشی جوانی‌یەوە بە دوای دا دەڕوا ــ ئەو سواری ئەسپەکەی بووە و ــ بە سەر ئاوێ دا دەڕوا! لە پشت ئەو ڕەوەزە بنەوشی‌یانە ــ حەمەدۆك شەڕێ دەکا ــ سمێلی درێژن و شۆڕ بوونەوە. چاوە ڕەشە جوانەکانی ئاورینگیان لێ‌دەبێتەوە! ئەو نانی هەژارانە ــ هومێدی داماوانە! ئەو هەتیوە چلمنە کوێرەمووشەیە کوا دەتوانێ ئەو بێ؟ حەمەدۆك شێرە ــ سوڵتانی وڵاتی ئێمەیە! پیاوچاکە ــ ئینسانە ــ ئازاری بە مێروو و باڵندەش ناگا!

وەلی دۆران سەری بەردابۆوە. ملی ڕێیەی گرتبوو، هەر دەڕۆیی و لە بەرخۆیەوە دەی‌بۆلاند، هەتا گەیشتە گوندێکی دی. ئەو توورەبوونە وای‌لێ‌کرد بەرێوە گۆرانی‌یەکی گاڵتەی دروست کرد. لەو گۆرانی‌یەی دا گاڵتەی بەو حەمەدۆکە قەڵبانە دەکرد، کە بە هەموویان بە نینۆکێکی حەمەدۆکە ڕەسەن و گەورەکەی نەدەبوون. کاتێك گەیشتە مزگەوتی گوندەکەی دیکە، تەنانەت بێ‌ئەوەی سڵاوێش لەو کۆمەڵە خەڵکەی بکا، کە لە وێ بوون، سازەکەی دە باوەشی گرت و دەستی بە پێ‌هەڵگوتنی حەمەدۆکی کرد، حەمەدۆکە ڕەسەنەکە، ئەوەیان کە هەر ئێستا لە پشتەوەی ڕەوەزە بنەوشی‌یەکان شەڕی لە گەڵ دوژمنان دەکرد، ئەوەیان کە پشتوپەنای ستەم‌لێکراوان و هومێدی هەژاران بوو. لە گۆرانی‌یەکەی دا ئامۆژگاریی خەڵکی دەکرد، کە هەر کەس هات و گوتی ئەمن حەمەدۆکم، باوەڕی پێ‌نەکەن! باسی ئەوەشی کردبوو کە لە ماڵی نایب ئەلیاسی چاوی بە کابرایەکی کەڵەکباز، شەرمێون و خۆپارێز کەوتوە، کە خۆی لە لای خەڵکەکەی کردۆتە حەمەدۆك، بەڵام ئەوەندەی غیرەت نەبووە سەری هەڵێنێ و چاو لە خەڵکی ببڕێ. ئەو بەشێوەیەك لاسای دانیشتن، هەستان و قسەکردنی بە شەرمەوەی ئەو کابرایەی دەکردەوە، کە خەڵکەکە هەموو پێ‌دەکەنین... وەلی دۆران ئەوەندەی کەیف بەو گۆرانی‌یە تازەیەی دەهات، کە لەو دێیەش بەند نەبوو، تەنانەت چایەك، قاوەیەك، یان پارووە نانێکیشی نەخوارد، هەستا خۆی پێچایەوە و بەرەو دێیەکی دیکە وەڕێ‌کەوت. لەخۆشیی گۆرانی‌یەکەی وا دەڕۆیی دەت‌گوت باڵی لێ‌ڕواون، هەر دەڕۆیشت، لە بەرخۆیەوە نارەی دەهات و بەندەکانی گۆرانیەکەی زیاتر ڕاستەوپاستە دەکردن...

دوای ئەوەی وەلی ڕۆیی، نایب ئەلیاس بە حەمەدی گوت:

ــ کوڕم وەلی کوڕێکی بەستەزمانە، گوێی مەدەیە! ئەو بۆیە توورە بوو، چونکە پێی‌وابوو ئەتۆ وەك حەمەدۆکەکەی وی ناچی. بە ڕاستیش ئەتۆ زۆرت جیاوازی لە گەڵ ئەو حەمەدۆکە هەیە، کە ئەو لە بیری خۆی دا دەی‌بینێ! ئەو پێی‌خۆش نەبوو واز لە حەمەدۆکەکەی نێو خەیاڵی خۆی بێنێ و ئەتۆی لە جێگا دابنێ، هەربۆیەش قسەی مەلا فەرهادی بۆ بوو بە بیانوو و هەستا ڕۆیی...

حەمەد ئەوەی پێ سەیر نەبوو، هەربۆیە هێندێك لە بەر خۆیەوە پێکەنی و قسەی نەکرد.

ـ ببوورە کوڕم، خۆ دیارە ئەتۆ حەمەدۆکی، بەڵام لە دەروونی هەرکام لە ئێمە دا حەمەدۆکێکی تایبەتی هەیە و وەلیش یەکی خۆی هەیە...

حەمەد بزەیەکی هاتێ و گوتی:

ـ بۆخۆم دەزانم ئەمن وەك حەمەدۆکی ناچم.

ـ بەڵام بەو حاڵەش حەمەدۆکی. حەمەدۆك دەبێ لە گیان و دڵ دا جێبکاتەوە، دەنا کەس حەمەدۆکێکی هەر وا بۆ دروست نابێ!

حەمەد لە حاڵێك دا نەیدەزانی لە وەڵام دا چ بڵێ، گوتی:

ـ ڕەنگە وا بێ!

نایب ئەلیاس سێ ڕۆژی دیکەی لە لای خۆی ڕاگرتن. کرێوەکە لێیکردەوە، ڕۆژ وەدەرکەوت و لە شاخ و دۆڵ و بەرپالآنی دا. شۆقی ڕۆژێ لە سەر بەفری سپی وا دەبریقایەوە، پیاو چاوی بۆ هەڵنەدەهات. کاتێك حەمەد و هاوڕێیانی دەڕۆیشتن، خەڵکی دێیەکەی هەتا دەرەوەی دێی لە گەڵیان چوون و بەرێیان کردن. نایب ئەلیاس هەر یەکەو توورەکەیەکی کەتانی گوڵدۆزی کراوی بچکۆلەی دانێ:

ـ کچەکانم بۆ هەرکامتان ژێرکراس و ژێرپاتۆڵێکیان درووە و دەو توورەکانەیان ناون... دەیانگوت لەوانەیە لە شاخی بێننەوە و ئەو جلانەیان پێویست بێ.

پاشان لە حاڵێك دا چاوەکانی پڕ ببوون لە ئاو و ڕیشە سپییە درێژەکەی دەلەرزی، یەك بە یەك هەموویانی دە باوەش گرت. بزەیەکی لە سەر لێوان بوو، بەڵام هەر لەو بزەیە دا خەمێکی قووڵ بەدی دەکرا:

ـ وا هەیە پیاو دەڕوا و ناگەڕێتەوە، وا هەیە دەشگەڕێتەوە، بەڵام لە گەڵ خۆشەویستانی یەکتر نابیننەوە. گەردنمان ئازاد کەن کوڕینە!

ـ ئەتۆش هەر وا نایب ئەلیاس!

هەتا حەمەد و هاوڕێیانی ئەوەندە دوور نەکەوتنەوە، کە ئیدی وەك کۆمەڵە نوختەیەکی ڕەش لە نێو بەفری سپی دا دەهاتنە بەر چاو، هەموو خەڵکەکە هەر وا ڕاوەستابوون و تێیانەوە ڕامابوون.

مەلا فەرهاد گوتی:

ـ کاتێك دەبینم ئەو خەڵکە لە سەر ئێمە ئەو مەرەدەمیان بە سەر دێ، وەختە دڵم دەربێ، بەڵام...

دوای دەقیقەیەك بێدەنگی پاشماوەی قسەکەی دەربڕی:

ـ بەڵام ئەو بەزمە بەو زووانەش تەواو نابێ... ئەو خەڵکە داماوە...

ـ نایب ئەلیاس سەرهەنگ باهۆزی دەکوژێ. با ئێمە زووتر وەخۆ کەوین و ئەو زەحمەتەی نەدەینە بەر وی.

ـ ئەوەی قبوولّ نیە و بڕیاری داوە بۆخۆی بیکوژێ.

ـ ئاخر ئەو پیرە و دەستی هێندێك لەرز بوون. بڵێی ئەو کارەی پێبکرێ؟

ـ پێیدەکرێ.

ـ بەڵام ئەگەر تەقەی لێبکا و نەیئەنگێوێ، ئەو دەم دەیگرن و هەر لە وێ بە زیندوویی کەوڵی دەکەن!

ـ نا، نا، وا نابێ، دەی کوژێ و هیچ دەستیشی نالەرزێ.

ـ کوڕە بابە پیرەپیاوێکی ئاوا خۆ تفەنگیشی بۆ ڕاناگیرێ...

ـ بەڵام نایب ئەلیاس شتێکی دیکەیە، لە زۆر شەڕان دا بەشدار بووە، ئەویش شەڕی گەورە گەورە! لە بەفر و سەرمای ساریقامیش، دوملووپینار و بالکانێ، هەزاران کەس تێدا چوون، بەڵام ئەو بە ساغی دەرچووە... ئەوە بە هەڵکەوت نیە و نیشانەی ئەوەیە ئەو کابرایە ئازا و بەهێزە. وەك ڕۆژێم لێڕوونە باهۆزی دەکوژێ.

ـ بە پێچەوانەوە، من پێموایە بۆخۆی تێدا دەچێ!

ـ بۆخۆشی هەر ئەوەی دەوێ.

ڕۆژ لە سەر سەری حەمەدی سووڕا، ئاورینگە پۆڵایەکەی نێوچاوی تررووسکەی دا و بۆخۆشی تێکڕابوو:

ـ بۆ بۆخۆمان نەیکوژین؟

مەلا فەرهاد وەڵامی دایەوە:

ـ ئەو کات نایب ئەلیاس لە داخان دەمرێ، لە داخی ئەوەی دوای ئەو هەموو سووکایەتی‌یەی بە خۆی، بنەماڵەکەی و خەلکی دێیەکەی کراوە، نەیتوانیوە تۆڵەی خۆی بکاتەوە و بە دەستی خۆی بیکوژێ.

حەمەد چاوێکی لە پێش خۆی کرد و باوی هەنگاوی توند کرد. وا دەڕۆیی، هیچیان نەیدەگەیشتنێ. مەلا فەرهاد باسکی گرت و ڕایگرت. حەمەد دە بیرەوە ڕۆچووبوو و ئاگای لە دەوروبەری خۆی نەمابوو. گەیشتنە کۆمەڵە بەردێکی، بەردەکان بەشێکیان بە دەرەوە بوو. لە سەر بەردەکان دانیشتن. مەلا فەرهاد توورەکەکەی خۆی ـ ئەوەی مام ئەلیاس پێیدابوون ـ کردەوە. سابوونێك، کراس و دەرپێیەك و و دەسرەیەکی گوڵدۆزی کراوی جوانی تێدا بوو. توورەکەی هەمووان وەك یەك، هەموو ئەو شتانەی تێدا بوو.

مەلا فەرهاد گوتی:

ـ ئەو کچە بەستەزمانانە داخوا لە کەنگێوە ئەو پارچانەیان هەڵگرتوون و ئێستا بۆ ئێمەیان کردوونە کراس و دەرپێ؟

حەمەد گوتی:

ـ ئەدی ئێمە لە بەرامبەر دا چماندا‌ونیٚ؟ ماڵوێرانی و دەرد و ڕەنج؟ ئەمن نازانم...

مەلا فەرهاد گوتی:

ـ کاتێك گەیشتی‌یە تەمەنی من، تیٚدەگەی.

وەڕیٚکەوتنەوە و بەرەوژوور ڕێگاکەیان درێژە دا. دوای ماوەیەك لە خوارەوەی دۆڵێکی دا گوندێك دەرکەوت. مەلا فەرهاد گوتی:

ـ دەچینە ئەو دێیەی کە ناوی"حەوت برالان" ـەـ. ماڵی کوێخا مەستانی لە وێیە. خەڵکی ئەو گوندەی زۆر هەژارن. بەشێکی عەرزەکەی دێمەکاریٚکی بەرداوی و وشکە، بەشێکی زەلە و خەڵکەکە نانی شەوێشیان بە تەواوی نیە. گوندەکە یەك پیاوی گەورەشی تیٚدا نیە، هەموویان بردنە شەڕیٚ و یەکیشیان نەگەڕایەوە. پیرێژن، پیرەپیاو و کوڕوکچی مندالکار نەبیٚ، تێی‌دا نەماوە. مندالی چکۆنەشی کەم تیٚدان.

تەیموور گوتی:

ـ هەرچۆنێك بیٚ، دەبیٚ لە شوێنێکی بێنینەوە و خۆمان حەشار دەین. ئیستا ڕۆژە و دەزانین سەرهەنگ باهۆزیشمان بە گورهانێك ژاندەرمەوە بە دووەوە!

مەلا فەرهاد بڕیاری دا:

ـ کە وایە یالڵا کوڕینە با بڕۆین.

حەمەد هێشتا هەر لە خەیاڵ دا بوو و وەخۆ نەهاتبۆوە. شۆڕبوونەوە پاناوکێکی و پێش ئەوەی داگەڕێنە خواریٚ، لە سەر تەپکی، لە شوێنێکی پەنا، لە پەنا هێندێك دار و بەردی گەورە گەورە کۆبوونەوە و دانیشتن. هێندێکیان پنچکیان بە دووی خۆ دا کێشابوون و بەو شێوەیە شوێنەکانیان پڕ ببوونەوە. هەر وا کە تەنیشتیان بە تەنیشتی یەکەوە دابوو و دانیشتبوون، دیسان هەموویان توورەکەکانیان کردنەوە و چاویان بە دیاری‌یەکانیان دا خشاندەوە. ئەو دیاری‌یانە بۆ وان زۆر بە نرخ بوون. حەمەد دەسرۆکەکەی دەرێنا، بردی‌یە بەر دەمی، بۆنەکەی هەڵمیسی و بە دەموچاوی دا هێنا. هەر لەو حاڵەش دا دیسان لە بەر خۆیەوە دووپاتی کردەوە، ئێمە چمان بۆ کردوون؟ بێجگە لە کوێرەوەری و ڕەنج چمان بۆ بە دیاری هێناون؟ لە سەریەك ئەو قسانەی دووپات دەکردنەوە و لە خۆی دەپرسی، بە ڕاستی ئێمە چ بکەین؟ ئەمن دەبیٚ چ بکەم؟ مردن شتێکی ئەوەندە قورس نیە و بەرەنگاربوونەوە لە گەڵ مەرگیش زۆر دژوار نیە. ئینسان گیانێکی هەیە و هەر جارێك دەمریٚ. گوللەیەکت ویٚکەویٚ، تەواوە. بەڵام ئەوە زەحمەتە کە پیاو بزانیٚ دەبیٚ چۆن بڕیار بدا و چ بکا... وەڕیٚکەوتنەوە. هیچیان قسەیان نەدەکرد. پێش ئەوەی بگەنە نێو دێ، تووشی منداڵێکی بوون.

ــ کاك مەستان ناردوومی. گوندەکە پڕە لە ژاندەرمە. باهۆزیش لە وێیە. وە دووم کەون، دەتانبەمە حەشارگەیەکی باش. کاك مەستانیش بۆخۆی لای نیوەشەوێ دێتە لاتان. ژاندەرمە هێندەیان لێداوە شڕیان کردوە. هەموو خەڵکی گوندەکەیان دە جێیە خستووە. منداڵی شیرەخۆرەشیان نەپاراستوە! ئەمن خۆم شاردبۆوە و هێشتا نەیاندیوم. بەو حاڵەش خەڵکەکە ناچارن چێشتی باشیان بۆ دروست بکەن و ئەو هەموو ژاندەرمەی بەخێو بکەن. ئێمە بۆخۆمان برسین، جا وەرە ئەوانەشت وەسەر گەڕێن... بزنیان نەهێشتن، هەموویان کوشتنەوە. کاریلەکانیشتیان هەر کوشتنەوە. قەل، مریشك... هیچی نەما... کاك مەستان لای نیوەشەوێ دێتە لاتان.

کوڕەکە وەپێشیان کەوت، بە پەنا دار و بەردان دا، بردنییە کۆخێکی. کۆخەکە لە نێو دۆڵێکی بەرامبەر بە دێی هەڵکەوتبوو. دەسبەجێ ئاگرێکی باشیان لە ئاورگی کۆخەکەی دا کردەوە. نایب ئەلیاس نانوپێخۆرێکی زۆری بۆ پێچابوونەوە و گۆشتی وشکیشی بۆ تێ‌نابوون. هێندێك گۆشتیان برژاند و پاشان نانیان دانا. کوڕەکە زۆر برسی بوو، هەر دەیخوارد و دەیگوت:

ــ ئەو شتە خۆشانەتان لە کوێ پەیدا کردوون؟

مەلا فەرهاد پێکەنی و گوتی:

ــ خودای گەورەی ئێمە گەیاندوویەتی، کوڕم، گوێ مەدەیە و تێر بخۆ!

ــ وا دیارە خودا گەورەکەی ئێوە زۆر دەست و دڵاواڵەیە! ئی ئێمە قەت شتی ئاوامان ناداتێ... ئێوە مادام خودایەکی ئاواتان هەیە، پێویست ناکا نە لەم دنیایە و نە لە دنیای دیکە خەمتان هەبێ! بە ڕاستی خودای ئێوە خودای چاکە!

مەلا فەرهاد گوتی:

ــ بەڵێ، وایە، زۆر خودای چاکە!

ــ ئاخر خوداکەی ئێمە زۆر نەدارە، پێموایە لە خۆشمان نەدارترە!

ــ دەبێ شتێکی هەر هەبێ!

کوڕەکە بە پەلە گوتی:

ــ داوای لێبووردنی لێبکە! چۆن؟ ئەگەر شتێکی هەبوایە، بێگومان دەیداینێ!

ــ خەمت نەبێ، ڕۆژێکی دەتانداتێ.

ــ قەت نامانداتێ...

بەو شێوەیە مەلافەرهادو کوڕەکە ماوەیەك باس و کێشەیان بوو و حەمەد و هاوڕێیانی دیکەشی تێر پێکەنین. دە ئاخری دا کوڕەکە باسەکەی گۆڕی :

ـ با لە وەی گەڕێین. شتێکی دی، ئەمن دەزانم کێهەتان حەمەدۆکە!
مەلا فەرهاد پێکەنی و گوتی:
ـ دە پێمبڵێ بزانم کێهەیان، شەیتان!
ـ پێم مەڵێ شەیتان. یەکی وەك تۆ، بەو ڕیش و تەمەنەوە بۆ شەیتان دەبێ، نەك ئەمن!
ـ ببوورە کوڕم، مەبەستم ئەوە نەبوو قسەت پێبڵێم، گاڵتەم لە گەڵ کردی!
ـ زۆر باشە!
پاشان کوڕەکە دەستی بۆ لای حەمەدۆکی ڕاداشت و گوتی:
ـ ئەوە حەمەدۆکە!
ـ چۆنت زانی؟
ـ چونکە هەر بێدەنگ بوو و هیچی نەدەگوت.
ـ باشە، ئەوەی بێدەنگ بێ، دەبێ ئینسانێکی تایبەتی بێ؟
ـ ئینسانی بێدەنگ... کوڕە چووزانم، دایکم وای دەگوت. دەیگوت... بەڵام قسەکەم لەبیر چۆتەوە. ئەمن هەر بۆخۆم هەستم کرد ئەوە حەمەدۆکە.
مەلا فەرهاد دەستی بە قژە زەردەکانی دا هێنا و گوتی:
ـ باشە!
کوڕەکە ئەوەی زۆر پێخۆش بوو و گوتی:
ـ ئەتۆ لەوانی دی زیاتر قسە دەکەی، بەڵام دیارە پیاوی چاکی. ڕیشت زۆر درێژە، بەڵام چاوەکانت پڕن لە میهرەبانی. دەزانی ڕدێندرێژ؟ ئەمنیش پێمخۆشە کاتێك گەورە بووم وەك تۆ ببمە چەتە! ئەو کات خوا میهرەبانەکەی ئێوە شتی ئاوا خۆشم دەداتێ، ئەمنیش بە کەیفی خۆم دەخۆم!
ـ هەمیشە شتی ئاوا خۆشمان ناداتێ.
ـ هەنگوین؟ هەنگوینتان ناداتێ؟ ئەمن هەر جارێکم هەنگوین خواردوە. کەوچکێکی پڕم خوارد. دزیم. خودای ئێمە هەنگوینمان ناداتێ، دەبێ بۆخۆمان بدزین. بەڵام دوایە، ئەوەی هەنگوینەکەم لێدزیبوو زانی و هێندەی لێدام هەمووم هێناوە! مێشەکانیشی بە هەموو گیانیانەوە دام! هەموو گیانم وەك دەهۆڵی هەڵمسا. بە قەد تۆ قەڵەو و ئەستوور ببووم. خەڵك لێمدەترسان. پێمهوایە خوداکەی ئێوە هەنگوینم دەداتێ...
ـ باوەڕ ناکەم.
ـ دەیدا بە ئێوە؟

ـ هێندێك جار.

ـ باشە، چونکەئەمن مندالّم، دەبێ بیدا بە من، وا نیە؟

کورەکە هێندێك ئالّۆز بوو، خەمێك لە دەنگی دا هەست پێدەکرا. ڕوخساری کە تا ئێستا لە خۆشیان دەدرەوشایەوە، وەك ئەوەی لە پڕ ئاسمانی بە سەر دا ڕووخابێ، تێكچوو و ڕەشهەلّگەڕا. مەلا فەرهاد بە وەی ناڕەحەت بوو:

ـ دەزانی چیە؟ با بلّێم، ئینسان نازانێ چۆن دەبێ... ئەتۆ وا دیارە کوڕێکی ژیر و وریای. کە وا بوو لەوانەیە بتداتێ.

چاوی کوڕەکەی درەوشانەوە:

ـ هەرکەس باش بێ، خودا هەنگوینی دەداتێ. دایکم هەمیشە دەلّێ کوڕم ئەتۆ باشی، دلّێکت هەیە لە زێڕی دروست کراوە.

ـ ئەگەر وا بێ، خەمت نەبێ، خوا هەنگوینت زۆر دەداتێ. نەبی بە چەتەش، هەر دەتداتێ! هێندەت دەداتێ، بە سێشەو و ڕۆژان بۆت نەخورێ!

ـ بەلّێنم پێدەدەی وا بێ؟ دەزانم ئەتۆ پیاوێکی گەورەی، دلّنیام مەلایەکی گەورەشی! بەلّێنم پێبدە!

ـ بەلّێنت پێدەدەم...

لەو کاتە دا کەلّەبابی نیوەشەوێ خوێندیان. حاجی لە کۆخەکەی چووە دەرێ و لە شاهێنی کە کێشکی دەکێشا، پرسی:

ـ کەست نەدیوە بۆ لای ئێرە بێ؟

ـ نا، تا ئێستا کەسم نەدیوە.

مەلا فەرهاد گوتی

ـ مەستان نەهات، نیگەرانم!

کوڕەکە گوتی:

ـ مەترسە، ئەو پیاوێکی زۆر نازایە. هەربینا پەیدا بوو. لە ژاندەرمەش ناترسێ. زۆر پیاوی چاکە! دەلّێن پیاوی دێی هەموو بەرێکرابوون بۆ شەڕێ، ئەو نەبێ، هیچیان نەهاتوونەوە. ئەوەندە ئاقلّە هەر چاو لە کەسێکی بکا، دەزانێ بیر لە چی دەکاتەوە. نیگەران مەبن، ئێستا پەیدا دەبێ.

ـ باشە، ئەتۆش ئەگەر لە کەسێکی ورد بیەوە، دەزانی چیی دە دلّی دایە؟

ـ بەڵێ، لە کاك مەستانیش چاتر دەزانم!

ـ باشە دەی، بۆمان باس بکە...

ـ گوێت لێبێ، خودا هێندەم هەنگوین دەداتێ، بە سێ شەو و ڕۆژان بۆم تەواو نابێ، بەشی دایکیشم دەدەم، هەر تەواو نابێ. بابم لە گرتووخانەیە، بەشی ویش دەنێرم. دەزانی بۆ گیراوە؟ ئاخر بابم ئەسپدزە. پیاوێکی زۆر بە دەستوبردیشە، تەمەنی زۆر نیە، زۆر لە خۆم گەورەتر نیە، هەر بە قەد ئەو حەمەدۆکەی دەبێ. هەموو جارێ ژاندەرمان دەیگرن و دە گرتووخانەی دەکەن. ماوەیەك دە وێ دا دەبێ، دوایە دێتە دەر و دیسان ئەسپێکی دیکە دەدزێ. سەر لە نوێ دەیگرنەوە دەیبەنە شاری و دە گرتووخانەی دەکەنەوە. هەڵیشدەکەوێ کە دوای ئەوەی بەردەبێ، ئەسپێکی دەدزێ و پێش ئەوەی بیگرنەوە دەیفرۆشێ و زۆرم شت بۆ دەکڕێ! دایکم هەمیشە دەڵێ بابم بەختی نیە، چونکە هەموو جارێ خودا کارێکی وا دەکا پێیبزانن و بیگرن...

پاشان کوڕەکە سەری بەرداوە و چاوە شینە جوانەکانی لیڵ بوون:

ـ بەڵێ خوای ئێمە ئاوایە. زۆری خۆشناوێین! خوایە گیان تۆبە، بمبوورە...

شەوێکی چوومە زگ خەڵێفە مێشەکانی ئەو کابرایەی بۆم باسکردن. باران دەباری، تاریك بوو و ئەمن بە حاڵەحاڵ پێش خۆم دەدی، بەڵا بەو شەوە تاریکەی خوا وای کرد مێشەکان دیتیانم و پێیانەوە دام، دوایەش وای کرد کە کابرا دۆزیمیەوە و گرتمی. بەڵێ وا دیارە بە ڕاستی ئێمەی خۆشناوێ و تووشمان دەکا... هەر کاتێك خوای ئێوە هەنگوینی دامێ، دەچم سەری بابم دەدەم و بەشی خۆی بۆ دەبەم. ئەویش زۆری پێخۆش دەبێ، قاپەهەنگوینەکەی بە سەرییەوە دەنێ و دەست، سەروسەکوت و سمێڵی هەمووی شیلاوی دەبن! ئاخر سمێڵی بابم زۆر گەورەن...

مەلا ئەرهاد گوتی:

ـ باشە، پێم بڵێ بزانم ناوت چییە؟

کوڕەکە چاوی لە حەمەدی کرد و پێکەنی:

ـ ئەوە ناوی چییە، ئی منیش هەر ئەوەیە...

ـ ناوت حەمەدە؟ ئێستا ئەو ناوەت لە خۆت نا؟

ـ ئێستا؟ نا، نا، شتی وا نیە! باپیرم کە لە شەڕێ بووە و نەگەڕاوەتەوە، ناوی حەمەد بووە و ئەمنیان بە ناوی وی کردوە. بەڵام با بۆتان بگێڕمەوە. کوڕی ئەو دێیەی هەموو ناویان حەمەدە. ژاندەرمان گرتیانن، هێندیان بە داران لە لاقان دان، هەموویان شەلوکوت کردن و ئاخرەکەی ناچار بوون ناوەکەی پێشوویان بڵێن. تەنانەت ئەوانەی وەك من هەر لە هەوەڵێوە

ناویان حەمەد بووە، ناچار بوون، ناوی خۆیان بگۆڕن. چی دیکەشیان پیٚنەدەکرا، چونکە دەستیان لیٚهەلٚنەدەگرتن و دەیانکوشتن. بەلاٚم قەیدیٚ ناکا، دوایە هەموویان دەبنەوە حەمەد!

پاشان ڕووی دە حەمەدی کرد:

ـ خۆ ئەتۆ ناوی خۆت نەگۆڕیوە؟

ـ نا.

ـ دەسخۆش، خوا بتپاریٚزیٚ! ئەتۆ نازای، دەزانم قەت ناوی خۆت ناگۆڕی! دیارە ئەگەر بشتگرن... ئەگەر بتگرن، لە دارت دەدەن... بەلاٚم خۆ ناوی خۆت هەر ناگۆڕی، وا نیە؟

ـ قەت نایگۆڕم.

ـ ئەمنیش قەتی ناگۆڕم! لە داریشم دەن، نایگۆڕم! بە زیندوویش کەوڵم کەن، هەر نایگۆڕم!

ـ زۆر باشە...

ـ ئەوانە سەیرن... هەر کەس چی پیٚخۆشە، با ناوی ئەوە بیٚ! تەنانەت ئەگەر لە هەوەلٚیٚشەوە ناوم حەمەد نەبوایە و دواتر وەك ئەو خەلٚکەی دیکە ئەو ناوەم لە خۆم نابا، دیسان هەر قەت نەمدەگۆڕی.

ـ ئافەرین، زۆر زۆر باشە.

کوڕەکە سەرنجی دا چەتەکان، زانی هەموو خەویان دی. هەر بۆیە گوتی:

ـ دەبوو ئیٚوە هیٚندیٚك بنوون! ئیٚوە زۆر بە ڕیٚیە دا هاتوون. ژاندەرمەشتان هەر بە دووەوەن و ئەوەش ماندووترتان دەکا. شوکور تا ئیٚستا زەفەریان پیٚنەبردوون و ئیشالٚلاٚ لەمەودواش هەر وادەبیٚ. بەلاٚم ئەگەر ڕۆژیٚك خوای نەخواستە بتانگرن، لاقتان دەشکیٚنن و هیٚندەتان لیٚدەدەن، هەموو گیانتان خویٚنی لیٚبتکیٚ. ئەوەش ـ قامکی بۆ حەمەدی ڕاداشت ـ ئەوەی لە دار دەدەن، زۆریش حەیف دەبیٚ! زۆرم بەزەیی پیٚتان دا دیٚ! دە تۆ خوا ئیٚوە بخەون و من کیٚشکتان لیٚدەکیٚشم.

هەموویان نوستن و حەمەدە چکۆلەش کیٚشکی لیٚدەکیٚشان، دوای ماوەیەك دەنگی تەقەی تفەنگان، لە خوارەوە، لە نیٚو دۆلٚیٚ ڕا هات. ئەو کات حەمەدە چکۆل بانگی کردن:

ـ هەستن!

هەموو یەکجیٚ ڕاست بوونەوە. مەلا فەرهاد بە کوڕەکەی گوت:

ـ حەمەد گیان ئەتۆ زوو لیٚرە دوورر بەوە! ئیٚمە دەچین سەر ئەو تەپکانە دەگرین، لەوانەیە تووشی شەڕیٚ بین و ئەتۆش وەبەر بیٚی!

کوڕەکە لیٚبڕاوانە گوتی:

ـ بشمکوژن، لێرە ناڕۆم!

ـ بۆچی کوڕم؟

ـ کاک مەستان گوتوویەتی ئێوە بەجێ‌نەهێڵم. پێی‌گوتم ئەگەر ژاندەرمان بتگرن، لەوانەیە لاقت بشکێنن، هەموو گیانت بریندار کەن و خوێت دە برینەکان کەن، بۆ ئەوەی جێگای چەتەکان ئاشکرا کەی. بەڵام ئەمن بەڵێنم پێ‌دا کە ئەگەر بە زیندوویی کەوڵم کەن و بمکوژن، هیچ نەدرکێنم و حەشارگەی ئێوە، یانی ئێرە، ئاشکرا نەکەم... کاک مەستان قەولی پێ‌داوم ئەگەر گەورە بووم ژنم بۆ بێنێ و بۆخۆی داوەتەکەم بۆ ساز کا...

ـ ڕۆڵەگیان، هەستە بڕۆ!

ـ نەخێر!

ـ وەختی ئەو قسانە نیە، هەستە زوو بە! دوایە دەرناچی!

تەقەکە نێزیک بۆوە. کوڕەکە ڕای کرد، دەستی حەمەدۆکی گرت و گوتی:

ـ پیاوی چاک بە، ئێوە ئەم ناوچەیە بەڵەد نین. هەوا زۆر تاریکە و ئێوە نازانن بە کوێ دا بڕۆن. ئەمن دەتوانم بتانبەمە شوێنێکی کە باهۆز و عەلی‌کەرتیش هەر قەتی ڕێ تێ‌نەبەن. بێ‌گومان کاک مەستان دە داو کەوتوە. لە وانەیە کوژرابێش. چونکە ئەو پیاوێك نیە لە قەول و بەڵێنی خۆی لابدا... لێم تێ‌گەیشتی حەمەدۆك؟

حەمەدۆك وەڵامی دایەوە:

ـ بەڵێ، زۆر باشە، وەپێش کەوە و ڕێمان نیشان دە!

لە کۆخەکەی هاتنە دەرێ و بە دوای حەمەدە چکۆلی دا ڕۆیشتن. کوڕەکە زۆر چوست و چالاك بوو، دەت‌گوت کەوە، لەو بەردی بازی دەدا بۆ ئەم بەرد و بەو شێوەیە ئەوانیشی بە دوای خۆی دا دەکێشا.

بەفرەکە لە بن پێیان خرمەی دەهات و شەبەقێکی کزی لێ‌دەبۆوە. لە چۆمێکی پەڕینەوە، گەیشتنە دارستانێکی، کە لە دارستانەکەش تێ‌پەڕین، لە شاخێکیان دا و گیشتنە هیندێك ڕەوەزی سەخت. حەمەدە چکۆلەکە بە باریکە ڕێگایەکی سەخت دا وەسەری خستنە سەر شاخەکەی. گەیشتنە نێو کۆمەڵە کاول و دیوارێکی ڕووخاو، وا دیار بوو ئەو شوێنە پاشماوەی شوێنەوارێکی کۆن بوو.

کوڕەکە کە دەت‌گوت سێبەرە لە پێشیان دەڕوا، گوتی:

ـ ئەوە گەیشتینێ! ئەوە "قەرەقەڵا" یان با بڵێین قەڵای ڕەشە...

ڕاوەستان هەتا هەموو گەیشتنێ. کوڕەکە گوتی:

ـ ئێستاش خانوێکی هێندێك ساغی تیّدا ماوە. ئەوەتا! ئەو کۆنەقەلاّیە پڕە لە مار، بەلاّم مارەکان دە زستانیّ دا ون دەبن. ڕاوەستن، کە چووینە ژووریّ، ئاگرێکی دەکەمەوە... دەنکە شەمچەتان پێن؟ ئێرە چەند ساردە! خۆ لە تاریکایی ناترسن؟ نا! ئاخر ئێوە چەتەن، وا نیە؟

مەلا فەرهاد گوتی:

ـ وایە، ئێمە چەتەین!

مەلا فەرهاد زۆری ئەو کوڕە خۆشویست. هەستی کرد کاتێك قسە لە گەلّ وی دەکا، بۆخۆشی دەبێتەوە منداڵ و کەیفی بە وەی دەهات. کوڕەکە گوتی:

ـ پرسیارێکی قۆڕم کرد، ها؟ ئاخر ئێوە ئەگەر لە تاریکایی ترسابان، چۆن دەبوون بە چەتە؟ بۆ دەبیّ بترسن؟ تاریکە، با تاریك بیّ، چی‌یە! بێجگە لە وەش ئێوە ئەو تفەنگە درێژانەتان پێن! بەلاّم دەزانن بۆ وام گوت؟ ئاخر بە شەو ئێرە زۆری جندۆکە لێن! کە ڕۆژ دەبێتەوە، نامێنن و شەویّ دیسان دێنەوە! ئێرە قەلاّی پاشای جندۆکانە. قەلاّکەی وی سەرپاکی شووشەیە، بەلاّم ئێمە نای‌بینین، هەروەك جندۆکەکانیش نابینین، هەرچەند هەم قەلاّکە هەیە و هەم جندۆکەکانیش هەن. ئێوەی چەتە لە جندۆکانیش ناترسن، وایە؟

ـ وایە، چەتە چۆن لە جندۆکەی دەترسیّ؟

ـ ئەو جار پیاو دوعای بخوێنیّ، بیسمیللایە بکا و ناوی خوای بێنیّ، هەموو جندۆکەکان هەڵدێن، وایە ئیدی؟

ـ بیّ‌گومان.

منداڵەکە لە بەرامبەر مەلا فەرهادی ڕاوەستا و لە بەری پێی ڕا هەتا تەپڵی سەری تێی‌هەڵڕوانی:

ـ ئەتۆ ڕیشت هەیە، ڕیشێکی ئاوا درێژ. چەتەشی، بەلاّم بەو ڕدێنەت ڕا دەزانم مەلای. مەلای چەتانی. ئەمن دەچمە نێو قەلاّکەی، بەلاّم لە پێش دا ئەتۆ دوعایەکی بخوێنە با هەموو جندۆکەکان هەڵێن... دوعای وا دەزانی؟

ـ ئەیچۆن؟ دەزانم.

ـ گوناهیشە! چونکە ئێرە ماڵی وانە. ئێستا دە نێو جێگا گەرمەکانیان دا نوستوون، دەبیّ ڕا کەن، بڕۆنە دەریّ و دەرێش زۆر ساردە. بەلاّم ئێمە چارەیەکمان نیە. ئەچینە ژوری، سەرما دەمانبا. وایە؟

ـ وایە، زۆر ساردە.

ـ دەی دوعاکەی بخوێنە...

مەلا فەرهاد کوڕەکەی هەڵێنا، بە سینگی خۆیەوە گوشی، ماچی کرد و دای‌نایەوە. کوڕەکەگوتی:

ـ دەی دوعاکەی بخوێنە.

ــ دەی خوێنم، بەڵام با حاجیش لە گەڵت بێ.

ــ منیش پێموایە باشترە ئەویش بێ. ڕەنگە جندۆکەکان بە دوعاکەی ناڕەحەت و تاڵۆز بن...

دەسبەجێ هێندێك چیلکەوچاڵی وشکی لە نێو دیوارە ڕووخاوەکا ن کۆ کردەوە، دە بن هەنگڵی نان و چوو لە بەر دەرگای ژوورەکەی ڕاوەستا:

ــ حاجی، کوای؟ دە وەرە ئیدی.

حاجیی وە پێش خست و بۆخۆی دوای وی چووە ژوورێ. هێندەی پێ‌نەچوو ڕووناکایی‌یەکی کز لە نێو ژوورێ وەدەرکەوت و حەمەدە چکۆل هاتە دەرێ.

ــ ئەو جار وەرنە ژوورێ چەتەکان. ئەوە ئاورم بۆ کردوونەوە. ئێستا ئەو ژوورەی وا گەرم دا دەێنم، وەك حەمامێی لێ‌دەکەم. جندۆکەکانیش ڕۆیشتوون. پێموایە بە دوعای ئەو کابرا ڕدێندرێژەی هەڵاتوون. دەڵێن ئەگەر دوعات خوێند، ئیدی جندۆکە هیچیان پێ‌ناکرێ. بە تایبەت ئەگەر دوعاکە مەلایەکی ڕیشدرێژ بیخوێنێ، ئیدی هەر خۆ ناگرن...

هەموو چوونە ژوورێ و لە دەوری ئاورەکەی کۆ بوونەوە. ئاورگەکە خۆڵەمێشی کۆنی تێ‌دا بوو، میچی ژوورەکەی قورماوی بوو، دیوارەکانی بە دووکەڵێ ڕەش هەڵگەڕابوون و وا دیار بوو زۆر جاری دیکەش ئاوری تێ‌دا کراوەتەوە. نێو ژوورێش زۆر سارد بوو. کوڕەکە گوتی:

ــ خەمتان نەبێ، هەر ئێستا دەگەڕێمەوە. دەزانم جندۆکەکان هەڵاتوون، ئەگەر بشگەڕێنەوە، لێیان ناترسین، ئەوەتا ئێوە هەمووتان تفەنگتان پێن، هەرچەند دەڵێن گوللە کار لە جندۆکان ناکا...

ڕای کردە دەرێ و زۆری پێ‌نەچوو هاتەوە، دارێکی وشکی گەورەشی بە دوای خۆی دا دەکێشا، کە وا دیار بوو لە نێو دیوارە ڕووخاوەکان دا دۆزیبوویەوە و هێنابووی.

ــ هیوادارم زۆر نەترسابن!

ئەوەندەی گوت و دیسان چۆوە دەرێ.

دە ماوەی نیو سەعات دا سێ ــ چوار باوەش داری دیکەشی کۆ کردەوە، هێنانی و لە سەریەك لە پەنا ئاورەکەی ڕۆی کردن:

ــ ئەو جار ئیدی ئاورەکەمان خۆش دەبێ...

دارەکانیان لەتوپەت کردن و نە سەر ئاورەکەیان دانان، وردە وردە ئاوردووەکە گرتی، بڵێسەی ئاورەکە هەموو ژوورەکەی ڕووناك کرد و ژوورەکە بە تەواوی گەرم داهات. کوڕەکە لە تەنیشت مەلا فەرهادی دانیشتبوو و دەست و لاقی بۆ لای ئاگرەکەی درێژ کردبوو. لە بەر شۆقی ئاورەکەی چاویان بە لاقی کەوت. کوڕەکە کەوشی دە پێ دا نەبوون:

مەلا فەرهاد گوتی:

ـ ئەوە خۆ کەوشت دە پێ دا نین؟

ـ منداڵی ئەو دێیەی هیچیان کەوشیان دە پێدا نین، ژنەکانیش...

ـ ئەدی لاقتان سەرما نایبا؟

ـ سەرماش بیبا، چارەیەکمان نیە، کاکە، نەداری دەردێکی گرانە! بەڵام دەربەستی من مەبن، ڕاهاتووم. بڵێین چی، چارەنووسی ئێمە ئاوایە ئیدی. دەڵێن باپیری من، ئەوەی ناوی حەمەد بووە، ئەسپدزێکی زۆر زیرەك و تەڕدەست بووە. دەڵێن ئەسپی بە خەڵکی گوندە چەرکەسی‌یەکانی ئوزوم ئایلای نەهێشتبوو. هەموو جارێش کە ئەسپێکی دەدزی و دەیفرۆشت، لە ماڕاشێ، تەنەکەیەك هەنگوین و جووتێك کەوشی دەکڕی و بۆ بابی دەهێنا...

پاشان سەری بەردایەوە و گوتی:

ـ بابم وەك وی زیرەك و ئازا نیە. دزی‌یەکەی دەکا، بەڵام هەموو جارێ دەگیرێ. جا ئەگەر هەموو جارێش بگیرێ، ئەوە قازانجی چی‌یە... بۆخۆم بە تەمام ببمە دزێکی تەڕدەست و چالاکی وەك باپیرم. ئەو کات نایەڵم بابم چیدی ئەو کارەی بکا و دەیحەسێنمەوە. دیارە پێش وەی ئێوە ببینم، نیازم وا بوو ببمە چەتە، بەڵام ئێستا پەشیمان بوومەوە...

ـ بۆچی؟

ـ ئەوە ژیان نیە ئێوە هەتانە. شەو و ڕۆژ هەر ڕا دەکەن و لە هیچ شوێنێکی بە تەواوی ناحەسێنەوە. باشە ئەوە سوودی چی‌یە؟ ئەو کابرایە، ئەوەی پێی‌دەڵێن باهۆز، ئاخرەکەی دە داوتان دەخا و دەتانکوژێ!

مەلا فەرهاد گوتی:

ـ بۆخۆشمان دەزانین وایە.

ـ بەڵێ، ئەوە زۆر ڕوونە. بەڵام من شتێکی دیکەم لە دڵ دایە و دەمەویست لێت بپرسم...

ـ بیڵێ...

ـ دەزانی... ئەو حەمەدە، حەمەدۆك...

دەستی بۆ لای وی ڕاداشت:

ـ دەڵێم پیاو دەبێ چ بکا، هەتا ببێتە یاغی‌یەکی وەك ئەوەی؟ دەزانی بۆ ئەو پرسیارەی دەکەم؟ ئاخر کاتێك ژاندەرمە بە دێی وەربوون، ورد و درشتی ئەو دێیەیان لە سەر ئەو حەمەدەی شەلوکوت کرد و دە جێیەیان خستن، بەڵام سەیر ئەوە بوو هیچکەس لێی ناڕەحەت

نەبوو، تووك و نزایان لیّ نەکرد و بە پێچەوانەوە هەر خۆیان بە قوربان دەکرد و تاریفیان دەکرد.

پاشان سەری بەردایەوە، هێندێك مات بوو، دە بیرەوە چوو و سوور هەڵگەڕا. سەرەنجام قاقایەکی کێشا و گوتی:

ـ باشە ئەگەر خەڵکەکە حەمەدۆکی ببینن و بزانن هەر کەمێك لە من گەورەترە... بڵێی چ بڵێن؟

ئەو جار قامکی دە زاری نا وساتێك بیّدەنگ بۆو.

ـ دە پێم بڵێن، بڵێی ئەو کات چ ڕوو بدا؟

یەك بە یەك چاوی بە هەمووان دا گێڕا، پاشان هەر بۆخۆی وەڵامی دایەوە:

ـ نە هیچ دەقەومیّ و نە هیچیش دەڵێن. بۆچی؟ چونکە پیاوەتی و ئازایەتی خۆ بە قەد و قەڵافەت نیە. ئەو دێیەی ئێمە منداڵی وای تیّدان بە قەد ئەوەی(دەستی بۆ لای قاسمی ڕاداشت) دەبن، بەڵام لە من دەترسن. ڕەنگە خەڵکی دێیەکەی، هەوەڵیّ باوەڕ نەکەن ئەوە حەمەدۆکە، بەڵام کە ئەمن سوێندم بۆ خواردن، گومانیان نامێنیّ کە ئەوە هەوە. ئێستا وا چاکە ئێوە بنوون. ئێوەی بەستەزمان زۆر ماندوون. دەزانم چەند ڕۆژە نەسرەوتوون و هەر جێگۆڕکێتان کردوە. خەمیشتان نەبیّ، ئاگرەکەمان لە دەرێوە دیار نیە، چونکە دیوارێکی گەورەمان لە پێشە. باپیرم ئەو ئەسپانەی دزیونی، هێناونی‌یە ئێرە. دیارە خەڵکی دێیەکەش زانیویانە، بەڵام کەس دەنگی نەکردوە. نازانم بۆ ئەو خەڵکە بۆ بابم وا نین؟ ئەو بیّ‌تەنوایە هەر دزی‌یەکەی دەکا، دەسبەجیّ ڕاپۆرتی لیّدەدەن و بە ژاندەرمانی بە گرت دەدەن... ئێوە دەربەست مەبن، خەڵکی دێی نازانن لێرەن و بشزانن جێگاکەتان بە ژاندەرمان ناڵێن.

ئەو جار کوڕەکە چوو لە لای حەمەدۆکی دانیشت و قۆڵی گرت:

ـ هێندێکم لیّ وەرە پێشیّ...

لەو ساتە دا هێندێك دڵەڕاوکێی بە ڕوخساری‌یەوە دیار بوو. مژۆڵەکانی کە بە قەدەر مژۆڵی ئەسپێکی درێژ بوون، دەلەرزین. حەمەدۆك تەکانێکی دا خۆی و لیی‌نێزیکتر بۆوە. کوڕەکە سەری بردە بن گوێی و گوتی:

ـ ئەریّ ئەتۆ ناتوانیّ ئەو باهۆزەی بکوژی؟ بە قوربانت بم، بۆ ئەو بەڵایەی لە کۆڵ ئەو خەڵکەی ناکەیەوە؟ دەزانی چیی بە سەر ئەو دێیانە هێناوە؟ دەزانم ئاخرەکەی دەی‌کوژی، وایە؟

حەمەدیش سەری بردە بن گوێی و گوتی:

ـ باشە دەی‌کوژم.

ـ سوێندم بۆ بخۆ!

حەمەد وەڵامی نەدایەوە. کوڕەکە دووپاتی کردەوە:

ـ سوێندێ دەخۆی؟

حەمەد هەر وا بێدەنگ بوو.

ـ کاکە گیان، بۆخۆت دەزانی، ئەوان درەنگ، یان زوو، هەر دەتکوژن.

حەمەد بە سرتە گوتی:

ـ دەزانم.

ـ کە وا بوو بەڵێنم پێبدە؟

ـ نازانم...

کوڕەکە هەستا و چوو لەو بەری ئاورگەکەی دانیشت.

ـ ئەوە چ بوو، کوڕەکەم، لە حەمەدۆکی تووڕەی؟

کوڕەکە وەڵامی نەدایەوە، بە ڕاستی تووڕە ببوو. ئەوانی دی هەموو قسەیان دەکرد و پێدەکەنین، بەڵام ئەو زاری هەڵتەدەپچڕا و هێندەی پێتەچوو، خەوی لێکەوت. ئەوانی دیکەش هەرکەس لە حاست خۆی، لە قەراغ ئاوری درێژ بوون و خەویان ئێکەوت. تەنیا قاسم بە خەبەر بوو و کێشکی دەکێشا.

حەمەدە چکۆلەکە پێش تاوهەڵاتێ وە خەبەر هات. هەستا لە سەر پەنجەی پێیان بە ئەسپایی چووە دەرێ و بە قامکیش ئیشارەی کردە قاسمی دەنگێ نەکا تا ئەوانی دیکە خەوەکەیان لێتێکنەچێ. پاشان چوو لە نێو دیوارەکان و دارستانی دەوروبەری قەڵایە باوەشێکی ئاوردوو کۆ کردەوە، هێنای، لە سەر ئاگرەکەی دانا و ئاگرەکەی هەڵکردەوە. ئەو جار چوو لەسەرەخۆ لووتی حاجیی کێشا، بۆ ئەوەی وە خەبەری بێنێ و نانوچای بەیانی ساز کەن. حاجی لە تاوان دەرپەڕی و کوڕەکە دەستی بە زاری خۆی گرت و بە پێکەنین هەڵاتە دەرێ. قاسمیش کە لە بەر دەرگایە کێشکی دەکێشا، لە خۆوە دەستی بە پێکەنینێ کرد.

حاجی وەخۆ هاتەوە. هەستا، چوو لە دەرێ، لە چۆماوێکی نێزیك قەڵایە کترییە ڕەشەکەی پڕ کرد لە ئاو و هێنایەوە وەسەر ئاوری نا. کوڕەکە هێشتا هەر پێکەنینی دەهات. قاسم گوتی:

ـ ئەرێ ئەو کوڕە بە چی پێدەکەنێ؟

حاجی وەڵامی دایەوە:

ـ کاتێك وەخەبەر هاتم، ڕاچڵەکیم. بە وەی پێدەکەنێ.

کوڕەکە گوتی:

ـ سەبر! ئەوە بۆ ئاوا بە دەنگی بەرز قسە دەکەن؟ نازانن ئەوانە نوستوون؟

حاجی و حەمەدە چکۆل لە دەوری ئاگری دانیشتن. کەتری‌یەکە کوڵی. مەلا فەرهاد پێش هەمووان هەستا. چوو لە چۆماوەکەی دەسنوێژی هەڵگرت و کە هاتەوە، سەربەرگەکەی ڕاخست و نوێژی کرد. ئەو جار ئەوانی دیکەش یەك بە دوای یەك دا هەستان. حەمەدۆك دوای ئەوەی وەخەبەر هات، لە شوێنی خۆی دانیشت، دەستی وەبەر چەنەی دا و دەبیرەوە ڕۆچوو. مەلا فەرهاد لە نوێژێ بۆوە. حاجی هێندێك بەردی پانی هێنابوو و نانەکەی لە سەر دانابوون، پەرداخێکیش چای بۆ مەلا فەرهادی تێکرد. مەلا فەرهاد هێندێکی شەکر دە چایەکەی کرد و لێکی دا:

ـ ها... ئەدی خانەخوێکەمان کوا؟ حەمەدە چکۆل، وەرە کوڕم، وەرە نانی بخۆ...

بەڵام کوڕەکە وەڵامی نەدایەوە. ئەوانی دیکەش هەوڵیان لە گەڵ دا، بەڵام هەر نەهات. ئەو جار حەمەدۆك هەستا، چوو قۆڵی گرت، هێنای لە پەنا مەلا فەرهادی دانا و ئەویش پەرداخە چایەکەی بۆ ڕاداشت، بەڵام کوڕەکە هەر هیچی نەخوارد. مەلا فەرهاد نیگەران بوو:

ـ کوڕم، چمان لێ‌کردووی؟ بۆ ناڕەحەتی؟ نەکا شەوێ کە گاڵتەمان لە گەڵ دەکردی، پێتناخۆش بوو بێ و تۆرابی. ئەگەر دڵت لێمان یەشاوە، داوای لێبووردنت لێ‌دەکەین.

ئەوانی دیکەش گوتیان:

ـ بمانبوورە!

حەمەدە چکۆل هیچی نەدەگوت. لە چاوی ڕا دیار بوو ناڕەحەتە و گریانی دە ئەوکی مابوو. ئاخرەکەی وە قسە هات و گوتی:

ـ ئەمن شێتم، وەڵڵاهی لە کەرێش کەرترم.

ـ بۆ وا دەڵێی ڕۆڵە...

ـ دایکم هەمیشە پێی‌گوتووم کە ئەمن تەنبەڵ و خوێریم. وا دیارە قسەکەی ڕاست بووە و من گوێم نەداوەتێ!

ـ باشە ئێستا چ قەوماوە کە تۆ وە بیر قسەی دایکت کەوتوویەوە و خۆت لۆمە دەکەی؟

ـ ئەمن دوێنێ شەوێ نانوپێخۆرەکەی ئێوەم هەموو خوارد و دەنگتان نەدام. ئەمن وەك گامێشی هەر چی بۆتان دانام، خواردم و بیرم نەکردەوە کە ئاخر ئەوە تێشووی ئێوەیە کە هەمیشە بە شاخ و کێوانەوەن و دوایە بێ‌نانوپێخۆر دەبن. ڕاستی‌یەکەی ئەوەیە ئەمن زۆر برسی بووم و لە ماڵێ چمان نیە بیخۆین. ئەو خواردنەش کە ئێوە داتان بە من، ئەوەندە خۆش بوو، لێی‌تێر نەدەبووم و خۆشم بۆ زەوت نەدەکرا کە چیدی نەخۆم. ئێستا زۆر پەشیمانم... زۆر! ئاخر

بۆ هێندەم خوارد؟ بیریشم لە وە نەکردەوە کە چەتە بە چ زەحمەتێك ئەو شاخانە و لە وەرزێکی ئاوا سەرما و سەختەت دا نانی پەیدا دەکەن!

مەلا فەرهاد و حەمەدۆك دڵخۆشی‌یان دایەوە، هێوریان کردەوە و گوتیان جارێ هێندێکیان نانوپێخۆر پێ‌ماوە. ئەو جار کورەکە چایەکەی لە مەلا فەرهادی وەرگرت و یەکبێن هەڵیقوڕاند، پاشان دەستی بە نانخواردنێ کرد و وەك شەوی پێشوو هەرچی لە گۆڕێ دانرابوو، هەمووی خوارد. چەتەکان سەریان لە خواردنی ئەو کورەی سوڕ مابوو. مەلا فەرهاد پەرداخێکی دیکەشی لە چایەکەی تێ‌کرد، پێنج کەوچکیشی شەکر تێ‌کرد، لێکی‌دا و گوتی:

ئەوەش پێ‌داکە، ڕۆڵە! هەنگوینمان نەماوە، بەڵام ئەوەش وەك هەنگوینی شیرینە.

کوڕەکە پەرداخەکەی لێ‌وەرگرت و بە پەلە خواردی‌یەوە.

ــ بۆت تێکەمەوە؟

ــ خوا بەزیادی کا. بە ڕاستی ئەو جار نیدی بەسە. تێرم و قەت نە خواردنی ئاوا بە تامم خواردوە و نە چای ئاوا خۆش! ئەو چایە بۆنێکی زۆر خۆشی لێ‌دەهات. ئێستاش بۆنەکەی دە گەرووم دا ماوە!

کاتێك ئەوانی دیکەش لە نانخواردنێ بوونەوە، کوڕەکە وەك پیاوێکی گەورە هەستایە سەرپێ و گوتی:

ــ دەبێ بڕۆم. زۆر نیگەرانی کاك مەستانیم. ئەو پیاوێك نیە بەڵێنی خۆی بشکێنێ! کاتێك وادەی داوە و نەهاتوە، بەو مانایەیە کە کوشتوویانە! مابایە، هەر دەهات. حەك کوێرێم مام مەستانە ئازا و بە جەرگەکەم!

مەلا فەرهاد پووڵی دەرهێنا و دەیەویست هێندێکی بداتێ، بەڵام کوڕەکە وەك ئەوەی ئاگری بۆ لای بەرن، پاشەوپاش کشایەوە:

ــ پیاو نابێ پووڵی لە چەتان وەرگرێ! ئەو پووڵە لەو شاخانە بۆ ئێوە پێویستترە. ئەو جار ئەمن خۆ تێشووم پێ‌نەهێشتن، چۆن پووڵتان لێ‌وەربگرم؟

حەمەدۆك داهاتەوە، چووە بن گوێی و سرتەیەکی لە گەڵ کرد. منداڵەکە بزەیەکی هاتێ، پووڵەکەی وەرگرت و دە گیرفانی نا.

ــ ئێستا لە سەر ئیزنی ئێوە دەڕۆم. هیوادارم خودا لە هەموو بەڵایانتان بپارێزێ! بەڵام هەر کە من ڕۆیشتم، دەبێ ئێوەش لێرە نەمێنن. دەسبەجێ بڕۆن. بە هیچ شێوەیەك لێرە نەمێنن.

ــ بۆچی؟

ــ باشە بەڵکوو ژاندەرمەکانی باهۆزی منیان گرت. هێندەیان لێ‌دام هەموو گیانم بوو برین و خوێیان دە برینەکانم کرد و ئەمنیش زیاترم بەرگە نەگرت... ئەو کات... دوور نیە ئاشکراتان کەم...

ئەوانیش دێن و دەتاندۆزنەوە. ئێوە زۆر کەمن و ئەوان زۆرن. بێجگە لە وەش، ئێوەی بەستەزمان، هەمووتان ماندوو و شەکەتن! خۆ بێتوو ئاوا بکوژرێن، ئیدی ئەمن دڵم دەتۆقێ...

پاشان ڕای کردە لای حەمەدۆکی، دەستی گرت، دەمی بردە بن گوێی و گوتی:

ـ دوای ئەوەی ئەو هەموو نانو پێخۆرەم لێ خواردن، نەدەبوو ئەو پووڵەم بدەنێ! بە ڕاستی ئەمن بێشەرمم! بەڵام چ بکەم، خواردنەکەتان هێندە خۆش بوو... چایەکەشتان دەتگوت هەنگوینە... بەو پووڵەی...

ـ جووتێك کەوشی پێبکڕە.

ـ ئای ئای، ئەوە دەڵێی چی؟ ئێمە تەنانەت نارد و خوێشمان دە ماڵێ دا نیە، ئەو کات ئەمن بچم کەوشان بکرم؟ پووڵەکەی دەدەم بە دایکم. زۆری پێخۆش دەبێ. هەنگوین و چاشی بۆ دەکڕم!

ـ زۆر باشە، بەخێرچی! زۆرمان پێناخۆشە بەجێت دێڵین، بەڵام بڵێین چی. بۆخۆت دەزانی ئێمە چەتەین ئیدی...

هەتا چۆمەکەی خوارێ لە گەڵی چوون. حەمەد هەرچی دەکرد، فرمێسکی ڕانەدەوەستان:

ـ وەرن هاوڕێیان... وەرن. با خۆمان بپێچینەوە و بڕۆین. بۆخۆتان دەزانن ئێمە بەڵێنمان بە حەمەدە چکۆلەکەی خۆمان داوە کە لێرە نەمێنین...

بە نێو ڕەوەزان و بە پەنا داران دا لە شاخەکەی هاتنە خوارێ و لە سەرەوەی گوندی "چنارە مردوو"ی ڕاوەستان. شاهێن هێندێك دۆستی لە وێ هەبوون.

دەنگە دەنگ لە لای گوندەکەی ڕا دەهات و وا دیار بوو دۆخەکە ئاڵۆزە. هەر وا هەتا تاریك داهات، لە پەنا داریەڵك و ڕەوەزە بەردان خۆیان حەشار دا. دیسان هەوا زۆر سارد بوو. کاتێك تاریکی کرد، شاهێنیان ناردە خوارێ بۆ نێو دێی، بەڵام زۆری پێنەچوو، هاتەوە:

ـ گوندەکە پڕە لە ژاندەرمە. ناچار بە ڕێگای خۆیان دا گەڕانەوە:

تەیموور گوتی:

ـ با بچینەوە قەڵاکەی و ئەمشۆش لە وی بەرینە سەر!

بەڵام حەمەد گوێی نەدایە ئەو پێشنیارە، ڕۆیشتن و بۆ لای بەیانی گەیشتنە نێزیك گوندەکەی کوێخا مەستانی. بێدەنگی‌یەکی قووڵ دێیەکەی داگرتبوو. ماڵێك زۆر لە سەرەوەی دێی، لە بن ڕەوەزێکی هەڵکەوتبوو و لە سەر ڕێگاکەیان بوو. شۆقێکی کز لە پەنجەرەی ماڵەکەیەوە لە دەرێی دابوو. لە دەرگای ئەو ماڵەیان دا. پیرێژنێك دەرگای کردەوە و کاتێك چاوی پێیانکەوت، گەشایەوە:

ـ بەخێر بێی حەمەدۆك، کورِم. فەرموون وەرنە ژوور. ژاندەرمەکان دوێنێ بەیانی لێرە ڕۆیشتن. ئەو بێدینانە هەر نەیانهێشتین. کاك مەستانیشیان کوشت و دەزانم ئێوە هاتوون لە بەخاکسپاردنەکەی دا لێرە بن. مەستان بۆ هەمووومان باب بوو... یاخوا بەخێر بێن!

ژنەکە ئاگرەکەی خۆش کرد. لبادی ڕاخستن و دۆشەکی بۆ دانان. حەمەد و هاوڕێیانی خەریك بوون، کەوشەکانیان داکەنن، بەلاّم ژنەکە نەی هێشت و گوتی:

ـ نا، ئەوە چ دەکەن؟ چەتە قەت نابێ کەوشی داکەنێ! پێتان وایە قەتم چەتە نەدیون؟ چەتە نابێ چەکیش لە خۆی دوور کاتەوە، چونکە تێکەوتن وەخت و سەعاتی بۆ نیە و نابێ کابرا لە خۆی دڵنیا بێ.

پاشان کەتری پڕ کرد، لە سەر ئاگرەکەی دانا و بۆخۆشی بە نارِەحەتی لە لای ئاورگەکەی داما. حەمەد هەستی بە دەروونی ئاڵۆزی وی کرد:

ـ دایە گیان، ئەوە چی‌یە؟ بۆ وا دە فکر دای؟

ـ ئاخ کورِم، شێری من، حەمەدۆکە ئازاکەم، کاتێك ئەتۆ کە وەك ئیمامی عەلی وای، ئەوە ئەو جار گەورەت کردووم و پێت دە ماڵێم ناوە...

دەنگی گۆڕا، گریانی دە ئەوکێ مابوو.

ـ ڕەبی خودا هەردووك چاوم کوێر کا! قورِم وە سەری بێ، نە کەچکە قاوەیەك، نە مستە چایەك و نە یەك نانیشم دە ماڵێ دایە، تا حەمەدۆکی قارەمانی خۆم و هاوڕێیانی بی‌خۆن... خودا لە عومری من هەڵگرێ و لە سەر ئی تۆی دابنێ. جا حەمەدۆکی خۆم، چۆن نارِەحەت نەبم و نەمرم؟

ـ دایە گیان، نارِەحەت مەبە! ئەو خولقە خۆشە و ئەو هەڵسوکەوتە جوانەت بۆ ئێمە هەموو شتی دنیایە دێنن.

ـ یارِەبی خولقە خۆشەکەم و هەڵسوکەوتەکەشم بە میرات بێ. بزانە ئەوە یەك جار حەمەدۆکم لێ مێوان بووە. بەلاّم ڕاوەستە بزانم! نا، شتێکم هەیە. لە بیرم نەبوو، کەڵەبابێکم هەیە... کەڵەبابێکی گەورە. مریشکەکانم نەماون، بەلاّم ئەو کەڵەبابەم ماوە و ئەوەش بە نسیب ئێوە بوە... ئیستا دەی‌گرم، دەی‌هێنم و ئێوەش بی‌کوژنەوە، جا سووری دەکەمەوە و چێشتێکی خۆشتان بۆ ساز دەکەم.

پیرێژنەکە کاتێك کەڵەشێرەکەی وەبیر هاتەوە، چاوەکانی گەش بوونەوە و خۆشحاڵ بوو. هەر چەندی حەمەد و هاوڕێیانی هەوڵیان دا واز لە کەڵەشێرەکەی بێنێ، بێ‌سوود بوو. دەی‌گوت بڵێن مەی‌کوژەوە، وەك جنێوم پێ‌بدەن، پێم‌وایە.

چارەیەك نەبوو. حاجی کەڵەشێرەکەی سەر بری و گوتی:

ـ زۆر چاکە دایە گیان، تا ئەتۆ هێندیك لە گەڵ میوانەکان قسە دەکەی، من کەڵەشێرەکەی دەڕووتێنمەوە. دوایە ئەتۆش بیکوڵێنە و بۆمان بکە شۆرباو. ئەمن هێندێکم پیواز پێن! ئاخر هەمیشە ئەمن چێشت بۆ دەستەکەمان لێدەنێم.

ئاسمان ڕووناك بوو و تیشکێکی سوور، پەمەیی و بنەوشی بە سەر لووتکە سپیپۆشەکانی تووڕووسی کشا.

شاهین گوتی:

ـ دایە، بە ڕاستی ئەو کەڵەشێرەت چاك بەخێو کردوە! بڕوانە چەند قەڵەوە، وەڵلاهی بە قەد مەڕێکی گۆشت پێوەیە.

ـ زۆرم خۆشدەویست. لە زاری خۆم دەگێڕایەوە و دەمدا بە وی. قەزاوقەدەر وایە ئیدی! وا دیارە ئەو کەڵەشێرە ڕزقی حەمەدۆکی بوو...

ـ خودا بتپارێزێ و لێتخۆش بێ، دایە.

ـ ژنەکە مەنجەڵێکی گەورەی وەسەر ئاوری نا. زۆر شاد بوو. دەهات و دەچوو، پێدەکەنی، دەتگوت جحێڵ بۆتەوە، قسەی خۆشی دەکرد و شوکری خوای دەکرد.

ـ کە ئێوە هاتن، لە خۆشی‌یان لە بیرم چۆوە مەستان مردوە. ئاخر ئەو مامم بوو.

ـ داوایەکم هەیە، دایە...

ـ بڵێ داواکەت چی‌یە، کوڕە چاوڕەشەکەم. ئامادەم گیانی خۆشمت بدەمێ.

ـ دایە گیان، لەو دەوروبەرەی کەس مێشەنگوینی هەن؟

ـ بەڵێ، شەهێنەکەم! وا دیارە ئیشتیات لە هەنگوینیە! مام عەولا خەڵێفە مێشی هەن و هەنگوینیشی هەیە!

ـ ماڵەکەیان لێرە نیزیکە؟

ـ ئەوەتا، جیرانمانە!

ـ دایە گیان ئەو پوولەی بەرە، لە گەڵ شاهێنی بچن، تەنەکەیەکی چکۆڵەی هەنگوین لێبکڕن.

ـ هەر ئێستا دەچم، گوڵەباغەکەم! مام عەولا هەمیشە هەنگوینی هەیە، بەڵام نە دەیدا بە کەس، نە بۆخۆشی دەیخوا. لەوەتا هەیە، مێشەنگوینی هەر هەن، بەڵام دەڵێن ئێستاش نازانێ هەنگوین چ تامە. ئەو ماڵوێرانە هەنگوینەکەی دەفرۆشێ و هەمووی دەدا بە توتن و پەڕ...

ـ ئەگەر وا بێ دایە گیان، زەحمەت نەبێ، تەنەکەیەکی گەورە و یەکی چووکەی لێبکڕن.

ـ دەڵێی هەر چی هەیەتی، لێی‌دەکڕم.

ـ ئەرێوەڵلا هەرچی هەیەتی، لێیبکرە.

ژنەکە لە گەڵ شاهێنی ڕۆیشتن بۆ هەنگوینکڕینێ. مەلا فەرهاد دەسنوێژی هەڵگرت و نوێژی کرد. کەڵەباب دە مەنجەڵی دا دەکوڵی و حاجی پیوازی ورد کرد و تێیکرد. زۆری پێنەچوو شاهێن و ژنەکە هاتنەوە. شاهێن دوو تەنەکە هەنگوینی پێبوون، یەکی گەورە و یەکی بچووك.

ـ ئەوە هەنگوینی هەرە سپی‌یە، کوڕم! حەمەدۆك ئەو هەنگوینەی بخوا، ئەوەندەی دیش بەهێز دەبێ و هەمو دوژمنەکانی قەڵتوبڕ دەکا! مام عەولا پووڵی زۆر لێ ستاندین، یاخوا چاوی کوێر بێ! زۆر لەچەرە! بریا شتێکی باشیشی ئەو پووڵەی کردبایە. هەر دەیدا بە تووتن و بەبای دەکا. تەنانەت یەکجاریش تامی ئەو هەنگوینە جوانەی ناکا.

لە پڕ بە زەوقەوە و گوتی:

ـ ئێوە دەبێ نانی بخۆن! هەنگوینیشتان بۆ دادەنێم. نانمان نیە، دەچم لە ماڵی جیرانەکەم دێنم.

چوو و کە هاتەوە نردوێك نانی هێنابوو. پاشان سفرەی ڕاخست، لەتەلبادێکی دانا، مەنجەڵەکەی لە سەر دانا و دوایە چێشتەکەی دە دوو ـ سێ قاپان کرد و دایڕنا. هەنگوینیشی دە دەوری‌یەکی گەورە دا دانا:

ـ کەڵەشێری چاك بوو و گۆشتەکەی بۆنێکی خۆشی لێدێ، وایە؟ خۆزگە ساوارم بوایە و پلاوێکی باشیشم بۆ لێنابان.

مەلا فەرهاد گوتی:

ـ پێویست ناکا دایە گیان، بەزیاد بێ!

هەموویان دانیشتن و دەستیان بە نانخواردنێ کرد، بەڵام ژنەکە هەر وا ڕاوەستابوو و چاوی لێدەکردن.

حەمەد گوتی:

ـ دایە، وەرە دانیشە و لە گەڵمان بخۆ. پێش تۆ یەك کەسیشمان تامی ئەو چێشتەی ناکەین.

ژنەکە لە گەڵیان دانیشت. تاقە کەوچکێکی داری هەبوو، هەموو بە نۆرە پێیان دەخوارد. ژنەکە بۆخۆی لە چێشتەکەی نەخوارد و هەر هەنگوینی بە نانی خوارد. هەنگوینی دە نانەکەی هەڵدەسوو، دە زاری دەنا، دەیجوو و قووتی دەدا. پاشان چاوی لە سەریەك دادەنان، بزەیەکی دەهاتێ، هەناسەیەکی قووڵی هەڵدەکێشا و بەو شێوەیە بۆنی هەنگوینەکەی پڕ بە سینگی هەست پێدەکرد.

کاتێك لە خواردنێ تەواو بوون و کەوڵەکەیان خڕ کردەوە، تەنیا یەسکی کەڵەبابەکەی مابوون. ژنەکە بیری کردەوە، ئیدی ئەو جار کەڵەبابم نیە بەیانی‌یان بۆم بخوێنێ، بەڵام قەیدێ چ

دەکا، سەد کەڵەبابی وا بە قوربانی حەمەدۆکی بێ. ئەگەر ژوورێکی پڕ لە مریشکیشم بوایە، هەمووم بۆ حەمەدۆکی دەکوشتنەوە و لە خۆشیانیش سەمام دەکرد.

ــ ئەرێ دایە، کوڕێك لەو گوندەی ئێوە هەیە، ناوی حەمەدە! یەکی چاوڕەشە و سەری دەڵێی ژووشکە قرژ بۆتەوە، دەیناسی؟

ــ پێموایە دەزانم مەبەستتان کێیە... دەڵێن چەتەکان پوولێکی باشیان داوەتێ. دەبێ ئێوە پێتاندابێ، وایە؟ بێگومان، چونکە هەر حەمەدۆك دەتوانێ ئاوا دەستودڵاواڵە بێ کە پوولێکی ئاوا بدا بە منداڵێکی... ئەمن قەت منداڵم نەبووە. پیاوەکەم و سێ برامیان بردنە شەڕێ و یەکیشیان نەهاتەوە. ئیدی لەو کاتییەوە بەتەنیا و بە بێوەژنی ماومەوە، کەس لێی‌نەپرسیوم و چەند ساڵە کەس دەرگای لێ‌نەکردوومەوە.

پاشان دەستەکانی بەرەو ئاسمان بەرز کردنەوە و گوتی:

ــ یارەبی ڕۆڵە، خودا چاکەتان بۆ بکا، یا ڕەبی دەست لە بەردی دەن ببێتە زێڕ. دەزانن بەو هاتنەتان چەندەتان دڵی من خۆش کرد؟ ئیدی ئەمن هەتا دەمرم بەو خۆشییەیەوە دەژیم!

ــ دایەگیان ئێمەش بە دیداری دایکێکی وەك تۆ زۆر خۆشحاڵین! دەتوانی ئەو کوڕەمان بۆ بانگ کەی؟

ــ بۆ ناتوانم ڕۆڵە. ماڵەکەیان لەو خوارەوەی، لە سەر کانییەکەیە. بابی دزە. باپیریشی دز بووە و لە بناخە دا بنە و بنەچەکەیان دز بووە! ئەوانە بە خزم و تایفەوە دزن و قەت نانێکی حەلاڵیان نەخواردوە. جا ئێستا ئەگەر پێتانخۆشە، ئەوە بانگی دەکەم. خۆ ئەو پوولەی باسی دەکەن، لە ئێوەی نەدزیوە؟

ــ نا، نەیدزیوە.

ــ ئەو هەتیوە ئەوەندە زیرەك و فێڵەزانە دەتوانێ کلی دە چاوی کابرای دا بدزێ. بەستەزمانە، هەنگوینیشی زۆر پێخۆشە. پارەکە زۆری نەمابوو ڕوحی خۆشی لە سەر دانێ. چووبووە زگ خەلێفەکانی ئەو عەولاّ کافرەی. هەر ئەوەی کە ئەو هەنگوینەمان لێ‌کڕی و کۆلێکی پوولێ لە ئێوەش نەستاند. مێشەکان لێی‌هالاّبوون، هێندیان پێوەدابوو، هەموو گیانی ئەو کوڕە ماڵوێرانەی هەڵمسابوو. ماوەیەکی زۆر نە چاوی بۆ هەڵدەهات، نە شەویلکەی لێکدەبۆوە. دەبوو بە قامیشی شۆرباویان دە زاری کردبا. وەڵلاهی پوورفاتمی قەرەچە دێی نەبوایە، دەمرد. ئەو دە فریای هات، دەرمانی دایە و چاکی کردەوە... دزی کوڕی دزی! بەڕاستی لە مردنێ گەڕایەوە و دەبوو ئیدی تەمبێ بوایە و کاری وای نەکردبایەوە، وانیە؟ بەڵام ئەو هەتیوە هەر چاك بۆوە و چۆوە زگ مێشەکان. ئەو جاریش هێندەیان پێوەدابوو، نەیدەتوانی لە جێی خۆی ببزوێ. دیسانیش پوورفاتم بە هاوارییەوە هات و چاکی کردەوە،

بەڵام هەر دەستی هەڵنەگرت و تا ئێستا چەند جاری دیکەش چۆتەوە هەنگوینەدزینێ. وا دیارە تازە خووی پێگرتوە و تەرکی ناکا! ئەوە ئێستا هەنگویندزە و ئەگەر ئەو مێشانە نەیکوژن، وەك بابوباپیرانی دەبێتە ئەسپدز!

پاشان بە پەلە گوتی:

ـ ئێستا دەڵێن چی، بچم بانگی کەم؟ دیارە ئەگەر ئەو پووڵەی دزیبێ، خۆی ون دەکا و نایە.

ـ هیچی لە ئێمە نەدزیوە. هەر پێیبڵێی، دێ.

ـ ئەوە دەچم دەیهێنم. ڕاستییەکەی زۆر کوڕی چاکیشە. ئازاری بۆ کەس نیە. هەر ئەو دەچێ ئاوردووم لە شاخی ڕا بۆ دێنێ. قەت لێم خافڵ نیە. کارگم بۆ دێنێ، گێلاس، سێو، هەرمێ هەنار... وەختی خۆی هەموو ڕۆژێ ئەو چەشنە شتانەم بۆ دێنێ. گوێشم بۆ دێنێ. کوڕێکی ڕوحسووکە، پێی خۆشە یارمەتیی خەڵکی بدا و لەو بارەوە تای نیە!

دوای ئەو قسانە ژنەکە چووە دەرێ. کوڕەکە لە لای کانییە، لە پێش دەرگای ماڵی خۆیان بوو.

ـ حەمەد! حەمەد! وەرە، وەرە ئێرە شتێکت پێبڵێم.

هێشتا ژنەکە تەواو نەگەیشتبۆوە ژوورێ، کوڕەکە پەیدا بوو. کاتێك حەمەد و هاوڕێیانی لە وێ دی، زۆری سەر سوڕ ما، شاگەشکە بوو و پێکەنی:

ـ وەڵڵاهی هەردایە زوهرە بانگی کردم، شتێکم بە دڵی دا هات. بیرم لە ئێوە کردەوە... یاخوا بەخێر بێن، هاوڕێکانم!

حەمەدۆك گوتی:

ـ بەخێرهاتووین حەمەد!

ئەو جار کوڕەکە بە دەنگێکی خەماوییەوە گوتی:

ـ دەزانن قسەکەم وە ڕاست گەڕا و مامە مەستان، ئەو پیاوە چاکە کوژرا؟ وا دیارە بەڕێوە بووە بێتە لای ئێمە، ژاندەرمەکان پێیانزانیوە و تەقەیان لێکردوە. خودا بیبەخشێ، زۆر پیاوی چاك بوو. هەمیشە هەر ئەو لە دەست مام عەولای هەنگوینفرۆشی ڕزگار دەکردم، دەنا ئەو بێدینە بە تفەنگێ دەیکوشتم. مامە مەستان باڵی بە سەر دەکێشام و نەی دەهێشت لێمدا، دەنا کەوڵی دەکردم.

پاشان چوو لە لای مەلا فەرهادی دانیشت و دەستی دە دەستی نا:

ـ ئێستا دەزانم ئەتۆ کێی، فێڵەزان! ئەو کاتی پێتنەگوتم، بەڵام دەبوو بەو سەر و ڕیشەتەوە بۆخۆم زانیبام! هەر ڕیشی تۆ دەبێ ئاوا جوان بێ! بە ڕاستی ئەمن گێژم!

ـ باشە، ئێستا پێمبڵێ ئەمن کێم؟

ـ دیتووتانە فێڵم لێ‌دەکا! پێی‌وایە ئێستاش نازانم! ئەتۆ مەلا فەرهادی، شێخی شێخان و گەورەی پیاوچاکانی! ئەتۆی گوللەبەندێکت بۆ حەمەدۆکی دروست کردوە، کە هیچ چەشنە گوللەیەك کاری لێ‌ناکا! بۆچما هەر ئەتۆش نەبووی ئەسپەکەی حەمەدیت زیندوو کردەوە؟ ئەو ئەسپە کەلەلایەی گوللەبارانیان کرد و پاشان کە زیندوو بۆوە، بوو بە حودوودێکی بۆر؟ بۆچما ئەتۆ نەبووی کە قاتڵەکانی دایە سوڵتانی، یانی یاوەر فاڕوق و سەرجووخە عەلی کەرتیشت کوشت و تەرمەکانیشت لە بن پردێ لە کن یەك دانان؟ هەر ئەتۆش نەبووی جندۆکەت ناردن، کەلەپچەی دەستی حەمەدۆکیان لە زیندانی مەحموداغای کانی گوڵان دا کردەوە و ڕزگاریان کرد؟ ئەتۆ هێندەت کاری دەگمەن و سروشتبەزێن کردوون، کە ئیدی ناژمێردرێن...

ـ نا، ئەمن هیچم نەکردوە و ئەوانەش هیچیان ڕاست نین.

ـ باوەڕت پێ‌ناکەم، ئەتۆ درۆ دەکەی!

ـ ئەگەر پێتوایە ئەوانە کاری منن، چۆن دەوێری بە من بڵێی درۆ دەکەی؟

حەمەدە چکۆل ترسا. دەستی مەلا فەرهادی بەردا و تا بەر دەرگایە کشایەوە. سەری بەردایەوە و هێندێکی بیر کردەوە. پاشان سەری هەڵێنا و لە بەر مەلا فەرهادی پاڕایەوە:

ـ لێم ببوورە! بڵێی خودا غەزەبم لێ‌نەگرێ، چونکە بە تۆم گوت درۆ دەکەی؟ نامکوژێ، گۆج و ئیفلیجم ناکا؟ ئاخر ئەمن و تۆ هاوڕێین، بۆیە وێرام وا بڵێم! پیاوی چاك بە بمبوورە، با خوا غەزەبم لێ‌نەگرێ! ئەمن هەڵەم کرد. نەمزانی!

ـ حەمە چکۆل وەرە ئێرە، قەیدێ ناکا، ئەمن لێت تووڕە نیم...

کوڕەکە چوو و لە پەنای دانیشتەوە، بەڵام هەر چاوی لێ‌دەکرد، وا دیار بوو هێشتا هەر دڵنیا نەبوو و دەترسا دڵی لێی‌بەشابێ.

ـ حاجی ئەو تەنەکە هەنگوینەی بێنە! ئەوی گەورەیان! کەوچکەکەش بێنە!

کەوچکێك هەنگوینی لە تەنەکەکەی هێنایە دەر:

ـ زارت داپچڕە!

کوڕەکە بە سەرسوڕمانەوە زاری داپچڕی و مەلا فەرهاد کەوچکێکی گەورەی هەنگوین دە زاری کرد. حەمەد زۆری پێ‌خۆش بوو. ماوەیەك چاوی لە سەریەك دانا و هەر زاری بزووت و لێوی لستنەوە. پاشان یەك بە یەك چاوی لە هەموان کرد. هەستی سوپاسکردن و منەتباری بە چاوانی‌یەوە دیار بوو.

ـ ئەو تەنەکە هەنگوینە بۆتۆ.

ــ بۆ من؟ بۆ من؟

باوەڕی نەدەکرد.

ــ بەڵێ، بۆ تۆ.

ــ ئەو هەنگوینەتان لە کوێ بوو؟

چاوی لە هەمووان کرد و گوتی:

ــ جێچزووی مێشەنگوینی بە ڕوخساری هیچکامتانەوە نابینم...

حەمەدۆك گوتی:

ــ مەلا فەرهاد دوعایەکی دەخوێنێ و ئیدی مێشەنگوین پێمانەوە نادەن.

ــ وەڵلاهی درۆیە! گاڵتەم پێدەکەن! عەیب ناکەن گاڵتە بە منداڵێکی وەك من دەکەن؟

لە بەر بێڵایە دانیشت و دەمولووتی تێکنا، بەڵام لە بنەوە هەر چاوی لە هەنگوینەکەی بوو. لە پڕ هەستا، باسکی حەمەدی گرت و سەری بردە بن گوێی و شتێکی بە سرتە پێگوت. پاشان ڕووی دە پیرێژنەکەی کرد و گوتی:

ــ پوورە زوهرە، کیتەڵێکی بێنە! ئەو هەنگوینە بۆ من یەکجار زۆرە. با هێندێکی بدەم بە تۆ!

ــ بەشی ویمان داناوە. ئەو تەنەکە چکۆڵە ئی وییە.

ــ کوڕەکە لە خۆشیان خۆی هەڵاویشت، دەستی مەلا فەرهادی ماچ کرد، دوایە پێداهات، یەك بە یەك دەستی هەمووانی ماچ کرد و دەستی پوورە زوهرەشی هەر ماچ کرد. پاشان ڕۆیبووە تەنەکە هەنگوینەکەی، هەر چۆنێك بوو هەڵیگرت و بردی. گوێیان لە دەنگی بوو، لە دەرێ هەرای دەکرد:

ــ دایە... دایە... وەرە یارمەتیم بکە!

چەتەکان ئامادەکاریی شەوێیان کرد. مەلا فەرهاد کێشکی یەکەمی وەرگرت. بیری کردەوە: سەرم لە کاری ئەو دنیایەی سوڕ ماوە. پێمwایە خەڵکی دیش هەر وەك منن و سەر لە دنیا، ژیان و خەڵکی ئەو دنیایەی دەرناکەن. ئینسان کە لە دایك دەبێ گێلە و هەر بە گێلیش دەمرێ. بەڵام حەمەدۆك... ئەو خەڵکە بۆچی هێندەیان خۆشدەوێ؟ ئەوە چ ڕاز و نهێنییەکە؟

قاوەڵتوونێکی درەنگ بە دەنگی گریان و شینگێڕیی ژنان، کە لە دوورەوە دەنگی دەدایەوە، وە خەبەر هاتن.

حەمەد گوتی:

ــ هەستن، ڕیشتان بتاشن، خۆتان ڕێکوپێك بکەن! دەچینە سەر قەبران.

دایە زوهرە ئاوی بۆ گەرم کردن. هەمزە گوێزانێکی هێنا، هێندێکی تیژ کرد. پاشان حەمەدی بردە دەرێ، لە سەر بەردێکی دایئیشاند، سابوونی لە ڕدێنی دا و خووساندی و ڕیشی بۆ تاشی. پاشان بە نۆرە ئی هەمووانی تاشی.

دایە زوهرە لە حاڵێك دا وەك کچی جحێڵ ڕوومەتە چرچەکانی لە شەرمان سوور هەڵگەڕابوون، هاتە لای حەمەدۆکی، دەستی گرت و گوتی:

ــ ڕۆڵە گیان، پاتۆڵەکەت سێ ــ چوار جێی هەڵدڕەشاوە. خۆ ئاوا ناکرێ بچییە نێو خەڵکی. دایکەنە، با بۆت بدروومەوە.

حەمەد پاتۆڵەکەی داکەند، دایە دەست دایە زوهرەی و بە دەرپێوە دانیشت.

ــ دایە زوهرە، وەڵڵاهی خۆ دەمزانی، بەڵام لە ڕووم هەڵنەدەهات پێت بڵێم بۆم بدروویەوە.

دایە زوهرە دەرزی و دەزووی هێنا و بە تەڕدەستی خەریکی دروونەوەی پاتۆڵی حەمەدی بوو.

ئەو جار شینگێڕییەکەی زیاتر بوو و دەنگی گریان و پێهەڵگوتنی ژنان دەگەیشتە ئاسمانێ.

حەمەدۆك و هاوڕێیانی خۆیان ئامادە کرد، ڕەختیان لە خۆ بەستن و تفەنگیان دەستدانێ. کاتێك هاتنە دەرێ، تووشی سڵەمان یەکچاوی بوون. سڵەمان سواری ئەسپێکی ببوو و دوو هێستری بە دووی خۆی دا دەکێشان.

ــ ماڵتان نەشێوێ! ئەو بەینەتان هەموو بە دوا دا گەڕاوم! هێندە گەڕاوم کەوتووم. تووشی کوڕێکی چکۆڵە بووم، ئەو نەبوایە قەتم نەدەدۆزینەوە! لێیپرسیم لە کێ دەگەڕێی و کاتێك ناوی حەمەدۆکیم هێنا، دەسبەجێ هێنامی بۆ ئێرە. کوڕێکی سەیر وریایە. هەر ئیشارەیەکی کرد و بە نارەنار وە پێش کەوت. هەتا ئێرە هەر گۆرانی گوت.

ــ قژی زەرد و ئاڵۆز بوو؟

ــ بەڵێ، هێنامیە ئێرە و یەکجێ بۆ خۆی ون بوو. دوایە هێندێکیش نیگەران بووم.

حەمەدۆك گوتی:

ــ ئی خۆمانە! ناوی حەمەدە. هەر لە دایکی خۆی بووە، ناویان ناوە حەمەد. کوڕی چاکە! ئەگەر بیگرن، لێیدەن و هەموو گیانیشی بشکێنن، خەیانەتمان پێناکا.

سڵەمان پێکەنی:

ــ ئەگەر وا بێ، پیاوێکی تەواوە ئیدی.

حەمەد چۆوە ژوورێ و بە دایە زوهرەی گوت:

ــ دایە، ئەوە هێندێکمان فیشەك بۆ هاتوون. دەکرێ لێرە، لە لای تۆیان بشارینەوە؟

ژاندەرمە ڕۆیشتوون و باوەڕ ناکەم جارێ بێنەوە ئەم گوندەی. ئەو جار شکی تۆش ناکەن و پێموانیە ماڵە تۆ بگەڕێن.

ـ حەمەد گیان، کوڕم، ڕۆڵە نازاکەم! با ژاندەرمە هەموو ڕۆژێ بێن، با ساڵ دوازدە مانگە لەو دێیەی بن و هەموو ڕۆژێش دە جار ماڵە من بپشکنن. ئەمن چەك و فیشەکت وا بۆ دەشارمەوە، تەنانەت ئەگەر ئەو دێیەی سەروبن کەن، قەرار بێ کەس نەتوانێ قاوغێکیش بدۆزێتەوە!

حەمەد بە سلەمان یەکچاوی گوت:

ـ بارەکەی لە هێسترەکان بێنە خوار و کارت پێی نەبێ، بگەڕێوە و هەر ئاوڕیش مەدەوە! بۆخۆمان جێبەجێیان دەکەین!

سلەمان بێ ئەوەی یەك قسەش بکا، بارەکەی داگرت، سوار بۆوە، هێسترەکانی بە دوای خۆی دا کێشا و بێ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە، لە دێی وەدەرکەوت.

مەلا فەرهاد گوتی:

ـ سلەمان دە کاتێکی چاك دا دە فریامان هات. هێندەی نەمابوو فیشەکمان لێ‌ببڕێ. ئەمن لەو بارەوە زۆر دەترسام. سلەمان قاچاخچی‌یەکی بە ئەزموون و نازایە و لەو بارودۆخە نالەبارەی دا هەرچۆنێك بێ، چەك و تەقەمنیمان دەگەیەنێتێ.

حەمەدیش گوتی:

ـ ئێستاش ئەو دنیایە پیاوی نازا و بە جەرگی تێدا ماون! وا دیارە دنیا وەك دەڵێن لە سەر شاخی گای نیە، بەڵکوو لە سەر شانی بنیادەمە پاك و نازاکان ڕاوەستاوە! ئەگەر باهۆز دایە زوهرەی لەتوپەتیش بکا، یەك فیشەکی بۆ نادۆزرێتەوە!

شاخ و دەشت هەمووی پڕ لە بەفر بوو. وڵات هەمووی سپی دەچوو. حەمەد و هاوڕێیانی گەیشتنە ماڵی کوێخا مەستانی. مردووەکە کفن کرابوو و ژنان دەوریان دابوو و شینیان لە سەر دەگێڕا. کاتێك هەستیان کرد حەمەد و هاوڕێیانی هاتوون، ساتێك بێ‌دەنگ بوون و پاشان دەستیان بە پێ‌هەڵگوتن و شینگێڕانێ کردەوە. کۆمەڵێك لاوی مندالکار لە دەرێ، لە سەربانی هۆڵەمەڕێکی کە بە وشکە بەردی دروست کرابوو، ڕاوەستابوون. داربەڵکێك لە سەرەوەی بانی هۆڵەکەی بوو و لکە ڕووت و درێژەکانی بە سەر بانەکەی دا بڵاو کردبوو. لاوەکان لە حاڵێك دا هەموو دڵیان پڕ بوو و گریانیان دە ئەوکێ مابوو، گوێیان بۆ شینگێڕی‌یەکەی هەڵخستبوو. ژنەکان هێندە زۆر بوون، لە ژوورەکە و لە هەیوانێش جێیان نەدەبۆوە. وردە وردە حەسارەکەشیان پڕ کرد و گەیشتنە سەربانی هۆڵەکە و بن دار پەلکەکەش.

کاتێك لاوه مێرمنداڵەکان چاویان بە حەمەد و هاوڕێیانی کەوت، هەستانە سەر پێ، دەستیان لە سەر سینگیان دانا و بەخێرهاتنیان کردن. دەسبەجێش جێگای خۆیان بۆ ئەوان چۆڵ کرد و بۆخۆیان کشانەوە پشتەوە.

ژنێکی کەڵەگەت و بەخۆوە بە مردووەکەی هەڵدەگوت و ئەوانی دیکەش هەموو بۆیان دەگێڕایەوە. کاتێك ژنەکە چاوی بە حەمەدۆکی کەوت، هەستایە سەر پێ، ئەوەندەی دەیتوانی دەستی بۆ ئاسمانی هەڵێنا، کۆخەیەکی کرد، گەرووی خاوێن کردەوە، پشوویەکی هێنایەوە بەر خۆ، پڕ بە گەرووی دەنگی بەرز کردەوە و تێیچریکاند:

ــ لە پەنا سپیدارەکانی چیای دوڵدوڵی، لە کن ڕەوەزەکانی دەروازە سووری! بەڵێن بێ ناوت نەهێنم، ئەگەر ماڵی هەموو دەوڵەمەندان بە سەر یەك دا نەڕووخێنێ...

ژنەکانیش ئەو بەندانەیان دووپات دەکردنەوە و زایەڵەی دەنگیان دۆڵەکەی پڕ دەکرد.

ــ کوڕە ئازاکان، قارەمانەکان ــ با سنەوبەرەکان بگرین ــ ئەوان مەستانی خۆشەویستی منیان کوشتوە! سەگان خوێنەکەیان لستۆتەوە...

ژنەکە سەری زیاتر هەڵێنا و چاوی لە حەمەدۆکی کرد:

ــ ئەمن دەگریم و دڵم لە تاوان ئاور دەگرێ ــ دوژمن تینووی خوێنە ــ دە هەستە مەستان، ڕۆڵە مەستان، دە هەستە! ــ ئاخر حەمەدۆك هاتوە سەرت بدا!

پاشان ژنەکە داهاتەوە، کفنەکەی لادا و دەموچاوی مردووەکەی وەدەرکەوت:

ــ قارەمانی من مردوە، بەڵام دە وەرن چاو لە مەستانی من کەن! بزانن لە مردنێش دا هەر پێدەکەنیوە، ئێستاش پێدەکەنێ...

پاشان سەربەرگی مەستانی هەڵێنا و بۆ لای حەمەدی ڕاداشت.

ــ گوللەکانت وێکەوتن ــ گیانت وەك کۆترێك فڕی ــ تەمەشا کەن لەشی پڕە لە گوللە ــ بەڵام ئەو کەسەی ناوی حەمەدۆکە، دەبێ تۆڵەت بستێنێ...

ژنەکە دەسرۆکەیەکی حەریری لە پەنا تەرمەکەی هەڵگرتەوە و بردی بۆ حەمەدۆکی:

ــ لە ڕێگای دەروازە سووری ــ چ گوڵەسووری بەهەشتێی لێ‌تێن، بیانچنم ــ دەسرۆکە حەریرە خوێناوییەکەتم دا بە حەمەدۆکی...

ژنەکە گەڕایەوە شوێنی خۆی و فرمێسکەکانی بە چارشێوەکەی سڕینەوە. ژنەکانی دیکەش وەك وییان کرد. ئەوجار ژنەکە دەستی ڕاستی بەرەو ئاسمان بەرز کردەوە. وەك ئەوەی دروشم بدا:

ـ خوایه گیان بمانبەخشە ـ ئەو خۆشەویستەم ئاوا جوان دەڕوا ـ هەزار کوڕیشم بوایە، هەموویانم بە قوربانی حەمەدۆکی دەکردن.

پاشان کفنەکەی بە سەر مردووەکەی دادایەوە:

ـ لە نێوەڕاستی دەروازەسووری ـ جەرگم کون کونە ـ ئەوەی بێتاوان دەکوژرێ ـ لە گەڵ حەمەدۆکی‌یە! تۆفان، باهۆز، بە لەعنەت بی ـ ئەو کەسەی ناوی حەمەدۆکە ـ زۆری پێ‌تاچێ سزات دەدا! ئەستێرە لە ئاسمانێ دەبارن و عەرزی ڕووت دادەپۆشن، کوڕی من سەرمایەتی ـ مەستان گیان، ڕۆڵە، دە هەستە ـ ئاخر حەمەدۆك بۆخۆی فەرماندەری شەڕێیە!

ژنەکە ماندوو ببوو. ژنێکی دیکە، یەکی باریکەڵەی سەرسپی هاتە جێگای. هەموو ژنەکان دەگریان... ئەو جار نۆبە گەیشتە ژنێکی جحێڵ. دەنگی ئەو ژنە شینگێڕەی ئەوەندە خەمبزوێن بوو، کە چەتەکانیش هەموو گریان.

دوای ماوەیەك، شینگێڕی تەواو بوو. مردووەکەیان هەڵگرت، هێنایان لە نێوەڕاستی حەساریێ، لە سەر بەردێکی پانیان دانا. بەردەکە وێنەی هێشوە ترێ و سەرەبەرانی لێ‌هەڵکەنرابوو. گوندەکە مەلا و مزگەوتی نەبوو. مەلا فەرهاد و هەموو پیاوەکانی دیکە لە کانی‌یەکەی دەسنوێژیان هەڵگرت. پاشان مەلا فەرهاد باسکی هەڵکرد، تەرمەکەی ـ کە هێشتا خوێناوی بوو ـ شوت، ئاوی پێدا کرد، وشکی کردەوە و دە کفنەکەیەوە پێچا. ئەو جار دارەتەرمێکیان هێنا، تەرمەکەیان لە سەر دانا و پیاوان هەڵیانگرت و بردیانە گۆڕستانی دێی. گۆڕەکە ئامادە بوو، تەرمەکەیان بە خاك سپارد و گۆڕەکەیان پڕ کردەوە. ئەو جار مەلا فەرهاد لە سەر گۆڕەکەی دانیشت و بە دەنگە خۆشەکەی تەلقینی دادا.

دوای بەخاکسپارنەکەی هەموو گەڕانەوە دێی. چەتەکان دوای هەمووان گەڕانەوە. خەڵکەکە چوونە ماڵە مردووەکەی و سەرەخۆشی‌یان کرد. دوای ئەوە حەمەد و هاوڕێیانی هاتنەوە ماڵی دایە زوهرەی.

کاتی نوێژی شێوان مەلا فەرهاد بەرماڵی ڕاخست و دەستی بە نوێژکرنێ کرد. دوای نوێژەکەش چۆکی دادا و ماوەیەك دوعای خوێندن. کە ئاوڕی دایەوە، دیتی حەمەدیش بۆ یەکەم جار وەك وی چۆکی دادوە و دوعایان دەخوێنێ.

مەلا فەرهاد گوتی:

ـ ئەوە چی‌یە حەمەدۆك؟ چۆنە دوعای دەخوێنێ؟

ـ لە بەر خودای دەپاڕێمەوە یارمەتیم بدا باهۆز بکەوێتە دەست من و بی‌کوژم.

ـ جا چۆنت بکەوێتە دەستی؟

ـ لەمێژە بیرم لیٚکردۆتەوە، مەلا فەرهاد. بۆسەیەکی لە دەروازەخوێنی دادەنێینەوە و هەر چەندی پێویست بیٚ بۆی ڕادەوەستین. ئەو هەمیشە بە سواری دە پێش ژاندەرمەکان دا دەڕوا. کاتێك گەیشتە سەر تەپکی، هەموومان وێکڕا تەقەی لیٚدەکەین و لەشی پڕ دەکەین لە گوللە. بیٚگومان ڕۆژێك بە ویٚ دا هەر دیٚ.

ـ وایە، ڕێگایەکی دیکە نیە.

دەروازەخوێن دەروێك بوو، باریکە ڕێیەکی پیٚدا تیٚدەپەڕی، هەر جێی سوارێکی دەبۆوە پێیدا بڕوا. ئەو دەرووە لە شاخی، لە شوێنێکی بەرز هەڵکەوتبوو و هەردووك لای ڕەوەزە بەرد و دۆڵی قووڵ و ئاستەم بوون. دەوەرو بەریشی هەمووی ڕژد و هەڵدێر بوو. شیوێکی چڕ و بەرداوی لە لای چەپی ڕێگاکەی هەڵکەوتبوو و ئاوێکی زۆر لە سەرەوەی شیوەکەی ڕا بە خوڕ دەهاتە خوار و بە سەر بەردان دا بڵاو دەبۆوە.

ـ لە نێو ڕەوەزەکان، لە لایەکی دەرویٚ، بۆسەی بۆ دادەنێینەوەو کە گەیشتیٚ تەقەی لیٚدەکەین...

ـ ئەدی ژاندەرمەکان چ لیٚدەکەی؟ پێتوانیە ئەوان دوایە ڕێگاکان دەبەستن و گەمارۆمان دەدەن. خۆ ناکریٚ هەر دەو دۆڵەی دا بمێنینەوە و ئەوانیش دەتوانن وەك کەویٚ بمانگرن.

ـ نازانم مەلا فەرهاد. لەوانەیە نەپەرژێنە سەر شتی وا و هەر بیریش لە وەی نەکەنەوە... هەرچۆنێك بیٚ، ئەگەر ئەوەمان بۆ بکریٚ، گیانی نایب ئەلیاسی دەکڕینەوە.

مەلا فەرهاد قاقایەکی کێشا:

ـ ئەها، ئەتۆ باوەڕت بە قسەکەی وی کرد؟ ئەو بەستەزمانە خۆ ناتوانیٚ بە پێوە ڕاوەستیٚ، چ بگا بەوەی کارێکی ئاوا بکا!

ـ وا نیە مەلا فەرهاد. قسەکەم هەڵگرە! ئەگەر ئێمە هەر دەو یەك ـ دوو ڕۆژانە دا ئەو کارەی نەکەین، مام ئەلیاس دەیکوژیٚ و بۆخۆشی تیٚدا دەچیٚ.

ـ باوەڕ ناکەم وا بیٚ. ئاخر بیر لە وەش بکەوە، بۆسە دانانەوە لە جێیەکی ئاوا بۆ ئێمەش وەك خۆکوشتن وایە.

ـ بیٚ ئەوەش ئێمە هەر دەمرین، بیٚگومان زۆریشی پیٚناچیٚ! پێت وایە عارف سایم بەگ ئاوامان لە کۆڵ دەبێتەوە؟ ئەو تەنانەت دەستی لە دایە سوڵتانیش نەپاراست و لە سەر ئێمە ئەویشی کوشت. نەخێر لە کۆڵمان نابێتەوە و نایەڵی نانێکی لەو شاخانە بە ئاسوودەیی بخۆین. زۆریش ناکێشیٚ دەکوژرێین، مەلا فەرهاد!

ـ دەزانم، حەمەدۆك، چاوەکەم! بەڵام پیاو نابیٚ بە ئەنقەست خۆی دە ئاوریش باویٚ. خودا ئەوەی پیٚناخۆشە و بە گوناهت بۆ دەنووسیٚ.

ماوەیەکی زۆر دووبەدوو قسەیان کرد. مەلا فەرهاد بۆسە دانانەوەکەی پێباش نەبوو و حەمەدیش لە سەر قسەی خۆی سوور بوو:

ــ بمبوورە، مەلا فەرهاد، دەستت ماچ دەکەم و رێزت لە سەر چاومە! بەلاّم ئەمن لە قسەی خۆم پاشگەز نیم، بۆسەکەی دادەنێمەوە و هەرچی‌یەکیش ڕوو دەدا، با ڕوو بدا! لە هاورێیانیش تەنیا ئەوانەی پێیانخۆشە با بێن!

ــ باشە، باشە، رۆلّە گیان. ئەگەر ئەتۆ ناوا لە سەر ئەو بۆسەیەی سووری، با قسەی تۆ بێ. ئەمنیش دێم! کەس هەیە بلّێ نایەم؟

ئەوانی دی یەکدەنگ گوتیان:

ــ دێین، هەموو دێین.

لەو کاتە دا حەمەدە چکۆل و هێندێك کوڕی مێرمندالّی دیکەی دێی وەژوور کەوتن و گوتیان:

ــ ژاندەرمەکان بەرێوەن بۆ ئێرە. ژمارەیان زۆرە و باهۆزیشیان دە پێش دایە.

مەلا فەرهاد چاوی لە حەدۆکی داگرت و ئەویش خێرا وەلاّمی دایەوە:

ــ لێرە نا، دەچینە "دەروازە خوێن"ی. لە وێ بەسەریان دەکەینەوە.

ــ بەلاّم لەوێ زیانمان دەبێ.

ــ لێرەش هەر وا. ئێرەش شوێنێکی لەبار نیە.

ــ زۆر باشە، با برۆین! با لە پێش وان دا لە دێی وەدەرکەوین!

خەلّکی دێی تێشوویان بۆ پێچابوونەوە. شتەکانیان هەلّگرت و هاتنە دەر. دایە زوهرە حەمەدی کێشا پەنایەکی، ئەنگوستیلەیەکی زێوی دایە. ئەنگوستیلەکە نەقیمێکی ڕەشی تێدا بوو و گوتی:

ــ ئەو ئەنگوستیلەیە ئی مێردەکەمە، کە وەك بۆم گێڕایەوە لە شەڕێ دا کوژرا و نەهاتەوە. با ئەوەت دە قامکی دا بێ و نیشانە بێ لە بەینی من و تۆ دا! هەر کەس ئەو ئەنگوستیلەیەی پێبێ، ئەمن چەك و تەقەمەنی‌یەکەی دەدەم بە وی. لە بیرت بێ، ئەگەر خوا نەخواستە بریندداریش بووی، ئەنگوستیلەکەی بدە بە هاورێیەکت. دەنا بێ ئەو نیشانەیەی ئەگەر تەقەمەنی‌یەکە هێندە بێنێتەوە، بشرزێ، نای‌دەم بە کەس! دلّنیا بە سەریشم تێدا بچێ، جێگاکەی ناشکرا ناکەم.

ــ حەمەدۆك داهاتەوە و دەستی دایە زوهرەی ماچ کرد، ئەویش هەردووك لاڕوومەتی ویی ماچ کرد. چەتەکانی دیکەش هەموویان سوپاسیان کرد و مالاّوایی‌یان لێکرد.

حەمەدە چکۆل هەتا دەرەوەی دێی لە گەلّیان چوو، لە وێ لە حالّێك دا کولّ گرتبووی گوتی:

ـ ئەو جار بە خوداتان دەسپێرم، هیوادارم بە ساغ و سلامەتی بتانبینمەوە!
پاشان چووە لای مەلا فەرهادی و گوتی:
ـ شتێکم بۆ هێناوی، لێمەرگرە! ئەوە گۆشتی سوورەوە کراوە و دایکم بۆی ساز کردووی. دەمزانی گۆشت مریشکت پیٚخۆشە، بەلاٚم نەمدزیوە. خودا هەر دووك چاوم کوێر کا، ئەگەر لە خزمەت تۆ دا درۆیە بکەم! دەزانم پیاوچاکی وەك تۆ شتی حەرام ناخۆن. ئێمە کەلەبابێکی سپیی، قەلەوی گەورەمان هەبوو، ڕەنگی بەفریٚ. ئەوە گۆشتی کەلەبابەکەیە، بۆ تۆ چاکە، بیخۆ نۆشی گیانت بیٚ! باوەڕیشم پیٚناکەی، ئەوە بیدە بە حەمەدۆکی! دەیخوا و هەر گوێشی نابزویٚ!
ـ گۆشت کەلەبابی خۆم بۆ دەدەم بە خەلکی، حەمەدە چکۆل؟ دزیبێشت هەر دەیخۆم!
ـ خودا پشت و پەنات بیٚ، مامۆستا!
پاشان کوڕەکە چوو بۆ لای حەمەدەۆکی. هەردووکییان بەیەکەوە ماوەیەك سرتەیان کرد و پیٚکەنین. لە دوایی دا یەکتریان دە باوەش گرت، مەلا فەرهادیش دە باوەشی گرت:
ـ مخابن هێشتا مندالم، دەنا قەتم بەجیٚنەدەهێشتن!
ئیدی پشتی تیٚکردن و بە ڕاکردن ڕۆیشتەوە بۆ لای دێی.
حەمەد و هاوڕێیانی شەویٚ تا بەیانی ڕانەوەستان و هەر ڕۆیشتن. تەیموور کە هەموو ئەو شوێنانە بەرد بە بەرد و دار بە دار بەلەد بوو، وەپێش دەکەوت و ئەوانیش بە دوای دا دەڕۆیشتن. سەرەڕای ئەوەی بەفر لە پشتێندیٚ بوو، لای بەیانی گەیشتنە دارستانێکی سەرەوەی گوندی "چنارۆك"ی. باشترین شوێن بۆ خۆحەشاردان لەو دێیەی، مالی سەرجووخە حوسێن چاوشینی بوو. تەیموور ڕەخت و تفەنگی لە خۆ کردەوە، گۆچانێکی بە دەستەوە گرت و چووە نێو دێی. حوسێن بە دیتنی خۆشحال بوو:
ـ دەترسام! زووتر گەیشتبانیٚ پێوە دەبوون... ئێمە خەلکی دێی کاتێك زانیمان ژاندەرمە دێن بۆ ئێرە، دێمان چۆل کرد، چووینە شاخی و دە کەپر، کۆخ و ئەشکەوتان دا ماینەوە. هیچکەس دە دێی دا نەمابوو. ژاندەرمەکان ئەوەندەی لە دێی دا مابوونەوە، هیچ ولاٚتیان لیٚنەهێشتبووین. هەر خۆراکێکی وە دەستیان کەوتبوو خواردبوویان و دوایە ڕۆیشتبوون. هەر ئەوان ڕۆیشتن و ئێمەش داپەڕین و هاتینەوە خواریٚ. دیٚ هیچی تیٚدا نەمابوو! نە مەڕ، نە مریشك، نە بزن، هەر هیچیان وە پاش خۆ نەدابوو. تەنانەت ئارد و ڕۆنیشیان نەهێشتبوو! ئەوە حالوبالی ئێمەیە... ئەگەر کوڕەکانت دەگەلن، بچۆ بیانهێنە خواریٚ! پێموانیە ژاندەرمە بەو زووانە بێرە دا بێنەوە...
تەیموور گەڕایەوە و هەموو وێکڕا چوونە خواریٚ. مەلا فەرهاد بە بەسەرهاتی ئەو گوندەش زۆر تێکچوو، چاوێکی لە کیسەکەی خۆی کرد و سکە زێڕەکانی ژمارد. پاشان بە حوسێنی

گوت، خەڵکەکەی لە شوێنێکی کۆ بکاتەوە. کاتێك خەڵکەکە هەموویان کۆ بوونەوە، مەلا فەرهاد، حەمەدۆك و هاوڕێیانیشیان چوون بۆ لایان. حەمەد لە شەرمان سەری هەڵنەدەهات.

حوسێن بە دەنگی بەرز گوتی:

ـ هەر ماڵە و پیاوێك بێ و لەو بەرەی بە جیا ڕابوەستن!

دەسبەجێ هەر ماڵەو یەك کەس هاتن و لە لایەکی ڕیز بوون. پیرێژنێك لە پێش هەمووانەوە بوو. حەمەد لێی‌پرسی؟

ـ لە ماڵی دا چەند کەسن؟

ـ دوو...

یەك لە دوای یەك ئەو پرسیارەیان لێ‌دەکرا، بە پێی سەر پووڵیان دەدرایە و بەرێ دەکران. کیسەکەی مەلا فەرهادی بەشی نەکرد و ناچار بوون کیسە تایبەتی‌یەکەی حەمەدی، کە لەبن فیشەکدانی لە خۆی بەستبوو، بکەنەوە و ئەویش دابەش کەن. کاتێك بۆ لای ماڵی حوسێن چاوشینی دەگەڕانەوە، مەلا فەرهاد گوتی:

ـ ئێستا ئیدی پووڵمان نەماوە حەمەد. دەزانم پێت خۆش نیە لەم بارودۆخە دا چالاکی‌یەکی پوولکۆکرنەوەی بکەین، بەڵام بڵێین چی! ڕاستی‌یەکەی ئەوەیە ناچارین بە سەر هێندێك بەگی دەوڵەمەندی بەنێوبانگی دولکادیرلی‌یان دا بدەین. دیارە تەنیا ئەوانەی کە ڕەگەزنامەیان مۆری قەیسەری پێوەیە!

ـ بەڵێ، دەبێ وا بکەین...

ـ ژاندەرمە ئەو خەڵکەی لە برسان دەکوژن! دەڵێی چی جارێ پێش ئەوەی بۆسەکەی بۆ باهۆزی دانێینەوە، بچین بەگی گوندیشلی ڕووت کەین و پوولێکی چاکی لێ‌بستێنین؟

ـ نا، با جارێ لە وەی گەڕێین! ئەگەر ئەو باهۆزەمان لە سەر ڕێی خۆمان پاك کردەوە، ئەو دەم بە کاوەخۆ پلان دادەنێین و هەرچی بەگی دولکادیرلین، لە شاخ و دەشتێ، ڕووتیان دەکەین!

مەلا فەرهاد ئیدی لە سەر باسەکەی نەڕۆیی. چوونە ژوورێ. کوڕەکانی حوسێنی بەرانێکیان کوشتبۆوە، گۆشتەکەیان چاك کردبوو و ئێستا هەر ئەوەندەی دەویست لە سەر پۆلووانی دانێی و بی‌برژێنێ. ئەو بەرانەش لە گەڵ چەند سەر مەڕ لە دەرەوەی دێی لە کۆخێکی دابوون و ژاندەرمە نەیاندیبوون. لە جیاتی سفرەی لبادێکی نەخشینیان دانابوو. نەخشە جوانەکانی لبادەکەی لە بەر شۆقی ئاوری دەدرەوشانەوە.

دوای نانخواردنێ حەمەد داوای کرد هێندێك کەپەنکیان بۆ پەیدا کەن. حوسێن دەسبەجێ وەخۆ کەوت و چەند دانە کەپەنکی بۆ هێنان. هەر کەپەنکەی وێنەی دوو خۆری بە لای سینگی‌یەوە بوو. تیشکی خۆرەکان وەك شۆقی ئاوری بە دەوری خۆیان دا بڵاو ببۆوە.

سەرجووخە حوسێن گوتی:

ـ بە ڕاستی ئەو کەپەنکانە شتی چاکن، مەلا فەرهاد! ئەوەت پێوەبێ، چەند ڕۆژان لە نێو بەفر و بۆرانیش بەرێدەچی و پەکیشت پێناکەوێ. خۆ دەزانن، پێش هەموو کەس شوانان کەپەنکیان دروست کرد. نێو کەپەنکی وەك تەندووری گەرمە! سەرهەنگ باهۆز وەك باوبۆرانی بە سەر دێیەکامان دادەدا، خەلکی دەکوژێ و مالوێرانیان دەکا. پیاوێکی ڕەق و داخ لە دڵە! ئەرێ بە ڕاستی ئەو کەپەنکانەتان بۆ چن؟ نەکا بە تەمابن ئێستا وەسەرکەون بۆ لای دەروازەخوێنی و بۆسەی دابنێنەوە:

حەمەد گوتی:

ـ ئەرێوەڵڵا بە تەما شتێکی واین!

ـ سەردەمێك پێش ئێستا، جارێکیان، هەر لەو شوێنەی، یاغی‌یەك کە ناوی "گۆجە" بوو، بۆسەی بۆ یاوەر شوکرووی دانایەوە و کوشتی...

حەمەد ڕووی بۆ لای مەلا فەرهادی وەرگێڕا و ئەویش گوتی:

ـ خوا گەورەیە! خۆمان بە وی دەسپێرین. ئیشاڵڵا ئەو ئاگای لێمانە!

ئەوانی دیش هەموو یەکدەنگ گوتیان:

ـ ئیشاڵڵا!

هەموو شتێکیان ئامادە کرد، ئەوەی پێویستیان بوو، پێچایانەوە، لە کۆڵیان نا، وەڕێکەوتن و دوای ماوەیەك خۆیان گەیاندە دەروازە خوێنی. لە وێ لە نێو گابەردەکان دا خۆیان حەشار دا و بۆسەیان دانایەوە. دیسان بەفر دەستی بە بارینێ کردەوە و سەربەرگەکانیشیان وەك عەرزەکەی سپی بوو. سێ شەو و ڕۆژان لە وێ مانەوە. دەو بەینەی دا چەند دەستە ژاندەرمە هاتن و بە بەر دەمیان دا تێپەڕین. فەرماندەرەکانی ئەوانیش بە سواری لە پێشێ دەڕۆیشتن و ئەگەر چەتەکان ویستبایان، سووك و هاسان ژمارەیەکی زۆریان لێدەکوشتن، بەڵام مەبەستی وان بە هیچ شێوەیەك ئەوە نەبوو ژاندەرمان بکوژن و بە شێوەی ئاسایی تا ئەوان تەقەیان نەکردبایە، حەمەد و هاوڕێیانی لێیان نەدەدان. هەمیشەش هەوڵیان دەدا ژاندەرمەی هەر بریندار کەن و نەیکوژن. تەنانەت سەبارەت بە سەرهەنگ باهۆزیش کە ئەو بۆسەیەی بۆ دانرابۆوە، مەلا فەرهاد باوەڕی وا بوو بەو شێوەیە نەکوژرێ، بەڵام حەمەد لە سەر قسەی خۆی سوور بوو و دەی گوت ئەو کابرایە وەك ژاندەرمەی دیکە نیە. خەڵکی ئەوەندە ئازار داوە، کە بۆ بەخشین نابێ و دەبێ بکوژرێ. هەر بۆیە مەلا فەرهاد لە دڵی خۆی دا دەپاڕایەوە باهۆز بە دەروازەخوێنی دا نەیە و دە نێو بۆسەکەیان نەکەوێ. حەمەدیش بەردەوام چاوی لە تووڵە ڕێگاکەی بوو و ئامادە بوو هەر کات باهۆز بگاتێ، لێی‌دا و بی‌کوژێ. لەو بەینە دا مامۆستا زەکی نەژادی بە میداڵە زێڕە بەند

سوورەکانی سەرسینگی‌یەوە، دەهاتەوە بەرچاو و نەختە ناورینگە پۆلایەکە لە چاوی دا دەبریسکایەوە. هەمیشە لە سەنگەرەکەی دا دەمایەوە، نەدەبزووت و قامکی لە سەر پەلەپیتکە و چاوی لە سەر سێرەی هەڵتەدەگرت.

هێندە مانەوە، ئاخرەکەی وەڕەز بوون. حەمەد ڕووی دە مەلا فەرهادی کرد:

ـ بەختی فەقیری نای‌گرێ...

هێندێك ڕاوەستا و قسەکەی درێژە دا:

ـ ئەگەر فەقیران بەختیان هەبوایە، بۆ ژیانیان وا دەبوو؟

ـ دەڵێی چی حەمەد... نەڕۆین؟

ـ ئەی چ بکەین، کاکە، چارەمان نیە. ئەو دڕندەیە نەهات، خوا دەزانێ ئێستا لە کوێیە...

هێشتا بە تەواوی لە نێو گابەردەکان نەهاتبوونە خوار، کە گورزوگومبەت بە سەر دەستێك ژاندەرمە دا کەوتن. ڕاست دەستەکەی سەرهەنگ عەزمی بوو، بۆخۆی بە سواری ئەسپی لە پێشەوە دەڕۆیشت. حەمەد دەسبەجێ تەقەی لێ‌کرد، بەڵام ئەویش هێندە تەڕدەست خۆی لە ئەسپەکەی فڕێ‌دایە خوار، کە گوللەکە ئەوی نەگرت و زینی ئەسپەکەی ڕووشاند. تازە نیوەڕۆ ببوو. شەڕیکی قورس دەستی پێ‌کرد و هەتا ئێوارێ خایاند. کە بوولێڵ پەیدا بوو، حەمەد و هاوڕێیانی کشانەوە و خۆیان گەیاندەوە گوندی چنارۆکی. بەڵام ئەویش ئیدی بۆ مانەوەی نەدەبوو. پیاوەکانی سوڵتانۆغڵی‌یە زەردەی و دەستەیەك بەکرێگیراوی بەگ و ئاغای دیکە لەو دەوروبەرەی بوون و لێیاندەگەڕان. ئەوە باش بوو، جووتێرەکان بە دایم هەتڵەیان دەکردن و نەیاندەهێشت لە شوێنی حەمەد و هاوڕێیانی ئاگادار بن.

ڕۆژێکی حەمەد بە مەلا فەرهادی گوت:

ـ کاکە بە ڕاستی ماندووین و خەریکە دەکەوین. ئەوە چەند مانگە ژاندەرمەمان بە دووەوەن و بۆخۆشمان بە دوای باهۆزی‌یەوەین. بە باوەڕی من با ئەو ناوچەیەی بەجێ‌بێڵین، بچینە گوندی "سەرچاوە"ی، لە چیای دوڵدوڵی و پاشماوەی زستانێ لە وێ بین. کەس فکری وێ ناکا، ئەگەر پێشیان زانین، دەتوانین هەڵگەڕێینە بناری شاخی. بە ڕاستی ئەو کەپەنکانە چاکمان دە فریا هاتوون و زۆر باشە کە پێمانن! خەڵکی سەرچاوەش هەم ئازا و هەم جێگای باوەڕن و دەتوانین پشتیان پێ‌ببەستین. ئەمن پێم‌وایە سەریشیان بچێ، خەیانەتمان پێ‌ناکەن و ئێمە بە دەستەوە نادەن...

هاوڕێکانی حەمەدی هەموویان ئەو فکرەیان پێ‌باش بوو. چەند ڕۆژان بە نهێنی لە ماڵی حوسێن چاوشینی مانەوە و دوایە بەرەو چیای دوڵدوڵی وەڕێ‌کەوتن. هەر وا کە مەنزڵ بە مەنزڵ

دەڕۆیشتن، بە سەر سێ بەگی گەورەی عەشیرەتی دولکادیرلی‌یانیشیان دادا. هەر سێك بەگ ڕەگەزنامەی باوەڕپێکراوی بە مۆری قەیسەریانەوە هەبوو. بەو شێوەیە پوولێکی زۆریشیان بە مەبەستی یارمەتیکردن بە نەداران و ئەو مندالآنەی بابیان دە شەڕێ دا کوژرابوون، کۆ کردەوە. پوولەکە لانی کەم خەلکی چاولەدەستی پازدە دێیانی پێ دەبووژایەوە.

هەر ڕێگای سیگارکێشیکیان مابوو بگەنە گوندی سەرچاوەی، کە لە بەستێنی چۆمێکی دا، کە ئاوی تێ‌دا نەبوو و پڕ لە بەفر بوو، تووشی ژاندەرمان بوون و لێکیان دا. تاریکوڕوونی بەیانی شەڕەکە دەستی پێ‌کرد و تا نیووەڕۆیە درێژەی کێشا. شاهێن و تەیموور کوژران. مەلا فەرهاد و حەمەد لە تاوان ئەوجار بە قەستی کوشتنێ ژاندەرمەیان داگرتن. سەرەنجام توانیان ژاندەرمان تێلكبشکێنن، دەرباز بوون و لای تاریکانێ خۆیان گەیاندە نێو گوندی سەرچاوەی. لە وێ دۆستەکانیان بەپیریانەوە هاتن. برینداره‌کانیان بە خەلکەی ئەسپارد و بۆخۆشیان هێندێك شوانیان وەپێش‌کەوتن و بردیانن بۆ بناری شاخی تا لە وێ لە حەشارگەیەکی دا بمێننەوە. بریندارەکان دەبوایە بە پشتی هێستران، گوێزرابانەوە گوندی "گولەڕەش"ی، بۆ لای "ئەسیمی" برینپێچ و نەشتەرگەر. ئەو ئەسیمە نەشتەرگەرێك بوو، وەك دەگوترێ، دەی‌توانی مردووی زیندوو بکاتەوە و ئەو زانستەش لە خانەقای چلچاوی فێرببوو.

خەلکی گولەڕەشیش جێگای متمانە بوون و حەمەدۆك دەی‌زانی سەریشیان بچێ، باهۆز هیچ ، نایەلن شەیتانیش بە جێگای بریندارەکان بزانێ.

باهۆز و ژاندەرمەکانی، لە گەلێ بەکرێگیراوانی بەگەکان هەتا بن ڕەوەزە بنەوشی‌یەکانی چیای دولدولی بە دوایان دا چوون. تینیان بۆ عەلی‌یە شەل و مووسا زریانیش هێنا کە شوێنی چەتەکان هەلگرن، بەلآم دوای ماوەیەك خولانەوە نەیان‌توانی هیچ شوێنێك بدۆزنەوە. یاغی‌یەکان وەك عەرز قووتی دابن، ون ببوون. ناچار ژاندەرمەکان بە شپرێوی و شەکەتی داگەڕانەوە خوارێ. زۆربەیان دەست و لاقیان سەرما بردبووی.

زۆری پێ‌نەچوو دەستەی حەمەدۆکی خۆیان گەیاندە کێوی "کۆنوور"ی. سەرهەنگ باهۆز لە داخان دەتگوت تەقی: ئاخر ئەوانە کوێرا گەیشتنە ئەوێ؟ بۆچما بالیان هەبوون کە لەو بەفر و بۆرانەی دا، بە چەند ڕۆژان لە چیای دولدولێ ڕا خۆیان گەیاندە کۆنووری؟ ئەوجار و بۆجاری یەکەم باهۆز هەستی بە چەشنە ڕێزدانانێکی تێکەلاو لە گەلێ سەرسوڕمان لە دەروونی خۆی دا بەرامبەر بە حەمەدۆکی کرد. ئەو هەموو ڕاوڕاوێنەی بەو دەستەیەی کرا؟ بەلآم بێ‌سوود! هێشتا حەمەد بە تەواوی لە چیای دولدولی نەدیترابوو، کە هەوالی پەڕینەوەی خۆی و دەستەکەی بۆ چیایەکی دووری دیکە، کە پێیان دەگوت "ئاخرکێو"، گەیشت.

مەلا فەرهاد، دورسوونە کوردە و ئەوانی دیش، هەموویان شەکەت ببوون. برینداره‌رکانیش کە دوای تیمارکران لە لای نەسیمی، هەموو گەڕابوونەوە گەڵ دەستەکەی و ئامادە نەبوون هاوڕێیانیان بەجیّ‌بێڵن، هەر ماندوو بوون. حەمەدۆك بۆخۆشی لە وان حەساوەتر نەبوو، بەڵام ڕانەدەوەستا. هەر بە دوای دەرفەتێك دا دەگەڕا کە باهۆزی بە سزای خۆی بگەیەنیّ. هەموو جاریّ کە تووشی یەك دەبوون و شەڕ دەقەوما، ژاندەرمان دیوارێکیان بە دەوری سەرهەنگ عەزمی دا دەکێشا و نەیاندەهێشت گوللە بی‌گریتەوە.

ڕۆژیکیان هەواڵێك بە گوندەکانی چیا دا بلاّو بۆوە: سەرهەنگ عەزمی، ناسراو بە باهۆز، لە حاڵێك دا لە پێش گورهانەکەی خۆی ڕۆیشتوە، کەوتۆتە بۆسەوە، گوللەیەکی ویّ‌کەوتوە و کوژراوە. دێهاتی‌یەکانی ئەو دەوروبەرەی دەزانن شەڕەکە چۆن بووە، دەشزانن کیّ باهۆزی کوشتوە، بەڵام بۆ هیچ‌کەسی ئاشکرا ناکەن و تەنانەت لە نێو خۆشیان دا باسی ناکەن...

کاتێك حەمەدۆك و هاوڕێیانی ڕۆیشتن، نایب ئەلیاس پلانی خۆی بە وردی دارشت: هێندێك کەسی جێگای بڕوای هێنانە یارمەتیی خۆی و پێی‌ئەسپاردن بە دایم و بە بیّ ئەوەی بێڵن هیچ‌کەس شك بکا، هەموو ئەو ڕێگایانەی دەچوونەوە سەر دەروازەخوێنی، بخەنە ژێر چاوەدێری‌یەوە و ئیدی باڵندەیەکێش بە سەر ویّ دا فڕیبا، دەسبەجیّ نایب ئەلیاس دەی‌زانی‌یەوە. هەموو شتێك بیری لی‌کرابۆوە. ئەلیاس تفەنگەکەی چەور کردبوو و خاوێنی کردبۆوە. ئەسپی هەمیشە تێر بوو و بە زینەوە ئامادە بوو. دوو توورەکەشی فیشەکی زیادی دانابوو. چەند ڕۆژ بوو خەریکی ئامادەکاری بوو، تا پلانەکە ڕێکوپێك بیّ و بتوانیّ ئەو کابرایەی سووکایەتیی پیّ‌کردبوو، بە سزای خۆی بگەیەنیّ.

بەیانی‌یەکی زوو، یەکێك لە چاوەدێرەکان کە ناوی "وەیسە" بوو، بە پەلە، بە سواری ئەسپێکی هات و لە حەساری ماڵی مام ئەلیاسی دابەزی. وەیسە برازای نایب ئەلیاسی بوو و بابی دە شەڕی سەربەخۆیی دا کوژرابوو. ئەو چووە لای مامی و بە دەنگێکی سەبر، بۆ ئەوەی کەسی دیکە نەزانیّ، پێی‌گوت کە سەرهەنگ باهۆز قەرارە پێش نیوەڕۆیە بە دەرووی دەروازەخوێنی دا بڕوا. نایب ئەلیاس سندووقی شتومەکەکانی هێنا، دەستێك کەواوپانتۆڵی هەرە جوانی لە گەڵ کراسێکی بە دەزووی زەرد پەڕاوێز بۆکراو و دەسرەیەکی بەر پشتێنیّ لیّ هێنایە دەر. بە ڕێکوپێکی جلەکانی دەبەر کردن. سەعاتەکەی دە گیرفانی لای چەپی جلیقەکەی نا و زنجیرەکەی بە سینگی دا شۆڕ کردەوە، سمێڵەکانی بادان، فیشەکدانی لە خۆ بەست، تفەنگی دە شانی کرد، سواری ئەسپەکەی بوو و ماڵاوایی لە خەلکی دێی کرد. خەلکەکەش کە پێیان وابوو

دەچێتە سەفەرێ، داوای سەفەرێکی خۆشیان بۆ کرد... ئەو جار مام ئەلیاس ئاوزەنگیی لە ئەسپە ڕەسەنە بەکەیفەکەی توند کرد و بە پرتاو لە دێی وەدەر کەوت. لە سەر شاخی، هێندێك خوارەوەتر لە دەروازەخوێنی، بە لای ئەدیوی دا، ئەسپەکەی لە پنچکێکی بەستەوە و چوو لە نێو گابەردەکان کە بە سەر دەرووەکەیان دا دەڕوانی، بۆسەی دانایەوە.

چاوەڕوانیی مام ئەلیاسی ماوەیەکی زۆری نەخایاند و سەرهەنگ عەزمی، کە ئەسپێکی کوێتی دە بن دا بوو و لە پێش ژاندەرمەکانەوە دەهات، وەدەرکەوت. ئەو پیاوێکی باریکەڵە بوو، ڕوومەتی هێندێك بەقوولێ دا چووبوون، دەموچاویشی باریك بوو و سمێڵی ماش و برینجی ببوون. سەرهەنگ لە سەر زینەکەی نەدەحەجمی و بەردەوام سەری بۆ ئەملاو ئەولای خۆی دەسووڕاند. کاتێك نایب ئەلیاس باهۆزی چاو پێ‌کەوت، هەستی کرد دڵی وێلەهات و مچوڕکی هاتێ. ڕاست لەو کاتە دا وە بیر ئەو سەرهەنگەی کەوتبۆوە، کە لە سەردەمی شەڕ دا فەرماندەری خۆی بوو و بە شێوەیەك زگی بە سەرهەنگ عەزمی سووتا. سەرهەنگەکەی خۆشی چاوی شین بوون... ئەلیاس لە بیری نەمابوو داخوا چاوی سەرهەنگ باهۆزیش شینن، یان نا... وەبیرهاتنەوەی سەرهەنگەکەی خۆی، کە زۆر پیاوێکی چاك بوو، مام ئەلیاس زۆری خۆش‌دەویست و ڕێزی دەگرت، هێندەی نەمابوو وای لێ‌بکا لوولەی تفەنگەکەی شۆڕ کاتەوە و دەست لە کوشتنی ئەو سەرهەنگەی بشوا. بۆ ئەوەی ئەو بیرە کۆنە تینی بۆ نەهێنێ، دوو جاران لە دڵی خۆی دا گوتی: نا، ئەو کابرایە شەرەفی منی بردووە و سووکایەتی پێکردووم! ئەو کابرایە پێی‌وانیە ئەو خەڵکە بایەخی پووشێکیشیان هەیە! ئەو جار غیرەتی هاتەوە بەر و ڕقەکە لە نێو دڵی دا بڵێسەی کێشایەوە. سەرهەنگ عەزمی گەیشتبووە بەرامبەری و شوێنەکە زۆر لەبار بوو. ئیدی سێودووی لێ‌نەکرد، سێرەی گرت و پەلەپیتکەی کێشا. دەستی هیچ نەلەرزی. تەقە لە تفەنگێ هات و سەهەنگ عەزمی لە سەر زینی ئەسپەکەی ڕا بەربۆوە خوارێ و تەخت بە سەر بەردەکانی قەراغ ڕێگایە دا کەوت.

نایب ئەلیاس لە سەرەخۆ تفەنگەکەی دە شانی کردەوە و بە نێو گابەردەکان دا بۆ لای ئەسپەکەی داپەڕی. ژاندەرمە دیتیان و دەسرێژیان لێ‌کرد. گوللەیەك پشتی پێکا، بە سەر زگ دا کەوت، هەستایەوە و دیسان کەوتەوە. لە گەڵ ئەوەی وەك بارانێ گوللەی بە سەر دا دەباری، توانی لە سەرەوژێرەکەی بێتە خوارێ، بۆلای ئەسپەکەی دەرباز بێ و سواری ئەسپەکەی بێ. ئەو جار نایب ئەلیاس توند یاڵی ئەسپەکەی لە دەستی خۆی ئاڵاند و پشتی کووڕ کردەوە. ئەسپ وەك تیری نێو کەوانی دەرپەڕی، لە وێ دوور کەوتەوە و هەتا نەگەیشتەوە بەر دەرگای ماڵی خۆیان ڕانەوەستا. مام ئەلیاس لە وێ چاوەکانی هەڵێنان و لە خەڵکی دێیەکەی ڕوانی کە هەموویان بە گەورە و چکۆڵەوە هاتبوون و حەسارەکەیان پڕ کردبوو. پشتی ئەسپەکەی

له خوێنیێ دا سوور ببوو. نایب ئەلیاس دانەبەزی، دوای ئەوەی هێندێك دە خەلکەکەیەوە ڕاما، لغاوی ئەسپەکەی کێشا، سەری وەرسووڕاند، ڕکێفی توند کرد و بە سەرڕەو لە دێی وەدەرکەوت.

خەلکی دێیەکەی هەموو بێ‌دەنگ ڕاوەستابوون و هەتا مام ئەلیاس و ئەسپەکەی ئەوەندە دوور کەوتنەوە، کە لە نێو توولەڕێگای بناری چیای بەفرین دا هەر بە قەد نوختەیەکی چکۆلە دیار بوون، چاویان لێ‌کردن.

ئیدی هیچ‌کەس نایب ئەلیاسی نەدیتەوە و کەسیش نەیزانی چیی لێ‌هات و بۆکوێ چوو. دواتر زۆریشی بە دوا دا گەڕان، بەلام نە بە زیندوویی و نە بە مردوویی هیچ کەس شوێنەوارێکی لە نایب ئەلیاسی پیر نەدۆزیەوە.

## (٢٤)

شنەبایەکی خۆش دەهات. ڕۆژ گەرما وتیشکی خۆی بە سەر شاخ، دۆڵ و مێرگان دا دەڕشت. باڵندە و گیانلەبەری دی هەموویان لە خەوی زستانیێ وەخەبەر هاتبوون، لە کونەکان و هێلانەکانیان هاتبوونە دەریێ و لە بەر شۆقی ڕۆژیێ دەخولانەوە. لە ماوەی چەند ڕۆژان دا هەمیشە بەهار و گەزیزە سەریان وەدەرنا، پشکووتن و تەپك و دۆڵو دەرەیان پڕ کردن. دەوری پنچکان و سەر جۆگە و دەراوان پڕ بوون لە وەنەوشەی وردیلە و بۆنی خۆشیان دە وڵاتی گەڕا. پۆل پۆل هەڵاڵە و بەیبوون لە نێو ڕەوەزان پەیدا بوون. مێلاقە پشکووتن. گیا شین بوو و شاخ و دەشت پڕ بوون لە گوڵ و ڕووەکی جۆراوجۆر. بەیانی کاتێك ڕۆژ لە ئاسۆ دەرکەوت، ئەوەندە گەش و جوان بوو، دەتگوت یەکەم جارە خۆی بە جیهان و خەڵکەکەی نیشان دەدا. هەزار و یەك بۆنی جۆراوجۆر لە هەموو گۆشە و لایەکی ڕا دەهاتن. پەپوولەی جوان جوانی گەورە گەورە، زەرگەتە کە باڵیان وەك شووشەی ڕوون بوو و خاڵی سەوزی تیێدابوو، مێروو، گورگ، ڕێوی، ورچ، مێشومەگەز و ژووشك و هەموو جڕ و جانەوەری دیکە گیانێکی نوێیان هاتبوە بەر و بە دەشت و شاخان دا دەخولانەوە. باڵندە گۆشتخۆرەکان، هەڵۆکان، شەهێنەکان، باشووەکان و کۆتری هەمەجۆر دەفڕین، لە ئاسمانیێ بەرەوژوور تیێهەڵدەچوون و هێندێکیان بە دەورە، یان بەڕیز هەڵدەفڕین، هەر کامە و بە شێوەی خۆی دەیخوێند و گمە، قڕە، قیرە و قاوقیژیان دەنگی دەدایەوە. عەرز کە لە خەوێکی درێژخایەن وەخەبەر هاتبوو، لە خۆشیی ئەو ڕۆژە جوان و پڕ خێر و بەرەکەتانە مەست ببوو.

ڕۆژێکی بەیانی زوو دایە حۆری هەواڵی پیێگەیشت کە ئەسپەکەی حەمەدۆکی هاتۆتەوە عەلیکۆی و دەسبەجیێ ڕۆیی بۆ ئەویێ. کاتێك گەیشتە ئەو شوێنەی باسیان دەکرد، لە خواریێ ڕا

ئەسپەکەی دی، کە لە سەر دوندی ڕەوەزێکی بنەوشیی گەورە ڕاوەستابوو. شاخەکە پڕ بوو لە گوڵی جۆراوجۆر و ڕەنگاوڕەنگ. نەرمەبایەك دەهات و بۆنێکی خۆشی لە گەڵ خۆی دێنا و بۆڕ، مەندۆك و گیا و گوڵی دیکەش کە هەتا چۆکان دەهاتن، دەلەرانەوە، شەپۆلیان دەدا و کە دەترووانی، پێتوابوو دەشت، دۆڵ و کێو سەما دەکەن و ڕادەژێن. دایە حۆری بە ئەسپایی، لە سەر پەنجان، لە ڕەوەزەکەی وە سەر کەوت. دەترسا ئەسپەکە بی‌بینێ و بڕەوێتەوە. لە حالێك دا دڵی توند لێی‌دەدا، وردە وردە خۆی نێ نێزیك کردەوە، بەڵام جارێ نەی‌وێرا دەستی لێ‌دا و بە دەنگێکی نەرم و بە سۆز لاواندی‌یەوە:

ـ بە قوربانت بم، شۆخەکەم، ئەسپە ئازاکەم، چاوجوانەکەم! یاڵت دەڵێی پرچی کیژە جحێڵانە، وەك کەروێشکێ چالاکی، ئەسپە جوانەکەم، بوونی تۆ لێرە نیشانەی خێر و بەرەکەتە! پێم بڵێ، ئەتۆ دەبێ هەواڵێکی حەمەدی منت پێ بێ! حەمەدی من کە ڕوخساری وەك ڕوخساری ئیمامی عەلی جوانە و دە غیرەت و ئازایەتیش دا وەك گەنج عوسمانی‌یە. دەی بۆم بگێڕەوە، هەرچی هەیە، بۆم بگێڕەوە، دایە حۆریی خۆت بە قوربان بێ! ماوەیەکی زۆرە هیچ هەواڵێکم چ بە چاك و چ بە خراپ، لێی نیە. گوندەکانی ئێمە پڕن لە ژاندەرمە، وردوخاشیان کردوین، ماتۆڕانیان کردووین، هیچیان پێ‌نەهێشتووین، لاق و دەستیان شکاندووین، زمانیان بڕیوین و ماڵەکانیان بە سەر دا ڕووخاندووین! باش بوو حەمەدۆکی من باهۆزی سزا داو ژیانی ئێمەشی ڕزگار کرد. بەڵێ، ئێمە ڕزگار بووین، بەڵام ئەومان لە گەڵ نیە! لەمێژە نازانم چیی بە سەر هاتوە، مردوە؟ ماوە؟ نازانین! دایە حۆری بە قوربانی ئەو چاوە ڕەشانەت بێ، دەڵێی کلیان تێ‌کراوە، بە قوربانی ئەو یاڵە جوانانەت بێ! باشە ئەتۆ نەبووی گوللەباران کرای؟ ئەو کاتی هەر یەسك و پێستێك نەبووی؟ ئەتۆ نەبووی لە تەنیشت پردێ مردبووی، بەڵام دوایە لە سەر دەستی چلسوارەی غەیبی زیندوو بوویەوە و بوویە حودوودێك؟ پاشان ئەفری بۆ ئاسمانێ، نەبووی بە هەورێکی بۆر و کاتێك بە سەر شارەکان دا دەڕۆی، پیاوخەراپان بە دەنگی حیلەت خەویان لی‌تاڵ نابێ؟ بۆچما نەچوویە گەڵ ئەسپەبۆری کوێرۆغلی، و بوراقی، کە بە ڕوخسار ژنە و حەزرەتی محەممەد کاتێك چوو بۆ لای بینایی چاوان، سواری بوو؟ نەچوویە لای دولدولی حەزرەتی عەلی و ئەسپە عەرەبی‌یە ڕەسەنەکەی گەنج عوسمانی، ئەو گەنج عوسمانەی سەری خۆی بە دەستەوە بوو و شەڕی دەکرد؟ بێ‌گومان خەبەری خۆشت بۆ هێناوم! خودا لە تەمەنی من هەڵگرێ و بی‌خاتە سەر نی تۆ ئەسپە کوێتە جوانەکەم! بە تەما نی باسی حەمەدی خۆشەویستم بۆ بکەی؟ دەتەوێ ئەوەم بۆ بگێڕیەوە کە هەر ئێستا ئەو لە ئالاکێوی لە پەنا ئاگرێکی گەورە دانیشتوە؟ ئەوەشم بۆ دەگێڕیەوە کە حەمەد نیازی وایە هەوەڵی هاوینێ، ئەو کاتەی گیا دەگاتە پشتێندێ، ئەو کاتەی هەورە سپی‌یەکە لە

سەر خانەقای چلچاوی لەنگەر دەگرێ، بێتەوە لای دایە حۆری خۆی؟ باشە، ئەسپە چاورەشەکەم، یالّ ئاوریشمەکەم کە ڕاپەڕینت ڕاپەڕینی ئاسکی‌یە، دە هەرچی دەیزانی بۆ دایە حۆریی خۆتی باس بکە و ئەگەر هەواڵی خۆشت پی‌یێ، بەڵێن بی‌ گیانیشمت بوێ، دەتدەمێ!

دایە حۆری چۆکی دادا و دەستی بۆ لای ملی ئەسپەکەی برد، بەڵام دەستی لێ‌نەدا. دەترسا هەر دەستی وێی‌بکەوێ، ئەسپە کوێت دەرپەڕێ و لە چاولێکنانێك دا خۆی ون کا. ماوەیەکی دیکەش گۆرانیی بۆ گوت و لاواندی‌یەوە. دەنگی هێندە بە سۆز بوو، بەردی نەرم دەکرد. سەرەنجام دەستی بە ئەسپایی گەیاندە ملی و وردە وردە بە هەر دووك دەستان ملی خوراند و لاواندی‌یەوە. سەیر بوو، ئەسپەکە لە جێی خۆی نەبزووت و هەر سڵیش نەبوو...

دایە حۆری هەستایە سەرپێ و ئەو جار باسکی دەملی ئەسپەکەی وەرێنا و دەستی بە سەر، و گوێ و ملی داهێنا. ئەسپ هەر وا بی‌دەنگ و هەست بزێ ڕاوەستابوو و وردە وردە دایە حۆریش ترسی شکا و زانی ئیدی لە دەستی ڕا ناکا. ماوەیەکی دیکەش هەر وا دەستی بە پشت و زگ و سەری دا هێنا و لاواندی‌یەوە، ئەسپە کوێت پاشووی بڵاوکردن و تاوێکی باش میزی کرد. ئەو جار دایە حۆری بیری لەوە دەکردەوە چۆنی لەو سەرەی ڕا بێنێتە خوارێ. لە پێش دا یالّی گرت و ویستی بە دوای خۆی دا ڕای‌کێشێ، بەڵام زوو تێ‌گەیشت ناوا ئەسپەکە وە دوای ناکەوێ. پاشان بیری لەوە کردەوە سواری بێ و بی‌باتە خوار، بەڵام گریمان ئەوە توانیبای خۆی باوێتە سەر پشتی و سواری بێ، بۆچما بە بی‌زین خۆی ڕادەگرت و لە سەر ئەو ڕەوەزەی ڕا بەرنەدەبۆوە خوارێ...

ــ ئەسپە جوانەکەم، چونکە هەواڵی خۆشت لە لای حەمەدی ڕا بۆ هێناوم، چونکە بۆت گێڕاومەوە کە ئەو ئێستا ئەوە لە ئالاکۆی، یان چیای هەزارگای لە پەنا ئاوری دانیشتوە و زۆریش بە کەیفە، دەبێ لە سەر ئەو ڕەوەزەی بچی‌یە خوار و ئەو خوارەی لە سەرم ڕاوەستی.

دایە حۆری ئەوەی گوت و لە سەرەخۆ بە لەپی دەستی لە کەفەڵی ئەسپەکەی دا.

ئەسپەکە سەرەتا بازێکی چکۆڵەی دا و پاشان وردە وردە لە ڕەوەزەکەی هاتە خوارێ، ڕاوەستا، سەری وەرسووڕاند و دە دایە حۆری‌یەوە ڕاما. ئەویش بە پەلە هاتە خوار و یالّی گرت. ئەو جار ئەسپە کوێت بی‌ دەردەسەری بە دوای دایە حوری دا ڕۆیی، ئەویش هێنایەوە دێی، هەوساری کرد و لە تەویلەی کە تەنیا مانگایەکی تێدا بوو ـ و هەر ئەو مانگایەشی هەبوو ـ بەستیەوە. ئەو جار تفاقی بۆ هێنا، ئاخورەکەی بۆ پڕ کرد لە کا، بەڵام ئەسپەکە هیچی نەخوارد. دایە حۆری چاوی لێ‌کرد:

ـ ئەسپە کوێت! دیارە ئەتۆ ئەسپی حەمەدۆکی و کات بۆ ناخۆرێ. ئەسپێك کە گوللەباران کرابێ، دوایە زیندوو بوبێتەوە، بووبێتە حودووديێك و فڕیبێ، نابێ ئەو تفاقەی بخوا! دەبێ جۆی هەبێ و جۆیەکەش جوان گێژەو کرابێ، خاوێن بێ و شۆرابێتەوە!

پاشان دایە حۆری گۆنی‌یەکی هەڵگرت و وەدەرکەوت. کابرایەکی "دارێندە"یی تازە دوکانێکی لە گوندی دانابوو. چووە ئەو دوکانەی:

ـ ئەو گۆنی‌یەم بۆ پڕ کە لە جۆ، میوانێکی زۆر خۆشەویستم هەیە!

کابرای خاوەن دوکان گوتی:

ـ باشە ئەو میوانە کێیە؟

ـ ئەسپی حەمەدۆکی‌یە...

ـ بە ڕاستی؟ زۆر باشە دایە حۆری. پووڵەکەی دوایە بدە!

کابرا خێرا گۆنی‌یەکەی پڕ کرد لە جۆ. لەو دەمەی دا کوڕێکی مێرمنداڵ بە وێ دا هات. دایە حۆری بانگی کرد:

ـ کوڕم ئەو گۆنی‌یە جۆیەم بۆ هەڵگرە، بی‌بە لە ماڵەکەی من لە بەر دەرگای تەویلەی دای‌نێ!

کوڕەکەی بەرێ‌کرد و بۆخۆشی بە هەڵەداوان وە نێو دێی‌کەوت، ماڵ بە ماڵ چوو و بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕانەوە. هەتا گەیشتەوە ماڵێ، خەڵکی دێی هەموو هاتبوون و لە بەر دەرگا ڕاوەستابوون. دایە حۆری چوو ئەسپەکەی لە تەویلەی دەرکێشا و بە خۆشحاڵی‌یەوە ڕووی دە خەڵکەکەی کرد:

ـ دەی‌ناسنەوە؟ ئەوە ئەسپە کوێتی حەمەدۆکی‌یە. هەواڵی حەمەدی بۆ هێناوم. حەمەد ئەوە لە ئالاکێوی‌یە. وا دیارە سەرانسەری زستانێ لە وێ بووە و بەو زووانەش دێ و سەری ئێمە دەدا. ئەوە قسەی ئەسپە کوێتی‌یە... نیگەران مەبن، وا دەردەکەوێ حەمەدۆکی من وەزعی باشە و مەلا فەرهادیش هەر وا. ئەوەش هەر ئەسپەکە گوتی! لە مەو دواش ئیدی جووتێرەکان قەت تووشی ئەو چەرمەسەری و کوێرەوەری‌یەی نابنەوە، کە تا ئێستا پێیانەوە ناڵاندوە!

ئەسپی حەمەدۆکی سێ شەو و ڕۆژان لە سەر ڕەوەزەکانی عەنیکۆی مایەوە، هەتا دایە حۆری چوو. ئەو ئەسپە ڕەوەك و سەرکێشە بۆ دایە حۆری ڕام بوو و پیرێژن هێنایەوە دێی... دەبێ ئەوە نیشانەیەکی باش بێ و خێری تێ‌دا بێ!

خەڵکەکە هەموو ناڕەحەتی و ناخۆشی‌یەکانیان لەبیر چۆوە و دڵیان پڕ بوو لە شادی.

بەهار بە هەموو هێز، توانا و تایبەتمەندی‌یەکانی خۆیەوە تەقیبۆوە. چرۆ دەکرانەوە، گوڵ لە هەموو لایەکی دەپشکووتن. شاخەکان، دۆڵەکان و مێرگەکان پڕ ببوون لە گوڵ. کانی و جۆگەکان بۆنێکی خۆشیان لێ‌دەهات و با ئەو بۆنەی بە وڵاتی دا بڵاو دەکردەوە. ئەستێرەکانی شەوێ و بەیانی بە هەموو ترۆپکی چیاکانەوە دەدرەوشانەوە و لە گەڵ تیشك و شەبەقی خۆر لە تووڕووسی، عەرزی چوکووڕاوایە وەك دەریایە کەفی دەکرد...

هەر کە بەهار داهات، عارف سایم بەگ هاتەوە شاری. ئەو جار ئەفسەرێکی دیکەی لە گەڵ خۆی هێنابوو. ئەو ئەفسەرە ناوی نافیز بەگ بوو، پیاوێکی جحێڵی وێچوو بوو، فەرماندەری ژمارەیەکی زۆر ژاندەرمە بوو و لە سەر داوای جەنابی نوێنەر دەسەڵاتی بێ‌سنووری درابۆیە، بۆ ئەوەی بتوانێ کارەکانی بە باشی جێ‌بەجێ بکا.

کاتێك ئەو ئەفسەرە لە ئەدەنەی لە شەمەننەفەری دابەزی، شارەیی‌یەکان پێشوازی‌یەکی باشیان لێ‌کرد. لە وێ ڕا نۆ ماشێنی لە گەڵ هاتن. تا ئێستا عیسمەت پاشا و فەوزی پاشای کۆنەسەرفەرماندەریش بەپیرەوەچوونێکی ئاوایان بۆ نەکرابوو. بەڵام شتێك کە زیاتر سەرنجی ئەو ئەفسەرە فەرماندەرە نوێیەی ڕاکێشا، وتاری مامۆستای خوێندنگە بوو، کە کاتێك هاتە سەر سەکۆی قسەکردن، وتارێکی زۆر باشی دا. وتارەکە هێندە بەهێزبوو و ئەوندە بە هەست نووسرابوو، وشەکانی خوێنیان لێ‌دەتکا. ئەفسەرەکە لە دڵی خۆی دا گوتی ئەگەر ئەو کابرایە دەرفەتێکی دەست کەوێ، لە ئەنکەرە، یان ئەستەمبووڵ وتارێکی ئاوا بدا، دەسبەجێ دەی‌کەنە نوێنەر و ئیدی هەتاهەتایە لە پشت تریبۆنی وتاردانی مەجلیسی نەتەوایەتی دەمێنێتەوە. ئەو وتارەی وی کە پڕە لە گڕی ئەوینی نیشتمان، دڵی هەموو کەس ئاگر دەدا و دەرووی دەورێکی زێڕین، کە لەو دا وڵات وەك وڵاتانی ئورووپایی گەورە دەبێ، دەکاتەوە.

کاتێك مامۆستای خوێندنگە لە وتارەکەی بۆوە، ئەفسەرەکە لە جێی خۆی هەستا، چووە پێشێ، هەر دووك لاچاوی ماچ کرد، ئافەرینی لێ‌کرد و داوای سەرکەوتنی بۆ کرد. ئەو کارەی فەرماندەری تازە، زۆر بە کەیفی ئاغا و بەگەکان بوو. ئەو ئەفسەرە جحێڵە، بەو پایە و شوێنە گەورەیەوە کە هەی‌بوو، بە ڕاستی وەك گورگێکی زەردی پایەبەرز هەڵسوکەوتی کرد! تەماشا کە کاتێك لاقی دەخاتە سەر لاقی، چۆن بەو چەکمە بریقەردارانەیەوە پانیەی ڕادەژێنێ... قسەی تێ‌دا نیە هەر ئەو ئەرکەی سەرهەنگ عەزمی تێی‌دا سەرنەکەوت، ئەوە تێی‌دا سەردەکەوێ و بە پشتیوانیی خوا و پێغەمبەری هەموو ئەو جووتێرە سپڵانە سزا دەدا. بەڵێ ئەو جینایەتکارانە بێ‌چاووڕووانە سزا دەدا کە بە گژ ئەو پیاوانە دا چوونەوە، کە ڕۆژێك ئەوانیان لە دەست دوژمن ڕزگار کردبوو!

لە ماڵی خەلیل بەگی گەورە نان و چێشتێکی زۆر دروست کرابوو و بانگهێشتێنێکی گەورە بە بۆنەی هاتنی فەرماندەری تازەوە ساز کرابوو. سفرەیەکی تایبەتی ڕازابۆوە کە شەرابی فەڕانسە، ویسکیی سکۆتلاند و ڤۆدکای ڕووسیشی لە سەر بوو.

ژاندەرمە دەستە دەستە دەگەیشتنێ و یاوەری تازە و شارەدار لە گۆڕاییەکەی لای پردێ ڕیزیان دەکردن. خەڵکی شاری لە وێ بە پێشوازیانەوە هاتن و گوڵیان پێشکەش کردن. خەڵکی گوندەکانی دەوروبەر کە فەرمانیان پێدرابوو لە ڕێورەسمە کە دا بەشدار بن، دەبوو چەپڵە بۆ ژاندەرمەکان لێبدەن و گوڵیان باوێنە بەر پێیان.

عارف سایم بەگ دوای ئەوەی چەند پێکی خواردەوە و خواردنەوەکە ماندوویەتیی لەبیر بردەوە، بە بیرێکی ڕازی و ئاسوودەوە دەستی بە قسان کرد:

ـ ئەم جار دەبێ وەك لە زووەوە گوتراوە، ئاوەکەی لە سەرچاوەوە وشك کەین. فەرماندەری خۆشەویستیشمان لە گەڵ من هاودەنگە.

ـ تکا دەکەم، جەنابی نوێنەر، جەنابت گەورەی و دەبێ بفەرمووی ئێمە چ بکەین. جەنابت دەبێ فەرمان بدەی و ئێمە بەڕێوەی بەرین...

ـ ئاوەکە لە سەرچاوە وە وشك بکرێ... جووتێرەکان، بە تایبەت ئەوانەی لە توورڕووسی دەژین، زۆر چاك دەزانن ئەو مەسەلە کۆنە لە کوێوە هاتوە و یانی چی. چۆم، جۆگە گەورەکان و گۆلەکانی وێ پڕن لە ماسییە خاتوونە، ماسییەکە هەموو لەشی خاڵی سوور سووری جوانە و لە چەشنی خۆی دا ئی توورڕووسی لە ئی هەموو دنیایە جوانترە! ڕاوکردنیشیان زۆر زەحمەتە. نە دە تۆڕی دەکەون نە بە قولاپی دەگیرێن. پیاو دەبێ قۆڵی هەڵکا و هەوڵ بدا بە دەستی بیانگرێ، بەڵام ئەو جار بەنێو قامکان دا دەرباز دەبن و هەر ناگیرێن. دەزانی جووتێرەکان چ فێڵێکیان بۆ دۆزیونەوە؟ دەچن ئاوەکەی لە سەرچاوە ڕا هەڵدەبڕن و دە لایەکی دیکەی دەکەن، ئەو کات ماسییەکان لە سەر خیزی بنی جۆگەکان و لە نێو گۆمیلکە ئاوان دا دەمێننەوە و ئەو جار کابرا دەچێ سووك و هاسان بە دەستی دەیانگرێ! ئێستا دە پلانەکەی من گەیشتی؟ هەر سبەینێ ئێمە دەست بە جێبەجێکردنی دەکەین و ناویشی دەنێین " پلانی ماسییە خاتوونە"ی. بەو مانایەی ئێمە خەڵکی توورڕووسی دادەگێرین بۆ چوکووراوایە، هەموو گوندەکانیان پێچۆل دەکەین و هەتا حەمەدۆکی نەگرین، نایەڵین بچنەوە جێی خۆیان. ئەو کاتی ئەو چەتەیە لە شاخی بێنان و ئاو دەمێنێتەوە، یانی ئیدی دەستی بە یارمەتیی دێهاتییەکان ڕاناگا و فەرماندەری خۆشەویستی ئێمە دەتوانێ وەك ماسییە خاتوونەی بە دەستی بیگرێ!

دەنگی چەپڵە و هاواری ئافەرین و بژی بژیٰ بەرز بۆوە: کوڕە وەڵڵاهی ناپلیۆن، ئەسکەندەری گەورە، ئاتیلا و چەنگیز خانیش قەت زەینیان وا تیژ و بەکار نەبووە! بابە ئەو تاکتیکە دەبیٰ لە مەو دوا لە خوێندنگەی بەرزی سەربازی دا بە دەرس بخوێندریٰ!

عارف سایم بەگ نەرمەکۆخەیەکی کرد و بە فیزەوە پێکەکەی بە سلامەتیی هەمووان خواردەوە.

ئەویٰ شەویٰ هەر سەری وە سەر سەرینیٰ کرد و خەوی لیٰکەوت. هێشتا هەر تاریك بوو، لە خەوێیان هەڵستاند. ڕیشی تاشی، زۆر بە ڕێکوپێکی جلەکانی دە بەر کرد، چاویلکە لاسکزێڕەکەی دە چاوی کرد، سەعاتە زێڕەکەی دە باخەڵی چەپەی جلیقەکەی نا و زنجیرە درێژە زێڕەکەشی بە سینگی دا بەردایەوە. ئەو جار وەکازە زێڕکفتەکەی ببە دەستەوە گرت و ڕۆیشت بۆ مەیدانی شاری. ژاندەرمەکان دەستە دەستە بە حاڵەتی ڕێزگرتنی سەربازی‌یەوە بە پێشی دا ڕۆیشتن و ڕێژەیان دا: ئەو پیاوە بەهێزانەی ڕوخساریان پۆڵا، تێڕوانینیان تێڕوانینی باشوری و سینگیان مەفرەق بوو! دەتگوت پڵینگن و هەر ئێستا ئامادەن خۆیان بە جووتێرەکانی تووررووسی دادەن... بەو شێوەیە دەست بە جێبەجێکردنی پلانە گەورەکەی کرا، پلانی ماسی‌یە خاتوونەی.

دوای چەند ڕۆژان ژاندەرمەکان گەیشتنە هەوەڵ گوندەکانی کێوپارەی و خەلکەکەیان بە زۆری داپەڕاندە چوکووڕاوایە. جووتێرە بیٰتەنواکان، بە بیٰ وەی پێشتر ئاگادار کرابن، یان هۆی ئەو کارەیان بۆ ڕوون کرابێتەوە و وشیار کرابنەوە، دەمودەست لە ماڵ و هێلانەی خۆیان وەدەرنران و دە ڕێیە کران. تەنانەت بە زەحمەت بۆیان کرا دەستە جلێك، یان پیٰخەفێك بە شانیان دادەن و لە گەڵ خۆیان بیٰبەن. گریان، ناڵەناڵ، هاوار هاوار و تووك و نزا وڵاتی هەڵگرتبوو. هەموو ئەو ڕێگایانەی بۆ ناوچە کێوپارەکان دەچوون، بەسرابوون و کەس نەی‌دەتوانی بە بیٰ بەڵگەی هاتوچۆ پێیان دا بڕوا.

لە هێندێك گوند ژاندەرمەکان لە گەڵ بەربەرەکانیی توندی خەلکی ڕووبەڕوو بوون، کە چاوەڕوانیان نەدەکرد. ئەو جار فەرماندەر نافیز توورە بوو، دەستووری دا تەقە لە ماڵەکان بکەن و بە سەر یەك دا بیانڕووخێنن. لە هێندێك گوندی دیکەش خەلکەکە لە ترسان لە سەر ژاندەرمان ڕانەوەستان، هەر بۆخۆیان دێیەکانیان چۆل کرد، هەرکەسە و هێندێك کەلوپەلی لە کۆڵیٰ نا و داگەڕانە دەشتیٰ. ئەوە فەرماندەری زۆر لەخۆبایی کرد و زۆریشی کەیف پیٰهات. لە هەر شوێنێك تووشی ئەو جووتێرانە دەبوو کە دەسپێشخەری‌یان کردبوو و بۆخۆیان ماڵەکانیان چۆل کردبوو، ناوی دەنووسین، وادەی خەڵات و قەرەبوکردنەوەی دەدانیٰ و پێشی دەگوتن کە دوای ئەوەی حەمەدۆکی‌یان گرت، ئەوان پێش هەموو گوندەکانی دیکە دەگێڕڕێنەوە سەر جێگا و ڕێگای خۆیان. هێندێك جووتێری واش هەبوون کە لە

شوێنی دوورەڕێ و تەریککەوتۆوەی نێو دارستان و چیا دا خۆیان حەشار دابوو. ئەوانە دەیانزانی کە ئەو چەشنە خەڵکڕاگوێزتنە هەمیشە بە گرتن و ئازاردانی خەڵکەکەی کۆتایی دەهات. دوای ڕاپەڕینە گەورەکەی کۆزانۆغڵی وا بوو: سەدان هەزار کەسی خەڵکی ناوچە کێوپارەکانیان ڕاگوێزتە باتلاغەکانی چوکووڕاوای گەرم و پڕ لە نۆبەتێ و ئاهۆی جۆراوجۆر و دوای چەند مانگان نیوەیان بەو نەخۆشی‌یانە مردن. ئەوانەش کە مابوونەوە، ناچار بوون بۆ ئەوەی ڕێگایان بدەن بگەڕێنەوە شوینەکانی خۆیان، بەرتیلی بدەن. جا ئەگەر کابرا پووڵی هەبا، ئەوە باش بوو، دەنا دەبوایە شتی دیکە بدا، بۆ وێنە کچیان لیٚ‌دەستاندن. دوای ئەوەش ئەو جار پارێزگارێك هات و بوو بە دەسەڵات، کە وەك"پێشکەوتنخواز"ی بە زەبروزەنگ و تووڕە بوو. ئەوێش وەك ئێستا، ڕاوڕاوێنی خۆی پی‌کردن و دوای ئەوەی گوندەکانی لی‌ڕووخاندن و پێیێ چۆڵکردن، گوتی دەبێ بخرێنە ژێر چاوەدێری و "پارێزگاری"ی ژاندەرمان. دیسان بەشێکیان بە گەرما و تاولەرزی چوون و جارێکی دیکەش ناچار بوون پووڵ، یان مەڕوماڵاتی خۆیان وەك بەرتیل بدەن بە ژاندەرمە و کاربەدەستان... ئەو بەیت و گۆرانی‌یانەی لە سەر ئەو ڕاگوێزتنە زۆرەملی‌یە و گیرۆدەبوونی جووتێرەکان و خێزانەکانیان بە تاولەرز، لەو سەردەمە دا گوتراون، ئیستاش لە زەینی خەڵکی دا هەر ماون. ئەو بەیت و گۆرانی‌یانە ئێوارانی زستانان و کاتی جێژن و شایی هاوینان، لە سەر کانیی گوندی دەگوترانەوە و خەڵکەکە بێزاری‌یان لە دەروێش پاشا ـ ئەو کەسەی بە سەر کۆزانۆغڵی دا زاڵ بوو ـ وپارێزگارە دڵڕەقەکەی، کە تا ئەو رادەیە ڕقی لە خەڵکی شاخی بوو، دەردەبڕی و نەفرینیان بۆ دەناردن...

ئێستا هەموو ئەو ڕێگایانەی بۆ چوکووڕاوایە دەچوون، پڕ ببوون لەو جووتێرانە کە یان بە تۆبزی ماڵوحاڵیان پیٚ بەجی‌هێشتبوون، یان بە ناچاری بۆخۆیان بڕیاریان دابوو ڕا بکەن. لە هێندێك شوین دەبوو چەند ڕۆژان لە نێزیك پردەکان و باریکە ڕێگاکان ڕاوەستن و چاوەڕوان بن. ڕاست وەك سەردەمی مراد پاشای گۆڕکۆڵ و دەوری دوای ڕاپەڕینە گەورەکەی، کێوەکانی توورووسی پڕ ببوون لە فرمێسك و ناڵە و گریان.

ماوەیەك بوو حەمەدۆك دیار نەبوو و کەسیش باسی نەدەکرد، بەڵام ئەسپەکەی دەرکەوتبۆوە. دێهاتی‌یەکانی نێزیك "دەروازە گولەك"ی، لە لای ڕۆژاوایە دیتبوویان لە سەر ترۆپکی دەمیرکازیکی‌یەوە بەرەو چوکووڕاوا فڕیبوو: سێبەرەکەی دەتگوت ئاورە بە سەر عەرزی دا دەڕوا و حیلەی ئەو ئاسمانەی پڕ کردبوو. ئەو ئەسپە بۆرەیە لە باشووریش دیترابوو: لە وێ لە شێوەی هەورێك دا، بە سەر دەریای نێوەڕاست دا هاتبوو و بە نێوان هێندێك هەوری دیکە دا کە وەك چارشێو دایانپۆشیبوو، بەرەو توورووس فڕیبوو. نیسێکەشی بە عەرزی دا

هاتبوو و حیلەی لە نێو ڕەوەزە بەردەسماتەکان دا دەنگی دابۆوە. لە لای ڕۆژهەڵاتێ ڕەنگی ئەسپەکەی سوورێکی قاوەییواش بووە، لە ئاسۆ تروسکەی داوە، سێبەرەکەی وەك کۆیەك تیشك بە سەر دارستان، دۆڵ و شاخان دا ڕۆیشتوە و حیلەی لە نێو چیاکان دا دەنگی داوەتەوە. پاشان چووە لە سەری چیای دوڵدوڵی ڕاوەستاوە. لە باکووریش ئەسپەکە تۆپەڵە شۆقێك بوو، بە سەر دەشتی دا فڕیبوو، بە سەر چیای ئەرجیاسی دا بۆ لای باشوور چووبوو. سێبەرەکەی لە سەر ڕەوەزان دیترابوو و حیلەی سەرانسەری دەشتێی ڕاتڵەکاندبوو.

حەمەدۆك و هاوڕێیانی پاشماوەی زستانێیان لە چیای ئاخچەی گوزەراندبوو و کاتێك ئەو هەواڵانەیان بیست، بە پەلە ڕۆیشتن بۆ" گۆڕێ گوڵان". تەتەرەکانیان کە زیاتر دە جل و بەرگی شوانان دا هاتوچۆیان دەکرد، ڕۆژ بە ڕۆژ هەواڵی تازەیان بۆ دێنان و لە بارودۆخی نوێ ئاگاداریان دەکردن. هەواڵەکان خۆش نەبوون: باهۆز کوژرابوو، بەڵام ئەو گەردەلوولە نوێیەی خەریك بوو توورڕووسی تێکەوەدەپێچا، لە ویش سامناکتر بوو! دەوبەینەی دا ڕاسپاردەی عەلییە شەلیش هات، پەیامەکەی ویش هەر ئەوە بوو کە پێشتر بیستبوویان. عەلی گوتبووی: هەرچی خەڵکی کێوپارەیە، ڕادەگوێزرێنە دەشتێ. گوندەکان هەموو چۆڵ دەکرێن. ئەوە پلانی عارف سایم بەگییە. دەڵێ توورڕووس نابێ یەك گیانلەبەریشی لێبمێنێ، نە ئینسان، نە باڵندەی ئاسمانێ و نە تەنانەت یەك مێرووڵەش! جا ئەو جار حەمەدۆك کە هێندە خۆشەویستی خەڵکی ئەو گوندانەیە و ئەوان بەخێوی دەکەن، بە تەنێ دەمێنێتەوە، لەو شاخانە لە برسان دەمرێ و ئەوەدەمی فەرماندەر ئافیز، سووك و هاسان، وەك چۆن هەرمێی لە دارێ دەکەیەوە، بە دەستی دەیگرێ.

حەمەدۆك بەو هەواڵەی زۆر تووڕە بوو و لە داخان وا دەڕۆیی، نە هیچی دەدی و نە گوێی لە هیچیش دەبوو. ئەوانی دی بە زەحمەت دەیگەیشتنێ. ڕۆژێکی، بەیانیی زوو، گەیشتنە بەر دەرگای ماڵی دایە حۆری لە گوندی دێرمەنلی. پێشتر دایە حۆری زانیبووی ئەوان دێن و هەر بۆیەش شەوێ تا بەیانی چاوی لە سەریەك دانەنابوو و هەر چاوەڕوانیان بوو. دەسبەجێ دەرگای لێکردنەوە و باوەشی بە حەمەدی دا کرد:

ــ بەخێربێیەوە کوڕم، ڕۆڵە قارەمانەکەم! ئەسپەکەت پێش تۆ گەیشتۆتێ و ئەوە لە لای منە! ئەوی بۆرە نا کە بە ئاسمانێ دا دەفڕێ، ئەوی سووری مەیلەوقاوەییش نا کە لە سەری چیای دوڵدوڵییە، ئەو کوێتەشیان نا کە لە باشووری ڕۆژاوا دەدرەوشێتەوە، ئەوەشیان نا کە لە گەڵ هەورە سپییەکانی دەریای نێوەڕاست دەفڕێ و هەروەها ئەوەشیان نا کە لە نێوەڕاستی ئاوی دەریایە دێتە دەرێ، بەڵکوو ئەو ئەسپە شێتەیە کە وەك خولخولەی دەخولێتەوە و هیچکەس ناوێری تخوونی کەوێ. ئەوە هاتبوە ئێرە و لەو بەینەی دەهات و دەچوو، ئەمنیش چووم گرتم، هێنامەوە و ئێستا لە تەویلەی خۆمان بەستوومەتەوە...

ـ باشه، چۆنت بۆ گیرا؟ بۆخۆت دەزانی ئەو ئەسپە هەر سەیرانی دەناسێ و بێجگە لە وی کەس ناوێرێ بۆ لای بچێ...

ـ جارێ لە وەی گەڕێ و وەرنە ژوور! ئاورم هەڵکردوە، دەمزانی دێن! با بزانم کاوڕێك، مەڕێکتان بۆ پەیدا کەم. دەبێ زۆر برسی بن، کوڕم.

ـ بە ڕاستیی برسین، دایە حۆری!

دایە حۆری چووە دەرێ و جیرانەکانی بانگ کردن. ئەوانیش هەر خەویان لێنەکەوتبوو و چاوەڕوان بوون. هەموویان بە پەلە هاتن و سێ ـ چوار سەر مەڕ و بەرانیشیان هێنابوون. حەیوانەکانیان کوشتنەوە و دەستیان بە گۆشتبرژاندنێ کرد. بۆنی کەبابی دە دێی گەڕا، خەڵکی دێی ئەو جار پێیانزانی و ڕوویان دە ماڵە دایە حۆری کرد. هەموویان لە خۆشیی دیتنی حەمەد و دەستەکەی شاگەشکە ببوون. حەمەد بە هاوڕێیانی گوت لە حەسارێ ئاورێکی باش بکەنەوە، لەگەڵ خەڵکەکەی پێکەوە گۆشتی ببرژێنن، با هەر کەس هات تێر گۆشتی برژاو بخوا. کاتێك لە خواردنێ بوونەوە، حەمەدۆك ڕووی دە خەڵکەکەی کرد و گوتی:

ـ ئەمن تا ئەمڕۆ زۆرم زەحمەت و کوێرەوەری بۆ ئێوە بووە و ئەوە ئێستاش لە سەر من لەم گوندە ڕاتاندەگوێزن!

جووتێرەکان وەڵامیان دایەوە:

ـ خودا ئەتۆمان پێبێڵێ، چ نیە، ئاخرەکەی ئەوە ڕەنج و کوێرەوەرییە کۆتایی دێ.

ـ کەی دەبێ دێیەکەی چۆل کەن؟

ـ ژاندەرمان دوێنێ بێرە دا ڕۆیشتن و پێیانڕاگەیاندین... سبەینێ دەبێ چۆلی کەین...

ـ سبەینێش دەست ڕاگرن! ڕۆژێکی نوێ لە وانەیە هیوا و هومێدێکی نوێی بە دووەوە بێ!

ـ باشە، حەمەدۆك. ڕۆژێکی نوێ، هیوایەکی نوێ!

حەمەد داهاتەوە، دەستی دایە حۆریی ماچ کرد:

ـ دایە گیان، ئێمە دەبێ بڕۆین.

ـ خوا ئاگادار و پشتیوانتان بێ، ڕۆڵە گیان. ئەسپەکەت بۆ ساز کەم؟ باشە، تفاقی دەدەمێ، تێری دەکەم و زینیشی دەکەم...

چەتەکان هەستان. خەڵکەکە درێ دا و ئەوان بە نێویان دا تێپەڕین و بەرەو عەلیکۆ ڕۆیشتن. تیشکی ڕۆژێ ئەوەندە بەهێز بوو، چاوی لە بەر هەڵتەدەهات. بۆنی خۆشی گوڵی جۆراوجۆری لاپاڵەکان تێکەڵ ببوو و بەدەم باوە شەپۆل شەپۆل بەرەو دەشتایی دەهاتە خوار.

ئەوان خۆیان لە دۆڵێکی دا حەشار دا و هەتا بوو بە شەو و وڵات تاریك داهات، مات بوون، بەڵام تەتەرەکانیان پەیتا پەیتا خۆیان دەگەیاندنێ و هەواڵی تازەیان بۆ دێنان. ژاندەرمەکان نێزیك ببوونەوە و بە هەر دێیەکیش دا هاتبوون، بە خەلکەکەیان چۆل کردبوو.

مەلا فەرهاد گوتی:

ــ با بۆیان بچینە "گەڵی کاردۆخی!"

ــ فکری ناگاتێ.

ــ خۆ فیشەکمان لیێنابڕێن؟

ــ بەشمان دەکەن...

ــ با بڕۆین...

ڕۆژی دواتر، پێش ڕۆژاوایە گەیشتنە ئەوێ. دەروویەك بوو هەردووك لای ڕەوەزە بەردی گەورە بوون. ڕێگاکە بە نێوەڕاستی دەرووەکەی دا دەهات و ئەوەندەش بەرتەسك بوو، هەر جێی سوارێك یان دوو پیادان دەبۆوە، پێیدا ڕەد بن.

ــ مەلا فەرهاد، بە قەستی کوشتنێیان پێوە نەنێین؟

ــ بۆخۆت دەزانی کوڕم، ئەتۆ لە پێش دا تەقەی بکە.

ــ ئەرێ ئەو فەرماندەرەش وەك ئەوی پێشێ بەدفەڕ و دڵڕەقە؟

ــ هەموویان وەك یەك ستەمکار و دڵڕەقن و لە وەی دا جیاوازییان نیە، بەڵام بڕیارەکە بە دەست خۆتە. وەك ئەمن بزانم، زەحمەتە هەموویانمان بۆ بکوژرێ...

ــ ڕاست دەکەی مەلا فەرهاد، زەحمەتە...

پێش خۆرئاوابوونێ، فەرماندەر ئەزیف لە نێو دەروێ وەدەرکەوت. ئەسپێکی باڵابڵیندی بەکەیفی دە بن دابوو. ئەسپەکە لە گەڵ هەنگاو گوێزتنەوەی ڕادەژا. یاوەر عەلی گاور، دوو ئەفسەری پلە خوارووتر و وەکیل باشی عاسمیش بە دوای وییەوە بوون. ژاندەرمەکان یەکجار زۆر بوون.

ئێستا ئیدی ئەسپی ئەزیفی گەیشتبوە بەر سێرەی تفەنگی حەمەدی. ئەسپەکە سەر و کلکی وەك یەك هەلێنابوون، ڕایدەژاندن و دەڕۆیی. حەمەد دەرفەتی پیێنەدا و پەلەپیتکەی کێشا. ئەسپ و سوار تێکهەلگلان. لە هەردووك لاوە تەقە دەستی پیکرد. وەکیل باشی عاسم بە پەلە، بیێئەوەی دەربەستی ئەو گوللانە بیێ کە دەڕژانە ئەو دەوروبەرەی، ڕای کردە لای ئەزیفی و کێشایە پشت بەردێکی گەورە، کە گوللە ئەی دەگرتەوە:

ـ جەنابی فەرماندەر، ڕانت بریندار بووە. سوور دەزانم حەمەدۆك پێی‌خۆش نەبووە بتکوژێ، دەنا هەم مەوداکە زۆر کەمە و هەم حەمەدۆکیش تفەنگچی‌یەك نیە گوللەی ببوێرێ...

دیسان وەکیل باشی بە بی‌ترس خۆی گەیاندە لای برینپێچەکەیان و پارچە و کەرەسەی برینپێچانێی هێنا:

ـ فەرماندەر، بریندارمان زۆرن. چەتەکان بە قەستی کوشتنێمان پێوە نانێن، دەنا ئێستا زۆریان لێ‌کوشتبووین. ئەو جار ئێمە پێمانوانەبوو هێندە زۆر بن. ئەوانە دەستەیەکی گەورەن.

ـ وەکیل باشی، چ بکەین؟

ـ ئەگەر حەمەد خۆ بە دەستەوە بدا، ئەتۆ چی بۆ دەکەی؟

ـ نایەڵم لە داری دەن.

ـ بچم قسەی لە گەڵ بکەم؟

ـ بچۆ وەکیل باشی، ئێمە لەو دەرووەی دا حاسیە بووین و هەموو لایەکمان لێ‌گیراوە. بەو حاڵەی کەسمان دەرناچێ.

وەکیل باشی لە سەنگەرەکەی هاتە دەرێ و چوو لە نێوەڕاستی دەرووەکەی ڕاوەستا، دەستی ڕاوەشاندن و هاواری کرد:

ـ تەقەی مەکەن، دەمەوێ لە گەڵ حەمەدۆکی قسە بکەم!

دەسبەجێ تەقە ڕاگیرا.

ـ گوێم لێ‌بگرە، حەمەدۆك!

ئەوەندە لێك نێزیك بوون، پێویست نەبوو دەنگی بەرز بکاتەوە و هەر وا بە شێوەی ئاساییش گوێیان لێ‌دەبوو.

ـ دەزانم مەبەستت ئەوە نەبوو فەرماندەر نەزیفی بکوژی، پێت خۆش نیە ژاندەرمانیش بکوژی. ئەوەش دەزانین کە ئەتۆ سەرهەنگ عەزمیت نەکوشتوە، بەڵکوو نایب ئەلیاس کوشتوویەتی! فەرماندەر نەزیف بە تەواوی لەو شتانە ئاگادارە. ئەو پیاوێکی بە وەجە، قسەی خۆی ناخواتەوە و بەڵێنی خۆی دەباتە سەر! ئەگەر ئەتۆ خۆت بە دەستەوە بدەی، نایەڵێ لە سێدارەت بدەن. تەنانەت بەڵێن دەدا لێخۆشبوونیشت بۆ وەرگرێ؟

ـ هەرگیز خۆ بەدەستەوە نادەم و بۆخۆشت ئەوەی دەزانی. گریمان ڕۆژێك خۆش بەدەستەوە بدەم، تەسلیمی پیاوێکی وەك وی نابم. پیاوێکی وا، کە تەنیا لە بەر ئەوەی چەتەیەکی بێ‌دەسەڵاتی بۆ ناگیرێ، هەموو گوندەکانی تووڕووسی چۆل دەکا و خەلکەکەش دە باتلاغی چوکووراوایە دەکا، تا بە تاولەرز و نەداری و دەردەداری‌یەوە بناڵێنن و بمرن!

ـ حەمەدۆك، چۆلکردنی ئەو دێیانە و ڕاگوێزتنی خەڵکی تووڕووسی تاوانی ئەو فەرماندەرەی نیە. ئەو تا ئەو ڕادەیە دڵڕەق و ستەمکار نیە! لە سەرەوەترەوە فەرمانی پێدراوە. ئەگەر نیازت وایە خۆ بەدەستەوە بدەی، لە سەر دەستی فەرماندەر نەزیفی بی‌کە! بەڵێنی داوە نەهێڵێ بتکوژن و دەڵێ سەریشم بچێ، لە بەڵێنی خۆم پاشگەز نابمەوە.

ـ کێ فەرمانی داوەتێ؟ بۆ بە قسەی دەکا؟ دەکرێ ئەمن هەر کەس هەر فەرمانێکی دا جێبەجێی بکەم؟ دەی خۆ فەرماندەرەکەت پیاوێکی ساویلکەی بێ‌ئەزموونیش نیە. مرۆڤێکی باش و دڵسۆز هەرگیز مل بۆ فەرمانێکی ئەوتۆ ڕاناکێشێ. ئەو درۆ دەکا. باوەڕی پێ‌ناکەم!

ـ عارف سایم بەگ فەرمانی داوەتێ، بۆخۆم لە وێ بووم و ئاگام لێیە. گوتم عارف سایم بەگ... تێگەیشتی؟ جەنابی نوێنەر بۆخۆی لە شاری دانیشتوە و چاوەڕوانە سەری تۆی بۆ بەرن! تێگەیشتی؟

ـ وەکیل باشی، واوەچۆ! زوو بە بچۆ پەنایەکی. پێم‌خۆش نیە گوللەیەکی وێڵەکیت وێبکەوێ!

دیسان تەقە دەستی پێ‌کردەوە و ئەو جار زۆر گەرمتریش بوو. وەکیل باشی گەڕایەوە لای فەرماندەر نەزیفی و دیتی ڕوخساری بە تەواوی سپی هەڵگەڕاوە:

ـ حەمەدۆك خۆ بە دەستەوە نادا فەرماندەر!

ـ ڕاست دەکا، ئەمنیش لە جێگای وی بوایەم، قەت خۆم لە سەر دەستی کەسێك بە دەستەوە نەدەدا کە ئەو کەسە خەڵکی هەرێمێکی گەورەی بە قەد وڵاتێکی ڕاگوێزتوە! ئەگەر نەشی‌کوشتم هەر چەشنێك سووکایەتی پێ‌کردن بوو.

ئەو جار دەستی بۆ لای وەکیل باشی ڕاکێشا و گوتی:

ـ یارمەتیم کە، با هەستم. وا چاکە بکشێینەوە و بڕۆین. هەرچۆنێك بێ، ئەو هێندە خۆی سووك ناکا دوژمنێکی وەك من بکوژێ...

وەکیل باشی دەستی گرت و هەڵی‌نەستاند. پاشان چووە بن پیلی و وردە وردە گەیاندی‌یە نێو پۆلێك ژاندەرمە، کە لە پشت هێندێك گابەردان خۆیان حەشار دابوو.

تەقەکە کەم ببوو، بەڵام هێشتا نەبڕابۆوە. تاق تاق تفەنگ داوێژران. جار بە جاریش پیاو گوێی لە هاواری ژاندەرمەیەکی دەبوو، کە دەپێکرا.

کاتێك تاریك داهات، حەمەدۆك لە مەلا فەرهادی پرسی:

ـ چەندی دیکە خۆمان لێرە پێ‌ڕادەگیرێ؟

ــ ئەوپەڕەکەی شەو و ڕۆژێکی دیکە! ئەگەر هەر ئەوەندە بوایەن، کە ئێستا دیمانن، ئەوە بە هاسانی چوارـ پێنج ڕۆژان بەربەرەکانیمان پێدەکرا، بەڵام دەزانم سبەینێ بەیانی هێزی دیکەیان بۆ دێ و بتوانن پشتمان لێبگرن، یەکیشمان دەرناچین.

ــ ڕاست دەکەی! کە وا بوو من لە گەڵتان دەمێنمەوە.

ــ کوڕم دەبێ ئەتۆ بڕۆی و وەدووی کاری خۆت کەوی! ئێمە دەتوانین لە بەرامبەریان دا ڕاوەستین و زەبری پێویستیان لێبوەشێنین، بەڵام تۆ دەبێ بڕۆی و کارەکەی خۆت جێبەجێ کەی، دەنا هەرگیز چاومان لە بەرامبەر ئەو جووتێرانە هەڵنایە. بڕۆ کوڕم، سەرکەوتوو بی! ئەوەشت لەبیرە ئیدی:" پیاو لەو دنیایەی دەبێ هەزار جار بمرێ، تا جارێك زیندوو دەبێتەوە!" ا بابوباپیرانی ئێمە لەخۆڕا وایان نەگوتوە!

حەمەد یەك بە یەك باوەشی بە هەموو هاوڕێیانی دا کرد و ماچی کردن. پاشان لە سەنگەرەکەی هاتە دەر، بازێکی دا و وەك ئاسکێکی ڕەوەك لە نێو ڕوەزە بەردەکان هاتە خوارێ. هێشتا جاروبار تەقەیەك دەهات و لە نێو شاخەکان دا دەنگی دەدایەوە.

حەمەد پێش نیوەشەوێ گەیشتەوە ماڵی دایە حۆری لە دێرمەنلی. دایە سفرەی ڕاخستبوو و چاوەڕوانی وی بوو. کە حەمەد گەیشتێ، بە پەلە نانی بۆ دانا. دوای ئەوەی نانیان خوارد، دایە حۆری قاپەکانی کۆ کردنەوە و بردنی بیانشوا. حەمەد چاوی بە ماڵێ دا گێڕا، دیتی هێندێك شتومەك پێچراونەوە و لە قولینچکێکی دانراون:

ــ دایە ئەوانە چن؟ وا دیارە ماڵەکەت پێچاوەتەوە و ئامادەی بڕۆی؟

ــ ئەدی چ بکەم ڕۆڵە؟ هەر وێنەکانی حەزرەتی عەلی لە گەڵ خۆم دەبەم، چونکە ئەو ئیمامە گەورەیە یارمەتیی داوی، تا ئێستا پاراستووتی و دەزانم ئەمەودواش هەر دەتپارێزێ. ئەمنیش لە گەڵ خەڵکی ئاوەدانی‌یە دەچمە خوارێ، بۆ چوکووڕاوایە. دیارە لە وێ نامێنمەوە و دواتر هەر چۆنێك بێ، دەڕۆم، دەچمەوە لای سەیرانێ، بەڵام هەر لە ئێستاوە جەرگم بۆ ئەو خەڵکەی دیکە ژانێ دەکا. دەزانم هەموویان لەو دەشتەی بە تاولەرز و ئاهۆی دیکە دەمرن. دیسان گەورەکان لەوانەیە خۆڕاگرن، بەڵام بە خوای منداڵەکان کەمیان بەرگەی ئەو هەوایە و ئەو ئەخۆشی‌یانە دەگرن. ئەمشۆ کەسی خەڵکی دێت چاو پێکەوتوە؟

ــ بەڵێ، کە گەیشتمە نێو دێی، هێندێکیانم چاوپێکەوت.

ــ هیچیان هیچ ناڵێن. یەکیشیان ناڵێ هەتیوی برایمە ڕووتی خۆی پێیە شایی بوو، عەبدی خان، عەلی سەفا بەگ و مەحموداغای کوشت و ئێمەی تووشی ئەو بەزمەی کرد. ئێستا کە لە

سەر تۆ گوندەکەشیان پێچۆل دەکەن، هەر لێت نارەحەت نین و تاوانبارت ناکەن، بەڵکوو هەر داوای سەرکەوتنت بۆ دەکەن و دوعایە دەکەن خوا بتپارێزێ. کورم ئەوان زۆریان باوەڕ بە تۆ هەیە! دەنا لانی کەم لەو بارودۆخە دا کە ڕایاندەگوێزنە ئەو دەشتە جەهەننەمەی خوارێ، دەبوو تووک و نزایان لێ‌کردبای و نەفرینیان کردبای...

ــ بەڵێ، دەبوو وا بکەن.

ــ دەبوو هەموویان لێت تووڕە بن و هەوڵی کوشتنت بدەن.

ــ ڕاست دەکەی، دایە...

ــ هیچ نەبێ، دەیانتوانی هاوکاریی ژاندەرمان بکەن، ڕاپۆرتت لێ‌بدەن و دە داوت خەن. بەڵام ئەوانەیان نەکردوە. ئەوان پشتی تۆ دەگرن و بەیت و گۆرانیت بۆ ڕێکدەخەن. هەر لەو بارودۆخەش دا کە خەریکن ماڵیان وێران دەکەن، ئەتۆ پێیان بڵێی خۆ لە شاخی ڕا هەڵدێرن، بێ سێ و دوو دەیکەن! پێیان بڵێی ساز بن، دەچین بە سەر چوکووڕاوایە دادەدەین و داگیری دەکەین، هەموویان بە قسەت دەکەن. ئێستا ئەتۆ دەتەوێ چ بکەی، کورم؟ دەزانی چەند دەستەوداوێنی حەزرەتی عەلی بووم، ئاگای لێت‌بێ؟ دەزانی چەند جاران یەخەم لە بەر بارەگای خودای دادڕیوە، داوام کردوە ئەمن دە سەر تۆ بگێڕێ و عومری من بخاتە سەر ئی تۆ؟

پاشان لە پڕمەی گریانێی دا، مستەکانی چووقاندن و لە چۆکانی دان:

ــ چ بکەم؟ ڕوو دە کوێ کەم؟ نە خودا و نە ئیمامی عەلی هیچیان دە هانام نەهاتن. سەری خۆم بۆ کوێ هەڵگرم؟

حەمەد گوتی:

ــ دایە گیان، مەگری، هێندە خۆت نارەحەت مەکە! سەبرت هەبێ، چووزانی سبەینێ چ دەقەومێ؟ هەر ڕۆژێك بۆخۆی ڕۆژێکی نوێیە!

دایە حۆری چی‌دی نەگریا، فرمێسکەکانی بە گۆشەی چارشێوەکەی سڕینەوە و بزەیەکی هاتێ:

ــ بەهبووره کورم! پیر بووم و فرمێسکم بۆ ڕاناوەستێ. بەڵام ئاخر مرۆڤ چۆن دەتوانێ لە بەرامبەر ئەو هەموو ستەمە دا تاقەت بێنێ؟ دیتووتە تەنیا لە سۆنگەی گرتنی چەتەیەکی دا چ بە سەر تەواوی خەڵکی تووڕووسی دێنن؟ وەڵڵاهی ئەگەر بە زۆریش لەو گوندەمان وەدەر نەنێن، ئیدی ئەمن لێرە نابم و دەچمەوە لای سەیرانێ.

ــ دایە گیان، زۆر باشە، بچۆوە لای وی و ئەو جار بەجێیمەهێڵە.

ــ ئینسان چووزانێ. لەوانەیە پەشیمان ببنەوە و گوندەکەمان پێچۆل نەکەن. ئەرێ مەلا فەرهاد و هاوڕێکانی دیکەت چ دەکەن؟

ــ ئەوان دە شەڕ دان. کاتێك من هاتم، شەڕەکە تەواو نەببوو.

ــ چاکت کرد هاتی بۆ ئێرە. ئەوان هەموویان دەکوژرێن. چەتە کوا دەتوانێ شەڕی ناوا درێژ بکا. قەت شتی وا نابێ...

ــ مەلا فەرهاد شتێکی دیکەیە دایە! ئەو دەزانێ چۆن شەڕ بکا و چۆنیش خۆی و دەستەکەی دەرباز بکا. خەمت نەبێ، گرفتیان نابێ!

ــ ئیشاڵلا...

ئەو جار خەوتن. هێشتا حەمەد بە تەواوی خەوی لێنەکەوتبوو، گرمەیەك لە پشت دەرکەی هات. حەمەد دەستی دا تفەنگێ و بە کەلێنی دەرکەی دا چاوی لە دەرێ کرد.

ــ کێیە؟

ــ ئەمنم بیکەوە...

حەمەد دەسبەجێ دەنگەکەی ناسییەوە. دەنگی موسلیمە چکۆلی بوو، دەرگاکەی کردەوە و دە باوەش خۆی گرت. دایە حۆریش بە پەلە هات، لە خۆشیان شاگەشکە ببوو:

ــ موسلیم، ڕۆڵە، لە کاتێکی زۆر باش دا هاتی. من نامەوێ چیدیکە لێرە بمێنمەوە و دەبێ بمبەیەوە لای سەیرانێ! ئیدی ئەو خانووەم ناوێ، قیروسیا لە ئێفە و سەرینەکانیشم! وێنەی حەزرەتی عەلی و حەمەدی خۆم نەبێ، هیچ شتێکی ئەو ماڵەی نابەمە دەرێ!

لە پڕ دەستی بە نێوچاوانییەوە گرت، ساتێك مات بوو و دوایە گوتی:

ــ بڕوانە ئەو بیرەی من! شەیتان بە لەعنەت بێ! باشە چۆن لە بیرم نەبووە، وێنەکەی خۆت نیشان بدەم؟

بە پەلە چوو و وێنەکەی هێنا. لە وێنەکە دا حەمەد ئەسپەکەی خۆی دە بن دابوو و بە سەر هەوران دا دەڕۆیی. بۆ ئەوەی چوارچێوە و شووشەکەشی لە ڕێگایە دا نەشکێن، دە لبادییەوە پێچابوو و بە بەنێکی جوان بەستبووی.

ــ بڕوانە حەمەد ئەو وێنەیە چەند وەك تۆ دەچێ! بۆخۆم بە مامۆستا وێنەگەرەکەم گوت بۆم بکێشێتەوە. گوتم با ئەو ڕوخسارە جوانەی کوڕی خۆم، کە لە گوڵەباغیش جوانترە، هەتا هەتایە بمێنێ! با خەڵك چاوی لێبکەن و بە دیتنی ئەو دەموچاوە جوان و دڵڕفێنەی خۆشحاڵ بن!

حەمەد کاتێك چاوی بە وێنەکە کەوت، شەپۆلێك شادیی لە دەروونی خۆی دا هەست پێکرد و هەستایە سەر پێیان:

ــ دایە، ئێوە ڕاناگوێزن! نا، ئێوە نابێ بڕۆن!

موسلیم گوتی:

ـ خەبەرێکی خۆشم بۆ هێناون! حەمەد کوڕێکی بووە و سەیران ناوی ناوە ئیبراهیم، یانی بە ناوی بابی حەمەدی کردوە...

دایە حۆری تاوێك لە خۆشیان حەبەسا و و قسەی بۆ نەهات. حەمەدیش هەر بێدەنگ بوو. پاشان دایە حۆری هەستا پێیان و دەستی بە چەپڵەلێدان و سەماکردنێ کرد.

ـ سوپاس خوای گەورە! سوپاس! سوپاس عەلی، ئیمامی بەڕێز و خۆشەویست!

پاشان ڕووی دە حەمەدی کرد:

ـ دەڕۆم، هەر سبەینێ دەڕۆم، یەك ڕۆژیش ڕاناوەستم! پێمخۆشە هەرچی زووتر ئیبراهیمە بچکۆلەکەم ببینم. زنجیریشم دە لاقان کەن، ڕاناوەستم! دەچم ئەوەی خۆم دە باوەش دەگرم، لانکەکەی ڕادەژێنم، لایلایەی بۆ دەکەم، باسی هەموو گوڵەکان، بۆنەخۆشەکان و هەورەکانی چیاکانمانی بۆ دەکەم... چ لە سبەینێ زووتر نیە!

ـ دایە ناتوانی هێندێکی دیش ڕاوەستی؟ ئەمن کارێکم بە دەستەوەیە، دەبێ بیکەم و زووش دەگەڕێمەوە. دڵنیا بە زۆرم پێناچێ! کە هاتیشمەوە، ئیدی بڕۆ خوات لە گەڵ بێ...

دایە حۆری هێندێك بە نابەدڵییەوە وەڵامی دایەوە:

ـ زۆر باشە، کوڕم...

حەمەد و موسلیم لە پەنا ناورگی دانیشتن. بە سرتە قسەیان دەکرد، بەڵام بەو حاڵەش دایە حۆری گوێی لێدەبوو. لە نەکاو دەرپەڕی و بە هەردووك دەستان بەرۆکی حەمەدی گرت:

ـ چی؟ عەلییە شەل؟ ئەو مەلعوونە دەبێ بمرێ! گەردنت ئازا نەبێ، ئەگەر نەیکوژی! ئەگەر بۆخۆت بەو کرمە پیسەی ناوەستی، بە موسلیمی بڵێ بیکوژێ!

حەمەد بۆ ئەوەی هێوری کاتەوە، ناچار بوو وادە بدا کە عەلی دەکوژێ. پاشان گوتی:

ـ ئەو جار دەبێ بڕۆین، دایە!

ـ جارێ نا! چام بۆ ساز کردوون، هەنگوین و ڕۆنی کەرەشمان هەیە. نان و چایەکەتان بخۆن، جا بڕۆن...

کاتێك نان و چایان خوارد، دایە حۆری پڕێسکەیەکی هێنا و لە حاڵێك دا بزەیەکی لە سەر لێوان بوو، دایە دەستی حەمەدی.

ـ دایە، ئەوە چییە؟

ـ هەنارن، لە پاییزێوە بۆم ڕاگرتووی. زۆر جوان و خۆشن. دەنکەکانیان پەمەیییەکی تۆخن...

حەمەد و موسلیم چوونە دەرێ. بایەکی ساردی دەهات. سەری عەلیکۆی پڕ بوو لە ئەستێرە.

ـ موسلیم، ئەسپەکەت لە کوێیە؟

ـ لە پەنا ئەو هۆڵە مەڕەی بەستوومەتەوە.

ـ دایە حۆری ئەسپە کوێتی لە تەویلەی دەرکێشا و لغاوەکەی دایە دەست حەمەدی. لە گەڵ ئەوەی هێشتا وڵات ڕووناك نەببوو، حەمەد دیتی قایشی لغاوکەی بە دەزووی زەرد پەراوێزی بۆ کرابوو. زینەکەش، یەکی چەرکەسیی زۆر جوان بوو، کە ئەویش بە ڕەنگی زەرد و زێوین پەراوێز درابوو.

ـ خوا بتبەخشێ، دایە!

حەمەد داهاتەوە، دەستی دایە حۆریی ماچ کرد و پاشان سواری ئەسپەکەی بوو. کە گەیشتنە لای هۆڵەکەی، موسلیمیش سواری ئەسپی خۆی بوو و بەرەو چوکووڕاوا لێیان‌خوڕی.

شەوێکی ڕەش و نمدار بوو. بۆ ئەوەی هەم زووتر بگەنێ و هەم تووشی ژاندەرمان نەبن، ڕێگایەکی سەربڕیان هەڵبژارد، ڕێگای ئانیزلی، کە باریکە ڕێگایەك بوو، هاتوچۆی بە سەر دا کەم بوو. ئەوان بەرەوبا ئەسپیان لینگ دەدا. لە هەردووك لایانەوە هاشەی داران وەك دەنگی ئاوێکی خوڕێن دەهاتە گوێ. جۆگەیەکیان هاتە سەر ڕێگا، ئەسپەکان بازیان دا و پەڕینەوە. لە لای خوارێ ئەستێرەیەکی گەش بە ئاسمانێوە دەبینرا، بەڵام زۆری پێ‌نەچوو ون بوو، دیسان وەدەرکەوتەوە و پێش ئەوەی ون بێتەوە، بە ئاسمانێوە دەڕۆیی و شەبەقێکی جوانی لێ‌دەبۆوە.

حەمەد لە موسلیمی پرسی:

ـ دیتت؟

ـ بەڵێ... بەڵام تەمەشای ئەولاتریش بکە، ئەوەیان ئەستێرەی شوانانە دەدرەوشێتەوە، دەڵێی چاو دادەگرێ.

جرووکەجرووك و جیوەجیوی باڵندان دنیای پڕ کردبوو. مەودایەکی باش ڕۆیشتن و دەنگی بەیانەگۆرانیی باڵندانیان هەر لە گەڵ بوو. کاتێك دەنگی باڵندەکان بڕایەوە، ئەستێرەکە دەرکەوتەوە و دیتیان لەسەرەخۆ بە ئاسمانی دا دەخزی و دەچووە پێش.

موسلیم گوتی:

ـ لەوەتا هەم، لە شاخی ژیاوم، بەڵام ئەو ئەستێرەیەم قەت نەدیوە!

ـ ئەمنیش نەمدیوە. ئەوە نابێ ئەستێرەی بەیانی بێ!

ـ سەیرە...

ئەسپەکان دەو شەوە نمدارەی دا خێرا دەچوونە پێش. ئەستێرەکە جارێکی دیکەش پەیدا بۆوە و ڕاست لەو ساتە دا شەو لەرزی، تەقی‌یەوە و گاڵۆبوغرێك پەیدا بوو، هەر مەپرسە.

دەتگوت قیامەت ڕابووە. جیکە جیکی باڵندان، حیلەی ئەسپ و ماینان، وەڕینی سەگان، لە گەڵ هاوار و تووك و نزای ئینسانان تێکەڵ ببوو... بەوبەیانە زووەی، هەر لەو لایەی کە ئەستێرەکە دەرکەوتبوو و بە سەر ئاسۆ دا درەوشابۆوە، کۆمەڵێك پیاو دەرکەوتن. پیاوەکان وا دە تۆز، خۆڵ و قوڕێ دا نوقم ببوون، کە چاو و ددانیان نەبێ، هیچکوێیان دیار نەبوو.

ئەستێرەکە جارێکی دیکەش لە پێش چاوی ئەو دوو سوارەی دەرکەوتەوە، درەوشایەوە و ون بۆوە. ئەوان بە نێو مەرەزەجارێکی دا ڕۆیشتن. ڕێگاکە تەسك و خۆڵەپۆتە بوو و بە پەنا جۆگەیەکی وشك دا تێدەپەڕی. سەر جۆگەکە پڕ بوو لە چەقڵەشینکە، کە هێشتا بە تەواوی گوڵیان نەکردبوو و ماریشی زۆر بوو. بە قەراغ باغە پرتەقاڵێکی دا ڕۆیشتن. دارەکان هێندەیان بەر گرتبوو، داهاتبوون. دەریاش بەرامبەر بە مێشەکەی هەڵکەوتبوو، دەریای کەفاوی و ڕوون. ئەستێرەکە ڕاست لە سەر دەریایە لە سەر ئاوە کەفاوی‌یەکەی وەستا و وەك دڵی مرۆڤێکی هەناسەسوار لێیدا. هەوا بۆنی پنگی دەدا. کۆمەڵێك ئەسپی سپی لە کەفەکەی هاتنە دەرێ و بەرز بوونەوە، هاوکات چەند کۆ ڕووناکیش وەك هەوری سپیی ڕوون، وردە وردە هەستان، وەك چارشێو تەسك بوونەوە و پاشان لە گەڵ ئەسپەکان تێکەڵ بوون، بوون بە یەك و بە سەر دەشتێ دا خزین. هەزاران پریشکە ئاوری ئاڵە ئەسپان بە سەر دەشتی دا بڵاو بۆوە. هەموو شتێك لە ژێر زرمەی سمی ئەسپان دا سپی بۆوە. هەڵۆیان لە گاورکۆی فڕین و دەریا، کە زۆر لێرە دوور بوو، کشایەوە، هات، پاڵی وە بناری شاخی دا. تیشکێکی سوور هات، لووتکەی شاخەکەی داگرت و بە سەر سەوزایی‌یە کشا. ئەسپی سووری مەیلەوقاوەیی لە دۆڵان ڕا هاتن، زیادیان کرد، بەرزبوونەوە، پاشان وەك سێلاوێك لە ئاگر بە دەشتێ دا بڵاو بوونەوە و بە دوای وانیش دا ڕۆژ هەڵات... حەشیمەتەکە ڕووی دە ڕۆژاوایە کرد، پیاوەکان لە نێو ڕەوەزەکانی دەرووی دەروازە گوڵەکی ڕاوەستان. کۆمەڵێك ئەسپی کوێت بە پرتاو، وەك چۆمی خوڕێن، لە نێو ڕەوەزان هاتنە دەر، شۆق و شەبەقی بەفری سپیی ئالاکێویان لە گەڵ خۆیان هێنا و لە پێش ئاناوارزای خۆیان گرتەوە. ڕەوەیەك ئەسپی ڕەش لە دەشتی خوارێ، لەو دیوی شاخەکانەوە هاتن، لە بەرامبەر میسیسی ڕاوەستان. ڕەنگی ڕەشی تۆخی ئەو ئەسپانە لە بەرامبەر بەفری سپیی خاوەندسەلات دا، کە تا چاو بڕی دەکرد، شەپۆل شەپۆل، بە سەر یەك دا کەوتبوو، دەبریقایەوە. ئەو ئەسپانە لە ئەرجیاس و چیای حەسەنی ڕا هاتبوون.

کلك و یاڵی ئاگرین، هەور و دەریای شین، هەموویان خزینە نێو یەك و تێکەڵ بوون. خانووەکان بە سەر یەك دا ڕووخان. دەریا هەڵمسا، هەستا و شینتریش بوو. ماسیگرەیەکی تەنیا بە بێ ئەوەی باڵە ڕووناکەکانی نێلێدا، لە سەر ئاوەکەی دە ئاسمانێ هەڵچوو. دارستان دەیگرماند و شەو پڕ بوو لە قاوقیژی باڵندان. کاتێك شەو بەرەو تەواو بوون چوو، ئەستێرەکە

هاتەوە، لە سەر ترۆپکی چیاکە کە هەر ئێستا گزینگی خۆر ئەنگاوتبووی، وەستا. حەشیمەتەکە، ئەسپەکان، بۆنەکان، جریوەکان لە گەڵ گەڵای دارپەڵکێکی گەیشتنە نێزیك شاری.ماڵی خاوەنملك بە سەر یەك دا ڕووخێنرا و ڕەگەزنامەی دولکادیرلی‌یان دڕبەدڕ کرا.

هونەرمەندی وێنەگەر دەستە پەڵەپەڵە ڕەنگاوی‌یەکانی لە ئاوی کانی‌یەکەی تەنیشت مزگەوتیّ دا شوتەوە. مامۆستا زەکی نەژاد چووە سەر منارەی مزگەوتیّ و دەستی بە قسان کرد. هاوکات، حەشیمەتەکە، ئەستێرەکان و دەریاش وەك میداڵە زێڕەکانی سەر سینگی وی ڕادەژان. ئەو جار لە منارەکەی هاتە خواریّ، سواری ئەسپێکی بۆرە بوو و بە پڕتاو ڕۆیی. خەلکەکە، هەورە سپی‌یەکان، بۆنە خۆشەکەی پنگی، ماسیگرە تەنیاکە، حەوت حەمەدەکان، مەلا فەرهاد، شاهێن، تەیموور، دورسون، قاسم و حەمەدە چکۆلەکەش بە دوای دا ڕۆیشتن.

فوڕات بە پشت ئەو چیا بەرزە بنەوشی‌یانە دا دەڕوا. ناوەکەی سەوزە، شینە، زەردە. گەیشتنە قەراغ فوڕاتیّ. تەپوتۆزێك، وەك هەوری، لە لای ڕۆژهەڵاتێوە پەیدا بوو و حەشیمەتێکی زۆر لە نێو تەپوتۆزەکەی وەدەرکەوتن، نێزیك بوونەوە، لە چۆمەکەیان دا و تێکەڵی ئەوانی دیکە بوون. هەڵۆیەکی باڵگەورە بە سەریان دا دەخولایەوە. خەلکەکە وەڕێ‌کەوتنەوە. مامۆستا زەکی نەژاد، یاوەر شاهێن و ئەو چەتەیەش کە بە ڕەشمار بەنێوبانگ بوو، لە پێشیانەوە دەڕۆیشتن. لە بناری کێوی ئەرجیاسیّ ژاندەرمان پێشیان پێ‌گرتن. ژاندەرمەکان زۆر بوون، بەڵام خەلکەکە لە ئەژمار نەدەهاتن. زۆری پێ‌نەچوو ژاندەرمەکان دە نێو خەلکی دا ون بوون و ئاسەواریان نەما. لە لای دەشتیش ڕا خەلکێکی زۆر هاتن، دەتگوت لە عەرزی هەڵدەقوڵێن، یان لە ئاسمانیّ ڕا بەردەبنەوە. هەزاران ئەسپ لە کێوی ئەرجیاسیّ ڕا داپەڕین، ڕەوە ڕەوە، دەتگوت کۆمەڵە هەورن، یاڵ و کلکیان بە دەم باوە دەشەکایەوە. لە هەموو لایەکەوە خەڵك دەهاتن و تەواوبوونیان نەبوو. هەموو تێکەڵ بوون، تەواوی دەشتەکەیان پڕ کرد و لە پێش شاری کۆنیای ڕاوەستان. لەشکرێکی چەکداری سەرتاپیّ ئاسن و پۆڵا هاتە پێشیان. ئەوانیش ئەوەندە زۆر بوون، دە ئەژمار نەدەهاتن. ئەسپەکان کە یاڵیان بە دەم باوە ڕادەژا، ماسیگرە تەنیاکە، دەریا، دارستان و هەموو خەلکەکە بە یەکەوە بزووتن و دوژمنیان وە بن خۆیان دا. بەفر دەستی بە بارینیّ کرد، دنیا لە ژێر بەفری سپی دا ون بوو. پیاوە چەکدارەکان کە سەرتاپێیان پۆڵا و ئاسن بوو، وە بن پێیان کەوتن. دەرگاکانی کۆنیای کرانەوە و ئەو ژنانەی لە گەڵ بابە ئەلیاسی بوون، پێش هەموو کەسی دی چوون دە شاری‌یەوە. سەیرانیشیان لە گەڵ بوو. سەیران منداڵەکەی بە باوەشی‌یەوە بوو. ئەو جار ئەسپەکان و خەلکەکە چوونە نێو شاری. حەشیمەتەکە کۆنیای دە نێو خۆی دا ون کرد. ئەسپەکان دەستە دەستە دەیانحیلاند. مامۆستا زەکی نەژاد چووە سەر منارەی. میداڵەکەی وەك ئاگر بە سینگی‌یەوە دەدرەوشایەوە. خەڵك هەر وا دەهات، ئەستەمبوڵ و ئەنکەرەشیان گرت و ئەو جار

شاره بچووکترەکان و گوندەکانیش گیران. زەکی نەژاد چووبووە سەر دوندی منارەکەی، میدالەکانی وەك ئاگر دەدرەوشانەوە. ژنان لە ژێر تیشکی خۆری تازە هەڵاتووی بەیانی گۆرانیی خۆشخۆشیان دەگوتن و هەر کەس گوێی لە دەنگیان دەبوو، خەمی نەدەما و دڵی وەك باڵندەیەکی سووك دەبوو.

دنیا پڕ بوو لە گۆرانیی خۆش خۆش، قاوقیژ، جۆش و خورۆش و هەرواهوریا. شەو، دارستان و دەشت و دەری داگرتبوو. ئەستێرەکە لە ئاسمانێ، ڕاست لە سەر دەریایە ڕاوەستابوو و دەدرەوشایەوە. ماسیگر، سپی‌یەکە باڵی وێكهێنان و بە سەر دەریای بێسنوور دا فڕی: جار جار خۆی دە نێو ئاوەکەی داویشت، دەهاتەوە دەرێ، دیسان باڵەکانی وێكدێنانەوە، بە سەر دەریاوە لەنگەری دەگرت و جووڵەی لێ‌دەبڕا...

لە نەکاو خورۆش و گرمەی دارستانی بڕایەوە. وا دیار بوو شەو کۆتایی هاتبوو و وڵات ڕووناك ببوو. ئەسپەکان شل بوونەوە.

موسلیم گوتی:

ـ ئەوەتا، ئەوە گۆڕی بابەحەسەنی‌یە!

هەڵوێستەیەکیان کرد و ئەو جار ڕووی ئەسپەکانیان دە لای ڕاستە کرد و ڕۆیشتن. دارستانەکەی ئەم لایە پڕتر بوو. لە بن داربەڵكێكی گەورە دابەزین. نمە بارانێك دەباری و هەوا بۆنی هەنگوینی دەدا. لە وێ حەمەد چاوی بە پۆلێك پنگ کەوت، ئیدی دڵەڕاوکێی نەما و دەروونی پڕ بوو لە شادی، پێی‌وا بوو تازە لە دایکی خۆی بووە.

ـ هەتا شەو دادێتەوە، لێرە دەبین.

موسلیم گوتی:

ـ زۆر باشە، وا دەکەین.

ماوەیەك پێ‌چوو و ڕۆژ بڵیند بوو. موسلیم لە خورجێنەکەی، کە بە پاشتەرکی ئەسپەکەیەوە هەڵواسیبوو، توورەکەیەکی دەرێنا و لە نێو توورەکەکەش نان، دۆڵمەی باینجان و گەڵامێوی هێنا دەرێ و لە پێش حەمەدۆکی دانا:

ـ ئەوە سەیران لێی‌ناوە و بۆی ناردووی.

کاتێك حەمەد چێشتەکەی لە موسلیمی وەرگرت، دەستی دەلەرزین و هەستی کرد گەرووی گیرا. تاوێکی باش دە دۆڵمەکانەوە ڕاما. زۆری ئێشتیا چووبوونێ، بەڵام دڵی نەدەهات بیانخوا. لە پڕ چاوەکانی پڕ بوون لە ئاو و بە ئەسپایی دۆڵمەکانی لە سەر گیای دانا. دەتگوت شتێکی پیرۆزی وەگیر کەوتوە و دەبێ بە پارێزەوە هەڵسوکەوتی لە گەڵ بکا.

گۆڕی بابە حەسەنی کەوتبوە پشتیان. گۆڕەکە گومبەزی لە سەر کرابوو. حەمەد چووە ژووری گومبەزەکەی، بەڵام لە بەر شەمشەمە کوێران نەیتوانی لە وێ دا بمێنێتەوە و زوو هاتەوە دەرێ. لە شەمشەمە کوێرەکان ترسابوو و بە ڕاکردن چۆوە لای موسلیمی.

ــ ئەوە چییە حەمەد؟ بۆ وا سپی هەڵگەڕاوی؟

ــ هیچ نیە... پیاوی چاك بە کەمێکم ئاو بۆ بێنە... زۆر ترسام...

موسلیم بە غار چوو قورۆشکەکەی خۆی، لە جۆگەکەی، کە ئاوێکی ڕوون و ساردی پیّدا دەهات، پڕ کرد و بۆی هێنا. حەمەد بە کاوەخۆ ئاوەکەی خواردەوە.

ــ لە چی ترسای؟ لە قەبرەکەی؟

حەمەد لە حاڵێك دا هێشتا هەناسەی نەهاتبۆوە سەرخۆ گوتی:

ــ نا، نا...

موسلیم چوو بۆ لای قەبرەکەی، بەڵام حەمەد نەیهێشت:

ــ بۆ دەچی؟ پێتخۆشە بمری؟ ئەو دڕندە پیسانە خۆ بە هەر کەس دادەن، هەتا هەموو خوێنی لەشی نەمژن، لە کۆڵی نابنەوە. بۆخۆشت دەزانی چنگ لە هەر کەس قایم کەن، ئیدی بەری نادەن، تەنانەت ئەگەر لەتوپەتیشیان کەی!

موسلیم ملی بادا و گوتی:

ــ دەنا هیچ لە من ناکەن!

خەریك بوو بچێ، بەڵام کە دیتی حەمەد تووڕە دەبێ، گەڕایەوە.

حەمەد گوتی:

ــ ئەمن هێندێك دەخەوم. ئەتۆش ئاگات لە وڵاتی بێ، بەڵام نەچی دە نێو گومبەزەکەیەوە، بچی، تووڕە دەبم...

ــ باشە، باشە، تێگەیشتم...

حەمەد هێندێك گەڵادار و چیلکەوچاڵی کردە سەرین و لە نێو گیای بۆی درێژ بوو. کاتێك لای نیوەڕۆیە وەخەبەر هات، موسلیمی بە پەشۆکاوی دی و گوتی:

ــ ئاخری چوویە نێو گومبەزەکەی؟ خۆ ئەمن بە خەون دیتم!

موسلیم قاقا پیّکەنی و گوتی:

ــ نا، نەچووم. نەتبیستوە دەڵێن خەونی ڕۆژێ هیچ نیە و هەزار خەونیش بە ڕۆژ ببینی، نابێ گوێیان بدەیەی؟

حەمەد بە بێوازی گوتی:
ــ دەزانم.
موسلیم هەر وا بە پێکەنینەوە چوو لە جۆگەکەی ناوی هێنا و هاتەوە. کە دانیشتەوە، خۆی پێڕانەگیرا، دیسان دەستی بە پێکەنینێ کردەوە و ئەو جار حەمەدیشی وە پێکەنین خست:
ــ بەسە ئیدی موسلیم، بێدەنگ بە با نانەکەمان بخۆین...
نانوپێخۆرەکانیان لە سەر گیای، لە پێش خۆیان دانان. حەمەد نانێکی هێنا و بابۆڵەیەکی لە دۆڵمەکان پێچایەوە. پاش ئەوەی تاوێکی تێوە ڕاما و یادی سەیرانێی کرد، خواردی.
تاریکانێ سوار بوونەوە، لە دارستانەکەی هاتنە دەرێ و هەتا گەیشتنە گوندی "دار هەناری" بە مەزرایان و کوێرەڕێیان دا ڕۆیشتن. ڕێژنەبارانێك باری. شەوێکی یەکجار تاریك بوو. کە دابەزین، دەسبەجێ عەلییە شەل دەنگی دان:
ــ ئەمن ئەوەتا لێرەم...
ئاوڕیان دایەوە و تەمەشایان کرد عەلی لە بن دارێکی گەورە ڕاوەستاوە:
عەلی گوتی:
ــ ئەسپێکی حەساوەوەم بۆ هێناوی! بەڵام وادیارە ئەوەی دە بنت دایە، ئەسپە بزۆزەکەیە، وا نیە؟
ــ بەڵێ، بۆخۆت دەزانی ئەسپەکوێت وەك ئەسپی دیکە نیە.
ئەوان دانیشتن و تاوێکی باش دە یەکترەوە ڕامان. عەلییە شەل قوتوێکی زێوی لە باغەڵی دەرهێنا، سیگارێکی بۆ حەمەدی پێچایەوە و دایە دەستی. پاشان یەکیشی بۆخۆی پێچایەوە و ئەو جار هەردووك سیگارەکانی هەڵکردن. هەردووکیان بێئەوەی قسەیەك بکەن، بەکاوەخۆ سیگارەکانیان کێشان, قونچکەکانیان فڕێدان و پێیانڕێخستن.
عەلی بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی:
ــ بە ڕاستی نازانم...
حەمەد هەر وا بێدەنگ بوو و چاوەڕوان بوو بزانێ عەلی دەڵێ چی.
ــ بە ڕاستی نازانم... ئەو لە ماڵە خەلیل بەگی گەورە دەبێ. ئەمشۆ ناخواتەوە. ئەو شەوانەش کە ناخواتەوە و مەست نابێ، بە شێوەی ئاسایی زوو دەچێ لە ژوورەکەی خۆی درێژ دەبێ و ڕۆژنامان دەخوێنێتەوە. بە بڕوای من ئەتۆ دەبێ ڕاست پێش نیوەشەوێ بگەیە نێو شاری. ئەمن ژوورەکەیت نیشان دەدەم... بەو جلانەوە کەس نامناسێتەوە و هەوڵیش دەدەم هێندە نەشەلم... لە وێ ئیدی بەجێت دێڵم، چونکە منیش کارێکم هەیە، کە دەبێ هەر ئەمشۆ تەواوی کەم...

ـ ئەوان قەت شکت ناکەن و لێت بەدگومان نابن. هیچ کەس نازانێ کە تۆ هاورێی منی و لە گەڵ منی...
بەڵام با پرسێکت پێ بکەم: پێتوایە وا باشتر بێ جارێ دەستڕاگرین و دواتر ئەو کارەی جێبەجێ بکەین؟
عەلی دەسبەجێ گوتی:
ـ نا، نا، ناکرێ حەمەد!
حەمەد بێدەنگ بوو.
کاتێك کەڵەبابی نیوەشەوێ خوێندی، سوار بوون. حەمەد بانگی موسلیمی کرد و کیسەیەکی دایە دەستی. کیسەکە هێندێك سکەی زێڕی تێدا بوو:
ـ ئەتۆ ڕاست بڕۆوە لای سەیرانێ و ئاگات لە وی بێ. ئەمن سەیرانێ بە تۆ دەسپێرم. ئەو زێڕانەشی بدەیە! پاشان ئاوزەنگیی توند کرد.
موسلیم بە دوای دا ڕای کرد و گوتی:
ـ باشە، قسێکی تایبەتیت نیە پێی بڵێم؟
حەمەد بە دەنگێکی پچڕ پچڕ گوتی:
ـ نا، هیچ قسەیەکم نیە...
ئەو جار بە دوای عەلی دا ئەسپی لنگ دا و ڕۆیی.
لە لای خوارێوە چوونە نێو شاری. ئەسپەکانیان سەبر لێدەخوڕین. بە ئەسپایی چوونە نێو حەساری ماڵی خەلیل بەگی گەورە و ئەسپەکانیان لە قولینچکێکی، بە دارزەیتوونێکییەوە بەستنەوە. عەلییە شەل بە هاسانی دەرگاکەی کردەوە. بێدەنگ، لە سەر پەنجان، لە پلیکانەکان وەسەر کەوتن. عەلی سەری بردە بن گوێی حەمەدی و گوتی:
ـ چراکەی داییسێ... بێگومان لە وێیە!
عەلی لە بەر دەرگای ژوورەکە، حەمەدی بەجێهێشت.
حەمەدۆك لە حاڵێك دا تفەنگی بە دەستەوە بوو و قامکی لە سەر پەلەپیتکەی دانابوو، دەرگای ژوورە خەوەکەی کردەوە و وەژوور کەوت. عارف سایم بەگ لە سەر تەختە خەوەکەی درێژ ببوو، لیفەیەکی جوانی پەڕاوێز بە دەزووی زەرد گوڵدۆزی کراوی پێوە بوو و ڕۆژنامەی دەخوێندەوە. کاتێك دەنگی دەرگاکە هات، سەری هەڵێنا، ڕۆژنامەکەی دانا و بە پەشۆکاوییەوە چاوی دە حەمەدی بڕی.
ـ عارف سایم بەگ ئەمن حەمەدۆکم!
عارف سایم بەگ هەوڵی دا بزەیەك بێنێتە سەر لێوانی، بەڵام کە دیتی حەمەد کاڕابینەکەی بەرز کردەوە، لە ترسان چاوی پێ زەق بوون:

ـ ئەوە چ دەکەی؟ چ دەکەی کوڕم... شتی وا نابێ... ئەمن... ئەتۆ خەریکی...

چی دیکەی بۆ نەهات و هەردووك دەستی بە دەموچاوی گرتن.

حەمەد پێنج جاران لە سەر یەك قامکی لە پەلەپیتکەی کێشا. چرا چینی‌یە گەورە کووپ پەمەیی‌یە گوڵ شینەکەی لە تەنیشت تەختەکەی بە دیواری‌یەوە هەڵواسرابوو، بە بای گوللەکان کوژایەوە.

حەمەد وەك برووسکەی لە پلیکانان هاتە خوارێ، خۆی هاویشتە سەر پشتی ئەسپەکەی و ئاوزەنگیی توند کرد. ئەسپ دەرپەڕی، وەك بای ڕۆیی و بە خێرایی لە شاری وەدەرکەوت. دوای ئەو تەقەیەی شارەکە شڵەژا و بوو بە گرمە و هەرایەك، دەتگوت ڕۆژی حەشریە . حەمەد جارجار گوێی لە ویزەی گوللەیەکی دەبوو، کە بە پەنای دا دەڕۆیی.

تاریکوڕوونی بەیانی گەیشتە گۆڕێ گوڵان. بڕیاری دا بوو بە لای دایە حۆری دا بڕوا و ماڵاوایی لێ‌بکا. دە نیوەی ڕێگایە دا، لە دوورەوە چاوی بە حەشیمەتێکی کەوت. جڵەوی هەڵەنگاوت و هەر لە وێ ڕاوەستا. ئەسپەکە هێندەی ئارەقە کردبوو، هەموو گیانی کەفی دەردابوو و یاڵەکانی کە ئێستا تۆختریشیان دەنواند، لە بەر شۆقی ڕۆژی دەبریقانەوە. سێبەری ئەسپ و سواری کەوتبوە سەر عەرزی و درێژ ببۆوە. باڵندەیەکی سپی کە هەر بە قەد پەڕەسێلکەیەکی دەبوو و باڵەکانی باریك و تیژ بوون، بە سەر خەڵکەکەی دا دەخولایەوە.

حەمەد پێویستیی بەوە نەبوو زۆر بڕوانێ و زوو ئەوەی لێی‌دەگەڕا، لە نێو حەشیمەتەکەی دۆزی‌یەوە. حەمەد ئەسپەکەی لێ‌خوڕی و چووە پێشێ. خەڵکەکە ڕێیان دا و ڕێگایان بۆ کردەوە. هەموو بێ‌دەنگ بوون، بێ‌دەنگی‌یەکی وا قووڵ کە تەنانەت دەنگی هەناسەشیان نەدەبیسرا. سەدان جووت چاو دە حەمەدۆکی‌یەوە ڕامابوون.

حەمەد لە پێش دایە حۆری دابەزی. سێ جاران دەستی ماچ کرد و لە سەر سەری دانا. دایە حۆریی پیریش باوەشی پێ‌دا کرد، ماچی کرد و بە سینگی خۆیەوە گوشی. ئەو جار حەمەدۆك سواری ئەسپەکەی بۆوە. ئەسپەکوێت گوێی دە چەمەوە بردن.

ـ دایە حۆری، زۆرت ئەرك بە ئەستۆی منەوە هەیە، گەردنم ئازاکە! لە سەر من زۆرت ناڕەحەتی و چەرمەسەری دیتوە...

پاشان هەستایە سەر ئاوزەنگی‌یان، چاوی بە خەڵکەکەی دا گێڕا و بە دەنگێکی بەرز گوتی:

ـ ئێوەش خەڵکینە، هەمووتان، گەردنم نازاکەن! قەرزدار و منەتباری هەمووتانم! ماوەیەك، هەر وا لە سەر زینەکەی، سەری دە بەر خۆی نا و بیٚدەنگ مایەوە. پاشان سەری بەرز کردەوە، چاوی بە سەر خەڵکەکەی دا گێڕایەوە و هاواری کرد:

ـ دەگەڕێمەوە! دێمەوە!

پاشان ئاوزەنگیی توند کرد و بە سەررەو بەرەو بناری عەلیکۆی ئەسپی ئاژوا.

کاتێك جووتێرەکان هەواڵەکەیان پیٚگەیشت، هاتن و وردە وردە لە دەشتی دڕووان کۆ بوونەوە. خەڵك بنەی نەدەهات، هەر وا بە ڕێوە بوون، دەگەیشتنێ و حەشیمەتەکە ساتبەسات زۆرتر دەبوو. بایرام و جومەك چاوەش بە دەهۆڵ و زوڕناوە هاتبوون و هەموو شایەرەکانی دیکەش گەیشتبوونێ... خەڵکەکە ویٚکەوتن گوێنی، کەرتەشی، چەقڵەشینکە، قەڵغان، کیفار و وشترخۆرکەیەکی زۆریان هەڵکەند، لە نێوەڕاستی دەشتەکەی لە سەر یەك کەڵەکەیان کردن و تەپۆڵکەیەکی گەورەیان لە دڕوان دروست کرد. دایە حۆری ئاگرەکەی هەڵکرد. بایرام و جومەك چووبوونە سەر تەپۆڵکەکەی، هەڵدەپەڕین و دەهۆڵ و زوڕنایان لیٚدەدا. شایەرەکانی دیکەش سەمایان دەکرد و گۆرانییان دەگوتن. کاتێك ئاگرەکە خۆش بوو و گڕ لە کۆ دڕووەکەی بڵیند بوو، تەواوی خەڵکەکە دەستی یەکتریان گرت و داوەتێکی خۆش سازبوو. گەڕی داوەتەکەی ئەوەندە گەورە بوو، لە سەرێکی ڕاوەستابای، ئەو سەریت لیٚ دیار نەدەبوو. هەر لەو ساتەوە گۆرانیی خۆش خۆش کە باسی سەرکەوتن و شادییان تیٚدا دەکرا، دروست بوون و گوترانەوە. گڕەکە بە سەر پۆلە دڕوان دا دەفڕی و تێکییەوە دەپێچان. ئاگر تەواوی دەشتەکەی پڕ کرد، گەیشتە بنارەکان و بە دۆڵەکان دا بڵاو بۆوە. هەرچی دڕووەجاڕی وشك بوو، سووتا. ڕووناکایی ئاگرەکە لە شاخە بنەوشییەکانی دەدا، ڕووناکی دەکردن و دەتگوت لەو کاتە دا ڕووەو ئاسمان ڕادەژێن.

لەو کاتەوە ئیدی حەمەدۆك ون بوو، بیٚسەر و شوێن چوو و کەس چاوی پیٚینەکەوتەوە...

لە ویٚڕۆژێوە خەڵکی گوندەکانی گۆڕیٚ گوڵان، وەنەوشە، کەلاوان، کانییە گوڵان و گوندەکانی دیکەی تووڕووسیش، هەموو ساڵیٚ پێش ئەوەی گاسنی لە عەرزی دەن، جلوبەرگی جوان دە بەر دەکەن، خۆیان دەڕازێننەوە، هەموو لە دەشت، یان دۆڵێکی گوندی خۆیان کۆ دەبنەوە و تەپۆڵکەیەکی گەورە دڕووی وەك کەرتەشی، چەقڵە شینکە، کیفار، وشترخۆرکە، گوێنی و زی کۆ دەکەنەوە. پاشان کچی هەرە جوان و کوڕی هەرە وێچووی دێی ئاگرەکە

هەڵدەکەن و ئیدی دەبێ بە جێژن و شایی. جووتێرەکان بە شێوەی کۆن و نوێ هەڵدەپەڕن. شێوەکی جوانیان ڕەشبەڵەکی هالا (فاراندۆڵ) ـــە، کە دەستی یەکتر دەگرن، ئالقەیەکی گەورە پێك دێنن و هەموو بە یەکەوە هەڵدەپەڕن. شایەرەکان گورانیی تازە و خۆش دروست دەکەن، کە بەندەکانیان باسی شادی و سەرکەوتنیان تێدان. ئەو گۆرانییانە دەسبەجێ بە تەواوی گوندەکانی کێوپارەی دا بڵاو دەبنەوە، دەگەنە دێهاتەکانی دەشتێ، دەچنە نێو ڕێگا و توولەڕێیانەوە و لە هەرێمێکەوە دەچنە هەرێمێکی دیکە. لە هەموو گۆرانییەکانیش دا دروو، لە دەشت، دۆڵ و هەموو شوێنێکی دیکە دەسووتێن. ئەو شەوە تا بەیانی ئاگر دایسێ و گڕ بەرز دەبێتەوە. بڵێسەی ئاگرەکە دەلرفێنێ، بە دەشت و دۆڵان دا شەپۆلان دەدا، دێ و دەچێ و ئاسۆ پڕ دەکا. هاوکات تۆپەڵە ڕووناکاییەك لە سەری عەلیکۆی، یەك لە لووتکەی چیای دولدولێ، یەك لە سەری چیای ئەستێرە و یەکی دیش لە ترۆپکی چیای هەزارگای، دەتەقنەوە و سێ شەوان لە سەر یەك، سەری ئەو کێوانە وەك ڕۆژی ڕووناکی لێدێ.

# فەرهەنگۆکی حەمەدۆك

بۆ ڕێکخستنی ئەم فەرهەنگۆکە لە قاموسی "هەمبانەبۆرینە"ی مامۆستا هەژار یارمەتی وەرگیراوە.

## پیتی - ئـ

ئاوقابوون= ئامبازبوون ـ تێکهالآن

ئاراوقارا = ئارام و قەرار

ئەنگوان = گوللە وێکەوتن

ئیستێك = ساتێك

ئالقەڕێز = زنجیرۆکەیەك کە دەرگای پێدادەخرێ

ئالیك = جەمەجۆی یەکسم

ئالآش = قامیش، جەگەن، یان گیای دیکە، کە بە سەر ئالوداران دا دەدرێن و خانوویان پێدادەپۆشرێ.

ئالوودار = ئەو دارانەی خانویان پێدادەپۆشرێ

ئەوبەرەوبەرەکێن = جارێك لەمبەر، جارێك لەوبەر. جێگۆڕکێ لە نێوان دوو بەران دا.

ئاهۆ = پەتا

## ب

بژیو = تێشوو ــ ئەوەی ئینسانی پێدەژی

بژارچن = کەرەسەیەکە بۆ بژارکردن و گژوگیا هەڵکەندن

بێلاندن = دەنگی کاریلەی ( کاریلە دەبێلێنێ)

بەقا = باوەڕ

بەمشە = بە لێشاو

بەرات = حەقدەست ــ برە پوولێك، یان دانەوێڵە و شتومەك کە لە بەرامبەر ماوەیەکی دیاریکراو کارکردن دا دەدرێ بە کەسێك

بوودەڵە = پووخەکە ــ بێنموود و بێکارە

بارێزە = گەڵای بە با داوەریو

بنەتۆو = ئەوەندە دانەوێڵەیەی بۆ چاندن وەبەرچاو دەگیرێ

بەرەگە (کار لە بەرەگە دەرچوون)= نە ناستچوونەدەر ــ نە دەسەڵات دا نەمان ــ لە توانا دەرچوون

بەردەباز = ڕیزەبەردێك لە نێو چۆم دادەنرێ و بۆ پەڕینەوە کەلکی لێوەردەگیرێ.

بە تاموخوێ = زۆر خۆش ــ هەم تامی خۆشە و هەم خوێی باشە.

بەگورد = توندوتۆڵ

بزگوڕ بزگوڕ = لەتلەتبوون

بەرپاڵ = بەرقەد

بینی پێوە نا = دەمی پێوەنا و یەکپشوو خواردی‌یەوە

باراش = گەنمی نامادەکراو بۆ لێکردن

بەخۆداشکانەوە = شەرمکردن ـ تەریقبوونەوە

بازرەبوون = دەرپەڕین و هەڵاتن.

بلووك = بلۆك ــ پارچە سمیتی چوارگۆشەی وشککراوەوە کە خانووی پێ دروست دەکەن

بێچاوڕوو = ڕووهەڵماڵاو ــ بێشەرم و حەیا

بەردەستکردن = بەسەردازانبوون ــ تەسلیمکردن

بێلا ــ بێلایە = هەیوان ـ پێش دەرگا

بۆرییە = حەسیری چنراو بە جەگەن

بیٚڕەزا = بیٚتامان

بیٚهوودە = بەخۆڕایی ـ بیٚسوود

بزڕ بزڕ = شیتاڵ شیتاڵ ـ دڕاو

باڵەڕیٚ = مەودا بە حەوای دا

باپەنا = جیٚگایەك کە با نەیگریٚتەوە

بە سەر ڕۆیشتن= سەرزەنش کردن ـ گلەیی و گازەندە تیٚگرتن

بەر موسوڵدان = خوارەوەی نیٚوك

## پ

پلتۆخ = نەبەگە ـ شل و شەویٚق ـ پیس و پۆخڵ

پتی خویٚنیٚ = خویٚنی گەش

پرمەی گریانیٚ = گریانی لە نەکاو و بە دەنگ

پرینگانەوە = سڵ کردن ـ ترسان و گەڕانەوە

پنگەڵ = شویٚنیٚك کە بە پۆل پنگی لیٚ شین دەبیٚ

پریٚۆڵە = گرموونەهەویری بچووك بچووك

پۆز ـ بەپۆزەوە = لەخۆباییبوون ـ بە لەخۆباییبوونەوە

پیٚرك = هەرزاڵ

## ت

تەشەنە = تەنینەوە ـ زیادبوون

تیٚوەستان = مانەوە ـ گیرکردن

تیٚشوو = نازووقە ـ بژیو

تیغبەند = دوعای پاراستن لە زامی شمشیر

تەلەسمبەند = جادووکراو

ترۆپك = لووتکە

تاوەسووت = تاوسووتوو

تەتەر = نامەبەر ـ پەیامهێنەر

تەڕلك = بنزینی ئەسپی

تێكبەزین = دەپاڵیەكترەودچوونی دوو، یان چەند شت

تێكسڕماو = تێرگۆشت، پتەو و قەڵەو

ترومپا = ئامرازێك كە ئاوی لە عەرز (چاڵاو) پێ‌هەڵدەكێشن.

توورەسپ = توورەكە ئەسپ = توورەكەیەك كە ئالیكی ئەسپی تێ‌دەكەن

تەپلە = جۆرەكلاوێك

تاقەتكردن(بۆ وەڵاغان دەگوترێ) = پێڕاگەیشتن و تفاقپێ‌دان

تریقانەوە= پێكەنین بە دەنگی بەرز

تۆرەمە = ڕەچەڵەك ــ بنەچەكە ــ نەژاد

تەوس = تانە ـ تەشەر

تەوەزەل = تەنبەڵ

تێتەقاندن = هەڵاتنی بە پەنە

تاپۆ = تارمایی

## ج

جاسووس = سیخوڕ

جیوە = شیرەی داری

جەیاز = جیاز ــ ئەوشتومەكەی بووك بۆ ماڵی زاوای دەبا

جلد = بەرگ

جەنجەڕ = ئامرازێكە لە دار و ئاسن، بۆ كلۆش وردكردن دروست كراوە

## چ

چاونەترس = ئازا

چش = قیرۆسیا( ئەگەر هەر ڕۆیی چش، با بڕوا...)

چوارناڵ = بە پڕتاو

چەویر = چەویل ــ خوار ــ لار
چاوتروکاندن = چاولێکنان
چرژان = ڕەنگ گۆڕان ــ سیما تێکچوون
چەتتیێکەوتن = تووشی گرفت بوون ــ گریتیێکەوتن.
چوارمێردەکی =چوارمەشقی
چەستلێدان= سلاوی سەربازی، دەست هەلدینن و لاقان جووت دەکەن.
چزوو = نووکی باریکی کلکی دووپشك، دمی زەرگەته و ئەو دەعبایانەی پێوه دەدەن.

## ح

حەمایەل = کۆمەلێك دوعای نووسراو کە وەك نوشتوویەکی گەورە دەپێچریتەوە و هەلدەگیری

حەژمەت = خەفەت ـ کەسەر ـ نارەحەتی ـ خەم
حووج = ئینسانێکی زۆر درێژ کە دە ئەفسانە دا هەیە

## خ

خەنجەری دەبان = دەبان چەشنە پۆلایەکی بەنێوبانگ کە شیر و خەنجەری لیدروست دەکری.
خۆشمەشرەف = ڕووخۆش
خوو = عادەت ـ سروشت ـ ئەخلاق
خورافات = بۆچوونی بیبناغە و کۆنەپەرستانه
خەتی سولوس = چەشنە خەتێکە
خورجێن = هەگبە ــ توورەکەیەکی دوولایی کە بە پاشتەرکی ئەسپەوە هەلدەواسری
خۆڕسك = لەخۆوە شین بوو

## د

داوەرین = شۆڕبوونەوە

دەوراندەور = دەور تا دەور ــ دەوردانێك كە لە هەموو لایەكەوە بێ.

دێخوون = دۆخین ــ بەنەخوێن

دەفدان = پشووسواربوون ــ دڵ توندلێدان

دڕدۆنگ = دوودڵ ــ بەگومان

دانگە = ئەو شوێنەی مەڕی لێ تفاوق دەدەن

دەرهەڵبوون = بە ڕق و تووڕەیی‌یەوە گوڕاندن و قسەی ناحەز كردن

دیق = ئازارە باریكە ــ كەسەر و خەفەت

دیوناس = ناسیاو ـ ئاشنا

دیزە = گلێنە دەفرێك كە شۆرباوی تیێدا لێدەنرێ

داڵدەدان = پەنادان ــ حەواندنەوە

دەڕابە = دەرگای تەنەكەی دوكانان كە هەڵدەكشێ و دادەكشێ.

دان = نیوەڕۆژێك (دانی بەیانی)

دەستاونگ = ئامرازێكە دانەوێڵە و شتی وای تێدا دەكوتن

دڵبەسۆ = دڵ پڕ لە پەژارە و حەسرەت

دایمودەرهەم = هەمیشە

داروبەخش = بەخشینەوە ــ دابەشكردن

دەمودەست = كتوپڕ ــ لەپڕ

دەقاف نەكەوتن = دەستوێڕانەگەیشتن ــ پێوەنەبوون ــ هەڵنەكەوتن ـ لە شوێنی گونجاو نەبوون(دە قاف ناكەوێ = هەڵناكەوێ، پێوە نابێ)

دەراغ = خەشاب ــ عەمباری تفەنگی

دەستەونەزەر = ڕاستڕاوەستان لە حاڵێك دا كە هەردووك دەست لە سەریەك و لە سەر دڵ دادەنرێ. بە مەبەستی ڕێزگرتن دەكرێ.

دژوێن = كەسێك كە لەش و جلەكانی ئەسپێ و شتی وای گرتبێ.

دەروو = شوێنێكی بەرتەنگ و باریك وەك دەروازەی.

ر

ڕاوڕاوێن = هەڵات هەڵات

ڕۆیەڵبوون = شۆڕبوونەوە و چوونەخوارێۆ نێو چاڵاو و کون و کەلێنان.

ڕاوێچکە = هاتوچۆ کردن

ڕمێن = بڕەو

ڕەفحە = تاقە

ڕەنێوهێنان = سەرپەرستی و پێگەیاندن

ڕاماڵبردن = هێرشکردن

ڕنەك = ئاسنێکی ددانەدار کە وەڵاخی پێدەخورێنن

ڕەتی بەست = سەرەنگرێ بوو ـ لاترەی بەست

ڕەشمە = هەوسار

ڕاپسان = ڕاسان ـ لەپڕ جیابوونەو

ڕەوەدە = ژمارەیەکی زۆر

ڕەسمە = چوارچێوەی دەرگا

ڕەوە = کۆمەڵێك ئەسپ و ماین

ز

زەڕ = زەردر ـ خەسار

زەندەقچوون = ورە بەردان ـ زۆرترسان

زایەڵە = دەنگدانەوە

زەلەق(قوڕوزەلەق) = قوڕوقاڵ

زمان لە گۆ چوون = زمانشکان ـ زمانم لە گۆ چووبوو= زمانم نەدەگەڕا و قسەم پێنەدەکرا.

زلقە = دەنگی پێیان لە نێو قوڕوزەلەقێ.

زاکوون = سام ـ نفووز

## س

**سامالّ** = ساو

**سەنگفەرِش** = جادە یان عەرزی بەرد تیٚگیراو

**سەررِەو** = تاودانی ئەسپ ـ بەغار لیٚخورِین

**سۆراغ** = شوێنەوار ـ شوێن

**سەرەنگریٚبوون** = رِەتبردن

**سەلەم** = پیٚشفرۆش کردن

**سەلیٚتە** = ژنی زماندریٚژی بیٚحەیا

**سوورباو** = مەیلەوسوور ــ شیٚوەسوور ـ ئامالّسوور ـ سووررواش

**سوورِەتبەند** = بە سکەی زیٚرِ رِازاوەوە( تاسکلاوی زەنگیانەداری سوورِەتبەند) = **تاسکلاویٚك** کە بە زەنگیانە و سکەی زیٚرِی بچووك رِازاوەتەوە.

**سەرکردن** = زیادبوون و رِژانە دەرەوە

**سەرتۆپ** = هەلّبژاردە ــ سەرچلّ

**سروشتبەزیٚن** = هیٚزی سەرەوەی سروشت. ئاسروشتی(مافوق گبیعی)

## ش

**شاییلۆغان** = بەزم و هەرای زەماوەند بە دەهۆلّ و زورِنا

**شیلەوتین** = **شیلەوگەرم**

**شلویٚ نەدەبوو** = نەدەشیٚوا ــ تیٚكنەدەچوو

**شیٚو و وەرد** = کیٚلاّن و دووبارە کیٚلاّنەوە. وەردی دەوە = **دووپاتەی کەوە**

**شەقە** = لیٚرە دا مەبەست داری بنهەنگلّی شەلانە

**شەمامە** = وەك گرِکەیەکی بچووك وایە و بۆنی یەکجار خۆشە

**شیرنباو** = **مەیلەوشیرن**

**شیپانە** = **چوارچیٚوەی** دەرگا ـ نیٚودەرکیٚ

**شە** = نم ــ تەرِایی

## ع

عۆدەدار = ئەو کەسەی دەستەبەری شتێك دەکا و دەیخاتە سەر شانی خۆی.

## ف

فایتوون = کاڵسکە ـ عەرابەیەکی سووك کە ئەسپی تێدەکرا و هاتوچۆی پێدەکرا. کاری تاکسیی ئێستاشی دەکرد.

فیچقەی کرد = دەرپەڕی ـ بە فشار هاتە دەر

فێڵوفەند = فێڵو تەڵەکە

## ق

قەبلاندن = نرخاندن ـ بەراوەردکردن

قەڵەمباز = خۆفڕێدان

قڕوقەپ = بێدەنگ

قورم = ڕەشایی دووکەڵ کە بە بەری میچی خانوویەوە دەنووسێ.

قوڕوزەلەق = قوڕوقاڵ

قیسپ = دارێکی ڕاست کە بۆ ڕاستڕاگرتنی بار کەلکی لێوەردەگیرێ.

قاوەڵتوون = نێوان نیوەڕۆ و بەیانی ـ چێشتەنگاو

قۆتڕ = بارگینی پیری پەککەوتە

قەوغا = پڕحەشیمەت

قولانجێك = بەینی قامکی گەورە و شادە بە بڵاوی. پیوەرێکی کۆن وەك بستێك، باڵێك، باوەشێك و...

قرووسکاندن = دەنگی سەگ لە کاتی ترسان و ئێش وێراگەیشتن دا

قرنوو = دەعبایەکی وردە بە لەشی پیاوییەوە دەنووسێ و خوێنی دەمژێ

قاوغ = فیشەکی بەتاڵ ـ قاپۆڕ

قوڕۆشکە = پەرداخی تەنەکە

## ك

**کەروێشکەکردن**= گەنم،جۆ و گیا کە بە هێزی با ڕادەژێن

**کووزکووز** = قەڵەش قەڵەش

**کەرامەت نواندن**= ئاگاداربوونی شیخ و پیاوچاکان بە سەرنەهێنییەکان دا ــ کاری عەجایبی پیاوچاکان

**کەفەڵ** = سمتی یەکسم

**کۆپەین** = کۆگایەك پەین ــ تەپۆڵکەیەك پەینی لە سەریەك ڕۆکراو

**کوفلەکوون** (کن فیکون) = دەسبەجێ

**کراوات** = بۆینباخ

**کڵاوی بە گەوەڕ** = کڵاوێك کە دەوراندەور شەپکەی هەیە

**کولێجە** = کەوای ژنان

**کاڵە** = پێڵاوی چەرمی خاو

**کولۆشکوت** = خەرمانکوت= ماشێنێکی بچووك کە کولۆشی دەکوتێ و وردی دەکا

**کوڕووزانەوە**= پرتە و بۆڵە ــ زەلیلی و بێدەرەتانی نیشاندان

**کووژەکە** = جۆرێك مووروی شین کە دەنێن بۆ چاوزار باشە

**کەبکەبە و دەبدەبە** = شکۆ و ڕازاوەیی

**کەسیرە** = سەرمابوون ــ لە سەرمان وێك‌هاتوو

**کەپەنك** = قاپووت

## گ

**گێژدان** = خولانەوە ــ سووڕدان

**گوللەبەند** = دوعای پاراستن لە زامی گوللە

**گێژەو** = باراش گێژەوکردن. خاوێنکردنەوەی گەنم: لە بێژینگ دا گەنمەکە گێژ پێدەدەن، بنژیل و چیلکەوچاڵەکە وەسەرەوە دەکەوێ، دەگیرێ، فڕێدەدرێ و بەو شێوەیە هەر گەنمەکە دەمێنێتەوە.

**گووران** = شین بون

گەرمە = غالّب ـ توند
گوندێنی ئەسپی = نێوگەڵ، ئەو شوێنەی گونی ئەسپەکەی تیّدان
گژەبا = بای توند
گاوگەردوون= مالاّت قوربانیکردن بۆ پێشوازی لە کەسێك
گوێقولاّغبوون = گویّ هەڵخستن و ئامادەبوون.
گڕنەگرتن = بیانوو و پەلّپ
گەڵوازە = خلخلە و بلبلە و مووروو کە وە لانکی منداڵی دەخریّ و منداڵەکەی پیّدەخافلیّ.
گورووبان = نایب عەریف
گوزوگومبەت = لە نەکاو ــ دەمودەست
گێژەو = خاوێنکردنەوەی دانەوێڵە بە بێژینگ( دانەوێڵەکەی لە بێژینگی دا گێژ پیّدەدەن، چیلکەوچاڵ و شتی وا دەکەوێتە سەرەوە و دەیگرن.)
گویّ دە چەمەوە بردن = گویّ قوت کردن

ل

لە نووکەوە = لە هەوەڵەوە
لێشاو = زۆروزەوەند
لە عەیبەتان = لە تاوان ــ لە ترسان
لووربوون(لووربوونە دەریایە)= لە حەوای ڕا بەگوڕ ڕووتێکردن و هاتنەخوار
لزگە = کۆمەڵێك مووروو یان ئاڵقەی بە یەکەوە بەسراو.
لێهاتن = جووتبوونی ئەسپ لە گەڵ ماین، یان جووتبوونی چەشنی دیکەی وەلاّخ
لالاّنەوە= پاڕانەوە
لارەوە لارەوە = لەقەلەق ـ لۆژەلۆژ
لیّخەفتان. (لێتدەخەفتیّ) = هەڵنان بۆ دۆزینەوەی هەلکەوتێکی لەبار.
لەبنەوەبڕ = کەسێك کە بە ڕواڵەت ئارامە، بەلاّم لە بنەوە( بە نەهێنی) کاری خۆی دەکا.
لەنگەرگرتن(باڵندەکە لە سەر ئاویّ لەنگەری گرتبوو) = ڕێك ڕاوەستابوو و باڵی لێکنەدەدان.

## م

مووبەموو = ورد و تەواو

مارِز = زاڵم ــ لاسار ــ کەللەشەق

ماڵتە = وشەیەکە بۆ ئاگادار کردنەوە و سەرکۆنە کردن (ماڵتە کابرا هەر خولێك بدا، دەزانیٚ..)

مەجومعە = سینی

مەڵحەم = مەرهەم

مۆدنە = دەمنە ــ دارسیگار

مۆرکە = کرمی داریٚ

متفەرِك = پیرۆز ــ مەبارەك

مۆرەدیوار = دیواری بە قورِ دانراو

مەیدانەئەسپ = مەیدانێك کە سوارێك دەتوانیٚ تیٚیدا ئەسپ بێنیٚ و بەریٚ و رِمبازی بکا.

مووچە = مەعاش ــ مانگانە

مرِخێشمرِخێش = هەناسەسواربوون بە هۆی شتێکی قورسەوە

ملیوانە = ئەو شوێنەی کراس و بەرگی دیکە کە دەکەوێتە سەر مل

مردەلۆخە = کزولاواز

مازەپشت = تیغەرەی پشتیٚ ــ بربرِەی پشتیٚ

مرید = پەیرِەو ـ= کەسێك کە پێرِەوی لە شێخێك، یان تیرەیەکی ئاینیی تایبەت دەکا

مەتەرێز = سەنگەر

## ن

ناڵچە (ناڵچەی کەوشان) = پارچە ئاسنێکی بچووك کە لە پەنجە و پانیەی کەوشی دەدرا.

نمەك‌کردن = نانی کەسێك خواردن و ئەمەگرِاگرتن( نمەکم کردووی، خەیانەتت پیٚناکەم)

ناسەرسەنگی = بیٚ‌وازی ــ بە پێچەوانەی ویست

نێرگزەئاویلکە = گوڵێکی نێو باتلاٚغی

## و

ولاّخ ( وەلاّخ) = لێرە دا مەبەست ئەسپە، دەنا بە مالاّتی دیکەش دەگوترێ
ودم = پیرۆزی ـ ئیجازەی تایبەت لە شێخی گەورەوە
وێژینگ = خەونووچکە ـ وەنەوز
وەکاز = دارعەسا
وشکەباوەڕ = باوەڕی کۆن و بێبنەما
واقمان = حەبەسان ـ سەرسامان ـ سەرسوڕمان

## هـ

هەزارپارە = هەزارلا، هەزاربەش
هەڵشە = بە پەلە ـ سەرەڕۆ ـ گوێنەبیس
هێور = هێدی ـ ئارام
هۆدانەوە( بە راستی هۆیاندایەوە)= تۆڵەکردنەوە و باش جێبەجێکردن.
هەڵمیسین(بۆنی پنگەکەی هەڵمیسی) = توند بۆنکردن ـ هەڵمژین
هەڵدان = گەشە کردن ـ هەلاّویشتن
هۆڕهۆڕ = بە دەنگی بەرز گریان
هەنیسك = نزگەردی بە گریانەوە
هەزارتوێ = هەزارسیما ـ هەزارڕوو.
هەتلە بوون = ڕێگالێگۆران
هەڵەداوان = بە پەلە

## ی

یەکاویەك = دەسبەجێ ـ بێتەملاوئەولا
یەکبین = یەك تەکان / یەکجێ
یەسکگران = خوێنتاڵ

